

# کەریم خانی زەند

## مێژووی ئێران لە نێوان ۱۷۴۷-۱۷۷۹



نووسەر : جان ڕ . پێری

وەرگێڕ : سەلاحەددین ئاشتی

جان ڕ. پێری

# کەریم خانی زەند

## مێژووی ئێران لەنێوان ساڵانی ١٧٤٧-١٧٧٩

وەرگێڕانی

سەلاحەددین ئاشتی



بنکەی ژین

سلێمانی ٢٠٠٥

٩٥٥
پ ٤٢٤ پێری، جان ڕ.
کەریم خانی زەند: مێژووی ئێران لەنێوان ساڵانی ١٧٤٧-١٧٧٩ /
نووسینی جان ڕ. پێری" لەفارسییەوە وەرگێڕانی سەلاحەددین ئاشتی._
سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٥.
٦٨٥ل: نەخشە" ١٧ × ٢٤ سم.
١. ئێران- مێژوو ٢. کورد- ئێران- مێژوو أ- ئاشتی، سەلاحەددین
( وەرگێڕ ) ب- ناونیشان
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی پێڕستو پۆلێنی سەرەتایی ئامادەکردووە

زنجیرە : ١٥
ناوی کتێب : کەریم خانی زەند، مێژووی ئێران لەنێوان ساڵانی ١٧٤٧-١٧٧٩
ناوی نووسەر : جان ڕ. پێری
وەرگێڕ : سەلاحەددین ئاشتی
بابەت : مێژوو
تایپو مۆنتاژ : تاهیر کەریمی- مەهاباد
بەرگسازی : ئومێد ئیسماعیل پووری- مەهاباد
تیراژ : ١٠٠٠
شوێنی چاپ : سلێمانی، چاپخانەی شڤان

لە بڵاوکراوەکانی
بنکەی ژین
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستانی عیراق - سلێمانی، گەڕەکی ١٠٤ ئاشتی ، کۆڵانی٣٩، خانووی ژمارە ١٠،
( بەرامبەر بە قوتابخانەی سەرەتاییی ئەردەڵان )
تەلەفۆن: ٣١٢٣١٠٥ مۆبایل: ٠٧٧٠١٤٨٤٦٣٣ یان ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ ژمارەی سنووقی پۆست: ١٤
E.mail: bnkaizhin@ yahoo.com

# کەریمخانی زەند

## مێژووی ئێران لە نێوان ساڵانی ١٧٤٧ ـ ١٧٧٩

نووسەر: جان ر.پێری
وەرگێڕ: سەلاحەددین ئاشتی

# پێرست

# پێشەکی نووسەر

مەودای ئەم پەنجاساڵەی بە سەر کۆچی دوایی نادرشـادا تێدەپـەڕێ و دەگاتە سەرەتای دامەزرانی پاشایەتی قاجارییەکان، بە گرینگترین و تاریکترین قۆناخەکانی مێژووی تازەی ئێرانییان دادەندرێ. ورووژانی ئەم بیرە کـە چـاخی باسکراو خاوەنی گرینگایەتییەکی پلە یەکەمـە، ناگەڕێتـەوە سـەر هاوچـەرخ بوونی لەگەڵ ئاڵوگۆڕ و رووداو و هەڵکەوتە بەرچاو و جیاوازەکانی فەرانسـە و ئەمریکا، بەڵکوو دەچێتـەوە نێـو زنجیرەیـەک گۆڕانکـاری ورد و بەرەبـەرەی شێوازی حکوومەتی هاوچەشنی سەدەکانی نێوەڕاستی ئێران کـە لـە ڕۆژگـاری سۆفی گەورە و پاشایەتی نادرشای ئەفشار یانی ئـاخرین کەڵـە سـەرکەوتووی ئاسیادا، بەدی هاتووە. لە مەودای ئەم گۆڕانکارییانـەدا، دوایـین بنکـە و پێگـە کۆنەکانی ئیمپراتۆرییەتی ئێران لە قەفقاز، ئاسیای ناوەندی و ئەفغانستان لـە دەستی دەرهاتن و یەکەمین هەڵمەت و چـالاکی ئیمپراتۆرییـەکانی رووسـیا لـە باکوور و بریتانیا لە باشوور بە مەبەستی وەدەس هێنانی جـەغزی دەسـەڵات و پاراستنی بەرژەوەندی بازرگانێتی (وپاشان سیاسی) ئـەوان بناغـەی بـۆ دارێژا. سەرهەڵدانەوەی دەسەڵاتی هۆزەکانی فارسی‌زمانی زنجیرە چیاکـانی زاگرۆسـی ناوەندی و باشووری و چاخ و خولـی تێمان و دواکـەوتوویی بنەماڵـەی مـیرانی تـرکـزمـان و تۆرەمـەی ئەفشـار و قاجـاری بـاکووری وڵات و ڕێگـیران لـە قوتبوونەوەی حکوومەتێکی ناوەندی زۆرداریيانـەی «ئـاییني یـان لەشـکری» لەبەر یـەکنـەگرتنیان جارناجارێـک خـۆی دەنوانـد. ئاکـامی تـەواوی ئـەم ئاڵوگۆڕانە بوو بـە هـۆی پێداچوونـەوە و چاکسـازییەکی بـڕێک بـەرچاو لـە دەسـپێکی بادانـەوەی بنەماڵـەی قاجـار بـەرەو ئیمپراتۆرییـەتێکی تـازەی کۆدەسەڵاتی ناوەندیخواز.

بۆیە ئەم چاخەم بە تاریک و تەماویترین ڕۆژگارانی مێژووی ئێران ناودێر کرد، چونکە سەرچاوەی فرەچەشنی پێویست بە مەبەستی لێکدانەوە و پێکگرتنی بەربلاو و هەڵسەنگاندن لەگەڵ بەڵگەنامە چەشناوچەشنەکانی بەردەس و بەکارهاتوو و جێی متمانە لە گۆڕێدا نین. ئەگەرچی ئەم سەردەمانەی باسیان کرا و دوایین پاشاکانی سەفەوی و پاشایەتی نادرشا لەگەڵ دەسەڵاتداریێتی دواتری قاجارییەکان هێندێک کەوتۆتە بەر توێژینەوە و نرخاندن، بەڵام هێشتاش کۆتایی ساڵانی حکوومەتی ئەفشارییەکان و دەسەڵاتداریێتی تایفەی زەند مەودای ئەمەیان بۆ نەڕەخساوە کە کۆنەتۆزی فەرامۆشییان لە ڕوو بتەکێ. گەڵاڵەی ئەم کتێبە کە بنچینەی لەسەر بنەڕەتی نامەی دکتۆرای پێشنیارکراوی زانکۆی کەمبریج، لە ساڵی ١٩٦٩دا داڕێژراوە، تێکۆشانێکە بە مەبەستی وەدیهێنان و پڕکردنەوەی بەشێک لەم نیاز و کەلەبەرە. لەو ساڵانەدا کە دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە بەڵگەی نوێتر لەوەی وا لەبەردەستان بوون وەدیهاتن و بەڵگەنامە کۆنەکانیش دەبوو لە ڕوانگەیەکی تازەوە سەیریان کرابا. بەڵام ئامانجەکە کە شیکردنەوەی چۆنیەتی وەدەسهێنانی سیستمی ئیمپراتۆرییەتی ئێران بوو لە لایەن پیاوێکی هەڵکەوتەی سەیر کە کار و کردەوە ئاساییە مرۆیەکانی لە ڕۆژگاری ملهوڕی و زۆرداریدا وەک نەریتێک خۆی نواند، گۆڕانی بە سەردا نەهات. ئەم جەغزی دەسەڵاتەی ئەو بەدی هێنا و شێوازێکی وا کە سەردەمانی خۆی دایهێنا، ڕەنگە دواتر بکەوێتە بەر پێداچوونەوە و نرخاندنی دادپەروەرانەتر.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجە کەسانێک لە ئێران و بریتانیا و ئەمریکا و شوێنەکانی تر یاریدەیان دام و بەدڵ تێکەوتن کە بۆم ناکرێ تاکتاک سپاسیان بکەم. جگە لە وەی لە پەراوێزی ئەم کتێبەدا ئەنگوستم لەسەر داناون، هێندێک لە دۆستان و هاوکاران و دامەزراوەکانیش دەبێ بەتایبەت بە چاکە باسیان بکرێ:

حامید ئالگار لە یەکەم دانیشتنەکانی پێکەوەمان لە تاران، سەردەمی «زەند»انی بە بار و بواری لێکۆڵینەوە و توێژینەوەدا وەک بەستێنی گەشە و هەڵدان ناساند، مامۆستایانی ڕێنوێنم، هیوبێرت دارک، پیتێر ئاوێری، خوالێخۆشبوو لۆرێنس لۆکهارت و نەمر موجتەبا مینەوی لە وەختی ڕێکخستنی ئەم بەرهەمەدا یارمەتی و ڕێنوێنییان کردم.

هێنـدێک لــە ئەنـدامانی ناوەنـدی لێکۆڵـینەوەی ڕۆژهــەڵاتناســی و ئەنستیتۆی خوێندنەوەکانی ڕۆژهەڵاتی و کۆلێژی پێمبرووکی زانکۆی کەمبریج و ناوەندی ئینگلیسی خوێندنەوەکانی ئێرانی لە تاران و ناوەندی ئاسیایی زانکۆی پەهلەوی لە شیراز و دۆســتان و هاوکــارانم لــە ســەنت ئانـدرووز، شـیکاگۆ و شوێنەکانی تر بەتایبەت توومــاس ڕیکــز بــە ڕووی خۆشــەوە کــات و بەڵـگە و بەڵگەنامە و بیر و بۆچوونەکانیان خستە بەردەستم. ناوەندی خوێندنــەوەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست چاپ و بڵاوکردنەوەی توێژینــەوەکانمی وەئەســتۆ گــرت؛ جوودی هێردێر دوابین دەقی بۆ تایپ کردم، کریستۆفێر میلروایـل نەخشــەکانی کتێبەکەی ئامادە کرد، ڕاشێل لێهر پێرستی ناوەکانی ڕێکخست؛ بە ئەرکی خۆمی دەزانم کە سپاسی تێکڕایان بکەم و هیـوادارم لایــان وانــەبێ کــە هەوڵــەکانیانم بەفیڕۆ داوە. لەبەر یاریدەی زیاتر سپاسی تایبەتیم پێشــکێش بـــە فرێـدریکا و ڕاهم و سۆنیا دەکەم.

*جان.ر.پێری*

## کورته نیشانەکان

ANP : France, Affaires Etrangeres, Perse series at the Archives Nationales.

BP : East India Company, Bombay Public Consul – tations / Proceedings series.

Brieven : Oost-Indische Compagnie, Bataviase Inko- mende Brieven overgekomen series.

EII : EI2 : The Encyclopaedia of Islam, Ist ed. (Leiden, 1913-38): 2nd ed. (1954- ).

FR : East India Company, Persia and the Persian Gulf Records, vols. XV-XVII (Factory Records).

GD : East India Company, Persia and the Persian Gullf Records, vols. VI-XIII (Gombroon Diary).

MAE : France, Affaires Etrangeres, Perse series at the Archives du Ministere des Affaires Etrangeres.

SP : State Papers, Series S. P . Foreign, Turkey.

# دەسپێک

## پێشینەی مێژوویی

ئێرانی ئەمڕۆ دەبێ بە ئافەریدەی پاشاکانی سەفەوی دابنـدرێ. بـوار و بەستێنی جوغرافیایی و مەزەبی و سیاسی کە بە واتای بەربلاوی وشە بە دەستی شاسمایل و جێنشینەکانی بەتایبەت شاعەباس (١٥٨٨ ـ ١٦٢٩. ز) ڕێـی بۆخـۆش کرابوو، هۆیەکانی دیاریکردنی ڕەوت و ڕێبـاز و ڕێنـوێنی و جڵەوکێشـی داب و نەریتە نەتەوایەتی و نەتەوەیی‌یـەکانی پێکهێنـا کـە لانیکـەم هـەتا سـەردەمی زیـادبوونی کـارتێکردنی ڕۆژاوا لـە نێوەڕاسـتەکانی سـەردەمی پاشـایەتی قاجارییەکان‌دا کە ڕوودانی کۆمەڵێک چاکسازی گرینگی مسۆگەر کـرد، درێـژەی کێشا. دیارە بە دژواری دەکرێ کە بە دوور و درێژی هەڵسەنگاندن و پێکگرتن لـە مابەینی ڕۆژگاری شاعەباسی گەورە و پاشای ئێستادا بێتە گۆڕ، بەڵام پتـەوی و نـەگۆڕی ڕوانگـەی سـەفەوی لـە مـەودای سـاڵانی پـاش مـردنی نادرشـا تـا فەرمانڕەوایەتی کەریمخانیش بە ڕوونی دێتە بەرچاوان. توێژینەوە لـە بابـەت فەرمانڕەوایانی ئەفشار و زەند و ساڵانی دەسپێکی پاشایەتی قاجارییەکان بەبێ گەڕانەوەی بێپسانەوە بۆ سەر مێژینـەی مێژوویـی و دەزگـا و دامـەزراوەکانی سەردەمی سەفەوی نەگونجاو دەنوێنێ.[1]

وەختایەک ئادەمیزاد چاوێک بە دیوی شاراوەی سەدەی کۆتایی ژیـانی سیاسی فەرمانڕەوایانی سەفەوی‌دا دەخشێنێ و تێدەگا کە ئێران لـەم قۆناخـەدا

---

١ـ بڕوانە کورتەی «هێلمۆت براون» لەم بەرهەمەدا:
The Muslim world, Part III, 181 – 218.

تەنیا لاشەیەکی کلۆر بووە، پتر سەری سور دەمێنێ. ئەم وڵاتە لەبەر شوولێهەڵکێشان لە رابواردن و تەرداوێنی و دەمارگرژی و ئینکەبەری و خوێنڕێژی و لەرزۆکباوەڕیدا کەوتبووە سەر لێواری هەڵدێر و رووخان و تەنیا بیرەوەری خۆشی کارە گەورە و گرانەکانی بناغەدانەرانی لە تلدان و گلانیان پاراستبوو.[٢] هێرشی توندوتیژی ئەفغانییەکان و داگیرکرانی وڵات لە لایەن ئەوانەوە، هاوکات لەگەڵ پەلاماری دەوڵەتانی رووسیا و عوسمانی ئەو لاشە کلۆرەشی تەفروتونا کرد و بوو بە هۆی ئەمەی کە لە ساڵی ١٧٢٠دا وڵات بکەوێتە سەر لێواری دابەشبوون. لەپێشدا نادرشا بە شێوەیەکی بیرمەندانە و پاشان کەریمخان لە سەر پێشوێنی کارەکانی وی وڵاتێکیان پێکەوە نا کە لە زۆر بار و رووکاری بنەڕەتییەوە لەگەڵ رووحی ژیانەوەی فەرمانڕەوایەتی سەفەوی یەکتری نەدەگرتەوە.[٣]

کار و تێکۆشانی ژیانەوەی سەفەوییەکان لە پێشدا بە شێوەی سیاسی و لەگەڵ قوتبوونەوەی خوازیارانی ئەفسانەیی جێنشینی پاشاکانی ئەو بنەماڵەیە ـ لانیکەم دوازدە کەسیان ـ لە ماوەی پەنجا ساڵ دوای داگیرکرانی ئێران بە دەس ئەفغانییەکان دەردەکەوێ.[٤] بێگومان هێندێک لەم داخوازەرانە رەسەن و راستەقینە و تاقمێکیش دەسکردی سەرکردە دەسەڵاتپەرستەکانی ئێران بوون. چوار کەس لە خوازیارانی فەرمانڕەوایەتی سەفەوی برێتین لە: شاتۆماسبی دووهەم و شاعەباسی سێهەم کە نادرشا سەرپەرەستێتی دەکرد و شاسلێمانی دووهەم کە گەورەپیاوانی مەشەد پشتیوانییان لێدەکرد و شاسمایلی سێهەم کە ئاڵقەبەگوێی کەریمخانی زەند بوو. داگیرکرانی فەرمانڕەوایەتی لە لایەن نادرشا و ریزی ئەم بانگەشەدەرانەی لەبەریەک هەڵتەکاند. هەوڵ و

---

٢ـ لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنە سەبارەت بە هۆیەکانی ئەم رووخان و داڕمانە لە:
Lockhart, The Fall of the safavi Dynasty, 16 – 34 ;
هەروەها: Arunova and Ashrafyan, Gosudarstvo Nadir shah, 5.

٣ـ بۆباس سەبارەت بەم بابەتانە و مەبەستەکانی دواتر بڕواننە، وتاری من: «The last safavids»

٤ـ لە هەمان سەرچاوەدا، مێژوویەکی کورتکراوی زیاتری ئەم خوازیارانەی حکوومەت لە لایەن کووهمەرەئییەوە خراوەتە روو، ل. ٤٧٨ ـ ٤٨٥.

تێکۆشانی پاشای ئەفشار بۆ لادانی مەزەبی شیعە و دانانی چەشنێک مەزەبی سوننی لە جێی ـ کە ببوو بە یەکێک لە توخمەکانی نەتەوەیی و کۆنباوی حکوومەتی سەفەوی ـ لەبەر دژایەتی نواندنی بیروڕای گشتی و بێباوەڕی حکوومەتی عوسمانی، بەرەوڕووی تێکشکان بۆوە. سەرکەوتنی پەلامارەکانی نادرشا کە بێگومان سیستمی حکوومەتی پارێزگارانەی سەفەوی کردبوو بە سیستمێکی ئیمپراتۆرییەتی بەرەو گەشەی ئاسیایی لە چەشنی دەسەلاتی تەیمووری لەنگ، بە مردنی نەزۆک مایەوە.[٥]

گەرچی هۆکاری ڕاگرتنی ڕووحییەتی زیندووکردنەوەی خانەدانی سەفەوی پاش مردنی نادرشاش سەرلەنوێ کەوتە بەر سرنج، بەلام بە شێوەی یەکجارەکی لە سەر دەستی کەریمخان بنەبڕ کرا و تێکەوە پێچرا. ڕەنگە لە بەشی سێهەمی کتێبەکەدا ئەم باسە بە شێوەیەکی ڕوونتر دەرببڕین. قاجارییەکان یانی ئاخرین تیرەی قزلباش ئەگەرچی لە ڕوانگەی ڕووداونووسییەوە بە دوایین چەشنی ئەم جوولانەوانە دادەندران، بەلام بە باری دەروونیدا وەک میراتگری ڕاستەقینەی فەرمانڕەوایانی سەفەوی دەهاتنە ژمار. خەلک لەم دەور و زەمانەدا بە چاوی دوژمنێکی داگیرکەر دەیانڕوانییە دەسەلات و پاشایەتی نادرشا و جێنشینی میرێتی کەریمخانیش وەک حکوومەتی ئەفغانی و ئەفشارییەکان بە داسەپاو دادەندرا و ئەم فەرمانڕەوایانە بە کەسانێکی زالم و بێئامانج و بێ قوتابخانەیەکی تایبەت دەژمێردران کە لەخۆوە گەیبوونە دەسەلات. قاجارییەکان لە ڕوانگەی تیئۆریکی و کردەوەیی لە سەر پێڕەوشوێنی یاساکانی شەرعی، زنجیرە پاشایەتییەکی زالمانەیان دامەزراند. ئاغامحەممەدخان و فەتحعەلیشا بە وەبەرچاو نەگرتنی جیاوازی کەسایەتییان، دەکرێ بە سەرهەلدانەوەی سیاسی شاسمایل و شاعەباسی یەکەم دابندرێن. هەلبەت ئەم مەبەستە پەیوەندییەکی بە ئامانجی ئێمەوە نیە لەم کتێبەدا. بەر لە دەسپێکی مێژووی زەندییەکان دەبێ باسی قۆناخێکی مێژوویی تر بێنینە گۆڕ کە ئەویش برێتییە لە سەربوردەی جێنشینانی یەک لەدوای یەکی نادرشا لە خوراسانی

---

٥ـ دەسکەوتەکانی نادرشا بە دووروودرێژی لەم بەرهەمەدا:

Lochart, Nadir shah, 266 – 281; but cf. Arunova and Ashrafyan, Gosudarstvo, 255 - 264

ناوەندی ئیمپراتۆرییەتی پاشای ئەفشار.[6] خوراسان دوای مەرگی نادر خودبەخود کەوتە هەلومەرجی پارێزگایەکی دابڕاو لە ناوەند. جێنشینانی نادر بارودۆخێکی وایان پێکهێنا کە تەنانەت چوونە ژێر باڵی پاشایەتی تازەدامەزراوی ئەفغانییەکان.

چەوساندنەوە و غەدری نادر لە بواری وەرگرتنی خەرج و پیتاک و بێلێهەڵێنانی بە باری کوشتاری خەڵک لە بنەبانی دەسەڵاتیدا، لە ڕوانگەی ئەم ژێردەستانەی ڕۆژگارێکی پێیانهەڵدەگوت، کردبوویە دیکتاتۆرێکی قێزەون و سامناک. لە قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆرییەکەیدا گەلێک ڕاپەڕین ڕوویان دا. لە پارێزگای سیستان عەلیقولیخانی(۱) برازای کە سەرکردە و ڕاسپێراوی سەرکوتی سەرهەڵدانێکی تر بوو، هەستی کرد کە کەوتۆتە بەر بەدگومانی توندی فەرمانڕەوای نەخۆش و نالەسەرەخۆ، هەر بۆیە وێڕای ڕاپەڕیوانی سیستانی و بلووچ و ئەفغان کە لەگەڵی تێکهەڵچووبوون، گەڵاڵەی ڕاپەڕینێکی گشتی داڕشت. نارەزامەندی خەڵک لە ساڵانی کۆتایی حکوومەتی سەرکەوتووی ئەفشار یەکتری گرتەوە و بنەی دانا. لەشکری ڕاپەڕیوان بەرەو خوراسان کشا و لە ئاوریلی ۱۷٤۷دا گەیشتە شاری هیرات. لەو دەمەیدا نادرشا تازە لە دوایین هێرشی بۆ سەر ڕۆژاوای ئێران گەڕابۆوە. لە سەر ڕێی گەڕانەوەی بۆ مەشەد بەرەورووی مەترسی لەنەکاوی جووڵانەوەی ئەوسای «خەبووشان» (قووچان) بۆوە و بێڕاوەستان لێیان وەخۆکەوت. لە شەوی بیستی ژووەندا سپای نادرشا کە بریتی بوو لە شازدە هەزار پیاوی شەڕکەر لە «فەتحاباد»ی قووچان هۆردووبەزی کرد. مەودای نێوان هۆردووگا و بنکە و شوورە و مەتەرێزی ڕاپەڕیوان تەنیا دووسەعاتەڕێ بوو.

دوژمنایەتی کۆنی نێوان قزڵباش و ئەفغانی و ئۆزبەکان کە نادر حەولی دابوو لە ڕیزی لەشکری چەن تۆرەمەیدا بیشارێتەوە، ئێستا گەیبووە ئەوپەڕی خۆی. بەپێی ئەو ترسەی بە سەر نادردا زاڵ ببوو، تازە نەیدەتوانی بڕوا بە

---

6. Lochart, Nadir shah, 259 – 260; Arunova and Ashrafyan, Gosudarstvo, 223 – 225; cf. Brieven 2617 (1749), 43 – 45.

داستانی ڕووداوەکانی دوایی لەم بەشەدا کورتەیەکی «موجمەلوتتەواریخ» ٥، ٨ ـ ٢٠؛ Bazin, 35 – 53 ; LocKhart, Nadir shah. 260 – 263.

سەرکردە ئێرانییەکانی بکا. ناردی لە شوێن ئەحمەدخانی ئەبدالی و سەرکردەکانی دیکەی ئەفغان. نیزیکایەتی و ڕووگەرمی نادر لەگەڵ ئەم سەرکردەیە یەکێک لە گرینگترین هۆیەکانی تۆران و بێزرانی هاوکارانی ئێرانی پاشای ئەفشار بوو. نادر فەرمانی دا بە ئەفغانەکان کە سبەینێ سەرکردە گەورەکانی ئێرانی قۆڵبەست بکەن و هەرکەس بەربەرکانی کرد بیکوژن. ئەم مەبەستە لە لایەن سیخوڕێکەوە گەیشتە لای قوربانییەکانی داهاتوو. سەرکردەکانی ئێرانی کە لە لایەنساڵەخانی(٢) قۆرقلووی ئەفشار و محەممەدخانی قاجاری(٣) ئێرەوانییەوە سەرکردایەتی دەکران، تەمایان گرت هەر ئەوشەوە فەرمانڕەوای دیکتاتۆر بکوژن. نیزیکبوونەوەیان بە شڵەژانەوە قوربانییەکەی وەخۆ هێنایەوە، بەڵام بەر لەوەی هاوار بکا و یاریکاری بوێ، ساڵەخان کوشتی. محەممەدخانی قاجار سەری بڕی و وێڕای تکا لە عەلیقوڵیخان بۆ دانیشتنە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی، سەرەکەشی بۆ نارد. هۆردووگای جیهانگیری ئەفشار تالان کرا، بەڵام حەرەمخانەکەی پارێزرا. دوو کەس لە وەزیرەکانی نادریش لەم ڕووداوەدا کوژران، بەڵام یەکێک لە وەزیرەکانی بە ناوی حوسێنعەلیخانی موعەییرولمەمالیک(٤) کە سەبارەت بە پیلانگێڕان ڕووی خۆشی نواندبوو، بەخشرا. ئێرانییەکان بوونە بەرهەڵستی ئەو کەسانەی خەریکی ڕۆیشتن و گواستنەوەی ڕیزەکانیان بوون، بەتایبەت ئەفغانییەکان.

سەرەڕای ئەم گشتە پارێزگارییە، چوارهەزار سوارەی شەڕکەری بەهێزی ئەفغانی بە سەرکردایەتی ئەحمەدخان لای بەیانی بەم پیلانەیان زانی. پاشماوەی لەشکرەکە یەکێتی خۆیان پاراست، ئەفغانییە لەبەرچاو بێزراوەکان هەلیان لە چارەنووسی شومی ئەربابەکەیان هێنا. لەبەروەی ئێرانییەکان بەیانەی ئەوڕۆژە گوێبیستی ڕزگاری خۆیان ببوون، دابوویانە دەری تێکەولێکە، ئەحمەدخان هەموو پیاوەکانی کۆکردەوە هەتا بە قوونەشەڕ بۆی دەربازبێ. بە گوێرەی ئەم نووسراوانەی لە بابەت ئەحمەدخانەوە بە دەستەوەن، ئەفغانییەکان تەواوی تۆپخانەی لەشکریان فڕاند، چەند کەسێکی بەندکراویشیان لەگەڵ خۆیانا برد و بەزۆری دڕیان بە لەشکر دا و چۆن چاکە ئاوا بە پڕتاو بەرەو باشوور ئاژاوتیان هەتا لە نیزیکبوونەوەی شارەکانی

مەشەد و هیرات کە بە دەس عەلیقولیخانەوە بوو، خۆبپاریزن. ئەحمەدخان لەشکری بچووکی خۆی بەرەو توربەتی حەیدەرییە و توون و قائین ئاژاوت. پیاوەکانی سەربازگەی عەلیقولیخان لە قائین دوای ماوەیەک خۆڕاگری هەلاتن. سەرکردەی ئەفغان لێرەوە چوو بۆ قەندهار و لەو شارەدا کاروانی گواستنەوەی ئەو زێڕ و جەواهێراتەی لە هیندەوە بەرەو هۆردووگای نادر بەڕێوە بوو وەچنگ‌هێنا. لە ئۆکتۆبری ١٧٤٧دا سەرکردەی گەنجی ئەبدالی وەک پاشای ئەفغانستان لە سەر تەختی پاشایەتی لێیدانیشت و نازناوی «دوڕان»ی وەرگرت و بناغەی فەرمانڕەوایەتی دورانی و ئەفغانستانی تازەی ڕۆنا.[7]

لەشکرگای نادر ڕۆژێک پاش کوژرانی بەتەواوێتی تێکوپێک درا. لە مەشەد کە سەربزێوی بەرفرەوانی کارگێڕان و تاقمەکانی لەشکری و خزمەتکارانی هۆردووگا چاکی بەر پێنەدەگیرا، بەپارێزەوە ئیزنی سەربازگەی ئەفغانییەکانی مەشەد درا کە بە سەرپەرستێتی خاوەن‌دەسەلاتی شار یانی میرسەیدمحەممەد کە پەردەداری نەزرگەی پیرۆزی ئیمام ڕەزا بوو، ئەوێ وەرگرێتەوە. میرسەیدمحەممەد بەیعەتی بە کوڕانی گەورەی نادر یانی نەسروڵلامیرزا و ئیمامقولیمیرزا نەکرد. عەلیقولیخان سەیدی لە سەر کار لانەدا، پووڵ و پارەیەکی زۆری لە نێو سەرکردە و پیاوانی لەشکریدا دابەش کرد هەتا بتوانێ بە لای خۆیدا ڕایانکێشێ. پاشان هێزێکی هاوبەشی شەڕکەرانی خێڵی بەختیاری(٥) بە سەرکردایەتی غولامی گورجی خۆی یانی سۆهرابخان بە مەبەستی گرتنی قەلای لەگیراننەهاتووی کەلات کە کوڕانی نادر پەنایان بۆبردبوو، بەرێکرد. ئەم قەلایەش گیرا، چونکە لە وەختی گەمارۆدانیدا بەهەلکەوت یان بە دانستە و دەهۆ و پیلانگێڕی نەردیوانێک بە تاشەبەردی پەنای قەلاوە هەلپەسێرابوو. تەواوی منالانی نادر بە دیل گیران و زگیان درا، تەنانەت ژنان و کەنیزانی ئەفشار کە پێشیان وابوو دووگیانن کەوتنە بەر شیران. تەنیا کەسێکی نەکوژرا شاروخمیرزا بوو. ناوبراو لە کوڕانڕا نەوەیەکی چواردەسالانەی دیکتاتۆر و لە کچانەوە نەوەی شاسولتانحوسێنی سەفەوی بوو. بۆیە ئەم شازادەیان هێشتەوە هەتا ئەگەر هاتوو خەلک پاشایەتی یەکێک لە پاشەوارەکانی خانەدانی سەفەوییان پێ لە عەلیقولیخان باشتر بوو،

---

7- See esp. al Hosayni, 12 a – 13 b ; Ferrier, 68 – 69.

بتوانن وەک داردەست هەڵیسووڕێنن. لە ڕۆژی ٦ی جووولای ساڵی ١٧٤٧دا عەلیقولیخان بە ناوی «عادڵشا» ڕۆنیشتە سەر تەختی پاشایەتی.[٨]

نووسەر و ڕووداونووسی هولەندی لە «بەندەر عەباس»ەوە دەنووسێ کە تەواوی ئێرانی و غەوارەکان وەک یەک لایان وایە کە بە نەمانی نادرشا هیوای هێور بوونەوەی ڕەوتی پاشایەتی لە دڵ و دەروونان‌دا زیندوو بۆتەوە.[٩] بەڵام پاشای تازە سەرەڕای دەرخستنی کەسایەتییەکی جەماوەری و ڕوانگەیەکی بەرز و ئاوەڵا سەبارەت بە بەخشینی خەرج و پیتاکی سێ‌ساڵانەی وڵات، نیشانی دا کە تەواو ئەو برشت و لێزانینە ڕەوشتییانەی بۆ کۆکردنەوە و بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆرێتی لێکهەڵوەشاو و بەرفرەوان و ناڕێکوپێکی مامی نیە. ئەگەرچی زۆرجاران بەئاشکرا دەگوێیان سرەواند کە بەرەو ئیسفەهان ببزوێ و بێ سێ‌ودوو لە پایتەختی پێشووی سەفەوی بنەگر بێ، دیشانیش برایمخانی برابچووکی کردە سەرداری پارێزگای ئیسفەهان هەتا چەن مانگێک کە خۆی ناچارە لە مەشەد بمێنێتەوە، ئەوێ بەڕێوە بەرێ. مەیخواردنەوەکانی عەلیقولیخان و بوونی سۆهرابخانی غولامی کە خەڵک تێکڕا ناخۆشیان دەویست و هەروابێتەوە لەشکری گەورە و گرانی، بوو بە هۆی پەرەمپەرەم بوونی خەڵکی مەشەد و گوندەکانی و قاتی و قڕی پەیدا بوو.[١٠] چەندجارێک فەرمانی دا بە کوردەکانی قووچان کە دەغڵودان و دانەوێڵەی پاشەکەوتیان بە مەبەستی دابینی خەڵکی پایتەخت ڕاگوێزنە وێندەرێ، بەڵام ئەم کوردانە کە لە سەردەمی نادریش‌دا سەرێکی ئەوتۆیان وەبەر حکومەت نەهێنابوو، هیچ مەیلێکیان بۆ هاوکاری نیشان نەدا. عادڵشا پایزی ساڵی ١٧٤٧ بەرەو قووچان بزووت و شوورە و قەڵای کوردانی تێکڕووخاند و هەرکەس لە سەربازگەی ئەوێ‌دا مابوو کوشتی. دوای

---

٨ ـ هەروەها بڕوانە: کتێبی مەرعەشی، ل ٩٦ ـ ٩٧، تەزکەرەی ئالیداود.

9 – Brieven 2647 (1749), 177.cf. Gombroon Diary, 12 October 1747.

زۆربەی ڕووداوەکانی ئەم بەشە لە کتێبی جیهانگوشای ئەستەرئابادی وەرگیراوە، بڕوانە: ل ٣٢٨ ـ ٣٣٢؛ بڕوانە: دووڕەی نادری ل ٧١١ ـ ٧١٨. هەروەها ل ٥٤ ـ ٥٨؛ بڕوانە: موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٤ ـ ٣٢؛ بڕوانە: مەجمەعوتتەواریخی مەرعەشی، ل ٨٥ و ٩٨ ـ ١٠٣؛ بڕوانە: تەزکەرەی ئالیداود، دەقی ب ٨٢ ـ ب ٧٦.

10. Gombroon Diavy, VI, 16 October, 7. November 1747

گەڕانەوەی بۆ مەشەد چەند کەس لە سەرکردەکانی خۆی بە تۆمەتی بەدگومانی سەبارەت بە پیلانگێڕانیان لە سپادا کوشت و بۆ وێنە دەکرێ ناوی محەممەدخانی قاجار بێتە گۆڕ؛ ناوبراو بە یەکێک لە بکوژانی نادر دادەندرا.

لەم ڕۆژگارانەدا چەکدارانی ئێلجاڕی تووتۆرەمە ڕەنگاوڕەنگەکانی وەک ئەفغانییانی ئەبدالی کە چووبوونە ڕیزی سپای نادر یان بۆ پاراستنی سنوورەکانی خوراسان نێردرابوون، سەری خۆیان هەڵگرت و بەرەو مەوتەنیان گەڕانەوە. پۆلە سوارەی خێڵی بەختیاری کە عەلیمەردانخان سەرکردایەتی دەکردن، وەختایەک دیتیان شا هیچ مەیلی نیە بەرەو ئیسفەهان ببزوێ، ئیزنیان لێخواست هەتا بگەڕێنەوە بو وڵاتی کوێستانی خۆیان؛ بەڵام عادڵشا لە ترسی وەی کە هێزێکی یەکانگیر و بەهێز لە پایتەختەوە وەڕێدەکەوێ، داخوازەکەی بردنەوە پاش؛ کەچی تەواوی چەکدارانی ئێلجاڕی بەختیاری لە کلکەی ساڵی ١٧٤٧دا ڕایانکرد. ڕەوین و خۆدزینەوەیان وەختایەک ئاشکرا بوو کە نزیکەی ٦٠ کیلۆمیترێک لە مەشەدەوە دوور کەوتبوونەوە. شای غەزریو سۆهرابخانی بە هێزێکی گەورە و گرانەوە خستە شوێنیان. ڕۆژی دواتر کە ڕێیان لە سۆهرابخان گرت، ناچار بوو کە بێ خۆئامادەکردن و بە سەرلێشێواوی پەلاماریان بدا. شەڕکەرانی کۆنەکاری بەختیاری کە بۆ تێکهەڵچوونی وا تەواو بەتوانا بوون، هێرشەکانیان تێکشکاند و بە هێوری درێژەی ڕێیان دا. سۆهرابخان و پاشماوەی لەشکرەکەی بەرەو مەشەد گەڕانەوە. لە گەڕانەوەدا خەڵکی تاکوتەرا و دابڕاوی بەختیاری و نابەختیارییان بە دیل گرت و سەریان بڕین هەتا هەم تووڕەیی و ناهومێدی خۆیان داسەکنێنن و هەمیش بۆ هەر سەرێکی بڕاو بڕەپارەیەک خەڵات لە عادڵشا وەرگرن. هەروەها دوای گەڕانەوەیان بۆ مەشەد سەری تەواوی ئەو لوڕانەیان بڕی کە لەم شارەدا نیشتەجێ ببوون. هەتا ژمارەی کوژراوەکان وەک شتێکی بەرچاو خۆبنوێنێ.[11]

لەم کاتەدا برایمخان کە خەریکی قایم و پتەوکردنی شوێن و شوێنپێی خۆی بوو لە ئێراقی عەجەمدا، داوای لە ساڵەخانی «بەیات»ی حاکمی شیراز کرد کە خوردوخۆراک و چەکوچۆڵ بنێرێ بۆ سپاکەی. وێدەچێ لەم بەینەدا لەگەڵ هاوپەیمانی داهاتووی یانی ئەمیرئەسلانخانی سەرداری نادر لە ئازەربایجان

11. Ibid, Bazin, 55 – 57 ; Olivier V, 456 – 457.

کە بەیعەتی بە عادڵشاش نەکردبوو بە نەهێنی نامەیان گۆڕیبێتەوە. واوێدەچێ کە بەدگومانی براکەی سەرەنجام وەها دەستێکەڵکردنێکی خێرای لێکەوتبێتەوە. عادڵشا لە ٨ی سێپتامبردا تەواوی زیڕ و جەواهێراتی کۆکراوە و کەلوپەل پێداویستییەکانی کۆشکەکانی مەشەدی بۆ ناردن بەرەو ئیسفەهان حازر کردبوو. هەر کە گەیشتە مازەندەران لە شاری ئەشرەف کە ئێستا پێیدەگوترێ بێهشەهر، بنکەیەکی دامەزراند و ڕێگاوبانی نێوان مەشەد و ئیسفەهانی ڕێکوپێک کرد. لەخۆڕا پێنج مانگی دیکەی لە ژیانی تەرخانی شەڕی تایفەی قاجار کرد بە سەرکردایەتی محەممەدحەسەنخان. ناوبراو لە سەردەمی نادرشاوە تا ئێستاش ڕاکردوو بوو.[١٢]

کاتی گەڕانەوەی لە شەڕی نێوان خۆی و هێزەکانی قاجار ـ تورکمان لە لێواری ڕووباری سیمبار کوڕی چوارساڵانەی محەممەدحەسەنخانی بە دیل گرت و فەرمانی یەختەکردنی دا. وێڕای تەواوی ئەم هێرش و پەلامارانە نەیتوانی کە خانی قاجار بخاتە داو یان بیبەزێنێ و بەناچار لە ساڵی ١٧٤٨دا بەرەو هەرێمەکانی ڕۆژاوا بزووت و درێژەی ڕێیەی دا.

برایممیرزا و ئەمیرئەسلانخان کە سەبارەت بە بانگ کرانیان بۆ بارگای پاشا خۆیان گێل کردبوو، ئاخرییەکەی بە ئاشکرا ڕاپەڕینی خۆیان ڕاگەیاند: ئەمیرئەسلانخان نێردراوەکانی شای کوشت و برایممیرزاش(٦) سۆهرابخانی لەبەرچاوبێزراوی کە لە لایەن شاوە بەدزی و بۆ سیخوڕی هاتبووە ئیسفەهان شرتوگوم کرد.[١٣] پاشان برایممیرزا هێزێکی بە دژی سەربازگەی بەهێزی کرماشان و سەرکوتی ئەو شارە بەڕێ کرد، بەڵام نەیتوانی تەوژمێکی ئەوتۆ بخاتە سەر ئەو قەڵایەی پێشتر بنکە و قۆرخانەی نادر بوو لە هەرێمەکانی ڕۆژاوا بە مەبەستی پاراستنی ئێراقی عەجەم. بەڵام سەرکردەکانی قەڵاکە یانی میرزا محەممەدتەقی گوڵستانە و ئەمیرخانی عەرەب میشمەست، وایان بە بەرژەوەند زانی کە بەڕواڵەت سەر وەبەر برایممیرزا بێنن. هێزە ڕاپەڕیوەکانی برایممیرزا کەم و زۆر توانیبوویان بەشێک لە هێزە پەرتەوازەکانی نادری لە ڕۆژاوای ئێران کە برێتی بوون سەربازانی ئێرانی و ئەفغانی بۆلای خۆیان

12. Gombroon Diary, VI, 18 and 2, 3 . December 1747
13. Gombroon Diary, VI, 11 June 1748 ; Hanway II, 592 - 594

ڕاکێشن؛ برایمیرزا بەم هێزەوە کە ڕەنگە بیستسی هەزار شەڕکەرێک بووبێ بەرەو باکوور کەوتە ڕێ هەتا لەگەڵ هێزەکانی ئەمیرئەسلانخان یەکتر بگرێتەوە.

سەرەنجام عادڵشا ناچار بوو کە خۆی دەس بە کار بێ و بە پەلە لە گیلانەوە بەرەو پارێزگا پێنجینەکان (ئەیالاتی خەمسە) کەوتەڕێ. لە شوێنێکی مابەینی زەنجان و سوڵتانییەدا بە خۆی و هێزی کەمی کەوتە نێوان دوو لەشکری سەربزێو. هێندێک دواتر لە ژووەنی ۱۷٤۸دا، وەختایەک شەڕکەرانی برایممیرزا لێی نیزیک بوونەوە، زۆرێک لە سەرکردەکانی سپاکەی هەر لەگەڵ یەکەم پەلاماری لەشکری دوژمن، وێڕای چەکدارەکانیان ڕایانکرد و برایمیرزا تەنانەت بێ شەڕ و لێکدانێکی بەرچاو سەرکەوتنێکی گەورەی وەدەس هێنا. عادڵشا ڕایکردە تاران، بەڵام حاکمی تاران گرتی و دایەوە دەس براکەی. برایممیرزا فەرمانی دا کە براکەی کوێر کەن. ماوەی پاشایەتی عادڵشا نەگەیشتە ساڵێک.[14]

لەم کاتەدا ئەمیر ئەسلانخان وەک هاوپەیمانێکی بڕواپێنەکراو بۆ برایمیرزا دادەندرا؛ دوای ئەوەی برایممیرزا لە نزیک مەراغە بە توندی هێزەکانی تێکشکاند(۷)، بە مەبەستی پەنابەرێتی بۆ قەراچەداغ، لەگەڵ کازمخانی قەراچەداغی ڕووی کردە ئەو هەرێمە، بەڵام کازمخان گرتی و دایەوە دەس فەرمانڕەوای ئەفشار و پاشان بە فەرمانی وی کوژرا. ئێستا کە بەڕواڵەت تەواوی دژ و خەنیمەکان تێداچووبوون، برایمیرزا بەرەو تەورێز بزووت و لە ۲۰ی دێسامبری ۱۷٤۸دا لە سەر تەختی پاشایەتی لێیدانیشت. بەڵام دیسانەوە گەڵاڵەی پیلانێک داڕژا. نۆ حەوتوو لەمەوبەر لە ۱ی ئۆکتۆبردا بە هۆی کەمتەرخەمی میر لە خوراسان سەرلەنوێ خوازیارێکی دیکەی تەختی پاشایەتی بۆ گەیشتن بە مافی خۆی ڕاپەڕی.[15]

شاروخمیرزای لاو بە یارمەتی دەستەوبەستە و فێڵ و دەهۆی سەرۆک و سەرکردەکانی خوراسان بەتایبەت سەرۆکانی کورد و بەیات کە لە مەشەد دەژیان لە سەر تەختی پاشایەتی دانیشت. برایمیرزا بەر لە ڕاگەیاندنی پاشایەتی خۆی بۆ ڕێگرتن لەم ڕووداوە تەتەرێکی ناردە مەشەد و بە مەبەستی

14. See Hanway II, 596, Brosset, 229.

15. See Poole, 90; Saidmuradov ; 58, SP 98,34,48.

بەشداربوونی لە جێژنی تـاج لـە سـەرنانیدا شـاروخ‌مـیرزای بـۆ ئیسـفەهان بانگێشتن کرد. دەهۆی ئاشکرای وی جێی‌نەگرت. دوای چەند مانگێک مانـەوە لـە تەوریز بە مەبەستی قایم‌کردنی بناغە و کۆڵەکەی دەسەڵاتی هەروا لـە هـەرێمی ئازەربایجان مایەوە و بە زیاد کردنی پیاوانی شـەڕکەر لـە ڕیـزی سـپاکەی‌دا، بـەهاری ساڵـی داهـاتوو بـەرەو مەشـەد کشـا. بارگەوبنـەی قـورس و ئـەو زیندانییانەی لەگەڵی بوون لە قوم بەجێی‌هێشتن. لـەم شـارەدا سـەربازگەیەکی تێکەڵ لە پیاوانی ئێرانی، ئەفغان و ئۆزبەک هەبوو کـە عادڵشـا دابوویـە دەس میر سەیدمحەممەد. هێزەکانی برایم‌میرزا لە جـوولای ١٧٤٩دا گەیشـتنە گونـدی سورخە لە نیزیک سمنان. ئەگەرچی قۆشەنی شـاروخ‌مـیرزا لـە ئەسـتەراباد و سەوپەنجا مایلێک دوور بوون، لەشکرە فـرە تۆرەمەکـەی مـیرزا لەبەریـەک هەڵوەشا. ئەمیرخانی تۆپچی‌باشی کە لە کرماشانەوە هاتبوو و یاریـدەی دەدا، ڕۆژێک بە تۆپخانەوە بەرەوپێش کوتای و لە وتووێژی لەگەڵ شاروخ‌دا پێکهاتن و تۆپخانە و پۆلە سوارەکانی بەرەو پاشماوەی لەشکری برایم‌مـیرزا دەنـگ دا و هەر خێرایەکی تەفروتونای کردن و تێک‌وپێکی شکاندن. برایم‌میرزا بەرەو شـاری قوم ڕەوی، بەڵام کارگێڕی شار نەیهێشت وەژوورکەوێ. ئەم پیاوە هەر کە هەواڵی تێکشکانی هێزەکانی برایم‌میرزای پێگەیشت، ئێرانییەکانی لە دەوری خـۆی کـۆ کردەوە و پیاوانی ئەفغانی و ئۆزبەکی لە چەک داماڵی و شاری بۆ بەربـەرەکانی ئامادە کرد. لەم کاتەدا تەنانەت هاوڕێیانی ئەفغانی برایم‌میرزاش پشتیان تێکرد و بە تەنیایان هێشتەوە، بۆیە ناوبراو ناچار بوو پـەنا بەرێتـە بـەر قەڵایـەکی نیزیکی قەزوێن. چەکدارانی سەربازگەی قەڵاکە گرتیان و دایانەوە دەس پیـاوانی شاروخ‌میرزا. بە فەرمانی شاروخ کوێریان کرد و وێڕای زیندانی و قوربانی‌کراوی پێشووی خۆی واتە عادڵشا بەرەو مەشەد بەڕێ‌کران و نێـردران بـۆ بەندیخانـە. عادڵشا ماوەیەک دواتر هەر کـە گەیشـتنە مەشـەد کـوژرا، بـەڵام بـرایم‌مـیرزا تەنانەت نەیتوانی ئەم ڕێگایە ببڕێ و بەر لەوەی بگاتە مەشەد تێداچوو(٨).

بە گشتی پلە و پایـە و لاوێـتی شـای تـازە لـە سـەرەتاوە بـە بـاری سەقامگیربوونی دەسەڵاتێکی تۆکمەدا گەلێکی هیواداری بـەدی هێنـا. سـەرەڕای پێداگری پەیتاپەیتای بـە مەبەسـتی گوێزتنـەوەی پایتـەخت بـۆ ئیسـفەهان، سەرکردەکانی هێزی تایبـەتی مـیری وایـان بـە بـاش دەزانی کـە لـە مەشـەد

بیپارێزن، چونکە ئەوان لە مەشەد زۆر بە هاسانی دەیانتوانی شا و خەزێنەکانی نادری بۆ پێشوەچوونی ئامانجەکانی خۆیان بخەنە ژێر ڕکێف. بڕێکی بەرچاو لە زێڕ و جەواهێراتی نادری و تاقمێک لە چەکدار و زیندانییەکان پاش تێکشکان و رووخانی دەسەلاتی عادلشا و برایمپاشا هێشتاش لە قوم لە ژێر چاوەدێری سەیدمحەممەد مابوونەوە. ناوبراو وەک یەکێک لە نەوەکانی شاسلێمانی سەفەوی لە شارەکانی قوم و مەشەد بە کەسێکی خاوەن بڕشت و دەسەلات دەناسرا و بە مەترسییەکی سیاسی دادەندرا کە دەبوایە هەس بدرێتەوە یان سوڕی ون بێ. هەر بۆیە شاروخ بە هەزار سوێند و ئەڵلا و وەڵلا و دڵنیاکرنەوە و پاراستنی گیانی و بەشداربوونی لە کاری حکوومەتا بانگهێشتی مەشەدی کرد.[١٦]

زیاتر ئەوانەی لاگیر و گیرۆدەی خۆشەویستی خانەدانی سەفەوی بوون، سەیدیان هان دەدا کە بە پشتیوانی ئەوان لە ئیسفەهان بچێتە سەر تەختی پاشایەتی، بەڵام ناوبراو خۆی دەپاراست و لەو سەردەمیدا خۆی بە یەکێک لە وەفادارانی شاروخ دادەنا و لەگەڵ تەواوی سەروەت و سامان و حەرەمخانەی پێشووی ئەفشارییەکان لە قومەوە بۆ یەزد و لەوێوە بۆ داوێنی «کەویر» و مەشەد وەڕێکەوت. لە مەشەد بەڕواڵەت تەواوی خەڵک بە نیازپاکی و ڕووراستییەوە بەرەوپیری چوون. دوای زیارەتی مەرقەدی ئیمام ڕەزا چوو بۆ میوانی لە باغی کۆشکی پاشایەتی. لێرەدا لەپڕ ئەو و شاروخ زانیان کە تەنیا هاتنی چەکدارانی لایەنگری پێشوو و پارێزەری حەرەم و کەسایەتی گەورە و گرانی مامی ئەوی لە پیلانێکی لەپێشا داڕێژراو ڕزگار کردووە(٩). پەردەداری ئیمام خۆی بە قایم و پتەوکردنی دەسەلات و بڕشتی خۆیەوە خەریک کرد و سەرەڕای بۆچوونی ئەو نووسەرانەی ژیاننامەیان نووسیوەتەوە و هەمیشە بە پیاوچاکیان داناوە و کەوتوونە پێداهەڵدان و تاریفاتی، تەنانەت ئەگەر بۆ

---

١٦ــ بە مەبەستی وردەکاری زیاتر سەبارەت بە بنەچەکەی سەید بڕواننە: مەجمەعوتتەواریخی مەرعەشی؛ هەروەها تەزکەرەی ئالی داود. هەروەها: کووهمەرەئی ل ٣٩٦ ــ ٣٩٩. ڕووداوە بەرچاوەکانی ئەم بەشە پتر لە مەجمەعوتتەواریخی مەرعەشی وەرگیراوە، ل ٨٨ ــ ٩٠ و ١٠٣ ــ ١١٥ و ١١٩ ــ ١٣٨. بڕواننە: تەزکەرەی ئالی داود، ل ٣٨ ــ ٨٣ و ١٠٩ ــ ١١٦؛ هەروەها کتێبی بریون، چاپی ١٧٥١، بڕواننە مەتلەعوششەمسی ئیعتیمادوسسەنتەنە، ل ٣٤١ ــ ٣٥٠ لەگەڵ ئۆلیویە، ل ٤٧٤ ــ ٤٧٦.

پاراستنی گیانی خۆشی بووبێ، ڕەنگە کەوتبێتە سەر پیلانگێڕان.

هەوڵ و تەقەلای پەنجا کەس لەو غولامانـەی بـێگومـان بـە فـەرمانی شاروخ پەلاماری هەرێمی حەرەمیان دابوو، بەرەو شکست بوویەوە؛ شـای گـەنج سەرلەنوێ بەرتیلێکی دایە یەکێک لـە سـەرکردەکانی بـە نـاوی بێهبوودخـانی ئەتەکی هەتا سەید بکوژێ. چونکە بێهبوودخان سەری لە ئاست ئەم داوایە بـادا خرایە سیاچاڵ(١٠). ئەم ڕووداوە بوو بە هـۆی هەڵگیرسـانی ئـاگری شۆڕشـێکی گشتی لە نێو ئەو سەرکردانەی کە حازر نەبوون سەر بـۆ شـاروخ نـەوی کـەن، چونکە دەیانبینی کە شاروخ وردەوردە مەترسیدار بووە و خەریکە لە ژێـر نـیری دەسەڵاتیان دەردەکەوێ. پۆلێک بە سەرپەرسـتێتی ئەمیرعەلـەمخـانی عـەرەب خەزیمە لە کۆشکەوە بەرەو حەرەمی ئیمـام ڕەزا بـزووتن، جـەماوەری خەڵـک کۆبوونەوە و سەرەڕای نارەزامەندێتی فێڵبازانە یـا ڕاسـتەقینەی سـەید بـەرەو کۆشک کوتایان. شاروخ هەڵاتە نێو ئەندەروونی و لـەوێ پێـنج بـرای گچکـەی عادڵشا و برایمیرزای کوشت(١١) کە هێشتا مابوون. سـەید ویسـت و خواسـتی گشتی سەبارەت بە کوشتنی شاروخ بردەوە پاش و تەنیا لە بەند توندکردنی بـە ڕەوا دانا. میرسەیدمحەممەد هەر ئەو ڕۆژە، واتە ٣٠ی دێسامبری ساڵی ١٧٤٩ بێ هیچ سەرێشەیەک گەیشتە دەسەڵات و حەوتەیەک دواتر یانی پێنجـەمی مـانگی سەفەر بە ناوی شاسلێمانی دووهەمی سەفەوی چووە سەر تەختی پاشایەتی(١٢).

لایەنگرانی شای تازە، هەروەک مێژینە و پێشینەی هەبوو، بیانوویـان بۆ خۆتێوەردان لە کاروبـاران وەدەس هێنـا. ئـەوان لـە شـوێن و پلـەی بـەرز دامەزرابوون؛ جللەی پیاوانی مفتەخۆری بارگای شا کە بە هۆی تێـرژانی خـزم و کەسانی پاشای سەفەوی و خزمەتکارەکانی پتر لـە سـەریەک کەڵـەکە ببـوو، هەرکامەیان بە هۆی فەرمانی هەڵگیرانی خەرج و پیتاکی سێسـاڵانە شـاڵاوێکی دیکەیان بۆ سەر خەزێنە بـەرەو هەڵـچۆڕانەکانی نـادری بـە پێویسـت دەزانی. ئەگەرچی کۆمەڵێک فەرمان بۆ سەرۆک و سەردار و حاکمانی بەڕواڵەت وەفادار و سەر بە حکوومەتی خوراسان دەنێردران، بـەڵام لای هـەمووان ڕوون ببـۆوە کـە بێگومان ئیمپراتـۆرێتی بـەربڵاوی نـادری لێکهەڵوەشـاوە و تـازەش سـەرنج نەدەدرایە ئـەم داوایـەی کـە شـا بـۆ گوێزتنـەوەی پایتـەخت بـۆ ئیسـفەهان دەسبەبزێوێ. لەم ڕوژگارەدا هەڕەشەی ڕاستەقینە لە لای ڕۆژهەڵاتـەوە دەسـتی

پێکرد و ئەحمەدشای دورانی هیراتی داگیر کردبوو. شاسلێمان چەند نێردراوێکی نارده قەندەهار و بە چەن نووسراو و نامەیەکی ئەوتۆ کە پاشایان دەینووسن بۆ ژێردەستانیان، چۆنیەتی رایەڵوپۆ و پەیوەندی نێوان خانەدانی سەفەوی و رعێتە ئەفغانییەکانی وەبیر هێنایەوە و فەرمانی دا بە ئەحمەدخان کە شاری هیرات بداتە دەس بێهبوودخانی ئەتەکی سەرداری خوراسان. وڵامی پاشای ئەفغان قایم و پتەوکردنی شووره و قەڵای هیرات و خۆسازدان بۆ شەڕ و بەربەرەکانی بوو. سەرەتا وێدەچوو کە هەڕەشەوگوڕەشەکانی شاسلێمانی دووهەم جێیان گرتبێ، چونکە ئەحمەدشا هێشتا لە خۆی رانەدەدی کە هێز بنێرێتە سەر خوراسان. بێهبوودخان و فەرماندەرانی پاش گەمارۆیەکی کورتماوە هیراتیان گرت و بێ ئەوەی کە خەسارێک بگەیەننە شەڕکەرانی ئەفغانی، ئیزنیان دان کە بەرەو نیشتمانی خۆیان قەندەهار تێیتەقێنن(١٣).

واوێدەچوو کە ئیدی هێمنایەتی باڵی بە سەر پایتەتەخت کێشابێ، شاسلێمانی چەند رۆژێک پشووی دا و بۆ راو رووی کردە چیمەنی رادکان(١٤) بەڵام هەر ماوەیەک دوای ئەوەی لە مەشەد دەرکەوت، ناکۆکییە نەبڕاوەکانی نێوان سەرکردە لووتبەرزەکانی ئەم پیاوە لێوەشاوە خۆی دەرخست: ئەمیرعەلەمخانی وەکیلودەولە هەلی لە دەس نەدا و بە کوێرکردنی شاروخمیرزا خۆی لە بابەت راپەڕینی بەرهەڵستکارانەی ئەفشارییەکانەوە خاترجەم کرد. شاسلێمان خێرا گەڕایەوە مەشەد و سێ رۆژان لەو شارەدا خۆی حەشار دا و هەڕەشەی کرد کە لە دەسەڵات دەکشێتەوە(١٥). ئەمیرعەلەمخان و هاوسەنگەرانی بەوپەڕی خۆبەکەمزانی داوای لێبووردنیان کرد، ئەویش رووداوەکانی لە بیر خۆی بردەوە و سەرلەنوێ هەموویانی لە شوێنی پێشوویان دامەزراندەوە و پلە و پایەی لێوەرنەگرتنەوە. ئیدی شا نەیدەتوانی لەوەندی داوێتی بە لایەنگرانی زیاتریان بداتێ و ئەمە خۆی بوو بە یەکێک لە هۆیەکانی بوغزاندن و دوژمنایەتی؛ چونکە لە لایەک تاڵانکەرانی جەواهێراتی نادری لەوە دەترسان خەرجوبەرجی سەید خەزێنەکان هەڵچۆڕێنێ و لە لایەکی دیکەشەوە رێنەدان بۆ دەسبەسەرداگرتنی ماڵ و دارایی «وەقف» کە نادر گلی دابوونەوە و لەشکری پێ بەخێو دەکرا خراپی رەنگ دایەوە. هەروەها خۆپاراستنی سەید لە دەرکردنی فەرمانی باوی داگیرکردنی ماڵ و دارایی بە زۆرەملی و چەوساندنەوەی

خەڵک و هەڵگرتنی خەرج و پیتاکی حکوومەتی کە خـۆی لـە ترسـی ڕاپـەڕین و سەرهەڵدانەوەی ئەفشارییەکان گەڵاڵـەی بـۆ داڕشـتبوو، کێشـەکانی قووڵـتر کردەوە.

ژنی شاروخ(١٦) لەم کەسانە بەتایبەت لە یۆسـفعـەلیخـانی جـەلایر نیزیک بۆوە و بێئەمەگی ئەوانی سەبارەت بە مەزن و سـایەچەوری پێشـوویان سەرکۆنە کرد و بڕوای پێهێنان کە تازە هەرچی بووە ڕابردووە، بەڵام با ئەمـەش بزانن کە لە ڕاستیدا شاروخ کـوێر نـەکراوە. پیلانێـک بـە بەشـداری زۆربـەی چەکدارانی بنکەی پاراسـتنی قەسـر و کاربەدەسـتانی پلەیەکـەم داڕێژا: لـە ٢٠ی مارسـی ١٧٥٠دا پیلانگێـڕان و پیاوەکانیـان خزینـە نێـو شـوێنە گرینـگ و بارناسکەکانی کۆشک و گرتیان. یۆسـفعـەلیخـان بۆخـۆی پـەلاماری ژووری پاشای دا و چاوی لە قاپێلکان دەرهێنا، پاشان ڕاپەڕیوان چوون و شاروخیان لە زیندانی نێو ئەندەروون ئازاد کرد. لەم وەختانەدا بوو کە پەلاماردەران تێگەیشتن شاروخیش چەشنی ئەم قوربانییەی ئێستاکە کوێر کراوە، بەڵام تازە کار لە کـار ترازابوو. ڕای گشتی وا ئاگادار کرابوو کە شازادەی لاو سلامەتە و چاوی سـاخن. ئەمیرعەلەمخان و سەرکردەکانی سپای شاسلێمان پـاش ڕاسـانێکی لـەخۆوە و پەلاماردانی کۆشـک بـە ڕێ و ڕێچکـاندا وەدەرکـەوتن و ڕەویـن. سـەید پـاش پاشایەتییەکی پڕکارەسات کە نیزیکەی هەشتاڕۆژێکی کێشا، بوو بە کابرایـەکی کوێری زیندانی لە ئەندەروونی کۆشکی میریدا. شاروخیش لـەم ئەندەروونـەوە سەرلەنوێ هاتەوە سەر تەختی پاشایەتی.

یۆسفعەلیخان و لایەنگرانی هەر زوو تێگەیشتن کە بەم بـڕە لەشـکر و خەزێنە لێسدراوەوە، وەدەس گرتنی دەسەڵاتی سیاسی لە هـەرێمی خوراسـان کارێکی بێهوودەیە و لەبری ئەوەی بکەونە شوێنی، دەبێ لە بەری هەڵـێن. وەک دەگێڕنەوە خانی جەلایر بە خۆی و پاشمـاوەی زێـڕ و جـەواهێراتی خەزێنـەوە وەڕێکـەوت و بـەرەو کـەلات تێـیتەقانـد. لـە دەرەوەی قـەڵاش لەگـەڵ ئەمیرعەلەمخان تێکهەڵچوو. خـانی جـەلایر و هاوکارانیـان بـەر لـە کـوژران گیرایەوە مەشهەد(١٧). عەلەمخان خۆی لە بەڕێوەبردنی مەشهەد پاراست و لەگـەڵ شاروخی قوربانیکراوی پێشووی و هاوپەیمانە کوردە بـەهێزەکانی خوراسـانی گەیشتە ڕێککەوتنێکی دژوار. هەر لەم ڕۆژانەدا ئەحمەدشـا خـۆی بـۆ پـەلاماری

خوراسان ئامادە کرد(١٨) و لە کۆتایی ساڵی ١٧٥٠دا هێراتی گەمارۆ دا و سەرلەنوێ گرتییەوە.[١٧]

سەرەڕای پەیدابوونی وەرزی زستان سپای ئەفغان بەرەو مەشەد کوتای، شوورەی ئەم شارە ئەوەندەی بتوانن ئومێدی سەرکەوتنێکی خێرا وەنائومێدی بگێڕن، قایم و پتەو و خۆڕاگر بوون. شاروخ هەڵنەچوو و پارێزی کرد و سەرکردەی ئەفغانیش وەختایەک زانی مەشەد هێزێکی ئەوتۆی تێدا نیە کە لە پشتەوەڕا گەمارۆی بدا، لەوێوە بزووت و لە ژووەنی ١٧٥١دا بە نیازی گەمارۆی نەیشابوور لەشکری دەنگ دا. خەڵکی ئەم شارە بە سەرۆکایەتی جەعفەرخانی بەیات و پاش مردنی بە سەرکردایەتی کوڕی گەنجی حەڤدە ساڵانەی شەڕ و بەربەرەکانییەکی ئازایانەیان کرد، ئەفغانییەکان لەبەر گەمارۆیەکی خوێناوی و چاوەڕواننەکراو نیوەی هێزی سەرەکی خۆیان لە دەس دا و لەبەر هاتنی شەپۆلی بای ساردی نێوەڕاست مانگی زستان، تووشی سەرمایەکی سەخت هاتن و ناچار بوون کە بە پەلە و بێڕاوەستان خۆیان بگەیەننە ناوچە دوورەدەستەکانی دەوروبەری هێرات.[١٨]

ئەحمەدشا بۆ ماوەی سێ ساڵی دیکەش لە هەرێمە داگیرکراوەکانی هیندووستان خەریکی شەڕ و تێکهەڵچوون بوو و ئەمیرعەلەمخان بە تەنیایی حکوومەتی خۆی بە زۆرەملی پاراست. بەهاری ساڵی ١٧٥٤ ئەحمەدشا سەرلەنوێ نەیشابووری گەمارۆ دایەوە کە هەمیشە دەروازەی لە رووی خوازیارانی داگیرکردنی خوراسان گاڵە دەدا. هەر کە ئەحمەدشا دووهەمین هێرشی خۆی لە رێگای قائین و تەبەسەوە بەرەو خوراسان دەس پێکرد، تاقمەکانی سپای عەلەمخان کە برێتی بوون لە کوردەکانی قووچان، هەر کە هەستیان بە مەترسی کرد، جڵەویان هەڵەنگاوت و ملیان نەدا بۆ شەڕ و بەناچار عەلەمخان رایکردە

---

١٧ـ بڕواننە: مەجمەعوتتەواریخی مەرعەشی، ل ١٣٨ ـ ٤٢٢، تەزکەرەی ئالی داود، ل ١٧٧ ـ ٢٢٠؛ موجمەلوتتەواریخ، ل٦٢ـ ٦٦؛ هەروەها Mann, «Quellenstudien». بڕواننە: بوخاری، ل١ و ٨ و ١١و ١٦.

١٨ ـ موجمەلوتتەواریخی گولستانە، ل ٦٩ـ ٧٣؛ ئەلحوسێنی، ل ٢٢ ب ـ ٢٠ ئەلف؛ هەروەها: Malcolm,218-219; Ferrier, 77-79; «Quellenstudien» 177-179.cf. Mann,

سەبزەوار. ئەحمەدشا بە سەر کورد و خەنیمەکانی دیکەی‌دا لە هەرێمی خوراسان زاڵ بــوو و بــە نــاردنی پــەیامێکی ســەرکەوتووانە خوازیــاری گێڕانــەوە و ناردرانەوەی عەلەمخان بوو لە سەبزەوارەوە و پاشــان بــۆ کــوژران دایــە دەس کوردان. سەرکردەی ئــەفغان لــە مــانگی جــوولای‌دا دیســان مەشــەدی گــەمارۆ دایەوە(١٩).

مەشەد بۆ ماوەی پێنج مانگان کەوتە گەمارۆیەکی تەواو و قاتی و قــڕی تێکەوت. شاروخ و فەرماندەکانی وێڕای تەواوی خەڵک بــە شــێوەیەکی بــەربلاو دەستیان دایە کاری بەکەلک و قازانج و خۆ بەخت کردنیان لە هەر ڕوانگەیەکەوە شایانی ڕێز و چاولێکەری بوو. وەختایەک بەهاری ساڵی داهاتوو ئەحمەدشا بە مەبەستی گرتنی نەیشابوور پێی نایە ڕکێف، بەرەسمی شاروخی لە سەر تەختی پاشایەتی خوراسان هێشتەوە و خۆی بوو بە دەمڕاســت و چــاوەدێری، هــەروەها نوێنــەرە ئەفغانییەکــەی خــۆی لەگــەڵ ســەربازگەیەکی بچــووک لــە مەشــەد بەجێهێشت.[١٩]

پاشان لــە ســەر ڕێــی پێشــڕەوی بــۆ هــەرێم و مەڵــبەندەکانی ڕۆژاوا لەشکرێکی بە سەرکردایەتی شاپەسندخانی عوشاقزایی بە مەبەستی ڕێگرتن لە هورووژمی بەرچاوی پەنابەران نارد. ئەمانە کەسانی خێڵــەکی، دەوڵــەمەندانی شاری نەیشابوور و سەبزەوار و لایەنگرانی پێشووی ئەمیر عەلەمخــان بــوون، چەشنی برایمخانی بوغایری. وەک گێڕاویانەتەوە ئەم تاقمە لە سەر پێشــنیاری محەممەدحەسەنخانی سەرۆکخێڵی قاجــار بــۆ پــەنا بردنــە بــەر ئەســتەراباد ڕایانکردە ئەو مەڵــبەندە. نــاردنی ئــەم لەشــکرە بــوو بــە بروبیانوویــەک بــۆ مێژوونووسانی قاجار و گەورە کردنەوەی ڕووداوەکان و توانیان کە پاشەکشــەی ئەحمەدشا لە مەودای دووهەمین لەشکرکێشی بــۆ ئێــران پێکــەوە گــرێ بــدەن و بیانبەنەوە سەریەک و ئــەم مەبەســتە بکەنــە هــۆی ڕزگــاری ڕۆژاوای ئێــران و پــارێزرانی لــە چنــگ داگیرکرانــەوەی دووبــارەی لــە لایــەن پــەلاماردەرانی ئەفغانییەوە(٢٠). لە ســەریەک ئــەم هێرشــە دوایــین پــەلامار و تێکهەڵــچوونی ڕۆژهەلات و ڕۆژاوای ئیمپراتۆرێتی دابەشکــراوی نــادری بــوو. ئــەم دابەشــینە

---

١٩ـ ئەلحوسێنی، ل ٢٢ب ـ ٣٨ب: . 328 – 323 ,184 – 178 «Quellenstudien»

Mann و موجمەلوتتەواریخ، ل ٦٧ـ٧٤.

باسکراوە دوای ئەم هێرشە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا خۆی نواند و تا وەختایەکی سەرەنجام جارێکی تر خوراسان کەوتە دەس کوڕی خواجەی محەممەدحەسەنخان، وەک خۆی مایەوە. لە نیزیک مەزینان کە کەوتۆتە شێست مایلی ڕۆژاوای سەبزەوار، پیاوەکانی شاپەسندخان لەنەکاو بۆ ڕێگرتن لە شەپۆلی ڕاکردووان بەرەگەیان گرت، بەڵام زۆر درەنگ پێیان زانی کە ئەوان چوونە نێو یەکێک لە بنکە و بارگاکانی خێڵی قاجار بە سەرکردایەتی حوسێنخانی دەوەللوو(٢١). محەممەدحەسەنخان ئەم لەشکرەی بۆ پشتیوانی ڕاکردووان و هەسدانەوەی ئەفغانییەکان ناردبوو. دوای ئەم تێکهەڵچوونە شەڕێکی کورت و سەخت لە نێوان چەندسەد کەس لە هێزەکانی بەرایی هەر دوو لا ڕووی دا. ئەفغانییەکان شکستیان هێنا و بە کوژراو و برینداریکی زۆرەوە بەرەو نەیشابوور ڕایانکرد.[٢٠]

شکستی هێزەکانی ئەفغان، بوو بە هۆی ڕاپەڕینی خەڵکی نەیشابوور کە هەتا ئەو کاتی لە ترسان و لەبەر پاراستنی بەرژەوەندی سەریان وەبەر هێنابوون؛ ڕاپەڕینەکە بە کوشتارێکی بەربڵاو و پڕکارەسات کۆتایی پێهات و شار تاڵان کرا، بەڵام ئەحمەدخانی ئەفغان ئەو ڕووداو و کارەساتانەی بە هیچ دانەنا، هەتاکوو سەرهەڵدانی «خەواف»ڕێگای پێوەندی هێزەکانی خستە مەترسی. ئەودەمی تێگەیشت کە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە دەسبکا بە پاشەکشەیەکی شەرافەتمەندانە. لە پایزی ساڵی ١٧٥٥دا دوای ئەوەی ئەمیرخانی قەرایی(٢٢) هاوپەیمان و سنوورپارێزی کردە سەرۆکی خوراسان، گەڕایەوە هیرات و لەوێوە بەرەو قەندهار چوو.[٢١]

سەرەڕای ئەم دەنگۆیانەی کەوتبووە هەرێمەکانی ڕۆژاوای ئێران، دوور دەنوێنێ کە ئەحمەدشا شێلگیرانە خۆی بۆ پەلاماردانی ئیسفەهان ساز کردبێ.

---

٢٠ـ ئەلحوسێنی ٢٢ب ـ ٣٨ب.
Mann, 329-330 ; Ferrier, 81, Gombroon Diary, 31 August 1755. 22b-38b.
هەروەها: موجمەلوتتەواریخ، ل ٧٦ـ٧٨، تاریخی گیتی گوشا، ٥٢-٥٣، سارەوی، ل ١٦. تەفرەشی، ل ٢١٠، ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی٩، ل ٢٥ـ٢٦؛ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی یەکەم، ل ٤٧٩.

٢١ـ بەلحوسێنی، ب٤١- ب٤٦؛ .Mann, 330 – 333 موجمەلوتتەواریخ، ل ٧٤-٧٨.

شالاوەکانی بۆ سەر سەبزەوار و مەزینان بە مەبەستی ناساندنی سنوورە سروشتییەکانی خوراسان ڕوویان دا. هەلسوکەوتی ئەو لەگەڵ شاروخیش ئەم مەبەستە دەسەلمێنێ کە دەیویست هەرێمی قەڵەمڕەوی شاروخ وەک لەمپەرێک بکەوێتە نێوان ئیمپراتۆرێتی بەرەو گووڕانی خۆی و پاشاگەردانی بازنەی ڕۆژاوای وڵات. هاوکات لەگەڵ هەوڵەکانی ئەحمەدشای دوڕانی کە دوازدە ساڵ دواتر هەلێکی بۆ سەقامگیر کردنی دەسەڵاتی لە خوراسان وەدەس هێنا، کەریمخانیش بەگەرمە خۆی بە هێنانە ژێر ڕکێفی ڕۆژاوای ئێرانەوە سەرقاڵ کردبوو.

ڕەنگە هەر بۆیە بێ کە ئێمە خۆمان لە لێکۆڵینەوە سەبارەت بە کەموکووڕییەکانی خوراسان لە ماوەی نیوسەدەی دوایی‌دا پاراستووە. ڕووداوەکان بە شێوەیەکی تاڵ و خەموورووژێن و پڕ لە پیلان و غەدر سەبارەت بە شاروخی نابینا و سەرکردە و کەسانی خۆشەویست و کوڕانی ڕکەبەری یانی نەسروڵلامیرزا و نادرمیرزا و گیرانەوەی هەرێمە وێرانکراوەکان و کوژران و تالانی شاروخی پیر لە ساڵی ١٧٩٦دا، بە دەستی ئاغا محەممەدخانی قاجار، کۆتایی پێهات. هەر بە هەڵکەوت و ڕێکەوتی چاک هاوکات لەگەڵ حکوومەتی شاروخ لە خوراسان، لە ڕۆژاوای ئێران ڕۆژگارێکی بەپیت و بەرەکەت دەستی پێکردبوو(٢٣).

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

*عەلی‌محەممەد ساکی ساڵی ١٩٨٥ ئەم کتێبەی لە ئینگلیسی‌ڕا کردۆتە فارسی و لە کۆتایی هەر بابەتێک‌دا ئەوەندەی بە پێویستی زانیوە تێبینی و پەراوێزی خستۆتە بەر دەست و گەلێک یارمەتی ڕوونبوونەوەی داوە کە لەم بەرهەمەدا بە ناوی «تێبینی و پەراوێزەکانی ساکی» خراونە ڕوو. (وەرگێڕ)*

١ـ عەلی‌قوڵی‌خانی ئەفشار کوڕی برایمخانی زەهیروددەولە و برازای نادرشا بوو. چونکە پێی وابوو نادرشا لێی دووشکە، لێی‌هەڵگەڕایەوە و بە دژی ڕاپەڕی. لە کوژرانی نادرشادا شوێنی گێڕا و بەوپەڕی بێبەزەیی منداڵەکانی

تێدابرد. یازدە مانگ پاشایەتی کرد و مانگی جیمادیولئەووەلی ساڵی ١١٦٢ی کۆچی کەوتە داوی برایممیرزای برای و کوێر کرا. لە مانگی جیمادییوسسانی ساڵی ١١٦٢ی کۆچی شاروخمیرزا دایە دەس حەرەمخانەی نادری و بە تۆڵەی خوێنی مناڵانی مامی پلپل کرا و بە ئەشکەنجە تێداچوو. ئاوای لە سەر سکەکەی نووسرابوو: گشت رایج بە حکم لمیزلی / سکە سلطنت بە نام علی (برەوی پەیدا کرد بە فەرمانی « لم یزلی»، سکەی شایەتی بە ناوی عەلی).

محەممەدکازم لە عالەمئارای نادریدا دەنووسێ کە عەلیقولیخان بەناچاری کەوتە ڕێزەی ڕاپەڕیوانی دژی نادر و بەدڵ پێیخۆش نەبوو مامی بکوژرێ، بەڵام چونکە بیروڕای گشتی خستبوویە نێو شەپۆلی هەستی دژی نادری و ڕاپێچی دابوو، ملی دا.( بەرگی ٣، ل ٢٤٦) هەڵبەت نادر لێی بە ڕقدا چووبوو و سەدهەزار تمەنی تاوان لێئەستاند.

٢ـ ساڵەخانی ئەفشار لە تۆرەمەی قۆرقلووی ئەفشار و یەکێک لە سەرکردەکانی سپای نادر بوو. لە پیلانێکدا بە هاودەستی محەممەدقولیخانی کێشکچیباشی و محەممەدخانی ئێرەوانی خەزووری نادر و مووساخانی ئەفشاری تاروومی و قۆجەبەگی گوندوزلووی ئەفشاری ئوورمی و حوسێنبەگی شاسوار، نادرشایان کوشت. لەبەرەوەی عەلیشا دوای ماوەیەک دەستی کرد بە کوشتنی بکوژانی نادر و محەممەدقولیخانی بە دەستی ژنانی حەرەمخانە لەتوپەت کرد، تۆقی و ڕایکردە لای برایممیرزا. ماوەیەک لە هەزارجەریبی قەزوێن لەگەڵ تاقمێکی چەکدارانی چاوەڕوانی ڕەوتی رووداوەکان مایەوە.

٣ـ محەممەدخانی ئێرەوانی قاجاریش پاش مەرگی دایە پاڵ برایمیرزا.

٤ـ حوسێنعەلیخانی بەستامی (ناسراو بە موعەییرولمەمالک) باوەگەورەی خانەدانی موعەییری بوو و لەو سەردەمە بە دواوە لە کاروباری حکوومەتیدا پیاوی گەورەیان لێهەڵکەوت. لە زەمانی شاسوڵتانحوسێن و نادرشادا خاوەندەسەڵات و برشتێکی باڵا بوو. دۆستاڵیخانی کوڕی لە زەمانی فەتحعەلیشادا خەزنەداری وڵات بوو. ئەم بنەماڵەیە پشتاوپشت دەچنەوە سەر بایەزیدی بەستامی. ڕێزدار «پێری» بە پشتبەستن بە «گوڵستانە»، ناوی بە حەسەنعەلی تۆمار کردووە کە هەڵەیە.

٥ـ تەنیا تاقمێک لە چەکدارانی سۆهرابخانی بەختیاری بوون.

٦ـ کەڵەوەکێشی نێوخۆی بارگای عادڵشا بوو بە هۆی نێردرانی سۆهرابخان بۆ ئێراقی عەجەم و سۆهرابخان بە فەرمانی برایممیرزا لە گەرماودا کوژرا.

٧ـ ئەمیر ئەسلانخانی ئەفشار لە باوکیڕا پوورزای نادرشا و دوای کوژرانی برایمخانی زەهیروددەولە بوو بە حاکمی ئازەربایجان. سەرەتا لەگەڵ برایممیرزا بوو بە هاوپەیمان، بەڵام ماوەیەک دواتر کە برایممیرزا لەشکری نارده سەر ئازەربایجان، ناچار بوو دەسبکاتەوە. لەبەروەی سپاکەی لە مەیدانی شەڕا پشتیان تێکرد، لەگەڵ کازمخانی قەراچەداغی پەنای بردە چیا. کازمخان میوانداری کرد. پاش چەند سەعاتێک گرتی و ناردییە لای برایممیرزا. ئەمیر ئەسلانخان و سارۆخانی برای بە پەت خنکێندران. مەرعەشی ئەو بە خوشکەزا و گوڵستانە بە پوورزای نادرشای دەزانێ.

٨ ـ پەناخانی قەلاّبڕی، برایممیرزای گرت و بە فەرمانی شاروخمیرزا کوێری کرد و لە ڕێدا کوشتی. مەجمەعوتتەواریخ نووسیویەتی کە سەلیمخانی قۆرقلووی ئەفشار کوێری کردووە کە هەڵەیە.

٩ـ چیرۆکی پیلانەکە ئاوا بوو: شاروخ بەڕواڵەت ڕەسووڵبەگی میرئاخوڕی لەگەڵ پەنجا غولامێک بە مەبەستی وەرگرتنی عادڵشای کوێر و کوڕەی نەخۆشی برایممیرزا نارده پێشوازی و لە ڕاستیدا دەیهەویست سەید بکوژێ. بەڵام سەید بە کوێرەڕێدا هاتە نێو شاری مەشهەد و پیلانەکەی شاروخ نەیگرت.

١٠ـ بێهبوودخان پاش وەرگرتنی حوکمی چوونە سەرسنوور، باسی مووچە و مانگانەی سپای هێنایە گۆڕ. شاروخ دەرهەڵبوو و فەرمانی دا کە بیخەنە زیندان. سەرکردەکان کە بەمەیان زانیبوو بە گوێیان نەکرد و بێهبوودخانیان ئازاد کرد و چوونە لای سەید و شاروخیان لێخست. بێهبوودخان لە بنەماڵەی ئەتەک بوو. لە سەردەمی پاشایەتی سەیددا لەگەڵ ئەمیرخانی عەرەب میشمەست هیراتیان داگیر کرد. دوای کوێرکرانی سەید (شاسلێمانی دووهەم) دەیانویست هیرات بەدەستەوە بدەن، بەڵام خەڵک ناڕەزامەندییان دەربڕی و بەناچار دەستیان کردەوە. پاش شەڕ ئەحمەدشای دوڕانی دەسبەسەری کردن.

۱۱ـ بڕوای ڕێزدار «پێری» سەبارەت بە کوژرانی پێنج کەس هەڵەیە. وەختایەک شاروخ فەرمانی دا پەتخنکێنیان کەن، ڕاپەڕیوان گەیشتنە سەریان و بە یارمەتی حەکیمان دوو کەسیان بە ناوی حوسێنمیرزا و ڕەحیممیرزا ڕزگار کرد. هێندێک لە مێژووەکان ئەمانە بە کوڕانی برایمپاشا و نەوەی برایمخان دەزانن. بەڵام بە گوێرەی تەمەنی برایمپاشا ڕەنگە ئەوانە برای بووبن.

۱۲ـ میر سەیدمحەممەد لە پێنجی سەفەری ساڵی ۱۱٦۳ی کۆچیدا، بوو بە پادشا. جگە لە «لا اله الا الله» و ناوی ئیمامەکان، ئەم شێعرەش لە سەر سکەی نووسرابوو: زد از لطف حق سکۀ کامرانی / شه عدل‌گستر سلیمان ثانی

(بە لوتفی خواوە سکەی بەختەوەری لێدا، شای دادپەروەر سلێمانی دووهەم). لە یازدەی ڕەبیعوسسانی ۱۱٦۳ لێخرا و کوێر کرا. لە ساڵی ۱۱۷۷ی کۆچیدا بە نەخۆشی ئازارەباریکە لە مەشەد مرد.

۱۳ـ حاکمی هیرات تەیمووری کوڕی ئەحمەدخان بوو کە پاشان بە ناوی تەیموورشا گەیشتە لووتکەی دەسەڵات. ئێرانییەکان پێکهاتن کە گەمارۆی سەر دەروازەی «گەرشەک» هەڵگرن هەتا لەشکری ئەفغان بێ شەڕ دەرباز بێ.

۱٤ـ شاروخ بە فەرمانی ئەمیر عەلەمخانی خەزیمەی عەرەب و سەردارانی تری خوراسان کوێر کرا. شاسلێمانی دووهەم تۆقیو لەم ڕووداوە، خەریک بوو دەس لە کار بکێشێتەوە، بەڵام سەرکردە ناوبراوەکان داوای لێبووردنیان کرد. شاروخ لە ساڵی ۱۱٦۳ی کۆچیدا کوێر کرا و ئەوەدەمی تەنیا حەڤدە ساڵی تەمەن بوو. ناوبراو کوڕی ڕەزاقولیمیرزا و خاتوو فاتمەسوڵتانبەگمی کچی شاسوڵتانحوسێنی سەفەوی بوو.

۱٥ـ ئەمیر عەلەمخان، محەممەدڕەزابەگ سەرۆکی ئەرکانی سپای کۆشک و پارێزەری شاروخی بە بیانوویەک بانگ کردە لای خۆی. حوسێنخانی قەرایی و ئەمیر مێهرابخانی نازر، شاروخی زیندانیکراوی نێو حەرەمخانەیان کوێر کرد. چەند ڕۆژ دواتر ئەمیر مێهرابخان مرد و لە ناشتنیدا یۆسفعەلیخان شاسلێمانی کوێر کرد.

۱٦ـ ژنی شاروخ کچی میرزاخانی سوڵتانی جەلایر و لەگەڵ یۆسفعەلیخانی جەلایر خزم بوو.

۱۷ـ وەختایەک بێهبوودخانی ئەتەکی بیستی کە شاسلێمان کوێر کراوە

و زمانیشی براوە لە شاروخ هەڵگەڕایەوە. یۆسفعەلیخان دەیویست بۆ تەمێ کرنی بچێتە هیرات، بەڵام ئەمیر عەلەمخان ڕێی پێگرتن و غولامانی شای کوێریش ڕەشمەی ئەسپەکەیان ڕاکێشا و بردیانە مەشەد. یۆسفعەلیخان حەوت باری یەسترانی زێڕ و جەواهێراتی میری ڕاگوێزتە «کەلات» بەڵام ئەمیر عەلەمخان خۆی و زاڵخانی برای گرت و بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە داینە دەس شاسلێمانی کوێری لێکەوتوو. شاسلێمان سزای نەدان، بەڵام ئەمیر عەلەمخان کوێری ون کردن.

١٨ ـ ئەحمەدخان زۆرجاران هاتە خوراسان. دوای کوێرکرانی شاسلێمانی دووهەم هیراتیشی گرت. لە یەکەم گەمارۆی مەشەددا خەڵک و شاروخمیرزا زۆر ئازایانە دەستیان کردەوە. لە ساڵی ١١٦٨ی کۆچیدا نەیشابووری لە دەس عەباسقوڵیخانی بەیاتی حاکمی شار دەرهێنا. شکانی هێزەکانی ئەفغان بە دەس پیاوەکانی محەممەدحەسەنخان لە پێشڕەوی پەشیمانی کردنەوە. ئەحمەدشا حەولی دەدا کە حکوومەتی شاروخ لە مابەینی خۆی و مێرخاسانی شەڕلێقەوماوی ڕۆژاوای ئێران وەک لەمپەرێک ڕابگرێ. پاش گرتنی مەشەد شاروخ بوو بە فەرمانڕەوای ژێرچاوەدێری ئەحمەدشا و ئاوای لە سەر سکەکەی نووسرابوو:

یافت از الطاف احمد پادشاه / شاهرخ بر تخت شاهی تکیه‌گاه

(لە چاکەی ئەحمەدشاوە، شاروخ لە سەر تەختی شایەتی پاڵی داوە)

لە بابەت نازناوی ئەحمەدخانەوە یانی دوڕانی جگە لە نووسراوەکەی میرزا «بێری»، حیکایەتێکی دیکەش دەگێڕنەوە. دەڵێن دەروێشێک پێشبینی کرد کە ئەو سەرداره دەبێتە پاتشا و گوتی تۆ پاتشای دەورانی! وشەی دەوران سواوە و بوتە دوڕان. (بڕواننە کتێبی ژیاننامەی سەرداری کابولی، بە قەڵەمی کەیوان سمیعی. ل ٣٧). (بەڵام گۆیا گوارەی دوڕ و مرواریيان کردۆتە گوێ، بۆیە پێیان گوتوون دوڕانی ـ وەرگێڕ).

١٩ـ چۆنیەتی کوژرانی ئەمیر عەلەمخان، بەوجۆرەی گولستانە نووسیویەتی ڕاستر دەنوێنێ: ئەمیر عەلەمخان لە سەردەمی کەمدەسەڵاتی شاروخمیرزاوە زۆر بەهێز ببوو. لە بەرەوڕوو بوونەوەی لەگەڵ جەعفەرخان و سەرکردەکانی تر گەلێکی توندوتیژی نواند و زۆربەیانی کوێر کردن و کوشتنی.

هێزەکانی ئەمیر عەلەمخان کە ٢٥٠٠٠ کەسێک دەبوون، وەختی تێکهەڵچوون لەگەڵ لەشکری ئەحمەدشا، پشتیان تێکرد و ناچار بوو ڕابکاتە قەڵای توون. ئەمیر مەعسوومخانی برای لەوێ دانا و بۆخۆی چووە لای خەزووری یانی دۆلیخانی کوردی شادلوو. سەرکردەی کورد پێشنیاری کرد کە بچێتە سەبزەوار. لە نزیکی شار کوردان بە دیلیان گرت و ناردیانە خزمەت شاروخ. شاروخ کە ئەوی بە بەرپرسی کوێرکرانی خۆی دەزانی، کوێری کرد و دایە دەس جەعفەرخان. لەوێ ئەوەندەیان بە داران لێدا هەتا مرد.

٢٠ـ هرووژمی ڕاکردووانی خوراسان بۆ باشووری ئێران، وای کرد کە لە ساڵی ١١٦٧ی کۆچیدا شاپەسندخانی ئەفغان لە سەبزەوار و نەیشابوورەوە بەرەو ئەستەراباد باژوێ. محەممەدوەلیخانی قاجاری یووخاریباش و حوسێنخانی برای لەشکرەکەیان تێکشکاند.

٢١ـ حوسێنخانی دەوەللوو یەکە خەنیمی محەمەدحەسەنخان و بە هۆکاری سەرەکی شکستی ئەو دادەندرا.

٢٢ـ ئەمیرخانی قەرایی لە تیرەی «بەرلاس»ی خوراسان و لە دەوڵەتاوا دەژیا. لە لایەن ئەحمەدشاوە کرابوو بە جێنشینیمیری. بەڵام شاروخ قبووڵی نەکرد و ئەرکەکانی خۆی خستە سەرشانی فەرەیدوونخانی گورجی کە غولامی بوو.

٢٣ـ لە ساڵی ١٢١٠ی کۆچیدا ئاغامحەممەدخان پێی نایە خوراسان و بە چۆڵەپێچ کردن و ئەشکەنجەدانی شاروخمیرزا، چی زێڕ و جەواهێراتی نادری بوو لە دەستی دەرهێنا. شازادەی پیر کە تابشتی ئەو هەمووە سووکایەتییەی نەبوو، لە ڕێگای تاراوگەدا بەرەو دامغان دڵی تۆقی.

# بەشی یەکەم

## خەبات لە پێناو وەدەسهێنانی دەسەڵات
## لە ئێرانی خۆراوایی‌دا
## (١٧٣٦ ـ ١٧٤٧)

# ١

# جێنشینی‌میری بەختیاری و زەند

## ١ـ١ بارودۆخی گشتی

لەو ڕۆژگارانەدا کە پاشایەتی ئەفشارییەکان لە خوراسان کەتبووە سەرەولێژی، ببڕای‌ببڕ شەڕ و دووبەرەکی نێوخۆیان بەهۆی هێرش و پەلامارەکانی ئەحمەدشا نەبڕایەوە. هێزی تازە بۆ وەدەس‌هێنانی دەسەڵات لە نێو پاشماوە و هەرەسی ئیمپراتۆرێتی نادری سەری هەڵدا. لەوپەڕی دەسەڵاتی جیهانگیری ئەفشاردا تەواوی هەرێمەکانی ڕۆژاوای ئێران چەشنی زنجیرە مەڵبەندێک کە بە باری جوغرافیایی و سیاسی‌دا لە ناوەندی مەشهەدەوە تیشک و تاویان دەخرایە سەر، چاویان لێدەکرا. لە ئازەربایجانەوە بۆ کوردستان، لوڕستان، فارس، لار، سیستان و پارێزگاکانی نێو بازنەی کۆمەڵە شاخان و ناوچە مەزراکانی نیزیک دەرودەشتی ئەمبەرەوبەری ڕۆخی دەریای خەزەر و گورگان، ڕێوبانەکانی تاران، دامغان، سەبزەوار، ڕێگای خۆڵەپۆتەی یەزد، تەبەس و قەهێستان کە بۆ پایتەختی نادر وەک دیوارێک وابوون، هەموو دەستیان تێکگرتبوو و مەشەد ڕووگەی هەستی مەزەبی و نەتەوەخوازانەیان بوو.

بناغە و بنچینەی ئەم پاڵوێکدانە لـە زەمـانی پاشـایانی سـەفەویدا بـە هـۆی تاریفاتیان لە بابـەت مەشـەدەوە وەک یەکەناوەنـدی زیـارەتی شـیعەکان بـۆ قەرەبووی لە دەس چوونی کەربەلا و نەجەف و دوژمنایەتی عوسمانییەکان خۆی گرت. هێز و دەسەڵاتی سەرنجڕاکێشی نادری تەواوی ئەم تاقم و دەستە و هەرێمە بەربلاوانـەیان هـەتا چەنـد سـاڵ دوای مەرگیشـی، وێـڕای نیگەرانییـەکانیان سەبارەت بە چارەنووسی جێنشینانی، بەرەو مەشـەد ڕاکێشـابوو. لـە مـاوەی تەواوی ئەم دەورانەدا نامەزرۆیی سروشتی خەڵک سـەبارەت بـە داب و نـەریتی تۆکمە و پتەوی سەفەوی و خەباتی نەهێنی بۆ پاراستنی مەزەب و ڕێبـازی تـازە هەروا مابوو. هـەروەک دواتـر وردەوردە ڕوون بـووە هیچکـام لـە خوازیـارانی جێنشینی نادر خاوەنی هێزی کێشندە و کەسایەتی ئـەو نـەبوون، لـە ئاکـامدا هەرێمەکانی ڕۆژاوایی بە ڕووگرژی و ڕقهەستانەوە باياندا وە سـەر حکوومـەتی پێشوو. بە شێوەیەکی وا کە تەوەرەیەک بە درێژایی چیاکـانی زاگـرۆس بـەرەو تەورێز و بەندەرعەباس بەدی هات کە نێوک و ناوەندی شاری ئیسـفەهان بـوو. ئەم تەوەرەیە وەک ڕووپەڕی سـەعات کـەوتبووە نێـوان ناوچـەکانی شـیراز و تاران، کە دواتر بوونە پایتەخت.

لە مەڵبەندەکانی دەورەی ئەم جەغزە، سیستان بە شێوەیەکی بـەرچاو لە ئێران دوور کەوتبووە و لە ژێـر سـەرۆکایەتی سـەرکردە بلووچـەکانی وەک نەسیرخان(١) تا ڕادەیەکی دیار لە بازنەی دەسەڵاتی ئەحمەدشای ئەفغان ترازاو و سەربەخۆ بوو.[1] لەبەر وەی کە ئاڵوگۆڕەکانی کرمـان و یـەزد پەیوەندییـەکی ڕاستەوخۆی بە ڕووداوەکانی بەرباسی ئێمەوە نیـە، ڕەنگـە وەک هەرێمـەکانی ڕۆخی کەنداوی فارس و خووزستان بخرێتە بەشـێکی تـر. لـە قۆڵـێکی دیکـەی وڵاتەوە هەرێمەکانی گیلان و مازەنـدەران بـە دەسـتی محەممەدحەسـەنخـانی قاجـارەوە بـوون و هـەروەها لـەم چاخـەدا ناوچـەکانی خـوارووی قـەفقاز و ئازەربایجان هەل و بەستێنی ئەمەیان تێـدا ڕەخسـابوو کـە بچنـە نێـو ڕیـزی جووڵانەوەی ئازادخانی ئەفغان. بابەتی سـەر بـە هـەردووی ئـەم پرسـانە بـە وردەکاری زیاترەوە شیدەکرێنەوە. ڕووداوە سەرەکییەکانی کتێـب تایبـەتی بـە جەرگەی هەرێمەکانی ئێـرانی ڕۆژاوا، یـانی پارێزگاکـانی داوێـنی زاگـرۆس و

1- See Frye, "Balucistan", Ei2 1,1005 – 6.

ئێراقی عەجەم لە مابەینی کوردستان و فارس‌دا ـ کە لەم ڕۆژگارەدا پێی‌دەگوترێ پارێزگای پێنجەم ـ و لەم ناوچانەدا هەوڵ و تێکۆشان بە مەبەستی هێنانە ژێر ڕکێفی گەورەترین بەشی ئیمپراتۆرێتی نادری دەستی پێکردبوو.

لە کوژرانی نادردا شارەکان دەورێکی بەپارێزانەیان گێڕا و چاوەڕێی ئاکامی کار و کاردانەوەکان مانەوە. بۆ وێنە لە خوراسان بڕیاریان دا کە لە پشت دەروازە گاڵەدراوەکان مات بن و تەنیا بە لایەنگری ڕواڵەتییانە لە بەرامبەر داروودەستە پەلاماردەرەکانی ئەفشارەوە خۆ بنوێنن هەتا ڕوون بێتەوە کێ سەردەکەوێ. بە بڵاوبوونەوەی هەواڵی نەمانی دیکتاتۆر هێندێک شادی و شادمانی ڕەنگی دایەوە. بیرجەند لە ژێر چنگی یەکێک لە داسەپاوە قێزەوەنەکانی نادری‌دا بوو. لە ئیسفەهان میرحوسێن‌خانی خوراسانی(٢) سەرۆک داروغەی هۆردووی نادری کە بەم زووانە توانیبووی خەرج و پیتاکێکی زیاتر لەم هەرێمە کۆکاتەوە، بە بیستنی مەرگی سەرکردەکەی، میرزا سەیدڕەزاخانی حاکمی ئیسفەهانی کە لە ژنانەوە خزمی شاسوڵتان‌حوسێنی سەفەوی بوو گرت و خستییە زیندان و بە یارمەتی هێزەکانی بە سەر ئەم شارەدا زاڵ بوو. لە ڕاپۆرتەکانی گێمبروون‌دا ناوبراو وەک کابرایەکی شەرابخۆر و لووتبەرز و خوێنمژ باسی کراوە کە ویستوویەتی خۆی تانجی پاشایەتی لە سەر بنێ. هەرچۆنێک بێ ئەم پیاوە توانیبووی شاری ئیسفەهان لە بەرامبەر پەلامار و هەڵمەتی تاقمێک لە ئەفغانییەکانی بەردەستی ئەڵلایارخان بپارێزێ.

ئەڵلایارخان خۆی بە مەبەستی تێکەڵ بوون لەگەڵ هێزەکانی ئەمیرئەسلان‌خانی قۆرقلووی ئەفشار بەرەو ئازەربایجان دەچوو، وەختایەک هەواڵی مەرگی نادر بڵاو بۆوە لە قەزوین بوو. بۆیە لێبڕا کە بچێتە کوردستان و تێکەڵ بە هێزەکانی ئەفغانی میرزا محەممەدتەقی بێ. لە ڕێیەدا تووشی ئەو تاقمە هات کە ئەشرەفسوڵتان سەرکردایەتی دەکردن. پێیان گوت کە محەممەدتەقی خان وازی لێهێناون هەتا بگەڕێنەوە مەوتەنی خۆیان و خۆشی چۆتە کرماشان. ئێستا خەڵکی شارەکان کە ماوەیەکی دوورودرێژ بە دەس هێزەکانی غەوارەی نادری چەوسابوونەوە، بە مەبەستی تۆڵەئەستاندنەوە ڕادەپەڕین؛ لە مابەینی شارەکانی سەرڕێ، ئەفغانییەکان لە هەمەدان دەستیان کرد بە کوشت و کوشتار. دوای سێ ڕۆژان ئەم هێزە دەهەزارکەسییە هەمەدانیان

گەمارۆ دا. لە ڕۆژێکی هەینیدا پەلاماری شاریان دا و دوو ڕۆژیان کوشتارێکی قورس کرد و ئەوێیان سووتاند.[٢] پاشان بەرەو ئیسفەهان کەوتنە ڕێ و لە سەر ڕێگایان دەستیان برد بۆ تالان و کوشتار. میرحوسێنخان تەنیا بە خۆی و سەد غولامێکەوە کەوتە شەڕ و پاراستنی شار؛ بە کۆکردنەوە و دەسڕێژی تێکڕای تفەنگان و بە تێکەڵ کردنی قریوەقریوی چەکداران و قرمەقرمی تەپڵ و تووڕەتووڕی زوڕنا ترسێکی وای خستە نێودڵی پەلاماردەران کە ناچار بوون(٣) واز لە ئیسفەهان بێنن و هێرش بەرنە ناوچەکانی دەوروبەری شار. هەر ئەو کات بۆ خاپووورکردنی قوم و کاشان وەڕێکەوتن.[٣] ماوەیەکی کورت دوای ئەم ڕووداوانە، جووڵانەوە و ڕاپەڕینی خەڵک بۆ پشتگیری عادڵشا بوو بە هۆی لە سەر کار لادانی میرحوسێنخان و هاوپەیمانی و لە مانگی ئۆکتۆبردا برایممیرزا بەرەو ئیسفەهان بزووت تا بە ناوی براکەی ئەم شارە داگیر بکا.[٤]

لەم سەردەمەدا ڕۆژاوای ئێران بەدەس دووکەس لە سەرکردەکانی ئەفشار یانی ئەمیر ئەسلانخانی قۆرقلووی لە تەورێز و برایممیرزا لە ئیسفەهانەوە بوو. لەشکرە چەکدارەکانی ئەم دوو سەرکردەیە پێکهاتبوون لە

---

٢ـ جیهانگوشای ئەستەرابادی، ل ٤٢٨؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٣٥ ـ ١٣٦، بامداد، بەرگی ٥، ل ٣٠.

٣ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٢٢٧ ـ ٢٢٨ ؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٣٦ـ ١٣٧ و GD 30 December 1747 ئاماژە بە ڕووداوەکانی ئیسفەهان دەکا و دەنووسێ: ئیسفەهان کەوتبووە مەترسی داگیرکران لە لایەن دەهەزار شەڕکەری ئۆزبەک و ئەفغان و بلووچ. پاشان سەرەڕای ئەمەی برایممیرزا لە ئیسفەهان نەبوو، شار کەوتە چنگی. وەک دەگێڕنەوە ئەفغانییەکان دایانە پاڵ سەربازگەی شار، بەڵام تاقمێکیشیان لەوێ ڕۆیشتن و لە مانگی نوامبردا لە دەوری شار دامەزران. ڕەنگە ڕۆستەمولحوکەما عەتائوڵلاخانی لەگەڵ برایمخانی ئۆزبەک لێتێکچووبێ کە دەڵێ ئەو حاکمی نادر بوو لە شاری لاهوور و بۆ خاپوورکردن و تالانی فارس وەڕێکەوتبوو. بەڵام ئەڵلایارخانی ئەبدالی لە زەمانی نادردا حاکمی هیرات بووە و «بامداد» بە «غەلجایی» دەزانێ. بەڵام هەڵبەت زەکەریاخان حاکمی لاهوور بووە و «لۆکهارت»یش لە کتێبی نادرشا، ل ١٥٥دا ئاماژەیەک دەکاتە ئەم مەبەستە. هەڵەیەکی ئەوتۆش سەبارەت بە چارەنووسی ئەڵلایارخان و سپا ئەفغانییەکەی وەبەرچاو دێ.

٤ـ GD VI, 16 October 1747 و موجمەلوتتەواریخ، ل ١٣٠.

تاقمەکانی ئەفشار، ئەفغان، ئۆزبەک و بلووچ، یـانی پاشمـاوەی سـەربازانی نادری. ئەمانە خەریکی کۆکردنـــەوەی هـــێز و ڕاووڕووتـــی خـــەڵک بـــوون. حەوت هەزار کەس لە هێزەکانی محەممەدڕەزاخانی قۆرقلووش هەرێمی فارسیان وەتەنگ هێنابوو. بێهبوودخانی هووتەکی (ئەتەکی) ئەفغانی و عەتائولـلاخانی ئۆزبەک لـە ئیسـفەهان دایانـە پـاڵ بـرایم‌مـیرزا؛ عەتائولـلاخان پیاوەکـانی بەجێهێشت و خۆی بـە مەبەسـتی گەیشـتنە مازەنـدەران و سـەروەبەرهێنان و دەربڕینی هەستی خزمەتکاری بۆ عادڵشا بە غار و پڕتاو کەوتە ڕێ.[٥] لەم بەینەدا برایم‌میرزا وەک بەشێک لە بەرنامە سیاسـییە نەهێنییەکـەی بـە دژی براکـەی دەستی کرد بە دڵخۆشی دانەوە و ڕاکێشانی خێڵەکان و وەختایـەک لـە بـەهاری ساڵی ١٧٤٨دا بەئاشکرا دژی براکەی ڕاپەڕی و بەرەو ئازەربایجان وەڕێکـەوت، ئەبولفەتح‌خانی حەوت‌لەنگی بەختیاری وەک جێنشینی خۆی لە ئیسفەهان دانا. لە ساڵانی دوای نەمانی دەسەڵاتی عادڵشا و برایم‌میرزا، خـانی بـەختیاری لـە لایەن شاروخ‌میرزاشەوە، لە شوێن و پلەی خۆی داندرایەوە.[٦]

یەکێکی تـر لـە سـەردارانی نـادر یـانی مـین‌باشـی سـەرئەفرازبەگی خودابەندەلوو(٤) کە لەشکرێکی هەزارکەسی لە ژێر ڕکێفـی دابـوو، بـۆ گـرتنی هەمەدان کەوتەڕێ و سێ‌هەزار کەس لە چەکدارانی خێڵی شاسەوەنی تێکشـکاند. پاش حەوت مانگ شـەڕی بـێ‌ئاکـام بـە دژی قـەرەگوێزلووەکان و تەقـەلا بـە مەبەستی بەربلاوکردنی قەڵەمڕەوی حکوومەتەکەی، سەرەنجام شکستی هێنـا و خۆشی گیرا و کوژرا و هێزەکەی بـە تـەواوی لێـک‌بلاوبـوو. برووجێـرد لەبـەر زاڵبوونی تاقمێک ڕێگر بە سەرکردایەتی کەسێک بە نـاوی کائیـد کەلبعـەلی(٥) کەوتبووە مەترسی. ئەم پیاوە بەر لەوەی گیرۆدەی چارەنووسـی تاڵـی بـێ بـە دەس سەلیم‌خانی قۆرقلووی ئەفشـاری، سـەرکردەی بـرایم‌مـیرزا لـە ئێراقـی عەجەمدا، لەشکرێکی دوازدەهەزار کەسی شەڕکەری پێکهێنابوو و لـەو ناوچـەدا ترس و دڵەڕاوکەی نابۆوە.[٧]

---

٥ـ ئەستەرابادی لە جیهانگوشای نـادری، ل ٤٢٨ ـ ٤٢٩دا (نووسـیویەتی کـەریم‌خـانی ئەفغان)؛ بامداد، بەرگی دووهەم، ل ٣٣٧. فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٢.

٦ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٤٦.

٧ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٣٠ ـ ١٣٢، ١٣٧، ١٤٤.

## ۱ـ۲کرماشان و سنوورەکانی سەر بە کوردستان

کرماشان دوای ئیسفەهان بە دووهەمین شاری گرینگی سیاسی‌ـلەشکری دادەندرا. گرینگایەتی کرماشان دەگەڕایەوە سەر قەڵا گەورەکەی. ئەم قەڵایە شەش کیلۆمیترێک لە شارەوە دوور بوو و بە بنکەی هێزەکانی نادری، ناوەندی قۆرخانە و زاخەی چەک و جبەخانەی دەروازەی ڕۆژاوا و شوێنی ڕێکخستنی لەشکر بە دژی سپای عوسمانی دادەندرا. ڕیزەکانی تۆپخانە و زاخەکانی باڕووتی ئەم قەڵایە بۆ ئەو کەسانەی ئارەزووویان بوو بگەنە دەسەڵات، بەهرەیەکی خودادادی بوو. جگە لە هەڵکەوتنی لەباری شوێنەکە بۆ لەشکرکێشی، قەڵاکە کەوتبووە نێوان ڕێوبانی ڕۆژهەڵاتی - ڕۆژاوای کەوشەنەکانی ئێراق و ئازەربایجان بۆ جەرگەی ئێراقی عەجەم و ڕێگاکانی باکووری - باشووری ئازەربایجان بەرەو سنە و خوڕمئاباد کە دەشتەکانی خووزستان کردبوویانە شتێک وەک دەماری هەرەباشی پەیوەندییەکانی سەرانسەری ناوچەکە. لە کاتی مەرگی نادرشادا شاری کرماشان بە دەستی کەسێک لە پارێزەرانی بارگای پاشایەتی بە ناوی حوسێن‌خان(٦) ناسراو بە چاووش‌باشی، کە لە بەرەبەبابی «حاج»ی تایفەی زەنگەنە دادەندرا، گیرا. بەگوێرەی نووسراوی گوڵستانە، ناوبراو بەر لەم ڕۆژگارە بە هۆی بەدگومانی سەبارەت بە تێکەڵ بوونی لەگەڵ خەیانەتێک بە فەرمانی نادر کوێر کرا. حوسێن‌خانی زەنگەنە لەشکرێکی پازدەهەزار کەسی لە تایفەی خۆی و تیر و تۆرەمەکانی «وەند» پێکهێنا و دەستی بە سەر ماڵ و دارایی بازرگانەکانی شاردا گرت و لەشکرەکەی بە تۆپخانە تەیار کرد. پەلامارێکی بێ‌سوودی بردە بەر شاری هەمەدان، بەڵام لە کاتی گەڕانەوەی‌دا تووشی مەیدانداریکی تازە هات.

میرزا محەممەدتەقی‌خان کە مامی گوڵستانەی مێژوونووس بوو، لەگەڵ تاقمێکی پێنج‌هەزارکەسی لە چەکدارە ئەفغانییەکانی نادرشا، لە سنە سەرقاڵی کۆکردنەوەی خەرج و پیتاک بوو لە خانەخوێی گەرموگوڕی سیاسی خۆی واتە سوبحانوێردی‌خان، حاکمی پشتاوپشتی قەڵەمڕەوی ئەردەڵان(٧) کە هەواڵی کوژرانی سایەچەور و سەرووەرەکەی پێگەیشت.هاوڕێ باوەڕپێنەکراوەکانی بەرەڵڵا کرد و لەگەڵ نۆکەر و غولامان و بارگە و بنەی خۆی بەرەو کرماشان کە

بێشتر لەویَ خەزێنەدار بــوو وەرِێ کــەوت. بــە هەڵــکەوتێکی ســەیر و ئەوپــەرِ سروشتی لە چنگ تاقمێک زەند(٨) ڕزگاری بوو کە دەیانگوت سوبحانوێردی‌بەگ هانی داون. حوسێن‌خان بە شێوەیەکی گــەرموگــورِ بــەڵام گومانــاوی پێشــوازی لێکرد. لەم ڕۆژانەدا لــە لایــەن عادڵشــاوە ســەرکردەیەک بــەناوی ئــەمیرخانی تــۆپچی‌باشــی (ســەرتۆپچی) بــۆ قــەڵای کرماشــان هەڵــبژێردرا. بــەگوێرەی سەرچاوەکان ئەو گەیبووە نیزیک بێستوون کە محەممەدتەقی‌خان زۆر بەگــەرمی بەخێری هێنا. حوســێن‌خــانی زەنگەنــە کــە چەکــدارە وەرزی و خێڵاتییــەکانی بڵاوەیان لێکردبوو، هەڵات و تەمای گرت کە خــۆی بگەیەنێتــە بــرایم‌مــیرزا لــە ئیسفەهان تا ڕادە و چۆنیەتی خۆبەزلزانی و ئاواتەکانی شــازادە هەڵســەنگێنێ. خان فەرمانی هەڵبژاردنی یەکێک لە خزمــانی ژێربالــی خــۆی بــۆ حکوومــەتی کرماشان لە شازادە وەرگرت. حوسێن‌خان لە هەمەدان چەن هێزێکی کــۆکردەوە و بە لەشکرێکی چوارپێنج هەزارکەسی تایفەی خۆیەوە دیسانەوە بەرەو کرماشــان گەڕاوە. ئەمیرخان حەوت هەزار چەکدار و چوار تــۆپی ئاگربــاری نــاردە ســەر ڕێی، بەڵام سپای زەنگەنە پێشاوبرکەی هێزە نێردراوەکانیان دایەوە و لە قــەڵای وشترانی(٩) نیزیــک هەمــەدان تێکیانشــکاندن. ئــەمیرخان کــە لــەم بەینانــەدا عەبدولعەلی‌خانی نەوەی دابوویە پاڵی(١٠)، وێرای مــیرزا محەممەدتــەقی‌خــان کاروباری پاراستنی شاریان ڕێکوپێک کرد. برایم‌میرزا بۆ پشتیوانی لە حــاکمی هەڵبژێراوی تایفەی زەنگەنە هێزێکی زۆروزەوەندی بەرِێ کردە کرماشــان. پــاش سێ حەوتوو گەمارۆ و شەڕ و بەربەرەکانی خۆڕاگرانــە، ئــەمیرخان بــەناچاری پاشەکشەی کرد.

لە هەلومەرجێکی ئاوا پڕمەترسی‌دا، هاوکارانی ئەمیرخان(١١) هەستیان کرد کە ئەگەر ژیانیشــیان نەکەوێتــە مەترســی، لانیکــەم دەبــێ لــە داهــاتوودا خەساری ئاڵوگۆڕەکانی بەرەوڕوو بدەنەوە، هەر بۆیە تەمایان گرت ڕوو بکەنــە برایم‌میرزا کە شانس و بەختی زیاتر بوو بۆ ئەوەی براکەی لە سەر کار لابا. لــە ئاکامدا وایان کرد کە ئەمیرخان بە نابەدڵی سەر وەبــەر ئیســفەهان بێنــێ. دوای ماوەیەکی کەم کۆت و بەندیان خســتە دەســت و پێــی ئــەمیرخان و وەک دیلێــک ڕایانگرت هەتا بۆ ڕوونکردنەوەی چارەنووسی بیدەنە دەس بــرایم‌مــیرزا. بــەڵام برایم‌میرزا کە قەدری ئەمیرخانی دەزانی، لە شەڕ لەگــەڵ عادڵشــادا کــردی بــە

فەرماندەری تۆپخانە. هەڵبەت شاری بێپارێزەری کرماشانیش خێرایەکی کەوتە ژێر چنگی خانی زەنگەنە. ناوبراو سەبارەت بە سەرکردە دووتۆوەکانی قەڵا باش جووڵایەوە و ڕووی خۆشی نیشان دان، بەڵام میرزا محەممەدتەقی بەئاشکرا لە ئاکامی سەرکەوتنەکانی برایمیرزا بۆ وەدەسهێنانی تەختی ئیمپراتۆرێتی ئێران، ترسێکی لە دڵیدا بوو. بە بیانووی بەڕێکردنەوەی سەیدێکی «ڕەزەوی» کە لە زیارەتی مەرقەدی ئیمامان دەگەڕایەوە و دەیەویست یەکڕاست بچێتەوە هەمەدانی زێدی، دەستی لە کارەکەی کێشایەوە. میرزا محەممەدتەقی بە پەلە بە لاڕێیاندا لە هەمەدان لای نەدا و ڕاستەوخۆ چووە ئیسفەهان. لەم شارەدا لە چاکە و پیاوەتی سەلیمخانی قۆرقلووی کۆنەدۆستی کە لە بابەت سەرکەوتنی بە سەر کائید کەلبعەلیدا کەیفساز بوو، توانی سکاڵای خۆی لە بابەت کردەوەی ناشیرینی حوسێنخان بگەیەنێتە گوێی برایمیرزا و وای لێبکا کە فەرمان بداتە خۆی و سەلیمخان تا لە کرماشانی وەدەرنێن.

ئاخرین پەردەی شانۆی گاڵتەجییانەی ئاهەنگین و مەشەدییانەی لایردنی حاکم خێرا کەوتە گەڕ: حوسێنخان بۆ شەڕ لەگەڵ سەلیمخان بە هێزێکی پێنجشەشهەزار کەسییەوە بەرەوپیری چوو[8]، بەڵام سەرکردەی ئەفشار خۆی لە تێکهەڵچوون پاراست و لە پشتەوەڕا پەلاماری کرماشانی دا و گرتی. پاشان بۆ گێڕانەوەی سەرۆکی تایفەی زەنگەنە فرتوفێڵێکی نواند و دڵنیای کردەوە کە هێشتاش باوەڕپێکراو و خۆشەویستی برایمیرزایە و بەڵێنی پارێزرانی گیانیشی دایە. وەختایەک یارانی لێیتەکینەوە، بە شێوەیەکی خائینانە کوشتی و جارێکی تر میرزامحەممەدتەقی بردەوە سەر حوکم.

## ١ـ٣ تایفەی زەند

هۆی سەرەکی پاشاگەردانی ساڵانی سەرەتای دوای مەرگی نادرشا زیاتر دەگەڕێتەوە سەر ئاڵوگۆڕی لەشکرەکانی لە قووچان و جێگۆڕەکەی چەکدارانی بنکە و ناوەندی پارێزگاکان و پیاوانی پارێزەری سنوور. لەڕاستیدا متمانە و

٨ ـ موجمەلوتتەواریخی گوڵستانە، ل ١٣٢ ـ ١٤٥.

یەکانگیری ئەم قۆشەنە وێڕای هۆکاری پەیدابوونیان، لەگەڵ سەرکردەکانیان تێداچوو. دڕدۆنگی سەبارەت بە هاوڕێیانی پێشوو کە ئێستا تێکڕا لە کەسایەتی ئەخلاقی و خێڵەکییانەیان گەیبوون، خۆی دەنواند. هەروەها چونکە لە ڕوانگەی جەماوەری تووڕەی شارنشینەوە لەشکری نادر پتر لە هێزی ڕێکوپێکی دوژمنان نیشانەی زوڵم و دەسدرێژی و شاباڵی سامناکی بوو، نەیاندەهێشت پێ بنێتە شارەکانەوە. ئەمە وای کردبوو کە هەر تاقمەی لە دەوری سەرکردەیەکی باوەڕپێکراوی خۆی کۆبێتەوە و تێکڕا بگەڕێنەوە مەڵبەندەکانی خۆیان و خێرا بەختیان لە هەرێمێکی ئاشنا و دۆستانەتردا تاقی بکەنەوە. لەم دەستەیە دەکرێ ناوی ئەبداڵییەکانی سەر بە ئەحمەدشا و بەختیارییەکانی ژێرڕکێفی عەلی‌مەردان‌خان بێتە گۆڕ کە پێشتر باسی کۆچکردنیان لە خوراسانەوە کراوە.

تایفەی زەندیش دەکرێ لە ڕیزەی ئەمانە دابنرێن؛ ئەمانە تاقمێکی خۆبژیوی مەڕدار بوون کە لە مەزرا و لەوەڕگەکانی داوێنی زاگرۆسەوە هاتبوونە گوندەکانی پەری و کومازان لە نزیک مەلایر.[٩] زۆربەی سەرچاوەکان زەندیان بە تایفەیەکی هۆزی لەکی لوڕستان کە کەڵهوڕ و زەنگەنە و مافی و باجەلانیش دەگرێتەوە(١٢) داناوە و نووسەرانی ئێرانی و غەوارەش ئەوانیان وەک تایفەکانی دراوسێیان بە کورد داناوە. هۆکاری ئەم سەرشێوان و بۆچوونە جیاوازانەش دەگەڕێتەوە سەر شوێنی دانیشتن و بنەگربوونیان. چونکە لە قەراغ ئەو خەت و کووزەی کە لە کرماشانەوە تێدەپەڕێ و بە شێوەیەکی کۆنباو لوڕستان و کوردستان لێک جیا دەکاتەوە، بەکردەوە دابونەریت و فەرهەنگی لوڕی و کوردی و زاراوەکانیان تێکەڵاون، هێندێک نیشانەش ئەمە دەسەلمێنن، بەلام هەر چۆنێک بێ زەند خۆیان لە دراوسییەکانی دیکەیان جوێ کردۆتەوە یان ئەوانیان

---

٩- بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی سپا، بەرگی پێنجەم کە لە لاپەڕە ٣٧٤دا دەنووسێ پەری کەوتۆتە سی کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی مەلایر و سەر ڕێگای ئەراک. کومازانیش دێیەکە لە لای وی. ئەم دوو گوندە لەگەڵ چەند دێی تر ناوچەی لەکستانیان پێکدێنا؛ «پۆرتر» لە بەرگی دووهەم، ل ٨٢ ـ ٨٣دا دەنووسێ: لە ساڵی ١٨١٨دا شوێنی نیشتەجێ بوونی کەریمخانی لەوێ دیوە کە هەر وا ماوە. بڕواننە: کووهمەرەئیش، ل ٤٥٢؛ «بیر» بەشی یازدەهەم و هەروەها:
Roschanzamir, Zand – Dynastie , 13,24 note I.

بە بێگانە داناوە. هێنـدێک جـار وەک لـوڕی فـەیلی(١٣) و جارجـارێکیش وەک کـوردی ئـەردەڵان باسـیان کـراوە. تایفـەکانی هـۆزی لـەک کـە زاراوە و تایبەتمەندییەکانیان پتر چەشنی کوردانی لێکردوون، بێشـک لـە ناوچـەکانی باکووری لوڕستانەوە باریان کـردووە یـان بـە دەسـتی شاعەباسـی سـەفەوی ڕاگوێزراونە دەوروبەری مەلایر و لە ئاخروئۆخری سەردەمی سەفەوی‌دا ناویـان بە لەک و لوڕ هاتۆتە گۆڕ.[١٠]

زەندەکان لە زەمانی مەهدی‌خان‌دا دەورێکی چالاکانەیان وەئەستۆ گرت، ناوبراو یەکێک لە ڕێگرانی خۆولاتی بوو کە پاش هێرش و پەلاماری ساڵی ١٧٢٠ی ئەفغانییـەکان کـە سـەردەمێکی ئاڵۆزبڵـۆزی وەک سـاڵانی سـەرەتای مـەرگی نادرشای بە شوێنەوە بوو، سەری هەڵدا. لـەم سـاڵانەدا ترکـانی عوسمـانیش هەلەکـەیان قۆزتـەوە و کرماشـانیان داگـیر کـرد و مەهـدی‌خـان لـە زێـدی باووباپیرانی لە پەری و کومازان بە خۆی و حەوسەد کەس لە پیاوەکانی دەستی دایە زەبروەشاندنێکی بێبڕانەوە و شـەڕی پـارتیزانی بـە دژیـان. وەختایـەک

---

١٠ـ لە بابەت تۆرەمەی تایفەی زەنـد بڕواننـە: ل ١٤٠ی قـەزوێنی، بۆستانوسـیاحەی شیروانی، ل ٥٦٢، کووهمەرەئی، ل ٤٥١، ناوبراو بـە یـەکێک لـە تایفـەکانی لوڕیـان دەزانێ. شەرەفنامەی بدلیسی، ل ٥٣ ـ ٥٤، ئەمین زەکی‌بەگ، مێژووی سلێمانی، ل ٢٨ و نیکیتین لە کتێبی «کوردەکان»دا بە کوردیان دەزانن. لە بابەت تایفەکانی هۆزی لەکـەوە بڕواننە: Minorsky , articles in Eil III, 10-11 (Lak) ; 41-46 (Lur) And Lambtons Ei2 III , 1102 (Ilat).

هێشتاش لە لوڕستانی باکووری و کوردستان هێندێک تۆرەمە و تایفە هـەن کـە پێیـان دەڵێن «زەند»، (یان لانیکەم هەتا زەمانی ئێمە هەبوون) ڕاببینۆ لە کتـێبی کوردسـتان ل ٤٠دا ئاماژە بەمە دەکا کـە لـە ناوچـەی «بـاقلا» نیشـتەجێ بـوون (سالـی ١٩٠٠). ئـەم زەندییانەی خۆیان بە تۆرەمەی کەریمخان دەزانن، وایان گوتووە.

schindler (Eastern Persian Irak, 48) ئاماژە بە تایفەیەکی لوڕان دەکا کە لە نزیک قوم نیشتەجێن و ناویان زەندە(ساڵی ١٨٩٠). «بیر» لە ژمـارەی ١٨دا باسـی پاشمـاوەی تایفەی زەندی بەگە دەکا لە لوڕستانی فەیلی‌دا. ئاماژەی لـەم چەشـنە سـەبارەت بـە کوردبوونیان لە لایەن ئیدمۆندز، نیکیتین و ئەمین‌زەکی‌بەگەوە کراوە. بۆچوونی مێلکۆم لە ل ١٢٢دا سەبارەت بەمەی کە ئەوان ئەرکداری پاراستنی «زەند»ی ئاوێستای زەردەشت بوون، ڕەنگە وەک سەرچاوەی دۆزینەوەی بنج و بناوانی وشەکە کەلکی هەبێ.

دەکەوتنە شوێنی پەنای دەبردە کێوێک. وەک دەگێڕنەوە ئەوەی وا لە تالان و دزی وەچنگی دێنا لە لەشکر و خەباتی بێگەردی نیشتمانپەروەرانەی خەرج دەکرد. سالی ١٧٣٢ نادرشا دوای لەشکرکێشی بە مەبەستی دەمکوتی یاغییەکانی بەختیاری، لە کرماشان بڕیاری دا کە ئەم ڕێگرانە بەتوندی سزا بدا. بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم مەبەستە هێزەکانی ژێر فەرمانی باباخانی چاووشلوو (چاپشلوو)ی ڕاسپارد(١٤). باباخان بە فێل لە سەرۆکانی زەند خۆش بوو، پاشان مەهدیخان و چوارسەد کەس لە یارانی دایە بەر دمی شمشیران و تەواوی خێوەت و مال و دارایی[11] بە تالان بردن و سەرکردەکان و کۆمەلێکی بەرچاوی بە خاوخێزانەوە دوور خستنەوە بۆ خوراسان و لە ئەبیوەرد و دەرگەزی نیزیک کەلات نیشتەجێی کردن. زەندەکان هەتا پازدە سال دوای ئەم ڕووداوە، هەر لە تاراوگە بوون و لە بەرامبەر هێرشی تورکمانانەدا تابشتیان هێنا و کەم و زۆر تەواوی سەرۆکانی تایفە بێنێوبڕ لە هۆردووی نادردا کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لە بەغداوە بگرە تا دێهلی لە هاتوچۆ دابوون، خزمەتیان دەکرد.

لەو وەختەدا کە نادرشا کوژرا، زەندەکانی دانیشتووی دەرگەز سەرجەم سیچل مالێک دەبوون. دوو برا بە ناوی ئیناق و بوداق سەرۆکی ئەم تایفە بوون. ئیناقی براگەورە باوکی کەریم و سادق و بوداقی براگچکە باوکی ئەسکەندەر و زەکی بوو. لەو ڕۆژگارەدا کە ئێمە باسی دەکەین جڵەوکێشی هەردک بەرەباب مردن یان بەگوێرەی ڕوون کردنەوەی «نامی» گەڕابوونەوە زێدی باب و باپیران و کورەکانیان سەرۆکایەتی تایفەکەیان دەکرد. کەریمبەگی کوڕی ئیناق بە سەرۆکی یەکەمی تایفە دادەندرا. ئەم مەبەستە کە داخوا کۆچ و کۆچباری ئەوان بەر یان لە دوای کوژرانی نادر و لە چ هەلومەرجێکدا ڕووی داوە هەروا لە پەردەدا ماوەتەوە.[12] ڕەنگە ئەگەر وا دابندرێ کە کۆچی سەرلەنوێی زەندان بۆ لای مەلایر

١١ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٤٦ ـ ١٤٧؛ تاریخی گیتی گوشای زەندیە، ل ٤٥؛ سارەوی، ل ١٧، لۆکهارت، کتێبی نادرشا، ل ٦٥.

١٢ـ بەگوێرەی دەقی تاریخی گیتیگوشا و گولستانە وەختایەک تایفە گەڕایەوە زێدی خۆی کە کەریمخان ببوو بە سەرۆکی. نامی دەڵێ کە ئەوان بە دلخوازی عادلشا لە کاروباری لەشکری لادران، بەلام بە ئیزن نەدانی بەختیارییەکان ئەم مەبەست ناڕاست دەنوێنێ، چونکە کووهمەرەئی لە ل ٤٥١دا، سالی ١١٦٢ی کۆچی/١٧٤٩، یانی پاش

ڕاست لە یەکەم ساڵی کوژرانی نادرشادا ڕوویدابێ، لە ڕاستییەوە نیزیکتر بێ. سەربازانی ئێلجاڕی تایفەش ڕەنگە هەر لەودەمەدا کە عەلیمەردانخانی بەختیاری لە مەشەد ڕایکرد، بەبێ ئێزنی عادڵشا و بە قبوولکردنی مەترسی سزادان لە بابەت وەلانانی خزمەت و هێندێک کێشەی ترەوە گەڕابنەوە ناوچەی خۆیان. ئەو کەسانەی دواتر وەک سەرۆک و سەرکردەی تایفە ناوبانگیان دەرکرد، بەتایبەت کەریم و سادقی برای و ئەسکەندەری دایکبرای و ئامۆزاکانیان محەممەد و شێخاڵی، بناغە و بنچینەی هێز و توانستی تایفەیان داڕشت. ئەوەی لێرەدا شایانی باسە نیازپاکی و متمانەیەکی دوولایەنەیە کە ئەم دوو بەرەبابە، لە یەکەم قۆناخەکانی دەسبەکار بوونەوە سەبارەت بە یەکتر بوویان.

## ١ ـ ٤ کەریمخان

کەریمبەگ دوای گەڕانەوەی بۆ مەوتەنی خۆی، هیچ هەلێکی بۆ خۆتێوەردان لە ململانێی نێوان سەرۆک هۆز و تایفەکانی ڕۆژاوای ئێران کە بە دنەی برایمیرزا لە ئیسفەهان خەریکی سازدانی بازنۆکەی دەسەلاتیان بوون، بەفیڕۆ نەدا[١٣]، ناوبراویش بە نۆرەی خۆی گەلاڵەیەکی گەورەی بۆ داهاتوو داڕشت. وەک دەگێڕنەوە برایمیرزا بۆ بەجۆکداهێنانی سەرۆک تایفەکانی تر پشتیوانی لە کەریمخان دەکرد و شانازی نازناوی «خان»ی دایە سەرۆکی تایفەی زەند. ئەگەر ئەو قسەی گوڵستانە ڕاست بێ، ئەم ناوە (خان) نازناوێکی

---

چوونە سەرتەختی شاروخمیرزا بە زەمانی گەڕانەوەیان دادەنێ. بێشک ئەم مێژووەش لە ڕووی ئەم هەڵکەوت و ڕووداوانەی کە گوڵستانە و نامی باسیان کردوون، دەبێ ڕۆژگاری دوای ئەودەمی بووبێ.

١٣ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٨، کووهمەرەئی، ل ٤٥١ باسی بارودۆخێکی پێچەوانەی ملکەچی و خۆبەکەمزانی دەکا. شەڕوانانی زەند سەرکەوتووانە سپای برایمیرزایان ڕەناند، چەند تۆپێکیان لە قەدەداران ساز کرد کە خڕکەبەردیان پێداویشتن.

نێوخۆیی و نارەسمی بووە کە هاوشانانی لە تایفەدا قبووڵیان کردووە.[14] هەروەها کەریمخان بە نازناوی لوڕی «تووشماڵ»یش(١٥) ناوی دەهات و پێیان دەگوت تووشماڵکەریم. وا دیارە نازناوی تووشماڵیان بۆ سەرۆکانی گەورە و گچکەی تایفەکانی لوڕستانی باکووری بەکار دێنا.[15]

یەکەم ملبەملە و زۆرانبازییەکی راستەوخۆ کە دژی پەرەگرتنی دەسەڵاتی کەریمخان دەستی پێکرد، لە لایەن مێهرعەلیخانی «تەکلوو»[16]ڕا هاتە گۆڕ. ناوبراو لە لایەن شاروخمیرزاوە کرابوو بە حاکمی هەمەدان و لەبەر بەدەستەوەبوونی لەشکرێکی دوازدەهەزار کەسی غللوور ببوو. نەزەرعەلیسوڵتانی باوکی پەیوەندییەکی گەرموگوڕی لەگەڵ تایفەی زەند بووە. مێهرعەلیخانیش پێشنیاری یەکگرتنی پێکردن؛ دەبێ وڵامی کەریمخان یەختەکردنی نێردراوەکانی و گێڕانەوەیان بە دەستی بەتاڵەوە بووبێ. سەرکردەی ڕقهەستاوی تەکلوو لەم وەختەدا لەشکرێکی پێنجهەزارسوارە و یەکەیەکی تۆپخانەی ناردە سەر. لەشکری نێردراو بە لە دەس دانی سێ تۆپ تێکشکا. دوای ئەم شەڕە بوێرانەی شادهێنە، سپای زەند لێبڕا کە پەلاماری دوژمنانی بدا لە باشووری ناوچە. ئامانجیان زەکەریاخانی حاکمی برووجێرد و

١٤ـ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٥؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٤٠٩.

١٥ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٢٤٦؛ سارەوی، ل ١٧ ب؛ مینۆرسکی لێکدانەوەیەکی سەبارەت بەم وشەیە لە سەردەمی سەفەوی‌دا نووسیوەتەوە و ئەوی بە هاومانای میرکابان داناوە. (وشەدانی دێهخودا بە «میرخوان»ی هێناوە؛ بە زمانی گورجی شوێنی چێشتخانە پێی دەگوترێ تووشماڵی. دەڵێ کە ئەم وشەیە لە ڕاستی‌دا مەغوولییە.) تووشمیل یانی پیاوی باوەڕپێکراو کە لە زاراوەی لوڕی‌دا بۆ سەرۆک دەکار دەکرێ، بەڵام ناحەزانی کەریمخان بۆ سووکایەتی پێکردنی وایان دەگوت. ڕابینۆ لە ل ٣٩ی کتێبی کرماشان‌دا دەنووسێ کە خانەکانی لەک ئەغلەب وشەی تووشماڵ دەبێتە پێشگری ناویان.

١٦ـ تەکلوو یەکێک لە تیرە سەرەکییەکانی ترکانن و بەگشتی بە قزڵباش ناسراون و لایەنگری شاسمایلی سەفەوی بوون. هەمزەمیرزا هێزی ئەم تایفەیەی بنەبڕ کرد و لەودەمیڕا بوونە بەشێک لە تایفەکانی دیکە. چەند بنەماڵەیەک ئەم ناوەیان پاراست، بەڵام ئیتر وەک تایفە نەمان.

(بڕوانە: Hotum Schindler, Eastern Persian Irak, 49; Rohrborn, 135.)

کەززاز بوو کە پێیان وابوو ڕەنگە ببێتە هۆی گەمارۆ درانیان. بەڵام هەر لەڕێوە کە بیستیان مێهرعەلیخان دەرکەوتووە و دەیەوێ تۆڵەیان لێبکاتەوە، گەڕانەوە. دووبارە مێهرعەلیخان شکستی هێنا و کەریمخان لە قەڵای (وەلاشگێرد) دەوری دا. مێهرعەلیخان(١٦) تەگبیرێکی کرد و عەبدولغەففاری برای بۆ یارمەتی خواستن، ناردە لای حەسەنعەلیخانی ئەردەڵان حاکمی کوردستان و هێزەکانی زەند ناچار بوون کە بە دارڕانی لەناکاوی لەشکری بەهێزتری کورد، دەس لە گەمارۆی قەڵاکە هەڵگرن.[١٧]

یەکەم تێکهەڵچوونی حەسەنعەلیخان لەگەڵ تایفەی زەند، زیاتر هەڵکەوتێک بوو و پتر دەگەڕاوە سەر دڵەڕاوکەی بەرەوسەری سەبارەت بە چارەنووسی کرماشان. برایمیرزا کە پیلانەکەی بۆ فریودانی شاروخ شکستی هێنابوو، پاشماوەی سپاکەشی کە ڕاستەوخۆ نەیاندابوویە پاڵ هێزەکانی شا، لە نێوەڕاستی ساڵی ١٧٤٩دا، لە هۆردووگاکەی ڕایانکرد هەتا بتوانن ئەوەندەی بۆیان دەکرێ هێزەکانیان ڕزگار کەن. لە نێو ئەم تاقمانەدا، دەستەیەکیش بە سەرۆکایەتی ئیمامقولیخان سەرکردەی بیستوپێنج ساڵەی زەنگەنە وەبەرچاو دەهات. ئەم تاقمە لە نیزیک بێستوون گیرۆدەی شەڕ و تێکهەڵچوونێک هاتن لەگەڵ کۆمەڵە تایەفەیەکی یەکانگیری ناوچەکە بە سەرۆکایەتی نەجەفقولیخانی کەڵهوڕ(١٧). ئیمامقولیخان شەوێکی لە هێرشێکی کوتوپڕا تێکیشکاندن و شاری کرماشانی گرت. پاشان سەرنجی کەوتە سەر قەڵای کرماشان کە هەروا بە دەس میرزامحەممەدتەقی و عەبدولعەلیخانەوە بوو. لە ماوەی سێ حەوتوواندا لەشکرێکی تازەپشووی لە تایفەی زەنگەنە و تایفەکانی دیکەی «وەند» پێکهێنا کە یازدەهەزار کەسێک دەبوون. لە ژێر شەپۆلی تەوژمی ئەم هەڕەشەیەدا میرزامحەممەدتەقی داوای یارمەتی لە حاکمی کوردستان کرد، حاکمیش بە ناسەرسەنگی و لەوپەڕی ساوەساودا بە هێزێکی بیستوپێنجهەزار پیاوی شەڕکەرەوە بەرەو کرماشان بزووت.

---

١٧ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٤٧ ـ ١٥٠؛ دێهگان، ل ٥٨. بەپێی نووسینی دێهگان وەلاشگێرد (وەلاشجێرد) لە «فەراهان»ە. (بڕواننە نەخشەی کەیهان، بەرگی دووهەم، ل ٣٨٤.) لێرەدا مەبەست ئەو وەلاشگێردەی نیزیک هەمەدان نیە.

ئیمامقولیخان خێرایه‌کی په‌لاماری قۆڵی سه‌ره‌کی له‌شکره‌که‌ی دا له‌ که‌لی بیله‌وار(۱۸). له‌م هه‌ڵمه‌ته‌دا ته‌نیا هه‌زار که‌سی له‌گه‌ڵ بوو. ئه‌گه‌رچی زۆر ئازایانه شه‌ڕی کرد، به‌ڵام له‌به‌ر ڕێکوپێکی هێزه‌کانی دوژمن تێکشکا و به سلامه‌ت بۆی ده‌رباز بوو و به‌ره‌و کرماشان رایکرد. له‌م شاره پێیزانی که ئیتر که‌س پشتیوانی لێناکا و ناچار به‌ره‌و چیاکان پاشه‌کشه‌ی کرد تا دیسانیش هێزی تازه‌پشوو له نێو تایفه‌ی وه‌نددا کۆ کاته‌وه.[18]

والی (حاکم) پاش دیدارێکی کورت له‌گه‌ڵ فه‌رمانده منه‌تباره‌کان، له قه‌ڵای کرماشانه‌وه به مه‌به‌ستی ڕزگارکردنی قه‌ڵای وه‌لاشگێرد و به ده‌نگه‌وه‌چوونی ناوه‌خت به نیازی وڵامی داخوازی مێهرعه‌لیخان که له ده‌سپێکی گه‌مارۆوه هاواری یارمه‌تی کردبوو، که‌وته‌ڕێ. که‌ریمخان به‌پارێزه‌وه به‌ره‌و کومازان کشایه‌وه، به‌ڵام چه‌کدارانی کورد که‌وتنه شوێنی. له‌پێشدا ژن و منداڵی ناردنه جێیه‌کی په‌نا و هێور. پاشان ده‌ستی کرد به‌و شێوه شه‌ڕه‌ی خۆی که‌یفی پێی ده‌هات، یانی ده‌سوه‌شاندن و ڕاکردنی شه‌وانه و ماوه‌ی چلڕۆژێک دوای ئه‌وه‌ی خۆی له تێکهه‌ڵچوونی ڕاسته‌وخۆی هێزه دامه‌زراوه‌کان پاراست، دوژمنی وه‌ته‌نگ هێنا. له‌م ناوچه‌دا چه‌ند هه‌واڵێک بلاوبۆوه که نیشانی ده‌دا سه‌لیمپاشای بابان(۱۹) حاکمی پێشووی عوسمانی له کوردستانی ڕۆژاوا، که به‌م زووانه له کار لادرابوو، به‌گوێره‌ی باو به‌ره‌و کوردستانی ئێران رایکردووه و خۆی له تاقمێکی مه‌ترسیداری ژێرده‌سته‌ی حاکم که ناحه‌زی بوون نیزیک کردۆته‌وه و به‌ره‌و سنه ده‌یکوتێ. حه‌سه‌نعه‌لیخان له‌ڕێوه گه‌ڕایه‌وه. سواره‌کانی زه‌ند به شێوه‌یه‌کی په‌رانپه‌ران له سه‌ر ڕێگا بۆسه‌یان بۆ نایه‌وه و ته‌نانه‌ت له حه‌شارگه‌کانی توویسیرکان به‌شێک له خه‌زێنه‌که‌یان به خه‌نیمه‌ت گرت. دیسانیش دوژمنێکی دیکه‌ی سامناک خاڵه لاوازه‌کانی ده‌رکه‌وتبوون و ده‌بوو خێرا که‌ریمخان کیسیان لێبێنێ.

مێهرعه‌لیخانی ته‌کلووش که ده‌ستی دابوویه ده‌ستی یه‌کێک له سه‌رکرده‌کانی پێشووی برایمه‌یرزا، واته مورته‌زاقولیخانی کۆسه‌ی ئه‌حمه‌دلووی ئه‌فشار، سه‌رجه‌م له‌شکره‌که‌ی سێزده‌هه‌زار که‌سێک ده‌بوو. ئه‌مانه

---

۱۸ ـ موجمه‌لوتته‌واریخ، ل ۱۵۰ ـ ۱۵۸. بیله‌وار ـ گوڵستانه نووسیویه‌تی بیلاوه‌ر ـ که‌وتۆته باشووری ڕۆژاوای کامیاران له سه‌ر سنووری ئه‌رده‌لان و کرماشان.

لە کرماشان بەگەرمی لە لایەن میرزا محەممەدتەقی و عەبدولعەلیخانەوە پێشوازییان لێکرا؛ سەردارانی یەکگرتوو پاشان ئیمامقولیخانیان فریو دا(۲۰) و بانگێشتنیان کرد تا بە شێوەیەکی یەکسان دەسەلات لە مابەینی خۆیانا دابەش کەن. بەلام هەرکە هات گرتیان و کوێریان کرد و خستیانە سیاچالەوە.[١٩]

## ١ ـ ٥ گیرانی ئیسفەهان

ئێستا کە کەریمخان بە داگیرکردنی بەشی هەرەزۆری ڕۆژهەلاتی کرماشان بناغەی دەسەلاتی خۆی پتەو داڕشتبوو، حاکمانی گچکەی هەرێمەکە وایان بە بەرژەوەند زانی کە خۆیان بخەنە داوێنی دەسەلاتی بەرەوگەشەی زەندان. ئاغاسیخانی بیگدلی شاملوو(۲١) کە خالۆزای لوتفعەلیبەگی ئازەر، نووسەری کتێبی ئاتەشکەدە (ئاورگا) بوو، بنەمالەکەی هەتا نەمانی نادر لە قەلەمڕەوی هەمەدان دەژیان. وەختایەک کە شاروخ فەرمانی حکوومەتی ئەم مەلبەندەی بۆ مێهرعەلیخان نارد[٢٠]، لەڕێوە دایە پالی. دەستەیەک لە هاوپەیمانان سەریان وەبەر نەهێنا. لە یەکەم دەسپێکی هرووژمی کەریمخان بۆ سەر وەلاشگێرد، عەلیوسخانی زەند یەکێک لە مەیداندارانی خەلکی فەراهان چووە مەیدان(۲۲). بۆ بەدبەختییان علیوس لە ماوەی هەلمەتەکەدا کوژرا و تایفەی زەند دەستیان کرد بە قسەی پڕوپووچ بە دژی خەلکی فەراهان و پاش پەلامارێک هەتا مەتەرێزەکانیان لە ئێنجێدان[٢١] کەوتنە شوێنیان. بەم جۆرە بنەڕەتی دوژمنایەتییەک لە ڕۆژهەلاتی کومازان بنجی داکوتا کە دوایە دەبێ بە وردی شی بکرێتەوە. ئامانجی دوایەی کەریمخان گرتنی جەرگەی ڕۆژاوای ئێران بوو. کەریمخان خۆی گەیاندە زەکەریاخانی دوژمنی پێشووی و پیاوێک بە ناوی شابازخان کە دووهەزار سواری تایفەی قەرەگوێزلوویان لە ناوچەکانی دەوروبەری هەمەدان لە ژێر فەرمانیدا بوو. پاشان بەرەو باشووری ڕۆژهەلاتی پێی بە ڕکێفەوە نا هەتا گولپایەگان و خوانسار لە سەرڕێی ئیسفەهان بگرێ. لەم ناوچەیەدا بۆ یەکەم جار لەگەل هێزەکانی عەلیمەردانخانی بەختیاری کە تازە

---

١٩ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٥٩ ـ ١٦٩.

٢٠ـ دێهگان، ل ٦١.

٢١ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٤٩.

لــە خوراســان[22] گــەڕابۆوە و لــە چیاکــانی بــەختیاری نیزیــک گولــپایەگان دەورودووکانی فەرمانڕەوایەتی دانابوو، بەرەوڕوو بوو. عەلی‌مــەردان‌خــان بــە مەبەستی ڕێ‌گرتن لە هرووژمــی خــانی زەنــد نــاردنی، لــە نیزیــک کەمــەرە[23] تێکشکان و زۆریان بریندار و کوژراو کەوتە سەر دەستی و گەلێکیان دیل لێگیرا و خەنیمەتێکی باشیان بەجێهێشت. لەم ڕۆژانەدا کەریم‌خان گولپایەگانیشی گرت.

کەریم‌خان بــە نــەرمی لەگــەڵ خەڵــکی گولــپایەگان جووڵایــەوە و بــۆ یەکەم‌جار لە دەرەوەی زێدی خۆی سەرنجی خەڵکی ڕاکێشــا و ڕێــی بــەرفرەوان کردنی قەڵەمڕەوی خۆش کرد. لەم وەختــەدا کۆمەڵــە هەواڵــێک ســەبارەت بــە پێشڕەوی مێهرعەلی‌خانی تــەکلوو گەیشــتە دەســتی و ناچــار بــوو بــە پــڕتاو وەرسووڕێتەوە. بە چوارڕۆژان لە گولپایەگانەوە خۆی گەیاندە قەڵای وەلاشگێرد و مێهرعەلی‌خــانی شکســت دا و پێــی نایــە هەمــەدان ناوەنــدی ســەرکردایەتی هێزەکانی ئەو. لە هەمەدان چەند کەسێکی تایفەی بەختیاری کە مێهرعــەلی‌خــان ئەسیر و زینــدانی کردبــوون ئــازادی کــردن و بــە کۆلــێک دیــاری و خەڵاتــەوە بەرەوماڵی کردنەوە. لەو کاتی‌دا کەریم‌خان دەیویست کــە ســەرەتای پێکهێنــانی بناغەی یەکێتییەک لەگــەڵ تایفــەی بەدەســەڵاتی بــەختیاری دابــڕێژێ. بــەڵام کەریم‌خان هەلێکی لە دەس دابوو، چونکە پاش بادانەوەی بــۆ ســەر هەمــەدان، عەلی‌مەردان‌خان دەستی خۆی ڕەپێش خست و گولپایەگانی گرت و گەمارۆی بــۆ ئیسفەهان ئامادە بوو.[24]

ململانێی سیاسی لە نێوان عەلی‌مەردان‌خان(٢٣) و ئەبولفەتح‌خان(٢٤) کە بەرەسمی لە لایەن شاروخەوە کرابوو بە بەگلەربەگ (گەورە/مەزن)ی ئیسفەهان، لەبەر نێوان‌ناخۆشی خۆیان و تایفەکانیان و بەخاتری داگیرکــردنی پایتــەختی پێشــووی ســەفەوی پتــری دەتەنییــەوە. ئــەم دووە لــە ڕیــزەی گــەورەپیاوانی

٢٢ــ ڕەنگــە لــە نێوەڕاســتەکانی نــوامبری ١٧٤٧دا، GD. (VI, 30 December 1747) دەنووسێ کە پازدەهەزار خێزانی بەختیاری لە خوراسانەوە بەرەو ئیسفەهان هەنگاویان نا کە دەستیان دایە گەورەترین ئاکاری دزێو و ناشیرین.

٢٣ــ موجمەلوتتــەواریخ، ل ١٦٩، دەنووســێ: کەمــەرە ناوچەیەکــە کەوتۆتــە نێــوان بroووجێرد و گولپایەگان؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٣٤.

٢٤ــ موجمەلوتتەواریخ، ١٦٨ ــ ١٧٠.

بەختیاری دادەندران، بەڵام ئەبولفەتحخان لە سەرۆکانی تایفەی حەوتلەنگ و بە باری مەزنایەتی بەختیاری و ڕەگەزداری‌دا خاوەنی پلەیەکی باڵا بوو، چونکە لە دایکەوە دەبوو بە نەتیژەی شێخ زاهیدی گیلانی، پیری شێخ سەفییەددینی ئەردەویلی، باپیرەگەورەی خانەدانی سەفەوی. عەلیمەردانخان لە سەرۆکانی تایفەی چوارلەنگ و پیاوێکی لەخۆڕازی و لووتبەرز بوو کە لەبەر کاربەدەست بوونی لە بارگای نادرشادا ناوبانگێکی دەرکرد[٢٥]. ئێستا بۆ هەموو لایەک ڕوون ببۆوە کە خۆتێوەردانی ڕاستەوخۆی فەرمانڕەوایانی مەشهەد لە گۆڕێ‌دا نیە و هەرکەس چۆنی مەیل لێبێ ئاوا دەتوانێ کەلک لە هێزەکانی تایفەی بەختیاری و شەپۆلی هەستی گشتی بۆ لاگیری لە خانەدانی سەفەوی وەربگرێ و لە ڕۆژاوای ئێران‌دا هەلەکان بقۆزێتەوە.

یەکەم هەوڵەکانی عەلیمەردانخان لە بەهاری ساڵی ١٧٥٠دا بە شێوەیەکی ئاشکرا شکستی هێنا: پۆلێکی بەهێزی چەکدارانی سەربازگەی ئیسفەهان لە دەوروبەری موورچەخورت ڕێیان پێگرت و نەیانهێشت بێتە نێو شار و بەرەو گوڵپایەگان ڕاویان نا. بەناچار گورمی بەستە لایەکی دیکە و بۆ ماوەیەکی کەم شاری «گەز»ی(٢٦) داگیر کرد کە تەنیا هەژدە کیلۆمیترێکی لەگەڵ باکووری ئیسفەهان مەودا هەیە و پەلاماری «جولفا»ی دا، بەڵام پارێزەرانی ئیسفەهان و سەربازگەی وێ زۆر لەوە بەهێزتر بوون کە تەنانەت لێی‌گەڕێن گەمارۆی شار بدا[٢٦] بۆیە چەند نوێنەرێکی نارده لای ڕقەبەرانی لە ناوچەدا، وەک کەریمخان و زەکەریاخان و داوای لێکردن کە ڕێگا خۆش بکەن بۆ پێکهێنانی یەکێتییەک لە نێوان خۆی و ئەوان‌دا. بە هاتن و ڕێککەوتنیان هێزەکەی گەیشتە بیست‌هەزارکەس. قۆشەنی باس‌کراو لە کۆتایی مانگی مەی‌دا بەرەو دەشتی

---

٢٥- موجمەلوتتەواریخ، ل ١٧٠، ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤٨، نابێ عەلیمەردانخانی بەختیاریمان لەگەڵ عەلیمەردانخانی فەیلی، حاکمی لوڕستان(٢٥) کە لە ساڵی ١٧٢٢دا لە شەڕی گڵۆن‌ئاباد بەشدار بوو، لێ‌تێکچێ. بڕواننە:

Lockhart, safavi Dynasty, 130 – 134.

26- Bazin, 68 – 70 ; Olivier VI, 25 – 26.

کەرێزە[27] لە لای ڕۆژهەڵاتی ئیسفەهان کشا تا پەلاماری سپای ئیسفەهان بدا، ئەم لەشکرانە هێزێکی سامناک بوون کە لانیکەم پازدەهەزار پیاوی شەڕکەریان لە خۆ دەگرت. ئەو فەرماندە بەجەرگانەی کە لانیکەم دەکەسیان خاوەن پلە و پایەی حکوومەتی زەمانی ئەفشار و پێشتر لە خزمەت نادرشادا ئەرکدار بوون، سەرکردایەتی ئەم هێزەیان دەکرد. ئەم فەرماندانە دەستێکیان لە کوژرانی نادردا هەبوو و سەرەنجام بە دووروویی دواتریشیان لە دیاری کردنی چارەنووسی عادلشا و برایمپاشادا دەورێکیان گێڕابوو.

هەڵمەتی لوڕان و بەختیارییەکان بوو بە هۆی تێکشکانی هێزە نێردراوەکانی ئیسفەهان و پاشەکشەیان بەرەو شار. سەلیمخانی قۆرقلوو و ڕەنگە چەند کەس لە فەرماندەرەکانی پێشووی برایممیرزا و هێندێک لە پیاوەکانیان بۆ پەنا بردنە قەلایەکی بەردەستی لە نیزیک قەزوێن تاویان دا[28]. دوای ئەوە ئیسفەهان بۆ ماوەی چەند ڕۆژان دەورەدرا و تۆپباران کرا؛ ئەم هێرشە بە ڕادەیەک ورەی پارێزەرانی هێنایە خوار کە ئێزنیان دا شار بە هرووژمی هێرشبکەران بکەوێتە ژێر چەپۆکیان. عەلیمەردانخان دەروازەی گەورەی شاری گرت و کەریمخان بە پەڕینەوە لە پردی خواجوو لە ناوچەی جولفا دابەزی.[29] بەگوێرەی گێڕانەوەی «بازین» خائینان و لەبنەوەبڕانی بەختیاری دەروازەکانی شاریان کردەوە و لە ڕۆژی سیویەکەمی مانگی مەی ساڵی ١٧٥٠دا ئیسفەهان گیرا و خۆی دا بە دەستەوە[30].

---

٢٧ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ١٢ ـ ١٣، نووسیویەتی قێهیز. موجمەلوتتەواریخ لە ل ١٧٠ ـ ١٧١دا «کەرێز»ی نووسیوە. ڕەنگە ئێرە کەهریزجان بێ کە کەوتۆتە ٧٥ کیلۆمیتری ڕۆژاوای ئیسفەهان (فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی ١٠ ل ١٥٠) کەرێزەیەکی دیکەش لە ٤٠ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای جولفایە.

٢٨ ـ گیتیگوشا، ل ١٨؛ تاریخی بەختیاری، ل ٤٧٧.

٢٩ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٧٠ ـ ١٧٢.

30- Bazin, 70 ; Grimood, 345 – 346. GD VI, 10 September 1750.

نامەیەک لە ڕێزدار گریووز نوێنەری کۆمپانیا وەبەرچاو دێ کە لەو زەمانیدا هەڵاتۆتە یەزد و لە ٢٥ی مانگی مەیدا ئاوای تێدا نووسیوە: یاغییەکانی بەختیاری توجارەتخانەیان تاڵان کرد.

ئەبولفەتحخان و سەرکردەکانی دیکەی بەختیاری بۆ پاراستنی ئەرگ (قەلاچکە)ی شار ئامادە بوون. بەلام عەلیمەردانخان پێشنیارێکی چاکی هێنا گۆڕ و گوتی ئەگەر هاوکاری بکەن هێندەی پێناچێ کە بەشدار بوونیان لەگەڵ دەسەلاتداری تازە لە کاروباری حکوومەتا وەکردەوە دەگێڕێ [٣١].

## ١ ـ ٦ پەیمانی سێقۆڵی

ئەگەرچی عەلیمەردانخان بە خۆی و هێزە شەڕکەرەکانییەوە شاری بە دەستەوە بوو، بەلام بە ڕوونی بۆی دەرکەوت کە ناتوانێ بێ هاوکاری و یاریدەی شانبەشانی ئەبولفەتحخان ئومێدی بە ڕاگیرکردنی درێژخایەنی ئەوێ هەبێ. وێدەچی ئەبولفەتحخان لە لایەن تاقمەکانی لایەنگری حکوومەتی سەفەوی و لاگیرانی شاروخەوە کە لە سەریەک زۆرینەیەکی تەواویان پێکدێنا، پشتیوانی لێوەکرابێ. لە نێو ئەو تایفە یەکگرتووانەی کە عەلیمەردانخان بە یارمەتی ئەوان ئاواتی وەدەس هێنانی پاشماوەی ڕۆژاوای ئێرانی لە دلا بوو، ئەگەرچی کەریمخان خاوەنی مێژینەیەکی نادیار بوو، بەلام سەروگەردنێک لەوانی تر سەرتر بوو. ئەم سێکەسە هەر لە سەرەتاوە دەستەیەکیان ساز کرد کە بڕوا و متمانە پێککردن لە چۆنیەتی پەیوەندی و پلە و پایەیاندا دەکەوتە پلەی دووهەمی گرینگایەتی.

یەکەم کاریان دەبووا دۆزینەوەی پاشایەکی گوێلەمستی خانەدانی سەفەوی بووبا، هەتا توانیبایان بە هۆی ئەوەوە ڕەوایەتی یاسایی بدەنە دەسەلاتی خۆیان. دوو یان وێدەچێ سێکەس لە شازادەکانی ئەم بنەماڵەیە هێشتاش لە ئیسفەهان مابوون. ئەمانە کوڕانی یەکێک لە کاربەدەستانی بالای بارگای پاشا بە ناوی مورتەزا و کچەزای شاسولتانحوسێن ئاخرین فەرمانڕەوای سەفەوی بوون. لاوتر یان لاوترینیان کوڕێکی حەڤدە ساڵە بوو بە ناوی ئەبووتوراب(٢٧) کە وەک لێوەشاوەترین پالاوتەی پاشایەتی هەلبژێردرا. بە بڕوای عەلیمەردانخان، ئەبووتوراب هێمن و دوورەپەرێزترینی شازادەکان بوو کە سەرەڕای داد و هاوار و گریانی دایکی لە ڕۆژی ١٢ی ژووەندا بە مەبەستی

---

٣١ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٤ ـ ١٥؛ Bazin, 70.

ڕاکێشانی سەرنجی زۆربەی جەماوەر سەرەتا بە ناوی شاسمایلی دووهەم[٣٢] حکوومەتەکەی ڕاگەیاندرا. پێکەوە هەڵسەنگاندنی ئەو لەگەڵ باپیرەگەورەی هاوتاوی واتە شاسمایل، وای کردبوو کە خەڵکی دیکەش وەک گریوز نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی، ئاوای بنرخێنن: « شتێکی وا نیە جگە لە ناوێکی گومانلێکراو کە عەلیمەردانخان بە مەبەستی برەوی زیاتری حکوومەتی دیکتاتۆرانەی خۆی کایەی پێدەکا.» بەختیارییەکان لە ماوەی چەند حەوتوو دوای گیرانی ئیسفەهان، ئەوێیان گیرۆدەی ترس و تۆقین کردبوو. نە تەنیا کۆمپانیای ئابڕووداری هیندی ڕۆژهەڵاتی، بەڵکوو شاندە ئایینییەکانی ژێزووئیت، ئاگۆستینین و کاپووچی بە شوو لێهەڵکێشانی شڵەژاوانە و کردەوەی مزگەوتیان تووشی گرفتاری و سەرێشە هاتن کە ناچاربوون لە شار ڕابکەن. بازین کە لەم ڕۆژانەدا لای ژێزووئیتەکان بووە، ناچارە کرا کە دوو شەمدانی زێو ئەمیری پارە بداتە وان. ڕێبەری ژێزووئیتەکان کە پیاوێکی پیر و پەککەوتە بوو، حەوتەیەک دواتر کە بە مەبەستی داڕووتاندنی زیاتر فەلاقە کرا، مرد[٣٣]. عەلیمەردانخان تەنیا بە چلپاندنی داهاتەکانی ئاسایی ڕانەدەوەستا و حوکمی محکردە سەر تەواوی بازرگان و دەوڵەمەندان. کارگێڕانی کۆمپانیاکە وەزیری تازە دامەزراوی شار بە ناوی زەکەریاخان(٢٨) بە مەرجێک ئیزنی چوونە دەرەوەی مەیدان کە ٥٧٠ تمەنی بەرتیل بدەنێ، بەدزی بەرەو یەزد خوشین[٣٤]. لە بارودۆخێکی ئاوا تێکەولێکەدا، لە ٢٩ی ژوومەنی ١٧٥٠دا، لە ڕۆژێکی پیرۆزدا کە

٣٢ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٦؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٧٦ و GD VI , 10 September. بازین لە ل ٧١ ـ ٧٢دا ئەبووتوراب بە لاوترینی ئەم سێکەسە دەزانێ، گریووز ئەو بە دووهەمین کەس لە کەسانی گومڕەچەلاک دەزانێ. تۆلیویە لە بەشی ٦، ل ٢١ ـ ٢٢، بە یەکێک لە دوو کوڕەکانی میرزا مورتەزای دەزانێ. مەرعەشی لە ل ٨٣ی مەجمەعوتتەواریخدا باسی ئەحمەدمیرزای برای هێناوەتە گۆڕ و دەڵێ تەنیا ئەم دووە کوڕانی میرزا مورتەزا بوون. بازین ئەمەنیشی نووسیوە. گریووز بە ئاشکرا دەڵێ کە شای تازەی چوارمانگ پێشتر لە شوێنی کۆمپانیا دیتووە. سەرچاوەکانی ئێرانی زۆربەیان پێی دەڵێن شاسمایلی دووهەم و شایەک بەم ناوە کە لە مابەینی ساڵانی ١٥٧٦ ـ ١٥٧٧ لە ئێران حکوومەتی کردووە، وەبەرچاو ناهێنن.

33- Grimood , 356 – 359.

٣٤ـ GD VI , 10 September 1750. و مونتەزەمی ناسری، ل ١٧٢.

سەرئەستێرەناس بۆ تاج لە سەرنان بە مەبارەکی دانابوو، شاسمایلی سێهەم تانجی پاشایەتی ئێرانی کردە سەری[٣٥].

خوایینەخوایی عەلیمەردانخان پلەی «وەکیلوددەولـە»ی بە خۆی تایبەت دابوو، هەروەها ئاشکراشی کرد کە بە شوێن پلە و پایەیەکی چەشنی «ئەتابەک» (مەزنە وەزیر)یەوەیە و دەبێ جێنشینیمیری بێ بۆ شای لاو. کەریمخان وێڕای خەڵات کران، بوو بە حاکمی لوڕستان و سەرکردەی هێزەکانی ئیسفەهان و ڕاسپێردرا کە درێژە بە هێنانە بەرباری وڵات بدا. ئەبولفەتحخان کرا بە حاکمی پایتەخت تا ویستی لایەنگرانی دابین بێ، بەڵام هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو. خاڵی پڕمەترسی لە ڕوانگەی چوارچێوەی چالاکی و دەسەڵاتی عەلیمەردانخانەوە، ناکۆک بوونی بوو لەگەڵ هاوپەیمانی بەهێزی زەندی. ئەگەرچی دوای هەڵبژێرانی کەریمخان ناچار بوو کە زۆربەی سپاکەی بخاتە بەردەستی ئەو، بەڵام وریا بوو کە ئەگەر ناشتوانێ هەموو هێزەکەی لای خۆی گل داتەوە، لانیکەم سوارانی تایبەتی بەختیاری بە مەبەستی ڕاپەڕاندنی ئامانجە تایبەتییەکانی خۆی بپارێزێ. کەریمخانیش لە بەرامبەردا سۆزی دابوو کە خانی بەختیاری دەبێ کارەکەی تایبەت بە ناوەند بێ و پایتەخت جێنەهێڵێ. هەروەها زۆری پێخۆش بوو کە ئەبولفەتحخان وەک یەکێک لە ئەندامانی سێقۆڵی بەڕێوەبردنی حکوومەت لە سەر کار ڕابگرێ هەتا پارسەنگێک بە زەرەدی عەلیمەردانخان لە نێو تایفەی بەختیاریدا بەدیبێنێ.

پەیمانی سێقۆڵی بە سوێندخواردنی وەفاداری ڕەوایەتی پێدرا و سۆزیان دا کە بەبێ ڕاوێژی یەکتر لە کاروباری حکوومەتا هیچ کارێک نەکەن. ئەم دابەشینی دەسەڵاتە خودبەخود کەش و هەوایەکی نابەدڵی بۆ دووکەس لە هاوپەیمانان بەدی هێنا[٣٦] و خێرایەکی دۆخی ئەم دوو هاوپەیمانەش ڕوون بۆوە.

## ١ ـ ٧ هێرش بۆ سەر هەمەدان و کرماشان و کوردستان

لە سەرەتاوە ویست و گەلاڵەی کەریمخان بۆ گرتنی هەرێمەکان ئەمە

٣٥ـ GD VI , 10 September 1750. ئەم مێژووە (١٨ی ژووەن، بە ڕۆژمێری کۆن) دەبێتە ٢٥ی ڕەجەبی ساڵی ١١٦٣ی کۆچی.

٣٦ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ١٥ ـ ١٦؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٧٢ ـ ١٨٠.

بوو تا مێهرعەلیخان و حاکمی ئەردەڵان کە کۆنەدوژمنی بوون بگرێتە ژێر ڕکێفی خۆی. ئەگەر سەرکەوتنێکی ئاوای وەچنگ هێنابا دەیتوانی کە فارس و هەرێمەکانی دراوسێی و سەرەنجام خوراسانیش بخاتە سەر حکوومەتی تازە[٣٧]. وا ڕێککەوت کە بە قازانجی هەردووکیان بڕایەوە؛ عەلیمەردانخان بە تەنیا بۆ هێنانە ژێرڕکێفی زێد و نیشتمانی مایەوە و سەرکردەی زەندیش بێگومان لێی سوور بوو چونکە بەشی هەرەزۆری سپای بە دەستەوەیە، ئاخرییەکەی دەتوانێ بەشی باکووری ئێراقی عەجەم کە هەمیشە بە مەبەستی باڵادەستی تیرەی زەند لەبەر چاوی بوو، بگیرێ و ئەو کات بە هەلومەرجێکی گەلێک لەبار و بەهێزتر لە پێشوو کە ئیسفەهانی جێهێشت، بگەڕێتەوە ئەو شارە.

چل ڕۆژێک پاش گیرانی ئیسفەهان[٣٨] کەریمخان بەرەو هەمەدان وەڕێکەوت. عەلیمەردانخان لەڕێوە دەستی کرد بە هەڵمەت و پەلامار بۆ سەر شارەکانی دەوروبەری ئیسفەهان هەتا تەواو جێپێی خۆی قایم کا، لە دووهەمی جوولایدا بەرەو باشوور بزووت(٢٩) هەتا شاری قومشە کە ئێستا پێی دەگوتری شارەزا، داگیر بکا، دوو حەوتە دواتر بێ سەرکەوتن گەڕایەوە[٣٩].

لەم ڕۆژانەدا مێهرعەلیخانی تەکلوو کە بە حوکمی شاروخمیرزا کرابوو بە حاکمی هەمەدان و نیزیکەی شەشحەوتهەزار پیاوی شەڕکەر و چەند تۆپێکی بەدەستەوە بوو، بۆ جاری سێهەم و ئاخرین کەڕەت لە مەیدانی شەڕا بەرەوڕووی خانی زەند بۆوە. بەڵام زۆر پیس شکا و گەلێک چەک و جبەخانە و بەشێکی بەرفرەوانی ناوچەکانی لە دەس دا و سەرەنجام ناوەندی حکوومەتەکەشی گیرا و کەوتە دەس کەریمخان[٤٠]. بە گرتنی ئەم شارە کەریمخان لە باکوورەوە دەستی گەیشتە قەزوین و تاران و لە باشوورەوە کرماشان و توانی گەشە بە دەسەڵاتی

---

٣٧ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٧٢ و ١٨٠.

٣٨ ـ موجمەلوتتەواریخ لە ل ١٧٢دا دەنووسێ: چل ڕۆژ دوای گیرانی ئیسفەهان بووە. ئەم ژمارەیە وەک هەمیشە جێی گومانە، بەڵام ڕەنگە تەواو هاوکات لەگەڵ ١٠ی جوولا، یانی ڕۆژێک بەر لە هێرشی عەلیمەردانخان بۆ سەر قومشە بووبێ.

39- G D Loc. Cit. ( 30 June Old style).

٤٠ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ١٦ ـ ١٧، ناوی سەرکردەی تەکلووی بە محەممەدعەلیخان نووسیوە.

بدا، بەڵام دیسانیش نەیدەتوانی تەواوی قەڵا سەختەکانی ئەم ناوچە بگرێ[41].

وەختایەک کەریمخان لە دەرەوەی شاری کرماشان دابەزیبوو، پۆلێک لە سەرۆکانی تیرەی کەڵهوڕ کە هاڕوونئاوا(٣٠) بنە و بارەگایان بوو، هاتبوونە لای هەتا ئەوپەڕی ڕێز و ملکەچی خۆیان دەربڕن. ڕووداونووسی گەنجی ئێمە، ئەبولحەسەنی گوڵستانەش کە زاوای میرزا محەممەدتەقیخان بوو، لە نێو ئەم پۆلەدا وەبەرچاو دەهات. ئەگەرچی خانی زەند ناوبراوی بەگەرمی وەرگرت، بەڵام نیزیک ماوەی مانگێک، یانی تەواوی ئەو بەینەی کە لە قەڵای کرماشان وتووێژیان لەگەڵ مامی دەکرد، لەنێو هۆردووی خۆیدا ڕایگرت. میرزا محەممەدتەقی بۆ درێژەی وتووێژەکان حازر نەبوو لە قەڵا دەرکەوێ. دەیەویست کە وێڕای ڕێز و لە سەرەخۆیی، وەختەکە بکوژێ. ئاکامی وتووێژەکان بە ناردنی چوار ئەسپی جوانی پێشکێشی بۆ کەریمخان بە باشی کۆتایی پێهات، چونکە سەرداری طەند ناچار بوو بە وەرگرتنی ئەم دیارییانە پێش بە قەومانی شەڕ بگرێ هەتا بتوانێ بەر لە هاتنی وەرزی زستان بە مەبەستی چوونە کوردستان و ئەو لەشکرکێشییە گەورەوگرانەی لە پێشی دابوو، لەم هەرێمە دەرکەوێ. گوڵستانەی گەنجی وەک بارمتە گل دایەوە و بردی، بەڵام مانگێک دواتر، وەختایەک کەریمخان تەنیا ڕۆژەڕێیەکی تا سنە مابوو، بە بیانووی هێنانی هێزی پشتیوان و گەیاندنی ڕاسپاردەی کەریمخان بە مورتەزاقولیخانی زەنگەنە لە کرماشان بە مەبەستی ناردنی بەشە چەکداری سەرشانی، خۆی لە هۆردووبەزی خان ڕزگار کرد. ئەو کات خانی زەند تەمایان گرت بۆ ئارام کردنەوەی مەڵبەندی سەرسنووری گیلانی ڕۆژاوا، بەرەو ئەوێ بکەونەڕێ[42].

---

٤١ـ موجمەلوتتەواریخ لە ل ١٧٥ و ١٧٧دا دەنووسێ: لە ماوەی ئەم هێرشەدا کەریمخان لەگەڵ شەڕی پارتیزانی کچی حاجی توغیانی فەراهانی بەرەوڕوو ببوو. حاجی توغیان لە مەڵبەندی فەراهان دەژیا، سەری وەبەر کەریمخان نەهێنا و گازی کرد بۆ شەڕی دەستەویەخە گوتی با بۆم بێتە مەیدانێ، کەریمخان تەمای گرت ئەم پێشنیارە قەبووڵ نەکا، چونکە لە شەڕ و شکاندنی ژنێکدا، شانازییەک وەدەس نەدەهات و ئەگەر شکستی هێنابا دەبوو بە هۆی شەرمەزاری؛ بۆیە گەڕاوە کرماشان و کچەی بۆ بەرەوەر بوون لە سەربەخۆیی واز لێهێنا. موجمەلوتتەواریخ، ل ١٧٦ ـ ١٧٧؛ دێهگان، ل ٦٧ ـ ٦٨.

٤٢ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٧٧ ـ ١٧٩.

لە وەختی کوژرانی نادرشادا، حاکمی ئەردەڵان، پیاوێکی بەڕێوجێ بوو بە ناوی سوبحانوێردیخانی مامۆیی(٣١). ناوبراو لە ساڵی ١١٤٣ی کۆچی / ٣٠ ـ ١٧٢٩ڕا خاوەنی ئەم پلەیە بوو و تەنیا لە سێ قۆناخی کەمخایەندا حکوومەت درایە دەس ئەحمەدخانی کوڕی. ئاخرییەکەی ئەحمەدخان وەبەر غەزەب و توورەیی پاشای ئەفشار کەوت و لەبەر دابەشینی گەنمی نێو عەمباری سپای نادری بە سەر خەڵکی کوردستانا کە بۆ ماوەی سێساڵان تووشی قاتی و قڕی هاتبوون، ناچار بوو لە شوێنی حکوومەتەکەی ڕابکا. سوبحانوێردیخان کە پاش هەڵاتنی کوڕەکەی بۆ ئاخرین جار کرایەوە حاکمی کوردستان، کەوتە ژێر تەوژمی فەرماندەی خۆبینی سەربازگەی سنە و هەزارکەسێک لە چەکدارانی ئەفغانی و سوارانی کوردی. لە ترسی تۆڵەی نادرشا، ناچار بوو کە ئەم هەلومەرجە بە ڕوویخۆشەوە قبووڵ بکا و تەنانەت لە بەرامبەر هۆزە تۆراو و بێزراوەکان لە سیستمی حکوومەتی نادریش، پشتیوانی لە چەکدارانی سەربازگە بکا. دوای سێ ساڵ کە هەواڵی ڕووخانی حکوومەتی زاڵمانەی نادری بلاو بۆوە، سوبحانوێردیخان وێڕای کەیف سازبوون بەم ڕووداوە، گەلێکی دیاری ماڵاوایی بە سەر سپای ناخۆشەویست و بێزراوی سەربازگەی شارا دابەشی و ئامۆژگاری کردن کە هەر ئەو شەوە، بەر لەوەی خەڵکی ناوچەکان بەو خەبەرانە بزانن، بگەڕێنەوە ماڵی خۆیان. ڕێگرتن لە کوردانی توورەی هەڵچوو کە بە مەبەستی ڕاکردنەکەیانیان زانیبوو و دەیانەویست بکەونە شوێنیان کارێکی ئاستەم بوو. ئەم حاکمە ئاقڵمەند و لەسەرەخۆیە شەش مانگ دواتر لە ساڵی ١٧٤٧دا کۆچی دوایی کرد و عادڵشا و حەسەنعەلیخانی خزمەت خۆی لە جێی دانا[٤٣].

حاکمی تازە ئەگەرچی بەڕواڵەت پیاوێکی لێوەشاوە و سەرکردەیەکی مناسب بوو، بەڵام لەوێ لایەنگرێکی وای نەبوو و نەیتوانی خێرا وەک حاکمی پێشوو سەرنج و خۆشەویستی گشتی بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. وەختایەکی حەسەنعەلیخان بە مەبەستی تێکهەڵچوون لەگەڵ زەندان کوردستانی

43- Nikitine, ((Les Valis d Ardelan)) 87 – 89 ; Rabino , Kurdistan 82.
ئەمینزەکیبەگ لە کتێبی کورد و کوردستان، ل ٢٣٠دا؛ گوڵستانە لە موجمەلوتتەواریخ، ل ١٦٧ – ١٦٨دا دەنووسێ: حەسەنعەلیخان کە بە دەس سوبحانوێردیخان دەرکرابوو، ئەم هەلەی قۆزتۆتەوە. (پەراوێزی ژمارە ٤٥).

بەجێهێشت، حاکمی دراوسێی لە کوردستانی عوسمانیدا بە ناوی سەلیمپاشا بە دەستی سلێمانپاشای ئامۆزای و یارمەتی سەلیمپاشای هاوناوی لە بەغدا، دەرپەڕێندرا و ناچار کرا کە لەگەڵ پۆلێک لە لایەنگرانی پەنا بێنێتە بەر قەڵەمڕەوی ئەردەڵان(٣٢). ئەو لێرە دژبەران و ناحەزانی حەسەنعەلیخانی لێکۆبۆوە و وای لێهات شان بداتە بەر رووخاندنی دەسەڵاتی سنە[44]. لەبەر پەلاماری پارتیزانانەی هێزەکانی زەند، تاقمێک لە چەکدارانی تری حەسەنعەلیخان رایانکرد و ناچار بوو کە بە پرتاو بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ سەلیمپاشا کە هێشتا خەریکی کۆکردنەوەی هێزی پشتیوان بوو، بەرەو سنە باژوێ. ئاشکرانیە کە داخوا هەر لە دەسپێکی کارەوە سەرکەوتووە یان وەک گولستانە باس دەکا لەپێشا بەتوندی شکستی هێنا و بەرەو کوێستانان ڕەوی و پاشان وەختایەکی لایەنگرانی خێڵەکی سەلیمپاشا لەبەر وەرزی بانەمەڕ هێزیان لەبەردا نەمابوو و ناوبراویش لە ترسی ئامۆزا و جێنشینەکەی واتە سلێمانپاشا و بێپشتیوانی لە ناوچەکانی دیکەدا بەرەو ئازادخان کە لە ئازەربایجان دەژیا، کەوتەڕێ. وێدەچێ لەم کاتەدا حەسەنعەلیخان گەڕابێتەوە سنە و سەرلەنوێ جڵەوی حکوومەتی بە دەستەوە گرتبێتەوە[45].

هێشتا حەسەنعەلیخان تەواو لە سنە دانەمەزرابوو کە سپای کەریمخان لە نیزیک ئەم شارە هەڵقولی. لەبەرەوەی دەیزانی لە قەڵەمڕەوی حکوومەتەکەیدا توانای بەربەرەکانی نیە، وای بەباش زانی کە لە ناوەندی

44- Longrigg , 178 – 179 ; Zaki. Solaymania. 73 – 75.

٤٥- موجمەلوتتەواریخ، ل ١٦٦ ـ ١٦٨. گولستانە ئاشکرای دەکا کە کاتی راکردنی سەلیمپاشا، خانەکانی ئەردەڵان، داوایان لە سوبحانوێردیخان کرد کە لە ئیسفەهان چاوەڕوانی رۆژێکی وابوو، بێتەوە و سەرلەنوێ جڵەوی حکومەت بە دەستەوە بگرێ. ناوبراو قبوولی کرد و جوولا، بەڵام چی وای پێنەچوو کە مرد و خوسرەوخانی نەوەی لە جێی دانیشت و لە زەمانی پەلاماری کەریمخاندا، ئەو حاکمی کوردستان بوو. ئەم وتەیە لە ڕوانگەی رابینۆ و نیکیتینەوە ناڕاستە، چونکە سوبحانوێردیخان زۆر بەر لەم مێژووە مردووە و خوسرەوخانیش قەت هەتا ساڵی ١٧٥٤ نەبوو بە حاکم. نامیش لە تاریخی گیتیگوشادا بە ڕوونی دەڵێ کە کاتی هرووژمی هێزەکانی زەند بۆ سەر کوردستان، حەسەنعەلیخان دەسەڵاتداری سنە بووە.

پارێزگا چۆن چاکە ئاوا میوانداری کەریمخان بکا. کەریمخان کە مەیلی لە تەسالحە نەبوو، فەرمانی دا کە هێزەکانی پەلاماری سنە بدەن و تالانی کەن. لە ئاکامدا ئەم شارەیان ئاگردا و بەشی زۆری دەوروبەرەکەیان خاپوور کرد[٤٦]. والی (حاکم) پەنای بردە بەر قەلای قەراتۆرێ(٣٣). شێخالیخان بەر لەوەی چەند رۆژ دواتر شەرکەرانی زەند کوردستان جێبێلن، لەخۆوە گەمارۆی قەراتۆرێی دا[٤٧].

ئێستا هاوکات بوو لەگەل مانگی ئۆکتۆبر یان نوامبری سالی ١٧٥٠[٤٨].

کەریمخان لە وەرزی زستانا گەرایەوە زێدی خۆی مەلایر هەتا سەر بە تیرە و تایفەکانی قەرەگوێزلوو و خودابەندەلووی دەرە و دەشتی لای هەمەدان نەوی کا و پۆلە سەربازی تازەپشوویان لێبستێنێ. لەم کاتانەدا لێکدالێکدا لە سەرچاوەی باوەرپێکراورا خەبەری وای بۆدەهات کە نیشانیان دەدا عەلیمەردانخان پەیمانی مابەینیانی شکاندووە. بۆیە ناچار بوو دەستی خۆی رەپێش خا هەتا پلەی بەرزەوەبوویان بپارێزێ. سەرکردەکانی کۆکردەوە و وێرای دەرخستن و رێزگرتنی کۆمەلێک شالاو و پرکێشی و پەیمانشکێنی

---

٤٦ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٧٩ ـ ١٨٠؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٧.

٤٧ـ Nikitine, op.Cit, 90 ; Rabino, op. Cit, 82. گوندی قەراتۆرێ کەوتۆتە سەدکیلۆمیتری باکووری سنە؛ بروانە: بەرگی پێنجەمی فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، ل ٣١٧ و نەخشەکانی.

٤٨ ـ رێکەوتی ئەم هێرش و پەلامارانە ـ بە گوتەی رابینۆ سالی ١١٦٨ی کۆچی / ١٧٥٠ ـ ١٧٥١ی زایینی ـ تەنیا وەختایەک دەتوانێ راستبێ کە مانگی دێسامبری ١٧٥٠ی زایینی، بەرامبەر بووبێ لەگەل محەرەمی سالی ١١٦٤ی کۆچی. مێژووی بەرباس. بە سەرنجدان بە یادداشتی ژمارە ٦٢ی گێمبروون سەرەتای ژانوییەی سالی دوایی بە رێکەوتی گەرانەوەی کەریمخان بۆ ئیسفەهان دادەنێ، ئەم مەبەستە وێناچێ وابێ. رووداونووسینەکانی ئەم چاخە تایبەتە لە موجمەلوتتەواریخ و گیتیگوشای زەندیەدا هێندە ورد وەبەرچاو نەگیراون و بوونە هۆی هەلەی مێژوونووسانی دواییش. فەسایی هێرش و لەشکرکێشی عەلیمەردانخان بۆ سەر فارس بە بەهاری سالی ١١٦٥ی کۆچی، بەرامبەر بە سالی ١٧٥٢ دەزانێ، یانی ١٨ مانگ درەنگتر لەوەی لە یادداشتەکانی گێمبروونا نووسراوە. ئەو مێژووەی کە هاتۆتە گۆر لە سەر بنەمای گۆترە و بۆچوون و لە رووی یادداشتەکانی گێمبروونەوە داندراون.

عەلیمەردانخان، پێیسەلماندن کە هەرچی زووە دەبێ بەرەو ئیسفەهان بزوون[٤٩].

لەو کاتەوە کەریمخان ئیسفەهانی جێهێشتبوو عەلیمەردانخان زوڵم و زۆرداری و ملهوڕی دووهێندە بەرز کردبۆوە و خەڵکی جولفا تاڵ و ناخۆشیان رادەبوارد؛ چونکە ناوبراو بە هەموو چەشنێک دوولکی دەخستە سەرملی خەڵک و ماڵی بە تالان دەبردن[٥٠]. وەک سەرچاوەکانی ئەرمەنی گێڕاویانەتەوە، عەلیمەردانخان لەبەر کار و خزمەتەکانی کەریمخان جولفای پێبەخشیبوو و ئەویش کارگێڕ و پارێزەری لێدانابوون کە عەلیمەردانخان بەر لە پەلامار و تالانی شار ئەوانی دەسبەسەر کردبوو[٥١].

ئەوەی روون و ماناداترخۆی نواند ئەمە بوو کە حەسەنعەلیخان، ئەبولفەتحخانی کۆنەڕەقیبی لێخست و کوێری کرد و پاشان کوشتی(٣٤). بەم شێوەیە ئاخرین بەرهەڵستی حکوومەتی دیکتاتۆرانەی خۆی لە ئیسفەهان لە سەر رێ لابرد و حاجیباباخانی مامی لە جێی دانا. سەرەنجام پاش ئەوەی سوێند و پەیمانی خۆی شکاند، سەربەخۆ بەرەو شیراز ئاژاوتی و پارێزگای فارسی گیرۆدەی راووڕووت و تالان کرد[٥٢].

## ١ ـ ٨ فارس لە سەردەمی مەرگی نادرەوە بەرەو دوا

فارس و ناوەندەکەی کە لە ماوەی راپەڕینی لەزەبری تەقیخانی شیرازی(٣٥) لە ساڵی ١٧٤٤ی زایینییەوە، کەوتبووە بەر کۆمەڵێک پەلامار و شالاوی قورس و گرانی نادرشای ئەفشار[٥٣]، دوای نەمانی نادر گێرە و کێشە و

٤٩ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٠؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٨.

50- GD VI, 25 August 1750; Olivier VI, 39.

51- Hovhanyants, 281.

٥٢ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٨؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٠.

٥٣ـ see Lockhart, Nadir shah, 242. ڕووداوەکانی ئەم بەشە پتر پوختەی بابەتەکانی رۆژنامەی «کەلانتەر»ە، ل ٤١ ـ ٤٥؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠١ ـ ٢٠٧. (Brieven 2685 (1751), 37 - 38) تاریخی بەختیاری ل ٤٧٥.

شڵەژانی زیاتر باڵیان بە سەر کێشا. میرزامحەممەد(٣٦) کەلانتەر (شارەوان)ی داهاتووی فارس لە نامیلکەی بیرەوەرییەکانی‌دا کە بنچینەی نووسراوەکانی فارس‌نامەی فەسایی‌یە، قامکی لە سەر زۆربەی ئەم ڕووداو و گیروگرفتانە داناوە. لەو وەختەدا کە هەواڵی مەرگی نادر بڵاو ببۆوە و هەلپەرەستانی چاوچنۆک بۆ پێشکەوتی کاری خۆیان بە داشکاندنەوە و لێدانی خەڵک دەیانویست ڕێ خۆش بکەن، میرزامحەممەد لە شیراز نەبووە و بۆ کۆکردنەوەی پیتاک لەگەڵ هەزارسوارێکی حکوومەتی ڕووی کردبووە ناوچەکانی دەوروبەری شار. محەممەدخانی شاترباشی سەرکردەی نادر لە شیراز لەگەڵ محەممەدعەلی‌بەگی حاکمی لار پیلانێکیان بۆ ساحێب‌ئیختیار (خاوەن دەسەڵات)ی فارس داڕشت کە بیکوژن. دەسەڵاتدار مامی دایکی میرزامحەممەد بوو. میرزا محەممەدحوسێن بە یارمەتی هاوڕێیانی دەستیان بە سەر خەزێنە داگرت. بەڵام ئەوان لە بابەت وەدەس‌هێنانی پشتیوانێتی چاوەڕوان‌کراو لە تاقمەکانی ئەفغان و ئۆزبەک کە گوێ‌ڕایەڵی محەممەدڕەزابەگی قەرەچۆرلووی سەرکردەیان بوون، شکستیان هێنا. چونکە ئەوان بێ‌لایەن نەمانەوە و محەممەدڕەزابەگ دوای گەڕانەوەی میرزا محەممەد هێزی دیکەی هاتەبەر و ئەم دوو سەربزێوەیان خەپ کرد و کوشتیانن. پاشان دارایی خەزێنەیان لە مابەینی چەکدارانی ئێرانی و ئەفغان و ئۆزبەکا دابەش کرد هەتا بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان.

ماوەیەک دواتر عادڵشا لەبەر هەڵلاوبگری سەربەستی‌خوازانەی شیرازییەکان بە ڕێبەرایەتی سەرکردەکانیان، لێیان بە ڕقداچوو و ساڵەخانی بەیاتی وەک سەرۆکی فارس ناردەوە.[٥٤] ساڵەخان زیرەکانە سەنگ و سەنگبایی گشتی ساحێب‌ئیختیار و برازاکەی هاتە دەست و خێرایەکی خۆی لەگەڵ داخوازەکانی ڕێکخستن و لەگەڵ داروودەستەی نادری دژایەتی نواند. مانگی داهاتوو کە میرزا ئەبولحەسەنی شیرازی(٣٧) کاربەدەستی هەڵبژێراوی عادڵشا،

٥٤- GD VI, 12 February, 2 March 1784. ساڵەخان وەک یەکێک لە سەرۆک تایفەکانی خوراسان بانگهێشتنی قوروڵتا (ئەنجومەنی پیران)ی نادر کرابوو لە دەشتی موغان و ئەم ڕووداوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٣٦. بڕواننە: دێهگان، ل ٥٤؛ میرزامحەممەدی کەلانتەر چووبوو بۆ وێ. کە وایە ڕەنگە ئەم دوو کەسە بەر لە هەڵبژێرانی ساڵەخان بۆ فەرمانڕەوایەتی شیراز یەکتریان دیتبێ.

ئەرکی خۆی وەک سەرۆکی شار دەس پێکرد، لە گەڕانەوەی یەکەم گەشتی‌دا بۆ لار، بەرەورووی یەکێتییەک بۆوە بە بەشداری میرزامحەممەد و ساحێبئیختیار و ساڵەخان. ئەم تاقمە زۆر مەتین و بەڕێزانە، بەڵام قایم و پتەو، ئەویان گێڕایەوە ئیسفەهان. لە درێژەی وەرزی زستانی ساڵی ١٧٤٧ ـ ١٧٤٨دا برایممیرزا بۆ دابینکردنی خوردوخۆراکی لەشکرەکەی لە ئیسفەهان، زۆری غەدر لە شیراز کرد، بەڵام وەختایەک کە لە زستانی ساڵی داهاتوودا لە تەورێز تاجی نایە سەر، ساڵەخان بەڕەسمی دانی پێدانەهێنا و ئەم ڕێبازە سیاسییەی ئەو کاتێک بەئاشکرا دەرکەوت کە نێردراوانی شاروخ فەرمانی هەڵبژێرانەوەی دووبارەی خۆی و دووکەس لە هاوکارانیان دایە دەستی.

لەگەڵ ئەوەدا هێشتاش برایممیرزا بۆیان جێگای مەترسی بوو. هاوکارانی بە مەبەستی کۆکردنەوەی بەشە چەکداری دیاری کراوی هەرێمەکە بە وڵات وەرکرد و «کەلانتەر» لە بیرەوەرییەکانی ڕۆژانەی‌دا ئەم هەڵسووڕانە بە چەشنێک فێڵ و دەهۆ دەزانێ، چونکە هەر لەو کاتی‌دا ساڵەخان خۆی حازر کردبوو کە بە پاشماوەی خەزێنەکانەوە بەرەو خوراسان تێی‌تەقێنێ. بۆ بەڕێوەبردنی پلانەکەی بەرەو داراب جمی. لێرە خەڵک کە خۆیان لە دانی نان و پێخۆر و کەلوپەلی پێویستی ڕێیە دەبوارد، ماتڵیان کرد(٣٨). ڕەنگە ئەم هەڵکەوتە لە ژووەنی ساڵی ١٧٤٩ی زایینی‌دا رووی دابێ. محەممەدتەقی‌خان بوغایری سەرۆکی دەس‌نیشان‌کراوی برایممیرزا، بەبێ بەرەورووبوون لەگەڵ هیچ دژایەتی و ناڕەزامەندییەک پێی نایە شیراز[٥٥]. هاوکارانی تووڕە و ناڕەحەتی ساڵەخان هانی گەڕانەوەیان دا. ناوبراو بە یارمەتی سپای تازەتەیاری ئەوان دەست و پێوەندەکانی برایممیرزای لە شار وەدەرنا. پاشان سۆزەی چەند هەواڵێک کە گۆیا برایممیرزا، فەتحعەلی‌خانی ئەفشاری بۆ هێورکردنەوەی شیراز بەرەو ئەم شارە بەڕێکردووە، دەهاتە گوێ. دەیانگوت کە ناوبراو ئێستا بە هێزێکی تەیارەوە لەڕێی ئیسفەهانەوە دێ. ساحێبئیختیار دیسانەوە بەرەو دەرەوەی شار بەڕێکرا، هەتا بۆ یاریدەدانی شار، هێزی تازەتەیار کۆکاتەوە، ساڵەخان ڕایکردە یەزد و میرزامحەممەد، خۆی لە چوونە باشوور دزییەوە و لە فیرووزئاباد چاوەڕوانی ئاڵوگۆڕەکان مایەوە.

---

٥٥ـ ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٣٥ ـ ٣٦ و.(Brieven 2658, 162 (7 July 1749

فەتحعەلیخان بێ ئەوەی تووشی هیچ کۆسپێک بێ شیرازی گرت. لەم کاتەدا ساحێبئیختیار، لەگەڵ پێنجشەش هەزار چەکداری تازەپشووی گەرمەسێری بە سەرکردایەتی عەبدولعەلی دەشتستانی بەرەو مەڵبەندەکانی باکووری کوتای. فەتحعەلی سەلماندی وەک چۆن سەربازێکی ئازا و ڕاهاتووە، ئاواش سیاسەتمەدارێکی وریایە و بەرژەوەندی کاران دەزانێ. وەختایەک سپای ساحێبئیختیار لە نیزیک چوار فرسەخی شیراز بەرەگەیان لێگرت، دەستی کرد بە وتووێژ لەگەڵیان هەتا بە تەسالحەیەکی ڕەزامەندانە کێشەکە ببڕێتەوە. عەبدولعەلی بە نازناوی خانەوە بەڕێکرایەوە نێو تایفەکەی خۆی و ساحێبئیختیاریش شانبەشانی فەتحعەلیخان چۆوە شیراز هەتا لە کاروباری حکوومەتا بەشدار و هاوکاری بێ.

لە هاوینی ئەوساڵەدا وەختایەک حکوومەتی برایممیرزا هەڵوەشا، میرزا محەممەد و ساڵەخان لە حەشارگەکانیان لە یەزد بەرەو ئەبەرقوو چوون و ڕێگای نێوان شیراز ـ ئیسفەهانیان بە هۆی هەزار سوارێکەوە بەست کە حاکمی ئەوێ کۆی کردبوونەوە، فەتحعەلیخان بە مەبەستی ڕێ لێگرتنیان لە شیراز دەرکەوت هەتا ئەم ناوەندی مەترسییە پرشوبڵاو بکا. دوای ماوەیەکی کەم لە شوێنی خۆی بزووت، بەڵام لەم کاتەدا عەبدولعەلی دەشتستانی خۆی خستە شیراز و ماڵ و بارگە و بنەی تاڵان کرد و خاوخێزان و دۆستەکانی زیندانی کرد. بەڵام ساحێبئیختیار خێرا خاوخێزانی بۆ گێڕایەوە. خانی ئەفشار وای بە باش زانی کە سەری خۆی هەڵگرێ و نەکەوێتە تێکهەڵچوون لەگەڵ هێزەکانی ساڵەخان و بکشێتەوە بۆ ئیسفەهان.

ساڵەخانی بەیات بە یارمەتی میرزامحەممەد و ساحێبئیختیاری مامی سەرلەنوێ لە کۆشکی فەرمانڕەوایی لێی دانیشت و لەو بارودۆخە شڵەژاوەدا بۆ ماوەی هەژدەمانگ، یانی هەتا هاتنی عەلیمەردانخانی بەختیاری بۆ شیراز، حکوومەتی کرد[٥٦].

---

٥٦ـ کەلانتەر بە کۆڵێک تایبەتمەندی خۆبەزلزانینەوە کە بوویەتی، ناچار بووە کە تاوانەکانی خۆی و مامیشی بخاتە ئەستۆی ساڵەخان و گەورە کاربەدەستانی دیکە،

عەلیمەردانخان لەگەڵ لەشکرێکی نیزیک پازدەهەزارکەسی و وێڕای پاشای ئاڵقەبەگوێی لە نێوەڕاست مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ۱۷۵۰دا، گەیشتە قەراخ شیراز[۵۷]. هاوکارانی گەلێک بەرژەوەندیخوازی ساڵەخان دەوریان بەردا، قۆشەنێکی تێکەڵیان کۆکردەوە و پێشنیاریان کرد بێتە لایان هەتا دەربازی کەن. ساڵەخان هەتا چەند ڕۆژێکی دیکە هەوساری شاری بە دەستەوە بوو و پاشان رایکردە ئیسفەهان. عەلیمەردانخان شیرازی بێ پارێزوان و چاوسووری گرت و لەوی بە دواوە ئەو بیژووە سەگە! (کەلانتەر لە ڕۆژنامەکەیدا ئەم جنێوەی بۆ دیکتاتۆری جێنشینی میری هەڵداشت.) بۆ ماوەی چوار مانگان فارس و مەڵبەندەکانی گەرانگەری بەهەمووو بارێکا داڕووتاند. لەبەر وەی کە «ساحێبئیختیار» هێندێکی تێبینی لە بابەت هەژاری و دەسکورتی خەڵک بۆخستەڕوو، لە سەر کاری لادا و ساڵەخانی دارۆغەی حاکمی ئاڵقەبەگوێی لە جێی دانا. پاشان خەرج و پیتاکی سێساڵی داهاتوو و هەروەها هێندێک دیاری و پێشکێشی بە کەڵەگایەتی کە بایی چوارهەزار تمەنێک دەبوو، لە خەڵک داوا کرد. ملی نا لە دەسبەسەراگرتنی ئاسن، خەڵووز، گوریس و ئەسپ، بۆ چودەنڕێژی و ـ چودەن کانزایەکە لە ئاسنی نەپاڵاوتە و تێکەڵەی خەڵووز سازدەکرێ و بۆ قالب داڕشتن کەلکی زۆرە ـ ڕاگوێزتنی تۆپان. لە ماوەی سێ حەوتوودا نیزیکەی شەشهەزار تمەنی بە زۆری و زۆرداری لە خەڵک ئەستاند و ئەمەش تەنیا نرخی کەرەسەی خاو و دەسکردی جۆراوجۆر بوو. بۆ وەرگرتنی خەرج و پیتاک پیاوەکانی بەرێکرانە ناوچە و مەڵبەندەکانی پارێزگاکانی

---

بۆیە تووشی لاری و خلیسکان بووە. شاهیدانی هاوچەرخی ئوروپایی، لایان وایە ساڵەخان دەسەلاتی یەکەم و سەرەکی شیراز و فارس و تەنانەت بەندەرعەباس بووە، (Brieven 2658, 214)

۵۷ـ GD VI 24 october , 3 and 4 November 1750. فەسایی لە بەرگی یەکەم، ل ۲۰۷دا کە تاریخی بەختیاریش (ل ۴۷۵) دەیسەلمێنێ، دەڵێ عەلیمەردانخان لە یازدەی جیمادییوسسانی بەرامبەری مانگی مەی ۱۷۵۲دا پێی نایە شیراز و شەش مانگ لەوێ ماوە؛ بەڵام سەرچاوەکانی ئینگلیسی و هولەندی ڕاپۆرتی شیاوتریان خستە ڕوو. جگە لەمە کەلانتەر ئەمەش دەخاتەوە بیر کە زوڵم و زۆرەملی و چەوساندنەوەی عەلیمەردانخان لە زستانا ڕوویان داوە.

باشوور و ڕۆژهەڵات و تەنانەت کرمان؛ داوای ٩٠ تۆنێکی دەغڵ و دان دەکرد لە شاری لار بۆ پاشەکەوتی ئازووخەی لەشکرەکەی[58]. هێندێک دواتر هەزاران چەکداری لەشکری ئەم دەغڵ و دانەیان هەڵلووشی. زۆربەی پیاوەکانی ئەگەرچی چەکداری تەیار بوون، بێ وەرگرتنی پیتاک لە چیاکانی فارس و دەشتەکانی *لێوارەوە گەڕانەوە و تەقەڵاکانیان ئاکامی پێچەوانەی لێکەوتەوە.* بەناچار بە مەبەستی دەمکوت و سزادانی سەربزێوانی مەڵبەندەکانی سەرلێوار خۆی پێی نایە ڕکێف و شای ئاڵقەبەگوێی بێدەسەڵاتی کە خەڵک بە ناوی ئەو دادەڕووتان، بە دوای خۆیا ڕەکێش دەکرد[59].

لە ماوەی ئەم هێرش و پەلامارانەدا مەعسوومعەلیخانی ئەفشاری وەک بریکار لە جێی خۆی دادەنا، هەتا درێژە بە خراپکاری و تاڵانوبڕۆ بدا. تەنانەت دیسانیش داوای پرتەقاڵ و شەراب و لیمۆ(٣٩) و شتی تری بۆ خوردوخۆراکی سەربازانی دەکرد و بۆ کەلک وەرگرتن لە قەڵاشکەری باغان، دەستیان دایە بڕینی داران. دەسدرێژی لەم چەشنە، شوێنەوارە مێژوویییەکانی شیرازیشی گرتەوە و ڕەنگە بە خراپ کردنی گومبەزەکەی «خواجە حافز» دڵی ئەویشیان شکاندبێ. لە نێو کاربەدەستانی حکوومەتی و کەیخودای گوندان‌دا کە ڕایان‌نەکردبووە هیچ شوێنێک، لە ماوەی ئەم دەسەڵاتە سامناکەدا، لانیکەم دوازدە کەسیان هەرکام چاوێکیان لە دەس دا[60].

## ١ـ٩٠ حکوومەتی سەربەخۆی کەریمخان لە ئیسفەهان

پەیتاپەیتا هەواڵی نیزیک بوونەوەی کەریمخانی تۆڵەئەستێن دەهاتە

58- GD VI , 13 and 21 November 1750.

59- GD VI , 1 December 1750; Brieven 2679 (1752) , 55 – 61.

بۆ وێنە عەلیمەردانخان بۆخۆی لە بەندەرعەباس نیزیک نەبۆوە. لەم ناوچەیە عەبدوڵلاخانی کارگێڕی نەیتوانی داخوازەکانی وی بە سەر حوکمڕانی ئەو شوێنە و بازرگانانی ئوورووپاییدا بسەپێنی.

60- see also GD VI, 4 April 1751; sp 97/35 ( 1751 – 1752), 44b.

61- So Brieven 2679 (1752). 62; cf. Gombroon Diary VI, 7 December 1759, 23 January 1751.

بەرگوێ. لەشکری بەرچاوی لە مەلایر بە هۆی سەلیمخانی قۆرقلوویی(٤٠) ئەفشارەوە پتر هێزی وەبەر هاتبوو. سەلیمخان پێشتر لە مەیدانی شەڕی کەرێزە ڕایکرد و لە قەلایەکی نیزیک قەزوێن بنەی خست و ئێستا خۆی گەیاندبووە سەرۆکی زەند. کەریمخان بەخۆی و لەشکرێکی بیستهەزار کەسییەوە[٦١] لە ئاخری ژانوییەی ساڵی ١٧٥١دا بەرەو ئیسفەهان کەوتەڕێ[٦٢]. حاجیباباخان خۆی پێڕانەگیرا و شار بە هاسانی کەوتە گەمارۆ و دەستی ئەو و سادقخانی برای کە ئێستا ببوو بە بەگلەربەگی ئیسفەهان[٦٣]. لەبەر کردەوەی باشی کەریمخان سەبارەت بە ئەرمەنییەکان لە وەختی گرتنی جولفا و سەرەتای خۆ بەدەستەوەدانی ئەم شوێنەدا، هەمیشە بە چاکە باسی دەکرا. دیسانیش جولفای گرتەوە و هەموو چین و توێژەکانی خەڵک لە حەیف و ناخۆشەویستی عەلیمەردانخان، بەڕاستی ڕەگەڵی کەوتن[٦٤].

لە فارسیش بەخت ڕووی لە عەلیمەردانخان وەرگێڕابوو. لە سەرەتای ساڵی ١٧٥١دا هەڵیکوتایە سەر شاری کازروون[٦٥] و تالانی کرد. لە ڕێگای گەڕانەوەیدا بۆ شیراز لە کەلێکی تەنگەبەر و خلیسکی مەنشوور بە کوتەلدوختەر تاقمێک لە چەکدارانی ناوچەکە بە سەرکردایەتی مەزارع محەممەدعەلی خشتی(٤١) کوێخای گوندی خشت ماتەیان هەڵگرتبوو و ڕێیان لێبڕیبۆوە. تەواوی ئەو ماڵ و شڕەوبڕەی لە تالانی کازروون وەچنگی هێنابوو، دۆڕاندی و سێسەد کەس لە پیاوەکانی کوژران یان بە دیل گیران. بۆیە ناچار کرا بگەڕێتەوە کازروونی خاپوورکراو. بە کوێستانەڕێی فەهلیاندا شۆڕبۆوە دۆڵەکانی زەردکووە (زەردکێو) هەتا لەو ڕێیەوە بگاتە ئیسفەهان. چاوەڕوانی ئەمەی دەکرد کە لە درێژەی ڕێگادا لانیکەم بتوانێ یارمەتی لە پیاوەکانی تایفەی خۆی وەربگرێ کە لە هاوینەهەوار و لەوەڕگاکانی خووزستانیانەوە دەگەڕانەوە. لەم کاتەدا میرزا محەممەد لەبەر تین بۆهێنانی مەعسوومعەلیخانی ئەفشار،

---

62- GD 13 January 1751.

٦٣ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٩.

64- GD VI. 15 May 1751. Hovhanyants, 281; Malcolm, 177.

65- Breiven, 1753, 20.

رایکردە مەیمەند (مەمێنـد) و چـاوەڕوانی سـەرنخوونبـوونی خێـرا و لەپـڕی عەلیمەردانخان بۆی دانیشت[٦٦]. لە ئیسـفەهان کـەریمخـان کـە بـە جووڵـە و گوێزەگوێزی عەلیمەردانخانی زانیبوو، سەرەبەهاری ئەو ساڵە دەنگی لەشکری دا هەتا لە وڵاتی خۆی لەگەڵی بەرەوڕوو بێ. ئاتەگ و داوێنەکانی زەردکێـو لــە سەرچاوەی ڕووباری کاروون و دەوروبەری باشووری ڕۆژاوایـی بـە چوارمحـاڵ ناسراوە[٦٧].

ئاکامەکە پێشبینی دەکرا؛ گەلێک لە پیاوەکـانی خـانی بـەختیاری لــە «خەوی غەفڵەت» ڕاپەڕیبوون: کاتێک شای گەنج و زەکەریاخانی وەزیر و چەنـد کەسی تر لە سەرکردەکانی سپاکەی هەسـتیان کـرد کـە دەرەقـەتی هێزەکـانی کەریمخان نایـەن، هــەموویان تێکـڕا ڕوویـان کـردە خـانی زەنـد. هێزەکـانی بەختیاری تۆقین و هەڵاتن؛ عەلیمەردانخان و نیزیکانی، بۆ وێنە سمایلخـانی فەیلی(٤٢) حاکمی لوڕستان بەرەو دەشتەکانی ڕۆژاوای خووزستان تێیانتەقاند تا بۆ وەختایەکی تر خۆیان بۆ شەڕ تەیار کـەن. چەنـد کـەس لــە سـەرکردەکانی سەربزێوان گیران و کوژران و یان کوێر کـران. لەگـەڵ چەکـدارانی بـەختیاریش هەروەک خەڵکی دیکە وا بە باشی جووڵانەوە کە هەرگیز چاوەڕوانی ئەمە نەبوون و ئەم ڕەوتــە لــە ڕێبـازی سیاسـی کـەریمخـاندا وەک داب و نــەریتێک خـۆی دەنواند[٦٨]، هەروەها کەریمخان ئاشکرای کرد کە ئاواتــەخوازی گـرتنی ناوچــە و مەڵبەندە شاخاوییەکانی بەختیارییە. پاش سەرکەوتن لەڕێوە داوای باجی کـرد لە تــەواوی جــەماوەری دانیشــتووی ناوچــە و دراوسـییەکانی. گورجییــەکانی

---

٦٦ـ ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٤٤ ـ ٤٦؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٧.

٦٧ـ ئازەر لە ئۆردووی عەلیمەردانخاندا یەکێک لــە هاوڕێیــانی بــووە؛ گـیتیگوشـا، ل ٢١؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٢؛ تاریخی بەختیاری، ل ٤٧٧. هاوهانیانتز، لە ل ٦٨٢دا، ئابکوورن بە شوێنی قەومانی شەڕەکە دادەنێ، کە دێیەکە کەوتۆتە ٢٨ کیلـۆمیتری باشـووری ڕۆژاوای شـاری کورد. وێشدەچێ ئەم ناوە سواوی «ئاب کاروون» بێ. یان هەروەک ئازەر دەڵێ شـەڕ لــە لێـواری ڕووبار ڕووی داوە. گوڵستانە دەڵێ شەڕ لە ڕۆخی زایەندەڕوود قەوماوە و ئەم شوێنە لە داغـاوی وێ، کەوتۆتە نیزیک ئیسفەهان. هەڵبەت تێکڕای گێڕانەوەکان شوێنی شەڕەکە لە ئیسفەهان بــە دوور نازانن. ئەم مەبەستە پاش هاتنی ڕاپۆرتی ئەم سەرچاوەی خوارەوە بۆ کرمان، سەلما.
See GD VI , 19 Juhe and July 1751.

٦٨ ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٢، تاریخی گیتیگوشا، ل ٢١ ـ ٢٤.

دانیشتووی گوندەکانی ئاخورە سەریان لە حاند ئەم داوایە بادا و شانبەشانی دێیەکانی ئەرمەنینشینی پەنایان دەستیان کرد بە شەڕی چەکداری. کەریمخانیش بە هێزی چەک پەلاماری دان. زۆرێک لە جووتیاران کوژران و بە دیل گیران و ڕێبەرانی گورجی گوللەباران کران و خانی زەند دوای گرتنی ئەسیرێکی زۆر لەوێ دەرکەوت[٦٩].

بەگوێرەی نووسینی نامی یەکێک لەو کەسانەی کە دوای شەڕی چوارمحاڵ کوێر کرا، سەلیمخانی قۆرقلووی ئەفشار بوو. وەک گێڕاویانەتەوە بەر لە ئێستا پەنای بردبووە بەر عەلیمەردانخانی بەختیاری؛ بەڵام ئەم ڕاپۆرتانەی کە لە بەندەرعەباسەوە نێردراون، وای دەردەخەن کە کوێرکرانی ناوبراو پەیوەندی بە هەڵاوبگری ئیسفەهانەوە نەبووە لە پایز یان سەرەتای زستانی ئەو ساڵەدا. گۆیا دەستەیەک لە لایەنگران و تاقمێک لە دژبەرانی کەریمخان لە میوانییەکی گشتیدا پێکهەڵدەپرژێن؛ پازدە تا بیست کەس لە سەرکردەکانی ڕاپەڕیوان دەکوژرێن و سەلیمخانیش کە لە سەردەمی نادردا چاوێکی لە دەس دابوو، چاوەکەی دیکەشی دەچێ[٧٠]. ئێستا لە هەموو لایەک ڕوون بووەوە کە خانی زەند توانستی لادان و دەرپەڕاندنی هاوپەیمانانی باوەڕپێنەکراویشی هەیە(٤٣).

شیراز بە هەڵبژاردنەوەی سەرلەنوێی حاکمی پێشووی عادڵشا یانی ئەبولحەسەنخانی شیرازی قەڵەمڕەوی بەرینتر بووە. مەعسوومعەلیخانی ئەفشار کە نوێنەری عەلیمەردانخان بوو، بە مەبەستی دیداری حاکمی تازە لە شار دەرکەوت و بە شێوەیەکی ڕەسمی چوو بۆ پێشوازی، بەڵام لەڕێوە کۆت و زنجیری خستە دەس و پێی و هێنایەوە شار؛ خەڵکی شیراز بە سەرکردایەتی

---

٦٩ـ Hovhanyants (282) دەنووسێ کە ئاخورە شارۆچکەیە لە ٢٥ کیلۆمیتری ڕۆژاوای داران و زۆرێک لە دانیشتووانی بە ڕەگەز گورجین.(فەرهەنگی جوغرافیایی سپا، بەرگی ٥.)، باپیرانیان بە دەس شاعەباس لێرە نیشتەجێ کراون. باسی گوندی ئەرمەنینشینی دیکەش کراوە، کە گرینگەکانیان بریتین لە: خونگ، سەنگباران، شابولاغ و میلاگرد کە کەوتوونە باکووری ڕۆژاوای ئاخورە. (فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی ٥ و نەخشەکانی).

٧٠ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٢٤: هەروەها: GD VI, 20 December, 1751.

محەممەدعەلی خشتی ڕاپەڕین و ئەبولحەسەنخانیان ڕزگار کرد و ئاخرین نوێنەری فەرمانڕەوای زاڵمی خۆیان تێدابرد. هەڵلا و بشێوی تریش ڕوویان دا: حاکمی تازەش کوژرا و کاروباری حکوومەتی بە شێوەیەکی کاتی کەوتە دەس سەرکردەی سپای نێردراوی کەریمخان. ئەمجارەیان ڕاپەڕینێکی دیکە لە لایەن کوردەکان و تایفەی بەیاتەوە سەری هەڵدا و ئاخرین حاکمی شاریشیان لە سەر کار لادا[71]. گەلێک تاقم و دەستەی خاوەن دەسەلات کە پاش شڵەژاوی و پاشاگەردانییەکان دڕندانە گەشەیان کردبوو، حازر نەدەبوون بە هاسانی سەر وەبەر ناوەند یان تاقە سەرکردەیەک بنێن.

دوازدە مانگی ڕابردوو، سەردەمێکی قەیراناوی بوو کە کەریمخانی خستە سەر ڕێ و ڕەوگەی مەزنایەتی. ناوبراو لە نێو تاقم و دەستە دز و ڕێگرەکانی خۆوڵاتی سەری هەڵدا و بە ڕێی تێکەڵی و پەیوەندییەکی ترسناک و سەداقەتێکی ئاشکرادا کە تێکەڵ بە برشت و میانەڕەوی سیاسی بوو، بوو بە پیاوی سەرکەوتووی، سەرکەشانی ئێرانی خۆراوایی. لەم کاتەدا بە وەچنگهێنانی دوو هۆکاری سەرەکی واتە پایتەخت و شا، نازناوی «وەکیلوددەولە»ی کە پێشتر درابوویە عەلیمەردانخان، تایبەت دا بە خۆی. چەند فەرمانێکی دەرکرد و چەن حاکمێکی هەڵبژارد و تەواوی ناوچە و مەڵبەند و هەرێمەکانی نێوان ئازەربایجان و بەندەرەکانی کەنداوی داگیر کرد. شێخالیخانی ئامۆزای کردە حاکم و سەرداری هەرێمەکانی باکووری و شوێنی نیشتەجێبوونی تایفەی زەند و محەممەدخان لە پارێزگاکانی ڕۆژاوای داوێنی زاگرۆس سەقامگیر بوو(٤٤). سادقخانی برای(٤٥) بە سەرکردایەتی دووهەزار سوارەوە ناردە کرماشان تا قەڵای هێشتا خۆبەدەستەوەنەداوی ئەو شارە دەور بدا و بیخاتە ژێر چاوەدێری[72].

---

٧١ـ ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٤٦ ـ ٤٧؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٧ ـ ٢٠٨؛ مێهراز، ل ٣٤ ـ ٣٥.

٧٢ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٢ ـ ١٨٣و ١٩٢و ١٩٣.

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ نەسیرخانی بلووچ لە زەمانی نادردا حاکمی سیستان و بلووچستان بوو. لە سەردەمی هێرشی ئەحمەدشاش‌دا یارمەتی دا.

٢ـ میرحەسەن‌خان لەپێش‌دا «داروغەبازار»ی هۆردووی نادری بوو پاشان بوو بە سەرکاری کۆکردنەوەی باجی ئیسفەهان. لەبەر دەڵەچەیی کرا بە بەگلەربەگی ئەو پارێزگایە. لە وەختی مردنی نادرا، میرزاسەیدڕەزای زاوای شاسوڵتان‌حوسێنی خستە زیندانەوە. چونکە خوازیاری پاشایەتی بوو بە دژی عادڵشا ڕاپەڕی و سەرەنجام بە دەس لات‌ولووتەکانی شاری ئیسفەهان کوژرا.

٣ـ ئەڵلایارخان، سەرکردەی حەوت‌هەزار چەکداری ئەفغانی بوو لە بنکەی قەزوێن. شان‌بەشانی ئەشرەفسوڵتان هەمەدانی وێران کرد.

٤ـ سەرئەفرازبەگی خودابەندەلوو لە گوندەکانی مابەینی کرماشان و هەمەدان‌دا سەرکردەی هەزارکەس بوو(مین‌باشی). لەگەڵ شاسەیوانەکان پێکهات و لە خوازیارانی دەسبەسەرداگرتنی ڕۆژاوای ئێران بوو. بە تەگبیری سەرۆکانی قەرەگوێزلوو کوژرا.

٥ـ کائید کەلبعەلی یەکێک لە لات و شڕەخۆرەکانی بررووجێرد بوو. بە شەڕەنگێزی ئەو ناوچەیەی شڵەقاندبوو. سەلیم‌خانی قۆرقلووی ئەفشار لە لایەن برایم‌پاشاوە بۆ دەمکوت‌کردنی نێردرا. دوای ئازایەتییەکی زۆر کوژرا. کائید لە زاراوەی لوڕی‌دا مانایەکی وەک کەیخودا و ڕێبەر (قائید)ی هەیە. لە لوڕستان تیرەی کائید و «کائیدڕەحمەت»یش هەن.

٦ـ حوسێن‌خانی زەنگەنە لە سەردارانی کوێرکراوی چەرخی نادری بوو. لە پێش‌دا چاووش‌باشی (سەرکاروان)ی نادر و لە خزمەت ڕکێفی دابوو. لەبەر شەڕەنگێزی کوێر کرا. پاش مەرگی نادر زۆری تالان و بڕۆ کرد. سەرکردەکانی قەڵای کرماشان خستیانە داو و کوشتیان.

٧ـ سوبحان‌وێردی‌خانی ئەردەڵان کوڕی عەباس‌قوڵی‌خانی ئەردەڵان و لە ساڵی ١١٤٣ی کۆچی‌دا حکوومەتی بە دەستەوە گرت. پاش وی ئەحمەدخانی کوڕی کرایە حاکمی کوردستان بەڵام حەسەن‌عەلی‌خانی ئەردەڵان جێی گرتەوە. سەرۆکی سەربازگەی سنە کە سوبحان‌وێردی‌خان ڕزگاری کرد، محەممەدڕەزابەگی کوڕی «باباکەریم»ی گورجی بوو.

٨ـ ئەم تاقمە زەنـدەکانی بـاکووری کوردسـتانن و بـە زەنـدی بەگـە بەناوبانگن. ئادینەخان و ئەحمـەدخان سـەرۆکیان بـوون و بـە زاراوەی لـەکی دەدوان.

٩ـ ئوشتوران (وشتران) یەکێک لە گونـدەکانی ناوچـەی خـورەمرووودی توویسیرکانە و ٢٨٤ سەر خێزانە و ١٥١٧ کەسی جـەماوەرە. (سـەرژمێری سالـی ١٣٥٥ هەتاوی).

١٠ـ عەبدولعەلیخانی کوڕی خەلیلخـانی عـەرەب مـیشمەسـت پـاش مەرگی نادر لە ئەراکەوە هاتە کرماشان و چووە لای ئـەمیرخانی تـۆپچیباشـی پلکەزای. هەتا زەمانی گیرانی قەڵای کرماشان یاریدەی میرزا محەممەدتـەقی دا. دوای گیرانی قەڵای شانی دایە پاڵ شانی ئازادخان. دواتر چووە لای شاروخمیرزا و سەرەنجام هاتە شـیراز و لـە سالـی ١٢٠٣ی کـۆچیدا لـە وەخـتی گەڕانـەوە لەحەجەوە مرد.

١١ـ ئەمیرخانی تۆپچیباشـی عـەرەب مـیشمەسـت (عـامیری) کـوڕی یاربەگخان و لە شەڕی «میهماندۆست» سەرتۆپچی نادر بوو. پاش کۆچی نـادر سەرەتا لای دایە لای عەلیقولیخان و برایمیرزا و لـە ئـاخردا سـەری وەبـەر شاروخ هێنا. دوای گیرانی هیرات لای ئەحمەدشا مایەوە.

١٢ـ کەڵهوڕ، زەنگەنە، مافی و باجەڵان کە چەند ناوچەیەکی نێوان ئیلام و کرماشان و لوڕستاندا نیشتەجێن و ئاخاوتنیان «لەکی»یە. باجەڵانـەکان لـە سەردەمی قاجاراندا لە شارستانی بروجێرد بە سەرۆکایەتی ئەفراسـیابخـان شۆرشێکیان هەڵگیرساند. زەنگەنە دەبنە دوو تیرەی فارسئاغا و ڕۆستەمئاغا.

١٣ـ ئەم زاراوەیە لە ڕۆژگاری سەفەویڕا بۆتە باو. مەبەست لە لـوڕانی فەیلی ئەو کەسانەن کە زاراوەیان لوڕییە و بە شێوازی لەکی نادوێن.

١٤ـ باباخانی چاپشلوو لە ساڵی ١١٤٤ی کۆچیدا لە لایەن نادرەوە بـوو بە سەرکردەی سەرکوتی ئاژاوەکانی لوڕستان. کۆچی بـە زۆرەملـی زۆرێـک لـە تایفەکان بە فەرمانی ئەو بەڕێوە چوو. ئەگەرچی چاپشلووەکان بـە یـەکێک لـە تۆرەمەکانی ئەفشار دادەندرێن، بەڵام لە ڕاستیدا لە «قـارش قـووزی»یـەکانی بوخاران. پاشان شاسمایل لە ئازەربایجانەوە بۆ خوراسان کۆچی دان. ئێستاکە لە ناوچەکانی چاپشلوو، نەوخەندان، محەممەدئاوا و دەرگەز نیشتەجێن.

١٥ـ وشەی تووشماڵ لە شێوازی لوڕیدا بە مانای کەیخودایە. تەش (تووش) سوارەی «تاش»ە بە مانای خواوەند و خاوەن و سەرۆک، ماڵ یانی ئاوایی و تاقم. کەوایە تووشماڵ یانی خاوەن و سەرۆکی ئاوایی. بە باری گەورە و چکۆڵەیی خێڵاتیدا، لە کەیخودا سەرتر و لە خان خوارتر بوو. ئاخرین تووشماڵێکی کە من لە لوڕستان بە منداڵی دیتوومە، کەسێک بووە لە تووشماڵەکانی باڵاگریوە و ناوی تووشماڵ محەممەد بوو. حکوومەت کردبوویە شارنشین و پیاوێکی لەسەرەخۆ و ئاقڵمەند بوو.

١٦ـ تەکلووەکان لە هەمەدان دەژیان و بە تایفە سەرەکییەکانی قزڵباش دادەندران.

١٧ـ کەڵهوڕ تایفەیەکە لە مابەینی کرماشان و ئیلام و ناوەندی گەورە و بەرچاویان، ئیسلامئاباد، گیلانی ڕۆژاوا ، ماهیدەشت و دەوروبەری قەسریشیرینە. تایفەیەکی گەورەیە کە ٢٠ بەرەبابی هەیە. ئەوانی گرینگی بریتین لە: ئەلوەندی، مەنسووری، قوچمی، گرکا، کەلەپا، کەلەجۆ، ماهیدەشتی، هاڕوونئاوایی، شاهین، مووشگیر، بوداقبەگی، زەینالخانی و کەمەرە. لە سەردەمی مەشرووتەخوازیدا لەبەر تێکەڵی داودخان سەرۆکی ئەم خێڵە لەگەڵ سالارودەولە، گێرە و کێشەیەکی سەیر سەری هەڵدا کە بوو بە هۆی کوژرانی داودخان لە بێستوون.

١٨ـ گێڕانەوەی مێژوونووسانی کورد زۆر لەگەڵ نووسەرانی تر لێک دوورن. مەردۆخ لای وایە کە هێزەکانی ئیمامقولیخان لە سپای حەسەنعەلیخان زیاتر بوون و تەنیا ئازایەتی کوردان کەمایەتی ئەوانی قەرەبوو کردۆتەوە. شوێنی شەڕەکە بیلەوار بووە.

١٩ـ بابان کە جاری وایە بە «بەبە»ش ناویان دێ، کوردی شاری سلێمانین.

٢٠ـ ئیمامقولیخان پیاوێکی چاونەترس بوو. سەری لە ئاست سەرکردەکانی قەڵا بادەدا. ئەوان تەمایان گرتبوو هەڵیفریوێنن، هەر بۆیە سوێندیان بۆ خوارد کە گیانی پارێزراوە و پێویستە بێ و لە کاروباری حکوومەتدا بەشدار بێ. مورتەزاقولیخانی کۆسەی ئەحمەدلووی ئەفشار گرتی و کوێری کرد.

٢١ـ ئاغاسیخانی شاملوو، باپیرەگەورەی خانەکانی مەلایر لـە قـەڵای «خانخۆرە»ی کومازان دەژیا. شاملووەکان کە تۆرەمەی ترکانی سپای قزڵـباش بوون، دەستیان کرد بە کەڵەوەکێشی و دژایەتی لەگەڵ تایفەی زەندی دانیشتووی مەلایر و لە کومازانەوە دەریانپەڕاندن بۆ پەری.

٢٢ـ رووداونووسانی ئێرانی ئەم ناوەیـان بـە شـێوەی عـەلیوەیـس، عەلیئووەیس نووسیوە و بەڕێز پێریش هەروای دابەزاندووە، بەڵام سـواوە بـە عەلییوس. لە لوڕستان تۆرەمەی عەلییوس و پیـاوی بـەم نـاوە زۆرن. هـەوای خۆشی «عەلییوسی»ش هی کابرایەک بووە بە ناوی عەلییوس.

٢٣ـ عەلیمەردانخان لە تایفـەی چوارلـەنگی بـەرەبابی کونورسـی و تورمەی زەمانخان و ناوی بـاوکی حەیـدەرئاغای بـەختیاری بـووە. کـوڕێکی لێومشاوەی لە پاش بەجێنەما، بەڵام ئامۆزاکـانی چـەن سـاڵان سـەرۆکایەتی بەختیارییان بە ئەستۆوە بوو. محەممەدتەقی کوڕی ڕەشیدخان لەبەر تێکەڵـی و دۆستایەتی لەگەڵ «لایارد»ی ئینگلیسی ناوبانگێکی دەرکردبوو.

٢٤ـ ئەبولفەتحخان لە سەرۆکانی تایفەی حەوتلەنگ و لـە بـەرەبابی بێهداروەند «بەختیاروەند) بوو. بێهداروەنـدەکان لـە سـەردەمی محەممەدشـادا سەرۆکایەتی خێڵی بەختیارییان دایـە دەس کـوڕانی حەیـدەرپاپی لـە لـوڕانی فەیلی. چونکە یەکێک لە خانەکانیان لە شەڕ لەگەڵ ئەرشـەدودەولەدا ئەسـیر کـرا، ئـەم نازناوەیـان دایـە و پێیـەوە ناسـران. یـەکێک لـە سـەرۆکە ناوبەدەرەوەکانیان خوالێخۆشبوو غولامڕەزاخانی ئەرشەد بـوو لـە ئاغاکـانی دوروود (دوو چۆمان).

٢٥ـ عەلیمەردانخانی فەیلی لە سەردارانی مەشـهووری ئـاخروئۆخری حکوومەتی سەفەوییە و بەگلەربەگی لوڕستان بووە. ئەو کوڕی مەنووچێهرخانـە و لە لوڕستان شوێنەواری چاکی لە پاش بەجێماوە. لە سەردەمی نادرشادا وەک بالوێزی ئێران لە وڵاتی عوسمانی، لوڕستانی بەجێهێشت. کـە چـاوی ون بـوو بابـاخانی چاپشـلوو پـەلاماری لوڕسـتانی دا. ئـاوای لـە سـەر «مۆر»ەکـەی نووسرابوو:

ز حسین و شاهوردی و منوچهر و حسین / شد علیمردان لر کلب امـام مشـرقین

لە حوسێن و شاوێردی و مەنووچێهر و حوسێن / عەلیمـەردانی لـوڕ بـوو بـە

سەگی ئیمامی ڕۆژهەڵاتان).

٢٦ـ گەز، شارەدێیەکە لە ناوچەی بەرخواری ئیسفەهان و بەگوێرەی نووسینی دوکتۆر «هونەرفەر» لە ل ٥٣ی کتێبی ئیسفەهاندا، لە سەردەمی ساسانییەکاندا ئاورگای لێبووە. ئێستاش مزگەوتی زەمانی سەلجووقی و کاروانسەرای شاعەباسی گەز هەرماوە.

٢٧ـ ئەبووتورابمیرزا کوڕی میرزا مورتەزاخانی سەدروسسدوور لە دایکەوە نەوەی شاسوڵتانحوسێنی سەفەوی بوو. لە ساڵی ١١٦٣ی کۆچیدا لە لایەن سەرکردەکانی هاوپەیمانەوە بە ناوی شاسمایلی دووهەم لە ئیسفەهان کرایە شا. پاش شکانی عەلیمەردانخان بە لای کەریمخاندا کەوت. وەختایەک کەریمخان لە بەرامبەر محەممەدحوسێنخاندا شکا ڕایکردە لای ئەو. دوای بەزینی محەممەدحوسێنخان سەرلەنوێ گەڕایەوە لای کەریمخان. ئەمجارەیان وەکیل خۆیەکی وای تێنەگەیاند و بە شای نمەکنەناس گازی کرد. بۆ هەمیشە ناچار بوو لە ئابادە نیشتەجێ بێ. لە ساڵی ١١٧٨ی کۆچیدا مرد.

٢٨ـ زەکەریاخانی کەززازی یەکێک لە سەرکردەکانی نادری بوو کە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی برایممیرزا ئەرکی وەزارەت و حکوومەتی ناوچەکانی کەلە، کەزاز، کەمەرە، چاپلق و برووجێردی بە ئەستۆوە بوو. ئەو وای لە شاسمایلی دووهەم کردبوو هەر تاوەی لە سەر هەوایەک بێ و هەر ڕۆژەی بۆ لای سەرکردەیەکی پاڵ پێوەدەنا. کەریمخان و عەلیمەردانخان خۆیان کردبوویانە وەزیری شا. لە ئاخرین ئەوبەرەوبەرەکێن و ڕاکردنی لە هۆردووگای محەممەدحوسێنخانڕا، ڕووی کردە قەڵای کەلە و لەوێ نۆکەرەکانی کوشتیان.

٢٩ـ سەرکارانی کۆکردنەوەی پیتاکی عەلیمەردانخان لە قومشە و زۆربەی ناوچەکانی فارس سەرکەوتنێکیان وەدەس نەهێنا و خەڵک لە شار و گوندان دەریانکردن.

٣٠ـ هاروونئاوا، ئیسلامئاوای ئێستایە.

٣١ـ ڕێزدار پێری ئەم ناوبانگەی لە گوڵستانە وەرگرتووە. مامۆستا مودەڕڕیسی ڕەزەوی کە کۆبە و پەڕاوێزی بۆ کتێبی موجمەلوتتەواریخ نووسیوە و هەڵەی بۆ ڕاست کردۆتەوە، بە هەڵە «مەئموونی» بە مامۆیی نووسیوە و ئەویش ئەم هەڵەیەی دووپات کردۆتەوە. بۆیە بە حاکمەکانی ئەردەڵانیان

گوتووە مەئموونی، چونکە ئەوان لە ڕەگەزی مەئموونی کوڕی مونزیر کوڕی پیلان کوڕی حەسەن کوڕی خدر کوڕی ئەلیاس کوڕی خدر کوڕی قەلەق کوڕی «بابا ئەردەڵ»ن. بڕوانە: مێژووی کوردستانی مەردۆخ.

٣٢ـ حەسەنعەلیخان کاربەدەستی سوبحانوێردیخان نەبوو، بەڵکوو ئامۆزای یان بە قەولی مەردۆخ برازای بووە. هۆکاری هێرشی سەلیمپاشاش، پشتیوانی کردنی حەسەنعەلیخان لە سلێمان پاشای بابانی کۆنەڕەقیبی بووە.

٣٣ـ قەراتۆرێ یەکێک لە گوندەکانی ناوچەی قەراتۆرێی سنە و بەگوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی ٨٧٠ خێزانی لێ ژیاوە و ڕێژەی جەماوەری ٤٠٢٩ کەس بووە.

٣٤ـ نووسراوەی ڕۆستەمولحوکەما سەبارەت بە کوژرانی ئەبولفەتحخان لەگەڵ سەرچاوەکانی تر جیاوازی هەیە. ئەو دەنووسێ ئەبولفەتحخان لە بەزم و میوانییەکی سەرکردە سێفلیقانەکەدا لە شیراز کوژراوە، چونکە لەبەر نێربازی دووکەسیان تیر و تانەی تێگرتوون. بەڵام ڕاستییەکەی ئەمەیە کە کەریمخان لەو دەمیدا خەریکی لەشکرکێشی بوو لە ڕۆژاوای ئێران. ناکۆکی و نێواناخۆشی تیرەکانی چوارلەنگ و حەوتلەنگ بوو بە هۆی کوژرانی. ئەبولفەتحخانیان لەپێشدا کوێر کرد و پاشان کوشتیان.

٣٥ـ تەقیخانی شیرازی یەکێک لە سەردارانی سەربەگێچەڵی نادرشا بوو. وەختی چوونە شەڕی داغستان لە شیراز ڕاپەڕی و کەلبعەلیخانی کۆسەی ئەحمەدلووی ژنبرای شای کوشت و محەممەدحوسێنخانی ئەفشاری تەرەکەمە کرد. نادر چلپەنجاهەزار سوارێکی ناردە سەری و شیرازیان دەورە دا و گرتیان. خەڵکێکی زۆری شیرازی کوژران. تەقیخان بە کوڵینی چاوێک و یەختەکرانی سزا درا. دوای دوو ساڵان شا لێی خۆش بوو و کردی بە حوکمڕانی کابول، بەڵام دیسانیش شۆڕشی کرد و تێکشکا. پاش کوژرانی نادر کەوتە گەڵ یارانی ئەحمەدشای دوڕانی و لە هێرشەکانیدا بۆ سەر ئێران، تەقیخان یەکێک بوو لە سەرکردەکانی.

٣٦ـ میرزا محەممەدی کەلانتەر کوڕی ئەبولقاسم و نەوەی سەید موحەممەدی مودەڕڕیس لە ساڵی ١١٣٢ی کۆچیدا لە شیراز پێی نایە جەغزی ژیان و لە ساڵی ١٢٠٠دا کۆچی دوایی کرد. پاش نەمانی محەممەدحوسێنخانی

ساحێبئیختیاری خاڵی، جێی ئەوی گرتەوە. وەختایەک ساڵەخانی بەیات دەروازەکانی شیرازی لە ڕووی کەریمخان داخست و بوو بە حەوشەکی، دەستی دایە دەستی کەریمخان و دەروازەکانی شاری لە ڕووی لەشکری کردەوە.

٣٧ـ میرزا ئەبولحەسەنی شیرازی لە سەرەتای کاری وەکیل (کەریمخان)دا، حاکمی شیراز بوو. مەعسوومعەلیخانی ئەفشار گرتی، بەڵام خەڵک ڕاپەڕین و ئازاد کرا و مەعسوومعەلیخانیش کوژرا. چەند مانگ دواتر لەگەڵ محەممەدعەلیخانی خشتی کە جڵەوکێشی ڕاپەڕینی خەڵک بوو، نێوانی تێکچوو و بە فیتی وی کوژرا.

٣٨ـ کەلانتەر بە درێژی باسی دووڕوویی ساڵەخانی کردووە(ل ٣٤ ـ ٣٧).

٣٩ـ کردەوەی عەلیمەردانخان لە شیراز بوو بە هۆی بێزرانی شیرازییەکان. تەواوی کەلوپەلی پێویستی سپاکەی لە خەڵک دەستاند و تەنانەت دەبوو لە خۆشاو و ئارەقی گیاوگوڵی شیراز کە خۆی پێیدەگوت ئارەقی ئاولیمۆ، بەشی سپاکەی جوێکەنەوە. زۆربەی دارەبەرییەکانی شیرازی بۆ سووتەمەنی بڕی، کەلانتەر سەبارەت بەوی ئاوا دەڵێ:

بناغێکی ئەو دوژمنی دینە داینا / پێچەوانەی ئایینی پێشینە داینا

لە ڕۆژگاری ئەوا ڕۆژی خەڵک شەو / شەو لە ترسانی حەرام بوو خەو

٤٠ـ لە مێژووی ئەفشاردا دووکەس ناویان سەلیمخانە. ئەم وێکچوونە هەڵەی ساز کردووە:

ئەلف: سەلیمخانی ئەفشاری قوتەلوو لە گەورەگەورەکانی ئەفشار و سەرداری نادر بوو کە برایمیرزا کردی بە وەکیلوددەولەی خۆی. لە قەزوێن دادەنیشت و شازادەی ئەفشار پێیدەگوت ئامۆزا. لە کووژاندنەوەی ئاژاوەی کەلبعەلی برووجێردیدا سەرکردایەتی لەشکرەکەی بە ئەستۆوە بوو. لە ساڵی ١١٦٥ی کۆچیدا کەریمخان لەگەڵ چەند کەسی دیکە کوێری کرد. پێموایە «نامی» لە کتێبی گیتیگوشای زەندیەدا، بە هەڵە قۆرقلووی کردبێتە قوتەلوو.

ب: سەلیمخانی ئەفشاری قۆرقلوو لە لایەن شاروخەوە سەرۆکدارۆغەی ئیسفەهان بوو. یاریدەی ئەبولفەتحخانی دا. دوای شەڕی کەرێزە چووە قەزوێن و پاشان دایە پاڵ کەریمخان. نادرشا پێشتر چاوێکی دەرهێنابوو. لە ساڵی ١١٦٥ی کۆچیدا کەریمخان فەرمانی دا چاوەکەی دیکەشیان کوێر کەن و دواتر کوشتی. بەڵام

لە نێو تۆرەمەکانی ئەفشاردا بەرەبابێک بە ناوی قوتەلوو نیە. دوور نیە هەردووکیان لە تایفەی قۆرقلوو بووبن. ویکچوونی چارەنووسی ئەم دووە، گومانێکی وا سازدەکا کە ڕەنگە بیرەوەری‌نووسان و نووسەندەکان لەم بارەوە هەڵەیان کردبێ و تەنیا کەسێک بە ناوی سەلیم‌خانی قۆرقلوو لە مێژووی ئەفشارییەکان‌دا بووبێ.

٤١ـ مەزارع محەممەدعەلی خشتی کوڕی زاڵخانی خشتی خەڵکی «جەرە»ی فارس بوو کە تایفەکەیان کۆچی کردبوو بۆ خشت. حاکمێکی زاڵمی نادری لە خشت دەریبەڕاند و بوو بە سەرۆکی ناوچەکە. لە بەرامبەر زۆرەملی عەلی‌مەردان‌خانی بەختیاری‌دا ڕاپەڕی و سپاکەی لێ پرش‌وبڵاو کرد. کەریم‌خان نازناوی «خان»ی دایە.

٤٢ـ سمایل‌خانی فەیلی کوڕی حوسێن‌خانی والی و دوای عەلی‌مەردان‌خان هەڵکەوتەترین والی لوڕستان بوو. بنەماڵەی والی لە ساڵی ١٠٠٥ی کۆچی تا ١٣٠٨ی هەتاوی فەرمانڕەوای لوڕستان بوون. لەبەروەی تایفەی زەند پێشتر ژێردەستەی سمایل‌خان بوون، پاش پێشکەوتی کاری کەریم‌خان، سمایل‌خان حازر نەبوو سەر وەبەر خزمەتکاری پێشووی بێنێ و لە تەواوی سەردەمی کەریم‌خان‌دا هەر دژایەتی کرد. پاش کۆچی‌دوایی کەریم‌خانیش چووە نێو ڕیزەکانی ئاغامحەممەدخان.

٤٣ـ کەریم‌خان کەلکی لە تێکهەڵچوونی دوو تاقمی چەکدار وەرگرت بۆ پاک‌کردنەوەی دژبەران.

٤٤ـ محەممەدخانی زەند زاوا و ئامۆزای کەریم‌خان بوو و بەپێچەوانەی نووسینی ڕۆستەمولحوکەما برای نەبووە. وا وێدەچێ لەبەر ئازایەتی بەم نازناوە ناودێر کرابێ، نەک لەبەر وەی کە شمشێر بەشێک لە سەری داتاشیبێ. لە ساڵی ١١٧٢ی کۆچی لە کاتی دیلێتی‌دا لە مازەندەران کوژرا.

٤٥ـ ئەم سادق‌خانی زەندە، محەممەدسادق‌خانی برای وەکیل (کەریم‌خان) نیە. ئەو برای محەممەدخان و کابرایەکی ئەندام وردیلەی ناشیرین بووە. لەبەر لێنەوەشاوەیی لە وەختی گەمارۆی قەڵای کرماشان‌دا شکستی هێنا و حەرەمخانەکەی کەوتە دەس دوژمن. پاش مەرگی کەریم‌خان، زەکی‌خان ئەو و کوڕەکەی لەگەڵ سەرکردەکانی دیکەی زەند گۆڕەهوو کرد.

# ٢

# کەریمخانی وەکیل

## ٢ ـ ١ خووزستان لە سەردەمی مەرگی نادرەوە

تەنانــەت وێــڕای تــەواوی ســەرکەوتنەکانی وەکیــل لــە ئێراقــی عەجەمدا، عەلیمــەردانخــان هێشــتاش لەگــەڵ لەشــکری گــەورە و گــرانی لــە هاوینەهەوار و لەوەڕگەکانی تایفــەی بــەختیاری لــە خووزســتان دەژیــا. ئــەم پارێزگایە کە بە دوورترینی ناوچەکانی ئێران لە مەشەدەوە دادەندرا، تەنانــەت بەر لە مەرگی نادریش لە ڕووی سیستمی بەڕێوەبەرایەتی و ئیدارییەوە تووشــی پاشاگەردانی بووە. پلەی حوکمڕانێتی عەرەبســتان لــە بنەماڵــەی ســەیدەکانی موشەعشەعی شیعەمەزەبی ئەویدا، پێشــینەیەکی سێسەدساڵــە و پشتاوپشــتی هەبوو. موشەعشەعییەکان لــە ســەرەتای پــەلوپــۆ داکوتانــەوە بــە ناوچــەی حەوێزەدا خزانە هەموو پارێزگاکە و سەرلەبەریان داگیر کرد. نادر بــە پەیــڕەو کردنی ڕەوت و ڕێبازی دیکتاتۆرانەی خۆی دەستی دایە ڕووخاندن و تواندنەوەی دەسەڵاتەکانی کۆنی بنەماڵەیی پارێزگاکان و لادانی ســەرکردەکانی لەشــکری و دانانی ئەو کەسانەی دڵــخوازی بــوون. حاکمــانی هەرێمــەکان راســتەوخۆ لــە

بەرامبەری‌دا بەرپرسیار بوون. لە درێژەی ساڵی ١٧٣٠دا، نادر دوو دابی تازەی داهێنا: دزفوول و شووشتەری کە لە پێش‌دا وەک بەشێک لە کۆهکیلۆیە دادەندران و بە دەس حاکمەکانی داندراوی خۆی بەڕێوە دەچوون وەسەر پارێزگای عەرەبستانی خستن و ئەو حاکمە تازەیەی کە حەوێزە ناوەندی دەسەڵاتی بوو، کردی بە سەرۆکی ئەم شارانە، سەید فەرەجوڵلای موشەعشەعیشی لێخست و بە ماڵەوە بەرەو باشوور دووری خستەوە ناوچەی دەوەرەق(١).

ئەم کارە سەرسەرییە سەبارەت بە ناوەندی کۆنی پارێزگا ئاکامی پێچەوانەی لێکەوتەوە و هێز و دەسەڵاتی تایفە ڕکەبەرەکانی عەرەب، بەتایبەت «ئالی کەسیر» و «بنی‌کەعبی» پێهەڵابرد و برشت و سرشتی درندانەی ئەوانی پتر گەشە پێدا. دوابەدوای ڕێژەوی چاکی بەرهەم و دەغڵودان لە کۆتایی ساڵی ١٧٣٠دا ویشکەساڵی ملی پێوەنا و قاتی و گرانی و پەتا و نەخۆشی گشتی قوت بوونەوە. تەنینەوەی شەپۆلی چارەڕەشی و درێژەی وەرگیرانی خەرج و پیتاک بە شێوەیەکی کەڵەزەڕییانە و نەبوونی دەسەڵاتێکی ناوەندی لە بنەبانی ساڵی ١٧٤٠دا، هۆکارەکانی بەدیهاتنی دەورەیەکی تەوژم و چەوسانەوەی تێکڕایی و نافەرمانییەکانی حەوت ساڵەی دوای مەرگی نادری پێکهێنا[1].

لە سەرەتای ساڵی ١٧٤٧دا، «مەولا موتەللیب»ی(٢) لە باوکەوە نەوەی سەید فەرەجوڵلا، بە هاوکاری بەرپرسی خۆبەزلزانی خەزێنەی پارێزگا بە ناوی عەباس‌قولی‌خان، بەگلەربەگی نادرشای لە سەر کار لادا و خۆی لە جێی دانیشت. دواتر مەولا موتەللیب هێزەکانی تێکەڵەی محەممەدڕەزابەگی حاکمی شووشتەر و برایمیرزای تێکشکاند کە تازە لە لایەن عادڵشای برایەوە کرابوویە حوکمڕانی ئیسفەهان. مەولا دوای دوو مانگ گەمارۆی شووشتەر دەستی بە سەر داگرت. پاش ئەوەی نادرشا کوژرا، یەکێک لەم یادگارانەی عادڵشا لە دوای خۆی بەجێهێشت، گێڕانەوەی سیستمی ئیداری سەفەوییەکان بوو. مەولا موتەللیبیش کرا بە حوکمڕانی عەرەبستان. عەباس‌قولی‌خان(٣) بە ناوی حوکمڕانی شووشتەر

---

١ـ تەزکەرەی شووشتەری، ل ٩١٢؛ کەسرەوی، ل ١٤١ ـ ١٤٢.

c f. Oppenheim VI. Part 1, 13, 32.

بۆ مێژووی سەرەتای دەرکەوتنی موشەعشەعییەکان، بڕوانە:

Minorsky in EI 2 supplement, 160 - 163

دەستی کرد بە کار. بەڵام گێرە و کێشەکانی ناوچەیی حاکمەی موشەعشەعی بەرەو حەوێزە پاشەکشە پێکرد و ساڵی داهاتوو شێخ «سەعد»ی ئالی کەسیر لە مەیدانی شەڕا شکستی دا. پاشان شێخ سەعد بە مەبەستی لابردنی عەباسقولیخان لە سەر دەسەلاتی شووشتەر راپەڕی و لەو دەمیڕا جڵەوی هەردووک شاری لە بنکەی خۆیەوە لە سەحرای نێوان ڕووبارەکانی «کەرخە» و «دێز»دا بەدەستەوە گرت. تێکهەڵچوونی شێخی ئالیکەسیر و لایەنگرانی شارنشینی لەگەڵ داژدارانی موشەعشەعی و «بنیلام»یش لە لایەکی دیکەوە هەر نەبڕایەوە. بنیلام لە ساڵی ١١٦٧ی کۆچی / ١٧٥٣ی زایینیدا، لەگەڵ سەرهەڵدانەوەی عەباسقولیخان کەوتە شەڕێکی گەرمەوە. ئەم مەبەستە وێڕای تالانی تایفەی بنیکەعب کە ئێستا بەرەو دەوەرەق یانی تاراوگەی پێشووی حاکم لە حەوێزە کەوتبوونە ڕێ، بێپسانەوە دەبوو بە هۆی خەسارەت بۆ سەر کشتوکاڵی بەرێژەوترین بەشی پارێزگاکە.

شێخ سەعد(٤) لە ساڵانی سەرەتای ئەم رۆژگارەدا بە وریایی سیاسی و لێزانینێکی لەم چەشنەش کە لە بواری لەشکریدا بووی، سەربەستی نێوخۆیی دابین کرد. لە شەڕێکدا شامرادبەگی گوندوزلووی ئەفشاری حاکمی هەڵبژێراوی برایمپاشای لە شووشتەر بەزاند. وەختایەکیش لە سەر فەرمانی شاروخمیرزا، ساڵەخانی بەیات لە شاری شیراز فەرمانی دامەزرانەوەی محەممەدڕەزابەگی ڕاگەیاند[٢]، نوێنەرانی شێخ لە شووشتەر و دزفوول بەئاشکرا ئەوەندەیان پەلوپۆ داکوتابوو کە بتوانن بەرەورووی حکوومەتی ڕاستەقینەی ئێراقی عەجەم ببنەوە و جووڵە و خۆنواندنەکانیان بەرنەوە پاش: عەلیمەردانخانی بەختیاری کە شاسمایلی سێهەمی بە دەستەوە بوو، فەرمانێکی وردبینانەتری دەرکرد و شێخ سەعدی وەک والی (حوکمڕان)ی عەرەبستان بە ڕەسمی ناسی.

سەرەنجام ئەو کاتەی کە فەرماندەی بەختیاری لە ساڵی ١٧٥١دا، وەک پەنابەرێکی شکاو هاتە شووشتەر، توانی بە یارمەتی و کەیخودایەتی سەیدفەرەجوڵلای کەلانتەر(٥)، (لەگەڵ حاکمەکەی پێشوو لێتان تێکنەچێ)

---

٢ـ تەزکەرەی شووشتەری، ل ٩٨، ١١٣و١٦٣؛ کەسرەوی، ل ١٤٢ ـ ١٥٢؛ هەروەها بڕواننە:
Oppenheim VI, Part 1, 13, 33, 52- 53.

ئەوپەڕی میوانداریتی و پشتیوانی شێخی ئالیکەسیر وەدەس بێنێ. پاشان کارێکی کرد کە ساڵی دواتر چەکدارێکی زۆری ئێلجاڕی عەرەب بە سەرکردایەتی «شێخ عەلوان»ی کوڕی شێخ سەعد، لەبری سوارانی تێداچووی لوڕی بخاتە ژێر ڕکێفی. بەم شێوەیە لەگەڵ ئەم هێزانە بوو کە وێدەچێ بەهاری ساڵی ١٧٥٢، لە لوڕستان دەرکەوتبێ و چووبێتە کرماشان[٣]. چونکە میرزا محەممەدتەقی و عەبدولعەلیخان کە هێشتاش مەترسی پەلاماردران و تاڵانکرانیان لە لایەن هێزەکانی زەندەوە لە سەر بوو، بۆ ڕاکێشانی یارمەتی ئازادخان لە ئازەربایجان و عەلیمەردانخان لە خووزستان داخوازی لەم چەشنەیان ناردبوو.

## ٢ ـ ٢ شەڕی نەهاوەند

سەرداری بەختیاری لە ڕێگادا کەوتە گەڵ سمایلخان و لوڕە فەیلییەکانی ژێر ڕکێفی. سوارانی پێشەنگی پێوەندییەکی دۆستانەیان لەگەڵ دانیشتوانی قەڵا سازکرد، چونکە هێزەکانی زەند نەکەوتبوونە مابەینی ئەوان و قەڵا و ناوەندی سەرکردایەتییان لەو کاتەدا لە پردی شا لە ٦ کیلۆمیتری ڕۆژاوای کرماشان و لە قەراخ ڕووباری قەرەسوو دامەزرابوو. بەگوێرەی نووسینی گوڵستانە، کەریمخان ساڵی ڕابردووی تەرخانی ئارامی و هێمنایەتی فارس و ئێراق کردبوو بە ناوی شای ئاڵقەبەگوێی سەفەوی. شای ناوبراو ئێستا لەگەڵ غولامان و خزمەتکارانی تایبەتی لە ئیسفەهان دادەنیشت و مووچە و مانگانەی پاشایەتی وەردەگرت، بەڵام هیچ دەورێکی لە ڕووداو و گیروگرفتەکانی

---

٣ـ تەزکەرەی شووشتەری، ل ١١٤ ـ ١١٥ و ١٥٤؛ کەسرەوی، ل ١٤٦؛ موجمەلوتتەواریخ لە ل ١٩٢دا دەنووسێ کە لە ماوەی هەشت مانگاندا عەلیمەردانخان توانی، هەشتهەزار کەسێک شەڕکەر لە سەرڕێی ڕەوگەی کۆکاتەوە. بەڵام هەتا سەرەتای فێورییە جگە لە ناوچەی چوارمحاڵ لە هەموو شوێنێک شەڕی کردبوو. (هەڵبەت ئەوە وێناچێ وابێ چونکە ڕەوگەکانی زەردکێو گرفتاری بەفر و بۆران ببوونەوە.) بە سەرنجدانە شەڕی نەهاوەند کە لە ئاخری هاوین یان سەرەتای پایز ڕووی دا، دەبێ قبووڵی بکەین کە ساڵێکی برێک زیاتر پێچووبوو کە خۆی ئامادە کرد. بە مەبەستی باسی زیاتر سەبارەت بە مێژووی ساڵانی ١١٦٥ ـ ١١٦٦ی کۆچی، بڕواننە پەراوێزەکانی ژمارە ١٥ و ٢٤.

بەڕێوەبەرایەتی وڵات بە ئەستۆوە نەبوو. کاتی مانەوە لە ئیسفەهان کەریمخـان تەنیا سەربازگەیەکی گچکەی بۆخۆی گـل دایـەوە و زۆرینـەی لەشـکرەکەی بـە سەرکردایەتی محەممەدخانی زەند بە ڕێی هەمەدان‌دا ناردبوو بـۆ کرماشـان تـا شەڕ هەڵگیرسێنێ. وەختایەک محەممەدخان لە هەمەدان تێپەڕی بە چاونەترسی باوی خۆی بە پرتاو لەگەڵ حەفتا سواری سووکەڵەچەکەوە گەیشـتە پـەنایان و بەرەبەیانی دەستی دایە پەلامارێکی سەرسوڕهێن بۆ سەر هۆردووگـای دوژمـن و هەتا لای پێش‌قەرەوڵەکان گوڕمی بەست و نەڕاندی و فیشقاندی و پلاری تێگـرتن و خۆی بە چەکدارانی خووزسـتانی ناسـاند و گـەفی کـرد ئەگـەر بێتـوو خـۆ بەدەستەوە نەدەن هەمووان دەکوژێ. هەڕەشەکانی کاریان نـەکردە سـەر سـپای دوژمن، هەر بۆیە زۆری پـێ‌تێکچـوو و گـڕی گـرت و تاقەسـوارە تـاوی دانـێ. ئەسـپەکەیان ئـەنگاوت و وەختایـەک تێکهەڵـگلا و خـان پـەڕی، لاقـی شـکا. عەرەبـەکان وێکـڕا هرووژمیـان بـردێ تـا بـە دیلـی بگـرن. لـەم کاتـەدا گوللەبەرەڵلایەک بەرمیلە باڕووتێکی ئەنگاوت و سی‌چل کەسی لێ‌کوشتن. خانی پاشکاویشیان(٦) گێڕایەوە لای هاوڕێیانی و تێکـڕا بـەرەو هەمـەدان گەڕانـەوە. ماوەیەک دواتر بە سەرڕەو وەک هەزارەزیلە و پۆلـە چەکـدارێکی بـێ‌سـەرکردە هەوڵیان دەدا لەوێ دوور کەونەوە. لەم کاتەدا عەلی‌مەردان‌خان دەستێکی بە سەر و پۆتـڕاکی هێزەکـانی‌دا هێنـا و بارگـەوبنـەی بەکـەلک و بـەجێماوی سـپای ورەدۆڕاوی دوژمنی لە شەش فرسەخێک ئەولاتر لە حاجی‌ئاوا بـە تـالان بـرد و نۆسەدکەسێکی لێ بە دیل گرتن و خـۆی لـە پاشماوەکـەیان نەگەیانـد کـە بـە شەڵوکوتی لەگەڵ سەرکردەکەیان دەگەڕانەوە پەری[٤].

سەرەڕای هان‌دان و پێداگری میرزا محەممەدتەقی و عەبدولعـەلی‌خـان، سەرداری بەختیاری ملی نەدا کە بەم سـەرکەوتنە گـڕ بگـرێ و بکەوێتـە شـوێن دوژمن. سەرکردەکانی قەڵای کرماشان بەئاشکرا خوازیاری ئەمە بوون کە یەکێک لە یەکێک هان بدەن و نەیاندەویست خۆیان گیرۆدەی کەڵەگایەکی تـازە بکـەن. کەچی عەلی‌مەردان‌خان لانیکەم لە سەر ئەم هەوایە بوو کە دووبارە سـپاکەی بـە چەک و جبەخانەی زۆروزەوەندی قەڵا تەیار بکاتـەوە. پـاش وەرگـرتنی دوازدە دەزگا تۆپ، چل ڕۆژ دواتر بە مەبەستی گرتنی نیشتمانی زەند کە محەممـەدخان

٤ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٩٢ ـ ١٩٧.

پاشەکشەی بۆ کردبوو بزووت. توراب‌خانی نەهاوەندی(٧) کـە پێشـتر سـەر بـە خانی زەند بوو و ئێستا کەوتبووە نێوان دوو هێزی خەنیم، کەوتە بـەر وێـزەی عەلیمەردان‌خان و ناوبراوی وەپێش خۆی دا و بـە زۆری کـردی بـە چاوسـاغ و ڕێنوێنی هێزەکانی.

وەختایەک، ڕەنگە لـە مـانگی مـەی سالـی ١٧٥٢دا، گەیشـتە نیزیـک لەشکری سەرلەنوێ گردەوەبووی زەند، مـەودای ئـەم ڕۆژە شـەڕ و لێکـدانیان ئاکامێکی لێنەکەوتەوە. توراب‌خان دەیزانی کە کەریم‌خان بـە خـۆی و هێزێکـی پشتیوانەوە لە ئیسفەهان‌ڕا وەڕێ کەوتووە و پێـداگر بـوو کـە هـەتا مەترسـی یەکترگرتنەوەی دوو لەشکری زەنـد سـەری هەڵـنەداوەتەوە، دەسـتی خۆیـان وەپێش بخەن و شەو بە سەریان‌دا بدەن. ئەو شەوە سێ‌هەزار چەکـداری داخـواز ئامادە ڕاوەستابوون و توراب‌خان لەخۆوە هەوڵی دەدا کە سەرداری بەختیاری لە خەوی ناوەختی هەستێنێ، لای بەیانی تێگەیی کە تازە بۆ پـەلاماردانی دوژمـن زۆر درەنگ بووە. لە ماوەی دووهەم ڕۆژی شەڕ و تێکهەڵچوونا، هاوپـەیمانانی عەرەبی عەلیمەردان‌خان، بەتایبەت عەبدولعەلی‌خان و هێزەکانی ئازایەتییەکی زۆریان نواند، بەڵام تازە کەریم‌خـان ڕاسـتەوخۆ بـە فریـای هێزەکـانی زەنـد هاتبوو. تەمای گرت کە دەستەیەک لە سوارەکانی بنێرێتە پشت بەرەی دوژمن کە بارگەوبنە و کەلوپەلیان لـەوێ بـوو، هاوکـات لـە بـەرەی پشـتەوەش‌ڕا بـە شێوەیەکی ڕێک‌وپێک ڕاستەوخۆ دەس بکا بە پەلامار. هێزەکانی عەلیمەردان‌خان بەزین و ڕایانکرد؛ عەبدولعەلی‌خان هەڵاتەوە قەڵای کرماشان و توراب‌خان خـۆی خستە تەویلەی کەریم‌خان و بەخشرا. عەلیمەردان‌خان جارێکی تر ئاوارەی چیـا و چۆلان بووە و لە دووهەمین شەڕی‌دا لەگەڵ کەریم‌خان زۆر لە جـارانی پێشـوو پتـر لـە ئامانجـەکانی دوور کـەوتبۆوە[٥]. لـەم بەینـەدا محەممەدتـەقی‌خـان و عەبدولعەلی‌خان دیسـانیش ماوەیـەکی کـەم‌خایـەنی دیکـەیان بـۆ پاراسـتنی سەربەخۆیی ئینکەبەرانەیان دەس کەوت هەتا لە مەودای تەقەلایەکی ترا خۆیان لە ژێر پێخوستی هێزە پێکهەڵپرژاوەکان دوور بگرن. ئەمانـە دەبوایـە بـە پەلـە خۆیان لادەن لە بەرەوڕوو بوونەوەی ئەو ڕەوتـەی کـە بـۆ مـاوەی چـل سـاڵان مێژووی ئێرانی بە شێوەیەکی بەرچاو خستبووە ژێر چۆکی خۆی.

---

٥ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٩٧ ـ ٢٠٠؛ تەزکەرەی شووشتەری، ل ١٥٤.

## ٢ ـ ٣ قاجارییەکان

قاجار یەکێک لەو گەلە هۆز و تایفە تۆرەمە تورکانە بوون کە بەر لە هاتن یان دوا بە دوای یەکێک لە هرووژمەکانی سەحرانشینانی ئاسیای ناوەندی بەرەو ئێران سەرەولێژ بوون و ڕەنگە لە ڕەگەزی مەغوولان بن. مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتییان هەتا ڕۆژگاری دەسەڵاتی تەیمووری لەنگ[٦] کەوتۆتە ژێر پەردەی مژەکوێرەیەکی ڕەش و تاریک. بەگوێرەی گێڕانەوەکانی مێژوویی ناوبراو سەدهەزار تورکمانی لە سووریاوە کۆچ دا و لە ناوچە جیاجیاکاندا پەرەمپەرەمی کردن. لەم کۆچەرانە پۆلێک بۆ تورکیا و تاقمێکیش ڕادرانە قەفقاز و ئازەربایجان. قاجارەکان لە نێو ئەو دەستەیەدا بوون کە کەوتنە ئازەربایجان. هێندێک جاریش وایان داناوە کە ئەم خێڵە لە پاشماوەی ئەو دیلانە بن کە دوای شەڕی ئانکارا بە نێوبژیوانی سوڵتانعەلی کوڕی سەفییەددینی ئەردەوێلی(٨) لە چنگ تەیموور ڕزگار کراون و لەبەر ئەم کەیخودایەتی و خۆڕاگرییەی سوڵتانعەلی، دوای جووڵانەوەی شاسمایلی سەفەوی وەک یەکێک لە حەوت تایفەی قزڵباش بۆ سەرخستنی سەفەوییەکان دەورێکیان گێڕا. شاعەباسی گەورە کرینی بە سێ دەستە هەتا سنوورەکانی گەنجە و مەرو و ئەستەرئاباد بپارێزن[٧]. قەڵای مبارەکئابادی ئاوەدان کردەوە و بە مەبەستی پارێزگاری وڵات دایە دەس تاقمی ڕاسپێردراو لە ئەستەرئاباد. شوورە و دیوار و سازکراوی ئەم قەڵایە هی سەردەمی شاتۆماسبی یەکەم و لە باشووری لێواری ڕووباری گورگان هەڵکەوتبوو. دوو تیرەی قاجاران لە ئەستەرئاباد لەبەر چۆنیەتی هەڵکەوتنی لەومەڕگاکانیان پێیان دەگوتن یوخاریباش (سەرەوەی چۆمی) و ئاشاقەباش (خوارەوەی چۆمی) و لە سەر سەرۆکایەتی تایفە ملبەملەیان دەکرد. سەرۆکایەتی هەر دوو تیرەی تایفەکە هەتا ڕۆژگاری شاسوڵتانحوسێن، ئاخرین پاشای سەفەوی لە ئەستۆی یوخاریباشەکان بوو، بەڵام شاسوڵتانحوسێن ئەم

---

٦ـ لەگەڵ ئەمەشدا مێژوونووسانی سەردەمی قاجار بە درێژی لەم بابەتەوە دواون؛ لەم بارەوە بڕواننە: ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٤ ـ ٩.

7- cf Perry, (( Forced Miyration)) 205 - 206

سەرۆکایەتییەی دا بە فەتحعەلیخانی ئاشاقەباش. لە زەمانی تۆماسبمیرزادا فەتحعەلیخان بوو بە یەکێک لە گەورەترین سەرکردەکانی جێباوەڕی ناوبراو لە خەباتیدا دژی ئەفغانییەکانی داگیرکەر[8]. بەڵام وەک دەگێڕنەوە لە ساڵی ١٧٢٦دا بە شێوەیەکی خائینانە و بە ڕەزامەندی تۆماسبمیرزا بە دەس نادر کوژرا. ئەم تایفەیە لەبەر دارشتنی پیلانی کوژرانی، لە نادری پاوانخواز بێزراو و بێزار بوون، چونکە لە ڕاستیدا نادر زیاتر لە تۆماسبمیرزا، مەیل و پەلەی لەم کارەدا نواندبوو[9].

پاش بەڕێوەچوونی ئەم گەلاڵەیە سەرلەنوێ یوخاریباشەکان، بە ڕێبەرایەتی زەمانبەگ بوونەوە سەرۆکی تایفە. محەممەدحەسەنخان و محەممەدحوسێنخان، کوڕانی فەتحعەلیخان پاش کوێرەوەری و دەرد و مەرەدێکی زۆر ڕایانکردە «میاندەشت»ی[10] «قەبچاق»ی تورکمانسەحرا و محەممەدحوسێنخان کە برای گچکەتر بوو ماوەیەک دواتر مرد. لە ١٦ی ژانوییەی ١٧٤٤دا، محەممەدحوسێنخان بە خۆی و هێزێکی تێکەڵەی شەرکەرانی ئاشاقەباش و تورکمانی «یەمووت» گەڕایەوە و ئاخرییەکەی زەمانبەگی ناچار کرد پەنا بەرێتە شار. بە کورتی بەر لە ناردنی بێهبوودخانی ئەتەکی لە لایەن نادرەوە و دەرکردنی محەممەدحەسەنخان لە ئەستەرئاباد و ڕاکردنی بەرەو دەشتەکانی وێندەرێ، ناوبراو خۆی کردە سەرۆکی خێڵی قاجار. پاش چەند مانگان سەرۆکی ڕاکردووی تایفەی قاجار و هاوکارانی لە تیرەی یەمووت، جارێکی تر لە خوارەزم ئاژاوەیەکیان نایەوە. نادرشا عەلیقوڵیمیرزای برازای لەگەڵ بێهبوودخانی ئەتەکی بە مەبەستی سەرکوتیان گاڵ دا. محەممەدحەسەنخان، عەلیقوڵیخانی ناچار کرد بە تەنێ بۆی بچێتە مەیدان و

---

٨ ـ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، ل ٩ ـ ١٢؛ گیتیگوشا، ل ٤٤؛ مستەوفی، ل ٣؛ مێژووی ئێران، مێلکۆم، ل ١٢٢ ـ ١٢٥. Rabino, Mazandaran and Astarabad, 80.

٩ـ دونبولی، مەئاسر، ل ٩، مستەوفی، ل ٣: Lockhart, Nadir Shah, 14 – 16, 26.

١٠ـ دونبولی، مەئاسر، ل ١٠؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ١٣؛ سارەوی بەرگی یەکەم، ل ١٣ و

Malcolm (127 ff.), Bakikhanov (174) and sykes (277) Confuse the sons, marking Mohammad Hosayn the surviver.

دەستی لێوەشاند، بەڵام دیسانیش ناچار بوو پاشەکشە بکا[11]. لە کاتی مەرگی نادرشادا محەممەدحوسێنخانی یوخاریباش کە حاکمی هەڵبژێراوی ئەو بوو لە ئەستەرئاباد، بە دەستی لایەنگرانی محەممەدحەسەنخان لە سەر کار لادرا و ئاشاقەباشی تایفەی گەیشتە ئەو کۆمەڵە داخوازەی تا ئێستا بە چاوی مافی ڕەوای تێیهەڵدەڕوانین و بێپسانەوە خەباتی بۆ کردبوون[12]. بەڵام هێندەی پێنەچوو کە محەممەدحەسەنخان ڕایکردەوە ئەستەرئاباد، چونکە لەگەڵ عەلیقولیخانی کۆنەدوژمنی کە ئێستا پێیدەگوترا عادلشا بەرەوڕوو ببوو. لە زستانی ساڵی ١٧٤٨ ـ ١٧٤٩دا، عادلشا لە ناوچەی ئەشرەف بە دژی تایفەی قاجار دەستی کرد بە هێرش و پەلامارێکی ناشیاو و لەڕێوە ئەستەرئابادی گرت. کوڕەی چوارساڵەی محەممەدحەسەنخان یانی ئاغامحەممەدخانی داهاتووی ئەسیر و یەختە کرد[13].

هەڵمەتی عەلیقولیخان دیوارێکی لە بێزران و بێباوەڕی لە نێوان سەرداری قاجار و خانەدانی ئەفشارییەدا ساز کرد. سەرەڕای هەوڵ و تێکۆشانی شاسلێمان بە مەبەستی وەدەس هێنانەوەی دڵی خانی قاجار[14] و سەر وەبەر هێنانەوەیان و ڕاسپاردنی بۆ وەرگرتنی دەسەڵاتێک، ناوبراو خۆی لە هەر چەشنە پەیوەندییەک لەگەڵ پاشایەتی بەرەو توانەوە و پووکانەوەی خوراسان پاراست و نیشانی دا کە لە ئێرانی ڕۆژاوایی‌دا مەیل و وازی لە پێکهێنانی حکوومەتە. سەرەنجام دەستی کرد بە قایم و پتەو کردنی شوێن و شوێنپێی خۆی و بە هێمنی گیلان و مازەندەرانی خستە ژێر ڕکێفی؛ ئەم دوو پارێزگایە لە ئێران کەم و زۆر لە بەرامبەر دەسەڵاتی ناوەندیدا خەریکی بەربەرەکانییەکی نەهێنی بوون و بە بوونی لێڕەواری سامناک و چیا و تالاوە بەرفرەوانەکانی لێواری دەریا، بۆ هەر خانەدانێکی سەربەستیخواز، بە قەلایەک دادەندران. وردەکارییەکی ئەوتۆ سەبارەت بە تەنینەوەی دەسەلات و قەلەمڕەوی محەممەدحەسەنخان هەتا سەردەمی گرتنی ڕەشت نەنووسراوەتەوە. بە گوێرەی

11- see Lockhart, Nadir shah, 245 – 246.

١٢ـ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ١٤ – ١٥.

١٣ـ تەزکەرەی ئالی داود، ل ٧٧؛ گوڵشەنی مراد، ل ٤٤ ، موجمەلوتتەواریخ، ل ٤٧.

١٤ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٤٧.

نووسینی «نامی» حاجی جەمالی فوومەنی(٩) حاکمی ڕەشت لـە سالـی ١٧٥٠ڕا، سەرەڕای گەمارۆی شار هەر لەوێ مایەوە، بەلام ئاخرییەکەی لایەنگرانی خـانی قاجـار خائینانـە دەروازەکانیـان کـردەوە و پـاش گـرتنی ئـەم شـوێنە محەممەدحەسەنخان حازر بوو سەرلەنوێ بیکاتەوە حاکم، بەم مەرجەی ئەویش سەرۆکایەتی و حکوومەتی بێ ئەملاوئەولای قاجار بە ڕەسمی بناسێ و یەکێک لە خوشکەکانیشی بداتێیـە[١٥]. خـانی قاجـار پاشـان قـەزوێنی گـرت و گەڕایـەوە مازەندەران. ڕەنگە سالی دواتریش خەریکی قایمکردنی جێپێی خۆی بووبـێ لـە قـەزوێن. ئاخرییەکەشـی تـەمای گـرت کـە لـە ولامـی داخـوازی یارمـەتی عەلیمەردانخان و سەرکردەکانی قەلای کرماشان ڕوو بکاتە ئەو شوێنە[١٦].

## ٢ـ ٤ یەکەم هەلمەتی کەریمخان بۆ سەر ئەستەرئاباد

پاش ئەوەی کەریمخان هێزەکانی عەلیمەردانخانی تێکشکاند، فەرمانی دا قەلای کرماشان ـ کە دیسانیش قـایم کرابـۆوە و بـە ورەیـەکی زۆر بـەرزەوە پارێزگاری لێدەکرا ـ گەمارۆ دەن. لەم کاتەدا پێـی زانی کـە لەشـکری قاجـار ـ تورکمانی محەممەدحوسێنخان تەنیا ڕۆژەڕێیەکیان تا هۆردووبەزی ئەو مـاوە. هەر بۆیە کاری گەمارۆی دایە دەس تایفەی زەنگەنە و کەلهوڕ و فـەرمانی دا کـە دەوری قەلا بەرنەدەن. ئەو کات خۆی سەرەتای پایزی سالی ١٧٥٢، لەگەل بەشی هەرەزۆری هێزەکانی داگەڕان و بەرەگەیان لێگرت. سەرکردەی قاجار وەختایەک پاش ئەم ملانەی تازەیان دیسانیش کەریمخانی ئامادەی شەڕ و تێکراچوون بینی داترووسکا، بۆیە دەستی کرد بە پاشەکشە. سەرداری زەند ئـەم کشـانەوەی بـە

١٥ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٢٥ ـ ٢٦؛ گولشەنی مراد، ل ٤٥؛ ڕەوزەتوسسـەفای ناسـری، بەرگی ٩، ل ١٦، مونتەزەمی ناسری، ل ٢٩٩ و

Rabino , Mazandaran and astarabad 472 – 473 ، ڕابینۆ چاوی لە نووسراوەی نامی کردووە و پێی وایە مێژووی ڕووداوەکە ئاخری نوامبری ١٧٥١ بووە.

However, GD records on 12 July 1751 that Mohammad Hassan Khan, ((Fatty Cajar son,)) has taken Rasht and is ready to march on karim khan.

١٦ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٠٣ ـ ٢٠٥.

لاوازی لێکدایەوە و کەوتە سەری، بەڵام خانی قاجار خۆی لە شەڕ دەپاراست و بێپشوو بەرەو ئەستەرئاباد دەیئاژاوت.

هەرچەندە هەلومەرجی پێشووتر بۆ کاری ئەو زۆر لەبار نەبوو، بەڵام لێرەدا دەرکەوت کە وەکیل بڕیاری داوە لەم هەلە چاوەڕواننەکراوە زیاترین کەلک وەربگرێ و لە تافی گەشەی دوژمنی خودبەخود قین لە زگی، زەبرێکی تێسرەوێنێ. بۆ ئەوەی بەڕواڵەت تووشی هیچ بەربەرەکانییەکی ناوچەیی بێ هەتا ئەستەرئاباد کوتای. هەر لەڕێوە قەڵای ئەستەرئابادی لە سێلاوە گەمارۆ دا، لایەکەی دیکەی کەوتبووە سەر رووبار و ئەگەر پارێزەران لەو قۆڵیڕا یارمەتی درابان، وەبەرچاو نەدەهات. محەممەدحەسەنخان دیسانیش هەر خۆی لە شەڕ لا دەگرت. بۆ تەساڵحە لەگەڵ سەرۆکی زەند کۆمەڵێک پێشنیاری دەخستە ڕوو و حازر بوو کە سەد سەر ئەسپی ڕەسەن بکاتە پێشکێش و ئاغامحەممەدخانی کوڕی بە سێسەد سوارەوە وەک بارمتە بنێرێتە لای کەریمخان، بەڵام وەکیل زۆر قایم و پتەو ڕاوەستا و خۆی شل نەکرد و دەوری بنکەکەی سەخت تەنی و تینی بۆ هێنا[١٧].

خانی قاجار بەناچار هێزە تایبەتە پشتیوانەکانی هێنایە مەیدان. لە ماوەی دوومانگێکدا چەن هرووژم و پەلامارێک لە لایەن دانیشتووانی قەڵاوە کرایە سەر خانی زەند و هەڵمەتبەرانی تورکمانیش بە وردی لە دەشتەکانی گورگانەوە پێشڕەوییان کرد. چەکدارانی زەند لە بابەت تفاقەوە تووشی سەرەگێژە ببوون، چونکە چەکدارانی تورکمان یەسترەکانیان لە لەوەڕگایان دەفڕاند و ڕێگای هاتوچۆی گەمارۆدرانیان نائەمین کردبوو. هێزی زەند ناچار بوو بۆ پاراستن و ئاگاداری یەکسمەکانی پۆلێک چەکداری ئازایان لەگەڵ بنێرێ. بەڵام تورکمانەکان هەم ڕەوە و ئەسپەکانیان بدن و هەم چەکدارەکانیان شڕودڕ کردن. پاشەکەوتی خواردەمەنی و کەلوپەلی سەرەتایی بە شێوەیەکی ترسناک بەرەو تەواو بوون دەچوون و زستانیش نیزیک دەبۆوە. سەرەنجام سەرکردەی قاجار گەلاڵەی پەلامارێکی لە ژوورەوەی قەڵاوە داڕشت و خۆی سازدا کە لە بەرامبەر هێزەکانی دوژمنا بێتە مەیدان. بەگوێرەی گەلاڵەکە دەبوو پۆلێکی زۆر لە تورکمانەکان خۆیان لە قۆڵێکی بەرە و مەتەرێزاندا حەشاردەن، پاشان خۆی هرووژم بێنێ و لەڕێوە بکشێتەوە هەتا هێزەکانی زەند بکەونە شوێنی و هاوکات

---

١٧ــ مجمەلوتتەواریخ، ل ٢٠٢ و ل ٢٠٥ ــ ٢٠٩.

خۆمەلاسداوەکان هەلکوتنە سەریان. شالاوی تورکمانەکان بۆ سەر سەنگەری دوژمن و تالانی بارگەوبنەی لەشکر و پەلامارەکانیان لە پشتی بەرەوە بوو بە هۆی سەرلێشێواوی هێزەکانی زەند و لەتوکوت بوونیان. وەکیل ناچار بوو ئەوەندەی دەرفەت ماوە بەرەو تاران تێیقوولێنێ. لەبەر خۆڕاگری و بەربەرەکانی پۆلەسوارەی پاشەنگی سپاکەی بە سەرکردایەتی مووساخانی ئەفشار، بادانەوە و ڕاکردنی کەریمخان وەبەر چاوی دوژمن نەهات. ئەم مووساخانە برای ئەمیرگۆنەخانی ئەفشار بوو کە وەکیل دوای خزمانی لە هەموو کەسی زیاتر متمانە پێدەکرد.

کەریمخان پتر لە نیوەی لەشکرەکەی بە شەلوکوت و کوژراوی و دیلی لە پاش خۆی بەجێهێشت؛ زیاتر لە نیوەی کوژراوەکانیش لە وەختی گەمارۆ و بەر لە دەسپێکی شەڕی ڕاستەقینە تێداچووبوون[18]. ئەوەی لەو وەختیدا زۆر گرینگ دیاری دەدا، شاسمایل بوو کە خۆی جڵەوکێشی جێنشینی میرایەتییەکەی دەکرد و لێرە دایەوە دەس خانی قاجار. هەڵبەت بە فیتی زەکەریاخانی وەزیر، شای ناوبراو خۆی دابوویە دەس خانی قاجار و زۆریش بە ڕووی خۆشەوە پێشوازی لێکرا. ماوەیەک دواتر کە خێڵی قاجار ڕەشتی هێنایە ژێر چنگی خۆی، چەند چەشن سکە بە ناوی شاسمایل لێدران[19]. سەیر ئەوە بوو کە

---

١٨ ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٠٩ ـ ٢١٣؛ گیتیگوشا، ل ٢٨ ـ ٢٩؛ سارەوی، ل ١٣ ـ ١٤؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی٩، ل ١٦ ـ ١٧. ژمارەی کوژراو و بریندارەکان پێکەوە جیاوازن و یەکتر ناگرنەوە و وێدەچێ هەموویان زۆریان پێوە نابێ. گولستانە دەنووسێ کە کەریمخان نیزیکەی هەموو لەشکرەکەی کە ٤٥هەزار کەس بوو لە دەس دا و ژمارەی ئەو تورکمانانەی کە شەڕیان بۆ محەممەدحەسەنخان دەکرد بە ٣٠هەزار چەکدار دادەنێ. سارەوی لای وایە کە بێجگە لەو ٤٥هەزار کوژراوەی زەندیە، ١٥هەزار کەس لە ماوەی چل ڕۆژەی گەمارۆ و ١٥هەزاری دیکەش لە وەختی کۆکردنەوەی تفاق و ئازووخەدا کوژران، هەروەها پاش ئاخرین شەڕ و لێکدان دەپازدەهەزار کەسێکیان لێ بە دیل گیراوە.

١٩ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢١٤ – ٢١٥؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٢٠ و
11 August 1754; Rabino, Coins, Medals and seals, 48.
سوبحانی وتاریکی لە گۆڤاری «توێژینەوەکانی مێژوویی»ساڵی حەوتەم، ژمارە ١، ل ٢٥٨دا نووسیوە

محەممەدحەسەنخان نەکەوتە شوێن دوژمنی بڕستبڕاو و هەر ئاوای واز لێهێنا. ڕەنگە هاوپەیمانانی تورکمانی لە بەر وەدەس هێنانی دەسکەوتەکانی شەڕ و گرتنی دیلان کە کاری لەمێژینەیان بوو، هەر بەوەندەیان واز هێنابێ و سەربەخۆ خەنیمەتەکانیان ڕاپێچی سەحرا کردبێ و گوێیان نەدابێتە فەرمانەکانی[٢٠]. محەممەدحەسەنخان زۆر بە نەرمی و بەزەیی لەگەڵ ئەسیرەکان جووڵایەوە و بۆ مانەوە و نەمانەوەیان لە هۆردووی خۆیدا کردنی بە سەرپشک. نووسراوەکانی نامی وا نیشان دەدەن کە زۆربەی دیلەکان مەیلیان وابووە کە بچنەوە نێو پاشماوەی هێزەکانی کەریمخان و بە کوێرەوەری گەڕانەوە تاران. هێزەکانی زەند دوو مانگی دیکەش لە تاران لەنگەریان خست و چاوەڕوانی تێپەڕینی زستان و ساڕێژ بوونەوەی برینەکان مانەوە[٢١].

نەرم جووڵانەوەی لە ڕادەبەدەری محەممەدحەسەنخان سەبارەت بە کڕینەوەی دیلەکان لە لایەن دوژمنەوە دوای سەرکەوتنێکی وەها پرشنگدار لە یەکەم تێکهەڵچوونیاندا، تەنیا نیشانەی تۆزێک لاوازییە لەبەر گەڕانەوەی سپای تورکمانی. وا وێدەچێ کە بە مەبەستی ڕێککەوتنی باوی سیاسی هیچ هەوڵێک نەدرابێ و ڕەنگە خانی قاجار لێی حاڵی بووبێ کە کەریمخان هەتا زەمانێکی مەترسییەکی وەها گران لە داوێنەکانی ئەلبورز تێکنەشکێنێ ناتوانێ بێدەنگ دانیشێ و بسرەوێتەوە. لەم کاتەدا کە وەکیلوددەولە شای ئالقەبەگوێی لە کیس دابوو، هەواڵێکی وای پێگەیشت کە گۆیا دیسان عەلیمەردانخان لە چیا و کوێستانەکانی بەختیاریڕا داگەڕاوە تا دەگژی ڕاچێ، بۆیە بەپرتاو بەرەو دوایە گەڕایەوە هەتا بالادەستی خۆی لە کێوەکانی زاگرۆسا بپارێزێ[٢٢].

---

٢٠ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢١٥؛ خانی قاجار بۆخۆی چەکدارانی تورکمانی ناردەوە سەر ماڵ و حاڵیان. لە بەرامبەر هاندانی فەرماندەکانی دا بە مەبەستی پەیکەردەی دوژمن ڕاوەستا و گوتی دەیهەوێ لە مازەندەران وەمێنێ و ناوچەکانی داگیرکردووی ئەهوەن کاتەوە و پایەکانی دەسەڵاتی قایم بکا؛ هەروەها لە ل ٢١٤دا گوتوویەتی کە دیلەکانی لە سەر حیسابی کیسەی خۆی بە پووڵێک کڕینەوە و ئازادی کردن و تورکمانەکانیش خۆیان دزییەوە و بەرەو سەحرا تێیانتەقاند.

٢١ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢١٤ ـ ٢١٥؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ٣٠.

٢٢ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٣٠.

## ٢ ـ ٥ گەمارۆی قەڵای کرماشان

لە درێژەی ئەم ماوەیەدا قەڵای دەورەدراوی کرماشان بەتابشتەوە خۆی ڕاگرتبوو. تایفەکانی زەنگەنە و کەڵهوڕ سەرەتا مەڕ و گاڕانی دانیشتووانی قەڵایان ڕادا و ڕفاندیان(١٠) و سەرەڕای تۆپبارانی ڕۆژانە و شاڵاوەکانی پارێزەران شەشمانگێک ئەوێیان بە شێوەیەکی سەخت گەمارۆ دا[٢٣]. ئەگەرچی خوردوخۆراک و ئازۆخەیان خەریک بوو بنەی دەهات، بەڵام گەمارۆدراوان هەروا ورەیان بەرز بوو. لە ڕۆژی ١٦ی نوامبری ١٧٥٢دا سامانێکی مفت و مەرحەبایان بە سەردا ڕژا[٢٤]. کاروانە تفاقێکی خەڵکی قەڵا کەوتە بۆسە و تاقمێک لە

---

٢٣ـ ڕووداوێکی ناسەرەکی دیکەیە کە دوابەدوای شەڕی کرماشان و کوژرانی عەلیمەردانخان بە شێوەیەکی شوێندانەر لە لای گولستانە ڕەنگی داوەتەوە (موجمەلوتتەواریخ، ل ٢١٦ـ ٢١٧). نووسەر خۆی لە نێو گەمارۆدراوانی قەڵادا ژیاوە و لە وتووێژەکانی بەدەستەوەدانی قەڵاشدا ئەندامی شاندەکە بووە. ئەو نەقڵە دوورودرێژەی ئەو نووسیویەتی، تەنیا بەڵگەیەکی بەردەستە لەم بارەوە.سەیر ئەمەیە هیچکام لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان و مێژوونووسان هەر بە حاڵودووبەڵاش باسیان نەکردووە و بەڵگەکانی ئورووپاییش ئاماژەیەکیان نەداوەتە ئەم مەبەستە. وا دیارە ئەم هەڵکەوتە لەچاو لەشکرکێشی کەریمخان بۆ سەر ئەستەرئاباد و بەزاندنی عەلیمەردانخان گرینگایەتییەکی ئەوتۆی نەبووە. بە هەرحاڵ هەر لە سەرەتاوە قەڵا شوێنێکی بارناسک و گرینگ بوو کە کەریمخان لە دەسپێکی کاری خۆیەوە، زۆری بایخ بۆ دادەنا. گێڕانەوەی گولستانە بێخەوش نیە و بۆ وێنە لە هەردووک شەڕاندا کە زەند لەگەڵ دانیشتووانی قەڵا تێکهەڵچوون بە شێوەیەکی ڕۆمانتیک ڕووداوەکانی گێڕاوەتەوە و لەم چەشنە مەبەستە پڕهەستانە لە کتێبەکەیدا زۆر دەبینددرێ کە دەبێ وەبەرچاو نەگیرێن.

٢٤ـ لە دەقی بلاوکراوە بە دەس ڕێزدار مودەڕڕیسی ڕەزەوی (موجمەلوتتەواریخ، ل ٢١٨ و یادداشتی ژمارە ٥)دا لە نێو ڕووداوەکانی ئەم ڕۆژانەدا تەنیا بۆ ئەم هەڵکەوتە، ڕێکەوتێکی دیاری کردووە و دەڵێ ئەم ڕووداوە لە ڕۆژی سێشەممەی ٩ی محەڕڕەمی ساڵی ١١١٥ی کۆچی بەرامبەری ٢٨ی نوامبری ١٧٥١دا قەوماوە. بەڵام ڕەزەوی ڕێکەوتی ١١١٥ی وەک سەرەوە ڕاست کردۆتەوە. ڕەنگە مێژووی دروستی ڕوودانەکە ساڵی ١١١٥ی

گەمارۆدراوان هرووژمیان بـۆ بـرد و کێشـە و هەرایـەک لـە مابـەینی ئـەوان و گەمارۆدراوانا قەوما و عەبدولعـەلی خـان وێـرای دووسـەد کەسـێک لـە قـەڵا دەرکەوت هەتا ڕزگاریان بکا. لە سەر ئەم مەبەستە شەڕێک ڕووی دا و لە لایـەن قەڵاشەوە عەبدولعەلیخان پشتی قایم کرا. قۆڵی ڕاسـتی شـەڕکەرانی کەڵـهوڕ بەرەو شار و دەرەوە ڕەپاڵ نران(١١). تەواوی هێزەکانی دوژمن بۆ وێنە سـەرۆکی کوێری تایفەی زەنگەنە نەجەفقولیخان هەتا وڵاتی خۆیان هاروونئاوا کـە لـە کرماشانەوە شەش فرسەخێک دوورە ڕایانکرد. (هەر فرسـەخێک نیزیـک شـەش کیلۆمیترە.) پارێزوانانی سەرمەست لـەم سـەرکەوتنە ٣٥٠ تۆپیـان هاویشـت و سـبەی بـەیانی بـە مەبەسـتی پڕکردنـەوەی بۆشـایی پاشـەکەوتە بـەرەو تەواوبوونـەکانیان هـەموو عـەمبارەکانی شـاریان بـەتاڵ کـرد و زۆربـەی شارنشینانی ماقووڵ و باڵادەستیشیان دنە دا تا ئازووخەیان لەگەڵ بگوێزنـەوە. بەڵام حەوتووی دواتر لەپڕ شارنشینان هەڵگەڕانەوە و چاکەی پێشوویان وەلانـا و بە دەستی زۆر ڕاسپێراوان و کارگێڕانی تالانی عەمبارەکانیان دەرکرد. وا دیارە تایفەی زەنگەنە کە لە وەختی گەمارۆدا وەک پێویست چاوەدێرییان نـەکردبوو، بـە مەبەسـتی دانی ڕاپـۆرتی پاشەکشـەیان بـە پەلـە چووبوونـە خزمـەت محەممەدخانی زەند هەتا بەر لە توێژینەوە لە سەر ڕووداو و ئەرکـەکانیان لـە نیزیکەوە، پیاوەکانی تایفەی کەڵهوڕ تۆمەتبار بکـەن؛ بـۆ تۆڵـە ئەسـتاندنەوە خێرا سادقخان بە خۆی و هەزار سوارەوە بەڕێ کرا، ئەو هەر لە پێشدا هەواڵـی نیزیک بوونەوەی خۆی بۆ خەڵکی وازیوازی و دەمدەمی شار نارد و لـە ئاکـامدا ئەوان کاریان تێکرا[٢٥].

دیسان قەڵا کەوتە گەمارۆ، هیچکام لە دەورگێڕان متمانەیەکی تەواویان نەبوو بۆ دیدار و گفتوگۆ. شەڕکەرانی پارێزەری قەڵا دەترسـان دیسـانیش ئـەم ئاڵوگۆڕانە بیانخاتە نێو گێژاوی قاتی و قڕی و دەیانویست دەستیان بگاتە شار. عەبدولعەلیخان ڕاسپاردەیەکی ناردە لای سادقخـان کـە ڕۆژی دواتـر دیـداری لەگەڵ بکا(١٢). سادقخـانی زەنـد بـە پـارێزەوە پێشـنیارەکەی قبـووڵ کـرد،

---

کۆچی و لانیکەم شەشمانگ پاش شەڕی نەهاوەند بێ. بەگوێرەی دەقی سەرەکی کتێبەکە ئەو هەڵکەوتە بەر لەساڵی ١١١٦ی کۆچی / ١٧٥٢ی زایینی ڕووی داوە.

٢٥- موجمەلوتتەواریخ، ل ٢١٦ ـ ٢٢٠.

ئەگەرچی ترسی فێڵوفرتێک لە گۆڕێ دابوو بەڵام ڕەنگە ئەوان سەبارەت بە شوێنکەوتی کارەکان لە ڕادە بەدەر بەپارێز بووبن. بە هێرشی چەکدارانەی سەربازگەی قەڵا سپای سادقخان تا نێو باغەکانی قەراخ شار پاشەکشەیان پێکرا و دابڕدابڕیان تێکەوت و پەرمەپەرمەم بوون. هۆردووگایان تاڵان کرا و گەلێکیان بە دیل گیران و لێرەدا دەکرێ باسی پۆلە ژنەی نێو لەشکر بکرێ کە پاشان عەبدولعەلیخان بێ ئەوەی کەس دەستیان بکاتێ بۆی ناردنەوە. سادقخان بە شەرمەزاری گەڕایەوە پەری[٢٦]. محەممەدخانی تووڕە خۆی لەگەڵ دەهەزار شەڕکەری زەند کەوتەڕێ هەتا چاوەدێری کاری گەمارۆ بێ.

گەمارۆدراوان شووره و مەتەریزەکانیان قایم کرد، سێ هاوەن (خۆمپارە)یان دامەزراندبوو کە کێشی هەر گوللەیەکیان ٨٠پۆند (٣٦کیلۆ) بوو. ئەمانە پشتیوانی ئەم سێ تۆپەی نێو سەنگەرێکی بەر دەروازەی گەورە بوون کە سەنگی گوللەکانیان ١٨ کیلۆ بوو. محەممەدخان بە چەشنێکی ئاقڵانە دەستی کرد بە شێوە شەڕی پارتیزانانەی تایبەتی تایفەی زەند. تاقمێکی چەکدار نارده بەرەوە تا خۆیان مەڵاس دەن و سبەی بەیانی وەختایەک ڕەوە دەچوو بۆ لەوەڕ، نیوەی ئەسپەکانی سەربازگەیان دزی. محەممەدخان هەر کە دامەزرابوو، سەرلەنوێ تایفەکانی زەنگەنە و کەڵهوڕی بە مەبەستی کەلک وەرگرتن لە هێزی شەڕکەرانیان بانگهێشتبوو. ڕاگەیاندراوێکی بڵاو کردەوە و وەبیری هێنایەوە کە دەبێ قەڵا بدرێتە دەس هێزەکانی کەریمخان. وەختایەک پێشنیارەکەیان بردەوە دواوە تا مانگی داهاتوو بە شێوەیەکی چڕوپڕ دەوری قەڵایان تەنی. پاشان لە سەرەتای ساڵی ١٧٥٣دا نەخشەی پەلاماری بۆ سەر قەڵا داڕشت. سێچوار هەزار سوار لە سێ لای قەڵاوە خۆیان حەشار دا. لەو لایەش کە بەرەورووی شاری کرماشان بوو، چاردەهەزار شەڕکەرێک لە پشت دیوارەکان دەستیان تێکگرت. لە کاتی ڕۆژاوادا کە سەربازگەی قەڵا خەریکی حەسانەوە و پشوودان بوو و کەمتر چاوەدێری بارودۆخەکە دەکرا، هێرشێکی ڕێک و پێک و هاوکات دەستی پێکرد؛ ئەگەرچی سوارەکانی زەند بە مەبەستی کەمکردنەوەی شوێن و کارکردی گوللەکانی چەشنهێشوو و بێنێوبڕی تۆپەکانی قەڵا تۆزێک لێکدوور دەڕۆیشتن، وەختایەک گەیشتنە بەر تیرپەڕی تۆپچییەکان، پەلامارەکەیان

٢٦ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٢١ ـ ٢٢٩

تێکشکا. پاش ئەم شالاوە محەممەدخان سەنگەربەندییەکی لار و کۆمی بە شێوەیەکی وەستایانە سازدا. تاقمێک پیادەی ئازا و حۆڕاگری کردە بەرپرسی بەڕێوەبردنیان. بەم شێوەیە پارێزەران چاردە مانگێکی تر کەوتنە بەر دەسڕێژی تفەنگچییەکان، بەلام لە سایەی بورج و شوورەی قایمی قەلاوە تووشی خەسارێکی کەم هاتن[٢٧].

پارێزەران و بەرگران جارێکی تر بەرەورووی تارمایی قاتی و قڕی وردەوردە بوونەوە. سەرەنجام دوو کەسی شووشتەری کرێکاری قۆرخانە بە مەلە لە ڕووباری قەرەسووی پەنای قەلاکە پەڕینەوە و خۆیان گەیاندە بنکەی سەر چیای عەلیمەردانخانی بەختیاری لە لوڕستان. وەختایەک کۆمەلە هەوالێک سەبارەت بە گەڕانەوەی تازەی کەریمخان لە مازەندەرانەوە بلاو بوونەوە، سەرداری بەختیاری خۆی بەناچار زانی کە بکەوێتە بیری پارێزەرانی قەلا، بەلام لەشکرێکی تەیاری ئەوتۆ کە بتوانێ یاریدەی سەربازگەی کرماشان بدا بە دەستەوە نەبوو. کەچی لە ولامی فریاخوازاندا گوتی کە هەتا دوو مانگی داهاتوو بە یارمەتی وەرگرتن لە هێزەکانی پاشای بەغدا بەرەو ئەو ناوچەیە دەکەوێتە ڕێ. هەروەها ئەم دوو کەسەی بە چەند بارە تووتن و خوێوە ناردەوە لای شەڕکەرانی قەلا(١٣) و ئەم نێوان و پێوەندییە بە شێوەیەکی ئاشکرا دنەی خۆڕاگری پارێزەرانی دا.

نووسەری موجمەلوتتەواریخ دەنووسێ کە خۆی گەلالەیەکی پێشنیار کردبوو کە بە مەبەستی بەڕێوەچوونی حەفتا سوار هەلیانکوتایە سەر سەنگەرەکانی پێشەوەی دوژمن و تەواو خافلگیریان کردن و توانیان پۆلێکی بەرچاو بکوژن و تاقمێکیش بە کەمەند ئەسیر بکەن. بەلام کەمەرخان(١٤) کە یەکێک لە چالاکترین شەڕوانانی زەند بوو تاقمێک لە سەربازانی لە شاری کرماشانەوە دەنگ دا و دژەپەلامارێکی توندوتیژی دەسپێکرد کە هەلمەتبەران ناچار بوون بکشێنەوە و ڕاکەنەوە نێو خەندەکەکانی قەلا. دوو دەستەی شەڕکەر وا لێک نیزیک بیوونەوە کە عەبدولعەلیخان لە ترسی چوونە ژوورەوەی هێزەکانی زەند لەگەل چەکدارانی خۆی و گرتنی قەلا، دەروازەی نەکردەوە. سەرەنجام پاش هەلێکی ناسک و تەنگەتاو لێبڕا کە شوێنی تێکهالقانی

---

٢٧ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٢٥ ـ ٢٣١.

شـــەڕکەرانی هـــەردوولا بداتـــە بـــەر تۆپـــان و ســـەیر ئەمەیـــە پەلامارەکـــەی وا ڕێکخستبوو کە لەشکری زەند دەستی لێکبەردا و ڕەوی، بەڵام پیاوەکانی خـۆی تووشی خەسار نەهاتن و پاش تەقەی تۆپان خێرا خۆیان بە قەڵادا کـردەوە. لــە حەیفی سەرنەکەوتنی دژەهێرش و هەڵمەتی، ماوەیەکی زۆر لە پـەنا شـووره و دیواری قەڵا، لەو شوێنەی کەوا چەکدارەکانی ئەستاندبوویانەوە، ڕاوەستابوو و گوێی نەدەدایە ئەو هەموو بانگ و هاوارەی فەرماندەکانی کە لە مەودای تیرپەڕی دوژمن لا کەوێ و بچێتە نێو ڕیزی ئەوان، بەڵکوو لــە بەرامبــەر گرمــە و ئــاگری تۆپان هەنگاوێک نەکشایەوە. سەرکردەکانی سپا کە بێباکی و بوێرییەکەی کاری تێکردبوون، هەوڵیان دەدا هـــەرچۆنێک دەکـرێ لـــەوێی ببزێــون؛ بـــەڵام تـــەنیا وەختایەک خانی غەمگین و دڵشکستە دەستی لە چەقین هەڵگرت کە محەممەدخان بۆخۆی هاتە پێش و بە هێمنی هانی گەڕانەوەی دا[٢٨].

محەممەدخان ئێستا مەتـــەرێزەکانی وا بـــەربڵاو کردبـــوو کـــە تەنانـــەت بەستێنی ڕووباری قەرەسووی پەنا قەڵاشی دەگرتەوە. هەشت خۆمپارەهاوێژ کـــە سەنگی هەرکام لە گوللەکانیان ١٨٠ کیلۆ بوو، یـــەکبین بـــەرەو قـــەڵا خرمژنیـــان دەکرد و بەم زەبرانە خەسارێکی زۆر بەر شووره و زاخەکانی جبەخانە دەکەوت و بیستوچوار کەسیش کوژران. گرفتێکی کەوا ئێستا ســـەری هەڵـــدابوو، کێشـــەی قۆرخانە و باڕووت بوو. ئەمانەیان لە ناوەندی قەڵاوە ڕاگوێزتە گۆشـــەیەکی لای دەروازەی باکوور و لە قوڵکەیەکدا سەریان داپۆشین و لێژەیەکی ٨٠هەزار گوللە تۆپیان لە سەر کەڵەکە کردن هەتا بارە باڕووتەکان لـــە زەبـــری چـــەکی دوژمـــن بپارێزن. بە مەبەستی قەرەبووی تۆپبارانەکە هێرشێکی درەوشاوەی تر ڕێکخـــرا. دووسەدوپەنجا کەس کە بەرگی سەرتاپا ســـپی و چەشـــنی جلـــی ئـــەفغانییانیان پۆشـــیبوو و بـــە زاراوەی ئـــەفغانی دەدوان لـــە پـــەنا شـــوێنی دامـــەزرانی تۆپـــە

٢٨ ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٣١ ـ ٢٣٧. کەمەرخان لە چەند شـــەڕاندا ئازایـــەتی نوانـــد: بەگوێرەی نووسینی ڕەوزەتوسسەفای ناســـری، بـــەرگی ٩، ل ١٩، ئـــەو دوو کـــەس لـــە پاڵەوانەکانی قاجاری لە شەڕی ئەســـتەرئاباد گۆڕەهـــوو کـــرد، بـــەڵام دوایـــە بـــە دەس محەممەدحەسەنخان لە کەمەریڕا کرا بە دوولەت. بەو پێیەی کە بێگومان لـــەم شـــەڕدا زیندوو بووە، ڕەنگە نووسراوەکەی ڕەوزەتوسسەفا لەبەر یەکترگرتنـــەوەی جەمســـەری قسەکان ڕێکخرابێ. (مەبەست ناوی کەمەرخان و لەت بوونی لە «کەمەر»ەوەیە.)

گچکەکانی لای ڕۆژهەلاتی قەلا کۆمەلەیان بەست. شەو لە قەلا دەرکەوتن و هێرشیان برد؛ پیاوانی نێو مەتەرێز کە ئەم دیمەنەیان بینی، پێیان وابوو کە ئازادخان و سەربازەکانی بە هاواری گەمارۆدراوانەوە هاتوون، بۆیە سەری خۆیان هەلگرت و تێیانقووچاند و هێرشبەران ئەم تۆپە مەترسیدارانەیان وەچنگ کەوت و لەوێ دامەزران.

محەممەدخان ڕاکردووانی بێڕوحمانە سزا دا و لەم بارودۆخە نالەبارەدا جارێکی دی پەیامی بۆ سەربازگەی قەلا نارد و ڕایسپارد ئەگەر بێتوو دەس بدەن بە ڕووی خۆشەوە وەردەگیرێن. ئەگەرچی پێنج مانگێک بە سەر چرکردنەوەی گەمارۆدا تێپەڕ ببوو، بەلام هێشتاش بارودۆخی دەورەدراوان ئەوەندە بەهێز و بەمتمانە و دلخۆشکەرە بوو کە بتوانن پێشنیارەکانی بەرنەوە پاش. لەگەل ئەمەشدا کەم بوونی ئازۆخە و دلنیا نەبوون لە بابەت بەلێنە خۆشەکانی عەلیمەردانخان، شەپۆلێکی ئاژاوە و دلەڕاوکەی ساز کردبوو. دوو مەلەوانە شووشتەرییەکە سەرلەنوێ بە نێو سپای زەندا تێپەڕین و ڕەوین، مەودای ٢٥٠ مایلەی نێوان کرماشان و بەغدایان بە پێنج ڕۆژان بڕی[29]. عەلیمەردانخان ماوەیەک بوو لەم شارە دەژیا و خەریکی داڕشتنی پلانێکی وا بوو کە ئاخرییەکەی بتوانێ سەرکەوتنی یەکجارەکی بە سەر کەریمخاندا بۆ مسۆگەر بکا.

## ٢ ـ ٦ شاسولتانحوسێنی دووهەم

بەغدا بە سەرکردایەتی سلێمانپاشای ڕووناکبیر و وریا وەک ناوەندی پەنابەرێتی خەسارمەندانی سالانی کۆتایی ژیانی نادرشای لێهاتبوو. بەتایبەت ببوو بە پەنا و پەسیوی ئەو ڕاکردووانەی کە لە سەردەمی دەسەلاتی جێنشینانی نادرەوە لەبەر کۆمەلێک ئاژاوە و نائەمینی بەربلاو یان بە خاتری پەیوەندی سیاسی و بێمەیلی سەبارەت بە درێژەی ژیان لە ئێرانا، ئەم ولاتەیان جێهێشتبوو. لەم تاقمە دەکرێ ناوی میرزا مەهدیخانی ئەستەرئابادی، نووسەری کتێبی زۆر بەناوبانگی «دوڕڕەی نادری» و مستەفاخانی بیگدلی

29ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٣٨ ـ ٣٤٢.

شاملوو بێتە گۆڕ. نادرشا ئەم دوو کەسەی وەک باڵوێز بە مەبەستی نوێ کردنەوە و ئیمزای گەڵاڵەی پەیمانی ئاشتی ساڵی ١٧٤٦، ناردبووە لای سوڵتانی عوسمانی. وەختایەک هەواڵی کوژرانی نادرشایان پێگەیشت کە لە بەغداوە بەرەو ئیستامبووڵ کەوتبوونەڕێ؛ میرزامەهدیخان دوای بیستنی ئەم هەواڵە گەڕایەوە ئێران، بەڵام مستەفاخان بەڵگەی نەچوونەوەی خستە بەر دەستی بارگای سوڵتانی عوسمانی و حازر بوو کە وەک میوانێکی ماقووڵ لای پاشای بەغدا وەمێنێ هەتا سەرەنجام لێی حاڵی بێ کە خۆر لە کام لاوە هەڵدێ[30].

ماوەیەک بەر لە هاتنی عەلیمەردانخان و سمایلخانی فەیلی کە دوو جار لە بەرامبەر هێزەکانی زەندیەدا بەزیبوون، پەنابەرێکی دیکە لە بەغدا پەیدا ببوو کە دەیگوت کوڕی شاتۆماسبی دووهەمە[31]. مستەفاخان بڕوای وابوو کە هەموو منداڵەکانی شاتۆماسبی دووهەم بە دەستی مەحموودی غەلجایی و پاش ئەویش بە دەس نادرشا کوژراون، هەر بۆیە گوێی بەم داوایە نەبزووت، بەڵام کۆمەڵێکی زۆری خەڵکی ئاسایی و پەنابەرانی ئێرانی سەرنجیان کەتبووە سەری و خودی پاشاش لانیکەم بەر لە ژووەنی ساڵی ١٧٥١، باوەڕی بەم داوایە هێنابوو. هەڵبەت هیچ دوور نیە کە پاشاش لەبەر ئامانجەکانی سیاسی-لەشکری لەم ڕێبازەدا پێشقەدەم بووبێ[32]. وێدەچێ مستەفاخان و عەلیمەردانخان بەر لە بزووتن بەرەو خوزستان یان هەرنەبێ بەر لە شکستی تازەی خانی بەختیاری چەند جار پێوەندییان بە یەکترەوە کردبێ و هەلومەرج و توانستەکانیان هەڵسەنگاندبێ، بۆیە خێرا کەوتبوونە بیری دەرفەتهێنان لە

---

٣٠- تاریخی گیتیگوشا، ل ٣٢، موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٤٢.
Sp 97, 33 (1751 – 1752), 203. See 15.3, below.

٣١- موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٤٣؛ دونبولی، ل ١١ و ١٧. ئەم خوازیارەش وەک یەکێک لە کوڕانی شاسوڵتانحوسێن ناوبانگی ڕۆیشتووە (گیتیگوشا، ل ٣١)، وا دیارە لەگەڵ ناوێکی پاشایەتی پەسەندکراو تێکەڵ بووە. مەرعەشی لە ل ٨٢ و ٨٤دا دەنووسێ کە شاتۆماسبی دووهەم تەنیا دوو کوڕی بووە.

٣٢- GD VI,12 July 1751 دەنووسێ کە سلێمانپاشای بەغدایی بە ڕێبەرانی ئێرانی ڕاگەیاندووە کە کوڕی شاتۆماسب لای ئەوە و دەخوازێ بە هێزی چەک بیگێڕێتەوە سەر تەختی پاشایەتی.

گەلاڵەی هاوکاری نێوان خۆیان و ئەم هەڵوێستاوەی پاشایەتی و کۆکردنەوەی هێز و دامەزرانیان لە لوڕستان. مستەفاخان و سلێمانپاشا بە مەبەستی ڕاکێشانی دەنگی ڕەزامەندی ئێرانییەکان لە بەغدا و ناوچەکانی سنووری دەستیان کردبوو بە چالاکی.

بەگوێرەی نووسینی گوڵستانە، چیرۆکی ئەم خوازیار و داواکارەی تاج و تەختە تەنیا وەختایەک کەوتە بەر دڵی مستەفاخانی ڕاڕا کە محەممەدڕەزاخانی قۆرچیباشی یەکێک لە سەرکردەکانی پێشووی سەفەوی و کارناسی تۆرەمەناسی ئەو خانەدانە کە لەم بارەوە بە یەکێک لە شیاوترین کەسان دادەندرا، ئۆباڵی بۆ ڕاستی و دروستی داخوازەکەی کێشا. بەپێی گوتەی ئەم خۆبەمیراتگرە، دروست هەشت مانگ دوای قەڵتوبڕی شازادەکانی سەفەوی بە دەس مەحموودی غەلجایی لە ساڵی ١٧٥٢دا، خواجەیەکی بارگای پاشایەتی ئەو و دایکی ئەسپاردەی غولامێکی گورجی کردووە بە ناوی مەحموودبەگ. غولامەی ناوبراو لە ڕێی ئازەربایجان و داغستانەوە بردوونی بۆ گورجستان، یان بەگوێرەی نووسینی گوڵستانە لە ڕێی ڕەشت و دەریاوە چوونە ڕووسیا. هەتا زەمانی کوژرانی نادرشا وەک دوورخراوەیەک وابوون بەڵام پاش ئەو بەرەو بەغدا بزووتووە و ئێستا بە هێنانە گۆڕی داواکارییەکەی، خۆی خستۆتە مەترسی و دەیهەوێ تاج و تەختی بێخودانی وڵات بە یارمەتی دەوڵەتی عوسمانی یان لانیکەم ئێرانییە کۆچەرەکان وەدەس بێنێ. لە کەربەلا یەکێک لە بێوەژنانی نادرشا کە کچێکی شاسوڵتانحوسێنی سەفەوی بوو[٣٣] بە دیتنی قۆڵبەندەکەی باوکی لە قۆڵی کوڕەی لاودا و مۆر و قەباڵەی زەماوەندی دایکی کوڕە، بڕوای بە ڕاستی و دروستی ڕەسەنایەتی تۆرەمەی هێنا و گوتی برازکەی دروشم و نیشانەیەکی هەیە و پەنجەی دەستی بەپەردەیە و زێدەگۆشتی کەوتۆتە نێو قامکانی[٣٤]. بە گشتی مستەفاخان چ باوەڕی بە کوڕەی گەنج کردبێ و

---

٣٣ـ قەزوینی، ل ٧٣ ـ ٧٥؛ کووهمەرەئی، ل ٤٧٥. ڕەنگە ئەم ژنە ڕازیەبەگم بووبێ کە نادرشا ساڵی ١٧٣٠ زەماوەندی لەگەڵ کردبوو. بڕواننە: Lockhart, Nadir shah, 42.

٣٤ـ قەزوینی، ل ٧٣ ـ ٧٥؛ کووهمەرەئی، ل ٤٧٣؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٤٣ ـ ٢٤٧. ڕۆستەموتتەواریخ، ل ١٩٧ ـ ١٩٨؛ ڕۆستەمولحوکەما باسێکی درێژی سەبارەت بە شازادە ڕازاندۆتەوە و زۆری فوو لێکردووە، بەڵام بێگومان لە گوڵستانەی وەرگرتووە. بە

نەکردبێ، دەیبینی کە وا دیارە دەکرێ لەم تازەدابەزیوە وەک سەمبولێکی بەنرخ و پیاوێکی دەورگێڕ کەلک وەرگیرێ و بە یارمەتی سپایەکی هاوبەشی عەلیمەردانخان و پاشا و بە ناوی ئەو گەڕایەوە ئێران.

بوونی ئەم کەسە بۆ عەلیمەردانخان بە دەرفەتێکی خودادادی دادەندرا هەتا بتوانێ لەگەڵ کەریمخان کە شای دەستندەخۆری خۆی بەم زووانە دابووە دەس سەرکردەی قاجار، بکەوێتە بەربەرەکانی. سەرکردەی بەختیاری هەمیشە هێزێکی بەرچاوی خێڵی خۆی و لوڕانی فەیلی سمایلخانی لە ژێر ڕکێفی دابوو؛ هەروەها بوونی ئەم شازادە وەجاخزادە ڕەسەنەی سەفەویش دەبوو بە هۆی ڕاکێشانی کەسانی تازەپشووی زیاتر لە ناوچە دووردەستەکانەوە. لە بەهاری ساڵی ١١٦٦ی کۆچی/١٧٥٣ی زایینیدا، ئەوان سازبوون و ئەم گەنجەیان بە شاسوڵتانحوسێنی دووهەم ناودێر کرد[٣٥]. مستەفاخان سەرکەوتنی خۆی وەک ڕاوێژکار و کەیخودای خزمەت ڕکێفی شازادە چەسپاند و بۆ پشتیوانی لە شازادە هێزێکی شەڕکەری زۆروزەوەندی لە سلێمانپاشا داوا کرد. لەم کاتەدا عەلیمەردانخان چەند باڵوێزێکی بە فەرمانی شای تازەوە حەواڵەی کرماشان کرد و هەواڵی نارد کە بەم زووانە لەشکری پاشایەتی دەگاتێ و دڵخورتەیان دەبڕێتەوە[٣٦].

## ٢ ـ ٧ گیرانی قەڵای کرماشان

پارێزەرانی چۆڵەپێچ کراوی قەڵا سەبارەت بە داهاتوویەکی ڕوون و ئەوەی کە ڕووی دابوو، نوقمی کەیف و شادی بوون. محەممەدخانی زەند هەر زۆروکەم گوێی نەدەدایە ئەم دەنگۆیانەی کە ڕەنگبوو بەم زووانە وەک

---

کورتی دەڵێ شازادە پەنای بردۆتە بەر سایەی قەیسەری ڕووسیا و پاش ئەوەی بەسەرهاتی خۆی گێڕاوەتەوە، بە بێمەیلی ئیزنیان داوە بۆ وەرگرتنەوەی مافی خۆی بە سواری لۆتکە لە پایتەختەوە بگەڕێتەوە. بەڵام مێژوونووسانی زەندیە و قاجاری ئەویان بە کابرایەکی کڵاوبازی تەڵەکەچی زانیوە.

٣٥ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٤٧ ـ ٢٤٩. Rabino, Coins, Seals and Medals, 45,his Regnal name is confirmed in sp 97, 37 (1753 – 1754), 15 December 1753.

٣٦ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٤٩ ـ ٢٥٠.

راستەقینەیەکی مەترسیدار خۆ بنوێنن. ڕوونکردنەوەیەکی لە سەر ڕووداوەکـان بۆ کەریمخان نووسی و ناردی بۆ ئیسفەهان. ئێسـتا گـەمارۆی قـەڵا ساڵـێکی پێچووبوو و کۆمەڵێک ناڕەزامەندی تێدا بەدی هاتبوون. یەکێک لـەم ناڕازییانـە کابرایەکی تۆپچی بوو و دەیەویست زەبرێک لە گەمارۆدراوان بدا و خەڵاتێک لـە زەندیە وەربگرێ. بە نەهێنی پلیتەیەکی داگیرساوی لە زاخەیەکی باڕووتە خۆڵ و گوللەتۆپ وەسـەرکراوەکانا نایـەوە و لـە شـوێنێکی کـە پێـی وابـوو بـاش و دوورەمەترسییە، لە پەنا کلاوقووچکەیەکی قـەڵا بـە لای ڕووبـاری قەرەسـوودا ماتەی هەڵگرت و چاوەڕوانی ئاکامی کارەکەی مایەوە.

تەقینەوەیەکی سامناک ڕووی دا و بوو بە هـۆی هەڵـتەکینی شـوورەی دەوری کلاوقووچکەی قەڵا و ڕووخانی دیواری نێوانیان و تەواوی ئـەو شـتانەی تێیدابوون. ڕێگای خەندەک گیرا و گوللەتۆپەکان وەها لێک بلاو بـوون کـە لـە سەرانسەری قـەڵادا وەک بـاران بـە سـەر پارێزوانـانـدا بـارین. دەورەدراوان و چەکدارانی سەربازگەی قـەڵا گێژوویـژ و تۆقیـو، پێیـان وابـوو کـە پـەلاماری هەمەلایەنەی دوژمن دەستی پێکردووە، بۆیە بێ ئامانج و سەرلێشێواو دەسـتیان کرد بە تەقەی تۆپان. پیاوانی لەشکری زەند بەتێکڕا لە سەنگەرەکانیاندا ترساو و داچڵەکاو پێیان وابوو کە بوودرپـان بـۆ مەتـەرێزەکانیان لێـداوە، بۆیـە بـە مەبەستی ڕاکردن لە بەرامبەر هێرشی چـاوەڕوانکـراوی دوژمنـا کشـانەوە. لـە شاری کرماشان محەممەدخانیش تێما و بێتـەما دامـابوو، هـەتا ئـەو دەمـەی کابرای پیلانگێڕ کە لە حەشـارگەیەوە بـە شـەپۆلی تەقینەوەکـە فڕێدرابوویـە رووبار بە زگەخشکە و ماتەماتە خۆی گەیاندە لای، تا ڕاپۆرتی تەڵە و داوی بـۆ بخاتە ڕوو و خەڵاتی چاوەڕوانکراو وەربگرێ. محەممـەدخان کـە سـەبارەت بـە خراپەکاری و بێشەرمی ئەو پیاوە غەزریبوو، دەیەویست لەتوپەتی بکا، بـەڵام پـاش تاوێـک هـەر بەوەنـدە ڕازی بـوو جـارێ بیکـوتن و بیخەنـە کـۆت و زنجیرەوە(۱۵).

ئەگەرچی گەمارۆدراوان زەبرێکی قورسیان وێکەوتبوو، بەڵام هـەر دوای تاوێک هاتنەوە سەرخۆ و تـا خۆرهـەڵات کاریـان کـرد، قەڵـش و کەلەبـەر و داڕووخاوانیان تەنین و بە هەر شتێکی دەکرا کونبڕیان کـردن و پاشـان کەوتنـە پاراستنی قەڵا. چەکدارانی تەیار سەرانسەری شەو لە سەر هەست مانەوە هـەتا

ئەگەر هاتوو هێزەکانی زەند ویستیان لەو ماوەیەدا دەرفەتیان لێ بێنن، وە دەس بێن، بەڵام تا بەری بەیانی کە گەمارۆدراوان دوو تۆپیان لە پەنا لارووخاوەکان دامەزراند، هیچ شتێک رووی نەدا. ئاگری ئەنگێوانەی تۆپی پارێزەران، هرووژمی سوارانی تێکشکاند و هەر لەرێوەش تۆپچییەکان کوژران و لە ماوەی حەوتوویەکدا پیاوانی سەربازخانە توانیان داروخاوەکان ساز کەنەوە و خەندەک دەردەنەوە. محەممەدخان ماوەیەک دواتر بە گەیشتنی شازدەهەزار کەس هێزی پشتیوان لە ئیسفەهانەوە، سەرلەنوێ درێژەی رەوتی گەمارۆی دا، بەڵام پێشکەوتێکی راستەقینە وەدەس نەهات[37].

رەنگە هەر لەم ماوەیەدا «بابی عالی» بەرەسمی لە سلێمانپاشای راسپاردبێ کە سەبارەت بە بەرێوەبردنی گەلاڵەکەی بە مەبەستی گرتنی ماسی لە قوراوی وڵاتی دراوسێ خۆبپارێزێ، چونکە هێشتاش باڵوێزەکانی ئێران لەگەڵ ئەو وڵاتە خەریکی وتووێژ بوون. بۆیە سەبارەت بە ناردنی لەشکری یاریدەر بۆ مستەفاخان و هاورێیانی بێمەیلی نواند، بەڵام مستەفاخان کە حازر نەبوو چی دیکە بحاوێتەوە و شان دابخا، پێیداگرت کە تەنیا ٦هەزار کەسێک بۆ بەرێکردنی لەشکری خوازەری تاج و تەخت هەتا سنوورەکانی ئێران لەگەڵیان بن و هەر کە گەیشتنە کوردستان بگەرێنەوە. بەم شێوەیە پێیان نایە رکێف، پاشان داوایان لە ئازادخانی کۆنەدۆستی مستەفاخانیش کرد کە یاریدەیان بدا.

لە سنووری ئێران هۆکارێکی چاوەروانەکراو خەساری گەیاندە تەواوی ئەو کارە گەورانەی لە پێشدابوون: شاسولتان حوسێنی دووهەم شتی وای کرد کە وەک پیاوێکی بێشەرم و درِ دەرکەوت و نەیتوانی مستەفاخان و عەلیمەردانخان بخاتە ژێر قورسایی کەسایەتی خۆی و ئەمانە وەها نائومێد ببوون کە تەنانەت دەیانویست لە سەر دەسەڵاتی لابەرن[38]. بەگوێرەی نووسینی گوڵستانە بەدزی کەسێکیان نارده ئازەربایجان هەتا لە رابردووی ژیانی ئەم پیاوە بکۆڵێتەوە. پاش ماوەیەک ئاکامی توێژینەوەکان ئاوا بوو: دایکی هێشتا ماوە و ژنێکی ئەرمەنییە، باوکیشی لە ترکانی دانیشتووی ئازەربایجانە. بۆیە

---

٣٧ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٥١ ـ ٢٥٩ و ٢٦٣.

٣٨ ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٦٠: «لە قسە و ئاکاری نالەباریرا ... زۆر وەک خەڵکی رەمەکی و کۆمەڵی گوندەکی دەچوو...»

تەمایان گرت هەتا ڕزگاربوونی یەکجارەکی لە چنگ گێرە و کێشەی جاریّ ئەم ڕازە نەدرکێنن، نەکا لەشکرەکەیان لێکبلاو بیّ. پێشڕەوی لەشکر وردەوردە شل بۆوە و داماوی ڕووی تێکردن، چونکە چاوەڕوانی هاتنی هێزی پشتیوانی لوڕ و بەختیاری و ئازادخان بوون. وەک گێراویانەتەوە سەرەتا عەلیمەردانخان و پاشان مستەفاخان تەمایان گرت کە خۆیان لە بەند و داوی ئەم ئەرکە پڕشەرمەزارییە دەربازکەن و بە بیانووی چارەسەری نەخۆشی شێتی، ژارێکی وا دەرخواردی شای ساختە بدەن کە وردەوردە لە بنەی بێنیّ؛ بەلاّم ئەو کەسەی بۆ ئەم ئەرکە ڕاسپێرابوو(١٦) وای بە باش زانی تا لەبری ژارەکە، دەرمانێکی بیّزەرەدی بداتیّ. سەرەنجام سەربازانی ئێلجاڕی تایفەکان داوەڕین و هاتن. فەرماندەکان بە بڕوبیانۆوە نەیاندەبرنە خزمەت شازادە. لەبەر بە دەستەوە نەبوونی نەخشەیەکی ڕوون، وەختایەک کە سپا لە پێچ و گەوەی کوێستانەکانی لوڕستان تێپەڕی، خەلّکەکە نائومێد و شەکەت بوون و قوونەدزەیان کرد و کەم بوونەوە. سەرەنجام لەبەر لێنەوەشاوەیی بەرچاوی سەرکردەکانیان دامان و دابڕدابڕ و دابەش بوون و بەرەو مالّی خۆیان ڕەوین و دەیانگوت شازادەیەک لە گۆڕیّدا نیە و ئەگەر هەشبیّ پیاوێکی کلاوبازە[٣٩].

کەریمخان کە بە باشی لە هەلّمەت و چالاکی کۆنەدوژمنی خۆی و هاوپەیمانانی ڕاهاتبوو و ڕەنگە ئاگایەکی لە هەلومەرجی کەسەرباری نێو لەشکرگایان بووبیّ. بە گوتەی گەشبینانەی گولّستانە، بە خۆی و چلودوو هەزار چەکدارێکەوە لە مانگی مەی سالّی ١٧٥٣دا لە ئیسفەهانەوە بەرەو کەوشەنی ئێران و عوسمانی بزووت و ئاخرین مەرج و دەرفەتی بۆ گەمارۆدراوانی قەلاّی کرماشان دانا. ئێستا هەروەک هەردوولا دەیانزانی کەمترین مەترسی لە لای شای ساختەوە کە گرینگترین هۆکاری پێوەندی نێوان دەورەدراوان و سپای عەلیمەردانخانی بەدیهێنابوو، لە گۆڕا نیە. دوو سالّ گەمارۆ زەرەد و خەسارێکی زۆری لە قەلا و پارێزەرانی دابوو و پاش کۆبوونەوەیەکی گشتی بە بەشداری فەرماندە ناڕەزامەندەکانی قەلاّ، بڕیار درا کە مەرجە ئاشتیخوازانەکەی سەرداری زەند قبوولّ بکەن. خودی ئەبولحەسەنخانی گولّستانە وەک یەکێک لە ئەندامانی شاندەکە نێردرا و

٣٩ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٦١ ـ ٢٦٢؛ گولّشەنی مراد ل ٧.

شاهیدی سوێندخواردنی کەریمخان بوو سەبارەت بە پاراستنی خاوخێزانیان. وەک گوڵستانە دەڵێ وەکیل لە پێشدا ملی نەدەدا سەبارەت بە بەخشینی مامی بەڵێنییەکی وەک دابووی بە عەبدولعەلیخان، بیدا بەویش، بەڵام ئەم مێژوونووسە شێعرێکی بەجێی خوێندەوە کە کەریمخان پێی خۆش بوو(١٧) و توانی گفتی لێبووردنی وەکیل سەبارەت بە مامی وەربگرێ. فەرماندەکانی خاوەن دوو ڕوانگەی جیاواز خۆیان وەدەرکەوتن و سەریان وەبەر کەریمخان هێنا. تاقمەکانی لەشکریش هەڵوەمەرجەکەیان قبووڵ کرد و عەبدولعەلیخان بەرەو ئیسفەهان کەوتەڕێ، بەڵام محەممەدتەقیخان لە شاری کرماشان نەبزووت. عەلیمرادخانی زەند وەک حوکمڕانی شار و قەڵا لەوێ مایەوە و ڕەنگە برانەوەی ئەم تەنگەژەیە بووبێتە هۆی ئەوەی تا کەریمخان تەواو بە سەرسووکی شاڵاوی بردبێتە سەر سنوورەکانی ڕۆژاوایی بە مەبەستی پەلاماردانی پاشماوەی سپای نێردراوی بەغدا[٤٠]

## ٢ ـ ٨ شەڕی کرماشان

هەواڵی گیرانی قەڵای کرماشان بوو بە هۆی ئاڵۆزکاوی و دابەزینی وورەی زیاتری تاقمەکانی سپای عەلیمەردانخان. یەکێک لە ئومێدەکانی سەرداری بەختیاری ئازادخان بوو کە خەبەری ناردبوو ئەوا لەگەڵ هاوپەیمانە ئازەربایجانییەکانی لە مەودای دوومزڵەی کرماشان دامەزراوە. ڕێک لەم ڕۆژانەدا خەبەر هات کە کەریمخان تەنیا چوارسەعاتێکی لەگەڵ ئەوان نێوانە. عەلیمەردانخان و مستەفاخان دەرفەتێکی وایان بۆ هەڵگیرسانی شەڕ نەبوو. گەلاڵەی چەشناوچەشن هاتنە گۆڕ، بۆ وێنە کۆمەڵێک زێڕەوانیان بۆ شازادەی لاو بەجێهێشت، چونکە ئەگەر تووشی گرفت و کارەساتێک بووبا، بارودۆخی مەیدانی شەڕ هەڵدەگەڕایەوە. پێنجهەزار سواری نێردراوی سلێمانپاشایان دنە دا یان تەماحیان وەبەر نان تا بەشداری شەڕ بن و وەک هێزی بەرایی بەرە دایانمەزراندن. لەپڕ چەکدارانی زەند شاڵاویان بردنە سەر. شێخاڵیخانی زەند پێنسەد سواری لە پێشقەرەوڵەکانی خۆی بۆ هەسدانەوەی چەکدارانی بەغدایی

---

٤٠ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٦٢ ـ ٢٦٧.

نارد و سەرەڕای تەقەیەکی کەمتاکورتیان پاشەکشەی پێکردن و تێکشکان. پاشماوەی سپای شای تازەی سەفەوی بە هاسانی ڕایانکرد. عەلیمەردانخان ڕووی کردەوە شاخستان و شای ساختەی لەگەڵ خۆی برد؛ مستەفاخان کە بە سواری ماینێکی ڕەسەنی پێشکێشی پاشای بەغدا(١٨) بەغار ڕایدەکرد، بە زەبری چەکدارێکی زەند بریندار بوو و گیرا و وەک دیل درایە دەس کەریمخان. کەریمخان زۆری پەند و سووکایەتی بە سەر هێنا. خستییە نێو جەڵلەی «ڕیکا»کان(١٩) و جل و کڵاوی ئەوانی کردە بەر و سەری و کڵاو و وەکازی پێشووی باڵوێزێتی لێئەستاندەوە و ئاوای تەمێ کرد. سامان و دارایی و ئەوەی لە سەردەمانی باڵوێزێتییەوە وەچنگی هێنابوو بە ماڵی تاڵانی داندران و درانە خەزێنەی حکوومەتی[41].

ئەم شەڕە کە لەبەر شوێنی قەومانی بە شەڕی کرماشان ناوبانگی دەرکرد و ڕەنگە لە مانگی مەی یان ژووەنی ساڵی ١٧٥٣دا ڕووی دابێ، سێهەمین و ئاخرین هەوڵ و تەقەلای عەلیمەردانخانی بۆ بە دەستەوە گرتنی جڵەوی کاروباری ئێران بە تەواوێتی لەبار برد. ئێستا شای دەستندەخۆری تەنیا بارێکی بێبەرهەم بوو و ماوەیەک دواتر کوێری کرد(٢٠) و ئیزنی دا کە سەری خۆی هەڵگرێ و بچێتە لای شیعان و پەنای مەزاری پیروزی ئیمامان لە ئێراق و لەوێ بە ناوی پیاوێکی دینپەروەر بە دوورەپەرێزی ژیانی تێپەڕ بکا[42]. سەرداری

---

٤١ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٥٩ ـ ٢٦٧؛ گیتیگوشا، ل ٣٣. دیارییەکانی نادر کە بەرەو بارگای سوڵتان بەڕێوە بوون، لە پێشدا درابوونە دەس کاربەدەستێکی باڵادەستی عوسمانی کە چووبووە دیداری باڵوێزی ئێران لە بەغدا. (Hatt - Humayun, NO. 15a ;sp 97/35 [1751–1752 ], 203) ناوی شوێنی شەڕەکە بە ڕوونی نەهاتووە. تاریخی بەختیاری لە ل ٤٧٨ ـ ٤٧٩ و ڕابینۆش لە کتێبی کوردستان، ل ٨٣دا، بیلەوار بە شوێنی شەڕەکە دەزانن. (بڕواننە: بەشی یەکەم، پەراوێزی ژمارە ١٨)، بەڵام لەبەر بە ڕێوجێ نەبوونی گێڕانەوەکانی دیکەیان، دوودڵی پەیدا دەبێ.

٤٢ـ تەزکەرەی شووشتەری لە ل ١٦٤دا دەنووسێ کە ئەم شاسوڵتانحوسێنە بە دەس عەلیمەردانخان کوێر کراوە و ساڵی ١٧٥٣ کە چۆتە نەجەف بە شووشتەردا تێپەڕیوە. بە گوتەی قەزوێنی (کووهمەرەئی، ل ٤٧٧) ناوبراو لە ساڵی ١٧٧٤دا لە نەجەف مردووە.

بەختیاری ناچار بوو لێرە بە دوا وەک پەنابەرێکی پەیکەردە ڕۆژگاری ڕابوێرێ. بێگومان دیسانیش چەند گەلاڵەیەکی بۆ ساڵی داهاتوو لە مێشکدا بوو و دەیویست کەسانێکی تازەپشووی خێڵەکی زیاتر لە خۆی کۆکاتەوە. ڕەنگبوو بتوانێ دیسانیش بەر لەوەی کە داڕووخێ زەبرێک لە کەریمخانی کۆنەدوژمنی بسرەوێنێ کە لە لایەن ئازادخانەوە زۆری تین بۆ هاتبوو.

سەربوردەی ئەم پیاوە یەکێک لە سەرسوڕهێنترین و هەروەها جێباوەڕترین بەشەکانی مێژووی زەندە و وا باشترە کە لێرەدا بیدرکێنین و پەروەندەی عەلیمەردانخان پێکەوە بنێین.

## ٢ ـ ٩ مردنی عەلیمەردانخان

پاش زنجیرەیەک تێکشکانی سەخت و پڕئازار کە هێزەکانی زەند دوای سەرکەوتنی کرماشان لە لایەن ئازادخانەوە تووشی هاتن، ئەم زەبرانە کردنی بە چەند تاقمێکی جۆراوجۆر بە سەرکردایەتی خانەکانی تایفە. وەختایەک لە بەهاری ساڵی ١١٦٧ی کۆچی / ١٧٥٤ی زایینیدا کەریمخان بەرەو پارێزگاکانی باشووری و شیراز ڕایەکرد، محەممەدخان و شێخاڵیخان بەو هیوایە کە دیسانیش هێزە پەرتەوازەکانیان کۆکەنەوە، لە چەمچەماڵ کە یەکێک لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کرماشانە بنەیان لێخست. عەلیمەردانخان لەگەڵ هێزەکانی لە چەمچەماڵ تووشی پۆلێکیان بوو، بەڵام بە ناردنی پەیامی دۆستی و یەکێتی بەری بە قەومانی شەڕ گرت.

خانەکانی زەندیش جگە لەوەی لەگەڵ ئەم خۆشەویستییە گومانلێکراوە کایە بکەن چارەیەکی تریان نەبوو. هەر ئەو شەوە پێیان نایە لەشکربەزی خانی بەختیاری و خێوەتەکانیان لە دۆڵێکی تەنگەبەرا هەڵدا. ڕۆژی دوایی

سوڵتانمحەممەدی کوڕی کە هاندەری قەزوێنی بوو، لە بەرگی دەروێشاندا دەژیا و باوکی بە خەم و پەژارەوە ئەوی لە خۆ تێوەردان لە کاروباری سیاسی هەس دەدایەوە. لە کاتی مردنی باوکی لە مەشهەد بوو. لەم شارەدا بە گەرمی لە لایەن شاروخەوە وەرگیرا و بە شێوەیەکی بەربلاو بە ئێرانا گەڕا. لە ساڵی ١٧٩١دا حەجی کرد و دووساڵ دوایە چووە هیند و ژیانی لە دیلێتی بارگای مەغوول یان کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتیدا کۆتایی پێهات.

عەلیمەردانخان و هاوپەیمانی پایەداری واتە سمایلخانی فەیلی لەگەڵ میوانانی زەندیان سەبارەت بە مەیلی زیندووکردنەوەی دۆستایەتی و یەکگرتوویی لەمێژینەیان لەگەڵ کەریمخان و دەرپەراندنی هێرشکەری تازە یانی ئازادخانی ئەفغان بە دووورودرێژی دوان. شێخالیخان کە لە تایفەی زەنددا بە پیاوێکی زیرەک و وریا ناسرابوو، بەڕواڵەت ئەم پێشنیار و وتووێژانەی قبووڵ دەکرد و لە گەرووی دەچوونە خوار[43]. سەرەنجام توانی ئیزنیان لێ بخوازێ کە بگەڕێتەوە لای کەریمخان و قایلی بکەن لە سەر ڕاستی و بێخەوشی ئەو مەبەستانەی باسیان کراوە. کاتێک دوو مانگ بە سەرچوونەوەیدا تێپەڕی و هیچ هەست و خوست و خەبەرێک نەبوو، خانی بەختیاری بە هەڵەی خۆی زانی و دەستی کرد بە خراپە دژی خزمەکانی کەریمخان کە لە سپاکەیدا مابوونەوە، چونکە لێی سوور ببۆوە کە ئەم تاقمە بایخی ئەمەیان نیە وەک نێچیرێک کەلکیان لێوەربگیرێ[44]. محەممەدخان لە بابەت باس و بڕیاری عەلیمەردانخان و فەرماندەکانی سەبارەت بە خۆیان ئاگادار کرایەوە. ئێستا باوەڕی هێنابوو تەنیا ڕێگای ڕزگاری پەنا بردنە بەر کردەوەیەکی ئازایانە و دلێرانەیە هەتا بەر لەوەی دوژمن کەولی بکا، ئەو لە کەولی کرپار بێ. سەرەنجام هەر کە عەلیمەردانخان دەستی کرد بە توندوتیژی، محەممەدخان و هاوڕێیانی دەستیان برد بۆ کارێکی کە لە پێشدا نەخشەی بۆ داڕژابوو. گەیی محەممەدخان لەم بارەوە کە ئەو بە هێنانی کۆمەڵێکی زۆری هاوڕێیانی دەیهەوێ قەڵتوبڕیان کا، وای کردبوو کە خۆ لە هێنانی چەکدار و نیگابان بپارێزێ. تاقمۆکەی هاوڕێیانی محەممەدخان وەختی وتووێژی نێوان ئەو و عەلیمەردانخان، لە پشت سەریان بۆ ڕێزلێنان چەقیبوون. لەپڕ بە ئاماژەی محەممەدخان خەنجەر برووسکانەوە و دەس و پێی چوارخانەی بەختیاری بەستران، ئەو کات هەرایان کردە نۆکەران و ڕاویان نان. محەممەدخان بە خەنجەرەکەی خودی دوژمن کەوتە گیانی و چۆکی لە سەر سینگی دادا و سەری بڕی. چوار دیلەکەیان لەگەڵ خۆیان برد و وێڕای چەکدار و ژنان وەک تیری تیژپەڕ بەرەو زارکی دۆڵەکە باڵیان گرت.

٤٣ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٩٤: «لە نێو زەنداندا بۆ ئاقڵ و فام و زانایی کەس تای نەدەکرد.»

٤٤ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٩٢ ـ ٢٩٤.

بەختیارییەکان بە بیستنی هەواڵی کوژرانی سەرۆکیان ئاڵۆزکان. بەڵام سمایلخان و چەکدارە لوڕستانییەکانی لەگەڵ دەستەیەک تفەنگچی کەوتنە سەر ڕاکردووان. فڕینی زەندان وەها توند و خێرا بوو کە سەرەنجام دەرکەوت تەنیا کەسێکیان بە ناوی عەلیمرادخان بە گوللەی گەرم کوژراوە.

پۆلەسواری ڕاکردووی زەند لە دۆڵەکە تێپەڕ بوون و بە باسک و بەندەنی بەختیاری‌دا بەرەو چیاکانی ڕۆژاوایی تێیانتەقاند هەتا گەیشتنە سنوورەکانی لای سەرپێڵی زەهاو و گیلانی ڕۆژاوا. ئەم تاقمە پاش چەندین ڕووداوی دیکە ئاخرییەکەی گەیشتنەوە لای کەریمخان و بەگەرمی پێشوازی لێکردن[45]. ئەمجار لەمێژینەترین و خۆڕاگرترین ڕقەبەری هەمیشەیی تێداچووبوو.

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ دەوەرەق، ناوەندی شادگان یانی «سوورەک»ی پێشوو بووە. لە لاپەڕە ٤١٣دا دەنووسێ دەوەرەق شارێکی گەورە و ئاوەدانە لە باشووری خووزستان و کەوتۆتە سەر لێواری چۆم بەرووڕووی وڵاتی ئێراق.

٢ـ مەولا موتەللیب نەوەی سەید فەرەجوڵڵای حاکمی دەوەرەق و باوکی ناوی سەیدمحەممەدخان بووە. لە ساڵی ١١٦٠ی کۆچی لە سەردەمی پاشایەتی نادرشادا ڕاپەڕی. عەباسقوڵیخانی خەزێنەداری خووزستانیش پاڵی وەپاڵی دا. محەممەدخان بەگلەربەگی خووزستانی گرت و برایمـمیرزای بەزاند و محەممەدڕەزاخانی حاکمی شووشتەری لە بەند توند کرد. عادڵشای کرد بە حوکمڕانی خووزستان. لە ساڵی ١١٦١دا ئالیکەسیر بەزاندیان و سەرەنجام ساڵی

٤٥ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٩٤ ـ ٢٩٩؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ٤٤؛ گوڵشەنی مراد، ل ٧ ـ ٨؛ تەورێزی، ل ١٧٤. ئەم نووسراوەی سەرەوە لە دەقی بابەتەکاندا لەگەڵ موجمەلوتتەواریخ یەکتر دەگرێتەوە. لە بابەت ئەو باسەی مونتەزەمی ناسری کە لە ل ٣٠١دا دەڵێ محەممەدخان دژی کەریمخان ڕاپەڕیبوو یان لە خزمەتیدا نەمابوو و خۆی کردبوو بە شەریکی چارەنووسی عەلیمەردانخان یا دواتر پەشیمان بۆتەوە و سەرداری بەختیاری کوشتووە، بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نیە.

١١٦٣ عەلیمحەممەدخانی زەند گرتی و دایە دەس کوڕانی شێخ سەعدی ئالیکەسیر هەتا بە تۆڵەی خوێنی باوکیان بیکوژن. سەید فەرەجولّلاش کوڕی سەیدعەلیخان بوو و نادر لە سەر کاری لادا و تەنیا کردی بە حاکمی دەوەرەق.

٣ـ عەباسقولّیخان، سەرکار و خەزێنەداری خووزستان بوو کە لە شۆرشی مەولا موتەللیبدا یارمەتی ئەوی دا.

٤ـ شێخ سەعدوون کوڕی شێخ نەسری ئالی مەزکووری حوکمڕانی بووشێهر بوو. لە شەڕ لەگەڵ میرمەهنادا باوکی ناردبووی بۆ خارک. باوک و باپیرانی شێخ هەر بە ڕەگەز عومانی بوون و تایفەکەیان پێی دەگوترا ئالی بوومهیرە. شێخ نەسری کوڕی شێخ مەزکووری ئەبوومهیری کەشتیوانی کەشتییەکانی نادر بوو لە کەنداوی فارس. شێخ سەعدوون لە بەستنی پەیمانی بازرگانیدا لەگەڵ ئینگلستان نوێنەری دەولّەتی ئێران بوو.

٥ـ سەید فەرەجولّلا کەلانتەر کوڕی سەید «محەممەدسادق»ی کەلانتەری شووشتەری بە مەبەستی وەدەسهێنانی دەسەلات، محەممەدڕەزابەگی حاکمی دەولّەتی لە شووشتەر دەرکرد، هەتا زەمانی ئاغامحەممەدخان زیندوو بوو، پاش خۆی کوڕەکانی واتە سەید ئەسەدولّلا و سەید ئەبولفەتحخان گەیشتنە دەسەلات. کەلانتەرەکان لە دووبەرەکی حەیدەری و نیعمەتی شووشتەرا دەوری پێچەوانەی سەیدەکانی مەرعەشییان دەگێڕا.

٦ـ ناوی ڕزگاریدەرەکەی کەریمبەگی زەنگەنە بوو.

٧ـ توراب‌خان لە تایفەی چگنی و حاکمی نەهاوەند بوو. لە سەرەتای کاری کەریمخاندا شانی وەشانی دا، پاشان لە سەر قسەی خۆی ڕانەوەستا و ڕووی کردە عەلیمەردانخانی بەختیاری و پاش شکانی ناوبراو پەنای بردە بەر مەیتەری وەکیل. هەتا سالّی ١١٧٥ی کۆچی کە بە فەرمانی کەریمخان کوژرا، خاوەنی چەندین لێپرسراوێتی بارناسک بوو. گۆیا لە شوغلی زێرەوانی و پارێزەری ژنانی کەریمخاندا سەبارەت بە پاراستنی حەرەمخانە تووشی هەلّەیەک ببوو و کوژرا.

٨ ـ سولّتان عەلی کوڕی شێخ سەدرەددین مووسا کوڕی شێخ سەفییەددینی ئەردەوێلی سەرجەللەی سۆفییەکانی ئازەربایجان و لەگەڵ ئەمیر تەیموور دیدارێکی کردووە. بەپێی نووسینی ریازوسسیاحە (ل ٣٧) ئەمیر

تەیموور بە تکای وی دیلەکانی عوسمانی ئازاد کرد. سولتان عەلی لە سالی ۸۳۲ی کۆچیدا مردووە.

۹ـ حاجیئاغا جەمالی فوومەنی کوڕی ئەمیر دەباجی گیلانی فەرمانڕەوای گیلان بوو. لە بەرامبەر هێرشی محەممەدحەسەنخانی قاجارا دەستی کردەوە، تاقمێک لە پیاوەکانی غەیانەتیان پێکرد و بەناچار ملی بۆ مەرجەکانی ئاشتی ڕاکێشا و خوشکی دا بە محەممەدحەسەنخان. هێندێک دواتر لەبەر گەرموگوڕی حاجیجەمال، محەممەدحەسەنخانیش خوشکێکی خۆی دا بە هیدایەتوڵلاخانی کوڕی. هیدایەتوڵلاخان لە زەمانی ئاغامحەممەدخاندا لە ئەنزەلی کوژرا.

۱۰ـ بە گوتەی گوڵستانە بەشێکی کەمیان فڕاندن.

۱۱ـ دووبەرەکی نێوان زەنگەنە و کەڵهوڕ وای کردبوو کە هاوکاری یەکتر نەکەن. بەر لە ڕاکردنی کەڵهوڕ، تایفەی زەنگەنە بەهەشتاو لە پێستوونەوە پاشەکشەی کردبوو.

۱۲ـ سادقخان بە فەرمانی محەممەدخان بە مەبەستی خەڵەتاندنیان باسی دیدار و ڕێککەوتنی کردبوو، ئەمانەش بەوریایی بانگێشتی قەلایان کرد، بەلام خانی زەند قبووڵی نەکرد. وا دیارە هەرچۆنێک بێ هەردک لا ویستوویانە یەکتر فریو دەن.

۱۳ـ بۆیە ئەم دوو پێداویستییەیان نارد، چونکە خوێ و توتنیان لێبڕابوو. گوڵستانە دەنووسێ پتێک توتن دە شایی دەکرد. هەروەها سێکەسی خەڵکی لوڕستانیان لەگەڵ هاتبوو کە ڕێزدار پێری ئاماژەیەکی پێنەکردوون.

۱٤ـ کەمەرخان برازای محەممەدخان و پەیرەوی ئەسکەندەرخانی زەند بوو. لە دووئاوی سیلاخور لەبەر تێکهاڵقان لەگەڵ سوارێکی ئەفغانی کوژرا. هیدایەت هەر بۆ ئەوەی ماستاوێکی سارد کردبێتەوە لە بەرگی ۹ی ڕەوزەتوسسەفادا دەنووسێ کە محەممەدحەسەنخان لە شەڕێکا دوولەتی کرد و ناوێشی بە کەرەمخان هێناوە. خوالێخۆشبوو «نەفیسی»ش لە مێژووی کۆمەلایەتی قاجاردا لە رووی نووسینەکەی هیدایەت ئاوای گێڕاوەتەوە: خانی بەرزەجێ لەبەر ئازایەتی خۆی پێڕانەگیرا و ڕکێفی لە یەکسمی خۆشبەزی دا و هەڵیکێشا شیری و هەڵیسووڕاند و وەهای لە تۆقی سەری کەمەرخان ڕاکێشا کە

کلاوخوود و زرێ و بالاپۆشی گەوچنی پۆلای دادڕی و هەتا سەرپشتێندی گیر نەبوو. (ڕەوزەتوسسەفا، بەرگی ۹).

۱۵ـ ڕێزدار پێری ئەگەرچی بابەتەکەی لە گولستانە وەرگرتووە، دەنووسێ کە تۆپچی لەبەر خاتری وەرگرتنی خەلات قەلای ئاگر دا. لە حالێکا گولستانە لە پلەی یەکەما «هاوڕەگەزی و خێلایەتی» بە هاندەر دەزانێ و زیادی دەکا کە «لەبەر ئەم خزمەتە شایانە محەممەدخان شاد و دلفەریح بوو و گوتی لە نێو بەند و باوی جیهانا ناوم دەڕوا و بە یەکێک لە یەکڕەنگان و دەولەتخوازانی بەندەی کەریمخان ناودێر دەکرێم.»

۱٦ـ ئەو حەکیمەی کە ڕاسپێراوی کوشتنی شاسولتانحوسێن بوو ناوی میرزا ئەحمەدی حەکیمی ئیسفەهانی بوو.

۱۷ـ ئەو شێعرە بەجێیەی کە ڕێزدار پێری ئاماژەی پێکردووە، لە لاپەڕەی ۷۰ی گولستانەدا ئاوایە:

بخشیدن گناه، بود لایق شهان / بر بیگناه منت بخشش چه لایق است

(لە «شا»یان دەوەشێتەوە بەخشینی تاوان، بێتاوان منەتی بەخشینی چی لە سەر دەکرێ)

۱۸ ـ پاشای بەغدا لەم سەردەمەدا سلێمانپاشا بوو.

۱۹ـ «ڕیکا» پۆلەکوڕانی شۆخ و شەنگ بوون کە وێڕای شاتران و یەساولانی پێش کەژاوەی پاشا هەنگاویان دەنا... بەلام بە لێکۆلینەوەی کۆمەلایەتی مێژووی سەردەمی زەندیە، وا دەردەکەوێ کە ئەم تاقمە ئەرکێکی هاوشانی کرێکاری شارەوانییان لە سەر شان بووە بۆ پاک و خاوێنی شار. کلاوەکانی ئەم تاقمە ڕیشوودار بووە.

۲۰ـ دەربارەی کوێرکردنی شاسولتانحوسێنی دووهەمەوە، زۆربەی سەرچاوەکان نووسیویانە کە عەلیمەردانخان کوشتوویەتی، بەلام گولستانە دەنووسێ چونکە نەجیبزادەکانی بەختیاری دەستی ڕێزیان لێدەنا، سەرداری بەختیاری کوێری کرد و ناردیە ئاستانەی بەرزی ئیمامان. خاوەنی تەزکەرەی شووشتەری ئەوی بە کوێری دیتووە و دەنووسێ دوو کوڕی بووە بە ناوی محەممەدمیرزا و تۆماسبمیرزا و حەوت مانگی پاشایەتی کردووە و لە سالی ۱۱۸۹ی کۆچیدا مردووە.

# ٣

# ئازادخانی ئەفغان

## ٣ ـ ١ ئازادخان و وەدەسهێنانی دەسەڵات لە ئازەربایجان

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر هاوینی ساڵی ١٧٥٣ و سەربوردەی ئازادخان. لە کاتێکا مەودای سەرکردەی ئەفغان تا کرماشان دوو ڕۆژەڕێ بوو، دلێرانی زەند خەریکی پاککردنەوەی پاشماوەی دوایین لەشکرگای عەلیمەردانخان و ژماردنی خەنیمەتەکانیان بوون لەو شارەدا. حەوت یان هەشتهەزار شەڕکەری ئەفغان و ئەفشار لە کێبەرکێی گەیشتنە سەر هەزارەزیلەی شکاو و دواکەوتە و دڕدۆنگ دەهاژان، کە لە بەرامبەر ئاڵوگۆڕی نامبارەکی بەختی خۆیانا وێستابوون. بارودۆخی ئازادخانیش ڕاست وەک باروهەوای هەژدەمانگ لێرەوبەری محەممەدحەسەنخانی قاجاری لێ بە سەرهاتبوو. بۆیە ئەویش وەک سەرۆکی قاجار وای بە بەرژەوەند زانی کە لێگەڕێ سپاکەی بەپارێزەوە بگەڕێتەوە شووره و قەڵاکانی لە ورمێ[1]

---

١ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٦٤؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٦٩.

ئازادخان کوڕی سلێمان لە ئەفغانییەکانی کابول و لە تایفەی غەلجایی بوو. ڕەنگە لە ساڵی ١٧٣٨دا کە ئەم شارە کەوتە ژێر ڕکێفی نادرشا، ناوبراو لە خزمەت جیهانگیری ئەفشاردا حازر بووبێ. لە کلکەی دەسەڵاتی نادریدا بوو بە جێنشینی ئەمیر ئەسلانخانی قۆرقلووی ئەفشار، فەرماندەی لەشکری ئازەربایجان و لە شەڕێکی کارەساتباردا کە لە نێوان سەرکردەکەی و برایمیرزادا قەوما، ئەویش یەکێک لەو کەسانە بوو کە پەیمانی شکاند و چووە پاڵ شازادەی ئەفشار و شەڕەکەی یەکلا کردەوە و لەبری ئەم خزمەتە نازناوی «خان»ی وەرگرت[٢]. وەختایەک کە شازادەی ناوبراو لە گەڕانەوەی شەڕی «سورخە»دا بەرەو قوم ڕایکرد، ئازادخان لای مایەوە، بەڵام کاتێک میرسەید محەممەد ڕێی نەدا بچنە شاری قومەوە، کاغەزێکی بۆ نووسی و لە لایەن خۆی و پازدەهەزار ئەفغانییەوە ڕایگەیاند کە ئامادەی خزمەتە. سەید فەرمانی پێدا کە بەرەو ساوە بکشێتەوە و چاوەڕوانی فەرمانەکانی تر بێ، چونکە باوەڕێکی ئەوتۆی بە وەفاداری و سەداقەتی نەبوو[٣]. لە سەرەتادا بەڕواڵەت هێزەکانی کۆکردەوە، بەڵام لەبری تێکەڵ بوون لەگەڵ سەید یان شاسلێمانی داهاتوو کە بەرەو مەشهەد دەچوو، وای بە باش زانی کە بچێتە شارەزوور[٤] لە سەر سنووری ئێران و عوسمانی و بەختی خۆی لەوێ بەتاقی بکاتەوە، چونکە هەرنەبێ لەوێ، خۆی و لەشکرەکەی وەک مەشهەد لەبەر سوننی بوون لە بەرامبەر ئازار و پەلاماری تێکڕای خەڵکدا، بێپەنا نەبوون.

لە شارەزوور(١) گەلێک خزمەتی شایانی بە خالیدپاشای حاکمی ئەو هەرێمە کرد و پەیمانێکی دۆستایەتی لەگەڵ نەقیخانی قاسملووی ئەفشار بەست. نەقیخان برای مەهدیخانی بەگلەربەگی ئازەربایجان بوو. ئازاد خان و

---

٢ـ ئازەر؛ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی یەکەم، ل ٤٩١؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٣ ـ ١٨٤. کووهمەرەئی، ل ٤٦٥؛ .(Olivier,18) تایفەی ئازادخان بە چەند شێوە نووسراوە: غەلجایی، کەلیشایی، غەلیزایی و قەلیزایی. ئەم جیاوازییە بەتایبەت لە نووسراوەکانی نووسەرانی ڕۆژاواییدا دەبیندرێ.

٣ـ مەرعەشی، ل ١٠٠ ـ ١٠٣، تەزکەرەی ئالی داود، ل ٨٠ ـ ٨٢، موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٣ ـ ١٨٤.

٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢٠٣ ـ ٢٠٤؛ کووهمەرەئی، ل ٤٦٥.

نەقی خان لە دەوری کۆمەڵەی سەرەکی یارانیان لەشکرێکی تێکەڵیان کۆکردەوە و بەرەو تەورێز کەوتنەڕێ. مەهدی خان لە لایەن خەڵکی شاری تەورێز و سەرۆکانی هۆز و کەسانێکی وەک کازم خانی کوێری قەراچەداغی، پەنا خانی جەوانشێر و عەلی خانی «شوقاقی»یەوە پشتیوانی لێدەکرا و زۆر تاقم و دەستەی لە دەوری هالابوون. پەلاماردەران بە هێرشی لەنەکاویان زەبرێکی گورچووبڕیان لە هێزەکانی دا و وەک گێڕاویانەتەوە نیزیکەی پێنجهەزار کەس لە هاوڕێیانی کوژراون و ئەوی ماویشن تۆقیوانە خۆیان خزاندۆتە کەلوکونی کارێزانەوە. لە ئاخروئۆخری ساڵی ١٧٥٠دا ئازاد خان جڵەوی شارەکانی تەورێز و ورمێی بە دەستەوە گرت و نەقیخانی کردە بەگلەربەگ (سەردار)ی ئازەربایجان. وێڕای چاوەدێرییەکی توند بە سەر ناوبراودا دەستی کرد بە ڕاکێشان و تێوەگلاندنی پیاوماقووڵان و سەرۆکەکانی دیکەی تایفەی ئەفشار. لە نێو هەڵکەوتەترینی ئەم پیاوانە دەکرێ ناوی فەتحعەلی خانی ئورشلووی ئەفشار و سەرۆکانی تیرەکانی چیانشین وەک شابازخان بێنە گۆڕ[٥].

سەرکردەی ئەفغانی هێشتا لە هەلومەرجێکی لەرزۆکدا بوو. گێڕانەوەی مەرعەشی کە دەڵێ کۆمەڵەی سەرەکی لەشکرەکەی واتە ئەفغانییەکانی غەلجایی پازدەهەزار پیاوێکی شەڕکەر بوون، زۆر فوولێکردنە[٦]. هێشتاش سەرژمێرییەکی دروست دەرباری غەلجایییەکان یانی دوژمنانی گەورەی سەرەتای پاشایەتی نادر وەدەس نەهاتووە هەتا ڕوون بێتەوە کە داخوا پازدەهەزار کەسیان لە خزمەت ئازادخاندا بوون یان نا. لە ڕاستیدا غەلجایییەکانی سەر بە وی لە نێو تایفەکانی ترکزمانی شیعەمەزەبا چوخسابوون. ئەم تایفانە بریتی بوون لە قزڵباشەکانی ڕەسەن و هێشتاش لە سەر ڕەوت و ڕێبازی شیعەگەری و بیروڕای قزڵباشانی سەفەوی و دژایەتی مەزەبی و نەتەوەیی ئەفغانییەکان سوور بوون. هەڵبەت نابێ وا بیر بکرێتەوە کە تایفەی ئەفشاری ورمێ لەگەڵ نادرشا و

٥ـ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی یەکەم، ل ٤٩١ ـ ٤٩٢؛ Nikitine ((Afsars)) 77, 106 تاریخی گیتیگوشا، ل ٣٣ـ ٣٤؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٤ ـ ١٨٥؛ و Butkov,1.238;III, 88.

6- cf . Lockhart, Nadir shah, 120; Quzanlu II, 676. Olivier (VI, 17).

ئۆلیویە دەنووسێ دەهەزار کەس. وا دیارە ئازادخان سەربازی ئێلجاڕی ئۆزبەکیشی بووە؛ بڕواننە: پەراوێزی ژمارە ٢٤.

جێنشینانی تێکەڵی و پێوەندییەکی تایبەتیان بووە. نیکیتین باسی چەند نیشانەیەکی سووکایەتی ئەوان سەبارەت بە نادرقولی دەگێڕێتەوە و دەڵێ ئەمانە نادریان بە یەکێک لە کوردەکانی قووچان دەزانی کە بە مەبەستی بەرزکردنەوەی پلە و پایەی کۆمەلایەتی، خۆی بە ئەفشاری قۆرقلوو ناساندووە[7].

ڕاستییەکەی ئەمەیە کە ئازادخان هەمیشە مەیلی بزووتن بەرەو باشووری ئێران و دانان و دامەزراندنی بنکەیەکی پتەوی بووە. گوڵستانە ئەم بابەتەی ئاوا گێڕاوەتەوە: ئازادخان لەگەڵ میرزامحەممەدتەقی و عەبدولعەلیخان کە لە قەلای کرماشان دادەنیشتن پێوەندییەکی سازکردبوو و پاشان پێشنیارێکی بە مەبەستی یەکێتی و هاوپەیمانی هێنایە گۆڕ. وڵامی زیرەکانەیان(۲) قنیاتی پێهێنا کە لە ئێستادا پێشنیارەکەی ئاکامی پێویستی لێناکەوێتەوە[8].

ماوەیەک دواتر مەترسییەکی ڕاستەوخۆی تازە لە بەرامبەر ئازادخاندا قوت بۆوە. ئەم مەترسییە لە لایەن تەیموورس پاشای گورجستان و ئارکێل (ئارکێلی، هێراکلیوس)ی کوڕییەوە بوو. ناوبراو کەمێک دوای کووژرانی پاشای ئەفشار دەستی دابوویە پەلهاویشتن و بەرفراوان کردنەوەی قەڵەمڕەوی خۆی لە سنوورەکانی باکووری. چالاکییەکانی ئارکێل بەکردەوە لە سەر بنەڕەتی ئیستراتژی بەرگرییەکی قایم دامەزرابوون و لەبەر پاشاگەردانییەکانی باشووری ڕووباری ئاراز، بزووتنەکانی زیاتر پاراستن و چەشنێک بەربەرەکانی سەرەتایی بوون[9]، چونکە هاڵۆزییەکانی باشووری ئازار پارێزگاکانی مەسیحینشینی باکووری ئەوێی دەخستە ژێر سێبەری هەڕەشەی تالان و

---

7- Nikitine ((Les Afshars)) 88. Koprulu ( Afshars, Ei 2, 1, 240.)
ئەم نووسەرە لای وایە کە نادر لە تایفەی قۆرقلووی ئەفشاری نیشتەجێی ئەبیوەردی خوراسان بووە.

٨ ــ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٥ ــ ١٨٦.

9- MAE Perse VII, NO. 81 ("Plastost Pour deffendre son Pays que pour faire des conquestes"): a report from a Swedish officer included in a report of the Comte Desalleurs, ambassador at istanbul, dated 1 February 1753.

کوشتار. ئارکێل راماڵی بردە لای تەورێز. لەگەڵ دەسپێکی پەلامارەکەی ئەگەر نەشێ بگوترێ تەواوی ئەفغانییەکان، لانیکەم دەکرێ بگوترێ کە زۆربەیان بە دڵخواز چوونە ڕیزی لەشکرەکەی. بە دیتنی ئەم هەلومەرجەی بەدی هاتبوو ئازادخان تەمای گرت بۆ تەمێ کردنی لەشکری بکاتە سەر. بەگوێرەی نووسینی ئۆلیویە تاقم و دەستەکانی ئەفغانی لە گرتنی ئێرەواندا دەورێکی بەرچاویان گێڕا"[10]

هەر لەبەر ئەم ڕووداوە ماوەیەک دواتر، لە سەرەتای ساڵی ١٧٥١دا ئازادخان گەمارۆی ئێرەوانی دا و ئارکێل کە لە بابەت برەوی هێز و دەسەڵاتی پیاوە ئەفغانییەکانییەوە ترسی ڕێنیشتبوو، بە پاڵپشتی ئەرمەنییەکان هەڵیکردە سەر ئازادخان و وێڕای کوشتارێکی بەربڵاو، پەلامارەکەی تێکشکاند[11] بەگوێرەی نووسینی گوڵستانە، ئازادخان دوای ئەوەی تەیموورس پێشنیارەکەی لە بابەت یەکێتی و هاوپەیمانی لە ڕێی زەماوەندەوە بردەوە پاش هێرشی کردووە[12] ئارکێل بە مەبەستی گرتنی خودی تەورێز داوەری و سەربازگەیەکی لێدانا. سەرەنجام یەکێتی خانەکانی قەفقاز لە پشتەوەڕا مەترسی بۆ ساز کرد و بەناچار پاشەکشەی کرد. هەڵمەت و شاڵاوی تر لەم ناوچانەوە ئاخرییەکەی لە ساڵی ١٧٥١دا، ئارکێلی ناچار کرد ڕوو بکاتەوە تفلیس[13]

ئازادخان دەرفەتی لەم شێوە سەرکەوتنە هێنا و بە زەماوەند لەگەڵ خوشکی ئارکێل و سازکردنی خزمایەتی لە ژنانەوە کە ئارکێل لە پێشدا لووتی پێدانەهێنابوو، پەیوەندەکەی توندوتۆڵ کرد. سەرەنجام توانی دەسەڵاتی باوێتەوە سەر ورمێ و پاشان لە ژانوییەی ساڵی ١٧٥٢دا لە تەورێز دابەزی[14]. ئەم ساڵە ساڵی چڵەپۆپەی دەسەڵاتی ئازادخان بوو لە ئازەربایجان و قەڵەمڕەوی لە سەرانسەری ناوچەکانی باشووری ئاراز تا ئەردەوێڵ و ورمێ پەرەی گرت و ناوچەکانی شانبەشانی چۆمی ئاراز هەتا پارێزگای

---

10- Olivier VI, 17.

11- peyssonnel part II, 119 – 124; Brosset, 156, 163; Butkov I, 238; III, 88.

١٢ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٦ ـ ١٨٧.

13- peyssonnel part II, 125 – 133; Olivier VI, 18 – 19.

١٤ـ Olivier VI,18 – 19 موجمەلوتتەواریخ، ل ١٨٧ ـ ١٨٨.

«نەخجەوان»یش کەوتە ژێر ڕکێفی[۱۵].

هەڕەشـەیەکی دیکـەش لـە لایـەن خـانی شـەکی و هاوپەیمانـە «لەزگی»یەکانییەوە بوو بە هۆی یەکێتی نێوان شـای گورجسـتان و خانـەکانی قەراباغ و شووشا و ئێرەوان. ئەم یەکێتییە لە یەکەم هێرشـی خـانی «شـەکی»دا تێکقرما. لەگەڵ ئەمەشدا ئارکێل و چەکدارە قەفقازییەکانی سـەرەنجام یـە ۳۱ی ئاگۆستی ساڵی ۱۷۵۲دا هێرشبەرانیان بەزاند و وێڕای قەڵاچۆیەکی سامناک هەتا ناوچـەکانی ڕۆژهـەڵاتی هەڵـیانبڕین[۱۶]. ئازادخـان کـە چـەتری پاراسـتنی لەزگییەکانی بە مەبەستی تێنهێنان بۆ ناوچـەکانی بـاکوور لـە دەس دابـوو، ناچار بوو مل بۆ کۆمەڵە مەرجێک ڕاکێشێ کە تێیـاندا ڕەزامەنـدی دەربـڕی تـا قەڵەمڕەوی تەنیا هـەر باشـووری ئـاراز بگرێتـەوە[۱۷]. وا دەردەکـەوێ کـە ئـەم پاشەکشەیە سێبەری خستبێتە سەر پەیوەندی تار و تەماوی نێوان ئەو و تایفەی ئەفشار و تیرەکانی تری ئازەربایجان. بۆیە ئازادخان لێدەبڕێ کە لـە بـەهاری ساڵی ۱۷۵۳دا بەختی خۆی لە سێسەد مایـل خـوارتری ئازەربایجـان بـەتـاقی بکاتەوە. ئەم ناوچانە کەوتبوونە قەڵەمڕەوی کەریمخـانی زەند. نـاوبراو ئێسـتا خەریکی شەڕ و لێکـدان بـوو لەگـەڵ عـەلیمـەردانخـان و هاوپـەیمانانی و وا وێدەچوو کە هەرێمی دەسەڵاتی زەندیە لە سەر لێکهەڵوەشانەوەیە.

## ۳ ـ ۲ گیرانی پەری و ئیسفەهان

ئازادخان لە بەختی بەدی زەمانێکی دەنگی لەشکری دا کـە کـەریمخـان توانستی شەڕ و بەربەرەکانی هەبوو. لەشکری ناردە پێش ئازادخان کە بە فیت و دنەی هاوپەیمانە ئازەربایجانییەکانی لە چەند مزڵەی لەشـکرگای کـەریمخـان هۆردووبەزی کردبوو. ئازادخان بە مەبەستی ڕاگرتنی شەڕ و پێکهـاتنی ئاشـتی چەند کەیخودایەکی ناردە لای، بەڵام کەریمخان عوزرهێنانەوەکەی قبووڵ نەکرد و گوتی ئێستا کە زانیویانە خوازیاری پاشایەتی و دەسـتندەخۆری سـەرکردەی

15- MAE Peres VII, NO. 81; Olivier VI, 35.

16- Olivier VI, 35; Bakikhanov, 161; cf. 13 . 30

17- Peyssonnel part II, 143 – 152; Brosset, 175 – 177, 212 – 214.

بەختیاری پیاوێکی فێڵەباز و درۆزنە، دەیانەوێ بە هاسانی شانی لێبترازێنن، جا کەوایە بە کەمتر لە تەسلیمبوونی ئازادخان و وەرگرتنی باج ڕازی نابێ. ئەم سووکایەتییە زۆر لەوە زیاتر بوو کە هاوپەیمانانی ئەفشار و ئەفغان خۆیان بۆ قبووڵ کردنی ئامادە کردبوو. بۆیە ساز بوون بۆ خۆڕاگری و بەربەرەکانی[18].

بەڵام تەنانەت بەر لەوەی شەڕێک بقەومێ، هێزەکانی زەند لەبەر دووبەرەکی نێوخۆ بە قورسی زەبریان وێکەوت. بێگومان محەممەدخان و شێخاڵیخان بە وەبیرهێنانەوەی ڕووداوی شکستی مەینەتباری پاری ئەستەرئاباد ــ لەوێش محەممەدخان داخوازی سازانی کردبوو ــ کە تەنیا دەگەڕایەوە سەر شەڕ و پەیکەردەی ئازایانەی سپای قاجار، ڕێوڕاست گوتیان لەگەڵ ئازادخان تێکهەڵناچن و کەریمخانیان هان دا کە لێگەڕێ سپای ئازادخان بکشێتەوە. بە گوتەی نامی یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ئەم دووبەرەکییە ئەوە بوو چونکە سەرداری زەند لەو شەڕەی ئاخریدا لەبری پشتبەستن بە سەربازانی ئێلجاڕی و پیاوانی تایفەی زەند پشتی بە چەکدار و قۆرخانەچییەکانی پیادە بەستبوو بە مەبەستی وەفادارمانەوەیان بەشێکی زیاتری دەسکەوتی بە سەرا دابەشین[19]. سەرکردەکانی دڵشکستەی سوارەی زەند ئەگەرچی بەئاشکرا نەیاندایە لانی سەرکێشی و دەرهەڵبوون، بەڵام لانیکەم حازر نەبوون کە وەک شەڕەکانی پێشوویان خۆڕابگرن. شێخاڵیخان و محەممەدخانی زەند ئیزنیان دا بە پیاوەکانیان کە بەر لە وەختی خۆی واز لە ڕاسپێراوێتی لەشکریان بێنن و بلاوەی لێبکەن. ئەسکەندەرخانیش کە وەک هەمیشە ئازایەتی دەنواند، خۆی لە یارمەتی دانی شێخاڵیخان پاراست و ناوبراو ناچار بوو کە فەرمانی پاشەکشە بدا بە هێزەکانی. سەرەنجام هەردوو تەنیشت و دەورەی بارگەوبنەی هێزەکانی زەند لەبەر هێرشی سەلیمخانی بابان کە لە کوردانی هاوپەیمانی ئازادخان بوو تەواو تەندرا و تەگبیری نەسازانی ویشک و ڕەقی کەریمخان تێکشکانێکی ئابڕووبەرانەی لێکەوتەوە؛ ماوەیەک بەر لە ڕۆژاوا بوون ئازادخان هەوساری مەیدانی شەڕی بە دەستەوە گرتبوو[20].

---

١٨ــ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٧٠ ــ ٢٧٢.

١٩ــ تاریخی گیتیگوشا، ل ٣٥.

٢٠ــ تاریخی گیتیگوشا ل ٣٥ ــ ٣٦؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٧٢ ــ ٢٧٣؛ تەورێزی، ب ١٧٣.

سەرکردەکانی زەند بەرەو زێد و نیشتمانی خۆیان و قەڵای پەری رایانکرد، شێخالیخان و محەممەدخان بە مەبەستی پاراستنی قەڵا مانەوە و کەریم و سادق و ئەسکەندەرخان گەڕانەوە ئیسفەهان هەتا سەرەتای پاراستنی پایتەخت خۆش بکەن. هەواڵی شکانی هێزەکانی زەند بەر لەوەی ئەوان بگەنە ئیسفەهان بلاو بۆوە و تاقمی ناڕازی لێرولەوێ سەریان هەڵدا. برووسکانەوەی تیخی دەسەلات و کوشتاری بە پەلەپرووزێ و بەکۆمەڵ، سەربزێوییەکانیان رۆمرکاند. لەگەڵ ئەمەشدا وەکیل تێگەیی کە هەلومەرج بۆ کۆکردنەوەی چەکداری ئێلجاڕی و پاراستنی شار لەبار نیە، بۆیە پاش چەند رۆژان ئەوێی بە مەبەستی چوونە شیراز بەجێهێشت[21]

لە ماوەی چەند کاتەژمێرێکا ئیمپراتۆرێتی یەکگرتووی زەندیە لەبەر بەرچاوتەنگی بیرتەسکانە گەیبووە سەر لێواری هەڵدێر. ئازادخان دەرفەتی لە دەس نەدا. هێزەکانی پاشەنگی زەندی هەتا شوێنی نیشتەجێبوونیان هەڵبڕی. لێرەدا میرزا محەممەدتەقی و عەبدولعەلیخان کە وەک بارمتە لای کەریمخان بوون، رایانگەیاند کە لە رەوکردنی هێزەکانی زەند بەرەو رۆژهەلات لەگەڵیان ناچن. ئازادخانیش پەنجا کەسی ڕەگەڵ خستن تا بەرەو کرماشان ببزوون. ئەو کات لەرێوە بە مەبەستی گرتنی سەنگەر و شوورە و قەڵای زەندیە لە پەری کەوتەرێ[22]

لە پەری داخوازەکانی قبووڵ نەکران، پاش چەند رۆژ گەمارۆ و تێکهەڵچوونی بێسەرکەوتن تەمای گرت هەڵیانفریوێنێ. قازی عەسکەری وریای(٣) وەک باڵوێز نارده لایان تا هانیان بدا بەر لە کشانەوە و گەڕانەوەی ئازادخان بەرەو هەرێمی ئازەربایجان دیدارێکی دۆستانەی لەگەڵ ئەنجام بدەن. رەنگە پێیان گوتبن کە پاش گیرانی ئیسفەهان تازە کەریمخان هیچ شانسێکی نەماوە و چونکە ئەوان لەو شەڕی دواییدا خۆیان لە پێکدادان پاراستووە، نابێ لە بابەت دیداری ئازادخانەوە دڵیان بترسێ.

سەرۆکانی تایفەی زەند چوون و هەرکە گەیشتنە بارگای ئازادخان لەرێوە وێڕای پازدە کەسی تر لە ژنان و پیاوانی ژووری قەڵا خرانە نێو

٢١ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٣٦ ـ ٣٧؛ Hovhanyants, 286.
٢٢ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٧٤ ـ ٢٧٥.

کۆت و زنجیرەوە. لە نێو دیلەکاندا دەشێ باسی دایکی کەریمخانیش بکرێ. هەروەها خەزێنە و عەمبارەکانی قەڵای پەریش کەوتنە دەس ئازادخان. ماڵ و دارایی و دیلەکان بۆ خانی ئەفغان سامانێکی گەورە و دیارییەکی ڕووحی بوون. زیندانی و خەنیمەتەکانیان دایە دەست عەلەمخانی ئامۆزای ئازادخان و بە حەوسەد سوارەی سکۆرتی ئاژاوە بەرێکرانە ورمێ. لەم ڕۆژانەدا ئازادخانیش بەرەو ئیسفەهانی بێ داژدار کەوتەڕێ[۲۳].

ئەم شارە لە مانگی سێپتامبر یان سەرەتای ئۆکتۆبردا بێ هیچ دەسکردنەوەیەک کۆڵی دا. ئازادخان وەرزی زستانی لەوێ ڕابوارد. یەکسمەکانی لە کلیسای ئاگۆستینین تاقەت کرد و خۆی لە کۆشکی چلستووندا بنەی دانا. باجێکی ٦٠هەزار تمەنی خستە سەرشانی خەڵک کە ٨هەزارتمەنی لە دانیشتووانی جولفا وەرگیرا.

بەگوێرەی نووسین و گێڕانەوەی ڕووداونووسانی ئەرمەنی «باجئەستێنەکان وەک ئاورێکی بەربێتە قامیشەڵان کەوتنە گیانی مەسیحییەکانی بێ داژدار؛ ژن و پیاویان لە شەقام و کۆڵانان بەستبوونەوە و داوای پارەیان لێدەکردن.» لە هەموو شتێک خراپتر بنەگر بوونی ئۆزبەکان بوو لە جولفا. ئیسفەهان بۆ دووهەم جار لە ماوەی کەمتر لە سێ ساڵان داگیر کرا و تووشی کۆڵەمەرگی و هەژارییەکی سەخت بووە[۲٤].

ئازادخان کە دڵپەرۆشی دوایین هێرشی بەهارانەی بوو بۆسەر کەریمخان، چەند تاقمێکی بە مەبەستی کۆکردنەوەی کەلوپەل و ئازۆخە ناردە ناوچە دووردەستەکانی ژێرڕکێفی خۆی. گوندەکانی ئەرمەنینشینی دەوروبەری

---

۲۳ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ۳۷؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ۲٤۷ ـ ۲۷۷؛ Hovhanyants, 282. گوڵستانە پێیوایە ڕاکردنی کەریمخان لە ئیسفەهان زیاتر لەبەر گیرانی پەری بووە تا نەسازان و ناڕەزامەندی خەڵک.

۲٤ـ Garmelites, 685; Hovhanyants, 286. ڕۆستەموتتەواریخ، ل ۲٦۳، (تەزکەرەی شووشتەری، ل ۹ ـ ۱۰) باسی زیندانییەک دەکا کە قەشەیەکی مەسیحی بووە. خودی نووسەر پووڵێکی داوە و کڕیوێتەوە و ئازادی کردووە. پاشان بردوویەتە ماڵ و قەشە ئینجیلی بۆ خوێندۆتەوە.

پەری سەرکەوتووانە دەستیان کردەوە[٢٥].

ڕاست لەم ڕۆژانەشدا ناوچەی بەرێژەو و بەرەکەتی قومشە کە خاوەنی قەڵایەکی قایم بوو ملی بۆ خواستەکانی ئازادخان ڕانەکێشا. فەتحعەلیخانی ئەفشار بە لەشکرێکەوە پەلاماری قومشەی دا و ئەو شارەی خستە بەر شەپۆلی تاڵان و بڕۆ و دەسدرێژی بۆ سەر شەرەف و کوشت و کوشتار[٢٦].

## ٣ ـ ٣ شەڕی قومشە

ئازادخان ناچار بوو کە بەرلە زەمانی دیاریکراو لەگەڵ کەریمخان تێکهەڵچێ. وەختایەک کە وەکیل گەیشتە قەراخ شیراز، هاشمخانی بەیات لە کۆدتایەکدا شیرازی خستە ژێر چنگی خۆی و کەریمخان دانی بە دەسەڵاتیدا نەهێنا[٢٧]. ناوبراویش دەروازەکانی شاری لە ڕوو داخست(٤). لەبەر وەی کە خانی زەندیش تاقمێکی وای لەگەڵ نەبوو گەڕایەوە. ژمارەیەک شەڕکەری ناوچە پشتیان گرت و هێزیان دایە بەر و ئێستاکە چەندهەزار چەکدارێکی بە دەستەوە بوو، بۆ دەگژڕاچوونی ئازادخان بەرەو باکووری شیراز بزووت. لە پەلاماری قومشەدا خەڵک بە گەرمی پشتیوانیان لێکرد، چونکە هەستیان دەکرد کە لە ئاخرین خۆڕاگری لە بەرامبەر ئەفغانییەکاندا شتێکیان نیە تا بیدۆڕێنن[٢٨]. کەریمخان ژنانی ناردە شوێنێکی پەنا و ئەمین لە کوێستانان و قەڵای قومشەی کردە ناوەندی سەرکردایەتی شەڕ و تێکهەڵچوون. لە ماوەی دوومانگەی زستاندا چەند پۆلێکی پارتیزان بە مەبەستی بڕینی هەودای پێوەندی و تاڵانی گیا و گیشە و کادێن و تفاقی ئازادخان بەڕێکرد[٢٩]. ڕەنگە دەسڕاگرتنی ئازادخان سەبارەت بە شاڵاوی یەکجارەکی و بڕینەوەی ڕەقیبی لاوازکراو لەبەر ئەم هەواڵانە بووبێ کە گۆیا محەممەدحەسەنخانی قاجار پەلاماری ناوچەکانی باکووری قەڵەمڕەوی

---

25- Hovhanyants, 280.

٢٦ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٢٦٢.

٢٧ـ ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٤٨.

٢٨ ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٣٨.

٢٩ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٨٧.

ئەوی داوە[30]. هەرچۆنێک بێ ئاخرییەکەی فەتحعەلیخانی بــە خــۆی و هێزێکــی هەشــتهــەزار کەســییەوە نــاردە ســەر قومشــە تــا هێلانــە زرگەتــەی ئەو شارە خاشەبڕ بکا.

گۆیا کەریمخان تــەنیا ســێهــەزار چەکــداری هێنابوویــە مەیــدان کــە زۆرێکیان خەڵکی مەشق پێنەکراوی شارەکی بــوون، بــەڵام دووســەد کــەس لــە سوارانی زەند بە ســەرکردایەتی ئەســکەندەرخانی لاوی دایــکبــرای، ئازایانــە پەلاماری سپای فەتحعەلیخانی ئەفشاریان دا کە ناچار بوو داوا لــە ئازادخــان بکا بۆخۆی بێتە مەیدانی شەڕ[31]. پاش داوەرینــی ســپای ئازادخــان بــارودۆخ وا تاڵوتوون بوو کە ئەسکەندەرخان ویستی لە دەســپێکی شــەڕا هەڵــکوتێتە ســەر خانی ئەفغان و بیکوژێ. وەکیل بــە نابەدڵــی پێشــنیاری براکــەی قبــووڵ کــرد. ئەسکەندەرخان ڕاستەوخۆ ڕکێفکوت بە نێو هێزەکانی دوژمنا تێپــەڕی. ســەرەتا لایان وابوو کە نێردراوێکە و بە مەبەســتی ســەروەبەرهێنان و دەس دان هاتۆتــە پــێش، بۆیــە دریــان دا و ڕێگایــان بــۆ کــردەوە. پــاش وەشــاندنی زەبرێــک وەرسووڕایەوە و ئێستا بۆ لەشکری دوژمن کە لە سەرســوڕمان خەلەســتبوون، ئامانجێکی لەبار بوو؛ وەختایەک گەیشتەوە نێــو ســپای براکــەی هــەتا کورتــە ڕاپۆرتی ڕووداوە بگێڕێتەوە، لە بەرپێی وەکیل گیانی دەرچــوو. بــەڵام ئــەو بــە هەڵە کابرایەکی دیکەی کوشتبوو. ئێستا بەرگر و بەرهەڵســتێک لــە ســەر ڕێــی ئەفغانەکان نەبوو. خانی زەند لەگــەڵ کــوژرانی بــرای گەنجیشــی بــە مــەتینی جووڵایەوە و بە ڕێی «گــەنمان»دا ڕکێفــی بــەرەو باشــووری ڕۆژاوایــی کوتــا و کشایەوە نێو زنجیرە چیاکانی ناوچەی کۆهکیلۆیە[32].

---

30- Hovhanyants, 287.

٣١ــ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٨٧ ــ ٢٨٨؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٢٥٠؛ ئەم کتێبــەی ئــاخری دەڵێ سپای ئازادخان سێهەزار کەس بوو. گوڵستانە بە چــلهــەزاریان دادەنــێ. بــەڵام هەردوو ژمارەکە وەک پێهەڵابردن دەچێ.

٣٢ــ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٨٨ ــ ٢٨٩؛ گیتیگوشای زەندیە، ل ٣٩؛ نووسینی نــامی لــە بابــەت مــەرگی ئەســکەندەرخانەوە لەگــەڵ گوڵســتانە جیــاوازە. بــە گوتــەی نــامی ئەسکەندەرخان لە شەڕێکی مەینەتباری تێکــەڵ بــە پاشەکشــەی زەندیــە، بــە دەســت ئەفغانییەکی خۆمەڵاسداوی پشت گاشەبەردێک بە گوللە کوژرا.

سەرەڕای نیگەرانی ئازادخان لە بابەت ناردنی هێز بۆ نێو چیاکانی بەختیاری، فەتحعەلیخانی ئەفشار و شاروخخانی ئەفغان لەگەڵ تاقمێکی چەکدارەکانیان کەوتنە شوێن کەریمخان، بەڵام بەربەرەکانی خۆڕاگرانەی ئەو بوو بە هۆی ڕزگاری گیانی ڕاکردووان. لە شەڕێکی دەستەویەخەدا شاروخی کوشت و فەتحعەلیخان دوای ئەوە خەشی دڵی خۆی بە گیان وماڵی خەڵکی گەنمان ڕشت(٥) گەڕایەوە ئیسفەهان[٣٣].

کەریمخان پاشماوەی زستانی ئەو ساڵەی لە چیاکانی لوڕستان و بەختیاریدا ڕابوارد و دەستی کرد بە کۆکردنەوەی سپای تازەپشوو لە پاشماوەی هێزەکانی تێکشکاوی زەند و خێڵاتی پشتیوانی. بنکەی حکوومەتەکەی لە خورمئاباد کە ناوەندی پارێزگای لوڕستانی فەیلی بوو دانا. لە خورمئاباد خەڵک بە گەرمی و میوانگری لەگەڵی جووڵانەوە[٣٤]. ئازادخان لە ئیسفەهان مایەوە و هیچ کارێکی نەکرد، بەڵام لەم کاتەدا ڕووداوێک قەوما کە ورەی هێزەکانی زەندی بەرز کردەوە.

## ٣ ـ ٤ ڕاکردنی دیلانی زەند و شەڕی دووئاو

گیرانی حەڤدە کەس لە خانەکانی زەند وێڕای پەنجا سەر ژن و منداڵیان لە پەری و دەس بە سەراگرتنی بێ سەرێشەی ئیسفەهان و ناوچەکانی دەوروبەری، دەسکەوتی سەرکەوتنی ئازادخان بوون. بە دابڕینی سەرکردەکانی تایفەی زەند کە پیاوی وەک محەممەدخان و شێخاڵیخانیان تێدا بەدی دەکرا[٣٥]،

---

٣٣ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٨٩ ـ ٢٩٢. ئەگەرچی گوڵستانە چۆنیەتی ڕووداوەکەی لە نامی وەرگرتووە، دیسانیش باسی شەڕی قومشە و پاشەکشەی پاش ڕاکردنی لە بەرامبەر ئازادخان لە لوڕستاندا هێناوەتە گۆڕ. یادداشتەکانی گێمبروون بۆ ئەم دەورەیە چیان پێنیە و هەڵبەت هیچکام لە سەرچاوەکانی هاوچەرخیش زانیارییەکی بەنرخیان لە بابەت زنجیرەی ڕووداوەکانەوە بە ڕێکی نیشان نەداوە. من بۆ ئەم مەبەستە کتێبی «نامی»م پێ باشترە لە گوڵستانە کە گومان ساز دەکەن...

٣٤ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٤٠.

٣٥ـ گوڵستانە سادقخانیش بە یەکێک لە بەندییەکان دەزانێ و دەڵێ ئەو بە ناوی خزمەتکاری محەممەدخان ناوی نەدرکا. کوتە یەسکێکی دیتەوە کە محەممەدخان کەندری

زۆر وێدەچی کە ئازادخان پلە و هەلومەرجی خۆی پێ لە نادر سەرتر بووبێ، چونکە دوورخستنەوەی سەرۆکانی زەند کۆتایی کاری ئەوانی وەک دەسەلاتێک لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆسدا بە شوێنەوە بوو.

ئەسیرەکان کە بەرەو ورمێ بەرێوە بوون گرفتاری نەهامەتی و چاوەدێری و چۆلەپێچکران هاتبوون. لە چوارەم رۆژی سەفەرەکەیاندا[36] محەممەدخان و شێخالیخان وایان رێکخست کە بەدزی باس و راوێژ بکەن و لە ئاکامدا تەمایان گرت کە بە دەربازبوونی تێکرایی خۆ بدەنە بەر کارێکی گەورە. بە دەرفەتهێنان لە سەرخەوی ئێوارەی پاسدێران، خۆیان لە بەند و داوان رزگار کرد و بە هێوری و هێمنی زیندانییەکانی دیکەشیان ئازاد کرد و ژنانیشیان لە مەبەستەکە حالی کرد. ئەو کات سەفەرعەلیخان و شوکرعەلیخانی زەند بە دەمانچە و شمشیرێکی کە حەشاریان دابوون پەلاماری عەلەمخانیان دا و ونجرونجریان کرد. پاشان هاواریان کرد کە کەریمخان و لەشکرەکەی گەیشتوونە سەریان. پاشی ئەم هەرا و زەنازەنایە ژنان و پیاوانی زەند بە شمشیر و نێزە هرووژمیان کردە سەر سەربازانی گێژ و خەوالوو[37] و لە ئەستوندەکی خێوەتەوە بگرە تا هەر شتێکی وەبەر دەستیان هات نائومێدانە و بەوپەڕی لە خۆبردوویی شەڕیان پێکردن. حەفتا سەر یەستری بارگەوبنەی پاسدێرانیان ڕفاند و بەر لەوەی ئەفغانییەکان وەخۆ بێنەوە، دیلانی سوارە بەرەو ئازادی تێیانقوولاند.

ئەم پۆلە سوارە بۆ خۆپاراستن لە ناوچەی پەری کە ڕەنگبوو هێشتاش

بەند و داوی خۆی پێبڕی. بەلام گیتیگوشا دەنووسێ کە سادقخان لە ڕاکردن بۆ ئیسفەهان پاش یەکەم شەڕ لەگەل ئازادخان، وێڕای کەریمخان بووە.

٣٦ـ گولستانە لە لاپەڕە ٢٩٧ی کتێبەکەی ئەم شوێنەی بە «زاغە» داناوە؛ ڕەنگە ئەم جێیە زاغەی ئونووج بێ لە شێست کیلۆمیتری پەری. (بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی سپا، بەرگی ٥، ل ٢١٠ و نەخشەکانی.)

٣٧ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٧٩؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٢٦١؛ تاریخی گیتیگوشا لە لاپەڕە ٤٠دا جیاوازییەکی کەمی لەگەل ئەم دەقە هەیە و دەلێ ژنان ڕێی ڕزگاری پیاوانیان خۆش کرد. لە دەقی ڕۆستەموتتەواریخیشدا، ژنان دەوری بەرچاویان هەیە و هەلبەت نووسەر هێندێک وتەکان دەڕازێنێتەوە و زیادیان دەکا. هەروەها دەلێ عەلەمخان وەختایەک کوژرا کە چووبووە سەر پێشاو.

بە دەس ئازادخانەوە بۆ ڕەویان بردە لای باشـوور و ناوچـەی بڕووجێـرد. لـە مەودای ڕێگادا تووشی ئەو تاقمە شەڕکەرە کـورد و لـوڕە فەیلییانـە بـوون کـە دەیانویست بۆ شەڕ دژی ئەم داگیرکەرە تازانەی ئەفغانی بچنـە نێـو لەشـکری کەریمخان. کەریمخان لە خورڕەمئاباد بوو کە هەواڵـی ئۆخژنبەخشـی ڕاکـردنی دیلانی پێگەیشت و لە بڕووجێرد چاوی پێیان کـەوت. بـێگومـان ئـەم شـاکارە هەڵکەوتەیە شوێنی باشی لە سەر ئەو تایفەیە دانـا کـە هێشـتا سـەبارەت بـە چوونە نێو ڕیزی سپای کەریمخان دوودڵ بوون و نە تەنیا بوو بە هۆی دڵـگەرمی هۆزەکانی کـورد و لـوڕ، بەڵـکوو قـەرەگوێزلوو و خودابەنـدەلووی(٦) دەرە و دەشتەکانیشی ڕاکێشا و ڕیزەکانی شەڕکەرانی خانی زەندی چڕتر کردەوە[38].

ئازادخان بە مەبەستی وەشاندنی زەبری یەکلاکەرەوە لە کـەریمخـان، عەبدوڵلاخانی ئەفغانی سەرکردەی خۆی ناردە خورڕەمئاباد، کـەچی هێزەکـانی زەند پەلاماری ئەم لەشکرەیان دا و تێکیانشکاند. بەڵام بارودۆخ وای هەڵـدەگرت کە هێزەکانی زەند و تایفەکانی هاوپەیمانی وەرزی زسـتان بـە نـەهێنی تێپـەڕ بکەن[39] و لەم ماوەیەدا بە کوێرەوەری خەریکی کۆکردنەوەی چەکداری تازەپشوو بن. لە بەهاری ساڵی ۱۱٦٧ی کۆچی / ۱۷٥٤ی زایـینیدا، ئازادخـان لەشـکرییانی تازەتەیار و تێروپڕی خۆی بە فەرماندەرێتی فەتحعـەلیخـانی ئەفشـار نـاردە شەڕی کەریمخان. بەڵام وەکیل هێشتاش کە سەرقاڵی کۆکردنـەوە و خڕهەڵـدانی هێزی پێویست بوو، کشایەوە کوێستانەکان. لە دووئاو(۷)ی سیلاخۆر[40] کـە زۆر لە بڕووجێردەوە دوور نیە، ئاخرین هاوپەیمانـەکانی خۆیـان لـێ لاڕی کـرد و بەرەو ماڵ پێیان پێوەنا. وەکیل لەگەڵ کۆمەڵێک لە پیاوانی دەسـکەرەوەی زەنـد دەستی کرد بە قوونەشەڕ بە مەبەستی بەرهەڵستی دوژمنـان و دوورکەوتنـەوەی ژن و منداڵ و بارگەوبنە. لەم شوێنەدا کەمـەرخانی زەنـد لەبـەر ئازایـەتی بـە تاقەسوارە چووبووە مەیدان و خەریکی سەرقاڵ کردنی دوژمـن بـوو و ژیانیشـی

---

۳۸ ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ۲۸۳.

۳۹ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٤١ ـ ٤٢.

٤٠ـ دووئاو کەوتۆتە ۷٥کیلۆمیتری باشـووری ڕۆژاوای بڕووجێـرد. بڕوانـە: دێهگـان، ل ۷۳؛ فەرهەنگی جوغرافیـایی سـپا، بـەرگی ۱۱، ل ۱۱٦ و نەخشـەی ئـەراک: ناوچـەی سیلاخۆر لە بەرگی دووهەمی جوغرافیایی کەیهان لە ل ٤٦٦ (نەخشە)دا نیشان دراوە.

لەم ڕێیەدا بەخت کرد: لە شەڕێکی بەگەرمەدا بۆ یەکەم شەڕکەری ئەفغان چووە مەیدان، هەر دوو بە سواری ئەسپ لینگیان دا و پێکیان دادا و گلین، هەردک سوار یان تاسان یان کوژران، سوارێکی دیکەی ئەفغانی هەڵیکوتایە مەیدان و سەری کەمەرخانی گۆشاوگۆش بڕی. یەکێک لە سوارەکانی زەندیش هەڕای کردە سەر سوارەی لەپێپەڕیوی ئەفغانی و سەری بڕی، بەڵام ئەم کردەیە لەچاو نەمانی قارەمانێکی ئاوا، ئەویش هەر ماوەیەک پاش مەرگی ئەسکەندەرخان، تەنیا تۆڵەیەکی کەم و ناچیزە بوو. کەریمخان لەم ڕۆژەدا خۆی تاوی دایە مەیدان و وەک گێڕاویانەتەوە چوارکەس لە پاڵەوانەکانی ئەفغانی قەڵتوبڕ کرد و لە ئاکامی ئەم چاونەترسی و بوێرییە بێهاوتایەی بوو کە فەتحعەلیخانی ئەفشار فەرمانی هەڵمەتی بەکۆمەڵی دا. زەندیە پاش تێکهەڵچوون لەگەڵ دوژمن بەرەو چەمچەماڵ کشانەوە. دوژمنیش بەر لەوەی لە بیری تەوژم و پەیکەردەی هێزەکانی زەندا بێ، لە فکری نیگاداری و کۆکردنەوەی خەنیمەت و مەڕوماڵاتی تاڵانی دابوو[41].

فەتحعەلیخان سێ ڕۆژ دواتر گەڕایەوە ئیسفەهان. محەممەدخان و شێخاڵیخانی زەند و تاقمەکەیان هەرکام بەجوێ لەگەڵ جەماوەرێکی زۆر هاتنە چەمچەماڵ(٨). لەم ناوچەیەدا تینیان بۆهێنان هەتا بچنە لای عەلیمەردانخانی بەختیاری. ماوەیەک دواتر هەر لە هاوینی ئەو ساڵەدا سەرکردەی بەختیاری بە دەستی محەممەدخانی زەند کوژرا.

## ٣ ـ ٥ خاپوورکرانی قەڵای کرماشان

شێخاڵیخان و محەممەدخانی زەند کە دوو جار دەربازبوونی سەرسوڕهێن تاسەی نەشکاندبوون، لێبڕان تا سەرەتایەک بۆ هێرشی بێوچان بە مەبەستی شەکەت کردنی ئازادخان خۆش بکەن. بە ڕێگای سنووریدا بەرەو ناوچەی زەهاو تێیانتەقاند و چوونە دیدەنی سەرۆکانی تایفەی زەند و زەنگەنە

---

٤١ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٤٢ ـ ٤٤؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٨٤ ـ ٢٨٦. موجمەلوتتەواریخ نووسیویەتی کە ئازادخان لەم شەڕەدا بۆخۆی سەرکردایەتی لەشکری لە ئەستۆ بووە نەک فەتحعەلیخانی ئەفشار.

و کەلهوڕ و کاتێک لەشکرێکی دەهەزار کەسییان کۆکردەوە، هاتنە لای مەڵبەندی سەرپێڵیزەهاو. عەبدوڵلاخان کە لە لایەن پاشای بەغداوە حاکمی زەهاو بوو داوای باجی لە هێزەکانی زەندیە دەکرد. لەبەر سەربادانی ڕقئەستوورانەی محەممەدخان سپایەکی لە تایفەی «باجەلان»ی خۆی و تایفەی جاف کۆکردەوە تا بە زۆری چەک فەرمانەکەی بێنێتە دی. لەم ڕۆژانەدا لەبەر هاتنەوەی شەشهەزار سەر خێزان کوردی شوقاقی(٩) کە تازە لە خوراسانەوە گەڕابوونەوە ڕیزەکانی سپای زەند بەهێزتر بوون. بێگومان نادرشا کوردانی شوقاقی پەڕەوازەی خوراسان کردبوو. ئەمانە سەرەتا دەیانویست کە لە ئیسفەهان تێکەڵی لەشکری ئازادخان بن، بەڵام کار و کرداری ناوبراو لەم تەمایەی سارد کردنەوە، بۆیە بە بیانووی کۆچبەری ئەم شارەیان جێهێشت و لە سەرپێڵیزەهاو زۆر کەیفخۆش بوون کە بەخت یاریدەی داون و تێکەڵی نوێنەرانی کەریمخان بوون. بەڵام تێکهەڵچوونێکی وا لە مابەینی عەبدوڵلاپاشا و محەممەدخاندا نەهاتەگۆڕ، چونکە وا دیار بوو کە لەشکری خانی زەند درز و ناکۆکی تێکەوتووە. محەممەدخان سەبارەت بە کەرەمخانی وەند(١٠) کارێکی نەفامانەی کرد. خۆبەزلزانی و ئازایەتی کەرەمخان تووڕەی کرد و فەرمانی دا کە ئەو و مامیان لە دار دا و لاشەیان وەک کەلاکەمەڕ لە نێوەڕاستەوە شەق کرد و پاشان سەریان بڕین. بێشک ئەم سزادانە بوو بە هۆی ڕق و بێزاری بەشێکی زۆری شەڕکەرانی وەند و کەڵهوڕی هاوپەیمانی و هەروەها بزووتنی محەممەدخان و پاشماوەی هێزەکانی بەرەو کرماشان لە مانگی داهاتوودا[٤٢].

پێویست بە وەبیرهێنانەوەیە کە پاش یەکەم شکستی کەریمخان لە بەرامبەر ئازادخاندا، عەبدولعەلیخانی عەرەب و محەممەدتەقیخان کە سەرکردەکانی پێشووی قەڵای کرماشان بوون، هۆردووبەزی سەرەکی زەندیان جێهێشت و تاقمێکیان سوارەی سکۆرت ڕەگەڵ خستن. عەبدولعەلیخان بوو بە هاوهەنگاوی ئازادخان و محەممەدتەقیخانیش کرایە حوکمڕانی کرماشان.

ژمارەیەک لەو تیرە و تایفانەی کە لە هێرش بۆ سەر کرماشان و عەلیمەردانخانی بەختیاری و ئازادخانی ئەفغاندا بیبوونە هاوپەیمانی سەردارانی زەند و گرینگترینیان تایفەی زەند بوو بە سەرۆکایەتی حەیدەرخان،

---

٤٢ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٠٠ ـ ٣٠٢.

بە پێدزکە مەیدانی شەڕیان چۆڵ کرد و ڕەوین و گەڕانەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان لە کوێستان[43]. ئێستا ساڵێک بە سەر ئەو ڕۆژە و ڕاکردنی محەممەدخاندا تێپەڕیبوو، حەیدەرخان تێگەیی کە محەممەدخان بە مەبەستی پەلاماری سەربازگەی قەڵای کرماشانی هاوپەیمانی ئازادخان خەریکی کۆکردنەوەی هێزی تازەپشوویە، بۆیە پێشنیاری سەرۆکی تایفەی زەنگەنە بە باری لەشکریدا بە قازانجی زەند بوو، ئەگەرچی ناوبراویش دەیتوانی تۆڵەی کوێرکرانی ئیمامقوڵیخانی زەنگەنەی خزمی لە محەممەدتەقیخان بکاتەوە کە لەگەڵ مورتەزاقوڵی ئەفشار و مێهرعەلیخانی تەکلوو کاکەوبرالەی کردبوو.

ئازادخان بە مەبەستی بە دەستەوەبوونی دەسەڵاتی کرماشان میرزا محەممەدتەقی بە ٥هەزار سوارەوە لە سەربازگەی قەڵادا جێگیر کردبوو. ئەم سەربازگەیە لەبەر سەپاندنی کوێرەوەری زۆر و بارمتەگرتن لە تایفەکانی زەنگەنە و کەڵهوڕ شەپۆلی بێزاری و تووڕەیی ئەوانی بەدیهێنابوو. جاڕدان و کۆکردنەوەی لەشکرێکی ٣٥هەزار کەسی لە تایفەکانی لەک و دەوروبەری کرماشان بۆ حەیدەرخان زۆر دژوار نەبوو، بەتایبەت میرزا محەممەدتەقی سەرەتا پێی وابوو کە هێزەکانی ئەوان لک و پۆی سپای زەندن و بۆیە تا ڕادەیەک چاوەڕوانی دۆستایەتی هەبوو. بەڵام ئێستا جگە لە تێکەڵ بوون لەگەڵ حەیدەرخان و کەوتنە شوێن کۆچی بەکۆمەڵی دانیشتووان و چوونە سنوور چارەیەکی تری نەبوو. زۆرێک لە خەڵکی شار ڕایانکردە کێوەکان و زەهاو و تەنانەت بەغدا؛ گەلێک ماڵ و مەتەرێز وێران کران و ڕێگاوبان دابڕان و هێزەکانی زەنگەنە ئەگەرچی مەیلیشیان لێنەبوو کەوتنە دوای کۆچبەران هەتا لە سەر سنوور بگەنە محەممەدخان[44].

ئەبولحەسەنی نووسەری مێژووی گوڵستانە هەقی بوو کە لە هەڵسوکەوتی حەیدەرخان بکەوێتە گومانەوە و لە یەکەم دەرفەتا بەرەو بەغدا بڕەوێ؛ مامی نەیدەویست یان نەیدەتوانی کە لەم کارەدا هاوڕێیەتی بکا. حەیدەرخانی زەنگەنە کە لەگەڵ محەممەدخان پەیوەندی و نێوانی هەبوو، ماوەیەک دواتر میرزا محەممەدتەقی بانگ کردە خێوەتەکەی (بەگوێرەی

43ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٠٠.

44ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٠٤ ـ ٣١١.

نووبینی گوڵستانە محەممەدخان ئەم فیتنەیەی نابۆوە و دنەی حەیدەرخانی زەنگەنەی دابوو.) لێرە محەممەدتەقی دایە بەر گولـلە و کوشتی. ماڵ و دارایی خزمەکانیشی تاڵان کران و خۆشیان بە دیل گیران. براکانی محەممەدتەقیخانیش ئەسیر بوون، بەڵام وا ڕێککەوت کە لە زیندانەوە بەرەو سنوور ڕایانکرد. عەبدوڵلاپاشای باجەلان کە هێشتا نیگەرانی شالاو و چالاکی هێزەکانی زەند بوو، ڕاپۆرتی ڕووداوەکانی بۆ بەغدا نارد. فەرمانیان دایە تا بەر بەو هێزانە بگرێ کە دەکەونە پێوشوێنی کەسانی سەر بە گوڵستانە و لە سنوور دەپەڕنەوە و هەروەها خەریکی ناردنی چەند هێزێک بێ بە مەبەستی تەمێ کردنی تایفەکانی زەند و زەنگەنە[45]. بەڵام محەممەدخان کەمێک دواتر چووە کرماشان و بە یارمەتی حەیدەرخان لە ماوەی سێڕۆژاندا شاری وێران کرد. دەستی بەسەر ماڵ و دارایی تەواوی ئەو کەسانە داگرت کە لە شار مابوونەوە؛ تەواوی کلاوقووچە نەڕووخاوەکانی قەڵای ڕووخاند و ژمارەیەک ئامراز و کەلوپەلی تۆپخانەی کە گەورەترین تۆپخانەی ئێرانی ڕۆژاوایی بوو، تێکڤرچاند و ڕشتییە ڕووباری قەرەسوو. وەختایەک ئەم کارانە کران، باردانە باڕووت و پاشماوەی چەکەکان گەڕێندرانەوە شار[46] و تەواوی قەڵا تۆپباران کرا. بەم شێوەیە بنکە و ناوەندی بەهێزی ڕۆژاوای نادرشا و چواربەندەی سەرەکی شەڕەکانی ناوچەی زاگرۆس لە ماوەی حەوت ساڵی ڕابردوودا تەفروتونا بوو.

## ۳ ـ ٦ کارەکانی تری محەممەدخان

محەممەدخان لەو ماوەیەدا کە لە سنوورەکانی پارێزگای کرماشان بنەگر ببوو، وەک مەترسییەکی ڕاستەقینە وابوو بۆ سپای ئازادخان لە ورمێ. (با لە بیرمان نەچێ کە محەممەدخان بەمەیلی خۆی ئەو ناوچەیەی هەڵنەبژاردبوو.) خانی زەند دەرفەتێکی چاکی لەم بارودۆخە دێنا. لە مانگی ئاگۆستی ساڵی ۱۷٥٤دا نەسیرخانی لاری(۱۱) چەند هەواڵێکی لە لایەن کەریمخانەوە پێگەیشت کە نیشانی دەدا محەممەدخان و پیاوانی ڕاکردووی هەر نە تەنیا کاری عەلیمەردانخانیان کۆتایی پێهێناوە، بەڵکوو سەلیمپاشای

٤٥ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ۳۱۱ ـ ۳۱٤.

٤٦ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ۳۰۲.

بابان یەکێک لە هاوپەیمانانی ئازادخانیشیان لە هەمەدان تێکشکاندووە[٤٧]. لە مانگی ژانوییەدا ڕاپۆرت درابوو کە پوولێکی چاک لە لایەن ئازادخانەوە بە شابازخانی دونبولیدا دەنێردرێتە ورمێ؛ ئەم کاروانەش چەشنی قافڵەی دیلانی زەند هەرگیز نەگەیشتنە جێ، چونکە محەممەدخان سەرڕێی پێگرت و سکۆرتەکانی خستە داو و دراوەکەی بەتاڵان برد[٤٨]. بێگومان ڕووداوی پەلاماری تری لەم شێوەیە کاریان کردبووە سەر لەرزۆک بوونی دەسەڵاتی ئازادخان. هێرش و هرووژمی ئەو لە ئاگۆستی ساڵی ١٧٥٤یشدا سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بە شوێنەوە نەبوو و بەناچار پاشەکشەی کرد. قاتی و گرانی ئیسفەهان کە شارەکەی بە چۆڵکردن دا لەگەڵ زنجیرە شاڵاوێکی تر کە محەممەدخان پشتی لێنەکردەوە، بوو بە هۆی لاوازی و توانەوەی و بە مەبەستی ڕزگاری خۆی لەم گێژاوە چووە ئازەربایجان.

قەڵای وەلاشگێرد یانی کۆنەدژی تایفەی تەکلوو لە نیزیک هەمەدان دوایین ئامانجی محەممەدخان بوو. زستانی ساڵی ١١٦٨ی کۆچی / ١٧٥٥ی زایینی، بێگومان عەبدولغەففار و ئاغاسیسوڵتان و عەبدولجەببار سێ برالەی مێهرعەلیخان بە پاڵپشتی سەرما و سایەقەی ئەم ناوچەیە کە دەبوو بە ڕێگر لەبەر دەم گەمارۆی درێژخایەنی قەڵا لە لایەن هێزەکانی زەندەوە، کەوتنە پارێزگاری کردن. محەممەدخانیش بەم مەبەستەی دەزانی، بۆیە بۆ بەربەرەکانی لەگەڵیان فەرمانی سازکردنی چەندین نەردیوانی بڵیندی قەڵاگرتنی دا، پاشان خەندەکی دەرەوەی قەڵایەی بە شووڵ و کا پڕ کردنەوە و نەردیوانەکانی پاڵ وەدیواری قەڵا دا و ئاوا پەلاماری بۆ برد. ئەگەرچی کوشتە و بریندارێکی زۆر کەوتە سەردەستان بەڵام هەر ئەوڕۆژە قەڵا گیرا. چەکدارانی سەربازگە کوژران و قەڵا کە وەک درکێکی تر لە چاوی خانەدانی زەندا خۆی دەنواند، خاپوور کرا. پاش ئەوەی دەرکەوت جەماوەری ئێرانی باکووری ڕۆژاوایی یاریدەی ئازادخان دەدەن، پێش یەکگرتنی لەگەڵ وەکیل لە فارس بە مەبەستی تالان و بڕۆی پاشەکەوتی تر سەرلەنوێ بەرەو خووزستان کەوتەڕێ[٤٩].

---

47- GD VII, 4 September 1754.

48- GD VII, 26 January 1755.

٤٩ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٠٣.

## ٣ ـ ٧ شەڕی کەمارەج و گیرانی شیراز

کەریمخان لە ماوەی ساڵی رابردووشدا خۆی لە چوونە شیرازەوە پاراست، بەڵام دەیویست کە بەر لە هاتنی ئازادخان پێی بگاتە وێ تا ئاوا بە شێوەیەکی ڕێسامەند خۆی بە ئاغا و خاوەنی تەواوی چیا و کوێستانەکانی زاگرۆس لە قەفقازەوە بگرە تا کەنداوی فارس دابنێ. هەر بۆیە دەستی کرد بە کۆکردنەوەی هێزی تازەپشوو لە نێو دانیشتووانی ناوچەکانی گەرمەسێریدا. بۆ گەیشتن بەم ئاکامە سەرکەوتنێکی وەدەس نەهێنا، چونکە ئازادخان لە ئاگۆستی ساڵی ١٧٥٤دا پێی نایە شیراز. ئازادخان بەر لەوەی بگاتە شیراز لە ناوچەی پریسپۆلیس بەرەورووی تێکهەڵچوونێکی کورت و سەرنەکەوتوو بۆوە لەگەڵ دووهەزار کەس لە سوارەکانی لەشەنی، ماڵئەحمەدلوو و کورباڵی(١٢) بە سەرکردایەتی عەبدولمتەللیبی کورباڵی، بەڵام ئەمانە هەڵخەڵەتان و لە سەنگەرەکانیان دەرکەوتن[٥٠] و لە پێدەشتی «مەرودەشت»دا بەقورسی تێکشکان؛ عەبدولمتەللیب پاش ئەم شکانە بە مەبەستی دانە پاڵ کەریمخان، لەم ناوچەیە رایکرد. وەک گێڕاویانەتەوە ئەفغانییەکان چوارهەزار کەس لە دانیشتووانی بێچەکی ئەم قەڵا بچووکەیان قەڵاچۆ کرد. دەسکردنەوەیەکی کەمتاکورتیش رووی دا، بەڵام هەرچۆنێک بێ هێزەکانی ئەفغان کە بە هێندێک بۆچوون دوازدەهەزار کەسێک دەبوون شیرازیان گرت[٥١].

پاش ماوەیەکی کورت دووهەزار شەڕکەری تازەپشوو بە هێزەکانی کەریمخانەوە زیاد بوو. داوای یارمەتی لە نەسیرخانی لاری کرد و پەیامێکی بۆ نارد. بەڵام خانی لار کە ڕۆژگارێکی درێژ لە پەنا سێبەری هەڵوێست و سیاسەتی ئاقڵانە و شوورە و قەڵای پۆڵایینی، سەربەستی خۆی پاراستبوو و لەگەڵ کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی نێوانی خۆش بوو، چورتەی نەکرد. ڕاپۆرتی

---

٥٠ـ ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٤٨ ـ ٤٩؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٩؛
GD VII, 22 August. 4 September 1754.

٥١ـ GD 9 september 1754. ڕۆژنامەی کەلانتەر دەنووسێ سیهەزار کەس کە فەسایی دەیکاتە سێهەزار. هیچکامیان ژمێرەیەکی ڕاستەقینە نین.

دوایین هەواڵەکانی بۆ کۆمپانیا ناردە بەندەرعەباس و داوای باڕووت و چەکوچۆڵی لێکرد. نەسیرخان لەم ڕۆژانەدا بەڕواڵەت سەری وەبەر ئازادخان هێنابوو کە حوکمی حکوومەتی لەنگەرگاکانی بۆ ناردبوو و چ هەمێتێکی وە کەریمخان نەدەدا و بە یەکێک لە پاشکۆیانی خۆی دادەنا. بەڵام بە چاوی نیگەرانەوە وریای باروهەوای ئەم دوو کەسە بوو و هەرگیز حازر نەدەبوو کە خۆی بخاتە نێو تەڵە و جەغزی ناچاری. بە مەبەستی سپاس و پێزانین سەبارەت بە دەرکردنی فەرمانی حکوومەتی لەنگەرگاکان، کۆمەڵێک دیاری نارد بۆ ئازادخان، بەڵام چەکدارانی قۆشەنێکی ١٤هەزار کەسی کە زۆربەیان عەرەبی لێوارەکانی کەنداوی فارس بوون، تەیاری کردن و تەمای گرت ئەگەر ناوبراو بخوازێ بەرەو لارستان بجووڵێ، بەرەی لێبگرێ[٥٢].

بەڵام کار و کردەی داهاتووی ئازادخان پێشبینی نەدەکرا. بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ کەریمخان چووە کازروون. لە مانگی سێپتامبردا سپای بچووکی وەکیل و هاوپەیمانانی کە شارنشینانی سەر بە عەلیقولیخانی کازروونی و سەربازانی ئێلجاڕی دەشتستانی بوون بەناچار شاریان چۆل کرد و بەرەو گوندی خشت کشانەوە. گوندی خشت لەگەڵ «کەلی کەمارەج» مەودایەکی وایان نیە. ماوەیەک بەر لە ئێستا چوارهەزار تفەنگچی بە سەرکردایەتی میرزا عەلیبەگی خوورمۆوجی و ڕەییس ئەحمەدشا تەنگستانی چووبوونە پاڵ کەریمخان. ڕۆستەمسوڵتانی کوێخادێی خشت چی لە دەس هات بۆ یارمەتی ئەم هێزانە کردی و خوردوخۆراکی بۆ دابین کردن.[٥٣] لە نیوەی دووهەمی مانگی سێپتامبردا نەجەفقولیخانی ئەفشار وێڕای تاقمێک لە چەکدارانی ئازادخان بەرەو کازروون کەوتەڕێ. بە تاوانی پەنادانی هێزەکانی زەند کەوکوژیان لە پاشماوەی خەڵکی شار کرد و هەر شوێنێکی کە سێ ساڵ پاش هرووژمی عەلیمەردانخان سازکرابۆوە، دووبارە وێران کرایەوە و ئاخرییەکەشی بەرەو ناوچەی خشت بزووت[٥٤].

52- GD VII, 4 and 9 September 1754.

٥٣- ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٤٩؛ فەسایی بەرگی یەکەم، ل ٢٠٩، ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٢٦١ و GD VII, 12 October 1754.

54- GD VII, 18 and 24 September 1754.

بارودۆخی کەریمخان تەنانەت لە کـاتی گـیرانی ئیسـفەهانیشدا ئـاوا مەینەتبار نەبوو. لەم ڕۆژانەدا ناچار بوو بـێپشـوو شـەڕ بکـا، بـەڵام هـەموو ڕۆژیش بە شوێن هەر شەڕێکەوە شکستێکی تازەی دەکەوتە سەرشـان و زۆربـەی جاران فیداکاری و چالاکی پاشەنگی سپا ڕێی دەربازی بۆ خۆش دەکرد. کارەکانی محەممەدخان کە ئێستا پێی زانیبوون، تەنیا برووسکەی ڕووناکاییەک بوو کـە هێشتاش دەدرەوشا؛ بەڵام هێزەکانی محەممەدخان لە شوێنێکی نێوان کرماشان و فارس و سپای بچووکی وەکیل لە کەلێکی کە بە ئـاخرین پەناگـەی لـە بـانووی ئێران دادەندرا، بنەگر ببوون. ئەگەر کەمارەج گیرابا وەک چۆن خۆی قەڵفڕی بە عەلیمەردانخان کردبوو، ئازادخانیش ئاوای بە سەر دێنا و دەیتاراند و ناچـار دەبوو کە لە ڕێی دەر و دەشتی خووزستان و داوێنەکانی زاگرۆسەوە دەس بداتـە چـالاکی پـارتیزانی، ئەگـەر وا بوایـە تـەنیا بـڕە هیوایـەکی بـە مەبەسـتی کۆکردنەوەی لەشکری مناسب و وەرگرتنـەوەی پایتـەختی لـە دەسچـووی بـۆ دەمایەوە. نەسیرخانی لاری کە گوێی نەدابوویە دە هاتـەوەچوونی و ئامـادەش نەببوو چاوی پێیبکەوێ، بە مەبەستی پاراستنی قازانج و بەرژەوەندی خۆی لە لارستان چاوەڕوان و گوێقوڵاغی ڕووداوەکان ڕاوەستابوو؛ شێخی بەندەری ڕیگ و جەماوەری دەشتستانیش بەرلەوەی دڵپەرۆشی بارودۆخی لەشکری زەندیە بـن، لە بیری پەرەپێدان و گەشەی لەنگەرگادا بوون و زۆربەی بازرگانانی لەنگەرگاش ماڵ و سامانیان کۆکردەوە و بەرەو نیزیکتـرین دورگـەی کەنـداو یـانی خـارک کەوتنەڕێ[55]. خاڵێکی کە دەربـارەی ڕووداوەکـانی ئـەم ڕۆژانـەدا کـەمێک دوور دەنوێنێ و جێی ڕامانە و مێلکۆم ئاماژەیەکی پێدەکا، ئەمەیـە کـە خـانی زەنـد لەبەر دەرد و پەژارەی شکستەکانی و بە دەستەوە نەمانی قەڵای پەری و هەروەها هەوڵ و تەقەلا دوور و درێـژ و بـێئاکامـەکانی بـە مەبەسـتی گەیشـتنە سـەر دەسەڵات، دەیویسـت هـەتا دەرفـەت مـاوە لـەم وڵاتـە دەربـاز بـێ و بچێتـە هیندووستان و لە نێو پەنابەرانی ئێرانیدا بسەکنێ. بەڵام هاوپەیمانانی تـازەی بەتایبەت ڕۆستەمسوڵتان شێلگیرانە و شانبەشانی خۆیان ڕاگرت و بە دارشتنی نەخشەیەک، پێشڕەوی دوژمنیان لە کوتەل کەمارەج(١٣) پەک خست.

کوتەل (کەلی) کەمارەج دوو مایلێک دەبوو کە لە هێندێک شـوێنان هـەر

---

٥٥ـ هەمان، ژمارە ٥٤.

ئەوەندە بەرین بوو کە ئادەمیزادێکی تێوەدەچوو. کۆمەڵە کێویکی لێژ و خیزکەلان و خڕکەبەرداوی تەنیشتی ڕەوگەیان تەنیبوو. ڕۆستەمسوڵتان و چەکدارانی خشتی خۆیان لە مەودای ئەم شوێنە و لە پشت تاشەبەردان مەلاس دابوو. وەختایەک سوارەکانی زەند و تفەنگدارانی دەشتستانی بۆ بەربەرەکانی لە بەرەیەکدا کە تا گەرووی کەل ڕاکشابوو، مەتەریزیان گرت، فەتحعەلیخان ڕاستەوخۆ بە مەبەستی پەلاماردانیان خۆی خستە دواوە؛ هێزەکانی کەوتنە نێوان تەقوتۆقی تاقووازی شەڕکەرانی نێو بۆسە و بە شڵەژاوی تێکیانهاویشت. لە ئاکامدا پێشەنگەکان گەڕانەوە دوا و پاشەنگی سواران بە مەبەستی یارمەتی دانی هێزەکانی پێشەوە هرووژمیان هێنا. ئەوانەی کە توانییان لەم باریکەڕێ مەرگاوییەش بەرەو دەرودەشتی ڕووبەڕوو بکشێن، بە دەس سوارانی کەریمخان کوژران. نەخشە و گەلاڵەی شەڕی سەرکردەکانی خشتی لەگەڵ هەڵمەتی پێشوو لە کۆتەل (کەلی) دوختەر ڕێیان لە عەلیمەردانخانی بەختیاری بەستبوو، یەکتری دەخوێندەوە و یەکسەر مەیدانی شەڕی بۆ فەتحعەلیخان و ئاغا ئەفغانییەکەی هەڵگێڕایەوە؛ لە کازروونەوە تا شیراز هێزەکەیان ڕاماڵی و کەوتنە شوێنی. دە ڕۆژ پاش ئەم شەڕە ئازادخان لە شیراز دەرکەوت[٥٦]. لەبەر بلاوبوونەوەی شەڕی کەمارەج خەڵک یەکجار زۆر لە ئەفغانییەکان بێزران و ساڵەخانی بەیات دووبارە هاتەوە سەر دەسەلات. ناوبراویش باشتر لە هاشمخانی خزمی هەڵومەرجی بۆ دابەزینی خانی زەند ئامادە نەکردبوو. کەریمخان و سوارانی زەند و مەمەسەنی و کازروونی و خشتی - لەم کاتەدا دەشتستانییەکان گەڕابوونەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان - ماوەیەک پاش

---

٥٦- تاریخی گیتیگوشا، ل ٤٤ - ٤٥؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣١٥؛ کەلانتەر، ل ٤٩؛ فەسایی بەرگی یەکەم، ل ٢٠٩؛
GD VII, 25, 29, 30 October, 8 and 9 November, 7 Desember 1754; Brieven 2753 (1753); Malcolm. 123 – 125؛ فەرهەنگی جوغرافیایی سپا، بەرگی ٨، ل ١٨٨؛ نەوەی ڕۆستەمسوڵتان لە ساڵی ١٨٠٠، شوێنی شەڕەکەی بە مێلکۆم نیشان داوە. کووهمەرەئی ناوی سەرکردەی خشتی شەڕەکەی بە محەممەدعەلی هێناوە. «بینینگ» لە ل ١٧١ و ١٧٤دا دەڵێ: هەورازی کۆتەلکەمارەج ئێستاش بە کەمەری ئازادخان ناودێرە؛ ساڵی ١٨٥٠.

قەومانی شەڕ لە مانگی ئۆکتۆبر یا نوامبردا گەیشتنە قەراخ شیراز و هەوڵیان دا کە لە ڕێگای وتوویژەوە پێبنێنە شار. ئەم تەمایە بەرەوڕووی شکست بوویەوە. بەناچار خان دەوری شاری دا هەتا بەر لەوەی ئازادخان پێبزانێ و ناچار بێ بگەڕێتەوە، بیگرێ. پیاوەکانی ساحێبئیختیار لە کاربەدەستانیساڵەخان و ئازادخان ڕەنجابوون و ڕوویان کردە ناوەندی سەرکردایەتی کەریمخان لە «حافزییە». لە حافزییە میرزامحەممەد بە وەرگرتنی بەڵێنی لێبووردن و باش جووڵانەوە، گفتی دا کە شار بداتە دەس وەکیل. تایفەکانی بەیات و لەشەنی نێو سەربازگەی ئەرگ (قەڵاچکە) کە هادیخانی لەشەنی سەرکردایەتی دەکردن، نەخشەیەکیان کێشا و دەروازەی ئیسفەهانیان لە ڕووی لەشکری زەند کردەوە. لە ٢٩ی نوامبری ساڵی ١٧٥٤دا ئەم کارەیان کرد و ساڵەخان کە دەیهەویست ڕابکا، بە زەبری گورزی شێخاڵیخان لە پەنا گومبەزی میرهەمزەی(١٤) تەنیشت دەروازەی ئیسفەهان کوژرا و لاشەکەی فڕێدرایە نێو زبڵوزاڵ و قوڕوقاڵ و بەردەمی سەگان[٥٧]. تەواو ساڵێک پاش ڕاکردنی کەریمخان لە ئیسفەهان، ناوبراو پێی نایە شیرازی پایتەختی داهاتووی.

## ٣ ـ ٨ گرتنەوەی ئیسفەهان

زستانی ساڵی ١٧٥٤ ـ ١٧٥٥ کەریمخان لە چەند بارانەوە ڕاگیرکردنی شیرازی بە پڕمەترسی دەزانی، چونکە هێشتاش دەستەوبەستەی دوژمن لە شارا هەبوون و پڕانی جەماوەرەکەی ڕاڕا و دووڕوو بوون. هێزە سەربەستەکانی نەسیرخانیش لە پای سەری چەقیبوون و ئازادخان لە ئیسفەهان چەند هێزێکی تازەپشووی کۆکردبۆوە. بۆیە لێبڕا کە سەرەتا لە لای سەرووی دڵنیا بێ. ماوەیەک دواتر کە هەرەتی لەشکرکێشی هات بەرەو لارستان کەوتە ڕێ. باروهەوای ئازادخان لەو خراپتر بوو و تەنانەت ئەوەندەی کەریمخان سەبارەت بە خەڵکی فارس بێباوەڕ بوو، ئازادخان زیاتر لە بابەت کۆمەڵانی ئێراقی عەجەمەوە بیری ئاڵۆز بوو. ڕووداوەکانی ماوەیەک دواتر بێمەیلی جەماوەری

٥٧ـ ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٤٩ ـ ٥٢؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ٤٥ ـ ٤٦؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٩ ـ ٢١٠.

ئیسفەهان و تەوریز و قەزوینی سەبارەت بە ئازادخان ئاشکراتر کرد. لەم ڕۆژانەدا محەممەدحەسەنخانی قاجار بەهەرەمە کەوتە سەر بیری هێرش و تۆڵە کردنەوە لە حوسێنخانی دەوەللووی حاکمی یوخاریباش لە ئەستەرئاباد. محەممەدحەسەنخان لە خزمەت شاسمایلی دووهەمدا لە ئەشرەف جێگیر ببوو و هەمیشە لە پشتەوەڕا هەڕەشەیەک بوو بۆ سەر ئازادخان. بەڵام ئاخرییەکەی کە ئەحمەدشای دوڕانی لە کلکەی مانگی ژووەنی ساڵی ١٧٥٥دا بەرەو نەیشابوور کشا، خۆشی لە پشتەوەڕا کەوتە بەر گەفی دوژمن و ناچار بوو کە بەرەو ئەستەرئاباد بکشێتەوە[٥٨]. سەرەڕای ئەمانەش تاقمێکی سپای زەند بە سەرۆکایەتی محەممەدخان لە دەسەڵاتی ئازادخان لە هەمەدان کەوتنەخۆ و هێزی فەتحعەلیخانی ئەفشاری سەرکردەکەیان لە بەهاری ئەم ساڵەدا تێکشکاند[٥٩].

ئەم زانیارییانەی کە لە بابەت ئاڵوگۆڕەکانی ئێرانی ڕۆژاوایی و باکووری لە درێژەی ئەم مەودایەدا لە سەرچاوەکانی نێوخۆ و دەرەکی بە دەستمانەوەن، هەموویان پرشوبڵاو و تەماوین. ئەو کۆمەڵە نیشانە و دیاردانەی لە بابەت سەرکردەکانی ڕکەبەر و دەورگێڕانی شانۆکان خراونە ڕوو ئەم مەبەستە دەسەلمێنن کە ئەوان پتر وازیان لە پاراستن و پەرەپێدانی قەڵەمڕەوی دەسەڵات و ناوچە تازە داگیرکراوەکانیان بووە. لە مانگی سێپتامبردا محەممەدحەسەنخانی قاجار پۆلەسواری هێرشکەری ئەحمەدشای دوڕانی لێکبڵاو کرد و بوو بە هۆی پاشەکشەی لە خوراسان. سپای قاجار لەبەر هرووژمی ڕاکردووانی کورد لە ڕیزی هێزە پەلاماردەرەکەی پێشوورا[٦٠] وردەوردە زیادیان دەکرد و خانی قاجار دەستی لە بابەت گرتنی پارێزگاکانی لێواری دەریای خەزەر کرابۆوە. شارەکانی فەرەحئاباد و ئەشرەف و ساری سەریان وەبەرهێنا و بەیعەتیان پێکرد. بەڵام سەبزعەلیخانی یوخاریباش بەگەلەربەگی زەندیە لە قەڵایەکەی خۆی لە پەنا ساری کەوتە بەربەرەکانی. خانی قاجار موقیمخانی سارەوی حاکمی ساری بۆ تەمێ کردنی گاڵ دا، پاشان

٥٨ـ Butkov I, 410 – 413 و تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٤٩.

59- Butkov I, 412; GD 13 and 15 April; VIII, 31 August 1755.

60- Butkov I, 411, 415.

محەممەدوەلیخانی نارده ئامول هەتا شارەکە بگرێ و سەربزێوانی خۆماڵی لە ڕێی وتوویژ یان شەڕەوە بەچۆکدابێنێ. ناوبراو نیشانی دا کە بەدبەختانە کەسێکی زاڵم و دژی گەلییە و هۆکاری ڕاپەڕینی جەماوەری شاران و چیانشینانی بەدی هێنابوو. محەممەدحەسەنخان لێیخست و لە بەندی توند کرد. موقیمخان کە نەیدەتوانی یان نەیدەویست لە بابەت محەممەدوەلیخانەوە پەسندی ئەم کردەوەی محەممەدحەسەنخان بکا، بە یارمەتی یاغییەکان ئاگری شۆرشی گشتی هەڵگیرساند و خۆشی لە ساری دامەزرا. محەممەدحەسەنخان لە ئەشرەفەوە کەوتەڕێ و لە نیزیک ئەم شارە پەلاماری ڕاپەڕیوانی دا. پاش شەڕێکی سامناک و بێڕوحمانە موقیمخان بوو بە قوربانی گوللەیەکی گەرم. ساری دیسانیش گیرایەوە، سەرکردەکانی شۆرش کوژران یان زیندانی کران و مازەندەران تەواو کەوتە ژێر چنگی ئاشاقەباشەکان[٦١]. لە مانگی ئۆکتۆبردا حاجی جەمالی فوومەنی لە ڕەشت و گوندەکانی گیلان هەروا لە ژێر فەرمانی محەممەدحەسەنخاندا مایەوە و دەستی کرد بە تاڵان و بڕۆی درندانەی ئازۆخە و ماڵ و سامانی خەڵک[٦٢]. قەزوێنیش دەستی دا و کەوتە بەر شالاوی تاڵان و ڕەشەدزی. ئێستا قەڵەمڕەوی خانی قاجار بەرەو جەغزی دەسەڵاتی ئازادخان پەرەی دەگرت.

ئەگەرچی ئازادخان سەرەتا لەبەر شالاوی ڕاپەڕیوانی قەزوێن کە بەشێکی بەهار و هاوینی ساڵی ١٧٥٥ی لەوێ تێپەڕ کردبوو، وەتەنگ هاتبوو، بەڵام هەروا دەسەڵاتی خۆی بە سەر ئیسفەهاندا پاراستبوو[٦٣]. ڕەنگە هێزی تازەپشووی لە ئازەربایجانیشەوە هاتبێتە هانای و ڕیزەکانی لەشکری پتەوتر بووبێ، بەتایبەت لە لایەن نەسیرخانی لارییەوە کە بە پەرەگرتنی قەڵەمڕەوی قاجارییەکانی نەزانیبوو و بە نیگەرانییەوە دەیڕوانییە بارودۆخی فارس. ئازادخان داوای لێکرا بچێتە سەر شیراز. لەپێشدا فەتحعەلیخانی ئەفشاری بە

٦١ــ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٢٧ ــ ٢٨؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٣٠١؛ نەفیسی، ل ٣٤.

٦٢ــ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٢٧ ــ ٢٨؛ Butkov I, 416, 417

63- Butkov I, 414; GD VII, 13, 15, and 29 April, 19 June 1755; VIII, 31 August 1755; SP 97, 38, 25 May 1755.

١٢هەزار شەرکەرەوە نارد (ماوەیەک دواتر ئەم قۆشەنانە لە لایەن ئازادخانــەوە بەهێزکران و یان بەگوێرەی دەنگۆیەکی تر، هەر سەرەتا خۆی ٢٠هەزار چەکداری لەگــەڵ بــوو.) ڕۆژی ســێزدەی مــانگی نــوامبر ئازادخــان بــە خــۆی و هــەموو پیاوەکانییەوە ئیسفەهانی چۆل کرد و وەک لە گۆترە گوتوویانە، لەشـکرەکەی گەیوەتە ٤٧هەزار کەسێک[64]. بەر لە بزووتنی ٢٠هەزار تمەنی لە ئەرمەنییــەکانی جولفا[65] وەرگرت بەلاّم لە خێر و چاکەی کەیخودایــەتی پزیشـکە فەرەنگییەکــەی شتێکی لە ئورووپاییەکان وەرنەگرت. ئەم دوکتــۆرە نــاوی ســینیۆر ســیمۆن و پیاوی دەزگای پاراستنی نەهێنی فەرانســە بــوو و تــازە هــاتبووە ئیســفەهان و لەبەر چازانی لە کارەکەیدا ئازادخانی لە مەرگ ڕزگار کرد.(بڕواننە: پاشکۆ.)[66]

ئەو ڕووداوەی کە ماوەیەک دواتر قەوما، بۆچوون و چاوەڕوانییــەکانی نەسیرخانی کردە بلقی سەرئاو. ئازادخان لە ئیسفەهانەوە تەنیا بــە مەبەســتی چوونە شیراز پێی نەنابوویە ئاوزەنگێ، بەڵــکوو دەیەویســت بچێتــە کاشــان، چونکە لێرە فەتحعەلیخانی ئەفشار پاش تالانی شار، لە لایەن تاقمێک لە زەند یا قاجارانەوە بە شەپۆلی شالاوێک تێکشکابوو[67]. کەریمخان کە ئەو سەروبەندە پــەلاماری کرمــانی دابــوو، وەختایــەک بــەم هەواڵــەی زانی پــاش چــوار ڕۆژ ڕێکوتان، لەپڕ ڕەوگەی بزووتنی گــۆڕی بــەرەو ئیســفەهان. بەشــی ســەرەکی سەربازگەی ئازادخان لەم شارەدا کە سێسەدکەسێک دەبوون پەنایان بــردە بــەر خانی زەند. بەم شێوەیە ئیسفەهان بێ هیچ دەسکردنەوەیەک لە ١٧ی دێســامبردا یانی مانگێک پاش دەرکەوتنی ئازادخان کەوتە ژێر چنگی وەکیل. سەرۆکی زەنــد تەنیا دوو ڕۆژ لەم شارە مایەوە و هەر ئەوەنــدەی دەرفــەت هێنــا کــە ٢٨کــەس لەوانەی یارمەتی ئەفغانییەکانیان دابوو بکوژێ. دوایە بە مەبەستی پەیکــەردەی

64- GD VIII, 5 September, 17 October, 23 Nonember, 18 and 21 December 1755; Carmelites, 661.

65- Hovhanyants, 287; GD VIII, 18 and 21 December 1755.

66- GD 18, 21 and 22 December 1755, the Last Recording a Letter from Simon himself.

67- GD VIII, 22 December 1755 ( from Simons Letter, noming Mohammad and shaykh Ali, the Zand khans, as the victors); Carmelites, 661 (naming Mohammad Hassan khan Qajar).

ئازادخان کەوتەڕێ. هێزەکانی ئازادخان کە ئێستا لە تاران مۆڵیان خواردبـوو، کەوتبوونە نێوان کوتک و سندانی زەنـد و قاجـار. ئازادخـان و هاوپـەیمانانی لێبڕان کە بەر لە هاتنی وەرزی زستان سەری خۆیان هەڵگرن و بگەڕێنەوە، بۆیە بەر لە دەسپێکی ساڵی ١٧٥٦، چەشنی تەیری تیژباڵ، بەرەو ورمێ فڕین[٦٨].

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ شارەزوور لـە سـەردەمی ژیـانی یـاقووتی حەمـەوی (ساڵـی ٥٧ی کۆچی)دا هەر بەم ناوە ناسراوە و لە شێعری شـاعیرانی فارسـیشدا ئـەم نـاوە وەبەرچاو دێ. ئێستا کەوتۆتە باشووری ڕۆژهەڵاتی سلێمانی و نیزیک سـنووری ئێران و ئێراق. خەڵکەکەی کوردن و جوغرافیزانـانی کـۆن بـڕوایان وابـوو کـە «زوور»ی کوڕی «زوحاک» ئەم شـارەی سـازکردووە. لـە ڕوانگـەی پەیـڕەوانی «هەقە»شارەزوور خاوەنی شوێن و پلەیەکی بەرزە و ڕۆژی دنیـاڕابوون لـەوێوە دەس پێدەکا. (هەڵبەت ئێستا ئەم شارە نەماوە و تەواوی ناوچەی باسکراو بـەم ناوە دەناسرێ.)

٢ـ لە وڵامی ئازادخاندا دانیشتووانی قەڵا بیـانووی وەک دووری ڕێگـا، کاتی بەهات و نەهات و پاراستنی قەڵایان هێنایە گۆڕ و خۆیان بـۆ شـل نـەکرد؛ بڕواننە لاپەڕە ٨٦ی موجمەلوتتەواریخی گولستانە.

٣ـ قازی عەسکەری ئازادخان ناوی قازی عومـەر بـوو و گولسـتانە لـە لاپەڕە ٢٧٥دا دەنووسێ: «ئەم قازی عومـەرە پیـاوێکی سـاختەچی بـوو کـە لـە فـرتوفـێڵدا سـەد هێنـدی شـەیتانی دەزانی و لـە زمـانلووسـی و گـزیدا «عەمروعاس»ی زەمانی خۆی بوو.»

٤ـ هاشـمخـانی بـەیات پـاش مـردنی ئەبولحەسـەنخـانی شـیرازی شانبەشانی ئەشرەفسولتانی کووهمەرەئی دەسەڵاتیان بە سەر شیرازدا پەیـدا کـرد و ساڵـــەخانی دارۆغـــەیان کـــوێر کـــرد و یەکێتییـــەکیان لەگـــەڵ

68- GD VIII, 30 December 1755; 5, 13 and 20 January, 24 February, 21 March 1756.

خانەکانی کورد و بەیات و قەشقایی پێکهێنا. ئەم پیاوە لــە دەورانی ساڵــەخانی بەیاتدا جێگری بوو.

٥ـ کردەوەی فەتحعەلیخان لە گەنمان سەرسوڕهێن بـوو. لـە مـاوەی حەڤـدە ڕۆژدا تـەواوی مـاڵ و سـامانی خەڵـکی تـاڵان کـرد و گەسـکی لێـدا و هەلومەرجێکی وای بەدیهێنا کە پێیان دەگوت «گەسکەخان».

٦ـ قەرەگوێزلوو و خودابەندەلوو دوو خێڵن لە خێڵەکانی ترکی ڕۆژاوای ئێران. قەرەگوێزلوو لە دەوروبەری هەمەدان و جەزین نیشتەجێن. لە سـەردەمی قاچارییـەدا پیـاوی گـەورەیان لێهەڵـکەوتووە. خودابەنـدەلوو لقێکـی خێڵـی شاسەیوانن و لە لای خەمسە بنەگر ببوون. لە «سەحنە» شارەدێیەک بـە نـاوی خودابەندەلوو هەیە. ئەم تایفەیە لە چەند دێـی ئـەم ناوچەیـە بلاوبوونـەوە و ناوەندی گرینگیان «کەنگرشا»یە.

٧ـــ مەبەسـت نـــاوچەی «دووڕوود»ی سـیلاخورە کـە هــەتا کۆتــایی حکوومەتی قاجار «بـەحرەین»یشـی پێـدەگوترا. سـەرچاوەی ئـاوی بـەحرەین کەوتۆتە باکووری ڕۆژاوای برووجێرد.

٨ـــ چەمچــەماڵ یــەکێک لــە شــارەدێیەکانی سـەحنەی کرماشــانە و مەوقووفەی شێخاڵـیخـانی زەنگەنەیــە بــە مەبەسـتی پاراسـتنی ڕێگاوبـان و کاروانسەرای چەمچەماڵ کە لە پەنا بێستوونە. وەقفنامەکەی لە کێوی بێسـتوون هەڵکەندراوە. پێشتر بە ناوەندەکەیان دەگوت سوڵتانئاوا. ئاوەکانی کولیـایی و کەنگاوەر و دینەوەر زەویوزارەکانی ئەم ناوچەیــە پـاراو دەکـەن و بـەگوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی ٤٧٠٧ سەرخێزان و ٢٦٥١٣ کەس جەماوەر و ١١١ گوندی بووە. (باسی چەمچەماڵی کوردستانی ئێراقە نەک ئێران.)

٩ـ کوردەکانی شوقاقی دانیشتووی ئازەربایجانن کە لەبەر دراوسێیەتی لەگەڵ شاسەیوانان شیعە مەزەبن. ( بڕواننە کتێبی کـورد و ڕیشـەی نـەژادی... ل ١٣٣، بە قەڵەمی ڕەشید یاسەمی.)

١٠ـ ڕێزدار پێری ناوی تیرەی کەرەمخـانی بـە وەنـد نووسـیوە. وەنـد پاشـگری تایبـەتی تـەواوی تایفـەکانی «لـەک»ە و کـەرەمخـان لــە تایفـەی جەلالوەندی شارۆچکەی «هولیلان»ی شارستانی کرماشان بـووە. جـەلالوەنـد پەیڕەوی بڕواداری «هەقە» بوون. هۆکاری کوژرانی کەرەمخان دەگەڕێتەوە سـەر

خۆبەزلزانی خۆی کە زۆر بە تایفەکەی و نەجەفقولیخانی کەلهوڕ دەخوڕی، چونکە خوشکی نەجەفقولیخان ژنی «سادقسولتان»ی مامی بووە.

۱۱ـ نەسیرخانی لاری پاش زاڵبوونی ئەفغانییەکان لەگەڵ براکەی کە دانیشتووی گوندی «کاڵ»ی ناوچەی «فاڵ»ی لارستان بوو، کۆمەڵێکیان لە دەوری خۆیان کۆکردەوە و دەسەڵاتیان خستە سەر دەوروبەری لار. نادرشا بە «خان»ی ناودێر کرد. خەڵکی شاری لار کە حاکمی خۆیان کوشتبوو داوایان لێکرد ببێتە حاکمیان. خانی لار قەت ئامادە نەبوو سەر وەبەر کەریمخان بێنێ، بەڵام ئاخرییەکەی دەستی دا و لە ساڵی ۱۱۷۹ی کۆچیدا نێردرایە شیراز. پاش ئەو حکوومەتی لارستان درایە مەسیحخانی ئامۆزای. کەریمخان سەرەنجام ئیزنی دا بگەڕێتەوە شارەکەی، بەڵام بە دەسکیسی حکوومەت کابرایەکی گوندەکی لێیدا و کوشتی.

۱۲ـ تایفەکانی ماڵئەحمەدلوو و لەشەنی دانیشتووی دەوروبەری شیرازن و کورباڵ ناوی ناوچەیەکە کە هۆزەکانی گەڕانگەڕی پێیان دەگوترێ کورباڵی.

۱۳ـ کوتەل کەمارەج (کەلی کەمارەج) سەر بە خشتە و لێی نزیکە. لە سەر ڕێی کازروونە.

۱٤ـ تەرمی سەید ئەمیرعەلی کوڕی هەمزەی کوڕی مووسای کازم لە ژێر ئەم گومبەزەدا نێژراوە. شوێنەکەی دەروازەی ئیسفەهانی شاری شیرازە. بەگوێرەی گێڕانەوەی کتێبی «مەزاراتی شیراز» لە ساڵی ۲۲۰ی کۆچی مانگیدا بە شێوەی نەناسیاو دێتە شیراز و لە ئەشکەوتێکا بنەگر دەبێ، پیاوەکانی بنیعەباس دەیناسنەوە و دەیکوژن. دەیانگوت کە پاش مردن سەری خۆی بە دەستەوە گرت و ملی نا بەرەو شیراز. (فەسایی، بەرگی۲، ل ۱٥٤.)

# ٤

# محەممەدحەسەنخانی قاجار

## ٤ ـ ١ چوونی سپای قاجار بۆ نێو ئیسفەهان

لەگەڵ دەرکەوتنی بەناچاری ئازادخان لە ئێرانی ناوەندی، تایفەی قاجار و زەند سەرلەنوێ بەرەورووی یەکتر بوونەوە. لەم ڕۆژانەدا کە دەکەوێتە سەرەتای ساڵی ١٧٥٦ و نیزیکەی بیست ساڵێک بە سەر دوایین دیداری نادرشا لە ئیسفەهان تێدەپەڕێ، ئەم شارە پتر لە هەر ناوچەیەکی دیکەی وڵاتی ئێران کەوتبووە بەر شەپۆلی شەڕ و شالاو و تالان و بڕۆ و وا دیارە شارەکانی گەرانگەری هێندێک هێورتر بوون. لە ماوەی زستانی ئەم ساڵەدا سپای زەند خەریکی چاککردنەوە و وەدەس هێنانەوەی ئەو ئامراز و کەلوپەلانەی خۆی بوو کە لە برە پاشماوەی تالان و پەلامار و کوشتارەکانی ئازادخان بەجێمابوون. خەڵکی کرمان بڕی سێهەزار تمەن ویشکەپووڵ و بایی هەزارتمەنیان شمەک یارمەتی دا؛ بۆ ئیسفەهان بڕی پەنجاهەزار تمەن و بۆ یەزد نیوەی ئەمە پیتاک دیاری کرا. عەلیمحەممەدخانی زەند شاری یەزدی بە مەبەستی وەرگرتنی پیتاکی دیاریکراو دەورە دا، بەڵام تەقیخانی بافقی حاکمی ئەو شارە، تێکیشکاند و ناچاری کرد بگەڕێتەوە ئیسفەهان[1].

1- GD 1 February, 15 and 31 March 1756.

حوکمڕانانی ناوچــە جۆراوجۆرەکــانی ئێراقــی عەجــەم کــە نیگــەرانی وەرگــرتنی فــەرمانی داندرانــەوە و هەڵــبژاردنەوەیان بــوون ـ ئەگــەر کرابــا دەیانویست بەشە پیتاکیان کەم کەنــەوە ـ خۆیــان گەیانــدە بارگــای پاشــا تــا ملکەچی و وەفاداری بنوێنن. لە نێو ئەم پۆلەدا میرزا مــوعیزەددینی غــەففاری کاشانیش وەبەرچاو دەهات. ئەو باوکی غەففاری ڕووداونووس بوو کە بە حاکمی قوم و کاشان و نەتەنز و جوشقان هەڵبژێرا[٢].

زۆربەی خەڵکی ئیسفەهان لەوەی کە ناچار بوون هــەر جــارەی لەگــەڵ یەکێک لە سەرکەوتووانی زاڵم کە پاش هاتنە جێی دەسەلاتی پێشوو تێدەکۆشــن وای بنوێنن کە لەوی باشترن، هاوکاری بکەن جــاڕز بــوون. بــەلام گــەورەترین هەڕەشەیەک کە بەختی کەریمخانی خستبووە مەترسی لە لایــەن ئــەو دەســتە و تاقمانەی سپاکەیەوە بوو کە شاریان لە ژێر چنگی دابوو. نەدرخانی زەنــدی بــە خۆی و هەزار سوارەوە لە سەربازگەی ئەم شارە دانــابوو تــا بــەر بــە شــالاوی هێرشکەرانی مەمەسەنی و قەشقایی بگرێ؛ توراب‌خانی بــە دووهــەزار ســوارەوە ناردە کەنگان هەتا بە مەبەستی پــەلاماردانی حــاکمی لار ســەربازی ئێلجــاڕی و خواردەمەنی و ئازۆخــەیان بــۆ لــە شــێخانی ســەر لێــواری کەنــداوی فــارس وەربگرێ[٣]. سەرەڕای ئەمە لە یەزد و کرمانیش گیروگرفتێکی هەبوو؛ تەواوی ئــەم هەڵمەت و چالاکییانە تا ڕادەیەکی زۆر دەگەڕایەوە سەر کەللەڕەقی سوارانی زەند و تایفەکانی وەفادار پێیان. لە ئاکامدا بەشــێکی زۆری لەشــکرەکەی کــە بــرێتی بوون لە چەکداری پیادەی عەرەب و دووساڵ پێشتر لە ناوچــە گەرمەســێرەکانی فارس و دەشتستان لە ئیسفەهان خستبوونییە ژێر ڕکێف، لەبەر درێژەی مــاوەی خزمەتیان دەستیان کــرد بــە دەربــڕینی ناڕەزامەنــدی. سەرماوسۆڵــی نابــاوی زستانی ئەوساڵــە لــە بــانووی ئێــران و ڕەنگــە وەدرەنــگ کــەوتنی مووچــە و مانگانەیان لە ماوەی کەمدەســەلاتی هێزەکــانی زەنــدا دەســتیان تێکگرتبــوو و ئەمانە دەیانویست بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵــی خۆیــان. کــەریمخــان کــە وای بۆدەچوو ڕەنگە لەگەڵ محەممەدحەسەنخانی قاجار تووشی تێکهەڵــچوون بــێ، داخوازەکەی بردنەوە پاش(۱).

---

٢ـ گوڵشەنی مراد، ل ٧.

٣ـ GD VIII, 20 January 1756 و گوڵشەنی مراد، ل ٦.

لە ٢٠ی مانگی مارسا نێردراوێک لە لایەن محەممەدحەسەنخانەوە بە بۆنەی جێژنی نەورۆز هاتبوو کە پێشنیارێکیشی هێنابوو. لەم پێشنیارەدا خانی قاجار وەبیری هێنابۆوە کە ئەگەر کەریمخان دان بە پاشایەتی شاسمایلی سێهەمدا بێنێ کە ئێستاش لەگەڵ خانی قاجار لە پاشماوەی خاکی ئێرانی ژێر دەسەڵاتی محەممەدحەسەنخاندا فەرمانڕەوایەتی دەکرد، کارێکی وا دەکا کە فەرمانی هەڵبژێرانی بە بەگلەربەگی ناوچەکانی گەرمەسێری بۆ وەربگرێ. دەنا نا بەپێچەوانە نابێ چاوەڕوانی کەمترین ڕوحم و بەزەیی بێ. ئەم گەفە وای کرد کە کەریمخان لە بابەت نەناردنەوەی چەکدارانی دەشتستانی و فارسیدا پتر پێدابگرێ و لە ئاکامدا ئاگری شۆڕش هەڵایسا. ڕاپەڕیوان لە شەقامەکانی ئیسفەهان مەتەرێزیان گرت و ماوەی سێ یان چوار ڕۆژان ڕووی تفەنگیان کردە ئەو تاقم و پۆلانەی نێردرابوونە شەڕیان و کەوتنە بەربەرەکانی.

ئەم شۆڕشە تەنیا وەختایەک کۆتایی پێهات کە پاش هەڵگیرسانی شەڕی نێوشار، سەرداری زەند دەستەیەک تفەنگچی ناردە سەربانان هەتا تەقە لە سەنگەرەکانیان بکەن. سەرەنجام سەرکردەکانی ڕاپەڕیوانی دنە دا تا بەڵێنی لێبووردنی گشتی کە خۆی شەرافەتمەندانە بەرعۆدەی بوو، قبووڵ بکەن[4]. بەڵام تازە خەسار و تێداچوونێک کەوتبووە سەردەستان. ئیسفەهان گیرۆدەی بارودۆخێکی نالەبار هات و لەشکری زەند لە دەرەوەی شار بە پەرانپەرانی تووشی دووبەرەکی وا هات کە لە بەرامبەر هرووژمی هێزی پەلاماردەری قاجاردا دەستێکی ئەوتۆی پێنەکرایەوە.

لەم وەختانەدا ئازادخانیش لە تەورێز گیرۆدەی گرژی و ئاڵۆزییەکی لەم چەشنە ببۆوە کە ڕێی بە تەوژم و بزووتنی دەگرت بەرەو تاران و قەزوێن یان پێشڕەوی بۆ لای قوم و کاشان. محەممەدحەسەنخان پارێزی کرد و شاسمایلی سێهەمی لە مازەندەران بەجێهێشت[5]. شێخالیخانی زەند کە گۆیا لە وەختی دووهەمین هرووژمی هێزەکانی قاجار لە فەراهان بوو لە لایەکەوە و

٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٥٠؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٠ و
GD VIII, 2 April 1756; Saldanha. 100 (from a letter to Bombay from Bandar RiGDated 3 May 1756); Hovhanyants, 287.

٥ـ GD VIII, 21 and 31 March 1756 و گوڵشەنی مراد، ل ٨.

محەممەدخانی زەندیش لە قۆڵێکی دیکەوە بە فەرمانی کەریمخان بە دووهەزار کەسەوە خێرا بە مەبەستی یارمەتی دانی نێردرا هەتا بۆ پێشاوبڕکەی سپای قاجار بچنە ئیسفەهان. هەردووکەس گەیشتنە ناوچەی «سەنجان»ی(۲) مەڵبەندی کەززاز[٦] و لە ۲۷ی مانگی مارسا، لە کاتێکا بەفر و سەهۆڵبەندان و وەیشوومە وڵاتی داگرتبوو، دەگژ هێزەکانی محەممەدحەسەنخان ڕۆچوون. بوو بە شەڕی دەستەوخەنجەر. چەکدارانی زەند کە زۆر کەمتر بوون لە هێزەکانی قاجار تەواو شکان. شێخاڵیخان و پازدە کەس لە پیاوەکانی هەرچۆنێک بوو لە مەیدانی شەڕ ڕایانکرد، بەڵام چوار سەرکردەی تر بۆ وێنە محەممەدخان کە ئەسپەکەی ئەنگوابوو بە دەس چەکدارانی دوژمن بە دیل گیران[٧].

لەڕێوە محەممەدخانیان ناردە مازەندەران هەتا بخرێتە بەندیخانە، بەڵام وەختایەک لە هاوینی ساڵی ۱۷٥۸دا، چەند هەواڵێکی سەبارەت بە شکانی هێزەکانی قاجار لە شیراز کەوتە بەرگوێ، گەلاڵەی دەربازبوونی داڕشت و بە شەو ڕایکرد. تاقمی پەیکەردەی کە لە لایەن محەممەدبەگی حاکمی مازەندەرانەوە کەتبوونە شوێنی خێرا دۆزییانەوە و ناردیانە ساری و چەند مانگ دواتر سووریان ون کرد. لەم ڕۆژگارەدا ئەسکەندەرخان و کەمەرخانی زەند و محەممەدخانی بێکەڵلە[٨] کە قارەمانی ڕاکردنی دیلەکانی «پەری» لە چنگ ئازادخان و بکوژی عەلیمەردانخانی بەختیاری و گەلێک شاکاری تر بوون لە ماوەی چەند ساڵ و دوابەدوای یەکتر لە دەس خانی زەند چوونەدەر.

محەممەدحەسەنخان ماوەیەک لە دەوراندەوری کاشان مایەوە، چونکە ئیتر هیچ بەرهەڵستێک لە مابەینی ئەو و ئیسفەهاندا نەمابوو. کەریمخان کە

---

٦ـ لەم بابەتەوە بڕواننە: دێهگان، ل ۷٥ و ۷۸ و پەراوێزەکانی؛ فەرهەنگی جوغرافیایی سپا، بەرگی دووهەم، ل ۲۳۰ و نەخشەکەی؛ جوغرافیای کەیهان، بەرگی دووهەم، ل ۳۸٤ و نەخشەکەی.

۷ـ گوڵشەنی مراد، ل ۷ ـ ۸؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ٥۳، سارەوی، ل ١٦ ب و
GD VIII, 31 March, 17 April 1756; MAE Perse VII, NO. 91.

۸ ـ گوڵشەنی مراد، ل ۳۸؛ کووهەمەرەئی، ل ٤١٤؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ۳۱۷؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ۲٥۷ و سارەوی، ل ١٦ا ب: ئەم کتێبانە تێکڕا نووسیویانە کە چونکە محەممەدخان تۆقی سەری لە شەڕا هەڵگیرابوو، پێیان دەگوت بێکەڵلە.

خۆی لەبەر گەمارۆی شار ڕانەدەگرت لەگەڵ پۆلێکی کۆنەشەڕکەرانی زەند ئیسفەهانی جێهێشت ـ هێندێک سەرچاوە ئەم تاقمەیان بە هەشتسەد کەس داناوە ـ و بەرەو گلۆنئاباد لە چەند فرسەخی ڕۆژهەڵاتی ڕێگای یەزد بزووت. گلۆنئاباد شەڕگەی ئێرانییەکان بوو بە دژی تایفەی غەلجایی و ئەم شەڕە پاشایەتی خانەدانی سەفەوی بەرەو نەمان برد[٩]. لە ڕۆژی یەکەمی مانگی ئاوریلی ١٧٥٦دا محەممەدحەسەنخان گەیشتە سەری و هێزی بچووکی تێکشکاند و هەر ئەو ڕۆژە بێ بەربەرەکانی یان بەرهەڵستێک پێی نایە ئیسفەهان[١٠].

---

٩ـ بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی سپا، بەرگی ١٠، ل ١٧؛ جوغرافیای ئێران، کەیهان، بەرگی ٢، ل ٤١٠ (نەخشە). ئەم گوندە ئێستا بە ناوی جۆلۆنئاباد، جولانئاباد، گۆنئاباد مەشهوورە؛ بڕواننە: Braun, 199; Lockhart, Safavi Dynasty, 130 –143.

١٠ـ گوڵشەنی مراد، ل ٩؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ٥٣ ـ ٥٤؛ GD VIII, 17, 21 and 25 April 1756; Saldanha, 100.

ڕەنگە غەففاری و نامی لەبەر هاتنی ڕۆژی جێژنی نەورۆز تووشی هەڵە بووبن کە ئەم هێرش و پەلامارەیان لە ڕیزی ڕووداوە بەرچاوەکانی ساڵی ١١٦٨ی کۆچیدا هێناوە. گەرچی غەففاری دەس لە سەر نەورۆزی ١١٦٨ دادەنێ (حەوتی جیمادییوسسانی)، بەڵام لە ڕاستیدا ساڵی ١١٦٨ لەگەڵ ١٧٥٥ یەکتر دەگرێتەوە و ئەو ڕووداوانەی کە باسیان دەکا دەکەونە ڕیزی هەڵکەوتەکانی ساڵی دوایی و دەبێ وێڕای ڕووداوەکانی ساڵی ١٧٥٦ بێن کە سەرچاوەکانی ئورووپاییش ئەنگوستیان لە سەر داناوە. ئەم هەڵەیە بوو بە هۆی بەدیهاتنی گیروگرفتێک لە ڕووداونووسینەوەی ئەودا. بۆ وێنە ڕێکەوتی شەڕی گلۆنئاباد یانی ٢٢ی جیمادییوسسانی دروستە و ئەگەر ببرێتە ساڵی ١١٦٨ لەگەڵ ٥ی مانگی ئاوریل یەکتر دەخوێنێتەوە و ناچار دەبێ بگوترێ کە ئەم شەڕە پاش شەڕی کەززاز قەوماوە؛ ئەگەریش ببرێتە ساڵی ١١٦٩ یانی ٢٤ی مارس، تەنانەت دەکەوێتە دوای شەڕی کەززاز. ئەم ڕێکەوتەی کە لە سەرچاوە ئورووپاییەکاندا بۆ شەڕی گلۆنئاباد و گیرانی ئیسفەهان داندراوە لە نێوان ٢٤ی مارس تا سەرەتای ئاوریلدا جێگۆڕکە دەکا. ڕێکەوتی یەکەمی ئاوریل ئاخرین مێژووی بەردەستە کە لە ڕاپۆرتی ڕێزدار «فۆد»دا لە لەنگەرگای «ڕیگ»ەوە نێردراوە... ڕێکەوتی سەر وەڕاستی ڕێزدار هاوهانیانتز داویەتی کە ئاگۆستی ١٧٥٦ دێنێتە گۆڕ. ڕەنگە لەگەڵ ڕێکەوتی دووهەمین گیرانەوەی ئیسفەهان بە دەس ئازادخان شێوابێ.

## ٤ ـ ٢ ئازادخان سەرلەنوێ دەس پێدەکاتەوە

کەریمخان و دووسێهەزار کەس لایەنگرانی پاش شکان و تەقینی تازەیان بەرەو شیراز کشانەوە و دە ڕۆژ دواتر چوونە ئەم شارەوە. شار لەگەڵ سەربازگەی ژێر فەرمانی نەدرخان هەروا پێی وەفادار مابوویەوە و کەریمخان بەگەرمە و هەڕەمە کەوتە دابەستنی شوورە و دیواری. محەممەدحەسەنخان کە لە بابەت زاڵبوونی بە سەر شارەکانی ئێرانی ناوەندیدا کەیفساز بوو، چەند مانگێک خۆی بەو شتانەوە سەرقاڵ کردبوو کە لە پاش کەریمخان و ئازادخان بەجێمابوون. ئەرمەنییەکانی جولفا کە هەمیشە بێئەنوا بوون، بەناچار وایان لێهات کە کەلوپەلی کلیساکان و زێڕ و زێوی پەسمەندەیان بفرۆشن هەتا بتوانن هەشتهەزارتمەنی باج بۆ کۆبکەنەوە[11]. لافاوی پەنابەران لە جولفا و ئیسفەهانەوە بەرەو خوراسان و کرمان و یەزد و ئێراقی عەرەب (کە لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوو)[12] لووزەوی بەست. خانی قاجار گوێقولاغ و نیگەران دەیڕوانییە زۆربەی جووڵە و چورتەکانی ئازادخان. لە مانگی مەیدا بوو بە دەنگۆ کە خانی ئەفغان بۆ گرتنی قەڵەمڕەوی محەممەدحەسەنخان هێزێکی ناردۆتە ڕەشت و ئامادەی هێرشێکی تازەیە بۆ سەر ئیسفەهان. بەڵام ماوەیەک دواتر خەبەر هات کە پاش شکانی لە شەڕێکی بەرەوڕووی شاسلێمان(٣) کە خۆی بە میراتگری تەختی پاشایەتی دەزانێ و دەڵێ کوڕی شاتۆماسبی گەورەی سەفەوییە، بەرەو ورمێ پاشەکشەی کردووە[13].

هێندێک دواتر لە مانگی ژووەندا محەممەدحەسەنخان پێی وابوو هەل لەبارە بۆ بزووتن بەرەو شیراز. بۆیە دەسەڵاتی ئیسفەهانی دایە دەس ئەمیرگۆنەخانی(٤) ئێرلووی ئەفشار و بێ هیچ بەرهەڵست و بەربەرەکانییەک پێی نایە ئەیالەت (پارێزگا)ی فارس. لە شیراز تێگەیی کە ئەم شارە لەوەی قایمترە بێ تۆپ و تۆپخانە بگیرێ. چالاکی تریش پاش حەوتەیەک تێکۆشانی بێهوودە بە مەبەستی ڕاکێشانی هێزەکانی زەند بۆ تێکهەڵچوونێکی گشتی ڕاگیرا.

---

11- Hovhanyants 288 – 290.

12- GD 21 May, 22 June; 1756; Saldanha, 100.

13- Saldanha, 100; GD VIII, 29 May, 8 June 1756.

لەم کاتەدا ئەم هەواڵانە بڵاو بوونەوە کە گۆیا ئازادخان و فەتحعەلی‌خانی ئەفشار بە سەرکردایەتی هێزێکی گەورەی تازەوە هەتا نیزیک قوم پێشڕەوییان کردووە. محەممەدحەسەن‌خان ناچار بوو کە لەڕێوە بە مەبەستی پاراستنی ئیسفەهان لە شیراز بگەڕێتەوە. ڕۆژی ۱۱ی مانگی جوولای بە خۆی و هێزی پەڕتووکاو و تەپوتۆزاوی و هەشتهەزار کەسییەوە[۱۴] گەیشتەوە ئیسفەهان. نەسیرخانی لاری لای وابوو کە پتر وێدەچێ محەممەدحەسەن‌خان بتوانێ دەسەڵاتی بە سەر فارس‌دا بشکێ هەتا کەریم‌خان و ئازادخان، بۆیە هەرکە فەرمانی بانگ‌کرانی لە لایەن ناوبراوڕا گەیشتە دەس خێرا ملی دا و بە هێزێکەوە بەرەو شیراز کەوتەڕێ، بەڵام هەر لەو کاتی‌دا لە ڕێیە هەواڵی پاشەکشەی کتوپڕی خانی قاجاری بیست و بە سەرشۆڕی بەرەو داراب گەڕایەوە[۱۵].

دە ڕۆژ پاش گەڕانەوەی سەرداری قاجار بۆ ئیسفەهان ژمارەی هێزەکانی گەیشتنە هەژدە هەتا بیست‌هەزار کەس و تۆپخانەیەکیشی تەیار و ئامادە کرد. ئەو کات بۆ شەڕ لەگەڵ ئازادخان کە دەیانگوت چل‌هەزارکەسێکی پیاوی شەڕکەر بە دەستەوەیە بەرەو کاشان کەوتەڕێ. وا دیار بوو دەیویست لەم ناوچەیەدا خۆی بگەیەنێتە سەرکردەکانی تری و عەلی‌خانی خەلەجی کە چوارپێنج هەزار کەسێکی چەکدار لە ژێر ڕکێف‌دا بوو. فەتحعەلی‌خانی ئەفشار بە لەشکرێکی دووهێندی عەلی‌خانی خەلەجی پەلاماری دایە و ناچاری کرد ڕابکا. خانی قاجار تێگەیی وەختایەک کار بکەوێتە شەڕی دەستەویەخە نابێ ئومێدێکی ئەوتۆی هەبێ، بۆیە هێزەکانی بەرەو کاشان گێڕایەوە تا بە ڕێگای قەراخ ڕۆژهەڵاتی کەویری نمەک (دەشتی شۆرەکات)دا خۆی بگەیەنێتە قۆڵی فیرووزکۆ و ساری. ئازادخانیش بێوچان بەرەو کاشان و ئیسفەهان کوتای. لە ماوەی کەمتر لە ساڵێک، لە نێوەڕاست مانگی ئاگۆستی ۱۷۵٦دا بۆ دووهەم جار ئیسفەهانی گرتەوە[۱٦].

---

14- MAE Perse VIII, NO. 94 ( a letter from Simon dated 28 August 1756).
هەروەها تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ٥٤؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٤ ـ ١٥.

15- GD VIII, 20 July, IX, 7 August 1756; Brieven 2777 (1757), 3.

16-MAE Perse VIII, NO. 94; GD IX, 2 and 20 September 1756.
هەروەها تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ٥٥

ئازادخان بۆ ماوەیەکی کەم لە ئیسفەهان مایەوە، مانەوکەشی بۆیە زۆری نەخایاند چونکە شتێکی وا نەمابوو تێیڕۆبێ و دایرووتێنێ و بەتالانی بەرێ و ژمارەی دانیشتووانی شارەکەش لەم سالانەدا زۆری کەم کردبوو. (کارلیتەکانی وێ وای بۆ دەچن کە تەنیا لە ماوەی داگیرکرانی شار بەدەس هێزەکانی قاجار ١٤٠هەزار کەس لە جولفا ڕایانکردبوو.)[١٧] بەلام ئەوسالە ڕەوین و کۆچی خەلکی شار پتر لە ترسی تۆف و بەندی زستان بوو تا محەممەدحەسەنخان. لەم سەردەمەدا دەکرا کەریمخان لە بیران بچێتەوە. ئەو هێشتاش لەگەل لایەنگرانی دەشتستانی خۆی کە لە مانگی ئۆکتۆبرا هێزەکانی شێخالیخانیان تێکشکاندبوو، هەر وا ملبەملەی دەکرد. ئەم تاقمە هەتا مانگی دێسامبریش حازر نەبوون سەری وەبەربێنن[١٨]. لە ئاکامدا، ئازادخان جارێکی تر تیژ بەرەو باکوور کەوتە ڕێ، بەلام کۆمەلێک پیلان کۆسپیان خستە بەرپێی. لەگەل تاقمێک تفەنگچی ئەو ناوچەیە پەلاماری فەراهانی دا و سەری بە قەلای حاجی توغیانی فەراهانی(٥) نەوی کرد کە بەگوێرەی هەندێک سەرچاوە کچە ئازاکەی شەش سالێک سەرێشەی بۆ کەریمخان نابۆوە[١٩].

ئازادخان لەم ڕۆژانەدا فەتحعەلیخانی ئەفشاری ڕاسپاردبوو کە بکەوێتە پەیکەردەی محەممەدحەسەنخان لە فیرووزکۆ. فەتحعەلیخان توانی لە کاشان دەس بە سەر بارگە و بنەی محەممەدحەسەنخاندا بگرێ و بە پڕتاو و ڕاستەوخۆ بە ڕێی خاکی وەرامیندا ڕووی کردە باکوور و دەیەویست ڕێگای پاشەکشەی هێزەکانی قاجار بگرێ بەر لەوەی بگەنە پێچ و گەوەی کەل. بەلام ئەم تەگبیرە وە درەنگ کەوتبوو. محەممەدحەسەنخان ئێستا هێزێکی کارامەی بە سەرکردایەتی محەممەدخانی قاجاری قوانلووی مامی لە ژێر فەرمانی دابوو کە دەیتوانی ڕێگای فیرووزکۆ و ڕەوگەکانی تری ئەلبورز بگرێ؛ ئەم هێزە چەند حەوتوویەک لە عەلیئاباد بنەی داکوتابوو و چاوەڕوانی هێزەکانی ئەفشار مابۆوە کە ڕەنگبوو خۆیان بخەنە مەترسی پێنانە زنجیرە چیاکانی

17- GD IV, 28 September (citikg) letters from the carmelites at Ispahan dated 30 August. The figures is groosly inflated; cf. 14. 5 and table 1.
18- GD IV, 20 and October 1756, 9 January 1757; Hovhanyants, 288.
١٩ـ گولشەنی مراد، ل ٦١؛ بڕواننە بەشی یەکەم، یادداشتی ژمارە ٤١.

ئـەلبورزەوە[٢٠]. بـەلام پـاش ئـەوەی فەتحعـەلیخـان تێمـا و چـەقی محەممەدحەسەنخان گەڕایەوە ئەسـتەرئاباد. لـە مـانگی ئۆکتـۆبرا ئازادخـان بەناچار سەرکردەکانی بانگ هێشت و ڕاستەوڕاست لە قەزوێنەوە تێپەڕی و لـە دۆلی «سفیدڕوود»ەوە لە درێژەی لێوارەکانی گیلان پەلاماری سپای قاجـاری دا. ڕۆژی ١٩ی نوامبر فەتحعەلیخانی ئەفشار بە دوازدەهـەزار چەکـدارەوە سـپای ئەمیرگۆنەخانی سەرکردەی محەممەدحەسەنخانی لە شاری ڕەشت تێکشـکاند و سێ ڕۆژ دواتر شارەکەی گرت. لە ئاخری مانگی دێسامبردا ئازادخـان سەرقاڵـی گرتنی تەواوی هەرێمەکانی باکووری بوو و بۆ ئەم مەبەستەش چەند لۆتکەیەکی بۆ گواستنەوە و گەیاندنی سپاکەی ئامادە کرد[٢١].

## ٤ ـ ٣ سەرکەوتنەکانی قاجارییان لە باکوور

نیگەرانییـەکی دیکـە بـەربینگی بـە محەممەدحەسـەنخـان گرتبـوو. حوسێنخانی دەوەللوو ڕقەبەر و نوێنەری لە نێو تایفـەی قاجـاردا، لەوەتـەی چاوی ئەوی لێدیار نەبوو، وای نواندبوو کە دەیهەوێ دەسەلاتی داگیرکەرانـەی خۆی بە سەر خێلا بسەپێنێ. بۆیە وای بە پێویست دەزانی لەبری بۆسەنانەوە لە سەر ڕێی ئازادخان، خێرا بـەرەو ئەسـتەرئاباد وەڕێکـەوێ. دوای گەڕانـەوەی خێرای سەرەنجام ئاشت بوونەوە و محەممەدحەسەنخان تەواوی هێز و سەرنجی خۆی خستە سەر مەترسی ئازادخان لە ناوچەکانی ڕۆژاوا[٢٢]. بەرەو ساری ڕکێفی کوتا و لەم شارەدا دیسانیش شای دەستندەخۆری خۆی واتە سمـایلی سـێهەمی هەلگرت و بەرەو ئامول ڕۆیـی. لـەم شـارەدا تاقمێـک شـەڕکەری تازەپشـووی

---

٢٠ـ ئێستا پێی دەگوترێ شاهی. لەم شوێنەدا ڕێگای فیرووزکۆ دەکەوێتە سەرڕێی ڕۆخی دەریا کە بـەرەو سـاری دەڕوا. بڕواننـە: فەرهـەنگی جوغرافیـایی ئێـران، بـەرگی ٣، نەخشەی ساری و هەروەها: Butkov 1, 422 – 423; III, 95.

٢١ـ گولشەنی مراد، ل ١٧ ـ ١٨؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ٥٥، ڕەوزەتوسسـەفای ناسـری، بەرگی ٩.

MAE Perse VII Nos. 96, 97 (from Simon at Julfa, 9 January 1757) : Butkov I; 242, 243, 418, t 19: III, 94.

٢٢ـ گولشەنی مراد، ل ١٥ ـ ١٨.

خوراسانی بۆ وێنە عەلیخانی کورد و برایمخانی بوغایری پاڵیان وەپاڵی دا. بە مەبەستی بڕینی مەودای لێوارەکانی دەریا ۳۰۰ لۆتکەی بەکرێ گرت هەتا بتوانێ پەلاماری سەرەکی و گرینگی خۆی بەر لە کاتی دیاریکراو دەس پێبکا. نەخشەیەکی وای کێشا کە بە یارمەتی حەوتهەزار کەس لە شەڕکەرانی زەبرێکی گورچووبڕ لە سەنگەرەکانی پێشەوەی دوژمن لە ڕوودسەر بوەشێنێ.

هێشتا هەر وەرزی زستان بوو کە ئازادخان وەک عادەتی هەمیشەی چووە ڕەشت و لەوێ بنەی خست. چاوەڕوانی ئەمە نەبوو کە دوژمن لانیکەم تا مانگێکی تر بتوانێ لەم ناوچەیەدا بەرەیەکی بەربلاو بکاتەوە. هێرشی خێرای شەوانە و هرووژمی سواران لە بەرەبەیانی ڕۆژی ۱۰ی فێورییەدا ڕێی دەسکردنەوە و بەربەرەکانی پێشەنگی بەرەی ڕوودسەری گاڵەدا و سپای ئازادخان بەتەواوی غافلگیر کرا. عەبدولعەلیخان و پیاوەکانی ڕایانکرد، چەکدارەکانی کەوتنە تەڵەی تەندراوی نێو لێڕەوار و دەریا و بە دەس هێزی قاجار گیران و کوژران. قۆڵی دووهەمی پاراستن و بەرەگەگرتنی ئەفغانییەکان کە پێنجهەزار کەس دەبوون بە سەرکردایەتی خوسرەوخانی موکری(٦) تووشی گرژی و ئاڵۆزی هات و بەرەو لاهیجان پاشەکشەی کرد. لە لاهیجانیش سپای سەربازگە بە سەرکردایەتی شابازخانی دونبولی کە هەشتهەزار چەکدارێک دەبوو، لەبەر تۆقین سەبارەت بە شکانی بەرەگەی پێشەنگ بێ هیچ دەسکردنەوە و خۆڕاگرتنێک بەرەو دۆڵی سفیدرۆود کشایەوە و شەو لەبەر شاڵاوی هەشتسەد سواری قاجار وەتەنگ هات. ئەفغانی و ئەفشار و کورد و گورجی لە ماوەی هێرش و ڕامالینی پاشانی دوژمن هەزارهەزار ڕایانکرد و خۆیان لە شەڕگە بوارد.

ئازادخان لە کۆتایی ئەم کارەساتە سامناکەدا جگە لە چۆڵکردنی ڕەشت و خۆگەیاندنە سپای شابازخان و سەرکردەکانی تری هیچ چارەیەکی نەبوو، چونکە کۆمەڵەبەستنی لەشکر لە دەوری یەکتر دەیتوانی ترس و تۆقینی گشتی کەم بکاتەوە. هەروەها لە کاتی پاشەکشەدا بەرەو قەزوێن دەستەیەک کەیخودا و ڕدێنسپی ناوچەکەیان وەک بارمتە لەگەڵ خۆیان برد. لە قەزوێنیش یارانی بە بەدیهێنانی مەرگ و وێرانی لە بنارە بەفراوییەکانی ئەلبورزا خەشی خۆیان ڕشت. ڕاست لەو وەختانەدا بوو کە محەممەدحەسەنخان ڕۆژی ١٦ی فێورییە

پێی نایە شاری ڕەشت[٢٣].

سەرداری قاجار خێرا لە پاشماوەی زستاندا دەستی دایە تۆکمە کردنی دەسکەوتەکانی لە گیلان و تالش(٧) و قزڵئاغاج (ئاستارا) لە لای باشووری دەشتی موغان[٢٤] و ئەم لەنگەر گرتنە هەلی بۆ پەلاماری هێزە ژاکاو و شڕوپەتوورەکانی ئازادخان بەرەو باشوور ڕەخساند. لەم هەرێمەدا شارەکانی ئێراقی عەجەم بۆ ماوەیەکی کورت لە تالان و بڕۆی ڕێکوپێک و تەوژم و قورسایی پیتاک و شەڕی نێوان سێ سەرکردە شەڕخوازەکەی بە دوور مابوون. (تەنانەت ڕاکردووان هەواڵیان دابوو کە خەریکی گەڕانەوەن بۆ ئیسفەهان.) [٢٥]

گۆیا ئازادخان چاوەڕوان بووە کە سەرداری قاجار بە مەبەستی شوێنهەڵگرتنی بەرەو باشوور باژوێ و بۆیە ئەویش بەئانقەست ئەم بیرەی تێدا بەهێز دەکرد. لە ڕاستیدا ماوەی مانگێک لە دەشتی موغان بە ناوی شای تازەی سەفەوی بۆ کۆکردنەوەی هێزی تازەپشوو لە نێو خانانی شووشی، دەربەند، قەراچەداغ و شاسەیوان حەولێکی بێهوودەی دا. لەم ماوەیەدا تەنیا حاکمی نیزیکترین ناوچەی پەنای واتە کازمخانی قەراچەداغی داواکەی قبووڵ کرد. پاشان لە وەرزی بەهاردا سەرانسەری ئازەربایجانی بڕی و بەرەو قەڵای سەخت و سەرەکی ئازادخان لە ورمێ گورمی بەست. تەوریز بێ دەسکردنەوە گیرا. لەم شارەدا ژمارەیەکی زۆر سەربازی بە بێگارگیراوی هێنایە ژێر ڕکێفی خۆی. عەباسقوڵیخانی بوغایری و سەفییارخانی ئەفشار شاری مەراغەیان دایە بەر شەپۆلی تالان. چەند ڕۆژ دواتر بارگەوبنەی لە شوێنێکی دوورتر لە ورمێ دایە دەس کازمخانی قەراچەداغی(٨) و خۆی گەمارۆی شاری دا. یۆسفخانی هووتەکی ئەفغان حاکمی ئاڵقەبەگوێی ئازادخان بوو لە ورمێ. کۆمەڵێک پەیامی بە پەلە و تەنگەتاوی بۆ فەرماندەکەی نارد و خۆی دەروازەی گاڵە دا و چاوەڕوان مایەوە[٢٦].

---

٢٣ــ گوڵشەنی مراد، ل ١٨ ــ ١٩؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٥٦ ــ ٥٧؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٣٢ ــ ٣٣؛

Butkov I, 419 – 420; III, 95;MAE Perse VIII, No. 97; GD IX, 20 March 1757.

٢٤ــ گوڵشەنی مراد، ل ١٩؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٥٧؛ Butko I, 420

25 - GD IX, April 1757.

٢٦ــ Butko I, 243, 420 - 422; III, 95. گوڵشەنی مراد، ل ١٩ ــ ٢٠؛ گیتیگوشای زەندیە، ل ٥٩.

## ٤ ـ ٤ شەڕی ورمێ

لەم ڕۆژانەدا ئازادخان خەریکی سەرکوتی تاقم و شانەکانی بەرگری بوو لە دەوروبەری فەراهان. هێنانە ژێر ڕکێفی ئەم ناوچەیە بەر لە چوونی بەرەو گیلان سەرنجی ڕاکێشابوو[٢٧]. هاتنی هەواڵی گەمارۆی ورمێ وای کرد هێزەکانی کۆکاتەوە و لە ١٥ی مانگی ئاوریلی ساڵی ١٧٥٧دا لە ئیسفەهان کۆچباری لێنا و لێبڕا کە خۆی بداتە شەڕێکی یەکجارەکی و چارەنووسساز.

سیمۆن لە بیرەوەرییەکانیدا بەگەرمە نووسی: «خەریکن دەبزووین و دەڕۆین بۆ شەڕ لەگەڵ محەممەدحەسەنخان.»

سەرکردەی قاجار لەگەڵ کوڕەکەی و ژنی سیغەکراوی لە باکووری ئێران شەڕێکی دژی ئەفغانییەکان هەڵگیرساند کە ئیتر قەت وێنەی وەبەر چاو نەهات[٢٨]. سەرەنجام گەیشتە ناوچەی گەڕووس(٩) و موکری و گەلێکی چەکداری تازەپشوو لە نێو کوردان کۆکردەوە و بە یارمەتی سەلیمپاشای ئەردەڵان(١٠) پێگەیەکی قایمی دانا و پاراستنەکەی خستە ئەستۆی سەربازانی ئێلجاڕی هۆزی بڵباس و خۆی بەرەو ورمێ پێیپێوەنا. ماوەیەک دواتر محەممەدحەسەنخان چەند کاری دیکەی کرد، سپایەکی پێنجهەزار کەسی بە مەبەستی گەمارۆی ورمێ بەجێهێشت و خۆی پێشاوبرەی ئازادخانی دایەوە و لە نێوەڕاست مانگی ژووەندا لە شەش فرسەخی ورمێ تێکهەڵەنگووتن[٢٩].

برایمخان و عەباسخان و عەلیقولیخانی بوغایری هاوپەیمانانی خانی قاجار هەرکام بە هەزار سوار و پیادەوە کەوتنە قۆڵی ڕاست. ڕاستەڕێی ئەسپاردەی عەلیخانی خەلەجی کرد بە هێزێکی بارتەقای ئەوانەوە. حەوتهەزار کەسی دیکە بە سەرکردایەتی محەممەدوەلیخانی قاجار پشتیوانی ئەم هێزانەی دەکرد. خۆشی لەگەڵ پیاوان و غولامانی تایبەتی لە سەر تەپۆڵکەیەکی کە دەیڕوانییە ڕیزی مەتەرێزەکانی شەڕ بنەی داکوتا. لە بەرامبەر ئەم هێزەدا کە ئەگەر خۆی کوشتبا تێکڕا نەدەگەیشتە پازدەهەزار کەس، ئەفغانییەکانی

---

٢٧ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٥٩.

28-MAE Perse VII, Nos. 100, 101.

29- G M, 20 ; T G G, 59 ; Butkov I, 422 – 423, III, 95.

ئازادخـــان و تۆپخانەکـەی دامـەزرابوون. سـپای فەتحعـەلیخـانی ئەفشـار و تاقمـەکانی ئازەربایجـانی لــە قۆڵــی ڕاســت و قەڵەنــدەرخانی ئــەفغان بــە سەرکردایەتی پۆلێک ئۆزبەک و ئەفغان لە قۆڵی چەپ مەتەرێزیان گرتبـوو. بــە گوتەی سارەوی سەرجەم ئەم هێزانە بیستهەزار کەسێک دەبوون. پێشبینی دەکرا کە ئەگەر بارودۆخ هەروا بڕواتە پێش، هێندەی پێناچێ سپای ئازادخــان چونکــە بە ژمارە زیاترە ئەوڕۆژە سەرکەوتووی مەیـدانی شـەڕ دەبـێ. تــاقمێکی سـپای قاجار ترس و دڵەڕاوکەی دەنواند، کورد و بلووچ و ئەفغانی مــەیلیان لــە چــۆڵ کــردنی مەیــدانی شــەڕ و ڕاکــردن بــوو و تــەنیا تــۆقین لـــە تـــەورزینی محەممەدحەسەنخاندا، خۆی پێڕادەگرتن. لە بەرامبــەر ئــەم لەشـکرە تێکەڵــە ناڵەبارەی محەممەدحەسـەنخـان، شـابازخانی دونبـولی کـە سـەرکردایەتی ئازەربایجانییەکانی سەر بە فەتحعەلیخانی لە ئەستۆ بوو، لەگـەڵ هێزەکـەی دایە.پاڵ ڕیزەکانی خانی قاجار؛ کەسانێکی دیکەش کە زۆریان ڕق لە هێزەکــانی ئەفغان بوو، کەوتنە شوێنی. لــە ئاکــامدا ئازادخــانی کەللــەڕەق تــۆقی و لــە مەیدانی شەڕ رایکرد. سپای قاجار هەتا شوێنی خستنی بارگەوبنـە هەڵـیبڕین و دەستی بە سەر بەشی زۆری سامانی بەجێماوی داگرت. ئــەو کــات شــەڕکەران و دیلانی هــۆردووی پـرشوبـڵاوی کـۆکردەوە و بــە مەبەسـتی گـەمارۆی ورمــێ کەوتەڕێ[٣٠].

ئەگەرچی هیچ ئومێدێک لــە بابــەت هــاتنی هێــزی یارمەتیــدەر بــەدی نەدەکرا، بەڵام دیسانیش یۆسفخانی هووتەکی چەند ڕۆژی تری دەس کردەوە و سەرەنجام لە ڕۆژی ١٩ی مانگی جوولایدا قەڵای بە هەلومەرجێکی ئاشـتییانە دا بەدەستەوە. یۆسفخان چوارهەزار کەسێکی شەڕکەری ئۆزبەک و ئەفغان لە ژێر فەرمانی دابوو کە وا قەرار کرا بچنە ڕیزی لەشکری قاجار. هاوکات تەواوی ئــەو بنەماڵە ئەفغانییانەی کە چوارهەزارکەسێک دەبوون کۆچدرانە مازەندەران هــەتا لەوێ بنەگر بن. بەم شێوەیە بنکە و پێگە و خەزێنــەکانی ئازادخــان و زۆرینــەی سپاکەی کەوتە دەس محەممەدحەسەنخان. فەتحعەلیخانی ئەفشار ڕایکردبــوو،

---

٣٠ــ گوڵشــەنی مــراد، ل ٢٠ ــ ٢٣؛ تــاریخی گـیتیگوشــای زەندیــە، ل ٦٠؛ ســارەوی، ل ١٧ ــ ١٨؛ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی دووهەم، ل ٢٠ ــ ٢١؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسـری، بەرگی ٩، ل ٣٥ ــ ٣٧؛ سەعید نەفیسی، ل ٣٥٣.

«خۆی». برایمخانی بوغایری نامەیەکی بۆ نارد و دنەی دا ئـەویش وەک ئـەوان دەس هەڵبگرێ و بچێتە ڕیزی سپای خانی قاجار. ئازادخانیش لەگـەڵ تـاقمێکی کەمی (۱۱) هاوڕێیانی ڕووی کردە شارەزوور هەتا لەوێوە پەنا بەرێتە بەغدا[۳۱].

بارودۆخی محەممەدحەسەنخانیش لە ورمێ و تەورێز چەشنی ئازادخان لەبەر بوونی حاکمانی سەربەخۆ و چیانشینی دراوسێی لە باکوور هەڕەشەی لە سەر بوو. پەناخانی جەوانشێر لە سایەیسەری شوورە و دیواری قـایمی قـەڵای شووشی (شیشە) دەسەڵاتی قاجـاری لــە ســەر گەنجــە و قــەرەباغ بــە ڕەسمــی نەدەناسی. لە پایزی ساڵی ۱۷۵۷دا، محەممەدحەسەنخان وای پـەلاماری قـەڵای شووشی دا کە ببێتە کۆسپ لە سەرڕێی گەیشتنی یارمەتی هاوپەیمانانی تـازەی و کەوتنە نێو جەڕومەنگەنەی خۆیەوە. تەهموورس (تەیموورس) و ئارکێل ئەگەر تا ئێستا بە مەبەستی هاوپەیمانێتی لە خانی قاجار نیزیک ببوونەوە، خۆیـان کەنار دا. محەممەدحەســەنخــان بــە ســەرووەبەرهێنان و بەیعــەتی ســەرەتایی سەرۆکانی شیروان و ئێـرەوان و زیادئۆغلــووی قاجــاری گەنجــە ڕازی بــوو[۳۲]. سەرەنجام سەرکردەی قاجار بۆ گەڕانەوە تەورێز بە دەشتی موغــاندا تێپــەڕی، دەستەیەکی هەڵمەتبەری خەڵکی قەرەباغ و شەکی پــەلاماری لەشــکرەکەیان دا و زۆریان خەســار و کــوژراو و بریــندار خســتە ســەر دەســتی: لــە ئاکــامی ئــەم پەلامارانەدا گەلێک لە یــارانی شاســەیوان و لایــەنگرانی تــری ئازەربایجــانی لێیکشانەوە و گەڕانەوە سەر ماڵوحاڵی خۆیان. بەم شێوەیە سەرداری قاجار بە هێزێکی کەمەوە بۆ پەلامارداني سپای زەند مایەوە[۳۳].

---

۳۱ـ گوڵشەنی مراد، ل ۲۳؛ تاریخی گیتیگۆشای زەندیە، ل ۶۰؛ هەروەها:
MAE Perse VII, No. 104 ; Garmelites, 661 ; GD I X, 9 and 30 July; X, 10 September 1757 ; SP 97/30, 1 October 1757 ; SP 97/40, 16 January 1758 ; Brosset, 200

۳۲ـ گوڵشەنی مراد، ل ۲۳؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ۶۰، ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ۹، ل ۳۸ ـ ۳۹.

Butkov I, 243 ; III, 96 ; The Zeyad – Oghlu Clan of the Gajars had provided the Beglerbegi of Qarabagh under the safavids ;See Bakikhanov, 106 ; Rohrbom, 95.

33- Butkov I, 244, 243.

## ٤ ـ ٥ گیرانی ئیسفەهان بۆ جاری دووهەم لە لایەن محەممەدحەسەنخانەوە

شەڕی یەکلاکەرەوەی نێوان محەممەدحەسەنخان و ئازادخانیش هەژدە مانگی وەختی سەرداری قاجاری تا ئەو دەمەی هێرشی بێهوودەی بۆ سەر فارس دەسپێکرد لەخۆی شەتەک دا. تێپەڕینی ئەم ماوەیە هەلی بۆ کەریمخان ڕەخساند هەتا خەریکی زنجیرەیەک هەڵمەت و چالاکی بێ و پەل بداتە کێشانە بەر نیر و دەستەمۆ کردنی ناوچەکانی نێوخۆ لە شیرازەوە بۆ بەرزاییەکانی کۆهکیلۆیە و لە مەڵبەندەکانی گەرمییانەوە بەرەو دەرودەشتی خووزستان و دەشتستان و لەنگەرگاکانی کەنداوی فارس و لە بەندر ڕێگەوە بۆ بووشێهر و بەندەرعەباس و قەڵەمڕەوی شاخستانی نەسیرخانی لاری. شەڕێک کە دوابەدوای ئەم شالاوانە لە ئیسفەهان قەوما بۆشاییەکی بەدیهێنا کە ئێستا محەممەدحەسەنخان بۆ پڕ کردنەوەی کەوتبووە بارودۆخێکی تایبەت.

ئیسفەهان پاش پەلاماری ساڵی پاری ئازادخان بە دەس پیاوانی دەستندەخۆری واتە جەعفەرمیرزا و تاهیرسوڵتان هەڵدەسووڕا، ئەگەرچی «دۆمنیکەن فریە» دەیتوانی لە مانگی ژووەندا کەیفخۆشی خۆی دەرببڕێ کە دەمێک لە دەس دیکتاتۆرێتی ڕزگاریان بووە. ڕەنگە لەبەر چەوساندنەوەی بێوچانی ئەم خەڵکە و داڕووتاندیان بە ناوی کۆکردنەوەی قەرزوقۆڵەی پێتاک و جەریمە و کۆچی ڕۆژانەی ئەرمەنییەکانی جولفا کە بە مەبەستی هەڵمژینی هەوای ئازادی زیاتری سێبەری دەسەڵاتی کەریمخان ڕوویان کردبووە شیراز، ئاوا هەستی بزاوتبێ[٣٤]. پاش ئەوەی هەواڵی شکستی ئازادخان لە ورمێ گەیشتە کەریمخان، توانی ٥هەزار کەس لە شەڕکەرانی بە سەرکردایەتی شێخاڵیخان و

---

هاتنی ڕاپۆرتێک لە کرمانەوە بۆ بەندەرعەباس لە ٢٨ی دێسامبری ١٧٥٧ دەنگۆیەکی بە شوێنەوە بوو کە گۆیا محەممەدحەسەنخان لە ئازەربایجان شکاوە و گەڕاوەتەوە بۆ مازەندەران. بۆ قبووڵ کردنی ئەم دەنگۆیە دەبێ چاو لە ڕاپۆرتە پێچەوانەکانی بکرێ.

34-MAE Perse VII, No. 101 ( Letter from Raymond Berselli, dated 1 Juan 1757): Carmelites, 611.

نەزەرعەلیخانی برای بە مەبەستی گرتنەوەی پایتەختی پێشووی خۆی بنێرێ. هەر کە ئەم هێزانە سۆراغیان پەیدا بوو ئەمیرگۆنەخانی ئەفشار کە فەرماندەرێتی پاشماوەی سەربازگەی ئازادخانی لە ئەستۆ بوو، لە رێی ئەردستانەوە پاشەکشەی کرد. بە دەرکەوتنی ئەم ئاڵوگۆڕە تازانە شێخاڵیخان بە مەبەستی گرتنەوەی گوڵپایەگان و برووجێرد[٣٥] برای خۆی گاڵ دا. لەم رۆژانەدا دەنگەشە بلاو ببۆوە کە محەممەدحەسەنخان ٢٠هەزار تفەنگچی لە رێی کرماشانەوە بە مەبەستی پەلاماری هێزەکانی زەند ناردووە[٣٦]. ئەم مەبەستە نیشانەی پەلاماری زستانە بوون و تایبەتی محەممەدحەسەنخان کە لە شەڕی ئازادخاندا هێنایە گۆڕ. پاشان دەرکەوت کە ئەگەر تەنانەت لەم رێگایەشەوە هەڵبەت نەهێنێ، بڕیاری لە سەر یەکلاکردنەوەی ملانەی نێوان زەندان و قاجاران داوە.

تەورێزی دایە دەس ئاغا محەممەدخانی تازەلاوی کوڕی کە چەند راوێژکارێکی متمانە پێکراو و سەربازگەیەکی هەشتهەزار کەسی لەگەڵ بوو و خۆی کەوتەڕێ. ئەو دەیەویست بە شێوەی ئاڵقە تێکبەزاندن، دژی سپای زەندی برووجێرد بێتە کایەوە. محەممەدوەلیخانی ماوەیەک دواتر نارد تا پێشەنگ بێ و لە رێگای ساوەرا هەرووژم بەرێ و هاوکات خۆشی راستەوخۆ لە قۆڵی خەمسەوە پەلاماری هەمەدان بدا. نەزەرعەلیخان توانی لە کاتی خۆیدا بەرەو ئیسفەهان بکشێتەوە. دوو هێزی نێردراوی قاجارییە لە خاکی سیلاخۆر گەیشتنەوە یەکتر و هێزەکانی شابازخانی دونبولیش بوونە پشتیوانیان. ئەم لەشکرە گەورە و گرانە راستەوراست بەرەو ئیسفەهان کوتای. شێخاڵیخان کە بە هێزی کەمییەوە شاری چۆڵ کردبوو و سەرۆکەکانیشی ناردبووە شیراز، خۆشی رۆژی ٩ی دێسامبر بەپارێزەوە ئیسفەهانی جێهێشت و لەگەڵ سیکەس لە یارانی هاتە شیراز. سەرکردەی قاجار لە ١٥ی دێسامبری ساڵی ١٧٥٧دا، بۆ جاری دووهەم سەرلەنوێ پێی نایەوە ئیسفەهان[٣٧].

---

٣٥ـ GD X, 22 September 1757. و گوڵشەنی مراد، ل ٢٨ ـ ٢٩.

36- GD X, 10 September 1757.

٣٧ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢٩ ـ ٣٠؛ تاریخی گیتی گوشای زەندیە، ل ٦٠؛
Butko, I,244, 242; GD X, 30 Desember 1757, 29 Januay, 26 February 1758.

پاش پێنانە ئیسفەهان خێرا چەند هێزێکی بە سەرکردایەتی سەفەرعەلیئاغای قۆیونلوو بە مەبەستی گرتنی کاشان گاڵ دا. میرزا موعیززەددین غەففاری کە لە لایەن زەندیەڕا کرابوویە حاکمی کاشان، بڕیاری بەربەرەکانی دا و خۆی بۆ گەمارۆدان ئامادە کرد؛ بەڵام حوسێنعەلیخانی قاسملووی ئەفشار(۱۲) کە سەردەمایەکی لە لایەن برایمیرزاوە حوکمڕانی شار بوو و پاش دەس بەکار بوونی میرزا موعیززەددین بە پلەیەکی نزم لای ئەو مابوویەوە، خەیانەتی پێکرد و سپای قاجاری داکێشایە نێو شار. لایەنگران و کاربەدەستانی بالای زەند لە گۆشە و کەناران دیل و زیندانی کران و ماوەیەک دواتر محەممەدحەسەنخان جڵەوی پارێزگای ئیسفەهانی بە دەستەوە گرت[۳۸].

سەرکردەی قاجار بە باری لەشکریدا کەوتبووە هەلومەرجێکی قایم و پتەو. شالاو و پرکێشی بێپسانەوەی لەشکری ڕقەبەران لە ڕۆژگاری نادرشاوە و لە ماوەی دەساڵدا جووڵەی لە پایەتەختی سەفەوییە بڕیبوو. نە تەنیا پووڵ و شتوومەک بە شێوەیەکی زاڵمانە بە تالان چووبوون، بەڵکوو مەزرا و لەوەڕگاش بەیار و بێبەرهەم کەتبوونەوە و بە شوێن کۆچی داخوازەرانەی خەڵکی شار ڕێژەی جەماوەرەکەی یەکجار دابەزیبوو. شەپۆلی کۆچ وا تیژ و خێرا تەنییەوە کە شوێنکەوتی وێرانییەکانی بێژمارتر بوو لە تەواوی قۆناخەکانی ڕاگواستنی بە زۆرەملی سەردەمی سەفەوی و نادرشا. تروسکەی ژیاندنەوەی کشتوکاڵ و سنعات ڕێک تێداچووبوو. سەرەنجام کۆمەڵێک ملۆزم لە بەرهەمی کشتوکاڵ نیشتن و لە ساڵی ۱۷۵۷دا حاسلاتی سەرانسەری ئێرانی ناوەندی و باشووری تێداچوو. ئێستا لە ئیسفەهان قاتی پتر پێوەدەچوو. بۆ ئەم شارە کە تەنانەت نەیدەتوانی پاشەواری زیندووەکانی جەمەردووی خۆی دابین بکا، تێرکردنی داروودەستەی تالانچی و درندەخووی قاجاری قەت بۆ جێبەجێ نەدەبوو. وەک

«ئیوز» کە ئەو کاتی لە بەندەرعەباس بوو، لە ل ۲۲۰ی کتێبەکەیدا هێزەکانی زەند بە ۱۳هەزار کەس دادەنێ، بەڵام ئەم ژمارەیەی تەنیا لە رووی بیسترانەوە نووسیووە، سپای قاجاریش ژمارەی چەشناوچەشنی هەیە. بۆ وێنە ئەم ڕاپۆرتە بە ۵۰هەزار کەسیان دادەنێ و ڕەوزەتوسسەفای ناسری لە بەرگی ۱۰، ل ۴۱دا دەنووسێ ۳۰ تا ۴۰هەزار کەس. بەڵام ڕاپۆرتەکانی نێردراو لە بەندەرعەباسەوە بە ۲۰ تا ۳۰هەزار کەسیان دادەنێ.

۳۸ ـ گوڵشەنی مراد، ل ۳۰.

زەمانی گەمارۆی ئەفغانییەکان لە ساڵی ١٧٢٢دا، خەڵکی ئەم شارە ناچار ببوون دەس بکەن بە خواردنی گۆشتی سەگ و پشیلە و جرجەمشک و تەنانەت تاقمێکیان منداڵەکانیان بۆ وەچنگ هێنانی هێندێک دانەوێڵە دەفرۆشت. وا بەراورد کراوە کە لە ماوەی حەوت مانگ قاتی و قڕی و سێجار داگیرکرانی شار[٣٩] بە دەس سپای قاجار، دوازدە تا بیستویەکهەزار کەس دانیشتووی وێ تەنیا لە برسان یا لەبەر تێهەڵدران بە هیلاک چوون. لاشەی مردووەکان ئەوەندە لە ڕێوبان و کۆڵانان دەمانەوە کە دەبوونە خۆراکی جانەوەران. لاشەکانیان پتر لە خەندەک یان کۆنەکاولەکانی دەوروبەردا دەخستە سەریەک، «چونکە هەڵکەندنی گۆڕ و وەدەس هێنانی کێل و بەردیش بووزی نەدەخوارد[٤٠].»

گومانی تێدا نیە کە بە مەبەستی ڕاگرتن و کەم کردنەوەی قاتی و قڕی محەممەدحەسەنخان هەڵسووڕداسووڕێکی کرد؛ کەچی گەلێک ئاکاری دزێو و نالەباریشی بە ئەستۆدا بڕا کە بەشێکیان ئەگەر هەمووشی نەبێ دەگەڕاوە سەر ئەو تاقم و دەستە بەهێزانەی کە لەم دوایەدا لە ئازادخان هەڵبڕابوون و دابوویانە پاڵی. وەفاداری ئەم تاقمانەی لەم شەڕەی ئاخردا بە پووڵ کڕیبوو و ئێستاش کە هیچ پارەیەکیان نەدەدرایە و دەیانبینی کە ئیسفەهان سافلەساف تالان کراوە، ڕیزی هۆردوویان بەجێدەهێشت[٤١]. لە مانگی مارسا محەممەدحەسەنخان تێگەیی کە ئیتر مانەوە لە ئیسفەهان ناتوانێ بە قازانج و بێ سەرێشە بێ، بۆیە حوسێنخانی دەوەللووی کردە حاکمی شار و خۆشی لەگەڵ لەشکری گەورە و گران و دەسبزێوی بە مەبەستی گرتنی شیراز کەوتەڕێ[٤٢].

---

٣٩ـ گوڵشەنی مراد، ل ٣٠ ـ ٣١؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٦١ ـ ٦٢؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٢٨٥ و هەروەها:
GD X, 21 July 1758; Hovhanyants, 290.

40- Hovhanyants, 290.

41- GD 10 February 1758; Butkov I, 423; III, 96.

٤٢ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٦٢ ـ ٦٣ و هەروەها:
Butkov I, 424; GD X, 14 April 1758; Hovhanyants, 290.

## ٤ ـ ٦ گەمارۆی شیراز

کەریمخان بە مەبەستی بەرورووو بوونەوە لەگەڵ هەڕەشەی لەشکری قاجار هیچ کەترەخەمی نەکردبوو. هەرچۆنێک بێ هەڵمەتی ئێستاش ڕاست نووپاتی هێرشی پێرار بوو و دەبوایە هەر بەو هەوایە قرمی لێخۆش کرابا. ماوەیەکی کەم پاش گیرانی ئیسفەهان تاقمێکی بچووکی سپای قاجار بە مەبەستی پەلاماری فارس و چاوەدێری[٤٣] لە شیراز ناردرابوون، بەلام ئەم ڕووداوە بەرهەڵستی کۆکردنەوەی ئازۆخەی سپای زەندی پێنەدەکرا لەم شارە بەپیت و ڕێژەودا. خانی زەند ڕایسپاردبوو کە هەرکەس لە دەوروبەری شار سێ یان چوار ڕۆژەڕێ دوورە، دەبێ بە هەموو دەغڵ و دان و پاشەکەوتی کشتوکاڵییەوە بەرەو شیراز تێبکشێ. سادقخان کاروانێکی کە دەچوو بۆ یەزد و بایی پێنجشەشهەزار تمەنێکی کەلوپەل پێبوو، ڕووت کرد و خستییە سەر پەسمەندەی سپای زەند لە شیراز[٤٤]. سەرەڕای ئەمەش لە نێوەڕاست مانگی ژانوییەدا ڕاپۆرت درابوویە بەندەرعەباس کە سەرکردەکانی دەهەزار کەس لەشکری زەند لانیکەم بە باری دانی مووچە و مانگانە و خوردوخۆراکی سپای بارتەقای محەممەدحەسەنخان لە تەنگەژە دان. سەفەرعەلیخانی زەند(١٣) کە پێشتر بەرەو سپای قاجار ملی نابوو، بۆچوون وابوو کە کەسانی دیکەش چاوی لێبکەن و بکەونە شوێنی[٤٥]. محەممەدحەسەنخان جارێکی تر بە فەرمانێک نەسیرخانی لاری کردەوە بەگلەربەگی فارس و ئەویش دووبارە بە خۆی و دووهەزار سوارەوە، بە مەبەستی چوونە پاڵ سپای قاجار کەوتەڕێ[٤٦].

لەشکری قاجار لە سەرەخۆ دەهاتە پێش. بە ڕێی «ئابادە»دا

43 - GD X 28 February 1758.
44- GD 19 February 1758.
45- GD 19 February 1758.
٤٦ـ GD 15 February, 14 April, 28 June 1758 و تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٦٤؛ فارسنامەی فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٠ ژمارەی سێهەزار و سەعید نەفیسی ٦٠٠٠ کەسیان نووسیوە.

بەرزاییەکانی بەیزا، فەهلەیان و کازروونی بڕی. ئەم ناوچانە پێگەیەکی گرینگی گەرمەسێری زەندیە بوون کە شێخاڵیخان لەوێ دادەنیشت. ناوبراو لە بەرامبەر هرووژمی هێزی پێنجهەزارکەسەی فەتحعەلیخان و برایمخانی بوغایریدا دەستی کرد بە کشانەوە. لە کازروون سەرۆکی قاجار خۆی دڵنیا کردەوە کە ئەمساڵ ئامراز و کەلوپەل و پاشەکەوتی گەمارۆی پێدەبێ و وەک پار بە ناکامی ناگەڕێتەوە و درێژەی دا بە جووڵانەوەی. ئەمجارەشیان لە کوتەل دوختەری شوم کە پێشتر هۆکاری گرفتاری عەلیمەردانخانی بەدیهێنابوو، تووشی تەقە و لێکدانێک هات. ئاخرییەکەی سپای سەرکردەی قاجار گەیشتە شیراز و هێزەکانی ژێر فەرمانی نەدرخانی زەندی لە دەرەوەی شار تێکشکاند و بارگە و بنەی لێگرت و پاشان دەستی کرد بە دەورەدانی بازێر. مانگێک دواتر نەسیرخانی لاری گەیشتە لای. لەم بەینانەدا وێدەچوو کە پێشکەوتێکی کەم و کورتی وەدەس کەوتبێ، بەڵام ماوەیەک بوو لەبەر کەمبوونی لەوەڕ و تفاق و ئازۆقە تووشی کوێرەوەری و گرفتاری هاتبوو[٤٧].

ئامراز و کەرەسەی تایبەتی گەمارۆی سپای قاجار ئەوەندە کەم بوو کە هیچ کارێکی نەدەکردە سەر شوورەی تازە دابەستراوە و خەندەکی شاری شیراز. پەلاماری ڕۆژانەی شەڕکەران بە سەرکردایەتی شێخاڵیخانی زەند وای کردبوو کە شار بە تەواوی نەکەوێتە گەمارۆوە. هەروەها بەڕێوەبردنی ورد و باریکی شەڕئەزموونی زەوی سووتاو لە گەڕانگەڕی شار ببوو بە هۆی برسیمانەوەی هێزەکان و یەکسمەکانیان. پاش چەن حەوتوو، دەورەدانی شیراز زۆر وەک گەمارۆی بێئاکامی چەند ساڵ لێرەوبەری ئەستەرئاباد دەچوو لە لایەن کەریمخانەوە. پارێزەران شاریان بە باشی دەپاراست و چی پێویستە بە دەستیانەوە بوو و بەکردەوە گەمارۆدەرانیان تووشی داوی ڕێلێگیراوی دەکرد. مێژوو بە هەموو وردەکارییەکییەوە دووپات ببۆوە. وەختایەک سپای قاجار تەمای گرت ڕەوەی دەدوازدەهەزار سەر ئەسپ و بارگین و یەستری بۆ لەوەڕ بنێرێتە ناوچەی ئەردەکان کە تا لەشکرگا شێست مایلێک دەبوو، تاقمی

---

٤٧ـ گوڵشەنی مراد، ل ٣٣ ـ ٣٤؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٦٣ ـ ٦٤؛ فارسنامەی فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١١؛ GD X, 9 June, 10 July 1758.

زەبروەشێنی شێخاڵیخان کەوتە شوێنیان. پاراستنی ئەم ڕەوەیە لـە ئەسـتۆی ئەبولقاسمخان(١٤) سەرکردەی زێرەوانانی تایبەتی محەممەدحەسەنخـان بـوو. پارتیزانان خافڵگیریان کردن و سێسەد کەسیان بـە دیـل گـرت. سـەرەنجامیش لەگەڵ بەشی زۆری ئەم نیگابانانە لە پردی دزەک تێکهەڵـچوون و لـە شـەڕێکی قورسدا لە ناوچەی دوژمنزیاری تێکڕای ئەم ورەدۆڕانەیان گرت و ڕەوەیان ڕادا. تەواوی خەنیمەتەکان لە شیراز درانە دەس کەریمخان. ئەم ڕووداوە بوو بە هۆی شادی گەمارۆدراوان و پەژارەی گەمارۆدەران[٤٨].

تاقمەکانی ئەفغان وردەوردە تاقەت و توانای خۆیان لـە درێـژەی ئـەم گـەمارۆ یـەکلایەنـە لـە دەس دابـوو و هـەسدانـەوەی تونـد و تیـژی محەممەدحەسەنخانیش لە بەرامبەر ئەم گەمارۆ بێئاکامەدا پتـری دەبێزرانـدن. لە شەوی ٢٦ی شەشـەکانی ساڵـی ١١٧١ی کـۆچی / ٣ی جـوولای ساڵـی ١٧٥٨ی زایینیدا بەشی زۆری هێزەکانی ئەفغان و ئۆزبەک هۆردووی قاجاریان تاڵان کرد و بەکۆمەڵ لەشکرگایان جێهێشت و پاش ماوەیەکی کـورت لـە ڕووداوی دیکـەدا سەریان وەبەر کەریمخان[٤٩] هێنا(١٥). محەممەدحەسەنخان ئێسـتا دەیبـینی کـە جگە لە تاقمێکی کەم بەشی زۆری لەشکرەکەی لێی بوونەوە و ئەوەندەشی ئەسپ بە دەستەوە نیە بکەوێتە پێوشوێنیان. هەر ئەو ڕۆژە پاشماوەی سپاکەی دەنـگ دا و بە سەرشۆڕی و ئابڕووتکاوی بەرەو باکوور ڕایکرد[٥٠].

وەک گێڕاویانەتەوە دەبێ سەرداری قاجـار و یـارانی کـەمی، مـەودای سێسەدمایلی نێوان شیراز ـ ئیسفەهانیان لـە مـاوەی سـێڕۆژا بـڕیبێ، بـەڵام هەواڵی لێکبلاو بوونی هۆردووەکەی زووتر لە خۆی گەیبووە هەموو شـوێنێک. حوسێنخانی دەوەللوو کە فەرماندەی سەربازگەی ئیسفەهان بـوو ئـەم شـارەی چۆڵ کرد و بەرەو مازەندەران تێیتەقاند. هەڵبەت چونکە بـە وریـایی پێشـبینی

---

٤٨ ـ گوڵشەنی مراد، ل ٤٥ ـ ٤٦؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٦٤ ـ ٦٥ و Hovhanyants, 291. فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١١ و غەففاری، پێیان وایە فەرماندەی قاجاری پارێزەری ڕەوە، کەریمخانی بووربوور بـووە. (بڕواننـە: ل ٢ ـ ٩ و یادداشـتی ژمارە ٧٢). ناوچەی دوژمنزیاری کەوتۆتە باکووری ڕۆژاوای ئەردەکان.

٤٩ـ من نەمتوانیوە بزانم پردی دزەک لە کوێ هەڵکەوتووە.

٥٠ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٦٦. GD X, 24 July 1758; Malcolm, 131.

پاشەکشە و هاتنی سەرکردەکەیانی لە شیرازەوە کردبوو، لە ماوەی چەند ڕۆژاندا دەسوبردی نواندبوو. وەک گێڕاویانەتەوە سەرداری بوخاریباش و یارانی بەر لەم سەردەمەش لە وەختی پاشەکشەی شەڕ لەگەڵ ئازادخان لە پایزی ساڵی ١٧٥٦دا دژی ئەو پیلانیان گێڕابوو، بەڵام خانی قاجار کە لەو ڕۆژگارە تاڵوتوونەدا وازی لە ساز کردنی قینەبەری و دووبەرەکی نەبوو، حوسێنخانی ڕازی کردبوو کە دیسانیش یاریدەی بدا. بەڵام گۆیا ئێستا حوسێنخان لە خۆی ڕادەدی کە بتوانێ ئەستەرئاباد بگرێ و ڕەقیب بخاتە تەنگەژەی هێزەکانی شوێنگێڕی زەند و پیاوەکانی خۆییەوە. بەم بۆنەیەوە محەممەدحەسەنخان کاتی لە ئیسفەهان بە فیڕۆ نەدا و لەڕێوە بەرەو کاشان کەوتەڕێ. لەم شارەدا سەفەرعەلیخانی قۆیونلووی حاکمی پێی وەفادار مابوویەوە و دەیەویست بەر بە دووبەرەکینانەوەی حوسێنخان بگرێ[٥١].

## ٤ ـ ٧ پەیکەردەی محەممەدحەسەنخان هەتا مازەندەران

لە کاتی کشانەوەی لە شیراز، سەرداری قاجار تەتەرێکی ناردە لای محەممەدبەگی قوانلوو بەگەربەگی (سەرداری) مازەندەران و بارودۆخی خۆی بۆ ڕوون کردەوە و ڕایسپارد کە وا باشە سەبارەت بەو کۆمەڵە زۆرە ئەفغانییانەی کە پاش شکانی ئازادخان لە شاری ساری مابوونەوە یان خەریکی خزمەت بوون، بەر لەوەی بە ناجوامێری و ڕوووەرگێڕانی هاوولاتییانیان بزانن، لەم هەلومەرجەدا هەڵوێستێکی شایان و بەجێ بگرێ. لە ١٣ی جوولای ساڵی ١٧٥٨دا یانی پاش دە ڕۆژ ڕاسپاردەکەی گەیشتە محەممەدبەگ[٥٢]. ناوبراویش لەڕێوە یۆسفخانی هووتەکی و گەورەپیاوانی تر کە خەبەریان لە ڕووداوە

---

٥١ـ گوڵشەنی مراد، ل ٣٢؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢٩١. ناوی تەواوی سەرکردەی دەوەللوو محەممەدحوسێن بوو، بەڵام لە زۆربەی سەرچاوەکاندا کورتی دەکەنەوە و دەنووسن حوسێنخان تا لەگەڵ محەممەدحەسەنخان تێکنەچن. ئەم شێوەیەش لەم کتێبەدا وەبەرچاو گیراوە.

٥٢ـ گوڵشەنی مراد، ل ٣٧؛ سارەوی، ل ١٩ ب. ئەم دەقە مێژووی ئەو ساڵەیان بە ١١٧٢ نووسیوە، بەڵام بڕواننە یادداشتی ژمارە ٤٩.

پرشەرمەزارییەکانی شیراز نەبوو بانگهێشتە ناوەندی سەرکردایەتی و گرتنی.

هەلومەرجێکی ناسک بوو: چونکە بەگوێرەی نووسینی نامی، حوکمڕان تەنیا خاوەنی شێست حەفتا کەس چەکدار بوو لە سەربازگەدا و تێکهەڵچوون لەگەڵ هەزاران ئەفغانی دانیشتووی پارێزگای مازەندەران کارێکی دژوار بوو. تا دووڕۆژ دواتر کە هێشتا هەواڵی شکستی محەممەدحەسەنخان بڵاو نەبۆوە لەگەڵیان پێکهات. وەختایەک خەبەر هات کە تایفەی دەوەللو بە ڕێبەرایەتی حوسێنخان ڕاپەڕیوە و بەرەو فیرووزکۆ کەوتۆتەڕێ و تاقمێک ئەفغانیشی ڕەگەڵ کەوتوون، زیندانییەکانی یەک‌یەک هێنایە دەر. سەرەتا لە یۆسفخانەوە دەس پێکرا و ئەوشەوە هەر پەنجا زیندانییەکەی ئەسپاردەی دەسی جەللاد کرد. لەم کاتەدا هێزەکانی ئەفغانی و کەسانی تر بە مەترسییەکەیان زانی و دەستیان کرد بە سەنگەرگرتن و بەربەرەکانی. محەممەدخان چەکدارانی ڕۆژانی تەنگەتاوی بانگهێشت و وێڕای ئەم چوارهەزار کەس مازەندەرانییە بەرەوپێش تاوی دا و لە ڕۆژی دووهەمی هەڵمەتا ئەفغانییەکان کوژران و بە دیل گیران یان ماڵ و سامانیان بە تالان چوو و ڕایانکرد. پاشەوارەکانیشیان پەنایان بردە لێڕەواران و بەم شێوەیە مەترسی هەمیشە ئامادەی ئەفغانییان ڕەوی[٥٣]. بە بیستنی ڕووداوەکان حوسێنخانی دەوەللوو بە مەبەستی تێپەڕین لە ساری و پوولادمحەللە و هێرش بەرەو ئەستەرئاباد کە تایفەکەی چاوەڕوانی بوون، سەرنجی کەوتە سەر ئەو ناوچەیە. پاش بزووتنی ناوبراو محەممەدحەسەنخان بە خۆی و هێزی کەمی پێی نایە تاران. لە تاران وێڕای دووسێ‌کەس لە سەرکردەکانی ڕایکرد. فەتحعەلیخانی ئەفشار و شابازخانی دونبولی کە وەک میراتێک لە ئازادخانەوە درابوونە دەستی، ئێستا خۆیان بە ئازاد زانی و بۆ گرتنی خاکی ئازەربایجان بەرەو ڕۆژاوای ئێران باڵیان گرت. پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵی شکانی خانی قاجار سەربازگەی ورمێ لەپڕ تێکییەوەپێچا و چۆڵی کرد. لەم ڕۆژانەدا برایمخانی بوغایری(١٦) کە هیچ قازانجێکی لە خزمەت ئەفشار و قاجاران وەگیر نەکەوتبوو گەڕایەوە خاک و زێدی خۆی دامغان و چاوەڕوانی

---

٥٣ ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٦٧ ـ ٦٨؛ گولشەنی مراد، ل ٣٢؛ سارەوی، ل ١٩ب؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٥٤ ـ ٥٥؛ غەففاری دەڵێ محەممەدبەگ سەرۆکانی ئەفغانی بانگهێشتن کردبوو.

هێزە سەرکەوتووەکانی زەند مایەوە کە دەبوو پاشان سەریان وەبەربێنێ[٥٤].

محەممەدبەگی قوانلـوو و دوازدەکـەس لـە سـەرکردەکانی قاجـار بـە مەبەستی پاراستنی خۆیان لـە چنـگ تـالان و بـرۆی ئەفغانییـەکان، هێزێکـی ناوچەیی‌یان کۆکردۆتەوە. هەر زوویەکی لە عەلی‌ئاباد بە سپایەکی چەند هـەزار کەسییەوە خۆیان گەیاندە محەممەدحەسەنخان[٥٥] و هەتا ساری لەگەڵـی هـاتن. لێرە پێیانزانی کە حوسێنخانی دەوەللوو نەیتوانیوە کۆدەتای یوخاری‌باشەکان لە ئەستەرئاباد ڕێک بخا و ناچار بووە کە لەگەڵ یاران و خاوخێزان و ئەوەی وا لە خەزێنەکانی محەممەدحەسەنخان وەگیری کەوتووە بـەرەو دامغـان ڕابکـا و هاوار بەرێتە بەر برایمخانی بوغایری. ئەو کات محەممەدحەسەنخان توانی کـە سپای تازە کۆکراوەی لە مازەندەرانەوە بنێرێتە ئەستەرئاباد و ڕێکخسـتنەکانی پاراستنی ئەوێ ڕێکوپێک بکا و پاشان خۆشی بە هێزی سوارەیەوە بە مەبەستی تۆڵەکردنەوە لە محەممەدحوسێنخان کەوتەڕێ.

هێشتا ماوەیەک بە سەر گەمارۆی دامغاندا تێنەپەڕیبوو کـە کۆمەڵـێک هەواڵی تازە دەربارەی هێـزە بـەرچاوەکانی شێخاڵـی‌خـان کـە بـە فـەرمانی کەریمخان لە شیرازەوە چووبووە فیرووزکۆ، هاتە بەرگوێ. ئەگـەر هێزەکـانی زەند ڕاستەوخۆ پەلاماری «سـاری»یـان دابـا، محەممـەدبـەگ کـە زیـاتر(١٧) نیگەرانی مانی دەسەلاتی بوو، ڕەنگـە لەبـەر سـەودا و مامەڵـەیەک چووبایـە پێشوازییان؛ چما ڕووداوێکی وا قـەومابا، هـیچ هێزێـک ئەسـتەرئابادی ڕزگـار نەدەکرد. بۆیە دەستی لە گەمارۆی دامغان بەردا، پاش تێپەڕین بە کۆسـاراندا و بەر لەوەی زەندیە بچنە نێو ساری، بەڕێی پوولادمحەللـەدا، بـە پـڕتاو خـۆی گەیاندە ئەو شارە. گۆیا محەممەدبەگ پێشتر لە ساری ڕایکردبوو و شار بە دەس شـەڕوانان و هاوپـەیمانانی بـێوەفـا و خودبەسـەری خێڵـی قاجـار یـانی یەمووتەکانی تورکمان تووشی پاشاگەردانی هاتبوو. محەممەدحەسەنخـان کـە نەیدەتوانی بەر بە شالاوی ئەمانە بگـرێ، لەگـەڵ شـای دەسـتندەخۆری واتـە سمایلی سێهەم کە هێشتا لە ساری بوو، وێڕای تاقمێک لە غولامـانی وەفـاداری

---

٥٤ـ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ٦٩ ـ ٧٠؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٣٠٤.

٥٥ـ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ٧٠، باسی سێچوارهەزار چەکدار دەکـا؛ ناسـری، ل ٣٠٤ باسی شەشهەزار کەس دەکا.

ڕایکردە ئەستەرئاباد.

شێخاڵیخان کە ئێستا حوسێنخانی دەوەللوو و برایمخانی بوغایری بە مەبەستی دانەپاڵی لە دامغانەوە هاتبوون، بە کەیفسازییەوە هەواڵی خۆبەدەستەوەدان و سەروەبەرهێنانی محەممەدبەگ و زۆربوونی هێزەکانی غەیری قاجاری کە دەچوونە ڕیزی سپاکەی، پێگەیشت. بەگەربەگ وێڕای وەرگرتنی خەڵات و نازناوی خان لە سەر کاری خۆی مایەوە. لە بەرامبەردا بە مەبەستی ئەمەگناسی ئەویش ساری بە دەستەوە دا و سیخوڕی بە وڵاتەوە وەرکردن و ڕێی حەشارگەی یارانی محەممەدحەسەنخانی گرت و لەبەر دڵی سەرداری زەند کەوتە قەڵاچۆکردنیان. بە ڕەچاوکردنی سیاسەتێکی نوێی ئەوتۆ لە لایەن دەوەللووەکانی ڕوووەرگێڕاوی پشووی تازە وەبەرهاتووی خاوەن حاکمی خۆماڵی و بە پاراستنی یەکسانی بۆ هەموو لایەک، جگە لە گێرەشێوێنەکانی وەک تورکمان، شێخاڵیخان لەڕێوە بوو بە مەزنی مازەندەران و ئامادە بوو کە لە خودی ئەستەرئاباد مل بنێتە بەرملی سەرکردەی قاجار[٥٦].

## ٤ ـ ٨ پتەوکردنی بنەماڵەکانی دەسەڵات لە شیرازەوە تا تاران

سیاسەتی کەریمخان لە ماوەی گەمارۆی شیراز و دواتریشدا زۆری خێروبێر لێکەوتەوە. لە زەمانی یەکەم هێرشی سەرداری قاجار بۆ سەر شیراز لە هاوینی ساڵی ١٧٥٦دا، خانی زەند بە مەبەستی نزیکایەتی لە خەڵکی باژێر گەلێکی تاڵی و سوێری چێشتبوو. لە وەختی شەڕی شیرازدا وای دەنواند کە بەر لەوەی پاراستنی شاری بە مەبەستی ڕاگرتنی بنکە و ناوەندی سەرەکی سپاکەی بوێ، پتر پاراستن و باڵ بە سەرکێشانی جەماوەری شاری لەبەر چاوە و ئەم شوێنەی بە پایتەختی خۆی ناودێر دەکرد[٥٧]. ئەو ڕاکردووانەی کە لە دەس زوڵم و زۆری ئازادخان و محەممەدحەسەنخان لە ئیسفەهانی خاپوورەوە ڕوویان دەکردە ئەم شارە، خێرا ئۆگری دەبوون. قەڵەمی مەینەتباری نووسەری

٥٦ــ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٧٠ ـ ٧٢؛ گولشەنی مراد، ل ٣٨ ـ ٣٩، ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٥٦ ـ ٥٨؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٣٠٤.

47- GD VIII, 20 July 1765.

ڕاپۆرتەکانی بەندەرعەباس، لیستەیەکی سەبارەت بە شوولێهەڵکێشان و پیتاکی قــورس و گــرانی عــەلیمــەردانخــان، فەتحعــەلیخــان، ئازادخــان و محەممەدحەسەنخان هێناوەتە گۆڕ کە بە سەر ماڵــەکانی ئیسـفەهان و یـەزد و کرمان و شیرازدا سەپیبوون، بەڵام هەروەک لــە ســێ شــاری یەکــەمدا زۆر کــەم دیاردەی چەپەڵکاری کەریمخان وەبەرچاو دێ، لە بابەت شیرازیشــەوە واتــرە و زێدەڕەوی بەدی نــاکرێ. یــارانی تایبــەتی دەورانی نوشســتی وەکیـل چەشـنی شەڕکەرانی خشتی و کازروونی بەوپەڕی دڵاوایی خەلات دەکران. ئەو دوژمنانەی سەریان وەبەر دێنا دەیانتوانی بە بەخشین و بەزەی ئومێدوار بن. لــە نێــو ئــەم تاقمانەدا دەکرێ باسی ئەو ئەفغانییانە بێتە گۆڕ کە سپای قاجاریان جێهێشت و هاتنە پاڵ لەشکری زەندەوە و بەگشتی تــەواوی پــۆل و دەســتەکانی خۆماڵــی و ئەوانەی لە بەرەوڕوو بوونەوەی هێرشکەراندا هەڵوێســتێکی نادیاریــان بــوو، دەکەوتنە ژێر سێبەری ئەم بارودۆخــە. لەگــەڵ ئەمــەشدا وەک «نــامی» ڕوونی دەکاتەوە و باوەڕیشی پێدەکرێ خانی زەند لەم بابەتــەوە زیــاتر لــەوە نــەرمی نوانــد کــە بکەوێتــە پــێوشــوێنی خەڵــک و بــو ڕۆژی خــۆی ڕابردوویــان لەبەرچاو بگرێ و بزانێ کامەیان دوورەپەرێز ڕاوەســتاوە و کێهــەیان یارمــەتی خانی قاجاری داوە[۵۸].

دوو مانــگ ڕابــرد تــا شــار و پارێزگــا ڕێکخرایــەوە و ســپایەک بــە سەرکردایەتی شێخالیخان بە مەبەستی چاوەدێری بە سەر هێزەکانی پەیکەردەی دوژمن ئامــادە کــرا. ســەرەنجام لــە ئــاخرین ڕۆژی ساڵــی ۱۱۷۱ی کــۆچی / ۳ی سێپتامبری ساڵی ۱۷۵۸دا، کەریمخان بە سەرکردایەتی لەشکرەکەی لە شیرازەوە وەدەرکەوت. ئەم ماوەیەی کەریمخان لەوێ نەبوو، سادقخان کرایە بەگلەربەگی فــارس و پارێزگاکــانی ســەربەوێ. قۆشــەنی نێــردراو لــە «بــاغی دڵگوشــا»دا هۆردووبەزی کرد تا ڕێوڕەسمــی ڕۆژی عاشــوورا بەڕێوەبــەرێ و پاشــان ڕۆژی دوایی واتە ۱۱ی موحەڕڕەم / ۱٤ی سێپتامبر، بــەرەو تــاران کەوتــەڕێ[۵۹]. وەکیـل

---

۵۸ ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۷۲ ـ ۷۳.

۵۹ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیــە، ل ۷٤ ـ ۷۵؛ گوڵشــەنی مــراد، ل ۳۹ ـ ٤۰؛ فەســایی، بەرگی یەکەم، ل ۲۱۱.

هاوکات لەگەڵ پێشڕەوی لەشکر دیداری شارەکانی ئێرانی ناوەندی کرد هەتا جێی بەتاڵی حاکمی ئەو شوێنانەی لەبەر پاشەکشەی جووتەی ڕقەبەرانی کارەکانیان جێهێشتبوو بە کەسانێکی هەڵبژاردەی نێو ڕیزی یارانی خۆی پڕ بکاتەوە. کەریمخان بەر لەوەی لە ڕۆژانی ٦ ـ ٧ی مانگی دێسامبری ساڵی ١٧٥٨دا بچێتە کاشان دیداری لەگەڵ محەممەدحوسێنخانی دەوەللوو کرد. وەختایەک چەند ڕۆژ دواتر پێی نایە قوم، فەرمانی دا بە شێخاڵیخان کە شانبەشانی هێزەکانی حوسێنخانی دەوەللوو هێرش بکەنە سەر ئەستەرئاباد[٦٠]. لە نێوەڕاست مانگی دێسامبرا لە تاران بنەی داکوتا و چاوەڕوانی ئاکامی ئەم پەلامارە مایەوە.

## ٤ ـ ٩ شکست و مەرگی محەممەدحەسەنخان

محەممەدحەسەنخان لە وەرزی زستانی باراناوی ناوچەکانی لێواری دەریای خەزەر، لە ئەستەرئابادەوە کەوتەڕێ و بەرەورووی شاری ئەشرەف دەستی کرد بە سەنگەر دابەستن هەتا دەگژ هێزەکانی شێخاڵیخانی بنەگر لە ساری ڕۆبچێ. لەشکربیانی زەند لە مەودای سیمایلیڕا وەخۆ کەوتن و بزووتن و بەرەورووی پێشەنگی هێزەکانی بوونەوە. سەرەتا بە یارمەتی ئاگری تۆپخانە لەخۆوە هەوڵیان دا کە بەرەی پێشەوەی دوژمن تێکشکێنن و سپای قاجار لە مەتەرێزەکانیان دەرپەڕێنن. پاشان کە شەو داهات هێزەکانی زەند لە سەنگەرەکانیان نیزیک بوونەوە و ناوچەکانی گەڕانگەڕیان گەمارۆ دا و تەمایان گرت کە بە زەبری شەوانە و هرووژمی سواران، پارێزەران بەرەو دەروەشتان ڕادەن، بەڵام ئەم شێوازەش سەرکەوتنی بە شوێنەوە نەبوو. سەرەنجام شێخاڵیخان ڕێیەکی ئازایانەی گرتەبەر: لەشکرەکەی لەبەر هاتنی سەربازانی ئێلجاڕی کورد و ئەفغانی ڕقەوەن ئەوەندە بەهێز ببوو کە بتوانێ بە پاڵپشتی ژمارەی زیاتری چەکدارەکانی دەس بەرێ بۆ زەبرێکی پڕمەترسی، بۆیە لە

٦٠ـ گوڵشەنی مراد، ل ٤٢ ـ ٤٣؛ باوکی غەففاری سەرلەنوێ کرایەوە حاکمی کاشان و لە ماوەی دیداری تیژتێپەڕی وەکیل لە کاشان، خانەخوێی ئەو بوو.

تەنیشتەوە پەلاماری قۆڵی ڕاستی بەرەی قاجاری دا. ئەم لایە بەڕواڵەت نەدەگەیشتەوە تالاوەکانی لێواری دەریا و لە ڕێی سەختی کەنارەوە بەرەو ئەستەرئاباد بزووت. محەممەدحەسەنخان ناچارکرا کە بە پەلە سەنگەرەکانی پێشەوەی بە ڕێگای تەواو ئاسایی نێوخۆییدا چۆل بکا هەتا بتوانێ سەرقاڵی پاراستنی پایتەختی بێ کە بە باری پارێزگاریدا گیرۆدەی بارودۆخێکی شڕ و نالەبار هاتبوو.

گۆیا هەر بەهەڵکەوت بوو کە هێزەکانی هەردک لا بە شێوەی هاوتەریب لە مەودای چوارفرسەخی یەکتر دابەزیبوون. زەندیە لە ڕۆخی دەریا و سپای قاجار لە زەوی و زارەکانی گوڵباد جێگیر ببوون و تەنیا لێرەوارێک بە قوولایی فرسەخێک (شەش کیلۆمیترێک) مەودای خستبوونە نێوان. پێشقەرەوڵان و مەیتەرانی هەرکام پێیان نایە لەوەڕگای بندەستی ئەوی تر. چەند فیشەکیان بە یەکترەوە نا و کێشەیەکی تەواو بەهەڵکەوت بوو بە شەڕێکی ڕاستی و بەگەرمە. سپای قاجار شکستی هێنا و بە شڵەژاوی و ئاڵۆزکاوی بەرەو ئەستەرئاباد ڕەوی. شێخاڵیخان بۆ بەرپەرچدانەوەی خافڵگیرکرانی هێزەکانی و بە سەرنج دان بە بارودۆخی لۆژێستیکی لە خاکی دوژمندا، بەر لە هەر کردەیەکی مەترسیدار و گەمارۆیەکی ناوەخت گەڕایەوە ئەشرەف[٦١].

هێندەی پێنەچوو کە ئەم لەشکرلێکرانە بوو بە ئاخرین قۆناخی دوژمنایەتی نێوان دوو تیرەی یوخاریباش و ئاشاقەباشی خێڵی قاجار. پیاوانی حوسێنخان و محەممەدحەسەنخان هەرکام دەوری ڕێبەرانی خۆیان گرت. محەممەدحەسەنخان خێرایەکی بە مەبەستی بەهێزکردنی سپاکەی داوای یارمەتی لە تیرە و تایفەکانی خوراسان و دەشتی قەپچاق کرد. وەلیخان و نەجەفخان بە دەهەزار چەکداری کوردی شادلوو و نیزیکەی چوارهەزار شەڕکەری تورکمانەوە چوونە هانای. سوارانی قاجاری لایەنگری و تفەنگچییەکانی ئەستەرئابادی شانیان وە شانی دا و لەشکرەکەی تا هەژدەهەزار کەسێک پێهەڵچوو، بەڵام لەبەر هۆکاری نەهێنی و هەمیشەئامادەی خۆفرۆشی

٦١ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٨٠ ـ ٨٣؛ ڕەوزەتوسسەفا، بەرگی ٩، ل ٥٩ ـ ٦٣؛ گوڵشەنی مراد، ل ٤٦؛ بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی سپا، بەرگی ٣، ل ٢٣٩، لە بابەت «گوڵباد»ەوە.

ئالۆزکاوییەک لە نێو لەشکرەکەیدا سەری هەڵدا، پاشماوەکانی هێزەکانی بوخاریباش لە لایەن محەممەدوەلیخانی دەوەللوو و براکەیەوە سەرکردایەتی دەکران. محەممەدحەسەنخان بەدزی ئەمای گرت کە تۆوی دووبەرەکی لە نێو تاقمە ڕقەبەرەکانی قاجار بچێنێ و لێکیان بترازێنێ هەتا خۆی لە تێکهەڵچوونی ڕاستەوخۆی ڕقەبەران قوتار بێ.

بە مەبەستی بە ئەنجام گەیاندنی ئەم بیرە سەبزعەلیخانی شامبەیاتی(١٨) ئاشاقەباشی بانگهێشتە ئەستەرئاباد کە پاڵی وەپاڵی بدا. ئەم پیاوە، محەممەدوەلیخان یان باوکی، بابیان کوشتبوو و تا ئەم سەردەمە لە دەشتی قەپچاق بۆ تۆڵەکردنەوە خۆی مەلاس دابوو. سەبزعەلیخان لە ئەستەرئاباد زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکرا. یوخاریباشەکان ئێستا لە نێو ڕیزی پیاوانی پارێزەری خاندا ڕەنگە خەریکی پیلان یان دژەکۆدەتایەک بووبن، بەڵام محەممەدحەسەنخان مەودای نەدا و یەکەم زەبری وەشاند: سەبزعەلی لەگەڵ تاقمێک لە پیاوەکانی ئامادەی وەدیهێنانی ئامانجەکەی بوون. محەممەدوەلیخانی دوژمنی بابەکوشتەی وی بانگ کردە بنکەی خۆی. بەڕواڵەت دەیەویست سەبارەت بە کاروباری شەڕ پرسوڕای پێبکا. وەختایەک کە خێوەتی دانیشتنەکەیان کەوتە بەر پەلاماری سەبزعەلیخان، خۆی لەوێ دەرکەوت و محەممەدوەلیخان و هاوڕێیانی تەختی زەوی کران. زۆربەی چەکدارەکانی کوژران یان گیران، سامانی بەرچاویان بە تاڵان ڕۆیی و خۆشیان تێداچوون. ماڵیان وەک خەنیمەت درایە دەس کوردەکانی هاوپەیمانی محەممەدحەسەنخان و یارانی تری[٦٢].

پاش پاکتاوی ئەستەرئاباد محەممەدحەسەنخان بە مەبەستی ئاکام وەرگرتن و تەفروتونا کردنی شێخاڵیخان لە ئاخری مانگی ژانویەی ١٧٥٩دا، لەگەڵ سپاکەی لە ئەستەرئاباد وەدەرکەوت. ئاشکرایە کە محەممەدحەسەن پێیخۆش بوو هێزی زەند پێشڕەوی بکا و وەک ساڵی ڕابردوو گەمارۆی شووره و

---

٦٢ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٨٠ ـ ٨٣؛ ڕەوزەتوسسەفا، بەرگی ٩، ل ٦٣ ـ ٦٤؛ گوڵشەنی مراد، ل ٤٦ ـ ٤٧؛ نامی لەبری سەبزعەلیخان نووسیویەتی شێرعەلیخانی شامبەیاتی. ئەم بەرەبابە لە تایفەی بەیات و یەکێک لە تۆرەمەکانی خێڵی قاجار بوو؛
c f . Summer, ((Bayat, )) E i2 1, 1117, XXIII.

مەتەرێزەکانی بدا هەتا بە یارمەتی پارتیزانانی تورکمان و پەلاماری چەکدارانی قاجار دەستەشکاویان بکا و ڕێگای پەیوەندییان لێبگرێ؛ بەلام شێخاڵیخان زیرەکانە لە ئەشرەف نەبزووت و چاوەڕوانی هاتنی هێزی پشتیوانی کەریمخان مایەوە کە لە تاران دابەزیبوون. محەممەدحەسەنخان دەیەویست بیهاڕووژێنێ هەتا بەر لە هاتنی هێزی یارمەتیدەر شەڕ هەڵگیرسێنێ. بۆیە ئەوەندەی بۆی دەلوا بە ئارامی پێشڕەوی دەکرد. کەم و زۆر لەشکرەکەی ڕۆژێ فرسەخێکی دەبڕی، بەلام شێخاڵیخان وەسەر خۆی نەدێنا؛ تەنیا وەختایەک فەرمانی بزووتن و پێشڕەوی و دەسپێکی شەڕی دا کە سپای قاجار دووحەوتوو دواتر تا دوو مایلی شاری ئەشرەف کوتابوویان. دەریا و لێڕەوار پەنا و پەرژینی دووقۆڵی لەشکر بوون.

بەرەبەیانی ١٤ی فێورییەی ساڵی ١٧٥٩، شەڕ هەڵگیرسا. سپای قاجار بە ژمارە کەمتر بوون لە لەشکری زەند و چەکدارانی ئەفغانی، یانی بە حیسێب کردنی بەکرێگیراوانی کوردیش تەنیا دەبوونە دوو لە سەر سێی هێزی دوژمن، کەوایە بەختی سەرکەوتنیان دووری دەنواند: کوردەکان کە کەوتبوونە قۆڵی چەپی سپا(١٩) لە بەرامبەر هێرشی هێزەکانی شێخاڵیخاندا ڕایانکرد، سەرداری قاجار کە لەگەڵ سوارەکانی تایفەی خۆی و دەستەیەک پیادە مابۆوە، دەستی کرد بە پاشەکشە، چونکە ئیتر نەیدەتوانی لەوە زیاتر خۆی ڕابگرێ. بەناچار بەرەو ئەستەرئاباد ڕایکرد. لە مەودای ڕێگای هەڵتەکاوی قەراخی دەریا کە شاعەباسی گەورە لێیدابوو، تاقمێک سواری زەند کەوتنە شوێنی. چەند کەسێک لە نۆکەرانی غەیانی قاجار بە سەرکردایەتی محەممەدعەلی دەوەللوو(٢٠) برای حوسێنخان و سەبزعەلی کورد ئەم تاقمەیان ڕێنوێنی دەکرد. وەختایەک گەیشتنە سەر ڕاکردووان پردی ڕووخاو ناچاری کردبوون کە ڕەوگەی خۆیان بگۆڕن بۆ نێو قوڕ و زەلەقی تەنیشت لێڕەوار و قەراخ ڕێگا. ئەسپی محەممەدحەسەنخان لەم شوێنە سەرسمی دا و سەبزعەلی کورد بە زەبرێک تێکیگلاند[٦٣].

---

٦٣- گیتیگوشا، ل ٤٥ - ٤٧؛ گوڵشەنی مراد، ل ٤٧ - ٤٩؛ سارەوی، ل ٢٠؛ ڕەوزەتوسسەفا: بەرگی ٩، ل ٦٤ - ٧١؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٣٠٥؛ تاریخی ئێران، مێلکۆم، ل ١٣٢.

## ٤ ـ ١٠ گیرانی ئەستەرئاباد

بەم شێوەیە مەترسیدارترین و کەللەڕەقترین و خۆڕاگرترینی ڕکەبەرانی کەریمخان تۆماری تەمەنی پێچرایەوە. لە بابەت سەرداری قاجارەوە گەلێک دیمەن و کردار و ئاکار جێی ئافەرین وەبەرچاو دێ. توانایی سیاسی و لەشکری و کەسایەتی و دڵاوایی و دووربینی و تەنانەت سڵ نەبوونەکەی کە قەت نەیهێشت بکەوێتە گێژاوی ڕقەوەنی، شیاوی هەڵوێستە کردنە. لە سەریەک سەرەڕای تەواوی ئەم دیاردە و نیشانانە بەپێچەوانەی ڕقەبەری زەندی ئاکامێکی وەدەس نەکەوت. وەک گوتوویانە ئەم دوو کەسە بە چاوی ڕقەبەرێکی بایخدار لە یەکتریان ڕوانیوە. ڕۆستەمولحوکەما وێڕای نووسینی بابەتێک سەبارەت بە شەڕی قومشە دەڵێ سەرۆکی قاجار ڕایگەیاندبوو هەرکەس کەریمخان بە زیندوویی بگرێ خەڵاتی دەکا. دەقودۆغر گوتبووی نە کەس دەرەقەتی کەریمخان دێ و نە کەسی لێ ئازاترە[٦٤]. ئەم مەبەستەی کە بۆچی محەممەدحەسەنخان بە پووڵ و ماڵی خۆی دیلانی زەندی لە یارانی تورکمانی کڕیبووە کە وەک خەنیمەت فرۆشتبوویانن، هەمیشە جێی باس و سەرسوڕمان بووە.

وا وێدەچێ کە ئۆگری کەریمخان سەبارەت بە سەرداری قاجار بگەڕێتەوە سەر ئەو چاکانەی لەگەڵی کراوە. بەڕاستی لە توێژینەوەی بەسەرهاتی زنجیرە سەرکردە بەهێزەکانی تایفەی قاجار: محەممەدحەسەنخان، حوسێنقوڵیخان و ئاغا محەممەدخانا کە بوو بە پاشا، ئادەمیزاد تەنانەت بە خوێندنەوەی بەرهەمی نووسەرانی قاجاری کە باسی ڕووداوەکانی مەودای نێوان ڕووخانی حکوومەتی سەفەوی و هاتنە سەردەسەڵاتی قاجار دەکەن لە ساڵی ١٧٩٦دا، وای لێدێ کە لەگەڵ ئەم قەڵەمبەدەستانەی دەرباری لە بابەت داوەری سەبارەت بە نارەسەنی بنەچەکەی خانەدانی ئەفشار و زەند، سەرەڕای بوونی ڕێبەرانی هەڵکەوتەیان، یەکدڵی بنوێنێ. هەروەها وا بزانێ کە ئەوان لە ساڵی ١٧٣٠ڕا داگیرکەری پاشایەتی ئێران بوون کە نەیانتوانی درێژە بە فەرمانڕەوایەتی خۆیان بدەن. فەتحعەلیخان ئەگەرچی هەر توانی ماوەیەکی کەم حکوومەت بکا،

٦٤ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٢٧٦.

بەڵام بەڕاستی چی وای لە نادرشا کەمتر نەبوو. محەممەدحەسەنخانی کوڕی پیاوێکی تەواو و وێدەچێ جێنشینێکی درەوشاوە بووبێ؛ پاش نەمانی عادڵشا، ئاغامحەممەدخان کە خۆڕاگرتنی لە ژێر باری قورسی یەختەکرانی بە لاوە دژوار بوو و دیلایەتی ساڵانی دواییش تەواوێک ڕووح و ڕەوانی ڕووشاندبوو، تووشی ڕقەوەنییەکی نابەرپرسیارانە هات؛ مردنی فەتحعەلیشای (دووهەم) لە ساڵی ١٨٣٤دا دیمەنی تێپەڕینی سەدەیەک فەرمانڕەوایەتی پڕشنگداری قاجار و هاتنی نیزیک سەدەیەک فەرمانڕەوایەتی تری داهاتووی ئاشکرا کرد.

بەڵام هات و نەهاتەکانی مێژوویی چەشنی چۆلگەیەک وان. سەری براوی خانی قاجاریان پێشکەشی شێخالیخانی زەند کرد، ئەویش سەرەکەی نارده خزمەت کەریمخان لە تاران. بە دوور لە سەرسوڕمان، بەگوێرەی نووسینی تەواوی سەرچاوەکانی مێژوویی، خانی زەند بە داخ و کەسەرەوە گوتی کە قەت ڕازی بە مەرگی دوژمنێکی ئاوا لێوەشاوە نەبووە کە دەیتوانی وەک سەردارێکی مەزن خۆی بنوێنێ و ڕووداوەکەی پێناخۆشە، پاشان بە دەستی خۆی سەری خوێناوی و قەتماغەبەستووی شۆردەوە و گوڵاوی پێداکرد و ناردییەوە ئەستەرئاباد(٢١) هەتا لەگەڵ پاشماوەی لاشەکەی لەوێ بینێژن[٦٥].

وەختایەک هەواڵی ئەم مەینەتە گەیشتە ئەستەرئاباد، محەممەدخانی قوانلوو کە وەک حوکمڕانی ئەو ناوچەیە لەوێ حکوومەتی دەکرد، وێڕای کوڕەی گەنجی سەرداری قاجار یانی ئاغا محەممەدخان هانای بردە بەر دەشتی قەپچاق کە پەناگای هەمیشەیی سەرۆکانی قاجار بوو. پیاوانی یوخاریباش کە خۆیان شاردبۆوە یان گیرابوون لەم ڕۆژانەدا بۆی قوتار بوون و دەستیان کرد بە کوشتن و تاڵان و وێرانی و داگیرکردنی زەویوزار و دارایی ئاشاقەباشەکان. هاوکات

---

٦٥ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٨٧ ـ ٨٨؛ گوڵشەنی مراد، ل ٤٩؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٦٩ ـ ٧٠؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٠٥. غەففاری پێیوایە کە سەرە براوەکەی ناردۆتە مەرقەدی شاعەبدولعەزیم لە شاری ڕەی؛ ڕۆستەمولحوکەما دەنووسێ کە لە مەرقەدی ئیمامزادە قاسم لە یەک فرسەخی تاران نێژرا. بە بڕوای مەنشووری قاجارییەکان (مەنسووری، خواندنیها، ژمارە ٥٥، ل ٢٨) کەریمخان کەللە سەری بۆگەنبووی بە ئیشتیاوە هەڵمژی و سوێندی خوارد کە هیچ عەترێک بۆنخۆشتر نیە لە بۆنی کەلاکی دوژمن.

لەگەڵ ئەم ڕووداوانە شێخاڵی‌خانیش هاتە نێو شاری تەواوێک چۆڵوهۆڵ و لە قەڵای حکوومەتی بنەی دانا هەتا چاوەدێری بە سەر ڕاگواستنی ماڵ و دارایی دوژمنا بکا. ئەم کارە بوو بە هۆی کوژران و گیرانی جەماوەرێکی زۆر. سەرەنجام پاش تێپەڕینی حەوتوویەک ماڵ و سامانی تاڵان‌کراوی قاجاریانی بەرەو تاران بەڕێ‌کرد و حوسێن‌خانی دەوەللوو وەک بەرپرسی پاکتاوکردن و هێمنایەتی مایەوە. شێخاڵی‌خان پاش گەڕانەوەی لە ئەستەرئاباد و چوونی بۆ تاران، بەرەوڕووی پێشوازی سەرکەوتووانەی وەکیل بوویەوە[٦٦]. ئەستەرئاباد چۆلی کرد، ماوەیەک پاش تۆڵە ئەستاندنەوە لە زۆربەی ناوچەکانی مازەندەران و شاڵاو بۆ سەر پیاوانی ئاشاقەباش، سێبەری ترس و تۆقین هەموو شوێنێکی داگرت. لەم کاتەدا کە زەندیە هۆش و فکریان تەواو کەوتبووە سەر ڕۆژاوای ئێران[٦٧]، وازیان لە ئاشاقەباشەکان هێنا کە لە بەرامبەر ڕقەبەراندا دەس‌بکەنەوە(۲۲).

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

۱ـ ئەگەرچی زۆربەی مێژوونووسان ئاژاوە و شێواوی نێو سپای کەریم‌خان لە ئیسفەهان بە تۆف و بەندی زستان و هەڵگرانی جەماوەری ناوچەکانی گەرمەسێرییەوە دەبەستنەوە، بەڵام بەگوێرەی نووسینی «نیبوور» خۆفرۆشانی سەر بە دوژمن گەلێک بەڵێنی و دەمچەورانەیان دا بە سەرکردەکانیان و بارودۆخەکەی پێ ئاڵۆزکا.

۲ـ کەززاز کە قەدیم پێی‌دەگوترا فایق، کەوتۆتە باشووری شاری ئەراک. ناوچەیەکی شاخستانییە و سەرچاوەی ڕووباری «شەرا» یان «قەرەشوو»

---

٦٦ـ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ۸۸؛ گوڵشەنی مراد، ل ۵۰ ـ ۵۱؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ۹، ل ۷۲؛

Hovhanyants (291) asserts that karim replaced Shaykh - Ali from Astarabad for fear that might rebel, an idea which in view of later development (6.2) is not to be rejected out of hand.

٦٧ـ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ۹، ل ۷٦.

لەوێیە. قەڵای فەرزین لە کەززاز بووە و ناوچەی «قەرەکەرێز» کە بەشێک لە شاری ئەراکی تێدا هەڵکەوتووە بە ناوچەیەکی کەززاز دادەندرا. سنجان گوندێکە و لە پەنا ئەراکە.

٣ـ لە نێو خوازیارانی تاج و تەختی پاشایەتیدا کەسێک بە ناوی شاسلێمانی کوڕی شاتۆماسب نەبووە. ئەگەر مەبەست شاسلێمانی دووهەم بێ، ئەو کوڕی میرزا داود و خوشکەزای شاتۆماسبی دووهەم بووە. تەنیا کەسێکی کە بە ناوی شاتۆماسبەوە ڕاپەڕی، حوسێنمیرزای ناسراو بە سوڵتانحوسێنی دووهەمە کە حەوت مانگ ناوی شای لە خۆی نا.

٤ـ ئەمیر گۆنەخانی ئەفشاری ئیرلووی تارۆمی یەکێک بوو لە سەرکردەکانی نادر و لە چەند هەڵکەوت و ڕووداواندا کەوتە نێو شۆرش و تەقە و لێکدانەکانی ڕۆژاوای ئێران. لە ساڵی ١١٦٩ی کۆچیدا، لە لایەن محەممەدحەسەنخانەوە کرایە حاکمی ئیسفەهان. پاش ماوەیەک چووە نێو ڕیزەکانی سپای ئازادخان و فەتحعەلیخانی ئەفشار و بە نووسراوەیەک لەگەڵ کەریمخان قەراری دانابوو تا سپاکەی لە داوێنی شارەوە بێنێتە ژوور. ئەمیرگونەخان پاش مەرگی وەکیلیش لە خزمەت ئەم خانەدانە دابوو، بەڵام پاش ڕاکردنی جەعفەرخان دەستی لێبەردا.

٥ـ قەڵای حاجی توغیان کەوتبووە فەراهان و ئەم کچە چەند ساڵان سەرۆکایەتی قەڵەمڕەوی باوکی لە ئەستۆ بوو، بەڵام ئاخرییەکەی لە هێرشی لەشکری عوسمانیدا کوژرا.

٦ـ موکری (موکریان) ناوچەیەکی پان و بەرینە و شارەکانی نەغەدە، شنۆ، پیرانشار، سەردەشت، مەهاباد و بەشێک لە خاکی بانە و سەقز لەخۆ دەگرێ. دانیشتووانەکەی سوننیمەزەبن و هۆز و تیرەکانی مەنگوڕ، مامەش، پیران، گەورک، دێبوکری و فەیزوڵلابەگی لێ نیشتەجێن. مەهاباد بە ناوەندی موکریان ناسراوە. (بەناچار تێبینییەکانی ڕێزدار «ساکی»م ڕاستەوپاستە کرد و چی پێویست بوو پێوەم زیاد کرد ـ وەرگێڕ).

٧ـ تالش ناوچەیەکە لە باکووری ئێران، بەڵام تالش شوێنی تایفەی لەمێژینی «کادووس»ە و خوالێخۆشبوو کەسرەوی پێی وایە تالش گۆڕدراوی وشەی «کادووس»ە. تالشی و «گیل» یەک نین.

۸ ـ کازمخان سەرەتا یەساولی نادرشا و پاشان داروغەی نووسینگەی تایبەتی بوو. وەختایەک پاشای ئەفشار چووبووە شەڕی لەزگییەکان لە کازمخان بەرقداچوو و کوێری کرد. لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەمیرئەسلانخاندا لە ئازەربایجان سەر بە وی بوو، ماوەیەک دواتر کە ئەمیری ناوبراو شکستی هێنا لەگەڵی رایکردە چیا. سارۆخان لە بانگێشتنێکدا ئەمیرئەسلانخان و براکەی گرت و داینەوە دەس دوژمن. برایمیرزا ئەم دووکەسەی کوشت.

۹ـ بیجار ناوەندی ناوچەی «گەڕووس»ە و کەوتۆتە نێوان قەیدار و ماهنیشانی زەنجان، تیکابی مەراغە، دیواندەرە و قوروەی کوردستان و میهرەبان و کەبوودەرئاهەنگی هەمەدان. سێ چۆمی گرینگ لە خاکی گەڕووس دینەخوار. بیجار یەکێک لە بەرزترین شارەکانی ئێرانە. (وشەدانی دێهخودا)

۱۰ـــ لە مێژووی فەرمانڕەوایانی کوردستاندا کەسێک بە ناوی سەلیمپاشای ئەردەڵان کە هاوچەرخی ئەم قۆناخە بێ نەبووە. ڕەنگە نووسەر مەبەستی سلێمانپاشای بەبە بێ کە لە لایەن کەریمخانەوە حوکمڕانی شارەزوور بوو، بەڵام ئازادخان لە چوونە سەردەسەڵاتی سەلیمپاشای بەبە و وەرگرتنی حکوومەتی ئەردەڵان یارمەتی دا و مەبەست سەلیمپاشای بەبەی دانیشتووی ئەردڵانە.

۱۱ـ ئازادخان پاش دەرکەوتن لە ئێران سەرەتا چووە شارەزوور و لەوێشەوە وێڕای خاوخێزانی ڕووی کردە بەغدا و سەرەنجام لەوێشەوە بەرەو تفلیس باری کرد. هەوڵەکانی ئازادخان پاش چوونە دەرەوە نەزۆک مانەوە، چونکە فەتحعەلیخانی ئەفشاریش لە ئازەربایجان پشتی تێکرد و داوای سەربەخۆیی دەکرد. تەواوی سەردارانی پێشووی ئازادخان چوونە پاڵ فەتحعەلیخان.

۱۲ـ قاسملووەکان لە تیرەی ئەفشارن و دانیشتووی قەڵاکانی میاب، کەبکان، دەستجێرد، نەوخەندان، جەژنئاباد و دەرەگەزن (خێڵەکانی دانیشتووی دەرەگەز).

۱۳ـ لە سەرچاوەکانی ئێرانیدا هیچ شتێک سەبارەت بە خەیانەتی سەفەرعەلیخان وەبەرچاو نەهاتووە. سەفەرعەلیخان وەختی گەمارۆی یەزی لەگەڵ سەرکردەکانی تر لە لایەن هێزەکانی ئازادخانەوە بە دیل گیرا و نێردرایە

ئازەربایجان. ئەو و شوکرعەلیخانیش لە ڕاکردنەکەدا دەورێکی بەرچاویان گێڕا و ئەمیرعەلەمخانی بەو دەمانچە کوشت کە حەشاری دابوو.

١٤ـ ئەبولقاسم سەرکردەی زێرەوانانی محەممەدحەسەنخان و سەرۆکی میرغەزەبانی بوو.

١٥ـ سەبارەت بە ڕاکردنی هۆردووی قاجار «نیبوور» لای وایە کە کەریمخان بە دانی بەرتیل لەبەریەکی بلاو کردن.

١٦ـ برایمخانی بوغایری لە زەمانی کوژرانی نادرشا و حکوومەتی جێنشینەکانی و هێرشی ئەحمەدشا و شەڕەکانی محەممەدحەسەنخان و سەردارانی دیکەدا لە قەومانی ڕووداوەکانی مێژووی ئێراندا دەوری گێڕا. سەرەنجام لەگەڵ محەممەدحوسێنخانی قاجاری دەوەللوو یەکی گرت و دەگەڵ محەممەدحەسەنخان ڕاچوو. ماوەیەک لای ئازادخان مایەوە و هاوپەیمانی بوو. ئاخرییەکەی پاش ڕاکردنی ئازادخان، لای دایە لای کەریمخان و ئێستاش دەیەویست دژی کەریمخان وەخۆ کەوێ. ڕۆستەمخانی عەمارلوو بە پیلانەکەی زانی و شێخمراد و کاکاخانی زەند لە میوانداری و بەزم و ڕابوارنێکی کەریمخاندا کوشتیان.

١٧ـ لە مێژووی قاجاردا دوو محەممەدخان و محەممەدبەگ هەن کە زیاتر بە مەبەستی خۆپاراستن لە هەڵە، محەممەدخانی قوانلووی ئامۆزای محەممەدحەسەنخان پێیدەگوترێ محەممەدخانبەگ و محەممەدخانی دادوێی سەوادکووهی بە محەممەدبەگ ناودێر دەکرێ. لەم ڕۆژگارەدا محەممەدخانی قوانلوو حاکمی مازەندەران بوو و بۆچوونی ڕێزدار پێری لە بابەت دڕدۆنگی محەممەدحەسەنخان سەبارەت بە خەیانەتی ئەو هەڵەیە و هەروەک ئاشکرایە محەممەدخان هەتا ئاخری عومری بە بنەماڵەی محەممەدحەسەنخان وەفادار بوو.

١٨ـ لە تێکهەڵچوونێکی تایفەییدا محەممەدوەلیخان باوکی سەبزعەلیخانی شامبەیاتی کوشت و ئاگرێک لە نێوان ئەم دوو بنەماڵەیە هەڵگیرسا. نامی و هیدایەت دەنووسن کە محەممەدوەلیخان خۆی باوکی سەبزعەلی کوشتبوو، بەڵام ناسیخوتتەواریخ باوکی محەممەدوەلیخان بە بکوژ دەزانێ. سەبزعەلیخان لە ترسی سەرداری دەوەللوو نەیدەوێرا بێتە نێو سپای

محەممەدحەسەنخان، بەڵام بە مەبەستی گێڕانی پیلانەکە دڵنیا کرایەوە.

۱۹ـ دەهەزار کەس لە کوردانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران (خوراسان) بە سەرۆکایەتی نەجەفخانی کوردی شادلوو لە خزمەت سەرداری قاجاردا خەریکی ڕاپەڕاندنی ئەرکی لەشکری بوون.

۲۰ـ ئەم کەسە ناوی محەممەدعەلیئاغا بوو و بە زەبری شمشێر محەممەدحەسەنخانی چەقیوی نێو قوڕوقاڵی متەقمردوو کرد. ئەم شەقە جۆگەی کە پردەکەی پسابوو و ڕێی پەڕینەوە و ڕاکردنی محەممەدحەسەنخانی بەست، شەقەجۆی «مەلاساقان»ی نێوان ئەشرەف و گوڵباد بوو.

۲۱ـ خودی نووسەرانی دەورەی قاجارییە لە نووسراوەکانیاندا باسی ڕێز و کرنۆشی کەریمخان دەکەن سەبارەت بە سەری براوی دوژمن، بەڵام وەک دیارە نووسراوەکان جاری وایە یەکتر ناگرنەوە. بەگوێرەی دەقی نووسراوی ڕۆستەموتتەواریخ محەممەدحەسەنخان لەبەر ساڵگاران بیابانگەردی مووی سەری وەریبوو و کاکۆڵی نەبوو، کەچی باسی شانەکرانی سەری لە لایەن کەریمخانیشەوە لە گۆڕێ دایە.

۲۲ـ یوخاریباشەکان لە ماوەی دەسەڵاتی چەند ساڵەیاندا، سامانێکی چاکیان وەسەر یەک نابوو کە هەمووی درا بە کوردان و هاوپەیمانانی تر. زۆربەی دیلەکانی ڕانەگوێزراوی ناوچە کوژران و تەنیا کەسانێک لە مەرگ خەلەستن کە لای حوسێنخان بوون، بەڵام هەر ئەم کوشتارە بوو بە هۆی سڵبوونەوەی زیاتری بەکرێگیراوانی کورد و تازە متمانەیان بە خانی قاجار نەما.

# ٥

# ئەفغانییان و ئەفشارییان

## ٥ ـ ١ قەڵاچۆکرانی ئەفغانییەکان

لە ماوەی چەندساڵی ڕابردوودا زنجیرەیەک هەڵمەت و شاڵاوی نەپساوە لە لایەن هێزەکانی زەند و قاجار و ئەفشار و لایەنگرانیان ڕووی دابوو. محەممەدحەسەنخان بەدڵ پێیخۆش بوو کە چالاکی و دەسوەشاندنی شەڕێکی بێنێوبڕ ڕێوڕاست لە مەودای زستانا درێژەی هەبێ، بەڵام ئاخرییەکەی کەریمخان و سەرکردەکانی پێشاوبڕەیان دایەوە، بە چەشنێک کە سەرەتای بەهاری ساڵی ١٧٥٩ی زایینی هەم سەرکەوتوو و هەم تێشکاوی ماندوو و نیگەران، خوازیاری خولێک تەقەوەستان و دەسڕاگرتن بوون. کەریمخان بە وەگیرهێنانی شاسمایلی سێهەم لە ساری دیسانیش توانی کە جێژنێکی شایانە لە تاران ساز کا و توانایی کاروباری لەشکری خۆی بنوێنێ و هێزی وەبەربێنێ.

هێشتاش لە نێو تایفەی قاجاردا ملنەدان و خۆڕاگری نەهێنی هەست پێدەکران کە دەبوو بنەبڕ بکرێن: هێندەی پێنەچوو کە شێخاڵیخان لە مانگی مارسا لە ئەستەرئابادەوە بانگ کرایەوە و زەکیخانی وەک سەرکردە نارده سەر

ڕەفیعخانی قاجار[1]. ناوبراو برای حوسێنخانی دەوەللووی کۆچکردوو بوو کە لە نێوخۆ و دەورویەری ئەستەرئاباد تاقمێک پشتیوانییان لێدەکرد و بە مەبەستی بەربەرەکانی هێزی گچکەی یارمەتیدەری زەکیخان دەرکەوتبوو. زەکیخان وای دانا سەرەتا بچێتە سمنان و شووره و دیوار و مەتەرێزەکانی دابەستێ، بەلام وا دیارە سەرهەلدانی ئەم ڕاپەڕینە لەنەکاو تا هاوینی سالی ١٧٦٠ بە خۆیەوە خەریک کردبوو[2].

خالە مەترسیدارەکانی داهاتووش کەموزۆر دیاری کرابوون: ئازادخان هەروا لە ئێراقی عوسمانی بنەی داکوتابوو و سەرقالی نۆژینەوەی یارانێک بوو لە نێو هۆز و خێلاتی کوردستان و ئازەربایجاندا[3]. فەتحعەلیخان و شابازخان هێشتاش دەسەلاتداری ورمێ بوون، بەلام وا وێدەچوو کە دەبوو ئەفغانییەکانی دانیشتووی مازەندەران بە مەترسی سەرەکی دابندرێن.

لە ماوەی قۆناخی دوازدەسالەی پاش کوژرانی نادر بوونی مەترسییەکی ئەوتۆ هەمیشە هەست پێدەکرا، چونکە تاقم و دەستەکانی ئەفغان و ئۆزبەکی سپای نادری بە هەموو ناوچە و مەلبەندەکانا بلاو ببوونەوە. پۆلێک چوونە پال ئەحمەدشا کە بەرەو قەندەهار ڕۆیشتبوو و بناغەی ئیمپراتۆرێتی خۆی ڕۆنابوو. تاقمێکیش لە دەوری ئەو پۆلە چەتە و ڕێگرانە کۆببوونەوە کە دواتر بنەمالەی پاشایەتییان لە ئێران دامەزراند و بەرچاوترینی ئەم گەردەنکەشانە ئازادخانی هاوولاتییان بوو. پاش ڕاکردنی سالی ١٧٥٧ی ئازادخان لە ئازەربایجان، ئەم کەسانە دەست و مەچەک و شمشێری خۆیان بە محەممەدحەسەنخانی قاجار فرۆشت و بوونە بەکرێگیراوی و پاش مەرگی ئەویش لە شیراز و ساری دایانە پال کەریمخان. ئێستا تەواوی شەڕکەرانی بە بێگارگیراو و خێزانەکانی ئەفغان لە مازەندەران دەژیان. پاش بەهێز بوونی سەرکەوتووانەی زەندیە لە فارس و ئێراقی عەجەم و دەسبەردانەوە و ملشۆڕ کردنی تایفەی قاجار، تازە مانەوەیان

---

١ـ گولشەنی مراد، ل ٥٣؛ ڕەوزەتوسسەفا، بەرگی ٩، ل ٧٢. نەدرخانی زەندی بە جێنشینی شێخالیخان داناوە.

٢ـ گولشەنی مراد، ل ٥٣. GD XI, 29 July 1760. ڕەفیعخان بەئاشکرا دژی زەندیە ڕاپەڕی، بەلام لە «قەرەچەمەن»یش بە لایەنگرێتی ئەوان شەڕی کردبوو.

3- M A E Perse XIII, NO . 3; GD XI, 30 April 1760.

چ پێویست نەبوو، بەڵکوو تەنیا نیشانەیەک بوون لــە شــەرمەزاری و ڕاڕایــی و بێوەفاییەکانی ڕابردووی ئەم ڕەگەزە. سەربازانی ئەفغانی ئێلجاڕی تایبــەتی خودی کەریمخان پتر لە حەوتهەزار کەسێک دەبوون؛ گەرچی ڕاوێژی «غەففاری» بەر لەوەی مەبەستێکی هەڵبەستراو بێ بۆ پاساوی قەڵتوبڕ کرانیان، دەیهــەوێ نیشانی بدا ئەمانە تاقمێکی تاڵانچی و ڕێگر بوون کە پاش بڕانەوەی یــەکجارەکی شەڕ، دۆزینەوەی چارەسەرێک پێویست بوو بۆیان[٤].

ئەو شێوازەی هاتە گۆڕ لاسایی و تەواو کردنی ڕەوتێکی زیرەکانــە بــوو کە هەشت مانگێک لێرەوبەر محەممەدبەگ بەڕێوەی بردبوو(١). پەیامێکی نهێنی نێردرا بۆ تەواوی حوکمڕانان و لایەنگرانی قەڵــەمڕەوی پاشــایەتی زەنــد هــەتا تەواوی ئەو ئەفغانییانەی کە وەک سەربازی ئێلجاڕی سپا لە گۆشــە و کــەناری وڵات سەرقاڵن، بیانکوژن. ئەم فەرمانە بەوپەڕی لێوەشاوەیی بەڕێوە چوو. لــە تاران ڕێورەسمی جێژنی بارگا بیانوویەکی بەئانقەســتی بــەدیهێنــا و وێــڕای سانێکی کە لە بەردەم کەریمخــان و ســکۆرتی تایبــەتی ئــەنجام درا(٢) تێکــڕای ئەفغانییەکان خرانە تەڵە و کوژران[٥].

لــە مازەنــدەران عــەلیخــانی شاســەیوان کرابــوو بــە بەرپرســیاری قەڵاچۆکردنی ئەفغانییەکانی دانیشتووی ئەم پارێزگایە و نەدرخانیش(٣) قــەرار وابوو کە تاقمە چەکدارەکانیان خاشەبڕ بکا. نەدرخان لە حــاڵاتی مەســتیدا بــە ئیما و ئیشارە پلانەکەی خۆی ئاشــکرا کــرد و هــەزار کــەس لــە ئەفغانییــەکان توانیان بە قوونەشەڕ خۆیان لەم داوە ڕزگار بکەن و ڕێیان بــەرەو ئەســتەرئاباد

---

٤ـ گوڵشەنی مراد، ل ٥٣.

٥ـ بەیزایی، ل ٦٠ ـ ٦١، ئەم ڕووداوە ئاوا دەگێڕێتەوە: یەکێک لە ئەفغانییــە باڵابــەرزە پاڵەوانەکان خۆی ڕزگار کرد و سەری فەرماندەی بە شیرێکی پەڕاند. پاشــان هەڵــیکردە سەر پارێزەرانی ئێرانی و گوڕمی بەستە نێو دەربار کە کەریمخان لەوێ لە لای ســەروو ڕاوەستابوو و دڕی بەو غولام و نۆکەرانە دا کە لە پەنا تەختی کــەریمخــان کرنۆشــیان بردبوو. وەکیل لەسەرەخۆ ڕاوەستا تا ئەو پیاوە ئانگژای بوو، خۆی لەبــەر زەبرەکــەی لادا و بە زۆری شیرەکەی لە چنگــی دەرهێنــا و ســەری پــێپەڕانــد و فــڕێی دا؛ پاشــان دانیشتەوە سەر تەختەکەی و دەستی کردەوە بە قسان لەگەڵ میوانان هــەر وەک ئــەوەی هیچ نەقەومابێ.

بکەنەوە. لە کوشتاری ئەستەرئابادیشدا دووسەد کەس لە چنگ بکوژان قوتار بوون و بەرەو رووباری گورگان رەویان برد، بەڵام ئەمانە زۆربەیان کوژران یان خنکان[٦]. لە سمنان زەکیخان هەزارونۆسەد کەسی قەڵاچۆ کرد؛ لەم بەینەدا سەرکردەی ئەفغانییەکان بە ناوی شێرعەلیخان بە فرتوفێڵ خۆی دەرباز کرد. لەو شارانەی وەک قوم و کاشان کە پاشماوەی شکستەی سپای ئازادخان مابوونەوە هەر لەو رۆژیدا بە گیرۆدەیی کوژران. غەففاری دەڵێ لە شاری کاشان ئەفغانییەک لە رێی دۆستێکییەوە بە مەترسییەکەی زانی و ماوەی شەش مانگان لەماڵی ئەو خۆی حەشار دا. پاشان بە شێوەیەکی نەهێنی لە یەخدانێکدا شاردییەوە و لە شاری دەرباز کرد هەتا دواتر بتوانێ بۆ چوونە لای ئازادخان لە بەغدا بکەوێتەرێ[٧]. چەند تاقمێک بە شوێن کەسی ئاواوە بوون؛ یەکێک لە خانەکانی ئەفغان کە لە کوشتاری تاران وەبەرنەهات و لەو شارە رایکرد، لە یەزد کەوتنە پێوشوێنی و کوشتیان. ژمارەی قوربانییەکانی تاران گەیشتە نۆهەزار کەس[٨].

ئەنجامی ئەو شاڵاو و کوشتارە سەبارەت بە دوژمنانی تێشکاو یەکێکە لەو پەڵانەی کە نیشتۆتە سەر داوێنی فەرمانڕەوای زەند. ئەگەرچی دەشکرێ ئەم کوشتارە وەک کردەیەکی سیاسی و لەشکری و پێویست کە لە رۆژگاری دەسەڵاتی قاجارانیشدا پێشینەی بووە، ریس و گوریسی بۆبێتەوە: لەگەڵ ئەوەی ئەمانە وەک چەکداری بەکرێگیراو لە رێی ئامانجیاندا خزمەتیان کردبوو، بەڵام ئەفغانییەکان پاشماوەی سەربزێوانی سپای نادری بوون و بە پیاو و داروودەستەی ئازادخان و ئەحمەدشا دادەندران.

هۆکاری هاندەری تۆڵەئەستاندنەوەی نەتەوەخوازیش بە کردەی کەریمخانەوە دیارە، چونکە ئەم کارە کەوتە بەر شەپۆلی ئافەرین و پەسنی تیرە و تایفە و شارنشینانی شیعەی ئێرانی کە لە سەردەمی حکوومەتی نادرشادا گرفتاری دەرد و مەینەت ببوونەوە و ئێستا ئەوان دەیانتوانی لە بابەت کەوتنە

٦ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٢٣.

٧ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٨٩ ـ ٩٠؛ گوڵشەنی مراد، ل ٥٤ ـ ٥٥.

٨ ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٢٢.

داوی دەربازبووانی ئەفغانییەوە کەیفیان ساز بێ. لە ڕاستیدا ئەم کوشتارە شایی‌لۆغان و نەورۆزانەی جێژنی نەورۆزی وەکیل بوو بۆ خەڵکەکەی[9].

## ٥ ـ ٢ ئاشنایەتی و توێژینەوەیەکی سەرەتایی دەربارەی باکووری خۆراوایی ئێران لە ساڵی ۱۷٦۰دا

هاوین سەرەڕای گەرمای ئازاردەری ئاسایی تاران، پەتای چاوقوڵکە و زگچوونیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو. بارگای زەندیە بەخاتری ڕاکردن لە دەس گەرما و زگەشۆرە بەرەو شمیران باری کرد و کەوتە حەسانەوە. ماوەیەک دواتر کە هێندێکی فێنک کرد کەریمخان دیسانیش گەڕایەوە بنکەی پێشووی. وەکیل ئەم ئاخرییانە سەرنجی کەوتبووە سەر تاران و دەیهەویست بۆ ماوەیەکی درێژ بە مەبەستی سەرکوت و سەرپێدانەواندنی ناوچەکانی باکووری ئێران کەلک لەم شارە وەربگرێ. تاران لەم ڕۆژگارەدا هێشتا ئەو ئاوەدانی و گرینگایەتییەی بەخۆوە نەدیبوو کە پاشایانی قاجار دواتر ڕێیان بۆ خۆش کرد. بۆیە زۆر وێدەچێ لەم سەردەمەدا لە قوم و کاشانیش بچووکتر بووبێ. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ دەسپێکی پێشکەوتی تاران لەم زەمانەڕا بەرەو دوا وەبەرچاو بگیرێ. کەریمخان ئێستا دەستی کردبوو بە گەشە پێدانی خانووبەرە و تەلارسازی و پێکەوەنانی ئامرازی خزمەت و حەسانەوە کە ڕەنگبوو ڕۆژایەک ئەم شارە بۆ پایەختێکی کاتی ئامادە بکا. لە پایزی داهاتووی ساڵی ۱۷٦۰دا کەریمخان توانی لە کۆشکێک لەنگەر بگرێ کە خاوەنی باخ و باخچە و پێداویستییەکانی تری حەسانەوە و ڕابواردن بوو. تەواوی ئەمانە لە ماوەیەکی زۆر کورتا سازکران و دەبێ ئەوە بە هەنگاوی سەرەکی و داندرانی بەردی بناغەی قەسری قەجەری دواڕۆژ لە «باخی گوڵستان»دا بێتە ژمار[10].

کەریمخان پاش تێپەڕکردنی زستانێکی دیکەش لە تاران، تەمای گرت کە لە ئازەربایجان خۆ بداتە چالاکی لەشکری. ڕۆژی ۱۹ی شابانی ۱۱۷٤ / ٦ی

---

۹ـ کەریمخانی زەند، نووسراوی نەوایی، ل ۸٤.

۱۰ـ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ۹٦؛ گوڵشەنی مراد، ل ٦٥ ـ ٦۷.

ئاوریلی ١٧٦٠ لە خەمسە دەرکەوت و بەهەشتاو پێی‌نایە ئەهەر، چواررۆژ دواتر لە سولتانییە تێپەڕی و گەیشتە تەورێز. بەلام فەتحعەلیخانی ئەفشار کە شانبەشانی شابازخانی دونبولی لەو شارەدا بنەی خستبوو، چەک و جبەخانە و ئامرازی پێویستی پاراستنی شاری بە باشی ئامادە کردبوو؛ هێزەکانی زەند بۆ گەمارۆدانێکی تەواو و سەرڕاست لە ڕۆژی ٥ی ڕەمەزان بەرامبەری ٢١ی ئاوریل، چەند جارێک پەلاماری گەڕانگەری شاریان دا و گەڕانەوە مەراغە. حاکمی مەراغە حاجیقاسمخان لەگەڵ حاجیعەلیمحەممەدی برای، لەشکرێکی لە شەڕکەرانی دڵخواز کۆکردەوە و کەوتە بەربەرەکانی، بەلام لە شەڕێکی قەراخ شارا شکستی هێنا و کەوتە گەمارۆ. ناچار داوای لێبووردنی کرد و سەرلەنوێ جڵەوی حکوومەتی شاری درایەوە دەس.

بەلام گیروگرفتی دیکە نەیانهێشت کەریمخان لەم بنکە خۆش و لەبارە وەحەسێ. لەپڕ تایفەکانی شوقاقی و شاسەیوانی دانیشتووی سەراب و هەشتپەڕ کە لەگەڵ هاتنی وەکیل بۆ تەورێز سەری کرنۆشیان بۆ دانەواندبوو، ڕاپەڕین. کەریمخان بۆ خاتری نەپچڕانی پێوەندییەکانی ناچار بوو کە بەشێکی بەهێزی سپاکەی بنێرێتە بەرپەچدانەوەیان. ئەم سەرکوتە بە تالانی چەند ڕەوە و کەرکە مەڕ و مالات و گیرانی تاقمێک لە سەربزێوان کۆتایی پێهات. بەلام بارودۆخی لەشکری وی لە مەراغە هێند لەبار نەبوو و ماوەیەک دواتر ناچار بوو کە چۆن بەپڕتاو ناوچەی بڕیبوو، ئاوا بگەڕێتەوە تاران[١١].

١١ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٩٧ ـ ٩٩؛ گوڵشەنی مراد، ل ٥٦ ـ ٥٩؛ کووهمەرەئی، ل ٤٥٥؛
GD XI, 30 April, 29 July ; X II, 18 November 1760.
غەففاری پاشماوەی ئەم ڕووداوەی نووسیوەتەوە. ئەگەرچی یادداشتەکانی گێمبروون دەریدەخەن کە ئەم لەشکر لێکردنە لە بەهاری ئەم سالەدا ڕووی داوە، بەلام شیکردنەوەی ئێرانییەکان لەگەڵ پێشکەوتی پەلامارەکە یەکتر دەخوێنێتەوە. نامی ڕێکەوتەکەی بە سالی ١١٧٤ی کۆچی و پاش حەسانەوەی هاوینەی کەریمخان لە خەمسە دادەنێ و غەففاری بە وەرزی دواتری دەزانێ. لە ڕاستیدا نامی لای وایە کە کەریمخان نەورۆزی سالی ١١٧٤ چۆتە خەمسە، بەلام ئەمە بە گشتی حەسانەوە دادەنێ. (گیتیگوشا، ل ٩٣) کەوایە شیکردنەوەی غەففاری لە سەر شەڕی مەراغە کە نامی باسی ناکا لەگەڵ نووسینی دونبولی کە باوکی لەو شەڕەدا بەشدار بووە یەکتر دەگرێتەوە، کە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی ئەو سەردەمەیە.

لەم کاتەدا گەرمای تاقەتپرووکێنی تاران قوولەی دەکرد و پەتا و نەخۆشی لێوەرگر تینی بۆ لەشکرەکەی هێنا[12]، بۆیە لە ڕۆژی ٦ی محەڕڕەمی ساڵی ١١٧٤ی کۆچی / ١٨ی ئاگۆستی ١٧٦٠ی زایینیدا بە مەبەستی تازیەداری و گێڕانی چەمەری و لەخۆدان بۆ ئیمام حوسێن لە شمیران، تارانی جێهێشت. پێنج ڕۆژ دواتر سەرلەنوێ گەڕایەوە سوڵتانییە و پاش حەوتوویەک گەیشتە وێندەرێ و چوارمانگی دیکەش بە مەبەستی پشوودانی درێژخایەن لەوێ بنەی داکوتا. وەکیل قۆناخی حەسانەوەکەی تێکەڵ کرد لەگەڵ پێداچوونەوە و ئاڵوگۆڕی گشتی لە شێوازی بەڕێوەبەرایەتی و ئیداری قەڵەمڕەوی هەرێمی باکووری بەگوێرەی ئەو بارودۆخە لەبارەی کە لە ناوندی وڵات هەیبوو. کاشان کە لەبەر نەخۆشکەوتنی موعیزەددینی غەففاری گیرۆدەی پەشێوی و ئاڵۆزکاوی هاتبوو، کەوتە سەر ناوچەی ژێردەسەڵاتی حاجیئاغا ڕەعنایی(٤) حاکمی ئیسفەهان. حاجی محەممەد لە شەڕی مەترسیدار و یەکلاکەرەوەی کەمارەجدا تەواوی ماڵ و دارایی خۆی لە بەر دەستی وەکیل نابوو. لە قەزوێن مەولاوێردیخانی قەزوێنی هاتە سەر دەسەڵات[13].

ڕەنگە هەر لەم سەردەمەدا بووبێ کە کۆمەڵێک نێردراو لە لایەن حاکمەکانی ئەردەڵان و بابان و شارە بچووکەکانی سەرڕێ بە خزمەتی گەیشتبن و ملکەچی و فەرمانبەرێتی خۆیان لە کۆشکی هاوینەی وەکیل ڕاگەیاندبێ. لە پاڵ ئەم تەشریفات و گۆڕینەوەی دیاری و خەڵاتانەدا، چەند گەشتێکیش بە مەبەستی ڕاو و ڕابواردن و خواردنەوەی بەربەرەڵا وەبەرچاو دێ[14]. لەم ڕۆژانەدا یەکەم دیاردە و نیشانەی دووبەرەکی و دووڕوویی لە بەرەی ئارامی یەکێتی بنەماڵەیی تایفەی زەندا خۆی نواند.

لە سەرەتاکانی دێسامبردا خانی زەند بە مەبەستی تێپەڕکردنی ڕۆژانی زستان گەڕایەوە قەزوێن هەتا لە جەنگەی بەهارا سەرپتەی شەڕێکی بەگەرمە بە دژی فەتحعەلیخانی ئەفشار خۆش بکا. هەڵبەت لەم بارەوە ئازادخانی کۆنەدوژمنی پێشبڕکەی دابۆوە و دەیەویست پەلاماری خانی ئەفشار بدا.

12- GD X II, 18 November 1760.

١٣ـ گوڵشەنی مراد، ل ٦٠ ـ ٦٥؛ ئەنساری، ل ٢٢٦.

١٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٩٥ ـ ٩٦.

## ٥ ـ ٣ شەڕی مەراغە

ئازادخان پاش شکانی ورمێ لە هاوینی ساڵی ١٧٥٧ لە بەرامبەر قاجاراندا، لە درێژایی سنوورەکانی ئێراقی عوسمانیدا چەواشە بوو. جگە لە تاقمێکی کەمی ئەفسەرانی، تێکڕا دەستیان لێبەردا. لێرەدا دەکرێ باسی سێکەس لە سەربازانی تیرەی گورجی و خزم و کەسی بەرەبابی بێتە گۆڕ کە هەروا لە پشتی ڕاوەستابوون[١٥]. حەرەمخانەی بەربلاوی کە برێتی بوو لە کۆمەڵە ژنێکی بەرچاو، بۆ وێنە ژنی پێشووی ئەشرەفخانی غەلجایی دووهەمین پاشای ئەفغان، لە پێشیدا دەبزووت، هەتا بیانگەیەنێتە بەغدا و بیانخاتە ژێر سێبەری «عادلەخاتوون». ناوبراو ژنێکی شیعەمەزەب و کچی ئەحمەدپاشای حاکمی پێشووی بەغدا و خێزانی سلێمانپاشای[١٦] فەرمانڕەوای ئێستای ئەو هەرێمە بوو. پەیامێکی گەرموگوڕ لە لایەن پاشاوە هات کە سوکنایی و ئۆخژنی خستە دڵی پەنابەران، بەڵام هەرکە دەنگۆ داکەوت بالوێزی محەممەدحەسەنخانی قاجار هاتۆتە بارگای پاشا و ڕەنگە لە بابەت سنوورداشکردنەوەی پەنابەران وتووێژ دەس پێبکا، ئازادخان سەرلەنوێ گەڕایەوە نێو کوردەکانی «قەرەچۆرلوو»ی چیانشین و پێنج مانگێک یانی تا ١٠ی ژانوییەی ساڵی ١٧٥٨ سەفەرەکەی بۆ بەغدا وەدواخست[١٧]. وا دیارە بەرهەڵست بوونەوەی محەممەدحەسەنخان چی پێنەکرا، چونکە ساڵی داهاتوو سەرکردەی ئەفغان و هاوڕێیانی بەڕێزەوە پێشوازییان لێکرا. قەشەی کرێملی بابل وای بۆچووە کە ئازادخان بەدڵ پێیخۆش بوو دەس لەم گێرە و کێشانە هەڵگرێ و دەیەویست پاشا (حوکمڕان) لە بەسرە

---

15- MAE Perse X II. No. 104 (Butkov I, 420).

سەرکردەی گورجی ناوی زاڵخان کاپلانقوو بوو کە چووە دیداری قونسوولی فەرانسە لە بەغدا و ئەگەرچی سیمۆن لەگەڵ ئەم پیاوە ئاشنا بوو، هیچ هەواڵێک لە بابەت چارەنووسییەوە پاش قەومانی شەڕ بە دەستەوە نیە.

١٦ـ گوڵشەنی مراد، ل ٦٨ ـ ٦٩.

17- MAE Perse VII. No. 104; S P 97/39, 1 October 1757, 14 July 1758 ; S P 97/98, 16 January 1785; cf. Hatt – i Humayun 1, 169 ( dated 1200, but in fact Letters from Mohammad Hassan Khan to solayman Pasha).

پاپۆڕێکی وێبدا و بگەڕێتەوە قەندەهار، بەڵام گۆیا پاشا ویستوویەتی بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی بەرفرەوان کردنی قەڵەمڕەوی سەرداری قاجار کەلکی لێوەربگرێ[18].

لەبەر یارمەتی پاشا یان لانیکەم پەیمان و بەڵێنی بەربلاوی ئەو سەبارەت بە کەلک وەرگرتن لە یاریدەی سپاکانی مووسڵ و کەرکووک و دیاربەکر، ئازادخان لەشکرێکی سێهەزار کەسی کۆکردەوە و لێی‌سوور بوو ئەگەر بێتوو وەرێکەوێ بەرەو ئازەربایجان دەتوانێ گەلێک شەڕکەری تر لە دەوری خۆی هاڵێنێ.

ئارکێل پاشای گورجستان کە لە لایەن هێزەکانی بەرەو گەشەی فەتحعەلی‌خان و کەریم‌خانەوە کەوتبووە مەترسی، نێردراوێکی ناردە خزمەت پاشا هەتا پێی‌بسەلمێنێ کە ئازادخانی هاوپەیمانی پێشووی بنێرێتە ئازەربایجان و بەڵێنی هەر چەشنە یارمەتی‌دانێکیشی بداتێ.

ڕەنگە سەرەتای بەهاری ساڵی ١٧٥٩ ئازادخان لەگەڵ سپای گچکەی بەرەو ئێران بزووتبێ. بە باری دابینی دراودا میری بەغدا لەشکرەکەی تەیار کردبوو و دڵنیاشی کردبۆوە کە چیانشینانی قەڵەمڕەوی پاشا پشتی دەگرن. ئازادخان لێی‌ڕوون بوو کە یارانی پێشووی واتە فەتحعەلی‌خانی ئەفشار، هراکلیووس و شابازخانی دونبولی، هەرکە لە ورمێ نزیک بۆوە، پشتی دەگرن[19]. بەڵام ئارکێل بەدڵ تەنیا ئاواتی پاراستنی سنووری قەڵەمڕەوی خۆی بوو. فەتحعەلی‌خان و شابازخانیش تازە چەند مانگێک بوو کە ڕێیان لە ڕێی تێشکاوی قاجار جودا کرابۆوە و چونکە لە لایەن وەکیلەوە هەستیان بە هیچ مەترسییەک نەدەکرد دووبارە کەوڵی دەسەڵاتیان لە ئازەربایجان ڕاخست و کەوتنە خۆ قایم کردن، بۆیە حازر نەبوون جارێکی تر کەس بکەنەوە شەریک و بەشداری دەسەلات و حکوومەتیان.

هەرێمی یەکگرتووی ئەم دوو سەرکردەیە بەرەوڕووی هرووژمی لەشکری ئازادخان بوویەوە کە لە قسان بیست‌هەزار شەڕکەرێک دەبوو. وا دیارە کە لە

---

18- MAE Perse VII, NO. 106 ; VIII. NO. 2.

١٩ـ MAE Perse VIII, NO. 3. و گوڵشەنی مراد، ل ٦٩ ـ ٧٠.

هاوینی ساڵی ١٧٦٠دا و بەر لەوەی ئازادخان بگاتە مەراغە لێیەوەخۆکەوتن و لە شوێنێک بە ناوی شەهراز(ە) هێزەکەیان تێکشکاند و ناچاریان کرد کە بە پەلەپرووزی و زراوچوونەوە ڕابکاتەوە نێو زنجیرە چیاکانی کوردستان و بە مەبەستی کۆکردنەوەی چەکداری تازەپشوو بۆ ساڵی داهاتوو یان وەختێکی تر بکەوێتە خۆ[٢٠].

ساڵی داهاتوو کە بەر بە پێشڕەوی کەریمخانیش گیرا لە تەورێز، سەردارانی ئازەربایجان تێگەیشتن کە خۆیان بۆ بڕیاردان لەوە حەقدارترن کە کات و ساتیان لەگەڵ هاوپەیمانانی گومانلێکراو بە فیڕۆ بدەن. ئازادخانیش ئەگەر دەستی بۆدابا هیچ دڵاودڵی لێنەدەکرد و بە زەبری زۆری قەڵەمڕەوی پێشووی خۆی دەگرتەوە. وا دیارە لە هاوینی ساڵی ١٧٦٠دا وێڕای لەشکرێکی گەورە و گرانی تێکەڵە کە بیستهەزار کوردێکیشی پێوە هەڵوێستابوو، بەرەو تەورێز کەوتەڕێ. یەکەم سپایەکی بەر لەوەی بگاتە مەراغە تێیهەڵەنگووت، لەشکرێکی تێکەڵەی تایفە و تاقمە بەکرێگیراوەکانی ئازەربایجانی بوو بە چلهەزار چەکدارەوە. ئەم شەڕکەرانە بە سەرکردایەتی فەتحعەلیخانی ئەفشار و شابازخانی دونبولی چوونە مەیدان و برێتی بوون لە چەکدارانی ژێردەسەڵاتی ئەمیرگۆنەخان ئیرلووی ئەفشاری تارۆمی (کە سەرەتا لە خزمەت

---

٢٠ـ گوڵشەنی مراد، ل ٧٠، نووسراوەکانی سەبارەت بە شەڕی مەراغە زۆربەیان گۆترەکی و لە ڕووی گومانەوە ڕێکخراون. نێوەرۆکی MAE Perse VIII, NO.3 وا نیشان دەدا کە ئازادخان لە شەڕێکا لەو قۆناخەدا، لە بەرامبەر فەتحعەلیخانا شکستی هێناوە (زستانی ١٧٥٨ ـ ١٧٥٩) خانی ئەفشاریش هاوپەیمانی کەریمخان بووە. ئەم ڕاپۆرتە خەیاڵاتە؛ بەڵام ڕەنگە هەر سەبارەت بەو شەڕە سەرەتاییە بووبێ کە غەففاری باسی دەکا. یادداشتەکانی گێمبرۆون فەتحعەلیخانی تا ساڵی دواتر بە هاوپەیمانی ئازادخان داناوە؛ هەروەها ئەم ڕاپۆرتە باسی چوونی ئازدخان بۆ خورەمئاباد دەکا. (ژمارە ١١، ٣٠ی ئاوریلی ١٧٦٠) ئەگەر ڕاست بێ دەبێ هاوین یان بەهاری ١٧٦١ بە مەبەستی کۆکردنەوەی چەکداری بەکرێگیراو چووبێ. ئەم ڕێکەوتە لەگەڵ نووسراوەکەی غەففاری کە شوێنی سەربتەی شەڕەکەی بەهاری ١٧٦٠ لەگەڵ شەڕی دوو ساڵ دواتری قەرەچەمەن بە یەک دادەنێ، یەکتر دەخوێنێتەوە و بەڕواڵەت لە هەموو بۆچوونەکان پەسندترە.

محەممەدحەسەنخانا بوو پاشان چووە ژێر ڕکێفی کەریمخان) نەجەفقولیخانی دونبولی (کوڕی شاباز و باوکی نووسەری ئێرانی، عەبدورڕەزاقی دونبولی) عەلیخانی شوقاقی و کازمخانی قەراچەداغی.

ئازادخان بە تەگبیر و گرتنەبەری ڕێوشوێنێکی لەشکری کەوتە باروهەوایەکی باش و بەم کارە پشتی کردە شار و تاقمەکانی کورد و ئەفغانی لە قۆڵی ڕاست و شەڕکەرانی خێڵاتی ئێرانی بە سەرکردایەتی مەحموودی کوڕی سلێمانپاشای بابان لە قۆڵی چەپ دامەزران و چەکدارانی ترکیش کەوتنە جەرگەی مەیدان. خودی فەتحعەلیخانیش شانبەشانی کازمخان ویکڕا لەگەڵ سپایەکی تێکەڵەی ئەفشاری و قەراچەداغی و نەخجەوانی کەوتبوونە نێو چەقی لەشکرەوە. لە لای ڕاست کوردەکانی شوقاقی و شەڕکەرانی ئەمیرگۆنەخان کە غەففاری لای وایە ترک و ئەفغانی بوون، دامەزران[٢١]. دەستەی تۆپخانە کەوتبوونە پشتەوەی فەتحعەلی، بەڵام ئازادخان تۆپخانەی نەبوو. سەرۆکی ئەفغان شاڵاوی شەڕی لە لای ڕاستەوە بە هێرش بۆ سەر ڕیزی سواران دەسپێکرد، بەڵام لە بەرامبەر دیواری پتەوی دونبولییەکاندا نەیتوانی پێشڕەوی بکا و ئەمیرگۆنەخان لە قۆڵی ڕاستی دوژمنەوە پەلاماری دا و بەهێزەوە تێکیشکاند. فەتحعەلیخانیش لە جەرگەی سپادا ئەم شێوازەی گرتەبەر و بە پشتیوانی ئاگری تۆپخانە پەلاماری نێرینەی لەشکری دوژمنی دا. ئازادخان و سپای هەڵبژاردەی پارێزەرانی تایبەتی خۆی لە هێرشێکی توندوتیژدا گورمیان بەستە جەرگەی سپای فەتحعەلیخان و دووفرسەخێک ڕاویان نان. لەو کاتیدا واوێدەچوو کە ئازادان شەڕی بردۆتەوە، بەڵام لەم وەختەدا هێزەکانی دونبولی کە بۆ پڕ کردنەوەی جێی بەتاڵی سپای فەتحعەلیخان نیزیک ببوونەوە، تاویان دایە ئازادخان. چەکدارانی پیادەی مەحموودی بابان دەستیان دا یان هەڵاتن. پاشماوەکانی لەشکری ئازادخان بەر لەوەی هێڵی بەرەیان پەلامار بدرێ، تۆقین. وەختایەک ئازادخان لە پەیکەردەی بێهوودەی جەرگەی سپای دوژمن دەگەڕایەوە، تێگەیی کە هێشتاش بیستهەزار کەس لە سوارانی خەنیم لە جێی

٢١ـ گولشەنی مراد، ل ٧٠ ـ ٧١؛ نیکیتین دەڵێ، ئەگەرچی دونبولییەکان بە ڕەگەز کوردن، بەڵام پێوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ ترکانی ناوچە هەیە.

خۆیانن، بەڵام تاقمە چەشناوچەشنەکانی یارانی خۆی تێکشکان، بۆیە جگە لە ڕاکردن بۆ کوردستان هیچ ڕێیەکی لەبەر نەبوو. محەمەلیخان پاش وەشوێنکەوتنێکی لەخۆڕا دەستی لە کۆڵ کردەوە هەتا ئاکام و دەسکەوتی سەرکەوتنی خۆی بەسەر بکاتەوە و بگەڕێتەوە تەورێز[22].

ئەمە دوایین دەرفەتی ئازادخان بوو بە مەبەستی وەدەسهێنانی دەسەلات لە ئێران. لە کرماشان هەوڵی دا هەتا سپایەکی تازەپشوو لە نێو لوڕەکانی فەیلی و خەڵکی هەمەدان کۆبکاتەوە، بەڵام سەرەنجام ناچار بوو کە بگەڕێتەوە ناوچەکانی سنووری هەتا داوای یارمەتی لە سلێمانپاشا بکا و بە پشتیوانی عادلەخاتوون خوازیاری هێزی یارمەتیدەری پتر بێ. پاشا کە سەرەڕای یارمەتییەکانی بە مەبەستی بەشدار بوون لە کایەیەکی ئەوتۆدا بێتوانای دەهاتە بەرچاو، داخوازەکەی بردەوە پاش. ئازادخان بە خۆی و هەزاروسێسەد کەس ئەفغانی و حەرەمخانەیەوە بەغدای جێهێشت و بە مووسڵ و کەرکووک و گەنجە و ئێرەواندا تێپەڕی و چووە تفلیس. لە تفلیس ئەگەرچی ئارکێل پێیخۆش نەبوو لە بابەت گرتنی ئازەربایجانەوە چالاکانە پشتیوانی لێبکا، بەڵام لە بارگای خۆی شوێنێکی خۆشی دایە و لە ماوەی دوو ساڵی دواییدا خزمەتی کرد[23].

---

۲۲ــ گوڵشەنی مراد، ل ۷۱ ــ ۷۲؛ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ۲، ل ۳۱ ــ ۳۵؛ کووهمەرەئی، ل ٤٦٧ ــ ٤٦٨. غەففاری شەڕەکەی لە زمان شەڕکەرانەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام هیچ سەرچاوەیەکی بە دەستەوە نەداوە.

۲۳ــ گوڵشەنی مراد، ل ۷۲ ــ ۷۳ و ۱۱۱؛ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ۲، ل ۳۹؛
Butkov I, 249; III, 99 ; SP 97/41, 172a – Gmelin (397 – 398)
ئەم نووسەرە (Gmelin) بانگەشەی ئەمە دەکا وەختایەک ئارکێل لەگەڵ هاوڕێیانی ماقووڵ و ئێسکۆرتێکی هەزارکەسی چووە پێشوازی ئازادخانی پەنابەر لە دەرەوەی شار، لە دیدارەکەدا ئازادخان بە زمانی پەشتوو فەرمانی دا بە یارانی کە هاوڕێیانی ئارکێل بگرن. ئارکێل تێگەیی و لەڕێوە بە زمانی گورجی لە پیاوەکانی خۆی خوڕی کە پارێزەرانی ئەفغانی ئازادخان بگرن و بیانکوژن. ئەم کارە کرا و ئازادخان خرایە بەندەوە، کەچی پاشان ئازاد کرا و تەنانەت کرایە حوکمڕانی یەکێک لە پارێزگاکانی کوێستانی. بەڵام لەبەر کردەی نالەباری تری گیرا و درایە دەس کەریمخان.

## ٥ ـ ٤ فەتحعەلیخانی ئەفشار

لە بابەت پێشینەی تایفەی ئەفشاری ئورورومی و کار و پلەی سەرەتایی فەتحعەلیخانەوە کورتە توێژینەوەیەکمان کردبوو، بەلام ئێستا دەمانەوێ لەم بارەوە پاش ئاخرین پەلاماری کەریمخان بە مەبەستی هێنانە ژێرکێفی ئەوان کە ناچار کران لە ناوەندی پارێزگا بنەگر بن، خۆ بدەینە خوێندنەوەیەکی ورد و باریکتر.

ئەفشارەکان بە لقێکی خێڵی ئۆغوز دادەندرێن. لە سەدەی دوازدەی زایینییەوە هاتوونە ئێران و چاردە بەرەبابن و سەربەدەرەوەترینیان ـ یانی ئەوانەی کە لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئێراندا لە چاخی سەفەوی و تەنانەت لە هەندێک بابەتاندا تا خولی دواتریش کاریان نەپسایەوە و حوکمڕانی مەڵبەندە چەشناوچەشنەکانی ئێرانیان بە دەستەوە بوو ـ برێتین لە: قاسملوو، ئیرلوو، ئۆرشلوو، قۆرقلوو و گوندوزلوو. ئەفشاری ئورورومی یەکەم جار لە سەردەمی پاشایەتی شاعەباسی گەورەدا لەم شارە نیشتەجێ بوون، کەچی سەبارەت بە پێشینەی مێژوویی و هاتنیان کۆمەڵێک ئەفسانە وەبەرچاو دێن[24]

خودادبەگی قاسملوو یەکەم کەس بوو لە تایفەی ئەفشار کە سەردەمی حکوومەتی سەفەوی کرایە بەگلەربەگ. لە ئاخرین ڕۆژانی دەسەلاتی شاسوڵتانحوسێندا لە چاکەی پەلاماردانی کوردانی ڕاپەڕیوی[25] ورمێ پلەی بەگلەربەگی (سەرداریتی) درایە. لە سەردەمی پاشایەتی نادرشادا فەتحعەلیخان لە بەرەبابی ئۆرشلووی ئەفشار بوو بە سەرکردەی لەشکری فارس و لە ماوەی ساڵانی ١١٥٧ ـ ١١٥٨ی کۆچی / ١٧٤٤ی زایینیشدا کرایە حاکمی خودی ورمێ. لە کاتی مەرگی نادرا مەهدیخان کە لە سەردەمی نادرا حوکمڕانی ناوچەی ئێرەوان بوو لەم ڕۆژانەدا لەبەر گلاندنی ڕقەبەری ئۆرشلووی کەوتە بەر پشتیوانی سەرکردەکانی ورمێ.

لە ساڵی ١٧٤٨دا، ئەمیر ئەسلانخانی قۆرقلوو لەبەر بانگەشەی

24- Koprulu,(( Afshars)) Ei 2 I, 232, 240 ;cf Nikitine(( Les Afshars,)) 67 – 70.
25- Nikitine (( Les Afshars,)) 71 – 76.

حکوومەتی سەربەخۆی ئازەربایجان کەوتە بەر هەڕەشەی برایمپاشا کە بەم زووانە هێزەکانی عادڵشای برای تێکشکاندبوو؛ ئەمیر ئەسلانخان بە مەبەستی وەدەسهێنانی پشتیوانێتی هۆز و تایفەکانی کورد و موکری و موقەددەم کە پاڵپشتی فەتحعەلیخان بوون، داوای لە مەهدیخان کرد فەتحعەلیخان ئازاد بکا. مەهدیخان جوابی نەداوە و تەنانەت پیاوانی ڕاسپاردەشی یەختە کرد. ئەمیر ئەسلانخان لەبەر تووڕەیی و ناڕەزامەندی گشتی سپایەکی بە سەرکردایەتی دوو برای ناسراو بە شەهریاربەگ و حاجیبەگی گوندوزلوو(٦) نارده مەراغە هەتا مەهدیخان بە مەبەستی بەدیهێنانی داخوازەکەی بخاتە تەنگەژە و بیتۆقێنێ. مەهدیخان هێزەکانی تێکشکاند و ئەمیر ئەسلانخان خۆی بەرەورووی هەڕەشەیەکی چاوەڕواننەکراو بینی. حەوت ڕۆژ پاش قەومانی ئەم شەڕە فەتحعەلیخان کە پێیزانیبوو ئەم هەڵایەی لە سەر کراوە، وای ڕێکخست کە بەرەورووی حوسێنخانبەگی باوکی مەهدیخان بێتەوە و ئەویش کارێکی وا بکا کە سەرۆکی چۆلەپێچکراوی قاسملوو، ئازادی بکا.

سەرەنجام مەهدیخان ئازادی کرد و قەرار کرا خانی ئەفشار بۆ شەڕ لەگەڵ ئەمیر ئەسلانخان یانی ئەو کەسەی دەیەویست ڕزگاری بکا، هاوپەیمانی بێ. ئەم ڕێککەوتنە ناباوە بە قازانجی هەردوولا بوو؛ هەڵبەت ئەم ئازادییە پتر بە قازانجی فەتحعەلیخان بڕایەوە. شیرازەی سپای ئەمیر ئەسلانخان لەبەر یەک هەڵوەشا، لە نێو شادمانی جەماوەرا دوو ڕقەبەر ئاشت بوونەوە و مەهدیخان لە تەورێز خۆی گەیاندە لای برایممیرزا کە دەچوو بۆ شەڕی شاروخ؛ فەتحعەلیخانیش کرایە حاکمی ورمێ.

ماوەیەک دواتر سپای برایممیرزاش دەستی لێکبەردا؛ لایەنگرانی شاروخ لە تەورێز هەوساری کارانیان گرتە دەس و سەری مەهدیخانیان بڕی(٧). فەتحعەلیخان بەرەو تەورێز کەوتەڕێ و ڕاپەڕیوانی تێکشکاند و تەواوی پارێزگای ئازەربایجانی هێنایەوە ژێر ڕکێف و پاش ماوەیەک لەگەڵ ئازادخان لە حکوومەتی ناوچەدا بوو بە شەریک[٢٦]. خانی ئەفشار جگە لەو خزمەتانەی لە سپای ئازادخانا ئەنجامی دابوون، توانی بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە

---

٢٦ـ هەمان سەرچاوە، ل ٥٩ ـ ٧٧ و کاویانپوور، ل ٧٨ ـ ٨٢.

پشتیوانێتی دانیشتووانی ناوچە داگیرکراوەکان بە لای خۆیـا بشـکێنێتەوە. بـە مەبەستی گەیشتن بەم ئامانجە سەرەتا دایە پاڵ محەممەدحەسەنخانی قاجـار و پاشان بـۆ ئـەوەی پێـی بکاتـە حوکمـڕانێتی پارێزگـا دەسـتی لـە سـەرۆک و سایەچەوری خۆی بەردا و بانگەشەی سەرۆکایەتی ئەو یەکێتییەی کرد کە خـۆی لە پێکهێنانیدا دەوری گێڕابوو.

هەلومەرجەکە وای دەنواند کە تا هێشتاش وەکیـل ناتوانـێ سـوود لـە دووبەرەکی نێـوان فەتحعـەلیخـان و ئازادخـان بێنـێ. ڕەنگـە هۆکـاری ئـەم نەتوانینەش ئەوە بووبێ کە دیسان سپای زەند لەبەر بلاوبوونەوەی نەخۆشـی و شۆرش و هاڵۆزکاوی ناوچە داگیرکراوەکانی گیلان و مازەندەران و خەمسـە لاواز و لەرزۆک بووبێ. بەڵام لە بەختی کەریمخان زێدەڕەوی لـە وەرگـرتنی پیتـاکی تازەدا، فەتحعەلیخانی لە بەهاری ساڵی ۱۷٦۱دا والێکرد بوەستێ و ڕاماڵ نەبا و لەشکری سیهەزارکەسەی خانی ئەفشار پاش گرتنی ئەردەوێل و میانـە واوەتـر نەبزووت. وا دیارە لە ماوەی ئەم ساڵەدا فەتحعەلیخان لـە شـەڕی پـەناخانی جەوانشێر لە قەڵای سەختی شووشیدا هەندێک سەرکەوتنیشی وەدەس کەوتبوو و خەلیلئاغای کـوڕی پـەناخانی وەک بارمتـە وێـڕای خـۆی هێنـابوو[27]. لـەم بەینانەدا پێشنیارێکیشی خستە بەردەم کەریمخـان کـە بـەگوێرەی ئـەو وەکیـل دەیتوانی فەرمانڕەوایەتی هەرێمەکانی فارس و ناوچـە گەرمەسـێرییەکانی بـە دەستەوە بێ. بەڵام لە جیاتیان ئێراقـی عەجـەم بداتـە دەس فەتحعـەلیخـان و هەروەها دەسەڵاتیشی لە ئازەربایجان بە ڕەسمی بناسـێ. بـەڵام تـەنیا وەڵامـی وەکیل بۆ پێشنیارەکەی ئەوە بوو کە فەرمانی دا بە زەکیخان هـەتا سـەرلەنوێ سپای لێکبلاوبووی خودامرادخان کۆ بکاتەوە و (ئەم سـپایە لـەم ڕۆژانـەدا بـە مـردنی سـەرکردەکەیان دەسـتی لێکبـەردابوو) خـۆی بگەیەنێتـە هێزەکـانی شێخالیخان لە هەمەدان و ئامادەی هێرش بن بۆ سەر ئازەربایجان. وەختایـەک وەرزی بەهار داهات جگە لە کۆمەڵێک هەواڵی لێڵ و نادیار دەربـارەی درێـژەی تێکهەڵچوونیان لە ناوچەیـەکی نێـوان کرمـان و بەندەرعـەباس هـیچ شـتێک وەبەرگوێ نەهات[28].

27- Bakikhanov, 162 ; Butkov I . 246.

28- GD XII,16 April,25 June,1Octpber1761; X III,10 December1761,21January 1762.

## ٥ ـ ٥ شەڕی قەرەچەمەن و گیرانی تەورێز

لە مانگی بانەمەڕی ساڵی ۱۱۷٥ / ۱۷٦۲دا کەریمخان وای لە سپای خۆی ڕادەدی کە دەس بداتە لەشکرلێکردنی گەورە و گران بۆ سەر خانی ئەفشار. بۆیە بەڕێوەبردنی تارانی دایە دەس یەکێک لە گەورەپیاوانی شار بە ناوی حاجی جەعفەرخانی ترک و ڕۆژی ۲٥ی مانگی مەی ۱۷٦۲ کەوتەڕێ. حەوتوویەک لە شمیران مایەوە هەتا پێویستی و ئازۆقەی سپا دابین بکا، ئەو کات بە ئارامی پێی نایە خەمسە. لە وەختی ڕاو و ڕابواردندا ڕادەی لایەنگرێتی تیرە و تایفەکانی سەرڕێیەی هەڵسەنگاند و بە لابڕدا چووە قەڵەمڕەوی شوقاقی و شاسەیوان. وەفاداری ئەم دوو تایفەیە لە دوایین لەشکرکێشیدا لە ئاستێکی دڵخواز دابوو؛ عەلیخان وێڕای سەر وەبەرهێنانی، بەدڵخواز چەند سەرێکی مەڕ و ئەسپ و پۆلە سەربازێکی بە مەبەستی یارمەتی دانی لەشکرەکەی پێشکەش کرد. ماوەیەک دواتر لە مانگی ژووەن یا تۆزێک بەر لە جوولای، سپای زەند لە لەوەڕگای خۆش و دڵگری قەرەچەمەن دابەزی. (قەرەچەمەن ئێستا بە سیاچەمەن مەنشوورە.) ئەم مێرگ و مێرغوزارە کەوتۆتە سەد کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی تەورێز[۲۹].فەتحعەلیخان لە لای تەورێزەوە هاتە پێش و سیهەزار چەکداری ڕاهاتووی تەواو تەیاری هێنابوو کە لە لایەن تۆپخانەوە پشتیوانی دەکران[۳۰]. کەریمخان بار و بارخانەی سپاکەی لە شوێنێکی زەنوێر لە پەنا کێوێکی بەرز دانا و پۆلە چەکدارێکی بە سەرکردایەتی نەدرخانی زەند بۆ پاراستنیان بەجێهێشت. خۆشی بە مەبەستی تێکهەڵچوون لەگەڵ دوژمن لە نیوەی ڕێگای تەورێز یانی ناوچەی ئووجان کەوتەڕێ[۳۱]. شێخاڵیخان

۲۹ـ گوڵشەنی مراد، ل ۸۰ ـ ۸۱؛ کووهمەرەئی، ل ٤٥٥؛ کەلانتەر، ل ٦۰.

۳۰ـ گوڵستانە لە ل ۳۰۸ی موجمەلوتتەواریخدا، باسی وردەکاری و ژمارەی شەڕکەران دەخاتە ڕوو؛ غەففاری لە ل ۸۲ی گوڵشەنی مرادا، سپای فەتحعەلیخان بە شێست هەتا حەفتاهەزار کەس دادەنێ کە وێدەچێ زۆری فوو لێکردبێ.

۳۱ـ گوڵشەنی مراد، ل ۸۲؛ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ۲، ل ۳٦. بە مەبەستی زانینی شوێنی ئووجان، بڕواننە فەرهەنگی جوغرافیایی سپا، بەرگی ٤، ل ٥٤ و نەخشەکانی پاشکۆی. هەروەها گوڵستانە لە ل ۲۳٤ی موجمەلوتتەواریخدا کە «ئاغاسی»ش کەوتۆتە

سەرکردایەتی قۆڵی ڕاستی لە ئەستۆ بوو. پیاوەکانی ژێر فەرمانی سمایلخانی زەند و برایمخانی بوغایری[۳۲] بە بەشێکی ئەم لایە دادەندران؛ زەکیخانی ئامۆزای کەوتبووە بەری چەپ و ڕەفیعخانی قاجاریش سەرکردایەتی هێزەکانی پشتیوانی دەکرد. لە جەرگەی ئەم ڕیزبەندی و ڕازانەوەیەدا چەکدارانی حەیدەرخان، شێخمرادخان، کاکاخانی زەند و شەڕکەرانی عەمارلوو، شاسەیوان و شاملوو کەوتبوونە ژێرڕکێفی خودی وەکیلەوە. تۆپخانە کەوتە پێش لەشکر و نێوان تفەنگداران و شەمخاڵداران (سەرپڕداران، ئەوانەی چەکی سەرپڕیان پێیە) هەتا پشتیوانی قۆڵەکانی لەشکر بێ. ئەم یەکینەیە لە لایەن لوتفعەلیخانی سەرتۆپچی گورجییەوە سەرپەرستێتی دەکرا. ڕیزبەندی و ڕازانەوەی سپای ئەفشار هەروەک شەڕی مەراغە وابوو: شابازخانی دونبولی لە قۆڵی ڕاست و ئەمیرگونەخان و نەجەفقولیخان لە قۆڵی چەپ و فەتحعەلیخان و براکانی برایم و عەلیمەردانخان لە جەرگەی لەشکر دامەزرابوون. تۆپخانەکەشیان لە لایەن تفەنگچییەکانی مەرەندی و ئەرمەنی قەرەباغییەوە[۳۳] چاوەدێری دەکرا.

---

شوێن نووسراوەکانی ئەو (ل ۱۹۵، یادداشتی یەکەم) بانگەشەی ئەمە دەکا کە شەڕەکە لە شوێنێکی زۆر نیزیکتر، لە ناوچەی خانە هاوپەیمانەکان و نێوان خۆی و سەڵماسدا ڕووی داوە و ئەم شەڕە پاش ئەوەی کەریمخان بۆ تێکهەڵچوون تەورێزی گرت، قەوماوە.

and for Tabriz cf. Butkov I, 246 ; III, 104 ; GD X III, 4 September, 17 and 18 October 1762.

۳۲ـ گوڵستانە لە لاپەڕە ۳۲٤ ـ ۳۲٥ی کتێبەکەیدا ڕوونی دەکاتەوە کە برایمخانی بوغایری بەر لە دەسپێکی شەڕ بەدزی لەگەڵ فەتحعەلیخان قەراری دانابوو کە هەر وەختایەکی تێکهەڵچوون دەستی پێکرد ئەو ڕووی خۆی وەرگێڕێ و لە خانی زەند هەڵگەڕێتەوە. کەچی کەریمخان نەیهێشت پیلانەکەیان سەربگرێ، چونکە وەختایەک پلانی شەڕ دادەڕژا کەریمخان بەڕواڵەت پێشنیارەکانی برایمخانی سەلماند؛ بەلام لە ڕۆژی شەڕا خودی کەریمخان برایمخانی لە شوێنێکی تر دامەزراند و بازنەیەکی تفەنگچی لە دەوری هالاند. ڕووداوێکی ئاوا نارەزامەندانە لە نووسراوەکانی غەففاری و کووهمەرەئیدا وەبەرچاو نایا و وێدەچێ ئەم هەڵەیە لەبەر پیلانێکی تر کە لە شەڕی ورمێدا ڕووی دابوو، بۆ گوڵستانە زیندوو بووبێتەوە.

۳۳ـ گوڵشەنی مراد، ل۸۳ـ۸٤؛ کەلانتەر، ل٦٠؛کووهمەرەئی، ل ٤٥٥؛ گیتیگوشا، ل۱۰۰ـ ۱۰۲.

پاش تەقوتۆقی سەرەتایی تۆپخانەکان، لێشاوی هێرشی لەشـکرییانی ئەفشار و دونبولـی لای ڕاست سپای زەندی لە جێی خۆی هەڵکەند و تێکیشکاند و زۆر کەسیان لە ژێر سمی ئەسپاندا پلێشاندەوە. سپای ئەفشار قۆڵـەی شـکاوی هەتا شەش فرسەخێک هەڵبڕی. نەدرخانی زەنـد کـە ڕاسـپێراوی چـاوەدێری و پاراستنی باروبارخانە بوو هەرکە تەپوتـۆزی سـوارانی هاتەبـەرچاو تـۆقی و وایزانی سپای زەند تەواو شکستی هێناوە، بۆیە بارگەوبنـەی خـۆڕایی کـرد و ئەمیرگۆنەخان دەستی بە سەر داگرت و ئەویش لەگەڵ سوارەکانی بەرەو قەزوێن ڕەوی. دوازدەهەزار کەسـی ئاسـایی و نالەشـکری وەک دوکتـۆر و چێشـتکەر و خزمەتکاری هۆردووش بە شوێن نەدرخانەوە لووزەویان بەسـت. لـەم کاتانـەدا جەرگەی سپای زەند خۆی لە بەرامبەر ترس و تۆقینی گشتی لەشـکرا ڕاگـرت و لەبەر پێداگری وەکیل لە شوێنی خۆی چەقی. چەکدارانی پیادەی قۆڵی تێکشـکاو کـە ئەمـەیان بـینی گەڕانـەوە و بەرپـەرچی زەبرەکـانی دوژمنیـان دایـەوە. شێخاڵیخان کە خۆشی تاق کەوتبۆوە و شەڕکەرانی پیادەی هەرەس بردووی لای ڕاستی ڕێبەرایەتی دەکرد، هەوڵی دەدا تێکەڵی هێزەکانی زەکیخـان بـێ. قۆڵـی چەپ بە ڕاگرتن و پاراستنی شوێنی دامەزرانی کەوتە پەلامار و دژەهێرش. قۆڵـی ڕاستی هێزەکانی فەتحعەلیخان پەرمپەرمی بوون و شـابازخان لەبـەر گـلانی ئەسپەکەی هەڵدێرا و بە دیل گـیرا و دیـواری هێلـی بـەرگری دەسـتی کـرد بـە داڕووخان. دوایین شالاوی شێخاڵیخان وێڕای سێهەزار نۆکەر و غولام و تاقمێک پیادە دڕی بە نێرینەی سپای ئەفشار دا و تۆپخانەی داگیرکردن. فەتحعەلیخـان شانبەشانی براکانی و پاشماوەی لەشـکر بـە قوونەشـەڕ گـەڕاوە لای بنکـەی سەرەکی خۆی. هەرچی لە مەیدانی شەڕا مـابۆوە بەرەڵـلا کـرا هـەتا بـە دەس کەریمخان و شێخاڵیخان بنەبڕ بکرێ. هەر لەڕێوەش زەکـیخـان کەوتـە دووی ڕاکردووان و ناچاری کردن دەس لە بارگەوبنە بەردەن و ڕاستەوخۆ بە مەبەسـتی خزانە پەنا دیوار و شووران بەرەو ورمێ تێیتەقێنن.

کەریمخان سەرلەنوێ لەشکری سەرکەوتوو بەڵام سڕ و ئالـۆزی خـۆی کۆکردەوە و خستنیە ژێر ڕکێفی شێخاڵـیخـان و خۆشـی وێـڕای پۆلەسـوارەی سکۆرتی و غولامانی تایبـەتی بـە مەبەسـتی بەسـەرکرنەوەی باروبارخانـە و چارەنووسـی لەشـکرگای گەڕایـەوە. ئەمیرگۆنـەخان کـە لـەڕێوە بـەڕاکردنی

سەرکردەکەی زانیبوو، هۆردووگای تالانکراوی زەندی دایە دەس عەلی شەشپەڕ و هەڵات. عەلی شەشپەڕیش تووشی هێزەکانی کەریمخان هات و لە ڕێگادا ماڵ و دارایی و ئەسیرەکانی جێهێشت و ڕەوی. وەکیل پاشان سوارانی سکۆرتی بە مەبەستی هێنانەوەی بارگەوبنە بەڕێکرد و چەند تەتەرێکیشی نارد بە شوێن نەدرخانی زەندا.

ئێستا وەختی تالان و دابەشینی هۆردووگای ئەفشار هاتبوو. شەشسەد سواری ئەرمەنی قەرەباغی بارگەوبنەیان دەپاراست، ئەم تاقمە پاش هێرشی لەگوڕی هێزەکانی زەند بە دیل گیران و وێڕای تاقمێکی تر لە سەرپەل و سەربازان بەتایبەت چەکدارانی ئەفغانی کوژران. ئەو سەرکردانەی خۆیان بە دەستەوە دا و سەریان وەبەر کەریمخان هێنا بەگەرمی وەرگیران و چاکەیان لەگەڵ کرا. بۆ وێنە شابازخان وێڕای خەڵات کران حوکمی حکوومەتی خۆی و سەڵماسی درایە[٣٤]. لەم کاتەدا نەجەفقولی دونبولی کە هەتا سنوورەکانی عوسمانی کەوتبوونە شوێنی، سەرەنجام داوای لە شێخالیخان کرد کە بینێرێتە بارگای وەکیل. خانی زەند لە وڵامدا گوتی هێشتا زووە و نابێ لەڕێوە پاش شەڕ بچێتە شیراز کە لێی خۆش بێ، بەڵام چەند مانگی دیکە دەتوانێ وا بکا. پاش گیرانی ورمێ تەواو پەنایان دایە نەجەفقولی و عەبدولخالەقی تازەلاوی برای و ئەوانیش کەوتنە ڕیزی غولامان و پیاوانی بەرەو زیادبوونی وەکیل[٣٥].

بەگوێرەی دابونەریتی باو سێڵاوی پیرۆزبایی سەرکەوتن و داوای سەر وەبەر هێنان لووزەوی بەست. یەکێک لەو کەسانەی شانی نەوی کرد پەناخانی

٣٤ـ گوڵشەنی مراد، ل ٨٥ ـ ٨٧؛ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ٢، ل ٣٦ ـ ٣٨؛ کەلانتەر، ل ٦٠؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٠٢ ـ ١٠٤؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٢٥ ـ ٣٢٧؛ سارەوی ١٧ ب؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٣؛ کووهمەرەئی، ل ٤٥٦؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٧٥ و GD X III, 4 September 1762 باسی دەنگۆی قەومانی شەڕێک دەکەن لە مابەینی فەتحعەلیخان و کەریمخاندا لە لای تەورێز کە وەکیل شکاوە؛ ڕەنگە ئەم دەنگۆیە سەبارەت بە ڕاکردنی نەدرخان بێ. ڕاپۆرتی دواتر لە ١٧ و ١٧ی ئۆکتۆبردا هەواڵی گیرانی شابازخانی تێدایە. لە گەمارۆی ورمێدا دەنگۆیەکی تریش دەربارەی فەتحعەلیخان وەبەرچاو دێ. گوڵشەنی مراد، ل ٨٨.

٣٥ـ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ٢، ل ٣٨ ـ ٣٩.

جەوانشێر، سەرۆکی قەڵای شووشی قەرەباغ بوو. تەورێز لەڕێوە دەروازەکانی بۆ محەممەدڕەزاخانی مەرەندی حوکمڕانی هەڵبژێراوی وەکیل خستە سەرپشت. بەلام کابرایەک بە ناوی میرزابابا بە پاڵپشتی ئەوەی کە فەتحعەلیخان لە ورمێ هێزەکانی ڕێکدەخاتەوە، بوو بە جڵەوکێشی ڕاپەڕینێکی گشتی لە تەورێز و حوکمڕانی نێردراوی کەریمخانی لێخست. لە دژەکۆدتایەکدا کە میرزا شەفیعی تەورێزی خەزێنەداری پێشووی نادرشا لە ئازەربایجان گەلاڵەی کردبوو، محەممەدڕەزاخان دووبارە گەڕایەوە سەر دەسەلات. میرزاشەفیع پاش کوژرانی نادر وەک بەڕێوەبەرێکی خودبەخودی ساکار بە فەرمانی برایممیرزا لە ساڵی ١٧٣٨ و بە حوکمی شاروخمیرزا لە ساڵی ١٧٥٠ و ١٧٥٦دا لە ئازەربایجان مایەوە[٣٦]. میرزابابا و هاوکارانیان بە کۆت و زنجیرەوە ناردە لای کەریمخان، بەلام پاش ئەوەی فەلاقە کران توانی بە کەیخودایەتی ڕزگاریان بکا.

لە پازدەی مانگی قوربانی ساڵی ١١٧٥ی کۆچی / جوولای ١٧٦٢ی زایینیدا کەریمخان و سپاکەی لە لایەن کاربەدەستان و خەڵکی تەورێزەوە پێشوازییان لێکرا. سەرلەنوێ میرزا شەفیع کرایەوە ساحێبئیختیار (شارەوان) و خەزینەدار و جێژنێکی گەورە گیرا. حەوتووی دواتر ئەو کەیخودایەی نێردرابووە لای پەناخان بە گفت و پەیمانی مڵکەچی ناوبراوەوە گەڕایەوە. پەناخان یەکتەکان قبووڵی کردبوو کە پەلاماری کازمخانی قەراچەداغی دراوسێی بدا[٣٧] و وادیار بوو نەیدەویست خۆی بخاتە تەڵە و داوی دوژمنێکی بەهێزی تازە لە پشت سەریڕا. یەکێکی تر لە هۆکارەکانی پێداگرتن بە مەبەستی نیزیکبوونەوە و تێکەڵاوی لەگەڵ خانی زەند ڕاگیرانی برایمخەلیلئاغای(٨) کوڕی بوو لە ناوەندی سەرکردایەتی فەتحعەلیخان لە ورمێ کە هێشتاش وەک بارمتە لەو شارە دەژیا[٣٨]. نەدرخانی ڕاکردووش گەڕایەوە. هێشتا چەند ڕۆژ بە سەر هەڵاتنیدا تێنەپەڕیبوو کە تەتەری کەریمخانی گەیشتێ. ئێستا وێدەچوو کە تەواوی هەودا بێپێزەکانی پەیوەندی و تێکەڵایەتی هێندێک خۆیان گرتبێ. سپای

٣٦ـ فەرمانەکان لە نادرمیرزا، ل ٢٨٣ ـ ٢٨٧ وەرگیراوە.

٣٧ـ گوڵشەنی مراد، ل ٨٨ ـ ٨٩.

38- Bakikhanov, 158 note, 162.

زەند پاش یازدە ڕۆژ مانەوەی لە تەورێز بە کەلوپەل و کەرەسەی پێویستی گەمارۆوە ئەم شارەی بە مەبەستی دەورەدانی ورمێ بەجێهێشت[٣٩].

## ٥ ـ ٦ گەمارۆی ورمێ

سپای زەند بە پارێزەوە هەنگاوی نایە لێواری باشووری گۆلی ورمێ و بە دەورەیدا سوورایەوە و کەوتەڕێ. هەزاروپێنسەد کەسی دەسکەرەوەی ئەم لەشکرە بە سەرکردایەتی برایمخان(٩) عەمارلوو بە مەبەستی پاراستنی ڕێگا و ڕەوگەکان پێشەنگێتی لە ئەستۆ بوو. ڕۆژی ٢٤ی جوولای ١٧٦٢ سپای زەند لە نیزیک دەوروبەری شاری ورمێ هۆردووبەزی کرد. زەویوزار و باغ و باغاتێکی هەوراز و لێژ کەوتبووە نێوان لەشکر و شار؛ گۆلاوێک بە درێژایی ٣٦ کیلۆمیتر لە لای ڕۆژهەلاتەوە لە پشت سەریان ڕاکشابوو؛ لە قۆلی ڕۆژاوا ڕووبارێک بە درێژایی ٩٠ کیلۆمیتر بە نێو مووچە و مەزراکاندا دەخوشی. بەلام لە لای باکوورەوە لەشکر تەنیا سەعاتەڕێیەک لە شارەوە دوور بوو کە دەشتێکی بەڕێژەوی دەکەوتە نێوان و خەندەکێکی لێژ لەبەر دەمی هەلزەقیبوو. فەتحعەلیخان چاوەڕێی هاتنی تۆپ و تۆپخانەیەکی زیاتر بوو لە لایەن حەسەنعەلیخانی قاجار حاکمی ئێرەوانەوە. کەریمخانیش بازنەیەکی بە دەوری شارا کێشا هەتا بیخاتە گەمارۆیەکی تەواو. شێخالیخان لەگەڵ تاقمێکی تایفەی زەند و تیرە و توخمەکانی دانیشتووی دەرودەشتی هەمەدان ڕاسپێرابوو کە لە قەراخ گۆلی ورمێ دامەزرێ. عەلیخانی شاسەیوان و سوارانی فارسی لە ژێر فەرمانی ڕەفیعخانی قاجار لە لای ڕۆژاوا کەوتنە سەنگەر لێدان. ئەرکی توراب‌خانی نەهاوەندی بە دەستەوە گرتنی بەرەی باکووری بوو. هەروەها لەم جەللەبەستن و دامەزرانەدا، لوڕان و کوردان و عەلیمەردانخانی گچکەی بختیاری(١٠) کە زۆربەیان دانیشتووانی ناوچەکانی شاخستانی بوون لە داوێنی بەرزاییەکان دامەزران هەتا پشتی بەرە بپارێزن.

لەم کاتەدا فەتحعەلیخان تاقمێکی فرەی پیاوانی هەلبژاردەی لەشکرەکەی بە پالپشتی تۆپخانە لە شار ناردە دەر هەتا بەر لەوەی سپای زەند

---

٣٩ـ گولشەنی مراد، ل ٨٩ ـ ٩٠.

ڕێگای پێشڕەوی بەرەو لەشکرگای سەرەکی ئەو خۆش بکەن یان بە گوتەی غەففاری ئاگری تۆپان بە سەر شارا دابارێنن، بەرپەرچیان بدەنەوە. تۆپخانەی دوژمن کەوتە دەسکردنەوە و سپای پیادە خۆڕاگری کرد. شێخالیخان و سەرکردەکانی تری زەند سوارەکانیان بە مەبەستی بەگژ داچوونەوە هێنایە جۆللانە. هێرشی بەتەوژمی دوژمن بۆ نێو جەرگەی سپای زەند تێکشکا و فەتحعەلیخان بە تووڕەیی ڕووی کردەوە پەنا حەساری شار و لە زارکی هەڵدێر و هەڵەمووتی دەروازە دابەزی و دەستی کرد بە شەڕ و لای ڕۆژاوایە لەپڕ بەناچار ڕایکردەوە ژوور. لە ماوەی سێ حەوتەی داهاتوودا هێزەکانی زەند بێ هیچ کۆسپ و سەرێشەیەک خۆیان دایە گەمارۆی چرپڕی شار[٤٠]. تەنیا لەم ماوەیەدا هۆز و تایفەکانی یەزیدی (ئیزەدی)، بلباس و هەرکی(١١) چیانشینی دەوروبەر بە مەبەستی تالان و بڕۆ پەلاماری هۆردووگایان دەدا. نامی ئەم مەبەستە دەخاتە ڕوو کە ڕێبەرانی یەزیدی خۆیان بە سوننی و مسولمان دەناسێنن، بەلام پرانی پەیڕەوانیان خاوەنی بیروباوەڕێکی نزم و نەوین و هێندێکیشیان هیچ بڕوایەکیان نیە. ئەم تیرە و تایفانە بە هێرش و شالاوی نەپساوەیان بۆ سەر سپای زەند و زەبروەشاندنی لەنەکاویان بە سواری ئەسپانی خۆشبەز و ڕیزەلەیان و پەلاماردانی ئەو پیاوانەی لە قوولایی خەندەک و شوێنەکانی تر سەرقالی کار بوون یارمەتی دوژمنیان دەدا. بەلام سەرەنجام جەغزی گەمارۆی شار تێکبەزی و تۆپبارانێکی قورس و ڕێکوپێک دەستی پێکرد[٤١].

پەلامارێکی دیکەش لە ژووری شارەوەڕا بە سەرکردایەتی ئەمیرگۆنەخان ئەنجام درا. ئەمیر بە هەڕەشەوگوڕەشە پێی وابوو ئەم شالاو خاشەی زەندیە دەبڕێتەوە. شانبەشانی ئۆغرلووسولتان هێرشی دەسپێکرد. بڕیار درا تاقمێکی تەکتیراوێژان لە پشت گابەردان خۆیان مەلاس دەن و پاشان چەکدارانی محەممەدئەمینخانی گەڕووسی بە مەبەستی ڕاکێشانی دوژمن بۆ نێو بۆسە شالاویان بەرنێ. بەلام خەریکبوو تۆڕی ماسیگرتنی ئەمیرگۆنەخان بە تەکانی ماسییەکی گەورەتر لە تۆڕ و داو پسپس بێ: شێخالیخان گورمی بەست و دەستی کرد بە بەرپەرچدانەوەی دوژمن و گەلێکی شەڕکەری ئەفشار بە دیل گرت و

٤٠ـ گولشەنی مراد، ل ٩٠ ـ ٩٥.

٤١ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ١٠٥ ـ ١٠٦.

کوشتی؛ پاشماوەکانی بەرەو داوگە هەڵبڕی. بۆسەگرتووان هەڵزەقین و ڕێژنـەی گوللە بە سەر خەنیماندا باری. یەکسمی شێخاڵیخان ئەنگوا، بـەڵام سـەرداری زەند پێی لە ئاوزەنگی ئەسپێکی دیکـە قـایم کـرد و چـۆوە سـەر خـوانی زیـن. هێزەکـانی پشـتیوان بـەوەخت دابـارین و بۆسـەگرانیان تێکشـکاند و زۆریـان دەردەس کران[٤٢].

درێژەی ماوەی گەمارۆ شوێنێکی خراپ و نالەباری لـە سـەر دوو بـەرە دانا. وردەوردە وەرزی سەرماوسۆڵ جێی بە هەوای هاوینـەی ئازەربایجـان لێـژ دەکرد. ئێستا فەتحەعلیخان بە شادمانییەوە دەیگوت کە «لە بەرەی(١٢) ئێمـەدا ڕیشسپییەک هەیە ...»[٤٣] هێزەکانی زەند کە لە بەر سـۆزی سـەرمای زسـتان و بـەفر و بـاران و سەهۆڵـبەندان و نـەبوونی پـەنا و پەسـیوێک حـەجمینیان لێهەڵگیرابوو، بە مەبەستی بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم کـەش و هەوایـە بـە دار و چرپی و حەسیر و هەڵاش کەپر و خانووچکەیان ساز کرد و خۆیان تێدا پـەنا دا و سەرانسەری زستان لە مەتەرێزەکانیان نەکشانەوە[٤٤]. سەرەڕای دابارینی تۆپ لـە لایەن گەمارۆدراوانەوە کە بە یارمەتی هەشت تۆپی دیاری دەستی عوسمانییەکان ئەنجام دەدرا[٤٥]، بازنەی گەمارۆ تەنگتر بوویەوە، بەڵام تۆپخانەی کەریمخان کـە ڕۆژ هەتا ئێوارێ شوورەی شاریان دەدایە بەر ئاگر شوێنێکی وای نەدەکردە سەر دیوار و پەناگە قایمکراوەکانی ورمێ. سەرەنجام زۆربوونی ژمـارەی تۆپـەکان و گوللەباران لە هـەلومـەرجی دەمارپڕووکـاویدا، شـوێنێکی زۆری کـردە سـەر دانیشـتووانی شـار کـە پێیـان نابوویـە یەکـەم قۆناخـەکانی قـاتی و قـڕی. ئاخرییەکەی پاش ئەوەی پیلانی کوژرانی کەریمخان سەری نەگرت، هیوای خانی ئەفشار تەواو بـا بـردی[٤٦]. لەبـەر ویسـتی جـەماوەر و لـە ترسـی خەیانـەتی

٤٢ ـ گوڵشەنی مراد، ل ٩٥ ـ ٩٦.

٤٣ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٠٦، «ئێمە ڕیش سپییەکمان هەیە کە لەم ڕۆژانەدا دێ.» غەففاری لە گوڵشەنی مراد، ل ١٠١دا هەر ئەم مانایەی هێناوە.

٤٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٠٦ ـ ١٠٧؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٠٠ ـ ١٠١ و فەسـایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٣.

٤٥ـ کووهمەرەئی، ل ٧٩.

٤٦ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٠١، تاریخی گیتی گوشای زەندیە، ل ١٠٧.

هاوڕێیانی ملی بۆ هەلومەرجی خۆبەدەستەوەدان ڕاکێـــــشا[47]. لە بەرەبـەیانی شابانی ساڵی ١١٧٦ی کـۆچی / ٢٠ی فێوریــەی ساڵــی ١٧٦٣ی زایـینیدا، پـاش حەوت مـانگ[48] گەمارۆ لەگەڵ تاقمێکی یارانی لە شار هاتەدەر و ملکەچانە خـۆی دایە دەس کەریمخان. کەریمخان ڕێزی لێگرت و بە دەوری داهات و لاواندییـەوە. چەکدارانی سەربازگەی ورمێ و خەڵکی شار بۆ سبەینێ خانی زەندیان بینی کـە سەرکەوتووانە پێینایە ئاخرین مەتەرێزی خۆڕاگری ئێرانی ڕۆژاوایی.

## ٥ ـ ٧ کەریمخان لە ئازەربایجان

کەریمخان لەبەر ئەو ڕەوت و ڕێبازەی سەبارەت بە هێنانـە ژێرڕکێفـی ئێرانی ناوەندی و باشووری گرتبوویە بەر و وای کردبوو تـا سـەر بەرهەڵسـتی ڕێبەرانی سیاسی و لەشکری کاشان و ئیسفەهان و شیراز بێ و بە زەبـری چـەک سەر بە سەربزێوانی یەزد و کرمان نەوی بکا و بە سەرنجدان بە زەبـر و چـالاکی شەڕی باکووری وڵات، بۆ یەکەم جار خۆی بە خاوەن دەسەڵاتی تـەواوی ئێـران دەزانی. تەنیا بابەتێکی ناوازە ئەیالەتی خوراسان بوو کە لـە لایـەن شـازادەی ئەفشارەوە وەک نێوان و لەمپەرێک لە مابەینی ئیمپراتۆرییەکانی ئەحمەدخانی دورانی و کەریمخانەوە بەڕێوە دەچوو. هاوکات لەگەڵ لێکهەڵوەشـانی یـەکێتی خێڵی ئەفشار لە ماوەیەکی کورتی پاش داڕووخانی دەسەڵاتی سەرکردەی قاجار، بیروڕای سەروەبەرهێنانی خانی زەند لە ئازەربایجاندا ببـوو بـە بیرۆکەیـەکی گشتی. لەم ڕۆژگارەدا کێشەی لادان و گۆڕینی دەسەڵاتەکانی بنەماڵەیی ناوچە و بەتایبەت جێگۆڕکە پێکردنی سەرکردەکانی تاقمی تێکشکاو یان گومانلێکراو یـا ئەوانەی کە بەڕواڵەت نارەزامەند بـوون یـان ملکـەچی خۆیـان دەرنەبـڕیبوو،

---

٤٧ـ گوڵستانە، لە موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٣٩دا بە ئاشکرا دەڵێ کە ئەمیرگۆنەخان لـەم قۆناخەدا کەینەوبەینەی لەگەڵ زەندیە بووە و پێشنیاری کردبوو کە بچێتە لای ئەوان.

٤٨ ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٠٢، ١٠٣؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٠٨، کووهمـەرەئی، ل ٤٥٧ (کۆمەڵێک مێژووی کۆن دەگێڕنەوە و ئەم ڕووداوە دەبەنـەوە سـەر ساڵـی ١١٧٦)؛ بریوین پێی وایە ساڵی ١٧٦٥ بووە. زۆربەی سەرچاوەکانی چوارقۆڵی ماوەی گەمارۆکـە بە نۆ مانگ دەزانن. ئەگەر بڕوا بە غەففاری بکەین دەبێ زیاتر بووبێ.

پێویستی دەنواند. حکوومەتی ورمێ درایە دەس ڕۆستەمخانی قاسملوو کە مەهدیخانی ئەفشاری باوکی کۆنەڕەقیبی فەتحعەلیخان بوو[٤٩]. ڕۆستەمخان هەتا ساڵی ٦ـ١٧٦٧ کە بە هۆی ڕاپەڕینی تێکڕای جەماوەر بە لایەنگرێتی ڕەزاقولیخان کوژرا، هەر حاکمی ئەو شارە بوو. پاش ئەو فەرمانی حکوومەتی ڕەزاقولیخانیش لە لایەن کەریمخانەوە دەرچوو. دوای مردنیشی لە ساڵی ١١٨٥ی کۆچی / ١٧٧٠ـ١٧٧١ی زایینیدا ئیمامقولیخانی کوڕی کە پێشتر وەک بارمتە نێردرابوویە شیراز کرایە جێنشینی باوکی و بەرەو ورمێ کەوتەڕێ. لە ماوەی دوازدە ساڵ دەسەلاتدارێتی ئیمامقولیخان، سێبەری دەسەلاتی خێڵی ئەفشار بە سەر ئازەربایجانا پەرەی گرت. وەک گێڕاویانەتەوە ناوبراو خەراجی ساڵانەی لە دراوسێیانی ناوچەکانی سنە و سابلاغ و مەراغە و خۆی وەرگرتووە. ئەگەرچی سەپاندنی ئەم دەسەلاتە بە دژواری دەیتوانی نەپساوە بێ، بەلام واوێدەچوو کە حوکمڕانی دونبولی خۆییە بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی دوژمنانی لە قەفقازی ڕۆژهەلاتی پێویستی بە یارمەتی ئیمامقولیخان هەبوو. بانگەشەی سەربەستی ناوبراو لانیکەم لە سەردەمی سستی و بۆشایی دەسەلاتی پاش مەرگی کەریمخان لە ئێراقی عەجەمدا ڕەنگی داوەتەوە. ساڵی ١٧٨٣ لە شەڕێکی لەگەڵ لایەنگرانی عەلیمرادخانی زەند رایکرد[٥٠].

مەلبەندی دونبولی و خۆی و سەلماس وەکوو زۆربەی ناوەندەکانی هەرێمە دوورەدەستەکانی ئیمپراتۆرێتی نادری دژی زولم و غەدری ئەستاندنی باج و پیتاکی ئەوان سەردەمان توندوتیژ سەری هەلدا. بەرزبوونەوەی باجەکان بە شێوەیەک بوو کە پیتاکی دیاریکراوی ساڵی ١٧٤٤ی سەردەمی سەفەوی، لە ٣هەزار تمەنەوە گەیشتە ١٠٠هەزار تمەن. سەردارانی دونبولی واتە مورتەزاقولی و نەجەفقولیخانیش یارمەتی ڕاپەڕیوانیان دەدا[٥١]. درێژەی ناڕەزامەندی جەماوەر لە شای ئەفشار بوو بە هۆی سەرهەلدانی کۆمەلێک ڕاپەڕینی سەرنەکەوتوو لە نێو جەرگەی شاری تەورێز بە ناوی لایەنگرێتی لە

---

٤٩ـ گولشەنی مراد، ل ١١٣؛ کاویانپوور، ل ٧٩.

٥٠ـ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ٢، ل ٢٥٤ ـ ٢٥٥، دێهگان، ل ٣٨٤ ـ ٣٨٦ (ئەم دوو کتێبەی لەبری عەلیمرادخان، بە هەلە نووسیویانە عەلیمەردانخانی زەند.)

51- See Arunova and Ashrafyan, Gosudarstvo, 176.

سەفیمیرزای داخوازەری جێنشینی خانەدانی سەفەوی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەو و عادڵشادا[٥٢]. ئازەربایجان لەبەر چەند هۆ و هۆکارێک چەشنی گەوهەرێکی تررووسکەدار لە سەر پۆپەی ئیمپراتۆرێتی سەفەوی دەدرەوشا: حوکمڕانی ئازەربایجان لە نێو گەورە سەرداران هەڵدەبژێردرا و دوای پاشا داهاتی لە هەموو کەس زیاتر بوو. ژمارەی لەشکرییانی ئەم هەرێمە لە هەرێمەکانی تری ئێران پتر بوو[٥٣]. تەورێز لە ماوەی سێ سەدەدا ناوەندی ئیمپراتۆرییەکانی ئێرانی ـ ترک بووە و کەوتۆتە ژێر ئاڵای دەسەڵاتی ئێلخانانی مەغوول و قەرەقۆینلوو و ئاققۆینلوو و سەرەتای پەیدابوونی بنەماڵەی سەفەوی؛ بۆیە پاش مەرگی نادرشا لە خۆی ڕادەدی کە لانیکەم وەک ئیسفەهان و شیراز بە توندوتیژی و خوێنڕێژی دیسانیش بانگەشەی دەسەڵاتی بکاتەوە. یان چەشنی ئیسفەهان ببێتە هۆی کێشمەکێشی نێوان سەرکردە لووتبەرزەکانی تایفە و چەکدارانی تایبەتی کە پاش پەرمپەرم بوونی سپای ئەفشار بەدی هاتبوو. هەروەک ئاشکرایە شاری تەورێز بە ڕیز دەوری خانەخوێی برایممیرزا و ئازادخان و فەتحعەلیخانی گێڕاوە لە وەختی هەوڵ و تەقەلایاندا بە مەبەستی ژیاندنەوەی ئیمپراتۆرێتی ئێران بە پاڵپشتی هێزەکانی خۆماڵی. کوردەکانی دونبولی تەنانەت لە هەڵکەوت و ڕووداوەکانی سەدەی یازدەدا کە سەرۆکەکەیان بۆ پشتیوانی کردنی شێخ جونەیدی باپیری شاسمایلی سەفەوی[٥٤] ڕاپەڕیبوو، ببوونە هەوێنی کار و کاردانەوەی ئەو سەردەمە. بە تێکشکانی دوایین داخوازەرانی تاج و تەختی ئیمپراتۆرێتی، کەریمخان ڕێوڕاست وەک جێنشینیمیری ئێران ناسێندرا. بە ڕەچاوکردنی ئەم تێبینییانە نەجەفقولیخان کە لە هۆردووی نادریدا خزمەتی دەکرد و لە زەمانی گەڕانەوەی لە ساڵی ١٧٤٢ڕا هەر جارەی لە پلە و دەسەڵاتێکا حکوومەتی تەورێزی هەڵسووڕاندبوو،

٥٢ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٨ ـ ٩؛ کووهمەرەئی، ل ٤٥٨؛ Lockhart, Nadir shah,251.

٥٣ـ cf . Minorsky, T M, 161, 174. تەورێز یانی ئازەربایجان بەکردەوە بە باری مووچە و مانگانەی حوکمڕاندا پلەی سێ و بەگوێرەی پێرستی مینۆرسکی لە ڕوانگەی داهاتەوە پلەی دووی بووە. ل ٣٢١ی ڕۆستەموتتەواریخیش دووهەمین داهات پاش فارس سەر بەم پارێزگایە دەزانێ.

٥٤ـ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ٢، ل ٤١؛ ئاغاسی، ل ١٩٦ ـ ١٩٧.

هەڵبژاردەوە بە پارێزگاری ئازەربایجان. ئەحمەدخانی مامیشی لە حکوومەتی خۆی و سەڵماسدا دەستی کرد بە کار و وێدەچێ لەو دەمەڕا بەجێی شابازخانی برای بووبێتە سەرۆک یان مەزنەسەرۆکی خێڵ. خودی شابازخان وێڕای کوڕەی گەنجی نەجەفقولیخان یانی عەبدوڕڕەززاق چوونە ڕیزی ڕکێفدارانی وەکیل هەتا وەک بارمتە لە شیراز دانیشن[٥٥]. لەم ساڵانەدا عەبدوڕڕەززاقخان دەستی کرد بە نووسین و لە ٥ی مارسی ١٧٧٤دا شابازخان بە نەخۆشی ئازارەباریکە مرد. گۆیا کەریمخان ناوبراوی زۆر خۆشویستووە و کچێکی کردۆتە بووکی خۆی و لە ئەبولفەتحخانی کوڕی مارە کردووە. ئەم کچە ناوی ساحێبسوڵتانخانم بووە[٥٦].

بە هەڵبژێرانەوەی میرزا محەممەدشەفیع وەک خەزێنەداری ئەیالەت کارەکانی بەڕێوەبەرایەتی هەمیشەیی زیاتر برەوی پەیدا کرد. ئەم پیاوە نیازپاکی خۆی سەبارەت بە وەکیل لە سەردەمی گیرانی تەورێزدا نیشان دابوو؛ لە مانگی فێوریەی ساڵی ١٧٧١ بە فەرمانێک یان لانیکەم بە ڕەزامەندی کەریمخان حاجیمحەممەدڕەفیعی تەورێزی کرایە جێنشینی[٥٧]. میرزامحەممەدیش لە سەر داخوازی زۆرینەی جەماوەر وەک سەرۆکی شارەوانی (کەلانتەر) هەڵبژێرا و لە ساڵانی ١١٧٩ی کۆچی / ١٧٦٥ و ١١٨٧ی کۆچی / ١٧٧٣ لە سەر داخواز و ڕاسپاردەی نەجەفقولیخان لەم پلەیەدا مایەوە[٥٨]. میرزا خەلیلی مەراغەییش لە سەرەتای ساڵی ١١٧٧ی کۆچی / جوولای ـ ئاگۆستی ١٧٦٣ کرا بە خەزێنەداری شاری مەراغە و لە ساڵی ١١٨٦ی کۆچیدا سەرلەنوێ بە مووچە و مانگانەیەکی زۆر زیاترەوە ماوەی خزمەتی درێژ کرایەوە[٥٩].

لەو دەمەڕا ئەم ئاڵوگۆڕە ئیدارییە کۆتایی پێهات تا برانەوەی پاشەواری پاشایەتی کەریمخان، ئازەربایجان وەک پارێزگایەکی لایەنگری ئارام و سەر بە خانەدانی زەند مایەوە. تەقەلایەک بە مەبەستی دژایەتی نەجەفقولیخان لە لایەن ناحەزانییەوە ڕەنگی دایەوە: ڕووداوەکە ئاوا بوو کە

٥٥ـ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی یەکەم، ل ٨٧؛ نادرمیرزا، ل ٢٧٢.

٥٦ـ ئاغاسی، ل ١٩٧ی یادداشت.

٥٧ـ نادرمیرزا، ل ٢٨٣ ـ ٢٨٧. (ڕوونووسی فەرمانەکانی.)

٥٨ـ هەمان، ل ٢٦٨ ـ ٢٧١ و ٢٩١ ـ ٢٩٣.

٥٩ـ کەریمخان، فەرمان، ژمارە ٢٠ و ٢١. B. L. Ms. Or. 4935

دەوروبەری شەشەکانی ساڵی ۱۱۸۳ی کۆچی / نوامبری ۱۷٦۹ی زایینی، کە بۆ دوایین کەڕەت وەرگرتنەوەی حوکمی هەڵبژێرانەوەی چووبووە شیراز، خەنیمەکانیشی کەیخودایەکیان ناردە لای وەکیل هەتا بە قازانجی شابازخانی برای لە سەر کار لای بدا. جا هەرچۆنێک بێ بەر لەوەی ئەم داخوازە بێتە دی، شابازخان مرد و نەجەفقولیخان تا کۆتایی پاشایەتی وەکیل کەس کاری پێینەبوو[٦٠] تا درێژە بە کارەکانی بدا کە لە ڕوانگەی دژبەرانەوە هەلسوکەوتی چەشنێک ملهوڕی و شوولێهەڵکێشان بوو. وەختایەک خانی زەند دواتر بە مەبەستی حەسانەوە لە ژێر باڵی هەوای فێنکتری هاوینی خۆیە چووە ئەو مەڵبەندە، شانازی نازناوی «خان»ی دا بە ئەحمەدبەگی دونبولی(۱۳). حاکمی شارەکانی شاخستانی سنووری هەتا ئێرە بێ ئەوەی هیچ باج و سەربازێک بدەن تەنیا بە سەروەبەرهێنانی سەرزارەکی خۆیان بواردبوو، ناسراوترینی ئەم تاقمە کازمخانی قەراچەداغی بوو. بەڵام ئێستا وایان بە بەرژەوەند زانی هەرکام بە ناردنی سەربازی ئێلجاڕی، بچنە سپای زەندەوە[٦١].

ئێستا وەختی ئەوە هاتبوو کە زەبروزەنگێک بە دژی ئاژاوەگێڕانی نێو قەڵەمڕەوی زەند کە کۆسپ و تەگەرەیان خستبووە سەر ڕێگاوبانەکانی پێوەندی کەریمخان نیشان بدرێ. حاجی جەمالی فوومەنی کە جارێکی تر بە فەرمانی محەممەدحەسەنخانی قاجار حکوومەتی گیلانی وەدەس هێنابۆوە، ماوەیەکی کەم بەر لە کوژرانی سەرکردەی قاجار ماڵاوایی لە ژیان کرد. هیدایەتوڵڵاخانی کوڕی کە هاتبووە تاران، بە خزمەت و لێوەشانەوەی سەرنجی کەریمخانی ڕاکێشا و نازناوی «خان»ی وەرگرت. لە وەختی تێکهەڵچوونی کەریمخان و فەتحعەلیخانی ئەفشاردا هەلەکەی قۆزتەوە و ڕایکرد و گەڕایەوە شاری ڕەشت و

٦٠ـ نادرمیرزا، ل ۲۷۰ و ۲۷۲.

٦١ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۰۵؛ گولشەنی مراد، ل ۱۱۳؛ هەردک سەرچاوە پەناخانیش دەخەنە سەر ئەم بابەتە. بەڵام هەروەک Bakikhanov دێنێتەوە بیر (ل۱٦۲) ئەو بەر لە گەمارۆی ورمێ چووبووە نێو ڕیزی هێزەکانی زەند. کوڕەکەی سەرلەنوێ حکوومەتی گرتەوە دەس و بە فەرمانی وەکیل کرایە حاکمی قەرەباغ. پەناخان چووە ڕیزی میوانان ـ بارمتەکانی شیراز و ماوەیەک دواتر لەم شارە کۆچی دوایی کرد و مەیتەکەی بۆ ناشتن نێردرایەوە قومشە.

حوکمڕانی هەڵبژێراوی خانی زەندی لەو شارە ڕەتاند. پاش شەڕی ورمێ وەکیل توانی محەممەدحوسێنخانی زەندیهەزارە بە خۆی و هێزێکی دوازدەهەزار کەسی بە مەبەستی تەمێ کردنی بنێرێتە سەری(١٤). محەممەدحوسێنخان بەزاندی و گرتی و هێنایە ورمێ. کەریمخان تەنیا دوازدەهەزارتمەنی تاوان لێئەستاند و بە پیاوەتی و کەیخودایەتی دۆستانی سزای دیکەی نەدا و دانانی نەزەرعەلیخانی زەندی ئامۆزای بە مەبەستی پاراستنی ناوچەیەکی ئاوا بارناسکی وەک گیلان بە تەواو زانی[٦٢].

کوردەکانی بڵباس و هەرکی و یەزیدی تەنانەت پاش گیرانی ورمێ درێژەیان بە هێرش و پەلامارە نەپساوەکانی خۆیان دا، بەتایبەت وەختایەک سپای کەریمخان نیزیک بۆوە لە هاوینەهەوارەکانی هۆزی بڵباس لە ناوچەی «چاڵدران»ی بەشی دەرودەشتی لای خۆیە. لەم ڕۆژگارەدا فەتحعەلیخانی ئەفشار ئەوەندەی باوەڕ و دڵنیایی وەکیل وەدەس هێنابوو کە بە سەرۆکایەتی سپاکەی خۆی بنێردرێتە سەرکوتکردنی ئەم هۆز و تایفانە. سەرکردەی ئەفشار زۆری لێکوشتن و ماڵەکانی تێکوەمەکان دان و سێهەزار دیل و گەلێک ماڵ و سامانی تالانکراوی کە برێتی بوون لە دەهەزار سەر مەڕ و ئەسپ لەگەڵ خۆی هێنا و دایە دەس کەریمخان هەتا بە سەر لەشکرەکەیدا دابەش بکا[٦٣]. ئەوەی دەمێنێتەوە و دەبێ بخرێتە ڕوو، ئەمەیە کە تازەترین ڕقەبەرانی ئێستای کەریمخان چۆنیان کۆتایی بە ژیانیان هێنا.

## ٥ ـ ٨ ئازادخان و فەتحعەلیخان: چوونە پایحیساب بۆ ئاخرین جار

ئازادخان ماوەی دووسالان لە گورجستان وەک دوورخراوەیەکی تێر و تەسەل دەژیا و بەناچار تێگەیبوو کە ئێستا دەسەلاتی کەریمخان پەلوپۆی

---

٦٢ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٠٤ ـ ١٠٥؛ بۆ توێژینەوەی ڕووداوەکانی دواتری گیلان بڕواننە: ١٣ ـ ٢.

٦٣ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٢٩ ـ ٣٣١؛ گوڵشەنی مراد، ل ١١٦ ـ ١١٧. غەففاری باسی ٥٠هەزار سەرمەڕ و ٢٠هەزار سەر یەکسم دەکا.

پەوی هاویشتۆتە هەرێمەکانی ئێرانی ڕۆژاوایی و ئومێدێکی وا نیە بۆ گەڕانەوە ئێران. پاش ماوەیەکی کەم وەکیل دوو کەس لە خانەکانی شاملووی بە ناوی محەممەدزەمانخان و عەبدولغەففارسوڵتان کە ماوەیەک لە گورجستان ژیابوون، بە دوو نامەوە ناردە لای ئارکێل و ئازادخان و داوای کرد کە سەرکردەی دوورخراوە بگەڕێتەوە ئێران هەتا لە ژێر سێبەری پەنایەکی شەرافەتمەندانەدا بژی. ئازادخان کە ڕقەبەری پێشووی بە سەرراست و خاوەنبەڵێن دەزانی، پێشنیارەکەی قبووڵ کرد. ئارکێل لەگەڵ کۆمەڵێک سوارەی سکۆرتێ و هێندێک دیاری بۆ خزمەت وەکیلی بەڕێکردەوە. وەختایەک پێی نایە ناوەندی سەرکردایەتی وەکیل هەروەک بەڵێن درابوو پێشوازی لێکرا تا پاشماوەی تەمەنی سەردەمی دیلێتی لە پەنا کۆنەدوژمنی بە خێر و خۆشی تێپەڕ بکا. ناوبراو یەکدوو ساڵ پاش مەرگی وەکیل لە ساڵی ١٧٨١دا مرد و لە سەر وەسێتی خۆی مەیتەکەیان ناردەوە کابولی زێدی و لەوێ ناشتیان. غەففاری بۆ ڕێزگرتن لە کەسێکی کە ڕقەبەری هێژای وەکیل بوو ئاوای باس کردووە: لەچاو فەتحعەلیخان پیاوێکی ڕەند و مەند و کەسایەتییەکی تایبەت بوو کە تێکڕای دەگەڕایەوە سەر ئازایەتی و دەماری ئەوپەڕ دلێرانەی، بۆیە وەختایەک سەردارانی زەندی بەزاند و دەستی بەسەر بارگەوبنە و ژنانیان داگرت، داب و نەریتی جوامێری و پاکداوێنی زۆرچاک ڕەچاو کرد و بەکردەوە پیاوەتییەکی بێوێنە و شایانی باسی لەگەڵ ژنانی دیل نیشان دا[٦٤].

فەتحعەلیخان لە زۆر بارانەوە تەواو پێچەوانەی ئازادخان بوو. لە زۆربەی ئەو بەرپرسایەتی و شوغلانەیدا کە هەیبوو کابرایەکی هەڵپەرست و نزم و ملۆزم بوو. وەختایەک لە لایەن برایممیرزا یان ئازادخانەوە لە شیراز و

٦٤ـ گوڵشەنی مراد، ل ١١١ ـ ١١٢؛ ئەم نەقڵە دەگەڕێتەوە سەر ئاکار و کرداری ئازادخان لەگەڵ ئەسیرەکانی قەڵای پەری لە ساڵی ١٧٥٣دا. هەروەها بڕواننە: تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١١٣ ـ ١١٤؛ کووهمەرەئی، ل ٤٥٧؛ دونبولی، تەجرەبە، ل ٣٩؛ Butkov I, 246 ; III, 99. گوڵستانە لە ل ٣٣٠دا دەڵێ کە ئازادخان بۆخۆی بۆ داوای لێبووردن لە کەریمخان هاتە پێش و ئەویش پەنجا کەسی لە لاوانی زەندی هەزارەی بۆ کردە سوارەی سکۆرتێ و مانگانە ٣٦٠تمەنی بۆ بڕییەوە. برووسە لە ل ٢٣٧ی کتێبەکەیدا دەڵێ کە ئازادخان گێردرابۆوە ئێران.

ئیسفەهان حکوومەتی دەکرد بە لانی زوڵم و ملهوڕیدا ببوو بە گـای قەشـان(١٥).
پاش ڕاماڵینی ئازادخان و تاراندنی بە دەست محەممەدحەسەنخانی قاجـار بـە کش و فشی ڕواڵەتی و سەرتر بوونی لەچاو قوڵەحاکمەکانی خۆولاتی گەڕایـەوە ئازەربایجان. وەختایەک خۆی دایە دەس هێزەکانی زەند ئەوەندەی پێـیخـۆش بوو لە کەریمخان نیزیک بۆوە و دەیویست کە بـەم شـێوە و بـە ژن و ژنخـوازی لەگەڵ سەرۆکانی ئازەربایجان پلـە و پایـەی خـۆی بپـارێزێ، بـەلام ئەمانـە بەڕاستی ئەوەندەی لێ ڕەنجابوون کە دەیانویست هەرچی زووە خۆیان لـە داوی ئەم کابرا زمانلووس و مەترسیدارە دەرباز کەن[٦٥]. تەنانەت بـەر لـە ڕۆیشـتنی وەکیل لە ئازەربایجان بە مەبەستی جێپێ لەقکردنی لێی وەخۆکەوتن. هـەرچی و هەرچۆنێک بوو وەختایەک کەریمخان لە ڕۆژی ٢٤ی جوولای ساڵی ١٧٦٤دا پێی نایە ناوچەی «میزدەج»ی چوارمحاڵی ئیسفەهان، لەوێوە تـەمای گـرت سـەری خانی ئەفشار تێدا بەرێ. بۆ دۆزینەوەی بیانوویەک چەند پرسـیارێکی پـرمانای هێنا گۆڕ و پرسی فەتحعەلیخان ئەم جێیەی لێیڕاوەستاوین کوێیە؟ ئەویش بـە ساردی و بێئەوەی پەشیمانی بە قسەکانییەوە دیار بێ، گێڕایەوە کە چۆن لێـرە تاقمێکی بچووکی چەکدارانی ڕاکردووی زەندی لەگەڵ سەرکردە و پۆلـی ژنانیـان ڕۆژێک پاش شەڕی قومشە هەڵبڕیوە. وەکیل کە بە زۆربلـەیی فەتحعـەلیخـان چراغپێ ببوو، گوتی «ئەو ڕۆژی ئاوا بوو، بەلام ئەمڕۆ وا نیە.» فەتحعەلیخـان لالایەوە و سەرەتا واوێدەچوو کە لێی قبووڵ کردووە و لە دڵی چۆتـەدەر، بـەلام هەر ئەو شەوە بانگی هێشت و فەرمانی دا سەریان بڕی. لاشەکەی لـە حەوشـەی مەرقەدی شازادەی قومشە تەسلیم بە خاک کرا[٦٦]. جەلیلخانی هەمەدانی دۆسـتە نیزیک و خۆشەویستەکەشی هەر ئەوشەوە کوژرا. واتـای نووسـراوەکەی نـامی ئەمەیە کە فەتحعەلیخان لەبـەر خەیانـەت و شـاهیدیدانی بـەدرۆ دەربـارەی یەکێتی سەرکردەکانی ئازەربایجان محاکمە کرا و چونکە شایانی مەرگی لەوێوە بوو، کوژرا. گێڕانەوەی دوور و درێژی غەففاری لە بابـەت غـەزرینی لـەخۆڕای وەکیل لە ڕاستی بە دوورە، چونکە قبـووڵکـردنی داخـوازی کـابرای مـەحکووم

---

٦٥ـ تاریخی گیتیگوشـا، ل ١٢٢؛ باکیخـانۆف لـە ل ١٦٢ی کتێبەکـەیدا دەنووسـێ کـە پەناخان لە کوژرانی ئەوا دەوری گێڕا.

٦٦ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٢٥ ـ ١٢٦ (ئەو ڕۆژێک بوو و ئەم ڕۆژێکە).

سەبارەت بە بەخشینی بنەماڵە و کوڕەکانی یانی ڕەشیدبەگ و جانگیرخان و بەرگرتن لە داڕووخانیان بە دەس خانەکانی تری ئازەربایجان، خۆی لە خۆیا دەکرێ نیشانەی ڕقەوەنی و کاکەوبرالەیان بووبێ بە مەبەستی کوشتنی کەریمخان. سەرەڕای ئەمەش غەففاری دێنێتەوە بیر کە وەکیل بۆ ڕقڕشتنی لە ڕووداوی قومشەدا، سەرەتا ئازادخانی بانگ کردبوو، بەڵام ناوبراو بە بیانووی ئەوەی کە ئەودەمی لە ئیسفەهان بووە داوای لێبووردنی کرد و سیاسەتمەدارانە بەگژ فەتحعەلیخانی داکرد و گوتی ئەو خۆی دەتوانێ وڵامی پرسیارەکان بداتەوە؛ کەوایە ئازادخان لە کوشتنی ئاشنایەکی نالەبارا کە کەریمخانیش دەریخستبوو ئێستا لێخۆشبوونەکەی خستۆتە پشتگوێ، دەستێکی بوو. بە وەبەرچاو نەگرتنی تێبینییەکانی سیاسی، ڕووداوی کوشتنی فەتحعەلیخانی ئەفشار بە بڕیاری پێشوو، ڕەنگە ڕووناکاییەکی زیاتر بخاتە سەر هۆی هاندەری ڕاستەقینەی کوژراوانی زۆر و زەوەندی ئەم چاخە کە لە بەشی کۆتاییدا شی دەکرێتەوە و دەخرێتە ڕوو.

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ مەبەست محەممەدخانی قاجاری قوانلووی ئامۆزای محەممەدحەسەنخانی قاجار و حوکمڕانی هەڵبژێراوی ئەوە لە مازەندەران. محەممەدخانی قاجار، پاڵەوان و سەرکردەی ناوبەدەرەوەی زەندی مەشهوور بە بێکەللە کە دوو ساڵان لای ئەو دیل و زیندانی بوو، لە وەختی کوشتاری ئەفغانییەکانی گیلان بە فەرمانی محەممەدحەسەنخان کوشتی.

٢ـ لە قەڵتوبڕی ئەفغانییەکاندا کەریمخان گەلاڵەیەکی تایبەتی داڕشتبوو. تاقمێکی لە شوێنی بنەگر بوونی خۆی لە تاران کوشت. وەختی ساڵ نوێبوونەوە، سەرۆکانی ئەفغان وەک ئەکرەمخان و میرەکخان و موعەززەم و محەممەدفارووق کوژران. لە ڕۆژانی نەورۆزا زەکیخان لە سمنان دەستەی دووهەمی کۆکردنەوە و ١٩٠٠کەسی کوشت. سەرکردەی ئەم تاقمە ناسراو بە شیرعەلیخان چونکە شیعە بوو ڕزگاری هات.

نەدرخان قەرار وابوو دەستەی سێهەم خاشەبڕ بکا. لەبەر ئاشکرا بوونی

ڕازەکە و لێنەوەشاوەیی نەدرخان ئەمانە بە سەرکردایەتی زەمانخان ڕایانکردە ئەستەرئاباد و وەختی ڕاپەڕینی ڕەفیعخانی قاجار تەنگەژەیان نایەوە. لە ناوچەکانی تری ئێران وەک کاشان و یەزد و ئیسفەهان و گیلانیش کوشتاری ئەفغانییەکان دەستی پێکرد. ئەو حیکایەتەی ڕێزدار پێری ئاماژەی پێدەکا سەبارەت بە سادقناوێکی زەردەشتی نوێمسولمانی کاشانییە. چونکە غەفوورخانی برای خدرخانی غەلجایی لەگەڵ ناوبراو دۆستایەتی هەبوو، شەش مانگ لای خۆی حەشاری دا و پاش ئەوەی هەڵلا و گرمە هێدی بوونەوە، خستییە یەغدانێکی نێو بار و بارخانەی بازرگانێتی و ئەگەرچی چاوەدێری یەکجار توند بوو دیسانیش دەربازی کرد و ناردییە بەغدا لای ئازادخان.

٣ـ نەدرخان یەکێک لە ئامۆزاکانی کەریمخان و برازای مەهدیخانی زەند و ژنبرای وەکیل بوو. پەریجیهانخانم کچی کەریمخان کە لە پێشدا ژنی عەلیمرادخان و پاشان مێردی بە لوتفعەلیخان کرد خوشکەزای نەدرخان بوو. کەلانتەر بە خراپ باسی سەردەمی حکوومەتەکەی کردووە لە شیراز. لە پێداچوونەوە و هەڵەبڕکردنی گیتیگوشادا کردوویانەتە نادرخان کە هەڵەیە. لەبەر بەدئاکاری حکوومەتی و خۆڕانەگرتنی لە شەڕی مەراغەدا زۆر وەبەر دڵی وەکیل نەدەکەوت. غەففاری سەبارەت بە مردنەکەی دەنووسێ: هێندێک لە پزیشکان لایان وابوو کە خواردنێکی گەنیو لە گەدەیدا بۆتە ژار و خوێن قوڵتی داوە و هێندێک پێیان وابوو کە شەوانە لە کاتی خواردنەوەدا بە شەڕابێکی ژاراوی دەرمانداو کراوە.

٤ـ ئاغامحەممەدی ڕەعنایی کە لە دەقی دەسخەتی گوڵشەنی مرادا، بە کتێبخانەی مەلیک ڕەهنایی نووسراوە لە زەمانی پاشایەتی نادرشادا یەکێک بوو لە سەرپەرستانی چاککردنەوە و ڕازاندنەوەی گومبەزی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبووتالب. وەختی لەشکرکردنی کەریمخان لە خشت داروندەداری بۆ تەیارکردنی سپا خستە بەردەستی خانی زەند. لە سەردەمی کەریمخاندا کرایە حوکمڕانی ئیسفەهان و یەزد و پاشان ناوچە و مەڵبەندەکانی لێواری کەنداو و جێی خۆی دا بە میرزا عەبدولوەهابی مووسەوی کوڕی میرزا ڕەحیمی حەکیمباشی شاسوڵتانحوسێن. ئاغامحەممەدی ماربینی خەڵکی ئیسفەهان بوو. زەکیخان لە وەختی ڕاپەڕینەکەیدا زۆری ئێشاند و تاوانی لێئەستاند. لەپێشدا

زێرینگەر بوو.

٥ـ یەکێکە لە گوندەکانی شارستانی مەراغە و لە فەرهەنگی گوندەکانی ولاتا، نووسراوە شیراز.

٦ـ یەکێکە لە بەرەبابەکانی ئەفشار و لە سەردەمی سەفەوییەدا بەشێکیان چوونە دەرەگەزی خوراسان و پاشماوەکەیان لە مەڵبەندەکانی ئازەربایجان مانەوە. بەر لە دەسەلاتی نادرشادا تاقمێکیان کەوتنە نیزیک شووشتەر و ئێستاش یەکێک لە ناوچەکانی شووشتەر پێیدەگوترێ گۆندوزلو.

٧ـ مەهدیخان پاش کوشتنی ئەمیرئەسلانخان لە لایەن برایمپاشاوە کرایە حوکمڕانی ئازەربایجان و خۆی بۆ شەڕ دژی شاروخ کەوتەڕێ. برای بچووکی کە بریکاری حکوومەت بوو زۆر لەگەڵ خەڵکی شار ناحەز دەجوولایەوە. میرزا محەممەدڕەزا ئەفشار وەزیری حکوومەت کە ڕۆژایەکی مەهدیخان دەست و زمانی باوکی پەڕاندبوو، سەرەتای کۆدتایەکی بە یارمەتی جەماوەری خەڵکی تەورێز خۆشکرد. شەوێک خۆیان ئامادەی پەلامار کرد و لای بەیانی کە نیگابانان لە خەوا بوون هێرشیان کردە سەر «دارولحکوومە». مەهدیخان و براکەی کوژران. بەپێچەوانەی بەڕێز پێری نەقیخانی براشی بە تۆڵەی ئەو ڕاپەڕی و بکوژانی خاشەکێشا و لە لایەن خۆیەوە ئازادخانی کردە حوکمڕانی تەورێز. پاش ئەوەی ئازادخان ڕاپەڕی یەکێک لە سەردارانی ئەفشاری سایینقەلا (گۆندوزلوو) دژی نەقیخان کۆدتای کرد و گرتی و ئازادخان چنگی هاویشتە سەر ئازەربایجان. سەبارەت بە سەرەتای کاری ئازادخان، فەتحعەلیخان، مەهدیخان و ئەمیرئەسلانخان بڕواننە: تاریخی ئەفشار بە قەڵەمی میرزا ڕەشیدی ئەدیبوششوعەرا.

٨ـ برایم خەلیلئاغاکوڕی پەناخانی جەوانشێر و چوارەمین سەرۆکی سەربەدەرەوەی خێڵی جەوانشێر بوو. ئەم خێڵە لە سەردەمی نادرشادا کۆچ درانە خوراسان و ئەفغانستان، بەلام پاش مەرگی نادر گەڕانەوە. پەناخان قەلای شووشی ساز کرد. سکەی زێوینی مەنشوور بوو بە «پەناباد» و ماوەیەکی درێژ لە ئێرانی باکوریدا بە «دەشایی»یان دەگوت پەناباد (پەنابادی). برایمخەلیلخان لە نێوانگرژی ئێران و ڕووسیادا بە لایەنگری ڕووسیا ڕاپەڕی، بەلام پاشان کە پەشیمان بۆوە هۆردووی ڕووس خۆی و چەکدارەکانی لە قەلای شووشیدا

قەلاچۆ کرد.

٩ـ عەمارلوو یەکێک لە تیرەکانی تایفەی «چەمش گزەک»ی کورد و لە ناوچەکانی دەرەگەز نیشتەجێن. نادرشا دەستەیەکی لە دووئاوی شارووود و قزڵئوزوون نیشتەجێ کردن. ئەم ناوچەیە کە پێشتر پێیدەگوترا خەرگام ناوی ئەم تیرەیەی بە سەردا برا. شاعەباس پێشتر کۆمەڵێک لە کوردەکانی بابانی سلێمانی هێنابووە ئەم مەڵبەندە. کوردەکانی عەمارلوو لە مەنجیل، دەیلەمان و رووباری ئەلەمووت (هەڵەمووت) نیشتەجێن.

١٠ـ وشەی «گچکە»یان بە مەبەستی ناسینەوەی عەلیمەردانخانی کوژراو بە ناوی عەلیمەردانخانی حەوتلەنگی بەختیارییەوە دەلکاند. لە بارگای کەریمخاندا سەردارێکی بەدەسەلات و برشت بوو. لەبەر چەند هۆکارێک لێی بەرقداچوو، بەلام تا وەختایەکی کە شێخالیخان دەسەلاتی لەدەس نەدابوو، دەپارێزرا. بەیانەی رۆژی جێژنی رەمەزان وەختایەک کە دەچوو بۆ بارگای کەریمخان پۆلێک لە تازەلاوانی زەندیە بە فەرمانی وەکیل دەورەیان دا و کوشتیان.

١١ـ هەرکی ٢٠هەزار خێزانێک دەبن و لە ئێران و ئێراق و تورکیا نیشتەجێن.

١٢ـ فەتحعەلیخان بە وەبەرچاوگرتنی سەرمای ئازەربایجان پێیوابوو کە کەریمخان لەبەر تۆف و بەند و سۆزی سەرما تێدەمێنێ، بۆیە بە تورکی گوتی: ئێمە ریشسپییەکمان هەیە کە بەم زووانە دەگاتێ و دوژمنان دەردەپەرێنێ.

١٣ـ دونبولییەکان تیرەیەکی کوردن و لەم زەمانەدا لە ولاتی ئێراق دەژین. ئەم تایفەیە «عیسابەگی»شی پێدەگوترێ. (کوردستان بە قەڵەمی مەردۆخ)

١٤ـ تایفەی زەند سێ تیرە بوون: ١ـ زەندی هەزارە ٢ـ زەندی بەگلە ٣ـ زەندی خەراجی. بنەماڵەی کەریمخان لە تیرەی زەندی بەگلە بوو. ئیناق، بوداق، مێهرعەلی و دوو برای تر لە سەربەدەرەوەکانی ئەم تیرەیە بوون. ئەڵلامراد و خوامراد لە خانەکانی زەندی هەزارە بوون و عەلیمرادخان کوری ئەڵلامراد لەم بەرەیە حیسێب دەکرا و تەنیا لە دایکیرا نەوەی بوداق بوو. عەلیمرادخان زۆربەی سەرۆکانی زەندی بەگڵەی کوشت و لە کاتی هاتنە سەر دەسەلاتی لوتفعەلیخانیشدا سەرکردەکانی زەندی هەزارە تێداچوون.

۱۵ـ فەتحعەلیخان لە کاتی هێرش بۆ سەر ئیسفەهان و فارس لە سەردەم و شانبەشانی ئازادخانا، گەلێکی توندوتیژی نواندبوو. لە گەنمان و ناوچەکانی دەوروبەری شیراز ماڵوحاڵی خەڵکی تاڵان کرد. گوڵستانە لە لاپەڕە ۲۹۲دا دەنووسێ: فەتحعەلیخان لە نێو ئەفشار و ئۆزبەک و ئەفغاندا لەبەر بێڕوحمی و زوڵم و ملهوڕی بە «گەسکەخان» ناوبانگی ڕۆیبوو... .

# ٦

# دووبەرەکی نێوخۆ

## ٦ ـ ١ پاکتاوی بارگای میری

لە ماوەی ئەم قۆناخەدا یانی مەودای ساڵانی ١٧٥٩ تا ١٧٦٤، وەکیل چ لە کاتی سازبوونی‌دا بە مەبەستی پەلاماردانی ئاخرین ڕکەبەرانی و چ وەختایەکی کە خاترجەم ببوو باڵادەستی هەموو لایەکە، بەرەوڕووی زنجیرەیەک بەربەرەکانی نێوخۆی تاقمەی خزمان و کۆنەیارانی دژی دەسەڵاتی ببۆوە. ئەم هەڵوێست و جووڵانەوانە بە سێ شێوە خۆیان نواند: ١ـ کێشەی پیلانەکانی هۆردووگای وەکیل کە بە کوشتن و کوێراندن و زەوت کردنی ماڵ و دارایی کەتنگێڕان بەتایبەت شێخاڵی‌خان لە ورمێ کۆتایی پێهات. ٢ـ زیزبوون و ڕاکردنی زەکی‌خان و هاودەنگ بوونی عەلی‌محەممەدخانی زەند لەگەڵی. ٣ـ سەر ومبەر نەهێنان و لێ‌ڕاستبوونەوەی تایفەکانی لوڕ و بەختیاری و لەم چەشنە کە کەریم‌خان پەیتاپەیتا سەرکوتی دەکردن و بە زۆری نیری دەخستنە سەر مل. ئێمەش هەروەک مێژوونووسانی ئێرانی کە چۆن ڕووداو و هێرش و پەلامارەکان دەنووسنەوە، ئاوا بەڕیز هەرسێک بابەتەکە یەک لە دوای یەک دەخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە. هەرچۆنێک بێ ڕووداونووسەکان خۆیان ڕایەڵ و پۆی

ڕاستەقینەی مابەینی ئەم هەڵکەوتانەیان خستۆتە ڕوو، بەڵام ئەگەر بمانەوێ لە بابەت ڕەوت و ڕێبازی کەریمخانەوە پتر لێکۆڵینەوە بکەین بە سانایی دەتوانین بڵێین کە دەکرێ ئاکاری ئەو پیاوە بە پاڵاوتن و پاکتاوی هاوڕێیانی ناودێر بکرێ. ئەم ئاکار و کردوەوانە کاردانەوەی کۆمەڵێک بەدگومانی و خۆپارێزی نێوان میرێکی نیگەران و کەینەوبەینەی هەلپەرستان و دەستەیەک بارمتەی بێتاوانە کە کەوتۆتە سەر بارێکی بێبەرهەڵست و ئەم گشتە کوشتارەی بەدیهێناوە. هەڵبەت چۆنیەتییەکی ئەوتۆ هەمیشە پاش دامەزرانی سیستم و دەسەڵاتێکی نوێ، لە ڕۆژگاری جووڵانەوەی عەباسییانڕا تا کۆتایی پاشایەتی نادرشا دیتراوە و ئەم خدە و شێوازەش هەر تەنیا تایبەت بە مێژووی ئێران نیە.

یەکەم نیشانەکانی ترازان و دوبەرەکی نێوان تایفەی زەند لە کاتی گەشت و سەیرانی بەهارانەی وەکیل لە ساڵی ١١٧٤ی کۆچی / ١٧٦٠ی زایینی لە خەمسە و بەر لە پەلاماردانی ئازەربایجان خۆی نواند. لە وەختی کەیف و نەهەنگ و ڕابواردنەکانی گشتی ئەم گەڕانەدا لە بابەت ئاکاری نابەجێ و قرە و کێشەی ژنانی حەرەمخانە و دمەتەقەکانی خوشکی محەممەدحەسەنخانی قاجار ڕاپۆرتێک خرایە بەردەمی وەکیل. خان ئەم ژنەی تازە هێنابوو. وەکیل ئەگەرچی زۆری پێ تووڕە بوو بەڵام هیچی نەکرد و بەنەرمی و لەسەرەخۆیی چاوی بە کێشەکان داگێڕا. بەدزی لەگەڵ ژنی زەکیخان(١) دوا کە وێدەچوو دەستی لەم ڕووداوەدا بووبێ؛ کاتێک کە لە ڕێگای گەڕانەوەیدا بەرەو تاران لەگەڵ هاوڕێیانی پێی نایە قەزوێن، کازمسوڵتانی زەند، سەرۆکی پاراستنی ئەندەروونی بە تاوانباری ئەم گیروگرفتانە زانی و کوشتی[1].

غەففاری سەبارەت بە چۆنیەتی ڕاستەقینەی ئەم ڕووداوە تاڵە هیچی نەدرکاندووە، بەڵام ڕەنگە ئەمە یەکەم دیاردەی پاڵاوتن و پاکتاوەکانی داهاتوو بووبێ. زەکیخان ئێستا خۆشی دانیشتووی کاشان بوو. ئاکار و ملهوڕییەکانی وای کرد کە حاجئاغامحەممەدی ڕەعنایی کە ئەم بەینانە سەرەڕای حکوومەتی ئیسفەهان، قەڵەمڕەوی کاشانیشی خرابوویە سەر، لای وەکیل سکاڵای لێبکا. کەریمخان بە شوێنیدا نارد هەتا سەبارەت بە کار و کرداری ڕوونکردنەوەیەک بدا، بەڵام هیچ بەڵگەیەک لە سەر تەمێ و سەرکۆنەکردنیشی بە دەستەوە نیە.

---

١ـ گوڵشەنی مراد، ل ٦٣ ـ ٦٥.

هەر لەم سەروبەندانەدا نەدرخانی زەندیش کە ئەرکی حکوومەتی مازەندەرانی لە ئەستۆ بوو، جێی خۆی دا بە یەکێک لە پیاوانی باوەڕپێکراوی دەربار، بەڵام ئەم جێگۆڕکەیە ناتوانێ نیشانەی خەسارباربارکردنی خزمە بێزراوەکانی بووبێ لە لایەن کەریمخانەوە[٢].

غەففاری و نامی باسی سەرەتای پیلانە پتەوەکانیان کردووە و وا وێدەچێ کە یەکەمینیان بەکردەوە لە ماوەی گەمارۆی ورمێدا ئاشکرا بووبێ[٣]. وا دیارە سەردەستەی پیلانگێڕان برایمخانی بوغایری یەکێک لەو چەند هاوڕێ خۆشەویستانەی وەکیل بووە. غەففاری بەئاشکرا وەبیری هێناوەتەوە کە تەنانەت بەر لە بەهاری ساڵی ١١٧٣ی کۆچی / ١٧٦٠ی زایینی بە مەبەستی خەیانەت و کاکەوبرالە کردن لەگەڵ فەتحعەلیخانی ئەفشار دەستی تێکەڵ کردبوو، بەڵام وەختایەک پیلانەکە لەقاو درا، کەریمخان چاوپۆشی کرد، کەچی دیسانیش ناوبراو لە ماوەی شەڕی قەرەچەمەندا لە دوژمنان و دژبەران نیزیک بۆوە[٤] و دووسێ جاران هەوڵی پەیوەندی گرتنی لەگەڵ فەتحعەلیخان دا. لەگەڵ شابازخانی بەکەکی ڕێککەوت و کابرایەکی ئەنگێوە بە ناوی تفەنگچی و چەند کەسی دیکەیان لە چەکدارانی سپای زەند فێر کرد کە لە پەسیوێک خۆدابگرن و لە دەرفەتێکی لەباردا کەریمخان بکوژن هەتا لە لایەن خانی گەمارۆدراوی ئەفشارەوە خەڵاتێک وەربگرن. یەکێک لە کەتنکەران نەخشەکەی درکاند بەڵام درێژەی بە هاوکاری دۆستەکانی دا: پاش لێکۆڵینەوە شەش کەس لە پیلانگێڕان کە مەولاموتەللیبی کوربالی و میرزائەمین، پزیشکی لەشکرگاش لە ڕیزی ئەو تاقمەدا بوون گیران و کوژران(٢). کەللەسەری ئەم چەند کەسە لەگەڵ نووسراوەیەکی تەوساوی بۆ فەتحعەلیخان فڕێدرانە پای شووورەی ورمێ. غەففاری وێڕای زیادکردنی تاموخوێ، دەقەکەی ئاوا نووسیوە:

بەوپەڕی شادمانییەوە لەگەڵ ئەم نامەیە بە مەبەستی نیشاندانی ڕێزمان خاڵوارێک لەم میوە تازانە دەکەینە دیاری هەتا خان تامی زاریان

---

٢ـ گوڵشەنی مراد، ل ٦٧.

٣ـ گوڵشەنی مراد، ل ٩٧ ـ ٩٨؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٠٧، ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٦٠.

٤ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٢٤ ـ ٣٢٥؛ بڕواننە: یادداشتی ژمارە ٣٢ی بەشی پێنجەم.

پێخۆش بکا[٥]. ڕۆژی دواتر سێسەد سەربازی ئازای ئێلجاڕی بوغایری فەرماندەکوژراو و گومانلێکراوی وەکیل بەرەو ئیسفەهان کە کەسوکاریان دانیشتووی وێندەرێ بوون ڕایانکرد. پۆلە سوارێکیان خرایە شوێن هەتا پێشاوبڕکەیان بدرێ و بە دەس حاکمی خۆولاتی بخرێنە داو[٦].

زۆر وێدەچێ ئەگەر تەواوی پیلانگێڕان بەڕاستی نەبووبنە فیدای بەدگومانی و تۆماتی پاش ڕاکردنی خوێرییانەی نەدرخانی زەند و چەکدارانی ئێلجاڕی کێشکچی بارگەوبنەی لەشکرگا لە ماوەی شەڕی قەرەچەمەندا، لانیکەم ژمارەیەکیان کەوتبنە هەلومەرجێکی ئەوتۆ. نەزەرعەلیخانی زەند کە یەکێک بوو لە ڕاکردووانی ئەو شەڕە، بڕێک دواتر و بەر لە ئاشکرابوونی کەتنەکە، ڕەنگە بۆ ئەوەی خۆی لە وەکیل نیزیک بکاتەوە مەولاموتەللیبی تۆمەتبار کرد. وەختایەک میرزا محەممەدی کەلانتەری فارس کە ئەویش ڕایکردبووە قەزوێن گەڕایەوە و نەزەرعەلیخانی سەرکۆنە کرد کە لەخۆوە ناوی خەڵکانی فارس دەزڕێنن، لە جوابدا نەزەرعەلیخان ئەویشی بە هاودەستی پیلانی کوشتنی وەکیل تۆمەتبار کرد. بەختەوەرانە وەکیل شانی بۆ قبووڵ کردنی ئەم تۆماتە شل نەکرد و ئەگەرچی چەند کەسێکی هەرێمی فارسی گرت وەک عەلیقولیخانی کازروونی(٣) کە یەکێک بوو لە ڕاکردووانی شەڕی قەرەچەمەن، بەڵام کەلانتەر بە مەبەستی لێبووردنیان کەوتە نێوان و خۆی دایە کارێکی مەترسیدار، وەکیل پاش کات و ساتێکی دژوار هەر لەو شەویدا پاش خواردنەوەی چەند فڕ شەڕابێک دەرهەڵبوو و گوتی میرزامحەممەد لەگەڵ تەواوی دوژمنانی من دۆستایەتی و نێوانی هەیە، بەڵام هەر چۆنێک بێ لە تاوانی عەلیقولیخان خۆشبوو و تەنیا جەریمەی کرد[٧].

## ٦ ـ ٢ کوێرکردنی شێخاڵیخانی زەند

ڕەوتی قەوارەی سێحربازانەی ڕاوی بە جەللەی ئادەمیزادان لە کاتی

٥ـ گوڵشەنی مراد، ل ٩٩.

٦ـ هەمان سەرچاوە، ل ٦.

٧ـ ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٦٠ ـ ٦٢؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٤.

گەمارۆی ورمێدا بە کوێرکردنی شێخالیخان پێی نایە قۆناخێکی تر. تەنانەت مێژوونووسانی زۆر قایل و لایەنگریش هەرچەندێک بیانهەوێ پاساو بۆ کردەکانی وەکیل بێننەوە، ناچارن ئەم هەنگاوە بە نموونەیەکی پێچەوانەی ئاکاری دابنێن. بەڵام وەک لە ئاخریدا دێتە بەرچاو شێخالیخان ببوو بە کابرایەکی خۆبەزلزان و لووتبەرز و خودبەسەر کە بۆ پلە و دەسەڵاتی ئامۆزاکەی مەترسی دەنایەوە. گەرچی لە هیچ جێیەک بەڕاستی تۆماتی پیلانی سەرنخوونکردنی وەکیلی نەخرابوویە ئەستۆ، بەڵام کەڵەکەبوونی کۆمەڵێک تۆمات بە دژی ئەو لە ماوەی ئەم قۆناخە پڕ مەترسییەدا، وای هەڵدەگرت کە مەرجی پارێز رابگیرێ. ساڵێک بەر لەم رووداوە لە کاتی گرتنی ئەستەرئابادا بێ ئەوەی ئیزن لە وەکیل وەربگرێ بەشێکی زۆری لەو خەنیمەتەی وەچنگی هێنابوو بە سەر لەشکرەکەیدا داروپەخش کرد. ئەگەرچی بەم کارە خۆی خستە جەرگەی بەدگومانییەکی زۆر، بەڵام گەلێکی دڵگەرمی دا بە چەکدارانی. جگە لەمانە تاوانبار بوو کە گوێی نەداوە بەو فەرمانانەی دەرکراون و داهاتی پارێزگا داگیرکراوەکانی تەخشانپەخشان کردووە و زۆربەی راسپاردەکانی کەریمخانی لە بابەت باش جووڵانەوە و دڵدانەوەی کۆمەڵانی خەڵکی نێو بازنەی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی وەبەرچاو نەگرتووە[8].

شێوازێکی ئاوا ببوو بە هۆی ئەوەی کە ناوی شێخالیخان هاوسەنگ بێ لەگەڵ زۆرەملی و چەوساندنەوە و ببێتە پەندی پساتێ. بەگوێرەی نووسینی یەکێک لە سەرچاوەکان بۆیە لە ئەستەرئابادەوە بانگیان کردەوە چونکە لێی دووشک ببوون کە رەنگە لەو ناوچەیە بکەوێتە سەرهەڵدان[9]. لە ماوەی گەمارۆی ورمێدا تاقمێک لە سەرکردە بێزراوەکانی بەرچاوی وەکیلی بۆ لای خۆی راکێشابوو (یان رەنگە بۆیە کەوتبێتە بەر رق و تووڕەیی کەریمخان کە خەریکبوو شان لە شانی بدا.) بارگایەکی سازکردبوو و خۆی سانی لەشکری دەبینی کە زیاتر ئەمە کاری میران بوو[10]. کردەوەکانی بەربەرەکانی بوون دژی پلە و پایەی

---

٨ ـ گولشەنی مراد، ل ١٠٧؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٠٩؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٤؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٢٠٧.

9- Hovhanyants, 291.

١٠ـ گولشەنی مراد، ل ١٠٨.

وەکیل و ئەویش لەوە زیاتر نەیدەتوانی تەنانەت لە بابەت لێوەشاوەترین سەردارانی هەڵکەوتەی نێو خزم و کەسانیشی کاری وا بخاتە پشتگوێ.

زێدە لەمەش پێشتر بە شێوەیەکی سامناک و چڕوپڕ گوێی زرینگاندبۆوە و سێ کەس لە ئەندامانی گرینگی سەر بەوی لەڕێوە سزا دابوو: لەم سێیانە باباڕەسووڵی شاترباشی کوێر کرا، حەیدەرخانی زەند لە ماڵی خۆیا کوژرا و عەلیمەردانخانی گچکەی بەختیاری لە ڕۆژی جێژنی ڕەمەزانی ساڵی ١١٧٦ی کۆچی / ١٥ی ئاوریلی ١٧٦٣ی زایینیدا سەری بڕا. لەگەڵ ئەمەشدا شێخاڵیخان سەرنجێکی نەدایە ئەم ئیما و نیشانانە. ئەو شەوەی کوێر کرا، سەرداری زەند لە بابەت ئەم کارانەوە وەکیلی سەرکۆنە کرد و ئەوەندە بە تووڕەیی و گڕگرتووانە قسەکانی دەربڕی کە هەرتکیان تەقین. وەکیل دەگـڕێ ڕۆهات و خستی و بە یارمەتی مووساخانی زەند و ئەوانەی لەوێ بوون بە نووکی خەنجەر چاوی لە قاپێلکان دەرهێنا[11].

گێڕانەوە خەمورووژێنەکەی غەففاری ڕەنگە بەپێی بەجێهێنانی ئەرک و پاساوهێنانەوە بۆ کردەوەی کەریمخان نووسرابێ کە وەک دەرهەڵبوونێکی لەپڕ و لەخۆوە و نابەدڵ و هەڵچوونێکی نەکاو ڕەنگی داوەتەوە. گوڵستانەش ئۆبـاڵ بۆ ئەم مەبەستە دەکێشێ کە خودی کەریمخان بە نووکی خەنجەر چاوی سەرکردەی کۆڵیوە[12]. نامی ئەگەرچی نەقڵەکەی وەک غەففاری گێڕاوەتەوە، بەڵام نووسیویەتی «بە شیش کوێری کرد» و دەریدەخا کە وەک باو بووە شیشەیەکی سوورەوەبوویان بە سەر گلێنەی سەرداری زەندا کێشاوە و ڕەشکێنەیان تواندۆتەوە و کوێریان کردووە. بەم شێوەیە ڕووداوەکەی نەبردۆتەوە سەر چراغپێ بوونێکی لەناکاو[13].

باشە بۆچی کەریمخان دەرهەق بە کەسێکی تا ئەودەم لە هەموو دۆستان و سەرکردەکانی پتر باوەڕی پێدەکرا غەدرێکی ئاوا زاڵمانەی کرد؟ شێخاڵیخان ئەوەندە لای وەکیل بەڕێز و خۆشەویست بوو ئەگەرچی پاش شەڕی قەرەچەمەن بوو بە ڕێخۆشکەری زەکیخان بۆ ڕاپەڕین و سەرهەڵگرتن و ئەم سەرکردەیەی

---

١١ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٠٨ ـ ١٠٩.

١٢ـ موجمەلوتتەواریخی گوڵستانە، ل ٣٣٠.

١٣ـ موجمەلوتتەواریخی گوڵستانە، ل ١٠٩.

لێتەکاندەوە، بەڵام متەقی نەکرد. کەریمخان لە کردار و ئاکاریدا لەگەڵ دۆست و دوژمن خۆی وەک سیاسەتمەدارێکی لێوەشاوە و بەتوانا هەڵخستبوو کە دەزانی بۆ وەرگرتنی ئاکامی هەرەباش دەبێ چ بکا. مرۆڤ تەنیا دەتوانێ وای بۆبچێ کە غلووری و خۆبەزلزانی و خیرەسەری و ئینکەبەری شێخاڵیخان ببوو بە هۆی ئەوەی کە حکوومەتی خۆی و یەکێتی بنەماڵەکەی لەو بارودۆخە قەیراناوییەدا بکەوێتە مەترسی و سەرەڕای دۆستایەتی لەمێژین و متمانەیەکی کە کەریمخان پێی بوو دیسانیش کارێکی وای کرد تا دەس بەرێ بۆ کردەیەکی تاڵ و توندوتیژ و بە شێوەیەکی قورس و قایم هەنگاو باوێ[14].

وا دیارە کەریمخان پاشان ئەم کارانەی کردووە: سەرلەنوێ هیدایەتوڵلاخانی کردەوە حاکمی گیلان، نەزەرعەلیخانی زەندی برای شێخاڵیخانی هاوکات لەگەڵ کوێرکردنی کاکی لێخست و هێنایە لەشکرگای خۆی، بەڵام پاشانیش کردییەوە حاکم. بە هەرحاڵ شێخاڵیخان و براکەی دوای چەند ڕۆژان ئازاد کران و ئامۆزاکەیان دڵنوایی کردن[15]. وا وێدەچێ لەمەودواش شێخاڵیخان نێوانی لەگەڵ فەرمانڕەوای زەند خۆش بووبێ و قەت نەبوو بە ماکەی سەربزێوی. لە ساڵی ١٧٧٣دا پاش نەخۆشکەوتن مرد و کەریمخان پتر لە هەموو کەس بۆی تازیەدار بوو[16].

## ٦ ـ ٣ پاکتاوی دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتی و ئیداری

ئەگەرچی ئاڵوگۆڕ بە لای زۆریدا لە دەربارەوە دزەی کردە پارێزگاکان، بەڵام دیسانیش پاڵاوتن کۆتایی پێنەهاتبوو. سەبزعەلیخانی برای شێخاڵیخان لە سەر کارەکەی خۆی واتە سەرکردایەتی لوڕستانی فەیلی لادرا. ئەو تەتەرەی ئەم فەرمانەی هێنابوویە شوێنی بنەگربوونی ناوبراو لە ئیسفەهان، لەبەرەوەی

---

١٤ـ کرێملی، ل ٦٦٣. سزادانی شێخاڵی دەبەستێتەوە بە پیلانێک کە بۆ کوژرانی وەکیل داڕێژرابوو. (بەشی ٦، بابەتی ٤)

١٥ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٠٩، گوڵشەنی مراد، ل ١٠٩.

١٦ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٧٣. سەبارەت بە کورتەی ژیانی بڕواننە: بامداد، بەرگی ٢، ل ١٥٣ ـ ١٥٤.

هەواڵێکی تاڵی پێبوو نیگەران بوو لە دیداری سەرداری تووڕە و تۆسن، بۆیە محەممەدڕەفیعخان کە خۆشی وەک سەبزعەلیخان پیاوێکی توندوتیژ بوو، حازر نەبوو بە خۆشی ئەم ڕاسپاردەیە ئەنجام بدا. وەختایەک سەبزعەلیخان دەیهەویست لە دەروازەی شار وەدەرکەوێ کوتەکی یەکێک لە غولامانی وەرگرت و تێیهەڵکرد. پلارەکە وە گورچووی کەوت و لەبەر ئەم زەبرە بە تووڕەیی و هەڵچوونەوە گەڕایەوە و بە بێڕوحمی نێزەیەکی لە خاڵیگەی ڕەفیعخان دا و کەلاکی خست[١٧]. لە ترسی سزادانی کەریمخان یان ئومێدی بەخشینی، خۆی گەیاندە نێو سپای زەند و لوڕانی فەیلی و عەرەبەکانی سەر بە دەوڵەت و لە ڕێی شووشتەرەوە بە مەبەستی کووژاندنەوەی ئاگری ڕاپەڕین و ئاژاوەی ئالیکەسیر پێشڕەوی کرد. هێشتا ڕوون نیە کە داخوا بە ئاشکرا بەخشراوە و کراوەتەوە سەرکردە یان نا؟

وەک نامی ڕوونی دەکاتەوە[١٨] بەر لە وەی ئەویش بە نۆرەی خۆی بە زەبری نێزەی شێخعەلوانی ئالیکەسیر لە دەرەوە بکوژرێ لە شەڕێکی قەراخ

---

١٧ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٠٩ ـ ١١٠؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٧٨ ـ ٧٩. ئەم کتێبەی ئاخری پێیوایە ڕووداوەکە ساڵی ١١٧٢ / ١٧٥٨ قەوماوە، یانی زەمانێک کە کەریمخان بەرەو تاران دەبزووت و ڕەفیعخان تازە ببوو بە حاکمی ئیسفەهان. ئەو ئەرکەکانی خۆی باش ڕادەپەڕاند و ئەو پیاوماقوولانەی کە شێخاڵیخان کاتی هرووژمی هێزەکانی قاجار ڕایگوێزتبوونە شیراز، دووبارە گێڕانییەوە ئیسفەهان و چی پێویست بوو لە ژیان بۆی دابین کردن و خستنیەوە سەرباری پێشوویان. بە قسەی نامی وەختایەک سەبزعەلیخان لە بازاڕی ئیسفەهان پاش دەمەقڕە لەگەڵ بازرگانێک لێیدا، تووڕە بوو. ئەگەر ئەم گێڕانەوە بسەلمێنین مەبەستەکە پەیوەندی بە پاککردنەوە و پاڵاوتنی دەرباری وەکیلەوە نابێ. غەففاری دەنووسێ بوونی ڕەفیعخان لە ئیسفەهان دەگەڕێتەوە سەر پسانی پەیوەندی لەگەڵ زەکیخانی برای کە بە مەبەستی هەڵگیرساندنی شۆڕش چووبووە برووجێرد و ئەو لای ماڵ و مناڵ و بارگەوبنەیان مابۆوە. ئەگەرچی غەففاری زانیاری گەرمەتەندووری لە باوکیڕا کە لە کاشان بووە دەسکەوتووە، بەڵام من مەیلم لێیە ئەم ڕووداوە بەرمەوە سەر لادان و خیچاندنی بەرەبابی شێخاڵیخان لە لایەن کەریمخانەوە و بەڵگەیەک بۆ لە کارلادانی سەبزعەلیخان بدۆزمەوە.

١٨ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٧٩.

شاری شووشتەر شکستی هێنا[١٩].

هەڵگەڕانەوە و نخوون بوونەوەی چاوەڕواننەکراوی پلە و پایەی شێخالیخان لە نێو ئەم بنەماڵە تازەیەی پاشایەتیدا ڕووداوێکی خەمورووژێن بوو و کەریمخان ئەوەندە لە کردەی خۆی پەشیمان ببۆوە کە تەواوی ماڵ و سامان و ملکوماشێکی کە وا لە ئێراقی عەجەم بووی و لێی زەوت کردبوو، سەرلەنوێ وێیداوە[٢٠].

لەم ڕۆژانەدا نەدرخانی زەند، ماکەی سەرەکی ڕاکردنی قەرەچەمەن بە مردنێکی کوتوپڕ مالاوایی لە جیهان کرد. شەوێک پاش زێدەڕۆیی لە مەینۆشی و کەیف و نەهەنگدا، وەختایەک دەیانشێلا و دایاندەمالی تێکهەڵگلا و سەرەڕای تەقەلای پزیشکان تازە وەهۆش نەهاتەوە. پزیشکان وای بۆچوون کە لە کاتی مەستیدا تووشی ڕیخۆڵەپێچەیەکی گران هاتووە، بەلام غەففاری بە ئاشکرا دەڵێ کە پشکنینەکانی دوای مەرگ نیشانیان داوە کە ژاری لە ڕیخۆڵەدا کۆبۆتەوە و ڕەنگە ژاریان لەگەڵ شەراب بۆ لێکدابێ و دەرخواردیان دابێ. گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتانە خوێنەر دەکاتە سەرپشک تا خۆی سەبارەت بە ڕاستی ڕووداوەکان بکەوێتە لێکۆڵینەوە[٢١]. ئەگەرچی هیچ وێناچێ کە زانین و زانیارییەکانی سەبارەت بە پێداچوونەوەی ئەو سەردەمی شتێکی پێچەوانەی ئەمە بخاتە ڕوو. ئەو مەبەستەی زۆر پڕمانایە ئەمەیە کە ڕاست لەو ڕۆژگاریدا زۆربەی پیاوانی دەربار و فەرماندەران و کەسانێکی کە وەک نەدرخان بەڕواڵەت چاوپۆشی لە هەڵەکانیان کرابوو کوژران یان کوێر کران. نموونەی بەرچاوی ئەم کەسانە فەتحعەلیخانی ئەفشارە. دەبێ کەسانێکی وەک کاکاخان و پیرمرادخان و شێخمرادخانی زەند کە سێ مانگ پاشگیرانی ورمێ و گەیشتنی لەشکری گەورە و گران بۆ خۆیە کوێر کرابوون لەم جەللەیە زیاد بکرێن. ئەمانە جگە لە دۆستایەتی لەگەڵ شێخالیخان تاوانێکی دیکەیان نەبوو و ناچار بوون کە لە بەرامبەر فەرمانەکانی کەریمخاندا لە بابەت کوێربوونیانەوە دەس بەردەنەوە؛

---

١٩ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ١٠٩ ـ ١١٠؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٠٦، کەسرەوی، ل ١٤٧. سەبارەت بە ئاڵوگۆڕەکانی خووزستان، بڕواننە بەشی ٦، بابەتی ٧.

٢٠ـ گوڵشەنی مراد، ل ١١٠.

٢١ـ گوڵشەنی مراد، ل ١١١.

گەرچی ئەمانە بەڕواڵەت بەخشران، بەڵام گۆیا وەختایەک کە پاش مەرگی نەدرخانی زەند بەهەق لە گیانی خۆیان ترسان و لەبەر کەریمخان لالانەوە و داوایان لێکرد دان بە لێبووردنەکەیان دابێنێ، وەکیل هەڵچوو و فەرمانی دا کە ئەوانیش بە چارەنووسی شێخاڵیخانەوە بنالێنن[۲۲].

لە ماوەی پێشڕەوی وەکیلدا بەرەو بەرەو باشوور لە ساڵی ۱۱۷۷ی کۆچی / ۱۷٦۳ ـ ۱۷٦٤ی زایینی، ڕاوی نێچیرە تۆقیوەکان بە شێوەیەکی بەربلاو درێژەی کێشا. لە ئیسفەهان تووراب‌خانی چگنی خوراسانی کە یەکێک لە خۆشەویستانی بارگای کەریمخان و سەرخەزنەداری قەڵەمڕەوی میری (مستەوفیولمەمالک) بوو کوێر کرا و میرزا عەقیلی ئیسفەهانی کە وەزیری دیوان و لە دۆستانی ناوبراو بوو لەگەڵ چەندکەس لە یارانی درانە دەس جەللاد. نامی ڕوونی دەکاتەوە کە تووراب‌خان هەر هێندەی پێنەچوو کە کوژرا و هیچ بەڵگەیەکیش جگە لە تووڕەبوونی وەکیل لە سەر تێداچوونی بە دەستەوە نادا[۲۳].
غەففاری دەڵێ توورابخان لەبەر بەشداری لە شۆرشی زەکی‌خان و هێنانی کەسانێک بۆ ئەندەروونی وەکیل دادگایی کرا. تۆمەتی هێنانی پیاوان بۆ ئەندەروونی لە لایەن خوشکی محەممەدحەسەن‌خانەوە خرابوویە ئەستۆی. بە مەبەستی ڕوون بوونەوەی ڕاستی و درۆ، تەنانەت شەوێکی کەریمخان بۆخۆی کەوتە چاوەدێری کردن(٤). پاش ئەم ڕووداوانە پلەی وەزارەت درایە میرزا محەممەدجەعفەری ئیسفەهانی و میرزا محەممەدی برووجێردی بوو بە خەزێنەدار[۲٤].

## ٦ ـ ٤ سیستمی حکوومەتی یان شێتایەتی تاکەکەسی

جەللەی گشتی کوشتار و چاوکۆڵینەکانی نێوخۆ لێرە بنەی هات، بەڵام سزادانی تاقمەکانی خێلاتی کە درزێک و سستییەک لە ملکەچییان‌دا پەیدا ببوو

۲۲ـ گوڵشەنی مراد، ل ۱۱۳ ـ ۱۱٤.
۲۳ـ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ۱۱٦؛ ئەنساری، ل ۲۲٦.
۲٤ـ گوڵشەنی مراد، ل ۱۲٤ ـ ۱۲٥. بە مەبەستی توێژینەوە سەبارەت بە پلە و پایەکان لە بارگای وەکیلدا، بڕواننە پەراوێزەکانی ۳، ٦، ۱۳ و ۱٦.

یان کەتبوونە بەر بەدگومانی، درێژەی کێشا. ئەم قۆناخە کە بە وردی گەلالـەی بۆ دارژابوو بە قەلاچۆکردنی ئەفغانییەکان لە تاران دەستی پێکرد و لە جەنگـەی شۆرشی زەکی‌خانا لورەکانی فەیلی و بەختیاری گرتـەوە و ئەمـەش دەبـێ بـە بەشێک لە نیشانە ئاشکراکانی ئەو نەخۆشییە دابندرێ. تەواوی ئەمانە گـۆرانی کەسایەتی نادرشا پاش کوێرکردنی رەزاقولی‌میرزای کـوری کـە بـوو بـە هـۆی تەنینەوەی کوشتارە بێ‌بەلگە و توندوتیژەکان دەخەنەوە یاد کە سـەری خۆشـی تێدا برد. چلۆن دەکرێ کە سەرەرای ئەم کارانە هەلگەرانەوە و تلاسابوونی ئـەو کەسەی هەتا ئێستا بۆ باسی بەزەیی و دادپەروەری بێوێنـەی بەویـەری چاکـە دواوین و دوایەش لە سەری دەرۆین، ریس و گوریس بێنینەوە.

وا دیارە دەربارەی گۆرانی تەبیاتی کەریم‌خانەوە دوو بۆچوون و پاسـاو بە دەستەوەیە و ئەگەر بیانخەینەوە سـەریەک رەنگـە بەشـێک لـە راسـتەقینە نیشان بدەن. پاش راوی بەرازە کێوی لە سیلاخۆر لە دوایین حەوتـەکانی سالـی ١٧٦٤دا کەریم‌خان زۆرتوند نەخۆش کەوت. لەم ناوچەیە گەلێک پەرۆشی مـەرگی بوون و دلیان غایلەی دەکرد، بەلام لە یەکەمی مـانگی رەجـەبی ١١٧٨ی کـۆچی/ ٢٥ی دیسامبری ١٧٦٤دا، پـاش دوو حەوتـە ئاگـاداری و چـاوەدێری شـەوانە و رۆژانەی چەند حەکیمێک، لە چنـگ ئـەم نەخۆشـییە خەلەسـت. یـەکێک لـەم پزیشکانە میرزا محەممەدئەمین بوو کە لە کاتی گـەمارۆی ورمـێدا، لـە ریـزی پیلانگێرانی کوشتنی کەریم‌خاندا پێـوە ببـوو. بـەلام لەبـەر چاکـە و خزمـەتی گرینگی پزیشکی چاوپۆشی لێکرا[٢٥]. گەرچی بـیرەوەری‌نووسـانی ئێـرانی هـیچ شتێکیان سەبارەت بە نەخۆشـییەکەی نەنووسـیوە، بـەلام راپـۆرتی کۆمەلـی «کرێملیت»ی بەسرە لەم جەنگەدا روونی دەکاتـەوە کـە بـە تـازەیی لـە چنـگ ئاوسانی گورچیلە رزگاری بـووە و چـاک بۆتـەوە. وەک گێراویانەتـەوە دەبـێ هێندەی تریاک کێشابێ کە تووشی ئەو دەردە بووبێ(٥). ئەگەر وابـێ دەبـێ لـە ماوەی چەند سالاندا گیرۆدەی ئێش و ئازارێک بووبێ کـە دەتوانـێ تێکچـوونی تەبیات و ئاکاری دادخوازانەی و گۆرانی بـەرەو رەقـەوەنی و تۆسـنی، پاسـاو بداتەوە. رەنگە هێندە تریاک‌کێشان و مەی‌خواردنەوەی بەر لەوەی بە مەبەسـتی سەرخۆشی و رابواردن بووبێ دەکرێ بۆ دامرکاندنی ژان و دەردێک هاتبێتە گـۆر

---

٢٥ـ گولشەنی مراد، ل ١٣٦ ـ ١٣٧؛ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ١٢٣.

کە دەتوانێ تێکچوونی تەبیات و ئاکاری دادخوازانەی و گۆڕانی بەرەو ڕقەوەنی و تۆسنی، پاساو بداتەوە[٢٦]. لەگەڵ ئەمەشدا نووسەندەکانی کۆمەڵی کرێملیت (کارێملیت) ئەم مەبەستە بە شێوەی جۆراوجۆر دەگێڕنەوە و بە پتەوونی پێیان وایە کە ئەم دابە زۆروکەم لە نێو فەرمانڕەوایانی ئەو ڕۆژگارىدا باو بووە[٢٧]. هەرچییەک بوو تازە وەکیل ببوو بە مرۆڤێکی مەترسیدار و خوێنڕێژ کە بۆ تاوانێکی بچووک چاو و لووت و گوێی کەسانی ژێرکێفی دەردێنا و دەیبڕی و هەردەم ئامادەی قەڵتوبڕ و ئەنجنینیان بوو[٢٨].

ڕاپۆرتە بەهەڵکەوتەکانی ڕووداونووسانی ئێرانی دەریدەخا کە کەریمخانیش کەم و زۆر بێبەش نەبووە لەو شێتی و غەزرینە بێمانا باوەی تایبەتی فەرمانڕەوایانی تر. لە ماوەی سەردەمی گەمارۆی شیراز لە هاوینی ساڵی ١٧٥٨دا، وەکیل ناچار بوو کە بە یارمەتی میرزامحەممەدی کەلانتەر سەبارەت بە کاروباری ئازۆقە و پاشەکەوت و یارانی قەڵەمڕەوی دەس بەرێ بۆ پێداچوونەوەیەکی دەگمەن. کەریمخان داوای لە میرزا محەممەد کرد کە یەکێک لە گەورەپیاوانی ئەو ناوچەیە بە ناوی مەلا ماندگار دنە بدا تا بە خۆی و ماڵ و دارایی و پیاوەکانییەوە بێتە شیراز. وەختایەک گوتی ناشێ چاوەڕوانی ئەمە بکرێ کە بە نێو گەمارۆی لەشکری قاجاردا تێپەڕێ و بێ، تووڕە بوو و هەڕەشەی کوشتنی لە کەلانتەر کرد(٦). بەگوێرەی نووسینی کەلانتەر پیاوەتی توراب‌خان[٢٩] ئەوی لە مەرگ ڕزگار کردووە و هەروەک دیتمان توراب‌خان خۆی بە تەڵەی ڕقی کەریمخانەوە بوو.

لەبەر ڕووناکایی ئەم ڕووداوانە، ڕەنگە ئەم زنجیرە کوشتار و سەربزێوییانە وەک دژکردەوەی فەرمانڕەوایەتی پیاوێکی چۆڵەپێچ کراوی دەمارپڕووکاو چاوی لێبکرێ. ئەغڵەب مەست بووە و ڕەنگە کارتێکردنی خەیاڵاتی مادە هۆشبەرەکان پیلانی خەیانەتی کەسانی باوەڕپێکراوی بە دڵیدا هێنابێ. لە

---

26- Carmelites, 665.

٢٧ـ Ibid, and 663 کەریمخان لە زەمانی تێکەڵاوی و هاتوچۆ لەگەڵ ئەرمەنی و گورجییەکان، بەڵێنی دابوو کە زۆر ئارەق نەخواتەوە.

28- Ibid, 666.

٢٩ـ ڕۆژنامەی بیرەوەرییەکانی کەلانتەر، ل ٣٠.

دەرەوەی جەغزی بارگاوە سەبارەت بە پیلانەکان زۆری فوو لێکراوە بۆیە لە دادوەری و سزادان ڕێگای توندڕەوی گرتۆتە بەر: تەنانەت وێدەچێ زۆربەی ڕووداونووسانی بەرگومانی کۆمەڵی کرێملی بایەخیان بۆ ئەم چەشنە ئەفسانانە دانابێ کە گوتوویانە «کەتن و پیلانی نەهێنی کە بێپسانەوە لە لایەن سەرۆکانی ڕەسمی بارگاوە دژی ژیانی وی گەلاڵەی دەکرێ، ناچاری دەکا تا بەپێچەوانەی تەبیاتی ئاشتیخوازانەی تێکڕای ئەوان چ تاوانەکانیان لە سەر سوور بووبێتەوە یان تەنیا بەرگومان بن، بکوژێ[30].»

## ٦ ـ ٥ سەرهەڵدانی زەکیخان

تەنیا بابەتێکی حاشاهەڵنەگر ڕاپەڕینی پتەوی زەکیخانە دژی دەسەڵاتی کەریمخان کە هەمیشە لە ژێر سێبەری خۆشەویستی و مێرەوانی وەکیلدا ژیابوو. ناوبراو کوڕی بوداق بوو. بوداق پاش مردنی «ئینـاق»ی برای، ژنەکەی مارە کردەوە کە دەبێتە دایکی کەریمخان، بۆیە زەکیخان هەروەک چۆن بە ئامۆزای وەکیل دادەندرا، دایکبراشی بوو. ئەو و شێخاڵیخان لە بارگای وەکیل و کاروباری سەرکردایەتیدا خاوەنی ڕێز و خۆشەویستییەکی تایبەت بوون. زەکیخان لە کاتی مەرگی کەریمخانا نیشانی دا کابرایەکی شەڕەنگێز و زاڵم و خاوەن سرشتێکی خوێنڕێژانەیە و هەستی تێگەیشتن و سەرڕاستی پێویستی بۆ دەمکوتی تاسە و تامەزرۆیی و داخوازەکانی نیە. وێڕای ئەمەش کەریمخان هەمیشە لە ڕادەبەدەر مایەی بۆ دادەنا و کردار و ئاکاری دزێوی کە زۆر لە کەسانی تر خراپتر بوو وەبەرچاو نەدەگرت.

پاش شەڕی قەرەچەمەن وەک باو بوو لە پیرۆزبایی و سەرکەوتننامەیەکدا کە بڵاوکرایەوە، دوای ناوی وەکیل ناوی شێخاڵیخان وەک سەرکردەی هێزەکان هاتبوو، ئەگەرچی لە دەسپێکی شەڕا لاوازیی نواندبوو. زەکیخان کە دەیبینی خۆڕاگری و نەکشانەوەی ئازایانەی تەنانەت بێ پەسندی

---

30- Carmelites. 663 ; cf. also p. 665.

دەنووسێ: «تەبیاتی دۆستایەتی و مێرەوانی لە ڕووحیدا خۆنەگرە، هێندێک جاران دەکەوێتە سەربارێکی وا خوێنڕێژانە کە ناچار دەبێ زۆربەیان بکوژێ یان کوێر بکا.»

وەکیل شکستی دوژمنی بە دواوەیە و پێویستە پتری سەرنج و بایخ پێبدریٚ، تووڕە ببوو. وەختایەک پاشماوەی سپای زەند بەرەو تەوریٚز کەوتنەڕیٚ، ئەوٚ و یارانی لەبەروەی زۆریان دڵ ئێشابوو لە ڕێی تارانەوە گەڕانەوە ئیسفەهان و خان گوێی نەدایە پێداگری و پاڕانەوەی ئەو سەردارانەی کە کەریمخان بە مەبەستی دڵدانەوە و گێڕانەوەی ناردبوونی. وەکیل خۆی دایە دەس چارەنووس و تاقمێکی بە فەرمانی هەڵبژێرانی زەکیخانەوە وەک سەرداری ئێراقی عەجەم بە شوێنیا نارد تا بەم شێوەیە ئابڕووی خۆی پاراستبێ و پاشان درێژەی دا بە ڕێگاکەی بەرەو ڕۆژاوا[٣١].

گەمارۆی ورمێ و گرتنی خێرای پاشماوەی ئازەربایجان بیر و هۆشی وەکیلی لەخۆی شەتەک دابوو. پاش هاتنەدی ئەم ئامانجە سەرنجی کەوتە سەر پارێزگاکانی قەفقاز و لە سێپتامبری ساڵی ١٧٦٣دا وەختایەک هەواڵی شالاو و چالاکی زەکیخان لە لەشکرگای ئەردەوێڵەوە گەیشتە ورمێ لێبڕا کە ئەم ڕووداوە تاڵە پتر بە وردی بخاتە بەر سەرنج[٣٢]. زەکیخان کاتێک پێی نایە تاران بارگەوبنەی شێخاڵیخانی کە نەزەرعەلیخانی برای بە سەری ڕادەگەیشت و لەویٚ مابۆوە تاڵان کرد و بەرەو ئیسفەهان ئاژاوتی.

لە ئیسفەهان چەند مانگێک بۆ پاراستنی بەرژەوەندی، ڕووکاری حوکمڕانێکی خۆبەکەمزان و دەڵەچە و ملکەچی بەخۆوە گرتبوو و وای دەنواند کە مەیلی لە ئاشتی و تەساڵحەیە. بۆ وێنە وەختایەک ڕاکردووانی سەر بە برایمخانی بوغایری لە ورمییەوە هەڵاتن و هاتنە ئیسفەهان، گرتنی و تاوانی لێئەستاندن، بەڵام ماڵ و سامانی بە خەنیمەت گیراوانی بە مەبەستی ڕاکێشانی پشتیوانی گەورەگەورەکانی ئیسفەهانی لە نێویاندا دابەش کرد[٣٣]. هەروەها وەک سەرداری ئێراقی عەجەم ئەوپەڕی شادمانی خۆی بە گەشت و گەڕان و پشکنینی ناوچە و مەڵبەندەکانی پارێزگاکە و قەڵەمڕەوی خۆی بە شێوەیەکی

---

٣١ـ گوڵشەنی مراد، ل ٨٩؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٣٢٧.

٣٢ـ گوڵشەنی مراد، ل ١١٧ ـ ١١٨؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١١٠ ـ ١١١. لەم گەشتەدا کەریمخان لە ئەردەوێڵ چووە زیارەتی گومبەزی شاسمایل بناغەدانەری زنجیرەی پاشایەتی سەفەوی. (گوڵشەنی مراد، ل ١١٧.)

٣٣ـ گوڵشەنی مراد، ل ١١٨.

یاسایی نیشان دا[٣٤].

وا وێدەچێ کە دۆستانی بەختیاری زەکیخان لــە پارێزگــای ئیسـفەهان تەمایان گرتبوو کە لە سەرهەڵدانی دەڵەمەی خانی زەندا بەشدار بـن و بکەونــە ڕاپەڕینێکی تەواو. وەختایەک زەکیخان بۆ دەرەوەی شاری ئیسفەهان سـەفەری کردبوو، ئەمانە فەرمانێکی ساختەیان لە لایەن وەکیلەوە بۆ زەکیخان نووسی و وەبیریان هێنایەوە کە عەلیمحەممەدخانی زەند، حــاکمی ئەوسـای بروجێـرد بگرێ و کوێری بکا. ئەو کات بە چەشنێک عــەلیمحەممــەدخانیان تێگەیانـد کــە ئەوان بەچاکە ڕێی بەڕێوەچوونی فەرمانەکەیان گرتووە و زەکــیخــان هــەر کــە حوکمەکەی گەیوەتە دەستی ڕەتی کردۆتەوە. ئامانج ئەمە بوو کــە ئــەویش لــە کەریمخان بتەکێننەوە. عەلیمحەممەدخان قبووڵی کـرد کـە فــەرمانی پاکتــاوی وەکیل ئەویشی گرتۆتەوە و هــەروەک چــاوەڕوان دەکـرا دایــە پــاڵ ڕاپــەڕیوان. وەختایەک زەکیخان گەڕاوە تەماشای کرد کە سـپاکەی لــە دەهــەزارەوە بۆتــە دوازدەهەزار شەڕکەری بەختیاری و بوغایری.

عەلیمحەممەدخان بە گرتنی شــار بــە نــاوی زەکــیخانــەوە سـپاکەی بەهێزتر کرد. هەروەها حاجیئاغــا محەممــەدی ڕەعنــایی سـەرۆکی شــارەوانی (ساحێبئیختیار) ئیسفەهان لێخرا و گیرا و جەریمە کرا. زەکیخان بە ڕەزامەندی لە بابەت گەلاڵەی داڕژاو گەڕاوە لای ڕاپەڕیوان و لــە مــاوەی سێڕۆژاندا بــڕی شێستهەزارتمەنی بە کەڵەگایی لە خەڵکی مەینەتباری ئیسفەهان ئەستاند[٣٥].

وەختایەک کە عەلیمحەممەدخان بە تاڵان و بڕۆی تاران و قوم و کاشان

---

٣٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١١١؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٢٧.

٣٥ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ١١٢ ـ ١١٢؛ گوڵشەنی مـراد، ل ١١٨ ـ ١١٩؛ تــەورێزی، ل ١٦٧ ئاـ ب؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٣٠ ـ ٣٣١. گوڵستانە بانگەشەی ئەوە دەکا کە دەرچوونی فەرمانی کوێرکرانی عەلیمحەممەدخان لە لایەن وەکیلــەوە ســاختە بــووە، بــەڵام بــە سەرنجدان بە سیاسەتی باوی وڵات ڕوونە کە هەڵکەوتێکی وا ڕێی تێـدەچێ. ( sp (٩٧/٤٢ دەنووسێ کە زەکیخان بۆیە دژی وەکیل ڕاپەڕیبوو کە فــەرمانی دابـوو چوارکــەس لــە سەرکردەکانی لەبەر ئاکاری نالەبار لە ئیسـفەهان زینـدانی بکـرێن. ئــەم چوارکەســە هازنراوە برێتی بوون لە: عەلیمحەممەدخان، نەزەرعەلیسوڵتان، شەفیع و کازمخانی بەختیاری.

لایەنگری دیکەی لە خۆی کۆکردەوە، زەکیخان خۆشی شانی دایە شانی. ئەو کات نەزەرسوڵتان و کازمخانی بەختیاری بۆ گرتنی کاشان گاڵ دا. لە ماوەی چەند ساڵی رابردوودا غەففاری پیر و پەرێشان سەری وەبەر قەڵەمڕەوی حکوومەتی ئیسفەهان هێنابوو. هێزە بەختیارییەکانی زەکیخان لە پەنا دیوار و شوورەی شاری کاشان دامەزران و شاڵاویان بردە نێو شار و دەستیان کرد بە داگیرکردنی ماڵ و سامانی خەڵک(٧). میرزا موعیززەددینی غەففاری بڕیاری دەسکردنەوە و بەربەرەکانی دا و گەلاڵەی هێرشێکی شەوانەی دژی دوژمن داڕشت. ئەم پەلامارە گیرانی کازمخان و سەدوهەشتا کەس لە پیاوانی و ڕاکردنی بەهەشتاوی نەزەرسوڵتانی لێکەوتەوە. زەکیخان لەڕێوە عەلیمحەممەدخانی بە لەشکرێکی گەورە و گرانەوە ناردە کاشان تا دەوری ئەو شارە بدا. عەلیمحەممەدخان لە «دیوانخانە» نیزیک بۆوە و لە دەرەوەی حەساری شار بوو بنەی دانا. ئەم قۆڵە کەمێک دواتر بەدەس تفەنگچییەکانی کاشانی گیرایەوە و هێزەکانی پەلاماردەر ناچار بوون کە فرسەخێک بکشێنەوە و پەنابەرنە بەر قەڵای شارۆچکەی فین. فین لەبەر باخی پاشایەتی سەربەدەرەوەیە. عەلیمحەممەدخان لەم ناوچەیەدا ڕۆژانە گەلاڵەی هەڵمەت و شاڵاوی دادەڕشت هەتا کاشان بخاتە گەمارۆ[٣٦].

## ٦ـ ٦ گرتنەوەی دووبارەی پارێزگای ئیسفەهان

کەریمخان وردەوردە قنایەتی کردبوو کە دەبێ بۆ بەرگرتن لە تێوەگلانی تەواوی هەرێمی ناوەندی ئیمپراتۆری تازە وەدەسهاتووی لە زۆنگاوی شڵەژاوی خۆی دەس بەکار بێ. ڕۆژی ١٦ی ئۆکتۆبری ١٧٦٣ لەگەڵ لەشکری بێژماری کە بەگوێرەی نووسینی غەففاری ١٥٠هەزار کەسێک دەبوو لە ئەردەوێڵ وەدەرکەوت. ئەم لەشکرە هەر تەنیا چەکدارانی خۆی نەبوون بەڵکوو سەربازانی ئێلجاڕی هەموو تایفە و سەرکردەکانی تازە دەستەمۆبووی ئازەربایجانیشی دەگرتەوە. تاقمێک لەم سەرکردە تێکشکاوانەی ئەم پارێزگایە وێڕای بنەماڵەکەیان بە

---

٣٦ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١١٩.

مەبەستی دەستەبەرێتی سەروەبەرهێنانی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیان لەگەلی هاتبوون. فەتحعەلیخانی ئەفشار، کازمخانی قەراچەداغی، پەناخانی جەوانشێر، عەبدوررەززاقبەگ و شابازخانی دونبولی سەربەدەرەوەترینی ئەم پۆلە بوون[٣٧]. هاوکات چەند هێزێکی پێشەنگ بە سەرکردایەتی مەولاسولتانی زەند و دووسێ کەس لە سەرکردەکانی ئەفشار بە مەبەستی ڕزگاری کاشان گال دران. هێزی زۆر و زەوەندیش لە مەلبەندی خەمسەدا کەوتنە پێشڕەوی و هەرکام لە شارەکانی خەلخال و سولتانییە یەکی ڕۆژێکیان خۆڕاگرت. زولفەقارخانی ئیرلووی ئەفشاریش نێردرایە خەمسە تا پاشەنگی لەشکری لە ئەستۆ بێ.

لە نیوەشەوێکا هێزەکانی ڕزگاریدەری کاشان گەیشتنە نیزیک ئەو شارە. مەولاسولتانی بێئەزموون و بێپارێز فەرمانی دا کە هەر ئەو شەوە هێرش بەرنە سەر هێزەکانی عەلیمحەممەدخان لە قەلای فیندا. مورتەزاقولی ئەفشار کە کۆنەشەڕوانێکی بەئەزموونی سەرکردەی هێزەکانی پشتیوان بوو، سەرەڕای داخوازی چەند پاتەی بە مەبەستی حەسانەوەی سوارانی شل و شەکەت و بەگوێنەکرانی بەناچار شانی بۆ نەوی کرد. وەک گێڕاویانەتەوە هێزەکانی زەند لای بەیانی پەلاماریان داوە چونکە زانیبوویان کە عەلیمحەممەدخان هەمیشە بۆ حەسانەوە دەچێتەوە ئیسفەهان و کۆمەلەی بارگەوبنەکەی لە لایەن دەستەیەک پاشەنگی بەهێزەوە ئاگاداری لێدەکرێ. کاتێک کە سوارانی ماندوو و ناڕێکوپێکی زەند هەلمەتیان برد، بە کوژرانی هەشتاکەسیان بۆ وێنە مەولاسولتان، بە دەس ئەم پاشەنگانە تێکشکان. هێزەکانی دوژمن بە ڕێکوپێکی تەواوەوە وێڕای هەشتا سەری بڕاو گەڕانەوە ئیسفەهان. کەریمخان وەختایەک لە ساوە بوو هەوالی ئەم شکستە پڕشەرمەزارییەی پێگەیشت و بە پەلە بەرەو کاشان کەوتەڕێ. لەم شارەدا غەففاری پیر یانی تەنیا قارەمانی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆژگارانەی کاشان چوو بە پیرییەوە. لە نێو دیلە گیراوەکانی سپای عەلیمحەممەدخاندا، نۆکەس بەختیاری و هەژدە کوردی ئەردەلانی ئازاد کردن[٣٨]. هەوالەکانی گەیشتوو لە ئیسفەهانەوە نیشانی دەدا کە زەکیخان چونکە چاوەڕوانی وەها بەرەوڕووبوونەوەیەکی بەربلاوی نەکردبوو، تووشی دلەڕاوکە

٣٧ـ گولشەنی مراد، ل ١١٩ ـ ١٢٠؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١١٣ ـ ١١٤.

٣٨ـ گولشەنی مراد، ل ١٢١ ـ ١٢٢.

و ئاڵۆزکان هاتبوو. بۆیە وێڕای بنەماڵە و بارگەوبنە و تاقمێکی زۆر لە یارانی بەختیاری و تاقمێک بارمتەی خاوخێزانەکانی سەر بە وەکیل ڕاستەوخۆ لە ئیسفەهانەوە بۆ زەردکێو و لەوێشەوە بەرەو خووزستان ڕایکردبوو. ئیسفەهان جارێکی تر بێ هیچ گرفتێک گیرایەوە[٣٩].

زەکیخان پاش ڕاکردن لە «سەردەشت» گیرسایەوە. ئەم شارۆچکەیە کەوتۆتە ڕۆژاوای داوێنەکانی زەردکێو. بارگەوبنەی سپاکەی لە باغێکی بەشوورەدا دانا و دەوری کردە مەتەرێز و خۆشی لەگەڵ زۆربەی شەڕکەرانی گەڕاوە گوندی «گەتوەند»ی نیزیک ئەو شوێنە[٤٠].

هێزە نێردراوەکانی لە ئیسفەهانەوە بە سەرکردایەتی نەزەرعەلیخانی زەند و عەلیخانی شاسەیوان پێشاوبڕکەیان داوە و لە قەڵایەکی دووفرسەخی گەتوەندا دامەزران. پتر لە مانگێکی تری کاتوساتی هێزەکان بەختی شەڕی تەکولۆی ڕۆژانە کرا. هەردوولا بێباوەڕ و جموجۆڵ کەوتبوونەوە[٤١]. ڕەنگە زەکیخان لەبەر ئومێدی بەخشران لە لایەن وەکیلەوە پتر خۆی نەدابێتە بەربەرەکانی، بەڵام دیسانیش حازر نەبوو خۆی بەدەستەوە بدا. کەریمخانیش نەزەرعەلیخانی ڕاسپاردبوو کە توندی لێنەکێشێ و بە زیندوویی بیگرێ[٤٢]. سەرەنجام زەکیخان بەلاماری سەنگەرەکانی نەزەرعەلیخانی دا بەڵام بەرەوڕووی خۆڕاگری خەنیم بۆوە. دژەهێرشی نەزەرعەلیخان لە پای دیوارەکانی قەڵا ڕاپەڕیوانی تەفروتونا کرد و زەکیخان ناچار بوو شوێنی دامەزرانی چۆل بکا و وێڕای سێسەد کەس بەرەو حەوێزە ڕایکرد.

پاشەواری چەکدارەکان کە هەڵاتبوونە لەشکرگای نەزەرعەلیخان بێشەڕ دەستیان بەردایەوە و هاوکات لەگەڵ ئازادی بارمتەکان و بارگەوبنە

---

٣٩ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٢٢؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١١٥؛ کەسرەوی، ل ١٥٢ ـ ١٥٣؛ مێلکۆم، ل ١٢٢.

٤٠ـ گەتوەند کەوتۆتە ٢٥کیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای شووشتەر لە لێواری باشووری شارۆچکەی سەردەشت. (بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی ٦، ل ٣١٠ و نەخشە).

٤١ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٢٩.

٤٢ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٢٥.

بەرەو ئیسفەهان گەڕانەوە[٤٣].

## ٦ ـ ٧ زەکیخان لە خووزستان

لە ماوەی ئەم قۆناخە دەسالانەیەدا کە ڕەقیبی پێشووی وەکیل یانی عەلیمەردانخان لە نێو هۆز و تایفەکانی دژبەر و دەستە و دایەرەی شارەکانی خووزستانا دۆستان و هاوپەیمانانێکی پەیدا کردبوو، گێرە و کێشەکانی نێوخۆیی و دەروون خێلی چەن ئالوگۆڕێکی لەم پارێزگایەدا بەدیهێنابوو. شێخ سەعدی ئالیکەسیر[٤٤] لە سالی ١٧٥٢دا، بە دەس «ناسر»ی مامی(٨) لە تەختی دەسەلاتەوە سەرەونخوون کرا[٤٥]. مەولاموتەللیبی[٤٦] «موشەعشەعی»ش بەڕوالەت وادیار بوو هێندێک زێدەبەشی و دەسەلاتەکانی حوکمڕانێتی عەرەبستانی وەدەس هێنابۆوە. شێخ سەعدی ئالیکەسیر سالی ١٧٥٤ لە حەوێزە زیندانی کرا و پاشان مرد یان بە دەستی مەولاموتەللیب کوژرا. بۆیە لە کلکەی سالی ١٧٦٣دا کە زەکیخان هاتە حەوێزە نێوانی حاکمی حەوێزی لەگەل شێخناسری خزمی نیزیک و پشتێی شێخسەعد تووشی گرژی و ناخۆشی هات. دەبێ والی (پارێزگار ـ حاکم) بە پەیدابوونی هاوپەیمانێکی ئاوا کەیفی ساز بووبێ و خانی ڕاپەڕیویش زۆری دەستی ڕێز لێنا. وایان بڕیاردا لە دووڕێی جیاوازەوە بەرەو دزفوول بکەونە ڕێ. ئالیکەسیر بەردەوام سەریان لە ئاست وەکیل بادەدا و ئەو بەینەش بە تێکشکاندنی هێزەکانی سەبزعەلیخانی سەرداری کوژراوی لوڕستان بێباکتر ببوون. بە مەبەستی هاوکاری و پەلامار و گرتنی دزفوول شانیان وەشانی زەکیخان دا. خانی یاغی دەیەویست ئەوەندی بووزدەخوا و دەتوانن بەهرەیان هەبێ و هاوپەیمانی زیاتری عەرەب بەرێتە ڕیزی هێزەکانی و گوێی نەدەدایە بکە و نەکەی حاکم. عەلیمحەممەدخان و شەفیعخان چوونە سوێی «عەلیقولیخان»ی حاکمی دزفوول هەتا پالی دەن بۆ ڕیزی ڕاپەڕیوان. ئەم کارە

٤٣ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١١٥ ـ ١١٦؛ گولشەنی مراد، ل ١٢٩.

44- Oppenheim I V part 1,53.

45- Ibid, 54 note 1 (citing the Tazkera – ye – Shushtar).

٤٦ـ گولشەنی مراد، ل ١٣٠.

دەبوو بە هۆی پارێزرانی بنکە و پێگەی زەکیخــان و زیــاتر بــوونی هێزەکــانی پشتیوانی تر بەتایبەت لە لای ئالیکەسیرەوە. سەرەنجام زەکیخان تەمای گرت زەمبروزەنگــی خــۆی لــە بەرامبــەر تەقــەلاکانی ئــەم تایفــەدا بــە دژی حــاکمی موشەعشەعی بنوێنــێ. شــەوێکی عــەلیمحەممــەدخان و شــەفیعخــانی لەگــەڵ چوارسەدکەس بە ناوی سەردانێکی دۆستانە ناردە لای حاکم و فەرمانی گــیرانی دا. لەپڕ خۆیان بە خێــوەتی حــاکم داکــرد و خــاوخێزان و ئەنــدامانی دەزگــای حکوومەتیان کوشت، بەڵام خودی والی (حوکمڕان) وای کرد دەستی بگاتە مــاینی خۆشبەز و دڵخوازی(۹). ئەم ماینەیان بۆ ڕۆژێکی ئاوا تەنگەتاو بــە زیــنکــراوی ڕادەگرت. چەند کەس لە غولامانیشــی وێــڕای ئــەو ڕایــانکرد. ماوەیــەک دواتــر زەکــیخــان تــەواوی مــاڵ و ســامانەکەی داگــیر کــرد و عــەلیمحەممــەدخان و نەجەفخانی کوردی بە مەبەستی پەیکەردەی حــاکم گــاڵ دا. نەجــەفخــان لــە دووفرسەخی شووشتەر گەیشتە سەری، ڕاکردووی تێماو بــە نێزەکــەی کــابرای هەڵمەتبەری هەڵداشت و پســاندی، بــەڵام کوڕەکــەی نەجــەفخــان ڕاســت لــە پشتەوەڕا پەلاماری دایــە و یەکســەمەکەی ئــەنگاوت و حــاکمی بــە دیــل گــرت و دەس و پێ بەستراو ناردییە لای زەکیخان. زیندانییەی نیگەران کە کەوتبووە بەر تۆڵەی دوژمنانی خوێنخۆری واتە عەرەبــەکانی ئــالیکەســیر، بــە لالانــەوە و پاڕانەوە حازر بوو ٦۰هەزار تمەن بدا بە زەکیخان. بە کەیفخۆشی پێشوازی لــە پێشنیارەکەی کرا. وایان قەرار کــرد نیــوەی ویشــکەپووڵ بــێ و نیــوەی زێــڕ و جەواهێرات کە دایکی حاکم لە دزفوول بیدا.

بەڵام ئالیکەسیر نەیانهێشت بە فێڵ و دەهۆ بــەر بــە تۆڵــەکردنەوەیان بگیرێ و دەرهەڵبوون و خێرایەکی کەوتنە گەڕ. زەکــیخــان ناچــار کــرا دیلەکــە بداتەوە دەس دوژمنانی. سەرکردایەتی هاوپەیمانانی عەرەبی ئــالیکەســیر لــە ئەستۆی کوڕانی شێخ سەعد یانی فەرحان، کاتع و عەلوان بوو کــە بــە ســەری بڕاوی حاکمەوە گەڕانەوە هەرێمی خۆیان. هاوڕێیــانی دیکەشــیان کــە عــەرەبی ئالیکەسیر بوون کەوتنە شــوێنیان. تاقمێــک لــە لایــەنگرانی حــاکمی کــوژراو زەکیخانیان جێهێشت و سەیر لێی بوونــە دوژمــن. هاوکــارانی پێشــووی واتــە عەلیقولیخان و پیاوانی دزفوولی قێزیان لەم هەڵوێستە پیاوکوژانەیە هەستا و ئیتر بەڵگە و بۆنەیەکیان بۆ یاریکاری ئەو پێشک نەدەهات، بۆیــە نەیانهێشــت

پێبنێتە شاری دزفوول[٤٧].

## ٦ ـ ٨ ئاشتی

جگە لە تاقمێکی سەرکردەکانی لوڕ و بەختیاری تەواوی هاوڕێیانی زەکیخان لێی ڕەوینەوە. خانی یاغی ئێستا کەوتبووە بەر شەپۆلی مەترسی تۆڵەکردنەوەی دوژمنانی عەرەبی و تەنانەت نەیدەتوانی ئالیک و تفاقێک کۆکاتەوە، بۆیە تەمای گرت کە بگەڕێتەوە لای باکوور و جەرگەی چیاکانی لوڕستان و بەڵکوو بەم شێوەیە بتوانێ پەناگا و لایەنگرانێک لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە[٤٨]. لە سەرەتای ساڵی ١٧٦٤دا کە کەریمخان چووبووە سیلاخور، تووشی نەخۆشییەکی سەخت هاتبوو کە پێشتر باسی کرا. وەختایەک بیستی

٤٧ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٣٠ ـ ١٣٢. نامی، ل ١٢٣ی گیتیگوشا. غەففاری تەنیا دەربارەی یەکێتی زەکیخان و ئالیکەسیر، بە کورتی شتێکی هێناوە. کەسرەوی لە لاپەڕە ١٥٣ ـ ١٥٥ی مێژووی پێنسەدساڵەی خووزستاندا نووسینەکەی لەگەڵ نامی یەکتر ناگرێتەوە و دەڵێ مەولاموتەللیب لەگەڵ زەکیخان کەوتە دژایەتی، بۆیە گیرا و عەلیمحەممەدخانی زەند کوشتی. گوڵستانە لە لاپەڕە ٣٣٢ ـ ٣٣٣ی موجمەلوتتەواریخدا ئەم ڕووداوە وەک شەڕێکی بەگەرمەی نێوان زەکیخان بە سەرکردایەتی عەلیمحەممەدخان و حاکم (وەک سەرۆکی بنیکەعب) دادەنێ و دەڵێ زەکیخان لەگەڵ سێ کوڕی ئەبوو تالبی شووشتەری کە والی باوکی کوشتبوون پەیمانی بەست. ئەگەرچی گێڕانەوەی گوڵستانە لە بابەت هێنانی ناوەکانەوە ئاڵۆزبڵۆزە بەڵام لە بابەت هەڵکەوتەکانی دواترا لەگەڵ گوڵشەنی مراد تەواو یەکتر دەخوێنێتەوە. ئەویش وەک کەسرەوی لای وایە کە حاکم لەگەڵ عەلیمحەممەدخان کەوتۆتە شەڕێکی دەستەویەخە و گیراوە. پاشان زەکیخان دایە دەس شەفیعخان و بێئاگاداری عەلیمحەممەدخان درایەوە دەس دوژمنانی ڕقەوەنی. پاشان دایکی حاکم تەمای گرت کوڕەکەی بکڕێتەوە. «تەوریزی»ش ڕووداوێکی ئەوتۆ دەگێڕێتەوە، ل ١٦٧ب و تەفرەشی، ل ٢١٥ئا.

٤٨ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٣٢؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٢٤؛ کەسرەوی، ل ١٥٥. Malcolm, 122.

زەکیخان گەڕاوەتەوە لای کوێستانان، سێهەزار چەکداری بە سەرکردایەتی نەزەرعەلیخان و جانگیرخان بەڕێ کرد هەتا بەرەگەی لێبگرن. لە خورەمئاباد لێی وەدەس هاتن و نەیانهێشت هێزەکانی تازەپشووی لور بگەنە هانای و راویان نا. نەزەرعەلیخان کە بە تووڕەیی دەیەویست تۆڵەی شکستی جاری پێشووی بکاتەوە، بێپسانەوە لە چیا و چۆڵی لورستانی فەیلیدا شوێنی لە دوو دەگێڕا. ئاخرییەکەی لە سووچێکی خاکی پشتکۆدا(١٠) دەورەی گرت، بەڵام پێیخۆش نەبوو بکەوێتە شەڕێکی بەگەرمە و یەکسەرە کردنی کاری ڕاکردووان، چونکە کوژرانی زەکیخان و دەرهەڵبوونی وەکیلی لەبەرچاو بوو. نەزەرعەلیخان شەڕی ڕاگرت و لە کەریمخانی ڕاسپارد. کەریمخان گەیبووە یەسکانی و هێزی پشتیوانی بۆ نارد و فەرمانی پێدا کە هیچی دی لە بەرامبەر خانی یاغیدا نەوی نەکێشێ. نەزەرعەلیخان لەم ڕۆژانەدا پەیامێکی لە زەکیخانەوە پێگەیشت کە دەریدەخست پەشیمانە و داوای بەخشین دەکا. بەڵام کەریمخان قسەکانی لێ قبووڵ نەکرد[٤٩].

لور و بەختیاری کە لە ترسی کارەکانی خۆیان تۆقیبوون زەکیخانیان دنە دەدا کە ڕابکا، چونکە ئەم تاقمە چاوەڕوانی بەزەیی و لێبووردنێکی وا نەبوون کە وەکیل لەگەڵ یەکێک لە ئەندامانی بنەماڵەی خۆی ڕەچاوی دەکرد[٥٠].

وەختایەک نەزەرعەلیخان جارێکی تر ڕاپەڕیوانی لە شەڕ وەردایەوە، چەکدارانی لور تێگەیشتن کە دەرفەتی پێویست لە کیس چووە و بەناچار چەشنی عەرەبەکان بە ئارامی سەری خۆیان هەڵگرت و لێی ترازان. زەکیخان زۆر پیس شکا و سەرکردەکانی سپای گیران و خۆشی لەگەڵ عەلیمحەممەدخان و شەفیعخان و چەند دەس لە نۆکەرانی بەرەو سنووره دوورەدەستەکانی خانەقین تێیتەقاند. چونکە وەرگیرانی وەک کەسێکی دوورخراوە کە ناوی خەیانەتکاری لە سەر بوو لە وڵاتی دیکەدا بە خاترجەمی دەستی نەدەدا، داوای خۆبەدەستەوەدانی کرد، بەڵام پێشنیارەکەی وابوو کە خۆی ڕاستەوخۆ بچێتە لای کەریمخان و بە ناوی کەسێکی پەژیوان داوای لێبووردن بکا. نەزەرعەلیخان

٤٩ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٣٥.

٥٠ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٢٤ ـ ١٢٥.

بە دڵەڕاوکە پێشنیارەکەی قبووڵ کرد بەڵام پاشماوەی سپاکەی بە مەبەستی بەرگرتن لە خوێنڕێژی زیاتر گەمارۆ دا[٥١]. تاقمێک چەکداری وەک سێبەر خستە شوێنی هەتا لەشکرگای وەکیل چاوی لێ‌خافڵ نەکەن[٥٢]. سەرەنجام خانی یاغی خۆی لە تەویلەی کەریمخان هاویشت و بەخشرا و دیسانیش ڕێزی لێگیرا. عەلی‌محەممەدخان کە لە داخوازی بەخشرانی دڵنیا نەبوو[٥٣] لە نیوەی ڕێیە لە زەکی‌خان هەڵبڕا و بە پەشیمانی و دەمارپرووکاوی وێڕای دووکەس لە غولامانی پەنای بردە مەرقەدی پاکی مەعسوومەی قوم. بەهەرحاڵ بە پیاوەتی و کەیخودایەتی نەزەرعەلی‌خان و شێخاڵی‌خان ئەویش بەخشرا و چاوپۆشی لە تاوانەکانی کرا و کەوتەبەر ڕوحم و بەزەیی وەکیل[٥٤].

بەم شێوە تەنیا سەرهەڵدانێکی کە لە لایەن یەکێک لە خزمانی وەکیلەوە بە دژی وی گەڵاڵە کرا و بەڕێوەچوو کۆتایی پێهات. گومانی تێدا نیە ئەگەرچی دەسبزاوتنی زەکی‌خانی زیزەڵۆک و سەربزێو ئەم ڕاپەڕینەی بەدی‌هێنابوو، بەڵام خێرایەکی وای تەنییەوە و بوو بە شەڕ و لەشکرلێکرانێک کە دەیتوانی جارێکی دیکەش ئێران بەرێتەوە نێو جەرگەی هەرەجمەرەج و کوشتاری قۆناخی بۆشایی دەسەڵاتی پێشوو. ئەم ڕاپەڕینە وەک «گەرماپێوێک» هەلومەرجی کەش و هەوای سیاسی جودا لە یاغی‌بوونی زەکی‌خانی نیشان دا و دەرکەوت کە هێندێک کەس و دەستەوبەستەی خێڵاتی کە وردەوردە دەستەمۆ ببوون، بە شوێن ناوەندێکا گەڕابوون بۆ درێژەی دوژمنایەتی. ئەگەرچی ئەم ڕاپەڕینە ئامادەیی وەکیلی بۆ بەخشینی زەکی‌خانی پەژیوان ـ کە کابرایەکی خودبەسەر و بێ‌بەزە بوو بەڵام بە ئاشکرا نیشانی دا کە خۆی هیچ مەترسییەکی بۆ ئامۆزاکەی نیە ـ بە دواوە بوو، بەڵام لە بابەت ئەو کەس و تایفانەی پشتیوانییان لێکردبوو، زۆر توندیان لێکێشرا و ئەغڵەب کوژران و دوورخرانەوە یان بۆ ڕزگاری گیانی خۆیان بەناچاری جەریمەیان دا.

---

٥١ـ گوڵشەنی مراد، ل ۱۳۳ ـ ۱۳٤.

٥٢ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ۳۳٤.

٥٣ـ هەمان سەرچاوە؛ گوڵشەنی مراد، ل ۱۳٥؛ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ۱۲٦.

٥٤ـ گوڵشەنی مراد، ل ۱۳٥؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ۳۳٤.

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ ئەم بەسەرهاتە یەکێک لە پاکتاوە خوێناوییەکانی دەربارى کەریمخانە کە لە کتێبی گوڵشەنی مرادا بە درێژی و لە نووسراوەکانی ترا بە کورتی باسی کراوە. میرزا موحسینی برووجێردی کە یەکێک لە ئاوالانی عەیش و نۆش و حەرەمخانەی وەکیل بوو بە هاودەستی ڕۆستەمسوڵتانی زەند و کازمسوڵتانی زەند شەوانە چەند کەس لە ژنانی حەرەمخانەیان دەبردە لای خۆیان. لە کۆبوونەوەیەکی ژنانەدا وێڕای پێکهەڵپرژان و دمەتەقە قسەکە درکا. خەجیجخانمی خوشکی محەممەدحەسەنخانی قاجار کە یەکێک بوو لە ژنەکانی وەکیل، ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە. کەریمخان بە لەسەرەخۆیی ژنی زەکیخانی ڕاسپارد تا لە قسەکە بکۆڵێتەوە. ڕاستی ڕوون بۆوە. کازمسوڵتان و ڕۆستەمسوڵتانی زەندیان بە زبری شمشێر کوشت. ژنانی تاوانباریش کوژران. میرزا موحسین کە هەمیشە بۆ کۆڕی شەرابخواردنەوەی وەکیل بانگ دەکرا لەوێ دانیشتبوو کە خانی زەند لێی پرسی ئەگەر کەسێک خەیانەت بە مەزن و میری خۆی بکا دەبێ چی لێبکرێ؟ وڵامی داوە دەبێ بسووتێندرێ. بە فەرمانی کەریمخان کۆمایەکی گەورەی ویشکەڵەداریان خستە سەریەک و میرزا موحسینیان تێهاویشت و ئاگریان دا.

٢ـ موتەللیبی کوربالی کوڕی شەمسەددینی کافقایی یەکێک لە جووتبەندەکانی کوربال بوو کە زەمانی پەلاماری ئازادخان بۆ سەر شیراز بە لایەنگرێتی کەریمخان ڕاپەڕی و تاقمێکی سوارەی لە ژێر ڕکێفی دابوو و نازناوی «خان»ی وەرگرت. یەکێک بوو لە گیانفیداکانی کەریمخان، بەڵام لە گەمارۆی ورمێدا کەوتە ڕیزی پیلانگێڕان و لەگەڵ تاقمی یارانی برایمخانی بوغایری و شابازخانی دونبولی کوژرا.

٣ـ عەلیقولی کازروونی یەکێک بوو لە پیاوماقوولانی فارسی و

ماوەیەکی درێژ حوکمڕانی کازروون بوو. لە شەڕی قەرەچەمەندا وێڕای تاقمێک لە چەکدارانی ناوچەی فارس و دەشتستانی ڕایکرد و لە ئیسفەهان گیرا. بڕیار درا کوێر بکرێ بەڵام میرزا محەممەدی کەلانتەر و براکەی کەوتنە نێوان. لە لاپەڕە ٦٢ی ڕۆژنامەی کەلانتەردا دەنووسێ: لەو شەویشدا خەریکبوو هەردکمان سەرمان تێدابچێ. وەکیل زۆر تووڕە بوو و گوتی هەرکەس لە هەرجێیەک دوژمنی دەوڵەتی ئێمە بێ دۆستایەتی دەکەی و دەتەوێ ئاوا خەریکی نان بە قەرزدان بی بە جەماوەری دەوروبەر. بەڵام باشە ئەوە لێی خۆش بووم. لە سەردەمی حکوومەتی جەعفەرخاندا گیرا و خرایە بەند.

٤- توراب‌خانی چگنی کەسێک بوو لە تۆرەمەی خێڵی گەورەی چگنی کە سەردەمی شاعەباس دوورخرابوونەوە بۆ خوراسان. ئەم خێڵە زەمانی سەفەوییە پیاوی گەورەیان لێهەڵکەوتووە. توراب‌خان لە سەردەمی نادرشادا حاکمی نەهاوەند بوو. جارێکیش دایە پاڵ کەریم‌خان و خەیانەتی کرد، بەڵام بەخشرا. لەبەر دوو هۆ کوژرا: ١- دنەدانی زەکی‌خان بۆ ڕاپەڕین ٢- لە ڕێی حاجی تالب‌خانی ڕیش‌سپی حەرەمخانەی وەکیلەوە دەستی لەگەڵ چەند کەنیزێک تێکەڵ کردبوو... کەریم‌خان لێکۆڵینەوەی کرد و مەبەستەکە ڕوون بووە. توراب‌خان کوێرکرا. کەنیزەکان و حاجی تالب کوژران. بۆ سبەینێ سەری توراب‌خانی کوێریان لەگەڵ هاوڕێ و هاوکاری واتە میرزاعەقیل کە وەزیری دیوان بوو تێدا برد... کوژرانی توراب‌خان دووهەمین پاکتاو بوو سەبارەت بە حەرەمخانەی وەکیل.

٥- لە زەمانی زەندیەدا خواردنی تریاک کە کراوەتە ماجووم باو بووە. مادەی هۆشبەر لە سەردەمی سەفەوییەڕا دەکرانە گرموولە و دەخوران و تریاک‌کێشان لە ئێرانا ڕەوتێکی تایبەتی تێپەڕ کردووە. ئەگەرچی تەبیاتی کەریم‌خان شەقلی مادەی هۆشبەری پێوە دیتراوە، بەڵام لە هیچکام لە سەرچاوەکاندا تریاک‌کێشانیم وەبەرچاو نەهاتووە.

٦- مەلا ماندگار کەلانتەر و خاوەنی کوار بوو. ملک‌وماش و مەڕ و گاڕان و ڕەوەیەکی زۆر و زەوەندی هەبوو. لە فارس و لوڕستان ماڵ و سامانی ببوو بە مەسەل. کەلانتەر سەبارەت بە مەبەستێکی کە ڕێزدار پێری ئاماژەی پێکردووە، ئاوا دەنووسێ: ئەوە بۆ دووجارەی دەچوو کە محەممەدحەسەن‌خانی قاجار

بێتەوە شیراز و وەکیل زۆر پـەرۆش و پەرێشـان بـوو. ڕۆژێکیـان ڕەفیـعخـانی سیاچارە لە خزمەت وەکیـلدا لـە سـەربانی عـەمبار ڕاوەسـتابوو کـە وەکیـل باسوخواسی مەلاماندگاری لێپرسیم. منیش عەرزم کرد کە نـاوێرێ لـە ترسـی لەشکری محەممەدحەسەنخانی قاجار بێتە شیراز و پەل بېزێـوێ. وەکیـل پێـی تێکچوو. ڕەفیعخانی چارەڕەش گوتی فلانکەس گوڵەبەڕۆژەیە و دەبێ بکـوژرێ. وەکیلیش بە تووڕەیی کوتی بتکوژم. عەرزم کرد قسەیەکی وام نەکرد کە تیغم بێتە سەری؛ خودالێخۆشبوو توورابخان چاوێکی لێهەڵتەکاندم یانیها بڕۆ...

٧ــ کـازمخـانی بـەختیاری و نەزەرسوڵـتانی بـەختیاری لـە لایـەن زەکیخانەوە کرانە سەرۆکی کاشان و لـە گـەڕەکێکی دوورەشـار بڤـەیان دانـا. عەبدوڕڕەززاقی کاشانی کە زاوای موعیززەددین محەممەدی غەففاری و لە لایـەن کەریمخانەوە نوێنەری خەڵکی کاشان بوو، سەری بۆ نەوی نـەکردن و تابشـتی ئەو گشـتە زوڵـم و زۆرەی نـەهێنا. لەپـڕێک پـەلاماری دان و کـازمخـانی بـە سەدوهەشتا کەسەوە ئەسیر کرد و نەزەرسوڵتانی برینـدار هەڵاتـە ئیسـفەهان. وەختایەک زەکیخان بیستی عەلیمحەممەدخانی نارد و شاری کاشانی گەمارۆ دا و کەریمخان بەناچار بەرەو ئەوێ کەوتـەڕێ. نووسـینی ڕێـزدار پێـری لەگـەڵ سەرچاوەی سەرەکی یانی گوڵشەنی مراد یەکتر ناگرێتەوە، چونکە لەم کتێبـەدا کە نووسەرەکەی کـوڕی مـیرزا مـوعیززەددین محەممـەد یـانی ئەبولحەسـەنی غەففارییـە، عەبـدوڕڕەززاقی زاوای بـە قارەمـانی بەربـەرەکانی و خـۆڕاگری ناساندووە.

٨ ـ شێخ ناسری کوڕی کەریم کـوڕی خـەنیفر یـەکێک لـە شـێخەکانی ئالیکەسیر و ئامۆزاکانی شێخ سەعدی کوڕی فارس کوڕی موساعید کوڕی ناسر کوڕی خەنیفر بوو. چونکە کەعبییەکان لە سەعد ناڕازی بوون بیانوویان پێگـرت و لە شەڕێکا کە قەوما شێخ سەعد گیرا، بەڵام پاشـان ئـازاد کـرا و چـووە نێـو ئالیخەمیس و سەرۆکایەتی ئالیکەسیر کەوتە ئەستۆی شێخ ناسر.

٩ـ مەولا متەللیبی کوڕی سەیدموحەممەدی کوڕی فەرەجوڵلاخان حاکمی حەوێزە پێی خۆش نەبوو کە لە ڕاپەڕینی زەکیخانەوە بگلێ، بـەڵام بەڕواڵـەت نەیدرکاند. تایفەی ئالیکەسیر لەبەر گیران و کوژرانی شێخ سەعد لـە حـەوێزە بە دەس تایفەی موشەعشەعی، خۆیان لە خانی زەند نیزیک کردەوە و بەڵێنیان

لێوەرگرت کە یارمەتییان بدا بۆ گیرانی حاکم (والی). زەکیخان، نەجەفخـان و عەلیمحەممەدخانی بە بیانووی دیدارێکی دۆستانە نـاردە مالّـی و بـەر لـەوەی وەخۆ بێتەوە کەوتنە قەلاّچۆکردنی خاوخێزانی. خۆی و چەند غولام و نۆکـەرێک ڕایانکرد. عەلیمحەممەدخان و نەجەفخان کەوتنە شوێنی. نەجـەفخـانی بـە نێزە کوشت و کوڕەی دلاوەریشی کە بە قەسـتی کوشـتن پـەلاماری دابـوو، بـە شیرێک دوولەت کرد. بەلاّم عەلیمحەممەدخان ماینـە سەرناسـەکەی دایـە بـەر دەمانچە و ئەنگاوتی و پیاوەکانی حاکمیان گرت. ئەگەرچی وا قەرار کرا کە دایکی والی ٦٠هەزار تمەن بدا و کوڕەکەی بکڕێتەوە، بەلاّم ئـالیکەسـیر خۆیـان دایـە بەرەوە و نەیانهێشت و حاکمیان وەرگرت. شێخ فەرحان و کـاتع و عـەلوان کـە هەرسێکیان کوڕی سەعد کوڕی فارس بوون کوشتیان و لەودەمیڕا شێخ فـەرحان ناوی زڕا بە شێخ «فیرعەون». کوژرانی حاکم هۆکاری سەرەکی شکستی زەکیخان بوو، چونکە عەرەب کە تەنیا بۆ خوێنگری هاتبوون گەڕانەوە و عەلیقولیخان و دزفوولییەکانیش لێی بێزران و تۆقین و دەروازەی شاریان لە ڕوو داخست.

١٠ـ مەبەست لە پشتکۆ پارێزگای «ئیلام»ی ئێستایە کە ئەو کات پشتکۆی لوڕستان بوو. زەکیخان پەنای بردبووە بەر بادرائی و باغسائی.

# ٧

# فارس و پارێزگاکانی ناوەندی

## ٧ ـ ١ بەختیاری

پاش گرتن و بەچۆک داهێنانی سەرکەوتووانەی ئێراقی عەجەم و لێوارەکانی دەریای خەزەر و ئازەربایجان، کەریمخان سەرنجی کەوتە سەر باشووری ئیسفەهان واتە پارێزگای گەورەی فارس و درێژەی وەسەرخۆگێڕانی خاک و مەڵبەندەکانی قەراغ و قۆلاغی پایتەختی هەڵبژێراوی کە شیراز بێ. لە ماوەی گەشت و گەڕانی وەکیلا بۆ دەروەی شیراز، سادقخانی برای ئەم شارەی وەک سەربازگەیەکی لەشکری لێکردبوو و زۆربەی ناوچەکانی فارسی بە پەلاماری تەمێیانە و چێوەچزانە دووبارە هێنابۆوە ژێرڕکێف. ئێستا جەنگەی ئەمە هاتبوو کە مەڵبەندەکانی دوور لە شیراز وەک لوڕستانی فەیلی و بەختیاری و کۆهکیلۆیە و لارستان بێنێتە ژێر باڵی حکوومەتی خۆی و بیانکاتە سەرچاوەی ڕێکوپێکی ئازۆخە و بەرهەم و هێزی ئینسانی و پێگەیەکی جێی متمانەی تەناهی و پاراستنی ڕێگاکانی دۆڵ و دەرە و کەل و ڕەوگە

شاخستانییەکانی کە بەرەو خووزستان و ناوچەکانی لێوار و بەندەرعەباس و کرمان شۆڕ دەبوونەوە. ڕەنگە سەرەتای کار تەنانەت بگەڕێتەوە بۆ بەر لە گەشتی ساڵی ١٧٥٨ بۆ ناوچەکانی باکووری و لەودەمیش بە دواوە کۆمەڵێک هەنگاوی ڕێکوپێک لە مابەینی ساڵانی ١٧٦٤ و ١٧٦٦دا هاویژراوە.

چیانشینانی سەرکێشی زاگرۆسی ناوەندی یانی بەختیارییەکان کە لەمێژ بوو خەریکی خۆ قایمکردن و برەوی دەسەڵاتیان بوون لە دەرودەشتەکانی دراوسێدا، سەبارەت بە هەر هێزێکی کە ئیسفەهانی دەخستە ژێرڕکێفی گەلێک بەپارێزەوە دەجووڵانەوە. لە دەورانی پاشایەتی سەفەوییاندا ئێلخانێتی (مەزنایەتی) بەختیاری وا دیارە پلەیەک بووە کە کەوتۆتە پاش ئەو چوار کەسەی پشتاوپشت بوونە حوکمڕان[1]. لە دەورانی نادرشادا عەلیمەردانخان یەکێک لەو سەردارە بە دەسەڵاتانە بوو کە زۆر بە پاکی و یەکڕەنگی خزمەتی پێکردبوو. پاش داڕووخانی نادر، خۆی لە پلە و شوێنێک نیزیک کردبۆوە کە بتوانێ دەس بە سەر ئیمپراتۆرییەکەی دابگرێ. نادرشا لە سەردەمی پاشایەتیدا هەوڵی دابوو کە دەسەڵاتەکانی ناوچەیی وەک زەندیە و کورد و تایفەکانی تر تێکشکێنێ و بە مەبەستی ڕێگرتن لە شەڕەخۆری و تاڵان و بڕۆی بەختیارییەکانیش بە هێنانی تاقمێکی بەرچاوی شەڕکەرانیان بۆ نێو ڕیزی سوارانی خزمەت ڕکێفی و ڕاگوێزتنی گشتی و تەواوی تیرەکانی ئەم تایفەیە بۆ لای سنوورەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی، توانی چورتمیشیان بکا و لینگیان بە سەردا بێنێ. بە شوێن ئەم سیاسەتەدا و پاش ئەوەی ڕاپەڕینی عەلیمرادخانی چوارلەنگی بەختیاری(١) لە ساڵی ١٧٣٦دا تێکشکاند، دەهەزار سەر خێزانی هەردک تیرەی «چوارلەنگ» و «حەوتلەنگ»ی لە مەڵبەندی جام کە کەوتۆتە نێوەڕاست ڕێی هیرات بۆ مەشهەد نیشتەجێ کرد[2].

لەگەڵ بڕانەوە و پڕووسقانی پاشایەتی نادرشا و گەڕانەوەی عەلیمەردانخان، بەختیارییەکان دووبارە خۆیان ڕزگار کرد. کەریمخان لە ڕۆژگاری پێش و پاش شکانی بە دەس عەلیمەردانخان پێیخۆش بوو لەگەڵ

1- See Lockhart . Safavi Dynasty, 6.

2- Lockhart, Nadir shah, 110 ; cf. Perry ((Forced Migration)), 2.9.

خێڵی بەختیاری پەیوەندییەکی ئاشتیخوازانە و گەرموگوڕ نیشان بدا. بەڵام بەختیارییەکان قەت لە یادیان نەبردبۆوە کە خانی زەند بە مەبەستی هێنانە ژێرڕکێفی ئێرانی ڕۆژاوایی چۆن ئەوانی دابوویە بەر زەبری پەلامارەکانی. بۆیە وەختایەک کە لە ماوەی ڕووداوەکانی ساڵی ١٧٦٢دا سەرقاڵی گرتنی ئازەربایجان بوو، ڕاکردنی زەکیخانی کردە بیانوو بە مەبەستی گرتنەوەی ئیسفەهان و تەمای گرت کە بۆ خاشەکێشانی مەترسی بەختیارییەکان ڕەوت و ڕێبازی نادرشا بگرێتە بەر.

ماوەیەکی کورت پاش ئەوەی ئیسفەهانیان لە زەکیخان وەرگرتەوە، وەکیل هێزەکانی لەوێ دامەزراند و هێندێکانی سزا دا و دەستەیەکی خەڵات کردن. وێدەچێ بەر لە هاتنی بەهاری ساڵی ١٧٦٤ی زایینی[٣] پێی نابێتە خاکی شاریکورد لە ناوچەی چوارمحاڵ(٢) و لە داوێنی بەرزاییەکانی بەختیاری و جەرگەی چیاکانی زەردکێو بنکەیەکی دانا.

لەم شوێنەوە چەند هێزێکی تۆکمەی بە مەبەستی نواندنی زەبروزەنگ بۆ سەر تیرە و تۆرەمەکانی ناوچەکە بەڕێکرد. هەرکام لەم هێزانە تایبەت درابوو بە یەکێک لە تیرەکانی بەختیاری. هێزەکانی زەندیان ڕاهێنابوو کە ئەوەندەی دەکرێ دەبێ تیرەکانی ڕەویو بێ خوێنڕژی بێهوودە و تاڵانی ماڵیان کۆبکەنەوە و ڕاپێچی دەشتەکانیان بکەن. ئاخرییەکەی ئەم کارە گەورە بەڕێوە چوو و جەماوەری تیرە چەشناوچەشنەکان و دوو تایفەی چوارلەنگ و حەوتلەنگ هەرکام کەوتنە ژێر چاوەدێری تاقمێکی هێزەکانی زەند لە دەرودەشتی هاموون و چەککران و ئەسپ و ئامرازی شەڕ و دەسکردنەوەیان لێئەستاندن[٤].

سێهەزار پیاوی شەڕکەریش چوونە ڕیزی هێزەکانی زەند. پاشەواریان بە چەشنێکی لەبار نیشتەجێ کران. حەوتلەنگ کەوتنە لای قوم و وەرامین و

---

٣ـ نامی کە فەسایش پەیڕەوی لێکردووە ڕێکەوتی ئەم چالاکییە دەباتەوە بەهاری ١١٧٦ی کۆچی. بەهەرحاڵ، غەففاری لە لاپەڕە ١١٩ی گولشەنی مرادا دەنووسێ کەریمخان تا ڕەبیعوسسانی ساڵی ١١٧٧ لە ئەردەوێڵ ماوەتەوە و نەیتوانیوە بەر لە خێڵبەرەوخواری بەختیارییەکان لە خووزستان خۆی بگەیەنێتە وێندەرێ.

٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١١٩ ــ ١٢٠.

چوارلەنگ لە نیزیک «فەسا»ی فارس بنەیان خست. شوێنی تاقمی یەکەم ۳۵۰ کیلۆمیتر و جێی دەستەی دووهەم ۵۰۰کیلۆمیتر لە خانە و لانەی باب و باپیرانیان لە خاکی بەختیاری، دوور بوو[٥]. سەرۆکانی خێڵ بۆ وێنە حەیدەرخان سەرۆکی تایفەی چوارلەنگ چووە نێو ڕیزی لەشکری کەریمخان و پاش ماوەیەک وەک بارمتە برایە شیراز. بەڵام ئەوانەی چووبوونە یاریدەی زەکیخان تەنیا بە زەرەدی ماڵ و سامان دەستیان لە کۆڵ کردنەوە. ئەم ڕەوت و ڕێبازە[٦] وای کرد کە بەختیارییەکان هەتا ئاخری تەمەنی وەکیل سەرنەبزێون، بەڵام هەروەک ڕۆژگاری پاش کوژرانی نادر زۆرێک لە دوورخراوەکان لەو کەسەبەکەسەی دوای مەرگی کەریمخاندا گەڕانەوە زێدی خۆیان هەتا بگەنەوە ئەو تاقم و دەستانەی کە لە دۆڵەکانی زاگرۆسا خۆیان حەشار دابوو، بەڵکوو کارێکی وا بکەن خێڵ بەرنەوە سەر دۆخی جارانی. لەگەڵ ئەمەشدا دوو تیرەی چوارلەنگ لانیکەم تا دەوروبەری ساڵی ۱۸۸۷، واتە سەردەمی ژیانی فەسایی لە فەسا و کەنگان مابوونەوە. ئەمانە داب و نەریت و ڕەشماڵ و زاراوەی لوڕی خۆیان هەروا پاراستبوو[٧].

## ۷ ـ ۲ لوڕستانی فەیلی

جەماوەرێکی دیکەی کە وەکیل سەرەڕای مەترسی دژایەتییان مەیلی لێبوو بیانهێنێتە ژێرڕکێف کەوتبوونە مەڵبەندی باکووری خاکی بەختیاری. ئەمانە لە ژێر فەرمانی حوکمڕانێتی سمایلخانی فەیلی والی (پارێزگاری) لوڕستان دابوون. ناوبراو هاوپەیمان و بەشداری تەواوی تەقەلاکانی عەلیمەردانخانی بەختیاری بوو بە مەبەستی سەرەونخوون کردنی وەکیل. وەختایەک سەرداری بەختیاری کوژرا سمایلخانیش بەپارێزەوە سەری وەبەر

٥ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ۱۲۱؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ۹۸ ـ ۹۹؛ تاریخی بەختیاری، ل ٤٨٠؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ۲۱٤ ـ ۲۱۵.

٦ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ۹۹؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ۳۸۰ ـ ۳۸۱؛ Hovhanyants, 292.

۷ـ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ۲۱۵؛ تاریخی بەختیاری، ل ٤٨٠.

کەریمخان هێنا و گەڕاوە سەرکار و نێو جەماوەرەکەی. بەڵام ئەمجارەیان کە پشتیوانی لە زەکیخان کرد و ڕێی هەڵاتنی بۆ خورەمئاباد نیشان دا بە پیاوێکی هەلپەرست هاتە ناسین. ماوەیەکی کەم پاش ئەوەی لوڕ تێکشکان و زەکیخان و عەلیمحەممەدخان خۆیان بە دەستەوە دا، لە سەرەتای ساڵی ۱۷۶۵دا وەکیل دروست چەند ڕۆژێک پاش هەستانەوە و چاکبوونەوەی لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆری سوارانی ڕووی کردە خورەمئابادی ناوەندی لوڕستان بۆ تەمێکردنیان.

زستانی ئەوساڵە ویشکەبەندێکی سەیر بوو. مرۆڤ و مالات وێڕای خزین بەرەو جەرگەی ناوچەی شاخستانی لوڕستانی فەیلی تووشی گەلێک ئێش و ئازار بوونەوە. چەندین کەس لە زێرەوانان لە شوێنی زێرەوانی کەسیرە بوون و مردن. سمایلخان کە توانستی شەڕ و بەربەرەکانی و ڕووی دیدار و سەروەبەرهێنانی نەبوو، پێیوابوو کە کەریمخان لەو زستانە سەختەدا هێزی پێشڕەوی و زەبروەشاندنی نیە. پاش دیتنی پۆلێک سواری زەند کە گەیبوونە نێودەرانەی دەرگای ناچار بوو بەرەو ناوچەکانی پشتکۆی لوڕستان تێیتەقێنێ. بنەماڵە و دارایی لە خورەمئاباد بەرەڵلا کرد و هێزەکانی زەند پێی خەنی بوون. تاقمێک لەم هێزە کەوتنە سەری و بارگەوبنە و سوارەکانی لوڕی هاوڕێشیان تالان کرد. سەرەنجام خۆی بەرەو داوێنی بەرزاییەکانی پشتکۆ و دەشتەکانی سنووری ئێراق ڕەوی و لەم مەڵبەندانە پەنای بردە بەر عەرەبە ڕێگر و شڕەخۆرەکان[8].

کەریمخان لە خورەمئاباد زۆر نەرمی نواند و پارسەنگی ڕاگرت. سەت هەزار سەر مەڕی وەک دیاری و جەریمە لە ماڵی سمایلخان و لایەنگرانی ڕاستەوخۆی وەرگرت، بەڵام دەربارەی خەڵک و خێڵاتی لوڕ هیچ سزایەکی تری ڕەچاو نەکرد[9]. لە لوڕستان نەزەرعەلیخانی(۳) برای حوکمڕانی ڕاکردوو کە زۆر دڵی لە براکەی ئێشاو و ناڕازی بوو، کرایە والی ئەو پارێزگایە. پاشان بە مەبەستی بەقەوەت کردنی، کەسێکی تریش پلەی درایە. کەریمخان پێی وابوو کە هێشتنەوەی ئەم بنەماڵەیە لە سەر دەسەڵاتی لوڕستان دەبێتە هۆی لایەنگری و

---

۸ ـ گوڵشەنی مراد، ل ۱۳۷ ـ ۱۳۸؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۲۸ ـ ۱۲۹؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ۹۹.

۹ـ گوڵشەنی مراد، ل ۱۳۸.

ملکەچی ئەوان لە زنجیرەی خانەدانی خۆی[10]. بەڵام سمایلخان پیاوێکی تووڕە و تۆسن و بێباک و کۆنەکار بوو کە هێشتاش لەنێو جەماوەری لوڕستاندا ڕێزی لێدەگیرا و ئاوا بە ساکاری قرت نەدەبووە. هەر لەڕێوە پاش کشانەوەی کەریمخان گەڕایەوە خورەمئاباد و چەندێکی کەریمخان حەولی دا کە نەزەرعەلیخان سەقامگیر بێ چی بۆنەکرا و بڕشت و دەسەڵاتی سمایلخان نەڕووشا. دوای مردنی کەریمخان لە لوڕستانەوە گەلێکی دیاری بۆ ئاغامحەممەدخانی قاجار ناردە تاران، هەتا لە لایەن پیاوێکی کە هەمیشە پێی وابوو بنەماڵەی پادشایەتییەک دادەمەزرێنێ لە سەر کاری خۆی دابندرێتەوە. بەڵام خواجەی تاجدار تەنانەت لە کەریمخانیش کەمتر چاوی بەرایی دەدا کە حکوومەتێکی بەهێزی بنەماڵەیی لە لوڕستان هەبێ و سمایلخان ئاخرین کەس بوو لە حوکمڕانانی لوڕستان کە لە مێژووی سیاسی ئێرانا دەورێکی بەرچاوی گێڕا[11].

## ۷ ـ ۳ خووزستانی باکووری

لەشکری زەند لە خوڕەمئابادەوە بەرەو باشوور کەوتەڕێ و پێی نایە خووزستان هەتا ڕایەڵوپۆی ئەم مەڵبەندە کە بە هۆی کاروباری زەکیخانەوە لەبەریەک چووبوو، بگەڕێتەوە سەر دۆخی جارانی. وەکیل لە دزفوولەوە تاقمێکی سوار بە سەرکردایەتی نەزەرعەلیخانی زەند بە مەبەستی ڕاونانی عەرەبەکانی بنیلام گاڵ دا. بێگومان بە فیتی سمایلخانی فەیلی دەستیان دابوویە سەربزێوی و ئەمانە ئامادەی پەلامار بوون بۆ سەر سپای کەریمخان. هەر کە نەزەرعەلیخان هێرشی بردنە سەر خێرا لەوەڕگاکانی خۆیان چۆل کرد و بەرەو سنوورەکانی ئێران و عوسمانی کەوتنەڕێ و بە ڕێگای کەوشەنەکانی ڕۆژاواییدا روویان کردە دەشتستان[12]. نەزەرعەلیخان نائومێدی دوابەدوای ڕاکردنی ئەو

---

۱۰ـ هەمان سەرچاوە؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۲۹؛ ساکی، ل ۳۰٤.

۱۱ـ هەمان سەرچاوە، ل ۳۰٤ و ۳۰۵.

۱۲ـ گوڵشەنی مراد، ل ۱٤۸؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۲۹؛ لە بابەت «بنیلام»ەوە بڕواننە: بەرگی سێهەمی Oppenheim ، ل ٤۵۰ ـ ٤۷۳.

تاقمەی بە دیتنی دەستەیەکی ئالیکەسیر لـە گەڕانـەوەیدا قـەرەبوو کـردەوە. ئەمانە لە جەنگەی ڕاپەڕینی زەکیخانـا ببوونـە هاوپـەیمانی سـەرەکی و لـە مەڵبەندەکانی لوڕستان زۆریان نەزەرعەلیخان تەفرە دابوو. ئێستا وا دیـاربوو پاک ببوونەوە و تەنانەت دەیانویست لە سەر ڕێیە بچنە خزمەت وەکیل و سەری وەبەر بێنن. سەرەڕای ئەمەش نەزەرعەلیخان پەلاماری دان و هەرچی بوویان بە تالانی برد[١٣].

کەریمخان تەنیا دوو ڕۆژ لە دزفوول مایەوە. هەڵبەت ئـەم ماوەیـە بـۆ دانانی کاربەدەستانی تازەی خۆماڵی و وەرگرتنی دیاری و تاوانی پێویست بەس بوو. پاشان چووە شووشتەر هەتا لەوێ ڕێوڕەسمـی جێـژنی نـەورۆزی ساڵـی ١١٧٨ی کۆچی / ١٧٦٥ی زایینی بەرپا بکا و سەبارەت بـە ملکـەچی و دەسـتەمۆیی شێخانی تازەیاغی دڵنیا بێتەوە. ئاڵوگـۆڕێکی لـە شـێوەی بەڕێوەبەرایـەتی و ئیداری حەوێزەدا بەدی هێنا و سەرجەم بیستهەزارتمـەنێکی جەریمـە و دیـاری وەرگرت[١٤]. وەکیـل بەرلـەوەی بیهـەوێ بـە کاروبـاری ئـەو مەڵـبەندە ڕابگـا و هێمنایەتی بگرێتەوە، تەمای گرتبوو کە زەبروزەنگی لە سەر بنیکـەعب بنوێنـێ. چونکە ئەم تایفەیە لە ماوەی شەڕ و کێشەکانی موشەعشەعی و ئالیکەسـیر لـە نێو تالاوەکانی یەکاوی عارەبانا گەیبوونە دەسـەڵات و لـە دەر و دەریـادا دژی پاشایەتی ترک و حوکمڕانی ئێرانی کەوتنە بەربەرەکانی. سەبارەت بە سەردەمی هێرشی ئاوریلی ساڵی ١٧٦٥ و کار و کردەکانی تری کەریمخان دژی بنیکـەعب و بەسـترانەوەی بـە ڕووداوەکـانی کەنـداوی فارسـەوە سـەرچاوەی تـەواو بـە دەستەوەیە. ئێمە باسی ئەم بەشە وێڕای لێکۆڵینەوە سـەبارەت بـە گەڕانـەوەی وەکیل لەڕێی کۆهکیلۆیەوە بۆ فارس لە هاوینی ئەم ساڵەدا دەخەینە ڕوو.

## ٧ ـ ٤ کۆهکیلۆیە: یەکەم پەلامار

بەر لەوەی باسی ئەم پەلامارە بکەین دەبێ چاوێک بخشێنین بـە بـوار و

---

١٣ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٣٠.

١٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە؛ گوڵشەنی مـراد، ل ١٣٩؛ موجمەلوتتـەواریخ، ل ٣٣٤؛ کەسـرەوی، ل ١٨٠ ـ ١٨١؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٥.

بەستێنی سەرێشەکانی بنەماڵەی زەندیە لەم مەڵبەندەدا. چونکە لە ساڵی ١٧٦٥دا کە کەریمخان لە بەرامبەر هێزەکانی ئازادخاندا بەرەو شیراز پاشەکشەی کرد و بارودۆخ لەوپەڕی تاڵیوتوونی دابوو، کۆهکیلۆیە لە باکووری ڕۆژاوای شیراز خاوەنی هەلومەرجێکی ئەوتۆ بوو کە بە قۆڵی چەپی ئیستراتژیکی نیشتمانی سەرەکی زەندیە لە فارس و شادەماری ڕێگاکانی پەیوەندی خووزستان و ڕێی نەهێنی و نەپارێزراوی داوێنەکانی ڕۆژهەلاتی زاگرۆس و پارێزگای بەختیاری و کوردستان و لوڕستانی فەیلی دادەندرا. لە ماوەی سێزدە ساڵ خەبات دژی ئازادخان و محەممەدحەسەنخان و فەتحعەلیخان و هۆز و تۆرەمەکانی دانیشتووی زنجیرە چیای زاگرۆس، کە نیوەی زیاتری لە دەرروونی شوێنە سەختەکانی فارسەوە بەرێوە چووبوو، وەکیل هەمیشە هەوڵی دابوو کە ئەم ناوچەیە هاوشێوەکەی کە لارستان بێ، لە قۆڵی ڕاست و بارناسکی خۆیڕا بێنێتە ژێر ڕکێف.

یەکەم دەرفەتێکی کە بۆ لەشکرکێشی ڕێکوپێک و خاوەن گەلاڵە بە مەبەستی هێنانەدی ئەم ئامانجە وەدەستی هێنا بەهاری ساڵی ١١٧٠ی کۆچی / ١٧٥٧ی زایینی بوو کە ئازادخان و محەممەدحەسەنخان بەگەرمە لە ورمێ سەرقاڵی شەڕ بوون. ڕەخسانی وەها هەلومەرجێک بوو بە هۆی ئەوەی کە شێخاڵیخان سەرلەنوێ بەرۆکی ئیسفەهان بترازێنێ و خودی کەریمخانیش لە ٩ی ڕەجەبی ئەو ساڵەدا هەڵکوتێتە سەر تایفەی بنیکەعب بە سەرۆکایەتی شێخ عوسمان. ئەم تایفەیە سێ ڕۆژ بەرلەوەی کەریمخان بگاتێ بە پەلامارەکەیان زانی و کاتێک سپای زەند پێی نایە دەوەرەق بنکە و شوێنی دامەزرانیان جێهێشت و بەرەو ناوچەیەکی تر کشانەوە. کەریمخان خێرایەکی بەرەی دووهەمی بە هێرش و بزووتنی شەوانە بۆ سەر بێهبەهان کردەوە. بێهبەهان نیشتمانی ئەو چیانشینانە بوو کە تەواوی ڕۆژگاری پاش مەرگی نادرشا ببوونە کەڵی مەیدانێ و سەریان وەبەر حکوومەتان نەهێنابوو. جەماوەری داوێنی کێوان و دۆڵی کاروون کە کەوتبوونە نێوان بێهبەهان و ڕامهۆرمز، هەمیشە لە دەس ئەم چیانشینانە دەناڵین و تۆقیبوون. پاش گەمارۆی قەڵای بێهبەهان کەریمخان قاسیدێکی ناردە لای قەڵانشینان و ئەسپێکی بە دیاری بۆناردن و بەڵێنی پاراستنی سەروماڵی پێدان و ڕایگەیاند حازرە بۆ وتووێژ. سەرکردەی

سەربزێوان(٤) سووکایەتی بە دیاری و داخوازی وەکیل کرد. فەرمانی دا یەکسمەی پێشکێشکراویان چەور کرد و پاشان ئاگریان دا. لەبەر گەرمای سووتێنەری هاوین سپای زەند دەسوبردی کرد و پەلاماری قەلای دا و گرتی. سەرکردەی سەربزێوان سەری پەڕی. شار کەوتە بەر شەپۆلی تالان و بڕۆ[١٥]. بڕی ١٥ هەزار تمەن خەساری شەڕ لە خەلکی بێهبەهان وەرگیرا[١٦].

هێرشی لەشکری زەند بە شالاو بۆ سەر شاری قایم و شوورەداری جایزان(٥) لە نۆ فرسەخی بێهبەهان درێژەی کێشا. وەکیل میرزاعەلیڕەزای(٦) سەرکردەی خۆراگرانی بۆ چارەسەرییەکی گونجاو و پێمل بوون دنە دا و بە مەبەستی دەستەبەرێتی داوای کرد کوڕێکی وەک بارمتە بنێرێتە لای. وەلامی سەرۆکی قەلای جایزان لەبەر قایم بوونی شوورە و مەتەرێزی بەپێچەوانە بوو، بۆیە گەمارۆی درێژخایەن لە کولەکولی گەرما و تاقەتپڕووکێنا بۆ ماوەی هەشتمانگێک درێژەی کێشا. بەینێک دواتر لە زستانی سالی ١٧٥٧ ـ ١٧٥٨دا یەکێک لە پیاوماقوولانی قەلا(٧) بۆ ئەوەی خۆی بێتە سەر دەسەلات پیلانێکی گێڕا و خەیانەتی کرد و هێزەکانی زەندی داکێشایە نێو شار. سەرکردەی بە دیل گیراوی سەربزێوان لە کۆت و زنجیردا هێنرایە خزمەت کەریمخان. بە مەبەستی داڕووتاندن و کڕووسینەوەی داروندداری هەتا شەرای مەرگ ئەشکەنجەیان دا. دایانە دەس ئەوانەی پێیان قەرزدار بوو یان زولمی لێکردبوون و خوریشۆریان کرد[١٧].

## ۷ ـ ٥ ڕێکخستنەوەی سیستمی ئیداری لە کۆهکیلۆیە

پاشان کەریمخان گەڕایەوە شیراز و سالی دواتریش بەرەورووی ڕاپەڕینی نەسیرخانی لاری و دووهەمین و مەترسیدارترین هێرشی محەممەدحەسەنخانی قاجار و گەمارۆی شیراز بووە. ئەم شەڕ و تێکهەلچوونانەی کە بە شوێن ئەم ڕووداوانەدا تا بەهار و هاوینی سالی ١١٧٣ی

---

١٥ـ گولشەنی مراد، ل ٢٤ ـ ٢٦؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ٥٨ ـ ٥٩؛
GD IX, 4 April, 9 July 1757.
16- GD X, 16 August 1757.

١٧ـ گولشەنی مراد، ل ٢٧ ـ ٢٨.

کۆچی / ۱۷٦۰ی زایینی قەومان، سەرنجی لە سەر کۆهکیلۆیە ترازاند. لەم بەینەدا سەرلەنوێ لە سولتانییە دەستی کرد بە کەڵتە و تەیارکردنی لەشکرەکەی. فەرمانی دا کۆهکیلویە بکەنە دوو بەش: بەشێکیان کە برێتی بوو لە دەرودەشت و داوێنی کێوان و پێی دەگوترا ژێرکێو خرایە سەر بێهبەهان و عەلیڕەزاخانی قەنەواتی بێهبەهانی بەڕێوەی دەبرد. حکوومەتی بەشەکەی دیکەش یانی پشتکۆی شاخستانی درایە دەس یەکێک لە کۆنەدۆستانی وەکیل(۸) بە ناوی هەیبەتوڵلاخانی کوڕی مەسیحخانی باوی(۹) خەڵکی «باشت»ی کۆهکیلۆیە[۱۸].

ئەگەرچی تایفەی «باوی» هەیبەتوڵلاخان بە ڕەگەز لوڕ بوون، بەڵام خانی گەنج زۆر لەوە بێئەزموونتر بوو کە بتوانێ بەرەورووی تایفە سەربزێوەکان ڕاوەستێ یان ئارامیان بکاتەوە. کەریمخان کە لێی حاڵی بوو بە زیرەکی میرزا زاهیری ئیسفەهانی کە پیاوێکی خۆڕاگر و یەکێک لە کۆنەهاوڕێیان و خۆشەویستانی بوو و لە کاروباری لەشکریشدا بە کەسێکی وریا دادەندرا، کردی بە بریکاری حکوومەتی پشتکۆ تا پێکەوە ئەم پارێزگایە بەڕێوەبەرن. بەڵام خێڵاتییەکانی دووزمان ویستیان کە دووبەرەکی بخەنە مابەینی ئەم دووە تا لێک ببنە دوژمن. لە وەختی پەلامارێکی تەمبێیانەدا توانیان میرزا زاهیر بە مەرایی کردن و ئیکلامکێشان لە خشتە بەرن و قەرار کرا بە مەبەستی تێدابردنی سەرۆکی گەنجی، ملکەچ و یاریدەری بن. لە دوایین کۆبوونەوەدا برای میرزا زاهیر بەدزی دەمانچەیەکی دەرهێنا و هەیبەتوڵلاخانی پێکا و کوشتی و میرزا زاهیر دەسەڵاتی ئەو ناوچەیەی بە دەستەوە گرت.

کەریمخان هەرکە هەواڵی ئەم خەیانەتەی پێگەیشت ڕانەوەستا و کەوتەخۆ بۆ سزادانی پیاوکوژان. لەپێشدا تاقمێکی سوارەکانی خۆی نارد هەتا بەر لە بزووتنی لە ئازەربایجانەوە، بە مەبەستی لێکۆڵینەوە بیگرن. بەڵام میرزا زاهیر دەمچەورانەی دا بە سوارانی پارێزەری و هانی دان کە بەرەو شیرازی بەرن. لەوشارەدا خێرا خۆی گەیاندە سەرای سادقخانی جێنشینی میری و باشان خۆی خستە تەویلە و پەنای گرت. پاش مەرایی و دەڵەچەیی یەکی زۆر و بەڵێنی دانی دیاری بە سادقخان، ناوبراو بە کەیخودایەتی و پیاوەتی گیانی

---

۱۸ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۹۳؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ۲۱۲. میرزا عەلیڕەزا و بنەماڵەکەی پاش لەشکرکێشی پێشوو برانە شیراز.

ڕزگار کرد[19]. لەم بەینەدا تایفەکانی کۆهکیلۆیە سەرلەنوێ سەربەست بوونەوە و دەستیان کردەوە بە بەرێچوونی ڕێگرانە.

## ٧ ـ ٦ کۆهکیلۆیە: دووهەم پەلامار

پێـنج سـاڵ بـە سـەر لەشکرکێشـی و ڕێکخسـتنەوەی دام و دەزگـای پارێزگاکانی ئازەربایجـان و ئێـرانی ناوەنـدیدا تێپـەڕیبوو کـە کـەریمخـان دیسانەوە توانی باداتەوە سەر کۆهکیلۆیە. لەم شالاوەدا کە ساڵـی ١٧٦٥ پـێش و پاش بزووتن بۆ سەر تیرە و تۆرەمەکانی بنیکەعب قەوما، تـەواوی سـەرۆکانی خێڵ.و حاکمی شـاران و پیاومـاقووڵانی ناوچـەیی جگـە لـە تیرەیـەکی لـوڕی لیراوی(١٠) هێنایە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی خۆی[20]. لیراوییەکان کەوتبوونە ناوچە چڕ و سەختەکانی زێدی خۆیان بەتایبـەت لـە «خێـراوا»ی جەرگـەی چیاکـانی ڕۆژهەڵاتی بێهبەهان و زنجیرە کێوەکانی کەلات لە دەرە و دۆڵی تەنگ و تەسکی بەرزاییەکان و پێدەشتان دامەزرابوون[21]. وەک نامی گێڕاویەتەوە ئـەم چەتانـە ببوونە پۆلە چەکدار و تەنیا لە ڕێی تالانی ماڵی خەڵک بەڕێدەچوون.

سەرداری زەنـد بـەرایی سـەرنخوون کـردنی ئـەم تایفەشـی هـەروەک چزاندنی بەختیارییەکان خۆش کرد. لە بنکەی سەرەکی خۆیڕا لە «زیـدەر» کـە پێدەشتێکی خواروی بێهبەهانە بە مەبەسـتی گـەمارۆی قـەڵا و قایمـەیان لـە خێراوا(١١) دەستی کرد بە بزووتن. تاقمە شـەڕکەرەکانی چیـایی بـە مەبەسـتی تێدابردن و هەڵکەندنی تیرهاوێژان و هێزەکانی بـەرگری گـاڵ دا و بـە دڵـڕەقی

---

١٩ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٩٤ ـ ٩٥.

٢٠ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٤٤؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٣٥. لیراوییەکان ـ کە نامی بە لیراوی ناساندوون و گوڵستانە و غـەففاری بـە لـیرەوی ـ تیرەیـەکی لـوڕی «جاکی»ن کە لە کۆهکیلۆیە دوو تیرەن: لیراوییەکانی دەشتەکی کە ناوەندیان بەنـدەری «دەیلەم»ە و لیراوییەکانی چیایی کە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی بێهبەهان بنەگرن.
بڕوانە: باور، ل ١٢٠ و ١٣٥؛ کەریمی، جوغرافیا، ل ١٣٧.

٢١ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٤٤؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٣٥؛ لە بابەت خێراوا (خێرئاباد)ەوە بڕوانە: فەرهەنگی جوغرافیایی، بەرگی ٦، ل ١٤٧؛ کەیهان، بەرگی ٢، ل ٤٦٦.

لیراوییەکانیان بەرەو قەڵایان ڕاپێچ دا و ئاگربارانی چرووپڕی تۆپخانەیان کردنە سەر و پارێزەران تەسلیم بون و ماڵ و سامانیان کەوتە بەر گوڕمی تاڵان و بڕۆ[٢٢].

پاش ئەم هەنگاوە، چوارتاقم لە چوارلاوە بە سەرکردایەتی نەزەرعەلیخان، زەکیخان، عەلیمحەممەدخان و بەستامخانی زەند بە مەبەستی تێکڕماندنی پاشماوەی شوورە و شوێن و سەنگەرە سەختەکانیان کەوتنەڕێ. پارێزوانان پاش ئەوەی لە سێ قۆڵی بەرە و بەربەرەکانی کشانەوە، تێکشکان و بە چەند قۆناخێک گەلێک کوژرا و بریندار کەوتە سەردەستی هەردووک لا. نە ئەوان پەنایان دەبردە بەر کەریمخان نە ئەویش پەنای دان. هەرکەس بە دیل دەگیرا دەیانبردە خێراوا و سەریان دەبڕی و وەک گێڕاویانەتەوە بۆ تۆقاندن و تەمێ کردنی زیندووەکان منارەیەکیان لە ١١٠٠ کەللەسەری بڕاو ساز کرد. ئەوانەی دەستیان دا چوونە ڕیزی سپای کەریمخان و بنەماڵەکانیان وەک بارمتە نێردرانە شیراز. دوابەدوای شالاوێکی دیکە پاشەواری خاوخێزانەکانیش بەناچار کۆچدرانە هەرێمی فارس و مەڵبەندی شاخستانی لیراوی درایە دەس سەردارێکی باوەڕپێکراو[٢٣].

ئەو زەبروزەنگەی کەریمخان سەبارەت بە لیراوییەکان نواندی تەنانەت وێنەی لە سەردەمی نادریشدا نەدیتراوە[٢٤]. لەبەروەی کە وەکیل زیاتر بەلای میانەڕەویدا هەنگاوی ناوە ئەم دەسوەشاندنەی نیازێکی وای بە داکۆکی ماستاوچییانەی نامی نیە. نامی بانگەشەی ئەمە دەکا کە زۆربەی ئەم چەکدارە ناکەسانە بەخشران و ئەگەر لیراوییەکان دەستیان نەکردبایەوە منارەیان لە کەللەی سازنەدەکرا و جاری وایە ئەم چەشنە سزادانە بۆ تەمێگرتوویی کەسانی تر پێویستە. بەپێی گێڕانەوەکان ئەم چزاندنە لە کاتێکی لەباردا ڕووی داوە. بەڵام ڕاوێژی داکۆکی کردنی ئەو کۆمەڵێک لاڕێیی و خوێنڕێژی وەکیل دێنێتەوە یاد کە خۆی (نامی) دەیانبەستێتەوە بە گەلاڵەی چەند پیلانێکەوە[٢٥].

---

٢٢ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٣٧ ـ ١٣٨؛ گوڵشەنی مراد، ل ٤٤.

٢٣ـ گوڵشەنی مراد، ل ٤٥؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٣٥ ـ ٣٣٦؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٣٨ ـ ١٣٩؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ١٢٥ ـ ١٢٦.

٢٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٣٨ ـ ١٣٩.

٢٥ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٠٨ ـ ١٠٩ و ١١٦.

ئـەم ئـاخرین زەبـرەی لەشـکری لـە راسـتیدا کۆتـایی قۆنـاخێکی شەشسالانە بوو کە کەریمخان دەستی برد بۆ چـالاکی پێچەوانـەی داب و بـاوی خۆی. داغ و مخابەتی خان سـەبارەت بـە مـەرگی گـەورەترین دوژمنەکـەی کـە محەممەدحەسەنخان بێ و کوشتاری دوایین هاوپـەیمانانی واتـە ئەفغانـەکان: جوولانەوەی نەرمی لەگەڵ فەتحعەلیخانی ئەفشار پاش گەمارۆی درێژخایەن و دژوار کە سەرداری ناوبراو خەریکی گێرانی پیلانێک بوو بـۆ کوشـتنی و پاشـان هەڵگەرانەوەی هەر سەبارەت بەم پیاوە کە وەک میوان لە بارگای زەند تەمـەنی تێپەڕ دەکرد بەڵام بە بیانوویەکی پووچ فەرمانی کوشتنی دا؛ ئینجـا کـوێرکردنی شێخالیخان کە دوای سادقخان بـە بـاوەڕپێکراوترینی سـەردارانی دادەنـدرا، هەروەها ئەنجامدانی زنجیرەیەک کوشـتار و کوێرانـدنی جـەماوەر، تێکـڕایان کردەوەی کەسێکی دیکتاتۆر دەخەنە بەرچاو. چاوپۆشی لە رادەبەدەری سەبارەت بە زەکیخانی زڕبرای و عەلیمحەممەدخانی تۆقیو، پاش ئەو راکردنە بەدەنگ و هەرا مەترسیدارە و سەرەنجام پێکگـرتنی جوولانـەوەی نـەرم و نیـانی لەگـەڵ بەختیاری و لوڕانی فەیلی و راپەڕیوانی خووزستان و دوابەدوای ئەو کوشـتاری «نـادر»انـەی لـە خـاکی لیراوییـەکاندا نموونەیـەکی ئـەم دژایەتییانـەن لـە کردەوەیدا.ناکرێ ئەم یەکترنەگرتنەوانە بـە جـارێکی وەک پێویسـتی مەیـدانی سیاسەت یان مەیلی خودی خۆی پاساو بدرێنەوە. لەم رەوتەدا وا دیـارە گـەلێک هۆکاری پڕ پێچوپەنا هەن کە هەرگیز ناکرێ بێنە ناسین.

تەنیا بەشێک لە لایەنەکانی پرسیارەکە رەنگە لـە نەخۆشـی سـامناکی کەریمخاندا سۆراغ بکرێ. ئەم نەخۆشییە لە نێوەراستەکانی ئەم قۆناخـەدا لـە سیلاخور هێـزی لێبـڕی و وێـدەچێ هـەر دوابـەدوای ئـەو پتـر خـۆی دابێتـە خواردنەوەی شەراب و هەڵدانی تریاک. ئەو راستییانەی نامی هەستی پێکردوون ناچاری کردووە کە ئەم هەنگاوانە بە کەم و کورت دابنێ تا مۆری دەگمەن بوونیان پێوەبنێ.

سپای زەند وێڕای ئەو دیل و دەسـکەوتـانەی وەچنگی هێنابوون بـە رێـی باشت(١٢) و فەهلیان(١٣) و خاکی دوژمـنزیـاری(١٤)دا بـەرەو شـیراز بـزووت[٢٦].

---

٢٦ـ لوڕەکانی مەمەسەنی کەوتوونە باشووری فەهلیان. لەم رووداوەدا مەمەسـەنییەکان سەرێشەیان نەنابۆوە. ئەمانە پێشتر لە لایەن نەدرخانی زەندەوە پەلامار درابـوون و وا

کەریمخان لە ٢١ی جوولای ١٧٦٥ لە سەعاتێکی پیرۆزدا کە ئەستێرەناس دیاری کردبوو، پاش سەرەقومەیەکی دوور و درێژی حەوتساڵانە هاتەوە شیراز و تا کۆتایی چواردە ساڵ پاشماوەی تەمەنی هەرگیز ناچار نەبوو لە پایتەخت دەربکەوێ[٢٧].

## ٧ ـ ٧ سەرهەڵدانی نەسیرخانی لاری

لەم سەردەمەدا تەنیا گرفتێکی دەیتوانی ببێتە هۆی دڵەپەرۆشی کەریمخان، باڵی ڕاستی دامەزراندنی قۆشەنی خەنیمی بوو لە لارستان کە بە باری بەرهەم و ڕووبەردا لە کۆهکیلۆیە گەورەتر بوو. لارستان نە تەنیا دەستی بە سەر ڕێ و بانی نێوان فارس ـ کرماندا دەڕۆیی، بەڵکوو تەواوی ڕێگاکانی پەیوەندی ناوچەکانی کەنداوی فارس کە کەوتوونە نێوان بەندەرعەباس و بووشێهر لە ژێرچنگی دابوون. تەنیا کەسێکی کە زۆربەی ڕۆژگاری پاشایەتی کەریمخان فەرمانڕەوایەتی ئەم ناوچە جوغرافیاییەی وەک یەکینەیەکی سیاسی بە دەستەوە بوو و ئەغڵەب بە مەترسییەکی ڕاستەوخۆ دادەندرا بۆ وەکیل، نەسیرخانی لاری بوو.

نەسیرخان سەرەتا وەک میرشکاری (سەرڕاوچی) لەگەڵ حاجیخانی میرشکاری برای لە سەردەمی ئاژاوەی پاش هێرشی ئەفغان و ڕاپەرینی نادر ناوێکی هەبوو. ئەم دوو برایە دەسەڵاتی خۆیان لە گوندی «کال»[٢٨]ی باشووری لارستانەوە برەو پێدا و بەرەو باکوور دەستیان بە سەر شوێنە شاخاوییەکانی «سەبعە» داگرت[٢٩] و خێرایەکی لەبەر بازنەی بەربلاوی پەلهاویشتنی

---

دیارە لە ساڵی ١٢٠١ی کۆچی / ١٨٧٦ ـ ١٨٧٧ی زایینیشدا کەوتنە بەر شالاوی جەعفەرخانی زەند و تەمێ کران. بڕوانە: فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٢٩.

٢٧ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٤٥، کەلانتەر، ل ٦٦٣؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٧٦. دونبولی لە بەرگی دووهەمی «تەجرەبە»، ل ٤٢، بە هەڵە ڕێکەوتی ئەم ڕووداوەی ساڵی ١١٨٠ی کۆچی داناوە.

٢٨ـ کاڵ کەوتۆتە ١١٨کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی گاوبەند. بڕوانە: فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی ٧، ل ١٨٢.

٢٩ـ ڕۆژنامەی کەلانتەر، پێشەکی هەڵەبڕ و ل ٤٠.

ڕێکوپێک، جڵەوی تەواوی ناوچەیان وە دەس هێنا.

نادرشا وەختایەک دەستی گەیشتە حکوومەت هەر تەنیا بە بەخشینی نازناوی خان بە سەر ئەم دوو برایەدا ڕانەوەستا و ئەوانی لە سەر دەسەڵاتی مەڵبەندی سەختی سەبعەش هێشتەوە. لە دەورانی پاشایەتی عادڵشادا واتە مارسی ١٩٤٨ میرزا ئەبووتالب وەک حوکمڕانی لارستان و بەندەرعەباس لەگەڵ سێسەدکەسێک سوارەی سکۆرتی لە شیرازەوە بەرەو ئەم مەڵبەندە بزووت[٣٠]. ئەم ساڵە لە ڕاپەڕینێکدا کە وێدەچێ بە دەس حاجیخانی لاری گەلاڵە کرابێ کوژرا؛ حاجیخان دەسەڵاتی لار و سەبعەی بە دەستەوە گرت.

ئەو سەرکەوتنەی وە دەستی هێنابوو هانی دا کە لە بەهاری ساڵی ١١٦٣ی کۆچی / ١٧٥٠ی زایینی لەگەڵ چەندهەزار تفەنگچییەک بەرەو شیراز بکەوێتەڕێ. ئەم شارە لە مەودای نێوان هێرشی ساڵی پێشووی فەتحعەلیخانی ئەفشار و پەلاماری ساڵدواتری عەلیمەردانخان جارێ پشوویەکی هاتبۆوە بەر. حاجیخان لە ڕێگادا مرد و نەسیرخانی براگچکەی پەیمانی شەڕبڕانەوەی لەگەڵ حکوومەتی شیراز ئیمزا کرد و تەنیا قنیاتی بە دەسەڵاتی لار و سەبعە کرد[٣١].

پاش چوار ساڵان نەسیرخان لەشکرێکی پازدە شازدەهەزارکەسی پێکهێنا و قەڵەمڕەوی خۆی لە لێواری کەنداوی فارس بەرفرەوان کرد و دەستی دایە وەرگرتنی باج و پیتاک لە شێخەکانی عەرەبی بەندەرەکان و بە مەبەستی پاراستنی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە بەندەرعەباس پێشنیارێکی خێرخوازانەی پڕخەرجی خستە ڕوو. لە کۆمپانیادا بۆ ڕێزلێنان بە «خانی ئێمە» ناوی دەهات[٣٢]. لە ساڵی ١٧٥١دا شاسمایلی سێهەم بە فەرمانێک خانی لاری کردە حوکمڕانی تەواوی ناوچەی گەرمەسێر، بۆیە تا ڕادەیەک دڵنیا بوو کە دەتوانێ خوازیاری هێنانە ژێرڕکێفی هەموو ناوچەکانی بەندەرعەباسیش بێ و داوای نیوەی داهاتی لە عەلیشای حاکمی بەندەرعەباس کرد. عەلیشا داواکەی بردەوە پاش و لە ئاکامدا لە ژانوییەی ساڵی داهاتوودا بە پەلامارێکی لەنەکاو قەڵا و کەشتییە شەڕکەرەکانی خستە داو و عەلیشای گرت و مەسیح سوڵتانی برازای

---

30- GD 18 March 1757.

٣١ـ کەلانتەر، ل ٤٠ ـ ٤١. فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٥.

32- Brieven 2696 (1751), Basra, 7, 15 ; ives, 201.

کـردە حـاکمی ئـەو شـارە[33]. لـە نـوامبری سالـی ۱۷۵۲دا لەبـەر هەنـدێک تەنگوچەڵەمەی نێوخۆیی ناچـار بـوو کـە مەلاعەلیشـا وەک کەسـایەتییەکی لێوەشاوە و خاوەنبڕشت بکاتەوە حاکم. لە ئۆکتۆبری ساڵی ۱۷۵۳دا مەلاعەلیشا سەری لە ئاست داوای نەسیرخانی لاری بە مەبەستی شەڕ بە دژی سـەربزێوانی «هووەیلە»ی عەرەب بادا و جودایی و سەربەستی دەسەڵاتی خۆی نواند. سـەرەتا لەبەروەی نەسیرخان نیگەرانی کـەریمخـان و لەشکری تـازە کۆوەبـووی دژی ئازادخان بوو و دەیەویست دەستی لەگەڵ بکاتەوە، هیچـی نـەکرد بـەڵام چەنـد مانگ دواتر دیسان بەندەرعەباسی گرتەوە و مەلاعەلیشای لەگەڵ خۆی بـردە لار و حاکم و سەرکردەی سـەربازگەیەکی لـەوێ دانـا. لـە هـاوینی سالـی ۱۷۵٤دا دووبارە مەلاعەلیشای کردەوە حـاکمی بەندەرعـەباس بـەڵام بنەماڵـەکەی وەک بارمتە لە لار لای خۆی هێشتەوە[34].

لە ئاگۆستی ساڵی ۱۷۵٤دا کەریمخان لە کازروون سەرقاڵی خۆقایمکردن و قەڵادابەستن بوو و هەردەم چاوەڕوانی پێشڕەوی و پەلاماری ئازادخانی دەکرد. چونکە پاش مەرگی عەلیمەردانخان خۆی بە جێنشینیمیری شاسمایلی سـێهەم دەزانی و ئەگـەرچی خـۆی لـە چوونـە شـیراز دەپاراسـت بـەڵام ناوچـەکانی گەرمەسێری بە قەڵەمڕەوی خۆی دادەنا، بۆیە بە نامەیـەک داوای بارمـەتی لـە نەسیرخانی لاری کرد وەک یەکێک لە ژێردەستەکانی[35]. نەسیرخان گوێی نەدایە داواکەی، چونکە پێی وابوو ڕەنگە ئازادخان لەم ملانەیەدا زاڵ ببێ. وەختایـەک لە شەڕی کەمارەجدا کەریمخان سەرکەوت، زستانی ئەو ساڵـە بـەرەو لارسـتان بـزووت هـەتا حـاکمی نافـەرمانی تـەمێگرتـوو بکـا. بـەگوێرەی نووسـینی ڕووداونووسی کۆمپانیا لە بەندەرعەباس هەواڵێک گەیبووە کەریمخان ـ پاشـان بە درۆ دەرچوو ـ کە گۆیا ئازادخان محەممەدخانی زەندی لـە نیزیـک هەمـەدان گرتووە. جارێ بەڕێوەبردنی گەڵاڵەکەی وەدوا دا و نەسـیرخان بـە قەراروبـڕی هێنانەدی داخواز و دانی دیاری پاکانەی بۆخۆی کرد[36].

33- GD VI,8 January to7 February1751; Brieven 2696(1753),Basra,16- 17.
34- GD VI, 3 March, 29 June 1754. cf. Amin, 27, 28.
35- GD VII, 4 september 1754.
36- GD VII, 6, 8, and 12 January 1755.

## ٧ ـ ٨ لار بەرەورووی کرمان و شیراز (١٧٥٥ ـ ١٧٥٦)

مانگی دوایی لە سەرەتای فێورییەی ساڵی ١٧٥٥دا کەریمخان بەرەو لارستان کەوتەڕێ تا کاری نەسیرخان یەکسەرە بکا و وێڕای بزووتن بەرەو ئەو مەڵبەندە ئارامی و هێمنایەتی گشتی لە گەرمێن سەقامگیر کا[37]. وەکیل پاش تێپەڕین لە داراب تیژ و خێرا شانبەشانی یەکێک لە ڕێگاکانی باشووری ئاژاوتی. هەردک سپا هاوکات پێکەوە هێزەکانی بەرگری سەرڕێیان تێکشکاند و بە زۆرەملی دەستیان کرد بە ئەستاندنی خەرج و باج. کەریمخان ٥هەزار تمەنی باج لە خەڵکی «دێفیش»ی(١٥) ڕۆژاوای شاری لار وەرگرت و جگە لەمە قەڵا و شاری تالان کرد و حاکمەکەی کوشت[38]. ئەگەرچی زۆر بەچڕی دەستیان لەبەر دەکردەوە بەڵام دیسانیش لە شاری لار نیزیک بووە و وای دەنواند کە بۆ تەساڵحە لەگەڵ نەسیرخان ئامادەیە، بۆیە نەسیرخان چەند یەکسمێکی وەک دیاری بۆ نارد و لە بەرامبەردا فەرمانی حکوومەتی لاری درایە دەس و خەڵات کرا. وەختایەک بارمتەکانیان هێنا وا وێدەچوو هەموو شتێک بە خۆشی کۆتایی هاتووە، بەڵام یەکێک لە مەلا ڕاوێژکارەکانی وەکیل تەماشای کرد کە بارمتەکانی نەسیرخان ئەوانە نین کە داوایان کردوون. بارمتەکان نێردرانەوە و وەکیل دەستی کرد بە گەمارۆ[39].

گەمارۆی قەڵای سەختی لار هەتا دوو حەوتووی کۆتایی مانگی ئاوریلی ساڵی ١٧٥٥ بێئاکام درێژەی کێشا. وەکیل دوو یان سێهەزار تۆن باڕووتی لە توجارەتخانەی ئینگلیسییەکان لە بەندەرعەباس داوا کرد، فەرمانی پەلامارێکی لەخۆوە دەرچوو کە وەک مەزندە کراوە نەسیرخان بۆتە هۆی تێداچوونی سەری هەزار شەڕکەری زەند[40] گەمارۆی نابەوەختی لێوارەکانی کەنداوی فارس تینی بۆ

---

37- GD VII, 5 and 13 February, 8 March 1755, تاریخی گیتیگوشای زەندیە ل٤٧
38- GD VII,16 March1755. Dehfishi (( Dapeichey)) in GM. is in Jurom, on the way to Bidshahr;

بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی، بەرگی ٧، ل ٤٩ و ١٠٩ و فەسایی، بەرگی ٢، ل ١٨١.
39-GD 22 March, 3 and 11 April 1755.
40- GD VII, 16 and 26 April 1755.

چەکدارەکانی چیانشینی فارس هێنا، بۆیە ڕاوەستانی وەکیل پێویست نەبوو. نەسیرخان چوارپێنج هەزار تمەنێکی خەرج و پیتاک پێشکەش کرد و ڕۆژی دووهەمی مانگی مەی هێزەکانی زەند لە لارەوە گەڕانەوە شیراز[٤١].

لە ماوەی سێ ساڵی دوایی‌دا، ئەو کاتەی کەوا بارگای شیراز بە دڵەڕاوکەوە لە شەڕ و لێکدانەکانی ئازادخان و محەممەدحەسەنخانی قاجاری دەڕوانی، وەکیل تەمای گرت کە بۆ چۆڵەپێچ کردنی تایفەکانی کۆهکیلۆیە و ناوچەی لار گەلاڵەیەک بەڕێوە بەرێ. لە هاوینی ساڵی ۱۷٥٥دا عەلیخانی شاسەیوانی ڕاسپارد کە بەر بە دەستدرێژییەکانی نەسیرخان بۆ سەر مەڵبەندەکانی کەناری کەنداوی فارس بگرێ. ناوبراو بە یارمەتی سەربازانی تازەپشووی عەرەب ئەم ئەرکەی بەجێهێنا[٤٢]. ئەو کات ٤هەزار ڕووپییەی دیاری لە مەلاعەلیشا و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بۆ کەریمخان داوا کرد[٤٣]. لە مانگی ئۆکتۆبرا لاریش گەمارۆ درا[٤٤]، بەڵام بەڕواڵەت چ ئاکامێک وە دەس نەهات و ئاخرین هەواڵێکی کە سەبارەت بەم سەردارە نێردراوە بۆ ناوچەکانی گەرمەسێری بەرچاو کەوتووە دەگەڕێتەوە مانگی مارسی ساڵی دوایی کە نەسیرخانی لاری تێی‌دا باسی شکستی عەلیخانی شاسەیوانی بە دەس جەمالخانی بیدشەهری کردووە[٤٥].

ماوەیەک دوای ئەوەی تەوژمی سەر نەسیرخان کەم بۆوە، لە لایەکی دیکەڕا تووشی مەترسی هات. لە ساڵی ۱۷٥٤دا هەلی لە داخوازی شاروخخانی حاکمی کرمان هێنا کە بە مەبەستی دەمکوت کردنی سەرهەڵدانێکی ئەم ئەیالەتە یارمەتی لێویستبوو. نەسیرخان دەیویست کە دەورەی شاری کرمان بدا بەڵام شکستی خوارد و تا ناوچەی لار دمم لە سەرپشت کەوتنە شوێنی. شاروخخان بە پەلاماری پەیتاپەیتا بۆ سەر جەغزی دەسەڵاتی نەسیرخان لە حاجیئاوا

41- GD VII, 16 May; Brieven 2255 (1756), 70; 2756 (1756), Ives 210;
خارک، ل ٤٨ ـ ٤٩؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٤٩.

42- GD VIII, 2 August 1755.

43- GD VIII, 3 and 4 September 1755; Lorimer 100.

44- GD VIII,21 October 1755.

45- GD VIII, 16 March 1756.

تووڕەیی خۆی نیشـان دا. وەختایـەکی لـە مـانگی مـەی سالـی ١٧٥٦دا سـپای نەسیرخانی تێکشکاند و حاجی‌ئاوای گەمارۆدا کەوتە ملانە لەگەڵ کەریمخـان و حاکمی لار و داوای ناردنی گوللەتۆپ و باڕووتی کـرد لـە نوێنـەری کۆمپانیـای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە بەندەرعەباس[٤٦].

لە مانگی ژوئییەی ئەوساڵەدا وەختایەکی کە محەممەدحەسەنخـان لـە ئیسفەهانەوە بەرەو شیراز هەڵمەتی بـرد، داوای لـە نەسـیرخان کـرد کـە بـە مەبەستی گەمارۆی شیراز بێ و دەنگی لەشکری بـدا. نـاوبراویش ئـەم دەرفەتـە زێڕینەی دژی کەریمخان قۆزتەوە و ئەوەندەی لە دەستی دەهات هێزی کۆکردەوە و ٦٠هەزار ڕووپییەشی بۆ برد[٤٧]. لە بەختی بەدی نەسیرخان، سـەرداری قاجـار دروست چەند ڕۆژ دواتر کە بیستی ئازادخان بەرەو ئیسفەهان بزووتووە، دەستی لە گەمارۆی شیراز هەڵگرت و بە پەلە لەو شارە دوو کەوتەوە. نەسیرخانیش بێ ئەوەی بگاتە شیراز گەڕایەوە داراب[٤٨].

لە مانگی ئۆکتـۆبردا لێبـڕا کـە بـە بیـانووی کێشـەی بـاج و پیتـاکی فەرمانڕەوای زەند لە دەشتستان سەرەتای ئاژاوەیەکی بەربلاو خۆش بکا، بەڵام دەشتسـتانییەکان بـەر لـەوەی یارمەتییـەکی ئـەوتۆی لێـوەرگرن بـەدەس شێخ‌ئالیخان تێکشکان و ناچار کران کە خێرا سێهەزار تمەن ویشکەپووڵ بدەن و دووهەزار[٤٩] چەکـداری ئێلجـاڕی بـۆ خزمـەت لـە سـپای زەنـدا تـەیار بکـەن. هەلومەرجێکی ئەوتۆش بە سەر شێخەکانی کەنداوا سەپی و قەرار کـرا هـەرکام بەپێی دەسڕۆیشتن و توانـایی بـڕێک پـارە و ژمارەیـەک چەکـداری ئێلجـاڕی کۆبکەنەوە و بینێرن؛ بۆوێنە شێخی بووشێهر دووهەزار تمەنی نارد. لـە مـانگی ئاوریلی ساڵی ١٧٥٧دا کەریمخان تەناهی لە سەرانسەری کۆهکیلۆیە و دەشتستان و بووشێهر و بەنـدەرریگدا سـەقامگیر کـرد و بەپتـەوی دەسـتی خسـتە سـەر دەسەڵاتی ئەو شێخ‌نشینانەی تا ئێستا لە ژێر فـەرمانی نەسـیرخاندا بـوون[٥٠].

---

46- GD VIII, 9 May 1756.
47- GD VIII, 20 July 1756.
48- GD IV, 7 August 1756.
49- GD IV, 11, 20 and 25 October, 2 November, 10 December 1756 ; 9, 11 and 19 January 1757.
50- GD IX, 4 and 26 April 1757.

پاش کۆتایی مانگی دوایی لەشکری بەرەو مەڵبەندەکانی ڕۆژاوایی گـاڵ دا هـەتا تەنگ بە بنیکەعب هەڵچنن. نەسیرخانیش تەمای گرت کە حکوومەتە ژێربالە لە دەسچووەکانی بگێڕێتەوە بەردەستی خۆی و تەنانەت هەولـی دا کـە پـەلاماری «شەمیل» بدا لە باکووری بەندەرعەباس. بەلام پاش گەڕانەوەی کـەریمخـان لـە لەشکرکێشانی بۆ سەر خووزستان و کۆهکیلۆیە لە مانگی ئاگۆستا هاتە لار و بە دانی ٥هەزار تمەن باج و دووسەت سەرباز و بارمتەیەک دەرگای ئاشـتی خسـتە سەر پشت[٥١].

کاتێک محەممەدحەسەنخان دووبارە شیرازی گەمارو دایەوە، دیسانیش نەسیرخان بەپڕتاو دووهەزار سوارەی دەنگ دا هـەتا بەشـداری شـەڕ بـێ دژی هێزەکانی زەند، بەلام جارێکی تریش ناچار بوو بێ ئەوەی فیشـەکێک بتـەقێنێ ڕابکا، چونکە خانی قاجار ناچار بوو بەر لـە گەیشـتنی هاوپـەیمانی دەس لـە گەمارۆ هەڵبگرێ[٥٢]. لە مانگی سێپتامبرداوەختایەک وەکیل ساز بوو بەرەو تاران وەڕێکەوێ، فەرمانی دا بە محەممـەدوەلیخـانی زەنـد هـەتا بـە چوارهـەزار چەکـدارەوە بچێتـە سـەر نەسـیرخان و گـوێی بـادا. هێـزی پـەلاماردەر لـە باکووریترین ڕێوبانەکانی هاتوچۆی ناوچـە هەڵـیکوتایە سـەر شـارێیەکانی بەندەرعەباس ــ کرمان و تالانی کرد. لەم ڕاووڕووت و ڕێگرتنەدا کاروانی شـاری کرمانیش وەبەرهات کە بایی چلهەزار ڕووپییەی بار پێبوو. لە مانگی ئۆکتۆبردا

٥١ــ GD IX, 27 August 1757; Lorimer, 101. بارمتەکە کوڕی نەسیرخان بـوو بـە ناوی عەلیخان و لەم کاتەدا چووە نێو ڕیزی سپای زەند کە سەرقاڵی شەڕ بوون لەگەڵ تەقیخانی یەزدی. لە ڕووی نامەیەکڕا کە فەرماندەیەکی لاری نووسیویەتی دەردەکەوێ کە پیاوەکانی تەقەمەنی و ئازۆخە و کەلوپەلی پێویستیان پێنەبووە و هەموو خـەریکی ڕاکردن بوون. عەلیخان لای کەریمخـان هـەلومـەرجێکی نالـەباری هـەبوو، چونکـە بەڕاستی خانی زەند لێی دووشک بوو کە دەیهەوێ لە شیراز کـە وەکیـل هێشـتا چـاکی جێپێی قایم نەکردبوو سەرەتای کۆدتایەک خۆش بکا. نامەکە وا دیارە ڕێکـەوتی پێـوە نیە و «ئیقتداری» پێی وایە ئـی سالـی ۱۱۷۹ی کـۆچی / ۱۷٦٥ ــ ۱۷٦٦ی زایینییـە. پـاش شکانی نەسیرخان مەسیحخان کرایە حاکمی لار. ڕووداوی تەقیخان و هەڵکەوتەکانی تر تێکڕا لە سالانی ۱۷٥۷ ــ ۱۷٥۸دا قەوماون.

٥٢ــ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٤٥.

هێزەکانی نەسیرخان بە مەبەستی پاراستنی ڕەوگەیەک لە نیزیک حاجیئاوا دامەزران، بەڵام ئەم هێزەش تێکشکا و سەرکردەکەی کوژرا، بۆیە نەسیرخان ناچار بوو بگەڕێتەوە قەڵاکەی لە مەڵبەندی لار[53]. تەنانەت شێخی «میناب» کە خۆی لە دانی پیتاک بە عەلیخانی شاسەیوان دزیبۆوە، ئێستا تەماشای دەکرد ئەگەر بێتوو بڕی سێهەزار تمەن لە خەڵکەکەی وەربگرێ و بیداتە خزمەت محەممەدوەلیخان ئاقڵانەترە. خانی زەند کە بە مرازی دڵی خۆی گەیشت بەرەو باشوور ئاژاوتی[54]. نوێنەری کۆمپانیاش زۆروکەم دیارییەکی دڵخۆشکەرەی دایە و بێئەوەی پەلاماری بەندەرعەباس بدا گەڕاوە. بەڵام واوێدەچوو کە دەیهەوێ هەڵمەت بەرێتە سەر لار و ئەو مەڵبەندە بگرێ[55].

لە سەردەمی مانەوە و حکوومەتی سادقخان لە شیراز ڕاووڕووتی ڕاستەقینەی نەسیرخان بێ هیچ کۆسپ و بەرهەڵستێک درێژەی کێشا. لە کۆتایی ساڵی ١٧٦٠دا ڕووداوێک بوو بە هۆی ئەوەی کە هێزەکانی زەند بەکردەوە مەڵبەندەکانی دراوسێی لاری ڕۆژاوایی داگیر بکەن و نەسیرخانیش بوو بە حوکمڕانی ناوچەکانی گەرمەسێری. هەڵبەت مەرجی ئەم هەڵبژاردنە ناردنی بارمتە و دانی ساڵانە بیستهەزار تمەنێک باج و پیتاک بوو. قەرار کرا سەت کەس چەکداری ئێلجاڕی جەزایرچی(١٦) بە مەبەستی خزمەت لە ڕیزەکانی سپای زەندا بنێرێ و جەعفەرخانی براشی وەک بارمتە بۆ شیراز بەرێ بکا[56]. بەڵام ئەم کار و هەنگاوانە نەبوونە بەرهەڵستی دز و چەتەی لاری لە گەڕانگەری شیراز و ڕاکردنیان بەرەو چیا. هەڵبەت سادقخانیش نەیدەتوانی کە کۆمەڵەی کەمی چەکدارانی بخاتە شوێنیان و خۆی تووشی مەترسی بکا[57]. لە هاوینی ساڵی ١٧٦٢دا سەرەنجام سپایەکی هەزارکەسی زەندی یان دەشتستانی توانی نەسیرخان بەرەو قەڵای لار بکشێنێتەوە و تۆپخانەکەی بگرێ و تاقمێکی

53- BP XXI, 27 December 1758.
54- Lorimer, 100, 101.
55- Amin, 43 ( citing BP XXII, 2 May 1759.)
56- GD XII, 7 January 1761.
57- GD XII, 28 May 1761.

سەتکەسی لە لایەنگرانی «عەرەب»ی شەقوپەق و مەتەقمردوو بکا[٥٨].

## ٦ ـ ٩ گیرانی لار

برانەوە و کۆتایی کاری نەسیرخان دەکەوێتە پاش گەڕانەوەی وەکیل لە ئازەربایجان. بە ملنەدان و خۆبواردنی حانی لار لە نوێ کردنەوەی گەلاڵەی ئاشتی و ناردنی چەکدارانی ئێلجاڕی، کەریمخان ناچار بوو سادقخان کە ئەو وەختی هێشتا بەگلەربەگی فارس بوو بنێرێتە تەمیکردنی. ئەم جار دەستی سادقخان بۆ بردنی چەکدارانی سەربازگەی شیراز و یەکسەرە کردنی کاری قەڵای لار تەواو ئاواڵە بوو[٥٩]. کەمێک پاش نەورۆزی ساڵی ۱۱۷۹ی کۆچی / ۱۷٦٦ی زایینی بێ ئەوەی تەگەرەی بێتە سەرڕێ شاری لاری گرت و قەڵای نەسیرخانی لەو لای شار لە بناری چیا گەمارۆ دا. ئەم قەڵایە بە هۆی ڕەهەند یان ڕێڕەوێک دەبەسترایەوە بە قەڵایەکی تر کە کەوتبووە سەر زەرد و ماهێکی زاڵ بە سەر شارا(۱۷). لەم قەڵایەدا نە تەنیا چەکداری ڕاهاتوو شووره و شاریان دەپاراست بەڵکوو تەواوی قەڵاکانی داوێنی چیاش دەکەوتنە ژێر سێبەری. بەڵام تەنیا دوای چوار ڕۆژ گەمارۆ، قەڵا گیرا، چونکە یەکێک لە ڕاکردووانی غەیان ڕێگایەکی نەهێنی کە تا دوندی چیا دەچوو نیشانی سادقخان دا. ئەوشەوە وەختایەک هێزەکانی گەمارۆدەر پەلامارێکی هەڵخەڵەتێنەیان کردە سەر قەڵای بناری کێو، دەستەیەکی تر بە مەبەستی غافڵگیرکردنی چەکدارانی قەڵای سەرچیا کەوتنەخۆ. سەرەڕای ناردنی بەپەلەی هێزی یارمەتیدەر لە لایەن نەسیرخانەوە قەڵای سەروو کەوتە دەس هێزەکانی زەند و بە ئاورکردنەوە سەرکەوتنی خۆیان بە یارانی گەمارۆدەری قەڵای بنار ڕاگەیاند. نەسیرخان ئێستا هەم لە لەیەن تۆپخانەی پێشووی لە مەتەرێزەکانی سەروو، هەم لە قۆڵی هێزەکانی بنەگری سپای زەند لە نێو شارەوە ئاگرباران دەکرا. ئیتر بە شێوەیەکی شێلگیر و پتەو شەڕی نەدەکرد، قەڵاکەی تێکڕما و ئازۆخە و قۆرخانەکەی تێداچوو، شەڕکەرانی

58- GD XII, 25 and 30 June, 20 July 1762.

٥٩ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٤٦.

لێی دەرهەڵبوون و ناچار بوو كە براكەی بە مەبەستی داخوازی وتووێژ بنێرێتە لای سادقخان[٦٠].

ئەم هەڵمەتە بە واتای كۆتاییهاتنی دەسەلاتی نەسیرخانی لاری بوو. سادقخان هەلومەرجی ئاشتی و رێككەوتنی پاراست و رێزی لێگرت و نەیهێشت چەكدارانی نەسیرخان قەلاچۆ و تالان بكرێن. هەردک قەلا خاپوور كران و خانی لار وێڕای بنەماڵەكەی نێردرایە شیراز و لەوێ زۆر بەگەرمی و مێهرەوانی بەرەورووی میوانە بارمتانە بوونەوە. حكوومەتی لار درایە دەس مەسیحخان. ئەم پیاوە ئامۆزای نەسیرخان بوو. وێدەچوو كە نەسیرخان لە ماوەی دەسبەسەركرانی لە شیراز توانیبێتی متمانەی كەریمخان بۆ سەر خۆی ڕاكێشێ، چونكە دوای ماوەیەک لە شیراز بوو بە دەنگۆ كە وەكیل دووبارە ناردوویەتەوە سەر دەسەلاتی پێشووی لە لار؛ بەلام هەر كە گەیشتە لارستان بە فیتی مەسیحخان یەكێک لە كەیخوداكانی بە زەبری خەنجەر كوشتی[٦١].

كەریمخان وێڕای لەشكركێشی بۆ سەر كۆهكیلۆیە توانی تەواوی ئەو تاقم و دەستە پرشوبلاوانەی خێلاتی كە ئەغڵەب خۆیان لە دانی پیتاک دەبوارد و كاروانەكانی نێوان شیراز و مەڵبەندەكانی قەراغ بەندەرریگ و بووشێهریان رووت دەكرد، پێمل بكا. لە ڕووداوی نەسیرخانیشدا كەریمخان كەوتبووە بەربەرەكانی لەگەڵ زنجیرەیەک حوكمڕانی ناوچەیی، چونكە هەمیشە بارودۆخی لە ڕۆژهەلاتی فارس قایمتر بوو تا ڕۆژاوای ئەم مەڵبەندە و دەوروبەری پایتەخت. حاكمی لار بەر لەوەی بە سپای ئێلجاڕی تایفەكان پشتئەستوور بێ، بە چەكدارانی هەمیشەیی خۆی پشتقایم بوو. لە ڕێی حاسلاتی كشتوكاڵ و گوومرگانە و ڕێدارانە و بەرتیل و دیاری و دراوی دیكەی

---

٦٠ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٤٧ ـ ١٤٩؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٥٠ ـ ١٥١؛ فەسایی، بەرگی یەكەم، ل ٢١٦؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٧٣ ـ ٣٧٤. ئەم كتێبە دەنووسێ كوڕەكانی نەسیرخان ناویان محەممەد و عەبدوڵڵا بوو.

٦١ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٤٩ ـ ١٥٠؛ فەسایی، بەرگی یەكەم، ل ٢١٦. كوڕانی نەسیرخانیش حكوومەتی لار و دەوروبەریان گرتەوە دەس تا ساڵی ١٨٥٨. لەم كاتەدا فەرمانڕەوایانی فارس نەسروڵلاخانی «لاری»یان لێخست و خۆیان حاكمێكیان نارد. (فەسایی، بەرگی یەكەم، ل ٣١٨ ـ ٣١٩).

سەربەبرەوی بازرگانێتی نێوان کرمان و بەندەرعەباس و شیراز پارەیەکی چاکی کۆکردەوە. ئەم سامانە لەگەڵ داهاتی هەوارانەی خێلاتی فارس ـ خێلەکانی ژێر باڵی زەند کە هاوینانە لەوێ خێڵبەزیان دەکرد ـ کە زستانان لە لای لارستانەوە کۆچباریان لێدەنا، دەبوو بە داهاتێکی زۆر[٦٢]. گرتن و سەرپێنەویکردنی لار بوو بە هۆی زۆربوونی داهات و پەرەگرتنی دەسەلات و پاراستنی باڵی زەندیە بە مەبەستی گەیشتنە ئامانجەکانی تر و کرمان و بەندەرعەباسی خستە سەر ئیمپراتۆریتی کەریمخان.

## ١٠ ـ ٧ زولفەقارخانی ئەفشار

پاشماوەی گرفتەکانی راپەرینێکی ئەیالەتی کە بەدەس سەرۆکی تایفەیەک ڕێبەرایەتی دەکرێ، هەمیشە وەختایەک کە دەکەوێتە بەر لێکۆڵینەوە ئەم هیوایە لە حکوومەتا ڕەنگ دەداتەوە کە ئەگەر ڕووداوەکە شەش‌حەوت ساڵێک درەنگتر قەومابا، ڕەنگبوو بە شێوەیەکی باشتر بەری پێگیرابا.

لەبیرمانە کە زولفەقارخانی ئەفشاری ئیرلوو لە کلکەی ساڵی ١٧٦٣دا وێرای پێشڕەوی وەکیل لە ئەردەوێڵەوە بەرەو باشوور، کرایە حوکمڕانی سوڵتانییە و خەمسە. بەڕواڵەت هەتا دەوروبەری ساڵی ١٧٧٢ یەکێک لە لایەنگرانی شێلگیر و پتەوی کەریمخان بوو. لەم ساڵەدا دەفتەر و بنچاغی باج و پیتاکی زۆری دواکەوتە و قەرزوقۆڵە نیشان دەدا.[٦٣] ئەو ڕاپۆرت و هەواڵانەی کە لە لایەن ڕاپۆرتچی و گەشتیارانەوە بە گوێی کەریمخان ئاشنا دەکرا، وای دەنواند کە خانی ئەفشار مەیلی سەربەستی لە کەللەی دایە. وێدەچێ ئەویش لە سەرکەوتنەکانی حوسێنقولیخانی قاجار کە لەم ڕۆژانەدا خۆی لە ژێر نیری حکوومەتی زەند دەرباز کردبوو، قرمی خۆش کردبێ. کەریمخان بە بارێکی ئاساییدا بانگی کرد هەتا بێ و حیساباتی باج و پیتاکی ڕوون بکاتەوە. زولفەقارخان لەبری خۆی کوڕەکەی (١٨) ناردە شیراز. ناوبراو دەوری

٦٢ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٤٦.

٦٣ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٧١.

ڕاسپێراوی چاک دەگێڕا و زۆر ئارام و نەجیبانە دەیگوت کە باوکی گەلێک نەزان و نانەجیبە و بێگومان بەم زووانە بە خزمەت دەگا و ئێستاش لەبەر شەکەتی سەر بە کاروباری دژواری خەریکی حەسانەوەیە. بەڵام کاتێک چەند جارێک ئەم دەورگێڕانانە دووپات بوونەوە، وەکیل سەبردانی دڕا و لێبڕا دەس بەرێ بۆ کردەیەکی پێویست[٦٤].

لەشکرێکی دووقۆڵی چوارهەزار کەسی بە سەرکردایەتی عەلیمحەممەدخان و عەلیمرادخانی زەند نارده سوڵتانییە. عەلیمحەممەدخان لە پارێزگای هەمەدانەوە بزووت و عەلیمرادخانیش ساوە و قومی دەور لێدا. کاتێک عەلیمرادخان بۆ کۆکردنەوەی چەکداری ئێلجاڕی لەنگەرێکی گرت، هێزەکانی عەلیمحەممەدخان گەیبوونە سەر کەوشەنی قەڵەمڕەوی زولفەقارخان و تووشی شەڕ هاتن. دوو سپاکە لە نیزیک ئەهەر تێکهەڵچوون و ئەگەرچی خانی ئەفشار زۆر ئازایانە پەلاماری جەرگەی هێزەکانی زەندی دا و وێدەچوو کە خێرایەکی تێکیانشکێنێ، هاوپەیمانە «شوقاقی»یەکانی کە لەوبەرەوبەر دامەزرابوون لە پشتەوەڕا بەرگەی شالاوی شێلگیرانەی چەکدارانی زەندیان نەگرت. بەم شێوەیە هێزەکانی زولفەقارخان دەستیان لێکبەردا و هەڵاتن و خۆشی لەم هەڵلایە قوتار بوو. چەند ساتێک دواتر تاقمێک چەکدار بە سەرپەرستێتی سەبزعەلیخانی سوڵتانبلووچ کەوتنە شوێنی و لە دووفرسەخی مەیدانی شەڕ گرتیان. ڕۆژی دوایی کە عەلیمرادخان هات، سەرانسەری ناوچە کەتبووە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی عەلیمحەممەدخانی زەند و ئەویش گەشایەوە کە هاوکات لەگەڵ لەشکری سەرکەوتوو دابەزیوە تا دەس بە سەر ماڵ و دارایی زولفەقارخان دابگرێ و خاوخێزانی گاڵ دا بۆ شیراز[٦٥].

---

٦٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٦٩. بەگوێرەی گێڕانەوەی غەففاری، ل ١٧٢ و ڕەزاقوڵیخانی هیدایەت، ل ٨٣، دایکی زولفەقارخان کەوتبووە مابەین و پاش گیرانی دووبارەی کوڕەکەی کەیخودایەتی بۆ کرد و پاڕایەوە.

٦٥ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٦٩؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٧٢؛ تەفرەشی، ل ٢١٧ ئا ـ ب. ئەم سەرچاوەیە بە محەممەدسوڵتانبلووچ ناوی هێناوە. ڕۆستەموتتەواریخ لە لاپەڕە ٣٧٩دا نەقڵەکەی جۆرێکی دی گێڕاوەتەوە و دەنووسێ عەلیمحەممەدخان کەوتە شەڕی دەستەویەخە لەگەڵ زولفەقارخان: «شیرەکەی وا داهێنایە شمشێری

زولفەقارخان بە تکای دایکی و مێهرەبانی هەمیشەیی وەکیل بەخشرا و تەنانەت دواتر بە وەرگرتنی خەڵات و فەرمانی حکومەت گەڕایەوە سەر دەسەڵاتی، بەڵام لەو دەمیڕا بنەماڵە و کەسوکاری لە شیراز مانەوە[٦٦].

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ عەلیمرادخانی بەختیاری لە زەمانی نادرشادا بوو بە جڵەوکێشی جەماوەری بەختیاری بۆ ڕاپەڕین و گەلێک جاران سەردارانی نادری شکست دا، بەڵام ئاخرییەکەی شای ئەفشار خۆی ڕووی کردە خانی بەختیاری. تێکیشکاند و سەرەنجام لە لورستانی فەیلی کەوتە داو. فەرمانی بڕینی دەس و لاقێک و دەرهێنانی هەردک چاوی درا و دووڕۆژ دواتر مرد. لەو سەردەمەوە کۆچی بەربلاوی خێڵی بەختیاری دەستی پێکرد و لە چەند شوێنێک بنەگر کران.

ناوی ڕاستەقینەی ئەم کەسە «عەلی مرادی»یە، واتە عەلی کوڕی مراد و لە تایفەی خەڵکی گوندەکی زەلقی بوو لە نیزیک ئەلیگوودەرز. هۆکاری سەرهەڵدانی عەلیمرادی ئەوە بوو کە ئەگەرچی زۆر بەجەرگ بوو بەڵام نەگەیشتە پلەی دڵخواز و شیاوی. هەروەها لە شەڕی نادر لەگەڵ عەبدوڵلاشادا یەسترێکی بە بارێک زێڕ و جەواهێراتەوە کەوتە دەستی و کابرای سەرپەل دەیویست لێی بستێنێ، بەڵام ملی نەدا و کەوتە بەر لێدران و ڕایکردە ناوچەی ئەلیگوودەرز. لەوێ جەماوەرێکی زۆری لێکۆبوونەوە و تاقمێک لە خەڵکی

---

زولفەقارخان کە وەک خەیار دوولەتی کرد.» پاشان نێزەکەی لە دەس دەرهێنا و پەلی ئەسپەکەی پەڕاند و گلی پێدا و خستی و گرتی و ناردییە شیراز. ڕۆستەمونتەواریخ دەنووسێ زولفەقارخان دووبارە ڕاپەڕی و دیسانیش چاوپۆشی لە تاوانی کرا و کارەکەی لێنەستێندرایەوە.

٦٦ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٧٢؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٨٤ ـ ٨٥.

خورەمئابادیش دایانە پاڵی و لەشکرەکەی گەیشتە ٢٠هەزار کەس. دەیەویست پەلاماری خوراسان بدا و شاتۆماسب لە زیندان دەرێنێ و بیکاتە شا. دەستی کرد بە سکەلێدان و ئاوای لە سەر لایەکی نووسرابوو:

میکنم دیوانگی تا برسرم غوغا شود/ سکه بر زر میزنم تا صاحبش پیدا شود

(خۆم شێت دەکەم تا هاوارم لەدوا بێ، سکەی زێڕ لێدەدەم تا خاوەنی پەیدا بێ). لە دیوەکەی تری ئەم ڕستەیە خۆی دەنواند:

علی مرا داد مراد و بخت یاری کرد / به زیر سکهٔ من نقره کامرانی کرد

(عەلی بە مرادی گەیاندم و بەخت یاری کردم، زیولە سایەی سەری سکەی منڕا برەوی پەیدا کرد). گەمارۆی ئەو ئەشکەوتەیان دا کە پەنای تێدا گرتبوو و دەستی دا. لە وەختی شەڕا ژن و منداڵی خۆی کوشت تا بە دیل نەگیرێن و خۆشی لە بەرپێی دایکی سەرەڕای ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر، پیاوانە گیانی دا.(عالەمئارای نادری، ل ٢٤٩)

٢ـ چوار محاڵ کەوتۆتە باشووری ڕۆژاوای ئیسفەهان و سەد کیلۆمیترێکی لێ دوورە. چوار ناوچەیە کە بریتین لە: لار یان رار، کیار، میزدەج و گەنمان (گندمان).

٣ـ نەزەرعەلیخانی فەیلی یەکێک لە نەوەکانی حوسێنخانی والی و ئامۆزای سمایلخان بوو. ڕێزدار پێری لە سەر پێوەدانی موجمەلوتتەواریخ بە برای ئەوی داناوە.

٤ـ گوڵشەنی مراد ناوی سەرکردەی ڕاپەڕیوانی بە «تەهمتەن» هێناوە. ڕێزدار پێری نووسیویەتی کە ئەم کەسە ئەسپی پێشکێشی کەریمخانی ئاگر داوە، بەلام گوڵشەنی مراد نووسیویەتی کابرای نێردراوی وەکیلی لە نەوتدا خووساند و سووتاندی.

٥ـ جایزان شارەدێیەکە لە شارستانی ڕامهۆرمز و کەوتۆتە نێوان

بێهبەهان و کۆهکیلۆیە و سولتانئاباد.

٦ـ میرزا عەلیڕەزا کوڕی قەوامودین (قوما) بێهبەهانی و لە تیرەی سەیدەکانی تەباتەبایی بێهبەهان بوو. هێندێک لە سەرچاوکان نووسیویانە پاش شکانی لە بەرامبەر کەریمخانا نێردرایە شیراز. بەڵام بە نووسینی گوڵشەنی مراد هەر لەو شوێنە بۆ ئەوەی پارەیەکی لێ بستێنن بە زەبری کوتەکی باجوەرگران کوژرا.

٧ـ عەلیڕەزاخانی قەنەواتی یان سەرۆک عەلیڕەزا، ئەمینی میرزا عەلیڕەزا بێهبەهانی بوو. کاتی گەمارۆی شار پەیوەندی کرد بە هێزەکانی زەندەوە و ڕێی بۆ شکستی حاکمی خۆی خۆش کرد و پاش دوورخرانەوەی میرزا عەلیڕەزا نازناوی «خان»ی درایە و کرایە حاکمی زەردکێو. سولتانمحەممەدخانی کوڕی حاکم، ئەبولخانی تەییبی هان دا بۆ کوشتنی.

٨ ـ هەیبەتوڵلاخان کوڕی مەسیحخانی باوی سەرکردەی چوار پۆل چەکداری ئێلجاڕی بوو.

٩ـ باوی ناوی مەڵبەندێکە لە ڕۆژهەڵاتی بێهبەهان و دوو بەشە، کووهمەرە و باشت و ناوەندەکەی شارۆچکەی باشتە. خێڵی باوی لەم مەڵبەندە دەژین و باوی لە زاراوەی لوڕیدا بە بابوویی (بابایی) دێتە سەر زار و زمانان.

١٠ـ تایفەی لیراوی دەبنە دووبەشی دەشتەکی و چیایی و چوار لکن: بەهمەئی، تەییبی، شیرعالی و یۆسفی.

١١ـ خێراوا (خێرئاباد) ناوی مەڵبەند و گوندێکە لە تەنیشت ڕوودشیرین. دەروازەی خێراوای بێهبەهان کەوتۆتە لای باشووری ڕۆژهەڵاتی شار.

١٢ـ باشت کەوتۆتە چل کیلۆمیتری شاری بێهبەهان و ناوەندی مەڵبەندی باشت و باوییە.

١٣ـ فەهلیان شارەدێیەکە لە مەڵبەندی ڕۆستەمی شارستانی مەمەسەنی پارێزگای فارس... خەڵکەکەی بە زاراوەی لوڕی دەدوێن.

١٤ـ دوژمـنزیـاری نـاوی خێڵێـکە و دوو بەرەبـابی «ئەلیاسـی» و «گشتاسبی»یە. خەڵکەکەی بە زاراوەی لوڕی قسە دەکەن.

١٥ـ دێفیش یان دێپیش کەوتۆتە ١٨کیلـۆمیتری بـاکووری ڕۆژهـەڵاتی بیدشەهری مەڵبەندی «جوویمەم»ی شارستانی لار.

١٦ـ تفەنگچی پیادەی هەمیشەیی پێیان دەگوترا جەزایرچی.

١٧ـ ناوی قەڵای سەرچیا کە بە ڕێگـای سەرداپۆشـراو بـە قـەڵای نێـو شارەوە دەبەسترایەوە قەڵای «قەدەمگا» و ناوی قەڵای نێو شار «نارینقەڵا» بوو.

١٨ـ بەڕێز پێری نووسـیویەتی کـە زولفـەقارخان کوڕەکـەی ناردۆتـە شیراز، بەڵام هەموو سەرچاوەکان نووسیویانە دایکی. غـەففاری لـە گوڵشـەنی مـرادا دەنووسـێ: لـە ترسـی ئـازار و تـووڕەیی پاشـایانە دایکـی نـارد کـە کەیخوداژنێکی فامیدە و پاکداوێنی زمانلووس بوو و کردی بە تکاکار لە خزمەت میری جیهانپەنا.




نەخشەی بەسرە ، دەوروبەری سالی ١٧٦٥ ی زایینی ، وەرگیراو لە گەشتنامەی نیبوور

# ٨

# کرمان و یەزد

## ٨ ـ ١ بەر لە کەریمخان

شار و پارێزگای کرمان بەگوێرەی دابی پێشوو ئارامییەکی کۆنباو باڵی لێئەنگاوتبوو، بەڵام لە جەغزی مەیلی بەرەو سیستمی حکوومەتی ناوەندی ئێراندا، چاوی دەبڕییە نەبەسترانەوە و سەربەخۆیی و بەختەوەرانە وا دیارە نەکەوتبووە سەر شارێی شالاوی پەلاماردەران. ئەم گۆشەنشینی و دوورکەوتنەوەی لە ڕادەبەدەری دەبوو بە هۆی ڕاکێشانی ڕاکردووانی شوێنەکانی تر. ئەو تۆڵەئەستێنانەی دەکەوتنە پێوشوێنی وان کەسان، پەلاماری تەواوی پارێزگایان دەدا و گەشەی بازرگانێتیش جموجۆڵی تالان و بڕۆی سەر ڕێوبانانی لێدەکەوتەوە. هەر لە سایەی ئەم هۆکارانەوە تەواوی سەردەمی دەسەڵاتی سەلجووقییە، مەغوول، تەیموور و کلکەی دەسەڵاتی سەفەوییە و ئەفشارییە و زەندان زۆرجاران کۆمەڵێک ڕووداو قەومان. هەڵسوکەوتی ساڵی ١٧٩٤ی ئاغامحەممەدخانی قاجار و جووڵانەوەی لەگەڵ خەڵکی ئەم شارە ڕووداوە تاڵە ئاماژە پێکراوەکانی گەیاندە ئەوپەڕی خۆی. (بڕواننە: بابەتی

کۆتایی ئەم بەرهەمە). لە ماوەی ئەو قۆناخەدا کە پەیوەندی بە کاری ئێمەوە هەیە، بە ڕوونی دەبینین کە مەڵبەندی گچکەی یەزدیش کە تەواوێک کەوتۆتە نێوەڕاست کرمان و ئیسفەهان و هەمیشە لە ژێر دەسەڵاتی حاکمی یەکێک لەم دووشارەدا ژیاوە، بە نۆرەی خۆی بیری سەربەستی لە مێشکیدا بووە. بەڵام کەریمخان کە تێکڕای پارێزگاکانی ڕۆژاوایی و ناوەندی هێنابووە ژێرڕکێفی، لێبڕابوو کە بەرەوپێش باژوێ و ئەم دوو شارەش کە دراوسێی پارێزگای ژێر باڵی ئەفغانییەکانی شاروخ بوون، بخاتە بن چۆکی خۆی.

لە کۆتایی دەسەڵات و پاشایەتی نادرا، موئمینخانی بافقی حاکمی کرمان بوو، بەڵام شاروخخانی ئەفشار لەم پارێزگایە دەریکرد. بنەماڵەی موئمینخان بێنێوبڕ لە زەمانی وەلیخانی باپیرەگەورەیەوە کە شاعەباس کردبوویە حوکمڕانی کرمان، پشتاوپشت دەستاودەستیان بەم دەسەڵاتە کردبوو. موئمینخان یەزد و «ئەبەرقوو»شی خستبووە سەر حکوومەتی خۆی و لە سەرەتای پاشایەتی نادرشادا ئاژاوەی نێوخۆیی بەرۆکیان گرت. عادڵشا و جێنشینەکانیشی گیرۆدەی کوشتاری یەکتر و خۆکوتان بوون بۆ وەدەس هێنانی دەسەڵات[1]. سەرەنجام لە ساڵی ۱۷۸٤دا شاروخشا داوای پیتاکی ئەم پارێزگایەی لە شاروخخان کرد و وێڕای دەرکردنی حوکمی هێشتنەوەی لە سەر دەسەڵات خەڵاتیشی بۆ نارد. بەڵام خانی ئەفشار بە نارەزامەندی وڵامی داوە و گوتی نادرشا کرمانی وا وێران کردووە کە هەتا سێساڵی دیکەش هیچ چەشنە باج و پیتاکێکی بۆ نادرێ. شای دەستندەخۆر و سەردارانی شەڕخوازی بەناچار ئەم بیانووەیان قبووڵ کرد[2].

لە ڕاستیدا ئەم بڕوبیانووانە هەڵگری گەلێک ڕاستەقینە بوون سەبارەت بە لا و لایەنە فرەچەشنەکانی وێران بوونی کرمان و ڕاپۆرتی هەواڵدەری

---

۱ـ گوڵشەنی مراد، ل ۷۳ ـ ۷٤؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ۹۰؛ وەزیری، ل ۳۱٦.
GD VI, 30 April 1748. When referring to the city of Kerman, as opposed to the province, Vaziri uses the older name Govashir (See Le Strange, Lands of the Eastern Caliphate, 330).

۲ـ وەزیری، ل ۳۱۷.

کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی ڕاستی و دروستی ئەم داوایە دەسەلمێنێ. لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٧٤٧دا تاقمێکی سێهەزار کەسی پەلاماردەری ئەفغانی کە گەیبوونە نیزیک ئەو شارە لە لایەن هێزەکانی حاکمەوە بەرپەرچ درانەوە و سەری ڕکێفیان هەڵەنگاوت و تێپەڕین، بەلام ڕۆژی دوایی پازدەهەزار ئەفغان و تاتار حاکم و فەرماندەرانیان لە چەند مایلی شار تێکشکاند. پاشان کەوتنە ڕاووڕووتی ماڵی زەردەشتییان لە دەرەوەی شوورەی شار و لە ماوەی شەش ڕۆژاندا هەموو شتێکیان بە تالان برد و بۆ وێنە ماڵی نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتیش وەبەرهات. بەلام لە کۆتاییدا وەختایەک پەلاماری حەوشەی شاریان دا سەرنەکەوتن و کشانەوە و مەڵبەندی ئاگرپەرەستانیان کە جەماوەری تێدا نەمابوو چۆل کرد و وێدەچێ دوابەدوای ئەوان قاتی و قڕی باڵی بە سەر شار کێشابێ[3]. کەمێک دواتر کرمان دیسان کەوتەوە بەر شالاوی تالان و بڕۆ. تەنانەت وەختایەک پێی دوژمنی دەرەکیش لە گۆڕێدا نەبوو دەکەوتە بەر شەپۆلی کوشتار و دەسدرێژی ئەو چەکدارانەی بەرواڵەت بە مەبەستی پاراستنی دەنێردران و لەبەر شالاوی چەکدارانی شرەخۆری بەختیاری و پاشماوەکانی پەرتەوازەی سپای نادری بەراستی پەیوەندی و بەسترانەوەی بە بەندەرعەباسەوە دابڕابوو[4]. لە سەرەتای ساڵی ١٧٤٨دا قاتی و قڕی وای تەنیبۆوە کە خەڵک گۆشتی ئادەمیزادیان دەخوارد و گۆشتی سەگ و پشیلە و جانەوەرانی حەرامگۆشتیش لە بازاڕەکانی گشتیدا بە ئازادی دەفرۆشران. وا دەنگۆ بوو کە تاقمێک شەوانە پەلاماری مالان دەدەن و خەڵک لە جێوبانیان دەردەکێشن و دەیانفرێنن و پاش کوشتن(١) دەیانخۆن[5]. لەم سەردەمانەدا دەستەیەکی بچووک بە سەرکردایەتی ئەڵلایارخانی ئەفغان شاری یەزدیان تالان کرد[6].

لەگەڵ ئەمەشدا شاروخخان لانیکەم توانی ناوەندی سیاسی پارێزگا لە شەپۆلی شالاو و هەرەجمەرەج بپارێزێ. لە هاوینی ساڵی ١٧٥٠دا سەربزێوی هەمەلایەنەی محەممەدڕەزابەگی کەللەڕەقی سەرداری نێردراوی برایمیرزای لە

3- GD VI, 20 and 27 October 1747.

4- GD VI, 26 October, 12 December 1747.

5- GD VI, 2 March 1748.

٦ـ زەرابی، ل ٢١١ ـ ٢١٢. ئەڵلایارخان پێشتر لە ئیسفەهان دەرکرابوو.

ئیسفەهانەوە ڕادایە دەرەوەی شار[٧]. ناوبراو دەیەویست لەشکرێک بە مەبەستی ملبەملەی یەکێتی سێ سەردارەکە کۆ بکاتەوە. لەم ڕۆژە بەم لاوە شاروخخان سەربەستانە ملی نایە حکوومەت کردن. لە ساڵی ١١٦٤ی کۆچی / ١٧٥١ی زایینیدا بە مەبەستی بەرپەرچدانەوە و بەرە ورووبوون لەگەڵ سپایەکی ٥هەزار کەسی سیستانی و بلووچ بزووت. سپای ناوبراو لە «بەمپوور» و «بەم»ەوە تێپەڕین و گەیشتنە «چلتوخم» کە میلێکیان مەودایە. بەڵام شاروخخان زۆر چاک تێکیشکاندن و زەبرێکی وای لە پەلاماردەران وەشاند کە هەزار کەلاکیان کەوتە سەردەست. چەند سەر وشترێک و بڕێک چەکوچۆڵیان لێ بە خەنیمەت گیرا. حوکمڕانی کرمان بەشێکی زۆری «سیستان»یشی هێنایە ژێر ڕکێفی خۆی و هەروەک پارێزگای کرمان باج و چەکداری ئێلجاڕی لێوەرگرتن[٨].

لە ئاوریلی ساڵی ١٧٥٤دا پارێزگای کرمان لە لایەن موئمینخانی بافقی حاکمی پێشووی وێندەرێ کەوتە بەر زنجیرەیەک شالاوی لەشکری. شاروخخان داوای یارمەتی لە دراوسێی بەهێزی واتە نەسیرخانی لاری کرد. نەسیرخان بەپێی ڕێککەوتن بەخۆی و هەشتهەزار چەکدارەوە لە لار وەدەرکەوت[٩]. بەگوێرەی ڕاسپاردەی شاروخخان حاکمی شارەکانی سەرڕێ وەک داراب و بافت چوونە پێشوازی نەسیرخان و هێزی یاریدەریان خستە ژێر باڵی. نەسیرخان لە پێشدا برازاکەی نارده دیداری حوکمڕانی کرمان. شاروخخان بێ ئەوەی دڵی

7- GD VI, 18 August, 10 September 1750.

٨ـ وەزیری، ل ٣١٧.

٩ـ GD VII, 10 September 1754. گێڕانەوەکەی وەزیری (ل ٣١٨ ـ ٣٢٠) کە لێرەدا بۆ خستنەڕووی ئەم لەشکرکێشییە کەلکی لێوەرگیراوە، هۆکارێکی تر دەخاتە ڕوو: بەوجۆرەی گوتراوە نەسیرخان بە فەرمانی کەریمخان دەیەویست کرمان بگرێ، بەڵام دەیەویست بە چەشنێک دەستی بگاتە شاروخ و بیگرێ. لەم ڕۆژگارەدا کەریمخان لە بەشی گەرمەسێری فارس خەریکی کۆکردنەوەی چەکدار بوو بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی درەنگ و زووی ئازادخان لە لای ئیسفەهانەوە و لەخۆوە داوای یارمەتی لە نەسیرخانی بەرواڵەت حاکمی ژێردەستەی کردبوو. ناگونجێ نەسیرخان سەربەخۆ ئەم هەنگاوەی نابێ و شاروخ کە پێشوازی لێکرد، بەر لەوەی بە دوژمنی خۆی بزانێ، پێی وابوو هاتۆتە یاریدەی.

غایلە بکا لە گوندی نارپ(۲) کە کەوتۆتە پازدە میلی مەشیز چاوی بە حوکمڕانی لار کەوت. نەسیرخان پاش سازکردنی میواندارییەک، میوانەکەی گرت و دەس و پێی بەست و پەیامێکی ناردە کرمان کە بێن و بە دەهەزارتمەن بیکڕنەوە. وەختایەک سەریان لە ئاست داواکەی بادا بە لەشکرێکی پتر پیادەوە وەڕێکەوت و بە دوو ڕۆژان شازدە فرسەخێکی کوتا. سەرەڕای پەلەپەلێکی دەیکرد و بارمتەیەکی کە بە دەستییەوە بوو قۆچەقانیداران و تفەنگچییەکانی کرمانی کە شوورەی بەرزی شاریان دەپاراست، وەها شێلگیرانە دەستیان کردەوە کە لە یەکەم پەلاماردا سیکەس لە پیاوەکانی کوژران و ناچار کرا خۆ بداتە گەمارۆی ڕێکوپێکی شار[10].

ڕەزاقولیخان(۳) کە لە لایەن شاروخەوە حکوومەتی «زەرەند»ی لە ئەستۆ بوو هەولی دا کە زەبرێکی شەوانە لە هۆردووبەزی لارییەکان بوەشێنێ و سەرکردەکەی ڕزگار بکا. هەلبەت زۆر وەدرەنگی کەوتبوو چونکە دوو سەعات هەلمەتەکەی وەدوا دا و پیاوەکانی نەسیرخان کازیوەی بەیانی چووبوونە سەر شوێنی زێرەوانی و ڕەپالیان نانەوە. بەلام پەلاماری ڕۆژانەی کرمانییەکان هەر ڕۆژەی چەند سەر ئەسپ و سەربازی تێدا دەبرد و گەمارۆدەران خێرایەکی تووشی کەمبوونی ئازۆقە هاتن. هێرش زەمانێک دەستی پێکرد کە شاروخ بە بەرتیل لەگەل نیگابانان پێکهات و ڕایکرد و گەیشتەوە کرمان. لەم کاتە بەدواوە چەند گەلالەیەک داڕژان و نەسیرخان دەستی کرد بە هەلسوکەوتی ناخۆش لەگەل نیزیکانی. بە هۆی شالاوی کرمانییەکان لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ لار، لە تەواوی مەودای ڕێگادا تا وەختایەکی گەیشتەوە نیزیک قەلای گەراش(٤) لە سێفرسەخی شاری لار تەنگی پێهەلچندرا و کەوتە تەنگەژەوە. سەرەنجام لە قەلای گەراش دابەزی. هەر لەم ڕۆژانەدا شاروخ بەر لە گەڕانەوەی بۆ کرمان، حاجیئاباد و تارۆم و «شەمیل»ی لە ناوچەی سەبعەی نێوان لار و کرمان تالان کرد.

هەر لە هاوینی ئەوسالەدا ئەحمەدشا دوڕانی کە شاری مەشەدی هێنابووە ژێر چنگی خۆی، شاروخخانیشی لە سەر حکوومەتی پارێزگای کرمان

10- GD VII, 10 September 1754 ; cf . Brieven 2755 (1756). 39 (20 December 1754).

هێشتەوە. ناوبراویش هەزارتمەنی دیاری لە خەڵکی شار کۆکردەوە[11] و بە پەلە چاکەی ئەحمەدشای داوە. لە لایەن ڕۆستەمخانی خزمی شاروخ و کەسانێکی دیکەش وەکوو محەممەدڕەزاخان و تەقیخانی بەمی کە جەماوەر زۆریان خۆش دەویست چەند هێرشێکی تریش کرایە سەر کرمان. ئەم شالاوانە بوونە ئاستەنگ لە سەر ڕێی شاروخ و نەیانهێشت خەریکی بەرفرەوان کردنی قەڵەمڕەوی بێ و تەنانەت سەرەتای نەمانی ڕێز و خۆشەویستیشی لە خودی کرمانا بەدیهات[12].

لەم هەلومەرجەدا شاری یەزدیش توانی لە کرمان جیا بێتەوە و تەقیخانی بافقی بەڕێوەی بەرێ. ناوبراو لە پێشدا بە ناوێکی بێفیزانەی وەک میرزا تەقی خەزنەداری یەزدەوە خزمەتی دەکرد و دۆستایەتییەکی سیاسی یەکچەشنی لەگەڵ کەریمخان و ئازادخان و محەممەدحەسەنخان یانی ناوەندەکانی دەسەڵاتی ئێران دامەزراندبوو، هەتا بە کاروکردەی بەرژەوەندخوازانە و پەنامەکی ببێتە حکوومەتێکی سەربەخۆ و هەرکام لە پاڵەوانانی مەیدانەکە گرەوی تاج و تەختیان بردەوە لەبەر دەغالەتی ڕواڵەتی دەسپێشخەرانەی لە شوێنی خۆی نەیبزێون[13]. حکوومەتەکەی لە ئاخری ساڵی ١٧٥٤دا یانی پاش شکانی ئازادخان لە کەمارەج و پاشەکشەی لە فارس دەستی پێکرد. لەم کاتەدا محەممەدئەمینخان لە لایەن سەرداری ئەفغانەوە حکوومەتی یەزدی لە سەرشان بوو و بەگوێرەی فەرمانی سەرکردەکەی ٥٠هەزار تمەنی باج لە خەڵک وەرگرت[14] و شاریشی وەک کەلاوەیەک بەجێهێشت و ئاخرییەکەی خۆشی هەڵات.

پاش ئەم ڕووداوە ڕەفیعخانی عەرەبعامری کە بە دژایەتی لەگەڵ ئازادخان خاک و مەڵبەندی لای «بیابانەک»ی داگیر کردبوو بە مەبەستی گرتنی یەزد کەوتەڕێ تا شاری چۆڵوهۆڵ بخاتە ژێر چنگی. هێزی بەرگری نێو شار کە تەقیخان ڕێکیخستبوون و ڕێبەرایەتی دەکردن زۆر سەرکەوتووانە بەرپەرچی شالاویان دایەوە. ڕەفیعخان بە گوللەبەڕەلایەک کوژرا و لەشکرەکەی پاشەکشەی

---

11- GD VII, 11 August 1754, 13 April 1755.

١٢ـ GD VII, 10 September 1754; VIII, 19 August 1755. تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٩١؛ گوڵشەنی، ل ٦٤ ـ ٦٧.

١٣ـ گوڵشەنی مراد، ل ٤١؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ٧٥ ـ ٧٦؛ GD IV, 5 August 1756.

14- GD VII, 17 September 1754; cf. Brieven 2755 (1756), 39.

کرد(ە). لەو ڕۆژیڕا میرزا تەقی بە خۆی دەگوت تەقیخان و تا چوارساڵ دواتریش حکوومەتەکەی درێژەی کێشا و نیشانی دا کە لە تەواوی حاکمەکانی تری پێشوو گەلێک دادپەروەرترە. ئەویش وەک شاروخخان لە کرمان کەوتە بەر شەپۆلی ئاژاوەی نێوخۆ و شەڕەنگێزی دراوسییەکانی کە دەبوایە هۆکاری تێداچوونیان ئامادە کردبا[۱۵].

## ۸ ـ ۲ تەقیخانی بافقی و خودامرادخانی زەند

وەک نامی گێراوییەتەوە وەکیل تەقیخانی لێخست و زیندانی کرد و ۱۲هەزارتمەنی جەریمە پێوەبەست. لەبەر تکای هێندێک لە هۆگرانی بەخشرا و چۆوە سەر کاری خۆی[۱۶]. لە مانگی مارسی ۱۷۵٦دا عەلیمحەممەدخانی زەند کە پەلاماری یەزدی دابوو پاشەکشەی پێکرد[۱۷]. لە ئاخری ساڵی ۱۷۵۷دا سادقخان لە لایەن وەکیلەوە چووە یەزد تا ۷هەزار تمەنی تاوان لێبستێنێ. بەڵام هیچکام لە سەرچاوەکان باسی چۆنیەتی دەربازبوونی تەقیخانیان لەم کارە ناڕەوایە نەکردووە[۱۸]. لە سێپتامبری ساڵی ۱۷۵۸دا وەختایەک وەکیل و لەشکرەکەی بە شوێن محەممەدحەسەنخاندا بەرەو باکوور بزووتن توانیان بچنە خاکی یەزد و تەقیخان بگرن. وەکیل بۆ ئەوەی زەمان بە فیڕۆ نەدا لە پێشا زەکیخانی بە سێسەد سوارەوە بەرەو یەزد بەڕێ کرد. بەرەبەیانی ڕۆژی سێهەم گەیشتنە ئەو شارە و توانیان بچنە نێو کۆشکی حاکم. سەرکردەی زێرەوانانیان گرت و ناچاریان کرد کە بیانباتە سەر تەقیخان هەتا سەبارەت بە هاتنی کەریمخان لەگەڵی بکەونە باس و ڕاوێژ. فێڵەکە گرتی و زێرەوانانی کۆشکی حاکم دەستیان دا و تەقیخان یەکسەر لە جێوبانەکەیڕا بەرەو ئەشکەنجەگا بەڕێکرا. لەم

۱۵ـ گولشەنی مراد، ل ٤۱؛ GD IX, 11 October 1756.

۱٦ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۷٦.

17- GD VIII, 31 March 1756.

۱۸ـ GD X, 28 December 1757. وێدەچێ ئەم سپایە کە زۆریش تەیار نەبوون سەربازانی ئێلجاڕی عەلیخانی کوڕی نەسیرخان بووبن، (ئیقتداری، ل ۲۸۸ ـ ۲۸۹؛ بڕوانە: بابەتی ۷، پەراوێزی ژمارە ٥۱.)

کاتەدا کەریمخان و لەشکرەکەی گەیشتنێ. زەکیخان بە ئازار و جزادان ١٢هەزار تمەنی لێئەستاندبوو. ئاخرییەکەشی ناچاریان کرد کە بەر لە چوونەدەر لە یەزد بڕی ١٥هەزار تمەن بداتەوە بەو کەسانەی پێیان قەرزدارە[١٩].

بەهەرحاڵ شاری یەزد ماوەیەکی زۆر لە کرمان جودا بوو. لە ١٣ی ئاوریلی ساڵی ١٧٦٠دا، وەختایەک کەریمخان لە خاکی خەمسە بنەی دانابوو، شاروخخان دووبارە یەزدی گرتەوە[٢٠]. ئەم کارە بە هەڕەشەیەکی راستەوخۆ بۆ سەر ئیسفەهان دادەندرا، بۆیە وەکیل لێبڕا تەنانەت لەم کاتەدا کە خەریکی لەشکرکردنێکی گرینگە لە ئازەربایجان، هێزێک بنێرێتە سەر کرمان.

بۆ راپەڕاندنی ئەم کار و ئامانجە هێزێکی پێنجهەزارکەسی بە سەرکردایەتی خودامرادخان ناردە سەر ئەم ناوچەیە[٢١]. لەم جەنگەدا کرمان و بەتایبەت شارە دوورەدەستەکانی ئەو پارێزگایە کە وردەوردە لە چنگ تین و تەوژمی شاروخ وەتەنگ هاتبوون، یەکجێ لێی هەڵبەزینەوە و راپەڕین. شاروخ بە تۆڵەی ئەم سەرهەڵدانە قەڵای «بێهاباد»ی دایە بەر تۆپ کە مەکۆ و ناوەندی سەرەکی راپەڕیوان بوو، بەڵام پەلامارەکەی لەبەر ورەی بەرزی خۆڕاگران بە سەرکشا. وەختایەک لە پەنا کلاوقووچەیەکڕا سەرپەرستی و چاوەدێری شالاوەکەی دەکرد، فیشەکێک لە مەتەرێزیدا بە سەختی پێکای و خستییە ئاویلکە[٢٢]. مەرگی لەپڕی پاش سێزدەساڵ حکوومەتی بێ بەرهەڵست، کاری خودامرادخانی هاسانتر کرد. مانگێک دواتر لە ٢٢ی ئۆکتۆبردا پێینایە شوێنێک کە چوار ساعەتەڕێ لە کرمانەوە دوور بوو. لێرەوە بە دڵنیایی پەیامی نارد بۆ تەقیخانی بەمی(٥) جێنشینی شاروخ و هەڵبژاردەی جەماوەر کە دەبێ سەر

---

١٩ــ گوڵشەنی مراد، ل ٤٢ ــ ٤٣؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٧٧ ــ ٧٨.

20- GD XI, 30 April 1760.

٢١ــ GD XII, 23 December 1760. و گوڵشەنی مراد، ل ٧٤.

22- GD XII, 17, 19 October, 22 December 1760 ; Brieven 2919 (1762), خارگ، بەرگی ٢، ل ١٨، ٣٠ی نوامبری ١٧٦٠. وەزیری لە لاپەڕە ٢٣١دا دەنووسێ کە شاروخخان وەختایەک دەورەی تەقیخانی بافقی دابوو ئەنگوا؛ بەڵام راپۆرتی نوێنەری کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵاتی لە کرمانەوە دەیسەلمێنێ کە راپۆرتەکەی غەففاری و نامی دروستە. جگە لەمەش تەقیخان دوو ساڵ پێشتر لە سەرکار لادرابوو.

وەبەر حکوومەت بێنێ[٢٣]. بەڵام ناوبراو وڵامی دایەوە کە خەڵکی ئەم شارە سەریان وەبەر ساحێبئیختیاری وەکیل هێناوە[٢٤] و هەتا وەختایەکی فەرمانی کەریمخان نەیا·گوێی بە قسەی خودامرادخان نابزوێ.

سەرداری زەند بۆ ماوەی شەش حەوتوو شاری گەمارۆ دا. لە ١٩ی نوامبردا شاڵاوی پارێزەرانی شار کە دزەیان کردبوو تێکشکاند و ژمارەیەک تفەنگی «زەنبوورەک»ی لێ بە خەنیمەت گرتن و شەڕکەرانی تا نێو حەساری شار کشاندنەوە. لە ١٤ی مانگی دێسامبردا چەند پەیام و ڕاسپاردەیەکیان بە مەبەستی دانیشتن و وتووێژ بۆ نارد. خودامرادخان پێی نایە شار و هەڵومەرجی پرسووکایەتی خۆی بە گرتنی جەماوەرێکی زۆر و غەدر و کەڵەزەڕی ڕاگەیاند[٢٥]. بە گەیشتنی فەرمان و ڕاسپاردەی وەکیل هەڵوێستەکەی گرم گۆڕا. بەڵام سەرداری زەند داوای بڕی ٢٧هەزار تمەن باجی سەرانەی حەوت ساڵەی کرمانی دەکرد. زۆربەی خەڵک بەر لەوەی وەرگرتنی باج بە شێوەیەکی بەربڵاو دەس پێبکا، لەو شارە کۆچیان کرد[٢٦]. خودامرادخان پاشان بە چنگ هاویشتنە سەر دووکانی سەوزیفرۆشی و نانەوایی و قەسابی داهاتێکی مفت و مەرحەبای بۆخۆی دابین کرد[٢٧].

· سکاڵای شارەکانی پارێزگا بێ ئەوەی گوێیان بۆ شل بکرێ درێژەیان کێشا، چونکە هەڵوێست و سیاسەتی زۆرەملییانەی حاکمانی نوێ ئەگەر پتری

---

٢٣ـ گولشەنی مراد، ل ٧٤ :«باقربەگ»ناوێک سەرۆکایەتی شاری کرمانی لە ئەستۆ بووە. یادداشتەکانی گێمبروون، بەرگی١٢، ساڵی١٧٦٠، تێیدا هاتووە کە تەقیخانی بەمی دەستی بە سەر حکوومەتا داگرتبوو.

24- GD XII, 17 and 19 October 1760.

٢٥ـ گولشەنی مراد، ل ٧٥: دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ٢، ل ٣٥ و

GD XII, 23 December 1760.

نووسراوەی غەففاری نیشانی دەدا کە ماوەی گەمارۆ زۆر کەمتر لەوە بووە کە گێمبروون نووسیویەتی.

26- GD XII, 27 February 1761.

٢٧ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٧٦.

نەکردبوون، داشینەبەزاندبوون. لە ٥ی مارسی ١٧٦١دا خودامرادخان ناچار بوو کە زۆربەی هێزەکانی بە مەبەستی دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی مەشیز بنێرێتە ئەو ناوچەیە. مەشیز(٦) کەوتۆتە پێنجفرسەخی کرمان و لەوێ یەکێک لە خزمەکانی شاروخخانی کوژراو بە ناوی ڕەشیدخانی ئەفشار لەگەڵ تەقیبەگی سوڵتان شانبەشانی یەکتر ڕاپەڕیبوون[28].

## ٨ ـ ٣ تەقیخانی دورانی

چیرۆکی تەقیبەگی سوڵتان دورانی یەکێک لە بەرچاوترین ڕووداوەکانی مێژووی ئەم ڕۆژگارەیە. بەسەرهاتی ئەم پیاوە هەروەک «وەزیری» لە مێژوو و مەسەلەی حکوومەت بە سەر شاری کرماندا گێڕاوییەتەوە و نامی و غەففاری و ڕووداونووسی بەندەری گێمبروونیش ئۆبالیان بۆ کێشاوە، ڕووی داوە. ئێمە دەمانەوێ خۆمان لەو ئەفسانە خەیاڵاتییانە بپارێزین کە تێکەڵی گێڕانەوەی سەرەتای سەرکەوتنەکانی و مێژووی کرمان بووە. وەک وەزیری نووسیویەتی تەقیخان لە سەرەتاوە کابرایەکی ڕەژیفرۆش و هەژار بوو کە هەمیشە بە باران ڕەژی لە گوندی «دوران»ی نشیمەنگای لە چیاکانی بنارەوە بە گوێدرێژ دێنایە شار. ئەم گوندە کەوتۆتە١٢فرسەخی باکووری کرمان[29]. تەقی وێڕای هێنانی بار بۆ شار جاروبارەش ڕاوی دەکرد. لەو هاتوچۆیانەدا سەفەرێکیان مەڕەکێوییەکی گەورە دەکوژێ و بە ئومێدی وەرگرتنی خەڵاتێک هەر کە دەگاتە شار دەیباتە کۆشکی حاکم و دەیداتە دەس غولامانی خودامرادخان. بە دابێ جاران نێچیرەکە دەکەنە شێوی شەو، بەڵام هیچ خەڵاتێک نادەن بە تەقی. ناوبراو بە گرژی دەگەڕێتەوە و هەر دەگاتە بەر دەرگا، یەساوڵان و نیگابانان کە دیبوویان دیاری بردۆتە ژوور، ڕێی پێدەگرن و داوای بەشە خەڵاتی لێدەکەن کە باو بووە کابرای خەڵاتکراو بیدا. یەساوڵان(٧) گوێیان نەدایە هاوار و لیللای کە دەیگوت هیچی وەرنەگرتووە و ئازاریان دا و دایانە بەر شەپ و مست. ئاخرییەکەی تفەنگەکەیان

28- GD XII, 16 April 1761.

٢٩ـ بڕوانن: فەرهەنگی جوغرافیایی سپا، بەرگی ٨، ل ١٥٠.

لێئەستاند و ناچار بوو کە بە مەبەستی پەیدا کردنی بەشـەخەڵات ڕەژییەکـەی بفرۆشێ و داواکەیان وەدی بێنێ.

بۆ سبەینێ وەختایەک کە خودامرادخان بە سواری هاتەدەر تەقی خـۆی بە سەر ڕکێفی کێشا و سکاڵای لە کردەوەی نالەباری پیاوەکانی کرد. لەبری وەی بـۆی تێهەڵـێنێتەوە و قـەرەبووی ئازارەکـانی بکاتـەوە فـەرمانی دا کـابرای چارەڕەشیان دووبارە کوتا و شاربەدەریان کرد. تەقی بـە هەسـتێکی بریـنداری دەس کەڵەزەڕی بە شەلەشەل چۆوە گوندەکەی خۆی و پاش ماوەیـەک تـاقمێکی چەکداری سێسەدکەسی لە نێو خزم و دۆستان و ڕێگرانی چیایی کۆکردەوە و لەپڕ بە یارمەتی ئەوان و بە شێوەیەکی پارتیزانی و نەهێنێ دەستی دایـە شـاڵاو بـۆ سەر پیاوەکانی خودامرادخان[٣٠].

هۆکاری سەرکەوتنی سووک و هاسانی ڕاپەڕینی ئەم تاقمە پارتیزانییـە بە سەر حاکمی پارێزگادا ئەمە بوو کە تەقی هەر خۆی بە ڕەژیفرۆشێکی سـاکار نیشان دەدا. غەففاری پێ لە سەر ئەم مەبەستە دادەگرێ کە تـەقی لـە سـەردەمی شاروخ‌خان‌دا مـاڵ و دەسـەڵاتێکی چـاکی پێکـەوە نـابوو. لـە نێـو نووسـراوە تەشـەراوییەکانی ڕۆسـتەموتتەواریخ‌دا لینگـە شـێعرێک وەبـەرچاوی دێ کـە دەریدەخا تەقی کابرایەک بووە ڕاوچی و ئەنگێوە و بڕوا بـەخۆ و جوامێرچەتـە. بۆیە لە نێو کرێکاران و کەرێزکەنانی کرمان‌دا زۆر بـەناوبانگ و قسەڕۆیشـتوو بووە و لە ڕاستی‌دا وەک نموونـەی بـەرچاوی «یـەعقووبی لـەیس» دانـدراوە. شۆڕشی تەقی بەرلەوەی دژکردەوەیـەکی تاکەکەسـی بـێ دژی خودامرادخـان و لەبەر بێبەشی لە قان و پشکی بـاوی ئـەو سـەردەمە ڕووی دابـێ، ڕاپـەڕینێکی کۆمەڵایەتی بووە دژی زۆرەملی و دەسەڵاتێکی نالەبار کـە حـازر نـەبوو دەرد و مەرد و تەنگەژەی داسەپیوی ئابووری ئەم پارێزگایـە لـە دەورانی حوکمـڕانی خۆی‌دا چارەسەر بکا.

هاوپەیمانێتی تەقی لەگەڵ ڕەشیدخان سەلمێنەری هەنگاوی غللوورانەن بە لانی تۆڵەکردنەوەدا. وەختایەکی ڕەشـیدخان هێزەکـانی خودامرادخـانی لـە

---

٣٠- وەزیری، ل ٣٢٢ ـ ٣٢٣. بە مەبەستی دۆزینەوەی جیاوازی گێڕانەوەکان سەبارەت بە مێژینەی تەقی و ئەو سووکایەتییانەی خودامرادخـان بـە سـەری هێنـابوو، بڕوانـە: گولشەنی مراد، ل ٧٥ و ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٧٥.

دەرموەی شاری مەشیز خافلاندبوو، ئەو دەستی برد بۆ مەترسییەکی گەورە و لەگەڵ پەنجا شەڕکەر لە شەوی یەکەمی ڕەمەزانی ساڵی ۱۱۷٤ی کۆچی / ۲٥ ـ ۲٦ی مارسی ۱۷٦۱ی زایینیدا، لە شوورەی شاری بێخەیاڵی کرمان سەرکەوت. کە تاو هەڵات تەقی و هاوڕێیانی دەستیان بە سەر قەڵا و شوورەی شارا داگرت و دابەزینە سەر تاقمۆکەی بێخەبەری کۆشکی حوکمڕانی. خودامرادخان بەڕووتی لە جێیە دەرپەڕی و کاتێک خۆی هاویشتە سەرپشتی ئەسپێک بە تیرێک ئەنگوا و پاشان لەتوپەتیان کرد. پیاوان و هاوکارانی لە سەرانسەری شارا بە دەس ڕاپەڕیوانی ڕقهەستاو گیران و لە ماوەیەکی زۆر کورتا تەواوی ناوچەیان کەوتە ژێر دەست. حکوومەتی خودامرادخان تەنیا چوار مانگی درێژە کێشا[۳۱].

سەرکەوتنی تەقیبەگ «ڕووبینهوود»ی سەرهەڵداوی کرمان و خەباتی دژی دیکتاتۆرێتی داسەپیو ڕوخساری گەلخوازانەی پتر درەوشاندەوە و ماوەیەک دواتر بە دەس بەسەراگرتنی ماڵ و سامانی ئەوانەی لە ژێر سێبەری دەسەڵاتی پێشوودا دەوڵەمەند ببوون، نیشانی دا کە لایەنگری چینی چەوساوە و بێدەسەڵاتە و خۆی بە شەریکی دەرد و کوێرەوەری ئەوان دەزانێ.

پاش ماوەیەک لەشکرێکی تەیاری هەزارکەسی پێکهێنا و خەڵکی شار کە دووجار دژی شاروخخان و خودامرادخان ڕاپەڕیبوون، پشتیوانییان لێدەکرد. ئەحمەدسوڵتانی براشی کردە «ساحێبئیختیار» یان داروغەی کرمان[۳۲] و «میرزا حوسێن»ی کەلانتەری پێشووی کردە حوکمداری شار[۳۳] و خۆشی بوو بە سەرداری پارێزگا و لەودەمیڕا بە تەقیخانی دورانی ناودێر کرا. شاری «بەم» و خاکی سیستان کە شاروخ پێشتر داگیری کردبوون هێنانییە ژێر دەستی خۆی و بە یارمەتی هۆز و تایفەکانی سیستان سپایەکی

۳۱ـ گیتیگوشا، ل ۱۱۸؛ وەزیری، ل ۳۲۳:.GD VII, 16 April 1761 ; Saldanha, 146 ڕاپۆرتەکانی گێمبروون ڕێکەوتی ئەم ڕووداوەی بە یەکەمی ڕەمەزان (٦ی ئاوریل) داناوە.

۳۲ـ وەزیری، ل ۳۲۳. GD XII, 15 June 1761 ڕەنگە ئەم پلەیە بەرپرسایەتی تەناهی شار و سەرۆکایەتی سەربازگەی لە ئەستۆ بووبێ.

۳۳ـ GD XII, 27 April 1761. لێرەدا نووسراوە میرزا حەسەن، بەڵام وەزیری، ل ۳۲۱ و نامی، ل ۱٥۲ بە میرزا حوسێن ناویان هێناوە.

یەکگرتووی پێکهێنا[٣٤]. نیزیک ساڵێک پاش گرتنی شار و بە دەستەوە گرتنی جڵەوی کاران میرزا حوسێنی لە سەر حکوومەت لابرد یان وەک گوتوویانە دژی وی ڕاپەڕی و تەواوی دەسەڵاتی حکوومەت و لەشکری خستە ژێر چنگی خۆی. گەرچی بەڕاستی کرمان بۆ خاتری ئازادی خەباتی کردبوو، بەڵام بەرەبەرە بەرەو پاشاگەردانی نێو شار و دابەزینی باری ئابووری تلی دا[٣٥]. لە بنەبانی ساڵی ١٧٦١دا، هەواڵ هات کە نەسیرخانی لاری بە فەرمانی کەریمخان ئامادەی هێرشە بۆ سەر کرمان، بەڵام بەڵگەیەکی وا کە ئەم بانگەشەیە بسەلمێنێ وە دەس نەهات[٣٦]. تەقەلای وەکیل بۆ گرتنی کرمان هەژدە مانگ پاش مەرگی خودامرادخان لە ئاگۆستی ١٧٦٢دا خۆی نواند. تەقیخانی بافقی حوکمڕانی پێشوو و ئابڕوودۆڕاو و لاوازکراوی یەزد کە وێڕای سپای زەند چووبووە تاران، چەند جاران وەکیلی هان دا تا بە مەبەستی نیشاندانی دۆستایەتی بێگەردی مەودای فیداکاری بدەنێ با بەختی خۆی لە تێکهەڵچوون لەگەڵ هاوناوە کرمانییەکەی بەتاقی بکاتەوە. ئەگەرچی کەریمخان فریوی زۆربڵەیی ئەو کابرا ترسەنۆکەی نەدەخوارد، بەڵام سەرەنجام ڕەزامەندی لە سەر داواکەی دەربڕی و لەشکرێکی پێنجشەش هەزار کەسی لە چەکدارانی ئێلجاڕی نائین و کووهپایە و ئەردستان و یەزد کۆکردەوە. لەگەڵ جەماوەر و شکۆ و پەیمان و بەڵێنییەکی ئەوتۆ بەرەو یەزد و بافق کەوتەڕێ. وەختایەک گەیشتە نیزیک کرمان سپایەکی سێهەزار کەسی بە سەرکردایەتی محەممەدڕەزابەگی زەنگەنە و ئادینەسوڵتانی فەیلی تێکەڵی بوون.

تەقیخان ژمارەیەکی چەکداری پیادە و چەنسەد تفەنگچییەکی لە نێو خەت و کووزی کەرێزەداروخاوەکانی تاجئاباد لە باشووری زەرەند دامەزراندبوو[٣٧]. سوارەکانی محەممەدڕەزابەگی زەنگەنە کە بێپارێز و بە چوارناڵە پەلاماری ئەو قۆڵەیان دابوو کەمێک دواتر لەبەر تەقەی

34- GD XII, 15 June 1761.

35- GD XII, 1 October 1761 ; XIII, 10 December 1761.

36- GD XIII, 24 December 1761.

٣٧ـ بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی ٨، ل ٨١، چاپی یەکەم.

چەکدارانی ماتەهەڵگرتووی کۆنەکەریزان گلین و کاتێکی لەبەر تێکهاویشتن و سەرشێوان ورەیان دابەزی، شەڕکەرانی پیادە هەڵیانکردنێ. بەم ڕووداوە پێشەنگانی لەشکری زەند گەڕانەوە دوا و ئەوانی تریشیان بە ترسی ناوەختیان تۆقاند. تەقیخانی بافقی وەک لەشکری شکستە پەنای بردە کۆنەقەڵایەکی کاول لە هەشت فرسەخی ئەولاتری شوێنی شەڕەکە وەختایەکی پێیزانی دوژمن نەکەوتۆتە شوێنی کەوتەڕێ و بە کیسهێنان لە تاریکایی شەو خۆی گەیاندە یەزد[38].
سەرەڕای ئەو خوێڕییەتی و ئابڕووتکانەی کە بەدیهێنابوو فەرمانی دا لە شاری یەزد کۆڕێکی جێژنیان پێکهێنا و لەبەر وەی بە سلامەت لە بەرەی شەڕ گەڕاوەتەوە ڕێوڕەسمی شوکرانەبژێری بەجێهێنا. بەم بۆنەوە سەرکەوتننامەیەکی بلاو کردەوە و بانگەشەی ئەوەی کرد سەرکەوتووی ڕاستەقینەی شەڕ ئەوە کە توانیویەتی چەکدارەکانی بێ خەسار و کوشتە و زامار بگەیەنێتە یەزد. دەڵێن وەختایەک کەریمخان ئەو قسەیەی بیستەوە قاقا پێکەنی و گوتی ئەم ڕووحییەتە دەگەڕێتەوە سەر سرشت و تەبیاتی شارنشینی[39].

گۆیا پاش گێڕانەوەی دووبارەی ئیسفەهان لە بەهاریساڵی ١٧٦٤دا کەریمخان بۆ جاری سێهەم هەوڵی بەزاندنی کرمانی دا. ئەم لەشکرە شەشهەزار کەسییەی تۆپخانەشی لە پشت بوو بە سەرکردایەتی

٣٨ـ گوڵشەنی مراد، ل ٧٦ ـ ٧٧؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٤١ ـ ٤٢؛ وەزیری، ل ٣٢٥ ـ ٣٢٦؛ GD XIII, 4 September 1762 دەنووسێ کە تەواوی تێکهەڵچوونەکان شەو و ڕۆژێکی کێشاوە. لەو شەوەدا ئەوەندەی چوار فرسەخێک مابوو تا سەر هێزەکانی دوژمن، ئەو چەکدارانەی دەگەڵ خۆی برد، وێدەچوو شەوگورزێکیان لێبوەشێنێ، کەچی بەغار ڕایکرد. جگە لە نامی وەزیریش هەروای گێڕاوەتەوە بەڵام ئەم ڕووداوە بە پاش لەشکرکردنی ئەمینخانی گەڕووسی و ئەمیرگۆنەخان دەزانێ واتە زەمانێکی کە وەکیل لە شیراز بووە. بەڵام ڕاپۆرتی گێمبروون بە دووروودرێژی ئۆباڵ بۆ نووسراوەکەی غەففاری دەکێشێ.

٣٩ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ١٤٢: جەماوەری شارەکی ئاوان؛ وەزیری، ل ٣٢٦.

هاوبەشی محەممەدئەمین‌خانی گەرووسی و ئەمیرگۆنەخانی ئەفشاری تارومی وەڕێکەوت[40]. ئەم دوو سەرکردەیە پاش دەرکەوتن لە ئیسفەهان تێگەیشتن کە هەڵکردنیان پێکەوە دژوارە و هەرکام ئازایانە تێدەکۆشان کە فەرمانڕەوایی بگرنە ئەستۆ. محەممەدئەمین‌خان، ئەمیرگۆنەخانی تۆمەتبار کرد کە خەڵکی شاری ڕەفسەنجانی سەرڕێگای تەواو داڕووتاندووە و تەنانەت بەر لە گەیشتنە کرمان نێوانیان وا گرژ بوو کە سەرلک و سەرپەلانی ئەفشار و گەرووسی لێکترازان و هێندەی نەمابوو دەگژ یەک ڕاچن. هەردوو داوایان لە وەکیل کرد پێڕابگا. ئەو کەیخودایەی لە لایەن کەریم‌خانەوە نێردرابوو، ئەمین‌خانی بەحەق زانی و ئەمیرگۆنەخان بە شەرمەزاری بانگ‌کرایەوە. خانی ئەفشار خۆی خستە داوێنی بەزەیی سادق‌خان و ناوبراویش وەختایەک وەکیل گەڕایەوە شار سەرکەوتووانە تکای بۆکرد و ژیانی ڕزگار کرد[41]. بەگوێرەی نووسراوەکەی غەففاری سەردارانی ڕەقیب پاش چوار ڕۆژ پێکەوە گەیشتنە کرمان و لە سێبەری شەوا چەکدارانی تەقی‌خان لە ناخافڵ پەلاماریان دان و سەرەنجام ئەمیرگۆنەخان بە ڕاکردوویی گەڕایەوە شیراز[42]. بە دڵنیایی هیچکام لەو دوو کەسە پسپۆڕی کاروباری لەشکری نەبوون و تەنیا شانس و فرتوفێڵی محەممەدئەمین‌خان نەک سەرکردایەتی ورد و باریک وای کرد کە بە تەنیایی شاری کرمان بگرێ. لەم کاتەدا تەقی‌خان لە کرمانەوە چووبۆوە دوران هەتا تفەنگداری تازەپشوو کۆکاتەوە و ئاژاوەیەکی کە لەو ناوچەیە سەری‌هەڵدابوو دایمرکێنێ. بۆیە کرمانی دایە دەس ئەحمەدسوڵتانی برای.

٤٠ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٣٨؛ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ١١٨ ـ ١١٩. ئەم ڕێکەوتە کەم و زۆر لەگەڵ گێرانەوەی نامی یەکتر دەخوێنێتەوە. غەففاری ئەم پەلامارە دەباتە ساڵی ١٧٦٥. بەڵام لە بەهار و هاوینی ئەو ساڵەدا ئەمیرگۆنەخان گەمارۆی بەندەر «ڕیگ»ی دابوو (لاپەڕە ١٨ی کتێبی نیبوور).

٤١ـ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ١٣٦ ـ ١٣٧؛ وەزیری، ل ٢٣٤.

٤٢ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٤٣.

محەممەدئەمینخان کە سیخوڕان لە نێو شارەوە ئەم ڕاپۆرتەیان بۆناردبوو، بەهەشتاو کەوتەڕێ و بەر لەوەی تەقیخان لە دورانەوە بگەڕێتەوە گەیشتە پای دیواری شار. سەربزێوانی شار لەڕێوە ئەحمەدسولتانیان بەزاند. گەلێک تاقم و دەستەی شارەکی پشتیوانی ڕاپەڕیوان بوون و گەمارۆدەران بێ هیچ بەرهەلستێک پێیان نایە شار[٤٣].

## ٨ ـ ٤ گەڕانەوە و ڕووخانی دەسەلاتی تەقیخانی دورانی

سەرکەوتنی محەممەدئەمینخان تەنیا دوو مانگی پێچوو. لە درێژەی ئەم ماوەیەدا بەئاشکرا توانایی پەلهاویشتن و برشتی دەسەلاتی لە قەراغ شاریشدا نەبوو. تەقیخان بەئارامی چەکدارانی دورانی(٨) کۆ کردەوە و هێرشێکی وەک ئەوەی جۆکی بە کرمان داهێنابوو دەسپێکرد: بەرەبەیانی شەڕکەران لە دیواران وەسەر کەوتن و چەند کلاوقووچەی دەوری شوورانیان گرت و بە سەربانانذا خێراْیەکی دابەزین. لێرە هەستی پێکرد وا دیارە بەشێک لە خەلکی کرمان ئێستاش بۆ گرتنەوەی شار پشتیوانی لێدەکەن. محەممەدئەمینخان پیاوەکانی ناردە بەربەرەکانی، بەلام بێئەوەی زەبرێک لە دوژمن بوەشێنن پاشەکشەیان کرد. ناوبراو بێگومان چارەنووسی خودامرادخانی هێنایەوە بیر و بە پەلە بارگەوبنەی کۆ کردەوە و لەگەل پاشماوەی سپاکەی لە کرمان ڕایکرد[٤٤].

کەریمخان هێشتا خۆی سەرقالی شەڕ و بەزاندن و سەرپێنەوی کردنی ناوچە و مەلبەنەکانی سەر ڕێیەی بوو لە ئێرانی ڕۆژاوایی‌دا. پاش ئەو گشتە تێبینییە بە مەبەستی ناردنەوەی سپایەکی ئەوتۆ کە بتوانێ کارساز بێ وای بە باش زانی دیسانیش محەممەدئەمینخان سەرەڕای لێنەوەشاوەیی ببوورێ و بیکاتەوە سەرکردەی سپا هەتا سەرلەنوێ درێژە بدا بە هەولەکانی و خۆشی پشتی گرت و هێزی دایە. ڕەنگە ئەم هەنگاوە لە بەهاری ١٧٦٥دا هاویژرابێ. ئێستا دەتگوت کە بەخت تەواو ڕووی لە محەممەدئەمینخان وەرگێڕابوو. لە شەڕ و

---

٤٣ـ گولشەنی مراد، ل ١٤٣؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٤٠.

٤٤ـ گولشەنی مراد، ل ١٤٣؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٤٠ ـ ١٤١.

تێکهەڵچوونێکی نیزیک کرمان خۆی پێ لەبەر تەقیخان ڕانەگیرا و پەنای بردە بەر هەرەسەڕووخاوی قەڵایەک. لەم شوێنە بە هۆی پەلاماری دواتر تێکشکا و بۆ جاری دووهەم گەڕایەوە شیراز[٤٥].

بۆ کەڕەتی پێنجەم ئەوەی کە وا وەک شانۆیەکی بێکۆتایی خۆی دەنواند، وەکیل کۆنەسەرکردەیەکی ناسراو بە عەلیخانی شاسەیوانی بەخۆی و دەهەزار چەکدار و یەکەیەکی تۆپخانەوە ناردە کرمان. عەلیخان زۆر بەپارێزەوە دەبزووت و لە تەواوی ڕێوبانان هێمنایەتی و تەناهی سەقامگیر کرد. تەقیخان لە کرمانەوە دەرکەوت و لە سێمزڵی ئەو شارە بەرەورووی بۆوە. هەر لە یەکەم تێکهەڵچوونا ڕاپەڕیوانی سامناک تێکشکان و گەڕانەوە کرمان. عەلیخان هەتا نیزیک دیواری کرمان پێشڕەوی کرد و گەمارۆی ڕێکوپێکی شاری لە گەڕانگەڕ و خانووەکانی نێو باغی شاروخخان دەسپێکرد. سێ ڕۆژ دواتر تەقیخان لە نێو شارەوە هەڵمەتێکی گەڵاڵە کرد و وەک پێشوو چەکدارەکانی لە بەرەیەکی کۆنەکەرێزان دامەزراند هەتا سوارەی دوژمن تێکهەڵگلێنێ. عەلیخان لە نەخشەکەی حاڵی بوو، بە دەسکردنەوەی توندوتۆڵ و پڕ جموجۆڵی چەکداران و سوارانی هەتا پای دیوار ڕاپێچی دان و ئەوەندەی کوشتە و زامار خستنە سەر دەستی کە تا دوومانگی دیکەش نەیانتوانی لەو شارەوە ئاسۆگ بدەن. ئەگەرچی تەقیخان هەوڵی دا فرتوفێڵی ئەوتۆ بنێتە کایەوە بەڵام وەک جاری پێشوو شکا. لەم کاتەدا عەلیخان کە کەوتبووە ڕیزی پێشەنگی هێرشبەران لە ماوەیەکی کورتا خۆی لە مابەینی دەسڕێژی گەمارۆدراوان و سپاکەیدا دیتەوە و بە فیشەکی تفەنگدارێکی قەڵاقووچکان کوژرا. براکەشی وەک خۆی لە شەڕی دەزانی و بەر لەوەی هێزەکانی بکەونە گازی تەقیخان خڕیهەڵدانەوە و چونکە چی دیکەی بۆ نەدەکرا بە ئارامی گەڕایەوە شیراز[٤٦].

کێشەی نەمانی یەکێک لە باشترین سەردارانی زەند کەوتە سەر تەواوی شکستەکانی پێشوو و وەکیل زوری پێ سەرشکستە بوو. بێگومان ئەم حیکایەتەش وەک ڕووداوەکانی تر لە هەموو جێیەک بڵاو بۆوە کە تەقیخانی ڕاوچی گۆڕین بۆخۆی لە کلاوقووچکەی «مەلاقوڵی»یەوە لە نیزیک دەروازەی

٤٥ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٤٥ ـ ١٤٦.

٤٦ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٤٦ ـ ١٤٧؛ گیتیگوشا، ل ١٤٣؛ وەزیری، ل ٣٢٧.

مزگەوت، عەلیخانی ئەنگاوتووە و مەودای تیرهاوێژ و کوژراو ۱۵۰۰هەنگاوێک و ڕەنگە پتریش بووبێ. ئەفسانەکە وای تەنییەوە کە دوو پیاوی سەنعەتکاری کرمانی بە ناوی قوڵی تفەنگساز و قوڵی باڕووتسازیشی گرتەوە. دەیانگوت کە تەقیخان ئەم دوو کەسەی بە نرخێکی گران بۆ خزمەتی خۆی بە مەختە گرتووە و باسەکە تێکەڵی خورافات بوو و گوتیان ئەم دووە باشترین تفەنگ و باڕووت ساز دەکەن[47]. تەقیخان ببوو بە قارەمانێکی گەلی و لە شکاننەهاتوو کە کەریمخانێکی خۆی بە دەمراست و وەکیلی هەموو ئێرانی ڕۆژاوایی دەزانێ، کردوویەتە گاڵتەجاڕ.هێزەکانی عەلیخان ئەمجارەیان بە سەرکردایەتی نەزەرعەلیخان بە مەبەستی تەقەلایەکی دووبارە نێردران و دوابەدوایان بەستامخان و محەممەدعەلیخانی زەند بزووتن. نەزەرعەلیخان وەک عەلیخانی شاسەیوان دەیویست لە پێشدا هێمنایەتی و تەناهی ڕێوبانەکانی بەرەو کرمان دابین بکا و پاشان دەستی کرد بە ڕوونکردنەوەی خەڵک و ڕاکێشانی سەرنج و بیروڕای جەماوەری پارێزگا و خودی شار و بەڵێنی دا بێتوو دەس لە بەربەرەکانی هەڵگرن لێبووردنی گشتی ڕابگەیێنێ و دەزگایەکی ئیداری شیاو و دادپەروەر دامەزرێنێ. تەقیخان تا ئێستا نیشانی دابوو بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆی لە تەواوی حوکمڕانانی پێشوو تێکۆشەرترە، بۆیە لە کرماندا مەکۆیەکی ناڕەزامەندان پێکهاتبوو کە تا ئەو زەمانە غیرەتی خۆنواندنیان نەبوو. لە سیرجان سەرداری زەند هێزەکانی بۆ شەڕ تەیار کرد. بەڵام هەتا یەک فرسەخی باشووری شار کە دامەزران و دەستیان کرد بە سەنگەربەندی هیچ جموجۆڵێک وەبەرچاو نەهات، چونکە تەقیخان ئاقڵانە بیری کردبۆوە کە شاڵاوێک بە دابی پێشوو لە نێو شارەوەڕا زۆر مەترسیدار دەبێ. گەمارۆ بۆ ماوەی سێچوار مانگ و وێدەچێ کە تا سەرەتای بەهاری ساڵی ۱۷٦٦ درێژەی کێشابێ. لەم ماوەیەدا شار بەرەوڕووی کەم بوونی کەلوپەل و خوردوخۆراک بووە و ناڕەزامەندی گشتی پەلوپۆی هاویشت[48].

---

٤٧ـ وەزیری، ل ۳۲۷؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ۳۷۷.

٤٨ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٤٨؛ وەزیری، ل ۳۲۸؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱٥۰. نامی ئاشکرای دەکا کە تەقیخان هەموو ڕۆژێک لە شارەوەڕا هەڵمەتی بردووە، بەڵام وەزیری دەڵی کە جووڵەی پێنەکراوە.

پێلانێک دارڕژا تا کۆتایی بەم بارودۆخە مەینەتبار و تاقەتپرووکێنە بێنێ. لە چەند دیدارێکی نەهێنیدا قەرار کرا نەزەرعەلیخان ژمارەیەک چاوەدێر بۆ خەفتان لە دەروازەکانی شار دابنێ هەتا نەهێڵن بە هیچ ڕێ و ڕەوگەیەکدا دەرباز بێ. دەبووا لە ڕۆژێکی دیاریکراوا لە نێو شارەوە پەلامار بدرێ. بێشک تەقی دورانی هەم لە لایەن جەماوەری شارەکی کە ڕۆژایەک بناغەدانەری حکوومەتەکەی بوون و هەم لە لایەن پیاوەکانی خۆیەوە بۆ وێنە چەکدارانی دورانی لە مەترسیدا بوو. سەرەنجام دەروازەی گەبری(۹) لە لای باکووری شار بۆ هێزەکانی زەند خرایە سەر پشت. تەقیخان کە تێگەیبوو تازە لە کرمان جێی پێلێژ بووە و ڕۆژگاری بەسەرچووە، دەیەویست هەڵێ. بەلام هەر کە لە دەروازەیەکەوە ویستی دەرکەوێ پیاوەکانی خۆی پێشیان گرت و سەربازگەی قەلاش تەقەیان لێکرد و نەیانهێشت پێ بنێتە وێندەرێ. ئاخرییەکەی شەڕکەرانی مەشیزی گرتیان و خستیانە نێو زنجیرەوە. مەشیزییەکان کە ببوونە هۆی ڕاپەڕینی دژی تەقیخان بردیانە خزمەت نەزەرعەلیخان و ئەویش کابرای دیلی لەگەڵ چەند زێرەوانێک ناردە شیراز. لە نەورۆزی ساڵی ۱۱۷۹ی کۆچی / ۱۷٦٦ی زایینیدا لە شاری شیراز هێندەیان جرپاوفرپیا دا تا مرد و بە قەولێکی خنکاندیان[٤٩].

ڕۆستەموتتەواریخ وێڕای هێنانی بابەتێکی تایبەت سەبارەت بە کۆتایی ژیانی پیاوێکی ئازای بە بنەچەکە هەژار و وەدەسهێنانی دەسەلاتێکی ئەفسانەیی کە توانی بۆ ماوەی پێنج ساڵان کرمان لە بەرامبەر تواناترین هێزەکانی ئێرانا ڕابگرێ ئاوای نووسیوە:

کەریمخان فەرمانی دا پەتێکیان خستە ئەستۆی و هەر سەرەی پەتەکە بە دەس کەسێکەوە بوو و دەیکێشا هەتا بیخنکێنن، تەقیخان هەردک لای پەتەکەی گرت و بە هەموو دەمای خۆی تەنافەکەی وا کێشا کە ئەو دوو کەسەی ترازاند و تلاندنی و سەرەنجام بیست کەسێک چوونە یاریدەی پیاوەکان و تێوەرووکان، بەلام دیسانیش دروەستی نەهاتن. ئاخرییەکەی تەواوی نۆکەران و غولامانی

---

٤٩ــ گوڵشەنی مراد، ل ۱٤۰ ــ ۱٥۰؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱٥۱ ــ ۱٥۲؛ وەزیری، ل ۳۲۸؛ تەفرەشی، ل ۲۱٦. نامی پێدادەگرێ کە تەقیخانیان لە شارەوە نارده دەر تا خۆی بە دەستەوە بدا و داخوازی وتوویێژ بکا لەگەڵ نەزەرعەلیخان.

کۆشک داوەرین و بە پەتپەتێنێکی سێلایەنەی گاڵتەجارپیانە تەنافێکی تریشیان خستە گەردنی و خنکاندیان[٥٠].

## ٨ ـ ٥ کرمان لە سەردەمی دەسەڵاتی زەندیەدا

نەزەرعەلیخان گەڕایەوە شیراز و بەستامخانی زەندی بەخۆی و پێنسەد چەکدارێکەوە وەکوو حوکمڕانی لەشکری بەجێهێشت و دەسەڵاتی حاکمی ناوچەشی هەتا زەمانێکی بەڕەسمی حوکمی دەگاتە دەس خستە سەرشانی. وا وێدەچێ کە بەستامخان هیچ کارێکی بە مەبەستی ڕاکێشانی سەرنج و باوەڕی کرمانییەکان نەکردبێ. ئەو سکاڵایانەی سەبارەت بە زوڵم و غەدرەکانی دەگەیشتنە شیراز بوونە هۆی بانگکرانەوە و لە کار لادرانی و میرزا حوسێنی ڕاینی لە جێی داندرا. میرزا حوسێن هەر ئەو کەسەیە کە لە ڕابردوودا کەلانتەری شاری کرمان بوو و تەقیخان سەرەتای کار حکوومەتی دایە دەست و پاشان لێیخست. ئاغاعەلی سیرجانیش بە وەرگرتنی نازناوی خان کە وا دیارە پێشباری هەڵبژێرانی بوو وەک سەرداری کرمان، لەگەڵی کەوتەڕێ تا پێکەوە پارێزگا (ئەیالەت)ی کرمان بەڕێوەبەرن. هەنگاوێکی دیکەی کەریمخان هەڵگرتن و بەخشینی باجب ساڵیانە بوو لە سەر خەڵکی کرمان هەتا بتوانن زەرەد و خەساری تاڵان و برۆی پێنجساڵی ڕابردوو قەرەبوو بکەنەوە[٥١]. بەدبەختانە دوو سەرکردەی هەڵبژێراو کە نەیانتوانیبوو لە محەممەدئەمینخان و ئەمیرگۆنەخان چاکتر یاریدەی یەکتر بدەن، هەر لە سەرەتای کارەوە لە سەر جەغزی دەسەڵاتیان کەوتنە مشتومڕ. لە ئاکامدا پارێزگای کرمان بەگوێرەی هەل و هەڵکەوتی جوغرافیایی بوو بە دوو کوت: بەشی باکووری کە برێتی بوو لە شاری کرمان(گواشیر)، خەبیس(١٠) ـ کە ئێستا پێیدەگوترێ شەهداد ـ بەم، نەرماشیر (١١)، ڕاین(١٢)، ڕاوەر(١٣)، زەرەند، ڕەفسەنجان، ئەنار(١٤) و بەردەسیر وەبەر میرزاحوسێنخان کەوت و لای باشوور کە دەبوو بە بابەک، سیرجان،

---

٥٠ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٧٧.

٥١ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٥٢ ـ ١٥٣؛ وەزیری، ل ٣٢٩ ـ ٣٣٠.

ئەقتاع(١٥)، ئوورزوونیە(١٦)، کۆشک(١٧)، سەوغان(١٨) و ئیسفەندەقە(١٩) کەوتە ژێر دەستی عەلی سیرجانی کە ئێستا ببوو بە سەرداری کرمان. هەردووکیان بە رادەی پێویست باج و پیتاکیان دەنارد بۆ شیراز، بەڵام دەزگای بەڕێوەبەرایەتی و ئیداری عەلیخان شیاوتر و چالاکتر بوو لە ڕێکخستنی ڕکەبەرەکەی. ئەویش زیاتر لەبەروەی بوو کە برا لێوەشاوەکانی واتە محەممەدڕەزاخان و شاحوسێنخان مەڵبەندی بابەک، عەقدا، ئوورزوونیە و کۆشکیان بۆ دەبرد بەڕێوە و خۆی تەنیا لە سیرجانی زێدی بنەی خستبوو. میرزا حوسێنخانی کەمشانس لە کرمان خزم و کەسێکی وای نەبوو و بە لای زۆریدا خەریکی هەسدانەوەی کارگێرانی بوو کە بریتی بوون لە مورتەزاقولیخان(یەکێک لە کوڕانی شاروخخان) لە زەرەند و عەلیقولیخان لە کووەبونان(٢٠) و محەممەدحوسێنخان لە بەم[٥٢].

چووپار کە تا کرمان تەنیا سی کیلۆمیتری مابەینە، کەوتە ژێر فەرمانی محەممەدعەلی و مورتەزاقولیخان، دوو کەس لە کوڕانی عەلینەقیبەگ(٢١). وەختایەکی بەستامخانی زەند حکوومەتی کرمانی لە ئەستۆ بوو کچی عەلینەقیبەگی خواستبوو. ئەم دوو برایە کاتێک هەستیان بە کەمدەسەڵاتی میرزاحوسێنخانی ڕاینی کرد، دەستیان دایە شاڵاو بۆ نێو جەرگەی پارێزگا و تەنانەت جارێکیان لە کۆشکی سەرۆکایەتی خۆی کوتایان و ماڵیان تالان کرد. سەرەنجام چۆنیەتی خراپەکارییەکانی بۆ شیراز کردنە ڕاپۆرت. محەممەدزاهیرخانی بەختیاری بە سەرکردایەتی هێزێک نێردرایە کرمان. بە خۆتێوەردان و کەیخودایەتی بەستامخانی مێردەخوشکیان و بە بیانووی ئەوەی کە بۆ دیداری ناوبراو لە شیراز دەچنە خزمەتی، لە چووپار دەربازبوون و بەرواڵەت سەریان دانەواند. هەروا بێتەوە زاهیرخان سێکەس لە یارانی میرزاحوسێنخان و چەند کەسێک لە جەماوەری قسەڕۆیشتووی وێندەرێی بەم بۆنەوە کە خەڵک سکاڵای لێیانە، بردنی بۆ شیراز. تەواوی کاربەدەستانی دەسەڵاتدارێتی شیراز لە بارگای کەریمخان سزا دران و ئاخرییەکەشی بەم و نەرماشیر درانە دەس محەممەدحوسێنخان و ئەمیربەگی سیستانی و زەرەند و کووەبونان درایە مورتەزاقولیخان هەتا سەربەخۆ و دابڕاو لە حوکمڕانێتی

---

٥٢ــ وەزیری، ل ٣٣٠.

کرمان حکوومەت بکەن و پیتاکی خۆیان ڕاستەوخۆ بنێرنە شیراز. شاری کرمان و دەوروبەریشی کەوتە ژێر دەسەڵاتی کەلانتەر ئاغاتەقی کە لە بنەماڵەی کۆنی کەلانتەرەکانی کرمان بوو[٥٣]. شاروخخان باوکی ناوبراوی لەبەر تێکەڵاوی و وەفاداری سەبارەت بە وەکیل کوشتبوو(۲۲). میرزا حوسێنخان تەنیا توانی سیرجان، عەقدا، کۆشک و ئووزووئیە بپارێزێ[٥٤].

## ۸ ـ ٦ سەید ئەبولحەسەن

سەبارەت بەو ڕۆژگارەی کە ئەم ئاڵوگۆڕانەیان تێدا قەومابوو یان لە بابەت حاکمێکی کە پاش ئەو قۆناخە داندرایە سەر دەسەڵات، هیچ شتێک نەنووسراوە. وا دیارە کە ئەم دابەشینەی پارێزگای کرمان ڕووداوێکی تێژتێپەڕ بووە و هێندەی پێنەچووە کە سەید ئەبولحەسەنی عەلیشای محەللی کوهەکی لە لایەن دەرباری شیرازەوە کراوەتە حوکمڕانی سەرانسەری پارێزگا[٥٥].

سەید ئەبولحەسەن یەکێک لە بەرەی باپیرانی ڕاستەوخۆی ئاقاخانە. ناوبراو لە خانەدانی سەیدەکانی ئیسماعیلی نزاری و ماوەیەکی زۆر لە ئەنجەدان(۲۳) ژیاوە و بەر لەویش بنەماڵەکەی دانیشتووی قوم بووە[٥٦]. هەر چۆنێک بێ ئاژاوە و هەرای بۆشایی دەسەڵاتی پاش کوژرانی نادر دارایی و میراتی بەتاڵان دابوون. ئەو ماڵ و سامانە بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام لە سەر پێوشوێنی وەرگرتنی پێنجیەک (خومس)ەوە کۆکرابۆوە کە لە لایەن پەیڕەوانی کۆمەڵی ئیسماعیلی هیند و دەوروبەری «جام» و «لەنگەر»ەوە دەنێردرا. لەم ڕۆژگارەدا هەر دراوێکی وەبەر دەستی دز و چەتەی سەر ڕێی کاروانەکانی یەزد و

---

٥٣ـ وەزیری، ل ۳۳۱.

٥٤ـ وەزیری، ل ۳۳۳.

٥٥ـ بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە گوندی کوهەک لە محەللات، بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی یەکەم، ل ۱۸۸ و بە مەبەستی ناسینی سەید، بڕواننە: کتێبی «ڕیجال»ی بامداد، بەرگی یەکەم، ل ۳۷ ـ ۳۸.

٥٦ـ بڕواننە: نەفیسی، ل ۳۹.

نائین نەدەکەوت لە لایەن کەلانتەران و کەیخوداکانی ناوچەیی بە ناوی «بارانە» و «ڕێدارانە» دەچلێپێندرا. هەر بویە سەید لە ئاخری حکوومەتی نادرشادا بەناچار ملی ڕێی شاری بابەکی گرتەبەر، چونکە لەم شارەدا هەلی لەبارتری بۆ پارێزەرانی ماڵ و سامانیان لە چنگ ئەم مفتەخۆرانە بۆ دەرەخسا. لەم ناوچەیەدا توانی کە خێر و سەدەقەی نێردراوی پەیرەوانی هیندی وەربگرێ و لە ئاکامدا دارایی و شوێن و پلەی پێهەلاچوو. هێندەی پێنەچوو کە زەوی‌وزارێکی زۆری کڕی و کەلوپەل و نێومالی پێویست و دەولەمەندانەی خستە سەریەک. لە باری پیاوچاکی و ڕەسەنایەتی ناوبانگێکی دەرکرد. پاش مەرگی نادر سەیدحەسەن ڕێبەری ئیسماعیلییە بۆ ڕابواردنی ڕۆژانی زستان چووە کرمان و مالەکەی شاری بابەکی کردە هاوینەهەوار. شاروخخان زۆری دەستی ڕێز لێدەنا و تەنانەت لوتفعەلی‌خانی کوڕی کردە زاوای سەید. ئەبولحەسەنی جێنشینی سەیدیش کەیخودایانی شار و دەرەبەگانی پارێزگا زۆریان ڕێز دەگرت و دەتگوت لە سایەی سەری ئەوەوە کرمان خەریکە بەرەو دۆزێکی هێمن هەنگاو بنێ و دانانی ئەویان وەک بەگلەربەگ بە هەلبژاردنێکی تەواو و بەڕێوجێ دەزانی[٥٧].

بۆیە پاش ئەوەی گەیشتە ئەم پلەیە میرزاحوسێن‌خان و مورتەزاقولی‌خان و حوکمڕانانی ناوچەیی تر بە ملکەچی مەلبەندەکانیان خستە ژێرڕکێفی. سەبارەت بە وردەکاری شێوەی بەڕێوەبەرایەتی حکوومەتەکەی هیچ شتێک نەنووسراوە. ڕەنگە پارێزگای بە یارمەتی خانەکانی ناوچەیی بەڕێوەبردبێ و برشت و دەسەلاتە مەعنەوییەکەی بە مەبەستی بەربەرچدانەوەی زولم و زور لەگەل هێزی لەشکری جێگۆڕکەی کردووە. لە هەلومەرجێکی تەواو لەباردا بە ڕێنوێنی دەولەتدارانی ڕاوێژکاری بواری حکوومەتی پارێزگای هەلدەسووڕاند. داهاتی تایبەتی وی کە هەموو سالێک لە هیندووستانەوە دەنێردرا و بڕی بیستهەزارتمەنێک دەبوو، ڕێی لە دزی و زێدەڕەوی کاربەدەستانی حکوومەت گرت. لە بارودۆخێکی ئاوا خەورەوێنا تا دواماوەی پاشایەتی کەریم‌خان بەزیرەکی حوکمڕانێتی ئەم پارێزگایەی کرد[٥٨].

---

٥٧- وەزیری، ل ٣٣٢ - ٣٣٣؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٧١.

٥٨- وەزیری، ل ٣٣٣ - ٣٣٤. لە سالی ١٢٠٥ی کۆچی / ١٧٩٠ی زایینی‌دا، سەید سەری وەبەر ئاغامحەممەدخان هێنا و وەختایەکی لوتفعەلی‌خان بەرەو کرمان پێشڕەوی کرد

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

۱ـ هێرش و شالاوی نەپساوە بۆ سەر ئیسفەهان و کرمان و ناوچەکانی دیکەی ئێراقی عەجەم ببوو بە هۆی قاتی و قڕی و هەژاری خەڵک. گوڵشەنی مراد لەم بارەوە دەنووسێ: ... ئەوانەی کە هەر تۆزێک دەیانتوانی بجووڵێنەوە هەر منالێکی بە ناخافڵ پێی لە ماڵەوە دەنایە دەر، دەیاندزی و دەیانبردە کاولاشان و دەیانکوشتەوە... .

۲ـ نارپ یەکێک لە گوندەکانی شارستانی سیرجانی پارێزگای کرمانە. مەزرایەک بە ناوی «ترشاو» کەوتۆتە نێوان نارپ و مەشیز... .

۳ـ ڕەزاقولیخان حاکمی زەرەند یەکێک لە ئامۆزاکانی شاروخخانی ئەفشار حوکمڕانی پێشووی کرمان بوو. سەردەمی دەسەڵاتی ناوبراو ئەو حوکمڕانی زەرەند بوو و لە زەمانی هێرشی نەسیرخانی لاریدا بە مەبەستی ڕزگاری شاروخخان چەند کارێکی کرد و هەنگاوی هەڵێنایەوە. لە دەورانی حکوومەتی سەید ئەبولحەسەنی ئیسماعیلیدا لەگەڵ هەزارسوارێک بە مەبەستی سەقامگیر کردنی هەلومەرجی کرمان و بلووچستان نێردرا. سەرەنجام عەلیمەردانخانی میرشکار لە قەڵای کۆشکدا سوڕی ون کرد.

٤ـ قەڵای گەراش کەتبۆوە سێفرسەخی ڕۆژاوای لار.

٥ـ لە مێژووی کرماندا میرزاتەقیخانی بەمی کوڕی سەیدعەلی، هاوچەرخی ئەبولحەسەنخانی ئیسماعیلی بووە... هەروابێتەوە پاش لێخرانی میرزاحوسێنخان و ئاغاعەلی شەماعی، ئاغاتەقی کەڵانتەر کە زاوای میرزا حوسێن و کوڕی میرزاعەلیڕەزا کەڵانتەری کوژراو بوو، کرایە کەڵانتەری کرمان.

٦ـ مەشیز کەوتۆتە نێوان کرمان، ڕەفسەنجان، کۆپەنج، بەم، جیرۆفت، بافت، پاریز، تەنگووئییە و چوارگونبەد... .

۷ـ خوالێخۆشبوو دێهخودا سەبارەت بە وشەی یەساوڵ دەنووسێ:

---

بەری پێگرت. سەید لە ساڵی ۱۲۰٦ یا ۱۲۰۷ی کۆچی / ۱۷۹۱ ـ ۱۷۹۲ی زایینی مرد. بڕوانە کتێبی ڕیجالی بامداد، بەرگی یەکەم، ل ۳۸.

یەساووڵ لە وشەی ترکی یەساوور وەرگیراوە. سوارێکە لە خزمەت ڕکێفی سەرداران و پیاوماقووڵاندا. هەموو کاربەدەستانی تەشریفاتی بارگا بەگشتی وایان پێدەگوترێ.

۸ ـ دوران کەوتۆتە ۷۵کیلۆمیتری باکووری کرمان.

۹ـ ڕێزدار پێری بە هەڵە بە «گیری» خوێندۆتەوە. دەروازەی گەبری دروستە کە کەوتۆتە شانبەشانی گەڕەکی زەردەشتییانی کرمان و لە باکووری شارە.

۱۰ـ ئێستا پێیدەگوترێ شەهداد. کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەلاتی کرمان. خەبیس (خبیص) لە زمانی عەرەبیدا بە خورماوڕۆن دەگوترێ.

۱۱ـ نەرماشیر یەکێکە لە مەڵبەندەکانی شارستانی بەم...

۱۲ـ ڕاین یەکێکە لە مەڵبەندەکانی بەم و ڕاین ناوەندەکەیەتی.

۱۳ـ ڕاوەر شارەدێیەکە کە هەنار و هەنجیری بەناوبانگە و بەشێکە لە شارستانی کرمانی پارێزگای کرمان.

۱٤ـ ئەنار کەوتۆتە مابەینی شاری بابەک، بافق، نووق و کەشکووئیە و بەشێکە لە شارستانی ڕەفسەنجان.

۱۵ـ ئەقتاع کەوتۆتە باشووری ڕۆژاوای گواشیر.

۱٦ـ ئوورزووئیە لە مابەینی بەندەرعەباس و دێسەرو و سەوغاندا هەڵکەوتووە. بەشێکە لە شارستانی بافتی پارێزگای کرمان.

۱۷ـ کۆشک کەوتۆتە نێوان جیرۆفت، سیاکۆ، دێسەرو، دەشتی ئابپزنجان و دونبالەڕوود. کۆشکی خواروو ناوەندێتی.

۱۸ـ سەوغان لە نێوان بەندەرعەباس، جیرۆفت، کۆشک، دێسەرو و ئووزووئیە دایە.

۱۹ـ ئیسفەندەقە یەکێک لە گوندەکانی مەڵبەندی سارووئییەی شارستانی جیرۆفتە.

۲۰ـ کووەبونان کەوتۆتە مابەینی بافق، تەبەس و کرمان. ئەم وشەیە لە تێکەڵکردنی کووە + بونان ساز کراوە. (کێوەبەن - کێوی بە دارەبەن).

۲۱ـ ناوچەی چووپار کەوتۆتە ۳۰کیلۆمیتری کرمان و مابەینی ماهان، کرمان و سیرجان. عەلینەقیبەگ کچەکەی کە لە پێشدا هاوسەری میرزاباقری

ئیسفەهانی کوژراوی دەست تەقی دورانی بوو، دای بە بەستامخانی زەند.

٢٢ـ کەلانتەر ئاغاتەقی کوڕی ئاغاعەلیڕەزا کەلانتەری کرمان بوو کە تەقی دورانی بردیە چیا و سووتاندی. پاش لێکەوتنی میرزاحوسێنخان و ئاغاعەلی شەماعی بوو بە کەلانتەری کرمان. کەلانتەرئاغاتەقی زاوای میرزاحوسێنی ڕاپنی بوو.

٢٣ـ ئەنجەدان یەکێک لە گوندەکانی مەڵبەندی «مێشکاباد»ی شارستانی ئەراکە.

# ٩

# ژیاندنەوەی بنەماڵەی میرانی قاجار

## ٩ ـ ١ ئەو ڕووداوانەی کە پاش مەرگیمحەممەدحەسەنخان قەومان

ناچارین کە بە شێوەیەکی تیژتێپەڕ لە ساڵی ١٧٥٩ڕا، واتە زەمانێکی کە محەممەدحەسەنخان بە دەس ڕەقیبی دەوەڵلووی خۆی کوژرا و ئەستەرئاباد گیرا و مەڵــبەندی خێڵــی قاجــار بــە ســەرۆکایەتی حوکمــڕانێکی دەســتندەخۆری «یووخاریباش»ان کەوتە ژێر دەسەڵاتی زەندیە، لە ڕەوتی ڕووداوەکان بــڕوانین و بیانتوێژینەوە. هەلومەرج وای دەنواند کە هێز و بڕستی ئەم خێڵە تەواو بنەبڕ بووبێ. لە بەرەبابی سەرداری کوژراوی قاجار نۆ کوڕ بەم ناوانــە بــەجێمابوون: ئاغامحەممەدخانی حەڤدە هەژدە ساڵە، حوسێنقولــیخــانی دە دوازدە ساڵــە، مستەفاقولی، مورتەزاقولــی، جەعفەرقولــی، مەهــدیقولــی، عــەباسقولــی، ڕەزاقولی و عەلیقولی. دوو کوڕەکــەی هەوەڵــێ لــە جــەیرانخــانمی ئــامۆزای محەممەدحەسەنخان و دووەکەی دوایان خوشکەزای حوسێنخــانی دەوەڵلــوو بوون. ئەوانی تریش تێکڕا لە سێ بەرەدایکی ژنی سیغەیی (ژنی کاتی بە شەرعی شیعان) بەرببوونەوە داوێنێ. لە مێژوودا تەنیا ناوی «بیبی شــاجیهانخــانم»ی

کچە چکۆڵەی محەممەدحەسەنخان و «خەدیجەبەگم»ی خوشکی هاتووە[1]. دوو کورە گەورەکەی و زۆربەی برا و کچەمامەکانیان لە ترسی تۆڵە و قەڵاچۆکران بە دەس تیرەی قینەبەری دەوەللوو لەگەڵ محەممەدخانی مامی باوکیان بەرەو پەناگای لەمێژینی تایفە لە دەشتی قەبچاق کە بە لەوەڕگای باشووری تورکمانان لە ئەستەرئاباد دادەندرا ڕەوین[2].

پاش لادرانی شێخاڵیخان لە سەر حکوومەتی ئەستەرئاباد محەممەدحوسێنخانی دەوەللوو کرایە حاکمی ئەم هەرێمە. ناوبراو هەر لەڕێوە تووشی پەلاماری لەگوڕی خانەکانی ڕاکردووی قوانلوو و یارانی تورکمانیان بۆوە. هەرچۆنێک بێ ساڵی داهاتوو لە ۱۷٦۱دا، دەوەللووەکان چەن پیلانێکیان داڕشت و بە هێزێکی کە نیزیکەی هەزار تورکمان و قاجار تێیدا بەشدار بوون لە سەر ڕێی بۆسەیان نایەوە و وەختایەکی کە قوانلووەکان لە تالانی دەوروبەری ئەستەرئاباد دەگەڕانەوە بە سەریان داکەوتن و زەبریان لێوەشا و زۆریان بریندار و کوژراو کەوتە سەردەست و محەممەدحەسەنخانیش گیرا. ناوبراو مامی دایکی ئاغامحەممەدخان بوو. خواجەی گەنج لەو ڕۆژەوە ناچار بوو کە سەری خۆی هەڵگرێ. پاش سێ ڕۆژان بە سواری خۆی گەیاندە ناوچەی هێور و هێمنی ئەشرەف. محەممەدخانی سەوادکووهی حوکمڕانی هەڵگەڕاوە لە قاجارانی مازەندەران، بە نیزیک شوێنەکەی زانی، ڕێی لێگرت و بێقڕە بە تەڵەیەوە کرد و هێنایە «بارفرۆش». لێرەشەوە بە فەرمانی کەریمخان بەڕێکرایە تاران. لە تاران بە ڕووی خۆشەوە وەرگیرا و خەڵات کرا و دنەیان دا کە ڕاکردووانی تری قوانلووش ڕازی بکا بۆ تەسلیمبوون.

گیرانی سەرۆکانی خێڵ و ئەگەری تۆڵەکرانەوە لە کەسوکاریان لە ئەستەرئاباد، سەرەڕای ئەوەش کە دەیانزانی بێتوو تەسلیم بن وەک بارمتەگیراوێکی شەڕافەتمەندانە لە بارگای وەکیل دەسبەسەر دەبن و ناکەونە

---

۱ـ سارەوی، ل ئالـب ۲۱؛ نەفیسی، ل ۳۸ ـ ۳۹؛ پاکرەوان، ل ٤٨. ڕیزی تەمەنی ئەم کوڕانە لە کتێبی نەفیسیدا نووسراوە، بەڵام مەبەستی دیکەی تێدا نیە. کەریمخانی زەند، ل ۱۲۲. cf . Butkov I, 245.

۲ـ سارەوی، ل ئا ۲۱؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۷۰؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ۹، ل ۷۱ ـ ۷۲؛ مونتەزەمی ناسری، ل ۳۰۵ ـ ۳۰٦.

چنگ دوژمنی بابەکوشتەی دەوەللوویان لە ئەستەرئاباد، دیسانیش وای لێکردن کە مەینەتی و کوێرەوەرییەکانی ڕێی بیابان بخەنە پشتگوێ و بەرەو ملکوماشی بنەماڵەیان لە «چاردە کەلاتە» و «هەزارجەریب»ی نێوان دامغان و ئەستەرئاباد بکەونەڕێ[٣]. پاش لەشکرکردنی کەریمخان بۆ سەر ئازەربایجان لە ساڵی ١١٧٧ی کۆچی / ١٧٦٣ی زایینیدا بەستامخانی زەند بە سەرکردایەتی هەزار سوارێک ڕاسپێردرا کە سەرۆکانی قاجاری قوانلوو وەک بارمتە ڕاگوێزێتە شیراز. لەم شارەدا بەگوێرەی دابونەریتی تایبەتی خۆی وەکیل باشی وەرگرتن.

مستەفاقوڵی و مورتەزاقوڵی لە سەر داوای حوسێنخانی دەوەللووی خاڵیان کە ئێستا حوکمڕانی ئەستەرئاباد بوو لەگەڵ دایکیان لەوێ مانەوە. ئەگەرچی ئەم کارەی وەک نیشانەی خۆشەویستی خاڵ بۆ سەر خوارزا ئەنجام دا، بەڵام لە دڵی خۆیدا دەیویست ئەم منداڵانە وەک چەک و بارمتەیەک بۆ تۆڵەئەستاندنەوەی لەنەکاوی پێویست ڕابگرێ. عەباسقوڵیخانی حەوت ساڵانە لە ڕێی بەرەوتارانا مرد و لە حەوشەی گومبەزی شاعەبدولعەزیم لە تەنیشت سەری باوکی نێژرا[٤]. حوسێنقوڵیخانیش ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئاغامحەممەدخان و تاقمێکی دیکەی براکانی ـ بەگوێرەی گێڕانەوەی ڕووداونووسانی قاجاری ـ نێردرایە شیراز. بەپێی گێڕانەوەیەکی تر سەرەتا لە سەر ملکوماشی تایفەی قاجار لە قەزوێن نیشتەجێ کران و جەعفەرقوڵیخان و عەلیقوڵیخان تا چەند ساڵی دواتریش نەچوونە شیراز لای ئاغامحەممەدخان[٥]. کەریمخان

---

٣ـ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٧٦ ـ ٧٧؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٣٠٧ ـ ٣٠٨. هەزارجەریب ناوچەیەکە لە باشووری ئەشرەف. بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی ٣، ل ٣٢٥ و کتێبی مەسعوودی کەیهان، بەرگی ٢، نەخشەکانی بەرەوڕووی، ل ٢٠٤ ـ ٢٨٢. چاردەکەلاتە کەوتۆتە نیزیک دێهستانە لە باکووری ڕۆژهەلاتی دامغان.

٤ـ سارەوی، ل ٢١؛ تاریخی گیتیگوشا ، ل ١٧٠؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، ل ٧٨.

٥ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٧٤؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٧٠؛ بینا، ل ٣٤؛ مستەوفی دەڵی کە ئاغامحەممەدخان و حوسێنقوڵیخان ئیزنی مانەوەیان بووە لە خاک و مەڵبەندی باب و باپیرانیان لە دامغان و پاش ڕاپەڕینی حوسێنقوڵیخان، ئاغامحەممەدخان وەک بارمتە براوەتە شیراز. پاکرەوان لە لاپەڕە ٣٩ و ٤٠دا دەڵێ کە حوسێنقوڵیخان لەگەڵ تاقمێکی بنەماڵەکەی ئیزنی مانەوەی لە دامغان پێدرا، بەڵام

خەجیجخانمی خوشکی محەممەدحەسەنخانی مارە کرد(۱) و لە شیراز گوێزرایەوە حەرەمخانە[6]. ئەم ژنە لە کۆتایی ژیانی وەکیلدا بە باری باریدەی ڕاکردنی ئاغامحەممەدخانی برازایدا دەورێکی بەرچاوی گێڕا. بیبیشاجیهانخانمی کچی محەممەدحەسەنخان لە قەزوێنەوە هێنرایە شیراز و لەڕێوە یان ماوەیەک دواتر وەک دەسگیرانی داهاتووی کوڕی گەنجی کەریمخان بە ناوی محەممەدرەحیمخان وەبەرچاو گیرا. ڕۆژێکی خوشکی محەممەدرەحیمخان لەگەڵ ئەم کچە بە کێشە هات و جنێوی پێدا و کوتی هەر ڕێیدەکەوێ مێرد بە ئێسترەوانان بکا و سەرەنجامیش لە عەلیمرادخانی زەند مارە کرا[7]. خوشکەکەی دیکەی محەممەدحەسەنخان مێردی بە سەیدئەبولحەسەنخانی حوکمڕانی کرمان کردبوو لە زەمانی کەریمخاندا[8].

کەریمخان بەم مێهرەبانی و پارسەنگڕاگرتنەی کە سەبارەت بە بنەماڵەی حوکمڕانی قاجار نواندبووی، بێگومان لای وابوو کە ئەگەر تەنانەت نەشیتوانیبێ ڕایانکێشێتە جەغزی دۆستایەتی و خۆشەویستی خۆی، لانیکەم توانیوییەتی ڕەزامەندییان لێوەربگرێ دەربارەی دەسەلاّت بە سەر مازەندەراندا. واوێدەچێ کە تەنانەت بە مەبەستی سەقامگیری ئارامی لە نێو جەماوەری ئەم خێڵەدا ڕازی بە کەرتبوونی قەڵەمڕەوی قاجار بووبێ، چونکە نەیدەویست کە وەک سەردەمی سەفەوی و ئەفشار یەکێک لەو دوو تایفانە پەرە بگرێ و گەشە بکا. هەنگاوی دواتری و هەڵبژاردن و ناردنی حوسێنقولیخان بۆ حوکمڕانێتی دامغان تەقەلایەک بوو لە پێناو هاتنەدی ئەم ئامانجەدا تا ناهاوسەنگی نێوان حکوومەتی یوخاریباشەکان لە ئەستەرئاباد و ئەوان ڕاست بکاتەوە.

بەداخەوە ئەم نیزیکبوونەوە ئاقڵمەندانەیە بە شێوەیەکی بەربلاو لە سایەی سەنگینی کردەوەی توندوتیژی زەکیخانی زەند بە مەبەستی

---

پاش ئەوەی ئەو ڕاپەڕی، برانە قەزوێن و حوسێنقولیخان قەت نەبرایە شیراز: «نەفیسی»ش لەگەڵ ئەم بۆچوونەیە.

٦ـ ڕەوزەتوسسەفا، بەرگی ۹؛ ئیسفەهانی ل ئا ـ ب ٤.

٧ـ نەفیسی، ل ۳۹؛ پاکرەوان، ل ۲۸.

٨ ـ نەفیسی، ل ۳۹.

سەقامگیرکردنی تەناهی چۆوە پاش و نەزۆک مایەوە. جیاوازی نێوان ئاکاری دڕندانەی زەکیخان و مێهرەبانی و میانەڕەوی وەکیل لە وەختی یەکلاکردنەوەی کێشە سیاسییەکاندا بوو بە هۆی بەدیهاتنی ڕقێکی قووڵ و گشتگیری کۆمەڵانی خەڵک لە بەرامبەر شالاوەکانی تری زەکیخان لە کاتی سەرهەڵدانی حوسێنقوڵیخان و دوژمنایەتییەکی تێکەڵ بە دانبەخۆداگرتن و بێزرانی لە حکوومەتی زەندانی لە نێویاندا پەروەراند.

## ٩ ـ ٢ یەکەم لەشکرکردنی زەکیخان بۆ سەر مازەندەران

لە سەرەتای بەهاری ساڵی ١١٧٢ی کۆچی / ١٧٥٩ی زایینیدا زەکیخان وەک سەرداری مازەندەران جێی شێخاڵیخانی گرتەوە. یەکێک لە براکانی حوسێنخانی دەوەللوو بە ناوی ڕەفیعخان بە پەلە سپایەکی بە مەبەستی ڕاپەڕین لە سنووری پارێزگا کۆ کردەوە. زەکیخان لە پێشدا پێی نایە سمنان و ئەوێی قایم کرد و پاشان پەلاماری هێڵەکانی دامەزران و بەرگری ڕاپەڕیوانی دا لە شوێنێک بە ناوی سوڵتانمەیدان لە مابەینی هەزارجەریب و دامغان و تەواو خافڵگیری کردن و بەرەو ئەستەرئاباد پاشەکشەی پێکردن. ماوەیەک دواتر زەکیخان گەڕاوە سمنان. وا وێدەچێ کە خانی زەند ئەم شارەی پێ لە هەموو شوێنێ باشتر بووبێ کە بیکاتە ناوەندی سەرکردایەتی ئارامکردنەوەی پارێزگا. پاش ماوەیەک ڕەفیعخان کە لە لایەن زەمانخان و تاقمێکی ئەفغانی دەربازبووی کوشتاری ڕۆژانی نەورۆزەوە هێزی وەبەر هاتبوو، بەرەو ساری بزووت. سەرکردەی زەند عەلیخانی شاسەیوانی نارده پێشی، بەڵام هێزەکانی عەلیخان لە عەلیئاوا تێکشکان و گەڕانەوە سمنان. زەکیخان لەبەر ئەم بەزینە دەرهەڵبوو، غەزری و ڕیشی سەرکردەکەی خۆی بڕی و فەرمانی دا بڕوا و دووبارە ڕوو بکاتەوە مەیدان[٩].

لەم کاتەدا دیسانەوە شەڕ لە عەلیئاباد قەوما و گۆیا عەلیخان لە

٩ـ گوڵشەنی مراد، ل ٥٩ ـ ٦٠؛ GD XI, 29 July. لەم ڕاپۆرتەدا هاتووە کە زەکیخان لە نیزیک ئەستەرئاباد شکاوە و ڕەنگە کابرای نووسەر مەبەستی لەم ڕووداوە بووبێ.

ترسی هەڵپێچانی زەکیخانی زەند ئەوەندە دڕ و ئازایانە پەلاماری ڕاپەڕیوانی دا کە دوژمنی بەزاند. بەڵام هەرچۆنێک بێ ئەوان نیشانیان دا کە تەواو دەتوانن قەرەبووی خەساری خۆیان بکەنەوە و وەختایەک عەلیخان لە قەڵای ساری بنەی دانابوو و لەشکرەکەی لە دەرەوەی قەڵا دامەزرابوو، پەلاماریان دا. یەکسەمەکانی لەشکری عەلیخان کە لە مەودایەکی ئەولاتری لەشکرگا دەلەوەڕان، ڕەوێندرانەوە. عەلیخان کە ئێستاش بۆ تێکهەڵچوونیان نائومێد نەبوو کەوتە شوێنیان و ئاخرییەکەی تەفروتونای کردن. هاوکات زەکیخانیش بەرەو ئەشرەف بزووتبوو هەتا ڕێگای سەرەکی پەیوەندییەکانیان هەڵببڕێ. ڕەفیعخان کە هیوای بە سەرکەوتن نەمابوو بە خۆی و چەکدارانییەوە دەستی دا و کەوتە ڕیزی هێزەکانی لایەنگری زەند. بەڵام زەمانخان کە خۆی و شەڕکەرانی ئەفغانی چاوەڕوانی هیچ ڕوحم و بەزەیەک نەبوون لە لایەن لەشکری زەندەوە، بەناچار ڕایانکرد و بەرەو تورکمانسەحرا ڕەوین.

زەکیخان لە پایزی ساڵی ۱۷٦۰دا کاری بەزاندنی مازەندەرانی کۆتایی پێهێنا و کاتی گەڕانەوەی بۆ تاران لە لایەن وەکیلەوە وەک قارەمانێکی سەرکەوتوو پێشوازی لێکرا و ڕەنگە هەر ئەمە زیاتری غللوور کردبێ و دنەی سەرهەڵدانی داهاتوو و هەڵاتنی دابێ. پلەی بەگلەربەگی مازەندەران بەگوێرەی نەریتی پێشوو درایە یوخاریباشەکان و میرزاعەلیخانی کوڕی محەممەدوەلیخان کە لە هەمووان بەساڵاچووتر بوو کرایە بەگلەربەگ. محەممەدوەلیخان بە پیلانێکی محەممەدحەسەنخان کوژرابوو. گیلان کە لە چاو ئازەربایجان بە باری لەشکرکێشیدا دەکەوتە پلەی خوارتری گرینگایەتی درایە دەس نەزەرعەلیخانی زەند[10].

سێساڵ دواتر سپای زەند وێڕای بارمتە و دیلانی قوانلوو بەرەو باشووری ئێران گەڕانەوە و مازەندەرانیان لە ئاشتی و ئارامیدا بەجێهێشت. لەم ڕۆژگارەدا حوسێنقولیخانی دەوەللوو لەبەر بڵاوبوونەوەی نەخۆشی چاوقوڵکە لە ئەستەرئاباد مرد و محەممەدحوسێنخانی برای لە جێی داندرا[11]. لە توێژینەوەی ڕووداوەکاندا وا دەردەکەوێ کە تا زەمانی هەڵبژاردنی

۱۰ـ گوڵشەنی مراد، ل ٦۰.

۱۱ـ مونتەزەمی ناسری، ل ۳۰۸.

حوسێنقوڵیخان بۆ حوکمڕانێتی دامغان لەم پارێزگایەدا هێمنایەتی و تەناهی سەقامگیر بووە.

## ٩ ـ ٣ ڕاپەڕینی حوسێنقوڵیخان

بەڕاستی زۆر چاک ڕوون نیە کە چ شتێک هانی کەریمخانی داوە تا بنکەیەکی دەسەڵات بۆ میراتگیرانی سەرەکی خاک و مەڵبەندی قاجار ئەویش لە قەڵەمڕەوی تایبەتی تایفەکەیاندا دابین بکا. بۆی هەیە چونکە حوسێنقوڵیخان لاوێکی ٢٠ساڵەی خۆشەویستی خودی وەکیل بووە لە شیراز و پاش مەرگی باوکی دە ساڵان بازرە بووە، وای داناوە ئەگەر بێتوو ئەو دەسەڵاتەی وێبدا بە سپاسەوە وەریدەگرێ و وەفادار دەمێنێتەوە. دوور نیە وەک ڕووداونووسانی قاجاری بانگەشە دەکەن بە ڕاسپاردەی ئاغامحەممەدخانی کردبێ ـ کە لەبەر زیرەکی سیاسی خاوەن ڕێزێکی سروشتی بووە ـ تا حوسێنقوڵیخان بخاتە سەر دەسەڵات و قنیاتی هێنابێ کە ئەم کارە باشترین ڕێگای ڕاگرتن و ئارامی مازەندەرانە[12]. ڕەنگیشە پێداگری خانی گەنج کە لەبەر غەریبایەتی و پەڕیوەیی تووشی مەینەت ببوو، هەلی بۆ ئەم تەمایە ڕەخساندبێ و کەریمخان ئیزنی دابێ ـ کە وەک حوکمڕانێکی خاوەن دەسەڵات و متمانە و ڕێزی پێویست ـ بگەڕێتەوە نێو بنەماڵە و لای دایکی. وێڕای ئەمەش بوونی ئاغامحەممەدخان وەک بارمتە بەس و تەواوی دەنواند. سەرەڕای گشت ئەم قسە و باسانە وەکیل لەم هەڵبژاردنەدا هەڵەی کردووە و کورتبینی نواندووە و ڕێی بۆ جێنشینی خۆی خۆش نەکردووە و سەرنجی نەدابوو کە ئەمە هەنگاوێکە و لە ڕێچکەی خۆکوژی سیاسی خانەدانی زەندیەدا هەڵیدێنێتەوە.

مەسەلەکە هەر شتێک بوو سەرەنجام حوسێنقوڵیخان لە ٢٠ی

---

١٢ـ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٨٦. نەفیسی دەڵێ کە حوسێنقوڵیخان هەتا ساڵی ١١٨٥ی کۆچی، یانی تا ئەو کاتەی ئاغامحەممەدخان نەبوو بە سی ساڵ و ئەو بە بیست ساڵ، حکوومەتی نەدرایە دەست. ئەو لە قەزوێنەوە بۆ دیداری براکەی هاتبووە شیراز و لێرەوە حکوومەتی دامغانی وەرگرت.

شەشەکانی ١١٨٢ی کۆچی / ٢٧ی فێورییەی ١٧٦٩دا کەوتــەڕێ. یەکــەم هــەنگاوی پاش وەرگرتنی فەرمانی حکوومەت زەماوەند بوو لەگــەڵ کچــی پیاوماقووڵــێکی هەڵکەوتەی قاجارییە لە تیرەی عــەزۆدەدینلوو هــەتا بــەم شــێوەیە جێنشــینی داهاتووی خانەدانی قاجاری لێبکەوێتــەوە. ئــەم ژنهێنانــەی دوو ســاڵ دواتــر فەتحعەلیشای داهاتووی مێــژووی بەرهــەم هێنــا[١٣]. خــانی قاجــار ســەرەتای ڕاپەڕینەکەی لە مەکۆیەکی ٢٠کەســیڕا داخســت. لــە پــێشدا دەســتی کــرد بــە کۆکردنەوەی تاقمەکانی تازەپشووی ئاشاقەباش و لایەنگرانیان؛ ئەگەر پێویست بووبــا بــە زەبــری چــەک دەیتۆقانــدن و هێزەکــانی دەوەللــوو و لایــەنگرە یوخاریباشەکانی خەساندن. تەواوی ئەم کارانە لە مــاوەی هەشــتســاڵ پــاش داندرانی لە سەر دەسەڵات ڕوویان دا. ئەم ڕۆژگارە شانبەشانی سەردەمێک هــات کە وەکیل سەرەڕای لەشکرکێشی بۆ سەر خاک و هەرێمەکانی لێــواری کەنــداوی فارس و گەمارۆی بەسرە لــە ساڵــی ١٧٧٥ ـ ١٧٧٦دا کــەمتاکورتێک دڵــەڕاوکەی سەبارەت بە گێرە و کێشەی پارێزگاکان نەمابوو و زۆر بــە هاســانی دەیتــوانی سپایەکی بەهێز بە مەبەستی لە سەر کار لادانی ئەو گەنجە و گرتنی ســەربازگە بنێرێ یا دوولک بخاتە ئەستۆی ئاغامحەمەدخان و بارمتەکانی تری بەردەستی. بەڵام حوسێنقوڵــیخــان وریــا بــوو کــە هەمیشــە هەســتی تۆڵەئەســتانەوە و ڕقبەرقەی کۆنی دوو تیرەی قاجار تین بدا تاکوو کارەکــانی نەبنــە ڕاپــەڕینێکی ڕاستەوخۆ دژی کەریمخان. بەڵام دیسانیش کەریمخان وای بە باش زانی کە ســێ لک چەکدار بــە مەبەســتی جێگۆڕکــە یــان دانانــەوەی خانــەکانی دەوەللــوو و ســەرپێنــەویکــردنی خــانی گــەنجی قاجــار و پەشــیمان بوونــەوەی و داوای لێبووردنی، بنێرێ. نامی و غەففاری هەردووکیان لە ئاخرییــەکانی حکوومــەتی زەندیــەدا وای نیشــان دەدەن کــە چەنــد دەســتێکی نەناســراو لــە مازەنــدەران حوسێنقوڵیخانی بێتاوانیان لاڕێ کرد[١٤]. ڕەنگە ئەودەمی ئەم قسانەیان لەبــەر

---

١٣ـ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١٠. بەگوێرەی گێڕانەوەی حاجی فەرهادمیرزا، کە هێنــدێک لە مێژوونووسانیش گێڕاویانەتەوە، فەتحعەلیشا سێ ساڵ دواتر یــانی ساڵــی ١١٨٥ی کۆچی / ١ ـ ١٧٧٢ی زایینی لە دایک بووە (فەســایی، بــەرگی یەکــەم، ل ٢٨٢؛ نەفیســی، ل ٤١).

١٤ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ١٧١؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٧٤.

دڵی قاجارییە هەڵبەستبێ، بەڵام زیاتر وێدەچێ کە بە مەبەستی پاکانە بۆ کەریمخانی پشوودرێژ و لەسەرەخۆ و بەرگرتن لە ئاماژە بۆ سەر هەڵە سیاسییەکانی ئەمەیان هێنابێتەگۆڕ. مێژوونووسانی قاجاریش پتر قورسایی دەخەنە سەر قینەبەری تیرەکانی دەوەللوو ـ قوانلوو و سوورن لە سەر ئەم گوتەیە کە حوسێنقوڵیخان سەبارەت بە کەریمخان وەفادار بووە. لە لایەکی دیکەوە ڕەنگە وایان ویستبێ ئەم واتایە بدرکێنن کە سرشتی قینلەزگانەی ئاغامحەممەدخان لە وەختی بارمتەییدا لە شیراز پلانی ڕاپەڕینەکەی داڕشتبێ. چونکە ئەو لەو سەردەمیدا بە ئینکەبەری گوڵی مافوورەکانی وەکیلی دەبڕی و بیری لە ڕابردوو و داهاتووی خانەدانی قاجار دەکردەوە[١٥].

یەکەمین هەڵمەتی حوسێنقوڵیخان دژی شوێنە سەختەکانی دەوەللوو لە «نەمەکە»ی دامغان ڕووی دا[١٦]. ئەم قەڵایە بۆ پاراستنی کوێستانەڕێی نێوان شاڕوود و ئەستەرئاباد گرینگ بوو. پاش گەمارۆیەکی کەمخایەن قەڵا کەوتە بەر هێرش و دەستی لێکبەردا و تێکڕووخا و چەکدارانی سەربازگەی قەڵتوبڕ کران. حەسەنخانی حاکمی ئەو شارە هەستی بە مەترسی کرد و تێگەیی کە ناتوانێ هیچ چاوەڕوانییەکی لە جەماوەری سەرەکی لایەنگرانی قوانلووەکانەوە هەبێ، چونکە تۆڵەوەرگرتنەوە و ڕکەبەرایەتی دڕندانە باڵی ئەنگاوتبوو. بۆیە کارەکەی بەرەڵلا کرد و بەرەو نەوکەندە واتە شوێنی حوکمڕانێتی مورتەزاقوڵیخانی زاوای کە باوکبرای حوسێنقوڵیخان بوو کەوتەڕێ[١٧]. ناحەزانی حکوومەت و لایەنگرانی ئاشاقەباشان لە ئەستەرئاباد لەڕێوە حوسێنقوڵیخانیان گاز کرد بۆ گرتنی شار، بەڵام ناوبراو نیشانی دا کە یەکەم هەنگاوی تەنیا داگیرساندنی ئاگری ڕاپەڕینە و خۆی بە کۆکردنەوە و ڕاکێشانی بیر و سەرنجی ڕێبەرانی ناڕازی مازەندەرانی و پیاوەکانیان سەرقاڵ و دڵخۆش کردبوو. هەروەها خانەکانی یەمووت(٢) و «گووکلان»ی تورکمان(٣) کە

١٥ـ مەنسووری:«خواندنیها»ی ژمارە ٦٨، ل ٢٨دا. بڕواننە: پەراوێزی ژمارە ٧ بابەتی ٩.

١٦ـ بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی ٣، ل ٣٠٦.

١٧ـ دوو شوێن بەم ناوە هەن، یەکیان لە نیزیک ئەستەرئاباد و ئەوی تر لە هەزارجەریب. ڕەنگە دووهەمی لەبەرچاو بێ. بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی ٣، ل ٣٠٦.

کۆنەلایەنگری باوکی بوون بە هەزار سوارەوە پاڵیان دایە پاڵی. کەمالخانی ئەفغان و هاونیشتمانانی کە لە کوشتاری ساڵی ١٧٥٨ ـ ١٧٥٩ خەلەستبوون لەگەڵ ئەڵلاویردیخانی(٤) حاکمی جاجەرم شانبەشانی حوسێنقولیخان بەرەو دامغان کوتایان[١٨].

## ٩ ـ ٤ دووهەمین پەلاماری زەکیخان و هەڵمەتەکانی تری زەندیە

هێرشی دڕندانەی حوسێنقولیخان بۆ سەر قەڵای نمەکە نازناوی «جیهانسۆزشا»ی بۆ خانی گەنجی قاجار بە دیاری هێنا و ئەو بڕە گومانەی کە سەبارەت بە ئامانجەکانی لە گۆڕا بوون ڕەوین. کەریمخان سپایەکی سێهەزار سوارەی چەندتوخمەی لوڕ و کوردی بە سەرکردایەتی زەکیخان گاڵ دا تا ڕاپەڕینەکەی سەرکوت بکەن و بارەکە بگێڕنەوە سەر دۆخی جاران. لەبەر ئەم شاڵاوە حوسێنقولیخان و تەواوی خزمانی بەرەو ناوچەی پەنا و هێوری تورکمانسەحرا تێیانتەقاند. بەڵام دیسانیش محەممەدحەسەنخانی دەوەللوو لە گرتنەوەی ناوەندی حکوومەت بە دەس خێڵی قاجار تۆقیبوو. بۆیە حکوومەتی ئەستەرئاباد درایە دەس میرزاعەلیخانی دەوەللوو و حەسەنخان لە هەزارجەریب بنەی دانا تا خۆی و بنەماڵەکەی بتوانن لە سایەی قەڵای قایمی ئاکرکی هەست بە تەناهی بکەن(٥). زەکیخان فەرمانی دا کە شووره و مەتەرێزەکانی چاردە کەلاتە وێران بکەن، پاشان لەگەڵ هێزەکانی گەڕایەوە شیراز[١٩].

لە ساڵی ١١٨٥ی کۆچی / ١٧٧١ی زایینیدا حوسێنقولیخان لە تورکمانسەحرا گەڕاوە و هێرشی بردە سەر قەڵای ئاکرکی کە حەسەنخان لەوێ بنەی داکوتابوو. ئەگەرچی قەڵا پێنسەدکەس هێزی پشتیوانی قۆرخانەداریشی هەبوو ناچار ملی دا و گیرا و قەڵتوبڕی تێکەوت. خودی حەسەنخان وەختایەک دەیەویست ڕابکاتە شوێنێکی پەنا لە سەر ئەسپ ئەنگوا و گلی و سەری بڕا.

١٨ـ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١٠ ـ ٣١١؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٨٨ ـ ٩٠.
١٩ـ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١١؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، ل ٩٠ ـ ٩١.

محەممەدعەلیئاغاش کە لە هاندەرانی کوشتنی محەممەدحەسەنخانی قاجار بوو کوژرا. کەمێک پاش ئەم تۆڵەکردنەوانە جیهانسۆزشا بە مەبەستی وەدەسگرتنی حکوومەت بەرەو دامغان فڕی. ساڵی دوایی تووشی وردە تێکهەڵچوونێک هات لەگەڵ فوغانعەلیخانی یوخاریباش؛ ناوبراو بە پاڵپشتی تاقمێک لە تورکمانان وێڕای دەستەیەک لە دانیشتووانی دەوروبەری ئەستەرئاباد پەیمانێکی بەست یا تەماحی وەبەرنان و هەستا بە پەلهاویشتن بۆ نێو قەڵەمڕەوی حوسێنقولیخان، بەڵام ماوەیەک دواتر کشاوە قەڵاکەی لە نیزیک ئەستەرئاباد. بەکرێگیراوانی حوسێنقولیخان لە ژووری قەڵادا کوشتیان و قەڵایان گرت. خانی قاجار دارایی و ملکوماشی ڕەقیبی تاڵان کرد و کوڕەکەی کوشت[٢٠].

لەم ساڵە و ساڵانی دواترا قەڵای سەرۆک و حوکمڕانانی ناوچەیی بە فێڵ و خەیانەتی نێوخۆیی و هێرشی خافڵگیرانەی هێزە چەکدارەکان کە بە پەلاماری لەنەکاوی حوسێنقولیخان و سەرداری دەستەڕاستی پیرقولی شامبەیاتی گەڵاڵەیان بۆ داڕژا، گیران[٢١]. خانی قاجار هەوساری گورگان و مازەندەرانی ڕۆژهەڵاتی، بۆ وێنە ئەستەرئابادی بە دەستەوە گرتبوو. ئەگەرچی خۆی ڕاستەوخۆ حکوومەتی بە سەر ئەو ناوچانەدا نەدەکرد، بەڵام حوکمڕانانێک بە سەریاندا زاڵ ببوون کە لە ترسی لایەنگرانی ملیان بۆ فەرمانەکانی ڕادەکێشا. لە ساڵی ١٧٧٢دا ئەشرەفیش خرایە سەر مەڵبەندە داگیرکراوەکانی و محەممەدخانی سەوادکووهی چاوچنۆک کە لەبەر هاودەنگی و هاوهەنگاوی لەگەڵ خانەدانی زەندیە لە وەختی پەیکەردەی محەممەدحەسەنخانی قاجار لە پلەی بەگلەربەگی مازەندەراندا مابۆوە، تەنیا ساری و مەڵبەندەکانی ڕۆژهەڵاتی و بارفرۆشی جەرگەی پارێزگای بە دەستەوە بوو[٢٢]. لەبەر کەوتنە مەترسی حوکمڕانێتی چواردەساڵانەی، تازەترین هەواڵەکانی سەبارەت بە کوشتاری حوسێنقولیخان نارد بۆ شیراز و داوای هێزی پشتیوان و یاریکاری کرد. لە ئاکامدا هەزار سوارەی زەند و لوڕ بە سەرکردایەتی بەرزەڵڵاخانی زەند نێردرانە هانای هەتا ببنە

---

٢٠ــ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١١؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٩٠ ــ ٩١.

٢١ــ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١١ ــ ٣١٢؛ سارەوی، ل ئا ٢٥ ــ ب ٢٦.

٢٢ــ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١٣، ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٩٨ ــ ١٠١.

پشتیوانی هێـزە شـەشهـەزار کەسـییەکەی کـە لـە سـەربازانی ئیلجـاڕی(٦) پێکهاتبوو. ناوبراو بە سەرکردایەتی ئەم لەشکرە لە ساریڕا بەرەو ئەستەرئاباد بزووت. لە گوڵباد هێزەکانی حوسێنقوڵیخان شانبەشانی شەڕکەرانی ئـەفغان و تورکمان لە سەر ڕێگای بۆسەیان نایەوە. هەر لـەم ڕۆژانـەدا خۆشـی لەگـەڵ پێنسەدکەس لە پیاوانی قاجار بە پڕتاو بـە کوێسـتانەڕێ و دوور لـە ڕەوگـەی چەکدارانی محەممەدخان مەودای چل مایلەی تا ساری بە ڕۆژێک بڕی و هەر ئـەو شەوە لە دیوارەکانی شار سەرکەوت و بە سەر پارێزوانانیدا زاڵ بوو. لایەنگرانی محەممەدخان کوژران و عەلیئەسغەری زاوای گیرا[۲۳].

بەبیستنی هەواڵی ئەم مەینەتە بەرەو ساری گەڕایەوە، بـەڵام هێنـدێک دواتر هێزەکانی ورەدۆڕاوی کە لەبەر تەوژمی پـەلامار و هەڵـمەتی تورکمـان و ئەفغانییـەکان وەتـەنگ هـاتبوون بـەرەورووی چەکـدارانی ژێرڕکێفـی مورتەزاقوڵیخانی براگچکەی حوسێنقوڵیخـان هـاتن. دەسـرێژی ئـەم تاقمـە سپاکەی بە شێوەیەکی سەرشۆڕانە لێک بڵاو کرد. محەممـەدخانی سـەوادکووهی گیرا و نێردرایە لای حوسێنقوڵیخان لە ساری. خـانی قاجـار سـێ ڕۆژ دواتـر چووە بارفرۆش و ئەو شارەی بێقڕە گرت. لە «بارفرۆش» محەممـەدخانی دایـە دەس ئەشکەنجەگەر هەتا جێی ماڵ و سامانی پێهەڵدا و ئاخرییەکەشی کوشتی. مەهدیخانی کوڕی محەممەدخان کە لە کاتی پەلامار بۆ سەر بارفرۆش لە حەوت کێوان تەقیبوو، ڕایکردە شیراز و چەند هەواڵێکی تازەی سەبارەت بە ڕاپـەڕین و مەڵبەندە داگیرکراوەکانی چنگ حوسێنقوڵیخان خستە بەردەم وەکیل. هەتا دوو مانگی تر یانی بەر لە ڕۆیشتنی خانی قاجار و براکەی بـۆ ئەسـتەرئاباد کـەس کـارێکی پێیـان نـەبوو تـا قەڵـەمڕەو و دەسـکەوت و خەنیمەتـەکانیان پتـر بتەنێتەوە[۲٤].

ئیتـر گومانێـک نـەمابوو سـەبارەت بـە وەی کـە کـوڕانی

۲۳ـ مونتەزەمی ناسری، ل ۳۱۲؛ سارەوی، ل ۲٤ب؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۷۱. سارەوی تورکمانەکانی گەڵ حوسێنقوڵیخانی لە وەختی گرتنی ساریدا بە هەزارکەس دادەنێ.

۲٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۷۲؛ گوڵشەنی مـراد، ل ۱۷۵؛ ڕۆسـتەموتتەواریخ، ل ۳۵۸ ـ ۳۵۹؛ سارەوی، ل ۲٤ب؛ cf. Butkov III, 127.

محەممەدحەسەنخان خوازیاری گێڕانەوەی پلە و دەسەڵات و میراتی باوکیانن. ڕەنگە لەبەرەوەی کەریمخان لای وابوو کە تۆڵەکردنەوەی لە ئاغامحەممەدخان ناتوانێ ڕەوتی ڕووداوەکان بگۆڕێ وەها کاریکی نەکرد و تەمای گرت بە ناردنی لەشکرێک سەر بە حوسێنقولیخان دابنوێنێ. مەهدیخان جێی باوکی گرتەوە و لە بەهاری ساڵی ١١٨٧ / ١٧٧٣دا بە مەبەستی گرتنەوەی پارێزگا نێردرایەوە ئەو هەرێمە. پێنج هەزار سوارەی زەندیش بە سەرکردایەتی عەلیمحەممەدخان ڕەگەڵی کەوتن و حەوسەد سوار و دووهەزار پیادەش بە مەبەستی قایم کردنی سەربازگەی مازەندەران نێردران. حوسێنقولیخان لە «کەلی عەلیئاباد» تەنیشت «شاهی» ئێستا پەلامارێکی ناسەرکەوتووانەی دا و بە توندی لە لایەن هێزەکانی زەندەوە پاشەکشەی پێکرا. پاش یەک دوو جار شان لەبەریەکچەقاندن و بەگژداچوونەوە لە گولباد(٧) کە براکانی عەلیمحەممەدخان: تاهیر، وەلی و عەلیهیممەتخان ئازایەتییەکی کەموێنەیان تێدا نواندن، لاوی ڕاپەڕیو بەناچار بەرەو لای لایەنگرانی لە تورکمانسەحرا تێیتەقاند[٢٥]. میرزا عەلیخانی دەوەللوو حوکمڕانی ڕەسمی ئەستەرئاباد چووە پێشوازی هێزەکانی زەند و لە پلەی خۆیا داندرایەوە. مەهدیخان بەڕەسمی لە بارفرۆش بوو بە حوکمدار و عەلیمحەممەدخان کە ئەرکی خۆی ڕاپەڕاندبوو گەڕایەوە شیراز[٢٦]. خوشکی خانی ڕاپەڕیوی کە لە نەوکەندە(٨) بە دیل گیرابوو

---

٢٥ـ گولشەنی مراد، ل ١٧٥ ـ ١٧٦؛ مونتەزەمی ناسری لە لاپەڕە ٣١٣دا دەنووسێ، نامەیەکی لە ئاغامحەممەدخانەوە پێگەیبوو کە نەکا لەگەڵ محەممەدعەلیخان تێکهەڵچێ و ڕاستەوڕاست هەڵێتە تورکمانسەحرا. لەبەرەوەی ڕاپەڕینی حوسێنقولیخان بەئاشکرا دەستی پێکردبوو، ئەم مەبەست و تاموخوێیانە دەگەڕێتەوە سەر پاراستنی ئابڕووی ڕووداونووسان. من لام وایە ئەگەرچی غەففاری زۆری باسی وردیلەشی هێناوە، بەڵام پتری بڕوا پێدەکرێ، بەتایبەت کە ئاماژەی وی سەبارەت بە ناردنی عەلیمرادخان هێندێک بەر لە ئاخرین لەشکرکردنی زەکیخان لە لایەن کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتییەوە دانی پێدا هاتووە. .(FR XVII. 1107 (19 October 1775

٢٦ـ گولشەنی مراد، ل ١٧٦؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١٣. گیتیگوشا، ل ١٧٢؛ فەسایی لە لاپەڕە ٢١٧ی بەرگی یەکەمدا دەنووسێ: لەم هەڵمەتەدا زەکیخان سەرکردایەتی هێزەکانی پەیکەردەی لە ئەستۆ بوو و لە شاڵاوەکەی ترا عەلیمحەممەدخان نێردرا.

وێڕای بەشێک لە بارگەوبنەی تالانکراوی پاشەنگانی سپای حوسێنقولیخانی لەگەڵ خۆی برد. ئەم کیژە بەپێی خەیانەتی یەکێک لە شەڕکەرانی تورکمان بە خانی زەند فرۆشرا(۹). ئەگەرچی عەلیمحەممەدخان لە ئەستەرئاباد لە خۆی مارە کرد بەڵام کچۆڵەکە زۆر بە توندی لە حاند ئەم زەماوەندە ناڕەزامەندی دەربڕی. وەختایەک عەلیمحەممەدخان گەڕایەوە شیراز قسەی خەجیجەبەگم کاری کردە سەر کەریمخان و ئەویش بە سەر عەلیمحەممەدخان ڕۆیی و لە سەر کاری لادا و کچەی بە مەبەستی ژیان لای ژنانی بنەماڵەی نارده قەزوێن. کردەوەی زاڵمانەی عەلیمحەممەدخان لەگەڵ ڕووحی دادخوازی وەکیل یەکتری نەدەگرتەوە و هەر بۆیە بەگوێرەی نووسینی غەففاری عەلیمحەممەدخانی بەختوەرگەڕاو ناچار بوو بۆ ماوەی چل ڕۆژ پەنا بەرێتە بەر مەرقەدی میرهەمزە تاکوو ببەخشرێ.

## ۹ ـ ۵ سێهەمین لەشکرکردنی زەکیخان

میانەڕەوی سیاسی و مێهرەبانی خودی وەکیل لە شیراز، ئازایەتی سەرکردە نێردراوەکان و تەقەلای سەرکەوتووانەیان و یارمەتی دانی حاکمانی ئالقەبەگوێی تیرەی یوخاریباش هیچ کارێکی نەکردە سەر هەنگاوە هاوچەشنەکانی حوسێنقولیخان. لە ساڵی ۱۷۷٤دا کە وەکیل چەند سپایەکی بە مەبەستی گرتنی بەسرە و کوردستان ناردبوو ژمارەی ئەو لەشکرانەی کە دەبوایە لە هەڵمەت دژی سەرهەڵداوانی باکوور بچنە مەیدان دابەزی. حوسێنقولیخان جارێکی تریش گەڕایەوە تورکمانسەحرا و کاتی شەڕ و پەلامار برا چکۆڵەکانی واتە مستەفاقولی و مورتەزاقولی دژی یوخاریباشەکان ڕەگەڵی کەوتن. لەم هێرشەدا تەواوی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ دەوەللووەکانی بەڕواڵەت جلەوکێشی حکوومەت خزم بوون یان پشتیوانییان لێدەکردن دەستدرێژییان بو سەر کرا و کوژران و ژن و ماڵیان بە تالان چوو. پاشەواری ئەو کەسانە بەرەو باشوور ڕایانکرد و بەم شێوەیە مەترسییەکی هەمەلایەنە ڕەنگی دایەوە. ڕاپەڕیوانی ئاشاقەباش تەواو دەسەلاتیان بە سەر ناوچەکانی گوندەکی مازەندەران داگرت[۲۷].

۲۷ـ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ۹، ل ۱۰۲ ـ ۱۰۳؛ مونتەزەمی ناسری، ل ۳۱۳؛

بەڵام مەهدیخان کە دەیویست تۆڵەی خوێنی باوکی بکاتەوە لە بارفرۆش بە یارمەتی جانمحەممەدخانی بلووچ لەشکرێکی ساز کرد. لێوەشاوەیی سەرکردایەتی ئەم پیاوە کەمتر بوو لە ڕاوێچکە و شنگڵ لە خۆدانی، چونکە لە ساڵی ١٧٧٥دا لە بارفرۆش وای هەنگاو نابوو کە خۆی کەوتە داو. حەوسەد سوارەی هەڵبژاردە پاش شاڵاو و پەلامارێکی بێوچان تا بەیانی هەڵیانکوتابوویە سەری. ئەم گەڵاڵەیەش تەواو دووپاتەچەوتەی شەڕ و دامەزرانەکەی ساری و گیرانی محەممەدخانی باوکی بوو. حوسێنقوڵیخان بە بارێکی غللوورانەدا دیلەکەی خستە کۆت و زنجیرەوە و تێیهەڵدا و ماڵ و سامانی بە تاڵان برد.بەڵام پاشان بەم هیوایەی کە بە گۆڕانی بەرە و مەتەرێز لەبری وەی سەر وەبەر کەریمخان بێنێ، خۆی بداتە پاڵ قوانلووەکان ئازاد کرا. یانی وەک ئەو جۆرەی کە ڕەزاقوڵیخان پاساو دێنێتەوە ـ کە لێرەڕا مەهدیخان خۆی و دەسەڵاتی بەرەسمی دەناسی و کەوتۆتە شوێن ئاشتی و ئارامی ـ[28] جووڵاونەوە. جانمحەممەدخان و چەکدارانی بلووچ ئیزن دران کە بێ خەسار بەڵام بە شەرمەزارییەوە بە ڕێی فیرووزکۆدا بگەڕێنەوە و دەسبەرداری ئەرکی کورتماوەیان بن. لە کاتی گەڕانەوەدا لە سەر ڕێ بە پڕتاو هەڵیانکوتایە سەر لەشکری گەورەی حوسێنقوڵیخان. خانی قاجار بە مەبەستی بڕینەوەی قسەی ئاخری یەکێک لە خانەکانی بلووچی نارده لای جانمحەممەدخان، بەڵام دوای ئەوەی دەستی لە پەلامارە نالەبارەکانی هەڵنەگرت، دژەهێرشی قاجارەکان دەستی پێکرد و هێزەکانی جانمحەممەدخان تێکشکان و خۆشی کەوتە داوی کەمەند و گیرا و ماوەیەک زیندانی کرا، بەڵام پاشان ئازادیان کرد کە بگەڕێتەوە شیراز[29].

بێگومان ئاکار و جووڵانەوەی حوسێنقوڵیخان لەگەڵ مەهدیخان و

---

FR XVII, 1099 ڕاپۆرتێکی تێدایە کە لە بووشێهرەوە ناردراوەتە بەمبەئی. ڕێکەوتی ئەم نامەیە ٦ی سێپتامبری ١٧٧٥ وا دەنوێنێ کە حوسێنقوڵیخان لە مازەندەران گەلێکی لایەنگر بووە و وێدەچێ کە حوکمڕانانی سەر بە کەریمخان تەواو تۆقیبن.

٢٨ـ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، ل ١٠٥.

٢٩ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٠٣ ـ ١٠٥؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١٤؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٧٣ ـ ١٧٥.

جانمحەممەدخان دیاردەی ئەوە بوو کە دەیویست نیشانی بدا هەڵمەت و چالاکی ئەو، پەیوەندی بە گێرەوکێشەی دوو تیرەی قاجارەوە هەیە و نایەوێ دەسەڵاتی وەکیل خەساربار بکا، بەڵام ئیدی تازە پشوودرێژی وەکیل بنەی بڕابوو. ساڵی دواتر سپایەکی بە فەرماندەرێتی عەلیمرادخانی زەند نارده مازەندەران. ناوبراو سەرەتا چەند سەرکەوتنێکی وە دەس هێنابوو بەڵام ئاکار و کرداری تەنانەت سەبارەت بە یوخاریباشەکانی دەوڵەتخواز و لایەنگری زەندییەش ئەوەندە دزێو و نالەبار بوو کە لە دەستانی سکالایان بردە لای وەکیل. لە ساڵی ۱۱۹۰ی کۆچی / ۱۷۷٦ی زایینیدا بانگ کرایەوە و زەکیخان جێی گرتەوە[30]. زەکیخان باری ئاسایی و یاسایی و تەناهی بە دڕندایەتییەکی کەم و زۆر بێوێنە گێڕایەوە. حوسێنقولیخان بۆ ئەوەی دەس بکاتەوە کشایەوە. ڕەنگە پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەڵلاوێردیخانی کرایلی حوکمڕانی جاجەرم کە بەر لە ڕاکردنی بۆ تورکمانسەحرا لە قەڵاکەیدا پەنای دابوو کاری کردبێتە سەر ئەم تەمایە[31]. زەکیخان بەرەو فیرووزکۆ ملی نا و ساری و «نەوکەندە»ی کە کەوتوونە ئەولای چاردەکەلاتە، گرتنی. لەم ناوچەیەدا خانەکانی خۆوڵاتی پێشنیارەکەیان لە بابەت هاوکاری و هاوهەنگاویان لەگەڵ سپای زەند بردەوە پاش و هانایان بردە بەر قەڵایەکی قایم. زەکیخان بە زەبروزەنگی تایبەتی خۆی پەلاماری قەڵای دا و سەرکردەکان و جەماوەری نیشتەجێی وێندەرێی شەقوپەق کرد و منارەیەکی لە کەللەی سەریان هەڵچنی. حاجیزەکی خانی ڕێبەری ڕاپەڕیوانیان لە کۆڵەکەیەک بەستەوە و ئەوەندەیان لێدا تا مرد. ئەوانەش کە نەیکوشتن ناردنی بۆ شیراز[32]. بیرەوەری زاڵمانەی زەکیخان لەم کارەساتەدا بۆ

---

۳۰ـ گوڵشەنی مراد، ل ۲۰۱: .FR XVII, 1107 (19 October 1775)
۳۱ـ مونتەزەمی ناسری، ل ۳۱٤؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ۹، ل ۱۰٦.
۳۲ـ گوڵشەنی مراد، ل ۲۰۲، ڕۆستەموتتەواریخ، ل ۳٦٤ ـ ۳٦٥؛ مونتەزەمی ناسری، ل ۳۱۱؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ۹، ل ۹۰ ـ ۹۱. مێژوونووسان تێکڕا لە سەر بێڕەحمی زەکیخان یەکدەنگن، بەڵام مێژوونووسانی قاجاری لایان وایە ئەم ڕووداوانە ئی جاری پێشووە لە ساڵی ۱۷۷۰دا. سەرکردەی ڕاپەڕینەکەش بە لای ئەوانەوە سمایلخانی بەرەی باوەگەورەی هیدایەت، نووسەری ڕەوزەتوسسەفای ناسری بووە. هەرچۆنێک بێ سەرچاوەی نووسینی غەففاری لەم گێڕانەوەیەدا دوو کەسن لەوانەی

ماوەیەکی دوورودرێژ لە زەین و خەیاڵی تایفەی قاجاردا مایەوە(١٠). دیلەکانی دێنا و لینگەوقووچ سەری لە قوڵکە دەنان و پڕی دەکردەوە یان لە دار و کۆڵەکەی چۆڵەپێچ دەکردن تا دەمردن[٣٣].

وەختایەک زەکیخان لە هەڵمەتەکەی گەڕایەوە[٣٤]، کەریمخان ئەو درندایەتییە بێپاساوانەی بەتوندی مەحکووم کرد و وا دێتە بەرچاو کە ئاکاری زەکیخان بەر لە وەی کار بکاتە سەر ئاشتی و سەقامگیری پارێزگا، بووبێتە هۆی زیاتر ترازانی داخوازی هەمیشەیی حوسێنقوڵیخان بۆ تۆڵە وەرگرتنەوەی بنەماڵەیی و خۆگەورەکردنەوە و وەفاداری سەبارەت بە کەریمخانی سەروەری یان جێبەجێ بوونی گەلاڵەی درێژخایەنی براکەی لە بابەت پەرەگرتنی دەسەڵاتی قاجارییە و وای کردبێ کە تیرە و بەرەبابە قینەبەرەکانی خێڵی قاجار لە یەکتر نیزیکتر بکاتەوە و ڕێکیان بخاتەوە. میرزاعەلیخانی دەوەللوو کرا بە حاکمی ئەستەرئاباد و دەسەڵاتی حوسێنقوڵیخان لە دامغان پاککرایەوە. هیچکام لە حاکمەکانی غەیرەقاجار و سەرۆکی تایفەکان نەیاندەوێرا پتر لە یوخاریباشەکانی لایەنگری زەندیە لاگیری ڕاپەڕیوان بکەن و بۆیە وەختایەکی زەکیخان بەرەو شیراز بزووت، تورکمانەکانی لایەنگری حوسێنقوڵیخانیش وردەوردە لێیهەڵگەڕانەوە[٣٥].

## ٩ ـ ٦ مەرگی حوسێنقوڵیخان

مستەفاقوڵی و مورتەزاقوڵیخان هێشتاش مەیلیان لە یارمەتی براکەیان بوو لە گورگان، بەڵام جەعفەرقوڵی و عەلیقوڵی بە مەبەستی دیتنی

---

خۆیان لەگەڵ زەکیخان بوون و خۆشی ئەم بەشەی پێ لە هەموو بەشەکانی مێژووەکەی جێباوەڕترە. ڕۆستەموتتەواریخیش ئەم مەبەستە لە زاری شاهیدێکی گومناو کە خۆی لەوێ بووە دەگێڕێتەوە و دەڵێ دیتوویەتی کە زەکیخان چلۆن پاش ڕێوڕەسمی نوێژ بە دەستی خۆی ٧٨ کەسی سەربڕیوە.

33- Malcolm, 138; ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٦٥.

٣٤ـ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١١، ٣١٤؛ ڕۆستەموتتەواریخ لە لاپەڕە ٣٦٥دا دەنووسێ خۆی لە تەویلەی کەریمخان هاویشت.

٣٥ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢٠٣؛ مونتەزەمی ناسری، ل٣١٤؛ ڕەوزەتوسسەفا، بەرگی ٩، ل ١٠٦.

ئاغامحەممەدخانی کاکیان لە قەزوێنەوە چوونە شیراز[٣٦]. ماوەیەک دواتر حوسێنقولیخان وەختایەک تەماشای دەکرد کە پێنج برای وەک بارمتە لای وەکیلن ـ بە نامەی وریاکردنەوەی ئاغامحەممەدخان پەژیوان بۆوە ـ ناچار بوو کە باباخانی کوڕی (فەتحعەلیشای داهاتوو) بە بارمتە بنێرێتە شیراز هەتا وەک بارمتە و بەڵێنییەک سەبارەت بە پەلامار نەدانی یوخاریباشەکان لای وەکیل وەمێنێ. دوو مانگ دواتر کەریمخان متمانەی پێکرد و فەرمانی دا منداڵەکە بەرنەوە لای باوکی، بەڵام حوسێنقولیخان ئەمجارەشیان پەیمانی شکاند[٣٧].

هەر لەڕێوە لەگەڵ تورکمانانی هاوپەیمانی پێشووی تێکهەڵچوو. گۆیا ئەم دوژمنایەتی و نێوانناخۆشییە لەو وەختەوە دەستی پێکرد کە حوسێنقولیخان چوو بە هانای ئەڵلاوێردیخانی جاجەرمی خانەخوێی پێشووی کە دەستەیەک تورکمان پەلاماریان دابوو. بە هۆی یەکێک لەو هەڵمەتانەی کە ئەو و باوکی تێیدا بەناوبانگ بوون تورکمانەکان تێکشکان. دووسەد کەس لە دیلەکانی کوشتن و هیچکام لە گیراوەکانی ئازاد نەکردن. بەڵام تورکمانەکان دەستیان لە هێرش و هەڵمەت هەڵنەگرت. میرزا علیخانی دەوەللوو کە دەیبینی سەرەنجام بە سەرهەڵدانی ئەم تەنگەژانە هەلی تۆڵەکردنەوەی لە ڕەقیب بۆ هەڵکەوتووە داری لە پشتی تورکمانان دا و سمێڵی چەور کردن[٣٨].

حوسێنقولیخان نە تەنیا ڕێوڕاست بۆخۆی کەوتە شەڕی تورکمانان بەڵکوو بەگوێرەی گێڕانەوەی ڕەزاقولیخان لە دوایین هێرشیدا پەلاماری ئەستەرئابادیشی دا. لەم هەڵمەتەدا بە هۆی خۆڕاگری حوکمڕانی ئەستەرئاباد و خەڵکەکەی شکستی هێنا[٣٩]. وا وێدەچێ کە ئەم ڕووداوە بووبێتە هۆی پشتلێهەڵکردنی ڕێکخستنەکانی ژێربەژێری لە ئەستەرئاباد. شەوێک پاش دوایین هێرشی لە بەهاری ١١٩١ی کۆچی / ١٧٧٧ی زایینیدا، کاتێک کە لە دەرەوە خەوتبوو، لە بەرچاوی پارێزەرانی چەند کەس لە تورکمانەکان پەلاماریان دا و

---

٣٦ـ گوڵشەنی مراد، ل ٣٠٢؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٧٤ ـ ١٧٥، لەبری عەلیقولی نووسیویەتی مەهدیقولی.

٣٧ـ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١٤؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ١٠٧.

٣٨ـ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١٤؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ١٠٦ ـ ١٠٨.

٣٩ـ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ١٠٦ ـ ١٠٧.

کوشتیان. ڕەنگە ئەوانە بە تۆڵەی پێشوو یان بۆ وەرگرتنی خەڵات لە میرزا عەلیخان وایان کردبێ[٤٠]. تەرمەکەی لە ئەستەرئاباد نێژرا. بێگومان نەمانی بوو بە هۆی ئۆخژنی دەروونی زۆران بەتایبەت ئی خودی وەکیل، بەڵام کەریمخان گەلێک بە مێهرەبانی سەرەخۆشی لە ئاغامحەممەدخان کرد[٤١].

مەرگی خانی گەنج ئاکامێکی ڕەزامەندانەی لێکەوتەوە و نیشانی دا کە قوانلووەکان وەک یەک جستە دژکردەوە دەنوێنن و ئامادە نین ئۆقرە بگرن. ئەگەرچی بەڵگەنامەی ڕاستەقینە سەبارەت بە کاکەوبرالەی میرزا عەلیخان و بکوژانی بە دەستەوە نیە، بەڵام زەمانێکی کە مورتەزاقولیخان لە ئەستەرئاباد دەژیا، گومان و دردۆنگی خۆی لەم بارەوە بە تویکڵەوە لای غولامێکی ناڕازی دەوەللوو درکاند و ئەمە وای کرد کە کابرا ئاغاکەی بداتە بەر تفەنگ و بیکوژێ. دوابەدوای شوێنکەوتی بەدەنگوهەرای ئەم ڕووداوە مورتەزاقولیخان و هاوڕێیانی بە سلامەت بەرەو نەوکەندە ڕایانکرد[٤٢].

٤٠ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٧٤؛ سارەوی، ل ٢٧؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١٤؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، ل ٢١٢؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٦٢ ـ ٣٦٣. جیاوازییەک لە بابەت شوێن و شێوەی کوژرانی لە گۆڕایە. بە گوتەی ڕەزاقولیخان بە خەنجەر یان نێزە لە ساڵی ١٧٧٥دا فێندرێسک کوشتیان. ئیعتیمادوسسەنتەنە دەڵێ کە لە تورکمانسەحرا بە دەس گووکلانەکانی نێو یەکێتییەکی پێکهاتووی خەنیمانی دەوەللوو کوژراوە. ڕۆستەموتتەواریخ لە لاپەڕە ٣٦١ وەک فەرهادمیرزا لە کتێبی «جامی جەم»دا، دەڵێ کە کەریمخان تایفەی «یەمووت»ی تۆقاند یان تەماحی وەبەر نان کە بیکوژن. نەفیسی لە لاپەڕە ٤١ی کتێبەکەیدا دەنووسێ کەسانێکی تایفەی یەمووت کە حاکمی دەوەللوو دەمشیرنانەی وێدان کوشتیان. لە سەر ڕێکەوتی مەرگیشی ناکۆکی هەیە و لە ساڵی ١١٨٨ تا ١١٩٢ (١٧٧٤ ـ ١٧٧٨) باس کراوە. مانگی ڕووداوەکەش بە سەفەر نووسراوە. من لەگەڵ نووسراوەکەی مونتەزەمی ناسریم کە مانگی سەفەری ساڵی ١١٩١ی کۆچی / مارس ـ ئاوریل ١٧٧٧ی زایینی هێناوە، چونکە سارەوی هەر ئەم مێژووەی بە بەهاری ساڵی ١١٩٠ داناوە.

٤١ـ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ١١٣ ـ ١١٦.

٤٢ـ هەمان سەرچاوە، ل ١١٤ ـ ١١٥.

## ۹ ـ ۷ ئاغامحەممەدخان

سەبارەت بە سەردەمی دەسبەسەر بوونی ئاغامحەممەدخان تا ئەو رۆژگارەی لە تاران پاڵی دایە سەر تەختی پاشایەتی، گەلێک جەفەنگ و قسەی خۆش لە گۆڕێ دان. زۆرێک لەم نوکتانە دەگەڕێنەوە سەر ڕاستی ڕووداوەکان و لە کانیاوی هەستی کۆمەڵانی خەڵک هەڵقوڵیون و نیشانەی تۆڵەن لە ڕێی سووکایەتی و گاڵتەجاڕی. هێندێک لەم نەقڵانەش لەگەڵ ڕاستەقینە یەکتر ناگرنەوە و دەچنەوە سەر ئامانجی پێشوو. تەواوی ئەم نەزیلانە ئەگەر تێکڕاش لە لایەن قاجاریان یان سەرچاوەی ترەوە گێڕدرابنەوە لەم ڕاستییەدا هاودەنگن کە «یەختەخان» لە قۆناخەکانی پیریدا ببوو بە بوونەوەرێکی نائاسایی و خاوەن دڵ و دەروونێکی تاریک و سرشتێکی ماخوولیایی و شێلگیر کە توانستی قینەوەنی و دوژمنایەتی سەبارەت بە «وەکیل»ی خانەخوێی سایەچەوری و هەموو بنەماڵەکەی ڕەنگی دایەوە.

بەگوێرەی دەقی تێکڕای سەرچاوەکان لە ماوەی شازدە ساڵ مانەوەی لە شیراز سەرەڕای بوغز و ناجسنییەکی کە دەینواند لەبری وەی وەک دیل و بارمتە لەگەڵی بجووڵێنەوە بە چاوی میوان تەماشایان دەکرد. ئەو جۆرەی بۆخۆی بۆ باباخانی برازای گێڕاوەتەوە، هەموو بەیانییان کە لەگەڵ وەکیل لە سەر کەنارەیەک بەرچایی خواردووە(۱۱) بە چەقۆ کەنارەکەی دێغدێغ کردووە[۴۳]، کەچی کەریمخان ئەم کردەوەی وەک ناخۆشەویستییەکی سروشتی وی دادەنا و خۆی شلوێ نەدەکرد و فەرمانی دەدا کە هەموو ڕۆژێ کەنارەکە بگۆڕن. لەگەڵ ئەمەشدا یەختەخان نەیدەهێشت ئەم هەستانە زاڵ بن بە سەر چۆنیەتی پێوانەکردنی پاراستنی نەفس و کاری گرینگی لە درێژخایەندا. بەڵام تەنانەت لەو زەمانیشدا ئەو بە پێوەری تۆڵە خەڵکی سەنگوسووک دەکرد. فەتحعەلیشا هەمیشە ئەو نەقڵەی گێڕاوەتەوە کە وەختایەک ناوی باباخان و منداڵێکی پێنجشەش ساڵانە بووە و چەشنی بارمتە لە شیراز ژیاوە، کەریمخان وەک

۴۳ـ ئیحتیشامولمولک، ل ۱۳۲؛ مستەوفی، ل ۵؛ .Malcolm, 265

منداڵەکانی خۆی چاوی لێکردووە و ئیزنی داوە لەگەڵ شازادەکانی بارگای زەندیە گەمە و کایە بکا. ڕۆژێکی لەگەڵ لوتفعەلیخانی شەشساڵانەی برازای(١٢) کەریمخان بە زۆرەبانی هاتووە و ملانەی کردووە. (ئەم لوتفعەلیخانە دوایین فەرمانڕەوای زەندیە بوو و وەختایەک هەژدە ساڵ دواتر بە دیل گیرا بە فەرمانی ئاغامحەممەدخان هەتا ئاویلکە بە شێوەیەکی دڕندانە ئەشکەنجە و جڕیاوفڕیا درا.) گۆیا لەم ململانییەدا باباخان بەقەوەتر بوو، بەڵام ئاغامحەممەدخان لە بنەوە چاوێکی لێهەڵتەکاند و تێیگەیاند کە دەس هەڵگرێ؛ کەریمخان پێیزانی و بە سەری ڕۆیی و گوتی لە ئێستاوە منال فێرە فێل مەکە. پاشان دنەی باباخانی دا کە چاک زۆرەبانی بگرێ و داینایە سەر ڕانی و ماچ و ئافەریمی کرد[٤٤]. لە نێو تەواوی ئەو نەزیلانەدا کە بۆ پێکەوە هەڵسەنگاندنی سەرجەلەی میرانی زەند و قاجار هێناویانە، ئەو داستانە ڕەوانترین و پتەوترینیانە.

ئاغامحەممەدخان لە ماوەی دوورخرانەوەی بۆ شیراز ئەوەندەی ڕقهەڵگرتبوو کە پاشان نە تەنیا دەربارەی دوایین پاشەواری خانەدانی زەند بەڵکوو تەنانەت سەبارەت بە دووکاندارێکی گومناوی شیرازی کە گاڵتەی پێکردبوو کەوتە تۆڵەکردنەوە و ڕقی پێڕشت. یەکێک لە ڕۆنفرۆشەکانی شیراز (بەپێی هێندێک لە سەرچاوەکان بەقاڵێک) هێندێکی شت پێدەفرۆشێ و دەڵێ ئەمە ماڵی «قەجەری»یە. وەختایەک ئاغامحەممەدخان لە ساڵی ١٢٠٦ی کۆچی / ١٧٩٢ی زایینیدا پاش گیرانی شیراز هاتە ئەو شارە بە شوێن کابرادا گەڕا و ناسییەوە و گرتیان و پاش وتووێژێکی مشکوپشیلانە کوشتیان. لە بەسەرهاتێکی دیکەدا کابرایەک بۆ سووکایەتی بە ئاغامحەممەدخانی گوتبوو زەمانێکی کە تۆ بوویە شا زگم بدڕە؛ «یەختەخان»یش بەوەخت پێشنیارەکەی(١٣) جێبەجێ کرد[٤٥].

تەنیا یاد و بیرەوەرییەکانی شیراز ئەوی هان نەدەدا بۆ ئاکار و کرداری وەها دڕندانە و توندوتیژ، بەڵکوو لەم چەشنە کار و کردەوانە لە سەردەمی

---

٤٤ـ ئیحتیشامولمولک، ل ١٣٢.

٤٥ـ ئەم بەسەرهاتە بە چەن جۆر دەگێڕنەوە. تێکەڵەیەکی حەوڕەنگیلە لە کەسان و سووکایەتی و ئاکامەکان دێتە بەرچاو. لە گێڕانەوەیەکدا بەقاڵی تاوانبار لە نێو سەرسوڕمانی خۆی و ئێمەدا کە دەیبیستین دەکرێتە سەرۆکی بەقاڵان.(مستەوفی، ل٥ـ ٦).

پاشایەتی لە ساڵانی دواتریشدا وەبەرچاو دێ. ئاغامحەممەدخان هەمیشە سەبارەت بە ژێردەستانی بێڕوحم و زاڵم بوو. یەکێک لە کارەکانی دەرهێنانی ڕیخۆڵەی ئەو خزمەتکارانە بوو کە لێیان غەزریبوو. وەختایەک ئەم بێچارانە هەر مابوون و کەوتبوونە ئاویلکە ورگ و ڕیخۆڵەیان لە دەوری سەریان دەهاڵاندن و دەیانخستنە بەر هرووژمی قەل و داڵان[46]. ئاغامحەممەدخانیش چەشنی وەکیل شەرابی دەخواردەوە و زۆرتر ئەو فەرمانانەی ڕۆژی پێشتر دابوونی لە یادی دەچۆوە و وەک شێتان دەیفیشقاند و جاری واش بوو کەسانی چارەڕەشی خۆشەویستی لە بەرچاوی خۆی دەکوشت[47]. لەم نێوەدا دەکرێ ناوی میرزا جەعفەری ئیسفەهانی(١٤) وەزیری کە قەدیم وەزیری کەریمخان بوو بێتە گۆڕ. جارێکی کە میرزا خەریکی دانی ڕاپۆرتی ڕۆژانە بوو لەخۆڕا گڕنەی تێهاڵاند، سەرەتا باڵنجەکەی تێهەڵکرد، پاشان قەنناویکەی بە سەری دادا و دواتر هەرچی لەبەر دەستی بوو ڕێیهاڵاند و سەرەنجام دەمانچەیەکیشی پێوەنا. میرزا جەعفەریان بە شان و شەپیلکی بریندارەوە بردە دەر. ئاغامحەممەدخان بە دمم نەشەی شەرابەوە لێی خەوت و قەت باسی ئەو ڕووداوەشی نەکردەوە. چەند مانگ دواتر وەزیر گەڕایەوە سەر کاری خۆی و دەتگوت هەر هیچ نەقەوماوە[48]. وا وێدەچێ کە خەساندنی لە سەرەتای ژیانا بە دەس عادڵشا و دوابەدوای ئەو دیلبوونەکەی لە شیراز گیرۆدەی مەینەتێکی ئەبەدییان کردبێ. لە شەڕ و کێشەیدا بە خاتری سازکردنی زنجیرەی خانەدانی پاشایەتی قاجار بە هەموو هێز و توانای خۆی تەواوی ئەو ئامانجانەی کە بە مەبەستی خزمەت گەڵاڵە کرابوون تێیدا بردن. ئەم کەمئەندامییە بۆ ئیمپراتۆرێکی سەرکەوتوو وای لێکردبوو کە تەواوی توانستی خۆی بە شێوەیەکی لە ڕادەبەدەر بەختی حاڵوباڵی لەشکری و تێر و تەسەلی سپاکەی بکا و بە چاوی سووک دەیڕوانییە توێژی کارگێڕانی ئیداری و دیوانسالاران و پێی دەگوتن «پێبەخەنە»[49]. ئەگەرچی ئادەمیزادێکی نەخوێندەوار نەبوو، بەڵام مەیلێکی واشی بە خوێندنەوە نەدەدا و

46- Watson, 66 – 67.
47- Kotzebue. 256.
48- Ibid, 256 – 258.

٤٩ـ سەعید نەفیسی، ل ٥٥ ـ ٥٧.

گۆیا زۆربەی ماوەی دەسبەسەر بوونەکەی لەگەڵ براچکۆلەکانی دەچوو بۆ ڕاو یان لە بیران ڕادەچوو و فکری دەکردەوە[٥٠].

ئاغامحەممەدخان لەگەڵ تەواوی بێڕوحمییەکانی وەک سیاسەتوانێکی بەتوانا ناوی دەرکردووە. «ژۆرژ فۆرستێر» کە لە کلکەی ساڵی ۱۷۸۰ و بەر لە سەرنخوونی دوایین میری زەند بە ساریدا تێپەڕیوە ئاماژە بە شەراب خواردنەوەی لە ڕادەبەدەری ئاغامحەممەدخان دەکا و دەڵێ: لەگەڵ ئەمەشدا وا وێناچێ کە ئەم خدەیە وای لە خەڵک کردبێ کە لەخۆڕا داوەری لە سەر بکەن؛ خانی قاجار وەک کەسێکی بەئەزموون و زۆر توانا مەنشووره و ئەم دۆزە لە سەرانسەری قەلەمڕەوی حکوومەتیدا وەبەرچاو دێ[٥١]. وەک گوتوویانە هەر ئەم لێوەشاوەیی و توانستە سیاسییانە وایان کردبوو کە لە ماوەی دیلێتیدا کەریمخان ڕێزی لێبگرێ و ناوی بنێ «پیرانی وەیسە». ئەم ناوە ئاماژەیە بە «پیران»ی سەرداری ئاقڵمەندی «ئەفراسیاب» کە بە وریایی و زیرەکی بەناوبانگ بوو[٥٢].

ئەو نەقڵ و نەزیلانەی سەبارەت بە تەمای وەکیل کە ویستوویەتی بە مەبەستی هێنانەوەی برا سەربزێوەکەی لە دامغانەوە ئاغامحەممەدخان بنێرێ، بەڵام میرزا جەعفەری وەزیری بە بەرژەوەندی نەزانیوە[٥٣]. ڕەنگە هەروەک خۆهەڵکێشانەکانی دیکەی قاجار بێ، کەچی وێدەچێ هەر ئەو وەختەی کە ئاغامحەممەدخان بە زیرەکی لە بابەت کار و کردەوەی براکەی داوای لێبووردنی لە وەکیل کردبێ، بەدزی براکەشی بە مەبەستی وەدەسهێنانی سەربەخۆیی تین دابێ. لە گەرمەی ڕاپەڕینی براکەیدا پێی گوترا کە بۆ پاراستنی گیانی پەنا بەرێتە بەر گومبەزی ئیمامزادەیەک، بەڵام کەریمخان دڵنیای کردەوە کە قەت نابێتە ئامانجی تۆڵە[٥٤]. وێناچێ ئاغامحەممەدخان ئەوەندەی کە لە کوشتارا لێزانی نیشان دا، ئەهێندە سیاسەتمەدارێکی باش بووبێ. ئەو بۆخۆی

٥٠ـ مستەوفی، ل ٥؛ پاکڕەوان، ل ٢٧.

51- Forster I, 198.

٥٢ـ ئیحتیشامولمولک، ل ١٣٢.

٥٣ـ پاکڕەوان، ل ٥٢ ـ ٥٣.

٥٤ـ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١٤.

حوسێنقولیخانی لە قاجارەکانی دەوەللوو تیژ کرد، بەڵام وەختایەکی لە یەکەم ڕاکردنیدا بەرەو مازەندەران گەیشتە ئەو شوێنە، ناچار بوو کە دوو لقی خێڵەکە پێکەوە ئاشت کاتەوە و یەکێتییەک لە بەرامبەر خانەدانی زەندا بەدی بێنێ. وا وێدەچێ کە ئەو تێکەڵەیەکی لە بێبەزەیی براکەی و توانستە سیاسییەکانی باوکی بە میرات بردبێ. ئەم دوو سفەتەی لەگەڵ ڕوانگەیەکی بەربلاو و خەیالات و بۆچوونێکی ڕەش و تاریکی تایبەت بە خۆی تێکڕا هەبوو. ئەوەی لێرەدا زۆر سەیرە هەڵوێستی کەریمخانە. ئەو سەرەڕای بەزەیی و میانەڕەوی ئاسایی، هەروەک لە وەختی پێویست و تەنگەتاویدا دیتراوە، بێڕوحمیشی دەنواند، بەڵام سەبارەت بە ناسینی کابرایەکی کە مەترسییەک گەورە بوو لە سەر درێژەی حکوومەتی بنەماڵەکەی کەمتەرخەمی کرد.

ئەو ئازادییە کەمتاکورتەی خانی قاجار لە سەردەمی دیلێتیدا لە شیراز بووی و ئەو گەشت و سەیرانە بەردەوامەی کە بە مەبەستی ڕاو چەند ڕۆژ لەو شوێنەی دووردەخستەوە، لە کاتی مردنی وەکیلدا بابەتی ڕاکردنەکەی بۆ هاسان کردەوە. هەڵاتنەکەی نە تەنیا وەدەسهێنانەوەی دەرفەتێک بوو بۆ کەلکوەرگرتن لە دۆزەکە بەڵکوو مەسەلەی بارناسکی مەرگ و ژیانیشی پێوە گرێدرابوو. بۆیە چاوەڕوانی بەزەیی کەسێکی وەک زەکیخان نەبوو کە دواتر تەواوی کەسوکاری خۆی و خانەدانی زەندی قەلاچۆ کرد. وەختایەک حاڵی کەریمخان پتر تێکچوو، پووری ئاغامحەممەدخان کە خێزانی وەکیل بوو بە ناردنی نامەیەک بە پێشخزمەتێکدا بە ناوی سلێمانخان(١٥) ئەوی لە ئاڵوگۆڕ و ڕووداوەکان ئاگادار کردەوە. خانی قاجار پێی نایە ڕکێف و لە شار دەرکەوت و وای نواند کە دەچێتە ڕاو، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە خزمان و یارانی خۆی لێک کۆکردبۆوە و چاوەڕوان بوو هەتا هەواڵی مردنی وەکیلی بۆبێ. ئەم هەواڵە لە ١٣ی سەفەری ساڵی ١١٩٣ی کۆچی / ٢ی مارسی ١٧٧٩ی زایینیدا گەیشتە دەستی. بۆ سبەینێ کابرای بارمتە و هاوڕێیانی لە سەفەرێکی دوور و دژوارا بەرەو مازەندەران پێیان پێوەنا هەتا جڵەوی بەختی خەوتووی قاجارییەکان بە ساز و ئامادەیی بۆ پێشڕەوی بەرەو سەدەیەک مەزنایەتی وەپاشکەوتوو بە دەستەوە بگرن[٥٥].

٥٥ـ سارەوی، ل ٣٠ب، ٢٩؛ ئیسفەهانی، ٦٦ئا ـ ب؛ مستەوفی، ل ٦؛ Malcolm, 157-158

# تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ «خەجیج خانم»ی خوشکی محەممەدحەسەنخان، ژنی کەریمخان بوو.

٢ـ یەمووت یەک لە تایفەکانی تورکمانە و لە لای کوتوول نیشتەجێن و دوو لکی سەرەکین. دووجی و بەدراق. تەواوی تیرەکانی یەمووت خۆیان بە تۆرەمەی دوو بەرەباوک بە ناوی شەرەف و چوونی دەزانن. دوو تیرەی گەورەی یەمووت ناویان «جەعفەربای» و «ئاغابای»ە.

٣ـ گووکلان لە تیرە و تۆرەمەکانی گورگان و لە لای گونبەدی قابووس نیشتەجێن. دوو بەرەی سەرەکین «دوو دەوەرەقە» و «حەلقەداغی»ن. وشەی گووکلان بەگوێرەی نووسراوەی «کامرانی»، پێداچوونەوەی مەسیحی زەبیحی لە دوو وشەی «گووک» بە مانای سەوز و «لان» بە مانای شوێن سازکراوە. ناوچەکە لەبەر سەوزەلانی و بەرپێژەوی وا ناودێر کراوە.

٤ـ جاجەرم شارۆچکەیەکە لە نێوان نەیشابوور و جوین و ئەڵلاوێردیخان حاکمی بوو. لە سەرەتای راپەرینی حوسێنقولیخانی قاجار بە خۆی و هەزار کەس لە سوارانی گرایلی تورکمان دایە پاڵی.

٥ـ قەڵای ئاکرکی کەتبووە هەزارجەریبی مازەندەران. ئێستا لە مەڵبەندی چواردانگەی هەزارجەریبدا گوندێک بە ناوی ئاوکرکا هەیە...

٦ـ لەم کتێبەدا زۆر باسی سەربازی ئێلجاری (بونیچە) کراوە. ئەم وشەیە لە دوو بەشی «بون» + «یچە» سازکراوە. بون (بن) بە مانای ریشە و بنەرەتە. بە شێواز و لیستەی باج و پیتاک دەگوترا. پیتاکی گوندان بەگوێرەی رێژەی ملکوماش و داهات و نفووس حیسێب دەکرا. بۆ گرتنی سەربازی لەشکریش ئەمانە وەبەرچاو دەگیران و خەرجی کابرای سەرباز تا شوێنی لەشکر و یارمەتی خەرجوبەرجی بنەماڵەکەی لە ماوەی خزمەتا لە ئەستۆی خاوەنی «بنیچە»یان مالیک بوو. چەکداری بونیچە (ئێلجاری، بەبێگارگیراو، ئیجباری) سەربازێک بوو کە خەڵکی هەر گوندێک دەیاندا بە حوکمران یان حکوومەت.

٧ـ گوڵباد بە کۆمەڵە گوندێک دەگوترێ لە مەڵبەندی «گەلووگا» کە کەوتۆتە نێوان گورگان و کۆمەڵە گوندی «یەخکەش» و مەڵبەندی «مایەسەر» لە

شارستانی ئەشرەف.

٨ ـ نەوکەندە یەکێک لە شارۆچکەکانی گورگانە و بەشێکە لە مەڵبەندی بەندەرگەز.

٩ـ حوسێنقولیخان دوو خوشکی هەبوو: بیبیشاجیهان کە لە سەرهەڵدانی حوسێنقولیخان و کوژرانی بە دەس تورکمانانلدا بە دیل گیرا و فرۆشرا. عەلیمحەممەدخان بە ٥٠تمەن کڕی و مارەی کرد. چونکە بەبێ ئیزنی کەریمخان وای کردبوو، کەوتە بەر تووڕەیی. کچە کە هێشتا نەگوێزرابووە و نەچووبووە پەردوو نێردرایە قەزوێن. کەریمخان دەیەویست لە ڕەحیمخانی کوڕی مارە بکا بەڵام چونکە کوڕە جوانەمەرگ بوو درا بە عەلیمرادخانی زەند و خانلەرخان لەو بەرەدایکەیە. خوشکەکەی تری حوسێنقولیخان یەکێک لە ئەندامانی بنەماڵەی قاجار خواستی.

١٠ـ کردەوەی زەکیخان لە گیلان بەشێکە لە چەپەڵکارییەکانی مێژوویی ئەو. کە دەگەیشتە هەر شوێنێک خەڵکی تەتەرپێچ دەکرد و ماڵی بە تاڵان دەبردن و دەیکوشتن. لە ئیسفەهانیشلدا وەختی ڕاپەڕینەکەی دژی کەریمخان هەر وای کرد... لە گیلان پاش ئەوەی زەبروزەنگی زۆر نواند، حاجی زەکیخانی ڕدێنسپی چواردانگەی کەلاتەی لەگەڵ سەگ لە فەلاقە کرد و چواربەندەی لێکترازاند و هەڵیقلیشاند... .

١١ـ ڕێزدار پێری لەبەر پێچەڵفلووچی ڕستە فارسییەکانی کتێبی گوڵشەنی مراد، سەری لێشێواوە و لەبری شێوی شەو نووسیویەتی بەرچایی.

١٢ـ بەگوێرەی نووسراوی ڕێزدار ویلیام فرانکلین لە گەشتنامەکەیدا، بە ناوی «لە گەشتی بەنگالدا بەرەو ئێران چیم چاو پێکەوت» نووسیویەتی کە لوتفعەلیخان لە ساڵی ١٧٨٧دا نۆزدەساڵانە بووە. جا لەبەروەی فەتحعەلیشا ساڵێک لە لوتفعەلیخان گەورەتر بووە و ئەم گێڕانەوەیە لە کتێبی فارسنامەی ناسری وەرگیراوە، هەڵە دەنوێنێ. چونکە ڕێزدار پێری نووسیویەتی کە لوتفعەلیخان لە باباخان (فەتحعەلیشا) باوخۆشتر بووە. ڕەنگە ئەم ڕووداوە پێوەندی بە ئەبولفەتحخانەوە بووبێ کە لە دایکبووی ساڵی ١١٦٩ی کۆچی / ١٧٥٥ی زایینییە. لوتفعەلیخان کوڕی برازای کەریمخان بووە، نەک برازای.

١٣ـ بەسەرهاتی بەقاڵی شیرازی بەگوێرەی گێڕانەوەی خوداڵێخۆشبوو

مستەوفی لە کتێبی «بیرەوەرییەکانی ژیانی من»دا ئاوایە: « لە ڕۆژگاری دەسبەسەری ئاغامحەممەدخانا لە شیراز، خانی قەجەر سەودای لە بەقاڵی گەڕەک دەکرد و هەرکات مانگانەکەی درەنگ دەهات شتی بە قەرز دەدایە. جاروبار کە بە دەرگای دووکانا ڕادەبرد، دەیگوت ماست و پەنیر و ترێ یان کەلوپەلی دیکەمان بۆ دانێن. بەقاڵ هەمیشە بە شاگردەکەی دەگوت هەستە ماست و پەنیر و ترێی قەجەری بۆ خان دابنێ با نۆکەرەکەیان کە هات گیر نەبێ. ڕۆژێک کە بەقاڵ لەوێ نەبوو خان لە شاگردەکەی پرسی وەستاکەت مەبەستی لە شتی قەجەری چیە؟ کوڕەی شاگردیش دەقودۆغر گوتی ئێمە ئەو شتانەی لێرە کۆن دەبنەوە و خۆیان دەخۆنەوە وەلایان دەخەین و ئاوا ناودێر کراون. ئاغامحەممەدخان وەختایەکی شیرازی گرت ناردی بە شوێن ئەم بەقاڵەدا. بەقاڵ لە ماڵەوە وەسیەت و خواحافیزی کرد و چووە خزمەت شا، بەڵام ئاغامحەممەدخان بەپێچەوانەی ئاکاری لاواندییەوە و کردی بە سەرۆکی بەقاڵانی شار.»

سەبارەت بە حیکایەتەکەی تر ئاوا دەنووسێ: «هەروەها ئاشکرایە کە پووری ئاغامحەممەدخان ژنی مەلایەک بووە لە شیراز. خانی قەجەر هەر وەختایەک چۆتە سەردانی پووری، مەلای شیرازی ڕوویەکی وای نەداوەتێیە تا وای لێدێ کە ئاغامحەممەد بە ئاشنایەکی بەینی خۆیاندا لێیڕادەسپێرێ و گلەیی لێدەکا. مەلای شیرازی لە جوابی ئەو گلە و گازندانەدا ڕێوڕاست گوتبووی بەم خانی قەجەرە بڵێن پێی خۆش بێ و پێی ناخۆش بێ ئاوایە و هەر وەختایەکیش بوو بە شا با زگم بدڕێ! دەڵێن شای قەجەر هەر ئەو ڕۆژەی ناردبووی بە شوێن بەقاڵدا، لە دوای مەلاشی ناردبوو و داوای دە پازدە ساڵ لێرەوبەری بەجێهێنابوو.»

بەسەرهاتەکە چ بێ و چۆن بێ تێکرا باسی تەبیاتی ڕقەوەنانەی ئاغامحەممەدخانە، بەڵام پووری وی ژنی کەریمخان بووە نەک مەلایەکی شیرازی و خودالێخۆشبوو مستەوفی لەم بارەوە هەڵەی کردووە. هەروەک لە کاتی ڕاکردنی ئاغامحەممەدخانیشدا دەنووسێ: پووری کە هاوسەری مەلایەکی شیرازی بوو، هەواڵی مەرگی کەریمخانی پێڕاگەیاند.

١٤ـ مەبەست میرزا محەممەدجەعفەری ئیسفەهانییە کە پێشتر لە

نووسینگەی نادرشادا خزمەتی دەکرد. پاش گرتنی ئیسفەهان لە لایەن ئازادخانەوە بوو بە وەزیری. لە تەواوی سەردەمی حوکمڕانێتی کەریمخانیشدا بە وەزیری وی دادەندرا. ئەو کابرایەکی بەفیز و وریا بوو و ساڵێک پاش مردنی کەریمخان لە ساڵی ١٧٨٠دا کۆچی دوایی کرد. ڕێزدار پێری هەڵەی کردووە و میرزا جەعفەر قەت وەزیری ئاغامحەممەدخان نەبووە.

١٥ـ سلێمانخانی قاجار کوڕی محەممەدخانی قوانلووی سەرداری محەممەدحەسەنخان بوو لە مازەندەران. لە تەمەنی دەساڵیڕا وێڕای خەجیجخانمی خوشکی محەممەدحەسەنخان چووبووە بارگای وەکیل. کاتێک وەکیل مرد ئەو خاتوونە بە سلێمانخاندا هەواڵەکەی نارد بۆ ئاغامحەممەدخان. خانی قاجار لە شیراز ڕایکرد و بە ڕێی ئیسفەهان و تاراندا هەڵاتە مازەندەران. سلێمانخان پاشان بە یەکێک لە نیزیکترین یارانی ئاغامحەممەدخان دادەندرا و نازناوی «نیزامودەولە»ی درابوویە.

# ١٠

# کەنداوی فارس

## ١٠ ـ ١ بارودۆخی گشتی

لەودیو دۆڵەکانی کۆهکیلۆیە و تەنگستان و لار، خاکی ئێران لە سەر کەنداوی فارس بە درێژایی هەزار مایل لە مەودای چەند ڕۆژەڕێی پایتەخت ڕاکشابوو. کەنار و دورگەکانی هەرتک بەری کەنداو لە ژێر دەسەڵاتی بنەماڵە عەرەبەکانی خۆجێییدا بوون. ئەمانە لە مەڵبەندەکانی خۆیان جگە لە داهاتی ماسیگری، ڕاوی مرواری و قازانجی بازرگانێتی دەکەوتنە دزی و ڕاووڕووتی دەریایی دژی خەڵکی خۆوڵاتی و دراوسێیانی دەرەوەیان و دەیانخستە سەر سامانیان و زیاتر بە شێوەی ڕواڵەتی ملکەچی و فەرمانبەرداری خۆیان سەبارەت بە حوکمڕانانی ناوچەیی وەک ئیمامی «مەسقەت» و عومان و لێوارەکانی عەرەبی کەنداو و خانی ئێرانی لار نیشان دەدا. حاکمی لاریش ئەگەرچی دەسەڵاتی بە ناوی بەگلەربەگی لە شاوە وەرگرتبوو بەڵام پاشان وا بەهێز ببوو کە دەیتوانی لە سەرانسەری قەڵەمڕەوی حوکمڕانییەکەیدا پارێزگاری لە خۆی بکا. لە سەرەتاکانی دەورانی سەفەویدا بە خاتری بوونی کەسانی نیشتەجێی

ئورووپایی و دەسەڵاتە بازرگانییەکانی ڕەقیب کە دەیانویست بەهرەی بەرچاو لە حاکمانی ناوچەیی و ئاغاکانیان وەربگرن، زۆر بوون لەم چەشنە حوکمڕانانەی کە جارناجارێکیش بە مەبەستی پێشکەوت و هاتنەدی ئامانجەکانیان بە هۆی دزانی دەریایی دەکەوتنە تۆقاندن و داگیرکردنی خاکی دەروجیرانان.

نادرشا سەبارەت بە پشتگیری و سەرنجدانە سەر بازرگانانی ئورووپایی ڕەوت و ڕێبازی حکوومەتی سەفەوی درێژە دا و بە مەبەستی کەلک وەرگرتن لە هێزی دەریایی ئەوان بۆ بەرفرەوان کردنی دەسەڵاتی بە سەر پانتایی کەنداوی فارسا سیلەچاوێکی لێیان بوو. لە لایەکی تریشەوە تێگەیبوو کە پەیڕەو کردنی وەها ڕەوت و سیاسەتێک لەبەر بەسترانەوەی ئێران لە جەغزی داخوازەکانی غەوارانەدا ئاکامێکی زۆر دڵخوازی لێناکەوێتەوە. بۆیە بەگوێرەی بێمەیلی بریتانیا لە یارمەتیدانی پلانەکەیدا نادر دەستی دایە سازکردنی هێزێکی دەریایی تایبەت بە وڵاتی خۆی و دوو پاپۆری ٤٠٠تۆنی کە هەرکامەیان ٢٠تۆپیان لە سەر دابەسترابوو لە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی کڕی و سەرەڕای ئەوەش گەلێکی لۆتکە لە دراوسێیانی عەرەبی ئێران کۆ کردەوە. وەستاکار و تەختە و دارێکی زۆریشی لە پارێزگای مازەندەرانەوە هێنایە باشووری ئێران و لانیکەم سێ پاپۆڕ بە داب و شێوازی کەشتییەکانی ئورووپایی لە بووشێهر سازکرا. مردنی نادر بنچینەی ئەم گەڵاڵە گرینگەی هەڵتەکاند و تەنیا ئاکامێکی وەدەس کەوت کڕینی دوو پاپۆڕ بوو بە ناوی «ڕەحمانی» و «فەیزی ڕەببانی»(١) کە هەردک چەندین ساڵ پاش مەرگی وی بە شێوەیەکی بەرەڵڵاکراو لە لەنگەرگای بەندەرعەباسدا مابوونەوە[1]. چەند ساڵێک پاش نەمانی نادریش ئەم هێزە دەریاییە ناتەواوە هێشتاش خەیاڵی جێنشینانی وی لە خۆی شەتەک دابوو: برایمیرزا، شاروخمیرزا و لە کاتی خۆیا کەریمخان و بەگلەربەگی ناوچەکانی گەرمێنیش هەرکام فەرمانێکیان بۆ مەلاعەلیشا نارد و وێڕای هەڵبژاردنی وی وەک حوکمڕانی بەندەرعەباس ڕایانسپارد کە زۆر چاک ئاگاداری لەو کۆمەڵە پاپۆڕانە بکرێ[2].

1- See Lockhart, Nadir shah, 213 – 215 ; Vadala, 17. نەشئەت ٦٥٩ ـ ٦٦٢

2- GD VI, 31 October 1747 ; VII, 25 and 27 Februarv 1757.

• هەوڵەکانی دیکەی نادر بە مەبەستی هێنانە ژێرکێف و دەستەمۆ کردنی سوڵتانەکانی گچکە و داگیرکەری کەنداو سەرکەوتنێکی ئەوتۆی وەدەس نەهێنا. یەکەمین هەڵمەتی نادر دژی جولفار و عومان هەر لە کاتی دابەزینی هێزەکانی لە ساڵی ۱۷۳۷دا تێکشکا. لە شالاوێکی دیکەدا کە تەقیخانی شیرازی سەرکردایەتی هێزەکانی نادری لە ئەستۆ بوو، سەربزێوانی مەسقەت هاتنی سپای ئێرانییان بە هەل زانی و شاریان داگیر کرد و ماوەیەک دواتر قەڵاشیان گرت، بەڵام لە ساڵی ۱۷٤٤دا دیسانەوە ئێرانییەکان چەک کران[3].

لە ساڵی ۱۷۳٦دا تەقیخان «بەحرەین»ی لە چنگ شێخ جابری هووەیلەی عەرەب دەرهێنا(۲). شێخی ناوبراو ئەم دورگەیەی لە ساڵانی ئاخری حوکمڕانێتی سەفەوییەکانا داگیر کردبوو. وەختایەکی کە ئێرانی لە بەستێنەکانی عومان کشانەوە ئەم دورگەیەش لە دەستیان دەرهات. لە نیزیک ساڵی ۱۷٥۲دا، دورگەی بەحرەین بە تێکۆشانی شێخ نەسری بووشێهری وەرگیرایەوە. وادیار بوو کە نادرشا شێخی وەک دەمڕاستی کۆمەڵە دورگەکان هەڵبژاردبوو.

• لەم هێرشەدا ڕەقیبەکەی واتە میرناسری زەعابی(۳)بەندەرڕیگی و تایفەی عتووبی(٤) و عەرەبەکانی هووەیلە شانیان دابوویە شانی[4]. کوڕانی میرناسر بە ناوی میرحوسێن و میرمەهنا خێرایەکی جڵەوی بەهرە و قازانجی ناوچەیان بۆخۆیان بە دەستەوە گرت، بەڵام عەرەبەکانی هووەیلە ـ و ڕەنگە عتووبی ـ بەوەخت لە سەر دەسەڵات لایاندان و هێندەی پێنەچوو کە خۆیان دایە دەس شێخنەسری بووشێهری و وا وێدەچێ کە سەرەڕای هەڵمەت و شالاوی تەکولۆی عەرەبەکان شێخ دەستی بە سەر هەموو دورگەکاندا شکابێتەوە. (لانیکەم لە ساڵی ۱۷٦۹ڕا پاش مردنی میرمەهنای قینەبەری تا کاتی مەرگی خۆی کە چاردە ساڵ دواتر ڕووی دا ئەم دەسەڵاتە هەر وا مابوویەوە). سەرەنجام لە

3- Niebuht, Rabino, 298, 300 – 303 ; Lockhart, ((Iranin Gampaigns in Oman)), 157 – 171 ; Nadir shah, 215 – 222 ; نەشئەت، ل ۳۱۹.
4- SP 97, 36 1753, unfoliated ; Brieven 2756 ( 1757) Kharg 52 – 53 ; Niebuhar Arabien, 316 – 317.

ساڵی ۱۷۸۲دا، عەرەبەکانی عتووبی «بەحرەین»یان داگیر کرد[٥].

ئەم بارودۆخەش ماوەیەکی وا خۆی ڕانەگرت، چونکە وەکیل دەیویست تەواوی ئەو دوورگانەی داوای دەکردن بە ناوی خۆیەوە بیانگرێ. تەنانەت حاکمانی گچکەی بەندەرەکان کە خۆیان لەبەر شاڵاوی تەمبێیانەی وەکیل ڕانەدەگرت پاش ئەوەی هەروا سەرزارەکی لەگەڵی پێکهاتن بە هۆی هەندێک نارەزامەندی شیرازەی پەیوەندییەکان لێک پچڕا. نیبوور کە سەبارەت بە عەرەبەکانی سەحرانشینی نێوخۆیی توێژینەوەیەکی کردبوو دەنووسێ کە بۆ پاراستنی ئازادی بارتەقای برا بیابانگەردەکانیان ئازان. هەر شارێکی بچووک شێخ (حاکم)ێکی سەربەخۆی هەیە کە لە ڕاستیدا خەرج و پیتاکێک نادەن. تەنانەت نادرشای گەورەش نەیتوانی کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن سەریان پێنەوی کا[٦]. کە هێزەکانی ئێران هرووژمیان دێنا لێک بلاو دەبوون و هەڵدەهاتن و بە سواری لۆتکەکانیان بە مەبەستی خۆپەنادان لە شوێنێکی هێور بەرەو یەکێک لە دوورگەکانی دوورەدەس دەیانئاژاوت[٧]. ئەمانە شانازییان بە ڕەگەزی خێڵ و مەزەبی سوننی خۆیان دەکرد و هەر بۆیە حازر نەبوون ژن و ژنخوازی لەگەڵ دراوسێ ئێرانییەکانیان بکەن. تەنیا بابەتێکی ناوازە بنەماڵەی زەعابی بەندەرریگی بوو: باوکی میرناسر دەستی لە مەزەبی بنەماڵەیی هەڵگرت و کچێکی ئێرانی مارە کرد، بەڵام هەر وەک دەبینین ئەم ڕووداوەش ئاڵوگۆڕێکی بە سەر نێوانگرژی ئەوان و وەکیلدا نەهێنا[٨].

زۆرترین بەشی داهاتی شێخانی ناوبراو و پاشکۆکانیان لە ماسیگری و ڕاوی مرواری لە دوورگەی خارک و بەحرەین و بازرگانێتی لەگەڵ دراوسێیان لە

---

٥- Lorimer, 137 ; GN Curzon 11, 232 ; Wilson, 245. سادقی نەشئەت لە لاپەڕە ۳۱۸ ـ ۳۱۹ و ٤٠٧ ـ ٤٧١ی کتێبەکەیدا، BP XXX, 5 November 1766 ڕاپۆرتێکی هەیە لە ڕێکەوتی ۲۸ی سێپتامبردا کە تێیدا دەنووسێ دانیشتووانی سێ لۆتکەی چەکداری عەرەبەکانی هووەیلە وەختایەک تێدەکۆشان لە بەحرەین دابەزن تێکشکان و ڕەپاڵنران. بە مەبەستی پتر ئاگادار بوون سەبارەت بە عەرەبەکانی هووەیلە بڕواننە: (۱۰ـ۲).

6- Niebuhr, 311.

7- Ibid, 313, 317.

8- Niebuhr, 311, 317.

کەنداوی فارس و دەریای عومان و ڕۆخەکانی مەدرەس وەدەس دەهات. ئەم کارە تا ڕادەیەک تێکهەڵچوونی سەبارەت بە قەڵەمڕەوی کەلوپەل و ڕێگاکان دێناگۆڕ کە بە ناوی دزی دەریایی قسەی لە سەر کراوە چما بە هەڵکەوت ئەگینا بە سەر گەمییەکانی عەرەب، ئێرانی، هیندی، ئینگلیسی، فەرانسەوی و هولەندیدا سەپاوە. هەر شێخێک بۆخۆی خاوەنی پۆلێکی کەمی کەشتی بوو کە بریتی بوون لە لۆتکەی سەوڵداری تایبەتی تەنکاوان و یەکدوو گەمیی گەورەتری باتاژۆ کە بە سەوڵیش بە باشی لێدەخوڕدران. هەڵبەت شێخانی دەوڵەمەندتر چەندین «غوڕاب»یشیان پێوە زیاد دەکرد. (غوڕاب لە زمانی عەرەبیدا یانی قەلەڕەشە و چونکە ئەم کەشتییانە کووڕ و ڕەش و ترووسکەدارن و دووسێ ئەستوندەک و قەپۆزەیەکی باریکیان هەیە، ئاوا ناودێر کراون). تیژڕەوترین و گەورەترینی غوڕابەکان سێسووچەی باتاژۆی خۆماڵی بوون، تۆپەکانیان جگە لەو بەشەی کە لە کەشتییەکانی ئورووپای وەرگیرابوون و وێنەیان هەڵگیرابۆوە، گەرووڵەیەکی بچووکیان هەبوو وەک تۆپیچکەکانی هێزی زەمینی. پاپۆڕەکانی ئورووپایی زۆربەیان گەورەتر و بە باری چەکوچۆڵدا تەیارتر بوون و لە دەریای پڕ شەپۆلا چاکتریان بەرگە دەگرت. بەڵام بنکەکانی لێواری کەنداو زیاتر لە بەرامبەر هەڕەشە و پەلاماری لەنەکاوا خۆنەگر بوون.

## ١٠ ـ ٢ لەبرەو کەوتنی بەندەرەکانی خوارووی کەنداو

کۆمەڵی سەرەکی ئەم عەرەبانەی لێواری دەریا جەواسم(٥) و هووەیلە بوون. هەردک دەستە لە لای زارکی خوارووی کەنداو گرد ببوونەوە. بە ڕاوێژی خۆماڵی قەواسم زیاتر دەبێتە جەواسم یا جەواسمی. ئەمانە سەرەتا سەر بە شێخی شارجە بوون، بەڵام لەبەر سەرهەڵدانی هەلومەرجێک ئەم ناوە تەواوی تایفەکانی قەراغ دەریای باریکەی نێوان قەتەر و «ڕەئسولخەیمە»ی گرتەوە. دواتر ئەم ناوچەیە بە جولفاریش ناودێر کرا. کار و چالاکی ئەمانە زیاتر گەڕانگەڕی خۆیانی لە کەنداو دەگرتەوە. بەگوێرەی پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان هەمیشە بە شێوەی تەکولۆ خەریکی شەڕ و تێکهەڵچوون یان

هاوپەیمانێتی بوون لەگەڵ ئیمامی مەسقەت و عومانی دراوسێیان. لە ساڵی ۱۷٦۰دا لەگەڵ ئیمام پێکهاتن و هەر لەو کاتیڕا دەستیان کرد بە دزەکردن بۆ نێو دورگەی قیشم کە لە بەستێنی ئەو بەری گەروولەی هۆرمز هەڵکەوتبوو. بەشێک لە ویشکایی نیزیک بەندەرلینگە[9]، قیشم و هۆرمز لەم ڕۆژگارەدا بە دەس شێخ عەبدوڵلا بنی موعین(٦) بەڕێوە دەچوو و ئەم شێخە لە دەستندەخۆرانی مەلاعەلیشا بوو. ناوبراو لەمێژ بوو کە حوکمڕانێتی بەندەرعەباسی لە ئەستۆ بوو[10]. لە ساڵی ۱۷٦۱دا شێخ عەبدوڵلا ژمارەیەک لە خێزانەکانی «بنی موعین»ی ناوچەی چارەک(۷) کە کەوتۆتە ۱۵۰مایلی ڕۆژاوای بەندەرعەباس بە مەبەستی قایم کردنی دورگەی قیشم ڕایگوێستنە ئەو مەڵبەندە و بۆ بەربەرکانی لەگەڵ جەواسم کەوتە هاوکاری کردنی مەلاعەلیشا و تێیا سەرکەوتن؛ بەڵام لە ساڵی ۱۷٦۵دا دەستێوەردەران لە دورگەی قیشم جێپێیەکیان کردەوە[11].

عەرەبەکانی هووەیلە کە دراوسێی ڕاستەوخۆی بنیموعین بوون وا دیار بوو کە لە تەواوی تایفەکانی بەستێن و بەندەرەکانی نێوان بووشێهر و بەندەرعەباس سەرتر بوون[12]. لە بەرامبەر ئەم بارودۆخەدا مەلاعەلیشا کە فەرماندەی گەمیە شەڕکەرەکانی نادری بوو، سێ پاپۆڕی گەورەی لە دورگەی هۆرمز بە دەستەوە بوو کە قەت ئامادە نەبوون ببزوون بۆ دەریا[13]، بۆیە عەرەبەکانی هووەیلە بە درێژی دەریا و بە لای بەرەوەدا خزین و دەیانویست پەلاماری لەنگەرگاکان بدەن[14]. لە ماوەی ساڵانی سەرەتای بۆشایی دەسەڵات لە ئێرانا ناوبراو تێگەیی کە ئەگەر هاوکاری کارگێڕانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بکا ئاقڵانەترە. بریتانییاییەکان نە تەنیا سەبارەت بە دزانی دەریایی بەڵکوو لە وەختی بەگژداچوونەوەی قینەبەرەکانیشی لە ویشکانی دەیانتوانی یاریدەی بدەن، چونکە لە دەورانی هەرەجمەرەجدا ڕکەبەرانی

---

9- GD XIII, 8 December 1760 ; Wilson, 199 – 200. نەشئەت، ل ۱۹٦.

10- GD XII, 24 December 1761.

11- Niebuhr, Arabien, 313 ; Lorimer, 633; Wilson, 200 – 201.

۱۲ـ Niebuhr, Arabien, 314 ; Amin, 27. سەدیدوسسەنتەنە، ل ۲۰٤.

13- ives, 202.

14- e . g . Chirak in 1751 (GD XI, 9 May 1751)

خۆماڵی پتر لە هەموو شتێک نیگەرانیان دەکرد. لە مانگی مارسی ساڵی ١٧٤٨دا برایمیرزا سەردارێکی بە ناوی میرزا ئەبوتالب بۆ بەندەرعەباس و لار دیاری کرد. ناوبراو بە مەبەستی داوای یارمەتی لەشکری پێی‌نایە بەندەرعەباس. پێشوازی گەرمی شێخ عەبدوڵلا و نێوانساردێکی کە لەگەڵ مەلاعەلی‌شا تووشی هات، بوو بە هۆی ئەوەی کە حوکمڕانی بەندەرعەباس و نوێنەرایەتی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بکەونە دڕدۆنگی و وا تێبگەن کە سەردار دەیهەوێ بە یارمەتی عەرەبەکانی ناوچە حوکمڕانییەکی سەربەخۆ دامەزرێنێ، بۆیە مەلاعەلی‌شا لەگەڵ ئینگلیسی و هولەندی و جەماوەری شار دەستیان تێکگرت هەتا لە بەندەرعەباس دەریکەن[١٥].

تەنانەت پاش ئەوەی کەریمخان لە شیراز دامەزرا، بەندەرعەباس و ناوچەکانی سەر بە وێ لەبەر بوونی نەسیرخانی بەدەسەڵات و سەربەخۆ پەیوەندی ڕاستەوڕاستیان لەگەڵ بارگای کەریمخان دابڕابوو. پەیوەندی و نێوانی نەسیرخان لەگەڵ مەلاعەلی‌شا و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ڕووکارێکی دۆستانەی هەبوو، بەڵام وەختایەک خۆی دەهاتە بەندەرعەباس گەلێکی چاوچنۆکی سەبارەت بە وەرگرتنی دراو و جلک و باڕووت ئەو کەلوپەلانەی پەیوەندییان بە تەناهی خۆی و سامانییەوە بوو نیشان دەدا. لەو هەوڵانەدا کە کەریمخان و نەسیرخان بە مەبەستی دەسهاویشتنە سەر شارەکان و ڕێوبانەکانی بەندەر دایان، ئەوانیش بوونە بەشداری ئابووری تێکجمیوی ئەو مەڵبەندە[١٦].دوابەدوای دیدارێکی نەسیرخان کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بەڕاستی هاتە سەر گواستنەوەی لە بەندەرعەباس و چوونە دوڕگەیەکی کەنداوی فارس، بەڵام وەگەڕکەوتنی ئەم گەڵاڵەیە وەدوا خرا[١٧]. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٦٠دا وەختایەک هولەندییەکان بەندەرعەباسیان جێهێشت و چوونە خارک، دیسان گەڵاڵەکە سەری هەڵدایەوە. پاش ئەوەی کۆنەقەڵای پۆرتوغالییەکانی لە

15- GD VI, 14 March 1748 ; Brieven 2646 (1750), GD. 87 – 88 ; cf. Amin 26 – 27.
16- cf. Brieven 2696 (1753), Basra, 26 – 29 ; 2777 (1757), GD . 1, 25 and Memoir van Gamrun, 8, 9.
١٧ـ Lorimer, 91. سەبارەت بە نەسیرخان و بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە ڕۆخەکانی کەنداوی فارس بڕواننە: (٧ـ ٧ و ٥ـ ١٥).

دورگەی هۆرمزدا بۆ ئەم کارە بە مناسب داندرا، نوێنەری کۆمپانیا ڕێزدار داگلاس کەوتە دیداری ناوچەکانی نێوان دورگەکان و لەنگەرگاکانی بەندەرعەباس و بەسرە و پەیدا کردنی شوێنێکی تر. هەر لە سەرەتای ئەو ساڵەدا سەرەنجام لە سەرداوای شێخی بووشێهر و کەریمخان لەوێ دامەزرا[18].

شتێکی وا بە سەر ئەم هەنگاوەدا تێنەپەڕیبوو کە لە فێورییەی ساڵی ١٧٦٠را بەندەرعەباس بۆماوەی چەند ساڵان گیرۆدەی شەڕ و کێشمەکێشم بۆوە. کێشەکە بە ڕاپەڕینی سەربازگەی دورگەی هۆرمز دەستی پێکرد، شەپۆلی سەرهەڵدان قەڵا و تەواوی خاکی ئەو مەڵبەندەی گرتەوە و بەناچار مەلاعەلیشا ڕایکردە قیشم یا دورگەیەکی دیکە. نەسیرخان چەند هێزێکی بە سەرکردایەتی جەغفەرخانی برای ناردە وێندەرێ و ناوبراویش کەوتە شوێن ڕاپەڕیوان و لە قەڵادا گەمارۆی دان. بەڵام کێشە و سەرێشەی ئەم ناوچەیە نەبڕایەوە. وەختایەکی کە هێشتا دورگەی هۆرمز لە گەرمەیاوی پاشاگەردانیدا دەتلایەوە، بارودۆخەکە بە هۆی هێرشی قەواسم و هێرشکەرانی عەرەبی جولفار پتر ئاڵۆزکا، ئەمانە هێندێک دواتر پەلاری خودی بەندەرعەباسیشیان دا. پیاوەکانی جەعفەرخان خۆیان دایە دژەپەلامارێک و هێرشکەران بەرەودوا کشێندرانەوە[19].

کێشەکێشەکان ئێستا ببوونە ملانەیەک بە مەبەستی وەدەسهێنانی ملکایەتی قیشم و هۆرمز و دوو پاپۆڕە لەنگەرگرتووەکەی پاشماوەی بۆ لە کەشتییەکانی هێزی نادری لە هۆرمز. شەڕ لە نێوان بنیموعین و هاوپەیمانە «چارەک»ییەکانی کە لە لایەن نەسیرخان و جەعفەرخانی لاریڕا پشتیوانیان لێدەکرا و ئیمامی مەسقەت و جەواسم کە هەر لە بنەڕەتەوە مەلاعەلیشا پاڵپشتی دەکردن دەستی پێکردبوو[20]. جەعفەرخان ببوو بە دزێکی دەریایی ڕێکوپێک و بۆ تاڵانی باری لۆتکە و گەمییەکان و لەنگەرگا دەستی دابوویە دەستی بنیموعینەکان و ئامانجی ئەمە بوو کە تاوانەکە بخاتە ئەستۆی جەواسم[21]. شێواوییەکان لانیکەم تا کۆتایی ساڵی ١٧٦٠ درێژەیان کێشا، چونکە

18- Lorimer, 92 – 93 ; Wilson,178; Amin, 48. for the ELC at Bushire, See 15 . 5.

19- GD XI, 11 to 18 February, 24 and 25 June 1760.

20- GD XII, 22 December 1760.

21- GD XIII, 16 March 1762 ; cf. Amin, 46.

شکستی ئەو ساڵەی کەریمخان لە بەرامبەر حوکمڕانی لارستاندا بووە بەرهەڵستی ئەوەی ئەو بتوانێ حاکمێک بۆ بەندەرعەباس دیاری بکا و شێخ عەبدوڵلا و جەواسم بێنێتە بەر باری حکوومەتی خۆی.

گوێزرانەوەی توجارەتخانەی هولەندی و ئینگلیسی لە مەڵبەندەکانی خواroوی کەنداوڕا بۆ ناوچەکانی سەرووی، دژکردەوەیەکە بە مەبەستی گۆڕینی ناوەندی سیاسی و بازرگانی. تەنانەت لە سەردەمی پاشایەتی نادردا کە ئیسفەهان و کرمان لە سایەسەری دەسەڵاتی مەشەدەوە بەرەو تێداچوون تلیان دەدا و گرینگایەتی پێشووی بەندەرعەباس لە کزی دا، نیزیکترین و باشترین شوێنێکی کە خانی زەند ئەو زەمانەی وا شیراز پایتەختی بوو و دەستی بە سەریدا دەڕۆیشت بەندەر بووشێهر بوو. لە سەدەیەک لێرەوبەرەوە ئەم بەندەرە کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی یەکێک لە بنەماڵەکانی عەرەبی «مەتارەش»ی عومان[22]. حاکمی ئەم شارە لە ڕۆژگاری کەریمخاندا ناوی شێخ نەسری کوڕی مەزکوور بوو و لەم ڕۆژگارەدا قەڵەمڕەوی خۆی بەرەو باکوور و ڕۆژاوا لە مەڵبەندەکانی دەشتستان و تەنگستان لە سنووری گەرمەسێری فارس پەرەپێدابوو. نە تەنیا توجارەتێکی بەربلاوی لەگەڵ عەرەبستان و مەسقەت و هیندووستان دامەزراندبوو، بەڵکوو خاوەنی پۆلێک پاپۆڕ و لۆتکەش بوو کە چەند کەشتی و چواربەندەی هێزی دەریایی نادرشاشی دەگرتەوە. لە دەوروبەری ساڵی ١٧٥٥دا وەکیل بانگیهێشتە شیراز و زیندانی کرد و کەوتە سەر شانی کە پاپۆڕەکانی هێزی دەریایی نادری بداتەوە و ساڵێ ٥هەزار تمەن پیتاکی بەحرەین وەلابخا. ماوەیەک دواتر ئازاد کرا و لە سەر حکوومەتی بووشێهر داندرایەوە، بەڵام ناچار کرا کە کوڕەکەی وەک بارمتە لە شیراز جێبێڵێ. ئەم شێخە کە هەتا چوار ساڵ پاش مەرگی وەکیل ژیا سەبارەت بە خانەدانی زەند وەفادار و کەوی مایەوە و دوو میلیۆن لیرەی ئەودەمی بۆو کوڕەی بەجێهێشت کە بە ناوی خۆیەوە کردبوو. میراتەکەی دیکەی وەفاداری بوو سەبارەت بە خانەدانی بەدبەختانە بەرەو تێداچوونی زەندیە کە بە ڕوووەرگێڕانی گشتی لە «لوتفعەلیخان»ی دوایین

---

22- Niebuhr, Arabien, 315 – 316 ; G N . Curzon II, 232.

کرۆزۆن لای وایە کە ئەمانە لە ڕەگەزێکی ترن و لە خانەدانی «بوومومهیرە»ی «نەجد»ن.

کەسی ئەو بنەماڵەیە خاشەی برا[٢٣].

## ١٠ ـ ٣ جووڵانەوەی میرمەهنا

بەندەری بچووکی ڕیگ کەوتۆتە چەند مایلی باکووری بووشێهر. لە سەردەمی کوژرانی نادرا میرناسری زەعتابی[٢٤] ئەوێی بەڕێوە دەبرد. وەک گوتوویانە ئەمانە لە تۆرەمەی کۆچەرانی «بنیسەعب»ن کە چەشنی مەتاڕەش بە ڕەگەز عومانین. هەروەک وەبیرمان هێنایەوە ئەو بوو بە شیعە. بەگوێرەی گێڕانەوەی نیبوور لە ساڵی ١٧٥٢ یا ١٧٥٣دا لە وەختی گرتنی بەحرەینا یاریدەی شێخی بووشێهری دابوو و پاش ئەم سەرکەوتنەش حوسێنی کوڕی بە مەبەستی پاراستنی قازانج و بەرژەوەندییەکانی لەوێ بەجێهێشت، بەڵام ماوەیەک دواتر لە پەنا هەرێمی ژێر دەسەڵاتی خۆی بەرەورووی دوژمنایەتی شێخ «نەسر»ی دراوسێی بوو[٢٥]. قەڵەمڕەوی میرناسر برێتی بوو لە دوورگەی خارک کە هەتا بەستێنی دەریا ٢٥مایلی مەودایە: درێژی و پانی دوورگە ٦مایل و ٣مایلە. لەو زەمانیدا ئەم دوورگەیە تەنیا لە بەشی باکووری گوندێکی ماسیگری سەدکەسی لێبوو کە گۆڕی چەند گەورەگەورەیەکی شیعەشی تێدا هەڵکەوتبوو[٢٦]. بۆ وێنە دەکرێ باسی مەرقەدی ئیمام محەممەد بنیحەنیفە(٨) بێتە گۆڕ. ئەم ئادە (دوورگە)یە یەکێک لە ناوەندەکانی سەیروسەمەرەی داستانەکانی سەدەی سەردەم بوو لە کەنداوی فارسا[٢٧].

---

23- GN . Curzon II, 232 ; Lorimer, III.

٢٤ـ سەبارەت بە وشەی زەعتابی یان زەعابی بڕوانن: نووسراوەی Beer بابەتی حەڤدە. ئەم ناوە لە لایەن نووسەرانەوە ئاوا هاتۆتە گۆڕ: ڕەقابی، ڕەعانی و وەغابی کە دیارە دەستنووسەکان و شێوازی خوێندرانەوەیان ئەم جیاوازییانەیان ساز کردووە.

25- Arabien, 316 – 317.

٢٦ـ Abdul Qadir, 33 ; Khosrav, 1 – 17. خارک لە عەرەبیدا پێدەگوترێ «خارج».

٢٧ـ سەرچاوە سەرەکییەکانی سەبارەت بە داگیرکردنی خارک لە لایەن هولەندییەکانەوە و چالاکی و هەڵمەتی میرمەهنا برێتین لە:

The OIC records dated 1754 – 1770 (Brieven 2716, 2735, 2755, 2756, 2762, 2777, 2801, 2860, 2888, 2895, 2919, 2956, 2984, 3048, 3051, 3076,

لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٥٣دا بارۆن نیفووژێن کـە پیـاوێکی پرۆسـی و غللوور و بەتوانا بوو و کاری بۆ کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هولەند دەکرد بـە فیت و پیلانی حاکمی داندراوی دەوڵەتی عوسمانی «موتەسـەللیم» (میربەنـدەر) ناچار بوو ئەو شوێنە جێبێڵـێ. وێـدەچێ لـەم بـارەوە نوێنـەری دانیشـتووی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی و بریکارەکەشی لەوێ یاریدەی «موتەسەللیم»یـان دابێ. ناوبراو تەمای گرت کە بارودۆخی خۆی سەبارەت بە ڕکەبەرەکـەی باشـتر بکا. کەلکی لەو پێشنیارە وەرگرت کە پێشتر میرناسر خستبوویە بەر دەمی و بـە یارمەتی سەرۆکەکانی لە «باتاویە»را بە سێ لۆتکە هەر لە مانگی نوامبری ئـەو ساڵەدا گەڕایەوە و پێگە و بنکەیەکی هولەندی قایمی لە خارک دانا و ماوەیـەک دواتر زارکی یەکاوی عارەبانی بەست و گەمارۆی دا و ئەو پاپۆڕە بازرگانییانەی بەرەو بەسرە بەڕێوە بوون دەسـتی بەسـەراگـرتن. کـەچی لـە مـاوەی هەشـت مانگاندا «موتەسەللیم»ی سەرکەوتوو لەبەر تەوژمی دەسـەڵاتی پاشـای بەغـدا سەری بەردایەوە و ناچار کرا ئەوەی لە نیفووژێن وەریگرتبوو بیداتەوە و ئیزنی گەڕانەوەی بەسرەی بدا[٢٨]. بارۆن زۆر بەشەرمانە پێشـنیارەکەی ڕەت کـردەوە و تەمای گرت کە بە ڕاکێشانی سـەرنجی بازرگـانی ئەرمـەنی و ئێـرانی دورگـەی خارک لە جەغزێکی بەرتەسکتردا بکاتە کۆلۆنیایەکی هولەندی بەو عەمبارانەوە کە گوومرگانەیان لە سەر نیە.

«حوسێن»ی کوڕەگەورەی میرناسر هێشتاش هەر لـە بـەحرەینی تـازە داگیرکراو بوو کە میرمەهنای لاوتر هەلەکەی قۆزتەوە و باوکی کوشت و دەسـتی بە سەر بەندەرریگ داگرت. حوسێنی برای گەڕایەوە و هولەندییەکان پارەیەکیان

3142) ; the EIC Records 1753 – 1765 ( GD VII – VIII, FR XVI BP XXVI – XXXII); The Carmelite Chronicle I, 667, 670, 689 – 693; (Niebuhr, Arabin 316 – 317, 321 – 326 and Reise II, 182 – 196 ; ives, 211 – 214.

تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٥١ ـ ١٥٤. سەبارەت بە باسی دووروبرێژی ئەم ڕووداوە بڕواننە: وتاری من بە ناوی «میرمەهنا و هولەندییەکان».

٢٨ـ وەرگێڕاوی نامەکان بۆ سەر زمـانی فەرانسـە لەگـەڵ نامـەکانی قۆنسـولخانەی فەرانسە بـە ژمـارە ANP, Bi . 175 ڕاگـیراون و کەوتوونـە مابـەینی نامـەکانی ٢٥ی سێپتامبر و ٢٦ی ئۆکتۆبری ساڵی ١٧٥٥ و هیچ ڕێکەوتێکیان لە سەر نەدراوە.

دایە و توانی بکوژی باوکی وەدەربنێ و خۆی لە بەندەرریگ سەقامگیر بێ. لەبەر مەترسییەکی کە لە لایەن میرمەهناوە هەست پێدەکرا دەستی کرد بە پتەوکردنی پێوەندییەکانی لەگەڵ ولاتانی هولەند و بریتانیا. ( لە ساڵی ١٧٥٥دا ئینگلستان بنکەیەکی نوێنەرایەتی بازرگانی لە بەندەرریگ دانابوو.) ماوەیەک دواتر کە کەریمخان دەسەڵاتی بە سەر کۆهکیلۆیە و تەنگستاندا شکابووە و توانایی دەستێوەردانی راستەوخۆی لەم کێشمەکێشمانەی بەستێنی دەریادا پەیدا کرد، دوو براڵەی قینەبەری هەتا ساڵی دواتر لە شیراز گل دایەوە. لە ئاوریلی ساڵی ١٧٥٦دا کە ئەم دوو کەسە وێکرا گەرانەوە ناوچەی خۆیان بەرواڵەت ئاشت ببوونەوە[٢٩]. بەڵام هەرچۆنێک بێ بازرگانانی ئورووپایی وریا بوون: نیفووژێن سەربازگە «پرۆسی»یەکەی بە یارمەتی عەرەب و ترکان تۆکمەتر کرد، نوێنەری کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵاتی بە ناوی رێزدار «فۆد» کە سەبارەت بە هەردوو دراوسێ دردۆنگ بوو، سەرەتا لە مانگی ژووەندا بەندەرریگی جێهێشت. مانگی داهاتوو کە گەرایەوە وێندەرێ تەماشای کرد میرمەهنا برا و پازدەکەس لە خزمانی خۆی کوشتووە و زۆر پتەو لە سەر تەختی دەسەڵاتی بەندەرریگ دانیشتووە. لە مانگی نوامبردا رێزدار فۆد و کارمەندانی بە هەرەشەی کوشتن خستە نێوان دوو بەرمیل (بۆشکە) باروت و دووری خستنەوە[٣٠].

تا چەند ساڵی تر میرمەهنا دەستی کرد بە راووڕووتی ئەو بازرگانانەی کە لە رێی ویشکانی یان دەریاوە بە بەندەرریگدا تێدەپەرین. بەندەرریگ کەوتۆتە نێوان گەناوە، بووشێهر، لاوەر(٩) و کەنگان. هەواڵی دڵرەقییەکانی وەک خنکاندنی خوشکانی، زیندەبەچاڵ کردنی ئەو کچانەی دەیبوون، برینی گوێ و کەپۆی پیاوەکانی لە سەر تاوانێکی بچووک لە کەنداوی فارسا کردبوویە گورگی چوارچاو. لە مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ١٧٥٧دا کەریمخان وێرای لەشکرکێشییەکی سەرکەوتووانە بە مەبەستی سەرکوتی «قایید حەیدەر»ی حاکمی بەندەرگەناوە دیسانیش بە شوێنیدا نارد. میرمەهنا هەر کە هێزەکانی

---

٢٩ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٦١؛

Brieven, 2777 (1757), Kharg 1, 4 – 5 ; Niebuhr, Arabien, 317.

30- GD VIII, 26 May, 21 and 24 July, 4 December 1756 ; Brieven 2755 (1756) 15 – 17 ; 28 – 29 (1759), Kharg, 5 – 9.

زەند نیزیک بوونەوە ڕایکردە دەریا، بەڵام کەریمخـان دەورەی بەنـدەرڕیگی دا و هەڕەشەی کرد ئەگەر بێتوو میرمەهنا لە ماوەی سێ ڕۆژاندا خۆ بە دەستەوە نەدا شار تاڵان دەکا. میرمەهنا خۆی تەسلیم کـرد و کەوتـە بەندیخانـە. سـەرەنجام ساڵی داهاتوو کە وەکیل بە مەبەستی پەیکەردەی محەممەدحەسەنخـانی قاجـار لە شیراز دەرکەوت بە نێوبژیوانی و کەیخودایەتی محەممەدبـەگی خوورمـۆوجی سەرداری سەربەدەرەوەی تەنگستـانی لێـی خـۆش بـوو و دووبـارە کردییـەوە حوکمڕانی بەندەرڕیگ. محەممەدبەگ مێردەخوشکێکی میرمەهنا بوو. لـە کـاتی شاڵاوی وەکیل بۆ سەر هەرێمی بـاکووری وڵات، سـادقخـانی بریکـاری چەنـد جارێک بە مەبەستی سەرکوتی میرمەهنا سپای گـاڵ دا، بـەڵام نـاوبراو هـەموو جارێ یان ئەو هێزانەی تێکشکاند یا لـە بەسـتێن ڕایکـرد و پـەنای بـردە نێـو گەمییەکانی[31].

لە کۆتایی ئاوریلی ساڵی ۱۷۵۹دا وەختایـەک کـە میرمـەهنا پـەلاماری یەکێک لە کاروانەکانی بەرەو «بەسـرە»ی دا لۆتکـەی تۆپـداری هولەندییـەکان بەری پێگرت. وا دیارە تـا ئـەو زەمـانی هـەردک لا خۆیـان لـە تێکهەڵـچوونی ڕاستەوخۆ دەپاراست، بەڵام ئێستا ملەبەملە دەسـتی پێکردبـوو. هولەندییـەکان نێوانیان لەگەڵ حاکمی بووشێهر خۆش بوو و لە لایەکی دیکەشەوە بە مەبەسـتی داگیرساندنی دۆستایەتی لەگـەڵ قاییـد حەیـدەری حـاکمی گـەناوە و ڕەقـیبی میرمەهنا هەوڵـیان دەدا. لـە سـەرەتای ساڵـی ۱۷٦۰دا وەختایـەک چەکـدارانی میرمەهنا گناوەیان گەمارۆ دابوو لۆتکە تۆپدارەکانی هولەندی بلاوەیان پێکردن. باوکی میرمەهنا هەمیشە لەگەڵ «شێخ نەسر»ی ڕەقیبی بازرگانی خـۆی نێـوانی سارد بوو و ئەم مەبەستەشیان وەختایەک خستە بەرچاو و پتری پێگرژ بوون کە لـەبری بەنـدەرڕیگ بووشـێهریان وەک بنکـەی دابـەزینی کـەلوپـەل و پێداویستییەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هولەند دیاری کـرد. لـە ساڵـی ۱۷٦۲دا زەمانێک کە وەکیل سەرکەوتووانە لە بـاکوورەوە دەگەڕایـەوە، تـەمای گرت کە ڕاست بۆخۆی سەبارەت بـە سـەقامگیر کـردنی هـێمنی و تـەناهی لـە ناوچەکانی بەستێنی کەنداوی فارس دەس بە کار بێ و هێزێکی هاوبەشی ئێرانی

---

۳۱ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱٦۱ ـ ۱٦۲ : Niebuhr, Arabien, 317 – 318.

و هولەندی بۆ ئەم مەبەستە بنێرێتە بەندەرڕیگ. میرمەهنا کە ئێستا لەگەڵ تەواوی دراوسێیەکانی تێکهەڵچووبوو بە پەرەپێدانی دەستدرێژییەکانی دژکردەوەی نواند: هێرشی بردە سەر چەند مەڵبەندێکی دوورتری نێوخۆی وڵات و دوو کاروان کە لە مابەینی بووشێهر و شیراز دەبزووتن ڕووتی کردن و لە ڕۆژی جێژنی «پاک»ی ١٧٦٢دا بە شێوەیەکی سەرنەکەوتوو پەلاماری «خارک»ی دا[٣٢].

تەواوی ئەم ڕووداوانە بە هەڵگیرسانی شەڕ لە دەوروبەری بەندەرعەباس (کە هولەندییەکان لە ساڵی ١٧٥٩ و بریتانییەکان لە ساڵی ١٧٦٣دا توجارەتخانەکانی خۆیان لەوێ داخستبوو) قەومان کە سادقخان دژی خانی لار کەوتە خۆ و یەکەم هێرشی هێزەکانی عوسمانی و زەند بۆ سەر مەڵبەندی نیمچە سەربەخۆی بنیکەعب لە خوارووی خووزستان و دژەهێرشی ئەو خێڵە بۆ سەر گەمیوانی لای سەرووی کەنداو بەتایبەت بەحرەین دەستی پێکرد. زەمانێکی کە کەریمخان سەرقاڵی کاروباری مازەندەران و ئازەربایجان ببوو یەکێک لە قۆناخەکانی شڵەژاوی گشتی و تێکەوڵێکەی کەنداو و مەڵبەندەکانی بەستێنی دەریا سەری هەڵدابوو.

## ١٠ ـ ٤ پێمل کردنی تەنگستان و دەشتستان

میرمەهنا لە ماوەی دوو ساڵی دواترا لەگەڵ هولەندییەکان کەوتە باروهەوای شەڕەوستانێکی دژوار. زیاتر سەرنجی کەوتبووە سەر قایمکردن و دابەستنی بەندەرڕیگ لە بەرامبەر هێرشەکانی کەریمخاندا. پەلاماری هێزەکانی زەند ئاخرییەکەی لە زستانی ساڵی ١٧٦٥دا بە سەرکردایەتی ئەمیرگۆنەخان وەڕاست گەڕا و سەرەتا «خوورمۆوج»ی گرت و بۆ ماوەی سێ مانگان کڕ کەوتەوە و دەستی نەبزاوت (جگە لە زێدەڕەوی لە ئەستاندنی پیتاکدا). ئاکار و کرداری مەیلەو ئاشتیخوازانەی لە لار و تەنگستان بوو بە هۆی ڕاکێشانی سەرنج و هاوکاری فەرماندەرانی ناوچەیی و جەماوەری خەڵکی ئەو هەرێمە[٣٣]. جگە لەمە

32- Brieven 2956 (1763), 26 – 27 ; 2984 (1764), Kharg I, 60 – 63 ; Niebuhr, Reise 182.

33- Niebuhr, Arabien, 317 ; Reise, 100 – 101, 104 – 105, 165 . 180 . 184.

شێخنەسر و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی کە هەردوولا گفتیان دابوویە سەبارەت بە گەمارۆی بەندەرریگ یاریدەی بدەن، تەنیا پاپۆڕێکی لەنگەرخستووی بەندەرریگیان بۆ نارد. میرمەهنا لە مانگی ژووەندا تێگەیی کە ئاقڵانەتر ئەوەیە تا بە بنەماڵە و بارگەوبنەوە سواری کەشتی بێ و لەگەڵ تاقمی سەرەکی شەڕکەرانی پەنا بەرێتە بەر دورگەی «خارگوو» کە چۆلگەیەکی خاپوورە و مایلێک کەمتر لە خارکەوە دوورە. سەرۆکی شەریکەی هولەندی ناسراو بە «بووشمەن» بۆ ئەوەی خۆی لە تێوەچوون لەم هەڵلایە لا بگرێ تەنانەت ئیزنی دا بە کەشتی میرمەهنا کە لە خارک خوردوخۆراک وەدەس بێنێ و سووتەمەنی پێویستی بۆ ئاژوان دابین بکا. لە ماوەی ئەم هەڵمەتە بێفایدەیەی دەریاییدا وەختایەک کە حەوتووی دواتر لۆتکەکانی میرمەهنا پێشاوبڕکەی پاپۆڕە شەڕکەرەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی و بووشێهریان دایەوە و تەنانەت توانییان دەس بە سەر چەند پاپۆڕێکی بازرگانی بووشێهری دابگرن کە دەچوونە بەحرەین، ئەمیرگۆنەخان بە خاترجەمی لە بەندەرریگی وێرانکراو دابەزی و لەشکرەکەی بۆ بزووتن و چوونە خارکەوە ئامادە کرد. بووشمەن چالاکی و هەڵمەتەکانی لە جەغزی ئاگربارانی نیوەشەوانەی تۆپخانەدا هێشتەوە هەتا بە قەولی خۆی «شەڕکەرانی دوژمن وەخۆ بێنێتەوە»[٣٤]. لە مانگی ئۆکتۆبرا میرمەهنا بووشێهری خستە گەمارۆیەکی سەختەوە و دوابەدوای ئەو بازرگانێتی و دابینکردنی ئازۆقەی هولەندییەکان بەری پێگیرا و ئەم کارە دوژمنایەتی «پیتێر هانینگ»ی بریکاری بێئەزموونی «بووشمەن»ی ورووژاند.

بەر بە دابەزینی هێزە نێردراوەکانی سەربازگەی هولەندییەکان کە پێنسەد چەکداری بووشێهری بوون گیرا و گەلێکیان کوشتە و بریندار کەوتە سەر دەستی. میرمەهنا ئەم سەرکەوتنەی بە پیادە کردنی هێز لە خارک و گەمارۆی قەڵاکەی درێژە پێدا. کاتێک بەتەواوی پێوەندی دورگە لەگەڵ دەرەوە دابڕا «هانینگ» لێبڕا کە دەرگای وتووێژ لەتەک میرمەهنادا بکاتەوە. لە ڕۆژی یەکەمی ساڵی ١٧٦٦دا، وێڕای دەستەیەکی بچووکی نوێنەرایەتی لە قەڵا دەرکەوت و بە فەرمانی میرمەهنا گیرا؛ قەڵا و شار دەستیان دا و بەرهەڵستان بە سواری

34- Niebuhr . Reise, 186 ; cf . FR XVI,841 ( 3 March 1765), Amin . 76 – 77.

گەمی گوێزرانەوە بووشێهر و لەوێوە بۆ تاوییە و میرمەهنا بەهێزترین قەلا و دەوڵەمەندترین بارخانەی کەنداوی فارسی داگیر کرد و سەرلەنوێ بەحرەینی خستەوە ژێر ڕکێفی خۆی. لەم وەختەدا کە ئەمیرگۆنەخان لە دەسکەوتی هەڵمەتەکەی بۆ سەر بەندەرریگ جارز ببوو، سەرۆکی زەعابی سەرکردەیەکی بە مەبەستی گرتنەوەی خاک و ملکی باوکی گال دا.

کەریمخان لە ئاوریلی ساڵی ١٧٦١دا هێزێکی دووهەزار کەسی بە مەبەستی گەمارۆی بەندەرریگ بە سەرۆکایەتی زەکیخانی ئامۆزای بەڕێ کرد. لە مانگی مەیدا بەندەرگەناوە دووبارە کەوتە دەس هێزەکانی زەند، بەلام هێشتاش بەندەرریگ لە ژێر چنگی ئەم هێزانەدا نەبوو. سەرکردایەتی سپای زەند جارێکی دیکەش لە یارمەتی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی بێبەش کرابوو و بەناچار گەڕایەوە شیراز. لە مانگی ئاگۆستی ساڵی ١٧٦٨دا وەکیل هێزێکی تری نارد و ئەم لەشکرەش کە بەرەورووی یارمەتینەدانی ڕێزدار «موورە» نوێنەری کۆمپانیا ببۆوە، کارێکی کرد کە بە یاریدەی پەلی پاپۆڕانی شەڕکەری بووشێهر، بەندەرریگ گیرۆدەی خەساری گەمارۆی زستانە بکا.

سەرەتاکانی ساڵی ١٧٦٩ توندی و سەختی گەمارۆ وێڕای خوێنڕێژییەکانی میرمەهنا تاقمێک لە خزمانی لێهەڵتەزاندووە. لە ٢٦ی ژانویەدا وەختایەک یاغی گەورەی دەریایی چووبوو بۆ بازاڕ بەرەورووی هرووژمی جەماوەر بۆوە و خافڵگیر کرا و خۆی و زێرەوانانی بە گەمییەک ڕایانکرد. حەسەنسوڵتان یەکێک لە جڵەودارانی ڕاپەڕیوان بە ناوی کەریمخانەوە دەستی بە سەر خارک داگرت و هەواڵی کۆدتای خۆی بە گوێی ئێرانییەکان ڕاگەیاند. تاقمێک لە سەربازانی زەکیخان لە خارک دابەزین و سەرهەڵداوان دەستیان دا. وەکیل بەگوێرەی داب و نەریتی خۆی نەرمی نواند و لە ڕاگەیەندراوێکدا ماڵ و سامانە دەسبەسەراگیراوەکانی دایەوە بە حەسەنسوڵتان و بە نازناوی «خان»ەوە کردی بە حوکمڕانی بەندەرریگ. پاش گرتنی خارک و بەندەرریگ چالاکی ڕێکوپێک دژی شەڕەنگێزان بەڕێوە چوو. لە خارکا بنکەیەک دامەزرا کە تاقمێک لە چەکدارانی پیادەی زەند لەوێ سەقامگیر بوون و دورگەی ناوبراو لەو کاتیڕا کەوتە ژێر دەسەلاتی وەکیل.

میرمەهنا پاش بڕینی ١٤٠مایل لە ١٧ی مانگی فێوریەدا بە سواری

گەمییەکی بچووک و بێ ئازۆخە گەیشتە شاری بەسرە. یەکێک لە پاسدێرانی ئەو شارە ناسییەوە و بردییە لای میربەندەر. میربەندەر داخوازی پەنابەرێتی لێ قبوول نەکرد و لە نیوەشەوی ٢٤ی مانگی مارسی ١٧٦٩دا ئەو یاغییە یەکچاوەیان(١٠) خنکاند کە بۆ ماوەی پازدە سالان ترس و سامی بە سەرانسەری ناوچەی کەنداودا بلاو کردبۆوە. سەری نێردرایە لای حوکمڕان (پاشا) و لەشیان خستە بەردەم سەگان[٣٥].

دورگە (ئادە)ی خارک دیسانیش پاش ئەم ڕووداوانە کەوتەوە گێژاوی گومناوی و هەژاری بەر لە هاتنی هولەندییەکان ( ئیتر هولەندییەکان نەگەڕانەوە کەنداو). شوێنە سەخت و قایمەکانی بەندەرڕیگ بە دەس هێزە سەرکەوتووەکانی ئێرانی تێکڕما و خاپوور کرا و ڕووحی سەربەستیخوازی «زەعابی» بە کوژرانی میرمەهنا تۆوی بڕا. بەندەرڕیگ لە بەرامبەر بووشێهردا پلە و پایەی دابەزی[٣٦]. زەکیخان هێورکردنەوەی بەستێنەکانی کەنداوی فارسی بە هێرش بۆ سەر شێخ حوجری کەنگانی تەواو کرد(١١). ئەم شێخەش میرمەهنایەکی بچووک بوو کە پاش تێکهەڵچوون لەگەڵ خانی زەند وێرای دەست و پێوەندەکانی خرایە کۆت و زنجیر و نێردرایە شیراز و لەوێ کوژرا[٣٧]. تێکڕای ئەو بەندەرانەی کە سەریان وەبەر شیراز هێنابوو هێور و ئارام بوونەوە و ئێستا وەختی وەی هاتبوو کە دەستێک بە سەروگوێی بەشی خوارووی کەنداوا بێ.

## ١٠ ـ ٥ شەڕ لەگەڵ عومان

ئەگەرچی لە ماوەی پاشایەتی نادرشادا ئیمامی عومان زۆر خۆی لاشەڕ گرتبوو، بەلام هەروەختایەک لە ئێرانا شای کەمدەسەلات دەهاتنە سەر حوکم ڕێبازێکی شەڕوەنانە و نائاشتییانەی دەگرتە بەر. لە سالی ١٧٧٣دا، لە

35- FR XVI, 101 b ; BP XXXII, 20 May 1769 ; Garmelites, 670.

هەروەها بڕواننە: ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٩٧ ـ ٣٩٨؛ تەفرەشی ٢٧١ئا.

Parsons. 197 ; Malcolm, 136, Wilson, 182 ; Amin, 99 – 100.

37- cf. Kinneir, III ; Monteith, Nites on the Routes, 108.

٣٧ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٦٨؛ گولشەنی مراد، ل ١٥٤؛ Carmelites, 668.

ڕۆژگاری پاشایەتی شاسولتانحوسێنی سەیفی بنی سولتانی سانیدا، بە یارمەتی عەرەبەکانی جەواسم و قەتەر، بەحرەین و لار و «قیشم»ی داگیر کرد و دەیەویست کە دورگەی هۆرمزیش گەمارۆ بدا. پۆرتوغالییەکان نەیانتوانی پۆلە پاپۆڕێکی بازرگانی بۆ گواستنەوە و گەیاندن بخەنە بەردەستی ئێران و عومانییەکان دەبووا بە دانی دەمچەورانە دەس لە شەڕ هەلبگرن[38]. ئیمام ئەحمەد کە ساڵی ١٧٤٩ عومانی خستبووە ژێرچۆکی خۆی، وای بۆدەچوو لەبەر وەی ئێرانی پاش کوژرانی نادرشا تووشی پاشاگەردانی و شلەژاوی بووە، ئەویش دەتوانێ دەس بخاتە سەر پۆلە پاپۆڕەکانی هێزی دەریای نادر لە پێگەی گێمبروون. بە هۆی بلاوبوونەوەی چەند دەنگۆیەک لە هاوینی ١٧٥٢دا، هاواری مەترسییان گەیاندە گوێی مەلاعەلیشا کە ئیمامی عومان دەیهەوێ بە وەدەسهێنانی دووسێ گەمی پەلاماری بەندەرعەباس بدا و پاپۆڕە شەڕکەرەکانی وێندەرێ داگیر بکا، بەلام ئەم هەڕەشەیە هەرگیز وەکردەوە نەگەڕا[39]. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٥٢دا بە هۆی ئەو ئالۆزییانەی کە دراوسێ سەربزێوە جولفارییەکانی عومان بەدییان هێنا، ئیمام چەند دیارییەکی وەک هەشت غولامی قولەڕەشە و دوو ماین و هێندێک قەندی کلۆی بۆ نەسیرخانی لاری نارد و داوای لێکرد کە هەزار کەس لە شەڕکەرانی بە مەبەستی بەرگێڕەوەی هێرشی ڕاپەڕیوانی عەرەب بنێرێتە یاریدەی[40]. لە ساڵی ١٧٦٧ یا ١٧٦٨دا ئیمام وای ڕێکخستبوو کە کەشتی «ڕەحمانی» لە شێخ عەبدوللای بنیموعین بکڕێ. شێخی ناوبراو پاش دەریاسالار بە گەورەترین خاوەنپلەی هۆرمز دادەندرا.

لە هاوینی ساڵی ١٧٦٩دا هەر ئەوەندە کە بەشی سەرووی کەنداو ڕووی کردە ئارامی، کەریمخان بە داواکردنی قەراروبڕی پیتاکی دیاریکراوی دەورەی نادری و گێڕانەوەی کەشتی ڕەحمانی کە بێ ڕەزامەندی دەولەتی ئێران کڕیبووی، دژی ئیمامی عومان وەخۆکەوت. ئیمام داخوازەکانی زەندی بەرەو پاش بردەوە و بە ئاماژە ڕایگەیاند کە نادرشا و کەریمخان دوو هێز و دەسەلاتی زۆر جیاوازن، لەوی دەترسا و ئەمەیان بە هیچ دانانێ، بۆیە ئەگەر خانی زەند

---

38- Lockhart, Safavi Dynasty, 115 – 116.
39- GD VI, 5 July 1750.
40- GD VI, 15 february 1752.

لە سەر ویستەکانی خۆی سووره، ولامەکەی گوللە و تۆپە[٤١]. لەو کاتەوە ئێران و عومان کەوتنە سەر باروهەوای شەڕ. سەرەتا دەگژڕاچوونەکان لە جەغزی کێشەکێشی بێفایدە و ڕاووڕووتی دەریاییدا دەخولانەوە. بو وێنە وەختایەک دوو کەشتی قاوە لە شاری «سەووەر»ەوە بەرەو بەسرە بەڕێوە بوون، ئێرانییەکان هێرشیان کردنە سەر و گرتیانن. لە سالی ١٧٧٠دا پۆلە پاپۆڕی لەشکری ئیمام وێڕای سپایەک لە نیزیک بەستێنی بووشێهر قوت بووه، بەلام نەیتوانی بگاتە لێوار و هێز دابەزێنێ[٤٢]. بەگوێرەی ڕاپۆرتەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی لە بەرایی سالی ١٧٧٤دا پاپۆڕانی شەڕکەری ئێران دژی مەسقەت کەوتنەخۆ، بەلام بەرەوڕووی پەلەپاپۆڕی موتەسەللیم (میربەندەر) بوونەوە و تێکشکان[٤٣]. وا دیارە ئەم ڕووداوە دەگەڕێتەوە سەر ناردنی کەشتی بۆ هێزەکانی زەکیخان لە دوڕگەی هۆرمز.

ڕەنگە ئەو ڕاپۆرتەی کە خودی موتەسەللیم نووسیویەتی زۆری پێوەنابێ. هەر چۆنێک بێ مێژوونووسانی ئێرانی هێرش دەکەنە سەر سلێمانپاشای والی بەغدا و بە شێوەی ناڕاستەوخۆ سەر سولتانی عوسمانی کە لەم قۆناخەدا یارمەتی عومانییەکانیان داوە. نووسراوەکانی قەلەمبەدەستانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتیش ئەوەی دەسەلمێنن کە پاشا سەبارەت بەو بۆرەقەولەی وا دابووی بە وەکیل کەمتەرخەمی کردووە[٤٤]. هەر چۆنێک بێ چونکە بەسرە لە ئاست ئێرانییەکان خاوەنی هەلومەرجێکی ناسک و خەسارمەند بوو، وای بە بەرژەوەند دەزانی چونکە مەسقەت بە باری بازرگانی و هەنارده و هاوردەی هیندووستاندا وەک بەندەری ناوەند و عەمباری وابوو، پشتیوانی لێبکا. لە لایەکی دیکەوە بەرژەوەندی کەریمخانیش وای هەلدەگرت کە هێلی گەمیوانی لە مەسقەتەوە بگوێزرێتەوە بۆ بەندەرعەباس و بووشێهر، چونکە کارگێڕانی ئێرانی وەکیل لێرە دەیانتوانی بارانە و گوومرگانە و هەقی

41- Lorimer, 411 – 412.

42- Ibid : FR XVI, 1009 (18 October 1769).

43- SP 95, 50 ( 1774), 36a.

٤٤ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ٢٨١ ـ ٢٨٢؛ گولشەنی مراد، ل ١٧٩؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٣٧؛ FR XVII, 1069 (1 May 1774).

لەنگەرخستن و گواستنەوە و گەیاندن بۆ سەر پاپۆڕان کۆبکەنەوە.

سەرەڕای ڕێگرتنی نێوەنێوەی گواستنەوە و گەیاندنی نێوان بەسرە و عومان لە لایەن هێزەکانی زەند و بلاوکردنەوەی دەنگۆی سەرهەلدانی شەڕی لەنەکاو، وا دیارە ئالوگۆڕێکی ئەوتۆ لە بازرگانێتی سەرانسەری کەنداوا پەیدا نەبوو. ڕووداونووسانی ئێرانی دەلێن کە پاپۆڕەکانی بازرگانی ئێران لە بەندەری مەسقەت کەوتبوونە داو و «خەواریج»ی عومان دەیانویست ڕووتیان کەن، بەلام ئابراهام پارسۆنێز ـ لە جێیەکی دیکە هەر بەو گوڕ و تینەی نامی ـ دەنووسێ کە لۆتکە و گەمییەکانی ئێرانی بە شێوەیەکی ئاسایی لەگەل عومان خەریکی ئالوویر بوون و ئیزنیان هەبوو کە بێ هیچ بەرهەلست و ئازارێک بکەونە کڕین و فرۆشتن[٤٥].

وەک نووسیویانە لە هاوینی ١٧٧٤دا، دروست پاش ڕووداوی هۆرمز، ئیمامی عومان لەبەر ئەو کۆمەلە گیروگرفتەی بوویەتی بە ناردنی دیارییەکی ٢٠٠تمەنی یان دانی باجێکی سالیانە لەگەل وەکیل تەسالحەی کردووە[٤٦]. بەمشێوەیە ئابڕووی حکوومەتی زەندیە لە بابەت سووکایەتی سەبارەت بە شکانێکی دیکەوە کڕدرایەوە. وێڕای تەواوی ئەم پێشهات و هەلکەوتانە سەرەڕای تێکۆشانە سیاسییەکانی حەیدەرعەلیخانی دەکەنی، وەختایەک کە ئیمام بە شێوەیەکی جەربەزانە پاپۆڕەکانی بە جلەوکێشی کەشتی ڕەحمانی یاریدەی هاوپەیمانانیان دا کە هێزەکانی زەند لە بەسرە گەمارۆیان دابوون، سەرلەنوێ شەڕ هەلگیرسایەوە. لە سەرەتاکانی سالی ١٧٧٨دا پاش ئەوەی ئێرانییەکان بەسرەیان خستە ژێر چنگی خۆیان، گەلێک دەنگۆ سەبارەت بە وتووێژی ئاشتی نێوان وەکیل و ئیمام بلاو بوونەوە، بەلام دوای مردنی کەریمخان ڕێگای هەر چەشنە گۆڕانێک گیرا[٤٧]. ڕووداوەکانی ئێران وایان کرد کە شانبەشانی دابەزینی دەسەلاتی دەولەتی زەند، هێز و بڕشتی ئیمام بە شێوەیەکی بەرچاو لە ناوچەکانی سەرووی کەنداوی فارس پێهەلاچێ: لە سالی ١٧٩٤دا ئیمتیازی ئیدارەی بازرگانێتی بەندەرعەباس سالێ بە ٦هەزار تمەن درا بە سولتان

---

٤٥ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٧٥؛ Parsons, 207.

46- SP, 97, 50 (1774), 165 ; FR XVII, 1771.

47- SP 97, 54 (1778), 68.

ئیبنیئەحمەد[48].

## ١٠ ـ ٦ زەکیخان لە هۆرمز

کەریمخان سەرەنجام پاش سەقامگیر بوون لە شیراز توانی کە گەرووولەی هۆرمز بخاتە ژێر دەسەڵاتی ڕێوڕاستی خۆی. لە ساڵی ١٧٦٠دا ماوەیەک پاش پێمل بوونی نەسیرخانی لاری، حاجی محەممەدی ڕەعنایی، حوکمڕانی بەدەسەڵاتی ئیسفەهان لە لایەن وەکیلەوە نێردرایە بەندەرعەباس هەتا ئەو ناوچەیە سەبارەت بە قبووڵی فەرمانەکانی حکوومەتی ناوەندی پێمل بکا. ناوبراویش بە ڕێوشوێنێک شێخ عەبدوڵلای بنیموعینی سەربزێوی خستە ژێر نیر و بە بنەماڵەوە لە کۆت و زنجیرا بەڕێی کرد بۆ شیراز[49]. شێخ عەبدوڵلا لە شیراز توانی کە بە دانانی کوڕەکەی(١٢) وەک بارمتە دووبارە بگەڕێتەوە سەر کارەکەی خۆی. گۆیا حاجی ئاغامحەممەدی ڕەعنایی پاش ئەو خزمەتە گەورە لە سەر کار لادرا و یەکێک لە حاکمەکانی ناوچەیی بە ناوی شێخمحەممەدی بەستەکی(١٣) وەک بەگلەربەگ لە مانگی سەفەری ١١٨٣ی کۆچی / ١٧٦٩ی زایینیدا جێی گرتەوە و دەستی کرد بە کار[50].

بەم ڕێخۆش کردنانە کەریمخان بۆ گاڵ دانی پەلەپاپۆڕێک بە مەبەستی هێرش بۆ سەر عومان، بەندەرعەباسی بە بنکەیەکی جێمتمانە دانا. لە شابانی ساڵی ١١٨٧ی کۆچی / نوامبری ساڵی ١٧٧٣ی زایینیدا فەرمانی دا کە شێخ محەممەد بۆ لەشکری زەکیخان ٣هەزار «مەن» خورما و ٥هەزار «مەن» دەغڵ و دان ئامادە بکا[51]. چەند فەرمانێکی دیکەی لەم چەشنەشی بۆ حاکمانی تری

---

٤٨ـ ئەم ئیمتیازە لە ساڵی ١٨٥٦دا دیسانەوە نوێ کرایەوە و تا ساڵی ١٨٦٥ درێژەی کێشا. Miles, 287.

٤٩ـ ئەنساری، ل ٢٢٧؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٧٦؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٥٨. BP XXIX, 4 November 1766.

٥٠ـ موقتەدیر، ل ٧٣٣ ـ ٧٣٤. بەستەک گوندێکە لە ناوچەی لارستان.

٥١ـ موقتەدیر، ل ٧٣٣ ـ ٧٥٤ ڕوونووسی فەرمانێک لە لایەن کەریمخانەوە. (کێشی «مەن» لە هەر زەمان و شوێنێکدا جیاواز بووە: ٣کیلۆ، ٦ کیلۆ و ١٢کیلۆ ـ وەرگێڕ).

بەندەرەکانی کەنداو سەبارەت بە کۆکردنەوەی ئازۆخە و پاپۆڕ نارد. وەختایەک کە لە زستانی ئەوساڵەدا زەکیخان گەیشتە بەندەرعەباس، شێخ عەبدوڵلا بە پەلە چووە خزمەتی و ئامادەیی خۆی بۆ هەر چەشنە یارمەتییەک دەربڕی. لەم کاتەدا قەرار کرا کە زەکیخان وەک میوان بەرەو ماڵی شێخ ببزوێ (بە شێوەیەکی وەستایانە چەند شتێکیان سەبارەت بەوپەڕی جوانی «عائیشە»ی کچی شێخ بە گوێی ئاشنا کردبوو و زەکیخانیش لە دنیای خەیاڵاتیدا تامەزرۆی زەماوەند ببوو لەگەڵی). شێخ بە شادمانی ڕەزامەندی خۆی سەبارەت بەم خزمایەتییە دەربڕی و سەرداری زەندی بانگهێشتی دوڕگەی هۆرمز کرد. لە ڕۆژەی دیاریکراوا شێخ عەبدوڵلا داوای لە زەکیخان کرد چونکە عەرەبەکانی هەژاری دوڕگەی بەردەلان و قاقڕ توانستی دابین و میوانداری کردنی هەموو پیاوەکانی ئەویان نیە[٥٢]، وا باشە کەمیان بکاتەوە. بۆیە نیگابانەکانی سواری کەشتی نەکرد و خۆی لەگەڵ زەکیخان و ژمارەیەکی کەمی هاوڕێیانی بەرەو دوڕگە کەوتنەڕێ. وەختایەک پێیان نایە خاکی دوڕگە زەکیخانی خافڵگیر کرد و وێڕای یارانی خێرایەکی گرتنی و خستنیە سیاچاڵەوە.

چەکدارانی سپای لە ڕۆخی بەندەرعەباس هەروا بێهوودە چاوەڕوان بوون کە سەردار بە بووکەوە بێتەوە. وەختایەک ڕووداوەکە ئاشکرا کرا و چەکدارەکانی زانییان کە لۆتکەی تەواویان بۆ شەڕ لەگەڵ بنیموعین بە دەستەوە نیە، بلاوەیان کرد. لەم کاتەدا شێخعەبدوڵلا بە نامەیەک لە وەکیلی ڕاسپارد کە وا چاکە بارمتەکان پێکەوە بگۆڕنەوە. کەریمخان هیچ چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی پێشنیارەکەی قبووڵ بکا. لە مانگی مەی ساڵی ۱۷۷٤دا «محەممەد»ی کوڕی شێخ بەڕەڵلا کرا و زەکیخانیش بە ئابڕووتکاوی گەڕایەوە شیراز[٥٣].

---

52- Waring, 138.

٥٣ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۷٦ ـ ۱۷۸؛ گوڵشەنی مراد، ل ۱٥۹ ـ ۱٦۰؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ۲۱۷. FR XVII, 1071 (18 May 1774) ; SP 97151 (1774), 18. سەدیدوسسەنتەنە، ل ۲٦۳ ـ ۲٦٤ و ٦۱٤. غەففاری دەڵێ کە پاش گیرانی زەکیخان حاجی ئاغامحەمەد حوکمڕانی تازەی بەندەرعەباس کە لە ڕاستیدا زەکیخان جێیگرتبۆوە، بۆ لە پاپۆڕێکی نارده هۆرمز و ئازادی کرد و جارێکی تر شێخ و خاوخێزانی گیرایەوە

یەکەمین تەقەلای «نادر»انەی وەکیل بە مەبەستی پەرەی قەڵەمڕەوی ئەوپەڕسنووری زەند ئاوای کۆتایی پێهات. شێخ‌عەبدوڵلا سەربەخۆیی خۆی پاراست. سەرلەنوێ بە چەشنێکی شیاو کەلکی لە کچەکەی وەرگرت بۆ بەستنی پەیمانی یەکێتی لەگەڵ ئیمام و نەسیرخانی لاری(۱٤). پێشنیاری بە نەسیرخان کرد ئەو کچەکەی بخوازێ کە ببوو بە هۆی گیرانی زەکی‌خان، بەڵام خانی لار قبووڵی نەکرد[٥٤]. وەکیل لە پاشماوەی دەورانی پاشایەتی‌دا کە گیرۆدەی گێرە و کێشەی ناوچەکانی سەرووی کەنداوی فارس و کوردستان ببوو، بەندەرعەباسی هەروا بەڕەڵلا کردبوو.

## ۱۰ ـ ۷ ڕاپەڕینی بنی‌کەعب

گەورەترین و تۆکمەترین ئاپۆرەی دزانی دەریایی کە خودی وەکیل کەوتە وێزەیان و بەزاندنی بنی‌کەعب بوون. وەک گێڕاویانەتەوە ئەمانە بە بنەچەکە بەرەبابێک بوون لە سەحرانشینانی بنی‌خوفاجە(۱٥) و سەدەکانی بەر لە دەرکەوتنی ئیسلاما کۆچیان کردووە بەرەو ناوچەکانی باشووری ئێراق. لەبەر ڕێگری بە «بنی‌خوفاجە» ناودێر کراون.

لە کلکەی سەدەی شازدە یان سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەی زایینی‌دا لە قەببان نیشتەجێ ببوون کە کەوتۆتە نێوان خوورمووسا و شەتولعەرەب (یەکاوی عارەبان). یەکێک لە حوکمڕانانی دەیبری (دەیری) بەسرە ئەم تایفەیەی نیشتەجێ کرد. پاشان بە یارمەتی حوکمڕانەکان تەواوی خاکی بەستێنی دەریای ئەو ناوچەیان داگیر کرد. لە سەردەمی پاشایەتی نادرشای ئەفشاردا کیسیان لە ڕاپەڕینی محەممەدخانی بلووچ هێنا لە شووشتەر و هەتا سەر مەڵبەندەکانی دەوەرەق و قەراخ ڕووباری «جەڕراحی»یان تالان کرد و هێندێک دواتر ئەم ناوچەیان کردە ناوەندی شاڵاوەکانیان.

---

شیراز، بەڵام کەس ئەم نەقڵەی نەگێڕاوەتەوە. نامەی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی دەیسەلمێنێ کە بارمتەکانیان گۆڕیوەتەوە.

٥٤ـ سەدیدوسسەنتەنە، ل ٦١٣.

نادر بە مەبەستی گەمارۆی قەببان هێزێکی نارد و بنیکەعب داوای هەلومەرجی تەسلیم بوونیان کرد و بۆ یەکەم جار ملیان دا کە سەر وەبەر حکوومەتێکی بێ ئەملاوئەولای ئێرانی بنێن؛ بەلام دیسانیش پێیان باشتر بوو کە یاریدەی حوکمڕان (پاشا) بدەن لە بەرامبەر دوژمنانی دراوسێی لە باکووری رۆژاوا کە عەرەبی هاوپەیمان بوون. لە سالی ١١٥٠ی کۆچی / ١٧٣٧ی زایینیدا دوو برا بە ناوی عوسمان و سەلمانی ئالیبووناسر، شێخ «تەمووز»ی سەر بە حکوومەتی عوسمانییان گۆڕەهوو کرد و بە هاوکارییەکی چڕوپڕ ئەم هەلە رەخساوەیان بە مەبەستی بالادەستی ئەم تایفە زۆنگاونشینە گومناوە قۆزتەوە[٥٥].

وا وێدەچوو کە عوسمان ماوەیەک بەڕوالەت سەرۆکایەتی تایفەی لە ئەستۆ بێ، بەلام سەلمان بەئاشکرا کەلەگایی دەکرد و بە شوێن سیاسەتی پەرەگرتنی دەسەلاتی خۆیەوە بوو. تایفەی کەعب لە گەمارۆی سالی ١١٥٦ی کۆچی / ١٧٤٣ی زایینیدا چوونە پال هێزەکانی نادر. سێ سال دواتریش بە چوونە پال لەشکری کەریمخان خزمەتێکی ئەوتۆیان بە دەولەتی ئێران کرد. لە وەختی کوژرانی نادرشادا توانییان کە دەست و پێوەندەکانی خانەدانی ئەفشار لە دەوەرەقی بەرەو رووخان دەرپەڕێنن. شێخ سەلمان دەوەرەقی لە بەشی خوازووی رووباری «فەلاحییە» کردبوو بە شارێکی برەودار و بەرەو گەشە. لەم رۆژانەدا بنیکەعب خاکی داگیرکراوی ژێرچنگیان لەوبەرەوبەری زارکی رووبار بەرەو باکوور و نێوخۆی مەلبەندی خووزستان پەرە پێدا، بۆیە زەمانی دەسپێکی حکوومەتی کەریمخان قەلەمڕەوی ئەوان برێتی بوو لە ناوچەیەکی سێسووچ کە لە هەر لایەکەوە نیزیکەی سێ مایل بە شێوەیەکی نارێک لە مابەینی دورگەی بووبیان و هیندیان (هیندیجان) و ئەهواز چەتری ئەنگاوتبوو. لە قۆلێکی رووباری کاروون بە ناوی «سابێلە» شێخ سەلمان بە چرپیوچال و قامیش و جەگەن و قوڕ بەندێکی گەورەی سازکرد و گولاوێکی چاکی بە مەبەستی ئاودێری

---

٥٥ـ کەسرەوی، ل ١٦١، ١٧١؛ ئەلعەزاوی، عەشایر، بەرگی ٤، ل ١٨١؛ Wilson, 186 ; Oppenhiem IV Part 1, 58, 61 ; Ainsworth, 208, 209 بە مەبەستی ئاگاداری تەواو سەبارەت بە شەڕەکانی بنیکەعب، بڕواننە: خێلی کەعب، نووسراوی پێری.

بەدیهێنا. بەگوێرەی گێڕانەوەی ئەلشووشتەری(۱٦) کە خۆی پاشماوەی هەرەس و ئاوبردەی بەندەکەی دیوە دەڵێ بەندەکە وا باش ساز کرابوو کە هاووڵاتییانی شارنشینی، بە بەردیش نەیاندەتوانی شتێکی وا دروست بکەن. «کینێر» کە چاوی بە پاشماوەی هەرەسەکانی وێ کەوتووە بڕوای وایە ئەگەر کەریمخان تێکینەدابا ڕەنگە چەند سەدەیەک خۆی ڕاگرتبا و نەڕووخابا[56].

تا دە ساڵ دوای کوژرانی نادر بنیکەعب لە خۆشی و کامەرانیدا دەژیان و نێوانیان لەگەڵ دەروجیرانیان خۆش بوو. تەنیا وریای ئالیکەسیر بوون لە دەوروبەری دزفوول و شووشتەر و حوکمڕانی موشەعشەعی عەرەبستان لە حەوێزە. ئەم دوو تاقمە لەبەر شەڕ و لێکدانی بێوچان شکستیان بە خۆیان هێنابوو. داهاتی فرۆشی خورما و دەسهاویشتنە سەر ڕووباری کاروون و بازرگانێتی نێو بازاڕ خەزێنەی ئاخنیبوون. هاوکات قەڵەمڕەوی بنیکەعب لەم زەمانەدا کەوتبووە نێوان دوو ئیمپراتۆری ئێرانی و عوسمانی و شێخسەلمانی کەعبی چ شتێکی نەدەدا بە هیچکامیان و هەر لایەی بیانوویەکی بۆ دێنانەوە[57]. لە بەهاری ساڵی ۱۱۷۰ی کۆچی / ۱۷۵۷ی زایینیدا بەرەوڕووبوونەوەیەکی وا کە خۆی لێ کلا نەدەکرا قەوما. چونکە ئیتر کەریمخان لە سەر ڕەوگەی هەرووژم و هێرشی هێزەکانی ئازادخان و محەممەدحەسەنخان کە خۆیان سەرقاڵی زۆرەبانی بوون، نەمابوو، بۆیە چەکدارەکانی بە مەبەستی سەرکوت و تێکشکاندنی هۆز و تایفەکانی کۆهکیلۆیە دەنگ دا و شاری «بێهبەهان»ی لە تەنیشت ناوچەکانی دەشتەکی بنیکەعب کردە ناوەندی هەڵمەت و چالاکی. سەبارەت بە سەرکەوتنەکانی ئەم لەشکرکێشییە باس و خواسێک لە گۆڕێدایە. بەگوێرەی نووسینی غەففاری، شنەی سەرکەوتنی وەکیل سێ ڕۆژ بەر لە پێنانە «فەهلیان» وە شلکەی گوێی بنیکەعب کەوتبوو. بۆیە وەختایەک هێزەکانی زەند گەیشتنە ئەو مەڵبەندە تەنیا بەرەوڕووی وڵاتێکی ویران و بەندێکی شکاو

---

٥٦ـ تەزکەرەی شووشتەری، ل ۹۹؛ کەسرەوی، ل ۱۷۷ ـ ۱۸۵؛ Niebuhr . Reise, 227 – 228. تاریخی گیتیگوشا، ل ۱۲٦؛ Curzon II, 322 ; Kinnier 90. نامی لای وایە بۆیە بنیکەعب خزاونە قەڵەمڕەوی ئێران چونکە «موتەسەللیم»ی بەسرە تینی بۆ هێنابوون. فەلاحییە ئێستا «شادگان»ە؛ بڕواننە: فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران، بەرگی ٦، ل ۲۲۸.

٥٧ـ کەسرەوی، ل ۱٤۳ ـ ۱٥۲؛ Niebuhr , Reise , 227

بوونەوە. رووداونووسانی ئێمە بە هەرەمە پێدادەگرن کە ئەم چەشنە شەڕ و تێکهەڵنەچوونانە نەبوونە بەرگێرەوەی پەیکردن و هەسدانەوە و تالانی کەعبییەکان و ئەفسانەکانی ئەم خێڵەش وایان ڕێکخستبوو کە کەریمخان بە دەسبەتالی لە ناوچەی ئەوانەوە گەڕاوەتەوە[٥٨]. بەڵام ئەوەی زیاتر لە هەمووان شیاوی قبووڵن ئەو دەقانەن کە لە لایەن نووسەندەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتییەوە نووسراون و سەلمێنەری ئەم ڕاستەقینەن کە وێران کردنی مەڵبەندی دەوەرەق بە دەس کەریمخان، شێخسەلمانی ناچار کرد کە بە سێجاران ٥هەزار تمەن بدا تا خۆی تێنەگەیەنێ[٥٩].

لە ساڵی ١٧٥٨دا شێخسەلمان دەستی دایە پێکهێنانی هێزی دەریایی. ئەم هێزە هەر ماوەیەک دواتر تەنانەت پێشاوبڕکەی هێزی دەریایی کاپووتانپاشای(١٧) بەسرەشی دایەوە. هێزی دەریایی شێخ لە ساڵی ١٧٦٥دا بریتی بوو لە ٧٠ لۆتکەی سەوڵداری بنپان و دە پاپۆڕی گەورە[٦٠]. بە پێکهێنانی ئەم پەل و لکانە هێزە شەڕکەرەکانی ئەوان لە زەوی و دەریادا تەیار دەبوون و بەگوێرەی ئاشنابوونیان لەگەڵ شوێنە تەنک و رووبارەکانی ناوچەدا دەیانتوانی خێرا بێن و بچن و هەر وەختایەک بیانهەوێ داوی سەرڕێی هاتوچۆ لە یەکاوی عەرەبان‌دا بنێنەوە. کەعبییەکان تەنانەت خۆیان لە شەڕ و هەڵلاکانی لای بەستێنی کەنداویش وەردا و بە هێنانە گۆڕی کۆمەڵێک داوا کەوتنە دوژمنایەتی «شێخسەعدوون»ی حوکمڕانی بووشێهر و لە فێورییەی ساڵی ١٧٦١دا هەڵمەتیان بردە سەر بەحرەین[٦١]. لە مەودای ساڵانی ١٧٦١ و ١٧٦٢دا «عەلیئاغا»ی حاکمی بەسرە لەخۆڕا هەوڵی دا کە بە یارمەتی نەخواستەی پاپۆڕێکی شەڕکەری ئینگلیسی زارکی رووباری جەڕڕاحی لە خوورمووسادا بگرێ هەتا بە زۆری باج لە بنیکەعب بستێنێ. کەعبییەکان بە هاسانی کشانەوە لای سەرووی رووبار و مەڵبەندی دوورەدەستی دەوەرەق. توانییان بە تەماح وەبەرنان و ناردنی

---

٥٨ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢٥؛ کەسرەوی، ل ١٢٦ ـ ١٢٧.

59- SP 97/39 (1765 – 1757 ; unfoliated) Basra, 26 May 1757.

60- Niebuhr, Reise, 288 ; GN . Curzon II, 322.

61- Brieven 2919 (1762), Kharg and Gombroon 1761, 4 – 5

لەودەمەدا کە شێخ نەسر لە شیراز مابۆوە، شێخسەعدوون جێنشینی بوو.

دەمچەورانە و دیاری بۆ حوکمڕان (پاشا)ی بەغدا گەمارۆی دەریـایی بـڕەوێنن و ماوەیەک دواتر پالیان پێوەنان تا لۆتکە شەڕکەرەکانی خۆیان بە دژی ڕێگـرتنی بەسرە هەلکێشنەوە نێو ڕووبار[٦٢].

## ١٠ ـ ٨ هەلمەتی سالانی ١٧٦٣ تا ١٧٦٨ دژی کەعبییەکان

کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی لە بەسرە لە ئاخروئۆخری سالی ١٧٦٣دا، چالاکانە کەوتە شەڕی کەعبییەکان. شـەڕ و قڕەکـە بۆیـە ڕووی دا چونکـە ئـەم تایفەیە دەستیان بە سەر هێندێک بەروبووی خورما داگرت کـە کۆمپانیـا تێـیدا شەریک بوو. ڕێزدار «پرایس» کە نوێنەرایەتی کۆمپانیای لە ئەسـتۆ بـوو، بـۆ یاریدەی هێزە نێردراوەکانی بەغدا دوو پاپۆڕی شەڕکەری گەورەی نارد، بەلام لە شالاوی بەراییدا هیچ بە هیچ نەکرا[٦٣]. هـەر لـەم سالـەشدا «عومەرپاشـا» دژی ئامانجەکانی کەریمخان وەخۆکەوتبوو. هۆی دەبەریەکڕاچوونی ئەم دووە ئەوە بوو کە لە ڕۆژانی بزووتنی کـەریمخـان لـە ئازەربایجانـەوە بـەرەو باشـوور بالوێزی پاشا لە سیلاخور چووە دیداری. وەکیل پێشنیاری پێکرد کە وا باشە بـە مەبەستی سەرکوتی کەعبییەکان هێزێکـی هاوبەشـی ئێـرانی و عوسمـانی گـال بدرێن و لەشکری پاشاش ڕێ و ڕەوگـەکانی دەربـازبوونی ڕۆژاوا و باشـووریان لێبگرێ و چەند لۆتکە و هێندێکیش پێداویستی بخرێتـە بەردەسـتی هێزەکـانی زەند لە بەرەی باکوور. بالوێز ئەم پێشنیارەی بەگـەرمی وەرگـرت[٦٤]. کـوژرانی والی موشەعشەعی لە سالی ١٧٦٣دا بـە دەس زەکـیخـان دوایـین بەرهەلسـتی پەلهاویشتنی کەعبییەکانی لە بـاکووری خووزسـتان خاشەکێشـا و لەمپـەری نێوان هێزەکـانی زەنـد و کەعبییـەکان هەلـگیرا. یەکـەمین گەلالـەی سیاسـی نێونەتەوەیی لە ناوچەی سەرووی کەنداو بـۆ تـاقی کرانـەوە کەوتـە قۆنـاخی بەڕێوەبردن.

---

٦٢ـ کەسرەوی، ل ١٧٧؛ Saldanha, 156 ; Lorimer, 1217 – 18.

63- Lorimer, 1218.

٦٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٢٧؛ کەسرەوی ١٧٨ ـ ١٨٠.

ماوەیەکی کەم دوای نەورۆزی ساڵی ١١٧٨ی کۆچی / ١٧٦٥ی زایینی سەرەنجام هۆردووی کەریمخان بەرەو ئەهواز پێشڕەوی کرد و لە نۆی شەشەکان/یەکەمی ئاوریلی ئەم ساڵەدا لە کاروون پەڕییەوە و شێلگیرانە بەرەو قەڵەمڕەوی شێخسەلمان هرووژمی برد. بە کەلک وەرگرتن لە مەلەوانانی تایفەکان چەند پردێکیان لە مەڵبەندی زۆنگاوان لە سەر شەقەجۆگان هەڵبەست. کەعبییەکان لە بەرامبەر پەلاماردەراندا لە دوڕگەیەکەوە پەنایان دەبردە دوڕگەیەکی تر و گوندە وێران و بێ لۆتکەکانیان بەڕوودا بەجێدەهێشتن. دیسانیش فەلاحییە چۆڵ کرا و دانیشتووانی سەرەتا پەنایان بردە بەر گوندی ئاوەدان و بەرێژەوی «حوفار» لە نێوان کاروون و یەکاوی عارەبان[٦٥]. ئێرانییەکان لە فەلاحییە(١٨) دابەزین و هۆردووبەزیان کرد و چاوەڕوانی یارمەتی پاشا مانەوە. پاش سێ ڕۆژان کە هیچ یارمەتییەک نەگەیشت و شێخسەلمان لەم بەینەدا خێرایەکی لە «حوفار»ەوە خۆی گەیاندە دوڕگەی موحرەزی (ئابادان)، کەریمخان پێی نایە حوفاری خاپوور. ئەم مەڵبەندە کەوتبووە شوێنی ئێستای خوڕمشار و بنکەیەکی دڵخوازی هەڵکەوتە بوو کە تا یەکاوی عارەبان سەعاتەڕێیەک و تا بەسرە و بنەبانی کەندا‌و کەمتر لە ڕۆژەڕێیەکی مەدا بوو و ڕاست کەوتبووە بەرەوڕووی زارکی باکووری موحرەزی کە کەریمخان ئێستا خۆی لێخۆش کردبوو. لەم لایەوە بە مەبەستی بارلێنان و بەتاڵکردنی ئەو گەمێیانەی کە لە ڕێی یەکاویعارەبانەوە دەچوونە کاروون لەنگەرگایەک هەبوو. ناردنی ئازۆقە و پاشەکەوت و لۆتکە و پاپۆڕ لە لایەن حاکمی بەسرەوە تەنیا ڕۆژێکی پێدەویست. کەچی تەنیا دوو گەمی خورما و لۆتکەیەکی تەشریفاتی بۆ وەکیل نێردرا. بیانوو ئەمە بوو کە برینج و دانەوێڵە لە بەسرە کەمتر پاشەکەوت کراوە و ئەو لۆتکانەش کە داوایان کردوون لە بەغدا، هێشتا نەگەیشتوونە جێ[٦٦].

ڕووداونووسانی ئێرانیش هۆکاری پاشگەز بوونەوەی عەلیئاغا لە

---

٦٥ـ حوفار یان خەفار، بڕواننە: Oppenheim I V Part 1, 60 not; Winswovth, 173 فەرهەنگی جوغرافیایی ئێران بەرگی ٦، ل ١٣١.

٦٦ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٣١ ـ ١٣٣؛ گولشەنی مراد، ل ١٤٠ ـ ١٤١؛ کەسرەوی، ل ١٨٠ ـ ١٨٢؛ Niebuhr, Reise, 228 – 229.

یارمەتی دانی کەریمخان دەبەنەوە سەر ترس و تۆقینی سەبارەت بە نیزیکایەتی و دراوسێیەتی هێزەکانی ئێران لە شاری بێچاوسووری بەسرە. ئینگلیسییەکان خۆیان لە داخوازەکانی حاکمی بەسرە بە مەبەستی سازکردنی لەشکر و پەلەپاپۆڕێکی شەڕکەری بەرچاو وەردابوو. ئەوان کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەم گوتەیە کە ترکان (عوسمانییەکان) بەڕاستی دەیانهەوێ بەگوێرەی قەراروبڕی پێشوو یاریدەی ئێرانییەکان بدەن[٦٧]. بانگەشەی نیبوور کە لای وایە کەعبییەکان بەرتیلیان دابوویە عەلیئاغا دەکرێ وابێ، بەڵام بۆچوونێکی دیکەش کە دەڵێ کێشەکە تەنیا پەیوەندی بە دەستەوەستانی بەڕێوەبەرایەتی حاکمی بەسرەوە بوو ڕاستر دەنوێنێ[٦٨]. لە لایەکی ترەوە خانی زەند بە داخوازی ئالیک و تفاق و خواردەمەنی و گەمی لە حەوێزە و بووشێهر ئەم ناکاوییەی قەرەبوو کردووە. زەکیخان بە مەبەستی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی سەرەتایی بە چەند گەمییەکەوە لە مەڵبەندی خوارووی یەکاوی عارەبانەوە پێی نایە دوڕگەی موحرەزی و تەماشای کرد کە نێچیر لە تەڵەی ڕەوییوە و بەرەو بەرینایی کەنداو خوشیوە و گۆیا بە مەبەستی گەیشتنە «قەببان» سووڕاوەتەوە، بەڵام زەکیخان نەیدەویست کە لەوێ بکەوێتە پەیکەردەی دوژمن[٦٩].

ماوەی شەش حەوتوو چالاکی و هەڵسووڕانی بێئاکام و نالێک و تێکهاڵقان لەگەڵ گەرمای نێوەڕاست مانگی مەی، وای لە وەکیل کرد کە فەرمانی ڕاگیرانی هەڵمەت بدا. نامەیەکی بۆ حاکمی بەسرە نووسی و تێیدا نارەزامەندی و تووڕەیی خۆی سەبارەت بە بە فیڕۆدانی کات و سات دەربڕی و پێیڕاگەیاند کە ئێستا سپاکەی لە حوفار دەکێشێتەوە. وەختایەک نامەی ڕەسمی وەکیلی پێگەیشت وای بۆچوو کە تەنیا مەبەستی تێپەڕبوون و پێشڕەوی سپاکەیەتی بە ڕووباردا[٧٠].

کەریمخان گەڕایەوە لای فەلاحییە و تەمای گرت کە لەگەڵ بنیکەعب وەک خۆیان بجووڵێتەوە: بەندەکەی شێخسەلمانی هەڵداشت و زەویوزارێکی

67- Lorimer, 1291.

68- Reise, 226.

٦٩ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٣٣ ، ١٣٤ ؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٤١.

70- FR XVI, 15 and 17 May 1765; Saldanha, 192 ; Lorimer, 1219.

بەرفرەوانی دایە دمم شەپۆلی لافاو. شێخ خێرایەکی مەرجەکانی لێ قبووڵ کرد. چەند ڕۆژ دواتر نێردراوێکی نارد و ڕایسپارد کە حازرە پیتاک بدا و بارمتە بنێرێ. ، بەڵام وەکیل دەبێ تاوانەکانی جەماوەری شیعەمەزەبی ببوورێ و دەس لە خاپوورکردنی زیاتر هەڵگرێ. ئەو کات دوابەدوای ئەم ڕێککەوتنە قەرارکرا کە لە شوێنێکی دیاریکراو دامەزرێن هەتا پاشەکشەی هێزەکانی کەریمخان دابین بێ. لە بەرامبەردا دیارییەکی گەورە پێشکێش کرا و کوڕی شێخ وەک بارمتە نێردرا و ساڵێ ٣هەزار تمەن باج و پیتاکی بۆ بڕایەوە[٧١]. وا دیارە هیچ پێویستیش نەبوو کە خۆی بە مەبەستی بەجێهێنانی ڕێز بێتە خزمەت سەرۆکی سپای زەند. وەک گوتوویانە لەشکری زەند ئەوەندەیان دڵەڕاوکەی چۆڵکردنی ناوچە بوو کە کەعبی تێپەڕینەکەیانیان وەبەرچاو نەهات.

چەند حەوتوو دواتر شێخسەلمان پەیمانێکی ئەوتۆشی لەگەڵ ترکان بەست. هەڵبەت ئەم ڕێککەوتنە پاش ئەوە کرا کە گەمییەکانی بنیکەعب پاپۆڕەکانی کاپوتانپاشایان زۆر زیاتر لەوەی میرمەهنا لەو وەختیدا بە سەر شێخنەسری هێنابوو، بە فیکە بەدەورە هەڵیانخولاندبوون. وەکیل چەند هەزار کەسێکی گەڕاوەی لە هەڵمەت بۆ سەر خاکی بنیکەعب بە بارمەتی ئەمیرگۆنەخان ناردە بەندەرڕیگ[٧٢] و خۆی چۆوە شیراز و ئیتر قەت نەکەوتە بیری پەیکەردەی کەعبییەکانی ڕەوەک. کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی کە خۆی لە تێوەردانی گەلاڵەی ئاشتی پاشا و کەعبییەکان بە دوور گرتبوو، لە مانگی جوولایدا بە هۆی پەلاماری دەریایی بنیکەعب دوو بازرگان و لۆتکەیەکی باثاژۆی خۆیانی لە دەس دا و لە حاڵێکا سەبارەت بە هاوکاری چالاکانەی تریان نائومێد ببوون بە یارمەتی هێزەکانی نێردراوی بەمبەئی دەستیان دایە زنجیرەیەک هەڵمەتی دەریایی و ویشکایی. هێزە هێرشبەرەکانی ئینگلیسی تووشی گەلێک خەسار هاتن و زۆریان کوشتە و بریندار لێکەوتەوە و بێ هیچ کاردانەوەیەک لە مانگی سێپتامبردا کشانەوە و بەشێک لە هێزەکانی ترکیان وەک چاوەدێرێکی ناچالاک لە دەوەرەق بەجێهێشت. لەم ڕۆژانەدا کوڕی

---

٧١ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٣٤ ـ ١٣٦؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٤٢؛ کەسرەوی، ل ١٨٣ ـ ١٨٤؛ Niebuhr, Reise, 229 ; Malcolm . 133.

72- Niebuhr, Reise, 186, 229 – 231 ; Lorimer . 1219.

شێخسەلمان بە هێنانی دیارییەکی بەرچاو بۆ خزمەت وەکیل کە گۆیا ٢هەزار تمەن ویشکەپووڵ و باری پێنج یەستران پارچە و قوماشی هەرەگرانی «مەدرەس» و سەت سەر یەکسمی ڕەسەن بووە، داوای لێکرد و تینی دا کە سەبارەت بە ڕەواندنی دەسدرێژی ترکان بۆ سەر شێخی وەفادار هەنگاو بنێ. کەریمخان لە مانگی سێپتامبردا دوو نامەی پڕ لە مێهرەوانی و فریودەرانەی نارد بۆ پاشای بەغدا و میربەندەری بەسرە و بە پتەوی وەبیری هێنایەوە کە دەوەرەق بەشێکە لە خاکی ئێران و ئەوان دەبێ هێزەکانیان لەوێ بکشێننەوە یان هەرچی دەبێ لە ئەستۆی خۆیانە. پاشا خێرایەکی ڕەزامەندی دەربڕی و بریتانیاش لە پێشدا کشابووە هەتا بکەوێتە زێرەوانی لە یەکاوی عارەباندا و بە نابەدڵی درێژەی بەم کارە مەترسیدارە بێهوودەیە دا[٧٣].

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا کەریمخان بە شوێن پەلەپاپۆرێکەوە بوو بۆ دەگژڕاچوونی میرمەهنای کەللەڕەق، بۆیە پێشنیاری کرد بە کەعبییەکان کە زیان و زەرەدی پاشا و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی قەرەبوو بکەنەوە؛ بەڵام دانیشتن و وتوویژەکانی ئێران و بریتانیا لەبەر کۆمەڵێک دڕدۆنگی بێ ئاکام مایەوە. ئەو پەلەپاپۆر و لۆتکانەی کە ئاخرییەکەی بە مەبەستی گرتنی خارک هاتنە بەستێنەکانی ئێران شوێنی دیداری لەگەڵ ئێرانییەکان لە بووشێهر لێتێکچوو. گەیشتنی دیارییەکی بە قیمەتگرانی دیکە لە لایەن کەعبییەکانەوە ڕوانگەی ڕەشبینانەی پێشووی کەریمخانی سەبارەت بە کۆمپانیای چنۆکی هیندی ڕۆژهەڵاتی تاریکتر کرد[٧٤]. سەرەنجام تەوژمی کەعبییەکان بۆ سەر تەواوی

---

73- FR XVI, 992, 994 (13 and 17 October 1766), 1002 (7 November 1766)
سەرچاوەی سەرەکی سەبارەت بە چالاکی و هەڵمەتی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بۆ سەر کەعبییان:
FR XVI, 871 – 1001 ; BP XXXIII, 14 August 1765, 17 January 1767; SP 97/43 (1766 – 1767), 112; Niebuhr, Reise, 231 – 232. هەروەها بڕواننە:
Lorimer, 104, 1220 ; Wilson, 187 ; Amin, 85 – 88 ; Perry, ((The Banukab)) 138 – 149.

74- FR Private No. 10 ; BP XXX, 17 November 1767 ; ANP, 81 – 175, 27 September 1768 ; but see 15.5.

دەستە هەمووچەشنەکان لە مانگی ئاگۆستی ساڵی ۱۷٦۸دا بە مردنی لەپڕی شێخسەلمان کە ماوەیەک لە جێدا کەوتبوو، کۆتایی پێهات[٧٥].

شێخسەلمان لە ماوەی سی‌ویەک ساڵ حوکمڕانێتی بە سەر کەعبییەکاندا سەرەڕای دانی خەرجوبەرجی نێوەنێوە و بەرتیل و دیاری بەو کەسانەی کە وێڕای ئائومێدی سەبارەت بە بەزاندنی بنی‌کەعب لە زۆنگاوی قەڵەمڕەوییاندا دیسانیش بە پەلاماری خۆیان دەیانتوانی زەرەدیان لێبدەن، گەلێک قازانج و سامانی لە ڕێی کشتوکاڵ و بازرگانێتی و دزی دەریایی وەدەس هێنا. ئەویش وەک میرمەهنا هێزی دەریایی و سوارە و پیادەی پێکهێنابوو و بە سەرنج دان بە شوێن و هەلومەرجی خۆی هیوادار بوو کە وەبەر لافاوی شەڕی ئێرانی و عوسمانی و بریتانییەکان نەکەوێ. ئیمپراتۆرییەتی بچووکی «شێخسەلمان»یش وەک حوکمڕانێتی میرمەهنا بە مردنی خۆی دوایی پێهات. جێنشینەکانی: غانم تا ساڵی ۱۷٦۹ و بەرەکات تا ساڵی ۱۷۸۳، هەمیشە لە پەلاماری وەکیلدا بە دژی دزانی دەریایی عوسمانی بەشدار دەبوون و لە وەختی گەمارۆی بەسرەدا کەشتی و لۆتکە بازرگانییەکانی ئەوان دەفریای هێزەکانی زەندیە کەوتن و هەر بۆیە دەڵێن گۆیا وەکیل شار و خاکی «هیندییان»یشی بە ئیجارە داوە بەوان. تەنیا لە سایەی تەسلیمبوونی شێخانی بەندەرەکانی کەنداو و تایفەی بنی‌کەعب بوو کە لە ساڵی ۱۷۷٤دا ڕێگای ئاخرین و غلloورانەترین ئاواتێکی کە شاعەباس و نادرشا بە مەبەستی هێنانە ژێرڕکێفی کەنداوی فارس خۆیان لێپاراستبوو یانی لوانی گیرانی بەسرە، بە ڕوویدا کرایەوە.

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

۱ـ ئێران لە سەردەمی نادرشادا لە چەند لاوە دەستی دایە تۆکمەکردنی هێزی دەریایی خۆی. لە پێشدا چەند کەشتی و لۆتکەیەکی لە عەرەبان و بەندەری «سوورات»ی هیند و ئورووپایی‌یان کڕی. ئاخرییەکەشی بە هێنانی

75- BP XXIX, 7 September 1768 ; GN. Curzon II, 324 :

کەسرەوی، ل ۱۸٦.

دار و تەختە لە مازەندەرانەوە بۆ بووشێهر گەمیسازی لــە ئێـران خســتە گــەڕ. گرینگترینی ئەم پاپۆڕە کڕدراوانە «فەتحشای»ی تایبەت بە دەریاداری کەنـداوی فارس بوو.

٢ـ لە ساڵی ١١٤٩ی کۆچی / ١٧٣٦ی زایینیڕا لەتیفخانی دەریاســالاری ئێران توانی بەحرەین لە چنگ عەرەبەکانی هووەیلە دەربێنێ. هەڵبەت ئەم کارە وەختایەک بووزی خوارد کە «شێخجەبارە»ی حوکمڕانی بەحرەین چوویــوو بــۆ حەج. لەتیفخان پاش گەڕانەوە لە بەحرەین و دابەزین لە بووشــێهر کلیلــەکانی قەڵای بەحرەینی بۆ محەممەدتەقیخان نارد و ئەویش بەڕێی کرد بــۆ نادرشــا و لەو وەختیڕا بەحرەین بوو بە پاشکۆی پارێزگای فارس.

٣ـ میرناسری زەعــابی (وەغــایی) میربەنــدەری بەنــدەرڕیگ و بــاوکی میرمەهنا بوو. میرمەهنا باوک و زۆربەی کوڕەمامەکانی خۆی کوشت و بــوو بــە حوکمڕانی بێبەرهەڵستی بەندەرڕیگ و خارک.

٤ـــ جەواســم لــە ڕاســتیدا «قەواســم»ە ... بەگــوێــرەی نـــووسینی خودالێخۆشبوو سەدیدوسسەنتەنە لە «نەهجولقەدیم»دا ئــەم تایفــە بــە ڕەگــەز «عەمالقە»ن کە لە گۆشە و کەناری ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستا بلاوبوونەوە و ئەوانەی کە لە بەحرەین و عومان بنەگر بوون بە جاسمی و جەواسم ناسران. ئەمانــە بــە درێژەی سەدەی هەژدە و نۆزدەی زایینی لــە ڕاووڕووتی دەریــاییدا ناوبانگیــان دەرکرد و بوونە هۆی ترس و تۆقینی دراوسییەکان.ئەگەرچی جەواسم کەوتبوونە ئەوبەری کەنداو و دانیشتووی شــارجە بــوون وردەوردە خزینــە بەشــی ئێــرانی کەنداوی فارس و لە نیزیک بەندەرعەباس بنەگر بوون. لە ساڵی ١٧١٧دا دوڕگەی بەحرەین و قیشم و «لارەک»یان داگیر کرد و کەوتنە گــەمارۆی قــەلای هــۆرمز و یەکەم شێخی جەواسم کە لە بەندەرلینگەوە هاتە بەندەر کۆنگ، شێخ ســەعیدی بنیقەزیب بوو کە «بنیموعین»ی لەم لەنگەرگایە دەرکرد.

٥ـ شێخ عەبدولقادر هاوکات لەگەڵ پەلاماری سادقخان بۆ سەر بەســرە ســەرۆکی تایفــەی هاوپــەیمان بــوو. شــێخ«ســامیر»ی بــرازای چــاوی بــە عەلیمحەممەدخانی زەند لە بەسرە سپی کرد. شێخ سووەینی کوڕی پاش مردنی سامیر بــوو بــە ســەرۆکی تایفــە و بــە دەس عــەرەبی خــەزاعیل کــوژرا و مــیر عەبدوللەتیفخانی شووشتەری خــاوەنی توحفەتولعالــەم، بــە چــاوی خــۆی

تێداچوونەکەی دیتووە(ل١٨٤). سەرۆک (شێخ)ی تایفە لە ڕۆژگاری ئەفشارییە و زەندیەدا لە تیرەی ئالیسەعدوون بوون...

٦ـ لە زەمانی زەندیەدا شێخ عەبدوڵڵای کوڕی محەممەد کوڕی عەلی کوڕی ساڵحی دووهەم دوازدەهەمین سەرۆکی تایفە بوو کە حاجی «ئاغامحەممەد»ی حوکمڕانی گەرمەسێر گرتی و لەگەڵ بنەماڵەکەی ناردی بۆ شیراز. لەم شارەدا توانی ڕەزامەندی وەکیل سەبارەت بە گەڕانەوەی بو دوڕگەی هۆرمز وەدەس بێنێ و کوڕەکەی بە بارمتە لای ئەو بەجێهێشت... بنیموعین لە ساڵی ١٠٠٧ی کۆچی / ١٥٩٨ی زایینیدا لە «نەجد»ەوە هاتنە کەنداو و لەو زەمانیدا عەتییەی بنی عەلی سەرۆکیان بوو و هەشت هەزار کەسێک دەبوون. بنیموعین سێ بەرەبابن: ١ـ خەوازمی ئالیمحەممەد ٢ـ ئیحامیدە ٣ـ حەناحنە لە ئالیعەبدورڕەحمان... .

٧ـ چارەک بەندەرێکی چکۆڵەیە سەر بە مەڵبەندی شیبکۆی شارستانی بەندەر لینگە.

٨ ـ مەبەست لە محەممەدی بنی حەنیفە، ئەبولقاسم محەممەدی بنیعەلی بنیئەبووتالبە و ساڵی ٢١ی کۆچی مانگی هاتۆتە جیهان و ساڵی ٨١ی کۆچی مانگی تەمەنی بڕاوەتەوە. حەنیفە نازناوی دایکێتی بە ناوی «حەولەتە»ی کچی جەعفەری کوڕی قەیس. پاش نەمانی باوکی دوورەپەرێز دەژیا. موختاری کوڕی ئەبیعوبەیدی سەقەفی بە ناوی ئەوەوە ڕاپەڕی و بنەمای ڕێبازی «کیسانییە»ی بە لایەنگرێتی ئەو ڕۆنا. ڕێزدار پیری وشەکەی بە هەڵە تۆمار کردووە.

٩ـ «لاوەر»ی سەر بەستێن یەکێک لە بەندەرە گچکەکانی مەڵبەندی کەنگانی شارستانی بووشێهرە.

١٠ـ نیبوور دەنووسێ: کۆخە نالەبارەکانی دوڕگە نەیاندەتوانی جەماوەر لە بەرامبەر بڵێسەی گەرمادا بپارێزن و زۆرکەس دەمردن. ئێستا خودی میرمەهناش هیچی لە چنگ نەدەهات. چاوێکی کوێر ببوو و ئەوی دیکەشی زۆر دێشا... ئەمە دەریدەخا کە میرمەهنا لەبەر شەڕ و لێکدان و سەختی گوزەران چاوێکی لەدەس دابوو.

١١ـ بەندەری کەنگان کەوتۆتە بەشی «سەلاس»ی مەڵبەندی کەنگان و

خوارووی بووشێهر... لە بوشێهرەوە ۲۳٦ کیلۆمیتر و لە بەندەر لینگەوە ۳۸۰ کیلۆمیتر دوورە.

۱۲ـ شێخ‌عەبدوڵلای بنی‌موعین لەبەرووەی لەگەڵ جەواسم دوژمنایەتی بوو، بە مەبەستی دڵنیاکردنەوەی وەکیل «محەممەد»ی کوڕی بە بارمتە دانا و گەڕاوە... محەممەد بە دەس «سەرحان»ی برا چکۆڵەی کوژرا. براکەی تری بە فەرمانی دایکی، «سەرحان»ی کوشت و خۆی بە ناوی سوقری کەبیر بوو بە سەرۆکی تایفە. (مێژووی شێخانی بنی‌موعین لە قیشم، ل ٦۱۲. کتێبی بەندەرعەباس، نووسراوی سەدیدوسسەنتەنە.)

۱۳ـ بەستەک یەکێک لە گوندەکانی مەڵبەندی بەستەکی شارستانی بەندەر لینگەیە و بەگوێرەی نووسینی فەسایی ۲۱ فرسەخ لە شاری لارەوە دوورە. هەر لە کۆنەوە شێخانی بەستەکی ئەم ناوچەیان بەڕێوە بردووە. مەڵبەندی بەستەک ئاوی شیرینی لێنیە و کشتوکاڵی هەمووی دێمەکارە.

۱٤ـ کچی شێخ عەبدوڵلا ناوی عائیشە بوو. شێخ دەیەویست لە ڕێی ژن و ژنخوازی‌ڕا لە دەسەڵاتدارانی ناوچە نێزیک بێتەوە. قەرار بوو ئایشێ کە کیژێکی جوان و جحێڵ بوو مێرد بە نەسیرخانی لاری بکا؛ وەختایەکیش خەریکبوون «زەمزەم»ی خوشکی بدەن بە حوکمڕانی عومان، بەڵام لەبەرووەی نەسیرخان لە ساڵی ۱۱۷٦ی کۆچی‌دا مرد ئایشێیان دا بە عەبدوڕڕەحمانی بنی‌ڕاشدی ئامۆزای شێخ عەبدوڵلا.

۱٥ـ بنی‌خوفاجە بەر لە ئیسلام لە ڕۆژهەڵاتی مەدینەی مبارەک ژیاون و تیرەیەکن لە بنی‌عەقیل کە وردەوردە لەبەر شەڕی تایفەتی بەرەو ڕۆژهەڵات ڕادران. لە نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمیش‌دا قەرامەتە بەرەو ئێراقیان پاڵ دان و بەگوێرەی نووسینی ئیبنی‌ئەسیر لە «ئەلکامیل»دا ئەمانە ساڵی ٥٦۰ی کۆچی پەلاماری ئێراقیان داوە. بنی‌خوفاجە لە سەدەی پێنجەمی کۆچی‌ڕا بوونە ماکەی گێرە و کێشە و کوشتار و تالانێکی زۆر لە دووچۆمان (بین‌النهرین)دا. تۆغرۆڵی سەلجووقی بە قورسی دەمکوتی کردن. پاش ڕووداوەکانی ساڵی ٥٥٦ی کۆچی کرانە ڕێداری ڕێوبانەکانی ئێراق. بنی‌خوفاجە کەم‌کەم جێی خۆیان دا بە دوو بەرەبابی ناسەرەکی یانی بنی‌کەعب و بنی‌حوزن. خوفاجە بە مانای دز هاتووە. ماوەیەک لە سەرەتای سەدەی شەشەم‌دا لە ناوچەی سووسەنگرد بنەگر بوون و

بەم ناوچەیان دەگوت خوفاجییە.

١٦ـ مەبەست لە ئەلشووشتەری سەید عەبدوڵڵای شووشتەرییە لە خانەدانی شووشتەری و نووسەری کتێبی «تەزکەرەی شووشتەری»یە و ڕێزدار پێری «ئەل»ی عەرەبی بە ناوبانگییەوە لکاندووە.

١٧ـ کاپوتانپاشا نازناوی فەرماندەی هێزی دەریایی بوو لە حکوومەتی عوسمانیدا(دەریاسالار).

١٨ـ فەلاحیە ناوی مەڵبەند و شارێکە لە خووزستانی باشووری و کەوتۆتە بەستێنی کەنداو و نێوان ئابادان و ئەهواز و جەڕراحی و هیندیجان و رووباری جەڕراحی بە نێوەڕاستیدا تێدەپەڕێ. لە پێشوودا پێیدەگوترا سەوەرەق(عەرەبێندراوی سەوەرەک) و موقەددەسی لە «ئەحسەنوتتەقاسیم»دا بە شارێکی گەورە و ئاوەدانی دادەنێ. بەلام چونکە شێخسەلمان لە پەنا هەرەسە رووخاوی ئەو کۆنەشارە، ئەم شارەی ساز کرد بە بناغەدانەری فەلاحیەی دەزانن. ئەم شارە ساڵی ١١٦٠ی کۆچی/١٧٧٤ی زایینی ساز کراوە ... .

# ١١

# گەمارۆی بەسرە

## ١١ ـ ١ پێشینە

بنەبانی کەنداوی فارس بە ناوەندی سروشتی بازرگانێتی دەرەوەی ئێرانی ڕۆژاوایی و دۆڵ و دەشتی دوورەدەستی باکووری ئێراق دادەندرێ. گواستنەوە و گەیاندن بەو چۆماو بەربلاو و ئارامانەی یەکاوی‌عارەباندا لە ڕێی ڕووبارەکانی دیجلە و فورات و کاروونەوە ئەنجام دەدرێ و بەندەری بەسرە نە تەنیا حاکم‌نشینی ڕەوگەیەکی ئاوییە بەڵکوو ڕێگاوبانی ویشکانی عەرەب و ئێرانییانی لێوارەکانی کەنداوی فارسیش بەوێدا تێپەڕ دەبێ. بەسرە لە ماوەی چوار سەدەی سەرەتای حوکمڕانێتی ئیسلاما گەورەترین لەنگەرگای ناسراوی ئەو ڕۆژگارە بوو. لە پەرپەڕۆچکەی هەڕەتی دەسەڵاتی خەلافەتی عەباسییەکان، ئاوریشم، دەوا و دەرمان و ئەفسانەکانی سەبارەت بە هیندوچین لە ڕێی بەسرەوە دەگەیشتنە ناوچەکانی جەرگەی جیهانی ئیسلام. پاش سەرکەوتنەکانی هۆزی مەغوول و لێک‌دابڕانی دنیای عەرەب و هەرێمەکانی خەلافەتی ڕۆژهەڵاتی ئێران لە یەکتر، بەسرە و ئاوەڕێی بوو بە بنەما و ناوەندی سەرەکی دووبەرەکی و نێوانگرژی لایەنەکان و لەو دەمیڕا تا ئێستا دوژمنایەتییان هەروا ماوەتەوە.

لە درێژایی بەشی زۆری مەودای سەدەکانی نێوەڕاستا دەسەڵاتی بازرگانێتی ئیمپراتۆرییەتی فاتمییەکان بوو بە هۆی ئەوەی کە ڕێگاکانی بازرگانێتی جیهان بەرەو هێڵ و تەوەرەی مەدیتەرانەی باشووری ـ دەریای ئەحمەر سەری باداتەوە و شارە سەربەستەکانی ئیتالیا بایخ و گرینگایەتی بەسرە تا ڕادەی بەندەرێکی ناوچەیی دابەزێنن. لەگەڵ دەسپێکی تەنینەوەی دەسەلاتی بازرگانێتی ئوروپاییەکان لە هیند و ڕۆژهەلاتی دوور ڕێگای کەنداوی فارس و بەستێنەکانی دووچۆمان بەرەو «حەلەب» بەتایبەتی چونکە بە خێراترین ڕێوبانی پێکەوە بەسترانەوەی نێوان هیندووستان و ئورووپا دادەندرا، بۆ ماوەی دوو سەدەیەک هۆکاری گەشە و نەشە و ژیانەوەی بەسرەی بەدیهێنایەوە. پاش ئەوەی کە میرانی مەمالیک ئەم شارەیان بە تەواوەتی لە عوسمانی دابڕی و گەیاندیانە سەربەستی، جارێکی تر لە سەدەی هەژدەی زایینیدا بەسرە وەک بەندەرێکی هێنانی کەلوپەل تا ڕادەیەک گرینگایەتی خۆی وەدەس هێنایەوە.

بەسرە وای گوڵ کرد کە چاوانی چنۆکی میرانی سەفەوی و ئەفشاری بڕییە خۆی و شاعەباس لە ساڵی ۱۶۲۹دا سپایەکی بە مەبەستی گرتنی ئەم لەنگەرگایە بەڕێ کرد، بەلام هۆردووی نێردراو پاش ئەوەی گەیشتە پای دیواری بەسرە، لەبەر هاتنی هەواڵی مردنی میری سەفەوی بەناچار گەڕایەوە[1]. لە ساڵی ۱۶۹۵دا عەرەبی «مونتەفیق» بەسرەیان لە چنگ دەوڵەتی عوسمانی دەرهێنا، بەلام ماوەیەک دواتر تووشی کێشمەکێشمی بنەماڵەیی هاتن لەگەڵ دراوسێی ڕۆژهەلاتی خۆیان کە والی موشەعشەعی(۱) بێ و لە ساڵی ۱۶۹۷دا لە بەسرە دەرکران؛ سەید فەرەجولڵا موشەعشەعیش بە نۆرەی خۆی وەک حوکمڕانی عەرەبستان کلیلی شاری بۆ شاسولتانحوسێن نارد. حکوومەتی ئێرانیش وێڕای ناردنی دیاری و خەلاتێک کلیلەکەی بۆ ناردەوە، بەلام لەبەروەی شار لە لایەن موشەعشەعییەکانەوە گیرابوو، بە شێوەی ناڕاستەوخۆ بەسرە بۆ ماوەی چوارساڵان بە دەس ئێرانییەکانەوە بوو. ئەو مەبەستەی کە شایانی وەبیرهێنانەوەیە ئەمەیە کە ڕاست چەشنی گیرانی شار لە سەردەمی حکوومەتی زەندیەدا هۆکاری وەک چۆلەپێچکران و بەلێنەکانی دەوڵەتی عوسمانی

---

۱ـ بڕوانە: کەسرەوی، ل ٦٥ ـ ١٦٢؛ .Sestini, 194

سەبارەت بە وڵاتانی ئورووپایی و پەرەگرتنی نەخۆشی چاوقوڵکە لە ساڵانی ١٦٩٠ ـ ١٦٩١دا، خۆراگری و دەسکردنەوەی شاری لاواز کرد و پاڵی پێوەنا بۆ دەس‌دان[٢].

یەکەمین هێرشەکانی نادرشا بۆ سەر ئیمپراتۆرێتی عوسمانی لە بەهار و هاوینی ساڵی ١٧٣٣را راستەوخۆ بۆ سەر بەغدا دەستی پێکرد و پاش ئەم پەلامارانە بەبێ سەرکەوتن گەڕایەوە ئێران. گەلاڵەی هەڵمەت بۆ سەر بەسرە لە لایەن هێزە هاوبەشەکانی بنی‌لام و موشەعشەعیش نەزۆک مایەوە[٣].

لە ساڵی ١٧٥٣دا هێزێکی بە مەبەستی یاریدەی لەتیف‌خانی دەریاسالاری و هێزی تازەی دەریایی گاڵ دا هەتا پەلاماری بەسرە بدەن. هێرشی ئێرانییەکان پاش سێ‌ڕۆژ تەقە و لێکدان لە یەکاوی‌عارەبان‌دا کە دوو گەمێی شەڕکەری بریتانیاییش بەناچار کەوتنە یارمەتی‌دانی پاشای بەغدا و دەورێکی گومان‌لێکراویان گێڕا، تێکشکا[٤]. لە مانگی سێپتامبری ١٧٣٤دا هاوکات لەگەڵ ئەو ڕۆژانەی کە هێزە سەرەکییەکانی لە لای مووسڵەوە، بەغدایان خستبووە مەترسی، لەشکرێکیشی بە مەبەستی گەمارۆی بەسرە بەڕێ‌کرد. هێرشی نادر بۆ سەر بەسرە بە هاوکاری عەرەبەکانی بنی‌کەعب، بنی‌لام و مونتەفیق ڕووی دا. لەم وەختەدا نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بە ناوی تۆماس دریل ناچار ببوو کە گەمییەکانی شەریکە بنێتە بەر دەستی پاشا. بەڵام پەنامەکی لە سەرۆکانی خۆی ڕاسپارد هەتا فەرمان بدەن کەشتییەکان لەم شەڕە بەرێتەدەر و بیانگێڕێتەوە.

هێرشبەران لەبەر وەی تۆپخانەی قورسیان بە دەستەوە نەبوو هیچیان لەگەڵ شوورەی شار پێنەکرا و سێ‌مانگ دواتر بەناچاری گەڕانەوە. بەگوێرەی پەیمانی بەستراوی ساڵی ١٧٤٦ و بەپێی سنوورە دیاریکراوەکانی ڕێککەوتننامەی ١٦٩٣ی نێوانیان ئاشتی سەقامگیر بوو[٥].

2- Lockhart, Safavi Dynasty, 52 – 54; Plaisted, 23.
3- Lockhart, Nadir shah, 68.
4- Ibid, 93 – 94; Longrigg.
5- Longrigg, 152, Lorimer . 1199; Lockhart . Nadir Shah, 234 – 236.

## ١١ ـ ٢ بەسرە و بەغدا لە سەر لێواری هەڵگیرسانی شەڕ

ئەحمەدپاشا بناغەدانەری زنجیرەی خانەدانی میرانی «مەمالیک»ی بەغدا بوو کە بنەڕەتی کاری خۆی لە سەر پێوشوێنی نەبەسترانەوە و سەربەخۆیی راستەقینە و جودایەتی لە «بابیعالی» ڕۆنابوو. بەسرەشی وەک سەرهەدی قەڵەمڕەو و حکوومەتەکەی دیاری کرد. سوڵتانی عوسمانی لێبڕا کە جارێکی تر بە دابەشینەوەی قەڵەمڕەوی پاشا و جویکردنەوەی بەسرە وەک بەشێکی سەر بە خاکی رۆژهەڵاتی فەرمانڕەوایەتی خۆی، دەسەڵاتی رابردووی وەدەس بێنێتەوە و سەقامگیری بکا، بۆیە سلێمانی گورجی غولامی پێشووی ئەحمەدشا و زاوای ئێستای کردە حاکمی بەسرە و تەماحی وەبەر نا. بەڵام هەرکە لە ساڵی ١٧٤٩دا سلێمانپاشا بەرەو بەغدا بزووت و قەڵەمڕەوی میرایەتی بەغدای تەواو داگیر کرد و سەرلەنوێ هەر دوو پارێزگای وەسەر یەک خستەوە، سوڵتان جگە لە دەربڕینی ڕەزامەندی مووی لێنەبزووت[6].

سەبارەت بە بیرۆکەی خودموختاری قەڵەمڕەوی میرایەتی بەغدا بە سەرۆکایەتی ئەحمەدپاشا و جێنشینانی لە ماوەی نیوسەدەدا لە پێشەکی چروپری کتێبی «گەشتێک بۆ ئیمپراتۆرییەتی ترکان» بە قەڵەمی «ئێتۆن»[7]دا ئاوا نووسراوە:

«پاشا (حوکمڕان) خاوەنی چەشنێک سەربەستی راستەقینەیە، لە سەردەمی ئەحمەدپاشادا چما بە هەڵکەوت، دەنا سوڵتانی عوسمانی هەمیشە لە سەر هەوای کۆن، پاشا و کاربەدەستانی بەڕێوەبەرایەتی و لەشکری بەغدای دەس لێنەداوە و لە جێی خۆی نەیترازاندوون، هەتا بە شێوەیەکی زاڵمانە دەسەڵاتیان بسەپێنن. بە هەر حاڵ لە چەند بۆنە و هەڵکەوتێکا فەرمانی هەڵبژاردنەوەی دەنارد و هەمیشەش پاشا پاڵێوراوی هەڵبژاردەی بابیعالییە بۆ

---

6- Cevdet 1, 339; SP 97/33 (1748), 175b – 176a; SP 97/34 (1749), 81, 121b – 122a, Brieven 2716 (1754), 52 – 57.

بە مەبەستی وەدەس هێنانی زانیاری سەبارەت بەم میرانە کە تا ساڵی ١٨٣١ مابوون، بڕواننە کتێبی لانگرینگ، بەشی ٧ تا ١٠.

7- Pp. 287 – 288.

ئەم پلە بەرزە و هەموو ساڵێ لەخۆوە نوێ دەکرێتەوە و پاشا لـە جێـی خـۆی دادەندرێتەوە و وای نیشان دەدەن کە بـابیعـالی دەسـەڵاتی لادانی حوکمـڕانی هەیە. سوڵتانی عوسمانی هەموو ساڵێ برە پووڵ و ماڵێ لەم پارێزگا بـەربلاوە وەردەگرێ.»

ئێتۆن لە درێژەی باسەکەدا دەڵێ کە لیستەی حیسابی سـالانەی پاشـا نیشادەری خەرجکرانی زۆربەی داهاتەکەیەتی بۆ لەشکری زۆروزەوەنـدی و ئـەم سپایە بە مەبەستی بەرپـەرچدانـەوەی هێرشـی ئێـرانی و عـەرەبان پێویسـتە. هەروەها بەشێکی داهاتی لەو قەلایانە خەرج دەکرێ کە لەمێژساڵە چۆلن. پاشـا قەت بۆ یاریـدەی شـەڕەکانی ئوروپـایی سوڵـتان چەکـدار نـانێرێ و دەڵـێ لەشکرەکەی بۆ قەڵەمڕەوی خۆی پتر پێویستە و بۆ بیـانوو دۆزینـەوە و بەڵـگە سازکردنیش جاری وایە دەس دەبا بـۆ شـەڕی قەسـتەکی لەگـەڵ عەرەبـەکانی مونتەفیق و شانۆیەک دەگێرێ.

سلێمانپاشا زۆر بەگەرمە سەبارەت بە کاروبـاری بەسـرە تامـەزرۆیی دەنواند و ئەو بەندەرەی لە لایەن نوێنەری خۆیـەوە بـە نـاوی «موتەسـەلليم» (میربەنـدەر) بـەڕێوە دەبـرد و بەتایبـەت لـە توجـارەتی کۆمپانیـای هینـدی ڕۆژهەلاتیشدا قازانجی پێدەگەیی. ڕاپەڕین و ئاژاوەی هـۆز و تایفەکانیشـی بـە هێرشی سەرکەوتووانەی شـەوانەی تێکدەشـکاند و ئـەم چالاکیانـە ناوبـانگی «ئەبوولەیلە»ی(٢) بۆ بە دیاری هێنـابوو[8]. گێڕاویانەتـەوە کـە جارێکیـان لـەم پەلامارانەدا شـەش دیلـی بـە دانیشـتنەوە بـە دەسـتی خـۆی بـەدوای یـەکدا سەربڕیوە[9]. دوازدە ساڵ حوکمڕانێتی تێکەڵ بە خۆشەویستی و دەسەلاتی لەگـەڵ پاشایەتی نادر هەڵدەسەنگێنن. دەیەویست کـە شـوێنێک بـە مەبەسـتی بنـەگر کردنی ڕاکردووان و یاغییان و پەنابەرانی ئێرانی دابین بکا. لێرەدا دەکـرێ لـەم ڕاکردووانە ناوی مستەفاخان و عەلیمەردانخان و خوازیارە ساختە و قەڵبەکەی تەختی پادشایەتی هاوڕێیان لە ساڵی ١٧٥٢دا و ئازادخان پاش ڕەوینی لە ڕووی قاجارییەکان لە ١٧٥٧دا بێتە گۆڕ.

• پاش مردنی سلێمانپاشا لە مانگی مەی ١٧٦٢دا، سەعدەددینپاشا کرایە

8- Cevdet 1, 339; Niebuhr . Reise, 317.
9- Beauchamp, 273.

جێنشینی کە بابیعالی لە «ڕەقە»وە ناردبوویە وێ. کەمێک دواتر سەرەنجام بەڕێوەبردنی بەغدا کەوتە دەس «عەلیپاشا»ی ناسراو بە ئەلعەجەمی. ئەو «کەهیا» (بریکاری وەزیر)ی سلێمانپاشا بوو(٣). عەلیپاشا ئەگەرچی لە کاروباری حکوومەتیدا زۆر چاکی خۆ نواند، بەلام بە پالپشتی هێزەکانی یەنیچەری (پارتیزانی) ـ گۆیا بە فیتی عادلەخاتوونی بێوەژنی سلێمانپاشا ـ لە بەغدا دەرکرا و لە کۆدتایەکدا بە مەبەستی وەدەسهێنانەوەی دەسەلات کوژرا. فەرمانی داندرانی عومەرپاشای جێنشینی لە هاوینی سالی ١٧٦٤دا لە لایەن بابیعالییەوە وەک پاشای پارێزگا یەکگرتووەکانی بەغدا و بەسرە دەرچوو[١٠].

بەرهەمی پاشاگەردانی ئێران ئێستا بە شێوەی جێنشینایەتی میری و بەهێزی کەریمخان خۆی نواندبوو. عومەرپاشا دانی بە دەسەلاتی وەکیلا هێنابوو و هەر ئەو سالەی بوو بە حوکمڕان، بالوێزێکی نارده لای و داوای هاوکاری لێکرد بە مەبەستی پەلامار بۆ سەر کەعبییەکان. ئەو میربەندەرەی سەرۆکایەتی بازرگانێتی بەسرەی دەکرد ناوی سلێمانئاغا بوو کە لە سالی ١٧٦٥ڕا ئەم پلەیەی وەرگرتبوو. ناوبراویش گورجیزادەیەک بوو کە بۆ لێوەشاوەیی و هەلسووڕاوی بارتەقای سلێمانپاشای نەمری بەغدا دەهاتەوە. گۆیا چەند جاری تابشت هێنا لە بەرامبەر حوکمی لە سەر کار لادرانی لە بەغداوەڕا: (سالانی ١٧٦٨، ١٧٦٩، ١٧٧١ و ١٧٧٣). پاش گیران و ئازادکردنی لە لایەن هێزەکانی زەندەوە دیسانیش گەڕایەوە سەر کاری خۆی و ئاخرییەکەشی بوو بە پاشا (حوکمڕان)ی بەغدا و لە سالی ١٨٠٠دا «سێرجان مێلکۆم»یش وەک شووشتەری لە بەغدا دیویەتی و دەلێ لەبەر ساکاری و جوامێرییەکەی کەوتبووە ژێر کارتێکردنی[١١].

لە ماوەی هەژدە مانگی ئەو دوو سالەی مابووی بۆ گەمارۆی بەسرە، ئێراق لەبەر نەخۆشی تاعوون هێزی دەبەردا نەمابوو. ئەم نەخۆشییە یەکەم جار لە سەرەتای سالی ١٧٧٢دا بەپێی کاروانێکەوە لە ڕۆمەوە هاتە ئەو شارە و خێرا لە بەسرە و ناوچەکانی بەستێنی و خووزستان و بووشێهر و مەلبەندەکانی

10- GD XII, 6 August 1762; Cevdet 1, 340; Hurat . 153 – 155.

11- Malcolm, 234 note; Shushtari. Tohfat, 146; Azzawi, Tarikh, 81; Olivier I. 343.

ئەوپەڕی وان بلاو بۆوە. بەر لەوەی ڕاست لە هاوینی ئەو ساڵە بـە شـێوەیەکی لەنەکاو ڕاوەستێ، ببوو بە دەنگۆ کە چەندهەزار کەسـی کوشـتووە. ئینگلیسـی لایان وابوو کە تەنیا لە شاری بەغدا ٢٥٠هەزار کـەس مـردووە[١٢]. ئـەم شـەپۆلی مەرگە سستییەکی گشتی بە سەر ژیانی ئیداری و بازرگانیدا بـەدیهێنـا و بـەم ڕادەیەش ئاستی خۆڕاگری جەماوەری بەتایبەت بە باری لەشکریدا لە بەرامبەر تەوژم و پەلاماری ئێرانییەکاندا هێنایە خوار[١٣].

نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ناسـراو بـە مـوورە بـە گـۆترە گوتوویەتی لە خودی شـاردا ٢٠٠هــەزار کـەس و لــە سەرانســەری ناوچـەشدا نیزیکەی ٢٠٠هەزار کەس بەم نەخۆشییە چوون. بەڵام ئینگلیسییەکانی تـر لایـان وایە سەرجەم ١٤٠هەزار کەس مردوون کە ڕۆژێ دەبێتــە ٣٠٠کـەس لــەم شــارەدا. بەپێی بۆچوونی وشیارانەتری «سێستینی» لە سەردەمی تاعووندا و گیرانی شار بە دەس ئێرانییەکان ڕێژەی جەماوەری ئەو شارە لە ٥٠هەزارەوە دابەزیوە بو ٢٠ تا ٣٠ هەزار کەس[١٤]. پاش گیرانی بەسرە خەڵکێکی زۆر ئەم شارەیان چۆل کـرد و لەوێشەوە ڕایانکردە شوێنی پەناتری وەک شووشتەر. لەم کاتەدا تاعوون هــەتا چوار فرسەخی شـار ملـی پێوەنـابوو. ئـەو جـەماوەرە سـیابەختەی لــە ڕێـی

12- SP 97 – 49 (1773), 147 a.

13- Shushtari, Tohfat, 142 – 143; FR XII, 1061 (19 January 1774); Lorimer 1241 Huart, 155 – 156; Badi 34; Azzawi, Tarikh, 42.

ئەم مێژوونووسە بلاوبوونەوەی تاعوون بە سەرەتای شابانی ١١٦٨ / نوامبری ١٧٧٢ تـا ئاوریلی ئەم ساڵــە دادەنــێ. ئــەم مەبەســتە بــەگوێرەی ڕاپــۆرتی کۆمپانیــای هینــدی ڕۆژهەڵاتی و بڕوای شووشتەری کە تا نێوەڕاست ساڵی ١١٨٧یش درێژەی بووە ـ ئەگــەر مانگە نووسراوەکان پاشوپێش نەکرابن ـ پتر پشتڕاست دەکرێتەوە.

14- FR XVII, 106; SP 97/49 (1773), 147a, 153a, Sestini, 106; Masson, 548.

ژمارەی سەر بەم دەورەیە بەپێی پێویست ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە زەمانی گەمارۆ و گیرانی شار بە دەس هێزەکانی زەند تێداچوون، بەڵام نابێ ڕێژەی «تــاعوونکوشــتان» لەبەرچاو ون بێ. بەراوردی دەورەی پەتاکە و بەتایبەت ئامــاری مــردووان زۆری لێـوە زیاد کراوە. باوی لای وایە کە ٧٠هەزار کەس تەنیا لە یەکەم ڕۆژا لــە بەغـدا مـردوون و ڕۆژی دووهەم و سێهەم لە ئەژمار بەدەر خەڵک تێداچوون.

ویشکانیڕا هەڵاتن، لە دەرودەشتان بڕە نان و ئاو و ئازۆخەیەکیان پێبوو. بەم چەشنە سەرەتای ڕاوەستانی تاعوون ئاسۆگی دا و شەپۆلی نەخۆشی بەتەوژم کەوتە بەستێنی یەکاویعارەبان[١٥]. لە ٢٧ی مانگی جوولایدا کە تاعوون بە زەحمەت تەواو ببوو، بنیکەعب هرووژمیان بردە سەر شار و دوو ماڵیان تاڵان کرد. ماڵی کاپووتانپاشا بەو لۆتکانەشەوە کە لە پەنای لەنگەریان هاویشتبوو ئاگر درا[١٦]. بەر لەوەی کە بەندەری بەسرە لە چنگ تاعوون ڕزگاری بێ، هێزەکانی زەند لە پەنا دەروازەکانی دابەزین.

## ١١ ـ ٣ هۆکارەکانی شەڕی بەسرە

درێژەی سەربەخۆیی زنجیرەی پاشایەتی مەمالیک لە بەغدا بێگومان لە دەساڵی ڕابردوودا بە هۆی تێکهەڵچوونەکانی حکوومەتی عوسمانی لە ئورووپا گەشەیەکی کردبوو. لە ساڵی ١٧٦٧ تا ١٧٧٤ حکوومەتی بەرباس بە دژی دەوڵەتی ڕووسیا کەوتبووە شەڕێکی نەفامانە تا دەستی پێ لە لەهێستان (پۆلۆنی) بەربدا. لە ئاکامی ئەم شەڕەدا نەک تەنیا هێزی دەریایی، بەڵکوو سەربازێکی زۆریشی لە بەستێنەکانی باکووری دەریای ڕەش لە دەس دا. بەگوێرەی پەیمانی «کوچوک کاینارجا»(٤) کە لە ژوئییەی ساڵی ١٧٧٤ لە نێوانیاندا بەسترا نە تەنیا بەشێکی لە قەڵەمڕەوی خۆی دایە دەس ڕووسیا، بەڵکوو ناچار کرا کە خودموختاری بداتە بەشێکی بەرچاوی ناوچە مەسیحینشینەکانی. لێرەدا خاڵی بەرچاوی ورد و باریک ئەمەیە کە بابیعالی هەتا کۆتایی هاوینی ساڵی ١٧٧٦، یانی سێمانگ پاش گیرانی بەسرە و نیزیکەی دوو ساڵ دوای هەڵگیرسانی بەرایی تێکهەڵچوونەکانی لە کوردستان، شەڕی لەگەڵ ئێران ڕانەگەیاند. سیاسەتی پاشای بەغدا گڕی شەڕی هەڵگیرساند یان لانیکەم پێداویستییەکانی سەرەتای لێکدانی ئامادە کرد؛ بۆیە دەوڵەتی عوسمانی لێیگەڕا تا خۆی لەگەڵ شوێنکەوت و بەرپرسایەتییەکانی هەڵگیرسانی شەڕ بکەوێتە بەربەرەکانی و لە ئاکامدا وەک یەکەم قوربانی

---

١٥ـ شووشتەری، توحفەتولعالەم، ل ١٣٢ ـ ١٤٣.

16- SP 97/49 (1773), 147b, 148b.

ڕووداوەکان تێدابچێ.

هۆکاری ناڕاستەوخۆی هەڵگیرسانی شەڕ لە کوردستان، دەستێوەردانی عومەرپاشا بووە لە کێشمەکێشمی پارێزگای بابانی سەرسنوور، کە ئێستا پتر بە ناوی «قەڵاچوالان»ی ناوەندێوە ناسراوە. ئەم ئەیالەتە لە ڕۆژگاری مردنی سلێمانپاشاوە لە بەغدا بە شێوەیەکی بەرچاو کەوتبووە ژێر کاریگەری ئێرانییەکانی بەردەستی والی ئەردەلان. جێگۆڕکەی عومەرپاشا لە سەر دەسەڵات وای کرد کە کەریمخان سەرپەتەی لەشکرکردنێک بۆ سەر ئەم ناوچەیە بە مەبەستی سەلماندن و نواندنی هێزی ئێرانییەکان خۆش بکا. لە دووهەمین پەلامارا بابیعالی تێگەیشت کە قەومانی شەڕ لەگەڵ ئێرانییەکان دۆزێکی مەترسیدارتر لە گیرانی بەسرەی بە خۆیەوە گرتووە. شەڕی کوردستان و ڕایەڵوپۆ و بەسترانەوەی بە هەڵمەت بۆ سەر بەسرە لە بەشێکی ترا دەکەوێتە بەر باس؛ لێرەدا تەنیا باسی ئەو پرسانە دەکەین کە بە شێوەیەکی تایبەتی بوونە هۆی هێرشی کەریمخان بۆ سەر بەسرە و لە ڕوانگەی ئێمەوە گرینگن.

کەللەڕەقی سیاسی پاشا (حوکمڕان) لە بەرامبەر ئێرانا زۆر زیاتر لەوەی لە پارێزگای بابان هاتە بەرچاو لە بابەت ئێرانییەکانی دانیشتووی بەغدا و بەتایبەت زیارەتکارانی شوێنە پیرۆزەکانی نەجەف و کەربەلا بەدەنگ و هەراتر بوو ئەو وەک حاکمێکی سوننی لە ناوەندەکانی زیارتگای شیعەدا خاوەنی هەڵوەرجێکی نالەبار بوو: لە بابەت ئەم شارانەوە لە بەر گرانی کرێی هاتوچۆی پاوانکراوی کەرتی تایبەت و داهات و مڵکانەی زەویوزاری وەقفی، شتێکی وای وەگیر نەدەکەوت، بەڵام تاجرەکانی نەجەف و کەربەلا لەبەر بازرگانێتی برەوداری زیارەتکارانی ئەم شوێنانە سامانێکی زۆریان وەسەر نابوو و دەنگ و هەرای بازاڕ ئەغڵەب نەیدەتوانی نووزە وناڵەی ئەو زیارەتکارە ئیماندارانەی گەیشتبوونە مەرقەدە مبارەکەکان، خپ کا[17]. پاشا ناچار بوو کە لەگەڵ شیعەکانی سنووڕپەڕاندووی دەرەکی و نێوخۆیی خزمایەتی دامەزرێنێ و هاوکات سەرووەرێتی خەلیفە لە چوارچێوەی دژایەتی خورافیدا بپارێزێ؛ بۆیە لەم وەختانەدا سکاڵای زیارەتکاران سەبارەت بە دادخوازی لە بابەت سووکایەتی

17- Kelly, 35 – 36.

زوڵمی ترکان پرسێکی باو بوو[18].

لەگەڵ ئەمەش وەختایەک کە گوومرگانەی چاوەڕواننەکراوی سنووری خرایە سەر زیارەتکارانی ئێرانی، بیانوویەکی سەرتر لە بیانووی ئاسایی کەوتە دەستیان[19]. لە بەغدا گەلێک کەند و کۆسپی تریش کەوتە بەر پێی جەماوەری ئێرانی و زۆریان تالان کران و جەریمەیان پێوە بەسترا و دوور خرانەوە[20]. ئەم کارانە بەئاشکرا پێشێلکردنی پەیمانی ساڵی ۱۷٦٤ بوو لەگەڵ نادرشای ئەفشار، چونکە لەو ڕێککەوتننامەیەدا سەبارەت بە زیارەتکارانی ئێرانی و ئازادی هاتوچۆ و پەڕینەوە لە باج و پیتاکی جۆراوجۆر چەند خاڵێک وەبەرچاو گیرا[21]. لە وەختی پەرەگرتنی نەخۆشی تاعووندا توندوتیژی گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. لە ماوەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکەدا ۷۰۰کەس ئێرانی دانیشتووی وڵاتی ئێراق و تاقمێک لە زیارەتکارانیش مردن. میراتی مردووەکان دەستی بە سەردا گیرا و فلسێک نەدرا بە کەسوکاریان. ئەو کردەوانە بوو بە هۆی سکاڵا بردنە بەر کەریمخان؛ وەکیلیش لە سەرەتای ۱۷۷٤دا حەیدەرقولیخانی زەنگەنە کە پیاوێکی زانا و زمانزان و جیهاندیدە بوو وەک باڵوێزی خۆی بەرێی کردە بەغدا هەتا نارەزامەندی بخاتە بەردەمی پاشا. لە جوابی نارەزامەندی باڵوێزی ئێرانا هەر سەریان هێنا و برد و خۆیان لارێ کرد و بیانووی نابەجێیان هێنایەوە و ملیان نەدا کە قەرەبووی خەسارەتەکان بکەنەوە[22]. بیانووی ڕاستەقینەی شەڕقەومان وەختایەک خۆی نواند کە پاشا فەرمانی فەلاقەکردنی دوو زیارەتکاری ئێرانی دا و لە شاری کازمین یەکیان پێی مرد[23].

---

18- Forster, 146.

۱۹ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۸۱؛ گوڵشەنی مراد، ل ۱۷۷؛ Cevdet II, 55.

۲۰ـ تەزکەرەی شووشتەری، ل ۱٦٥.

21- Hatt – i Humayun, NO . 2; Lockhart, 253; Qaddusi, 439.

۲۲ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۸۱؛ گوڵشەنی مراد، ل ۱۷۷؛ تەزکەرەی شووشتەری، ل ۱٤٤.

FR XVII, 1061; SP 97/53 (1775), 37b – 38a; Cevdet II, 55.

۲۳ـ تەزکەرەی شووشتەری، ل ۱٤٤.

ئازادی چوونی زیارەتکارانی ئێرانی بۆ شوێنە پیرۆزەکان ئێستا لە هەر زەمانێکی تر پێویستی دەنواند و گرینگایەتی زیاتری پەیدا کردبوو. لە ماوەی شەڕەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و میرانی سەفەوی گومبەزی مبارەکی عەلیڕەزا لە مەشەد وەک تای دووهەمی نەزرگە لە دەسچووەکان بوو بە ناوەندی زیارەتکارانی ئێرانی. بێگومان وەختایەک نادرشا مەشەدی کردە پایتەخت ئەم بارە باشتر سووڕا و چاکتری جێگرت. بەڵام لەبەر جیابوونەوەی ناوچەی ڕۆژهەڵاتیی ئیمپراتۆریتی نادری مەشەدیش لە ڕوانگەی سیاسی و جوغرافیاییەوە لە دەس ئێرانی «کەریمخانی» دەرچوو(٥). نەجەف و کەربەلا کە هەرگیز بە باری مەعنەویدا تووشی نوقسانی نەهاتبوون ئێستا بۆ چوون و دەسوێڕاگەیشتنی زیارەتکاران ساکارتری دەنواند و پتر بوونە ناوەندی نەزر و نیازی ئێرانییەکان. ڕەنگە یەکێک لە هۆکارەکانی ئەم پرسەش هاتوچۆی لێکدالێکدا و ژمارەی پەنابەرانی کۆوەبووی ئێرانی بێ لە بەغدا[٢٤] کە بواری ترس و ناڕەزامەندی پاشای بەدیهێنابوو. ئەگەرچی تەنیا ئەم هەنگاوە نەبوو بە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ و بیانوویەک لای کەریمخان، بەڵام بوو بە هۆی ئەمەی کە شەڕ لە ڕوانگەی ئێرانییانەوە بۆن و بەرامەی شەڕێکی پیرۆز و خاچپەرەستانەی لێوە بێ.

چەشنی ئەوەی لە «جیهاد»ەکانی دیکەشدا وەبەرچاو دێ هۆکارێکی پلەدووی بەئاستەم پەسندکراویان لە سەر بنەمای ئازادی چوونە نەزرگە و شوێنە پیرۆزەکان خستە ڕوو. هێندێک لە نووسەران لایان وایە کە بوونی لەشکرێکی گەورەی عەشیرەتی و سەرکێشی ئێرانی کە حاونەوەیان سەرەنجام تەنیا لە ڕێگای وەرگرتنی مووچەی نەپساوە یان تالانەوە بووزی دەخوارد، یەکێک لە هۆیەکانی هەڵگیرسانی ئەم شەڕە بووە[٢٥]. بەشێک لەم هێزانە پێشتر نێردرابوونە مازەندەران و خەریکی سەرکوتی ڕاپەڕینی حوسێنقولیخان بوون، تاقمێکیش دەبووا لە هەلومەرجێکی لەبارا لە کوردستان بمێننەوە هەتا نیمچە سەرکەوتنەکانیان لەم بەرەیەدا بپارێزن. لە پشت پەردەی هێرشی چڕوپڕ بۆ سەر بەسرە پێویستی تیهەڵێنانەوە و پاراستنی ئابڕوو، دوابەدوای شکانی

24- Niebuhr, Reise, 213.
25- Malcolm, 139; cf. H . Hedayati, Tarikh – e Zandiya, 177.

شەرمەزارانەی پارەکەی زەکیخان و هەڵخەڵەتانی لە لایەن شێخی هۆرمزەوە هەر لە سەرەتای ئەو چالاکی و شالاوەی بە مەبەستی گرتنی عومان لە سەرانسەری بەستێنەکانی کەنداوی فارس دەهۆڵ و زورنای بۆ هەڵگیرابوو، هەست پێدەکرا. لەو کاتیدا پاشا بە مەبەستی پاڵپشتی هێزەکانی ئێران هاتبووە بەرەوە، بەڵام سەرەڕای چەند بۆرەبەڵێنییەکی کە دابووی بە وەکیل تەنەخی کرد[٢٦]. بەسرەش یارمەتی دەنارد بۆ عومانییەکانی شەریکەقازانجیان لە توجارەتا کە وەکیل ئێستا ئەو سەربزێوانەی لە شەڕا بە خەنیمی خۆی دەزانی. سەرەڕای تەواوی ئەو قسە و قسەڵۆکانە وەک ڕوودانووسانی ئێرانی نووسیویانە، پاشا ڕێی نەدەدا کە سپای ئێران بە قەڵەمڕەوییدا تێپەڕێ و بە بەستێنەکانی عەرەبیدا سووڕ بداتەوە و یارمەتی و پشتیوانی گواستنەوە و گەیاندنی هرووژمی دەریایی هێزەکانی زەکیخانی نەدەکرد[٢٧]، بەڵام بە ڕاستی باوەڕ ناکرێ کە وەها پەلامارێکی گەرموگوڕ لە بەرچاو بووبێ. جگە لە تەواوی ئەو بەڵگە و بۆنانەش دەبێ بیرەوەری خۆپاراستنی دە ساڵ لێرەوبەری پاشا بۆ یاریدەدانی سپای کەریمخان بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی عەرەبەکانی بنیکەعبیش ون نەبێ. بە سەرنج دان بە تەواوی ئەم مەبەستانە دەبێ عومەرپاشا و میربەندەری، شیاوی سەرکۆنە بن.

واوێدەچێ کە بەرژەوەندی بازرگانی پتر لە تەواوی هۆکارە ڕواڵەتییەکانی باسکراو لەم نێوەدا خۆی نواندبێ. هەلومەرجی سەرتر بوونی بەسرە لە کەنداوی فارسدا دەبێ بە گۆڕانکاری بەندەرعەباس و بووشێهر لە سەردەمی سەفەوییەدا وەک دوو لەنگەرگای گەورە بە مەبەستی کەلک وەرگرتن لە خاک و مەڵبەندێکی کە لە ناوەندی ئیسفەهانەوە ئیدارە دەکرا، قەرەبوو کرابێتەوە. بەڵام لە ڕۆژگاری نادرا کە پایتەختەکەی لە باکووری ئێران هەڵکەوتبوو و کۆمپانیاکانی ڕووسی و ئینگلیسی لە ڕێی دەریای خەزەرەوە کەلوپەل و پێداویستییەکانیان بۆ دابین دەکرد، ئەم دوو بەندەرەی کەنداوی فارس هەندێک لە ڕەنگ و برەو کەوتن و پاش سەرهەڵدانی ئاژاوە و پشێوی،

26- FR XVII, 1069 (1 May 1774).

٢٧ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ١٨١ ـ ١٨٢، گولشەنی مراد، ل ١٧٨؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٠٣٧؛ لێکۆڵینەوەکانی مێژوویی، ژمارە ١٠، ل ١٣٦، وتاری نەسیری.

ناوەندی بازرگانێتی کەنداو لەبەر ڕێگرانی تالانچی و حوکمڕانانی زۆردار بەرەو ڕۆژاوا کشا و گوێزرایەوە ناوچەی هێورتری بەسرە. بە نەمان و تێداچوونی ئیسفەهان کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی دەستی خۆی ڕەپێش دا و تەقەلای کرد کە هاوکات لەگەڵ پەیدابوونی میرمەهنا پێگەیەک لە بەندەرڕیگ دابنێ. کەچی سەرەنجام لەساڵی ١٧٦٣دا لەبەر پێداگری کەریمخان، کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی بەندەر بووشێهری لەبری بەندەرعەباس کردە ناوەندی بازرگانی خۆی، بەلام لە ساڵی ١٧٧٠دا کۆمپانیا تەنانەت ئەم ناوەندەشی لە دەس بۆوە و تەنیا لە بەسرە هەڵدەسووڕا و کاری دەکرد. وەکیل سەبارەت بەم مەبەستە زۆر بە توندی هەڵبەزییەوە و هەڕەشەی کرد کە بە تۆڵەی ئەم کارە ئەو بەندەرە ئاوەدانەی بەدڵ ڕقی لێیەتی خاپووری دەکا[٢٨]. ئەگەرچی لەبەر زەخت و زۆری هەمەڕەنگ، نوێنەرایەتی کۆمپانیا لە ساڵی ١٧٧٥دا گەڕایەوە بووشێهر، بەلام کارگێڕانی بەسرە و بەڕێوەبەرانی کۆمپانیا لە ماوەی چوار ساڵی دواتریشیدا چاوەڕوانی پەلاماردانی ئەم بەندەرە بوون و تەنانەت وەختایەک کە کەریمخان لە ساڵی ١٧٧٥دا یەکەمین هێرشی بۆ سەر بنیکەعب دەس پێکرد نیگەرانی پەلاماردانی بەسرەش بوون[٢٩]. یەکێک لە هۆکارەکانی دیکەی هەڵگیرسانی شەڕی بەسرە دەوڵەمەند بوونی ئەو بەندەرە و کەمبوونەوەی سامان و داهاتی لەنگەرگا هاوشێوە ئێرانییەکانی بوو. هۆکاری ئەم گۆڕانکارییە دەگەڕێتەوە سەر کۆچی بازرگانانی ئێرانی و بەتایبەت ئەرمەنی. ئەم کۆچبەرانە پێداگری کەریمخانیان بۆ گەڕانەوە وەبەرچاو نەدەگرت و پاشاش گوێی نەدەدایە داخوازی وەکیل لە بابەت گێڕانەوەیان[٣٠].

میرزا محەممەدی کەلانتەر کە بیرەوەری پاشایەتی کەریمخان بە لایەوە خاوەن بایەخێکی لە گۆڕاننەهاتووە، چونکە وەکیل لە گەمارۆی بەسرەدا کەوتبوە زۆرانبازی لەگەڵ بیرۆکەی نادرشا، ناڕەزامەندی خۆی سەبارەت بەم لاڕێبوونە دەردەبڕی. هەڵبەت ڕەنگە هەر بە ڕاستیش کەریمخان ویستبێتی وا بنوێنێ لەو شوێنەی کەوا نادری گەورە لێی تێکشکاوە سەرکەوتن وە دەس دێنێ.

28- SP 97/49 (1773), 1476; FR XVII, 1669, 1080.
29- GD IX. 15 May 1757.
30- SP 97/49 (1773), 1476.

لە ڕاستیدا ئەم هێرشە بۆ ئێران سەنگ و بایەخ و بۆ بەسرە وێرانی بە شوێنەوە بوو[٣١]. بەڵام هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوە نیە کە نیشانی بدا وەکیل پێداگر و ئارەزوومەندی لاسایی پادشایەک بووبێ کە هەموو ئاکارەکانی قێزەوەن بوون و لە ئاخری تەمەنیدا بەو ڕووحە شەمزاو و ئاڵۆزکاوەیەوە کەوتە گێژاوی نەمان. چالاکی و دەسبزاوتنی پاشا لە وەختی شکستی وتووێژەکاندا تا ڕادەیەک دنەی هەڵگیرسانی شەڕی دا: بەسرە ئامانجێکی بەردەس و خەڵاتێکی گرانبایی و مناسب بوو کە دەیتوانی بە شوێنی مەبەستی سەرەکی دابندرێ و زۆریش وێدەچێ کە وەکیلیش هەر ئەوەی لەبەر چاو بووبێ. بەسرە بارمتەیەکی بایخدار بوو کە دەیتوانی بە چۆڵەپێچ کردنی گەلێک ئیمتیازی تایبەتی سیاسی‌ـمەزهەبی لە پاشا بستێنێ و هاوکاری دەریایی و بازرگانی پێویست لە بریتانیا وەربگرێ، تەنانەت ئەگەر ئەم مەبەستە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار سەنگ و بایی نەپارێزرانی شاریشی لێبکەوێتەوە. بەگشتی بۆیە کەریمخان لەم هەنگاوە مەترسیدارەدا شکستی هێنا چونکە بە بڵاوبوونەوەی هەواڵی مەرگی، سپاکەی کشایەوە.

## ١١ ـ ٤ دەسپێکی گەمارۆ

وەختایەک کە عەلیمرادخان و نەزەرعەلیخانی زەند بە سپای گچکەی خۆیانەوە دەگژ هێزەکانی پاشا ڕاچووبوون، سادقخانی برای وەکیل سەرکردایەتی بەشی زۆری لەشکرە سی تا پەنجاهەزار کەسییەکەی لە شیراز لە ئەستۆ بوو[٣٢]. لە ڕۆژی ١٠ی ژانوییەی ١٧٧٥دا سادقخان ڕامالی بردە بەر خووزستان و لە شووشتەر تێپەڕی و ڕاستەوخۆ بەرەو حەوێزە ئاژاوتی. مانگی داهاتوو گەیشتە حەوێزە و مانگێکی تریش بۆ خۆ تەیار کردنی پێداویستییەکانی

---

31- Kalantar, 67 – 68.

٣٢ـ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٨؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٣٧؛ Hovhakyants . 317 (all give 30,000); SP 97/52, 1776, 176 (20,000 to 40,000); Malcolm 141 (50,000).

پەلامار بۆ سەر بەسرە، لەو ناوچە مایەوە[٣٣]. یەکێک لەو ئـامرازە بەرچاوانـەی هەوڵی دابین کردنی دان، گەمێ بوون بە مەبەستی پاراستنی رێـی هـاتوچـۆ و گواستنەوەی ئازۆقە. ئەگەرچی نەخشە و پلانی سادقخان بۆ شەڕ سەیر دەهاتـە بەرچاو، بەلام لە کردەوەدا بە باشی بەڕێوە چوو: بەگوێرەی ئەم گەلالەیە دەبوو سپای ئێران لە لای باکوورەوە ـ یانی هەر ئەو رێیەی کـە هێزەکـانی نـادر لـە ساڵی ١٧٤١دا پێیا تێپەڕیبوون ـ برۆنە پێش[٣٤]. سەرەتا لێوارەولێواری رووبـاری حەوێزە برۆنە خوار تا دەگاتە ئەو شوێنەی کە لە خوار «قورنە» لە «شـەوییب» لەگەڵ یـەکاویعارەبـان تێکـەڵ دەبێتـەوە. پاشـان پردێـک لـە سـەر یـەکاو هەڵبەسترێ و سپای ئێران پێش خۆی پاک بکاتەوە و عەرەبەکانی مونتەفیق کـە رەنگە بۆسەیان نابێتەوە دەرپەڕێنێ.

لەشکری ئێران شانی دایە بەر جێبەجێ کردنی ئەم گەلالەیە و هەر ئـەو گەمێ و لۆتکانەی خووزستانی هێڵەکانی دواوەی بەرەیان دەپاراست. هاوکـات لەگەڵ ئەم هەڵمەتە لە خوارەوەتری بەسرە پەلێکی بچووکی دەریایی رێکخرا کە پەیتاپەیتا لە رەوگەی نێوان بەندەرریگ و بووشێهردا راوێچکەیان دەکرد و ئـەو ناوچەیان لە بوونی دوژمن دادەماڵی. بـە لا کـەوتنی عەرەبـەکانی مونتـەفیق و هاوکاری بنیکەعب هێزە هێرشبەرەکان ئیتر کۆسـپیان لـە سـەر رێ نـەدەما و بەسرە دەکەوتە گەمارۆیەکی توندەوە.

لە ٩ی محەڕڕەمی ١١٨٩ی کۆچی / ١٢ی مارسی ١٧٧٥ی زایینیدا سادقخان لە حەوێزە ترازا و سێ رۆژ دواتر هێزەکانی بـە بـێ تەقـە و لێکـدان گەیشـتنە بەستێنی یەکاویعارەبان[٣٥]. پێشـەنگی هێزەکـانی چەنـد رۆژ زووتـر لـە رێـی

٣٣ــ تەزکـەرەی شووشـتەری، ل ١٤٤؛ تـاریخی گـیتیگوشـای زەندیـە، ل ١٨٣ ـ ١٨٤؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٨١؛ ئەو راپۆرتەی کە لە لایەن (1775) SP 97/51 را ریکـەوتی ١٣ی فێورییە نێردراوە، مەودای سپای ئێران تا بەسـرە بـە شـەش رۆژەرێ دادەنـێ و دەبـێ مەبەستی ناوچەی حەوێزە بێ.

34- FR XVIII, 1089.

٣٥ــ گوڵشەنی مراد، ل ١٨١؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ١٨٤ ـ ١٨٥. هەردک سـەرچاوە رۆژی ١٢ی محەڕڕەم بە رێکەوتی بـزووتنی لەشـکر لـە حـەوێزە و ١٥ی محـەڕڕەم بـە رۆژی گەیشتنە دەم «شەت» دەزانن. ئەم رێکەوتە سێ رۆژ پاش ئەو دەمەیە کە پارسۆنێز قامکی

«شەوییب»ەوە گەیشتبوونێیە. شێخعەبدوڵلای مونتەفیق وەک بەشی چاوەدێر و توێژینەوە، هەواڵی دابەزینی ئەم هێزەی دا بە بەسرە. لە لایەن سەرکردایەتی هێزەکانی ئێرانەوە باڵوێزێک نێردرایە بەسرە هەتا موتەسەللیم (میربەندەر) و شێخدەروێش(٦) و مەزنەسەرۆکی مونتەفیق و سەرۆکانی کۆمەڵانی جوولەکە و ئەرمەنی و بازرگانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی. چەند نوێنەرێک بنێرن کە هەلومەرجی ئێرانیان بۆ ڕوون بکرێتەوە، بەڵام پەیامی ئێران گوێی بۆ شل نەکرا. پازدەهەزار شەڕکەری شێخعەبدوڵلا کە جگە لە بەربەرەکانی هیچ ئەرکێکی دیکەیان لە ئەستۆ نەبوو وردەوردە لە شوێنی دامەزران و مەتەرێزەکانیان کشانەوە و گەڕانەوە لێواری دەستی ڕاستی ڕووبار. ڕاپۆرتەکانی هاتوو بۆ بەسرە دەریاندەخست کە هێزەکانی ئێرانی بێ هیچ گرێ و کۆسپێک خەریکن بە سواری «کەلەک» لە ڕووبار دەپەڕنەوە و کەس بەرگێڕەوەیان نیە[36]. بێگومان ئەم تاقمە بەشێک بوون لە هێزە ئازا و بەجەرگەکانی بەختیاری کە بەگوێرەی نووسینی نامی لە خاکی دوژمن تێپەڕین و لەوبەری ڕووبار جێشانی کلێکیان خۆش کرد و چاوەڕوانی هاتنی کەرەسەمانەوە بە مەبەستی لێدانی پردێکی کاتی بۆ پەڕینەوەی لەشکر[37].

سازکردنی پردێکی وەها پێویستی بە دەکار کردنی کۆمەڵێک زنجیری قورس بوو کە لۆتکەکان لە سەر ئاو ڕابگرێ. جێبەجێ بوونی ئەم گەڵاڵەیە دوو حەوتە و نیوی پتر کێشا و لە کاتی جێژنەکانی نەورۆزیدا کۆتایی پێهات. لە ڕۆژی ٢ی سەفەر / ٤ی ئاوریلدا تەواوی بار و بارخانە و هێزەکانی لەشکری لە

لەسەر داناوە و دەڵێ ١٥ی مارس بەرامبەری ١٢ی محەڕڕەم بووە. (ڕاپۆرتی کۆمپانیا ئەم ڕێکەوتەی سەرەوە پشتڕاست دەکاتەوە.) یانی سێچوار ڕۆژ پاش نووسینی ڕووداونووسانی ئێرانییە. ڕەنگە ئەمانە مەبەستیان هرووژمی زۆرینەی لەشکر بووبێ. گێڕانەوەکانی سەر بە گەماڕۆش دەبێ بەپێی پێویست توێژینەوەیان لەسەر بکرێ، چونکە بەڵگەنامەیەکی مێژوویی و دووروودرێژی لەشکری بە ڕاپۆرتی ڕووداونووساندا دەچێتەوە. بڕواننە: وتارێک بە قەڵەمی کشمیری لە توێژینەوەکانی مێژووییدا، ژمارە ٦، ساڵی یەکەم، لاپەڕە ٨٧ ـ ١٢٦ و ژمارە ٢، ل ٦٩ ـ ١٠٤.

36- Parsons, 164 – 165; FR XVII, 1092; Lorim, 1249 – 51.

٣٧ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ١٨٧؛ تەفرەشی، ل ٢١٨ب؛ تاریخی بەختیاری، ل ٤٨١.

«شەت» بەڕینەوە[38] و لەڕێوە لە مەودای چل‌پەنجا مایلی بەسرەڕا کەوتنە بزووتن. پێش‌قەرەوڵەکان سەعات شەشی بەیانەی ٦ی ئاوریل وەڕێکەوتن و بەشی زۆری هێزەکانیش لە ساعەت ١٠ی بەیانی ئەوڕۆژە کەوتنە شوێنیان. بۆ سبەینێ کاروانەکانی بارگەوبنە و پاشەنگانی هێزەکان بە دوایانا داوەرین. لەشکرگای دوایی کەوتبووە شوێنێک لەولای سێ‌مایلی باکووری دەروازەی بەغدا هەتا لەوێوە پەلاماری مارجیل بدرێ. دوو مایل لەولاتری لەشکرگا ـ کە خانووی هاوینەهەواری نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لێهەڵکەوتبوو و تەنانەت دەرک و پەنجەرەشیان بە تالان برد ـ هێزەکانی ئێرانی یان بە گوتەی ئابراهام پارسۆنێز[39]: ئەو «مان‌چۆسێن»ە شەنگولانە لە ڕووبەرێکا بە درێژایی ٥ مایل و پانایی ٣ مایل بلاو بوونەوە و دامەزران(٧).

بەسرە بەر لە هەستانی تۆفان بە شێوەیەکی بەگرمە و هەرا لە بابەت هەڵزەقینەوەی مەترسی‌ڕا ئاگادار کرابۆوە. لە ڕۆژگاری شالاوی هاوبەش و بێ‌ئاکامی پاشا و کەریم‌خان دژی بنی‌کەعب لە ساڵی ١٧٦٥دا، موتەسەللیم (میربەندەر) بێ‌باوەڕی خۆی سەبارەت بە دراوسێی بەهێزی پەنای نیشان دابوو. لە ساڵی ڕابردووش‌دا ڕوون ببۆوە کە پێوەندییەکانی نێوان شیراز و بەغدا گرژ بووە و بەسرە کەوتۆتە بەر هەڕەشەی زیاتر. لە ١٨ی ئۆکتۆبری ١٧٦٦دا کۆمەڵە هەواڵێک سەبارەت بە لەشکرکێشی کەریم‌خان دژی پاشا (حوکمڕان)ی ژێربالی بەغدا لە کوردستان و سازبوونی بە مەبەستی هەڵمەت بۆ سەر بەسرە وەبەرگوێ دەکەوتن. ماوەیەک دواتر لە ١٥ی ژانوییەی ئەو ساڵەدا ببوو بە دەنگۆ کە سادق‌خان لە شیراز دەرکەوتووە. کەچی سێ شەو دواتر تاقمێک لە تایفەی بنی‌کەعب پەلاماری شاریان دا و سەرکەوتوانە بە دیوارەکانی شار هەڵچوون و ڕاستەبازاڕیان تالان کرد. پارسۆنێز قەومانی ئەم ڕووداوە دەباتەوە سەر بێ‌کیفایەتی پارێزگارانی شار[40]. بەگشتی تەنیا پەنا و پارێزەری بەسرە

---

٣٨ـ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ١٨٥ ـ ١٨٧؛ گولشەنی مراد، ل ١٨٢؛ تەفرەشی، ل ٢١٩ب؛ Parsons, 170.

39 - Parsons, 170 – 172 (the apt epithet is from Kelly, 43); SP 97/51 (1775), 68a.

40- FR XVII, 1084; Parsons, 162.

شوورەیەکی ڕووخەک و دارزیو بوو کە لەبەر چاوی هەر ڕێبوارێکی مەودای سالانی ١٧٥١ تا ١٨٠٠ باوەڕێکی ئەوتۆی پێنەدەکرا. لە زۆر جێیان هەرەسی بردبوو و بە لەرزۆکی بە دەرەوەی شارا سووڕابۆوە[٤١]، گەرانگەری لاکێشانەی بەگوێرەی گێڕانەوەی «وارینگ» لانیکەم ٦مایل ـ هەڵبەت بەپێی نەخشەکەی نیبوور ٧/٥ مایل و بەو نیشانانەی پارسۆنیز داوییەتی ١٢مایل ـ بوو. لە ژووری ئەم حەسارەدا دەبێ شارێکی نالەبار بە خانووبەرەی لار و کۆمەوە بێتە بەر زەین. مالی حوکمداری شار تەنیا خانووچکەیەک بوو. بەشی زۆری زەوییەکانی گەرانگەری شار باغە خورما و گۆڕستان بوون.[٤٢] بە هەر حال دیواری شار لە هێندێک شوێنان ٦ تا ٧/٥میتر پان بوو کە خەندەکێکی قووڵ و بەرین هێزی وەبەر دەنا و بە دەوریدا سووڕابۆوە و دەچۆوە سەر یەکاویعارەبان. هەروەها چەند سەنگەری بەرزیشیان ساز کردبوو، چوار دەروازە و لەنگەرگایەکیش بۆ پەلاماردانی دوژمن بە دەستەوە بوون. تۆپخانەی برێتی بوون لە هەشت تۆپی زەردەی ٧/٥کیلۆیی کە لە نێو مەتەرێزی سەردیواران دامەزرابوون و ٥٠ تا ٦٠ تۆپی ٥/٥کیلۆیی دیکە کە لە سەر گەمییەکانی دابەسترابوون. زۆربەی ئەم تۆپانە هەتا ماوەیەکی کەم بەر لە شالاوی هێزەکانی زەند بۆ کار پێکردن ئامادە نەبوون. پاشەکەوتی خۆمالی (نیتراتی پۆتاسیۆم) وای کردبوو کە بەسرە بۆ بارووت دانەمێنێ و تەنانەت لە بارودۆخی ئاساییدا هێندێکیش بۆ دەرەوە بنێرێ[٤٣].

لە سالی ١٧٥٠دا سەربازگەی شار تەنیا برێتی بوو لە سێسەدکەس چەکداری «یەنیچەری»[٤٤]. ئەم هێزە بە یارمەتی و پالپشتی هێزەکانی پشتیوانی سلێمانئاغا کە پتر لە نێو هۆز تایفە و دیلەکانا هەلدەبژێردران زۆرتر و تۆکمەتر دەبوو. وەختایەک کە لە دووهەمی مانگی ئاوریلدا سێسەد چەکداری تایفەی مونتەفیق لەگەل شێخسامیر تێکەلیان بوون، جەماوەریان ئەوەندەی

41- Quoted respectively From Waring 132; SP 97/51 . 37b; Plaisted, 21; Carmichael, 53.
42- Plaisted, 20; Neibuhr, Reise, 213 (See Fig. 2)
43- Parsons, 155 – 156.
44- Plaisted, 21.

دیکە پێهەڵاچوو. ئەگەرچی شێخسامیر زۆر چاکی بەڵێنی دابوو کە بەندی سەرووی شەوییب بە مەبەستی وەبەرخۆدانی لەشکرگای زەندیە دەشکێنێ تا پشتیوانێتی خۆی سەبارەت بە شێخدەروێشی خزمی کە لە حەساری شارا بوو بسەلمێنێ، بەڵام کەمتەرخەمی کردبوو. هەروا بێتەوە لە ڕۆژی سێهەمی ئاوریلدا دووسەدکەس سەربازی گیانفیدا لە بەغداوە هاتن. ئەم تاقمە لە سەرووی «قورنە» لە گەمییەکانیان دابەزیبوون و پێشەنگی قۆشەنی زەندیان هەڵبوارد و کەمێک لە خوارتر لێی سواری گەمی بوونەوە.

شەڕکەرانی هۆزی(٨) مونتەفیق بە سەرکردایەتی شێخ عەبدوڵلا لەشکرگایان لە شار بردە دەر و گواستیانەوە بۆ «زوبەیر»[45]. ڕێژەی ئاسایی جەماوەری شار کە لەم ڕۆژانەدا لە چل پەنجا هەزارەوە بۆ هەشتانەوەد هەزار کەس سەر و خواری دەکرد، دەبێ پێشتر بە نەخۆشی تاعوون لە کەمێی دابێ[46]. ئەگەر کەمترین ژمارەی جەماوەر قبووڵ بکەین و تێخزانی گوندەکانی دوورەدەستیش وەبەرچاو بگرین، دەبێ بەشداری گەشبینی ڕێزدار پارسۆنێز بین کە دەڵێ سەرەڕای تاعوون، دیسانیش خەڵک ورەی دەسکردنەوەی بەرز بوو. لانیکەم بازرگانێکی خۆڵاتی لای وا بووە کە: میربەندەر پیاوێکی شێلگیر و بەڕێوەبەرێکی لەبارە کە بە یارمەتی گەمییەکانی نوێنەرایەتی ئینگلیس لە بەسرە و بە پشتیوانی خودا دوژمن لە دەوری شار دەتارێنێ[47].

## ١١ ـ ٥ پاشەکشەی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی

هەڵسوکەوت و چالاکی نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە ماوەی گەمارۆی بەسرەدا هێندێک جار یەکتریان نەدەخوێندەوە و دژاودژ دەکەوتن کە دەبێ توێژینەوە و لێکدانەوەیان لە سەر بکرێ هەتا بێکیفایەتی و تەنانەت ترسەنۆکی ئەو کابرایە ئاشکرا بێ. نائومێدی ناوبراو سەبارەت بە ڕاکێشانی سەرنجی سەرۆکەکانی بە مەبەستی خۆتێوەردانێکی بەهێز بۆ پاراستنی بەسرە

45- Parsons, 165 – 170 – 171.

46- By Niebuhr (Reise, 213) and Parsons (173), respectively. Olivier (IV, 344), also quotes 40,000 and Masson (548) 50,000.

47- SP 97/51, 38a.

ئەویش ئەدەمەی کەوا پتر لە هەر زەمانێک نامەزرۆی وتووێژ بوون لەگەڵ کەریمخان بۆ بەستنی گرێبەستێک، بوو بە هۆی ئەوەی کە موورە سەرەتا بەگوێرەی ڕێبازی کۆمپانیا بجووڵێتەوە و لە بابەت متەسەللیم(میربەندەر)ەوە بێلایەن بێ. میربەندەر جگە لە وەی نەیدەهێشت کەلوپەلی کۆمپانیا بگوێزنەوە نێو پاپۆڕە شەڕکەرەکان هەتا ورەی خەڵک بۆ تێکشکان دانەرووخێ، هیچ کارێکی نەکرد کە موورە پاڵ پێوەبنێ بۆ دەسکردنەوە و پاراستنی بەسرە[48].

هەرچۆنێک بێ وەختایەک لە ۲۱ی مارسا هێزەکانی سادقخان لە نیزیک شەوییب لە رووبار دەپەڕینەوە چاردە پاپۆڕی تایفەی «بنیکەعب»ی کۆنەدوژمنی کۆمپانیا قوت بوونەوە. ئەو پاپۆڕانە بەگرمە و هەرا لە لای سەرووی ڕووبارەوە بەرەو حەساری بەسرە دەئاژوان. پاش دیتنی ئەم گەمێیانە موورە ڕاپەڕی و ڕایگەیاند چی تر بە تەماشاچی و بێلایەنی نامێنێتەوە و ماڵ و دارایی و ئابرووی کۆمپانیا دەپارێزێ. دوابەدوای ئەم بڕیارە پاپۆڕی شەڕکەری «ساکسیس»ی خستە گەڕ و یەک دوو لۆتکەی تەفروتونا کرد. بێگومان موورە لای وابوو کە بریتانیا هەمیشە بە شێوەیەکی ڕێسامەند لەگەڵ بنیکەعب شەڕێتی، بۆیە بەناچاری دەبێ لێیان وەدەس بێ و سەر بۆ خواستەکانیان نەوی نەکا. ئەگەر ئەوان یاریدەی ئێرانییەکان دەدەن هەڵوێستی ئەویش هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ بێلایەنییەکەی نابێ. چەند ڕۆژ دواتر نوێنەری کۆمپانیا ئامادە بوو کە ژمارەیەک مەلەوانی خۆی بۆ سەرکردایەتی و کاروباری هەڵسووڕاندنی دوو پاپۆڕی تۆپداری پاشا کە وە سەر ڕەنگی گەمییەکانی ئینگلیسی گەڕابوون بنێرێ و هەروەها دوو پاپۆڕی شەڕکەری هێزەکانی خۆشی ڕەگەڵ خستن. لەم وەختەدا پارسۆنێز بڕوای وابوو کە بۆ بەرگرتن لە پێشڕەوی بنیکەعب باشتر وایە کە زنجیرەیەک لۆتکە و گەمی دەس تێکگرن تا نەهێڵن بێنە پێش. موورە پاپۆڕی «ساکسیس»ی کە تەیار بوو بە زنجیرێکی ۱۲۸میتری بۆ ئەم

48- FR XVII, 1085; Lorimer, 1246.

بەگوێرەی ئاخرین نامەیەکی کە میربەندەری دواتر بە ناوی نەعمانپاشا نووسیویەتی، موورە سەرەتا ویستی یارمەتی ترکان بکا، بەڵام دوایە کەوتە لای ئێرانییەکان؛«ئینسیلی»باڵوێزی بریتانیا لە ئیستانبووڵ بە دڵشکاوی وەدرۆی خستەوە.
SP 97/55 (1779), 200a – 202b.

مەبەستە حازر کردبوو[٤٩].

٨ی ئاوریل رۆژێک دوای ئەوەی فەرمانی دەسپێکی شەڕ لە ویشکانی دەرچوو، یەکەم شەپۆلی پۆلەپاپۆڕی هێزە ئێرانییەکان کە لە کەنداوی فارس و بەندەرەکانیڕا هاتبوون و شازدە کەشتی دەبوون و لانیکەم دە گەمێی شەڕکەریشیان لەگەڵ بوو دەرکەوتن. کەشتی دووکۆڵەکەی «تایگێر» کە دوو ساڵ پێشتر لە کۆمپانیا ئەستێندرابوو زۆر ئازایانە ئەم هێزەی ڕێنوێنی دەکرد. ئەم پەلەپاپۆڕانە لە ساعەت ٩ی بەیانی تا ٣ی پاشنیوەڕۆ لە چەند مایلی خوارووی ڕووبار لەگەڵ گەمییەکانی پارێزەری بەسرە تێکهەڵچوون. لەم جەنگەدا پاپۆڕە گەورە شەڕکەرەکانی «ئیگڵ» و «ساکسیس» پەلاماریان دان هەتا پاشەکشەیان پێکردن[٥٠]. سێ ڕۆژ دواتر لە بووشێهرەوە چەند هەواڵێک بەرگوێ کەوت کە گۆیا ڕۆژی ٣١ی مارس شێخنەسر ـ کوڕە گەورەکەی سەرۆکی خێڵ کە خۆشی ناوی نەسر بوو ـ هێرشی دەریایی خۆی بە چاردە گاللیۆت(٩)ی هێزی دەریایی کەنداو دەس‌پێکردووە و پەنجا لۆتکە و ١٥٠٠ شەڕکەریشی وێڕا بووە[٥١].

هاوکات لەگەڵ ئاڵوگۆڕ و بەخۆداهاتن و دامەزرانی هێزەکانی بەرەی دەریایی هێرشی ویشکانی ئێرانییەکان خێرایەکی کەوتە سەر بارێکی مەترسیدار. دوو داخوازی گەمارۆدراوان لە لایەن سادقخانەوە بەئەدەبانە بەلام بەتوندی ڕەدکرانەوە. لە یەکیاندا پێشنیاری دانی «بیست لەک» ڕووپیە و لەویترا داوای وتوویژ کرابوو لەگەڵ شێخدەروێش بە مەبەستی بڕانەوەی شەڕ. لە ٥ی مانگی ئاوریلدا چوارکەس لە ئێرانییەکان کە ئازایانە هەتا نیزیک سێ‌میتری دیوارەکانی شار بە مەبەستی وەدەس‌هێنانی زانیاری و ناسیاری هاتبوونە پێش لە لایەن دوازدە کەسی سەربازگەی بەسرەوە پەلامار دران و کوژران. وەک گێڕاویانەتەوە سادقخان لە ٩ی ئاوریلا بە هێرشێکی لەنەکاو کە سێ بەتڵی شەو چووبوو، پەلاماری شاری دا. شەڕ و لێکدانی توندوتیژی دەستەویەخە هەتا چەند ساعەتان لەوپەڕی تاریکیدا درێژەی کێشا؛ پارسۆنێز و کارگێڕانی

49- FR XVII 1089; SP 97/52 (1776), 146; Parsons, 166 – 167.
50- Parsons, 173; Wilson, 185.
51- FR XVII, 1089.

کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بە پەلە لە ڕێی لەنگەرگای کاپوتانپاشاوە خۆیان گەیاندە پاپۆڕی «ئیگڵ» بەڵام کە ڕۆژ هەڵات هەموو شتێک کۆتایی پێهات. پارێزەران بانگەشەی سەرکەوتنیان دا و گوتیان لە ئاست سەد کەس ئێرانی کە کوژراون تەنیا سێ کەس شەڕکەری خۆیان لە دەس داوە. هەموو ئۆخژنێکیان هاتەوە بەر و ورەی دەسکردنەوەی پارێزەران بەرز بۆوە. کەچی شێخعەبدوڵڵا شوێنی دامەزرانی خۆی لە زوبەیر چۆل کرد و ژمارەیەک یەکسم و مەڕوماڵاتی دایە دەس دوژمن. بۆ سبەینێ ئێرانییەکان لێبڕان کە پرد و بەرگێڕەوە کاتییەکەی لە زنجیر چێکراوی ڕێزدار پارسۆنێز بسووتێنن و لەبەریەکی بەرن هەتا چاکتر دەستیان بگاتە پاپۆڕەکانی خۆیان، بەڵام وەستاکەی لە سەر ئەو باوەڕەی خۆی سوور بوو کە ئەگەر بێتوو سەکۆی بارهەڵگرتنیش بسووتێندرێ کۆڵەکەکانی ژێراوی زنجیرەکە ڕادەگرن[٥٢].

ڕێزدار مووڕەی نوێنەری کۆمپانیا ئێستا هۆکاری مانەوە یان ڕۆیشتن لە بەسرە و مەسەلەی پشتیوانی کردن لە پارێزەرانی هەڵدەسەنگاند. ڕۆژی ٢٧ی مارس میربەندەر هەڕەشەی لێکرد بێتوو خۆی ببوێرێ و بیهەوێ شار چۆل بکا، دەیگرێ و دەیخاتە زیندانەوە. ئەویش بەناچار ملی بۆ داخوازەکەی ڕاکێشا تا ئەگەر هاتوو ئێرانییەکان سەرکەوتن و شاریان گرت ئەرکی دانی جەریمەی کۆمپانیای بکەوێتە ئەستۆی. بەڵام لە لایەکەوە ئێستا جێهێشتنی شار ئەم قەراروبڕیەی لاواز دەکرد و دروست وەک ئەمە وابوو کە لە پشتەوەڕا ورەی خەساربارى پارێزەرانی شار خەنجەری لێبوەشێ. بەڵام دەسکردنەوە لە بەرامبەر هێزی پتەوی ئێراندا نە تەنیا بۆی دەبوو بە مەترسییەکی هەمیشەیی، بەڵکوو سێ گەمێی بازرگانیشی دەکەوتنە بەر شالاوی هەڕەشە. هەروەها لە بەمبەئیشەوە فەرمانیان پێدابوو کە گەمییەکانی لە یەکاو بگرێتەوە و لەگەڵ دەرباری ئێران پێوەندییەکی دۆستانە دامەزرێنێ، چونکە ڕەنگە ئێرانییەکان کەوتبانە تۆڵەکردنەوە[٥٣].

ئەم شێوە بیر و بۆچوونە ئاخرییەکەی سەرکەوت. ڕۆژی ١١ی ئاوریل

52- Parsons, 167, 171, 172, 174 – 178.
53- FR XVII, 1089; Amin, 113.

ڕێزدار پارسۆنێزی نوێنەری کۆمپانیا و کارگێرانی پەیوەندیدار بە خەزێنەوە سواری کەشتی بوون و هێشتا گەمیەکانی بەسرەیی لە خەودابوون کە وێڕای دوو پاپۆری شەڕکەر بەرەو باشوور ئاژاوتیان و وایان دەنواند کە دەیانهەوێ بچنە شەڕی پاپۆڕەکانی شێخنەسر. مووره هێشتاش لە جەغزی بیری خۆیدا سەری دێنا و دەبرد و خوازیاری گەڕانەوە بۆ بەسرە و وەرگرتنی پشک و قانی زیاتر بوو لە میربەندەر، بەڵام ئەمجارەیان پێی لێنا کە شکستی هێناوە. وەک ژۆزێف ئەمین دەنووسێ شوێنکەوتی ئەم کردەوە گاڵتەجارییانە، شەڕەتۆپی بێپسانەوەی ڕۆژانە بوو. ئەم ئاگربارانە تەنیا زیان و زەرەدێکی سووکەڵەی هەبوو بۆ سەر ئامرازی کار و بازرگانێتی و باسی کوشتە و بریندار نەکراوە. هەر کام لە دوو لایەنەکە ئەوی تری بە دەسدرێژکار دەزانی و خۆی بە سەرکەوتووی شەڕ دادەنا. «ئەمین» کە پارسۆنێزیش ئۆباڵی بۆ دەکێشێ گێڕاویەتەوە کە هێزی دەریایی بووشێهر لە پێشدا تەقەی لە گەمیەیەکی بائاژۆی دوو مایل ئەولاتر کرد و بادەوانەکەی تێکشکاند و سەعاتی ٩ی شەو کێشایەوە نێو یەکاویعارەبان و لە قوڕ و لیتە چەقی و سبەی بەیانی نوێنەری کۆمپانیا بە یارمەتی بای شەماڵ فەرمانی شالاوێکی تری دا[٥٤]. مانگی دواتر شێخنەسر بە دڵئێشاوی سکاڵای بردە لای ڕێزدار گاردێن کە لە لایەن کۆمپانیاوە هاتبووە بووشێهر و گوتی لەو ڕۆژیدا تەنیا هەڵگری پەیامێکی دۆستانەی کەریمخان بووە بۆ ڕێزدار مووره، بەڵام پاپۆڕەکانی بریتانیایی پەلاماریان داوە. ئەگەرچی خۆی زۆر بەتوندی بەری بە چەکدارەکانی گرت کە وڵامی تەقە و ئاگری بەرەوڕوو نەدەنەوە، بەڵام دیسانیش هێندێک لە لۆتکەکان بەر لەوەی بەرەو باشوور ڕابکەن ئاگری تووڕەیی خۆیان بە سەر گەمیەکانی بریتانیاییدا ڕشت[٥٥]. تازە وردەکاری ئەم کێشمەکێشمە چیە و چۆن بووە دیسانیش گەورە پاپۆری شەڕکەر توانی بەرەو باشوور بچێ و پاش چاککردنەوەی کونوکاژێران لە قەرین (کووەیت)، ڕۆژی ١٥ی ئاوریل بگاتە بووشێهر. پارسۆنێز کە ئاگاداری نەخشە و پلانەکانی مووره نەبوو لەوپەڕی دەرد و پەژارەدا دەتلایەوە، چونکە هەروەک پێشبینی کردبوو هێزی دەریایی بووشێهر ڕێی بەرەو شەتاوی بەرنەدا و وەختایەک ئاو هەستا پردەی کاتی

54- Emin, 452; Parsons, 179 – 180; cf . SP 97/52 (1776), 15a, 17.
55- Saldanha, 296 – 297 (Letter received 3 May 1775).

شەپۆل بردی ئەمانیش گەیشتنە پاڵ هێزەکانی سادقخان[56]. ئەم سێ پاپۆڕەی عەرەبی و پەنجا گەمییە شەڕکەرەی کە دەبوو باڵادەستی ئێران لە ماوەی گەمارۆدا دابین بکەن، وەک تەنیا هێزی شەڕکەری دەریایی ناودێر کران لە ماوەی تێکهەڵچوون لە بەرەی ئێراندا چالاکییان دەنواند.

گاردێن ڕیزێک وتووێژی سەرکەوتووانەی سەبارەت بەو دوو بارمتەیەی کە لە جنگ کەریمخان دابوون و دانانی بنکەی نوێنەرایەتی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە بووشێهر دەسپێکردبوو. ئێستا مووروەی بە قسەی سڕ و ساردی وەک ماخولیا و بێبەرژەوەند لەبەر هەڵوێستی بە دژی ئێران و پەلامار بۆ سەر هێزەکانی دەریایی و ڕاکردنی دوایی لە بەسرە دەورە دابوو. ئەم سەرکۆنەیە ئەگەر بە پێشنیاری وەکیل لە نامەیەکدا کە نووسیبووی نەهاتبێتە گۆڕ دیسانیش هەم ئەو و هەم کاربەدەستانی کۆمپانیا وەباڵیان بۆ کێشا و پشتیوانیان لێکرد. مووره ئێستا لە هەموو لایەکەوە کەوتبووە بەر ڕەهێڵەی ڕەخنەی دۆستان و دوژمنان و خاوەنکارانی. ڕێوڕاست ڕایانسپارد کە بگەڕێتەوە بەسرە، بەڵام ملی بۆ ئەو فەرمانە ڕانەدەکێشا و چارەنووسی نوێنەری کۆمپانیای بە ناوی ڕێزدار بووریل لە وەختی گەمارۆی بەسرە لە لایەن نادرشا و ئاکاری نالەباری گەمارۆدراوانی تووڕەی ئەو شارەی لەگەڵیدا خستەوە بیر[57]. لە مانگی جوولایدا گەڕایەوە بەمبەئی و بە نامەیەک داوای لێبووردنی لە سلێمانئاغا کرد کە نەیتوانیوە هیچ یارمەتێک بکا و «لاتووشە» و «نوورهام»ی وەک جێنشینی خۆی ناساند[58].

لەگەڵ ئەمەشدا دەور و سەنگی مووره لە سیاسەتی شەرمەزارانە و چەند تۆوەی کە پاش دەسبەردان لە ڕەوت ڕێبازی بێلایەنی هاتە گۆڕ، حاشای لێناکرێ. کۆمپانیا لەبەر قەومانی گێرە و کێشەی نێوان میواندارانی بەناچاری کەوتبووە تەنگەژەوە[59]. لە ڕەخنە و پەلامارەکانی گاردێندا بۆ سەر مووره بەر لەوەی ئەم چاووڕاوە بە مەبەستی تاوانبار کردنی ئەو وەک قوربانییەکی هەڵە

56- Parsons, 180 – 182; FR XVII, 1089; Wilson, 185.
57- FR XVII, 1089.
58- FR XVII, 1092.
59- Longrigg, 191.

گـەورەکان بخرێتـە ڕوو، ئـەو لێپرسـراوییەی کـە لـە ئەسـتۆی سـەرۆکان و هاوکارانییەتی وەبەرچاو دێ و ڕەنگە لە داهاتوودا ڕۆژایەک ئەم مەبەسـتە پتـر ڕوون بێتەوە.

## ١١ ـ ٦ بەسرەی تەنیا

گەڕانەوەی لەپڕی نوێنەری فەرەنگیی ئینگلیس و پاپۆڕە شـەڕکەرەکانی هەلی بۆ هێزەکانی زەند ڕەخسـاند کـە بـە تـەواوی گـەمارۆی بەسـرە بـدەن. سادقخان هێشتا لە سەر ئەم بۆچوونەی سوور بوو کە بـەر لـە درێژەکێشـانی گەمارۆی بەسرە پەلاماری شوورەی شار بدا و لە ٢٢ی ئاوریلدا پاش تۆپبـارانی حەساری شار بە دەس شێخنەسـر بـە کۆمەڵـێک نـەردیوان لـە پێـنج شـوێنی دیاریکراوڕا گەلێک شالاوی دەسپێکرد. هرووژمی سادقخان لەبـەر تێـداچوونی سەت نـەردیوان لـە ئاسـت برینـدار بـوونی تـەنیا دووکـەس کـە پـارێزەران ڕایانگەیاند، بەرپەرچ درایەوە[60]. سـەرەڕای ئـەم گشـتە چـاووڕاوە، تەنانـەت ڕووداونووسانی ئێرانیش دانیان پێداهێناوە کـە ئاگربـاران و هێـرش بـۆ سـەر بەسـرە شـوێنێکی وای دانـەناوە و ورەی پـارێزەرانی شـار لەبـەر کـار و هەڵسووڕانەکانی سلێمانئاغا بەرز ببۆوە. سادقخان ناچار کرا کە دەس بکا بـە سەنگەر لێدان و ئامادەی گەمارۆیەکی سەخت بێ. ڕۆژێک یەکێک لـە ڕاکـردووان قۆڵێکی شکست و زۆر لاوازی شوورەی شاری بە هێزەکانی زەند نیشان دا، بـەڵام سەرەڕای سازکزدنی چوار قەڵاقووچکە و چەند قایمەیەک لەو شـوێنە و ڕۆژێـک تۆپباران، پارێزگارانی شار هەر بە شـەو وەخـۆ کـەوتن و سـازیان کـردەوە و تەنانەت دایانبەستەوە. چەند بنکەیەکی پشکنین و ڕێگرتن لـە گەڕانگـەری شـار داندران و نە تەنیا بەر بە هاتن و چوونی کاروانەکانی ئازۆخە گیرا و گەیشـتنی هێزی پشتیوان لە بەغداوەش تەگەرەی خرا بەر پێ، بەڵـکە هێرشـی شـەوانەی هێزەکانی بنەگری سەربازگەی شاریش بەری پێگیرا[61].

پەنا بردن بۆ کەلک وەرگرتن لە گزە و خەیانەتی خۆماڵـی، ئـەو یـارە دێرینەی هێزەکانی زەند هۆکاری دواتری کارەکانیان بوو. سـەربازێکی هـەڵاتوو

60- FR XVII, 1089.

٦١ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٨٧ و ١٨٩ – ١٩٠؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٨٨.

پێشنیاری بە سادقخان کرد کە لە لای یەکێک لە دەروازەکانی بەرەو رووبارەوە دەتوانن سەرانسوێیەک بکەن و بە نێو ئاودا دەتوانێ رێگایەک دەسنیشان بکا. بۆیە شەوێک سێ یان چوارکەس لە غولامانی باوەرپێکراو رەگەڵ ئەو پیاوە خران هەتا سەبارەت بەم مەبەستە توێژینەوە بکرێ؛ وەختایەک کە گەیشتنە نیزیک دەروازە بە دیتنی تاقمێک چەکداری پارێزەری شار واقیان بردەوە. بەناچار هەر بە رێی خۆیاندا گەرانەوە هەتا خێرا هێزەکانی زەند لەم مەترسییە وەخۆ بێننەوە و هەڵمەتی شەرکەرانی بەسرە بە هۆی شەرێکی سەخت و دەستەویەخە تێکشکا. رێگای چوونەژووری پەنامەکی ئیتر رێگایەکی نەهێنی نەبوو[٦٢].

هێشتاش مەترسییەکی دیکە لە بەسرە هەرەشەی لە هۆردووگای هێزەکانی زەند دەکرد و ئەویش برێتی بوو لە ئەگەری لافاوی مەینەتباری شکاندنی ئەو بەند و شەقەجۆگانەی ناوچەی «حوورولحەمار». عەرەبەکانی مونتەفیق کە بەرواڵەت خاوەنی ئەو مەڵبەندە بوون خۆیان لە تێوەگلانی شەری راستەوخۆ پاراستبوو، بەلام دیسانیش رەنگە ئەگەر مەیلیان لێبا توانیبایان هێزە پەلاماردەرەکان بە لێشاوی رووبار بخنکێنن. سادقخان لە دەستی نەدەهات کە تاقمە چەکدارێک بۆ پاراستنی شوێنی مەترسی بنێرێ، بۆیە ناردی لە دوای «حاجی ناسر»ی(١٠) سەرۆکی تایفە و لە سەر کاری خۆی دانایەوە و خەلاتی کرد و بێگومان بە پارەیەکی زۆر تەماحی وەبەرنا و پاراستنی بەنداوەکانی لە ماوەی شەرا خستە ئەستۆی و بەڵێنی لێئەستاند. بە نیزیک بوونەوەی هاوین مەترسییەکی دیکە قوت بۆوە. ئەو با گەرمەی کە بە سەر خیزەلانا بەرەو بەسرە باڵی دەنگاوت، رەنگبوو تابشتی ژیان و مانەوەی ئەو کەسانەی لە دەشتودەر جێگیر ببوون خاشەبڕ بکا. لەبەر هەڵگەرانەوەی کەش رەوگەی ئەم بایە لە تەواوی وەرزی هاوینا گۆرا و هەوایەکی فێنکی باکووری جێی گرتەوە. لە روانگەی ئێرانییەکانەوە هاتنی شەماڵ بە خەلاتێکی ئاسمانی و نیشانەیەک لە بالادەستی و سەرکەوتن لێکدرایەوە[٦٣].

---

٦٢ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٩١.

٦٣ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٩٣ ـ ١٩٤.

## ۱۱ ـ ۷ خۆتێوەردانی عومان

لەم کاتەدا سەرەتای ئەو دیاردانەی کە دەریاندەخست ئیمامئەحمەدی عومانی تا ڕادەیەک سەبارەت بە کەریمخان ـ کە بە قسەی خۆی فەرمانڕەوای عومانیش بوو ـ ئینکەبەری دەکا، بە ئامادەبوون و هەڵسووڕانی لە بابەت یارمەتیدانی شاری بەسرەوە خۆی نواند. لە ڕێکەوتی ۳ی مانگی مەیدا دوو گەمێی عومانی گەیشتنە «ڕەئسولهەلیلە»(۱۱) لە نیزیک بووشێهر، بەڵام هەر لەو مانگەدا پاش تێکۆشانێکی بێهوودە سەبارەت بە دنەدانی پاپۆڕەکانی ئینگلیسی بە مەبەستی پەلاماردانی گەمارۆدەرانی بەسرە، گەڕانەوە ئەو شارە[64]. لە نێوەڕاست مانگی ئاگۆستا هێزی دەریایی ئیمامی عومان شنگڵی لە خۆی دابوو کە ڕاستەوخۆ هرووژم بکاتە سەر هێزەکانی ئێرانی. ئەم پۆلە بریتی بوون لە پاپۆڕێکی دەسکردی بەمبەئی بە ناوی ڕەحمانی و ۹ گەمێی گەورە و بچووکی دیکە کە ۳۰ تا ۵۰ بەلەمی گچکە و ۷۰ لۆتکەی گەورەش وێڕایان بوون. لە سەریەک ئەم هێزانە پێکهاتبوون لە ۱۰۰کەشتی و بە چەند جۆرە تۆپ تەیار بوون. بەپێی قسەی ئێرانییەکان کە دیارە زۆریان پێوەناوە، ئەوانە ۸ تا ۱۰هەزار شەڕکەر و بڕێکی زۆریان ئازۆقە بۆ خەڵکی بەسرە دەبرد[65]. ئەم هێزە بەرچاوە لە ڕۆژی ۱۱ی سێپتامبردا بە بووشێهرا تێپەڕی و چەند ڕۆژ دواتر لە زارکی یەکاویعارەبان لەنگەری خست.

هێزەکانی زەند لە ئاست ئەم هەڕەشەی «خەواریج»ە دەستەوستان نەوێستابوون. مانگێک پێشتر کەریمخان دەسەر شێخنەسری بووشێهری و شێخبەرەکاتی بنیکەعبی(۱۲) کردبوو کە چی زنجیری وەگیریان دەکەوێ و هەیانە حازری بکەن. سەرێکی ئەم زنجیرانە لە لایان بنیکەعب و سەرەکەی دیکەیان لە لایەن سادقخانەوە دەپارێزران و هەردک تاقم بە تۆپ تەیار بوون.

---

۶٤ـ FR XVVII, 1089 : تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ۱۹٦.

٦٥ـ تاریخی گیتیگوشا، ل ۱۹٦؛ Lorimer, 416; Salil, 69–170, Miles, 273; 196 نامی ئەم ژمارە بە دوازدەهەزار و سلیل بە دەهەزار کەسی دادەنێ. وەرگێڕاوی نامەیەک بە زمانی عەرەبی کە لە SP 97/52, 112 دا وەبەرچاو دێ، ژمارەی هێزەکانی عوسمانی بە ۳۰۰ تا ٤۰۰ گەمیوان دەقەبڵێنێ.

هێزی دەریایی عومانی ناچار کرا کە بە نائومێدی باشترین ڕۆژانی ئەو مانگەی لە لەنگەرگاکەی چورتە نەکا و واش دیارە کە هیچ تەقەلایەک بۆ پساندنی ئەم زنجیرانە نەدراوە و تەقە و لێکدانێک لەگەڵ زێرەوانانی بەستێن ڕووی نەداوە. ماوەیەک دواتر نیوەشەوێکی مانگی ئۆکتۆبر هەڵیدەکردە تۆفان و ڕەشەبایەکی بەقەوەتی چاوەڕوان نەکراو و زنجیرەکانی پسپس کرد. پردەکانی سووکەڵەی کاتی کەوتنە بەر شەپۆلی ڕووبار و زنجیرەکانیان لەخۆیانەوە پێچا و بردیانن، هێزەکانی عومانی بەم زەبرەی چارەنووسەیان زانی و ڕۆژی دوایی لەنگەریان هەڵکێشایەوە و بەرەو یەکاویعارەبان بزووتن. سەرەڕای گژەبای توندوتیژ و تۆپبارانی تۆپخانەی بەستێن بە خەسارێکی کەم لە ڕۆژی ١٤ی ئۆکتۆبرا لە نێو قریشکوهۆڕ و شادی جەماوەری شاری ئالقەدراو تەواوی هێزەکانی خۆیان گەیاندە پەنا دیواری بەسرە[٦٦].

لەشکری سادقخان و پاپۆڕەکانی شێخنەسر تازە نەیانتوانی بەر بە دابەزاندنی باری ئازۆقە و پیادەبوونی تاقمەکانی چەکداری یارمەتیدەر و پەلاماری بەربلاوی ڕۆژی دوایی گەمارۆدراوان بگرن. ئەو شەڕەی کەوا ڕووداونووسانی ئێرانی بە ناوی «ترککوژی» ناودێریان کردووە دوابەدوای ئەم ڕووداوە قەوما. سادقخان ڕایگەیاند بۆ سەری هەر کوشتەیەک سێتمەن و بۆ گرتنی هەر دیلێک پێنج تمەن دەسخۆشانە دەکاتە خەڵات. پاشماوەی شکستەی هێرشبەران بەرەو دوا یان شار و پشتی بەرە و نێو گەمییەکان ڕەوین. لەم وەختەشدا بە خەستی تۆپباران کران و ئەوانیش بەگژیاندا چوونەوە. هەڵبەت عومانی لە ڕاپۆرتەکانیاندا باسی سەرکەوتنی یەکسەرەی خۆیان کردووە. نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە بووشێهر ئەم باس و هەواڵانە کە ڕەنگە هەر لە ڕووی ڕاپۆرتی عومانییەکانەوە ڕێکخرابێ، پشتڕاست دەکاتەوە و

٦٦ـ FR XVII, 1107, 1109. تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٩٦ ـ ١٩٧؛ گولشەنی مراد، ل ٩١ ـ ٩٢؛ سلیل، ل ١٠٧. «مایێلز»یش شوێنپێی ئەوی گرتووە و بانگەشەی ئەمە دەکا کە گەمێی ڕەحمانی زنجیرەکانی پساندووە، بەڵام ئەم گوتەیە لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکەدا دانی پێدا نەهاتووە. سلیل قسەی دیکەی زۆرن و دەڵێ خودی ئیمام سەرکردایەتی هێزەکانی دەریایی کردووە، کەچی بەگوێرەی سەرچاوەکانی ئێرانی کوڕەکانی سەرکردایەتی هێزەکانیان لە ئەستۆ بووە.

دەڵێ هێرشی فیداکارانەی ئێرانییان بە کەوتنەوەی ژمارەیەک کوشتە و بریندار بەرپەرچ درایەوە[٦٧]. لە رووی ئەم راپۆرتەرا چارەنووسی نادیاری شەڕ بەئاشکرا وەبەرچاو دێ. کەلوپەل و ئازۆخە و چەکدارانی داوەریوی عومانی بێگومان باری قورسی سەرشانی بەسرەیان سووک کرد و ورەی پارێزەرانیان بەرز کردەوە، بەڵام نەیانتوانی پەلاماردەران لە شوێن و مەتەرێزەکانیان دەرپەرێنن. چەند مانگان هەردوولا دەستیان کرد بە شەرەتۆپ و لە جێی خۆیان نەجووڵانەوە، بەڵام ئاخرییەکەی پاشەکەوتی عومانییەکان لە کەمێی دا. سەرەتا پۆلپۆل شەرکەر روویان دەکردە باغاتی خورما هەتا ئاو و خواردەمەنی وەچنگ بێنن. بە مەبەستی رێ لێبرینەوەیان سادقخان چەکداری چاوەدێری لەوبەرەوبەری بەستێن دامەزراند و رەنگە بە دەستەوەگرتنی جڵەوی یەکاویعارەبان لە لایەن عومانییەکانەوە لەم ماوەیەدا رێی لە هاتوچۆی تەدارەکی هێزەکانی زەند و ئەو گەمێیانە گرتبێ کە ئازۆقە و شمەکی پێویستیان بۆ شێخنەسریش دێنا[٦٨]. بەڵام لەو دەمەدا کە بەسرە دیسانیش لە فریاکەوتنی بەغدا بەشی براوو، لە شیرازەوە هێزی پشتیوان دەهاتن: عەلیمحەممەدخانی زەند ئەگەرچی لەبەر نەبوونی ئامرازی هاتوچۆ بە مەبەستی برینی درێژایی رووباری حەوێزە وەدرەنگ کەوتبوو، گەیشتێ[٦٩]. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٧٦دا عومانییەکان تەمایان گرت کە پێی خۆیان لەم گێرە و کێشە بێهوودە و پڕ خەرجوبەرجە بکێشنەوە و شەوێک لەنگەری هەموو گەمی و بەلەمەکانیان هەڵکێشا و بەرەو مەسقەت گەڕانەوە[٧٠].

٦٧ــ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٩٨ ــ ١٩٩؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٩٣؛
Salil, 170; FR XVII, 1107 (19 October 1775).

٦٨ــ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢٠٠؛ گوڵشەنی ل ١٩٤.

69- FR XVII, 1109.

٧٠ــ SP 97/52 (1776), 476; Miles, 273. نامی لە لاپەرە ٢٠٠ی تاریخی گیتیگوشادا دەنووسێ کە هێزەکانی دەریایی ئیمامی عومان تا پێنج مانگان لە لێوارەکانی بەسرە لەنگەریان گرت.

## ۱۱ ـ ۸ گەمارۆ و خۆ بەدەستەوە دان

بەپێچەوانەی بۆچوونی ڕووداونووسانی ئێرانی، دەبێ بەسرە بە تەواوی ئاڵقەی لە دەوری نەدرابێ. دەربڕینی ئەم مەبەستە کە هێزەکانی ئێرانی لە شەش مایلەی ویشکانی دەوری شار دامەزرابوون فوولێکردنە، چونکە سەرەڕای وەبەرچاو نەهێنانی نیو مایل مەودای نێوان هێزەکانی زەند و حەساری شار، گەمارۆدەران دەبووا لە ڕووبەرێکی هەشت مایلی قۆپی و زۆنگاو و لمستان و نەخلستاندا بلاو بووبانەوە؛ هەڵبەت ئەمە جگە لەو دوو مایلەی درێژایی ڕووبارە کە بە پەنا شاردا شۆڕ بۆتەوە. بنیخالید و مونتەفیق هاوپەیمانانی بێمەیلی بەسرە ڕێیەکیان کردبۆوە کە هێندێک ئازۆخە بگەیەننە شار. چالاکی ئەم دوو تایفەیە وەختایەک دەیتوانی ببێتە مەترسییەکی ڕاستەکی کە هێزێکی پتەو لە بەغداوە بنێردرێ. چەند دیاردەیەک وەبەرچاو دەهاتن کە نیشانی دەدا سادقخان لە باری وەرگرتنی زانیاری و هێچک لێکێشانی گەمارۆ و وەسەریەکنانی پێداویستییەکانی سەر بەم کارە دەستی لەگەڵ عەرەبی خەزاعیل تێکەڵ کردبوو. ئەمانە لەو تۆرەمە شیعەمەزەبانە بوون کە بە شێوەیەکی کۆنباو مونتەفیق و بنیخالیدیان دەبوغزاند و هیوادار بوون کە بە یارمەتی هێزەکانی زەند بە سەر خەنیمەکانیاندا زاڵ بن.

لە ئاخروئۆخری ساڵی ۱۷۷۵دا وەختایەک کە هێشتا گەمییەکانی ئیمامی عومان لە ڕووبارا لەنگەریان خستبوو، سادقخان کۆمەڵە هەواڵێکی سەبارەت بە بزووتنی هێزی یارمەتیدەر بۆ بەسرە پێگەیشت. شێخ «حەممادەی» خەزاعیل(۱۳) گوتی حازرە بەرەگەیان لێبگرێ. بە یارمەتی هێزەکانی خۆی کە چەند پەل و پۆلێکی شەڕکەرانی زەندیش یاریدەیان دەدان دەس بە کار بوو؛ بەڵام وەختایەک گەیشتنە نیزیک «حیللە» سەروسۆراغی هێزە نێردراوەکانی پاشا وەبەرچاو نەهاتن. شێخحەمماد پاش ماوەیەک چاوەڕوانی تەمای گرت بگەڕێتەوە، بەڵام هێندەی پێنەچوو کە خەبەر هات هێزەکانی بەغدا گەیشتوونە حیللە و شێخئەحمەدی برای شێخسوڵتانی برازای پەلاماریان داون و تێکوپێکیان شکاندوون. ئەم دوو کەسە وێڕای پۆلێک شەڕکەر لە دواوە بەجێمابوون. سادقخان لەبەر ئەم شەڕە خەڵاتی کردن.

سەبارەت بەم تێکهەڵچوونە زانیارییەکی ئەوتۆمان بە دەستەوە نیە، بەڵام لە ڕووی شکستی سووک و هاسانیڕا وا دەردەکەوێ کە تەنیا هێزێکی پشتیوان و سەمبولیک بووە[٧١]. زانیاری ڕوون و ئاشکرای خەزاعیل سەبارەت بە ژمارە و شوێنی ئەم چەکدارانە، ئەم بیرە دەورووژێنی کە سیخوڕ یان کەسانێکی نیزیکیان بووبێ لە بەغدا. بێشک ئەم مەبەستە زۆری یاریدەی هێزەکانی زەند دەدا[٧٢].

عومەرپاشا و مستەفاخان کە چەند مانگ دواتر لە جێی وی دانیشت هیچکام نەیانتوانی کۆمەڵە چەکدارێک بۆ ڕزگاری شاری ئاڵقەدراوی بەسرە بنێرن. پاش کشانەوەی هێزەکانی ئیمامی عومان لە بەهاری ساڵی ١٧٧٦، سادقخان توانی بازنەی گەمارۆ پتر وێک بێنێ: لەوبەرەوبەری ڕووبار نیزیکەی ١٥ مایلێک نیگابانی دامەزراندبوون هەتا هەر کەس بیهەوێ تخوونی شار بێ بەری پێبگرن. هەندێک دواتر حەشیمەتی برسی شار تاقوواز و سەرەنجام بەکۆمەڵ شانیان نەوی کرد و پەنایان بردە بەر هێزەکانی زەندیە. خوردوخۆراک و دەسمایە دەدرایە ئەم پەنابەرانە و پیاوماقووڵ و گەورەگەورانیان خەڵات دەکران. وەختایەک کە شێخسامیری برازا و زاوای شێخعەبدوڵڵای سەرۆکی بەرەی مونتەفیق، سەرکردەی هێزەکانی تایفە لە سەربازگەی بەسرە داوای ڕێی پاشەکشەی لە سادقخان کرد، ئیزنیان دان تا بێئەوەی کەس دەستیان بکاتێ و بەرهەڵستیان بن بە نێو لیزگەی هێزەکانی ئێرانیدا تێپەڕن[٧٣].

تاقمێکی تر کە پەنابردنیان لەمەش پتر شەقڵ و شوێنی خۆی دانا

---

٧١ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢٠١. بە مەبەستی زانیاری پتر سەبارەت بە مێژووی کۆنی بنیخالید بڕواننە: ئۆپنهام، ل ١١١، ١٣٣ ـ ١٣٥؛ توێژینەوەیەک سەبارەت بە خەزاعیل، ل ٣٢٢ ـ ٣٢٣؛ مونتەفیق، ل ٤١٥ ـ ٤١٨ و پەراوێزی ١٢ و ٧.

٧٢ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٩٤ ـ ١٩٥، تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ٢٠١ ـ ٢٠٢؛ شووشتەری لە تۆحفەتولعالەم، ل ١٤٥، عەززاوی، مێژوو، ل ٦٠. SP 97/52 (1776), 4b – 5 دەنووسێ کە حەڤدەهەزار کەس لە بەغداوە نێردرابوون یا دەبوایە بنێردرێن.

٧٣ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٩٥ ـ ١٩٧؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢٠٣ ـ ٢٠٤؛ ئەلبەسری، ل ٣١ ـ ٣٢.

تایفەی بنیخالید بوو. ئەمانە لە بەستێنی عەرەبنشینی یەکاوا لە نێوانی بەسرە و «قەتیەف»دا بیابانگەرد بوون. وا باو بوو کە هەموو ساڵێ هاوینان پەلاماری باغاتی خورمای بەسرەیان دەدا و بە ئەندازەی پێویست خورمایان دەرنی و دەیانبرد. بێگومان بە سەرنجدان بەو بۆرەبەڵێنییەی لەگەڵ میربەندەر و عەرەبەکانی مونتەفیق لە سەری پێکهاتبوون نەیاندەویست کە بە گەمارۆی شار لە خۆیانی تێکدەن و ئەم نەریتە هەڵوەشێننەوە. کاتێک کە هرووژمیان بۆ بردنی خورما دەستی پێکرد، زێرەوانانی ئێرانی هێرشەکەیان تێکشکاندن و ژمارەیەکیشیان لێکوژرا. لە ئاکامدا مەزنی ئەو تایفەیە شاندێکی بۆ وتوویژ ناردە لای سادقخان و گەلێک دیاری بەرچاویشی پێدا ناردن(١٤). ئەمانە داوایان دەکرد لێیانگەڕێن بەرهەمی خورما کۆبکەنەوە چونکە ژیان و مانی بنەماڵەکانی پێوە بەند بوو. سیاسەت و هەڵوێستی جێپەسندی سادقخان نە تەنیا ئەم ئەم داخوازەی لێقبووڵ کردن بەڵکوو دیاری و پێشکێشەکانیشی دانەوە و کەیخوداکانیشی خەلات کرد و تاقمێک زێرەوانی بۆ پاراستنی پۆلە خورماچنەکان دانا. بنیخالیدیش لە چاکەی خان، شیر و خورما و گۆشتیان بۆ سپای ئێران دابین کرد و بەشێک لە قورسایی باری فریاڕەسانی ئازۆخەیان لە سەر شانی سووک کرد. بنیخالید تەنانەت لە لێدان و سەرکوتی هۆز و تایفەکانی دیکەدا یارمەتی لەشکری ئێرانیان دا[٧٤].

ئێستا ماوەی گەمارۆ سەری لە پازدە مانگی تەواو دابوو، لە حاڵێکا دەورەدراوان هیچ هیوایەکیان نەبوو بۆ شکاندنی و ئازۆخە و خواردەمەنیش لە گۆشتی سەگ و پشیلە و یەکسم و گوێدرێژ و سەرەپنچک و پرژوپاڵی دارخورما وێوەتر نەبوو[٧٥]. ئەو ولام و هەواڵانەی کە لە بەغداوە دەهاتن دەریاندەخست کە ڕزگارکردنی بەسرە تەواوێک دەستی لێشۆراوە[٧٦]. حەشیمەتی قاتیوقڕی تێکەوتووی شار ڕۆژانە هەڵدەهاتن و پەنایان دەبردە بەر گەمارۆدەران. سەربازگەی شاریش لەمە پتر متمانەی پێنەدەکرا. دووشک بوون لە فەرماندەی سەربازگە، سلێمانپاشای وا لێکرد بیکوژێ و عەبدوڕڕەحمانی برازای لە جێی

٧٤ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٩٨، تاریخی گیتی گوشای زەندیە، ٢٠٥ ـ ٢٠٧.

75- Carmelites, 674; cf. Hovhanyants, 317, 318.

76- AL - Basri, 33.

دابنێ، بەڵام عەبدوڕڕەحمان لە ژێرەوە دەستێکی لەگەڵ هێزەکانی ئێرانی تێکەڵ کردبوو و هەموو ڕۆژێ هەلی بۆ پۆلێک لە پیاوەکانی دەڕەخساند کە بۆی قوتار بن. ئاخرییەکەی خۆشی دەستی دا و تەسلیم بە هێزەکانی دوژمن بوو. شێخمەهنای برازای شێخعەبدوڵلا و پاشماوەی سەربازانی ئێلجاڕی و تایفەی مونتەفیق ئەوەندەی چەکدار و پاشەکەوت و سەرچاوەی هێز و دارایی بەرەوهەڵچۆڕانی میربەندەر بری کرد خۆیان لە پاراستن و پشتیوانی نەبوارد، بەڵام ئەوانیش سەریان وەهێزەکانی زەند هێنا. لە ڕاستی‌دا ئیتر سەربازگەیەک لە گۆڕا نەبوو کە خۆ بە دەستەوە بدا. سلێمان‌ئاغا بەناچاری هەلومەرجی دەسبەردانەوە و شەڕپڕانەوەی ناردە خزمەت سەرکردەی لەشکری ئێران. لە ٢٦ی سەفەری ١١٩٠ی کۆچی / ١٧٧٦ی زایینی‌دا شاندێکی بە سەرۆکایەتی شێخدەروێشی گەورەکەیخودای بەسرە و سەید محەممەدشەفیعی(١٥) پیاوماقووڵی شاری ناردە لای سادقخان. خانی زەند سەبارەت بە دانیشتووانی شار و بەرگرتن لە تاڵان و داڕووتانی خەڵک چەند دەستەبەربوونێکی خستە ڕوو. بۆ سبەینێ بەیانی سلێمان‌ئاغا کە فرمێسکی دەهات و داخ و مەینەت و ناهومێدی لە چاوی زابوو، بەڕەسمی بە پەیمانێکی ئابڕوومەندانەی خۆبەدەستەوەدانەوە پێی نایە لەشکرگای دوژمن. لە یەکەمی ڕەبیعولئەووەل / ٢٠ی ئاوریلی عیسایی شاریش دەستی دا و بەیانی ڕۆژی دوایی سادقخان لە بەسرە دابەزی[٧٧].

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ خانەدانی دەبیری بە ڕەگەز دەچوونەوە سەر سەلجووقییەکانی ڕۆم و ڕۆژگارێکی دوورودرێژ لە بەسرە حکوومەتیان بە دەستەوە بوو. بەر لە هاتنە سەر دەسەڵاتی ئەم بنەماڵەیە، خەڵکی بەسرە باجێکی سەرانەیان دەدا بە سەید موبارەکی موشەعشەعی، بەڵام ئەمانە نەک تەنیا باجیان نەدا، بەڵکوو ناوچەکانی «جەزایر» و «قەبیان»یشیان داگیر کرد و کەعبییەکانیان کۆچ دایە

٧٧ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٩٩ ـ ٢٠٠؛ تاریخی گیتیگوشا، ل ٢٠٧ ـ ٢٠٩؛ شووشتەری، توحفەتولعالەم، ل ١٤٥؛ FR XVII, 1126. Hovhanyants, 318.

وێندەرێ. سەید فەرەجوڵلای موشەعشەعی کە لەساڵی ١٠٩٧دا پاش مردنی براکەی دەسەڵاتی بە دەستەوە گرتبوو کیسی لەو ناکۆکییانەی بنەماڵەی دەبیری هێنا. شێخ «مانع»ی مونتەفیق بەر لەوەی هێزەکانی موشەعشەعی بگەنێ، شاری گرتەوە، بەڵام سەید فەرەجوڵڵا بەسرەی داگیر کرد و قورنەشی وەدەست هێنا. کەچی دەرباری سەفەوی سەبارەت بە سەید فەرەجوڵڵا دڕدۆنگ ببوو و کەسێکی تری نارده جێی و لەبەر گۆڕانی حوکمڕان و دووبەرەکی نێو بنەماڵەکەی بەسرەش لە چنگ ئێران دەرهات.

٢ـ سلێمانپاشا لەبەر ئازایەتی و بڕست و بڕشتی بەڕێوەبردنی وڵات نازناوی زۆر بوون وەک: ئەبوولەیلە، ئەبوسەمەرە و دەواسوللەیل.

٣ـ جێگری وەزیر یان والی لە حکوومەتی عوسمانیدا پێیدەگوترا «کەهیا».

٤ـ دەوڵەتی رووسیا هەمیشە بە شوێن دۆزینەوەی ڕێیەکەوە بوو بۆ گەیشتنە گەروولەی بۆسفۆر و داردانێل و هاتوچۆی بازرگانی بە ڕەوگەی دەریای ڕەش و مەدیتەرانەدا. بۆیە بۆ تێکهەڵچوون لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی لە بیانوویەک دەگەڕا. ئازار و ئێشاندنی هاومەزەبانی ئۆرتۆدۆکسی خۆی کردە بیانوو و شەڕەکانی مەودای ساڵانی ١٧٦٨ ـ ١٧٧٤ لە نێوانیاندا دەستی پێکرد. لەم ڕۆژگارەدا دەوڵەتی عوسمانی لەبەر گەندەڵی سوڵتانەکانی ئالیعوسمان لەوپەڕی لاوازی و کەمدەسەڵاتیدا بوو و بە دەوڵەتی نەخۆشی ئورووپایان ناودێر کردبوو. لەبەر تێکشکانی دەوڵەتی عوسمانی لەم شەڕەدا پەیمانێک بە ناوی پەیمانی «کوچوک کاینارجا» لە نێوانیاندا بەسترا. خۆتێوەردان و جێرەمبکردنەوەی دەوڵەتی رووسیا پێی دەوڵەتە گەورەکانی بریتانیا و فەرانسەشی کێشایە نێو جەغزی هەڵلاوبگری ڕۆژهەلات و دنیا بەرەو کێشەیەکی نوێ بووە بە ناوی *«کێشەی ڕۆژهەلات»*.

٥ـ ڕێزدار پێری ناوی ئیمامی هەشتەمی شیعەیانی بە هەڵە نووسیوە و مەبەستی «ئیمامڕەزا»یە.

٦ـ شێخدەروێشی ئالیباش لەو کاتەدا یەکێک بوو لە پیاوماقووڵان و قسەڕۆیوەکانی بەسرە.

٧ـ «مانچۆسێن» یەکێک لە ناوە سەرناسەکانی مێژووی ئەدەبیاتی

جیهانە و پەیوەستە بە ڕووداوەکانی ژیانی پیاوێکی خۆهەڵکێش و توندەتەبیات کە بەشداری شەڕەکانی ڕووسیا و عوسمانی ببوو. حیکایەتەکانی، بەسەرهاتی ژیانی قارەمانێکی ڕاوچی وەرزیشوانە. بە چەند جۆر گێڕدراونەوە، بەڵام سەرەتا هەر حەڤدە چیرۆک بووە. نێوەرۆکی کتێبەکە تا ئەندازەیەک وەک ژیان و بەسەرهاتی ئەمیرئەرسەلان و حوسێنی کوردی شەبستەری دەچێ.

٨ ـ زوبەیر کەوتۆتە ڕۆژاوای بەندەری بەسرە و دوو مایل لەم شارەوە دوورە. دانیشتووانەکەی زۆربەی «نەجد» و «بەدەوی»ن.

٩ـ گالیۆت لەبەر هەڵەی نووسینەوەی نووسەرەوان بە چەشنی وەک کولیات، کلیت، کلابت و کلابیت هاتووە، وشەی «Gallivats» بە مانای گەمێی درێژووکەی هولەندییە کە زیاتر لە ناوچەکانی مەدیتەرانەدا بۆ هێنانوبردنی بار کەلکیان لێوەرگیراوە.

١٠ـ ڕێزدار پیری ناوی حاجی «ناسر»ی تایفەی مونتەفیق دێنێتە گۆڕ کە بە وەرگرتنی پارە و خەڵات خۆی لە شکاندنی بەنداوی سەرووی بەسرە و خەساربار کردنی سپای ئێران پاراستووە. لە هیچکام لە سەرچاوەکانی ڕووداونووسانی ئێرانی‌دا باسی کەسێک بە ناوی حاجی ناسری سەرۆکی تایفەی مونتەفیق نەکراوە. تەنیا لە لاپەڕە ١٩٣ی گیتی‌گوشای زەندیەدا نووسراوە کە حاجی ناسر سەرۆکی ناوچەی جەزایر بووە. سەرۆکانی مونتەفیق لەم دەورانەدا شێخ‌عەبدوڵلا و سامیری برازای و «سووەینی» کوڕی بوون. مونتەفیقیش لە شەڕا بێلایەن نەبوون و شێخ لەگەڵ سەرۆکانی تری تایفە لە بەسرە دەژیا و لە ئاخروئۆخری شەڕا سامیر و سووەینی ئێزنیان لە سادق‌خان وەرگرت کە بە سلامەتی لە بەسرە دەرکەون. شێخ‌مەهنای ئامۆزاشی کەمێک دواتر بەخۆی و دووهەزار چەکداری تایفەوە و تاقمێک لە نەجدییەکان لە بەسرە ڕایکرد.

١١ـ هەلیلە کەوتۆتە سێ فرسەخی باشووری بووشێهر و بەشێکە لە مەڵبەندی سەر بە شارستانی بووشێهر.

١٢ـ شێخ«بەرەکات»ی کەعبی لە زەمانی هرووژمی سادق‌خان بۆ سەر بەسرە سەرۆکی کەعبییەکان بوو. پاش ئەوەی کە شێخ سەلمانی کەعبی لە ساڵی ١١٨٢ی کۆچی‌دا مرد، دوو کوڕەکەی: غانم و داود بە شوێن یەکا بوونە جێنشینی، بەڵام دوابەدوای یەک لە ماوەیەکی کورتا بە دەس پیاوانی تایفەی خۆیان

کوژران. پاش مەرگی ئەوان شێخبەرەکاتی کوڕی عوسمان، برازای شێخسەلمان سەرۆکایەتی تایفەی گرتە ئەستۆ. لە شەڕی بەسرەدا کەعبییەکان گەلێک یارمەتی حکوومەتی شیرازیان دا و وەکیل «هیندیجان»یشی خستە سەر دەسەلاتیان. لە سالی ۱۱۹۷ی کۆچیدا شێخ«بەرەکات»یش کوژراو شێخ غەزبان لە جێی داندرا.

۱۳ـ ناوی ڕێک و تەواوی سەرۆکی تایفەی شیعەمەزەبی خەزاعیل بەگوێرەی نووسینی ڕوون و ئاشکرای عەززاوی «حەممادولمەحموود»ی خەزاعیل بووە. ئەم تایفەیە لە شەڕی بەسرەدا یاریدەی هێزەکانی زەندیان دا. پاش ئەوەی کە سلێمانپاشا لە ئێران گەڕایەوە و لە بەسرە سەقامگیر بوو، ئەوی لە سەر کار لادا و شێخ«موحسین»ی لە جێی دانا. لە زۆربەی سەرچاوەکانی فارسیدا ناوی مەزنی تایفەی خەزاعیل بە هەڵە بە شێخمەحموود هاتووە.

۱٤ـ نامی سەبارەت بەو دیارییە بەرچاوە دەنووسێ: وێڕای چوارهەزار سەر وشتر کە هەریەکەی بارێکی توورەکەپێچی ئەشرەفی (سکەی زێڕ) لە سەر پشتی بوو، بە سەت زمان دەپاڕایەوە و دەلالایەوە....

۱۵ـ سەید محەممەدشەفیعی کوڕی تالب کوڕی سەیدنوورەددین کوڕی سەید نیعمەتوڵلا لە سەیدەکانی جەزایری شووشتەرە و کاکی «میرعەبدوللەتیف»ی نووسەری توحفەتولعالەم بووە.

# ١٢

# كوردستان و داگیركردنی بەسرە

## ١٢ ـ ١ بابان و ئەردەڵان

لە بەشی یەكەمدا، ئەیالەتی گەردنكەشی كوردستانمان لە زستانی ساڵی ١٧٥٠ ـ ١٧٥١دا هەروا بەجێهێشت. حەسەنعەلیخانی ئەردەڵان بە دەس ئێشوئۆفی زەبری هەڵمەت و پەلاماری تەمێیانەی كەریمخانەوە لە سنە دەناڵی و لەم كاتەدا سەلیمپاشای «بابان»ی كۆنەوالی كە بە ڕقەبەری بنەماڵەشی دادەندرا لە ئازەربایجان سەری وە بنباڵی ئازادخان هێنابوو. ساڵی دواتر سەلیمپاشا لە ژێرڕكێفی ئازادخانا لە یەكەم لەشكركردن بە دژی كەریمخان بەشداری كرد و لە شەڕی قومشەدا ناوبانگێكی وەدەسهێنا[1]. ئەو كات وەختایەك ئازابخان ئیسفەهانی گرت حەسەنعەلیخانی لە سنە بانگهێشت و سەلیمپاشای لە جێی دانا. هێندێك دواتر وەختایەك ئازادخان حەسەنعەلیخانی لە كۆت و زنجیرا نارده سنە والی دیارییەكی چوارهەزار تمەنی دایە خزمەت ئازادخان. سەلیمپاشا لەم شارە حەسەنعەلیخانی خنكاند.

---

١ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٧٢ ـ ٢٧٣.

بەڵام دارودەستەی والی (حوکمڕان ـ پارێزگار)ی کوژراو خێرایەکی ڕاستەوە بوون و سلێمانپاشای بابان هرووژمی هێنا[2] و سەلیمپاشای تەنگەتاو کرد بکەوێتە چارەی خۆی و بیری پەنابەرێتی و یارمەتی خواستن لە محەممەدحەسەنخان لە مازەندەران، بەڵام هەڵسووڕانەکانی هیچ ئاکامیان لێنەکەوتەوە، چونکە خوسرەوخانی «ئەردەڵان»ی نەوەی سوبحانوێردیخان بە یەکێک لە خزمەتکاران و نیزیکانی باوەڕپێکراوی خانی قاجار دادەندرا و دڵنیاکرابۆوە کە سەلیمپاشا تۆڵەی غەدر و پیاوکوژییەکانی لێدەکرێتەوە و بە ئاوات و ئامانجی خۆی دەگا. لە محەرڕەمی ساڵی ۱۱٦۸ی کۆچی / ئۆکتۆبر ـ نوامبری ۱۷٥٤ی زایینیدا بە ڕەزامەندی تێکڕای جەماوەر و پشتیوانێتی خانی قاجار لە سەنەندەج وەک والی، حکوومەتی بە دەستەوە گرت[3].

لەم ڕۆژانەدا ئازادخان لە فارس شوێنی لەدووی کەریمخان دەگێڕا و عەبدوڵڵاپاشا باجەڵان حاکمی زەهاب کەوتبووە بەر هەڕەشەی هێزی بەرەو گەشە و نەشەی ژێرڕکێفی محەممەدخانی زەند. خوسرەوخانی ئەردەڵانیش بۆ نیشاندانی ئازایەتی و وشیاری خۆی سەبارەت بە بەشدار بوون لە بناغەدانانی حکوومەتێکی کە ۳۰ساڵی تەمەن کرد بە دەس ئاوەڵایی هەلی بۆ ڕەخسابوو (۱۱٦۸ـــ۱۱۷٦ی.ک. / ۱۷٥٤ ـ ۱۷٦۲ی.ز.و ۱۱۷۹ ـ ۱۲۰٤ی.ک. / ۱۷٦٥ ـ ۱۷۸۹ی.ز.). خوسرەوخان لە قۆڵی باکوورەوە لە لایەن هێزەکانی ئازادخانەوە بەئاشکرا گەفی لێدەکرا. پاش گیرانی ئیسفەهان بە دەس محەممەدخانی زەند لە ئاوریلی ساڵی ۱۷٥٥دا، دوازدە ڕۆژی خۆڕاگرت و سەرەنجام سپای نێردراوی قاجار دەفریای هاتن و ڕزگاریان کرد و تەنانەت هەتا گەڕووس ئەفغانییەکانی هەڵبڕی. لەبەر ئەم خزمەتەی فەرماندەی فەرماندەی قاجار خەڵاتێکی سێهەزار تمەنی بۆ نارد. دوای شکست و مەرگی محەممەدحەسەنخان، خوسرەوخان سەری وەبەر کەریمخان هێنا و ئەحمەدخانی کوڕی لە ساڵی ۱۱۷٤ی کۆچی / ۱۷٦۰ی زایینی ناردە خزمەت خانی زەند لە سوڵتانییە[4]. لە ڕووداوێکی ئەوتۆدا سلێمانپاشای ڕقەبەریشی نێردراوێکی ناردە لای کەریمخان یان تەنانەت بۆخۆی

---

2- SP 97/36, 1 August 1753.

3- Rabino, Kurdistan, 83.

٤ـ Ibid ئەم مەبەستە لە لایەن مێژوونووسانەوە پشتڕاست نەکراوەتەوە.

بەرەو هۆردووگاکەی خوشی[٥]. ڕەنگە لە ڕووی پێشوازی گەرمی وەکیل سەبارەت بە پێشبینی هێرش بۆ سەر خاکی ئەردەڵان و لادانی ڕقەبەرەکەی لە ماوەی دووساڵی داهاتوودا دڵنیا بووبێتەوە.

ئەم پەلامارانە جودا لەو زنجیرە هێرشانە بوون کە پاشای بابان لە قەڵەمڕەوی ئەردەڵان و والی کوردستان لە خاکی باباندا بە فیت و دنە یان دوژمنایەتی دەربارەکانی ئێران و عوسمانی یا بە مەبەستی پاراستنی قازانج و بەرژەوەندی ئەوان ئەنجامیان دەدا. ئەم بەزمە بە گەشە و هەڵدانی بنەماڵەی بابان لە سەتساڵ لێرەوبەر دەستی پێکرد و درووست هەتا سەدەی نۆزدە درێژەی کێشا[٦].

ئەردەڵان بریتییە لە بەشی هەرە زۆری خاکی پارێزگای کوردستانی ئێرانی ئێستا و ناوەندەکەی سنەیە و «بابان»یش تەواوێک لەگەڵ مەڵبەندی سلێمانی ئێراق یەکتر دەگرێتەوە و پاشان قەڵاچوالان بوو بە ناوەندی ئەم ئەیالەتە. ئەمانە هەر لە کۆنەوە زۆر پتەو تێکەڵاو بوون و کێشمەکێش و دەگژڕاچوونەکانیان بەرلەوەی بگەڕێتەوە سەر ملانەی نێوخۆیی، دەبەستراوە بە پیلانگێڕی و هاندانی ئەو دوو دەوڵەتەی کە هەرکام بە پارچەی یەکیان دادەندران. هەر بۆیە هەردوولا سەبارەت بە قەڵەمڕەوی کوردستان لە بارودۆخێکا بوون. هێڵ و تەوەرەی کرماشان ـ زەهاو بەرەو باشوور و خەت و کووزی موکریان ـ سۆران پەڕی بەرەو باکوور داویشت. یەکپارچەیی ئەم هەرێمە لەبەر دابەشینی سنووری هێڵی باکووری ـ باشووری ئێران و عوسمانی دادەبڕا. ئەم هێڵی سنوورییە وەک لە کێشەی پارێزگا باشوورییەکانی کوردستانا دیتراوە هەتا ئێستا نەیتوانیوە ببێتە بەرگر و لەمپەری پەڕینەوە و پێشڕەوی شەڕکەرانی سەربەستیخوازی کورد.

مەرگی سلێمان پاشای بەغدا لە مانگی مەی ۱۷٦۲دا، سەرلەنوێ چۆلەپێچی دەسەڵاتی دەوڵەتانی ناوەندی داماڵی و بوو بە هۆی ئەوەی کە

---

٥ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٩٥.

٦ـ بە مەبەستی خوێندنەوەی بەسەرهاتی میرانی بابان، بڕواننە: ئەلعەززاوی، هۆزەکان، بەرگی ۲، ل ۹۸ ـ ۱۰۰؛ ئیدمۆندز، ل ٥۲ ـ ٥٩. بە مەبەستی ئاگاداری سەبارەت بە شەڕەکانی ئەردەڵان و بابان، بڕواننە: مێژووی سلێمانی، ئەمینزەکیبەگ، ل ۷۳ ـ ۸۸.

ئەحمەدپاشا سلێمانپاشای بابان لە سەر دەسەڵات لابەرێ. ئـەم هـەنگاوە بـەر لەوەی پەیوەندی بە پرسی پاراستنی خۆیەوە بێ دەگەڕایەوە سەر سەرکەوتنێکی ڕووحی، چونکە هەر لەو ساڵیدا ناوبراو پەلاماری خاکی ئەردەڵانی دا و ناوچەی سەر سنووری مەریوانی داگیر کرد. ئاخرییەکەی وای لێهات کە خوسرەوخان بـە لەشکرێکی کەمەوە تیژ بزووت و لە دەشتی مەریوان سـلێمانپاشـای تێکشـکاند. سـلێمانپاشـا بـەرەو شـیراز پێـی پێوەنـا و هـەلات و سـەرەڕای پـیلانی چەشناوچەشن، بە دانی دیارییـەکی سێهەزارتمـەنی بـە کـەریمخـان تـوانی سەرەتای لادانی خوسرەوخان و وەرگرتنی حوکمی حکوومەتی کوردستان بۆخۆی خۆش بکا. سلێمانپاشا تەنیا ساڵێک پاش ئەوەی بۆوە حوکمـڕانی بابـان، بـە دەس عومەرپاشای میری تازەی بەغدا کوژرا و کەریمخان لە ساڵی ١١٧٩ی کۆچی / ١٧٦٥ی زایینیدا دووبارە خوسرەوخانی کـردەوە والـی ئـەردەڵان. نـاوبراو تـا دەساڵ دوای مردنی وەکیلـیش لـەم پلەیـەدا مایـەوە، سـنەی کورسـینشـینی پارێزگاکەی گەشە پێدا و خۆشـی کـرد و بـەرەوڕووی کێشـەکێش و زۆرانبـازی سەختی دیکە نەبۆوە لەگەڵ جێنشینانی سلێمانپاشا لە ئەیالەتی باباندا[٧]. لـە ڕاستیدا بە هۆی داهاتنی قۆناخێکی دەساڵانەی پڕ شەڕوشوور و کوشتاری پـاش مەرگی سلێمانپاشا لە قەڵەمڕەوی بابـان، خوسـرەوخان(١) و لـە ڕێـی ئـەوڕا وەکیلیش بە هـیچ کلۆجێـک بـە مەبەسـتی دۆزینـەوەی ڕێدەسـتێک لـە نێـو خوازیارانی جێنشینایەتی ڕەقیبدا خۆیان لە کاروباریان هەڵـنەقوتاند. تـەنیا لەم بەینەدا درێژەی گێـرە و کێشـە و ملانـەی ئەحمـەد و مـەحموودی کـوڕی و «محەممەد»ی برای لە گۆڕێ دابوو بۆ گرتنی ناوەندەکانی قەلاچوالان و کۆیە کـە هیچ پەیوەنییەکیان بە باسەکەی ئێمەوە نیە[٨].

قەڵەمڕەوی ئەردەڵان لە ساڵی ١٧٧٤دا جارێکی تـر ڕاسـتەوخۆ تووشـی ئـاژاوە بـۆوە. لـەم ڕۆژانـەدا محەممـەدی بـرای سـلێمانپاشـا بـە پاڵپشـتی

---

٧ـ تـاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٨٨؛ ڕابینۆ، کوردستان، ل ٨٤؛ ئەمینزەکـیبـەگ، مێژووی سلێمانی، ل ٧٧ ـ ٨٠؛ بە مەبەستی زانیاری سەبارەت بە یـەکساڵـەی ئـاخری ژیانی، بڕوانە: بامداد، بەرگی یەکەم، ل ٤٧٨؛ Longrigg, 179.

8- See Cevdet, I, 344 ff.; Aazzawi, Tarikh, 44 – 48; Longrigg, 180; Zaki, Solaymania, 81 – 88.

خوسرەوخان بەرەو قەڵاچوالان و کۆیە کشا و ڕقەبەرانی لەوێ دەرپەڕاند و ئەوانیش دادیان بردە بەر عومەرپاشا. قەڵەمڕەوی هەرێمی کوردان جگە لە بەرهەم و داهاتیان بە باری لەشکریشدا بۆ وڵاتانی ئێران و عوسمانی بە شادەماری ژیانەکی دادەندران و لە لایەکیشەوە شەڕکەری پێویستیان بۆ دابین دەکردن. لەبەر بەڕێوەبردنی ڕاستەقینەی بابان لە لایەن ئێرانەوە، پاشا لە دوو لاوە دەکەوتە مەترسی و هەر بۆیە هەمیشە هەوڵی دەدا هەتا ڕێبەرانی بابان لێکدالێکدا بگۆڕێ[9]. عومەرپاشا ئێستا هەلوێستێکی دوورەپەرێزانەی هەڵبژاردبوو هەتا وردەوردە دەسەلاتی خۆی لەو هەرێمەدا وەک خۆی لێبکاتەوە: پاشا هێزێکی گەورەی لە بەغداوە گاڵ دا هەتا مەحموود لە کۆیە و ئەحمەد لە قەڵاچوالان سەقامگیر بکا و محەممەد لەوێ بتارێنێ و ئەویش بەناچار پەنای بردە بەر سنە[10].

## ١٢ ـ ٢ دەسوەردانی هێزەکانی زەندیە لە کوردستان

مێژوونووسانی ئێرانی هەرکات کەوتوونە سەر باس و بابەتی کوردستان، لە سەر ئەم خاڵە پێیان داگرتووە کە ئێرانییەکان هەمیشە لە بابەت ئاکاری نالەبار و توندوتیژی پاشا سەبارەت بە هاونیشتمانانیان لە ئێراق تووڕە و ناڕازی بوون و دۆزی ناوچەکە وای هەڵدەگرت کە بە مەبەستی ڕاگرتنی پارسەنگی دەسەلات خۆتێوەردان لەم هەرێمەدا بێتەگۆڕ. لە ئۆکتۆبری ١٧٧٤دا وەکیل لەشکرێکی بە سەرکردایەتی عەلیمرادخانی زەند نارده کوردستان هەتا پاشای لێخراو بەرێتەوە جێی خۆی و هاوکات فەرمانی دا کە هێزی دیکەش ئامادەی بزووتن بن بۆ بەسرە. ئەم هەواڵە لە لایەن سیخوڕێکی دانیشتووی شیرازەوە گەیشتە دەس سلێمانئاغا لە بەسرە و لەوێشەوە حەواڵەی عومەرپاشا کرا[11]. عەلیمرادخان لە سەر ڕێگای چوونی بۆ سەر خاکی ئەردەڵان کەوتە کۆکردنەوەی هێزی پشتیوان و لە سەرەتاکانی نوامبردا بە سپایەکی دەدوازدەهەزار کەسی لە مەڵبەندی قەڵاچوالان دابەزی. ئەحمەدپاشا ئەگەرچی بە

9- cf. Rousseau, Description, 100 – 101.

١٠ـ گوڵشەنی مراد، ١٧٦ ـ ١٧٨؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ١٧٨ ـ ١٨٢.

11- FR XVII, 1084, 1085 (4 December 1774).

هێزی یارمەتیدەر و پشتیوانیشەوە سێهەزار چەکدارێکی پتر بە دەستەوە نەبوو، بەلام لەم شەڕەدا سەرکەوت. دوابەدوای تێکهەڵچوونێکی سێ‌چوار سەعاتە سەرەتا ئێرانییەکان فایقتر بوون. عەلی‌مرادخان بە مەستی و بە مانەیەکی پتەو تاقەسوارە پەلاماری ڕیزەکانی دوژمنی دا و نەڕاندی: کێ پیاوە بۆم بێتە مەیدانێ. هێزەکانی پاشا(حوکمڕان) سووک و هاسان لە خوانی زین هەڵیانداشت و دەستیان بەست. لە ئاکامدا لەشکرەکەی تەقورەوی تێکەوت و دەستی لێکبەردا. نیزیکەی چوار یان پێنج‌هەزار کەس کوژران و جگە لە سەرکردەی سپا دەدوازدە کەس لە سەرپەل و سەرلکەکانی گیران. عەلی‌مرادخان نێردرایە بەغدا. عومەرپاشا کە هێشتاش پێی خۆش نەبوو لە بابەت تێکگیرانی لەگەڵ سپای کەریم‌خان پێهەڵێنێ، سەرکردەی زەند و هاوڕێیانی ئەسیری پاش کۆتایی شەڕ، زۆر بەئەدەبانە و شکۆ و ڕێزەوە ناردەوە لای «وەکیل»ی تووڕە. لەگەڵ ئەم تاقمەدا پەیامێکی تەوساوی نارد و گوتی لای وایە ئەمانە بێ‌ئەوەی کەس فەرمانی پێدابن سەربەخۆ پەلاماری خاکی عوسمانییان داوە. وەکیل بە ناردنی دیاری و خەڵات بۆ پاشا کارەکەی قەرەبوو کردەوە. یەکێک لەو دیارییانە فیلێک بوو؛ هەروەها سەبارەت بە درێژەی ئاشتی و ئارامیش دڵنیای کردەوە[12].

· عەلی‌مرادخان بێ‌ئەوەی سزا بدرێ تەنیا سەرکۆنە کرا. وەکیل لەڕێوە فەرمانی دا بە نەزەرعەلی‌خان کە بە هەڵمەتێکی نوێ ئابڕووی لە دەس‌چوویان بکڕێتەوە. سەرەڕای متمانەیەکی کە دابووی بە عومەرپاشا لە سەرانسەری سنوورا هێرشی دەس‌پێکرد. سادقخان لە ژانوییەی ۱۷۷۵دا بەرەو بەسرە کەوتەڕێ و هەر لەو وەختیشدا نەزەرعەلی‌خان کەوتە کۆکردنەوەی هێز. میرزا محەممەدجەعفەری وەزیری ناردە لای عەبدوڵلاپاشا لە ناوچەی زەهاو هەتا پیتاکی ئەوێ وەربگرێ. سەرۆکی تایفەی باجەلانی زەهاو هەر خۆی بوارد و

12- Ibid; SP 97/51 (1775), 46a (Whence the quotaion); Hatt – I – Humayun, 135, 348a; Cevdet, I, 134; II, 52 – 53.
تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ۱۷۸ – ۱۷۹. Longriggs, 18 ژمارەی چەکدارانی عەلی‌مرادخان بە چاردەهەزار کەس . FR XVII, 1084 بە دەدوازدە هەزار کەسیان دادەنێ؛ ئەلعەززاوی لە لاپەڕە ۴۸ی کتێبەکەی‌دا بە دەهەزار چەکدار و تەفرەشی لە لاپەڕە «۲۱۸ئا»دا بە چوارهەزار تفەنگداریان داناون.

تەفرەی دا و بالوێزی کەریمخانی خافلاند و لە ژێرەوەش چەند پۆلێکی وێرای بنەماڵەکەی ناردە هەرێمی بەغدا هەتا بەڵکوو بتوانن ٥هەزار چەکدارێکی بۆ کۆبکەنەوە. هەر کە میرزا محەممەدجەعفەر بە زیادبوونی سپای عەبدوڵلاپاشای زانی وتووێژەکانی ڕاگرت و گەڕایەوە لای نەزەرعەلیخان لە هاڕوونئاوا (دواتر ببوو بە شاهابادی ڕۆژاوا و ئێستا ئیسلامئاوای ڕۆژاوایە) کە بە مەبەستی دەسپێکی پەلامار چاوەڕوان مابوویەوە.

نەزەرعەلیخان هەر خێرایەکی کەوتەڕێ، بەڵام وەختایەک هات شاری زەهاوی بە ورد و وێرانی لەبەرچاوی هەڵـزەقی. بارگەوبنەی ئەسپاردەی ئەڵلاقولیخانی زەنگەنەی حاکمی کرماشان کرد و ئاغامیرزاعەلی کوڕیشی کردە حوکمڕانی زەهاو. سەرەنجام لای تاوپەڕێ کەوتەڕێ و تەواوی شەو بێوچان کوتای. سبەی بەیانی لە نیزیک خانەقین عەبدوڵلاپاشای دەردەس کرد و دووهەزارکەس لە پیاوەکانی کوشت و سەدوبیستهەزار سەر مەڕ و گاڕانی بەخەنیمەت گرت و تەواوی ئەو مەڵبەندەی خاپوور کرد و بە کەیفسازی گەڕایەوە کرماشان[١٣]. سنوورەکانی عوسمانی لە چەند جێیدی کەوتنە بەر پەلاماری سەردارانی زەند و محەممەدخانی فەیلی. هێزەکانی زەند ئابڕوویان کرایەوە، تایفەی باجەلان زراوی چوو، زەهاو خرایە سەر ئێران، ئەحمەدپاشا ڕایکردە کەرکووک و عومەرپاشا وا تۆقیبوو کە ئیدی نەیدەتوانی محەممەد بگێڕێتەوە قەڵاچوالانی ناوەندی حکوومەتی[١٤].

## ١٢ ـ ٣ هەڵسووڕداسووڕی دیپلۆماسی

ڕاچەنین و پەرچەکرداری بابیعالی سەبارەت بە هەڵگیرسانی شەڕ لە سنوورەکانی ڕۆژاوایدا بە حاڵودووبەڵا بوو. «مەمالیک»ی مەیلەو سەربەخۆی بەغدا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەهێمنی لە پلەی خۆیاندا مابوونەوە. سەرەڕای

١٣ـ گولشەنی مراد، ل ١٧٩ ـ ١٨٠؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٧٩؛ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٣٧ ـ ٣٣٨؛ئەمینزەکیبەگ، مێژووی سلێمانی، ل ٨٤.

١٤ـ ئەمینزەکیبەگ، مێژووی سلێمانی، ل ٨٤؛ عەززاوی، مێژوو، ل ٤٩؛ تەفرەشی، ل ٢١٨ب؛ Uzuncarsili, 459.

تەقەلای قۆناخ بە قۆناخی سوڵتان بە مەبەستی دابەشینی قەڵەمڕەوی ئەوان لە نێو پیاوەکانی باوەڕپێکراوی خۆی لە پارێزگا پاشکۆکانی کوردستان و بەسرەدا، ئیستانبووڵ باسوخواسەکەی لە بیر بردبۆوە. ئێستا سیساڵ بە سەر ئاخرین هێرشی نادرا بۆ سەر ئەم هەرێمە تێپەڕیبوو کە دیسان ئێرانییەکان هەڕەشەیان لە سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی عوسمانی دەکرد. ئەم ڕووداوە تەنیا چەند مانگ پاش ئەوەی لە کوچوک کاینارجا (Kuchuk Qainarja)ڕووسیا هێزەکانی عوسمانی لە ڕۆژاوا هەڵشێلابوون و زەبرێکی چاکی لە ئابڕووی دابوون دەقەوما. ئەم هەڵکەوتە ئاماژەپێکراوەی کە ئادەمیزاد دەچوخسێنێ پتر دوابەدوای مردنی سوڵتان مستەفای سێهەم، سوڵتانی بەدەسەڵاتی عوسمانی لە کۆتایی ساڵی ۱۷۷۳دا تین و گوڕی وەبەرهات و عەبدولحەمیدی جێنشینی بێکیفایەتی هەروەک دەرەقەتی ئێرانییەکان نەدەهات، هەرواش نەیدەتوانی کە بە شێوەیەکی شەرافەتمەندانە ئیمپراتۆرییەتی خۆی لە چنگ کارەساتی تاڵ و ناخۆشی شەڕ لەگەڵ ڕووسیادا ڕزگار بکا.

یەکەم باڵوێزی بابیعالی بۆ چوونە دەرباری شیراز سونبولزادە وەهبی ئەفەندی بوو کە لە مانگی ژانوییەدا لە ئیستانبووڵەوە کەوتەڕێ و لە ئاوریلی ساڵی ۱۷۷۵دا پێی نایە شیراز[15]. بەڵام گەشتەکەی جووت کەوت لەگەڵ پەلاماری توند و خێرای سادقخان و گەمارۆی بەسرە و گفتوگۆکانی لەگەڵ وەکیل کەوتە ژێر سێبەری سەنگینی هرووژم بۆ سەر بەسرە. چونکە ئەم شاندە ڕاسپێراوی وتووێژی سەبارەت بە گێرە و کێشەی کوردستان بوو، نەیدەتوانی لە بابەت قەیرانی تازەدا سینگ بداتە پێش. ئەم شاندە وای نیشان دەدا کە ڕاسپێراوی ڕاگەیاندنی ڕێوڕەسمی هەواڵی مەرگی سوڵتانمستەفا و هاتنە سەر تەخت و دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمیدە. ئەم هەنگاوە بیانوویەکی بەجێ بوو بۆ دەسپێکردنەوەی پێوەندی دیپلۆماتیک لەگەڵ دەوڵەتی ئێران کە هەتا ئێستا لەبەر نەبوونی سەرۆک لەو وڵاتەدا سەرکەوتنێکیان وەدەس نەهێنابوو، هەروەها بەڕەسمیناسینی حکوومەتی کەریمخانیش بوو کە تا ئێستا وەدوا خرابوو. هەر عوزرخوازییەکی بەپارێزەوە کە دەربارەی ئاکار و کرداری

15- SP 97/51, 21a (3 February), 68a (29 June 1775).

عومەرپاشا دەهاتەگۆڕ، بەئاشکرا تای تەرازووی ڕاست نەدەکردەوە[16]، بۆیە لە مانگی سێپتامبردا بە سووکی و سەرشۆڕی و بە کۆلێک سکالا و تووڕەیی وەکیل لە بابەت عومەرپاشاوە کە لە توێی وتووێژەکاندا بە زمانێکی ورد و باریکی دیپلۆماسی بۆ بابیعالی درکابوون، گەڕانەوە ئیستانبوول. ئەم پەیوەندییە بە ناردنی عەبدوللاخانی زیرەک و وریای کەلهوڕ کە هەر لەو مانگیدا و پاش گەڕانەوەی وەهبی وەک بالوێزی ئێران وەڕێکەوتبوو، درێژەی کێشا[17].

خالی ناکۆکی لە لایەن ئێرانییەکانەوە بە ڕادەی پێویست ڕوون و ساکار بوو. ئەگەر بابیعالی فەرمانی دابا کە عومەرپاشا بەر بە دەستێوەردانی نوێنەرەکەی لە کوردستان بگرێ و گوومرگانەی هاتوچۆی داسەپیو لە سەر زیارەتکارانی ئێرانی هەلگیرێ و ـ ئەم باجە بەرچاوە ئەو کەسانەی نەدەگرتەوە کە لە هیندووستان یان ئاسیای ناوەندیڕا دەهاتن ـ چلهەزار کیسە دراو بە مەبەستی تێهەلێنانەوە و قەرەبووی داگیرکردنی نایاسایی مال و دارایی ئەو ئێرانییانەی بە تاعوون تێداچووبوون بدرێ و بەگوێرەی نێونـاخن و هەلومەرجی پەیمانی بەستراوی کوردان(٢) لەگەل نادرشا لە سێپتامبری ١٧٤٦دا بجوولێنەوە، کەریمخان هیچ گیرە و هەرایەکی لەگەل بابیعالی نامێنێ[18]. ئەگەرچی وا دیار بوو دەرباری عوسمانی ئیشتیای لێیە ئەو بڕە دراوە بدا، بەلام بەکردەوە و بەقسە چەند بەرهەلستێک کەوتبوونە سەرڕێی جێبەجێکرانی ئەو پێشنیارە. ئەو پەیمانەی ئاشتی کە باسی کرا لەبەر هەلکەوتی مەرگی نادرشا و تەنینەوەی

---

١٦ـ گولشەنی مراد، ل ١٩٠؛ cf. Cevdet I, 343; II, 53; See also 15.3. لە لاپەڕە ١٩٤ـ١٩٥ی تاریخی گیتیگوشای زەندیە نووسراوە کە ئەم شانده هاتبوون ڕێ لە پەلاماردانی بەسرە بگرن و گەمارۆی لە سەر لابەرن و پێشنیاریان دەکرد چونکە بەسرە ملکی دایکی سولتانە لێیگەڕێن و کوێی دیکەیان پێخۆشە با بیگرن.

17- SP 97/51, 87 . 89b, 96b, 106; Hatt – i – Humayun, 174, 202, 218, 219; هەروەها: گولشەنی مراد، ل ١٩٠.

18- Hatt – i – Humayun,2, 5 . For the Treaty See Lockhart, Nadir shah, 255. ئەم نامانە لە توێژینەوەکانی مێژووییدا، سالی دەهەم (١٣٥٤ی هەتاوی / ١٩٧٥ی زایینی)، ژمارە یەکەم، لاپەرە ١٧٥ – ١٩٤ لە ڕێی نەسیریڕا چاپ کراوە؛ بە مەبەستی لێکۆلینەوەی زیاتر بڕواننە پەراوێزەکانی ٣ و ١٥.

ئاژاوە و شێواوییەکانی ئێران لە لایەن هیچکامی ئەم دەوڵەتانەوە مۆر نەکرابوو. لە ئیمپراتۆرییەتی ئێرانا ئێستا دوو حکوومەت وەبەرچاو دەهاتن کە هەرکامیان بە نـاوی جێنشـینی دەوڵـەتی نادرشـا خوازیـاری بـەرەسمیناسـین بـوون. شەرعییەتی خودبەخودی ئەفشارییەکان لە خوراسـاندا وای کردبـوو کـە قـەت پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ بابیعـالی نەپسـێنن و تەنانـەت ئەگـەر گێـرە و کێشەی بەرباسی سنووری گەیشتبایە ئەو ئاکامەنەی کە وەکیل بـۆ سـازان وەک پێشمەرج داینابوون، عومەرپاشـا کۆمەڵـە تۆمـات و داخـوازی ئێرانییـەکانی دەبردەوە پاش چونکـە بـابیعـالی هێشـتا دەرینەخسـتبوو کـە داخـوا هێـز و دەسەڵاتی دانان و لابردن و پێملکردنی حوکمڕانی بەغـدای هەیـە یـان نـا. لـەم بەینانەدا دۆزی گەمارۆی بەسرە بەرەو تاڵی و تفتی چووبوو. وا دەردەکەوت کـە لێنەوەشاوەیی ترکان ئەوانی لە بەرەی رووسیاڕا پاڵ داوەتە بەرەی ئێران.

ئیستانبووڵ بەگەرمە هەوڵی دەدا کە خۆی تووشـی ئـەو گێلمەگێلمانـە نـەکا و تـا ئەندازەیـەکیش سـەرکەوتنی وەدەس هێنـا. دەیەویسـت پیـاوێکی باوەڕپێکراو و شیاوتر لە جێـی ئۆمەرپاشـا دابنـێ هـەتا نـەک تـەنیا دەرک و دەروازەی سازان لەگەڵ ئێران بخاتە سەر گازەرای پشت و ڕێگای بۆخۆش بکـا، بەڵکوو کۆتاییش بێنێ بە دەسـەڵاتی خانـەدانی مـەمالیکی بەغـدا و سـەرەتای پەیوەندییەکی قایمی ئەم ناوچەیە لەگەڵ ئیستانبووڵ دامەزرێنێ. هیچ دوور نیە کە تاقم و دەستەکانی خەنیمی پاشا لە مووسـڵ و شـارەزوور لـە گـرتنی ئـەم تەمایەدا دەوریان گێڕابێ[19]. سەرەنجام سەرەتای ساڵی ۱۷۷٦، ئێسـپەناقچیزادە حافزمستەفاپاشای ئۆرفە لەگەڵ سێچوار هەزار پیاوی شـەڕکەر بـە مەبەسـتی ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی بەغدا کەوتەرێ. سەبارەت بـە ئینکەبـەری و دوژمنایـەتی لەخۆوەی پاشا لەگەڵ ئێران تێبـینی پێویسـتی درابوویـە، ئێسـتا کـە کێشـە تەنیبوویانەوە، تێمـابوو و نەیـدەزانی چبکـا و بـەناچار دەبـوو ڕاگوێزرێتـە دیاربەکر. وا ویدەچوو کە ئۆمەرپاشا دەیهەوێ بەسەبرایەکی لە بەغدا بخوشـێ، بەڵام مستەفاپاشا یان بەپێی فەرمانی نەهێنی بـابیعـالی یـان لەبـەر مـەیل و ئیشتیای سەبارەت بە داگیرکردنی ماڵ و دارایی حوکمڕانی بەغدا، هەرکە ئەو لە شار دەرکەوت، بە بیانووی بەرگرتن لە هەرچیوپەرچی و ئـاژاوە، هاوڕێیـانی

19- SP 97/51; 70b; Cevdet II, 56; Huart, 156.

گرت و قەلاچۆی کردن. عومەرپاشا پاش شەرێکی قارەمانانە بەرەو مووسڵ رایکرد، بەڵام لە رێگادا یەکسمەکەی سەرسمی دا و گۆیا لەبەر هەڵدێران و گلانی یان پەلاماری ئەوانەی هەڵیانبڕیبوو کوژرا. لە مانگی مارسا سەریان ناردە ئیستانبووڵ و بابیعالی ڕەزامەندی خۆی نەشاردەوە و ئێسپەناقچیزادە جڵەوی حکوومەتی بەغدای گرتە دەست[٢٠].

خوایینەخوایی کوژرانی عومەرپاشا لە لایەن ئێرانییەکانەوە وەک نیشانەیەکی ئاشتیخوازانە ڕێزی لێگیرا، بەڵام هیچ گۆڕانێکی بە سەر ڕەوتی شەڕا نەهێنا. بێجگە لەم باسوخواسانە کەریمخان دەیهەویست کە دەرفەت لە شەڕ و کێشەی داهاتووی نێوان ترکان بێنێ لە بەغدا[٢١]. ئێسپەناقچیزادە کە بە شێوازێکی نەفامانە ماڵ و سامانی تالانکراوی ئۆمەرپاشای بۆخۆی گلدابۆوە لە ژێر تەوژم و گوشاری بیروڕای گشتی خەڵکی بەغدادا مەرگی پاشای پێشووی پێوە نەهات و تەنیا حەوتوویەکی حکوومەت کرد و عەبدوڵلاپاشا لە سەر کاری لابرد و جێیگرتەوە. عەبدوڵلاپاشا بە ناوی کەهیای پێشووی عومەرپاشا بەئارامی لایەنگرانی سەرۆکی کۆنی کە لە دەوروبەری بەغدا ماتەیان هەڵگرتبوو، لە دەوری خۆی هالاند. ئیستانبووڵ ناچار بوو کە ئەم بارودۆخە سەقامگیرە بەڕەسمی بناسێ و گەلاڵەکانی خۆی بە مەبەستی بەڕێوەبردنی ڕاستەوڕاستی بەغدا وەلابنێ[٢٢]. لەم ڕۆژانەدا بەسرە کە خۆی لە یارمەتیدانی ئەم هەڵگەڕانەوە و کۆدتایانە پاراستبوو بە دەس سادقخان گیرا. بابیعالی بەئاشکرا کەوتە دڵەڕاوکە و ئەم هەواڵانەی هەتا چەند حەوتووان حەشار دا تا ئەوەی کە لە ڕۆژی ٣ی ژووئیەدا بە سەرساردی ڕایگەیاند[٢٣].

## ١٢ ـ ٤ بێلایەنی بەرەی باکوور

سەرەڕای گیرانی کۆنفەرانسی بالای مانگی ئاگۆستی بابیعالی و داوەرینی سەرعەسکەر بە خۆی و شێستهەزار کەسەوە بۆ شاری مووسڵ لە

20- SP 97/52, 8a, 11a, 21b; Cevdet II, 56.
21- Malcolm, 142; Miles, 274; cf. Rostam, 402.
22- SP 97/52, 74b, 75a; al – Basri, 41 – 43, 77; Cevdet II, 58; Longrigg, 182.
23- SP 97/52, 59a.

مانگی سێپتامبردا، هێشتا نیشانەی هەڵگیرسانی شەڕێکی ڕەسمی وەبەرچاو نەدەهات[24]. لەم ناوچەیەدا مەترسییەکی تازە خۆی نواند. ئارکێلی میری گورجستان لەبەر سەرکەوتنەکانی هاوپەیمانانی ڕووسی و حکوومەتی ئێران کە بەڕواڵەت سەری وەبەر هێنابوو، هەروەها دڵنیابوونەوەی سەبارەت بە شەڕ لە بەرەی دواوەیدا لەبەر قڕە و هەڵلای فەتحعەلیخانی ڕەقیبی و یەکێتی دوژمنانی لە داغستان، هەر بەجارێکی پەیمانی ئاشتی خستە پشتگوێ و تەمای گرت کە پەلاماری پاشالیک ئاخال تیزیخە(۳) بدا[25]. پاشا لێیدامەزرا و کەوتە بەرپەرچدانەوەی، چەند پەیام و ڕاسپاردەیەکی نارد بۆ تەواوی خان و دەرەبەگەکانی پشت بەرەی ئارکێل و ـ دوژمنانی سڕ و بێدەنگ و جەماوەری ناڕازیشی دەکەوتنە جەغزی ئەم داروودەستانەوە ـ چەند ڕاگەیاندراوێک بەڕێکرا بۆ تەواوی حوکمڕانانی کوردستانی باکووری و ئاناتۆلی هەتا سەربازانی ئێلجاڕی هێزی پشتیوان بە مەبەستی پەلاماردانی ئێران گاڵ بدەن بۆ نێو لەشکری سەرعەسکەری ڕۆژهەلاتی قارس. بەلام لە ڕووی ئەو ڕاپۆرتانەوە کە لە بابەت بێکیفایەتی تاقمەکانی شەڕوان و پاشەکەوتیان و دابڕانی ڕێی هەر چەشنە یارمەتییەکی بەرهەستی زیاتر و ئەو هەواڵە ڕاست و دروستانەی کە حوکمڕانانی خۆی، ئێرەوان، شەکی، شیروان و داغستان دەیاننارد بۆ ئیستانبووڵ بەڕاستی وا دەردەکەوێ کە بابیعالی نەیویستووە پارێزگاری لەم سنوورە یان کەوشەنەکانی دیکە بکا و تەنیا ویستوویەتی لە ڕێی حوکمڕانانی ناوچەییڕا خۆیەک بنوێنێ. دەوڵەتی ئیستانبووڵ سەبارەت بە قەڵەمڕەوی بڕشت و دەسەلاتی کەریمخان لە پارێزگاکانی باکووری ئێران شتێکی کەموکووڕی دەزانی و نەدەزانی، بۆیە وەختایەک ئێرانییەکان هێرشیان هێنا لە ژوورەوەی سنوورەکانی ڕۆژهەلاتی لە یەکاویعارەبانڕا تا قەفقاز زەنگی مەترسی وەجرینگە هات.

• بەختەوەرانە سەرەڕای تەواوی ئەم باسوخواسانە هەڵسووڕداسووڕی ڕواڵەتییانەی بابیعالی ئاکامێکی چاکی لێکەوتەوە، ئارکێل و خانەکان

24- SP 97/52, 846; FR XVII, 1107 (Letter From a Roman Catholic Priest in Shiraz, dated 16 September).

25- Brosset, 223, 242 – 243; cf. below, 13 – 14.

سوێندیان خوارد ـ و بێگومان بەڕاستیشیان سوێند خوارد ـ کە نایانهەوێ سەر وەبەر فەرمان و گەلاڵەکانی کەریمخان بێنن و بە باری ڕواڵەتیشدا ئامادەن کە لە بەرامبەر هرووژمی هێزەکانی زەندیە بۆ سەر خاکی عوسمانی یاریدەی بابیعالی بدەن. وێڕای تەواوی ئەو کەوڵە ڕووکەشە پیاوچاکییانەی بە سەر خۆیان کێشابوو، نیشانیان دا کە هەر لە بنەڕەتەوە قەت حازر نین بکەونە شەڕەوە. ئەمانە پاش کۆتایی پادشایەتی خانەدانی سەفەوی خۆیان بە جەماوەری ژێرکێفی سوڵتان دادەنا و بە مەبەستی سەلماندنی وەفاداری ئامادە بوون بارمتە بنێرن. بەڵام وەک ئەرکێکی پێویست سەبارەت بە بەرپرسایەتی هاوبەش و وەرگرتنی دەستەبەرێتی پێیان دادەگرت. بابیعالی و سەرکردەکانی لەشکری لەم ئاماژەیە حاڵی بوون: گەلێک دیاری هەریر و ئاوریشم و دراو و خەڵاتی دیکەیان درایە. هەردوولا بە سپاسەوە دەستیان لە گێرە و کێشە کێشایەوە و بەرەی ئازەربایجان لە درێژەی هێرشی ساڵانی دواترا بۆ سەر کوردستان هێور مایەوە[٢٦].

## ١٢ ـ ٥ ئاکامی هرووژم بۆ سەر کوردستان

لە بنەبانی ساڵی ١٧٧٦دا نەزەرعەلیخانی زەند بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو هەموو هێزەکانی لە کرماشان هێنادەر و گەڕایەوە شیراز[٢٧]. بە مەبەستی کۆکردنەوەی سپا لە کەرکووک و مووسڵ و گێڕانەوەی دەسەڵاتی عوسمانی، حەسەنپاشای ماردین کرایە حوکمڕانی کوردستان؛ لەگەڵ ئەمەشدا هێزی یارمەتیدەری پێویست کە دەبووا لە لایەن بەغداوە گاڵ بدرێن، لەبەر سەقامگیرنەبوونی دەسەڵاتی لەرزۆکی عەبدوڵلاپاشا لە ناوەندی پارێزگا هەر

---

26- Hatt – i – Humayun, 73, 82, 94h – m, 97, 113, 131, Cevdet II, 58 – 66; نەسیری لە توێژینەوەکانی مێژوویی‌دا، ساڵی دەهەم، ژمارە ٦، ل ١٤٤ ـ ١٥٣، وتارێک بە ناوی چەند نامەیەک لە فەرمانەکانی خۆی و مەراغە: موجمەلوتتەواریخ، ل ٣٣٨.
cf . SP 97/54 (1778), 91b.

27- SP 97/53 (1777), 68; نەسیری، توێژینەوەکانی مێژوویی، ساڵی دەهەم، ژمارە٦، ل ١٤٠. وەکیل ئەم لەشکرکردنە بە هەنگاوێکی ئاشتیخوازانە ناودێر دەکا؛ گوڵشەنی مراد، ل ٢٠٨.

ئەمرۆسبەی پێدەکرا. حەسەنپاشا لێبڕا کە سەرەتای بەهار بە پاڵپشتی سەربازانی ئێلجاڕی تایفەی بابان بە سەرکردایەتی محەممەدپاشا دژی ناوچەی بێپارێزوانی ئەردەڵان وەخۆکەوێ. ئەحمەدپاشای حوکمڕانی پێشووی قەڵاچوالان کە لە ماوەی شاڵاوی پێشووی ئێرانییەکاندا شوێنپێی خۆی قایم کردبوو دایە پاڵ هێزەکانی بابان کە بەرەوپێش دەکشان[۲۸]. لە ڕۆژی ١٤ی ڕەبیعولئەووەلی ۱۱۹۱ی کۆچی / ۲۲ی ئاوریلی ۱۷۷۷ی زایینیدا، محەممەدپاشا سنووربەزی کرد و «بانە»ی پاش دەسکردنەوەی حوکمڕانی ئەو شارە بە ناوی سالەخان تاڵان کرد. دوابەدوای تێکهەڵچوونێکی سێساعەتە خوسرەوخان بەهەشتاو پێی بە ڕکێفەوە نا و هات هەتا بەرسینگەی لێبڕێتەوە و لە ۲۷ی ڕەبیعولئەووەل / ٥ی مانگی مەی لە «مەریوان» بە دانی کوشتە و بریندارێکی زۆر شکستی هێنا. والی کوردستان و پاشماوەی شیروەشێنانی لەشکرەکەی بەرەو شاری سنە ڕایانکرد، سەری پتر لە ۲۳۰کەس لە کوژراوانی شەڕ بۆ حوسێنپاشا نێردرا و ئەویش بە نۆرەی خۆی ناردنی بۆ ئیستانبوول[۲۹].

خوسرەوخان لە پەنا پەساری شوورە و دیوارەکانی سنەوە هاوارێکی فریاخوازی بۆ کەریمخان نارد. فەرمانی هێرشێک لە سێقۆڵەوە دەرچوو. عەلیمرادخانی زەند هێزەکانی پارێزگای هەمەدانی بەرەو ناوچەی باکووری ئەردەڵان دەنگ دا، زولفەقارخانی ئەفشار لە باڵی باکووری ڕۆژهەڵاتیڕا وەرسووڕا و لەگەڵ سپای هاوپەیمانی کەلبعەلیخانی کوڕی شێخاڵیخانی زەندی کۆچکردوو ڕاستەوخۆ بەرەو سنە کەوتنەڕێ. ئەم هۆردووکردنە سێچوار مانگی مەودا پێدەویست. بۆیە حەسەنپاشا توانی لەشکرێکی گەورە لە چەکدارانی ئێلجاڕی لە بەغدا کۆبکاتەوە کە دوازدەهەزار کەس هێزی پشتیوانی ناوچەکانی باکووری و چەندینهەزار شەڕکەری محەممەدپاشا تێکەڵی ببوون. سێقۆڵەی لەشکری زەندیە لە سنە یەکتریان گرتەوە و لە شارەزووری نیزیک

---

28- گوڵشەنی مراد، ل ۲۰۸. SP 97/53, 126, 150a; Cevdet II, 67;

۲۹ـ گوڵشەنی مراد، ل ۲۰۹؛ عەززاوی، مێژوو، ل ٦٦ ـ ٦٧؛ ئەمینزەکی، مێژووی سلێمانی، ل ۸۵. SP 97/53 131b, 159b; FR XVII, 144 (10 August1777); Cevdet II, 68. عەززاوی سپای خوسرەوخان بە ۱۲هەزار و جەودەت بە ۲۰هەزار کەس دادەنێ. غەففاری بە هەڵە ڕێکەوتی شەڕەکە دەباتە ساڵی ۱۱۹۲ی کۆچی / ۱۷۷۸ی زایینی.

سلێمانی لەگەڵ هێزەکانی عوسمانی دەگژیەک ڕاچوون. لای ڕۆژاوا ترکان پیس شکان و هێزەکانی زەند بۆ ماوەی چەند ڕۆژان بەرەو باشوور هەڵیانبڕین و بێحەسانەوە ئاژاوتیان و خۆیان گەیاندە نیزیک بەغدا. پاش ئەوەی ئەحمەدپاشایان لە کوردستان کردەوە حوکمڕان، کەوتنە پاشەکشە. دیسانیش ئەحمەدپاشا وەک حوکمداری بابان لەگەڵ سەرکەوتەی مەیدان پاڵی ڕێکدا[30].

تەنانەت پاش گەڕانەوەی هێزەکانی زەندیش دوژمنی خۆی تێکشکاند و محەممەدپاشای بە دیل گرت، بەڵام بە ملکەچی و عوزرخوازی و دەربڕینی وەفاداری لەگەڵ حەسەنپاشای هەرەسبردە ئاشتەوە بوو. بەم پێیە بۆ مانەوە و ڕاگرتنی دەسەڵاتێکی کە بە تەوژمی هێزەکانی ئێرانی وەدەستی هێنابوو وای کرد دەوڵەتی عوسمانیش ئۆباڵی بۆ بکێشێ[31].

عەبدوڵڵا پاشا بە مەبەستی پاراستنی بەغدا کەوتەڕێ. لێبڕابوو کە خۆی بەگوێرەی ئەو مەشق و ڕاهاتنەی کە دیبووی بەسرە وەربگرێتەوە. دەیەویست لە ڕێی گفتوگۆ چارەسەرێک بدۆزێتەوە. لە پایزی ساڵی ١٧٧٧دا، شاندێکی بە سەرۆکایەتی محەممەدبەگی شاویزادە ناردە شیراز. محەممەدبەگ پیاوێکی زیرەکی بە ڕەچەڵاک ئێرانی بوو کە لە دەرباری مەمالیکدا خزمەتی دەکرد و ئێستا خەزێنەداری عەبدوڵڵاپاشا بوو. وتوویژەکان چەند پێشکەوتێکیان لێکەوتەوە کە ڕەنگبوو پەیمانێکی سەبارەت بە چۆڵکردنی بەسرەوە بە شوێنەوە بێ. وەختایەک کە شاویزادە لە ئاخری ساڵ هاتەوە ئەم ئومێدانە پتریان گەشە سەند، چونکە لەگەڵ حەیدەرخانی زەنگەنەی باڵوێزی وەکیل گەڕابۆوە[32]. سەرەنجام کاتێک کە لە سەرسنوور دیداریان کرد هەواڵی

---

٣٠ــ گوڵشەنی مراد، ٢١٠؛ عەززاوی، مێژوو، ل ٢٧ ــ ٢٨، ئەمینزەکی، مێژووی سلێمانی، ل ٨٥؛ cf. SP 97/54 (1778), 52.

نامەیەک کە سەبارەت بەم سەرکەوتنی دواتر لە حەلەبەوە نێردراوە، دەنووسێ کە بابیعالی هەواڵەکەی شاردبووە.

31- Cevdet II, 112; Longrigg, 283.

32- Cevdet II, III; SP 97/53, 271a; FR XVII, 1146 (18 October 1777); ANP, B1. 176, 8 March 1778.

عەززاوی، مێژوو، ل ٦٨ ــ ٧١، ئەمینزەکی، مێژووی سلێمانی، ل ٨٧ ــ ٨٨.

مەرگی عەبدوڵلاپاشا بە چەشنک نەخۆشی جومگەخرە و لەپڕپەڕین بڵاو بۆوە. دمەتەقەیەک کە لە سەر چوونە سەر دەسەڵاتی تێکەڵ بە شەڕی شەقامان و راپەڕینی گشتی ڕووی دا، لانیکەم وتووێژەکانی هەتا مانگی مەی ساڵی ۱۷۷۸ وەپاش خست. لەم کاتەدا حەسەنپاشا ـ کە مانگێک پێشتر ئەم دەسەڵاتەی وەرگرتبوو ـ لە کەرکووکەوە هات. هێشتاش سەبارەت بە مەترسی خەنیمەکانی لە ناوچەدا سڵەی دەکرد، بۆیە بە ڕاسپاردەیەک هاواری بردە بەر ئەحمەدپاشای بابان. ئەویش پاش کوێرکردنی محەممەدپاشای زیندانی، خێرایەکی بەرەو بەغدا بزووت. ئەحمەدپاشا لە نیوەی ڕێیەدا مرد و خێڵاتی هەرێمی بابان دیسانیش ئاژاوەیان تێکەوت و بوو بە هەرچیوپەرچی و لێک بڵاو بوون. ساڵی دوایش وڵاتی ئێران بە مردنی وەکیل کەوتە گێژاوی هەرەچمەرەچ[33]: جا بۆیە ئەو شەڕەی کە بە نوێنەرایەتی هەردوولا هەڵدەسووڕا و ئەو پەیمانەی کە دەبووا بەسترابا بنەیان هات.

## ۱۲ ـ ٦ بەسرە لە زەمانی حکوومەتی سادقخاندا

لە ماوەی سێزدە مانگ گەمارۆ و سێ ساڵ داگیرکرانی دواتریدا بەڕاستی بەندەری بەسرە لە لایەن ئیستانبووڵ و بەغداوە لە بیر چووبۆوە. هەروەک هەمیشە دیتراوە حەوڵودەولی جاروبارەی بابیعالی بە مەبەستی دانانی حوکمڕانێکی سەربەخۆ و نەبەستراوە بە والی بەغدا لە بەسرە، دەگەڕایەوە سەر مەیل و داخوازی تایبەت و پتر لاواز کردنی دەسەڵاتی «مەمالیک»ی لەبەرچاو بوو تا گەشەپێدانی قازانجی حکوومەتی عوسمانی. بەغداش بە نۆرەی خۆی سەرەڕای داهاتی بەرچاوی ئەم بەندەرە هێندە لە سنوورەکانی کوردستان دەترسا کە حازر نەبوو هێزی زیاتری بۆ بنێرێ. گرینگترین ئاکامێکی کە لە پێکەوە هەڵسەنگاندنی توێژینەوەی سەرچاوەکانی ئێرانی و عوسمانی وەدەس دێ، ئەمەیە کە ئێرانییەکان بەسرەیان بە ئامانجێکی بایەخدار دادەنا و هۆردووکردنی کوردستان بە لایانەوە تەنیا بیانوویەک بوو، بەڵام لە ڕوانگەی ترکانەوە کوردستان و ئازەربایجان هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە بوون و بەسرە

33- Cevdet II, III, 113; Evers, 51; Longrigg, 184 – 185.

کێشەیەکی لادەستە و کەمبایخ. لە ڕاستیدا کەریمخان لەشکرێکی وای بە دەستەوە نەبوو کە بتوانێ یاریدەی هرووژمی حوکمڕانانی ئازەربایجان و قەفقاز بدا بۆ سەر ئاناتۆلی ڕۆژهەلاتی یان خۆی هێرش بکاتە سەر بەغدا، بەڵکوو بە بۆچوونی ئەو بەسرە بەرەیەک بوو کە کرانەوەی بۆ قەرەبووی تاوانەکانی ئۆمەرپاشا پێویستی دەنواند و بارمتەیەک بوو کە دەیتوانی دوژمنەکەی پێ بچوخسێنێ و لە جێیەکی دیکە قان و پشکی پێبستێنێ.

مەسەلەی وەگەڕخستنی تلاساندنی بیر بۆ سەر سنوورەکانی ئازەربایجان و کوردستان زۆر لەوەی پەیوەندی بە بزووتنی لە ڕادەبەدەری هەستی دانیشتووان و کارکردنە سەر پشتیوانانیانەوە بێ یان بەسترابێتەوە بە هەڵە یا خۆ پێشبینی دروستی پاشا و وەکیل، پەیوەندی بە ڕق و ناخۆشەویستی ئەم دووە بوو سەبارەت بە یەکتر.ئەم ئاڵوگۆڕانەی کە لەم بوارەدا بەدیهاتن دەبێ پاشاوی هەتا سەدەی نۆزدە و سەدەی بیستیش لووزەوی بەستبێ[٣٤]. هەروەک دیترا بەسرە بۆیە بوو بە بارمتەیەکی کەمبایخ چونکە لە لایەکەوە ئاکامی داگیرکرانی پێشووی کوردستان بە دەس عوسمانی و لە لایەکی ترەوە کزی و لەرزۆکی سیاسی قەڵەمڕەوی پاشای بەغدا کاریان تێکردووە. بەسرە بۆیە لە ماوەی دەسبەسەرداگیرانیدا نەبوو بە خەلاتێکی بازرگانی کانی زێڕ، بەڵکوو وەک زۆنگاوێکی لێ بەسەرهات، چونکە کەوتبووە ژێر هۆکاری سرشت و تایبەتمەندی و سایەی سەنگینی قۆناخی داگیرکرانی.

سەرکەوتنی سادقخان و چوونی بۆ بەسرە لە ٢١ی مانگی ئاوریلی ١٧٧٦دا بە لێدانی سکەیەک بە ناوی کەریمخان کە دروشمی تایبەتی شیعان (ساحیبوززەمان)ی پێوە بوو ڕاگەیەندرا[٣٥]. چەند مزگەوتێک تاقکرایەوە بۆ شەڕکەرانی شیعە مەزەب[٣٦]، کەمێک دواتر لە ڕۆژی ١٨ی ژووەندا کاروانێکی

---

٣٤ـ ئاخرین تێکهەڵچوونی بەگەرمەی نێوان ئێران و عوسمانی لە ئازەربایجان و کوردستان لە ١٨٢١ ـ ١٨٢٢ ڕووی دا؛ بڕواننە: سایکس، ل ٣١٦ ـ ٣١٧. چەند ڕووداوێکیش لە ١٩٠٦ ـ ١٩٠٧ لە مەودای شەڕی یەکەمی جیهانیدا قەوما (سایکس، ل ٤١٥).

٣٥ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢٠٦.

٣٦ـ شووشتەری، ل١٤٥؛ بەسری، ل٣٥، باسی سازکردنی مزگەوتێک دەکا لە بەسرە بە دەستی وی. بەلام باسی شوێنەکەی یان ئەوەی لە کام سەرچاوەی وەرگرتووە ناکا.

ئەسیران بە سەرکردایەتی عەلینەقیخانی زەند نێردرایە شیراز. لە ڕیزی ئەم دیلانەدا دەکرێ ناوی سلێمانئاغا، کوڕی شێخدەروێش، سەرۆکی بازرگانانی هەرمەنی و چەند بارمتەیەکی(٤) ماقووڵی تر لە ڕەگەز و ئایینەکانی دیکەی دانیشتووی بەسرە بێنە گۆڕ[٣٧]. سەبارەت بە سزادانی دیلەکان باسی هیچ کوشتن و چزدانێک نەکراوە، بەڵام سادقخان بەڕواڵەت وا دەجووڵایەوە کە بەتوندی پاساو بۆ بانگەشەی ڕووداونووسانی ئێرانی لە بابەت بەڕێوەبردنی ورد و باریکی قەراروبڕی تەسلیمبوونەوە، دێنێتەوە[٣٨].

هێندێک دواتر بۆچوونی بوێرانەتر لە قەڵەمی ئورووپاییەکانی دانیشتووی بەسرەوە هەڵقوڵی. لەگەڵ ئەمەشدا بیانوویەکی زۆریان بۆ سکاڵا بە دەستەوە نەبوو. ڕاستی ئەمەیە کە سادقخان یەکێک لە کاربەدەستانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بە ناوی ڕێزدار «گالی» بەگەرمی وەرگرت و بەپێی داخوازی شێخنەسری[٣٩] بووشێهری شوێنی توجارەتخانەی بریتانیاییەکان کەوتە ژێر چاوەدێری هێزەکانی ئێرانەوە هەتا کەس نەتوانێ پەلاماری بدا و بەرهەڵستی نوێنەری کۆمپانیا بێ. سادقخان لە مانگی مەیدا فەرمانی وەکیلی لە بابەت پاراستن و نیگادێری ماڵ و کاربەدەستانی کۆمپانیاوە پێگەیشت و بەڕێوەی برد[٤٠]. هیچ دوور نیە کە شێوە ئاکار و کرداری سادقخان زیاتر بۆخاتری پەیڕەوکردنی فەرمان و ڕێنوێنییەکانی وەکیل بووبێ. ئەم دەستوەردانە پاش گوێزتنەوەی ئینگلیسییەکان بۆ بووشێهر دەرچووبوون. وەختایەک کە بە سادقخانیان گوت شوێن و بنکەی نوێنەرانی بریتانییەکان بۆ بنەگربوونی وی لەبارە، گوتی: «ئەگەر هەموو دیوارەکانی لە ژێر بێ پێی تێنانێم.»[٤١] ئەو

37- Sestini, 194; MAE Perse VIII, NO . 7; Hovhanyants, 318;

تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢٠٩. شووشتەری دەنووسێ سلێمانئاغا و ژمارەیەک لە بەندییەکان لە سەرڕێیان بە شووشتەرا تێپەڕین؛ ئەو بەختی میربەندەری پێشووی بۆ بوون بە حوکمڕانی بەغدا پێشبینی کرد.

38- FR XVII, 1126; تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢٠٩.

9- Lorimer, 1262; غەففاری، گوڵشەنی مراد: نوێنەری بریتانیا لە ڕیزی دیلەکاندا بوو نێردرایە شیراز. ڕەنگە مەبەستی ڕاپۆرتنووس یان دەلالی کۆمپانیا بووبێ.

40- FR XVII, 112, I, 1125 – 26. AME Perse VIII, NO. 7.

41- FR XVII, 1132 (28 October 1776); Malcolm, 143.

ڕاستییەی نابێ حاشای لێبکرێ ئەمەیە کە حەشیمەتی بەسرە لەبەر گەمارۆی سەخت و دەسکردنەوەی قارەمانانەی خۆیان تووشی هەژاری و نەدارییەکی مەینەتبار ببوونەوە، بەڵام لە وەختی بەدەستەوەدانی شارا پتر لە سێهەزار تۆن برینج لە ماڵی شێخدەرویش پاشقوڵ و حەشار درابوو[42]. کەچی زۆربەی خەڵک لە هەژارەوە بگرە تا دەوڵەمەند کە سادقخان نیازێکی بە بێدەنگ کردن و ڕەزامەندی ئەوان نەبوو لەبەر شوولێهەڵکێشان و غەدری داگیرکەران تووشی ئازارێکی گران هاتبوون.

کەریمخان بڕی ۱۲۵هەزار تمەن جەریمەی بە تەنگە گرتن[43] و ئەمەش بۆ شارێکی کە خۆی لە نێودەرانەی قاتی و قڕی لاترەوەی دەبەست زۆر بێڕوحمانە بوو. ساڵێک پاش گەمارۆش هێشتا بازرگانێتی و کشتوکاڵی ئەو شارە ڕەنگ و برەوی نەبوو. جەریمەکە بە سەر کۆمەڵان و چین و توێژەکانی شارا سەرشکێن کرا. مەسیحی و جووڵەکە دانی نیزیکەی چوارییەکی ئەو برەپووڵەیان کەوتە ئەستۆ؛ مەسیحییەکان بە تەنیایی دەوروبەری هەژدەهەزار تمەن واتە حەوتیەکی تاوانەکەیان دا. زۆربەی ئەم پارەیە لە بازرگانانی ساماندارتر و پارەفرۆشان و ڕێبەرانی ئایینی و نەتەوەیی بەسرە وەرگیرا، ئەوانیش بەنۆرەی خۆیان ئەم دراوەیان بە زۆرەملی لە ژێردەستانیان ئەستاند. یەکێک لە سەربەدەرەوەترینی ئەم گەلەکەسانە کۆچبەرێکی خەڵکی جولفای نوێ بوو بە ناوی «یارویتۆن» کە لە ماوەی گەمارۆدا ناوەندێکی بە مەبەستی دەسگیرۆیی برسی و هەژارانی ئەرمەنی دانابوو[44]. یەکێکی تر هەر لەو قوماشە سەرۆکێکی جوولەکەی پارەفرۆش و دەڵاڵی کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی بوو کە دەورێکی چالاکتری گێڕا و تەنانەت خۆشی بە نیشتمانپەروەر دانا و خۆراکی سەربازگەی دابین کرد و بە میربەندەری ڕاگەیاند کە ئەگەر پێویست بکا بۆ پاراستنی بەسرەی زێد و نیشتمانی جگە لە دابینی نان و خوانی سەربازان تەنانەت ئامادەیە تەواوی مرواریەکانیشی بفرۆشێ[45].

42- FR XVII, 1126.
43- Carmelites, 674; cf. SP 97/52, 85a (125,000 tumans).
44- Hovhanyants, 317 – 318.
45- Sestini, 195.

کوڕی یەکێک لەم دووکەسە وەک بارمتە و دەستەبەرێتی بە مەبەستی هاوکاری نێردرایە شیراز. سەرەڕای ئەم جەریمەیە، ڕێبەرانی کۆمەڵانی ئایینی شار دەبوو بە مەبەستی پاراستنی ئازادی و پلەی خۆیان دیاری بدەن بە سادقخان و ئەفسەرانی. فەلاقە و دارکاری و ئەشکەنجەی سەردەمی گیرانی کورتخایەن و تالان و برۆ هەڕەشەیەکی هەمیشەیی و گشتگیر بوو. هیچکەس نەیدەتوانی لە شار دەرکەوێ، بەڵام ژمارەیەک لە دانیشتووانی مسوڵمانی بەندەر لانیکەم توانیان بە دانی بەرتیل بە نیگابانان لەو تەتەرپێچ کردنەی کە سادقخان بەدیهێنابوو دەرباز بن و قەڵشێک بکەنە ئەم حەسارەوە[٤٦].

بریتانیا بە مەبەستی تێهەڵێنانەوە و قەرەبووی ئاکاری دووڕووانەی خۆی لە ماوەی گەمارۆدا چەند هەنگاوێکی هاویشت و توانی بە کەلکوەرگرتن لە هەلومەرجی لەباری، بۆ دامرکاندنەوەی دڵەڕاوکەی گشتی بێتە مەیدان و لە نێو عەرەبەکانی خۆجێیدا ڕووحی گەشبینی بەدیبێنێ. بە دانی پارە، گەلێک دیلی دەس ئێرانییەکانی لە سەربازگەی بەسرە کڕییەوە و ئازادیان کردن و کاربەدەستانی بەڕێوەبەرایەتی عوسمانیشیان دنە دا کە وەوتۆ بکەن. نێوبژێوانی ئینگلیسییەکان «خواجە یاقووب»ی لە ئەگەری کوژران ڕزگار کرد[٤٧]. وەختایەک کە ناوی ئەو و دەڵاڵەکانی کۆمپانیا لە ڕیزی جەریمەدەراندا وەبەرچاو هات، نوێنەری بریتانیایی لە بەندەر ئیزنی دا کە بریکاری نوێنەرایەتی بە ناوی ئابراهام بچێتە شیراز. ئابراهام ناچار بوو کە لە شیراز برە پارەیەک وەک دیاری کۆمپانیا بداتە خزمەت وەکیل. ئاخرییەکەی گرتیان و بەرلەوەی سەرەنجام لە نێوەڕاست مانگی جوولای ئازاد بکرێ بە بڕوبیانووی چەشناوچەشن لاڕێ دەرۆیشتن و دەیانگوت وەختایەک کە گوتراوە بریتانیاییەکان لە بەسرە پارێزراون و کەس نابێ دەستیان بکاتێ، نابێ مەسەلەکە لە چوارچێوەی خۆی بترازێ و ترک و جوولەکە و ئەرمەنییەکان ڕەگەڵ بخرێن. لەم سەردەمەدا بەناچار قەرەبووی خەساریان وەرگرت و بەرپرسایەتی گەڵاڵەی کۆکردنەوەی پارە خرایە ئەستۆی شێخدەرویشی هەلپەرەست کە لە هەموو دیزان ئەسکۆی بوو. خەڵک ناچار کران کە کەلوپەل و

46- MAE Perse VIII, NO . 7; FR XVII, 1132, 1137.
47- Sestini, 195 – 198.

پێداویستییەکانی نێوماڵ و خاوخێزانیان لە قەراخ شەقامان هەڕاج کەن و زۆریان لەبەر تەوژمی پتری هەژاری و دەسبەتاڵی خۆیان کوشت[48].

ئەم کردارە بوو بە پێودانی بەکردەوەی هێرشبەران لە خاک هەرێمە داگیرکراوەکاندا. بەڕاستی سادقخان لە بەسرە ڕەوت و ڕێبازێکی توند و تیژی وەبەر خۆی دابوو کە بەرەو تەنینەوەی زیاتر دەچوو. وێڕای ئەمەش لەچاو توندڕەوی و دڵڕەقی و ئاکاری نالەباری نادرشا و ئاغامحەممەدخان لە زۆربەی شارەکانی خودی ئێراندا هەڵوێست و جووڵانەوەی وی بە مناسب و میانەڕەوانە داندراوە.

بەڵام تەنیا لە کۆتایی ساڵا کە سادقخان لە بەسرەوە چۆوە شیراز و عەلیمحەممەدخانی زەند کرایە حوکمڕانی شار و پارێزگای بەسرە، کاری بەڕێوەبەرایەتی و ژێرچەپۆکە کردنی شار لە لایەن ئێرانییەکانەوە بەرەو گەندەڵی و نزمی فرێ (تەواوی سەرچاوەکانی مێژوویی لەم بارەوە هاودەنگن)[49]. شار گیرۆدەی پاشاگەردانییەکی گران و چاوچنۆکی و تێرەنەخۆری و کوشتارێکی بێڕوحمانە بووە. ئەم دۆزە بۆ تراژێدی خودی ئێران بە مردنی ئەمرۆ و سبەی وەکیل سەردەقێکی لەبار بوو.

## ١٢ ـ ٧ بەسرە لە ڕۆژگاری حکوومەتی عەلیمحەممەدخاندا

عەلیمحەممەدخانی زەندی ناودێر بە «شێرکوژ»، کوڕەگەورەی محەممەدخانی بێکەللە بوو. محەممەدخان یەکێک بوو لە تواناترین و بەقەوەترین سەردارانی وەکیل کە لە شەڕی قومشەدا(٥) بە دەست شەڕکەرانی قاجار گیرا و پاشان لە مازەندەران گۆڕەهوو کرا. عەلیمحەممەدخانیش هەروەک باوکی پیاوێکی ئازا و بوێر و بێباک بوو، بەڵام لە هێندێک مەبەستاندا سەرنجی نەدەدایە چاکە و خراپەی کاران و هیچ بۆچوونێکی تایبەتی نەبوو. یەکێک لە بەرچاوترین کارەکانی هاوکاری بوو لەگەڵ شۆرشی زەکیخان لە پازدەساڵ

48- FR XVII, 1125, 1126, 1132; MAE Perse VIII, NO. 7.

٤٩ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢٠٩؛ گوڵشەنی مراد، ل ٢٠٠.

لێرموبەردا[٥٠]. لە هاوینی ساڵی ١٧٧٥دا کە بۆ یارمەتیدان و پشتیوانێتی هێزەکانی سادقخان گەیشتە دەوروبەری بەسرە، چوار براکانیشی لەگەڵ بوون. دانانی بە حوکمڕانی بەسرە پاش گەڕانەوەی سادقخان بێگومان نیشانەی تەنینەوەی لە ڕادەبەدەری کرووووسینە و تالان و نەپاراستنی مەرجەکانی پەیمانی بەدەستەوەدانی شار بوو.

لە ژانوییەی ساڵی ١٧٧٧دا پیاوەکانی عەلیمحەممەدخان خواجەیاقووبیان دەردەس کرد و کوتایان هەتا ناچار بێ شەشهەزار تمەن وەک تاوانانە بدا. شیکار و ڕاپۆرتنووسی کۆمپانیا هەواڵی گفتوگۆ لەگەڵ عەلیمحەممەدخان و دەربڕینی نارەزامەندی سەبارەت بەم بارودۆخە وەدرۆ دەخاتەوە و دەنووسێ «لاتووشە» و کارگێڕانی نامەیەکیان بۆ کەریمخان نووسی، لە شوێنی کۆمپانیا سەنگەریان دابەست و خۆیان لە دیداری داگیرکەران بۆ وێنە وتوویژی بەهەڵکەوتی دۆستانە لەگەڵ عەلیمحەممەدخان پاراست. لە مانگی مارسا وڵامی نامەکە لە لایەن کەریمخانەوە هاتەوە. میری زەند لە نامەکەدا چەند فەرمانێکی سەبارەت بە شێوەی جووڵانەوەی عەلیمحەممەدخان لەتەک کۆمپانیا و کارگێڕانیدا دەرکردبوو[٥١].

زۆر دوورە کە دەستوورەکانی کەریمخان چکۆلەترین شوێنی کردبێتە سەر دەس پاراستن لە ئازار و ئەشکەنجەی خواجەیاقوب و سەدانکەسی وەک وی. بێشک جوولەکە لە بەسرە لە مەسیحییان ـ بەتایبەت ئەرمەنییەکان ـ کەمتر بوون، بەڵام لەچاو وان، یەکجار دەوڵەمەندتر و زۆربەی سامانی شاریان بە دەستەوە بوو. کەچی وێناچێ کە بەم بۆنەوە پتر لە کەمینەی مەسیحی یان

٥٠ـ جگە لەمە، نازناوەکەی لەبەر کردەوەیەک درابوویە کە ڕۆستەمولحوکەما لە لاپەڕە ٣٥٥ ـ ٣٥٦دا گێڕاویەتەوە: وەختایەک کە نێردرابوویە مازەندەران ملی نابوو لە ئاکاری دزێو و وەکیل سزای دا و لە کۆشکی خۆیا خستییە پاڵ شێرێک. هەڵبەت تەنیا باڵاپۆشێکی پێوەبوو و خەنجەرێک بە بەرەوە. عەلیمحەممەدخان وەک دڕندەیەکی کێوی پەلاماری شێرەی دا و باڵاپۆشەکەی لە دەستی چەپی هاڵاند و ڕەزگ زاری شێرەی نا و پاشان لە نێو سەرسوڕمان و ئافەریمی وەکیلا بە خەنجەران کوشتی.

51- FR XVII, 1137; Lorimer, 1264.

ترک و عەرەبەکانی سوننی کەوتبنە بەر شەپۆلی مەترسی[٥٢].

عەلیمحەممەدخان و سەرپەل و سەرلکانی سپاکەی سەرەڕای چاوچنۆکی سەبارەت بە کۆکردنەوەی پووڵ و ماڵ بە ڕفاندنی کیژان و تەنانەت ژنانی بەمێرد لە ماڵان خۆیان خاو دەکردەوە. خانی زەند ژنانی مەسیحی لە شووەکانیان دەستاند و شەوانە لە حەرەمخانەی خۆی گلی دەدانەوە و سبەینێ بەرەڵلای دەکردن؛ ڕۆژی حەڤدەی فێورییە پیاوەکانی ڕاماڵیان بردە ماڵی هەواڵدەری کۆمپانیا و ژنخوشکی حەڤدەساڵەیان ڕفراند[٥٣]. کچی یەکێک لە پزیشکانی ڕێزداری عەرەبی بۆ ماوەی سێڕۆژان لای خۆی ڕاگرت و پاشان وەدەری نا، باوکی کە چاوەڕێی کچە مابۆوە، چونکە لە بەرامبەر ئەم بێناموسییەدا تابشتی نەدێنا، تەمای گرت کیژە بکوژێ، بەلام هەست و سۆزی باوکانە بەری پێگرت و مێردێکی بۆ دیتەوە. عەلیمحەممەدخان کە بە مەسەلەی زەماوەندەکەی زانی ڕۆژێکی مەست و تووڕە ناردی بە دوای باوکی کچە و مێردە بە خێزانەوە و پرسی کە چۆنیان وێراوە کەسێکی تایبەت بە کۆڕی بەزمی ئەو بە شوو بدەن و بیخوازن. هەر ئەو دەم دەستووری دا سەری هەرتک پیاوەکەیان بڕی و فەرمانی دا بە ژنەی بێئەنوا کە مەسینە هەلگرێ و خوێنی کوژراوەکان کە بە سەر دەستی جەللاد هەلپڕژابوو بشواتەوە. «کاپێر» داستانی کارەساتەکە بەم ڕستەیە کۆتایی پێدێنێ «گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە زۆر شوورەیی و دلتەزێنە.»[٥٤]

دێوەزمەیەکی ئاوا بۆ بەڕێوەبردنی شارێک کە ڕێژەی جەماوەری ـ بە تەنینەوەی هەلپەی تاعوون و گەمارۆ و مەینەتەکانی ڕۆژگاری داگیرکردنی ـ شتێک بوو لە نێوان بیست تا سی هەزار کەس و ساڵەودوا گەیشتەوە پەنجاهەزار کەس، لەگەڵ سەربازگەیەکی ٧٥٠٠کەسیدا، مایەوە و سینگی داکوتا[٥٥]. سەرداری زەند نە تەنیا هەر شاری وشک و قاقڕی چەوساندەوە، بەلکوو ڕاماڵی بردە سەر

---

٥٢ـ بڕوانە: Levi، ل ٤٨٤. ئەو بەپێچەوانەی بۆدەچێ و دەلێ تەنیا چوونی سادقخان بۆ بەسرە جووی لە قەلتوبڕ ڕزگار کرد؛ وێدەچێ ئەم کۆمەلە لە سەردەمی دەسەلاتی عەلیمحەممەدخانا پتر مەترسییان لە سەر بووبێ.

53- Carmelites, 674; Capper, 222; FR XVII, 118a.

54- Capper, 222 – 223.

55- Capper, 222, 228; Sestini, 169, 195; Evers, 3.

ناوچە دوورەدەستەکانیش. ئەو گوندنشین و هۆز و تایفانەی کە زۆر چارەڕەش بوون دەکەوتنە بەر گوڕمی شالاوەکانی و ئەگەر نەشکوژرابان بێگومان ماڵیان بە تالان دەچوو. پتر لە هەمووان عەرەبەکانی مونتەفیق کە پاش مردنی شێخعەبدوڵلا لە ساڵی ڕابردوودا شێخسامیر(٦) سەرۆکایەتی دەکردن وەبەر ئەم پەلامارانە دەهاتن. ئەم عەرەبانەش زیاتر لە سایەسەری پاشماوەی بازرگانێتی بەسرە بەڕێدەچوون، بۆیە بە باری پاراستنی هێوری و ئارامی کەنداوا بە یارمەتی هێزە داگیرکەرەکان تووشی چەرمەسەرییەکی زیاتر دەبوون[56]. ئەوان تەنانەت بە پاڕانەوە داوایان لە سەرداری زەند کرد تا بەئاشکرا سوێندیان بۆ بخورێ کە ئەگەر هاتنە شار کەس دەستیان ناکاتێیە و بە ڕووی خۆشەوە بەرەوڕوویان دەبنەوە. ئەگەرچی ئەم داخوازەیان قبووڵ کرا، بەلام هەر لەڕێوە دووبارە کەوتنەوە ڕاووڕووتی حەشیمەت و ماڵ و سامانیان. عەرەبی مونتەفیق کە لەم پەیمانشکێنییانە وەگیان هاتبوون بەنداوەکانیان شکاند و سێلاویان بەردایە دەرودەشتان و هەرکام کەوتنە بۆسەنانەوە بۆ تاقمێک لە پەلامادەرانی ئێرانی و لێیان وەدەس هاتن و ئاخرییەکەشی لە ساڵی ١٧٧٨دا کوشتەیەکی بەرچاویان خستە سەر دەستی[57]. بە تۆڵەی هەڵمەت و چالاکی عەرەبان عەلیمحەممەدخانیش لە یەکەمی مانگی ژووئییەدا ناوچەی سنووری «ئەلزوبەیر»ی لە سێ فرسەخی بەسرە تالان کرد. «کارمایکێل» دەیان ساڵ بەر لەم ڕووداوە ئەم شوێنە وەک جێیەکی زۆر پیس و ناخۆشی حەوتهەزار کەسی ناو دێنێ. وەختایەک شارەکەیان تالان کرد فەرمانی ئاورتێبەردانی دا و گوتی هەرکەس خۆ بداتە کووژانەوەی دەکوژرێ. پیاوانی زوبەیر قەلاچۆ کران و ژن و منداڵیان بە دیل گیران، بەلام ماوەیەک دواتر کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی بە بڕەپارەیەک ئەسیرەکانی کڕییەوە و ئازاد کران[58].

عەلیمحەممەدخان لێبڕابوو کە بە تەواوی هێزەوە پەلاماری تایفەی مونتەفیق بدا و خاشەیان بکێشێ. لە بەسرە دەرکەوت و عەلیهیممەتخانی

56- SP 97/53, 85a.

٥٧ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢١٢؛ گولشەنی مراد، ل ٢١٢؛
FR XVII, 1175; SP 97/54, 253.

58- Carmelites, 53; Capper, 224; SP 97/54, 253, 271.

براچکۆڵـــەی وەک جڵەوکێشـــی ســـەربازگەی دووهەزارکەســـی لەگـــەڵ محەممەدحوسێنخانی بێهبەهانی بەجێهێشت و بـە سـەرۆکایەتی شـەشهـەزار سـواره و ژمارەیـــەک پیـــادە ڕووی کـــردە بـــاکوور. بـــەگوێرەی گێڕانـــەوەی ڕووداونووسانی ئێرانی، عەرەبی مونتەفیق کـە لـە کـردەی خۆیـان پەشـیمان ببوونەوە، حازر بوون باجوخـەراج بـدەن و دڵـی عـەلیمحەممـەدخان بـەجێ بێننەوە، کەچی ناوبراو نەیسەلماند. بەڵام ئەوەی زیاتر وەڕاستی دەچێ ئەمەیە کە سەرۆکانی تووڕەی تایفەکان تێگەیبوون کە بێجگە لە هەڵبژاردنی ڕێچـارەی شەڕێکی یەکلاکەرەوە هیچ ڕێگایەکی دیکـە نـەماوە و گەلاڵـەی تێکهەڵـچوون و لێکدانی خۆیان لە سەر بنەمای ئەم تەمایە دارشت.

سەرەتا هێزەکانی پێشەنگی عەرەب سپای ئێرانیان هەتا پـازدە مـایلی بەسرە کشاندەوە. تەواوی چەکدارەکانیان بە سـەرکردایەتی شـێخسـامیر لـەم ناوچەیە کۆببوونەوە و لە مەیدانی شەڕی هەڵبژێراودا چاوەڕوان ڕاوەستابوون. ڕۆژی ١١ی سێپتامبر سەرداری زەند فەرمانی دا بە پیاوەکانی کە بە سواری ئـەو لۆتکانەی بۆ ئەم مەبەستە سازی کردبوون لە ڕووبار وەپەڕن.

هەڵخەڵەتانی هێزەکانی ئێرانی لێرە دابوو، چونکە هەردک جەمسـەری ئەو پردەی کە ئەوان پێیا دادەڕۆیین کەوتبووە پـێچ و گـەوەی ڕووبـار و قۆڵـی سێهەم دەکشایە زۆنگاوێک و شێخسامیر لە بەرەی چوارەم مەتـەرێزی گرتبـوو: وەختایەک کە هێزەکانی ئێرانی هرووژمیان هێنا بـە سـەر زۆنگـاودا کـەوتن و عەرەب بەری ئاوی پشتەسەریان لێگرتن. لـەم وەختـەدا کـە ئەسـپی سـوارانی ئێرانی بە تێماوی لە قوڕ و زەلـەق چەقیبوون عەرەب پەلاماریان دان و کوشتیانن یا بە دیلیان گرتن. تەنیا ژمارەیەکی کەمی ئێرانی توانییان بـە سـواری لۆتکـان ڕابکەن.

عەلیمحەممەدخان ئەستۆی وەبەر زەبری شمشیری قولەپیاوێک هات و گلی و چەند سەعات دواتر مرد. مەهدیخانی براشی تێداچوو. عەرەبی مونتـەفیق تەنیا چەند کەسێکیان لێکوژرا. کوشتارەکە ئەوەندە سامناک بوو کە بـەگوێرەی هێندێک سەرچاوە، هێزەکانی زەند تەنیا سـێ کەسـیان دەرچـوون و گەڕانـەوە بەسرە. چەند حەوتووی پێچوو هەتا مەیـدانی شـەڕ کـەلاکی لـێ کۆکرایـەوە و تەنانەت شوێنەواری ئێسکوپرووسکی کوژراوەکان تا سالانێکی درێژی تـر هـەر

لەوێ مانەوە[٥٩].

## ١٢ ـ ٨ تێکەوەپێچانی دەسەڵات

پاش ئەم رووداوە عەرەبی مونتەفیق بەسرەیان گەمارۆ دا، چەند تۆن خورمایان دزی و بە تاڵانیان برد[٦٠]. پاشان هەر بەوەندە سەرکەوتن و راووروووتەوە وێستان و ئەم هەلە زێرینەیان بۆ دەرپەڕاندنی پاشماوەی هێزەکانی ئێرانی لە کیس خۆیان دا. بەراستی ئەگەر ئەم عەرەبانە لە کاتی پەڕینەوەی سادقخان لە رووبار ئاوا بە شۆر و شەوقەوە جووڵابانەوە و لە «شوعەیب» شەڕیان کردبایە هەر لە قۆناخی یەکەمدا هێزەکانی سادقخان قەت پێیان نەدەگەیشتە بەسرە. بەڵام ئەو دەمی هەر بە دووی قازانجەوە بوون، کەچی ئەمجارەیان بە شوێن ئازادی و سەربەستی و پاراستنی تایفەی خۆیانەوە هەڵدەسووڕان. محەممەدحوسێنخان و عەلیهیممەتخان لەرێوە چەند قاسیدێکیان ناردە شیراز و چاوەڕوان مانەوە. سادقخان خێرایەکی بە چوارهەزار سوارەوە گەڕایەوە. ناوبراو لە ٢٤ی دێسامبر دابەزیبوو بۆ گوشار خستنە سەر شێخسامیر بە مەبەستی بەستنی پەیمان و سەرویهێنانێکی شەرافەتمەندانە دەرگای وتوویژەکانی کردەوە. بەڵام سەرکەوتنی گەرماوگەرم و پرسی ئازادی ئەوان شتێک نەبوو وا بە هاسانی دەستی لێبەربدرێ و لەبەر دەربڕینی نارەزامەندی سەبارەت بە چەند بابەتێک دەربارەی مەزەبی شیعە کە لە لایەن سادقخانەوە خرابوونە روو، پێشنیارەکانیان بردەوە پاش[٦١].

لەم زەمانەدا مەڵبەندەکانی گەڕانگەری بەسرە لە دەس زەندیە

٥٩ـ تاریخی گیتی گوشای زەندیە، ل ٢١٢ - ٢١٣؛ گوڵشەنی مراد، ل ٢١٣؛ Cevdet II, 114; Azzawi, Tarikh, 84 – 97; al – Basri, 36 – 41; Capper, 225; Evers, 8 – 11; Carmelits, 674; Sp 97/55, 18b, 29; FR XVII, 1161; Longrigg, 193; Evers شوێنی شەڕەکە بە ئەرجییە و نیبوور بە «ئەرجە»ی پەنا فورات و رۆژاوای کووت دادەنێن کە وادیارە زۆر لە بەسرەوە دوورە. کاپێر باسی شوێنێکی گومناو دەکا لە ١٥مایلی بەسرە کە زۆر راستر دەنوێنێ.

60- SP 97/55, 29.

٦١ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢١٤ ـ ٢١٥؛ گوڵشەنی مراد، ل ٢١٣؛ لانگریگ، ل ١٩٤؛ نەشئەت، ل ٤٦٠ ـ ٤٦١.

دەرچووبوون و خودی شار بە شێوەیەکی ئاوا نزم، بە دژواری بایەخی ڕاگـرتنی نەبوو. ئەوەی لە چنگ تاعوون و گەمارۆ و پێخوستی سادقخان خەلەستبوو بـە دەس عـەلیمحەممـەدخان بـەربا درا. چاوخشـاندنێک بـە نووسـینی کـاپێردا چۆنیـەتی چـوونی سـادقخـان بـۆ بەسـرە باشـتر نیشـان دەدا و دەڵـێ: «شەنگەسوارێک بوو لە پێش سپای دەستەبژێر و ڕازاوەیدا» هەر ئەو نووسـەرە لە جێیەکی دیکەدا مەبەستێکی ئەوتۆش دەدرکێنێ: «شەقامە سەرەکییەکانی شار ببوونە گۆڕستان، مابەینی دوو قەبران بە زەحمەت هەنگاوێک دەبـوو.[٦٢]» تـەنیا ساڵێک دواتر «سیستینی» ئاوای نووسی: «شاری بەسـرە تـەواو وەک وێرانـەی لێهـاتبوو، ئێرانییـەکان هـیچ دەسـتیان لـە خـاپوورکرانی نەپاراسـت.» درێژەکێشانی ماوەی گەمارۆ و دابەزینی ڕێژەی جەماوەری بازرگانێتی ئەوێی لە ماوەی ژیانی چەندین وەچەی داهاتوودا خاشەبڕ کرد. سیستینی وەبیر دێنێتەوە کە وەختایەک گەمارۆ و داگیرکرانی شار زۆری پێوەچوو ئیتر مرواری بۆ ناردنـە دەرەوە نەدەهاتە وێندەرێ. (مرواریێ کاڵای ناردنەدەرەوەی تایبەتی بەسرە بـوو کە لانیکەم لەمەودوا بەرێ دەکرا بۆ مەسقەت.) درێژەی ئەم بارودۆخە وای کرد کە ئیدی لە «حەلەب»ەوە قافڵەیەک نەیا. ئەو کاروانە گەورانەی کە هەموو ساڵـێک بۆ چوونە بازارەکانی حەلەب و دەمیشق لە زوبەیر کۆدەبوونـەوە و کاڵاکانیـان لانیکەم بایی شەشهەزار تمەن دەبوو، ئێستا تەنیا دەگەیشتە دووهەزار تمەن[٦٣]. بەسرە تا دەساڵی دیکەش هەروا بە نیمچـەخاپووری مایـەوە و زوبـەیر هـەروا بیابان بوو[٦٤].

نرخی گوومرگانە لە ماوەی داگیرکرانی شار بـە دەس ئێرانییـەکان لـە پێشوو پتر هەڵنەکشا، بەڵام بڕانەوەی نرخی لە سەداسێی گوومرگانە کە ترکـان پێشتر خستبوویانە سەر کووتاڵی پەشمی هاوردە و کەریمخان بەڵێنی هەڵگرتنی دابوو، بەڵام نـەکرابوو، کۆمپانیـای هینـدی ڕۆژهـەڵاتی دڵسـارد کردبـۆوە[٦٥]. کۆبوونەوەی بەڕێوەبەرانی کۆمپانیـا بـە شـێوەیەکی شـێلگیر و پتـەو کەوتـە

62- Capper, 228.
63- Sestini, 192, 198 – 200.
64- AbdulQadir, 60/51.
65- FR XVII, 1143.

پێداچوونــەوەی هــەلومــەرجی خــۆ کۆکردنــەوەی داموودەزگــای لــە بەســرە و سەرلەنوێ ئەوێی لە ناوەندی سەرەکیڕا کردەوە نوێنەرایەتی.

بازرگانانی تریش لەمەودوا سەرنجی خۆیان خستە سەر بەنــدەرەکانی دیکەی کەنداو بەتایبەت کووەیت و ڕەنگە گەشەی ئەم شوێنە هەر لێرەوە دەستی پێکردبێ. بەر لە گەمارۆی بەسرە قەرین(٧) کە پاشان بە کووەیــت نــاودێر کــرا، لانیکەم لە چاوی حوکمڕانانی عوسمــانیڕا بــە ناوچەیــەکی ســەر بــە بەســرە دادەندرا. بە تێداچوونی باری سیاســی و بازرگــانی بەســرەی گەورەدراوســێی و کۆچی بازرگانانی کەنداو و ڕاگوێزتنی بنکە و ناوەندی پۆستەی بریتانییەکان لە بەسرە و زوبەیرەوە بۆ ئەو ناوچەیە و هاوهــەنگاو بــوونی گەشــە و هەولــدانی خانەدانی ئالیسەباح لەگەڵ ئەم ڕەوتــە، بــوو بــە هۆکــاری دەولــەمەندبوونی یەکجارزۆری ئەم شێخنشینە[٦٦].

بێگومان سادقخان لێی حالی ببوو کە بەسرە بە باری نەغدینەدا ئیتــر هیچی پێنەماوە و شیلەی دادۆشراوە و ئێستا ڕاگرتنی هەر سەرێشــەیە و لەگــەڵ هەڵپەسێرانی وتووێژەکانی بەغدای شێواوی هەڕەمــەی دەســتەبەندی، بــوونی وەها شارێک وەک ناوەندێک بۆ ساتوسەودای سیاسی بێفایدەیــە. بــەگوێرەی هێندێک سەرچاوە خۆشی بۆ مانەوە لەم بەندەرە وەڕەز ببوو و ڕەنگە مەیلی لــێ بووبێ کە ئەم شارە بدرێتەوە بە ترکان[٦٧]. هەروەها دەیزانی بێتوو وەکیل بمــرێ بارودۆخ لە شیراز بەرەو ئالۆزکاوی داژوێ، بۆیە هیچ ئۆگر نەبوو بە بەســرە و چارەنووسی داهاتووی. ڕەنگە زیاتر لە هەر بەلــگە و بۆنەیــەکی تــر ئیشــتیای سازکردنی قەڵایەک لە ڕۆخی چەپی یەکاویعارەبان لە سەرەتای ساڵی ١٧٧٩دا، هەر بۆ شاردنەوەی مەبەستی گەڕانەوەی بووبێ.

لە سێزدەی مــانگی مارســا کــە هەواڵــی مــردنی وەکیلــی پێگەیشــت، بەڕێوەبردنی شاری دایە دەس شــێخدەروێــش و مــیرزای میربەنــدەر بــە نــاوی مەلائەحمەد و شەش ڕۆژ دواتر لەگەڵ هەموو چەکدارەکانی گەڕایەوە شیراز. هەر ماوەیەک پاش ڕۆیشتنی، شێخ سامیر بەسرەی داگیر کــرد. لــە ســەر داخــوازی حوکمڕانی بەغدا تاقمێک لەشکری لەگەڵ میربەندەرێک بە ناوی نەعمانئەفەندی

66- cf . Lorimer, 145 – 147, 1002; Wilson, 184.
67- SP 97/55, 81.

بە مەبەستی ژیاندنەوەی دەسەلاتی عوسمانی چوونە بەسرە[٦٨]. پاشا (حوکمڕان) پەیامێکی ڕاستەوخۆی بۆ شیراز نارد. لەم ڕۆژانەدا میربەندەری پێشوو (سلێمانپاشا) کە لە زیندانی زەندیە لە شیراز ئازاد کرابوو[٦٩] بەرەو بەسرە کشا. جەماوەری پرشۆری شار و عەرەبی خەزاعیل «نەعمان»یان شاربەدەر کرد و ئەویش پەنای بردە بەر شێخسامیر. سلێمانپاشا سەرلەنوێ چووە سەر دەسەلاتی خۆی. لە ٢٠ی نوامبردا بەپێی حوکمی بابیعالی کرایە «پاشالیک»ی بەغدای بێحوکمڕان[٧٠]. پاش پەنجاسال جارێکی تر مێژوو هەر بەو ناوە تایبەتانەوە دووپات بۆوە.

## ١٢ ـ ٩ مردنی کەریمخان

لە سەرەتای ساڵی ١٧٧٦دا دەنگۆی مەرگی وەکیل سەرەڕای حاشای ئەوانەی بە چاوی خۆیان دەیاندی، لە هەموو شوێنێک بڵاو ببۆوە[٧١]. ڕەنگە هاوکات بوونی ڕێکەوتی گەڕانەوەی سادقخان لە بەسرە و نەزەرعەلیخان لە کوردستان ڕەنگدانەوەی چاوەڕوانکراوی کێشەی پتەوکردنی جێنشینی ڕەسمی یان ناڕەسمی وەکیل بێ ئەگەر هاتوو شتێکی وا قەومابێ. لە ساڵی ١٧٧٧ یان ١٧٧٨دا مردنی کەریمخانی بووربوور کە یەکێک بوو لە سەردارانی هاوناوی وەکیل دەنگۆکەی پتر گەشاندەوە و بوو بە هۆی هەڵایسانی ئاگری ئاژاوە و ئاڵۆزبڵۆزی لە نێو لوڕ و بەختیارییەکان، ئەرمەنی و گورجییانی دانیشتووی ڕۆژاوای ئیسفەهان تاڵان کران و تەنانەت چەند نائارامی و ڕاپەڕینێک لە جولفاش وەبەرچاو هات. پاش مانگێک کە دەرکەوت کەریمخان هێشتا زیندووە سەرلەنوێ وڵات هێور بۆوە[٧٢]. هەر چۆنێک بێ لە ساڵی ١٧٧٨دا نیشانەی ئەو

---

68- Ibid, 99; Longrigg, 193; Lorimer, 1264.

69- Gmelin II, 483 – 484.

70- al – Basri, 82 – 83; SP 97/55, 259a.

71- SP 97/53, 95a.

72- Hovhanyants, 318 – 319. وەک کەریمخانی بووربوور لە ل ٣٦ی گوڵشەنی مرادا، یەکێک لە ئەفسەرانی محەممەدحەسەنخان لە کاتی گەمارۆی شیراز ناسێندراوە.

نەخۆشییەی کە لـەمێژ بـوو پێیـەوە دەناڵانـد و ڕەنگـە ئازارەباریکـە بووبـێ دەرکەوت[٧٣] و خێرایەکی پێوەچوو؛ ئەگەرچی هێشتاش چالاکانـە هەڵدەسـووڕا و بۆخۆی بە کاروباری پارێزگاکان ڕادەگەیشت، مسۆگەر بـوو کـە پیـاوێکی بـەو تەمەنی حەفتا ساڵەوە چی تر بەرگە ناگرێ. لە پایتەختیش چەشنی پارێزگاکان سەرپێتەی هەڵگیرسانی شەڕی نێوخۆیی خۆش کرابوو.

واوێدەچێ کە وەکیل سەبارەت بـە جێنشـینی خـۆی تـەدارەکی ڕوون و ئاشکرای نەدیتبێ. ئەبولفەتحخانی کوڕەگەورەی ئەگەرچی ٢٥ساڵی تەمەن بوو، بەڵام نیشانی دابوو کە هیچ کارێکی لەبەر ڕاناپەڕێ و بێجگە لە شەرابخۆری چی دیکەی لە دەس نایە؛ کوڕەی نێونجی ٢٠ساڵەشی وەک کاکی یـەکێکی بـێمێشـک بوو و «محەممەدئیبراهیم»ی کوڕەچکۆلەی هێشتا مناڵێکی یازدە سـاڵانە بـوو[٧٤]. ڕەوتی ڕووداوەکـان لـە زەمـانی مـەرگی وەکـیلا وایـان دەنوانـد کـە ڕەنگـە ئەبولفەتحخانی بۆ جێنشینی خۆی وەبەرچاو گرتبێ، بەڵام لە سەردەمی ژیانی کەریمخانا لەبەر نەبوونی بەڵگە و پێشینەیەکی ئاشکرا کێشـەی جێنشـینایەتی وی ئاڵۆزتر ببوو. شاسمایلی سێهەمی پاشای بەڕواڵـەتی سـەفەوی لـە ساڵـی ١١٨٧ی کۆچی /١٧٧٣ی زایینیدا مرد. هەر کەسیش باسی مردنەکـەی نـەکرد[٧٥]. وا وێدەچێ کە چۆڵ بوونی تەختی پاشایەتی و نەمانی شاسمایل هیچ تەکولۆ یان تەنگەژەیەکی بۆ دەزگا و دەسەڵاتی کەریمخـان سـازنەکردبێ و نـەبوونی شـای ناوبراو دەریخست کە بـوون و نـەبوونی لـەو سـەردەمیدا وەک یەکـە. کـەچی

٧٣ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢١٤؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢١٦. زۆرینەی سەرچاوەکان باسـی چەشـنێک نەخۆشـی «هەناسـەبڕکە» دەکـەن؛ غـەففاری ئـەم نەخۆشـییە بـە ئازارەباریکە و کەڵانتەر بە دووشاخە و ئەوانی تر بە چەشنێک جومگەخڕەی دادەنـێن و هەموویان لێک جیاوازن. هادی هیدایەتی لە مێژووی زەندیە، ل ١٥٥ ـ ١٥٦دا دەنووسێ، تەمەنی ڕاستەقینەی وەکیل دیار نیە کە چەند بـووە. بـەگوێرەی نووسـینی پزیشـکی کرێملی، کەریمخان لە ساڵـی ١٧٧٦دا ٦٨ ساڵـێکی تەمـەن بـووە.SP 97/53a Butkov (بەرگی٢، ل ٧٠ ـ ٧١) بە هەشتا ساڵەی داناوە.

٧٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢١٦؛ گوڵشەنی مراد، ٢٢٠؛ مێلکۆم، ل ١٥٣.

٧٥ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٧٤؛ فەسایی، بـەرگی یەکـەم، ل ٢١٩. سـەبارەت بـە نازنـاوی کەریمخان بڕواننە: ١٣ ـ ١٥.

تێئۆری بێبناغەی درێژەی پاشایەتی سەفەوی ئەم بارودۆخەی بەدیهێنابوو و نەیدەهێشت کە کەریمخان بکەوێتە هەڵومەرجێکی چەشنی نادر و دوور لە واتای دەسبەسەراگرتنی تەختی پاشایەتی جێنشینێک بۆخۆی دیاری بکا. ڕەنگە لای خۆی بە گەشبینی وای دانابێ کە سەرکردایەتی خانەدانی زەند چەشنی ئەو هەڵەی بۆخۆی ڕەخسابوو لەبەر چەند هۆکارێکی چەشناوچەشنی وەک گەورەتربوون و لێوەشاوەیی بەرەو سادقخانی برای یان زەکیخانی زڕبرا و ئامۆزای وەرسووڕێ. بەلام قەومانی کوشتوکوشتاری کارەساتبار و لێکهەڵوەشانی زنجیرەی خانەدانی زەندیە و ڕووداوەکانی دوای مەرگی خۆی پێشبینی نەدەکرد.

ڕۆژێکیان کە لە کۆشکی پاشایەتی لێی سواری ئەسپ ببوو دەگێڕەوە هات و بوورایەوە و گلی. ئەبولفەتحخانی کوڕی خێرایەکی غاری دایە و هاتە سەری و بردییەوە ژوور و سەر جێوبانی. تەواوی ئەو هەولانەی کە بە مەبەستی ڕزگارکردنی گیانی درا چوونەوە پاش و لە شەوی سێزدەی سەفەری ١١٩٣ی کۆچی / ١٧٧٩ی زایینی چاوی لێکنا و مالاوایی لە دنیا کرد[٧٦].

ماوەی سێ ڕۆژان تەرمی بێگیانی لە گۆڕێ مایەوە و نەنێژرا. لە ماوەی ئەم سێ ڕۆژەدا بنەماڵەکەی دەمیان تێکنا و کەوتنە پەلامار و کوشتاری یەکتر و وەکیلیان لە باغێکی پەنا کۆشکی پاشایەتی ناشت[٧٧]. ڕەنگە ئەم جێیە کەوتبێتە «باغی نەزەر» لە حەوشەی قەسری «هەشتبەر» ناسراو بە «کلاوفەڕەنگی» کە ئێستا «مووزە»ی «پارس»ی تێدایە. شوێنەواری گۆڕێک کە وێدەچێ ئی وەکیل بێ لە ساڵی ١٩٣٨دا لێرە دۆزرایەوە[٧٨]. لەم کاتوساتەدا پاش ئەوەی کەریمخان دەستی لە دنیا هەڵتەکاند، ئاغامحەممەد بە مەبەستی ناشتنی خانەدانی زەندیە لە شیراز ڕایکرد. سێزدە ساڵ دواتر ئەو کاتەی «یەختەشا» شیرازی خستە ژێر

---

٧٦ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢١٤ ـ ٢١٥؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢١٦؛
SP 97/55, 99a – bc  ANP, b1 . 197, 15 June 1779.

٧٧ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ٢١٧ ـ ٢١٩. بە مەبەستی ئاگاداری پتر سەبارەت بە ڕووداوەکانی دوایی بڕواننە کۆتایی ئەم بەرهەمە.

٧٨ـ سامی، شیراز، ل ٣٥. بەگوێرەی گێڕانەوەی ئیسفەهانی (٦ب) کەریمخانی زەند لە موغبەرەی شا«میرهەمزە» نێژراوە.

چۆکی خۆی، گلکۆی وەکیلی دایەوە و یەسکوپرووسکی تەرمەکەی نـاردە تـاران (لە چەند سەرچاوەیەکدا نووسراوە تەنیا کاژەلاکی سەری). ئەم یەسقانانە لـە پای پلیکانی گۆشەی باکووری کۆشکی گولستان خرانە چالەوە(پاشان ئەم بەشە بە «خەلوەت»ی کەریمخانی ناودێر کرا). ئاغامحەممەدخان بـە گـڵ وەسـەردانی یەسکوپرووسکی کەلاکی دوژمنەکەی و پێخوست کردنی لە وەختی پیاسـەدا بـە شێوەیەکی دڕندانە کەیفی بە تۆلەئەستاندنەوەی خۆی سازدەبوو[٧٩].

هەڵبەت ئـەم جێگۆڕکەیـە نـەبوو بـە کۆتـایی کـاری تـەرمی وەکیـل. یەسقانەکانی لەم گـۆڕە نەشـیاوە دەرهاتنـەوە، بـەلام کـەنگێ و برانـە کـوێ هێشتاش قسەی لە سەرە. دەڵێن فەتحعەلیشا فەرمانی دا گۆڕەکەیان دایـەوە و سەرلەنوێ یەسقانی نێردرایەوە شیراز یان نەجەفی پیرۆز[٨٠]. نیزیـک ٢٢٠ سـاڵ دواتر، لە ساڵی ١٣٠٤ یا ١٣٠٦ی هەتاوی یانی لە مابەینی ساڵانی ١٩٢٥ ـ ١٩٢٧ی زایینیدا ڕەزاشا لـە ڕێورەسمێـکدا بـە بەشـداری ژمارەیـەک لـە پاشـەواری خانەدانی زەندیە، پاشماوەی تەرمەکـەی وەکیلـی لـە گـۆڕ هێنـاوە دەر (لـەم ڕێورەسمەدا ئەندامانی خانەدانی زەند شمشێری «کەریمخانی»یان پێشکێش بـە ڕەزاشا کرد[٨١]. بەلام لەبەر نەخۆشکەوتنی لەپڕی جێنشینی شا (شای داهـاتوو) گوێزرانەوەی ئەم یەسقانانە قۆرتی تێکەوت. گۆیا تەرمەکەیان لـە نێـو زێـڕ و جەواهێراتی پاشایەتی کۆشکی گولستانا ڕاگرت. وەختایـەک لـە سالـی ١٣١٧ی هەتاوی / ١٩٣٨ی زایینیدا ئەو زێڕ و جەواهێراتەیان بـۆ زەماوەنـدی میراتگـری پاشایەتی لەگەڵ «فەوزییە» لە کۆشکی گولستان بردەدەر، چەمەدانێکی بچووکی قوماش کە گۆیا یەسقانی کەریمخانی تێدا بووە بۆ نێژرانـەوە برایـە ئیمـامزادە

---

٧٩ـ Brydges حیکایەتێکی دیکەش دەگێڕنەوە کە گۆیا یەسکوپرووسکیان لەبـەرچاوی ئاغامحەممەدخان ئاور دا و خۆلەمێشەکەیان کردە دەفرێک و پاشان بە دمم بایان دادا.

٨٠ـ کەریمی ڕێنوێنی کتێب، ل ٩، لۆرد کـرۆزۆن، بـەرگی یەکـەم، ل ٣١٣؛ هیدایـەتی، مێژووی زەندیە، ل ١٦٢.

٨١ـ زەکا، ل ١١٩ و ١٢٠؛ وێنەیەکەی ئەم شمشێرە لە لاپەڕە ١٣٠دایە. (هیدایەتی، مێژووی زەندیە، ل ١٦٢؛ لۆکهارت، شارەکانی ئێران، پەراوێزی ٤٨). ئەم شمشێرە تا چەند ساڵان لە کۆشکی گولستان ڕاگیرا، بەلام پاشـان بـۆ نوانـدنی لەگـەڵ تـەواوی شـوێنەواری پاشماوەی زەندیە نێردرایە مووزەی پارس.

زەید. تەرمی لوتفعەلیخانیش لە ساڵی ١٧٤٩دا لێرە تەسلیم بە خـاک کرابـوو. بەڵام هێشتاش گومان هەرماوە کە داخوا ڕەزاشا تەرمەکەی ناشتەوە یـان چەنـد کەس لە خانەدانی وەکیل بەدزی پەسقانەکانیان ناردەوە شیراز یا زێدەکەی کـە «پەری» بێ[٨٢]. هەڵبەت ڕەنگە هەرگیز ڕاستی ئەم ڕووداوانەمان بۆ دەرنەکەوێ.

گۆڕی بەتاڵی کـەریمخـان لـە کلاوفـەڕەنگی، لـە نێـو زۆرێـک لـەو یادگارییانەی کە لە پایەختی هەمیشە جوانیدا لە پاشی بەجێماون، وەبەرچاو دێ و بیرەوەرییـەکانی و سـافیلکەیی خـەمورووژێـنی ڕەنگـە بکـرێ لـە نێـو مادەتاریخی مەرگیدا کە زۆر بـە کـورتی هەڵـپێچراوە بـە شـێوەیەکی سـاکار وەبەرچاو بێ: «ئەی وای کەریمخان مرد[٨٣].»

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ خوسرەوخان کوڕی ئەحمەدخان کوڕی سوبحانوێردیخـانی مـەئموونی یەکێک بوو لە بەناوبانگترین والییانی کوردستان و حوکمڕانێکی شایان و لێوەشـاوە بوو. لە ١١٦٨ی کۆچیڕا محەممەسەنخانی قاجار هەر لە پلەی خۆیدا هێشتییەوە. لـە دەورانی پاشـایەتی کـەریمخانـا ماوەیـەک لـە سـەر کـار لادرا و سـلێمانپاشـا و عەلیخانی کـوڕی جێیـان گرتـەوە. لـە ١١٧٩ی کـۆچیدا سـەرلەنوێ بـە فـەرمانی کەریمخان بۆوە حاکم. وەختایەک کە عەلیمرادخانی زەنـد چـووە سـەر دەسـەڵات، خوسرەوخانی لێخست و کەهزادخانی کردە جێنشینی. وەختایەک کـە جەعفـەرخانی زەند بۆ تەمێکردنی سمایلخانی زەند پێی نایە هەمەدان، والـی سنەش شانیوەشانی دژبەرانی دا و وای کرد خانی زەند خۆی نەگرێ و ڕابکا. خوسرەوخان سەرەنجام دایـە پاڵ ئاغامحەممەدخان. لە ١٢٠٤دا لە لایەن شای قاجارەوە بانگ کرایە تاران. لە تاران لە کەللەی دا و دەنگۆ بوو کە دەرمانێکیـان بـۆ کردۆتـە شـەرابەوە. پـاش دوو سـاڵ نەخۆشی و شێتی لە ١٢٠٦ی کۆچیدا لە تاران مرد.

٢ـ «کوردان» شوێنێک بووە لە «مەهاباد»ی کوردستان کـە لـەوێ نادرشـا و باڵوێزی عوسمانی بە ناوی نەزیف ئەفەندی پەیمانێکیان مۆر کرد. ئەم پەیمانـە لـە

---

٨٢ـ بڕواننە: گوڵشائیان لە وتاری «ئەرگی کەریمخانی»دا. من سەبارەت بە نـاردنی ئـەم وتـارە سەرنجڕاکێشە خۆم بە ئەمەگداری «بێتریچ» دەزانم.

٨٣ـ ئیسفەهانی، ٦ب؛ Binning,268 ئەگەر ڕەقەمی سەر بە پیتی ئەم ڕستەیە پێکەوە کۆکەینـەوە، دەبێتـە ١١٩٣.هیدایەتی چەند ساڵمەرگی دیکەی لە مێژووی زەندیەدا خستۆتەڕوو، ل ١٥٦ ـ ١٥٧.

ڕێکەوتی ١٧ی شابانی ١١٥٩ی کۆچی / ٤ی سێپتامبری ١٧٤٦ی زایینیدا بەڕەسمی لە کوردان مۆر کرا.

٣ـ ئاخال تیزیخە یەکێک لە شارەکانی گورجستانە و کەوتۆتە لێواری «پێسخووچای»... لە سەردەمی شەڕەکانی نێوان ئێران و ڕووسا شەریفپاشا حوکمرانی وێندەرێ بوو.

٤ـ لە نێو دیلەکاندا دەکرێ ناوی نوێنەری دەوڵەتی بریتانیا و یاقوبی تاجری جوولەکەش بێتەگۆڕ. ئەم تاقمەیان لەگەڵ عەلینەقیخانی کوڕی ناردە خزمەت کەریمخان.

٥ـ محەممەدخانی زەند لە شەڕی قومشە نەبوو. شەڕی بەناوبانگی قومشە لە مابەینی سپای ئازادخانی ئەفغان و فەتحعەلیخانی ئەفشار لە لایەک و بڕە هێزی کەریمخان لە لایەکی دیکەوە قەوما. لەبەر نەبوونی هاوسەنگی نێوان هێزەکان ئەسکەندەرخانی دایکبرای کەریمخان پەلی دایە فیداکاری و کوژرا. ئەگەرچی ڕێزدار پێری ئاماژەی بە بابەتی ٣ی بەشی یەکەمی کتێبەکەشی کردووە، بەڵام بەداخەوە تووشی هەڵەیەکی ئاوا زەق هاتووە. محەممەدخان لە ناوچەی سەنجانی مەڵبەندی کەززاز لەگەڵ شێخالیخان و تاقمێکی تری سەردارانی زەند پەلاماری هێزەکانی محەممەدحەسەنخانیان دا، بەڵام هێندە کەم بوون کە شکان. لەو ڕۆژەدا کرێوەیەکی سەیری دەکرد. سمی ئەسپەکەی بە کونێکا ڕۆچوو و گردەبڕ بوو و خۆشی بە دیل گیرا. محەممەدخان دوو ساڵان لە مازەندەران ئەسیر بوو، ڕایکرد و گرتیانەوە. هاوکات لەگەڵ قەڵاچۆی ئەفغانییەکان ئەویشیان لە بەندیخانەدا کوشت.

٦ـ شێخسامیری مونتەفیقی برای شێخعەبدوڵڵا پاش ئەو بوو بە سەرۆکی تایفە. دوای ڕۆیشتنی سادقخان لە بەسرە ئەو شارەی خستە ژێر ڕکێفی، بەڵام ئاخرییەکەی ناچار بوو کە ئەوێ بداتەوە دەس سلێمانپاشا. بەپێی نووسینی «میرعەبدوللەتیف»ی شووشتەری لە توحفەتولعالەمدا، لە تێکهەڵچوون لەگەڵ عەرەبەکانی خەزاعیلدا کوژرا.

٧ـ ناوی تری کووەیت قەرین بوو. قەرین سواو و جووتکراوی «قەرەن»ی بە مانای شاخ (قۆچ)ە. لەبەر لێواری دووفلیقانەی کەنداو لە پەنا ئەم دوورگەیە، ئاوا ناودێر کراوە. کووەیت کەوتۆتە ناوچەی نێوان قەتیف و فاو و یەکێک لە سەربەدەرەوەترین بەندەرەکانی دنیای عەرەبە.

# ١٣

# حکوومەت، خاک، گەل

## ١٣ ـ ١ سنوور و ڕووبەری ئیمپراتۆری

دوابەدوای زنجیرەیەک هەڵمەت و پەلاماری نەپساوە کە کەریمخانیان بردە سەر دەسەلات و ئەو هەڵوێست و سیاسەتانەی کە بوونە هۆی ڕاگرتن و پاراستنی لە بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆرییەکەی‌دا، زۆربەی ئەو چەمک و گریمانانەی دەرەکی سووربوونەوە. چەند وشەیەکی وەک ئێران، دەوڵەت و وەکیل لە ڕۆژگاری زەندیەدا خاوەنی واتایەکی تایبەتن. سەبارەت بەم باس‌وخواس و ڕوانگانەی کە لە بابەتەکانی داهاتوودا دێنە گۆڕ، دەمانەوێ سەبارەت بە بواری ئاڵوگۆڕ و ئەو چەمکانەی سەرەوە بدوێین.

واتای ڕاستەقینەی جوگرافیایی و سیاسی ئێران کە کەوتە دەستی زەندیە لە ڕاستی‌دا هەمان ئێرانی سەردەمی سەفەوی بوو کە هرووژمی ئەفغانی و ترک و ڕووسان و داگیرکرانی تەختی پاشایەتی بە دەستی نادر و هەراو کردنی ئیمپراتۆرییەکەی بەتێکڕا نەیانتوانی لە بابەت گۆڕین و هەڵگێڕانەوەی ئەو ئیدەئالەدا سەرکەوتنێک وەدەس بێنن. ئەم کارە لە کردەوەدا پتری بە بەرەوەیە هەتا تێئۆری. نەدەلوا و نەدەگونجا کە ئێران پاش ئەو ئاڵوگۆڕە بەرچاوانەی کە

لە زنجیرەی پاشایەتی و ڕایەڵوپۆی لەشکری لە مەودای ساڵانی ١٧٢٢ تا ١٧٥١دا ڕووی دابوو، بێ گۆڕانکاری لە شانۆی مێژوودا خۆی بنوێنێ. سیاسەتێکی ئەوتۆ تەنگەژەی زیاتر دەخاتە مابەینی ئاواتە بەرزەکانی کۆنباو و ئاڵوگۆڕی ڕاستەقینەی سیاسی، بەڵام ئەوەی کە بە لای ئێمەوە زیاتر گرینگ و پێویستە ناسینەوەی وڵاتێکە کە بە دەس کەریمخان بەڕێوە دەچوو.

باسەکە بە ناسینەوەی جوغرافیای قەڵەمڕەوی وەکیل دەس پێدەکەین. مەسەلەی پەیوەستبوونی ناوچەکانی لار، کرمان، باشووری ئێران و ئازەربایجانی باشووری و هەرێمەکانی زاگرۆس، خووزستان و ڕۆخەکانی کەنداوی فارس بەگوێرەی ئاست و هەلومەرجی ئیداری مەودای ساڵانی ١٧٦٣ ـ ١٧٧٩ دەخەینە بەرباس و شیکردنەوە. ئەوەی دەمێنێتەوە خستنە ڕووی دۆزی سنووورە دیارینەکراوەکانە کە لێیان دەکۆڵینەوە و بە باری ڕووکار و پێوەندییەکانی دەوڵەتی کەریمخان لەگەڵ ناوچەکانی پێشووی قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریتی دەوڵەتی ئێراندا دەچینەوە کە ئێستا بە شێوەیەکی بەرهەست لە جەغزی دەسەڵات و حکوومەتەکەی دوور کەوتبوونەوە. کورتترین و ڕاسترین و ڕوونبینانەترین لێکدانەوە و بۆچوون سەبارەت بە ئیمپراتۆرییەتی خانی زەند بە قەڵەمی عەبدوڕڕەززاقبەگ نووسراوە: قەڵەمڕەوی وەکیل لە لێواری چۆمی «ئاراز»ەوە لە باشووری ئێرەوان هەتا گەروولەی هۆرمز نەدەپسایەوە و جارجارەش تەنیا بە وەرگرتنی پیتاکی بەهەڵکەوت لە ناوچەکانی پەنای هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی وەک قەرەباغ و ئێرەوان و عومان و کوردستان و دەشتستان قنیاتی دەکرد[1]. ناوچەی سیستان و بلووچستان کە تەنانەت دەوڵەتی سەفەوی و دەسەڵاتی نادرشاش بە چاوی شارەی دابینکردنی هێزی چەکداری سپاکانی خۆیان لێیان دەڕوانی، قەت بە شێوەیەکی مسۆگەر نەکەوتە ژێر ڕکێفی ئەو حکوومەتانە و دوابەدوای ئەو گێرە و کێشانەی پاش کوژرانی نادرشا لە ئێرانی ڕۆژاواییدا بەدیهاتن، ئەم پارێزگایە لە ژێر دەسەڵاتی حوکمڕانێتی نەسیرخانی بلووچکەلاتیدا پارێزرا و نەکەوتە بەر شەپۆلی کارەسات. لەو سەردەمەدا کە کەریمخان بە ناوی وەکیل لە ئیسفەهان[2] پاڵی دابۆوە سەرتەختی

---

١ـ دونبولی، تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی یەکەم، ل ١٣٤.

2- Gubar, 301; Goldsmith, 401.

پاشـایەتی، ناوچـەی نـاوبراو سـەری وە ئیمپراتۆرییـەتی تـازەدامـەزراوی ئەفغانستان بە ڕێبەرایەتی ئەحمەدشای دورانی هێنابوو؛ پـەلاماری تاقمـەکانی بلووچ لە سالانی ١٧٤٧ ـ ١٧٥٢دا و تەنانەت پاش ئەویش هەڕەشەی لە ناوچـەی کرمان و بەندەرعەباس دەکرد[3]. بـەلام بەڕوالـەت لەبـەر یەکـەم هـەنگاوەکانی کەریمخان سەبارەت بە گرتنی پارێزگـای کرمـان لەمپـەرێک کەوتـە سـەرڕێی درێژەی شالاوەکانیان. کرمان بە بنەبانی قوڵی ڕۆژهەلاتی ناوچەی ژێردەسەلاتی زەندیە دادەندرا. ناوچەکانی هێڵی پێشەوەی کرمـان وەک بـەم و نەرماشـیر بـە دەس یەکێک لە سەردارانی خۆولاتییەوە بوو بە نـاوی ئەمیربـەگی سیسـتانی و ڕەنگە قەڵەمڕەوی حکوومەتەکەی بەشی هـەرە زۆری سیسـتان و بلووچسـتانی ئێرانی ئەمڕۆی گرتبێتەوە[4]. پارێزگای کرمان شێخنشینەکانی لێواری «مـەکران» تا ڕۆژهەلاتی «میناب»یشی دەگرتەوە، بەلام حوکمدان سەبارەت بـەوەی کـە تـا کۆی دەسەلاتی بە سەریاندا شکاوە کارێکی دژوارە.

سنووورە سروشتییەکانی کەویری لووت (شۆرەکاتی قاقـڕ) قەڵـەمڕەوی فەرمانڕەوایەتی زەندیەی لە هەرێمی خانەدانی ئەفشـارییە کـە لـە ماوەیـەک لێرەوبەرەوە لە خوراسان سەریان وەبەر ئەحمەدشـای دورانی هێنـابوو، جیـا دەکراوە. وا دیارە شارەکانی قەهێستان واتە بیرجەند و «تەبەس»یـش هـەر بـە خوراسان حیساب دەکران. ئەم شۆرەکاتە قاقڕە لـە بـاکووری ڕۆژاویـیدا، لـە ناوچەی جاجەرم دەگەیشتەوە زێد و نیشـتمانی سـەرەکی خێڵـی قاجـار یـانی ئەستەرئاباد. ئەوەی لێرەدا جێگـەی سەرسـوڕمانە هـەوڵنـەدانی وەکیلـە بـۆ خستنەوە سەرخۆی پاشماوەی بەلـەنگازی خانـەدانی نـادری و شـای کـوێری دەستندەخۆر و سەرکردە هەمیشە لێکمکوڕەکانی. بە پێی داب و نەریتی کۆنبـاو وا دەردەکەوێ کە وەکیل ڕێزێکی تایبەتی بۆ پاشەواری فەرمانڕەوای پێشووی واتە نادرشا داناوە و خۆی تێنەگەیاندوون[5]. بەلام ئەم پرسـە بـە دوو شـێوە پاسـاو دەدرێتەوە: یەکەم ئەوەی کە تێکۆشانی بـێوچـانی کـەریمخـان بـە مەبەسـتی زاڵبوون بە سەر ئێرانی ڕۆژاواییدا، دوازدەساڵ سەردەمی فەرمانڕەوایەتی خانی

3- Reports of such raids are Frequent in GD, e.g., VI, 8 January 1752.

٤ـ وەزیری، ل ٣٣٣.

٥ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٣٧ ـ ٣٣٨؛ پەرتەو بەیزایی، ل ٦٠.

تایبەت دابوو بە خۆی و مـاوە و مـەودای تـەواوی نـەبوو بـۆ ئاوڕدانـەوە لـە مەڵبەندی خوراسان؛ دووهەم ئەمەی کە ئەحمەدشای دوڕانی هەمیشـە خـۆی بـە خاوەنی خاکی خوراسان دەزانی و لە مـاوەی هەڵـمەت و هرووژمـەکانی ١٧٥٤ ـ ١٧٥٥یشدا چەند دەنگۆیەک سەبارەت بە ئامادەیی ناوبراو بە مەبەسـتی هێـرش بـۆ سـەر ئـەم پارێزگایـە بـڵاو بـۆوە[٦]. وەک گێڕاویانەتـەوە ئەحمەدشـا لـە نەیشابوورەوە دواتر چەند پەیامێکی دۆستانەی بۆ کەریمخان نارد و هانی دا کە پێکەوە پەیمانێکی دووقۆڵی بە مەبەستی خەبات دژی ئازادخانی بەرەڵلای خائین ببەستن[٧]! هەروەها گفتی دابوو ئەگەر وەکیل مەیلی لە گرتنی ئێـران بـێ پـارە و هێزی لەشکری دەنێتە بەردەستی. وەک گوتوویانە کەریمخان چەند وڵامێکی لێڵ و دووتۆوەی بۆ ناردبۆوە[٨]. وێڕای تەواوی ئەمانەش هێزەکانی دوڕانی ناچار بـە پاشەکشە و خۆدزینەوە بوون لە مەترسی. «بوخـاری» ئامـاژە بەمـە دەکـا کـە ئەحمەدشا پەیمانێکی دۆستایەتی لەگەڵ کەریمخان گرێدابوو. زۆر وێدەچێ کـە ئەم دوو پیاوە بەدەسەڵاتە میراتی نادرشایان لە مابەینی خۆیانا دابەش کردبێ و لە ڕووی بارناسکی هەرێمەکـەوە هـەرکام بـەجوێ و بـەنهـێنی سـەبارەت بـە مانەوەی خوراسان وەک لەمپەری نێوانیان ڕەزامەندییان دەربڕیبێ. کەریمخـان بەئاشکرا بۆی دەرکەوتبوو کە بە باری ئابووریدا بەزاندنی پـڕ خـەرجوبـەرجی پارێزگای خاپووری خوراسان قەڵەمڕەوی شێواوی دەوڵەتەکەشی بەرەو داڕمـان دەبا. فۆرستێر لەم بارەوە ئاوای توێژیوەتەوە:

ئێرانییەکان لایان وایە کە سەردارانی کەریمخان هەمیشە هانیان داوە تا لەشکر بکاتە سەر خوراسان، چونکە برەوی دەسەڵاتی لـەو هەرێمـە دەبـوو بـە هۆی باڵادەستی حکوومەتەکەی لە تـەواوی ئێرانـا؛ ئەگـەرچی پیـاوێکی ئـازا و بێباک بوو، بەڵام عەیش و نۆشی شیرازی لەو گیروگرفتانە بە باشـتر دەزانی و هەمیشە بێمەیلی خۆی سەبارەت بەم گەڵاڵە بەرزەفڕانەیە ئاوا پاساو دەدایەوە و دەیگوت پاش گەمارۆیەکی پڕمەترسی و درێژخایەنی قەڵاکان، وەختایـەک چـاو

٦ـ ڕۆستەمو تتەواریخ، ل ١٤١؛
SP 97/33, 3346; SP 97/38, 29 September. 1754, 20 January 1755.
7- SP 97/38. 12 July 1755.
8- ((Ahd – e mosafat bast)), quoted by Mann, Quellenstudien, 356.

لە ئاکامەکە بکەی جگە لە چەند ڕەشکە کا هیچ شتێکیان تێدا نامێنێ[9].

پەیوەندی نێوان شاروخمیرزای حوکمڕانی خوراسان لەگەڵ کەریمخان دووجار سەردان و چوونی نەسروڵلامیرزای کوڕی بوو بۆ شیراز(۱). ناوبراو لەم هاتوچۆیانەدا پتر لەوەی ئامانجی باڵوێزایەتی بێ بە شوێن ئامانجی گێرەشێوێنانەی خۆیەوە بوو. یەکەم هەنگاوەکان پاش نەورۆزی ۱۱۸۱ی کۆچی / ۱۷٦۷ی زایینی دەستیان پێکرا. حاکمی «خار» بە ناوی تەقیخانی زەند کە کەوتبووە سەرڕێی کرمان هەواڵێکی سەبارەت بە هاتنی لەپڕی نەسروڵلامیرزای گەیشتە دەس. کەریمخان ڕایسپاردبوو کە لە ڕێیە زۆر ڕێزی نەسروڵلامیرزا بگرن و خۆشی ئەم شازادەیەی لە شیراز بە خۆشڕوویی و وەک کوڕی خۆی وەرگرت. لە ڕووی دەقی ئەو نامانەوە کە شازادە لەگەڵ باوکی ئاڵوگۆڕی کردووە دەردەکەوێ کە سەبارەت بە داوای یارمەتی دەربارەی هەڕەشەی لەشکری ئەحمەدشاوە گفتوگۆی لەتەک وەکیلا کردبوو. کەریمخان لە ڕێی یەکێک لە هاوڕێیانی ناوبراوڕا بەزیرەکی بۆی دەرکەوت کە شاروخمیرزا پێیخۆشە ئەوەندەی دەکرێ نەسروڵلامیرزا لە شیراز ڕابگرێ، چونکە کوڕە خۆشەویستەکەی شاروخ بە ناوی نادرمیرزا(۲) بەئەسپایی لە سەر کورسی جێنشینی پاشایەتی خوراسان پاڵی دابۆوە. وەک گێڕاویانەتەوە کەریمخان تا شەش مانگی دیکەش بە میوانداری کردنی نەسروڵلامیرزا داوای شاروخی بەجێهێنا؛ لە ئاخری مانگی شەشەمدا بە بێمەیلی وێڕای چەند دیارییەک کە بۆ شاروخی نارد میوانەکەی ئیزن دا، بەڵام سەبارەت بە ناردنی سپا هیچ بەڵێنییەکی نەدا[10]. لە سەرەتای ساڵی ۱۷۷٥دا جارێکی تر نەسروڵلامیرزا هاتەوە شیراز. گۆیا ئەمجارەیان بە مەبەستی داوای یارمەتی بە دژی باوکی و براکەی هاتبۆوە لای کەریمخان. وەکیل لەم وەختەدا سەرقاڵی ناردنی لەشکر بۆ سەر کوردستان و گەمارۆی بەسرە بوو. وەک گوتوویانە نەسروڵلامیرزا تا حەوت ساڵان یانی هەتا سەرەتای دەسەڵاتی عەلیمرادخان لە شیراز مایەوە، پاش

---

9- Forster 1, 187 – 188.

۱۰ــ گوڵشەنی مراد، ل ۱٦۱ــ ۱٦۳؛ ئیعتمادوسسەنتەنە لە مەتلەعوششەمس، ل ۳٤۳، موجمەلوتتەواریخ، ل ۹۸؛ کووهمەرەئی، ل ٤۲۲ ــ ٤۲٥؛
Butkov I, 247; Mann Qullenstudien, 170.

ئەوە گەڕایەوە مەشەد و بەکردەوە جڵەوی دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت[11].

## ١٣ ـ ٢ لێواری دەریای خەزەر (مازەندەران)

سەروخوار و هەڵکێشداکێشی یەکێتی و یەکدەنگی قاجارییان لە دامغان و ئەستەرئاباد و مازەندەران هەمیشە مەبەستێکی بەرسەرنج بووە. گیلان کە لە رۆژگاری پاشایانی سەفەویڕا بە مڵکوماشی تایبەتی و میری دادەندرا، محەممەدحەسەنخان خستییە سەر قەڵەمڕەوی خێڵی قاجار. ئەم پارێزگایە پێشتر وەک پارێزگایەکی نیمچە سەربەخۆ بەڕێوە دەچوو و ئەو سیستمە تا ساڵی ١٧٥٩ یانی دەورانی فەرمانڕەوایەتی زەندییەش بەردەوام بوو. حاکمی ناوچەی ڕەشت بە ناوی حاجی جەمالی فوومەنی لە سەرەتای ساڵی ١٧٥٠دا لەبەر نێوانناخۆشی و قینەبەرایەتی لەگەڵ خانەکانی شەفتی(٣) کە لە سەردەمی پاشایەتی شاسوڵتانحوسێنەوە تووشی هاتبوو و تا سەدەی نۆزدەش درێژەی کێشا، لە ناوچەی شەفت بە دەس ئاغاهادی شەفتی کوژرا. پاشان ئەم بکوژە لەگەڵ میرزا زەکی کە بریکاری حکوومەتی کەسگەر(٤) بوو ماوەی سێمانگان واتە بەر لەوەی سەرۆکی تایفەی قاجار خافڵگیری بکا گیلانی بەڕێوە دەبرد. محەممەدحەسەنخانیش کوڕەی لاوی حاجیجەمالی بە ناوی هیدایەتوڵڵاخان کردە حاکمی ڕەشت و سەرکردەی سەربازگەی دامەزراوی وێندەرێ[12]. لە ساڵی ١٧٥٩ یان ١٧٦٠دا کەریمخان ناوبراوی بردە تاران و خۆی حوکمڕانێکی لەوێ دانا. زەمانێکی کە وەکیل سەرقاڵی گەمارۆی ورمێ بوو هیدایەتوڵڵاخان لە تارانەوە ڕایکردە ڕەشت و جارێ حوکمڕانی وێندەرێی کێشا. کەریمخان فەرمانی گرتنی دا و ١٢هەزار تمەنیان تاوانانە لێئەستاند و لەو ماوەیەدا کە ناچار بوو لە ئازەربایجان بنە داکوتێ، نەزەرعەلیخانی کردە

---

١١ـ کووهمەرەئی، ل ٤٢٥ ـ ٤٣٨؛ قەزوینی، ل ١٢٥؛ ئیعتیمادوسسەڵتەنە، مەتلەعوششەمس، ٣٤٥.

FR XVII, 1065 (1 February 1775); Butkov II, 76; III, 140.

12- Rabino, Les Provinces Caspiennes, 437; Rulers of Lahijan and Fuman, 98; Malcolm, 461 note; Gmelin 1, 417 – 418.

حاکمی ئەو پارێزگایە. لەوەختی گەڕانەوەیدا بۆ شیراز لە ساڵی ١١٨١ی کۆچی / ١٧٦٧ی زایینی هیدایەتوڵلاخانی کردە حوکمڕانی گیلان و تەنانەت خوشکی یەکێک لە حاکمانی ئەم ناوچە بارناسکەی بۆ ئەبولفەتحخانی کوڕی خواست[١٣]. گۆیا هیدایەتوڵلاخان هەتا حەوت ساڵ پاش مەرگی وەکیل بە شێوەیەکی نیمچە سەربەخۆ حوکمڕانێتی ئەو شارەی کرد کە بە دەروازەی پارێزگاکانی باکووری ئێران دادەندرا.

حکوومەتی بەهێز و درێژخایەنی سەرنجی تاقمێکی زۆری بۆ سەر خۆی ڕاکێشابوو، بەتایبەت شێوەی ئاکار و جوولانەوە و کارەکانی لە سەرچاوەکانی ئورووپاییشدا ڕەنگیان داوەتەوە. ناوەندی حکوومەت و بارگایەکی جوان و خشپیلانەی بۆخۆی ساز کردبوو پڕ لە مۆبلمانی باش و مەشرووبی ئاگرین و کەنیزانی گورجی و هێزێکی هەزاروپێنسەدکەسیشی ڕاگرتبوو کە دەیتوانی بە کۆکردنەوەی چەکدارانی ئێلجاڕی ژمارەیان بگەیەنێتە دەهەزار کەس. داهاتێکی چاکیشی هەبوو لە بەرهەم و حاسلاتی خۆماڵی بەتایبەت ئاوریشم. باجێکی بەرچاویشی لە کۆمەڵی فرەی ئەرمەنییەکان وەردەگرت و هەروەها لە ڕێی بازرگانی لەگەڵ ڕووسیاوە کە توجارەتخانەیەکی گرینگی لە بەندەر ئەنزەلی دانابوو پارەیەکی وەگیردەکەوت. ئەگەرچی فۆرستێر دەنووسێ ساڵێ ٢٠هەزار لیرەی داهات بووە و بە دڕ و زاڵم و ترسەنۆک ناوبانگی ڕۆیوە، بەلام گمێلین (Gmelin) پێداگرە کە کاری نالەباری نەکردووە و زیادی لە کەس نەستاندووە و زۆری خۆ داوەتە ڕاگرتنی دڵی جەماوەر بەگشتی. باجێکی دووبەرامبەری باو و دیاریکراوی دەنارد بۆ شیراز (٨٠هەزار ڕووبڵ نەغد و بایی ٤٠هەزار ڕووبڵ کەلوپەل). جگە لەمەش گەلێکی پێشکێشی و دیاری لەگەڵ کالای ئاوریشمین دەنارد[١٤]. هیدایەتوڵلاخان پتر لە جارێک چاوی بە کەریمخان کەوتبوو. لە

١٣ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٦٤ ـ ١٦٥.

14- Forsterl,219;Arunova and Ashrafyan, ((Novye Materialy));112Gmelin I,418 - 420 بە گوێرەی سەرچاوەکانی ڕووسی ساڵی ٢٤٠٠٠لیرە یا ١٢٨٠٠تمەنی کە دەبێتە لە سەتا ١٢ی تەواوی داهاتی ساڵانەی داویەتی. (هەڵبەت ئەگەر بەراوردەکەی فۆرستێر دروست بێ). ڕۆستەموتتەواریخ ئەم برە پارە بۆ تێکڕای پیتاکی گیلان ٢٥٠٠٠تمەن یان ٤٦٨٧٥ لیرە دادەنێ. (بڕوانە خشتەی لاپەڕە ٤٩٠ ـ ٤٩١).

کەرەتێکیش زیاتر تووشی تێکهەڵچوون ببوو لەگەڵ وەکیل کە یەکیان دەگەڕێتەوە ساڵی ١٧٦٨ یان ١٧٧٠. هیدایەتوڵلاخان بریکاری حکوومەتی لاهیجانی بانگهێشتبووە ڕەشت و ناوبراو لە ڕێیە بە گوللە کوژرا(٥). وا دەنگۆ بوو کە ئەم پیاوە لەبەرەوەی هیدایەتوڵلاخان سەبارەت بە یەکدەنگی و وەفاداری لێی دڕدۆنگ بوو دەستووری کوشتنی داوە. کەریمخان فەرمانی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی دا. بەڵام هیچ شتێک سوور نەبووە و وەکیلیش تەنیا ٥٠٠«مەن» ئاوریشمی خستە سەر باجی ساڵانەی و قەرار کرا هەتا ڕوونبوونەوەی ڕووداوەکە ئەم باجە زیادییە وەربگیرێ[15].

لەوان سەردەماندا هیدایەتوڵلاخان «تونێکابۆن»یشی خستبووە سەر حکوومەتی خۆی. پێشتر برایمخانی عەمارلوو ئەم ناوچەیەی بەڕێوە دەبرد، کەچی وا دیارە مەهدیخانی خەلعەتبەری کە لە لایەن کەریمخانەوە هەڵبژێرابوو کاروباری ئەو ناوچەیەی لە ئەستۆ بوو[16]. هەر ماوەیەک دواتر لە سەرەتای ساڵی ١٧٧٣دا لەپڕ بە هۆی ژیانەوەی قاجارییەکان حوکمڕانی گیلان کەوتە مەترسی و ویستی خۆی بخاتە ژێر باڵی ڕووسیا[17] و وەختایەک کە ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٧٧٩دا داواکەی لێقبووڵ نەکرد بازرگانانی ڕووسی دەرکرد و سەبارەت بە مەترسی تەنینەوەی دەسەڵاتی قاجارییان هاواری برد[18] بۆ فەتحعەلیخانی قوببەئی(٦). لە ساڵی ١٧٨١دا لەبەر زەخت و زۆری ئاغامحەممەدخان لە سەر حوکم لادرا[19]، بەڵام هەر ماوەیەک دواتر دووبارە چۆوە سەر دەسەڵاتی پێشووی. هیدایەتوڵلاخان سەرلەنوێ دوژمنایەتی کۆنی خوێنی ژیاندەوە و ئاغارەفیعی شەفتی و پێنج برا و برازایەکی کوشت. ئەم کارە بوو بە

---

15- Rabino, Les Provinces Caspiennes 474. Arunova and Ashrafyan, ((Novye Materialy)), 112: ئەم سەرچاوەیە دێنێتەوە بیر کە لە ١٧٦٨دا ئیجارەی باجی ساڵانە پێهەڵاچوو. ئەگەر ئەم ئیجارەیە هەر تەنیا سەر بە پیتاک و داهاتی خۆجێیی بێ بە تەمبێیانە لێیان ئەستاندووە. ڕۆستەموتتەواریخ بە ڕوونی دەڵێ (ل ٣٧١ – ٣٧٢) کە هیدایەتوڵلاخان دووجار دژی کەریمخان ڕاپەڕیوە و هەردک جار شکاوە و تەمێ کراوە.

16- Rabino, Mazindaran and Astarabad, 15.

17- Butkov I, 131; II, 79.

18- Butkov II, 71, 80; III, 147; Bakikhanov, 166 – 167 (See further, 15.2).

19- Butkov II, 82 – 83; III, 157.

هۆی بێباوەڕی و ئابڕووتکانی، چونکە لە ساڵی ١٧٧٦دا کـە ئاغامحەممـەدخان بەم بیـانووە پـەلاماری گـیلانیدا، دژایـەتی لەگـەڵ هیدایەتولـڵاخان سـەری هەڵدایەوە، ڕووسان داریان لە پشتی دا و ئاخرییەکەشـی هـەر ئـەو پشـتیوانە ڕووسانەی دایانە دەس تەنیا پاشەواری بنەماڵەی شەفتی واتـە ئاغاعـەلی(٧) و ئەویش سەری بڕی. فەتحعەلیشاش بە نـۆرەی خـۆی هـەتا ڕۆژگـاری مـەرگی ئاغاعەلی ئاگری ئەم دوژمنایەتییەی خۆش کرد هەتا بتوانێ ئـەم ئەیالەتـە پـڕ سەرێشەیە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی[٢٠].

## ١٣ ـ ٣ خانەکانی قوببە و گورجستان

وێڕای ئەم باسە دەبێ وەبیر بێنینەوە کە چۆمی ئاراز لەو شوێنەی کەوا لەگەڵ ڕووباری «کوورا» تێکـەڵ دەبێتـەوە و لـەوێوە تـا دەریـای خـەزەر بـۆ سەرپەڕی سنووری بـاکووری، ڕاستەوڕاسـت بـە پارێزگاکـانی ژێردەسـەڵاتی کەریمخان دادەندران و لە ساڵانی ١٧٦٣ ـ ١٧٧٩دا بێپسانەوە خـەراجی سـاڵانەی خۆیان بۆ دەنارد. لە بەشـەکانی پێشـوودا بـەکورتی باسـی مێـژووی سیاسـی مەڵبەندەکانی ژێرڕکێفی ئەفشارەکانی ورمێ و دونبولییەکانی خۆی سـەلماس و تـەورێزمان کـردووە؛ باسـی مێـژووی نێوخـۆی پارێزگاکـانی ئازەربایجـان و ئەرمەنستان و گورجستان لەم ڕۆژگارە سەرنجڕاکێشەدا کە مەودایەکی بە بەرەوە بوو ئەوەندەی پەیوەندی بە قایم بوونی دەسەڵاتی کـەریمخانـەوە بـێ لـە دوو بابەتی داهاتوودا دەکەونە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

هەرێمـەکانی قـەفقازی ڕۆژهـەڵاتی دراوسـێی ئازەربایجـان، واتـە پاشایەتی گورجستانی کارتێل و کاختی و حکوومەتەکە ژێربالەکانی خـوارووی ئەوان لـە گەنجـە و قـەرەباغ و ناوچـەی سـەربەخۆی شـیروان لـە بـاکووری ڕۆژهەڵاتی کوورا و مەڵبەندەکانی سەرلێواری ڕۆژهەڵاتی داغستان بەتێکـڕا لـە

20- Rabino, Rulers of Lahijan and Foman, 98 – 99; Malcolm, 461 – 462; Forster I, 219; Atkin, 52 – 53. See also Gmelin I, 391; Ferrieres le Sauveboeuf, 4 – 5; G N. Curzon I, 375 – 376.

نیوەی دووهەمی سەدەی شازدەرا یانی لەو وەختەوە کە شاسمایل و شاتۆماسبی یەکەم سەریان بە زۆربەی میرنشینەکان نەوی کرد، باجیان دەدا بـە ئێـران. لـە ساڵی ۱۷۲۰دا ئەم ناوچەیە وەک هەموو پارێزگاکانی باکووری ئێران، لـە نێـوان دەوڵەتانی رووسیا و عوسمانیدا بەش کرابوو[٢١] و تەنانەت زەمانێکی کە نادرشـا دووبارە پەلی کێشا بۆ سەر تـەواوی خـاک و سـنوورەکانی پێشـووی ئێـران، هەوڵەکانی بە مەبەستی سەپاندنی دەسەڵاتی قایم بە سەر بـاکووری رووبـاری ئارازدا بەتەواوی ناکام مایەوە[٢٢]. هێرشەکەی لە ساڵانی ۱۷٤۱ ـ ۱۷٤۲دا بـۆ سـەر داغستان بە شێوەی شکستێکی قورسی شـەرمەزارانە خـۆی نوانـد و راپـەڕین و خودبەسەری هەمیشەیی سەرانسەری ئەو خاکـەی گرتـەوە کـە لـە نێوەراسـت «دەربەند»ەوە هەتا تفلیس قۆڵی راکێشـابوو. هـەروەها هـەر گەلاڵـەیەکی کـە ویستبێتی رایەڵوپۆی پەیوەندی نێوان ئەم ناوچانە وەک پارێزگاکانی سـەر بـە ئێران بەرێتەوە سەریەک، پسپس کرا. رەنگە نیزیکی ئەردەوێڵ واتـە مەوتـەنی خانەدانی سەفەوی گورجستانی بە باری رواڵەتیدا وەک ئەنـدامێکی دانەبـڕاوی ئێران لێکردبێ، چونکـە هەواڵـدەرانی زەنـد و دیپلۆماتـەکانی رووس و تـرک هەمیشە وایان بە باش زانیوە کە هەتا گۆڕانی رەوگەی رووداوەکان ئەم هەرێمـە بە بەشێک لە خاکی ئیمپراتۆری سەفەوی دابنێن.

پاش مەرگی نادر حاکمانی ئاڵقەبەگوێی لە هەردک بەری چـۆمی ئـاراز سەرەتا بەرەورووی هەڵبژاردنی رێگای دژایەتی و رەزامەندی سەبارەت بە تێکەڵ بوون لەگەڵ هێزە هاوبەشەکانی ئازادخان و فەتحعەلیخانی ئەفشار ببوونەوە. کازمخانی قەراچەداغی خۆی دایە دەس ئازادخان و پاش ویش دایە پاڵ کەسـانی دی و سەرەنجام سەری وەبەر کەریمخان هێنـا و جـێپێـی خـۆی قـایم کـرد[٢٣]. پـەناخانی جەوانشـێری قـەرەباغی کـە ناوچەکـەی کـەوتبووە شـانبەشـانی قەراچەداغ لە قۆڵی باکوور، ناچار بوو کە نێوەنێوە لە ساڵی ۱۷٥۰را هەتا ئـەو

---

21- See Lockhart, Safavi Dynasty, 176 – 189.

22- See Lockhart, Nadir shah, 197 ff. 238; Arunova and Ashrafayan Gusudarstvo, 263.

٢٣ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ۱۸۸ ـ ۱۸۹؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیـە، ل ۱۱٤؛ گوڵشـەنی مراد، ل ۸۹ و ۱۲۰.

زەمانەی چووە ژێربالی پادشای گورجستان هەر جارەی لەگەڵ ئەفغان و تایفەکانی قاجار و ئەفشار تێکهەڵچێ و لە قەلای ناسراو بە شووشی یان شیشەدا گەمارۆ بدرێ[٢٤]. لە هاوینی ساڵی ١١٧٥ی کۆچی / ١٧٦٢ی زایینیدا کە هێزەکانی کەریمخان گەیشتنە قەراخ چۆمی ئاراز، پەناخان لەگەڵ کازمخان لێکیان دەدا، بەلام ئەویش وەک کازمخان سەری وەبەر وەکیل هێنا و وێرای هێزەکانی زەند گەڕایەوە شیراز. لەم کاتەدا برایمخەلیلخانی کوڕەگەورەی لە لایەن وەکیلەوە کرایە حاکمی قەرەباغ[٢٥]. بارمتەکانی گورجی کە لەو زەمانیدا دراونە دەس حکوومەت برێتی بوون لە: حاجیخانی کەنگرلووی نەخجەوانی برازای حوسێنعەلیخانی حاکمی ئێرەوان، ڕەزاقولیخانی گەنجەئی، شاوێردیخانی زیادئۆغلووی قاجار بەگەربەگی پێشووی قەرەباغ[٢٦].

شیروان کە ناوچەیەکی بەرفرەوانترە و کەوتۆتە مابەینی شەمخالات، دربەند، باکۆ و شەکی بۆ ماوەی چلساڵان لێرە بەدوا بە دەس خانەکانی قوبەوە بوو. حوسێنعەلیخان لە زەمانی پاشایەتی نادرشادا قەڵەمڕەوی حکوومەتەکەی لە لای باکوورەوە بەرەو دەربەند و لە قۆلی باشوورەوە بەرەو «سالیان» پەرە پێدابوو[٢٧]. فەتحعەلیخانی کوڕی و جێنشینی لە ساڵی ١١٧١ی کۆچی / ١٧٥٨ی زایینیدا جێیگرتەوە و پێیدەگوترا فەتحعەلیخانی قوبەئی یان دەربەندی. ناوبراو لەبەر هێرش و پەلامار و پیلانگێڕی و ژن و ژنخوازی و دۆزینەوەی هاوپەیمانێک قەڵەمڕەوی خۆی پەرە پێدا کە جەغزی دەسەلاتی تەواوی خاکی سەرەکی گورجستانی گرتبۆوە و لە باشوورەوە لەگەڵ ئێران و لە باکوورەوە لەتەک ڕووسیا و لە ڕۆژاوارا بوو بە دراوسێی گورجستان. لە ساڵی ١٧٧٤دا بەستراني پەیمانی یەکێتی داغستانی ڕەقیبی لەگەڵ «ئووسمی

---

24- Butkov . I, 238 - 240; Brosset, 235, 237, Lang, Last Years, 148 – 149. بە فارسی دەنووسن شیشە و بە ڕووسی شووشە. گەنجە پاش ساڵی ١٨٢٢ کرایە ئیلیزابێتپۆل و دواتر لە ساڵی ١٩١٧دا بوو بە گیرۆفئاباد.

٢٥ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١١٤؛ گوڵشەنی مراد، ل ٨٨ ـ ٨٩ ، ١١٣ و ١٢٠؛ Bakikhanov, 162; Butkov I, 386; II, 97.

٢٦ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١١٤؛ گوڵشەنی مراد، ل ١٢٠.

27- For details, See Bakikhanov, 165 – 166; Butkov III, 108 – 112.

قەرەقیتاق» بوو بە هۆی گەمارۆی فەتحعەلیخان بۆ ماوەی نۆ مانگان. دەورەدانی لەبەر هاتنی هێزەکانی رووسیا لە بەهاری ساڵی داهاتوودا تێکشکا. لە راستیدا رووسان هێزەکانی خۆیان بۆ تەمێکردنی ئووسمی لەبەر گرتنی یەکەمین فەیلەسووفی ناتۆرالیستی رووسیا ناردە ئەو ناوچەیە. هەر بە رێکەوتێکی بەهات فەتحعەلیخان زۆر وریایانە هەلەکەی قۆزتەوە و جارێکی تر بالادەستی خۆی پتر پێهەلابرد و تا ساڵی ۱۷۸۹ کە مرد، هەروا بەدەسەلات مایەوە[٢٨].

نادرشا لە ساڵی ۱۷٤٥دا، جارێکی تر بە هێنانە سەردەسەلاتی تەیموورس لە خاکی کارتێل و ئارکێلی کوری لە قەڵەمرەوی کاختی، فەرمانرەوایی گورجستانی بەدیهێنایەوە. پێهەلاچوونی نرخی ملکانە و پیتاک، راپەرینەکانی هەمیشەیی پتر هەڵگەراند و خودی تەیموورس بە مەبەستی داخوازی دابەزینی نرخی ئەم باجانە چوو بۆ مەشەد. راست لەم رۆژانەدا نادرشای دیکتاتۆر کوژرا. «تەیموورس»یش هەر ماوەیەک دواتر کەوتە ریزی هاوکارانی برازاکەی و جێنشین و زاوای نادرشا واتە عادڵشا. پاشان برایمپاشا گرتی و دواتر لە ساڵی ۱۷٤٨دا ناوبراو بە نابەدڵی ئیزنی گەرانەوەی دا بۆ ناوەندی حکوومەتەکەی. لەم رۆژانەدا ئارکێل حوکمرانی ژێرباڵی ئەفشاری لە تفلیس وەدەرنا و بیست ساڵ دواتر بوو بە یەکێک لە بەهێزترین حاکمانی باکووری ئاراز. وەختایەک شاروخ چووە سەر تەختی پاشایەتی، فەرمانی حکوومەتی هەر دوو پارێزگاکەی ژێردەسەلاتی لەوێوە پەسند کرا و درایە دەستی[٢٩]. بەلام هەر خێرایەکی دەرکەوت کە مەشەد ناتوانێ بۆ ماوەیەکی درێژ ناوی پایتەختی ئیمپراتۆرێتی ئێرانی لە سەربێ. ئەو راپۆرتانەی کە دەوروبەری ساڵی ۱۷٥٠ لە لایەن شاهیدانی ئورووپایی و ترکەوە نێردراون دەریدەخەن کە ئارکێل گوێقولاغ بووە تا بزانێ کێ لە ئێران دەسەلات بە دەستەوە دەگرێ هەتا ئەویش سەری وەبەر بێنێ. سەرهەلدانی باشووری ئاراز بە دەس لەشکرێکی

28- For details of the Darband episode, See Bakikhanov 165–166; Butkov III,134–140;Baddeley, 37–38; Akademiya Nauk,istoriya Dagestana,378-379.
29- Brosset, 131 – 158; Peyssonne; Part II, 109, 110, 153; cf. Lockhart, Nadir shah, 259; Lang, Last Years, 144 – 148.

چڵهەزارکەسە بە وەبەرچاو گرتنی هەموو لایەنەکانی پارێز سەبارەت بە دەوڵەتەکانی رووسیا و عوسمانی تێکشکا[30].

برشت و دەسەلاتی «ئارکێل»یش ئەگەرچی لەم رۆژگارەدا وەک دۆزی فەتحعەلیخانی ئەفشار کەوتبووە مەترسی، بەلام هەرچۆنێک بێ لە سەر دەسەلات مایەوە و سەرەنجام لە ساڵی ۱۷۹۸دا کە مرد دامودەزگاکەی تێکقرما. تەنیا هاوپەیمان و هاوڕێی لە رۆژاوا شاسلێمانی ئەیمەرتی بوو کە خۆی هەمیشە لە ژێر هەڕەشەی ترکانا بوو. لە ساڵی ۱۷٤۹دا کە ئێرەوان ئامادەی دانی باج و خەراج بوو، لانیکەم تا پاش چوارجار تێکهەڵچوون و گێڕانی شانۆی سەربازی کە تا ساڵی ۱۷۸۰ی کێشا، ملی نەدا[31]. لە گەنجە شاوێردیخانی زیادئۆغلووی قاجار ساڵی ۱۷۵۱ بە عوسمانییەکانی ڕاگەیاند کە چونکە لە حاڵی حازردا ئێران پادشایەکی نیە، سەرووەبەر سوڵتانی عوسمانی دێنێ[32]، بەلام هەڵبەت لەبەر ئەو کەلێن و کەلەبەرانەی پەلامارەکانی پەناخانی جەوانشێر و ڕاپەرینەکانی نێوخۆ کردبوویانە سەری، بە لاوازی ئامادە بوو کە بکەوێتە ژێر سێبەر و بەر پاڵپشتی ئارکێل. پاش ساڵی ۱۷٦۸ محەممەدحەسەنخانی کوڕیشی تووشی قەیرانێکی ئەوتۆ هاتبوو[33]. قەڵەمڕەوی برایمخەلیلخانی قەرەباغی بە خۆی و بڕانی جەماوەری ئەرمەنییەوە لە ساڵی ۱۷٦۰را کەوتە سەر حکوومەتی ئارکێل، بەلام هەڵبەت هەتا ڕادەیەک وەک نیمچە سەربەخۆ وابوو[34].

لە ساڵی ۱۷۵۲دا هەوڵی دا کە بە هاوبەشی خانەکانی شووشە، قەرەباغ، ئێرەوان و نەخجەوان دژی دەسەلاتی «حاجی چەلەبی» حوکمڕانی شەکی یەکێتییەکی پێکبێنێ، بەلام حاجی چەلەبی دەستی خۆی ڕەپێش دا و هێرشی کردە سەر و پەیمانەکە لێکهەڵوەشا[35]. ئەگەرچی ئارکێل و پارێزوانانی «چرکەس»ی پەلامارەکەیان بەرپەرچ دایەوە، بەلام بە هەرحاڵ قەومانی ئەم

30- MAE Perse VII, NO. 81.

31- Brosset, 151 – 162. 63; SP 97/35, 95b (25 August 1750); Butkov III, 146 – 154; Tsintsadze, 139 – 141; Hatt – i – Humayun . 73 (1189; cf. Lang, Last Years 148 – 149).

32- Hatt –i – Humayun, 224 (21 Shawwal 1163).

33- Butkov III, 96 – 97, 112, 128.

34- Ibid, 337.

35-Bakikhanov,161; Butkov III 89–90;MAE Perse VII,NO .81;Peyssonnel Part II, 153.

ڕووداوە بوو بە هۆی ئەوەی کە تەیموورس بکەوێتە شوێن یارمەتیخواستن لە ڕووسیا و چوونە پاڵ هێزەکانی ئەو ئیمپراتۆرییە. هەڵوێستی دەوڵەتی ڕووسیا دڵساردی بەشوێنەوە بوو؛ سەرەنجام لە ساڵی ١٧٦٠دا وەختایەک کە خودی تەیموورس بە مەبەستی داوای یارمەتی لە دەوڵەتی ڕووسیا بۆ بەرەنگاربوونەوەی پەلاماری دەسبزێوانی لەزگی چووبووە ئەم وڵاتە، فەرمانڕەوای پیر لە گەڕانەودا ماڵاوایی لە دنیا کرد[٣٦] و ئارکێلی وەک حوکمڕانی خودبەخودی کارتێل ـ تاختی بەجێهێشت. لە ساڵی ١٧٦٨دا بابیعالی شەڕی لەگەڵ ڕووسیا ڕاگەیاند و بە مەبەستی ڕێکخستنی هێزەکان دژی دەروجیرانانی مەسیحی کەوتە وتووێژ لەگەڵ ئووسمی و شەماخی[٣٧]. لەم کاتەدا ڕووسیا بە ناسەرسەنگی بە پیر داوای فریاخوازی «سلێمان» و «ئارکێل»ەوە چوو(٨) و هێزێکی پێنسەدکەسی بە سەرکردایەتی ژێنێڕال «تودتلبێن» نارده وێ. ئەم ژێنێڕالە لە ساڵی ١٧٧٠دا دەستی لە ئارکێل بەردا هەتا خۆی بە تەنیا لە «ئاسپاندیزا» بەرەوڕووی لەشکری گەورەوگرانی ترکان ببێتەوە و خۆشی خێرایەکی بانگ کرایەوە و لێخرا. لە ساڵی ١٧٧٣دا سێهەمین باڵوێزی گورجستان ڕووی کردە پێترێزبوورگ و داوای لە ڕووسیا کرد ئەم هەرێمە بخاتە ژێرباڵی خۆی و سەربازگەیەکی بنەگری هەمیشەیی لێدابنێ[٣٨] و مەترسی تەنینەوەی دەسەڵاتی ئاغامحەممەدخانیشی لە گوێ سرەواند و سەرەنجام ڕازی کردن کە بە بەستنی پەیمانی «گیورگیوسک»(٩) بەرپرسایەتی سیاسی و لەشکری پاشماوەی حکوومەتی گورجستان بخەنە ئەستۆیان[٣٩].

## ١٣ ـ ٤ قەفقازی ڕۆژاوایی و وەکیل

لەم حاڵوڕۆژەدا دەکرێ بگوترێ کە وەکیل بەگشتی بەرپرسایەتی

36- Brosset, 173, 218; Butkov III, 91, 1012; Hatt – i – Humayun; 2256; cf. Lang, Last Years, 150 – 152, 155.
37- Hatt – i – Humayun, 94a, b (1189), 170 (1183).
38- Tsintsadze, 134; Butkov III, 116, 119, 126 – 127; cf. Lang, Last Years, 164, 168 – 169. 170, 172 – 175.
39- Brosset, 249 – 250, Lang, Last Years, 178.

سـەبارەت بـەم مەڵـبەندە لەمپـەر و نێوانـەی لـە ئەسـتۆی خـۆی داڕنیبـوو. چەوساوەکانی گورجستان سەرلەنوێ هاواریان بۆبردەوە. لە دەوروبەری ساڵـی ١٧٦١دا دانیشتووانی کۆنەشاری شەماخی داوایان لێکرد کە «مەحموود سـەعید»ی دەسبژێرکراویان بۆ حکوومەت وەک خـان لـە شـوێنی خـۆی دابنێتـەوە. ئـەم داخوازە ڕەزامەندی لە سەر دەربڕا؛ بۆیـە جـەماوەری شـاری شـەماخی حـاجی مەحموودعەلی حوکمڕانی ناخۆشەویستی هەڵبژاردەی نادریان لێخست و داوایان لە مەحموودسەعید کرد بێ و حکوومەت بە دەستەوە بگـرێ[٤٠]. لـە ساڵـی ١٧٦٨دا ڕعێت و خێلاتییەکانی خانشینی نەخجەوان داوایان لە وەکیل کرد کە پێویسـتە لەبەر وەی حوسێنعەلیخان ملی بۆ زێدەڕەوییەکانی ئارکێـل ڕاکێشـاوە تـەمێ بکرێ[٤١]. هەندێک پاش ئەم داخوازە خەبەر هات کە هێزەکانی ڕووسـیا هاتوونـە ئەیمەرتی و کارتێل و کاختی[٤٢]. وەزارەتی دەرەوە لە سـەنت پێترێزبـوورگ لـە ساڵی ١٧٧٠دا بۆ خاتری بەرگرتن لە هەڵتەزینەوەی وەکیل، ڕێـزدار «بوگـولی» کردە قۆنسوولی ئەو دەوڵەتە لە ڕەشت و فەرمانی دا کە بـە نـاردنی نامەیـەکی دۆستانە بۆ وەکیل و فەتحعەلیخانی دەربەندی و گـەورەپیاوانی دیکـەی ئێـران شیکردنەوەیەک بنووسێ و دڵنیایان بکاتەوە کە پشتیوانێتی دەوڵەتی ڕووسیا لە سلێمان و ئارکێل تەنیا زنجیرە چالاکییەکی کاتی بووە بە مەبەستی بەرگرتن لـە لێشاوی هرووژمەکانی حکوومەتی ترکان و دەسەڵاتی قەیسەری قەت چـاوی بـە شوێن خاکی ئێرانەوە نیە. وێناچێ کە کەریمخان نامەیەکی ئەوتۆی بـە دەسـتی گەیشتبێ، بەڵام هەرچۆنێک بێ لە وڵامی سکالانامەیەکی ئارکێلدا سەبارەت بـە حاکمی قارس، نامەیەکی بۆ نووسی و تێیا لە حوکمڕانی گورجسـتانی ڕاسـپارد کە وا چاکە دەس لە هێرش و شالاوی سنووری هەڵـبگرێ و خـۆ لـە وەرگـرتنی یارمەتی و تێوەردانی ڕووسیا بپارێزێ. ئارکێـل لـە نامەیـەکدا سـەبارەت بـە هەردک بابەتەکە و شەڕەکانی دەگەڵ عوسمانی وڵامـی دایـەوە کـە هاوپـەیمان بوونی لەگەڵ ڕووسیا کـارێکی بەرژەوەندخوازانـەی بوێرانەیـە بـۆ پاراسـتنی

40- Dorn, 417 – 418; Butkov I, 248; cf. Bakikhanov 159.

41- Niikitin, Les Kurds, 125. the Bigzadeh inhabited the urmiya region, see Karimi, Joghrafya, 150.

42- Tsintsadze, 110 (NO. 5).

قــازانجی ئێــران و تێکهەڵچوونەکانیشــی لەگــەڵ عوسمــانی دەبێتــە هــۆی وەرگرتنەوەی خاک و هەرێمەکانی پێشووی ئێران[43].

ئارکێل وێڕای تەواوی ئەو ڕێزە سیاسییانەی بۆ ئارکێلی دانــابوو هــیچ چەشنە دەســتەبەربوونێکی بــە مەبەســتی بــەڕێوەبردنی دەســتوورەکانی یــان بەیعەت پێکردنی وەبەرچاو نەگرتبوو و کەریمخانیش لــەم بــارەوە هــەنگاوێکی هەڵنەهێنایەوە. وەکیل گیرۆدەی داوی سەربزێوی خێڵی قاجار و شەڕ بوو لەگەڵ عومان و لە هەلومەرجێکا نەبوو کە بپەرژێتە سەر کێشەی گورجستان[44].

هەڵبەت ئەم نامەیە بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو، چونکە ئارکێل پێشتریش لە نووسراوەیەکی ئەوتۆدا بۆ سوڵتانی عوسمانی لە ساڵی ۱۷٤٤دا ئەوپەڕی ڕێز و مەرایی نواندبوو. نامەی ئارکێل لە وەڵامی نیمچە فەرمانێکی بابیعالی دابوو کە لەگەڵ چەند دیاری و خەڵاتێک ناردبووی بۆ تەواوی حوکمڕانانی ئازەربایجان و باکووری ئاراز و دەیەویست کە سەبارەت بە پشتیوانی یان لانیکــەم بــێلایــەنی ئەوان لە مەسەلەی کوردستان و کێشە لەگەڵ میرانی زەندیــەدا دڵــنیا بێتــەوە. «ژۆزێف ئەمین» ناسیۆنالیستی ئەرمەنی گێڕاوییەتەوە کە وەختایەک باڵوێزێک لە لایەن کەریمخانەوە بە مەبەستی وەرگرتنی خــەراجێکی کــە بــڕێتی بــوو لــە ژمارەیەک کیژ و کوڕی گورجی هات، ئارکێل بە شێوەیەکی پڕســووکایەتی ڕێــی نەدا و خۆی لە دیداری پاراست[45]. گورجییەکان چ لە ڕۆژگاری عادڵشادا لە ساڵی ۱۷٤۸ و چ لە زەمانی عەلیمرادخانا لە ساڵی ۱۷۸٤دا بە شــێوەی پۆلــەچەکــداری بــەرچاو چالاکانــە بەشــداری ســپای ئێــران بــوون. فەرمانــدەی تۆپخانــەی کەریمخانیش پیاوێکی گورجی بوو[46]. ڕەنگە بکرێ سۆهرابخان بە ئاخرین پیاوی گورجی دەرباری دابندرێ کە لە ئێرانا دەورێکی سیاسی چالاکی بە ئەستۆوە بوو. گورجییەکان لە سپای ڕووسیاشدا چ وەک ئەفســەرانی تایبــەت و چ لــە ساڵــی

---

43- Ibid, 134 – 139. For the status of the Russian consul, see below, 15.2.

44- Ibid, 140 – 142 (NO. 6), 142, 144 (NO. 7). Cf. Hatt – i – Humayun, 174 (also published by M.R. Razavi in Bar - rasihaye Tarikhi X. NO. 1, 184); Butkov I, 289; MT, 341; Lang, Last Years, 171.

45- See Malcolm, 213 note; Kishmishev, 235 – 236.

46- Butkov I, 234 –235; Ferrieres de Sauvebioeuf,218, Niebuhr, Reise,103, 118.

١٧٦٨را بەرەودوا وەک لکەسوارێکی سووکەڵەچەک خزمەتیان دەکرد[٤٧].

کەریمخان دوو ڕێبازی دیکەی بۆ شوێنکردنە سەر حاکمانی سەربزێوی دەگرتە بەر: یەکیان خزمایەتی لە ڕێی ژن و ژنخوازی و ئەوی تر پیلانی سیاسی. ئەمانە ویکڕا ببوونە هۆی ڕاگرتنی وەکیل. پێشنیاری زەماوەندی ئەبولفەتحخانی کوڕەگەورەی وەکیل ئەگەرچی بەڕواڵەت لە لایەن فەتحعەلیخانی دەربەندیڕا قبووڵ کرا، بەڵام هەرگیز وەکردەوە نەگەڕا[٤٨]. لە ساڵی ١٧٦٧دا ئەلێکساندر(١٠) کە خۆی بە خاوەنی تاج و تەختی حوکمڕانێتی گورجستان دەزانی، لە لای ئارکێل ڕایکرد و پەنای بردە بەر شیراز. بەڵام پاش ڕووداوی دەربەند وەکیل تەنانەت چەند دیاری و خەڵاتێکی نارد بۆ ئووسمی قەرەقیتاق (قەراقیتاق) و دنەی دا پەلاماری گورجستان بدا و ئەلێکساندر بەرێتە سەردەسەڵات. ئووسمی تەواو دژی یەکێتی فەتحعەلیخان و شەماخی ڕاپەڕی، بەڵام ئەویش لە وەکیل زیاتر هێزی شەڕکردنی دەبەردا نەبوو و خوازیارەی تانج و تەختی گورجستان هەتا ماوەیەک پاش مردنی وەکیلیش هەر لە شیراز مایەوە[٤٩].

حوکمڕانانی گورجستان سەبارەت بە ئەگەری پیلانگێڕی دەرباری زەند هەمیشە گوێقوڵاغ بوون. لە ماوە و سەردەمی بۆشایی دەسەڵات و مەودای پێکهاتنی دەوڵەت لە ئێرانی ساڵانی ١٧٥٢ و ١٧٨٠دا ئارکێل پەنای دا بە یەکێک لەو کەسانەی خۆی بە خاوەنی تەختی پاتشایەتی ئێران دەزانی و پشتی گرت. فەتحعەلیخانیش لە ساڵی ١٧٨٤دا دەیەویست لەم ڕێبازە بۆ دژایەتی دەوڵەتی ئێران کەلک وەربگرێ، بەڵام هیچکام لەوان سەرکەوتنێکیان وەدەس نەهێنا[٥٠].

زۆربەی ئەو سکانەی بەجێماون دەتوانن وەک شاهیدێکی ئاشنا لە سەر ڕەوتی ڕووداو و کەڵەوەکێشییەکانی وڵاتان حیسابیان بۆ بکرێ؛ بەڵام وەک دیارە

47- Butkov, 159, 160.

48- Bakikhnov, 159, 160.

٤٩ گوڵشەنی مراد، ل ١٦٣ ـ ١٦٤؛ ANP, B1, 175, 16 May 1771; Brosset, 238; Bukov III, 108, 143; cf . Lang, Last Years, 158, 178 – 179; Perry correspondence in Bar – rasiha – ye – Tarikhi XI, NO. 1, 234.

50- Peyssonnel Part II, 153; Butkov III, 153, 154, 180; cf. Lang, Last Years, 179.

سکەکانیش وەک نامەکانی ئارکێل خاوەنی دوو ڕوون! سکەی زێو بە ناوی شاسمایلی سێهەم لێدراون یا بەپێی دابی زەندیە بە «یاکەریم» نەخشێندراون. ئەم سکانە لە شەماخی و نەخجەوان و گەنجە و تفلیس لە مابەینی سالانی ١٧٦٤ و ١٧٧٦ڕا تا سالانی ١٧٨٠ ـ ١٧٩٩، واتە ٢١سال پاش مەرگی کەریمخانیش بە باشی لە تفلیس وەگیر دەکەوتن. بۆ ڕوون بوونەوەی پتری بابەتەکە دەبێ سەرنج بدەینە ئەو ڕیزە سکانەی ئەوان ڕۆژان لە تفلیس (١١٧٦ ـ ١٢١٠ی کۆچی / ١٧٦٥ ـ ١٧٩٥ی زایینی) لە برەو دابوون و بەرێکیان نەخشی مەسیحایەتی بە زمانی گورجی و تەنانەت ڕووسی پێوە بوو و ئەغلەب بە شێوەی هەلۆیەکی دووسەری ئیمپراتۆرییەتیش خۆی دەنوێنێ. ئەگەرچی دەربارەی کاری بەجێی کەریمخان سەبارەت بە لێدانی سکەی زێوی برەودار بۆ بازرگانێتی سەرانسەری ئێرانا هیچ گومانێک لە گۆڕا نیە، بەلام لێدانی سکەی «مز» ـــ کە تەنیا لە نێوخۆی شارەکان دەچوون ـ نیشانەی ڕەنگدانەوەی هەلوێستگرتنی ئارکێلە بە لای ڕووسیادا[٥١].

وەختایەک کە کەریمخان لە سالی ١٧٦٣دا گەیشتە بەستێنەکانی چۆمی ئاراز، پاش گرتنی ئازەربایجان بە مەبەستی جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی کەوتە ڕاکێشانی سەرنج و پشتیوانێتی حاکمانی خۆجێیی. کە گەیشتە قەرەباغ فەتحعەلیخانی دەربەندی لە ڕێی ژن و ژنخوازیڕا ڕەزامەندی خۆی بۆ یەکگرتوویی سیاسی دەربڕی و ئارکێلیش بەلێنی ئازادکردنی ئازادخانی دا و بە جووتە سەریان وەبەر هێنا. هیچکام لە حوکمڕانانی خۆجێیی پێویست نەبوو کە بەڕەسمی بەیعەت بکەن یان کەس بە بارمتە بنێرن و تەنانەت سەبارەت بە دانی پیتاکی سالیانەش بابەتێک نەنووسراوە. کەریمخان پاش گەڕانەوەی بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی ڕاپەڕینی زەکیخانی ئامۆزای دەستی لەمانە بەردا هەتا ئیمپراتۆرییەتی دژوار وەچنگهاتووی خۆیان سەربەستانە پتەو بکەن، چونکە لەو ڕۆژگارەدا وەکیلیش خۆی خەریکی قایمکردنی بناغەی دەسەلاتی بوو.

---

51- Pooles, 105 ff.; Rabino, ((Coins of the shahs of Persia)) 179, 192; Lang, Numismatic History, 110– 115; cf. Perry, Correspence in Bar – rasiha – ye - Tarikhi XI, NO. 1, 243 – 244.

## ١٣ ـ ٥ تیئۆری حکوومەتی ناوەندی

ئاڵوگۆڕ و ئەمبارئەوبار بوونی سەردەمی فەرمانڕەوایەتی کەریمخان دەربارەی پاشماوەی هەرێمەکانی سنووری کە قەڵەمڕەوی حوکمڕانانی ئەردەڵان، لوڕستان و عەرەبستانی دەگرتەوە، لە بەشەکانی پێشوودا شیکرانەوە. کەش و هەوایەکی تر کە بە میراتی بۆچوونی حکوومەتی سەفەوییە دادەندرێ و لەگەڵ ڕووداوەکانی مێژوویی یەکتر دەگرێتەوە سرشتی دەسەڵاتی سیاسی کەریمخانە.

پلەی کۆمەڵایەتی پاشایەتی دوای سەفەوی کە پاش کۆمەڵێک گۆڕانکاری لە سایەی زاڵبوونی ئەفغانییەکانەوە سەری هەڵدا لە زۆر بارانەوە گەلێک وەک چارەنووسی ئاخرین خەلیفەکانی عەباسی دەچێ کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری میرانی بە ڕەگەز ئێرانی و ترکانی سەدەکانی دە و دوازدەی زایینی. وەختایەک کە حکوومەتی سەفەوی لە شێوەی کۆنفێدراسیۆنێکی پێکهاتوو لە هۆز و تایفە ئازاکانەوە گۆڕا بۆ حکوومەتێکی کۆدەسەڵاتی پڕ لە دیوانسالارانی شارەکی، ڕێبەرانی وڵات کەمتر لە نێو پەیڕەوانی پیری سۆفی و سەیدەکان و کوڕانی پێشەوایانی ئایینی هەڵدەبژێردران، بەڵکوو زیاتر لە نێو حوکمڕانانی قەدیمەوە دادەندران. پلە و پایەی ئایینی دەسەڵاتی شا لە سایەی موجتەهیدەکانیڕا کە دەمڕاست و شیکەرەوەی یاساکانی خودایی بوون، بە سەرنج دان بەم خاڵە کە شا تەواو ببوو بە دەسەڵاتێکی زاڵ و سیاسی، پتر وەک بەڕێوەبەری یاساکانی ئیلاهی خۆی دەنواند. ئەگەرچی شا زەمانێکی کە تەنیا خۆی خاوەنی دەسەڵات بوو دەبوو بە فەرمانڕەوایەکی دیکتاتۆر، بەڵام دیسانیش هێندێکی فەڕ و شکۆی ڕووحییەتی لەمێژین یانی شوێنپێی سەمبولیکی ڕابردوو و کەسایەتییەکی ئەوپەڕی پاشایەتی وەدەس هێنابوو. بەڵام سەرەنجام بناغەی دەزگا و دامەزراوەکانی سەفەوی قەت لە سەر هەوای پێشوویان نەمان. لەبەر شەپۆلی هرووژمی دوژمن بە شێوەیەکی ئازایانە تێکشکا. بەڵام دیسانیش بە ناسەرسەنگی و بێوازی کەڵتە کرایەوە و لە سەردەمی پاشایەتی کەریمخانیشدا تۆزە پاشماوەیەکی مابوو. کەچی لە زەمانی نەبوونی ناوەندێکی دیکەدا بۆ درێژەی حکوومەت، سەرلەنوێ سازکردنەوەی دامودەزگاکانی سۆفیمەزن پێویستی

دەنواند[٥٢].

بۆیە عەلیمرادخان و محەممەدحەسەنخـان و کـەریمخـانیش کەوتنـە سوودوەرگرتن لە قاپۆڕ و ڕووکاری شـای سـەفەوی وەک تـەوەرەی یـەکێتی و دامەزران بە دژی جێنشینانی نادر، چونکە پێیان وابوو بەرژەوەندی لەوەدایە کە لە دەوری شاسمایلی سێهەمی گومناو کۆببنەوە کە چەشنی تەلیسمێکە و دەبێتـە هۆی بەدیهاتنی دەسەڵاتی یاسایی و ڕاکێشانی جەماوەر. هەروەک نادرشاش لـە کاتی لێخستنی شاتۆماسبدا وای بە باش زانی کە منداڵـەی کـەمتەمـەنی واتـە شاعەباسی سێهەم بکاتـە جێنشـینی[٥٣]. ئەمانـە هـیچ ڕێزێکیـان بـۆ ئـەم شـا دەستەمۆیانەی خۆیان دانەدەنا و هەرگیز سەرنجیان نەدەدایە ئـەم بابەتـە کـە داخوا بەڕاستی لە ڕەگەزی خانەدانی پادشایەتی سـەفەوییە یـان نـا و قـەتیش گوێیان نەدەدایە نارەزامەندییەکانی سـەبارەت بـەوەی کـە بەڕاسـتی وازی لـە شایەتی نیە[٥٤]. هەم خەڵک و هەم فەرمانڕەوایان بـە چـاکی ئاگـادار بـوون کـە سیساڵ داگیر و پێخوست کرانی وڵات و ئاژاوە و نەبوونی حکوومـەت چەنـدیان گیروگرفت بەدیهێناوە و بەڕاستی ڕایەڵوپۆی ئیداری لە درێژەی ئـەم ماوەیـەدا لەگەڵ دادپەروەری و هێمنایەتی و پاراستنی سنوور و خاکی هەرێمـەکانی وڵاتی بەدەم با دادا[٥٥]. ئەگەر بەوردی لەم بابەتە خوردبینەوە دەبینین لەبری وەی شای دەستەمۆ وەک سەمبولێکی زیندوو چاوی لێبکرێ، بە شێوەی بەردەستەیەک هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرا. هەرچۆنێک بوو بـارودۆخ وای هەڵـدەگرت کـە لـە ساڵی ١٧٦٤دا کەریمخان بۆ گەڕانـەوە فـارس ئامـادە بـێ و شـا بـە تویێشـە و تەدارەکی تەواوەوە لە قەڵای ئابادە بخاتە ژێر چاوەدێری و ڕۆژانە بڕی تمەنێکی

---

٥٢ـ مینۆرسکی هێندێک بـیر و بۆچـوونی سـەبارەت بـە پاشـایەتی و هـەڵومـەرجی سەفەویان لە تەزکەرەتولملووک، ل ١٢ ـ ١٤دا شیکردۆتەوە؛

Lambton, ((Quis Custodiet Custodes)) 142 – 143; Savory, the Safavid state and Policy, 179 – 181; Perry, ((The Last Safavids)) 59 – 60.

53- See Lockhart, Nadir shah, 62 – 63.

٥٤ـ ڕۆستەمولتەواریخ، ل ٢٨٣ ـ ٢٨٤: MAE Perse VIII, NO.5. Olivier VI, 124.

55- Ferrieres de Sauvaboeuf (234), refrring both to the earlier interregnum (1747 on) and that of his own time (1785), with eloquent despair

بۆ خەرج بکرێ و دیاری و خەڵاتی نەورۆزانەی وێبدرێ هەتا خان نیشانی بدا کە یەکێک لە «کەمترین بەندەکان»ی ئەوە. شای دەسبەسەر ڕۆژێ خـۆی بـە کـاری وێنەگەری و چەقۆسازکردنەوە دەخافلاند. سەرەنجام لە ١١٨٧ی کـۆچی / ١٧٧٣ی زایینی بێ ئەوەی خەڵک ئاگایان لێبێ مرد[٥٦].

ئەم وشەیەی کە بە هاتنە سەر دەسەڵاتی کەریمخان بـەدیهات خـاوەنی سەنگ و پلەیەکی تایبەت بوو. وشەی وەکیل یـانی نوێنـەر، ئەگـەر نیشـانە و سلسلە و پلپلەی دیکـەی وێنـەخرێ، بارتـەقا و لێـکولێکـی پلـەی پێشـووی «سەرداری پارێزگا»یە لە سەردەمی پاشایەتی شاعەباس‌دا. وەکیلی دەوڵەت پایە و پلەیەک بوو کە لە زەمانی پەیدابوونی یەکێتی سـەردارانی سـێکۆچکـەدا لـە ئیسفەهان عـەلیمـەردانخـانی بـەختیاری دایهێنـا. پێشـینەی ئـەم نازنـاوە دەگەڕێتەوە سەر خانی ئەفشار لە زەمانی شاتۆماسب‌دا و دەس‌بەسەرداگرتنی لە لایەن نادرەوە. نازناوی «وەکیلی دەوڵەت» لەگەڵ نـاوی تێکـەڵاوی «جێنشـینی میری» کە ئەو خـۆی بـە خـاوەنی ئـەم پلەیـە دەزانی لـە لایـەن شاعەباسـی سێهەمەوە، وێکدەچوون. هەروەها ئاماژەیـەک بـوو بـۆ سـەر سـەرکردایەتی هەرەباڵای هێزەکان لە لایەن شاوە[٥٧] و شێوازی دیکتاتۆری لەشکری ـ سیاسی کە لە کردەوەدا مەزنی سەرکردەکانی سەدەی دەهەم و یازدەهەمی بەغدای پێ ناودێر دەکرا. کەریمخان بە تلاندنی عەلیمەردانخان بوو بە میراتگـری ئـەم نازنـاوە، بـەڵام هـەر ماوەیـەک دواتـر کـە لـە ساڵـی ١٧٦٥دا ـ بـەگوێرەی نووسـینی ڕەزاقولیخان ـ لە شیراز بنەی داکوتا ئاڵوگۆڕی بە سەر هێنا و کردی بە وەکیلی ڕعێتان یان وەکیلی جەماوەر و تـا ئـاخرین ڕۆژەکـانی ژیـانی پێـی لـە سـەر بەکارهێنانی ئـەم نازنـاوە دادەگـرت. وەک عەبـدوڕڕەززاق دەنووسـێ «ئەگـەر کەسێک بە شا ناوی هێنابا لەڕێوە بە سەری دەڕۆیـی و بـە خۆبەکـەمزانینـەوە

---

٥٦ـــ دونبـولی، تەجرەبەتولئـەحرار، بـەرگی ٢، ل ٣١؛ ڕۆسـتەموتتەواریخ، ل ٣٣٧؛ پەرتەو بەیزایی، ل ٦١؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٩.

٥٧ـ مینۆرسکی، تەزکەرەتولملووک، ل ١١٤ ـ ١١٥؛ لۆکهارت، نادرشا، ٦١ و ٦٣؛ Savory, ((Some Notes)) 114.

دەیگوت شا ئەوە لە ئابادەیە و من تەنیا کەیخودایەکم[٥٨].»

پلەی وەکیلی ڕعێتان (وکیل‌الرعایا) لە سەردەمی سەفەوییە، قاجارییە و زەندیەدا شوغڵێکی ئەیالەتی و ئیداری بوو. وا دیارە ئەم شوغڵە بەڕواڵەت نوێنەرایەتی جووتیاران و کرێکارانی لە ئەستۆ بووە و لەبری وەی هەڵبژاردەی حوکمڕانانی پارێزگاکان بۆ لە لایەن کەیخودایان و کەلانتەرەکانی خۆولاتیڕا هەڵدەبژێردرا و شاش حوکمی دەس بەکار بوونی دەدایە[٥٩]. لەگەڵ ئەمەشدا بەر لەوەی بە نوێنەری حوکمڕان دابنرێ، ئەرکی بەپێی پێویست نوێنەرایەتی جەماوەری خەڵک بوو (ئەوانەی کە لە نێو چینەکانی باڵادا پشتیوانێکیان نەبوو) لە وەختایەکدا کە دەکەوتنە بەر شەپۆلی زوڵم و چەوساندنەوەی دەرەبەگان و کاربەدەستانی حکوومەتی. لە ڕاستیدا کەریمخان بە گۆڕینی ناوی شا بۆ ماکە و هەوێنی پاراستنی جەماوەری خەڵک ڕایگەیاندبوو کە دەیهەوێ وەک بەڕێوەبەری عەدالەتی کۆمەڵایەتی و فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر حکوومەت بکا.

سەبارەت بە جێگۆڕکەی وشەی «دەوڵەت» و «ڕعێت» دەکرێ لێکدانەوەی ڕاگەیاندنی ڕەسمی لابردنی شاسمایلی سێهەمیش کە زۆری فوو لێکرابوو

٥٨ـ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ٨٠ ـ ٨٢؛ کووهمەرەئی، ل ٤٦٠؛ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ٢، ل ٣١ (ئێمە پیاوێکی کەیخوداین)؛ ئیسفەهانی لە بەرگی ٢ ئادا، بە وەکیلی ڕعێتانی نووسیوە، (وکیل‌الرعایا).

٥٩ـ موشیری لە گۆڤاری توێژینەوەکانی مێژووییدا، ساڵی هەشتەم، ژمارە ٣، ل ١١٢، فەرمانێکی چاپ کردووە کە تێیدا عەلیمرادخان، ئاغا محەممەدئەهدی کردۆتە وەکیلی ڕعێتەکانی قوم. کتێبی شۆڕشی مەشرووتەی براون چاپی کەمبریج، ساڵی ١٩١٠، ل ١٣١، ئۆباڵ بۆ ئەم پاساوە دەکێشێ کە یەکەمین نوێنەری هەمەدان لە پارلەمانی شوورای نەتەوەییدا وەکیلی ڕعێتەکانی ئەو شارە بوو...

*ئۆلیوێر کێرموول ناسراو بە لۆردی پشتیوانی بریتانیا، سیاسەتوانێکی ئینگلیسی بوو کە لە ساڵی ١٦٤٠دا بە ئەندامی پارلەمان هەڵبژێردرا و شۆڕشێکی بەرپا کرد و لە «ناسبی» هێزەکانی پادشایەتی تێکشکاند. ئەو دادگایەکی پێکهێنا کە شارلی یەکەمی بە مەرگ مەحکووم کرد... بە پێودانێکی دیکتاتۆرانە حکوومەتی گرتە دەس و لە ساڵی ١٦٥٣دا چونکە پارلەمان وەبالی بۆ کارەکانی نەکێشا، هەڵیوەشاندەوە. ئەم پیاوە گەلێک یاسای باشی دانا کە بە «یاساکانی کێرموول» ناودێر کراون. (فەرهەنگی موعین، بەرگی ٦، ل ١٥٦٦ ـ ١٥٦٧؛ وەرگێڕ).

وەبەرچاو بگیرێ. لە ڕاستیدا کەریمخان سیستمێکی حکوومەتی «کێرموول*»ی لە سەر بنەمای پاتشایەتی ڕۆنا و دیکتاتۆریێتی پرۆلتاریای بەدیهێنا. لەم ئاڵوگۆڕە زیرەکانەیەدا لابردن و گۆڕینی وشەکان هەر لەخۆوە نەبوو. کەریمخان دەبووا دەس بەردا لەو مەشرووعیبەتە ئایینییەی خۆی وەک ئەوەی وا لە حکوومەتی سەفەویاندا هەبوو و بە شێوەیەکی ڕواڵەتی شای دەستندەخۆری بپارێزێ هەتا مەترسی ڕیسوابوونی داگیرکردنی دەسەڵاتی نەخرێتە ئەستۆ. نادرشای دیکتاتۆر سەرەتا سواری وزەی بزوێنەری تێئۆری ژیاندنەوەی درێژەی پاشایەتی خانەدانی سەفەوی بوو و بە توانایی خۆی و پاڵپشتی لەشکرییانی کەوتە سەر باری فەرمانڕەوایەتی پاوانکراوی و سەرەنجام وەختایەک لە باری کەسایەتی تووشی تلاسان هات لەبەر چاوی جەماوەری خەڵک کەوت و شکا و پیاوەکانی لێیهەڵگەڕانەوە. وریایی و ئاقڵمەندی وەکیل لە سەر پێوشوێنی هەمان سرشت و تەبیاتی ئارامیخوازی وای کرد کە لەچاو فەرمانڕەوایەتی خانەدانی سەفەوی وەک سەردەمێکی پرشنگدار ڕێزی لێبگرێ و لەگوێن تایفەی ئەفشار نازناوی دیکتاتۆر و داگیرکەری تەختی پاشایەتی لەخۆنەگرێ. لەگەڵ ئەمەشا ئەو خۆی بە کەیخودایەکی مابەینی جەماوەری خەڵک و میرێکی بەڕاستی سەمبولیک نیشان دەدا.

بیر و بۆچوونێکی ئاوا سەبارەت بە حکوومەت جگە لەوەی هەمیشە سیلەچاوێکی لە ڕابردوو بێ هیچ کاریگەرییەکی دیکەی نەبوو. سەبارەت بە حاوانەوە، خۆشمەشرەفی و دادپەروەری وەکیل نەقڵ و نەزیلەی زۆر وەبەرچاو دێ. چ ئەمانە ساختە بن یان ڕاستەقینە بەهەرحاڵ بۆچوونی ڕوون و پوختی «هۆرن» دەسەلمێنن کە دەڵێ: «بۆ ئەوەی دەستی بگاتە مەبەست و شتی باشتر، پشتی لە دنیا هەڵنەکردبوو، بەڵکوو ئەو پیاوە بۆ شێوازێکی ئاوا فەیلەسووفانە زۆر ساکار و گوندەکی بوو. وای دەنواند پتر لەوەی کە پاتشایەکی گەورە بێ، چەشنی ڕیشسپی تایفە و بنەماڵەیەکە[٦٠].» دونبولیش ئەم بابەتەی ئاوا لێکداوەتەوە و دەنووسێ «ئەو بە باری خدەوخۆوی سروشتیدا زیاتر لەوەی

٦٠ـ Horn, 593 دەنووسێ: «ئەو بەر لەوەی فەرمانڕەوای وڵاتێکی گەورە بێ، وەک باوکی بنەماڵەیەکی باوکسالار وابوو.»

وەک پادشایان بچێ، چەشنی کەیخودایەک وابوو.» وێڕای ئەمەش بە پاڵپشتی تێگەیشتن و لێکدانەوەی زەین لە سەر ڕووداوەکان ڕوون بۆتەوە کە ئەو زەمانی لەبەرووەی غەوارەکان و ئێرانییەکان عادەتیان بە دیتنی فەرمانڕەوایانی پاوانخوازی دیکتاتۆر گرتبوو، هێندەیان تاریف نەدەکرد. قەشەی «کارمێلیت»ی ئیسفەهان لە کۆتایی ساڵی ۱۷٦٤دا سەبارەت بە کەریمخان ئاوای نووسیوە: «هەتا ئێستا نەیتوانیوە پلەی پاشایەتی بگرێتە ئەستۆ.» هەر لەو ساڵەیدا قۆنسوولی ڕووسیا لە ڕەشت هەواڵی داوە کە کەریمخان دەوڵەمەندترین ئەیالات و شارەکانی سەراسەری ئێرانی خستۆتە ژێر چۆکی خۆی، بەڵام سەرەڕای ئەوەش خۆی خۆش نەکردووە کە بڵێ «شا»م.... بۆیە دڵی خەڵکی وەدەس هێناوە. هەر ئاواش هەتا ئاخری تەمەنی مایەوە و مۆرکی گەلی پاراست، چونکە هەرگیز حازر نەبوو پلەی پاشایەتی وەربگرێ.

تەنانەت لە ڕۆژگاری جێنشینانی دڕ و دڕندەشیدا خۆبەکەمگرتنی وی وەک ئەرک و نەریتێک پەیڕەو کرا. ئەگەرچی بەڕاستی ئامۆزاکان و نەوەی ئامۆزاکانی یەک لەدوای یەک بوونە پادشا، بەڵام بەڕواڵەت پاڵپشتی سەرپەرستێتی وڵات بوون لە لایەن کوڕانی وەکیلەوە. (ئەم پایە و پلەیە لە ڕاستیدا هەمان نازناوی وەکیل بوو کە قەت بە ڕوونی ڕانەگەندرا.) هیچکام لە فەرمانڕەوایانی زەند لە زەکیخانەوە بگرە تا لوتفعەلیخان پتر لە پلەی «خان» پێهەڵنەچوون و بانگەشەیان بۆ نەکردووە[61].

بەڵام ڕووکارێکی دیکەی نیزیک لە ڕاستەقینە سەبارەت بەوەی کە خۆی بە میر و جێنشینیمیر داناوە لەم چوارینەیەدا کە بە ئاوی زێڕ لە سەردمی شمشێرەکەی نووسراوە، ئاشکرا دەبێ[62]:

این تیغ که شیر فلکش نخجیر است      شمشیر وکیل، آن شه کشورگیر است

---

61- Carmelites, 664; Arunova and Ashrafyan, ((Novye Materialy)) III.

62- cf. Perry, ((The Last safavids)) 66 – 69.

شمشێری کەریمخان لە مووزەی پارسی شیرازە. هەروابێتەوە ڕۆستەموتتەواریخ دروشمێکی هەیە (ل ۳۳۳): هەی ئافەریم بۆ «کەریم»ی مەزن کە شا بوو بەخۆی دەگوت وەکیل. ئەمە نیشانی دەدا کە ڕەنگە مەبەست لە وشەی وەکیل، وەکیلی دەوڵەت بێ. بەڵام کەریمخان هەمیشە دەیویست ڕوخساری جەماوەری وشەکە ڕابگرێ.

پیوسته کلید فتح دارد در دست　　　آن دست که بر قبضهٔ این شمشیر است

(ئەم تیخە کە شێری گەردوون نێچیری ئەوە، شیری وەکیل، ئەو پاشای وڵاتگرەیە، هەمیشە کلیلی سەرکەوتنی بە دەستەوە، ئەو پەنجەی کە دەسکی ئەو شمشێرەی بە دەستەوەیە.)

پێویستی پاراستنی کێشی شێعرەکە ڕێگای پێوەزیادکردنی «ژێر»ێک نادا لە نێوان «وەکیل» و «ئەو پاشای وڵاتگرە»دا، یانی بە واتای «وەکیلی ئەو پاتشای وڵاتگر»ە ناخوێندرێتەوە. لێرەدا مانای پێچەوانەی ڕووکاری ڕاستی نیشان دەدا کە وەکیل ئەو پاتشای وڵاتگرەیە کە لە سەر دمی شیرەکەی نووسراوە و پلەی سیاسی ئەو کە لێی بۆتە نازناوێکی تایبەت، خوازە (ئیستیعارە) لە تەرز و چەشنی ئەم ڕاستەقینە سیاسییەدا ڕوون دەکاتەوە.

## ۱۳ ـ ٦ حکوومەتی ناوەندی لە کردەوەدا

ئەگەرچی لە کردەوەیدا وەک شێخێکی پیاوچاک دەجووڵایەوە، بەڵام زۆر بەتوندی هەوساری سیاسەتی حکوومەتی ناوەندی بە دەستەوە بوو. لیستەی وشەی کۆنباوی کارگێڕی دەرباری سەفەوی و تەشریفاتی ئیداری لە کەلێن و قوژبنی ڕووداونووسینەوەکاندا وەبەرچاو دێ. بەڵام ناوێک کە بەڵگە بێ لە سەر بوونی سەرکردەکانی دەرباری وەک قۆرچیباشی (سەرۆکی جبەخانە)، قوولەرئاغاسی(گەورەنۆکەر)، ئیشیک ئاغاسی باشی (سەرۆکی دەربار) و تفەنگچی باشی (سەرۆکی چەکداران) وەبەرچاو نایە. ئەمانە لە ئاخرین ساڵەکانی حکوومەتی سەفەویدا[٦٣] لەگەڵ سەروەزیر (ئیعتیمادوددەولەی سەرداری مەزن) بەتێکڕایی دەبوونە شووڕای پارێزگا. هیچکام لە وەزیرانی دەوڵەتی کەریمخان نەبوونە خاوەنی خاڵێکی بەرچاوی تایبەت: سەرکردایەتی پەلامارەکان و حوکمڕانێتی ناوچەکان بە بێ ڕەچاوکردنی هیچ ڕێ و شوێنێکی دروست دەدرایە دەس خزمان و سەرۆکی هۆز و تایفەکانی باوەڕپێکراوی بە ناوی سەردار. وەختایەک کە پارێزگاکان هێور بوون، کارەکان دەدرانە دەس حاکمان و

---

٦٣ـ تەزکەرەتولملووک، ل ۱۰۱ ـ ۱۰٤؛ Lockhart, Safavi Dynasty 13.

کارگێڕانی خۆجێیی و ئەمانەش یەکبەیەک دەبوو ڕاستەوخۆ وڵامدەرەوەی بن. هەر نازناوێکی کە دەدرایە شازادەکانی زەندیە[٦٤] ـ وەک ئیعتیزادوددەولە و ئیستیزهادوددەوله کە وا دیارە هەرتک تایبەتی زەکیخان بوون ـ بەرلەوەی پەیوەندی بە پلە و پایەی ئیداری ئەوانەوە بێ، پتر بۆ ڕێزلێگرتن بوو.

پاش کەریمخان لە کاروباری دیوانیدا دەبوو بە وەزیری دیوان. یەکەمین وەزیری دیوان میرزاعەقیل بوو کە لە ساڵی ١١٧٧ی کۆچی / ١٧٦٣ی زایینیدا لە ئیسفەهان کوژرا. پاش ئەو میرزا محەممەدجەعفەر ئیسفەهانی بۆ ئەم ئەرکە هەڵبژێردرا. هاوشانی ئەم شوغڵە بە هێندێک سەروخوارەوە مستەوفیولمەمالک (سەرخەزنەداری وڵات) بوو. میرزا محەممەدی برووجێردی و میرزا محەممەدحوسێنی فەراهانی(١١) بە بنەماڵە و پشتاوپشت ئەم ئەرکەیان لە ئەستۆ بوو. ئەمانە بەپێی دابەشینی پلەی ئیداری و بەڕێوەبەرایەتی و کاروباری خەزێنەداری کەوتبوونە سەرووی هەموو شوغڵەکان و لەو سەردەمەدا هێندێک لە کارگێڕی ئیداری دیوان سەرتر بوون. وەکیل بەرپرسی ئەم کارەی وەک مۆردار و بەردەست و هاوکاری کاتی بێکاری خۆی پتر لەوانی دی لە پلەی خۆیا دەیهێشتەوە[٦٥]. شێوەی کاروباری بەڕێوەبەرایەتی حکوومەتی خانی زەند لە چوارچێوەی بەرتەسکتردا وەک شێوازی حکوومەتی نادر و ئاغامحەممەدخانی، پێش و پاشی دەچوو[٦٦]. سەرداری هەمیشەیی و باوەڕپێکراوی سادقخانی برای بوو، ناوبراو لە کاتی پەلاماری وەکیل بۆ سەر باکووری ئێران ئەرکی بەگلەربەگی فارسی لە ئەستۆ بوو.

بەڕوونی دیارە کە کەمبوونەوەی خاک و هەرێمەکانی ئێران لە ڕۆژگاری کەریمخاندا وای کرد ژمارەی پارێزگاکانی ژێر دەسەڵاتی سەردارانی هەڵبژێردراوی حکوومەتی ناوەندی دابەزێ بۆ سەر ٨ پارێزگا، چونکە لە

---

٦٤ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٤٥ و ١٨٣.

٦٥ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤٣٦؛ دونبولی، تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی یەکەم، ل ١٣١؛ گولشەنی مراد، ل ١٢٤ ـ ١٢٥؛ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٢١٠. بە مەبەستی زانیاری پتر سەبارەت بەم بابەتەی سەرەوە بڕواننە نازمر لە ژێر سەردێری شاعیرانی هاوچەرخ، بەهار، بەرگی ٣، ل ٣٣٣.

66- Waring, 93; Maredith, 63.

ڕۆژگاری سەفەوی و دەورانی پادشایەتی نادرا دەگەیشتە ۱۲ تا ۱۵ پارێزگا[٦٧]. دەبێ ئەم ژمارەیە سێ‌چوار والی بنەماڵەیی وەک ئەردەڵان، لوڕستان، عەرەبستان و چەند حاکمی شارە گەورەکانی چەشنی کرماشان، ئیسفەهان، کاشان، یەزد، بووشێهر و بەندەرعەباسی بخرێتە سەر. تەواوی ئەمانە لە قسەدا، هەڵبژاردە یان لانیکەم خاوەنی حوکمی دەوڵەتی ناوەندی بوون و ناچار بوون کە زۆربەی جاران بە شێوەیەکی ڕێکوپێک خۆ بدەنە هاوکاری لەشکری و ماڵی.

هەروەها دەبوو دەرەبەگ و خانەکانی سنوورنشین و تێکڕای هۆز و تایفەکانی وڵات چەند کەسێک لە خزمانیان وەک بارمتەی دڵخواز بنێرنە ناوەندی دەسەڵات و ئەمەش بۆ دابین و جێبەجێکردنی داوا و فەرمانەکانی حکوومەتی ناوەندی بوو[٦٨]. بارمتە گرینگەکانی شیراز بریتی بوون لە باوک و کوڕی نەجەفقولی‌خانی حوکمڕانی ئازەربایجان، برازای حوسێنقولی‌خانی حوکمڕانی ئێرەوان، حەیدەرخانی بەختیاری، بنەماڵەی زولفەقارخانی ئەفشار حاکمی خەمسە، کوڕ و مامی حوسێنقولی‌خانی قوانلووی قاجار حاکمی دامغان، میرمەهنا و میرحوسێنی بەندەرڕیگی کوڕی شێخ‌عەبدوڵلای بنی موعین حاکمی دورگەی هۆرمز، کوڕی نەسیرخانی حوکمڕانی لار و نوێنەرانی بنەماڵەکانی حوکمڕانی بووشێهر، بێهبەهان و تایفە گەورەکان.

بارمتە میوانەکانی وەکیل بەگوێرەی کەسایەتی و هەلومەرجیان خاوەنی پلە و داهاتێک بوون. بەڕاستی بەڕواڵەتیش کە بوایە ئەمانە بارمتە نەبوون، بەڵکوو هەموویان باسی ئاکاری چاکی دەربارییان دەکرد دەرهەق بەخۆیان[٦٩]، چونکە لەبەر وەدەس‌هێنانی ڕەزامەندی بنەماڵەکانیان نەکەوتبوونە سەر ڕەوگەی تۆڵە. لە گەرمەی ڕاپەڕینی حوسێنقولی‌خانا ئاغامحەممەدخان پەنای بردە بەر گومبەزی شاچراغ لە شیراز، بەڵام کەریم‌خان

---

٦٧ـ تەزکەرەتولمولووک، ل ۱۰۰ ـ ۱۰٤و ۱۱۳.

68- Arunova and Ashrafyan, Novye Materialy, 111; ڕۆستەموتتەواریخ، ل ۳۳۱.

٦٩ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ۳۳٤، ۳۳۸ و ۳٦۱؛ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ۲، ل ٤۳؛ ئیحتیشامولمولک، ل ۱۳۲.

دڵنیای کردەوە کە سەبارەت بە ڕووداوەکان و ئەوی لێیدەکەوێتەوە ناکەوێتە بەر تۆڵە[٧٠]. بەڵام ئاغامحەممەدخان و فەتحعەلیشا لە شیراز نە تەنیا هەڵومەرجی باشیان بۆ ڕەخسا، بەڵکوو کاری گرینگی ئامادەسازی قاجارییە و هاتنە سەر دەسەڵاتی ئەو خێڵەیان بە سەرنخوونکردنی زەندیە تەواو کرد. ئەوجۆرەی کە ڕۆستەموتتەواریخ نووسیویەتی کەریمخان بە تەواوی پێشبینی وەها ڕووداوێکی کردووە.

تێکەڵی لە ڕێی ژن و ژنخوازیڕا بە باشتر لە شەڕ و تێکهەڵچوون دادەندرا. هێندێک جاران ئەم شێوازە تەنانەت جێی ڕایەڵەی بارمتەگیری گرتۆتەوە. خودی وەکیل خوشکی محەممەدحەسەنخان واتە پووری ئاغامحەممەدخانی خواست(١٢). عەلیمرادخانی زەند بیبیشاجیهان خانمی کچی محەممەدحەسەنخانی هێنا. ئەبولفەتحخانی کوڕەگەورەی وەکیل کە یەکێک لە ئامرازەکانی بەرچاوی ڕاپەڕاندنی ئەم سیاسەتە بوو لەگەڵ خوشکی نەجەفقولیخانی دونبولی و خوشکی هیدایەتوڵڵاخانی ڕەشتی زەماوەندی کرد، ڕێی بۆ زەماوەندێکی سەرنەگرتووش لەگەڵ خوشکی فەتحعەلیخانی دەربەندی بە ناوی فاتمەبەگم خۆش کردبوو. خانەکانی دیکەی زەندیش ئەم ڕەوتەیان دەگرتەبەر و زەمگاوەندی سیاسی ـ بەرژەوەندخوازانەیان برەو پێدەدا. بەستامخان کیژی عەلینەقیبەگی جووپاری خواست، بەڵام دوو بابەت لەم چەشن زەماوەندانە بەرەورووی ناکانی هاتن و بەئاشکرا پووچەڵ بوونەوە. عەلیمحەممەدخان لە ماوەی هەڵمەتی ساڵی ١٧٧٣دا بۆ سەر مازەندەران لەگەڵ کچەی دیلی حوسێنقولیخان زەماوەندی کرد، کچە بە هەزار ناری عەلی ملی پێدا نەدێنا، بنەماڵەکەی بە بزاوتن و دنەدانی وەکیل کابرایان چۆڵەپێچ کرد؛ زەکیخانی زەند دەیەویست کیژی شێخی هۆرمز بخوازێ بەڵام ئەم زەماوەندە سپاکەی لەبەریەک هەڵوەشاند و ئازادکرانی کوڕی شێخی لێکەوتەوە کە لە شیراز بە بارمتەیی دەژیا.

گەلاڵەی پیلانگێڕی، خوێنڕێژی و نانەوەی دووبەرەکی و گەلێک فرتوفێڵی تر بۆ خاشەکێشانی دوژمن لە لایەن وەکیلەوە ئۆباڵیان بۆ نەکێشراوە، بەڵام ناکرێ بە تەواویش بڵێی وایە و چی هەیە خۆی لێ گێل بکەی.

---

٧٠ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٥٣ ـ ٣٥٤ و ٣٥٩؛ مونتەزەمی ناسری، ل ٣١٤.

قەلاچۆکردنی ئەفغانییەکان نیشاندەری ئەوەیە کە ئەو لە کردەوەدا بۆ پێشکەوتی ئامانجە سیاسییەکانی خۆی لە کوشت و کوشتار و فێڵەبازی لانەداوە. سەرەڕای ئەم بابەتەی باسی کرا کوشتار و سزادانی زۆرێک لە سەرۆکانی تایفەی زەند و پیاوانی پشتیوانیان لە بارگای پاشایەتی و پارێزگاکان، لە سەردەمی ڕاپەڕینی زەکیخانا دەتوانێ وەک سووچێکی داماڵین و پاکتاوی ڕایەڵوپۆی ئیداری و بنەماڵەیی بکەوێتە بەر سەرنج. کوژرانی نەسیرخانی لاری پاش ڕزگاری لە شیراز و هەڵبژاردنەوە و دانانەوەی بە حوکمڕان و قوتاربوونی لە تەمێ و سزا، ئەگەر بە ئیمای زیرەکانەی وەکیلیش ئەنجام نەدرابێ، دیسانیش لانیکەم نیشانەی بێخەیاڵی و کرکەوتنەوەی پێوەدیارە. چونکە وەکیل بە نێوانناخۆشی مەسیحخان و نەسیرخانی دەزانی و هیچ دوور نیە کە بە تێداچوونی ئەو کۆنەخەنیمەی ناڕازی بووبێ. لە لایەکی تریشەوە دانەوەی حوکمڕانی خووزستان بە سەرۆکانی ئالیکەسیر کە بە خوێنی سەری توونی بوون لە لایەن زەکیخانە کە وازی لەم چەشنە کارانە بووە، بە هەڵەیەکی تەواو دادەندرێ(١٣).

تایفەکانی قوانلوو و دەوەللووی قاجار بۆئاشکرا نیازیان بە دنەدانی کەس نەبووە سەبارەت بە قینەبەرایەتی نێوانیان، بەلام مەیل و ئیشتیای کەریمخان بۆ تێکدانی هاوسەنگی بە دژی دەوەللوو لە لایەن قوانلووەکانەوە پاساو نادرێتەوە. ئەو سەبارەت بە پڕکردنەوەی بۆشایی و کەلەبەری نێوانیان هەنگاوێکی نەناوە و دیارە ویستوویەتی بە دانانی حوسێنقولیخان بە حوکمڕانی دامغان هاوسەنگییەک ساز بکا. وەختایەکیش پێی بە هەڵەی خۆی برد نەیدەویست یان نەیدەتوانی ئیزن بدا کە دەوەللووەکان جڵەوی تەواوی پارێزگا و خێڵی قاجاریان بە دەستەوەبێ. ئەگەر ڕاست بێ وەک یەکێک لە سەرچاوەکان باسی دەکا، ڕوون دەبێتەوە کە حوسێنقولیخانی کوژراو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بە فیت و دنە و هەڕەشەی دەرباری شیراز، کەوتۆتە داو.

لە مەسەلەی هاوسەنگیدا وا وێدەچێ کە وەکیل مەیلی لە دەنگدانی قۆشەن و بەلاماردانی دەرودەشتە دوورەدەستەکان نەبووبێ و کەم و زۆر حاوانەوە و توندنەکێشانی و سزادانی بە مەبەستی پەند و تۆقاندن و هەروەها پیلانگێڕانی لەم بابەتەی، دەبوو بە هۆی دنەدانی سەربزێوان بۆ کەتنگێڕانی

مەیلەو پەنامەکی کـە نموونەیـەک لـەم هەڵـکەوتانە لـە ڕووداوی خەیانـەتی بریکاری لاهیجاندا وەبەرچاو دێ. بەڵام دەبێ کارەکانی وی لەگەڵ پێودانـەکانی ڕێک و پتەوی نادرشا بەراورد بکرێ و ئەمانە لەتەک ئەو ئاژاوە و سەرهەڵـدانە زیاتر و گەورە و قورسانەی کە بە دژی نـادر قـەومان هەڵبسـەنگێندرێن. بـەڵام کارەکانی وی پتر ڕەنگیان دایەوە و شوێنیان دانـا. ئـەم بانگەشـەیە کـە دەڵـێ کەریمخان لە بواری پاراستن و یەکڕیزی و وەفاداری کەسـان و داهـات خـاوەنی شێوازێکی ئارامتر و بەپارسەنگتر بووە، لە باسی داهاتوودا دەخرێتە ڕوو.

## ۱۳ ـ ۷ سیاسەتی ئایینی

کەریمخان بە ناوی بەڕێوەبـەر و دەمڕاسـتی خانـەدانی ڕواڵـەتییانەی تازەی سەفەوی کە هێشتا بەکردەوە بێپادشا بـوو، دەبـێ سـەبارەت بـە دۆزی تایبەتی خۆی بە شوێن ڕەزامەندی و ئۆبـاڵ بۆکێشـانی زانایـانی ئایینییـەوە بووبێ، کەچی ئەم ڕێگایەی نەگرتەبەر.

ئەو دەریا بێسنوورەی کە مـەودای دەخسـتە نێـوان جـەماوەر و شـای سەفەوی لەبـەر پـنجداکوتـانی زۆرەملـێ ئـایینی، هـەر بـەو بەرفراوانییـەی چەوساندنەوەی سیاسی، ئـەم لێکتـرازان و مەودایـەی هـەرواتر کردبـوو. لـە چینبەندی کۆمەڵی شارنشینیدا کە بەڕاستی شـوێنی یـەکێتی پێشـووی هـێز و تیرەکانی سەردەمی شاسوڵتان حوسێنی گرتبـۆوە، ڕێبـەرانی ئـایینی بـواری پشتیوانیکردنیان لە فەرمانڕەوایان وەک جێنشینی ئیمـام و نوێنـەری «خـۆدا» خۆش دەکرد و بەگوێرەی یاساکانی ئایینی لێکیان دەدایەوە و ڕیسوگوریسـیان بۆ دێنایەوە[۷۱]. دەسەڵاتی ئەمانە لەبەر تەقەلای نادر بـە مەبەسـتی گێڕانـەوەی ئێران بەرەو مەزەبی سوننی و پێداچوونەوەی بـەربلاوی لـە کاروبـار و مـاڵ و سامانی وەقفدا و خەرجکردنیان لە پێناو خەرجوبەرجی لەشکریدا گـەلێک لاواز ببوو[۷۲]. لە ڕۆژگاری هەرچیوپەرچی پاش کـوژرانی نـادرا گـەلێک لـە عولـەما کۆچیان کرد بۆ شوێنە پیرۆزەکانی ئێراق[۷۳]. هەر بۆیـە ئـەو مـەلا و سـەرجەلە

71- cf. Lambton, ((Quis Custodiet Custodes)) 125 – 133; Algar, 40 – 41.
72- Lockhart, Nadir Shah, 232 – 233, 271.
73- Algar, 30, 33.

ئایینییانەی کە مابوونەوە و ئەوانەی لە دەورانی فەرمانڕەوایەتی کەریمخانـا گەڕانەوە ئێران دەسەلاتیان لە کزێی دابوو و ڕێبەری تازەی خێڵەکی ولات کە لـە کاروباری دینیدا سەرسارد و بەربەرەڵلا بوو نیازێکی بە پشتیوانی ئەوان هەست پێنەدەکرد. کەریمخان بەپێی دابی کۆن بـە لێدانی سکە بـە نـاوی ئیمـامی ون (ئیمامی زەمان)[٧٤] و سازکردنی مزگەوت و تەکییـە و خانـەقا و گرینگـی دان بـە نوێژی بە جەماعەت ـ ئەگەرچی کەس زۆری لێنەدەکرا بۆ ئەم کارە ـ خۆی دایە گەشەپێدانی مەزهەبی شیعە. یەکێک لـە پیاوچـاکترین ڕووداونووسـانی ئێـرانی بەوپەڕی قێزەوەنی وەبیری هێناوەتەوە کە کەریمخـان لـە تـەواوی سـەردەمی ژیانیدا هەرگیز نوێژی نەدەکرد.[٧٥]

بالاترین پلەی داندراوی ڕێبەری ئایینی لە شیراز شێخولئیسلام بوو. وا دیارە ئەرک و ڕاسپاردەکانی لە پیاوانی پێشخۆی لە سەردەمی سەفەویدا کەمتر بووە. پلەی «مەزنە مەلا»ی هەڵبژێراوی باوی زەمانی شاسولـتانحوسـێن ئێتـر نەژیایەوە[٧٦]. ئەو سەرجەلە مەزهەبییانەی کە هەر لە کۆنەوە شـا هەڵـیدەبژاردن کەریمخان مزە و مانگایەکی بۆ بڕیبوونەوە. بۆ وێنـە پـەردەدار و سەرپەرسـتی گومبەزی «شاعەبدولعەزیم»ی شاری ڕەی لە ساڵی ١٧٦٥دا و چاودێری کاروباری ئایینی لە قەزوێن لەم قوماشە بوون[٧٧]. بەلام مەلا بەرەژێرتر و فـەقێ و سـەیدی عەلەوی و دەروێش کە بە مووچەی مانگانە بەڕێـدەچوون دەسـبژێر نـەدەکران. وەک گێڕاویانەتەوە وەکیل ئەمانەی بە چاولەدەس نـاودێر دەکـرد و گوتبـووی ئەرکی گشتی سەرشانی من ئێزن دەدا بەوانە کە وەک(١٤) خەڵک بەوەی هەیانـە بە باشی بژین[٧٨].

---

74- Poole, XX.

75- Qazvini, 143a.

٧٦ـ ڕۆسـتەمونتەواریخ، ل ٣٠٩، فـرانکلین، ل ١٣١ و ١٨٣؛ تەزکـەرەتولملووک، ل ١١٠، ئالگار، ل ٣٢ و ٤٨ ـ ٤٩؛ وەهبی ئەفەندی. بـە شێخولئیسـلامی کـەریمخـانی گوتـووە سەرۆکمەلا (چامەی تەنانە، ل ١٤، دێڕی ١٨).

٧٧ـ بڕواننـە، محەممەدعـەلی هیدایـەتی، ل ١٠٧ ـ ١٠٩، گـۆڤـاری توێژینـەوەکانی مێژوویی، ساڵی حەوتەم، ژمارە ٤، ل ١٠٥ ـ ١٠٦.

٧٨ـ ڕۆستەمونتەواریخ، ل ٣٠٩.

بارۆن ئالگار و چەند کەسێکی دیکە ئاماژەیان بەم بابەتـە کـردووە کـە ڕەنگە وەکیل بێئەوەی ئاگای کردبـێ پشـتیوانی لـە شـەپۆلێکی دەمـارگرژی و ئازاری عولەمایان دەکرد سەبارەت بە «سۆفی»یان[٧٩]. ئـەم کـار و هـەنگاوە لـە تەواوی سەردەمی سـەفەوی‌دا هۆکـارێکی کۆنەپەرەسـتانەی گرینـگ بـوو(١٥). خوردبوونەوەیەکی قووڵتر سەبارەت بەم نموونەی ئاماژەی پێکرا، دەریدەخا کە جگە لە دوورخستنەوەی مەعسوومعەلی‌شا(١٦) و نوورعـەلی‌شـا(١٧) لـە شـاری شیراز لە دەورانی فەرمانڕەوایەتی وەکیلا دەربارەی ڕووداوی دیکەی ئـاوا هـیچ قسەیەک نەبیستراوە[٨٠].

ئەو سۆفییانەی کە لەبەر گوشار و زێدەڕەویی ئایینی دەورانی سەفەوی پەنایان بردبووە بەر حکومەتی میوانگر و بەخزمـەتی «دەکـەن»، هـەروەک لـە سەردەمی بۆشایی دەسەڵاتا زانایانی ئایینی لە ئێراقەوە گەڕانـەوە، ئـەوانیش ڕوویان کردەوە ئێران و ئەگەری تێکهەڵـچوونی نێـوان دوو توێژەکـە زۆر بـوو. بەرچاوترین و گەورەترین تاقم و دەستەی سۆفییەکان «نیعمەتوڵلاهی» بوون کە مەعسوومعەلی‌شای دەکەنی سەرجەلەیان لە سـێ‌ساڵـەی ئـاخری حکوومـەتی کەریمخانا پێی نایە شیراز و لە لایەن خۆیەوە چەند شاندێکی نارده سەرانسەری ئێران. یەکێکی تر لەم ڕێبەرانە نوورعەلی‌شا بوو کە پرچی درێژی بە دەستووری عولەما تاشران و لە زەمانی دەسەڵاتدارێتی عـەلی‌مرادخـانیش‌دا لـە ناوچـەی «موورچەخۆرت» گوێیەکیان بڕی[٨١]. موشتاقعەلی‌شا(١٨) نێردرایە کرمـان و لـە ڕەمەزانی ١٢٠٦ی کۆچی / ١٧٩٢ی زایینی‌دا جەماوەری تین‌دراوی خەڵک بـە فـیتی خەتیبانی هەینی و زانایانی ئایینی بە سەنگەسار کوشتیان. ئەم کارەساتە چەند ڕۆژ بەرلەوەی لوتفعەلی‌خان لەبەر قاجاران ببەزێ و ڕاکاتە شـیراز، ڕووی دا. دەڵێن لەو ڕۆژی‌دا سەید ئەبولحەسەنخانی محەللاتی حاکمی شار و کەلانتـەری

---

٧٩ـ مێژووی ئەدەبیاتی ئێران، براون، ل ٣٦٨، ئێرانشـار، یۆنسـکۆ، سـاڵـی یەکـەم، ل ٦١٢؛ ئالگار، ل ٣٨.

٨٠ـ ڕیازوسسیاحەی شیروانی، چاپی ١٣٣٩، ل ٦٥٦، cf. Gramlich, 34.

81- Malcolm, 417 – 420; For this Order, see Gramlich, 28 ff, esp. 30 – 34 باستانی پاریزی، ل ٢٠٥؛ ڕازی، ل ٥٤٢.

شاری کرمان هیچیان لەوێ نەبوون[٨٢]. خودی مەعسوومعەلیشاش کە شیرازی و خەڵکی ئیسفەهان بە شوێنیدا دەگەڕان، لە ساڵی ١٢١٢ی کۆچی / ١٧٩٨ی زایینی لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی فەتحعەلیشای قاجاردا بە دەس ئاغاعەلی «موجتەهید»ی کرماشانی لە شاری کرماشان کوژرا(١٩). ئەم موجتەهیدە بە سۆفیکوژ مەشهوور بوو، چونکە ژمارەیەک لە سۆفییانی بە مەرگ مەحکووم کرد و سەری تێدابردن[٨٣].

سەرەڕای ئەم بەرهەڵستی و دژایەتییە توندوتیژە، دەروێشەکانی نیعمەتوڵلاهی و دەستەکانی دیکەش لە قۆناخی بەر لە زاڵبوونی قاجاریەدا زۆرتریان گەشە کرد. بەڵام دەبێ دانی پێدابێ کە بووژانەوە و ژیانەوەی سۆفییایەتی لە سەردەمی کەریمخانەوە دەستی پێکردووە. هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوە نیە کە ئەو خەڵکی لێ تین دابن و تەنگەژەی بۆ نابنەوە. ئەگەرچی کردەوەی دڵساردکەرەوەی سەبارەت بە زانایانی ئایینی ڕەنگە کاری کردبێتە سەر ئازار و ئێشاندنی سۆفییان، بەڵام ئەم کارە تا وەچەی داهاتوو پەرەی نەگرت و ڕەنگە کە پێداگری پتەوی بەرپرسایەتی و ئەرکی کۆمەڵایەتی عولەمای پارێزگاکان و پشتیوانە شارنشینەکانیان لەبەر وردەوردە توانەوەی حکوومەتی ناوەندی بووبێ.

ڕەوشتی کەریمخان سەبارەت بە کەمینەکانی مەسیحی و جوولەکە تێکەڵاوی کۆمەڵێک ڕایەڵوپۆی دیپلۆماسی و سیاسەتی بازرگانییە، چونکە ئەمانە یان بێگانەی دانیشتووی ئێران بوون وەک شاندەکانی ئایینی عیسایی یان ئەرمەنی و جوولەکەی خۆولاتی بوون کە لەبەر قازانجی ئابووری و دەسبەخێری، سەرنجی خەڵکیان بۆلای خۆیان ڕادەکێشا. سەبارەت بە تاقمی یەکەم هەر ئەوەندە بەسە وەبیر بێنینەوە کە چ خودی کەریمخان لە ساڵی ١١٧٧ی کۆچی / ١٧٦٤ی زایینی و چ عەلیمرادخان لە ساڵی ١١٩٥ی کۆچی /١٧٨١ی زایینیدا، لە وڵامی ڕێبەران و قەشەکانی فەرەنگی، کارملیتان، ڕاهیبان،

---

٨٢ـ وەزیری، ل ٣٤٨ ـ ٣٥٠؛ باستانی پاریزی، ٢٠٦ ـ ٢١١ و ٢١٧.

٨٣ـ ڕازی، ل ٤٥٢؛ یۆنسکۆ، ئێرانشار، بەرگی یەکەم، ل ٦١٢؛ مێژووی ئەدەبیاتی ئێران، براون، ل ٣٦٧.

کاپووچییانی یەسووعی، ئاگۆستینییان و تاقمەکانی دیکەی بنەجێی چەندین پارێزگای ئێران چەند فەرمانێکیان دەرکرد و ئازادی شوێنی دانیشتن و عیبادەت و توجارەتیان وەک سەردەمی سەفەوییە دەستەبەر کرد و کارێکی وایان کرد کە لە بەرامبەر دەستدرێژی ئەرمەنییەکانی عیسەوی‌مەزەبدا بپارێزرێن. بەڵام بەو مەرجەی ئاکار و کردارییان لەگەڵ شەریعەت و مەزەبی شیعە بە باری دوژمنایەتی‌دا نەکەوێ[٨٤]. کەوایە ئەگەر پەیوەندی نێوان مەسیحی و موسوڵمانانیش زۆر باش و پتەو نەتەندرابێ، ڕەنگە دیسانیش گرژتر نەبووبێ لە نێوانی ڕێباز و مەزەبەکانی خۆولاتی ـ وەک لاتین و ئەرمەنییان ـ چونکە لانیکەم حکوومەتی دەمارگرژ تەتەرپێچی نەکردبوون و مەینەتی نێوخۆییانی بە سەر نەهێنابوون.

ڕەنگە لە ئاکامی ئازادی و کرانەوەی کەشی مەزەبی‌دا، شانۆی تازیەگێڕی و شەهادەتی ئیمام حوسێن و تەڕدەستی کە خەڵک زۆریان بەدڵ بوو، لە سەردەمی حوکمڕانێتی کەریمخانەوە بووبێتە باو[٨٥]. من پێم وایە بیر و بۆچوونی «مەلیکوششوعەرا»ی بەهار بەجێیە کە لای وایە ویشکەسۆفی نەبوونی بارگای کەریمخان بە باری ڕووحی و گەشەی ڕووناکبیری‌دا شانبەشانی پەرەی ئابووری بۆتە هۆی قوتارکردنی ئێران لە چنگ توندڕەوییەکانی نیوسەدەی ڕابردوو[٨٦].

---

٨٤ـ ١٥٠ بەڵگەنامەی مێژوویی، قایمەقامی، ل ١٠٣؛ گۆڤاری توێژینەوەکانی مێژوویی، ساڵی دووهەم، ژمارە ٣ و ٤، ل ٣٦١ ـ ٣٦٢.

٨٥ـ نەراقی، ل ١٠٧.

٨٦ـ سەبکشناسی، ل ٣١٨.

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

۱ـ نەسروڵڵامیرزای کورەگەورەی شاروخمیرزا لە گەمارۆی مەشەددا بە پاڵپشتی ئەحمەدشا دورانی زۆری ئازایەتی لە خۆی نیشان دا، فەرەیدوونی گورجی میرزا و خەزێنەداری شاروخی کوشت و جڵەوی قەڵەمرەوی باوکی بە دەستەوە گرت. شاروخمیرزا دڵی لێی دەترسا و بۆ پارێزران لە چنگانی لە ساڵی ۱۱۸۱ی کۆچیدا ناردی بۆ شیراز. پاش مردنی وەکیل گەڕایەوە و دەستی کردەوە بە هەڵسووڕاندنی کاروباران. چونکە نەخشەی بەربلاوی لە مێشکیدا بوو، کەوتە ماڵ کۆکردنەوە و تەنانەت دەستی گەیاندە زێڕ و جەواهێراتی ئیمام ڕەزاش. لە ئاخری تەمەنیدا ببوو بە کابرایەکی تریاکی سیاچارە و لە پەنا ئاگری مەنقەڵی تریاکەوە حکوومەتی هەڵدەسووڕاند. لە ساڵی ۱۲۰۰ی کۆچی مانگیدا مرد.

۲ـ نادرمیرزا کوڕی دووهەمی شاروخمیرزا و جێنشینی میری بوو. زۆرتر پاش نەسروڵڵامیرزا لەبری باوکی بە کاروباری حکوومەت ڕادەگەیشت. پاش کوژرانی ئاغامحەممەدخان بە یارمەتی پادشای ئەفغانستان مەشەدی هێنایە ژێر ڕکێفی. بەڵام لە ساڵی ۱۲۱۸ی کۆچیدا، محەممەدوەلی میرزای قاجار حوکمڕانی خوراسان گرتی و بە فەرمانی فەتحعەلیشا کوژرا.

۳ـ ئاغاهادی شەفتی یەکێک بوو لە خانەکانی شەفت و لە ساڵانی بۆشنایی دەسەڵاتی پاش کوژرانی نادرشا لە گیلان حکوومەتی دەکرد. لە ساڵی ۱۱۶۷دا ئاغاجەمالی فوومەنی کوشت. هەر ئەم مەسەلەیە بوو بە هۆی هرووژمی محەممەدحەسەنخان بۆ سەر گیلان و کوژرانی ئاغاهادی. خانەکانی شەفت ڕەنگە لە کۆچەرانی چگنی لوڕستانی سەردەمی شاعەباس بن. بەگوێرەی گێڕانەوەی ڕابینۆ لە کتێبی گیلاندا «مسوڵمانی پیوازی»شیان پێدەگوتن. یەکێک لە گەورەکانیان بە ناوی کازمخانی شەفتی لە سەردەمی فەرمارەوایەتی شاسوڵتانحوسێنا، ئاغاکەمالی فوومەنی کوشت و تۆوی دوژمنایەتی لە نێو دوو تایفەکەدا چاند کە بوو بە هۆی کوشتاری سەرانی هەردوولا و هەتا زەمانی

دەسەڵاتدارێتی «ناسرەددینشا»ش دوژمنایەتییان هەر مابوو.

٤ـ میرزا زەکی بریکاری حکوومەتی گەسکەر بوو کـە لەگـەڵ ئاغاهـادی شەفتی، حاجی جەمالی فوومەنییان کوشـت. چـوار مانـگ پـاش ئـەم رووداوە محەممەدحەسەنخان بە مەبەستی تۆڵەکردنەوە کەوتــەرێ و هیدایەتوڵــلاخانی کوڕی حاجی جەمالی کردە حاکم.

٥ـ هیدایەتوڵلاخان بە دەس یەکێک لە سـەربازانی تالشـی خـۆی لـە بەندەر ئەنزەلی کوژرا. وەختایەک دەیەویست ڕابکا چەکدارێک تەقـەی لێکـرد و شلێپ کەوتە ئاو. مەیتەکەیان دەرهێناوە و سەریان نـاردە لای ئاغامحەممەدخان، ڕێزدار پێری چۆنیـەتی بەسـەرهاتی هیدایەتوڵـلاخان و مسـتەفاخانی تالشـی پێکەوە لێکۆڕاوە.

٦ـ قوببە کەوتۆتە مەڵبەندی شیروان و تـا ئـەو شـارە سـێ فرسـەخی نێوانە. پێشتر عەرەب لێی نیشتەجێ بـوون. لـە ساڵـی ١٧٦٥دا پـاش کـوژرانی نادرشا، فەتحعەلیخانی قوببەیی ناوچەکانی شـەمخاڵ و قیتـاق و دەربەنـدی خستە سەر خانشینی قوببە. بەڵام بـەڕەورووی نارەزامەنـدی سـەرکردەکانی داغستان بۆوە و تێکشکا و سەری وەبەر رووسان هێنا و کلیلی دەربەندی نارد بـۆ کاترینی دووهەمی قەیسەری رووسیا، بەڵام لەبـەر وەی رووسـان سـەریان لـە کێشە نەدەخورا و نەیاندەویست ئێران بهاروژێنن کلیلـەکانیان بـۆ ناردنـەوە. پاش لەشکرکرننی ئاغامحەممەدخانیش دەربەند هەر بە ئێـران حیسـاب دەکـرا. جێنشینی فەتحعەلیخان بە ناوی شێخالیخـان لـە شـەڕی یەکـەمی ئێـران و رووسا، لایەنگری ئێرانی دەکرد و پاش شکانی ئێران، رووسان عـەلیپەنابـەگ ناوێکیان لە جێی دانا.

٧ـ ڕێـزدار پێـری لـە بابـەت هیدایەتوڵـلاخان و درانـەوەی بـە دەس ئاغاعەلی ئاخرین پاشەواری خانەدانی شەفتی کەلکی لـە بابەتـەکانی رابینـۆ وەرگرتووە و بێگومان لە نووسینەوەی ئەم رووداوەدا تووشـی تلاسـان بـووە. بەگوێرەی زۆربەی سەرچاوەکانی قاجـاری، لـە وەخـتی سـواربوونی گـەمیدا کووژراوە... .

٨ ـ ئارکێل یا «هراکلیووس»ی دووهەم پادشای گورجستان پاش ٥٢سـاڵ پاشایەتی لە ١٢ی ژانوییەی ١٧٩٨ و لە تەمەنی ٨٢دا دەستی لـە جیهـان بـەردا.

سلێمانخانیش حوکمڕانی شەکی بوو کە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ محەممەدحەسەنخانی برای نێوانیان ناخۆش بوو و لە مەودای ساڵانی ١١٧٥ تا ١٢١٢ی کۆچی مانگیدا حکوومەتی کرد.

٩ـ پەیماننامەی گیورگیوسک لە نێوان فیلدمارشاڵ پاتیمکین لە لایەن کاترینی دووهەم و شازادە «گراتیون»ی گورجی نوێنەری پادشای گورجستان لە قەڵای «گیورگیوسک»ی سەرسنووری قەفقاز مۆر کرا. گورجستان یەکەم وڵاتی جیهان بوو کە بەگوێرەی ئەم قەراروبڕییە بوو بە ژێربال. ئەم پەیماننامەیە بریتی بوو لە سێزدە بەند و پێشەکییەک. بۆ زانیاری زیاتر بڕواننە مێژووی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئێران لە دەورەی هاوچەرخدا بە قەڵەمی خوالێخۆشبوو سەعید نەفیسی.

١٠ـ ئەلێکساندر برای هراکلیووس و خوازەری تاج و تەختی گورجستان بوو و لە ڕۆژگاری وەکیلا پەنای هێنایە بەر ئێران و پاش مردنی کەریمخان لە زەمانی ئاغامحەممەدخان و فەتحعەلیشادا دایە پاڵ هێزەکانی ئێران و بەشداری چەند شەڕێکی کرد و هەر لە شەڕیشدا کوژرا و بەگوێرەی مێژووی کۆمەڵایەتی و سیاسی قاجار بە قەڵەمی خوالێخۆشبوو سەعید نەفیسی لە دەرەوەی دەروازەی شاعەبدولعەزیم لە کۆنە کلیسای مەسیحییاندا نێژراوە.

١١ـ میرزا محەممەدحوسێنی فەراهانی مامی میرزا عیسای قایممقام (میرزابوزورگ) و لە دایکەوە باپیری میرزا ئەبولقاسمی قایممقام و پیاوێکی بەڕێز و مامۆستای منداڵەکانی سادقخان بوو. لە لوتفعەلیخان هەڵبڕا و چووە لای ئاغامحەممەدخان. پاش ئەوەی لە ساڵی ١٢٠٩ حەجی کرد، لە قەزوێن مرد. شێعریشی دەگوت و نازناوی وەفا بوو.

١٢ـ مێژووی سارەوی و مونتەزەمی ناسری، ئەم ژنە کە ناوی خەجیجەبەگم بوو بە پووری ئاغامحەممەدخان دەزانن.

١٣ـ زەکیخان لە خووزستان دژی کەریمخان ڕاپەڕی و لەگەڵ دژبەرانی وەکیل دەستی تێکەڵ کرد. بەپێچەوانەی بۆچوونی ڕێزدار پێری والی حەوێزە بە ئاماژە و ڕەزامەندی و پەسندی کەریمخان نەکوژراوە.

١٤ـ بڕوای کەریمخان سەبارەت بە هێندێک لە فەقێ و مەلاکان لەگەڵ نووسراوەی بەڕێز پێری ناکۆکە. دەقی نووسراوەی ڕۆستەمولحوکەما کە ناوبراو

کەلکی لێوەرگرتووە ئاوایە. «وەک بیستوومانە بەڕێز جەنابی محەممەدی بیدئابادی لە زانست و زانیندا مەلایەکی بێوێنەیە و منەت لە کەس هەڵناگرێ و بە ئاوریشمچنین بەڕێدەچێ، ئێمەش وەکیلی دەوڵەتی ئێرانین و باش لە وەستایی دەزانین و کارمان گۆرەویچنین و مافوورە و بەڕە کردن و جاجمتەنینە. وەکوو بیستوومانە هەموو پێغەمبەران و پیاوچاکان و ئیمامانی ئێمە و تێکڕای پاشایانی پێشوو خاوەنی کار و پیشەیەک بوون.» مەبەست ئەوەیە کە مواجیبێکی بۆ کەس نەبڕیبۆوە.

١٥ـ لە دەورانی زەندیەدا مەعسوومعەلیشا لە شیراز دەنگ و هەرایەکی هەبوو کە مەلا پێی هاروو‌ژابوون. کەریمخان بۆ ئەوەی ئاژاوەیەک وڵات نەتەنێتەوە دەستووری دا ئەو و نوورعەلیشایان دوورخستەوە. میرزا زەینولعابیدینی شیروانی دەنووسێ: «سەرەتا کەریمخانی زەند ئەو کارە دزێوەی لەگەڵ ئەو دوو پیاوچاکانە کرد و سەید مەعسوومعەلی و نوورعەلیشای (قەبرەکەیان پڕ بێ لە نوور) وەدەرنا و ئاخری ئەویش خۆشی لە خۆی نەدی و ساڵێکی پێنەچوو کە تۆماری تەمەن و حکوومەتی تێکەوەپێچرا. کەریمخان ۸۰ساڵێک ژیا و پادشایەکی خۆشناو بوو و تا ئاخری عومریشی لە بەری داری تەمەنی خوارد.» *نازانم مەبەستی شیروانی لە هێنانەگۆڕی ئەم موعجزەیە چی بووە؟*

١٦ـ مەعسوومعەلیشا پێشەوای نیعمەتوڵلاهییە لە ئێران و مریدی عەلیڕەزا دەکەنی بوو. ئەو بە فەرمانی پیر و مرادی خۆی لە هیندووستانەوە هاتە ئێران و ماوەیەک لە ئێران بنەی دانا و بە دەستووری کەریمخان خرایە زیندان و پاشان ئازاد کرا و لە ئێران و ئەفغانستان و دووچۆمان (بین‌النهرین) مریدێکی زۆری لێکۆبۆوە. ساڵی ۱۲۱۲ لە گەڕانەوەیدا لە مەزارگەی ئیمامانەوە بۆ ئێران، لە کرماشان بە دەستووری ئاغامحەممەدعەلی بێهبەهانی موجتەهیدی بەدەسەڵاتی ئەو زەمانی گرتیان و بەدزی لە چۆمی قەرەسوودا خنکاندیان و بە قەولێکی لە باغی «عەرشی بەرین» کوشتیان و هەرلەوێ ناشتیان (وشەدانی دێهخودا).

١٧ـ نوورعەلیشا ناوی محەممەدعەلی کوڕی میرزا عەبدولحوسێن کوڕی مەلامحەممەدی ئیمامجومعەی تەبەس بوو؛ یەکێک لە عارفە ناودارەکانی سەدەی

سێزده و لە ئیسفەهان لە دایک بووە و لە تافی لاوی‌دا لەگەڵ باوکی چۆتە شیراز و هەردک بوونە مریدی مەعسوومعەلی‌شا و نازناوی فەیزعەلی‌شا و نوورعەلی‌شایان وەرگرتووە. نوورعەلی‌شا پاش کوژرانی مەعسوومعەلی‌شا بوو بە سەرجەلەی ڕێبازی نیعمەتوڵلاهی، بەڵام چونکە لە هەموو قۆڵێکەوە لێی ڕاست بوونەوە و بە کافریان دەزانی، ئەوشارەوشاری دەکرد و ئاخرییەکەی ساڵی ١٢١٢ی کۆچی لە مووسڵ مرد. بەڵام سێرجان مێلکۆم ڕێکەوتی وەفاتەکەی دەباتەوە ڕۆژی عاشووورای ساڵی ١٢١٥ی کۆچی و دەڵێ ڕەنگە بە پیلانی ئاغامحەممەدعەلی موجتەهید دەرمانداویان کردبێ. دەڵێن پێشتریش لە نەزرگەی ئیمامان دووجاریان ژار دابوویە بەڵام ڕزگاری ببوو. نوورعەلی‌شا پیاوێکی جوانچاکی مووقەترانی بوو کە خێرا خەڵکی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. «قیسەسولعولەما» دەنووسێ کە پێنسەد مریدێکی بوو و قوببەی زێڕی لە سەر خێوەتەکەی دەچەقاند... .

١٨ـ میرزا محەممەد کوڕی میرزا مەهدی ناسراو بە موشتاقعەلی‌شا بە حەسڵ خەڵکی توربەتی حەیدەرییەی خوراسان و لە ئیسفەهان پێی نابوویە جەغزی ژیان. پاش ماوەیەک چووە کرمان و دوای خوێندنی سەرەتایی خۆی بە فێربوونی مووسیقاوە خەریک کرد. زەمانێکی زۆرانیبازێکی ناوبەدەرەوە بوو. دەنگخۆش و خاوەنی گەلێک قوتابی بوو. لە خزمەت نوورعەلی‌شادا بوو بە پەشمینەپۆش و لە سەردەستی فەیزعەلی‌شا تۆبەی لە ڕابردووی کرد. پاش ئەوەی سەری وە لاشیپانەی سەیدمەعسووم هێنا لەم ڕێبازەدا نازناوی موشتاقعەلی‌شای وەرگرت. ماوەیەک لە ماهان ژیا و سەرەنجام بوو بە نیشتەجێی شاری کرمان(گواشیر)... دەڵێن ڕۆژێکیان لە ساڵی ١٢٠٢ی کۆچی‌دا کە مەلا عەولای واعیزی کرمانی لە مزگەوتێک خوتبەی دەدا، موشتاقعەلی‌شا بە دەنگی تارەوە قورئانی دەخوێند و خەڵک پێی چراغپێ بوون و ورووژان و بە فەرمانی مەلاعەولا بەردەبارانیان کرد و کوشتیان... .

١٩ـ ئاغامحەممەدعەلی موجتەهید کوڕی خوالێخۆشبوو ئاغامحەممەدباقری بێهبەهانی لە بواری زانین و نووسینی سەربوردەی گەورەپیاوان و زانستی ئایینی‌دا توێژەرێکی کەموێنە بوو. خوێندنی سەرەتایی لای باوکی خوێندووە و لە حوجرەی فەقێیان دەرس و دەوری تەواو کردووە و لە

تاعوونی ساڵی ۱۱۸٦ی کۆچیدا لە ئێراقەوە هاتە ئێران و لە کرماشان بنەگر بوو. «مەکاریموائاسار» دەنووسێ: «بۆیە هێندێک دڵیان لێیئێشاوە چونکە بەینی خۆش نەبوو لەگەڵ پەیڕەوانی ڕێبازی عیرفان و سۆفییان و بانگەشەدەرانی سیدق و سەفا و بە لای خۆشەویستی و مێهر و وەفادا هەنگاوی نەدەنا و ئالای گرتن و کوشتن و ئێشاندن و قین و جزدانی بۆ هەڵدابوون.» نێوانی لەتەک گەورەپیاوان و دەسەڵاتدارانی ئێرانی وەک هیدایەتوڵلاخانی فوومەنی، کەریمخانی زەند و ئاغامحەممەدخانی قاجار خۆش بوو. لە زەمانی فەرمانڕەوایەتی فەتحعەلیشادا فەرمانی پەیکەردەی سۆفییانی دا و کەسانێکی وەک مەعسوومعەلیشا و موزەففەرعەلیشای تێدابرد. دەیانگوت گەلێک سۆفی بە دەستی وی کوژراون. ساڵی ۱۱٤٤ی کۆچی پێی نایە ژیان و ساڵی ۱۲۱٦مرد. لە کرماشان نێژراوە و گومبەزەکەی بە «موغبەرەی ئاغا» ناودێر کراوە.

# ١٤

# حکوومەت، داهات و کۆمەڵ

## ١٤ـ ١ هۆز و تایفەکان

کەریمخـان ڕەوتی کاروبـاری ئیمپراتـۆریتی بچـووک بـەڵام بـەهێز و تۆکمەی خستە سەر ڕەوگەی بەڕێوەبەرایەتییەکی سادە. هۆکـارێکی دیکـە جگـە لەوەی کە بە شێوەی کۆنباو پاڵپشت و دەستەبەری کارەکانی بـوون و هـەروەها سرشتی ساکار و جوامێرانە و کەمتەرخەمانەی دەبـێ لـە جـەغزی لێکدانـەوەی سەرکەوتنەکانیدا وەبەرچاو بگیرێن. دەمهەوێ کە لەم بەشەدا کەلک لە شێوازی کۆکردنەوەی وردەکاری سەر بە چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵی ئێرانی وەربگرم و خۆبپارێزم لە باس و خواسی لادەستە یان وێنـەی سەرسـوڕهێن سـەبارەت بـە شیرازی پایتەختی و دەورەی حوکمڕانێتی کەریمخان(بڕواننە، بابـەتی ١٦). مـن لام وایە کە ڕێکخستنەوەی مێژووی کۆمەڵایەتی یان ئابووری ئەو دەورانـە ــ کـە مێژووی هونەر و ئەدەبیاتیش دەگرێتەوە ــ دەبـێ لـە دووتـوێی لێکۆڵـینەوەی سەردەمێکی بەرفرەوانتری سەفەویدا کە لانیکەم سەرجەم لەساڵی ١٦٠٠ تـا ١٨٠٠ یانی لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی شاعەباس هەتا فەتحعەلیشـا دەگرێتـەوە،

ڕێکبخرێ و شیبکرێتەوە. کەوایە ئەم دوو باسەی داهاتوو ڕەنگە لەبەر دەرخستن و هێنانەگۆڕی ئامرازی پێویست لەم توێژینەوەیەدا وەک تابلۆیەکی ڕێنوێن ڕەوگەمان پێ نیشان بدەن.

لە وڵاتێکا کە شێوەی بەڕێچوونی گوندەکی و مەڕداری بە چەشنی کۆنباو تێکەڵاوە، گەلێک بازنەی ڕێکوپێک سەر بە گەشە و درەوشانەوە و داڕووخانی هەر فەرهەنگێک بە نۆرەی خۆی وەبەرچاو دێ کە تێکەڵاوی سلسلە و پلپلە و هاوپێچی سیاسییە. ئەم پرسە بە شێوەیەکی ڕوونتر دەربارەی ئێران کە هەمیشە شەپۆلی پەساپەسای پەلاماردەرانی سەحرانشین هەولیان داوە تا بنەڕەتی ژیانی کۆمەڵایەتی کشتوکاڵی ـ شارنشینی لەگەڵ کۆنفێدراسیۆنەکانی ژیانی گەڕۆکی مەڕداری تێکشکێنن و جێگۆڕکەیان پێبکەن، وەبەرچاو دێ و تەنیا وەچەی دووهەم یان سێهەمی پەلاماردەران لە ڕووی سوود و داهاتی ئابووری لە ژیانی بنەجێی شارەکیدا تەسلیم دەبن. سەرکەوتنەکانی «نادری» لەم گۆشەنیگارا دەکرێ بە شێوەی هرووژمی سەحرانشینان سەنگوسووک و ڕاست بکرێنەوە. سەرکەوتنەکانی نادری لە جەرگەی دار و پەردووی کۆمەڵی شارنشین کە لە کلکەی دەسەڵاتی سەفەوییاندا جێگۆڕکەیان پێکرابوو، بەڵام بە هرووژمی ئەفغانییەکان تێکنەقرمابوون بەدیهات و وەرسووڕانەکەی تەنیا بوو بە هۆی پەیدابوونی سیستمی چەنبنەکی و گۆڕانی بنەڕەتی حکوومەتی شارەکی بەبێ نوێکردنەوەی بنەما یان گوێزتنەوەیەک.

خەسارمەندیی کۆمەڵی یەکبنەکی و لێکگردەوەبووی شارنشین، بەبێ پشتیوانی بەهێزی خێڵاتی لە بازنەی زاڵبوونی ئەفغانییەکانی غەلجایی بە سەر ئێرانا بە ڕادەی پێویست شیکراوەتەوە و بەپێچەوانەکەشی لە زۆربەی ڕووداوەکانی سەردەمی بۆشایی دەسەڵاتا بێهوودەیی هۆردووی خێڵاتی بەبێ خۆڕاگری کۆمەڵی شارەکی گەلێک وەبەرچاو دێ. شاری قوم دەروازەکانی لە ڕووی هێزەکانی برایمیرزا گاڵە دا؛ ئیسفەهان لە چنگ سپای عەلیمەردانخان ڕاپسکا و قوتار بوو؛ هاشمخانی بەیات نەیهێشت کەریمخان پێ بنێتە شیراز و کەموزۆر بەرەو نەمان و بڕانەوە بە دەس ئازادخان پاڵی پێوەنا. بەڵام بە بوونی لایەنگرانی شارنشین و هێزەکانی خێڵاتی فەرمانڕەوایەکی بەهێز و جەماوەری دەیتوانی وەفاداری و تەنانەت متمانەی حەشیمەتی خێڵاتی و شارەکی وەدەس

بێنێ. تاقمەکانی خێڵاتی دەیانتوانی ئەگەر سەردارەکەیان دەستی نەقووچێنێ، تایفەکانی دیکەی بۆ پێمل بکەن. جەماوەری کۆمەڵی شار لە سایەسەری لەشکرەوە تەناهی باڵی بە سەر دەکێشان و پایتەختیش بە هەڵگرتنی خەرج و پیتاکی باو و هەلومەرجی باش تووشی ئاڵوگۆڕ دەهات. لەشکری خێڵاتی دەسەلاتداریش لەو قان و پشکانە بەهرەوەر دەبوو[1].

بنەمای هێز و توانستی خێڵاتی کە بە هۆی هەوڵ و تێکۆشانی سەفەوییەکان گۆڕانی بە سەر هاتبوو درێژەی کێشا و نادرشا و کەریمخانیش ئەم ڕچەیان کوتا. کاروباری ڕاستەوخۆی ئیدارەی ناوەندەکانی شارەکی بەر لەوەی بە دەس خانانی هۆز و تایفەکان بەڕێوەبچێ لە لایەن بالادەستانی هەڵبژێراوی پارێزگاکانەوە هەڵدەسووڕا. لە ڕاستیدا ئەم کاربەدەستانە لە پارێزگاکانی قەڵەمڕەویاندا خاوەنی ڕیشەی بنەماڵەیی یان تایفەیی بوون و بە نۆرەی خۆیان بەرپرسایەتی ملکەچی و بەڕێچوون و هێوری و لە کاتی پێویستا سەرکوتی تایفەکانیان لە ئەستۆ بوو. لەم بارەدا ئەو دەستوورانەی کە سەبارەت بە کوردانی شوقاقی درا بە نەجەفقولیخانی دونبولی لە کاتی هەڵبژێرانیدا بۆ بەگلەربەگی تەورێز نموونەیەکی لەبارە[2].

تایفە گەورە و گرینگەکان بە دەس سەرۆکانی ئاسایی خۆیان بە شێوەی کۆمەلانی سەر بە پارێزگا بەلام بەبێ گەڕانەوە بۆ سەر ناوەندەکانی شار بەڕێوەدەچوون. بەختیارییەکان، لوڕانی فەیلی، کوردانی ئەردەلانی، ئەفشاری ورمێ و قاجاری ئەستەرئابادیش هەروا بەڕێوە دەبران. لە نێو کوردەکانی ئەردەلان و ئەفشاری ورمێ و قاجارەکانی ئەستەرئاباد زیاتر سەرۆکی تایفە حوکمڕانی پارێزگا و ناوەندەکەی بوو. مەسەلەی وەفاداری و سەروەبەرهێنان بۆ حکوومەتی ناوەندی بەگوێرەی هەلومەرجی تایبەت و بەپێی پێویست بە وەرگرتنی بارمتە دابین دەکرا. لە بابەت چاودێری بە سەر دەسبژێرکردن بۆ دەسەلاتدارێتی فەرمان دەردەچوو ـ وا باو بوو ئەم حوکمانە هەموو ساڵ نوێ دەکرانەوە ـ هەتا سەرۆکی تایفەکان سەقامگیر و یاغییەکان دەمکوت بکا و تین

1- cf. Kuznetsova, 308 – 310. For a general account of the tribes during this period, see Tappers chapter in Cambridge History of Iran VII (forthcoming). Lambton, Landlord and Peasant, 133.

٢ـ نادرمیرزا، ل ١٧٣ ـ ١٧٤؛

بۆ سەربزێوان بێنێ پیتاک بدەن و شالاویان کەمتر کەنەوە یان سەرکردەکانیان بگۆڕن.

ئالوگۆڕی سەرۆکی تایفەکان بێبڕانەوە و بە دوور لە گۆڕانکاری حکوومەتە دەسەلاتدارەکان بە سەریاندا خۆی دەنواند. کاری بەختیارییەکان لە سەردەمی حکوومەتی کەریمخانا ـ لانیکەم لە بابەت دەرەبەگانەوە ـ نموونەیەکی بەرچاوی ئەم چەشنە بوو. کەریمخان لە ڕەجەبی سالی ١١٦٤ی کۆچی / ژووەنی ١٧٥١ی زایینیدا هەر ماوەیەک پاش ئەوەی بوو بە وەکیلی دەولەت یان بریکاری شاسمایلی سێهەم فەرمانێکی بە ناوی ئەو پادشایە دەرکرد و عەلیمەردانخانی لە چوارمحال و نەهاوەند دەرپەڕاند. ئەو کات ئەبدالخانی(١) کوڕی عەلیسالحبەگی حاکمی داندراوی نادری بە سەرۆکی تایفەی بەختیاری دانا و سالێ حەوسەدتمەنێکی مووچە بۆ دیاری کرد[٣]. وەختایەک لە سالی ١١٦٧ی کۆچی / ژووەنی ١٧٥٤ی زایینیدا ئازادخان ئیسفەهانی گرت، ئەبدالخانی لە سەر کاری خۆی لانەبرد و تەنانەت باری وەرگرتنی ملکانە و پیتاکی چوارمحالیشی خستە ئەستۆی و لە حوکمەکەیدا نووسی کە دەبێ سەبارەت بە گوندنشینان دادپەروەر و مێهرەبان بێ[٤]. پاش گەڕانەوەی کەریمخان جارێک لە سالی ١٧٥٩ و جارێکی دی لە ١٧٨٠دا داوای تاپۆ و فەرمانی ملکایەتی کێشەلە سەری چوارمحالی کرد. وەکیل و جێنشینەکەی ڕەزامەندییان لە سەر ئەم داخوازە دەربڕی و ئەبدالخان هەر بەو نووسراوەیە بوو بە حاکمی حەوتلەنگی بەختیاری و ڕوون کرایەوە کە ئالوگۆڕی داهاتووی ملکایەتی دەبێ بە سەرمایەی خودی ئەبدالخان ئەنجام بدرێ و ڕەنگە ئەم بابەتە بە شێوەی خۆدزینەوە لە دانی هەر چەشنە یارمەتییەکی مالی و یان لێخۆشبوونی ملکانە لێکبدرێتەوە[٥].

گێڕاویانەتەوە کە کەریمخان حوکمی ئێلخانیگەری (سەرۆکخێلی) داوە بە یەکەم ئێلخانی قەشقایی. (ناوبراو کە ناوی جانیئاغا و نەجیبزادەیەکی تایفەی شاهیلوو بوو، وەک باسی دەکەن دەبێ یەکێک لە هاوکاران و وەزیرانی

٣ـ بەختیاری، ل ١٥١ ـ ١٥٢.

4- Garthwaite, NO. II (P.4).

5- Ibid, Nos. III, III, IV (Pp. 4 – 6).

کەریمخان بووبێ.) ئەم فەرمانە وای کرد کە کۆبەندی تێکەڵەی تایفە ترکزمانەکانی فارس گۆڕانیان بە سەرابێ و وەک زنجیرەیەک کە ئێستاش هەر وا ماونەوە تووشی پاڵڕێکدان بن. گومانی تێدا نیە کە ئامانجی کەریمخان لەم کارە پارمەتی دان و باڵگرتنی پاراستنی شاری شیراز بوو. یەکێکی تر هەر لەو بنەماڵەیەش بە ناوی ئێلبەگی هەڵبژێرا هەتا پارمەتی سەرۆکهۆز بدا و وەکیل سەبارەت بە کۆکردنەوەی باج و ملکانە خاترجەم بێ[6]. لە ڕاستیدا جانیخان خاوەنی پایە و پلەیەکی دەرباری بوو. ئەو و سمایلخانی کوێر(٢) ـ کە ئەویش سەرۆکی تایفەی قەشقایی بوو ـ باوەڕپێکراوی وەکیل بوون[7]. خێڵ و تایفەکانی دیکەی فارسیش کە پاشان بە ناوی خەمسە(٣) یەکێتییەکیان پێکهێنا کەموزۆر بە سەرۆکایەتی یەکێک لە تایفەکانی فەرمانبەردار بەڕێوە دەچوو[8].

تایفە سەربزێوەکانی ناکۆچەر و بنەگری کۆهکیلۆیە لە هۆردووکردنی ساڵی ١٧٦٥دا هێرشیان کرایە سەر. لەگەڵ خێوەتنشینان و هەوارچییانی ئەو ناوچەیە لانیکەم بە چەشنی ڕواڵەتی و لە سەر کاغەزیش بێ بە شێوەیەکی باشتر دەجووڵانەوە، بەڵام بە هەرحاڵ مەحکووم بوون بە دانی پیتاکی قورس و بێگاری و چەوسانەوە لە لایەن حاکمانی شارەکانی دەروجیرانیان. سەیدەکانی میرسالاری ناوچەی بەمبەئی ڕەزامەندی کەریمخان و جەعفەرخانیان ـ کە ساڵی ١٧٨٥ هاتە سەر دەسەڵات ـ بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە لە بابەت نەدان و هەڵگیرانی ئەم چەشنە پیتاکانەی لە سەردەمی شاسوڵتانحوسێنەوە تا ئێستا نەیاندابوون، ڕاکێشا[9].

تانوپۆی سەرەکی یارانی کەریمخان واتە لەکان و لوڕان و هۆز و خێڵەکانی دەشتی هەمەدان و زەنگەنە و وەند و کەلهوڕ و قەرەگوێزلوو پاش

---

6- Garrod, 32. ff; Ullens de Schooten,86 – 87.

فەسایی لە لاپەڕە ٢٦٧ی بەرگی یەکەمدا سەبارەت بەم ناوە و هاتنی لە ١٢٣٤ی کۆچی / ١٨١٨ ـ ١٨١٩ی زایینیدا سەبارەت بە جانیخانی قەشقایی ئێلبەگی فارس دەنووسێ کە واژەی ئێلخانی تایفەکانی ترک زمان بۆ یەکەم جار لە فارس دەکار کراوە.

٧ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل٣٣٨، ٣٣٧؛ دونبولی، تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی یەکەم، ل ١٣٤.

8- Christian, 5.

٩ـ سێمسار، ل ٨٠ ـ ٩٤.

چوونە سەر دەسەلاتیشی هەر لێی نیزیک بوون و نیوەی هێزەکانی سەقامگیری فارسیان پێکدێنا. ئەمانە وەفادارانە لە خاکی سەرەکی زەندیە و سنوورەکانی کرماشان مابوونەوە. دەستەیەک لە حەشیمەتی گۆران و ئەحمەدوەندی کوردی قەڵەمرەوی کرماشان[10] و لقی هوداوەندی تایفەی میشمەستی عەرەبی خورەمئاباد[11] و ژمارەیەک لە جەماوەری خێلاتی(٤) بیرانوەند و زەنگەنە بەرەو دەوروبەری شیراز کۆچ دران[12]. ناوچەی زەهاو لە ئاخری سەردەمی زەندیە و سەرەتای دەسەلاتی خێلی قاجاردا بە دەس محەممەدحوسێنخانی قەرەگۆزلوو بەرێوە دەچوو. ناوبراو بردی زەهاوی لە سەر ڕووباری ئەلوەند هەڵبەست[13]. شاری کرماشان وردەوردە لە گیروگرفتی تۆپخانەی پێشووی لە قەلای نادریدا ڕزگاری هاتبوو و سەرەڕای درێژەی حکوومەتی تایفەی زەنگەنە (عەبدولباقی لە دەورانی نادری و ئەللاقولیخان لە دوایین سالانی دەسەلاتی وەکیلا) گۆڕانێکی دیکەی بە سەر نەهاتبوو[14]؛ کرماشان لە ماوەی داڕووخان و لێکبلاوبوونی دەسەلاتی خانەدانی زەندا دووبارە تووشی هێندێک زەرەد بۆوە[15].

لە ناوچەکانی دوورەدەس و بەتایبەت لە نێو تایفەکانی سەحرانشیندا دەسەلاتی حکوومەت بەتەواوی مەبەستێکی ڕواڵەتی بوو. وەکیل تەنیا ئۆباڵی بۆ سەرۆکانی سەردەسەلاتی تایفەکان دەکێشا و پتر خۆی لە شەڕ و سەرێشە و خەرجوبەرجی زیادی بە مەبەستی نواندنی زەبروزەنگ دەپاراست. ئەگەر خێلێک سەربزێوی کردبا و ملی نەدابا لە شوێنی خۆی دوور دەخرایەوە و زۆر کەمیش ڕازی دەبوو کە دوورخراوەکان بگەڕێنەوە جێی پێشوویان. بێگومان لەبەر نەبوونی دەرفەتی تەواو ئەم هەنگاوەی دەنا ، کەچی زۆریش وێدەچێ ئەم هەڵوێست و سیاسەتەی بە لاوە بێفایدە بووبێ. شاعەباس و نادرشا نیشتەجێ کردنەوەی دووبارەی هۆز و تایفەکانی کۆچەر و بنەگریان ئەنجام دابوو کە دیارە

١٠ـ ئەمینزەکیبەگ، کورد و کوردستان؛ ڕابینۆ، کرماشان، ل ٤١.

11- Lambton, Lanlord and Peasant, 142.

12- Mann, Mundarten, XX, XXIV.

١٣ـ فیرووزیان، ل ٨٢.

14- Lockhart, Nadir shah, 97 and index.

١٥ـ فیرووزیان، ل ١٣٤ و ١٣٦.

ئامانجیان نەک هەر تەنیا پاراستنی هێمنایەتی و تەناهی، بەڵکوو بەرپەرچدانەوەی هێرشی پەلاماردەرانی عوسمانی لە باکووری ڕۆژاوایی و سازکردنی قەڵا و قایمە لە ناوچەکانی باکووری و ڕۆژهەڵاتی خوراسان بوو. ئەگەرچی کەریمخان لە سنوورەکانیدا کێشەی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام بۆخۆی پێیخۆش بوو کە بۆ خاترجەمی و ڕاکێشانی سەرنجی تایفەکان کەمتر بکەوێتە دەستێوەردان. بەرچاوترین گواستنەوەی سەبارەتە بە بەختیارییەکان لە ساڵی ١٧٦٣دا. بۆ بەرپەرچدانەوەی گەڕانەوەی خێڵاتی بەختیاری تایفەی بەگەرلوو کە لە دەورانی دەسەڵاتیدا لە کاشانەوە گەڕابوونەوە قوم، دنە دران تا لە ناوچەکانی بەختیاری نیشتەجێ بن و گەلێک لەو ملکوماشە وێرانە ئاوەدان بکەنەوە، هەتا لە ماوەی چەند وەچەی داهاتوودا ئاڵوگۆڕێک بەدی بێ[16].

## ١٤ ـ ٢ پارێزگاکان و شارەکان بەر لە کەریمخان

لە مەودای ساڵانی ١٧٢٢ تا ١٧٦٤دا شارەکانی ئێران تووشی قۆناخێکی پڕ شەڕەنگێزی و شاڵاوی لەشکری و زۆرەملی بێوچان لە لایەن تاڵانکەرانەوە هاتبوون و بە تەنیایی دابینی خەرجوبەرجی سەنگین و بەخێوکردنی سپای گەورە و گران و چەوساندنەوەیان بە ئەستۆ دابڕابوو. پیتاک پێهەڵاچوون و کەمتر لە ڕۆژگارانی پێشوو خەرج کران؛ تەواوی ماڵ و سامانی ئەو هەرێمانەی کە خۆیان ناوچەیەکی دیکەیان داڕووتاندبوو بە زۆری لێیان ئەستێندرا، تەنانەت سەبارەت بە سیاسەتی «زەویسووتاو» کە لە هێندێک شوێن وەبەرچاو دێ ناوچەی خۆشیان تاڵان کردووە. ئەگەرچی فەرمانڕەوایەتی نادرشا لە ڕوانگەی سیاسییڕا لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی سەپیوی ئەفغانییەکان پتەوتر بوو، بەڵام بە دژواری دەشێ بانگەشەی ئەمە بکرێ کە کەمتر لەو سام و ترسی وەبەر خەڵک ناوە: زوڵم و تاڵان و بڕۆی بەربلاو ڕوخسارێکی دیکەی لە سەرانسەری وڵاتا بەدیهێنا و لە هەر دە ماڵان لانیکەم یەکیان چۆڵ کرابوو. ئەگەر بە لای

16- Lambton, Landlord and Peasant, 141.

بە مەبەستی زانیاری زیاتر سەبارەت بەم گوێزانەوە زۆرەملییانە بڕوانە: وتاری پێری بە ناوی کۆچی بەزۆرەملی.

کەمیدا لامان وابێ کە چارەنووسی ناوچەکانی دیکە هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ چارەنووسی بەندەرعەباس نەبووە، کەریمخان بەناچار کەوتۆتە بیری دۆزینەوەی ڕێچارەیەک بۆ بەربەرەکانی لەتەک قاتی ساختە و دەسکردی وڵات کە ئەویش لە کاتی تەقەلا بۆ وەدەسهێنانی دەسەڵات تێیا بەشدار بووە[١٧].

باری داسەپیوی ئابووری بە سەر پارێزگاکانی ناوەندی ئێرانا کە پاش سەرکەوتنە یەکلەدوایەکەکانی عەلیمەردانخان، ئازادخان، کەریمخان و محەممەدحەسەنخان دەخرانە ڕوو، بەگشتی لە ڕێی ئەستاندنی ملکانە، پیتاک، جەریمە و قەرەبووی خەسارەت و چەند جۆر تاوانانە کە پاش گیرانی شارەکان وەبەرچاو دەگیران، دابین دەکرا. لە مەودای سالانی ١٧٥٠ ـ ١٧٦٠دا بڕی ئەم داهاتانە وە سەرووی ٣٥هەزار تمەنیش دەکەوت. ئەم خشتەیە ڕەنگە تەنیا ١٢چەشن پیتاکی گرتبێتەوە (یانی جگە لەو دیاری و پێشکێشییانەی کەسێک بە مەیلی خۆی دابێتی). ئەم بڕە پارەیە ئەو جەریمەیەی تێدا وەبەرچاو نەگیراوە کە لە ماوەی بیستجارێک داگیرکرانا ئەستێندراوە و ڕەنگە نیوەی ئەو پارەیە بێ کە باسی کرا (بڕوانە: خشتەی لاپەڕە ٤٩٠ ـ ٤٩١). بڕی ٧٠٠هەزار تمەن نیزیک بارتەقای دەجار داهاتی ملکانە و پیتاکی ساڵانی ئیسفەهان بووە.

ئاکام و بەرهەمەکانی دیکەی ئەم شەڕانە چۆڵکرانی گوندان، دابڕانی ڕایەڵوپۆی بازرگانی، برسییەتی، نەخۆشی و وردبوون و تێداچوونی بنەمای ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی بوو. لە بەشەکانی پێشوودا چەند وێنەیەکمان سەبارەت بەم باسانە خستە ڕوو. لە ماوەی پەلاماری ساڵی ١٧٥٥ی محەممەدحەسەنخانی قاجار بۆ سەر گیلان، باجێکی ١٥٠هەزار رووبڵی بە سەر جەماوەری ئەو ناوچەیەدا سەپی کە دەبوو بە نیزیکەی ٨هەزار تمەنێک. عەمبارەکانی گەنمی شاری ڕەشت دەستی بە سەرا گیرا، تەواوی ماڵ و سامانی خەڵکی قەزوێن بە تالان چوو؛ لە ئاکامدا گوندنشینان ڕایانکردە نێو لێڕەوارەکان و توجارەتی بەندەر ئەنزەلی ڕاوەستا[١٨]. زۆرێک لە جەماوەری گیلان و مازەندەران لە ساڵی ١٧٥٠دا کە قاجاری بە سەریاندا زاڵ بوون لە برسان و بە نەخۆشی مردن. قاتی و

17- Plaisted, 10.
18- Butkov I, 417.

نەخۆشی ئەم پارێزگایانە کە بە کۆتایی شەڕ دامرکابوو، سەرلەنوێ لە ئاخری ساڵی ١٧٧٠دا لەبەر مردنی چاوەڕوانکراوی وەکیل و ژیانەوەی دەسەڵاتی سیاسی خێڵی قاجار سەریان هەڵدایەوە[19] و کوشتار و کێشمەکێشم لە نێو ڕێبەرانی خۆجێییدا تازە بۆوە. «ئارەزوومەندانی پلە و پایە و ماڵ و سامان کە خاوەنی دەسەلاتێکی بێسنوور بوون، تووشی کوژران، کوێری، داگیرکرانی ماڵ و دارایی و دوورخرانەوە هاتن[20].» لە دەورانی قاتیوقڕی ساڵی ١٧٥٧دا لەبەر زۆرەملێ قاجاریان بارودۆخەکە پتر ئاڵۆزکا و خەڵکی ئیسفەهان و جولفا ناچار بوون کە بۆ دابینکردنی نان، منداڵەکانیان بفرۆشن و بکەونە ڕاوی جانەوەری کێوی و ئادەمیزادان[21]. پەمۆدانەیان لەبری نان و تاماو دەخوارد، سەرکەوتووان یاسای دڕندانەی لێرەواریان دادەسەپاند، بە مەبەستی وەرگرتنی ملکانە و پیتاکی داسەپیو چەند نوێنەرێکیان هەڵدەبژارد کە بۆ گەیشتنە ئاکام هەر ڕێبازێکیان وەبەر خۆیان دەدا: حاکمان و کەلانتەران و کوێخاکان لەجیاتی تاقمەکانی چەتە و ڕێگرانی چەکدار دەیانویست بکەونە دزی. ڕووداونووسی بەندەرعەباس لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٦٠دا، هەلومەرجی زاڵ بە سەر ناوچەدا ئاوا دەخاتە ڕوو: «واوێدەچێ کە ئەم حکوومەتە دەیهەوێ زۆر خێرا وڵاتەکە خاپوور بکا. ئەوانەی دەسەڵاتیان بە دەستەوە هیچ سەرنج نادەنە حاڵ و باڵی جەماوەر، تەنیا لە بیری ئەوە دان کە بزانن چۆن دەکرێ ئەو چەکدار و کەسانەی بەپێی پێویست لە ژێر فەرمانیان دان ڕازی ڕابگرن. ئاکامی ئەم کارە برانەوەی خاشەی بازرگانێتی لێدەکەوێتەوە[22].»

بەڕێوەبردنی حکوومەت و داهات و ئاسوودەیی کۆمەڵایەتی شارنشینان و جووتیاران ئەگەرچی لە ئاستێکا بوو، بەڵام هەروەک تیئۆری سیاسی حکوومەتی ئێران لە ماوەی چەندین سەدەدا نیشانی داوە، حوکمڕانان ئەیالەتەکانی خۆیان بە هێزی سپا دەپاراست و سپاش بە نۆرەی خۆی تەنیا لە ڕێی داهاتێکی ڕێکوپێکەوە ڕادەگیرا و بەخێو دەکرا؛ کارێکی ئەوتۆ تەنیا بە

19- Kukanova, 73.
20- Arunova and Ashrafyan, ((Novye Materialy)) III.
21- Hovhanyants, 290.
22- GD XII, 28 February 1760.

ئابوورییەکی گەشەداری سەرکەوتە دەکرێ و ئابووری سەرکەوتووش لە ڕێی جەماوەری ڕازی و شادمانەوە وەدیدێ و ئەم کارەش تەنیا لە سێبەری دادپەروەریدا گوڵ دەکا[٢٣]. نادر و جێنشینانی کە ئەو ڕێگایەیان لە ماوەیەکی کورتا بڕیبوو، هۆردوویان بۆ زۆرەملی و زێدەڕۆیی دێنایە مەیدان و خەرجوبەرجی ڕاگرتنیان لە جەماوەری خەڵک وەردەگرت و قەت وەک سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسی نەیاندەڕوانییە باری ئابووری و ئەخلاقی.

ڕەنگە بتوانین سەرچاوە گرینگە کۆنباوەکان و داهاتی پارێزگاکانی حکوومەتی زەندیە بکەینە پێنج جۆری یاسایی و ڕێکوپێک و پێنج چەشنی ناڕێکوپێک و نێوەنێوە[٢٤]. ملکانە و پیتاکی پێنججۆرەی ڕێکوپێک بریتی بوون لە:

١ـ وەرگرتنی ملکانەی زەویوزاری پاشایەتی و ملکوماشی دەوڵەت. لە سەردەمی سەفەوییەدا ئەم چەشنە زەویوزارانە کەوتبوونە لای ناوچەکانی ڕۆژاوا و باشووری ڕۆژاوای قەراخ دەریای خەزەر و ئێراقی عەجەم و فارس و کرمان. خوراسان لەو بابەتەوە خاوەنی هەلومەرجێکی تایبەتی بوو. ملکانەی ئەم زەوییانە نیزیکەی ٣٠% بەرهەمی ساڵانە بوو. لەبەر بە دەستەوە نەبوونی شای ڕاستەقینە و کەمتەرخەمی وەکیل سەبارەت بە ماڵ و سامانی خۆی وا وێدەچوو کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ملکی پاشایەتی و ملکی دەوڵەتیدا نەبێ (بەڵام لە ڕاستیدا جیاوازیش بووە)[٢٥].

٢ـ ملکانەی زەویوزاری دەرەبەگان و مووچە و مەزرای مەوقووفە کە داهاتیان دەگەیشتە ١٥% تا ٢٠% و سەروخواری دەکرد.

٣ـ پیتاک و ملکانەی نەگۆڕی سەرانە کە لە خێزانی هۆز و تایفە و

---

٢٣ـ ئیبنی بەلخی، فارسنامەی چاپی ئەوقافی گیب، لەندەن ١٩٢١، ل ٥. لە زمان سەعالبیڕا دەڵێ: «نە وڵات بێ لەشکر ڕادەگیرێ، نە لەشکر بێ مووچە و دارایی و نە ماڵ و سەروەت بێ ئاوەدانی و نە ئاوەدانی بێ عەداڵەت.

٢٤ـ ئەو پیتاک و ملکانەی کە وا باسی دەکرێ، زۆربەی لە مێلکۆم وەرگیراوە، ل ٤٧٨ ـ ٤٨٠؛ Waring, 85; Fraser, Narrative, 206 – 207, 213. ڕۆستەموتتەواریخ، ل٣٢٥؛ هادی هیدایەتی، مێژووی زەندیە، ل ٩٥؛ موشیری، ل ١٩٢ـ١٩٣.

٢٥ـ بڕواننە: تەزکەرەتولملووک، ل ١٤٧.

کەمینەکانی ئایینی بە نەغد یان بە وەرگرتنی ئاژەڵ دەبڕایەوە. (مەڕ و پاتاڵ و یەکسم وەردەگیرا).

٤ـ گوومرگانە کە لە ٧ تا سەتی ١٠ی نرخی ئەو شمەکانە بوون کە وا دەهاتنە وڵاتەوە و لە بازرگانە گەورەکان وەردەگیرا.

٥ـ پێشکەشییانە کە لە لایەن والی، سەرۆکانی خێڵ، کاربەدەستان و حاکمان و ئەوانەی وا کاریان دەکەوتە بەردەستی حکوومەت دەدرا. ئەم باجە بەهەڵکەوتانە، نەورۆزانە، دیاری گەشت و دیداری ئەیالەتی، زەماوەند و لەم چەشنەیان دەخرایە سەر. ئەم دوو جۆرەی ئاخری بە باری چەندی و چۆنی و کەم و زۆری‌دا دەکەوتنە جەغزی دەستەی دووهەم. بە دڵخواز چەند و چۆنیان پێخۆش بووبا دەیانئەستاند.

پێنج جۆر پیتاکی نارێکوپێک و نێوەنێوە برێتی بوون لە:

١ـ پیتاکی چاوەڕواننەکراو و لەپڕ بە مەبەستی دابینکردنی خەرجوبەرجی تایبەت و تەنگەتاوی کە لە باجی تاکەکەسی، کۆمەڵایەتی و جەریمە و تاوانانەڕا تا یارمەتی بە مەبەستی لەشکرکردنی دەگرتەوە.

٢ـ دابینی خوردوخۆراک و تفاق و توێشە بۆ ئەو لەشکرییانەی کە زیاتر دەکەوتنە دەرەوەی سەربازگە لە خاکی دوژمن یان لە نێو هەرێمی خۆدا بوون.

٣ـ کەلک وەرگرتن لە هێزی کار یان بەکۆیلە بردن بە مەبەستی هەڵسووڕاندنی وزەی ئادەمیزاد بێبەرامبەر بۆ کاری گشتی، هەڵگرتنی بەرهەم، گواستنەوە و گەیاندن و کاروباری لەم چەشنە.

٤ـ نیچیر دۆزینەوە و شوێنگێڕان بۆ ڕاوی پاشا. دەگێڕنەوە شاعەباس بۆ ئەم کارە جارێکیان هەزار کەسی گوندەکی بە سۆغرە گرتبوو.

٥ـ کڕین و فرۆشتنی بەزۆرەملی (تەرح)(٥): ئەو بەرهەم و کەرستانەی کە زیاتر بوو لە نیازی نوێنەرانی شا بە زۆری و بە چەند بەرامبەری نرخی باوی بازاڕ بە بازرگانان و خاوەنی کۆمپانیاکان دەفرۆشران. نادرشا دەیتوانی سپای زۆروزەوەندی هەر بە داسەپاندنی ئەم نرخانە خێرایەکی تەیار بکا[٢٦].

زیدە لەم بابەتانەی باسیان کرا، باجی ڕێدرانە، بەئیجارەدانی بازاڕ،

26- cf. Arunova and Ashrafyan, Gosudarstvo, 259.

داهاتی سەر بە داموودەزگای میری و هەموو چەشنە بەرتیل و دراوی یاسایی مفت وەک خەزێنەی دۆزراوە، میراتی بێکەسوکاران، دارایی حاکمانی لێخراو و سەربزێوانی دەردەسکراویش لە لایەن شاوە کۆ دەکرانەوە.

لە ماوەی بۆشایی دەسەلاتا ملکانە و پیتاکی چاوەڕواننەکراو بە شێوەی ئاسایی زیاد دەکران و شوێنیان دەکردە سەر کشتوکاڵ، توجارەت و ئاڵوگۆڕی کۆمەڵی شارنشین. ئەمانە بە شێوەی سروشتی و ئاسایی دارولەلەی باویان بۆ دانەندرابوو، بەلام بە تەنیایی بە باری پێشکەوت و گەشەی کۆمەلا زۆر کاریگەر بوون. جگە لە ئەرک و کاروباری درێژخایەن وەک ڕاگرتن و پاراستنی ناوەندەکانی توجارەت و ڕێوبانەکانی بازرگانی، هەر حکوومەتێکی تازەدامەزراو دەبوو بۆ پێشکەوت و گەشە و هەڵدانی باری ئابووری و یارمەتیدانی بەشی سەرمایەنانەوە سیاسەتێکی لەبار بگرێتە بەر. بەر لە فەرمانڕەوایەتی زەندیە شارە گەورەکانی وەک ئیسفەهان و مەشەد بە شێوەیەکی سروشتی زۆریان سەرنج دەدرایە و شیرازی «کەریمخانیش» هەروابوو. تەنیا یارمەتییەکی کە سالانە بۆ ئەم شارانە وەبەرچاو دەگیرا هەلگرتنی پیتاک بوو بە شێوەیەکی کاتی و تیژتێپەڕ. نادرشا پاش گەڕانەوەی لە دێهلی و عادڵشا دوای ئەوی ڕۆنیشتە سەر تەختی پاشایەتی کارێکی ئەوتۆیان کرد و لە سەریەک دوو جار هەلگرتنی ملکانە و پیتاکی سالیانە سێساڵێکی گرتەوە.

نادرشا هێندێک پاش بەخشین و لێخۆشبوونی پیتاکی گشتی، تێهەڵچۆوە و نەزمە چاوەڕوانکراوەکەی خستەوە گەڕ و عادڵشا سێیەکی ئەو ماوەیەی بۆ دووجاران نوێ کردەوە[27]. کەریمخان قەت ملکانە و پیتاکی بە یەکجاری هەڵنەگرت و تەنیا وەختایەک چاوی بە ڕۆژەڕەشی و مەینەتی خەڵکی کرمان کەوت، ملکانە و باجی چەند ساڵەی لە سەر هەلگرتن، بەلکوو قەرەبووی ژیان و بەرێچوونیان بکرێتەوە. بەلام قەتیش لە بواری وەرگرتنی پیتاکا ئاوێکی خراپی نەڕشت یان گۆڕانێکی نوێی نەهێنایە ئاراوە، تەنیا دادپەروەری و فەلسەفەی هەبوونی حکوومەت و دەسەلاتی واقیعگەرایانەی هەلی بۆ خەڵکی ئێران ڕەخساند هەتا ژیانیان بە شێوەیەکی بەرچاو بەرەو باشی و تەسەلی و حەسانەوە بازوێ.

---

27- Lockhart, Nadir shah, 238; cf. Prologue.

## ١٤ ـ ٣ حکوومەت و داهاتی کەریمخان

بەگوێرەی بەراوردی تەواوی ڕووداونووسان نادرشا کە کوژرا پازدە کروور پارەی نەغدی لە پاش بەجێما و هەر کروورێک پێنسەدهەزار تمەن دراوی زێو بوو[٢٨]. پاش مەرگی کەریمخان نیزیکەی حەفتاهەزار تمەنێک لە خەزێنەیدا مابوو و ئەمەش تەنیا لەبەر سەردەمی نەخۆشی و بناوبێری خەرج نەکرابوو[٢٩]. ئەگەر بڕوا بە حیساباتی ڕۆستەمولحوکەما بکەین (بڕوانە: خشتەی لاپەڕە ٤٩٠ ـ ٤٩١)، بە سەرنجدان بە ئاوسانی باری ئابووری ئەو هەرێمانەی کە پاش خانەدانی سەفەوی لە ئێران دابڕابوون، داهاتی کەریمخان لەچاو ساڵانی کۆتایی حکوومەتی سەفەوی لە بارودۆخێکی ئابڕوومەندانەدا بوو. بنەمای کۆکردنەوە و وەرگرتنی پیتاکی ئەم دەورانە دەفتەری حیساباتی سەردەمی نادری بوو[٣٠] کە تاقمێک لە خەزنەدارانی زەحمەتکێش لە ماوەی حەوت ساڵاندا یانی لە ساڵی ١٧٢٥ڕا بەرەو دوا خەریکی ببوون و ڕێکیان خستبوو، بەڵام لەبەرەوەی نادر دەویەکی ملکانە و پیتاکی بە زیادی و زۆرەملی کۆکردەوە، سامانێکی لەخۆوەی وەسەریەک نا و سەرەنجام کوولەکەی ڕووحی شکا و «قاز»ی هێلکەزێڕینی کوژرا، بەڵام کەریمخان هەڵوەرجێکی تایبەتی پێکهێنا و بێنێوبڕ لە داهاتی کەم کردەوە و خستییە سەر سەرمایەنانەوەکان.

سەرەتا بە وردی ڕێوشوێنی وەرگرتنی پیتاک و ملکانەی حکوومەتی لە بەگلەربەگیڕا تا کوێخادێ و دەس و پێوەندەکانی کارگێڕ و کۆکەرەوە و خەزێنەداری دەکردە یەکجێ. لە ڕۆژانی نەورۆز یان لەوان دەوروبەراندا تەواوی ئەو کاربەدەست و کارگێڕانە دەبوو بەڵێننامەیەکیان ئیمزا کردبا کە نابێ لە

---

٢٨ـ ئەستەرئابادی، جیهانگوشای نادری، ل ٤٢٧. قەزوێنی لە لاپەڕە ٢٨٣ ئەم بڕە پارەیە دەکاتە دوو قات و ئۆلیویە کردوویەتە نیوە و گوتوویەتی حەوت کروور و نیوی لە خەزێنەدا بووە، بەرگی ٥، ل ٤٤٦.

٢٩ـ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ١٢٣. بەگوێرەی ڕاپۆرتی ڕووسان (Butkov I, 152) لە خەزێنەی ئەبولفەتحخاندا لە ساڵی ١٧٨٠، کەریمخان ٥میلیۆن ڕووبڵی ویشکەپووڵ واتە ٢٦٦/٦٦٦تمەن نەغد و بایی ٢٠میلیۆنی شتوومەک لەپاش بەجێمابوو.

٣٠ـ ڕۆستەمولتەواریخ، ل ٣٢٥.

## خشتە

**دامودەزگای ئیداری و داهات و نفووس لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی کەریمخاندا (١٧٥١ ـ ١٧٧٩)**

| ژمارە | شار | حوکمڕانی هەڵبژێراوی زەندیە | ڕێکەوت (ساڵ) | داهات بە تمەن | مەزندەی نفووس | سەرچاوەی ئەژماری نفووس |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەستەرئاباد | محەممەدحوسێنخانی دەوەللوو (بەگلەربەگ) | ١٧٥٩-١٧٦٠ | ـ | ـ | ـ |
| | | محەممەدحەسەنخانی دەوەللوو | ١٧٦٠ـ ؟ | ـ | ـ | ـ |
| | | میرزاعەلی دەوەللوو | ١٧٧١ـ ؟ | ـ | ـ | ـ |
| ٢ | بەندەرعەباس | حاجیئاغامحەممەد ڕەعنایی (حاکم) | ١٧٦٧ـ١٧٦٩ | ـ | ٥٠٠٠ | Emerson |
| | | شێخمحەممەد بەستەکی | ١٧٦٩ـ ؟ | ـ | ـ | ـ |
| ٣ | برووجێرد | عەلیمحەممەدخانی زەند | ١٧٥٠ـ ؟ | ـ | ١٢٠٠٠ | Hambly |
| | | تەقیخانی زەند | | ـ | ـ | ـ |
| ٤ | بووشێهر | شێخنەسری ئالیمەزکوور و کوڕەکەی | ١٧٤٥ـ١٧٧٨ | ـ | ٨٠٠٠ | H. _ Kelly |
| | | شێخنەسر (کوڕ) | ١٧٧٨ـ ؟ | ـ | ـ | ـ |
| ٥ | ئێرەوان | حوسێنعەلیخان (بەگلەربەگ) | ـ | ـ | ٢٠٠٠٠ | Hambly,in Iran |
| ٦ | قەڵەمڕەوی هەمەدان | ئەبولمەعسوومخان (حاکم) | ـ | ١٥٠٠٠ | ٢٥٠٠٠ | Olivier,51. Emerson |
| ٧ | ئیسفەهان | میرزا عەبدولوەهاب | ١٧٥٢ | ٧٠٠٠٠ | ٤٠٠٠٠ | Carmelites VI, Olivier |
| | | حاجیئاغا محەممەد ڕەعنایی | ١٧٦٠ـ١٧٦٧ | | | |
| ٨ | جولفا (جولفای تازە) | سێرگیس (کەلانتەر) | ـ | ـ | ـ | Hovhanyants |
| ٩ | کاشان | موعیززەدین غەففاری | ١٧٥١ ـ ؟ | ١٢٠٠٠ | ٢٠٠٠٠ | Olivier, 169 |
| | | بڕوانە: ئیسفەهان | ١٧٦٠ ـ ؟ | ـ | ـ | |
| ١٠ | کرمان | خودامرادخانی زەند | ١٧٦٠ـ ؟ | ٢٠٠٠ | ٣٠٠٠ | Hambly |
| | | محەممەدئەمین گەرووسی | ١٧٦٤ ـ ؟ | ـ | ـ | ـ |
| | | ڕۆستەمخانی زەند | ١٧٦٦ ـ ؟ | ـ | ـ | ـ |
| | | حوسێنخانی ڕەعنایی ـ ئاغاعەلی | ١٧٦٧ ـ ؟ | ـ | ـ | ـ |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | سەید ئەبولحەسەنی محەللاتی | ١٧٦٧ ـ ؟ | – | – | – |
| ١١ | كرماشان | عەلیمرادخانی زەند | ١٧٥٣ ـ ؟ | ١٥٠٠٠ | ٣٠٠٠٠ | Olivier, 23; Hambly |
| ١٢ | خورەمئاباد | ئەزەرعەلیخانی فەیلی | ١٧٦٥ ـ ؟ | – | – | – |
| | (لورستان) | سمایلخانی فەیلی (والی) | ١٧٦٦ ـ ؟ | – | – | – |
| ١٣ | خۆیوسەلماس | ئەحمەد دونبولی (بەگلەربەگ) | ١٧٦٣ | – | ١٥٠٠٠ | Hambly |
| ١٤ | لار | نەسیرخانی لاری (بەگلەربەگ) | ١٧٥٠_١٧٦٥ | – | ١٥٠٠٠ | Hambly |
| | | مەسیحخانی لاری | ١٧٦٥ | – | ١٢٠٠٠ | Emerson - Hambly |
| ١٥ | مەراغە | حاجی عەلیمحەممەد | ؟ | – | ١٥٠٠٠ | Hambly |
| | | ئەحمەدخان | ١٧٧٥ | – | – | – |
| ١٦ | قەزوین | مەولاوێردیخان | ١٧٦٠ | ١٢٠٠٠ | ١٥٠٠٠ | Beau, 69 |
| ١٧ | قوم | بڕوانە: كاشان | – | – | ١٠٠٠٠ | Olivier, 163f. |
| ١٨ | ڕەشت (گیلان) | ئەزەرعەلیخانی زەند (بەگلەربەگ) | ١٧٦٢_١٧٦٣ | ٢٥٠٠٠ | ١٢٠٠٠ | Hambly |
| | | هیدایەتوللاخان | ١٧٦٣_١٧٨٦ | – | – | – |
| ١٩ | ساری | محەممەد سەوادكووهی | ؟_١٧٧٢ | – | – | – |
| | (مازەندەران) | مەهدی سەوادكووهی | ١٧٧٣ ـ ؟ | – | – | – |
| ٢٠ | شیراز (فارس) | سادقخان | ١٧٥٧_١٧٧٥ | ١٦٠٠٠٠ | ٤٠٠٠٠ | Emerson – Hambly |
| ٢١ | تاران | حاجیجەعفەرخان | ١٧٦٢ | ١٢٠٠٠ | ٢٠٠٠٠ | Emerson – Hambly |
| | | غەفوورخان | ١٧٦٣ | – | – | – |
| ٢٢ | ورمێ | ڕۆستەمخانی قاسملوو | ١٧٦٣ | – | ١٢٠٠٠ | Hambly |
| | | ڕەزاقولی قاسملوو | ١٧٦٦ | - | – | – |
| | | ئیمامقولی قاسملوو | ١٧٧٠ | – | - | – |
| ٢٣ | یەزد | تەقیخانی بافقی | ١٧٥٤_١٧٥٨ | ١٢٠٠٠ | ٥٠٠٠٠ | Petrov, 329. |
| ٢٤ | زەنجان (خەمسە) | زولفەقارخانی ئەفشار | ١٧٦٣ ـ ؟ | – | ١٠٠٠٠ | Emerson - Hambly |
| ٢٥ | شووشتەر | میرزاحوسێن | ١٧٦٥ | – | ١٥٠٠٠ | Hambly |
| ٢٦ | تەوریز (ئازەربایجان) | نەجەفقولی دونبولی | ١٧٦٣ ـ ؟ | ٦٠٠٠٠ | ٣٠٠٠٠ | Emerson - Hambly |

جـــەغزی کاریاندا جگە لەوەی دیاریکراوە تەنیا فلسێک زیادی وەربگرن و دەبوو کە لە کۆتایی هەموو ساڵێکا پسوولەی سەبارەت بەو کەسانەیان بە دەستەوە بێ کە جەریمە کراون یان لێیان خۆش بوون. دەگێڕنەوە کە کـەریمخـان هەڕەشـەی لێکردبوون ئەگەر فلسێک زیادی لە خەڵک وەربگرن، دوو فلس جەریمە دەکرێن و بێجگـە لەمـەش سـزاش دەدرێـن[31].بەرپرسـی پێداچوونـەوەی سـاڵانە مـیرزا محەممەدی کەلانتەری فارسی بوو کە ئەویش هێندێک دزی و زێدەڕەوی و زوڵـمی خستە ڕوو. تەنانەت وەختایەک کە وەکیل لە ساڵـی ١٧٦٠دا دەیەویسـت لەشـکر بکاتە سەر تاران ئاغا فەزلوڵلای خەزێنەداری شیراز ڕاسپارد تا بـە حیسـاباتی پایتەخت کە سادقخانی برای حوکمڕانی بوو، ڕابگا. کەلانتەر کە سـەبارەت بـە زێدەڕەوییەکانی سادقخان سکاڵای بردبووە بەر وەکیل، دەنووسێ پاش هـاتنی ئاغا فەزلوڵلا بە شێوەیەکی بەرچاو تەماح و چاونەزێری سادقخان لـە کـەمێی دا. لە ئاکامدا ئەویش زۆر شوکرانەبژێر بوو[32].

وا باو بوو کە کاربەدەستان پاش ئەوەی هەڵدەبژێردران مانگانەیان بـۆ دیاری دەکرا و لە حوکمەکەیاندا دەنووسرا. وەختایەک حوکمی دەسبەکاربوونی لێپرسراوێک دەنووسرا لەڕێوە لێکۆڵینەوەی لە سەر دەکرا تا بزانن چی هەیـە و چی نیە. حوکمڕانانی پارێزگاکان پتر لـە نێـو کەسـایەتییەکانی خـۆوڵاتی کـە خۆیـان خـاوەنی داهاتێـک بـوون و دەیـانتوانی سـەرەڕای مڵـکانە و پیتـاکی دیاریکراو دیاریش بدەن هەڵدەبژێران. مووچەی ساڵانەی حوکمـڕانانی گـەورە سەدتمەن نەغد و نیزیکەی ١١٤تۆن دەغڵ و دان بوو. کاربەدەسـتانی ژێردەسـتی حاکم لە سەر ئەو پێودانە و بە باری جیـاوازدا مووچـەیان بـۆ دیـاری دەکـرا. ڕۆسـتەمولحوکەما لـە بابـەت حکوومـەتی ئیسـفەهانەوە چەنـد نموونەیـەک دێنێتەوە و دەڵێ وەکیل وەختایەک لە ساڵی ١٧٥٦دا لە مازەندەران دەگەڕایەوە، میرزا عەبدولوەهابی لەگـەڵ حـەوت کـەس لـە ژێردەسـتانی بـۆ حکوومـەتی ئیسفەهان هەڵبژارد. پلە و شوغڵی ئیداری ئەو حەوت کەسە ئـاوا بـوو: وەزیـر، خەزێنەدار، وەکیلی ڕەعێتان (وکیل‌الرعایا)، حیسابگەر، کەلانتەر، موحتەسـیب و

٣١ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٠٨.

٣٢ـ کەلانتەر، ل ٥٧ ـ ٥٨؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٢.

نەقیب[٣٣].

لە پشت ئەم نووسراوەیە ڕاپۆرتێک سەبارەت بە ڕایەڵوپـوی ئیـداری و بەڕێوەبردنی شار لە ئاخروئۆخری سەدەی هەژدەی ئێرانا وەبـەرچاو دێ. ئـەم زانیارییانە دەریدەخەن کە تانوپۆی دامودەزگای ئەم دەورەیە تەواو بـەگوێرەی سیستمی ئیـداری لای بنـەبانی حکوومـەتی سـەفەوییە و سـەرەتای قاجارییـە خراوەتـە گـەڕ. تەزکـەرەتولملووک نـاوی چـاردە کـەس لـە کاربەدەسـتانی ئیسفەهانی ڕیز دەکا کە لە ڕاستیدا نـۆ کـار و شوغڵـیان لـە ئەسـتۆ بـووە. (دەفتـەرەکانی وەزیـر و خەزێنـەدار لـە چەنـد شـوێنان چەنـد جارێـک دەنووسرانەوە). ڕۆستەموتتەواریخ پێنج پایەی وەرگری پیتاک دەخاتە ڕوو لـە پلەی بەرەژێرتردا کە پێوەندی بە باسی ئێمەوە هەیە. دەبێ لە بیرمـان بـێ کـە ئیسفەهان پایتەخت بوو و ئێمە لامان وایە کە دامودەزگای کەریمخان لـە شـیراز گرینگتر و لە ئیسفەهان بێقابیلەتتر بوون و لە هەندێک بابەتاندا ئەرکـەکانیان ـ بە گوتەی کەلانتەر ـ چووک دەبۆوە یان گەورەتر دەبوو.

وەزیر کارگێڕی حوکمڕانانی پارێزگا و کشتوکاڵی ناوچە بـوو کـە بـە دابەشینی زەویوزار و پەیداکردنی کرێکار و تـۆو و چـاککردنـەوەی ڕایەڵـەی ئاودێری، پـەرەی دەدا بـە کشـتوکـاڵ[٣٤]. خـۆی چـاوەدێری دەکـرد بـە سـەر کۆکردنەوەی بەرهەم و داهاتا و لەو شـوێنانەی کـە کێشـەیەک دەهاتـە پـێش پێڕادەگەیی و گرێ و کۆسپی دەڕەواندن. وەزارەتی پارێزگای ئیسفەهان، لەبـەر بەربلاوی ئەو هەمووە گوندە بەرفرەوان و بەرێژەوی کە لە سەردەمی سەفەوییەدا بووی، لەچاو باری ئابووری شیرازی هاوتای، تەنانەت لە زەمانی حکوومـەتی زەندیەدا بە پلەیەکی گرینگ دادەندرا.

مستەوفی (خەزێنەدار و ئەمین) بە سەرۆکی دامودەزگای کاروباری ملکانە و پیتاک و دارایی ڕادەگەیشت و بەرپرسایەتی تـەواوی داهـات و دەرکـەوتی لـە ئەستۆ بوو. دەزگاکەی داهاتی کۆکراوەی دەخستەوە سەریەک و بە پسوولەکاندا دەچۆوە و لە ڕووی بۆچوونی کارگێڕانی لە پلەی سەروخواردا ملکانە و پیتـاکی

٣٣ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٠٧.

٣٤ـ تەزکەرەتولملووک، ل ٧٨ ـ ٨٠، ١٤٠ ـ ١٤٧؛ دەستوورولملووک، ل ٣١٩.

دیاری دەکرد[35]. یەکەمین سەرخەزێنەداری دەورەی کەریمخان توراب‌خانی چگنی بوو کە لە ساڵی ۱۱۷۷ی کۆچی / ۱۷٦۳ی زایـینی بـە فـەرمانی وەکیـل کـوژرا و میرزامحەممـەدی برووجێـردی لـە جێـی دانـدرا. میرزامحەممـەد لـە شوغڵـی باج‌ئەستێنی‌را گەیشتە ئەم پلەیە.

پێشتر بە گشتی باسی وەکیلی ڕەعێتان کراوە(۱۳ ـ ٥). تەزکەرەتولملووک باسی ئەرک و ڕاسپێراوی ئـەم شوغڵـەی نـەکردووە، بـەڵام بـەپێی نووسـینی دەستووروڵملووک، کەلانتەری ئیسفەهان کەم‌وزور هەمان کاری وەکیلی ڕەعێتانی دەکرد. ئەو لەم پلەدا دەبووا ڕەزامەندی خەڵک وەدەس بێنێ سـەبارەت بـە هـەر چەشنە فەرمانێکی حاکم یان بەڕێوەبەرانی تری دەزگا و دەسەلات و ڕێ بگرێ لە هەر جۆرە زوڵم و چەوسانەوە و غەدرێکی کـە بـە سـەر جـەماوەردا دەسـەپێ و هەروەها بەڕێوەبردنی یاسای بلاو کراوەی سەر بە سـات و سـەودای لـە لایـەن پیشەوەرانەوە لە ئەستۆ بوو[36]. ڕەنگە ئەم نوێنەرانەی کرێکاران و گوندییان هەر لە بنەڕەتەوە سـەر بـە داموودەزگـای کەلانتـەر بـووبن، بـەڵام لـە سـەردەمی حکوومەتی وەکیلا کاربەدەستێکی دی ئەم کارەی دەکرد کە ئەویش نـاوی کـەریم بوو. وەکیلی پێشووی ئیسفەهان لـە پاکتـاوی سـالانی ۱۱۷٦ی کـۆچی / ۱۷٦۳ی زایینی‌دا میرزامحەممەدجەعفەری حوسێنی بوو. ناوبراو دواتر بوو بـە وەزیـری پارێزگا، واتە وەزیری دیوان. لەو ڕۆژگارەدا کە مـیرزا مـوعیززەددین غـەففاری حاکمی کاشان بوو ئەویش هەر لە پلەی وەکیلی ڕەعێتـان (نوێنـەری جـەماوەر)دا مایەوە[37].

بە مەبەستی زیاتر ئاشنا بوون بە کار و باری حیسابگەر جـارێکی تـر ڕوو دەکەینەوە دەستووروڵملووک: حیسـابگەری پارێزگاکـان وەک نووسـەندەی

---

۳٥ـ تەزکەرەتولملووک، ل ۷۸، ۸۱، ۸٤، ١٤٦.

۳٦ـ تەزکەرەتولملووک، ل ٤۲۲: جا چونکە وەکیلی ڕەعێتانە، لـە ئەسـتۆی نـاوبراوە... بۆچوونێکی ئاواش لە تەزکـەرەتولملووک‌دا هـاتووە (77b – 78a) کـە دەڵـێ ئـەرکی کەلانتەر دابین‌کردنی مافی جووتیاران و کرێکاران بووە و (لە لایەن جەماوەرەوە وەکیلە کە بەر بە چەوسانەوەیان بگرێ و نەهێڵێ زوڵمیان لێبکرێ). بـە مەبەسـتی ئاشـنایەتی زیاتر سەبارەت بەم باسە بڕوانە: وتاری خۆم بە ناوی پارێزگاری کردن لە بێبەشان.

۳۷ـ گوڵشەنی مراد، ل ۱۱۹.

کەلانتەر کاری دەکرد و بە مەیل و ئیشتیای وی هەڵدەبژێردرا ... لە دەفتەری خۆیدا وێنەیەکی حیساب و نرخاندنی قەرزوقۆڵەی پیتاک و ملکانەی هەر تاقمێکی لە لایەن نەقیبەوە مۆر و پشتڕاست کرابایەوە و کەلانتەریش ئۆبالی بۆ کێشابا، دەینووسییەوە. لە ژێر ئەم نووسراوەیەدا پێرستێکی بە ناوی پاساونامە (توجیە نامە) دەنووسی کە لیستەی ئیمتیازاتی ڕەسمی و مووچە و مانگانەی بەگوێرەی ناوی خاوەن یا خەزێنەدار یا بەرپرسی دەستەی پەیوەندیدارەوە دەنووسییەوە و هەر بابەتێکی دیکەش کە بەپێی ڕووداوەکان پەسند دەکرا و پێویستی بە پشتڕاستکردنەوەی ڕەسمی بوو دەینووسی ... پاشان کەلانتەر ئەم نووسراوانەی ئیمزا دەکرد و بەپێی گرینگایەتی لەبەر دەستانی دادەنان[٣٨].

حیسابگەری سالانە داهاتی پازدە تمەن بوو کە خاوەن پیشەکان دەیاندا. کەلانتەر یان شارەوان بەخۆی و ژێردەستانییەوە، کاروباری فرەچەشنی لە ئەستۆ بوو. خوایینەخوایی نوێنەری تاقمەکانی خاوەنی سوود و بەرژەوەندی خۆجێیی وەک حاکم، وەزیر، خەزێنەدار و حکوومەتی ناوەندی بوو. کەلانتەر بەرپرسی دانان و لادانی کەیخودای گەڕەک و ریشچەرمگانی خاوەنپیشەکان، ڕێکخستنی بەرد و تەرازوو، کیلە و پێوانە و نرخ و چاوەدێری بوو بە سەر سکالا و ناکۆکییەکانی بازرگانی و تەواوی کاروباری سەر بە پیشەوەران. وەک باسمان کرد ئەو بۆ دیاری کردنی پیتاکی پیشەوەران پاش ڕاوێژ لەگەڵ نەقیب و کۆڕی ریشچەرمگان، تەمای دەگرت و هەنگاوی دەنا[٣٩]. ئەرکەکانی بەگوێرەی بەرفرەوانی و باری ئابووری شار گۆڕانی بە سەر دەهات.

بۆوێنە ناوبراو لە بووشێهر سەرۆکایەتی دەزگای گوومرگیشی لە

---

٣٨ـ تەزکەرەتولملووک، ل ٤٢٣ و ٥٥١. دەفتەری حیسابگەری کەلانتەر بە هەمان شێوە لە تەزکەرەتولملووکدا باسی کراوە، ل ٧٧ئا ـ ب. نرخاندنی پیشەی پیشەوەرانی لە ئەستۆ بووە.

٣٩ـ بڕوانە: تەزکەرەتولملووک، ل ٨١ و ١٤٨؛ دەستوورولملووک، ل ٤٢١ ـ ٤٢٢؛ Lambton, ((The Office of Kalantar)) 207 – 216; Floor, exp. 255 – 261; Kuznetsova,316.

ئەستۆ بوو، «شابەندەری»یشی پێدەگوترا[40]. بە گواستنەوەی پایتەخت لە مەشەدەوە بۆ شیراز هەمیشە ئەرکەکانی یانەی کەلانتەر لەگەڵ ئەرکی ساحێبئیختیاری دەورانی فەرمانڕەوایەتی نادر تێکەڵ دەبوو. کەلانتەر چەشنی شارەوانی مەزن چەند ئەرکێکی دیکەشی لە سەر شان بوو، بۆوێنە وەک بەرپرسی پێراگەیشتن بە کۆشکی پاشایەتیش دادەندرا. هەروەها خەرجوبەرج و ڕێکخستنی جێژنەکانی لە ئەستۆ بوو، بۆ نموونە لە ساڵی ۱۱۸۰ی کۆچی / ۱۷٦٦ی زایینیدا بەرپرسی بەڕێوەچوونی زەماوەندی ئەبولفەتحخان و میوانداریێتی میوانانی ماقووڵ و باڵوێزانی لە سەر شان بوو. میرزا محەممەد لەم شوغڵەدا وەک پیاوێکی هەمەکارە و دەسپێوەگر خزمەتێکی دژوارتر و کارێکی تەشریفاتی بۆ وەکیل بەڕێوە دەبرد[41].

موحتەسیب بەڕێوەبەری بازاڕ بوو، سەنگ و تەرازوو و گەز و کیلە و پێوانە و سیایی نرخەکانی هەموو مانگان کۆدەکردەوە و پێیانا دەچۆوە و بە ڕەزامەندی هەر پیشەیەک بۆ ڕێنوێنی پیشەکانی دیکە دەینارد. ئەو دەیتوانی بۆ ڕاگرتنی نەزم و ڕێکوپێکی بازاڕ کەسانی تاوانبار فەلاقە بکا و جەریمەیان پێوە ببەستێ یان نیر و سندمی زەنگولەداریان بخاتە ئەستۆ و پێ و سزایان بدا. تاوانبارانی لە شوێنی کەسابەتی خۆیان دەکردە گاڵتەجاڕ و لەبەرچاوی خەڵک دەیجزاندن[42]. یەکێکی تر لە ئەرکەکانی بەرگرتن بوو لە تاوانی گشتی وەک قومار، شەرابخواردنەوە، داوێنپیسی و هەرچی دژایەتی ئایینی لێکەوتبایەوە. لەو سەردەمیدا ئەم کارانە لە ئەستۆی داروغە یان سەرۆک پۆلیسی شار بووە کە دواتر دێینە سەری.

نەقیب بە کاروباری سنعاتکاران ڕادەگەیشت. بە پیتاکیاندا دەچۆوە و وێڕای ڕاوێژ لەگەڵ سەرۆکی هەر سنفێک (کەیخودا ــ ڕیشسپی) لیستەیەکی لە سنعاتکاران و پیشەسازان هەڵدەگرتەوە و ڕێکیدەخست. ئەو حیکایەتخوان و بەزمگێڕانەی کە لە قەراخ شەقامان کۆڕیان دەبەست و خەڵکیان لە خۆیان

40- Waring, 148.

٤١ــ ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٦٤ ــ ٦٥؛ تەزکەرەتولملووک، ل ٤٢٧.

٤٢ــ تەزکەرەتولملووک، ل ٨٣، ١٤٩؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٠٨؛ Kuznetsova, 318.

کۆدەکردەوە، ئەو دیاری دەکردن. وا دیارە هێندێک تاوانی سووکەڵە کە شتێکی وا نەبوون و پێویست نەبوو دارۆغە و قازی پێیان ڕابگا، خۆی داوەری لە سەر دەکردن[43].

لیستەی ڕۆستەمولحوکەما دەربارەی ئەرکی تایبەتی حیسابگەر و وەکیلی ڕعێتان زۆر زیاترە لە ئەرکی کارگێڕانی دامودەزگای کەلانتەر. ڕەنگە ئەم کارە نیشانەی دابەزینی پلەی ئیسفەهان بێ پاش تالان و بڕۆ و ئاژاوەکانی سیسالەی تێکەڵ بە کەمتەرخەمی و چەوسانەوە کەلانتەری ئەم پارێزگایە لە نێو کاربەدەستانی دیکەدا بە نوێنەری دەوڵەت دادەندرا و ئیسفەهانیش یەکێک لە گەورەترین سەرینچاوەکانی داهات بوو کە بە نیوەی جیهان ناودێر کرابوو: (اصفهان نصف جهان).

مەبەست لە دانان و هەڵبژاردنی کارگێڕانی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی لە لایەن وەکیلەوە بۆ ئەوە نیە کە ڕاستەوخۆ هەڵیدەبژاردن، بەڵکوو ئامانج پشتیوانی بوو لە بەرپرسایەتی کۆنباوی حوکمڕانان لە کاروباری هەڵسووڕاندنی قەڵەمڕەوی خۆیانا. وا وێدەچێ کە وەکیل ئەم مەسەلانەی زۆر بەوردی توێژیبێتەوە. هێنانەوەی وێنەیەک لە هەڵوێست و کرداری لە هێندێک بابەتاندا کیفایەتە: گێڕاویانەتەوە کە ئاغامحەممەدی ڕەعنایی دووهەمین حوکمڕانی وەکیل لە ئیسفەهان بە مەبەستی سەرنەوینەکردن بۆ شانۆی گاڵتەجاڕییانەی کەریمخان بە یەستر و گوێدرێژێکەوە لە ئیسفەهان دەرکەوت و بەرەو شیراز بزووت[44]. لە ورمێ دەستەیەک لە بازرگانان کە چەتە ڕووتیان کردبوون، سکالایان بردە بەر ڕەزاقولیخانی حاکمی ورمێ، ناوبراو بارتەقای کالایان دراوی دانەوە هەتا گیرۆدەی لێپرسینەوەی کەترەخەمی نەبێ و ماوەیەک دواتریش ماڵە دزراوەکانی دیتەوە[45].

. ئەگەر ئادەمیزاد لای وابێ دەبێ کە حوکمڕانی هەر پارێزگایەک بتوانێ ئەو دزی و غەدرانەی کە لەبەر مێژینەیان ڕێزیان بۆدادەندرێ بخاتە

---

۴۳ـ تەزکەرەتولملووک، ل ۸۳، ۱٤۸ ـ ۱٤۹؛ Kuznetsova,314 – 318.

٤٤ـ ئەنساری، ل ۲۲۹.

٤٥ـ دێهگان، ل ۵۸۹.

پشتگوێ، داوا و چاوەڕوانییەکی زۆر قورسی هەیە. هێندێک لەم حاکمانە هەرچۆنێک بێ بەگوێرەی تێگەیشتنی خۆیان لێیان روون بۆوە کە ئیتر ئەو ڕێبازە بڕشتی نەماوە و قبوول ناکرێ. دەڵێن حاکمی مازەندەران بڕی دووعەباسی (یەک لە پەنجای تمەنێک) بێقابیلەتی بە زۆری لە سەوداچییەک ئەستاندبوو و ئەو پیاوە سکاڵای بردە شیراز. وەکیل لەڕێوە چەند کەسێکی نارد هەتا حاکم تەتەرپێچ کەن و بیهێنن، کە هێنایانە دەربار لە سەر کاری لابرد.

ماوەی شەش حەوتوو کابرای خاوەن سکاڵا لە کۆشک مایەوە و خواردن و جێخەوی بۆ دابین کرا و کاتی گەڕانەوەی بۆ مازەندەران نە تەنیا خەرجی ڕێگایان دایە، بەڵکوو قەرەبووی داهاتی ئەو ماوەیەشیان بۆکردەوە کە لە سەر کار هەڵپچڕابوو. بڕی ٣٥٠تمەن خەسارەتی ئەم خەرج و کارانە لە پێناو دوو عەباسی غەدردا، لە حاکمی لێخراو ئەستێندرا[٤٦].

کاتێک کە لە ساڵی ١٧٥٨دا زەکیخان، تەقیخانی بافقی حوکمڕانی یەزدی گرت، وەکیل فەرمانی دا کە هەر وەختایەک گەیشتە ئێرە لەڕێوە بەرەوڕووی ئەو زوڵملێکراو و خاوەنقەرزانەی بکەنەوە کە سکاڵایات لێیەتی. ئەم کۆمەڵە خەڵکە دەیانگوت کە تەقیخان بڕی چلهەزار تمەنیان پێقەرزدارە. ناوبراو حاشای لەم هێندە پارەیە دەکرد، بەڵام بەر لەوەی بەپێی ڕێسا دادگایەکی بۆ پێکبێ، تاقمێک شاهیدییان دا کە پازدەهەزار تمەنی پاشقول داوە و غەدری کردووە. بە فەرمانی وەکیل جەریمە کرا و لە سەر دەسەڵات لادرا. لە دووتوێی ئەم بەسەرهاتانەدا دڵەخورتەی بێوێنەی کەریمخان سەبارەت بە پاراستن و ڕاگرتنی یاسا و ڕێسا دەردەکەوێ[٤٧].

نرخاندنی گرینگایەتی ڕەیژەیی سەرچاوە فرەچەشنەکانی داهاتی پیتاک و ملکانە کارێکی دژوارە. نادرشا و ئاغامحەممەدخان هەردوو کەوتبوونە سەر ڕێبازی سیستمێکی کۆدەسەڵات و ملکی پاشایەتی و ئەیالەتییان لە سەر کیسەی خۆیان بەرفرەوان کردەوە[٤٨]. ئەگەر بە خوردبوونەوە لە نووسراوەکەی

---

٤٦ـ ئیسفەهانی، ٢ئا، ٣ئا.

٤٧ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٧٧ ـ ٧٨.

٤٨ـ مینۆرسکی:تەزکەرەتولملووک، ل١٤٧ـ١٤٨؛ئارنوا و ئەشرەفیان:دەوڵەتی نادرشا، ل ٢٥٩.نووسەرانی سۆڤیەت بە سەرسوڕمانەوە دەیانەوێ حاشا لە بوونی سیاسەتێکی ئەوتۆ بکەن.

میرزا محەممەد مەترسی تەنینەوەی مەسەلەکە قبووڵ بکەین، لە ڕووی وەیڕا کە کەلانتەر لە ماوەی دەسەلاتیدا دەدوازدە گوندی لە دەوروبەری پایتەخت ـ لە فارس ـ کڕیوە و بەئاشکرا کەوتۆتە چینی ملکدارانی[٤٩] خۆولاتی و بەدەسەلات، ڕوون دەبێتەوە کە لە سەردەمی کەریمخانیشدا زەویوزاری ملکداران پەرەی گرتووە. هەڵبەت ڕێبەرانی تایفەی زەندیش چوونە ڕیزی دەرەبەگانی گەورە. بۆ وێنە لە ساڵی ١٧٦٣دا وەختایەک کە ملکوماشی شێخالیخان لە فارس و ئێراقی عەجەم دەستی بە سەراگیرا، داهاتی ڕۆژانەیان سەری لە ٦٠تمەنی بەرەوداری تەورێز دەدا[٥٠]. بە سەرنج دان بە گرتنەبەری وەها سیاسەتێک دەبوو لەم ساڵانەدا داهاتی گوومرگانە و پیتاکی بازرگانی تا ئاستێکی بەرچاو هەڵکشابن. دیاری و ملکانەی حوکمڕانانی کوردستان و لوڕستان و عەرەبستان و تایفەکانی بنیکەعب و بەختیاری و خێلاتی ژێرفەرمان بەزۆر وەردەگیرا. هەڵبەت ئەم دیاری و دراوانە جاری وایە بە خۆشی و هەلی واشە بە زەبری زۆری دەستێندران.

داهاتی باجی بەهەڵکەوت ئەگەرچی هەر لە بنەڕەتەوە وەک تەواوکەری پیتاکی دیاریکراو وەبەرچاو گیرابوو، زۆرجاران هەر نە تەنیا دەخرایە پشتگوێ بەڵکوو پاش هاتنە سەر دەسەلاتی کەریمخان، بنەی بڕا. هەڵبەت ڕوون و ئاشکرایە کە دوای گرتنی بەسرە جەریمەیەکیان بە تەنگەی خەڵکی ئەو شارەوە بەست کە دوژمنی تێکشکاوی دەرکی بوون. هێندێک جاریش فەرماندەرانی زەند لە کاتی لەشکرکێشیدا، هەلیان دەقوازتەوە بۆ کۆکردنەوەی تفاقی هەرزان و دابینکردنی ئازۆخە و بە بێگاربردنی جەماوەر تەنانەت بەبێ ئاگاداری و ڕەزامەندی ڕەپوڕاستی وەکیل. جگە لەم بابەتانە وەک نووسیویانە، وەکیل عەلیمحەممەدخان و زەکیخانی زەندی لەبەر جموجۆڵ و کرداری توندوتیژیان لە مازەندەران سەرکۆنە کرد. ئەو دەسکەوت و خەنیمەت و تاوانانەی کە لە ڕاپەڕیوان و دوژمنانی تێکشکاو وەردەگیرا، قەت پاشەکەوت نەدەکرا؛ بۆ وێنە ئەو ماڵ و سامانانەی کە لە میرمەهنا ئەستێندرا بە سەر لایەنگرانی پێشوویدا دابەش کرا کە بۆ یارمەتی دانی سپای زەند لێی

---

٤٩ـ ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٦٥ ـ ٦٦.

٥٠ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٠٩، تمەنی تەورێز نیزیکەی ٨/٠تمەنی شیراز بوو.

هەڵگەڕابوونەوە. لە مەسەلەی لێخستنی تەقیخانی یەزدیدا بەشی زۆری ماڵەکەی لەبری وەی بدرێتە خەزێنەی پارێزگا، بە سەر ماڵخوراوان و ئەوانەی پێوەیدابوون دابەش کرا. لە کاری سازکردنەوەی شووره و دیوار و قۆنگرەی شیراز، وەک چاوەڕوان دەکرا خەڵک نەکێشرانە بەرکار. وەکیل کرێی دوازدەهەزار کرێکاری چوست و چالاکی لە خەزێنە دەدا و خۆی بەڕێوەبردنی گەلاڵەکەی لە ئەستۆ بوو هەتا بتوانێ دەستەیەک لە سنعاتکارانی بێکار بخاتە سەر کار و پشتیوانییان لێبکا[٥١].

جێی سەرنج و رامانە کە کەریمخان ئەنجامی ئەم کارەی بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی و بە دوای ماڵ و سامانی مفتومەرحەبادا نەدەگەڕا. وەختایەک کە یەکێک لە بازرگانانی هیندی بێمیراتگری دەوڵەمەند لە شیراز مرد، پێشنیاریان بە وەکیل کرد تا لە سەر پێوشوێنی فەرمانڕەوایانی پێشوو، میراتی کابرا بۆخۆی گل داتەوە. دەڵێن لە وەڵامدا بە تووڕەیی نەڕاندی و گوتی: ئێمە مردووشۆر نین[٥٢]. ئەو کات فەرمانی دا کە چی هەیەتی بیخەنە لاوە و ئاگاداری لێبکەن و هەوڵ بدەن میراتگری بدۆزنەوە. جارێکی دیکە وەختایەک خەریکی نوێکردنەوەی شاری شیراز بوون لە خەندەکێکا کووپەڵەیەکی پڕ لە زێڕیان دیتەوە، خانی زەند زێڕەکانی بە سەر ئەو کرێکارانە دابەشی کە لەوێ کاریان دەکرد[٥٣].

ئەو رووداوە خۆشەی هەر ئێستا باسی دەکەین بەسەرهاتی چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئاڵوگۆڕی بەرچاوی گەلێکە کە رۆژگارێکی دوورودرێژ وەک چارەنووسێکی سروشتی و دیاریکراو دەیروانییە غەدر و چاوچنۆکی و خووی پێوەگرتبوو[٥٤]. وەکیل لە کاتی چاوەدێری بە سەر کاری وەستا و فەعلەدا لە دۆڵی «ئەڵلاهوئەکبەر» لە دەرەوەی شاری شیراز کاڵەکی دەخوارد. هەوارچی لە

---

٥١ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٥٥؛ گەشتنامەی فرانکلین، ل ٤٠٣ ـ ٤٠٤.

٥٢ـ رۆستەموتتەواریخ، لە لاپەڕە ٤٢١دا دەنووسێ کە گوتی: ئێمە مردووشۆر نین کە دەس بەسەر ماڵیدا بگرین: Fraser, An Historical, Account, 364.

٥٣ـ رۆستەموتتەواریخ، ل ٤٢٠.

٥٤ـ نەوایی، کەریمخانی زەند، ل ٢٨٠ ـ ٢٨١، (من سەرچاوەی سەرەکی ئەم بەسەرهاتەم بۆ نەدۆزرایەوە).

هاوینەهەواران دەگەڕانەوە، پیرەپیاوێک کە بەخۆی و کەرەکەمەڕێکەوە بە لایاندا تێدەپەڕی لەگەڵ وەکیل کەوتە قسان و لە پەنا وی دەستی کرد بە کاڵەک خواردن. پیرەپیاو بە ڕاوێژێکی خەمبارانەوە گوتی چونکە وەجاغکوێرە و هیچ میراتگرێکی نیە تا ماڵ و سامانی بۆخۆی بەرێ کە ئێستا لە سەر پشتی وشتری دابەستراوە، حازرە هەمووی بدا بە کەریمخان هەتا لە کاروباری بیناسازی خەرج بکا. کەریمخان پێشنیاری بە پیرە کرد کە ئەم دراوانە بۆ سازکردنی پرد و کاروانسەرا و کاروباری خێرخوازانەی تر کە پێی باشە خەرج بکا و دراوەکەی لێومرنەگرت. سەرەنجام لە سەر حەسیری ژێری چۆکی دادا و پیرەپیاوەش وەکی وی کرد و لە حاڵێکا چاوی ئەسرینی تێزابوو شوکرانەی بژارد کە لە ژێر سێبەری حکوومەتەکەیدا خەڵک دەتوانن بە ئازادی ماڵ و دارایی کۆ بکەنەوە و بێئەوەی کەس تەماحیان تێبکا، بۆ کوێیان پێخۆش بێ دەیبەنە وێ.

## ١٤ ـ ٤ ڕێژەی جەماوەر

بەم پێشکەوتانەڕا دەبێ لێمان سوور بێ کە ماوەیەک دواتر جووتیاران و سنعاتکاران ڕوویان کردۆتە مەزرا و بازاڕەکان. ئەو کەسانەش کە لەبەر قاتیوقڕی ساڵی ١٧٥٦ لە ئیسفەهان و جولفا ڕایانکردبوو، وردەوردە گەڕانەوە و ئەوانەش کە وایان نەکرد لە مەڵبەندی خۆش ئاووهەواتری شیراز بە یەکجاری بنەیان داکوتا. هەرچۆنێک بێ ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەمەندترین و برەپێدەرترینی چین و توێژەکانی کۆمەڵ بەتایبەتی بازرگانان و پارەفرۆشان و دەلالان و دووکانداران و شادەمار و دامەزراوە ئابوورییەکانی کە ئەو چەند ساڵەی دوایی لە ئێران ڕەویبوون، لەگەڵ خۆیان سامان و پسپۆڕی و دەسڕەنگینی و کارزانییان بە دیاری هێنا. یەکێک لە ڕووداونووسانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی کە گەمییەکانی زیاتر پەنابەرانیان دێنا و دەبرد و کەمتریان باری بازرگانی پێبوو ئاوای نووسیوە: «لە سەرانسەری وڵاتی پاشایەتیدا ڕێژەیەکی بەرچاوی جەماوەر بە بیانووی چوونە حەج نیشتمانیان جێدەهێشت[٥٥].» ژمارەیەکی زۆری کەمینەکانی جوولەکە و ئەرمەنی و مەسیحی تر

---

55- GD VI, 31 October 1751.

کە ئامانجی سەرەکی ڕاووڕووت و ئەشکەنجەش بوون، لە هەر سنووریکەوە بووزی بۆخواردن ڕایانکرد.

نیبوور سەبارەت بە کۆمەڵێک ئادەمیزادەی یەکچاو و نوقستانکراو کە قوربانی دەس زوڵم و زۆری نادری بوون و ساڵی ١٧٦٥ لە هەمەدان دیتوونی، چەند باسێکی نووسیوە و پێداچووە و دەڵێ: «من گەلێکم ئاکامی چەپەڵکارییەکانی لە سوورات، مەسقەت، بەسرە و بەغدا دیتووە[٥٦]؛ ئەمانە ئەو بازرگانە ئەرمەنی و مسوڵمانانە بوون کە دواتر مەوتەنی خۆیان بەجێهێشتبوو. لە هیندووستان کە مەغوول حوکمیان بە سەردا دەکرد، لە بەنگال و ئێراق و یەمەن، وەچەیەکی نوێ لە ئێرانی و ئەرمەنییانی ڕاکردووی مابەینی ساڵانی ١٧٣٢ ـ ١٧٥٨ شەڵغەیان دابوو کە نیزیکەی سەتهەزار کەسێکیان تەنیا لە بەغدا و گەڕانگەڕی شوێنە پیروزەکان دەژیان. دەیانگوت دوو لە سەرسێی جەماوەری بەسرە پەنابەرانی ئێرانی بوون[٥٧].

بەهەرحاڵ لە نێوەڕاست ساڵی ١٧٥٠ڕا چەند دەنگۆیەک سەبارەت بە سەرکەوتن و دادپەروەری کەریمخان لە تەواوی هەرێمەکانی دەرەوەی ئێران بلاو ببۆوە، ئێرانییان و ئورووپاییەکانی کۆچەر بە تامەزرۆیی دەیانبینی کە «لە ئێران ئاسۆیەکی تازە بە سەرکردایەتی میرێک بەدیهاتووە و بێگومان پەیوەندی و ڕایەڵەی بازرگانی کە لەمێژ بوو هەڵبڕابوو، سەرلەنوێ لێک گرێدەداتەوە و بۆیە کۆچبەران بەڕاستی ڕوویان کردۆتەوە گەڕانەوە[٥٨].» لە ساڵی ١٧٦٠دا چۆنیەتی متمانە و دڵنیایی ئەو کۆمەڵە خەڵکە ئاوا دەخرێتە ڕوو: «ئەو کەسانەی کە لەم وڵاتە پەرەوازە ببوون لەبەر ڕێبازی دروستی سیاسی کەریمخان و ئەو تەناهییەی بۆیان بەدی هاتووە، خەریکی گەڕانەوەن[٥٩].» جارێکی تر توجارەت وەبرەو کەوتەوە و تاقمەکانی ئایینی هاتنە وڵات[٦٠]. ئەم

56- Reise, 179.

57- Carmelites, 671.

58- AME Perse VII, NO. 104.

٥٩ـ Ibid. VIII, NO. 4, 20 July 1760. دەنووسێ: لەبەر کردار و ئاکاری شیاو و سەرنجڕاکێشی کەریمخان...

60- Carmelitse, 662 – 663.

تاقم و دەستانە بە هەزارهەزار و لــە هــەر چــین و توێژێــک دادەوەرینــە ســەر کاروانەڕێی ئەمین و ئارام. کۆچبەران بەنرخترین هاوردەی بەرەوگەشــەی وڵاتی ئێران بوون. لە ساڵــی ١٧٦٥دا، نوێنــەری کۆمپانیــای هینــدی ڕۆژهــەڵاتی لــە بووشێهر کاروانێکی شتوومەک و باری بازرگانی نارده شــیراز، «تاقمێــک ئــەم هەلەیان قۆزتەوە و لە دەوری کاروان گردبوونەوە بۆ گەڕانەوە. ئــەم ئاپۆرەیــە ژمارەیەکیان بنەماڵەی هەژار و نەداری ئەرمەنی و هێندێکیان سەوداچی بچــووک بوون کە لەبەر ئاژاوە و هــەرچیپــەرچی لــە ئێــران ڕەویبــوون، بــەڵام ئێســتا دەیانویست بچنەوە نیشتمان[61].» ئێرانی لە هەڕەتی دەسەڵاتی وەکیــلدا ڕوویــان کردە گەڕانەوە. بۆیەش دەهاتنەوە چونکە حکوومەت بەڵێنی دابینکردنی تەناهی و یارمەتی و چاوەدێری و پاراستنی دابوونێیە. ئەم جەماوەرە پاش گەڕانەوەیان بە تەواوی لە وادەکانی حکوومەت بەهرەوەر بــوون. لــە ئــاخری ساڵــی ١٧٧١دا کاروانێکی دەهەزارکەسی گەشتیاری ڕێکوپێک و گونجاو لە بەغداوە بەرەو ئێران کەوتەڕێ[62].

بۆ نیشاندانی ژمارەی ئەوانەی کە لەبەر کار و چالاکی وەکیل گەڕانــەوە ئێران ئامرازێکی جێیماتمانە بە دەستەوە نیە. ئەم ئامارانەی کــە لــە خشــتەی لاپــەڕە ٤٩٠ ـ ٤٩١دا وەبــەرچاو دێ، زۆربــەیان لــە ڕووی ئــەژمێر و بــەراوردی کۆتایی یان نێوەڕاســتی دەســەڵاتی ســەفەوی و ســەرەتای دەورەی قاجــارەوە نووســراونەوە. دەمانــەوێ کــە لــە هێنــدێک بابــەتاندا دابەشــین و چۆنیــەتی ئامارەکانی کۆمەڵایەتی لە مەودای ساڵانی ١٧٣٠ تا ١٧٩٠ بناسێنین.

ئیســفەهان کــە لــە پەڕپەڕۆچکــەی گەشــە و بەختــەوەری ســەردەمی سەفەویدا ڕێژەی نفووسی لە نێوان ٢٥٠ تا ٥٠٠ هەزار کــەس بــووە، ڕەنگــە لــە ساڵی ١٧٥٠دا بۆ ٢٠هەزارکەس دابەزیبێ و لە ساڵی ١٧٧٢دا گەیوەتەوە چلپــەنجا هەزارکەسێک و لە ساڵی ١٨٠٠یشدا هەروا بەرەو گەشە و هەڵدان بووە[63]. شــیراز لە ساڵی ١٧٥٦دا ببوو بە شارێکی چۆڵگە و خاپوور، لــە ســەریەک بــە تەنکــەی

61- Niebuhr, Reise, 96.

62- Carmelites, 672.

63- Grimod, 345; Carmelites, 671.

جەماوەری، مەسیحی تێدا نەمابوو[٦٤]. لەگەڵ ئەمەشدا ئامانجی ڕۆژانەی کۆچبەران بەتایبەت ئەرمەنییەکانی بەشی جولفا دەرباز بوون لە ئیسفەهان و ڕۆیشتن بۆ شیراز بوو. ئەگەرچی سەبارەت بە ژمارەی دانیشتووانی شیراز لە زەمانی وەکیلا هیچ ئامارێک بە دەستەوە نیە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە زۆربوونی جەماوەری ئەم شارەیە لە مەودای ساڵانی ١٧٥٩ تا ١٧٧٩دا لەچاو ئیسفەهان، واتە ئەگەرچی بە ڕووبەر کەمتر بووە بەڵام کەموزۆر نفووسی بارتەقای ئیسفەهان هاتۆتەوە. پاش ئەوەی لە ساڵی ١٧٩٢دا ئاغامحەممەدخان پایتەختی زەندیەی تاڵان کرد، جەماوەری شار بوو بە نیوە و هەتا ٢٠هەزارکەسێک دابەزی[٦٥]. زۆرێک لە شارەکانی دیکەی ئێرانی ناوەندی وەک قوم کە لە بەر لافاوی پەلامار و شاڵاوی ئەفغانی و ئەفشارییەکان تەواو تووشی خەساری قورس و گران هاتبوون، لە شەڕ و لێکدانی نێوان قاجارییە و زەندیەشدا گیرۆدەی زەرەد و زیان بوونەوە، بەگوێرەی چەند سەرچاوەیەک لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی کەریمخانا کەوتنەوە سەر ڕەوگەی ئاوەدانی[٦٦].

سەبارەت بەم زۆربوونەی جەماوەر ناکرێ گەلێکی باوێیە سەر حیسابی وەکیل، چونکە ڕووداوی وەک تاعوونی ساڵانی ١١٧٣ ـ ١١٧٤ی بەغدا هەزاران سەر خێزانی لەو ناوچانە و شاری بەسرەوە بەرەو ئێران پاڵ پێوەنا و ئەو کۆچبەرانە لە دێهاتی دەوروبەری ئیسفەهان نیشتەجێ بوون[٦٧].

---

٦٤ـ بەگوێرەی هێندێک بۆچوونی ژمارەگەری کۆن و نوێ ژمارەی دانیشتووانی ئیسفەهان لە دەورەی سەفەویدا گەیوەتە ٥٠٠هەزار تا میلیۆنێک، کە یەکجار زۆرە. بڕواننە: Emerson, 18. ئۆلیویە نفووسی ئەم شارە لە ساڵی ١٨٠٠دا بە نیزیکەی ٥٠هەزار و مێلکۆم بە ١٠٠هەزارکەسی دەقەبڵێنێ.

٦٥ـ ئەم بەراورد و ژمێرانە سەر بە سەدەی نۆزدەیە. بڕواننە: ئێران و پرسی ئێران، لۆرد کرۆزۆن؛ Monteith, notes, 118; Hambly,((An Introduction))72 (using Malcolms estimates in the Melville papers; See Chapter 15, note 201.

66- Olivier V, 163 – 164.

هەرچۆنێک بێ هامبێلی سەبارەت بە بەراوردی شاهیدانی سەرەتای قاجارییە کە دەڵێن کەم بوونەوەی جەماوەر لە سەردەمی کەریمخانا بەری پێگیرابوو، بەگومانە.

.(An Introduction 70)

67- Ferrieres de Sauveboeuf, 34.

## ١٤ ـ ٥ ئەرمەنییەکان و جوولەکەکان

شاری ئەرمەنی‌نشینی جولفای نوێ و چەند گوندێکی دیکەی ئەرمەنی و گورجی‌نشین لە مەڵبەندی «پەرییە»ی ڕۆژاوای ئیسفەهان لە ساڵی ١٦٠٣دا بە دەس شاعەباس سازکران. لێکۆڵینەوە لەم بارەدا کە بەڵگەی باوەڕپێکراویشی لە سەرە، بۆوە دەبێ پەندی لێوەربگیرێ و بە زۆر باراندا هەڵومەرجی کۆمەڵایەتی دنیای بچووکی ئێرانی ئەو دەمی دێنێتە بەرچاو. لە مەودای بۆشایی دەسەڵات و هاتنە سەر حوکمی ئەفشارییەکاندا سامانی جولفا بە دوو هۆ لە کەمێی دا: یەکەم ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەمەندانی شار پەرەوازەی هەندەران بوون، دووهەم پاشماوەی دانیشتووان کەوتنە بەر زوڵم و زۆری پەلاماردەرانی یەک‌لەدوای‌یەک و تووشی هەژاری و دەس‌بەتاڵی بوونەوە[٦٨]. بۆ وێنە لە ماوەی شالاوی محەممەدحەسەن‌خانی قاجاردا لە ساڵی ١٧٦٥دا جەماوەری جولفا ناچار بوون کە تەنانەت لەبەر دڵ و ڕەزامەندی پەلاماردەران سڵسڵە و پلێلەی ڕازاندنەوەی کلیسا بتوێننەوە و جلکانی ڕەسمی بفرۆشن[٦٩]. لە ساڵی ١٧٥٨دا ئەو پەنابەرانەی کە لەبەر خاپوورکرانی قەراخ شار ڕایانکردبوو، هەموویان لەماڵەکانی شاری جولفا بنەجێ بوون[٧٠].

لە کاتی گیرانی شاری ئیسفەهان لە لایەن هێزە هاوپەیمانەکانی زەند و بەختیاری لە ساڵی ١٧٥٠دا، بەڕێوەبردنی جولفا کەوتە دەس کەریم‌خان و پیاوەکانی و بە نەرمی و مێهرەبانی لەگەڵ خەڵک جووڵانەوە. وەک ڕووداونووسانی ئەرمەنی گێڕاویانەتەوە کەریم‌خان لەبەر خەونێکی کە دیبووی ئاوا بەخۆشی بەرەورووی جەماوەر ببۆوە[٧١]. پاش هێرش بۆ سەر گوندی

68- Hovhanyants, 284; Ferrieres de Sauveboeuf,, 32 – 33.

69- - Hovhanyants, 288.

70- Carmelites, 700.

71- Hovhanyants, 280, 311.

لە مووزەی «وەنگ»ی کلیسای جولفای نوێدا فەرمانێکی ساڵی ١١٦٦ی کۆچی / ١٧٥٢ی زایینی وەکیل ڕاگیراوە کە پیتاکی زاڵمانەی لەسەر خەڵکی جولفا هەڵگرتووە.

گورجیئنشینی ئاخورە و دەمکوتی دانیشتووانی، «بیشاپ زەکەریا» و کەلانتەر «سێرگیس» داوای ئازادکردنی دیلانی ئەرمەنییان لە وەکیل کرد و دەیانویست بە وەرگرتنەوەی ئەمانە ژمارەیەک لە ئەرمەنییەکانی پەرییە، قەرەبووی جەماوەری ڕەویوی جولفا بکەنەوە. کەریمخان داخوازەکەی قبووڵ کردن. بەڵام ئەم هەنگاوە سەرنەکەوت، چونکە جەماوەری دێهاتی کە خوویان بە ژیانی شارنشینی نەگرتبوو، بێزاربوون لە کەش و هەوای جولفا و لە هەڵسووڕاندنی ژیانیاندا تووشی گەلێک گرفت و چەرمەسەری ببوونەوە و بەناچاری ڕوویان کردبۆوە پەرییە. وەکیل بەم کارە تووڕە بوو، بۆیە توورابخانی وەزیری بە تاقمێک چەکدارەوە نارد بۆ سزادانیان[72].

پاش شکانی وەکیل لە بەرامبەر ئازادخان و محەممەدحەسەنخاندا، ئیتر جولفا لە ژێر ڕکێفیدا نەبوو، بەڵام هەمیشە مەیل و تاسەی ئاوەدانی و گەشەپێدانی ئەم بەشەی بەتایبەت لە ڕێی کەلانتەر سێرگیسەوە، کە نوێنەر و باڵوێزی بوو لە نێو تۆرەمەی سەرگەردانی ئەرمەنیدا، لە بیرگەیدا مابۆوە. ژمارەیەک لە دانیشتووانی جولفا لێکدالێکدا ڕوویان دەکردە نوێنەرایەتی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هولەند و داوایان دەکرد کە ئیزنیان بدەن بچنە کۆلۆنی هولەندییەکان لە دوڕگەی خارک. لە ساڵی ١٧٦٥دا کەلانتەر سێرگیس نێردرایە خارک تا دژی میرمەهنا یارمەتی لە هولەندییەکان بخوازێ و داوای گەڕانەوەی تەواوی ئەرمنییەکانی دوڕگەی خارک بکا بۆ جولفا؛ وەڵامی نوێنەری دەوڵەتی هولەند تەم و مژاوی و دووتۆوە بوو[73]. گۆیا سێرگیس بەپێی دەستووری کەریمخان نامەی بۆ خەڵکەکە دەنووسی و لەبری خەلیفە و پیاوماقووڵانی جولفا دنەی گەڕانەوەی دەدان؛ وەختایەک هەڵسووڕانەکانی ئاکامیان لێنەکەوتەوە لە ساڵی ١١٨٧ی کۆچی / ١٧٧٣ی زایینیدا فەرمانی پێدرا کە یەکسەر بڕواتە بەسرە. ئەمجارەش ئەرمەنی گوێیان بۆ شل نەکرد. دوای گەڕانەوەی بۆ شیراز، پاشماوەی تەمەنی لەو شارە تێپەڕ کرد. ژمارەیەک لە ئەرمەنییەکان تەنانەت لە وەختی گەمارۆی بەسرەدا خۆیان لە چۆڵکردنی شار

72- Hovhanyants, 281 – 282.
73- Brieven 2716 (1753), 78 – 80; 3076 (1767), 11 – 12; below, 15.7.

بوارد و بەگوێرەی ڕێسا خانی زەند بە توندی جەریمەی کردن[٧٤].

سەرەڕای نائومێدی سەبارەت بە ئاوەدانکردنەوەی سەرلەنوێی جولفا و بە دەستەوەبوونی خانووی چۆل و زەوی بەیار، پاشماوەی دانیشتووانی شار لە ساڵی ١٧٧٠دا ڕێککەوتننامەیەکیان لە بەینی خۆیاندا مۆر کرد کە ئەو خانووبەرانەی هەرەسیان هێناوە و چاک ناکرێنەوە تەختیان کەن و بیانکەنە ڕەز و باخ و لە کشتوکاڵ و داهاتی زەوی‌وزاری بەجێماودا ببنە شەریک و ئەوانەش کە تازە دێن بیانکەنە هاوبەش و هەڵومەرجێک دابنێن بۆ دانەوەی پارەی ئەو کەسانەی دووبارە دێنەوە. قەرار کرا زەوی نەدرێ بە کەسی غەیری ئەرمەنی هەتا شێوازی کۆمەڵی ئایینی پارێزراو بێ. بەپێی سەرژمێرییەکی کە لەم کاتەدا لە لایەن ئۆسقۆف و خەلیفەی ئەرمەنییەکانەوە خراوەتە ڕوو، جەماوەری جولفا ١١٦٧ [١٧٠٠] کەس بووە. ڕەنگە لەم سەرژمێرییەدا تەنیا جەماوەری پیاوی باڵغ حیساب کراین. تەنانەت ئەگەر ئەم ژمارەیە پێنج جار بخەینە سەریەک ژمارەی وەدەس‌هاتوو کە ژن و منداڵانیش دەگرێتەوە، تەنیا سەری دەگاتە ٨٥٠٠کەس[٧٥]. ئەم ئامارە نیشان دەدا کە ڕێژەی جەماوەری جولفا لەچاو سەرژمێری سەدەی حەقدەی زایینی کە گەیوەتە دەیان‌هەزار کەس، لە کەمێی داوە[٧٦].

شیراز هەروەک چلۆن کەسانی گەڕاوەی دەرەوەی وڵاتی بە ئامێزی ئاوەڵاوە وەرگرت، ئاواش تاقمێک لە ئەرمەنییەکانی جولفا و پەرییەی بەرەوخۆی ڕاکێشا. زۆربەی ئەمانە تا ڕۆژگاری ئێمە خەریکی ڕەزەوانی و

74- Hovhanyants, 311 – 312, 315, 318.

خودی دەسخەتی فەرمانی وەکیل بۆ سێرگێس، لە کتێبخانەی ئامێن پێرکیک ڕاگیراوە.

75- Hovhanyants, 312 – 315. The same source gives the population of Julfa in the 1850s as 1,586 males and females (i. e ,adultes only?) quoted in issawi, 59.

٧٦ـ ژمارەی نفووسی شار ٣٠هەزار و مەڵبەندی پەرییە ٥٠هەزار کەسێک بەراورد کراوە.(لۆکهارت، ل ٤٧٤ ـ ٤٧٧)؛ Gregorian, 661, 663, 667, 669 ئەم ژمارە یەکجار لەسەرن، لەم ڕۆژگارەدا جەماوەری جولفا تەنیا ١٢٥٠٠کەس بووە (کەیهان، بەرگی ٢، ل ٤٢٥). لۆکهارت لای وایە ژمارەی دانیشتووانی ئیسفەهان لە ساڵی ١٨٠٠دا گەیوە ١٢هەزار کەس (ل ٥٢١).

توجارەتی شەراب بوون و لە شاری شیراز کەلانتەرکی تایبەت بە خۆیان هەبوو. (ماڵەکانیان کەوتبووە گۆشەی ڕۆژاوای شیراز لە پەنا دەروازەی کازروون.) بە دابەشینی گوندەکان ئەم دەستە و تاقمانەیان بۆ نیشتەجێ بوون لە دەوروبەری پایتەخت دنە دا. خەلیفە «مێگردیک وێردایت» ساڵێ شەش‌مانگ لە شیراز و شەش مانگ لە ئیسفەهان دەبوو[77].

تاقمێک لە جووەکان کە ژمارەیان لە مابەینی ساڵانی ١٧٤٧ ـ ١٧٧٩ بۆ ٢٠هەزار کەس دابەزی، بە گەڕانەوەیان بۆ وڵات، شیرازیان کردە گەورەترین ناوەندی یەهوودی‌نشینی ئێران[78]. گەڕەکی جوولەکان کەوتبووە قوڵی ڕۆژاوای بازاڕ دەبوو لەبەر بنەجێ‌بوون لەم شارە باجێکی تایبەتیان دابا. واوێدەچێ کە ئەم تاقمە لە ساڵی ١٧٦٥دا تووشی هەژاری و دەستەنگی هاتوون، بەڵام هەتا سەردەمی پاش مردنی وەکیل نەکەوتنە بەر شەپۆلی ئەشکەنجە و ئازار[79].

## ١٤ ـ ٦ کشتوکاڵ و چالاکی گشتی

هەمیشە پاش ئەوەی دووبارە ئاشتی و ئارامی وڵات دەتەنێتەوە، ژیاندنەوەی کشتوکاڵ دەدرێتە دەس کۆمەڵی گوندەکی کە حازرن سەر وەبەر چاکسازی بێنن. هەتا ساڵی ١٧٦٠ ڕاووڕووت وڵاتی داگرتبوو، بەڵام تەنانەت محەممەدحەسەن‌خانیش پاش دووساڵ داگیرکردنی ئیسفەهان نیگەرانی کاریگەری درێژخایەنی ئەم چڵپاندنەی هۆردووی خۆی و ئازادخان بووە لە سەر ئەم شارە قاتی تێکەوتووە و لەم زەمانەدا تێگەیبوو کە ئیدی ئیسفەهان خۆی پێ‌بەڕێناچێ، بۆیە فەرمانی دا بە قۆشەنی کە بە مەبەستی دابین‌کردنی خوردوخۆراک و ئازۆخە جارێ بەرەو فارس ببزوون. ئەمیر محەممەدسەمیع گەنجاڵی‌خان یانی باوەگەورەی ڕۆستەمولحوکەما نووسەری ڕۆستەموتتەواریخ پێشنیاری پێکرد کە داوا لە ئاغاوەت و دەرەبەگانی ناوچە بکا بەگوێرەی زەمانی

77- Niebuhr, Reise, 120; Hovhanyants, 315.

78- See Levi, 486 – 488.

79- Francklin, 60; Niebuhr, Reise, 120.

پێشوو هەرکەس بە مەیلی خۆی بڕە پارەیەک بدا هەتا تۆو و پێداویستییەکانی دیکە لە پارێزگاکانی باکووریڕا بێنن و بەرهەمێکی نوێ بچێنن و پێیەوە هەژاران بێننە بەر کار هەتا کاروباری مووچە و مەزراکان ڕاپەڕێنن و دەوڵەمەندانیش بەڵێننامەیەکیان لێوەربگیرێ کە تا ئەو زەمانەی دەگەنە خۆبژیوی، خواردنیان بۆ دابین بکەن"[٨٠]. ڕەنگە ئەم کارانە دەسپێکراین ـ ئەمەش چەشنێک بەربەرەکانی بوو لەگەڵ برسێتی ـ بەڵام وێناچێ کە محەممەدحەسەنخان بۆ درێژخایەن توانیبێتی چارەسەرێک بدۆزێتەوە. لەبەر دڵەڕاوکە و نیگەرانی ناچار بوو لەشکری دەنگ دا کە هەرچی زووە پەلاماری شیراز بدا. ئاخرییەکەشی ناچار بوو کە لە هاوینی ساڵی دواتردا لە شیراز و ئیسفەهان بکشێتەوە و ئەم شارە پشوویەکی هاتەوە بەر و بە دوور لە کۆتوبەندی داگیرکرانی لەشکری لە ماوەی ٢٥ساڵدا توانی خەریکی ساڕێژکردنەوەی برینەکانی بێ.

بۆ زانیاری و وردەکاری زیاتر لە بابەت داخوازێ پتەوی وەکیلەوە سەبارەت بە مەسەلەی قەیرانی کشتوکاڵ دەبێ پشت بە نووسراوەی ڕۆستەمولحوکەما ببەستین. کەریمخان لە هەر پارێزگایەک عەمبارێکی دەغڵودانی ساز کرد کە هەموو ساڵێک بۆ تەدارەک و ئازۆخەی قۆشەنی پڕی دەکردن. لە پایزی ساڵی ١٧٧٥دا لەبەر هرووژمی کوللە و ژەنگهەڵێنانی گەنم و خەرجوبەرجی لەشکر بۆ سەر بەسرە، لە شارەکانی شیراز و ئیسفەهاندا هەست بە کەمبوونی دەغڵودان دەکرا و قەیران ئەوەندەی تەنییەوە کە وەکیل ناچار بوو بۆ تێرکردنی هەژاران دەرکی عەمبارەکان بکاتەوە. لە ئیسفەهان نرخی هەر «مەن»ێک نان گەیتبووە ١٠پەناباد (٥قران)، لە چواردەوری مەیدانی «شا» دەغڵودان هەڵدەدرایەوە؛ لە پەنا هەر کۆگایەک سەت جووت قەپان داندرابوو؛ گەنمی میری هەر «مەن»ی بە ٤پەناباد (٢قران) و جۆی میری هەر «مەن»ی بە ٢پەناباد (قرانێک) دەفرۆشرا. لە شیراز بارودۆخ ئەوەندە گرژ و تاڵ بوو کە کەریمخان ناچار بوو بۆ هێنانی دەغڵ و دانەوێڵە چەند کاروانێکی یەکسمان بەرەو تەورێز و قەزوێن و ناوچەکانی دیکەی ئازەربایجان بەرێبکا. پاش هاتنی دەغڵودان لەبەر ڕێگای دوور و ناخۆش نرخەکان بەرز بوونەوە و هەر مەنێکی تەورێز (٣کیلۆ) گەیشتە ٢٨پەناباد (١٤قران). ڕاوێژکارانی وەکیل پێشنیاریان

٨٠ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٢٨٥ ـ ٢٨٨.

پێکرد کە وا باشە بۆ قەرەبووی خەرج و بەرجان هەر مەنی بە ٣٠پەناباد (١٥قڕان) بە خەڵک بفرۆشن. لە وڵامی ئەواندا خانی زەند بە تەشەر گوتی جا کەوایە بازاڕێکی عەللافی بکەینەوە باشە! چونکە بەو نرخە تازە کەس هیچی بۆ ناکڕدرێ. ئەو کات بێ سێودوو دەستووری دا کە هەر مەنێکی تەورێز گەنم بە دوو قڕان و جۆش بە قڕانێک ـ دوو هێندەی نرخی ئیسفەهان ـ بفرۆشن و خەزێنەش با کەم و کەسری بداتەوە. بەم شێوەیە بە تێهەڵێنانەوەی دەوڵەت بە باری داراییدا قاتی بنەی بڕا[٨١].

کەریمخانیش وەک زۆربەی فەرمانڕەوایانی ئێران بەشی هەرەزۆری بیناسازی و ئاوەدانی خستە پایتەخت. هەڵبەت ئەم کارە بەرهەمی سرشتی شێوەی چەنبنەکی ئیداری بوو؛ لەبەر کەمبوونی ڕێکاوبانی پەیوەندی، ئەرکناسیی کۆنباوی خۆجێیی و لاڕێبوونی فکری حکوومەتی ناوەندی وەختایەک حوکمڕانانی پارێزگاکان وەفاداربوونیان بە زماندا دێنا یان پیتاکیان دەدا، هاوکات داوای یارمەتی یان لێخۆشبوونی باری ماڵییان دەکرد و کەموزۆر حاکمان لە درێژایی ساڵدا دەستیان بۆ بەرێوەبردنی قەڵەمڕەوی خۆیان ئاواڵە بوو. ئەم ئەرکە بێگومان باری بیناسازی و ئاودێری و تەواوی ئەو کارانەشی دەگرتەوە کە قازانجی گشتی تێدابوو کە دەبووا دەسەڵاتی ناوەندی یان پایەبەرزان ئەنجامی بدەن.

لە هەلومەرجی گونجاودا حاکم دەیتوانی ڕاستەوخۆ ڕێی پێشکەوت و ئاسوودەیی شارنشینان دابین بکا. لە کۆتایی ساڵی ١١٩٢ی کۆچی / ١٧٧٨ی زایینی بوومەلەرزەیەک شار و پارێزگای ئیسفەهان و بەتایبەت کاشانی ڕاتلەکاند و دەڵێن دەهەزارکەسێک زیندەبەگۆڕ بوون. کەریمخان دەستەیەک کرێکار و وەستای بە سەرپەرەستێتی محەممەدتاهیربەگی ـ برازای زەکیخان ـ و مەنووچێهرخانی زەندی نارده ئەو شارە هەتا دەس بکەن بە چاککردنەوەی ئەو شوێنە[٨٢].

ئەو کارانەی کە خانی زەند لە دەورانی فەرمانڕەوایەتی خۆی لە

---

٨١ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤٢١ ـ ٤٢٢؛ ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ١٧، ل ١١٠٧ (٩ی ئۆکتۆبری ١٧٧٥)؛ ڕۆژنامەی کەلانتەر، ل ٦٧ ـ ٦٨.

٨٢ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢١٣؛ قەزوێنی، ل ١٤٧.

پارێزگای کورسیِنشیندا ئەنجامی داون و خێری هەموو لایەکی پێوە بووە هەست پێدەکرێن، بەڵام هیچیان ئەوەندە بەرچاو نەبوون کە بتوانن سەرنجی گشتی بۆ لای خۆیان رابکێشن. یەکێک لە شوێنەوارەکانی کە لۆرد کرۆزۆن ناساندوویەتی، کاروانسەرای گورگانە لە تەنیشت پردێکی سەر رووباری چاردەمایل ئەولاتری «دێهبید» کە کەوتۆتە سەر رێی هەرەسەکانی پاسارگاد[٨٣]. یەکێکی تر لەم شوێنەوارانە حەمامی برایمخانە لە کرمان کە بە شانازییەوە باسی دەکرێ. لە سەر دیواری ئەم حەمامە تابلۆیەکی وێنەگەری دەبیندرێ کە شەڕی رۆستەمی لە سەر کێشراوەتەوە و دەڵێن زەمانی کەریمخان سازکراوە. کاروانسەرای وەکیل ئەگەرچی وەک عیمارەتێکی قاجاری باسی کراوە، بەڵام لە ناوی وەکیلڕا وێدەچێ کە شوێنەواری فەرمانڕەوای زەندیە بێ[٨٤].

کەریمخان لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی کە لە تاران خەریکی خۆ تەیار کردن بوو بۆ شەڕی فەتحعەلیخانی ئەفشار، گەلێکی بینا و عیمارەت لە پاش خۆی بە یادگار بەجێهێشتووە. بەگوێرەی نووسینی نامی لە ماوەیەکی کورتا قەسرێکی شکۆداری سازکرد و غەففاری بەوردی پێیدا دێ و دەڵێ حەساری تاران بە خۆی و ١١٤ قۆنگرەوە کە لە زەمانی شاتۆماسبدا سازکرابوو و ئەشرەفی و ئەفغان فەرمانی خاپوورکردنی دابوو و شار بە باری پارێزگاریدا چی وای بە بەرەوە نەمابوو، کەریمخان سەرلەنوێ سازی کردەوە و قەڵایەکی سەخت و قایمی لەگەڵ چەندین مەتەرێز رۆنا و خەندەکێکی دەرەوەیدا لێدا. هەروەها دیوانخانەیەکی لە پەنا باغێک ساز کرد کە ناوەندی دەسەڵات بوو[٨٥]. تاران هەمیشە لەبەر بوونی چوارباغێکی لە وێنەی چوارباغی ئیسفەهان کە کاری شاعەباس بوو، هەروەها ئەو کۆشکە تێکەڵەی کە بە شوێنەواری شاسلێمان

---

٨٣ـ ج.ن. کرۆزۆن، بەرگی ٢، ل ٧٠. رێوبان و ئامرازی هاتوچۆ بۆ رۆژی تەنگانە و ئاژاوە بە دەس فەرمانڕەوایانەوە بوون. (مێلکۆم، ل ٥٢٥). Hambly, An Introduction.

٨٤ـ روجێر ئیستۆنس، ل ٢٠٨؛ هەر ئەم نووسەرە لە ل ١٦٨دا دەنووسێ کە کەریمخان «تەبەس»ی سەرلەنوێ ساز کردەوە و بەتایبەت گومبەزی «سوڵتانحوسێن»ی برای ئیمامڕەزای رۆنا؛ بەڵام تەبەس لە قەڵەمڕەوی پاشایەتی ئەفشاردا بوو.

٨٥ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ٦٩؛ گوڵشەنی مراد، ل ٦٥ ـ ٦٦؛ زەکا، ل ١٨ و ٤٢؛ دارسی تابلۆیەکی کێشاوەتەوە کە دەیسەلمێنێ لە ژێر کارتێکردنی غەففاریدا ئەم وێنەیەی بۆ ئەرگ و سەرجەم عیمارەتەکانی شیراز لە نیزیک ٨ساڵ دواترا هەڵبژاردووە.

دادەندرێ، بە خۆی نازیوە. بە زیادکردنی بیناکانی وەکیل بنەی سەرەکی کۆشکی تێکەڵەی گوڵستان کە پاشان بە دەس میرانی قاجار پەرەی پێدرا، بناغەی داندرا. بە واتایەکی ڕوونتر خانی زەند لە پێش پاشایانی قاجاردا پێشبینی ئەوەی کردبوو کە ڕەنگە ڕۆژایەک تاران ببێتە پایتەخت[٨٦]. بەڵام بە سەرنجدان بەم قۆناخە پڕ قەیرانەی مێژووی ئێران وا وێدەچێ کە ڕەنگە تەنیا مەیلی لێبووبێ بنکەیەکی قایم بۆ چاوەدێری بە سەر پارێزگا تازەداگیرکراوەکانی قاجارییان وەک گورگان و مازەندەرانا دامەزرێنێ. هەروەها کەریمخان لێرەوە خۆی سازدا بۆ پەلاماردانی بەربلاوی ئازەربایجان[٨٧]. لە ڕاستیدا هەڵبژاردنی شیراز وەک پایتەخت لەبەر ڕاکردن و ڕەوینی محەممەدحەسەنخان و ئازادخان لە ساڵی ١٧٥٦دا، یانی چوارساڵ پێشتر بە سەریدا سەپیبوو.

تاران و شیراز دوو جەمسەری ئێراقی عەجەم بوون کە یەکیان لە سەر دەروازەی ئازەربایجان و پارێزگاکانی لێواری دەریای خەزەر هەڵکەوتبوو و ئەوی دی ناوچەی فارس و خاکی بەستێنی کەنداوی لە خووزستانەوە تا لاری دەگرتەوە. بۆ زاڵبوون بە سەر ڕۆژاوای ئێرانا دەبوو هەردووی ئەمانە بە دەستەوە بن. لە دەس دانی یەکیان دەبوو بە هۆی لێکهەڵوەشانی یەکجارەکی و قایم کردنی دوژمن لە جەمسەری لاوازتردا. وەختایەک کە لە ساڵی ١٧٦٣دا وەکیل لە ئەردەوێڵ وەدەرکەوت، بە تێپەڕبوون لە تاران و شۆڕبوونەوە بە خەمسەدا شۆرشی زەکیخانی لە ئیسفەهان سەرکوت کرد. پاش ئەم ڕووداوە تەواوی پاشماوەی تەمەن و فەرمانڕەوایەتی لە شیراز مایەوە و دەستی لە ئیسفەهان بەردا و لێیگەڕا تا هێزەکانی قاجار وردەوردە لێی کۆبوونەوە و هۆکاری تێکدانی ڕایەڵوپۆی کاری جێنشینایەتی ئامادە کرد. بەڵام لەو ڕۆژەوە کە شیرازی کردە پایتەخت ڕەزامەندی و پێشکەوتنی بێ ئەملا و ئەولای دانیشتووانی بەدی هێنا.

## ١٤ ـ ٧ کاروباری کەلتووری

سەدەی هەژدەی زایینی کە لە ئورووپا و تا ڕادەیەکیش لە هیندووستان ماکەی کاریگەر و هەوێنی نوێبوونەوەی ئەدەبی بوو، بە تاریکترین و قاقڕترین

---

٨٦ـ زەکا، ل ٨؛ ڕوجێر ئێستۆنس، ل ٨٤.

87- cf. Lockhart, Persian Cities. 5;    زەکا، ل ٨

قۆناخەکانی ئەدەبیات و کەلتووری ڕەگەزی ئێرانی دادەنرێ. تەواوی ئەو کەسانەی کە سەبارەت بە ئەدەبیاتی ئێران توێژینەوەیان کردووە لە سەر ئەم بۆچوونە هاودەنگن[٨٨]. هێرش و تالانوبڕۆکانی ئەفغانییان و ئەفشارییان و کەڵەوەکێشی و ملانەی سەردارانی سێکۆچکە (ئازادخان و محەممەدحەسەنخان و کەریمخان) ئاخرین پاشماوەی لاوازی ئەدەبیاتی ڕوو بەرەو نەمانی دەورانی سەفەوییان لە نێو کاکۆنی پەرێزان و کاولاشی گوندان‌دا پێخوست کرد. شوێنەواری لوتفعەلی بەگ کە لێرەدا پشتی پێبەستراوە ، لە سەردەمی بۆشایی دەسەلاتا ئاوا باسی خەسار و زامی دەر و ژووری ئادەمیزاد دەکا: «دنیاکە وای لێهاتووە کە هیچکەس دڵی ناچێ بۆ شێعر خوێندنەوە و تەنیا لێی‌دەگەڕێن کە شێعرێک بهۆنێتەوە[٨٩].»

ئەگەرچی ئەم هەلومەرجە تاڵە بەرچاوە بەربینگی ئەدەبیاتی گرتووە، بەلام ئەو باروهەوایە تا ڕادەیەکی زۆر هەمەلایەنەیە و هونەرە جوانەکان و بەشە تایبەتەکانیشی وەبەر خۆی داوە، کەچی وا دیارە وەکیل سەبارەت بە شێعری تاریفات لەگەڵ نادرشا هاودەنگە و لە بابەت مێژوونووسینەوە هێندە لەوی پشوودرێژتر نیە[٩٠]. ئەوان تەنانەت ئەگەر بە ئانقەستیش نەبووبێ دیسانیش هەر پشتیوانی هونەرمەندان و سنعاتکارانی دەربار بوون. کارخانەی شا یان شوێنی کار و کارگەی میری، بۆ ئەو کەسەی داوای پادشایەتی ئێرانی دەکرد بە بەشێک لە ئامراز و پاشکۆی لەمێژینی دەربار دادەندرا و دەمایەوە، ئەگەرچی جاری وابوو وەک کۆیەسقانی چواربەندەیەکی ڕەقوڕووت دەستاودەستی دەکرد، بەلام دیسانیش بە مەبەستی پاراستنی ئەوپەڕی ئابڕووی جڵەوداری حکوومەت وەبەرچاو دەگیرا. ئەو سنعاتکار و هونەرمەندانەی دادەمەزران مانگانەیەکیان بۆ بەڕێچوون وەردەگرت و سێبەر و پاوانی مەعنەوی دەربار وەک تەنیا مشتەری بەرهەمەکانیان (مافوورەی گران، قوماشی زێڕ و زێوکفت، جل و بەرگ و شمەک و مینیاتۆر، تابلۆی خۆشنووسان، کەلوپەلی چێشتخانە و ئامرازی کایەی

88- Bausani and Pagliaro, 205.

٨٩ـ ئاورگەی ئازەر، بەگوێرەی گێڕانەوەی براون لە مێژووی ئەدەبیاتی ئێرانا، ل ٢٥٨ و لۆکهارت لە بەسەرهاتی میرانی سەفەوی‌دا، ل ٤٩٢.

90- See Francklin, 295 – 296.

چینی دەسەڵاتدار) پشتیوانی لێدەکردن[٩١].

نادرشا لە هێرشی خۆیدا بۆ سەر هیندووستان سەرەڕای تالانی ئەو وڵاتە ژمارەیەکی بەرچاوی هونەرمەند و سنعاتکاری هیندی وەک دارتاش، سەنگتراش، زێڕینگەر و وەستاکاری دیکەی کانزاگەری هێنایە ئێران. لە ماوەی بۆشایی دەسەڵاتی پاش مەرگی نادر ئەمانەش گەڕانەوە نیشتمانی خۆیان یان چوونە وڵاتانی تر، بەڵام کەریمخان وەختایەک لە شیراز سەقامگیر بوو لێبڕا کە پاشماوەی وەستاکار و شاگردەکانیان کۆبکاتەوە و دنەی دوورخراوان و بازرگانان و پەنابەرانی دا کە بگەڕێنەوە ئێران و گەشە بدەن بە پایتەخت[٩٢].

چوارچێوەیەکی وا کە بنیادمم بتوانێ ڕەوتی تلدانی هونەری و ئەدەبی نیوەی دووهەمی سەدەی هەژدەی بە کورتی تێدا جێبکاتەوە بوونی نیە. خۆشنووسی، پەخشان و ئەوەی بەڕواڵەت ناوی جووڵانەوەی گەڕانەوەی ئەدەبییە وێڕای پەیوەندی و بەسترانەوەی لەگەڵ شێوازەکانی سەرەتایی و کۆتایی لە جێی دیکەدا خراوەتە ڕوو[٩٣]. من تەنیا دەمەوێ کە هێندێک لەو ئاڵوگۆڕە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی کە هەتا ئێستا دەستەیەک لە هونەرمەندان و نووسەرانی هاوچەرخ بە باری مێژوویی‌دا شیکرانەوەیان لە سەر کردوون، ڕوون بکەمەوە.

لە شوێنەواری زۆربەی ئەو هونەرمەندانەڕا کە لە ئیسفەهان پێیان نابوویە جەغزی ژیان و لێیڕاهاتبوون، وا دیارە داب و نەریتی کەلتووری و سیاسی بارگای سەفەوی وەبەرچاو دێ، بەڵام ژمارەیەکیش کە لە ڕۆژگاری وەکیلا خەریکی کار و چالاکی بوون پاشگری ئیسفەهانییان پێوە بوو: ئەم تاقمە بێجگە لەو ٢٧کەسە کە غەففاری جەللەی کردوون[٩٤]، دەستەیەکیش وەک «حەزین»ی شاعیر (١١٨٠ی کۆچی / ١٧٦٦ی زایینی) لە ساڵی ١٧٥٠ کۆچیان

91- cf. Minorsky, TM, 30, 48 – 50; Lockhart,Safavi Dynasty 490; Kuznetsova,230.

92- Lockhart, Nadir shah, 154; Kishmishev, 231; Rypka, 307.

93- See: Bahar III, 307, 310 – 326; Browne, History of Persian Literature, 282 – 286; Rypka, 307 – 309.

٩٤ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢٢٧ ـ ٢٥٢.

کردووە بۆ هیندووستان. هێندێکیش وەک «وەفا»ی قومی کە لە سەردەمی دەسەڵاتی نادرشادا چوونە ئیسفەهان لە دەورەی فەرمانڕەوایەتی کەریمخانا گەڕانەوە ئێران[95]. زۆر کەسی وەک موشتاق (١١٧١ی کۆچی / ١٧٥٧ی زایینی)، ئازەر (١١٩٥ی کۆچی / ١٧٨٠ی زایینی)، هاتف (١١٩٧ ـ ١١٩٨ی کۆچی / ١٧٨٣ ـ ١٧٨٤ی زایینی) . ڕەفەق (١٢١٥ی کۆچی / ١٨٠٠ی زایینی) لە ماوەی بۆشایی دەسەڵات، بەتایبەت لە شارەکانی ئێرانی ناوەندیدا چەشنی ئیسفەهان، قوم و کاشان مانەوە. هیچکام لە ناوبەدەرەوەکانی ئەم دەورەیە دانیشتووی خوراسان یان سەر بە دەسەڵاتی خانەدانی ئەفشاری ئەو هەرێمە نەبوون. مەشەد بە باری کەلتووریشدا هەروەک دۆزی سیاسی و ئابووری لە ساڵی ١٧٥٠ڕا بەرەو دوا سەرەڕای بوونی شیلە و هەوێنی کەلتووری بەتاڵانهێنراو لە لایەن نادرەوە، گیرۆدەی گلاربوونەوە و ڕۆژەڕەشی ببۆوە. ئەمیرانی شەڕخوازی خوراسانی دەسکەوت و خەنیمەتە فەرهەنگییەکانیان تێدابرد و زۆربەی ئەو چوارسەد بەرگ کتێبە دەسنووسەی کە ئەم سەردارە جیهانگیرە لە دێهلیڕا هێنابوونی لە مەرقەدی ئیمامی هەشتەمدا لەبیر چوونەوە[96].

ئەگەرچی ئێرانی ڕۆژاوایی و ناوەندی بە باری فەرهەنگیدا نیمچە چالاک مایەوە، بەڵام دیسانیش لە ئاخری ساڵی ١٧٥٠ و سەرەتای ١٧٦٠دا لە بوار و بەستێنی داسەپیوی کەلتووری خۆیدا، تووشی چاکسازی بوو. ئیسفەهان بەناچاری زیاتری جێ پێ لێژ بوو، چونکە شیراز بوو بە ڕووگەی پشتیوانی و دنە دان. هاوکات لەگەڵ کۆچی هۆزەکانی لەک و لوڕ بە مەبەستی چوونە پاڵ قۆشەنی فارس لە باشووری ڕۆژهەڵاتی، چەند پۆلە بارمتە لە ئازەربایجان و ئەستەرئاباد و کۆمەڵێک پەنابەریش لە ئێراق و جولفاوە هاتنە شیراز و لە ئاکامدا ژمارەیەکی زۆر شاعیر و وێنەگەری هەژار و مسکێن بە هێوای وەرگرتنی مانگانە بەرەو دەرباری وەکیل لووزەویان بەست. «محەممەدهاشم»ی زێڕینگەر و شەش کەسی دیکە لە خەتخۆشان و لانیکەم دەستەیەک لە هۆنەرانی وەک ئازەر و میرزامحەممەدنەسیری تەبیب لە ئیسفەهانەوە کۆچیان کرد هەتا لە شیراز و

---

٩٥ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢٤٨.

96- Lockhart, Nadir shah, 277; ٣١٧, بەهار، ل ١١١،

لە بارگای وەکیل بنەی بۆ داکوتن[٩٧]. نامی شاعیری ئیسفەهانی و غەففاری کاشانی وێنەگەر هەریەکەی شوغڵێکی ئیداری سەقامگیریان وەدەس هێنا و ئەو ناوبانگەی ئێستا هەیانە لە سایەسەری مرخ و توانستی مێژوونووسینی خۆیانە. عەبدورڕەزاقی دونبولی خۆیی، بارمتەی لاویش لێرە شوغڵێکی ئەدیبانەی وەرگرت کە ناچار بوو بە نووسینی مێژووی سالانی سامناکی سەرەتای میرانی قاجار و پێلێهەڵێنان سەبارەت بە ژیانی پڕکامەرانی شیراز و تایبەتمەندییەکانی کەریمخان و هەر بەم کارەی ناوبانگی ڕۆیی.

پێویستە وێڕای عەبدورڕەززاق بە کەلێنی ئەو ڕووداوانەدا چاوێک بە چۆنیەتی دابەزینی پلەی ئیسفەهان وەک ناوەندی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی ئێرانا بگێڕین. میرزا عەبدولوەهابی مووسەوی حوکمڕانی ئیسفەهان کە لە کۆبوونەوە بەردەوامەکانیدا ببوو بە پشتیوانی قایمی شاعیرانی شار وەک ئازەر و لە سالی ١١٧٣ی کۆچی / ١٧٥٩ی زایینیدا مرد. جێنشینەکەی ئاغامحەممەدی ڕەعنایی نیشانی دابوو کە کابرایەکی زاڵمی خوێڕییە. شاعیرانی دڵشکاو و بێبەش و چەند کەسێکی گرینگی تر لە سالی ١١٧٧ی کۆچی / ١٧٦٣ی زایینیدا بە نوێنەرایەتی پێیان نایە بارگای وەکیل و پاش ئەوەی قەوەیان بە قەوەی حاجیئاغامحەممەد نەشکا و بۆیان لە جێی خۆی نەترازا، لانیکەم تاقمێکیان لە پایتەختی تازە مانەوە هەتا وەک پێشینییانی بەرزەجێیان: حافز و سەعدی ببنە پەسندەری شیراز[٩٨].

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ ئەبدالخانی بەختیاری کوڕی عەلیسالح کوڕی خەلیلئاغا کوڕی خوسرەوئاغا، کوڕی غالب کوڕی حەیدەرپاپی لوڕستانی، لە سالی ١١٦٩ی کۆچیدا بە فەرمانی کەریمخان بوو بە سەرۆکی تایفەی حەوتلەنگی بەختیاری. لە زەمانی ئاغامحەممەدخاندا لەگەڵ تایفەی چوارلەنگ بوو بە هاوپەیمان.

٩٧ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ٤٠٩؛ دونبولی، تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی یەکەم، ل ١٦٩، ١٦٢.
٩٨ـ تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی یەکەم، ل ٢٤١ ـ ٢٦٢، ٢٦٩ و ٢٧١.

ئەگەرچی جارێکی سەرمەقولات بە خانی قاجار دابوو، بەڵام لەبەر خەیانەتی کەسانی دەوروبەری گیرا و کوژرا.

٢ـ لە سەردەمی کەریمخانا سەرۆکایەتی هۆزی قەشقایی لە ئەستۆی سمایلی ئەعما کوڕی حاجیئاغا کوڕی نامدارئاغا کوڕی بەگمحەممەدئاغا کوڕی عەلیئاغا کوڕی جانیئاغا کوڕی قازی کوڕی ئەمیرقازی شاملووی قەشقایی بوو. وەکیل نازناوی «خان»ی دایە. پاش خۆی جانیخانی کوڕی و دوای ویش مستەفاقولیخان و دواتر داراب‌خان لە هەڵسووڕاندنی هۆزەکەیاندا دەورەی گرینگیان گێڕا. ئاخرین سەرۆکی بەدەسەڵاتی قەشقایی سمایلخانی سەولەتوددەولە بوو کە ساڵی ١٣١١ی هەتاوی لە زیندانا کوژرا.

٣ـ خێڵاتی خەمسە برێتین: ١ـ تایفەی ئینالوو کە ترکن و سەرۆکانیان لە نێو ئەبولوێردییەکان هەڵدەبژێردران. خەفر و داراب و فەسا هاوینەهەواریان بوو؛ پایزان لە مەرودەشت خێڵبەزیان دەکرد. چەند تیرەیەکن. ٢ـ تایفەی باسەری کە هاوینەهەواریان سەروستان و کوربال و کووارە و خێڵبەزیان دێتەوە ئەرسەنجان و کەمین. سەرۆکیان لە ڕەگەزی عەرەب هەڵدەبژێردرا. لە نێو تیرەکانیدا تەنیا چواربونیچەییەکان ترکن. ٣ـ تایفەی بەهارلوو کە ترکزمانن، یەزدخواست و لارستان و داراب هاوینەهەواریانە و خێڵبەزیان دێتەوە مەرودەشت و ڕامجێرد. ٤ـ هۆزی عەرەب کە لە نەجد و عومان و یەمامەوە لە دەورانی بنیئومەییە و بنیعەباسدا هاتوونە ئێران. بلووکی سەبعە هاوینەهەواریانە و خێڵبەزیان دێتەوە بووانات و سەرچاهان. بە ڕاوێژی عەرەبی دەدوێن بەڵام وردەوردە فارسییان تێکەڵ کردووە و بەولایەدا شکاوەتەوە. ٥ـ تایفەی نەفەر کە بە ڕەگەز ترکن.

٤ـ بیرانوەند یەکێک لە خێڵە گەورەکانی لوڕستانە و بە زاراوەی لەکی دەئاخێون. هۆبە و هەواریان پایزان دێتەوە نێوان برووجێرد و خوڕمئاباد لە مەڵبەندی چەقەڵوەندی و هێرۆ و هاوینەهەواریان دەچێتە بەشی ئەلواری گەرمەسێری. ئەم خێڵە لە دوو تیرەی سەرەکی ئالاینان و دشاینان پێکهاتووە و هەرکامەیان دەبنە چەند بەرەباب. لە ئاخری سەردەمی حکوومەتی سەفەوییەدا سەرۆکایەتی خێڵ لە ئەستۆی تیرەی شەمسەددین بووە. هاتوچۆ و کۆچ و کۆچباری ئەم خێڵە شوێنی کردۆتە سەر پلە و پایەی کۆمەڵایەتی هۆز و

تایفەکانی دیکەی لوڕستان و ڕاپەڕینی ئەم خێڵە کە لە دەورەی فەتحعەلیشای قاجارەوە دەستی پێکرد، بۆ ماوەی سەدەیەک لوڕستانی تووشی نائارامی و ئاڵۆزی کرد. پاش ئەو شەڕ و لێکدانانەی کە لە ساڵی ١٣٠٠ تا ١٣١٢ درێژەی کێشا، ناوچەی لوڕستان و ڕێی خووزستان بەرەو هێمنی و هێوری چوون.

٥- تەرح داب و نەریتێکی بەر لە هێرشی مەغوول بوو و حوکمڕانانی زاڵم شتوومەکی خۆیان بە نرخی بالاتر بە ژێردەستانیان دەفرۆشت. لە مێژووی سیستاندا باسی پێشینەی ئەم چەشنە باجگیرییە نەکراوە، بەڵام شێخی سەعدی لە گوڵستاندا ئاماژەیەکی بەم دابە کردووە: «دەگێڕنەوە کە زاڵمێک بارە داری مسکێنانی دەکڕی بە مفت (حەیف) و ئی دەوڵەمەندانی دەدا بەگران (تەرح).»

# ١٥

# بازرگانی و پەوەندییەکانی دەرەوە

## ١٥ ـ ١ تایبەتمەندی و خاڵە بەهێزەکان

مێژووی ئابووری ئێران لە سەردەمی دەسەڵاتی زەندیەدا، تەنانەت لە دیرۆکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی چاخی سەفەوی و سەرەتای دەورانی قاجارییەش پتر لێکهاڵاوە و دەبێ بۆ توێژینەوەی زیاتر لە سەر بابەت و بەڵگەنامەکان لە ڕوانگە و دیمەنگایەکی بەرین و ئاوەڵاتر لەچاو ئەوەی دەتوانێ لێرەدا بێتەگۆڕ، بخرێتە ڕوو. ڕوون و ئاشکرایە کە بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە پاش مەرگی نادرشا لە نێوخۆی وڵات یا سنووری دەروجیرانەکانی ئێران واتە عوسمانی، ڕووسیا و ئێمپراتۆرێتی مەغوول، بەدیهات، بە نۆرەی خۆیان هەتا ڕادەیەک بوونە هۆی گۆڕانکاری ئابووری. هەروەها لە ڕوانگەی پەیوەندی ئێران لەگەڵ گەورەهێزانی ئورووپایی، ئەم ساڵانە بە قۆناخی گواستنەوە دادەندرێن. بە گیرانی بەسرە بە دەس قۆشەنی زەند وسەرکەوتنەکانی پێشووی ڕووسیا، یەکەمین نیشانەکانی توانەوە و تێداچوونی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی وەک ئەندامێکی نەخۆشی ئورووپا و ئاسیا

دەرکەوت. دەوڵەتی رووسیا برشت و دەسەڵاتی لە ناوچەکانی قەفقاز قایم و پتەو کرد و وەک چۆن سەبارەت بە «دەریای رەش» هەنگاوی نابوو ئاواش بە مەبەستی گرتنی «دەریای خەزەر» تەنگی بە مەڵبەندەکە هەڵچنی. هەر لەم قۆناخەدا بوو کە بریتانیای گەورە پاش حەوت ساڵ کێشمەکێشم هیندووستانی خستە ژێرڕکێفی خۆی. تەواوی ئەم هۆکارانە بۆ ئەوەی بارودۆخی ئێران لە بەر چاوی وەچەکانی داهاتوو لە حاڵەتی «قەڵا»ی ریزی دواوەی شەترەنجی مەسەلەی رۆژهەڵات وەک «سەرباز»ی بەرەی پێشەوەی کایەی کۆتایی نیشان بدەن، لە سەریەک کەڵەکە بوون.

جگە لە بەرژەوەندییەکانی درێژخایەن، کێبەرکێ بە مەبەستی وەدەسهێنانی بازارەکانی ئاسیایی لە رۆژانی بەر لە پێکهاتنی کۆیلەدارییەکان لە هەموو زەمانێک پتر دەوری هەڵگرتبوو و ئاڵوگۆڕی سیاسی لە جەرگەی ناوەندەکانی بازرگانیدا گۆڕانکاری دیکەی بەدیهێنا. لە مەودای ساڵانی ١٧٤٩ تا ١٧٧٩ رووسیا کەموزۆر بریتانیای لە مەیدانی بازرگانێتی دەریای خەزەر دەرپەڕاند، بەڵام دەوڵەتی ناوبراو لە کەنداوی فارسا بە سەر رقەبەرانیدا زاڵ بوو. هولەند کە تا پەرپەرۆچکەی چالاکی بازرگانی و شێوەکۆیلەداری خۆی باڵی ئەنگاوتبوو، لەپڕ قەلفری پێکرا. دەوڵەتانی فەرانسە و رووسیا کە هیچکام لەگەڵ کەریمخان خاوەنی پەیوەندی دیپلۆماتیک نەبوون، قۆنسوولەکانیان لە بەسرە و رەشت نەبردبۆوە و چاوەدێری بەرژەوەندی بازرگانی خۆیان دەکرد و راپۆرتی ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی ناوچەیان دەناردەوە بۆ وڵاتانی خۆیان. راپۆرتی کۆمپانیای دەرەکی زیاتر لە بابەت زانیاری بازرگانی و ئابووری ئێرانەوە کۆدەکرانەوە و دەنووسران و بە هۆی تێکۆشان و هەڵسووڕانی ئەمانە قەوارەی زۆرێک لە گەڵاڵەکانی دوایی بەدی هات.

کەرەسەی خاو و بەرهەمی کارگە و کارخانەکان و دەسوێڕاگەیشتن بە رێگاوبانەکانی بازرگانی لە بەشی رۆژاوای ئیمپراتۆرێتی نادری کە کەریمخان بە میراتگری دادەندرا لە باری چەندی و چۆنی، گەشەی بەرچاوی کردبوو. لەبەروەی قەڵەمڕەوی کەریمخان لە ویشکانیدا چەند ناوچەیەک دەورەیان دابوو، دابڕان لە بەشەکەی دیکەی شوێنێکی وای تێنەدەکرد و زێدە لەمەش بە خێراییەکی پتر لە بەشی بەرەورووی لە ناوچەی رۆژهەڵات گەشایەوە.

ئەگەرچی کارگە گەورە و ناوەنـدەکانی بازرگـانی ئێـرەوان، گەنجـە، تفلیس ، مەرو، مەشەد و هیرات کەوتبوونە دەرەوەی بازنەی دەسـەڵاتی وەکیـل دیسانیش پەیوەندییان لەگەڵ پاشماوەی خاکی ئێران دانەبڕابوو. واوێدەچێ کـە تەورێز وەک جەرگە و ناوەندی سەرەکی توجارەتی ترانزیتی بـاکووری ڕۆژاوای ئێران لە ماوەی شەڕی بۆشایی دەسەڵاتا، لانیکەم ئەوەندەی کە پەیوەنـدی بـە شتوومەکی ڕووسیاوە بێ گەلێک تووشـی خەسـار هـاتبوو. ئـەم شـارە هـەتا ئاخرییەکانی ساڵی ١٨١٠ وەک بازاڕێک بە مەبەستی کڕین و فرۆشتنی تاقمەکانی کۆیلەی گورجی لە ئێران مابۆوە. لـە پـەنا مەراغـە کارخانـەی شووشەسـازی دانـدرابوو[1]. ڕەشـت و بەنـدەر ئـەنزەلی وەک ناوەنـدی هـەناردەی بەرهـەمی کشتوکاڵی و ئاوریشمی خاو مانەوە و ئـەم کاڵایانـە نیزیکـەی سـێ لـەچواری سەرجەم هەناردەی ئێرانیان لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا پێکدێنا[2]. قەزوێن و قوم لەبەر سازکردنی تیخی شمشێر ناوبانگێکیان هەبوو[3]. چەرم و لبادی هەمەدان بە چاک دەرچووبوون و کاشان مافوورە و قوماشی ئاوریشمی تایبەتی لێدەکرا[4]. لە ئیسفەهان واتە گرینگترین و خۆش‌مرخترین شاری پیشەسازی ئێـران بەرهـەمی قوماشـتـەنی، کـەلوپـەل و پێداویسـتی و کـڵاوی کەوڵـەبەرخ و تریـاک لـە برەودابـوو[5]. هـەرچۆنێک بـێ زۆرێـک لـە سـەرمایەداران و پیشـەگەران و سـنعاتکارانی دەسـڕەنگین و خاوەنـانی پیشـەی بازرگـانی و فەرهـەنگی لـە خوارەکەوپێچەکـە و گۆڕانکارییـەکانی سـەرئەژمێری سـاڵانی ١٧٢٢ تـا ١٧٦٥ی زایینی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕادرانە شیراز.

شارەکانی یـەزد و کرمـان هـەردوو بـە ناوەنـدی لـەمێژینی سـنعات دادەندران و بە باری توجارەتی ویشکانی لـە ئێـرانی چـەرخی سـەفەویدا بـە عەمباری کاڵا و شـتوومەکی گرینـگ حیسـاب دەکـران. لەبـەر کـەمبوونـەوەی هاتوچۆی ویشـکانی و دەرکـەوتنی بەندەرعـەباس وەک بنکەیـەکی بازرگـانی

---

1- Markova, 118; Hambly, ((An Introduction)), 81.
2- Markova, 106.
3- Francklin 148; Beauchamp, 79 – 80.
4- Hambly, ((An Introduction)), 81.
5- Ibid; Kelly, 44.

ساتوسەودای ئەم شارانە تەنیا تایبەت درا بە کەرەسەی خاوی وەک ئاوریشم و تریاک لە یەزد و مووی بزن (مەرەز) و مز و ئاسن لە کرمان و بە هەر باریکا گیرۆدەی ڕەوتی پاشەوپاش کشانەوە بوون[٦]. کرمان لەبەر بوونی کانگای گۆگرد و شۆرە بۆ باڕووتسازی و هەبوونی کارگەی تفەنگی پلیتەیی، کەموزۆر کەوتبووە بازنەی بارودۆخێکی پیشەسازی[٧].

دەغڵ و دانەوێڵە و تووتن و تریاکی کازروون و شەرابی شیراز و میوەی ویشککراو هەم بۆ نێوخۆ و هەم بۆ ناردنەدەرەوە وەبەرهەم دێن[٨]. یەکسمی ئەم ناوچەیە بە باری ناردنەدەرەوەدا خاوەن ناوبانگێکی تایبەتن و لە لای ناوچەی دەشتستان بەخێو دەکران. شێخنەسری بووشێهری بە جووتکردنی تۆرەمەکانی عەرەبی مەڵبەندی نەجد و تورکمان، چاککردنی ڕەسەنی ئەم یەکسمانەی دەسپێکردبوو[٩]. گۆیا شووشە و شمشێر و تیر و کەوان و مەتاڵ و گورز و ڕمب و زرێ و کلاوخوود و چی ئامرازی شەڕە ـ وەک بەرهەمی کارخانەکانی مەراغە و قەزوێن و کرمان ـ گرینگترین بەرهەمەکانی کارگاکانی شیراز بوون. لوولەی تفەنگی پلیتەدار و سەرنێزە و دەمەشمشێری پایتەخت لە سەرانسەری کەنداوی فارسا بازاڕی گەرم بوو[١٠]. کەلوپەلی بلووریات گەلێک جوان و ڕەنگین و چاک بوون. لە سەردەمی قاجاریەدا هەروەک پێشبینی دەکرا ئیستانداردەکان تێداچوون[١١].

ڕێخۆشبوون و گەشەی بازرگانی لە پایتەختی کەریمخان دەگەڕاوە سەر ئۆگری وی سەبارەت بە برەوی توجارەت. وەک گێڕاویانەتەوە ئەو بازرگان

---

6- Ftaser, Travels, 354; Malcolm, 206; Kelly, 44; Hambly, ((An Introduction)), 81.

ئەم نووسەرە لە لاپەڕە ٧٥دا پێدادەگرێ کە یەزد وەک ناوەندێکی سنعاتکاری و بازرگانی کەمتر تووشی گیروگرفت بۆوە.

7- Fraser, Travels, 354.

8- Ibid, 303; Ferrieres de Sauveboeuf, 26; Kelly,44; Hambly, An Introduction, 81.

9- Waring, 77, 113 – 114; Kinneir, 41, 65; GN. Curzon II, 232.

10- Capper, 237;Malcolm, 529; Monteith, Notes on the Routes, 110; Porter I,714.

11- Niebuhr, Reise, 118; Francklin 147; Binnig, 288; Porter I, 714.

و دووکاندارانەی کە کەلکیان وەردەگرت لەو کاروانسەرا و دووکانانەی کە ئەو سازی کردبوون، مانگێ ئیجارەیەکی زۆر کەمیان دەدا[١٢]. یەکێکی تر لە هۆیەکانی سەرنجی کەریمخان بۆ سەر بازرگانێتی وڵات لێرەوە دەردەکەوێ کە خوشکی ئاغامیرباقری گورگیەراقی ئیسفەهانی قوماشفرۆشی نێوەڕاست بازاڕی شیرازی خواستبوو[١٣].

تاجرانی نێونەتەوەیی بەپێی ڕێسا گوومرگانەی کالا و شتوومەکی هاوردەیان کە نیزیک سەتی ٧ تا سەتی ١٠ی نرخی هاوردەکان بوو هەر لەو بەندەرەی کە دایاندەگرتن دەیاندا بە شابەندەر[١٤]. (لە بووشێهر کەلانتەر شابەندەریش بوو.) کۆمپانیاکانی ئورووپایی گوومرگانەیان پتر بە نرخی خوارتر و لە سەتا سێ دەدا. (ئەوەی پرمانا و سەرنجڕاکێش بوو ئەمەیە کە لە سەتا سێ، هەر ئەو نرخە دیاریکراوەیە کە بەسرە لە هەلومەرجی کاپیتۆلاسیۆن لەگەڵ بابیعالی لە سەری ڕێککەوتبوو[١٥].) کاروانەکانی باربردن و گواستنەوە و گەیاندنی نێوخۆ بەهەرحاڵ ناچاربوون کە لە ماوەی بزووتنیان بە ڕێوبانانڕدا برە باج و ڕێدرانەیەک بدەن. ئەم ڕێدارانە لە لایەن حوکمڕانانەوە وەک پارێزوانی ڕێگا هەڵدەبژێران، بەڵام ئەغڵەب لە چەتە و دزانی دەریایی کەنداویش پتر غەدریان دەکرد. لە سەردەمی حکوومەتی جەعفەرخاندا مابەینی شیراز و بووشێهر ٩ ڕێدارخانەی لێبوو و زێدە لەمە لە پایتەختیش پیتاکی لە سەتا ٢/٥ وەردەگیرا[١٦]. ڕاست لە سەری ئەوسەری ئێران و بەرەوڕووی ئەم شوێنە چواریەکی سەدەیەک دواتر بازرگانانی رووسی دەبوو باج بدەن بە ٩ ڕێدارخانەی مابەینی گیلان و شیروان و هێندێک کالای دیاریکراو ١٥چەشن باجی بەجوێی پێوە دەبەسترا. هەروەها خاننشینەکانی خۆجێیی وەک «شەکی»ش باجی ترانزیتییان لە سەر ١٧چەشن شتوومەک دانابوو[١٧].

---

12- Francklin, 58 – 59.

١٣ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٤٥ (ئاغامیرباقر وەک دۆستێکی نووسەر باسی کراوە.)

14- Francklin, 148; Niebuhr, Reise, 92; Hambly, An Introduction, 76.

15- Abdul Qadir, 53; Hambly, An Introduction, 76.

16- Waring, 77.

17- Merdith, 74.

هەڵبەت دەسکەوت و ئاکامی ئاکار دوولایەنە بوو. لە ماوەی سەدەکانی هەژدە و نۆزدەدا وڵاتانی ئێران و عوسمانی وێکڕا بە دەس کەمبوونی سکەوە دەناڵین. ئەم کەمهێنانە زۆرتری دەگەڕایەوە سەر نەبوونی بارتەقایی و هاوسەنگی بازرگانی لەگەڵ هیندووستان و ئەفغانستان و خاک و هەرێمەکانی کەنداوی فارس و بە دەستەوە نەبوونی کاڵای هەناردەی تەواو بۆ قەرەبووی شتوومەکی هاوردە. هاوردەی ئەم وڵاتانە بەلای زۆریدا بە کڕینی پارچە و بەرهەمەکانی ئورووپایی و هیندی کە هەمیشە بازرگانانی ئێرانی لێیان مشتەری بوون، قەرەبوو دەکرایەوە و دەوڵەتانی ڕووسیا و عوسمانی لە بەرامبەر ئەم کەلوپەلانەدا سکە و «شمش»یان دەدا.

وا دیارە کە دەوروبەری ساڵی ١٨٠٠ لە بەرامبەر نیوەی تێکڕای هاوردەی ئێران لە هیندووستانەوە (کە نیزیکەی ٢ لەسەر سێی هاوردەی وڵات بوو لە ڕێی بووشێهرەوە) پارە دەدرا. ١٦ «لەک» ڕووپییە لە ڕێی زیارەتکارانی ئێرانیڕا دەبرایە «مەکە» و مەزارگەی ئیمامان و گەلاڵەیەک داڕێژرابوو کە بەشێک لەم برە دراوە لە ڕێی دەریای خەزەر و قەفقاز و زاگرۆسەوە بێتە ئێران و بە لای خوراسان یان سیستان و کەنداوا بنێردرێتە دەرەوە[18].

لەگەڵ ئەمەشا فەرمانڕەوایانی ئێرانی لە چاو سوڵتانەکانی عوسمانی کەمتریان سکە لێدا، بۆیە بایەخی دراوەکەیان پارێزرا و توانییان لەگەڵ گەڕانی بەرفرەوانی دراوی قورس (پارەی دەرەکی) بەتایبەت ڕووپییەی بەمبەئی، «قرۆش» و «زەڵۆتە»ی بەسرە و حەلەب، سکەی زێڕی هولەندی و سکەی زێڕی وێنیزی هەڵیسووڕێنن و نەهێڵن نرخی دابەزێ[19]. سەرەڕای نەبوونی سیستمێکی حکوومەتی و بەڕێوەبەرایەتی کارامە چەشنی عوسمانییەکان و سەرەڕای ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە بە سەر جەرگەی ناوەندی ئابووری و ڕێوبانەکانی بازرگانی داهاتن و سەرەنجام بەدیهاتنی دەوڵەتێکی تێکەڵەی هۆز و تایفەکانی یەکگرتووی چەشناوچەشن، پاش خولێکی پاشاگەردانی دووروودرێژ، وەکیل و ڕاوێژکارانی توانییان بەهرە لەم هەلومەرجە وەربگرن و ئەوەندەی دەکرێ

18- Olivier III, 272; Abdul Qadir,19; Hambly, An Introduction, 77– 80; Markova,109.

19- cf. Hambly, An Introduction, 76 – 77.

بارودۆخی ئابووری ولات بەرەو باشی بەرن. سیایی سەنگ و بایەخی بازرگـانی ئێران و دراوسێیانی لە سالی ١٨٠١دا زۆروکەم سێرجان مێلکۆم خستوویەتە ڕوو. ئەم لیستە سەبارەت بە گرینگایەتی ئەو پەیوەندییانەی کە دەبێ توێژینـەوەیان لە سەر بکرێ بۆچوونێکی ڕێژەیی دەخەنە بەردەستمان: لـە سـەرجەم ٩٠ لـەک ڕووپییەی بازرگانی دەرەکی ئێران نیزیکەی ٢٠ لەک ڕووپییە لەگەل ڕووسیا، ٣٥ لەک ڕووپییە لەتەک تورکیا، ٤ لەک لەگـەل بەسـتێنەکانی کەنـداوی فـارس و بەحری ئەحمەر و ٣٠ لەک ڕووپییە لەگەل هیندووستان و هەروەها بایی ١٠ لـەک ڕووپییە ساتوسەودای جۆراوجۆر، چۆنیەتی توجارەتی زەندیە نیشان دەدەن[20].

## ١٥ ـ ٢ توجارەت لە ڕێی دەریای خەزەر و قەفقازەوە

توجارەتی نێوان ئێران و ڕووسیا هاوکات هەم لە ڕێی ویشکانی (قزلار و ڕێی سەر لێواری شیروان) و هـەم لـە ڕێـی ئـاوی دەریـای خـەزەرەوە کـە لـە «دەربەند» و «باکۆ»ڕا دەکرا، گالەی دەهات. بنە و بنکـە گـەورەکانی بازرگـانی هەردک لا کەوتبوونە ڕەشت و هەشتەرخان. ولاتانی ڕووسـیا و ئینگلسـتان لـە دەورانی سـەفەوییەڕا مـەیلیان لـە پەیوەنـدی بازرگـانی بـوو لەگـەل ئێـران: کۆمپانیای بەڕەسەن لەندەنی ڕووسیا (کۆمپانیای مۆسکۆوی) لـە سالـی ١٥٥٥دا دامەزرا و «پێتر»ی گەورە لە زەمانی بالوێزیتی «وینێسکی» لـە سالـی ١٧١٧دا، پەیمانێکی لەگەل شاسولتانحوسێن ئیمزا کرد کـە بـەگوێرەی نێـوەرۆکی ئـەم قەراروبڕییـە مـافی دانـانی قۆنسـوولخانەیەک لـە گـیلان درا بـە ڕووسـیا[21]. بریتانیاش سالی ١٧٣٨ هـەروەک لـە کەنـداوی فـارس کـاری دەکـرد لێـرەش هەلسووڕا و لە شاری ڕەشت توجارەتخانەیەکی دانا. ئەم دەولەتانە بەرەوڕووی گەلالەکانی نادرشا بوونەوە کە بە لانی سەربەخۆیی و بێنیـازی و چاولـەدەس نەبوونی دەولـەتانی دەرەکـی داڕێژرابـوون و بـە پالپشـتی هێزەکـانی خـۆی کاروباری گەیاندن و گواستنەوە و چاوەدێری بـە سـەر ڕەوگـەکانی دەریـاییدا دەگرتەوە. ئەگەرچی ئەم پرۆژەیە بە مردنی دەسپێشخەرەکەی تێکەوەپێچرا بەلام

20- Malcolm,

21- See Lockhart, Safavi Dynasty, 103 – 108, 176 – 177.

لە ڕاستی‌دا فکری دانانی هێزی دەریایی، دەریای خەزەر لەبەر نارەزامەندی توندوتیژی چەند ساڵ پێشووی ڕووسیا وەلانرابوو. چالاکی و هەڵسووڕانی گەمییەوانی ئەم ناوچەیە لە ئەستۆی پیاوێکی ئازای بریتانیایی بوو بە ناوی «جان ئێلتۆن». ئەو پاش دانانی توجارەتخانەی ئینگلستان لە ڕەشت هاتبووە ئەم ناوچەیە و لە زەمانی نادردا کرابوو بە فەرماندەی هێزی دەریایی و بەرپرسی گەمی‌سازی ئێران. ئەم بابەتە دراوسێی باکووری هەڵتەزاندەوە و نە تەنیا بریتانیای ناچار کرد کە دوو پاپۆری کڕدراو لە لایەن ئێلتۆنەوە بە بازرگانانی ڕووسی بفرۆشێ، بەڵکوو لە نوامبری ١٧٤٦دا بە فەرمانی شاژنی ڕووسیا ئیمتیازی ترانزیتی کالا لە ڕێی ڕووسیاوە کە ساڵی ١٧٣٤ پەیمانی لە سەر بەسترابوو، هەڵوەشایەوە و توجارەتی بریتانیا و ئێران لە ڕێی دەریای خەزەرەوە یەکجاری کۆتایی پێهات[22].

پێتری یەکەم لە ساڵی ١٧٢٣دا لە وەختی هرووژمی بۆ سەر ئێران فەرمانی دانان و پاوانی شەریکەی بازرگانی ئێرانی دەرکرد و لە ساڵی ١٧٥٨دا ئەنجومەنی پیران پشتڕاستی کردەوە؛ ئاخرییەکەی پێتری سێهەم لەبەر نارەزامەندی بازرگانی سەربەخۆی ڕووسیا لە ساڵی ١٧٦٢دا ئەم بڕیارەی هەڵوەشاندەوە. تەقەلا و تێکۆشانی تر وەک گەشە و پەرەپێدانی بازرگانی لە قەفقاز و دەریای خەزەر بە دانی یارمەتی و دەرکردنی فەرمانی پاوان کە لە ساڵانی ١٧٥٦ ـ ١٧٥٧دا ڕووسیا پێی هەڵسابوو، شتێکی وای نەخستە سەر قەبارەی سەنگ و سەنگبایی بازرگانی و لە بەرامبەردا بارودۆخی ئێران و قەفقازی ڕۆژهەڵاتی تووشی خوارووژووریکی زیاتر بۆوە[23].

زۆربەی هاوردەی ڕووسیا لە ئێرانەوە ئاوریشمی خاو بوو. بنەگیای ڕۆنیاس دەکەوتە پلەی دووهەم و پاشان لۆکە و جلوبەرگی ئاوریشمین و برینج و ماسی ویشک دەهاتنە گۆڕ. کالا و کەلوپەلی هەناردەی ڕووسیا بۆ ئێران بریتی بوون لە: ئاسن، پۆلا، کانزای هەمەجۆر، شووشە، تەلیس، کاخەز، چەوەندەر، کەوڵ، شەکر، هەنگوین، نان و شتوومەکی هەمەڕەنگی تر.

---

22- For details of this episode Lockhart, Nadir shah, 286 – 290; cf. Malcolm 102 (whence the quotation); Petrov, 332.
23- Butkov 1, 197; III, 102; Kukanova, 75 – 76; Petrov, 331 – 332.

هەرچۆنێک بێ پەیوەندی بازرگانی نێوان ئێران و ڕووسیا بارتەقایی‌یەکی باشی بووە. پاشماوەی سات‌وسەوداش پتر بە پارە دەکرا[24]. گەمییەکانی بازرگانی بێوچان لە دەریای خەزەردا دەهاتن و دەچوون و لە ٢٥٠تۆنیان کەمتر بار هەڵدەگرت. هێندێکیان گەمێی پانکەڵە بوون و بۆ کرێکار و مەلەوان دەکەوتنە تەنگەژە کە زۆربەیان ئەرمەنی بوون. تەواوی گەمییەکان ئی دەوڵەتی ڕووسیا بوون[25]. ئەو بازرگانانەی کە لە کاروباری گەیاندن و گواستنەوە و توجارەتدا هەڵدەسووڕان زۆربەیان نە ڕووسی بوون نە ئێرانی، بەڵکوو بە ڕەچەڵاک ئەرمەنی بوون. ئەرمەنییەکان هەروەک سەرەتا بە نەتەوەی ئێرانی دادەندران، دواتر لە ساڵی ١٧٥٠ڕا بە باری نەتەوایەتی‌دا بە ڕووس دەهاتنە ژمار. گورجییەکان و تاتارەکان و هیندییەکانیش لە توجارەتی ئەم ناوچەدا دەورێکیان دەگێڕا[26].

دوابەدوای ئاژاوە و تێکەولێکەی کلکەی فەرمانڕەوایەتی نادرشا و ئەو هەرەج‌مەرەجەی پاش مەرگی ڕوویان دا، ئەم پەیوەندییە بازرگانییە لێکهەڵوەشا. لە ڕاستی‌دا ئەم ناوچەیە ـ لێواری دەریای خەزەر و مەڵبەندەکانی دەوروبەری و ئازەربایجان و هەردک بەری چۆمی ئاراز ـ نە تەنیا بوونە مەیدانی یەکەمین و تاڵترین هەڵسووڕداسووڕەکانی گەیشتنە سەر دەسەڵات، بەڵکوو تەنانەت پاش ئەوەی کە کەریمخان پاشماوەی ئێرانی ڕۆژهەڵاتی ئەهوەن کردەوە و ئەو ناوچەیە کەوتە جەغزی قەتیسمان و هەوساربساوی و هەرچی‌وپەرچی و نوشستی ئابووری. کۆچی زۆرێک لە بازرگانان بەتایبەت تاجرەکانی ئەرمەنی و پەل‌هاویشتن و بەرزەفڕی نێوەنێوەی عوسمانییەکان لە ڕۆژهەڵات و دابڕینی ڕێوبانی سەر بەستێنەکان و نەزانی و غللووری و شەڕەنگێزی ڕووسەکان و دژوازی و دووڕوویی ـ وەکوو ڕقبەرقەی هولەندی و

24- Markova, 11416; Petrov 330; Kukanova, 79 – 80; Hambly, An Introduction,77 – 78.

25- Hambly, An Introduction, 74 – 75; Atkin, 40 – 42.

26- Kukanova, 74; Markova, 106.

هەم سەرۆک و هەم کارگێڕانی ئەم کۆمپانیایەی ڕووسی کە لە ساڵی ١٧٥٨دا دەستی کرد بە کار ئەرمەنی بوون. Kukanova, 75 – 76.

ئینگلیسییەکان لە کەنداو ـ بوو بە ڕێخۆشکەری سەرهەڵدانی دەورەیەکی ئاڵۆزبڵۆز و پڕ خوارەکەوپێچەکە لە پرسی بازرگانی باکووری ئێران لە مەودای سالانی ١٧٤٣ ـ ١٧٧٣دا[٢٧].

لە ساڵی ١٧٤٧دا، ناوەندی بازرگانیتی ڕووسان لە ڕەشت لەبەر کەڵەکەبڕینی جەماوەر هەرچی تێیدابوو کە بایی ٢هەزار تمەنێک دەبوو، بەتالان چوو[٢٨]. لە مانگی ژانوییەی ساڵی دوایـیدا، توجارەتخانەی ڕووسیا لەوێ بە دەس قۆشەنی ئەمیر ئەسلانخان تالان کرا و ٨٠هەزار ڕووبڵێکی زەرەد وێکەوت. ڕۆژی دووهەم بە نامەیەک داوای قەرەبووی خەسارەتی لە عادڵشا کردەوە و قەتیش وڵامی نەدرایەوە[٢٩]. ساڵی دواتر واتە ڕێکەوتی ١٧٥١ دەزگا و دامەزراوە بازرگانییەکانی ڕووسان تەنیا برێتی بوون لە توجارەتخانەیەک و نوێنەرایەتییەک لە بەندەر ئەنزەلی و تێکڕای بریتانییەکان بێجگە لە جان ئێلتۆن بەناچاری لە ناوچەکانی باکووری ئێران وەدەرکەوتن. لە وەختی پێشڕەوی قۆشەنی هەشتهەزار کەسی محەممەدحەسەنخانی قاجار لە باکووری ئێران، حاکمی گیلان بە ناوی حاجی جەمالی فوومەنی بە مەبەستی پاراستنی شاری ڕەشت داوای یارمەتی لە جان ئێلتۆن کرد. بەڵام ناوبراو جوابی نەداوە و حاجی جەمالیش تۆماتی کاکەوبرالەی لەگەڵ قاجاران دایە پاڵ و بەخۆی و دووهەزار سوار لە «لەنگڕوود» دەوری ماڵەکەی دا. جان ئێلتۆن پاش ئەوەی بەڵێنی پارێزرانی گیانی وەرگرت خۆی بەدەستەوە دا، بەڵام حاجی جەمال خستییە سیاچاڵ و دوای ماوەیەک سوڕی ون کرد[٣٠].

لە ماوەی پاشاگەردانی ساڵی ١٧٥٠دا، ئاماری توجارەت بەگشتی

---

27- cf. Markova, 103 – 104, 107 – 109, 120; Arunova and Ashrafyan, Gosudarstvo, 259.

28- GD VI, 7 November 1747.

29- Hanway, 1, 429 – 430; Picault, 318; Lockhart, Nadir shah, 290.

30- MAE Perse VII, No. 80; GD VI, 24 October 1751; Hanway 1, 452 – 453; Cook, 452 – 453.

ئەم کتێبەیان دەنووسێ کە ئێلتۆن بەر لە گیرانی، قۆڵی ئەنگواوە. بەڵام پاشان ئازاد کرا و ماوەیەکی کورت لە لەنگڕوود مایەوە و پاشان بەرەو بەندەرعەباس کەوتەڕێ و نەگەیشتە جێ و لە ڕێی ئیسفەهان کوژرا.

چۆنیەتی دابەزینی باری بازرگانی لەگەڵ رووسیا و برانەوەی هەناردە و هاوردەی باکوور دەردەخا. ئاماری رەسمی کەمتر لە نیوەی ئەم ژمارانە نیشان دەدەن، بەڵام روون دەبێتەوە توجارەتی ترانزیت کە بە دەس خەڵکانی غەیرەرووسەوە بوو، لەم رێگا قەرەباڵغە ترانزیتییەش‌دا تووشی دابەزینێکی ئەوتۆ هاتووە[31]. لە سەرەتای ساڵی ١٧٦٠دا شێوەی بەرێوەبردنی وڵات لە لایەن کەریمخانەوە با بە شێوەی ناراستەوخۆش بووبێ بەڵام دیسانیش شوێنی کردۆتە سەر بازرگانی باکووری وڵات. رێگای پێکەوەلکانی نێوخۆی وڵات بەم چەشنە بوو و پارێزگاری لە بازرگانان بەتایبەتی تاجرانی رووس دەکرا و دنە دەدران بۆ کار و چالاکی لە هەرێمەکانی ژێردەسەڵاتی وەکیلا[32]. پیاوەکانی رووسیا لە بەندەر ئەنزەلی باوەرپێکراوی وەکیل نەبوون، چونکە ئەم دەوڵەتە قەت هەنگاوی نەنابوو بۆ بەستنی پەیمانێک. بەڵام هیدایەتوڵلاخانی نیمچە سەربەخۆ و فەتحعەلی‌خانی سەربەخۆ بە نیازپاکی لێیان دەروانین. فەتحعەلی‌خان جارێکیان کەشتییەکی رووسی کە تۆفان بەخۆی و ٧٠٠هەزار رووبڵ بارەوە وە کەنارێکی خستبوو، وەچنگی هێنا[33]. بەگشتی هیدایەتوڵلاخان رێزی بۆ پەیمانی لێخۆشبوون و هەڵگرتنی بارانە و گوومرگانەی نادرشا دادەنا کە لە ساڵی ١٧٣٢دا لەگەڵ رووسان بەستبووی و هەمیشە لە بەرامبەر پێخوستکرانی مافی رووسان لە لایەن تاجرانی ئێرانی و هیندی‌را ـ بە وەرگرتنی دەمچەورانە ـ نارەزامەندی دەردەبڕی. ئەمانە لە ژێر پەردەی گەمییەوانی رووسی‌دا بە بێ دانی گوومرگانە و بارانە، کالا و شتوومەکیان دێنا[34]. رووسانیش بە نۆرەی خۆیان سەبارەت بە چوونەدەری سکە بە شێوەی نایاسایی بۆ نێو ئێران و پارێزگاکانی قەفقاز نارەزامەند و پەرێشان بوون، چونکە قۆنسوولەکانیان نەیاندەتوانی بەر بەم کارە بگرن و ئەوانیان دنە دەدا بەرپەرچیان بدەنەوە، چونکە ئەمانە نەک لە کۆڵ حەشاردانی سکە و شەیتانەبازار دەبوونەوە، بەڵکوو دەیانتوانی سکەکانی رووسی بتوێننەوە و

31-Kukanova, 74 (table 1), 75 (table 2); cf. Markova, 110 – 111.

32- Kukanova, 73 (quoting reports dated 1763), 76.

33- Butkov II, 29; III, 139 – 140; Kukanova, 74.

34-Kukanova, 78. for the terms of this treaty, see Lockhart, Nadir shah, 58.

دووباره به ناوی خۆیان یان وەکیل لێیبدەنەوە و بیخەنەوە گەڕ[35]. ڕاوەستانی نەچوونی سکە لە ئێرانەوە (۱۵ ـ ۵) بوو بـە هـۆی گەشـە و پـەرەی توجـارەتی ڕووسـیا لەگـەڵ ئێـران لـە ساڵـی ۱۷٦۰دا و کەوتـە پـێش قـەبارە و ڕادەی ساتوسەودای ساڵی ۱۷۵۰. ئەم حاڵە بەتایبەتی لەو هێندە ئاوریشمە خاوەدا کە بازرگانـانی ئێـرانی دەیانفرۆشـت بـە تاجرەکـانی ڕووسـی، خـۆی نوانـد و پێهەڵاچوو. چەن کەس لـە حاکمـان و حوکمـڕانانی ئێـرانی لـە پارێزگاکـانی باکووری بەتایبەت هیدایەتوڵلاخان و فەتحعەلیخانی دەربەندی لە هەشتەرخان نوێنەرایەتی بازرگانییان دانابوو[36]. لە نێوەڕاستەکانی ساڵی ۱۷۷۰دا سـەرەنجام ئاڵوگۆڕێک لە ڕەوتی گەیاندن و گواسـتنەوەی ڕووسـیا بەتایبـەت لـە ڕێگـای ویشکانی دەربەندەوە بۆ قزلار بەدیهات و «یابلۆنێسکی» قۆنسوولی ڕووسیا لە ساڵی ۱۷۷٤دا ئاوای نووسی: «ئێستا قۆناخی ئارامی و پێشکەوت لـە ئێـران بـە سەرچووە، هەر بە چاولێکنانێک پاشاگەردانی تەواوی وڵات دەتەنێتەوە[37].» ئەم نووسراوەیە سەبارەت بە ئێران وەک داوەرییـەکی نابـەوەخت خـۆی دەنوانـد. شەڕی ساڵانی ۱۷٦۸ ـ ۱۷۷٤ی نێوان دەوڵەتانی عوسمانی و ڕووسان ڕێگاوبـانی زەمینی گـیرۆدەی مەترسـی کردبـوون و هەڵوێسـتی یـەکجار شـەڕەنگێزانەی ڕووسـان سـەبارەت بـە خانـەکانی ناوچـەییش لـەم سـەردەمەدا بـەرەودوا نێوانساردی و دابڕانی پەیوەندی بازرگـانی و سیاسـی ڕووسـیا و ئێـرانی لـە پاشماوەی ئەم سەدەیەدا لێکەوتەوە. پەلاماردرانی دەربەند لە لایـەن هێزەکـانی ئێرانەوە و خۆپاراستنی ڕووسیا دەربارەی بەدەنگەوە چوونی پێشنیاری ئارکێلی دووهەم و فەتحعەلیخان و هیدایەتوڵـلاخان و خسـتنەڕووی چەنـد مـەرجێکی پڕسووکایەتی[38] لەم بابەتەوە خراپی ڕەنگدایەوە. هەروەها دەرچوونی فەرمانی

---

35- Kukanova, 76 – 80; Markova, 109 – 110.

ئەم نووسەرەی دوایی باسی ئەم چەشنە سـکانەی نـەکردووە. بـەڵام ڕیفـۆرمی دارایـی کەریمخان بە هۆکاری قەیران و ئاوسانی نرخی زێڕ و زێو دادەنێ و دەڵێ ئەمە وای کـرد کە خانەکانی ناوچەیی سکان لە لای خۆیان ڕابگرن و نەیخەنە گەڕ.

36- Kukaniva, 76, 78 – 79.

37- Markova, 106, 113 (esp. table 3), 117; Kukaniva, 81.

38- Markova, 108.

دەوڵەتی ڕووسیا لە ساڵی ١٧٧٦دا کە دەستووری دابوو بە قۆنسوولی خۆی دەبێ بەربگرێ بە کاری ئەو وەستا و کرێکارە ڕووسانەی خەریکی سازکردنی دوو گەمی بوون بۆ هیدایەتوڵلاخان و نابێ کەرەسە و ئامرازی پێویستیشیان پێبفرۆشترێ[39]، بوو بە هۆی ئەوەی هەتا هیوا و هومێدی زۆرێک لە حاکمانی ناوچەیی ـ کە هەموویان لەو سەرهەڵدان و ڕاپەڕینانە تۆقیبوون کە ڕەنگبوو پاش مەرگی نیزیکی وەکیل ڕوویدا ـ سەبارەت بە دراوسێی بەهێزی باکووری تێدا بچێ.

ئەو هەواڵانەی کە لە بابەت هەڵوێست و ڕێبازی ڕووسیاوە گەیوەتە دەس ئێمە دەبێ ڕاسپاردەی یابلۆنێسکی بۆ سەرۆکەکانی سەبارەت بە چۆنیەتی توجارەت لەگەڵ ئێران و گەشەپێدانی بخرێتە بەرچاو: ئەو ڕایدەسپارد کە دورگەکان بگرن و لە بەندەرەکان دامەزرێن و بنکەی قایم و پتەو سازبکەن[40] (وەک سەربازگەی شێوە کۆلۆنی هولەندییەکان لە دورگەی خارک). بۆیە هۆکارەکانی بەدیهاتنی سەرەتای یەکەمین تێکهەڵچوونی دەوڵەتی ڕووسیا و دەسەڵاتی تازە ڕاستەوەبووی ئێرانی باکووری، واتە ئاغامحەممەدخان هاتە ئاراوە[41].

## ١٥ ـ ٣ ئیمپراتۆرێتی عوسمانی

ناکۆکییە تایبەتییەکانی سیاسی و بازرگانی وەکیل و بابیعالی و قەڵەمڕەوی هەرێمی بەغدا ـ بەسرە کە سەرەنجام بوو بە شەڕ و دوژمنایەتی ساڵی ١٧٧٤ ـ ١٧٧٦ و بەدیهێنانی گۆڕانکاری سیاسی، پێشتر باسی کرا. ئەوەی دەمێنێتەوە نیشاندانی گەلاڵەی توجارەتی نێوان ئەم دوو وڵاتە و سرشتی تێکهەڵچوونی سیاسییانە.

لە وڵاتی ئێران و عوسمانیدا کۆمپانیا یان بازرگانێکی خۆماڵی کە چۆنیەتی سەرلەبەری ساتوسەودای خۆی نووسیبێتەوە یا ڕووداونووس و شاهیدێکی هاوچەرخ کە باسی هاتوچۆی کاروانەکان و گەمییە بارهەڵگرەکانی

39- Markova, 108.
40- Kukanova, 81 – 82.
41- Butkov III, 158, 159; Sykes, 290.

کردبێ لەتەرکێن وەبەرچاو نایا. بەڵام دیسانیش سێرجانمێلکۆم سەنگبایی بازرگانی ئێران و عوسمانی لە ساڵی ١٨٠١دا بە بڕی ٣٥ «لەک» رووپییە مەزندە دەکا. دەبێ بڕی ئەم پارەیە بە زیاد و کەمەوە قبووڵ بکرێ و سەری دەگاتە لە سەتا ٣٥ی تێکڕای نرخی توجارەتی دەرەوەی ئێرانی دەورانی زەندیە لە ساڵی ١٧٦٣ تا ١٧٧٤ و دواتریش.

بۆ هێنان و بردنی شتوومەک سێ ڕێی گرینگ بە دەستەوە بوون: ١ـ ڕێگای ویشکانی کە لە خووزستانەوە تێدەپەڕی و پاشان لە ئاوەڕێی یەکاویعارەبان و کاروونەوە دەگەیشتە بەندەری بەسرە و لەوێشەوە بە ڕێگای ئاوی و وشکانیدا سەری دەگەیشتەوە بەغدا و حەلەب. ٢ـ کوێستانەڕێی زاگرۆس بەرەو هەمەدان و کرماشان و خانەقین بۆ بەغدا. ٣ـ ڕێگای دۆڵی ئاراز کە بۆ نەخجەوان و ئێرەوان و ئەرزەڕۆم دەکشا. ڕێگای خۆی و ماکۆ و گیلان و شیروانیش بە دۆڵی کوورادا تێدەپەڕی و وا دیارە لە قۆناخی بەرباسی ئێمەدا بە ڕەوگەی پلە دوو حیساب کرابن. ئەو کالایانەی دەنێردرانە دەرەوە برێتی بوون لە «خم»ی هیندی، بووزووی کشمیری، چیت و قوماشی زەڕی، کەوڵەبەرخ، ئاوریشم، توتن، زەعفەران، ئاموونیاک، قرمزدانە و ڕێواس. ئەو کەلوپەل و کەرستانەی کە لە ڕێی عوسمانیڕا دەهاتن برێتی بوون لە بەرهەم و دەسکردەکانی ئورووپایی و قوماشی دەمیشق و حەلەب و ڕەنگ و زێڕ و جەواهێرات. هاوسەنگی بێپارسەنگی توجارەتی ئێران و عوسمانی بوو بە هۆی گەشەی بازرگانی نێوان ئێران و هیندووستان. بەڕواڵەت وا دیارە کە زۆرێک لە گەمییەکانی هەڵگری باری هەنارده و هاوردەی هەر دوولا لە قۆڵی هیندووستانەوە دەهاتن و لە لای دیکەڕا دەچوونە ئورووپا.

گۆیا ڕێگای زاگرۆس بۆ بەغدا پتر لەوەی بار و شتوومەکی پێدا بێ و بچێ، زیارەتکارانی ئێرانی هاتوچۆیان پێدا دەکرد و ئێران هەموو ساڵێ بڕی ١٠ لەک سکەی خەرجوبەرجی ئەو کۆمەڵەخەڵکە لە گیرفانی دەچووەدەر[42]. ئەو کەسانەش کە ڕوویان دەکردە کابەتوڵڵا و دەچوونە حەج پتر بەم ڕێگایەدا هاموشۆیان دەکرد. لە ڕاستیدا زۆربەی زیارەتکاران شوغڵێکیان بە دەستەوە بوو، بۆیە هاتوچۆیان بە باری چالاکی بازرگانیشدا دەکەوت. هێندێک لەمانە

---

42– Hambly, An Introduction, 78; cf. Kelly, 44; Porter II, 210.

شــتێکیان دەدا و تــاقمێکیش بەدانســـتە خۆیــان دەبــوارد و چــی و چەنــدی لێخۆشــبوونی گوومرگانــە و ڕێدارانــە زیارەتکــارانی دەگرتــەوە، ســوودیان لێوەردەگرت. عومەرپاشا زۆر هەڵسووڕا کە ڕێ لەم فـرتوفـێڵ و تێداچوونــەی سامانی وڵاتەکەی بگرێ و نەهێڵێ کەس بە مفت بۆی قوتار بێ و هەر ئەمەش وای کرد ڕاستەوخۆ بەرەوڕووی کەریمخان ببێتەوە. یەکێک لەم سەرچاوانەی قـازانج و بەرژەوەندی کە بە لای پادشادا شکایەوە و بـە زەرەدی کـەریمخـان بڕایــەوە نیشتەجێ بوونی ئەرمەنییە کۆچەرەکان و بازرگانانی ئوورووپایی بوو لە بەسرە. تەواوی حەولودەول و وەبەر هەڵخوێندن و دنەدانیان بە مەبەستی گەڕانــەوەیان بۆ شیراز و بووشێهر تێکشکا و چۆوە پاش(بڕواننە: ١٤ ــ ٥).

هیچکــام لــەو کێشــانە پەیوەنــدییان بــە بــابیعالییــەوە نــەبوو. کەمووسکەیەک لە داهاتی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی بەغدا دەنێردرایە ئیستانبووڵ و تەواوی زێدەڕەوی و داســەپاندنی هــەق و ناهــەقی ئۆمەرپاشــا ســەبارەت بــە زیارەتکاران لە خەزێنەی خۆیدا دەمایەوە یان دەدرا لە هەقی ئەو هاوردانەی کە لە ئێرانەوە دەهاتن. وا وێدەچێ کە بابیعالی بەسرەی لە بەرامبــەر بانگەشــەی مەمالیک سەبارەت بە حکوومەتی سنجاق لە ساڵی ١٧٤٩دا دابوو بەوان. باڵوێزی بریتانیا لە ئیستانبووڵ و ڕەقیبە فەرانسەوییەکەی لەو ساڵەدا ســەبارەت بــەو گەلاڵەیەی کە بابیعالی بە مەبەستی گەشەی بازرگانی خۆی لــە هیندووســتان دایڕشتبوو دڕدۆنگ بوون و وا دیــارە بایــەخی توجــارەتی دەریــای ســوور لــە ٢٠ساڵی دواییدا وەهــا پێهــەلاچوو کــە «ڕەئــیس ئەفەنــدی» وەزیــری دەرەوە و «ئینسێلی» گەورەباڵوێز لە ساڵی ١٧٧٨دا لێکهەڵبەزینەوە و نێوانیان تێکچوو[43].

گۆیا بابیعــالی ســەرلەنوێ تۆزێــک دەســەلاتی بــە ســەر بەغــدادا دەرۆیــی و داگیرکرانی بەسرەش لــە لایــەن زەندییــەوە وەک مەســەلەیەکی یــەکلاکراوەی لێهاتبوو. ئیستانبووڵ لە درێژخایەندا پتر نیگەرانی پاراستنی خاک و هــەرێم و سنوورەکانی بوو لەگەڵ ئێران. ئاژاوەی دەورانی بۆشایی دەسەلات پازدەساڵێکی دەرفەت دا بە حوکمڕانانی مەمالیک و بابیعالی. تەنانەت پاش سەقامگیربوونی کەریمخان لە شیراز واوێدەچوو کە بابیعالی و وەکیل لە جێــی دیکــە ئەوەنــدە گرفتارن کە بەغدایان ئاوا بە شێوەیەکی سەربەستیخوازانەی پارێزگارانــەی واز

43- SP 97/34 (1749 – 1750), 27 – 28; 97/45 (1778), 68, 126 b.

لێهێناوە. هەرچۆنێک بێ عومەرپاشا ئەو جۆرەی کە پێویست بوو سلە و پارێزی لە ئەربابی ڕواڵەتییانە و دراوسێی تازەدەسەڵاتی نەدەکرد، بۆیە دیار بوو کە قەڵەمڕەوی دڕی بەغدا هەتا سەر ئاوای ناخوا. کەریمخان وا تووڕە و چراغپێ بوو کە داوای خاکی کوردستان و بەسرەی دەکرد؛ بابیعالیش هەوڵی دەدا لە ناوچەکانی سنووری ئێران بەرپرسایەتی ڕاستەوخۆ و دەسەڵاتی بژێنێتەوە. ئەگەرچی لابردن و کوشتنی عومەرپاشا هەنگاوێکی بەجێ بوو، بەڵام لەبەر توانەوە و لێکهەڵوەشانی خانەدانی مەمالیک ئاکامێکی لێنەکەوتەوە. بەهەرحاڵ بە گێڕانی شانۆی لەشکری و هێنانەگۆڕی هەڕەشەی چالاکی خراپکارانە لەودیو هێڵەکانی سنووری باکووری و خستنەڕووی چەند پێشنیاری سیاسی، قەومانی شەڕ بۆ ماوەیەک قۆرتی تێکەوت.

دەبێ ئەم خاڵەش بە وردی لەبەرچاوبێ کە ئەم شەڕە بەپێچەوانەی لەشکرکردنی نادرشا بۆ سەر ئێراق تێکهەڵچوونی نێوان دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی نەبوو. وتووێژەکانی وەهبیئەفەندی درێژەیان کێشا، ئاڵوگۆڕی نامەی نەرمونیان لە مابەینی وەکیل و سوڵتان و سەرووەزیرا سەرەڕای بەردەوامبوونی شەڕی کوردستان و گەمارۆی بەسرە نەپسابۆوە. هیچکام لە لک و پەل و سەربازگە گەورەکانی پارتیزانی و سەربازانی لەشکری ئیمپراتۆریتی عوسمانی بۆ شەڕ لەگەڵ ئێران دەنگ نەدران. (سەربازگەی نیمچەگەورەی پارتیزانی بەغدا کرایە دووهێندە، بەڵام لە جێیخۆی چورتەی پێنەکرا: سەرکردایەتی ئەمانە لە ئەستۆی ئەفسەرانی خۆیان بوو کە لە ئیستانبووڵەوە دەنێردران و پاشا نەیدەتوانی بیاننێرێتە یارمەتی یان شەڕی ڕزگارکردنی بەسرە و هێندە لەمێژ بوو مووچە و مانگانەیان نەدرابوویە کە هاتبوونە سەر لێواری ڕاپەڕین و دەس لێکبەردان[44].)

• تەنانەت پاش گیرانی بەسرەش هەڵگیرسانی شەڕی ڕەسمی ڕانەگەیەندرا؛ دەستووری تەیارکردن و تەدارەکی پارێزەرانی بەسرە لە دیاربەکر و ئەرزەڕۆم و تەنانەت دەمیشقەوە دەهات و ڕەوتێکی کیسەڵی بوو. گۆیا ٥٠هەزار کەس سەربازی یەنیچەری (چریکی نوێ ـ پارتیزان) کە فەرمانی بزووتنیان پێدرابوو، وەک ئاوالانی دیکەیان لەبەر خەمساردی بەرپرسان و وەدرەنگ

44- Niebuhr, Reise, 327.

کەوتنی مانگانەیان، ئاژاوەیان تێکەوت[٤٥].

دەبــوو ڕواڵــەتی مەســەلەکە پارێزرابــا و ئەوانــەی تاوانبــار بــوون دۆزرابانەوە و سزادرابان: لە ٥ی ژانویەی ١٧٧٧دا یەکێک لــە گــەورەوەزیرەکان ناسراو بە دەروێشپاشا لە سەر کار لادرا و تۆمەتی دزی و پاشقــولدانی دارایــی کەوتە ئەستۆ و نێردرایە تاراوگە. مانگی دواتر بە تەشەر بە باڵوێزی ڕووسیایان گوتبوو کە کەریمخان ناچار ببوو بۆ بەرگرتن لــە شــەپۆلی هێرشــێک لــە لای خوراسانەوە هێزەکانی خۆی بکێشێتەوە[٤٦]. وەهبیئەفەندی پاش گەڕانەوەی لــە دێسامبری ١٧٧٥دا بۆ ئەوەی هێندێک لە دەردەکانی سووک بن دەســتی کــرد بــە نووسینی گەشتنامە و هۆنینەوەی بیرەوەری ڕۆژانەی و تێیدا وەکیل و دەربــاری کردە گاڵتەجاڕی و بە دوژمنێکی گوندەکی ناو بــرد؛ لــە شــابانی ســاڵــی ١١٨٩ی کۆچی / ئۆکتۆبری ١٧٧٥دا عەبدوڵلابەگی کەڵهوڕ بە پەلە وەک باڵوێز نێردرایــە ئیستانبووڵ[٤٧]. عەبدوڵلابەگ هەڵگری داخوازەکــانی بەئەدەبانــە بــەڵام پتــەوی کەریمخان بوو. لە ماوەی دووساڵی دوایی‌دا دانیشتن و وتووێژی بــێئاکــام لــە نێوان بەغدا و شیراز نەپسایەوە. ئەم گفتوگۆیانە لە ساڵی ١٧٧٧دا کە شاویزادە هاتە شیراز و حەیدەرقوڵیخانی زەنگەنەش لە ئاخری ساڵ چووە ئیســتانبووڵ درێــژەی کێشــا. بــەردەوام وتووێــژ و قــەول و قــەراری هێمنانــە لــە لایــەن ئیستانبووڵەوە پێشنیار دەکرا و لە لایەن ئێرانەوە ڕەت دەکرایــەوە؛ جــارێکیش دەوڵەتی ڕووسیا دەنگی خستە پاڵ دەنگی دەوڵەتی عوسمانی و هەڕەشەی کــرد،

45- SP 97/52 (1776), 59b, 146a – b.

46- SP 97/53 (1777), 19a, 24b – 25a.

٤٧ـ چامەی تەنانە، ل ١٢ ـ ١٧ی دیوانەکەی. وەهبی بە تەشــریفاتەوە چــووە شــیراز و عومەرپاشا بەخیلایەتی پێدەبرد ـ بە گوتەی ئونات ـ و زیاتر وێــدەچوو کــە ڕاپــۆرتی وەهبی سکاڵای خانی زەند بسەلمێنێ. باڵوێزێکی ناردە لای سوڵتان عەبدولحەمید هەتا باسی لێنەوەشاوەیی شاندەکەی بۆ بکا. عەبدولحەمید دەستووری گرتنی دا بەڵام وەهبی بە نەناسیاوی ڕایکردە ئیسکوودار و چامەکەی بــۆ ڕەتدانــەوەی تۆمــاتی عومەرپاشــا نووسی. سەرەنجام بەخشرا و کرایە دادوەر. (بڕواننە: ١٣٤ ـ ١٣٦، ١٦٦ و ١٧٧٥) ٩٧/٥١.

بەڵام وەکیلیش دەروەستی گفتوگۆ دژوارەکان دەهات[٤٨].

سەرەنجام بە مردنی عەبدوڵلاپاشا وتوویژەکان برانەوە. لە فێورییەی ساڵی ١٧٧٨دا، واتە دەوری دوای ساڵێک هەرچۆنێک بێ بابیعالی فەتوایەکی وەدەس‌هێنا و بەرەورووی تێکڕای پیاوان و مەزن و ماقووڵ و خانانی ئێرانی کردەوە کە تێیدا هاتبوو سوڵتان دەیهەوێ بۆ تەمێی وەکیلی بەرزەدەماخ و غللوور، قۆشەنی دەنگ بدا. تەنانەت ئەگەرچی ڕاوێژی ڕاگەیاندراوەکە چاووڕاوی تێکەڵ کرابوو، بەڵام لە کۆتاییدا وەبیری هێنابۆوە کە پاش گوێ‌بادانی کەریمخان ئاشتی و دۆستایەتی باڵی دەنگێوێ[٤٩]. لەم کاتەدا لە هەموو شوێنێک ببوو بە هەرا کە وەکیل مردووە و هەلومەرجی پێشوو بە مەبەستی تەنینەوەی دەسەڵات و سەقامگیری دووبارە جگە لە بابەت ملکایەتی بەسرەوە لەبار دەبێ.

لە سایەی بارودۆخێک بە دوو تایبەتمەندی دژاودژەوە سەرەڕای شەڕێکی پێنج‌ساڵانەی ڕانەگەیەندراو و داگیرکرانی بەسرە، قەڵەمڕەوی پاشای بەغدا لە هەڕەشە و هێرشی وەکیل بە دوور مایەوە و نەبوو بە گیرۆدەی ملانەیەکی ناپێویست لەگەڵ دەوڵەتی لاوازی عوسمانی. هۆکاری تری پێچەڵقلوچی و لێکدابڕانی لەنەکاو، پەیوەندی دیپلۆماتیکی پاش مەرگی نادر بوو کە بەر لە بەستنی پەیمانی ١٧٤٦ ڕووی دا و لە لایەکی دیکەشەوە خۆ بە خاوەن‌زانانی جێنشینی نادرشا لە خوراسان و بوونی کەریمخان کە خۆی بە جێگرەوەی نادر و تەنانەت بە شێوەیەکی لەبارتر بە هی سەفەوییە دەزانی، بوونە هۆی نێوانگرژی و هەڵپسانی پەیوەندی. لە سەرەتادا داگیرسانەوەی پەیوەندی پێشوو لەبەر هاتوچۆی لێکدالێکدا و خێرای باڵوێزەکانی عادڵشا و برایم‌پاشا و شاروخ‌شا بە مەبەستی دەربڕینی مەیل و تامەزرۆیی سەبارەت بە بەستنی پەیمانی ئاماژەپێکراو و ئاشتی و دۆستایەتی ژیایەوە. ئەو پرس و بابەتانەی کە دەبوونە هۆی دڵئێشی مەزەبی بۆ ماوەیەک خرانە پەراوێز و بابیعالیش لەوپەڕی وریایی و مێهرەبانیدا وڵامی دەدانەوە[٥٠]. یەکەمین

48- SP 97/54 (1778), 41, 90, 91b, 98.

49- Name – i – Humayun, IX, 90; cf. Cevdet II, 58, 305.

50- Nami – i – Humayun, III NO. 3, 25 - 82. Hatt – i – Humayun 138 - 144, 150, 180; SP 97/34, 123a.

تێکهەڵچوونی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ وەکیل دروست لە ساڵی ١٧٧٥دا بە دەسپێشخەری حکوومەتی عوسمانی قەوما؛ بەڵام دیسانیش ئەگەرچی ئێرانی دراوسێی دەسدرێژی کردبوو، سوڵتان ناچار بوو بکەوێتە گفتوگۆ. ڕێنەدان و وەرنەگرتنی باڵوێزی خوراسان لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٧٨دا سووربوونی ڕواڵەتییانەی لە سەر گەرمەی وتووێژەکان نیشان دا. بابیعالی بەئاشکرا تەواوی هیوا و هومێدی بە گفتوگۆکانی شاندی شاویزادە بوو لە شیراز[51].

بە مردنی کەریمخان، بەر لەوەی بگەنە هیچ ڕێککەوتنێک، میلی کاتەژمێری زەمان گەڕایەوە ساڵی ١٧٤٧. سمایلخانی قەشقایی کە لە ساڵانی ئاخری تەمەنی وەکیلا باوەڕپێکراو و چاوەدێری تایبەتی بوو، ئەو دیارییانەی کە سوڵتانی عوسمانی بە باڵوێزێکدا بۆ وەکیلی ناردبوون، لێی وەرگرت و پسوولەیەکی دایە و پاشقولی دان و کابرای بەڕێکردەوە[52]. پەیوەندی ئێران و عوسمانی لە پاشماوەی دەورەی زەندیەدا بە هەڵاواسراوەیی مابۆوە.

## ١٥ ـ ٤ بازرگانێتی کەنداوی فارس پاش مەرگی نادرشا

لە سەردەمی دەسەڵاتی میرانی سەفەویدا بازرگانێتی ئێران لە کەنداوی فارس لەگەڵ بازرگانێتی دەریای خەزەر خاڵی هاوبەشی پتر بوو. لە سەرەتای پاشایەتی ئەم خانەدانەدا کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی سەر بە هێزەکانی دەریایی پۆرتۆغاڵ تا ساڵی ١٦٢٢ و بریتانیا و فەرانسە و هولەند، لەگەڵ پادشاکانی سەفەوی چەند ڕێککەوتننامەیەکیان مۆر و ئیمزا کرد و لە قەڵەمڕەوی ئێرانا چەند ناوەندێکی بازرگانییان بنیات نا. ئەم بنکە و ناوەندانە لەبەر نەبوونی لەنگەرگای قووڵ و گۆماو و بوونی لەشکریانی تالانچی و سەرۆک و

51- SP 97/54, 40b.

52- Hatt – i – Humayun, 1390 (report dated Jomada II 1193 / May 1779). Esmail is here referred to as the self – appointed Kapi kethudasi;

ڕۆستەموتتەواریخ لە لاپەڕە ٣٣٨دا دەنووسێ: «سمایلخان هاودەمی کەریمخان بووە و دونبولی لە بەرگی یەکەم لاپەڕە ١٣٤ی تەجرەبەتولئەحراردا وەک وەکیلی دیوان ناوی هێناوە.

فەرمانــدەرانی خودبەســەر گــیرۆدەی کۆمەڵــێک گرفتــاری ببوونــەوە. ئــەم کۆمپانییانە کیسەی چاکیان بۆ توجارەتی دەرەکی ئێران هەڵدرووبوو. ئەگەرچی تەواوی ئاڵوگۆڕەکانی بەدیهاتوو دەگەڕانەوە سەر ڕەوتی ئابووری و مێژوویــی سیاسی ئێران، بەڵام لە سەر بنەمای کۆلۆنی ـ ئەمپریالیستی کە لە داهــاتوودا بەدیهات، هەڵدەسوورا.

بنکەی سەرەکی بریتانیا لــە ئێــران بەندەرعــەباس (گێمــبروون) بــوو. ناوەندی بازرگانێتی ئەم بەندەرە لە ساڵی ١٦٢٠دا کرایەوە و بەسرەش ٢٠ساڵــی دواتر دەستی کرد بە کار. لە بەسرە ئەوان بــەپێی ڕێســا لەگــەڵ فەرانســەوی و هولەندی و ئاڵمانییەکان و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بریتانیا بە چــاکی لــە فەرمانی ئیمتیازی توجارەت لە سەرانسەری خاکی عوسمانیدا شــەریک بــوون، بەڵام لە بەندەرعەباس تەنیا هولەندییەکان ناوەندیان دانابوو[٥٣]. ئەو شتوومەک و کەرستانەی کە کۆمپانیا بە کڵۆ دەیهێنان بریتی بــوون لــە قوماشــی پەشــم، ساتێنی ئورووپایی، پارچەی دەزووی بەنگال و سوورات، قورقوشــم، قــەلایی و داری ساج. لە بەرامبەردا خورمای بەسرە، قــاوە ـ لــە مووکــا یــا عومانــەوە ـ گوێز، نیتراتی سۆدیۆم و مرواریيان دەناردە دەرەوە. ئەوەی زۆری گرینگایــەتی هەبوو گەیاندن و گواستنەوەی گەشتیارانی ترانزیتی و پۆستی هیندووستان بوو. لە پەندەرعەباسەوە ئاوریشــمی گــیلان و مــووی بــزن (مــەرەز) و مــزی کرمــان دەنێردرایە دەرەوە. ڕەنگە سەنگ و بارستایی بازرگــانی ڕەســمی کۆمپانیــا لــە سەتا ١٥ی تێکڕای توجارەتی کەنداوی فارس بووبێ. مەزنــدەی کاڵاکــانی تــری شەریکەکان و بازرگانانی کــەرەتی تایبــەتی نوێنەرایــەتی کۆمپانیــای هینــدی ڕۆژهەڵاتی کە پێکەوەیان کار دەکرد، دەگەیشتە ســەتی ١٠ی تێکــڕای توجــارەتی کەنداوی فارس. بەشی زۆری هەناردەش بریتی بــوون لــە: مــافوورە، شــەراب، یەکسم، یەستر، ئانقۆزە، کەرەســەی خــاوی ڕەنــگ، پســتە، بــادام، مێــوژ، ســەوزە، میــوەی ویشــک و تــازە، مــرواری و پشــیلەی ئێــرانی[٥٤]. زۆربــەی

---

53- Danvers, 384 ff; Sestina, 209.

بە مەبەستی زانیاری تەواو سەبارەت بە پەیوەندی سەرەتایی کۆمپانیاکانی هولەندی و ئینگلیسی لەگەڵ ئێران، بڕوانە: میرانی سەفەوی، بە قەڵەمی لۆکهارت، بەشی ٢٩.

54- ives, 198 – 199; Niebuhr, Reise, 95,113,213; Sestini 197; Masson, 543.

ساتوسەودا و توجـارەتی کەنـداو کـە دەگەیشـتە ٧٥% بـە دەس بازرگانـانی خۆجێیی (عەرەب، ئێرانی، ترک، ئەرمەنی و هیندی) هەڵدەسووڕا. یـەکێک لـە گەورەترینیان توجارەتخانەی چەلەبی بـوو. ئەمانـە بـە ڕەسـەن ئەرمـەنی و مووسڵاوی بوون. لە نێـوان سـوورات و بەسـرەدا بازرگانییـان دەکـرد. ساڵـێ پێنجشەش جاران بە گەمییەکانی خۆیان خەریکی هێنـان و بـردنی شـتوومەک و کاڵای بازرگانی بوون (ئەم توجارەتخانەیە لە سـوورات کارگـای گـەمیسـازی هەبوو). بەڵام زیاتر کاریان بە گەمییەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی دەکـرد؛ ئەم گەمییانە هەڵگری قوماشی لۆکە، قاپ و قاچاخی کانزایی، داری خەیزەرەان بۆ نێزەی عەرەبان، ویشکەڵەدار و تەنانەت بەرد بوون. بەردیان بۆیـە لـێ بـار دەکرد هەتا گەمی لە وەختی گژەبـا و تۆفانـا سـەرەونخوون نـەبێ و هـەر کـە دەگەیشتنە بەسرە دەیانفرۆشت. ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئیسـفەهان و «هـووەیزە»ش مامەڵەیان دەکرد[55].

لە سەریەک قورسایی و قەبارەی بازرگانێتی لەبەر زەبری مەینەتباری دەورانی بۆشایی دەسەڵات و کۆتایی حکوومەت کەموزۆر بە شـێوەیەکی بـەرچاو دابەزی[56]. بەڵام توجارەت و گەیاندن و گواستنەوەی دەریایی پـاش سـەردەمانی سەفەوی بە چەشنێکی پتەو مایەوە و تەنانەت هێندێکیش برەوی پەیدا کرد و ئەم هێنان و بردنە جێی گەیاندن و گواستنەوەی توجـارەتی ویشـکانی گرتـەوە کـە وێڕای بازرگـانی جوولەکـە و ئەرمـەنی و هیندییـەکانی نیمچـە دەوڵـەمەند و تەناهی ڕێوبانـان گوم ببوو. بەوجۆرەی کە لە سەرچاوەکانی کۆمپانیای هینـدی ڕۆژهەڵاتیڕا دەردەکەوێ، بازرگانێتی خۆماڵـی و دەرەکـی وێکـڕا لـە مـەودای ساڵانی ١٧٤٥ ـ ١٧٥٣دا بە شێوەیەکی پتەو و مناسب بەردەوام بـووە. لـە ساڵـی ١٧٥١دا مەزەندەی ئەو کاڵایانەی کە لە ڕێی کەنداوی فارسەوە نێردراونـە دەرەوە گەیوەتە ٤٥هەزار لیرە کە بەشی زۆری لە بەندەرعەباسـەوە دەرچووبـوو. (ئـەم

---

لەبۆ مەزندەی بەرهەمەکان خۆم بە قەرزداری تووماس ڕیکز دەزانم (بەشی تایبەت).

55- Sistini, 196 – 197, 208.

56- cf. Olivier VI, 115. Malcolm, Hambly, An Introduction, 77.

مێلکۆم وای بەراورد کردووە کە لە ١٨٠١دا سـەرجەم نرخـی کـاڵای دەسـکردی کۆنبـاوی کاروانان سەری دەگەیشتە نیوەی تێکڕای مەزەندەی بازرگانێتی دەرەوەی ئێران.

برە پارەیە دەبێتە چواریەکی تێکڕای هەناردەی کۆمپانیا بۆ ڕۆژهەڵات[٥٧].)

لە بەسرە بازرگانانی ئورووپایی کە ملیان بۆ گوومرگانەی لە سەتاسێی شتوومەکی هاوردە کەچ کردبوو، بە هۆی مەرجەکانی قەراروبڕی کاپیتۆلاسیۆن لەگەڵ بابیعالی گوومرگانەیان پێهەڵاچوو و گەیشتە نرخی مەزەندەی ڕاستەقینەی فرۆشی کاڵایان لە بەسرە. لە زۆر بابەتاندا ئەم پیتاکە بوو بە بنەمایەکی زاڵمانە بە مەبەستی وەرگرتنی لانیکەم ٧/٥% داهاتی تاجرانی خۆجێیی و ئەم پێوانەیە لە دەورەی ئاستی مەزەندەی نووسراو لە دەفتەرەکانی گوومرگیدا حیساب دەکرا. هەروەها ئەو کەلوپەل و کەرستانەی کە بەرەو بەغدا و حەلەب دەچوون ٣% پیتاکیان پێوەدەبەسترا. کەوایە ئەگەر کۆمپانیا ئەوەندەی بۆی کرابا بنەمای لێخۆشبوونی گوومرگانەی ئێرانی پاراستبا بە قازانجی بوو[٥٨]. بەڵام بەندەرەکانی ئێرانی گیروگرفتی سەیر و سەمەرەیان هەبوو؛ دەبوو سەنگەربەندی کرابان و سەربازگەیەکیان بە مەبەستی بەرگرتن لە تاڵان و بڕۆ لێداندرابا. ساڵی ١٧٥٨ لە بەندەرعەباس دوازدە تۆپی گەورە بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی هێرشی زەمینی و چەند تۆپێکی بچووکتر بەرەو دەریا دابەسترابوون[٥٩]. تەنانەت ئەم تۆپخانەیەش دەستەبەر و وەڵامدەرەوەی بەرگرتن نەبوو لە بەرامبەر تاڵان و بڕۆی حاکم و «تیوولدار»ێکی* ڕەزامەندی وەک نەسیرخانی لاری و سەردارێکی نێردراوی گەرمێنێ. ئاخرین پێگەی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی واتە بووشێهر لە پایتەخت نیزیکتر بوو، بەڵام سەفەر کردن بۆ شیراز بەڕێی دۆڵ و دەرەی تەنگستانا بەگوێرەی هێمنایەتی ڕێوبان لە یەک تا سێ حەوتەی دەگرت. جگە لەمانەش باجی ڕێدارخانەکانی سەر ڕێگا و پیتاکی گوومرگانەی دیکەش دەبوو لە شیراز درابان[٦٠].

ساڵی ١٧٤٧ لە کاتی مەرگی نادرا کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هێشتاش

---

57- Amin, 40, 151; Ricks, Politic, 232.

58- Kelly, 37.

59- ives, 199.

*خاوەن تیوول. تیوول بەو ملکانە دەگوترا کە پادشایان دەیاندایە کەسانێک هەتا لە بەرووبۆی بخۆن و داهاتی ئی خۆیان بێ (وەرگێڕ)

60- Niebuhr, Reise, 113.

لە کرمان و ئیسفەهان خاوەنی نوێنەرایەتی و دەسوپێوەنـدی نێوخـۆیی بـوو. داخرانی ئەم نوێنەرایەتییانە ماوەیـەک پـاش سالّـی ١٧٣٣ دەگەڕایـەوە سـەر کۆمەڵێک بەرژەوەندی کە بەدیهاتن. لەم ڕۆژانەدا لە بەسـرە بریتانیـا ناچـار بیوو کە بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ هرووژمی نادرشا یارمەتی ترکـان بـدا. کەوایـە پەیوەندی و نێوانیان لەگەڵ پادشای جیهانگیری ئەفشار کەوتە مەترسی. بـەلاّم ئاواتی هەبوونی هێزێکی دەریایی وای کرد کە سەرەڕای دەسدرێژی بۆ سەر مافی خەڵک لە کلکەی حکوومەتەکەیدا، پشتیوانی و لایەنگری لەم شـەریکەیە بکـا[61]. مەرگی نادرشا سەرەتا بۆ گەیشتنە ڕێککەوتنێکی تازە بوو بە مایـەی کۆمەڵـێک ئومێدواری. لە ئۆکتۆبری سالّی ١٧٤٧دا نوێنـەری کۆمپانیـا لـە ئیسـفەهان بـە شێوەیەکی گەشبینانە داخوازێکی بەنووسراوەی سـەبارەت بـە نـوێکردنـەوەی ئیمتیازی کۆمپانیا دایە خزمەت عادڵشا.

ئەگەرچی حاکمی کرمان ناسراو بە شاروخخان بە نامەیەکی بەئەدەبانە داوای لە کارگێڕی ئیسفەهان کرد وەمێنێ و درێژە بە کارەکەی بدا و زێدە لەمەش دەریبڕیبوو کە شای تازە، گەلێک ڕێز بۆ ئورووپاییyan دادەنێ، بەلاّم لە لایـەن شاوە هیچ فـەرمانێک دەرنـەچوو. سالّـەخانیش لـە شـیراز شـیکردنەوەیەکی ئـەوتۆی خسـتە بـەردەم ئینگلیسـی و هولەندییـەکان[62]. ئەگـەرچی هـەردوو کۆمپانیاکە پێیان خۆشبوو ناوەندەکانی بازرگانی خۆیان لە بەندەر بپـارێزن و چاوەڕوانی ڕووداوەکان مابونەوە، بەلاّم سەرهەڵدانی نێوخۆیی بەئاشکرا پەرەی دەسەند.

لە یەکەمی مانگی دێسامبردا، بەمبـەئی ئیـزنی گەڕانـەوەی لـەڕێوەی نوێنەرایەتی کرمان و پەلەکردن لە چوونەوەی نوێنەری ئیسفەهانی پەسند کرد. ئەم کارە هەتا وەختی دەرچوونی عەلیمەردانخان لـە ئیسـفەهان لـە بـەهاری سالّی ١٧٥٠دا نەگەیشتە سـەرەنجامێک. لـەم سالّـەدا ناوەنـدەکانی بازرگـانی بەتالاّن چوو: دوو کارگێڕی کۆمپانیا کە یـەکیان ڕێـزدار «گریـووز»ی نوێنـەری کرمان بوو، بەر لە ڕاکردن بۆ بەندەرعەباس تالاّن کران و لێیاندرا. گۆیا سالّـی دوایـی لـە وەخـتی گـرتنی ئیسـفەهان بـە دەس کـەریمخـان، ڕاپۆرتنووسـی

61- Lorimer, 86; Amin, 17 – 20.
62- GD VI, 19 and 21 October, 7 November 1747; cf. Amin, 25.

کۆمپانیاش بە کۆیلە فرۆشرا[٦٣]. (هەڵبەت پاشان پارەیەکی دا و خۆی کڕییەوە و ئازاد کرا.) سەرەنجام لە مانگی ئۆکتۆبرا فەرمانێکی مێهرەبانانە بە ناو و مۆری شاسمایلی سێهەم نێردرا بۆ بەندەرعەباس؛ بەڕێوەبەرانی توجارەتخانە بەوریایی وڵامیان دایەوە کە تەنیا بە هیوای ئاکار و کردار و ڕۆژانی باشتر هەروا لێرە دەمێننەوە، دەنا ئامادەن ناوچەکە چۆل بکەن[٦٤].

توجارەتخانەی ئیسفەهان تازە نەکرایەوە. نوێنەرایەتی چووە کرمان و تا ١٧٥٨ لەوێ بنەی دانا، چونکە لەو ڕۆژگاریدا بازرگانانی مەشەد و ناوەندەکانی باکووری و مەڵبەندەکانی دیکە پێیان خۆش نەبوو بەرەورووی مەترسییەکانی ڕێوبانی بەندەرعەباس ببنەوە؛ بەڵام گرینگترین هۆی مانەوەی پێگەی بازرگانی کرمان مەرەزی باش و تیسکدرێژی بزنەمەرەزی پەروەردەی ئەوێ بوون کە لەبەر قاتی گشتگیری ئەیالەت، بە هەرەمە بەرەو تۆوبڕان دەچوون. جگە لە ڕاپۆرتنووسی زمانزانی ئەرمەنی کۆمپانیا کە لە ساڵی ١٧٦٠دا وەک نوێنەر لەوێ مایەوە، هەموویان لەم ئاخرین بنکەی ژووروووی وڵاتە دەرکەوتن[٦٥]. لەم سەردەمەدا وەکیل زۆر چاک دەسەڵاتی قایمتر دەبوو لە فارس و خەریکی بزووتن بەرەو باکوور بوو. کۆمپانیای هولەندی و ئینگلیسی تێگەیشتن کە ئەگەر دەس لە پێگەی بێسوود و مەترسیداری بەندەرعەباس بەردەن و بچنە شوێنێکی تا لە ناوەندی تازەی دەسەڵات کە شیراز بێ نیزیکتر بن، قازانجی پتر دەبێ.

## ١٥ ـ ٥ کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە ساڵانی ١٧٥٠ تا ١٧٦٩

ئەو کۆمەڵە مەترسییە گیانی و ماڵییەی کە لە لایەن تاڵانکەرانی بلووچ و ڕاووڕووتی سەرداران و سەرتر لە هەمووان باجی زۆرەملییانەی پشتیوانەکانیان واتە مەولاعەلیشا و نەسیرخانی لاری هەرەشەیان لە کۆمپانیاکانی بازرگانی ئینگلیسی و هولەندی دەکرد، زۆر زیاتر لەوەیە لە

63- GD VI, 20 December 1747; Brieven 2679 (1752), Gombroon 21 – 22 (17 February 1751); Lorimer, 90.
64- GD VI, 9 October 1751.
65- GD VI, 31 December 1751; XII,1 and 5 March, 13 May 1761; Amin, 45.

گێڕانەوە بێ[٦٦]. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٥٩دا هولەندییەکان سەرەنجام بەرەو خارک گەڕانەوە و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هەر ئەو ساڵە بڕیاری دا کە لەوێ بڕوا و قەومانی ڕووداوێک کە ڕەنگدانەوەی درێژی حەوتساڵ شەڕ بوو لە کەنداوی فارس، پتری پاڵ پێوەنان خێراتر وەخۆکەون. دوو پاپۆڕی بازرگانی فەرانسەوی هێرشیان کردە سەر توجارەتخانە و بەتاڵانیان دا. مەولاعەلیشا بە لایەنگری لەوان خۆی تێوەدا[٦٧].

دەستووری چۆڵکردنی بەندەرعەباس لە سەرەتای فێوریەی ١٧٥١دا، لە لایەن کۆمپانیاوە لە بەمبەئی دەرچوو، بەڵام نوێنەری دەستەی بەڕێوەبەرایەتی لای وابوو کە مانەوەیان بە مەسڵەحەتە. لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٧٥٤دا دەستوور درا بە «فرانسیس ڤۆد»ی نوێنەری کۆمپانیا کە توجارەتخانەیەک لە بەندەرڕیگ بکاتەوە، بەڵام ئەم ئەزموونە بەرەوڕووی ناکامی بۆوە. ئینگلیسییەکان لایان وابوو کە هولەندییەکان بوونە هۆی شکانیان، بەڵام گۆیا هەڵتەزینەوە و ناڕەزامەندی میرمەهنا شکستی بە گەلاڵەکەیان داوە. لە ساڵی ١٧٥٩دا پاش ئەوەی حوکمڕانی بەغدا بە فەرمانێک ئیمتیازاتی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە بەسرە نوێ کردەوە ئەم شکانە هەتا ئەندازەیەک قەرەبوو کرایەوە[٦٨] و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی ئینگلیس تەواوی تەقەلاکانی خۆی لەوێ چڕ کردەوە. مەسەلەی بازرگانی تەنیا هۆی بزووتنی بریتانییەکان نەبوو بۆ وێسگەی سالمتری کەنداوی فارس: لەبەر قەومانی شەڕ لەگەڵ فەرانسە ڕێگای پۆستی زەمینی نێوان حەلەب و بەسرە وەک کورتترین ڕێ تا هیندووستان گرینگایەتییەکی پەیدا کردبوو. تەتەرەکان تەنیا لە ماوەی ١٥ڕۆژاندا بە ڕێگای بیابانەکانی نێوان دوو وێسگەدا خۆیان دەگەیاندە شوێنی مەبەست و بە کۆتایی هاتنی شەڕیش ڕێگای ڕاستەوخۆ وای کرد تا شەش مانگ لە زەمان کە بەختی دەورلێدانی قەپۆزەی «ئومیدنیک» دەکرا کەم بێتەوە[٦٩].

66- See GD VI,25 January to 24 February1752; Lorimer,98 -102; Amin. 42.

٦٧ـ بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە وردەکاری ئەم ڕووداوە تکایە بڕواننە: یادداشتەکانی گێمبروون، بەشی ١٣، ٢٩ی مارسی ١٧٦١.

68- Saldanha, 73, 80, 91 – 92; Vadala, 41; Danvers, 400.

69- Sestini, 211; Amin. 60; Nashat, 112 – 113.

لە ساڵی ١٧٦٠دا بەڕێوەبەری تازەی کۆمپانیا بە ناوی ڕێزدار داگلاس بە مەبەستی هەڵبژاردنی باشترین شوێن بۆ دانانی توجارەتخانەی شەریکە نێردرایە لەنگەرگاکانی کەنداوی فارس. لە پەیامێکدا کە ناردی بۆ بەمبەئی، بووشێهری بە چاکترین جێ دەسنیشان کرد و گوتی: «لێرە مرۆڤ تەنیا نیازمەندی ڕەزامەندی و ڕاکێشانی سەرنجی شێخە.» بەڵام بەڕێوەبەرانی لەندەن هیچ بایەخیان بۆ ڕاسپاردەکەی دانەنا و خستیانە پشتگوێ و لە ئاوریلی ساڵی ١٧٦٢دا دەستووریان دا کە نوێنەرایەتی کۆمپانیا بگوێزنەوە بۆ بەسرە[٧٠].

چۆڵکردنی بەندەرعەباس لە ٢٦ی فێورییەی ١٧٦٣دا بە یارمەتی سێ پاپۆڕی شەڕکەری ئینگلیسی دەستی پێکرد. جەعفەرخانی لاری برای نەسیرخان بەرەگەی لەم پاپۆڕانە گرت. ناوبراو لە دانەوەی تاڵانی و ئەو باجانەی لە ڕابردوودا بە زۆرەملێ ئەستاندبوونی خۆی پاراست. هەربۆیە داگلاس بۆ پاشەکشە پێکردنی شەڕی هەڵگیرساند. بەر لەوەی لە ٧ی مانگی مارسا سواری گەمی بن، جەعفەرخان و پیاوەکانیان لە شوورە و سەنگەرەکانی پادگان و قەڵا دەرپەڕاند کە پێشتر ئی توجارەتخانەی هولەندییان بوو. ئەوان ١٣ پیاویان کوژرا و هیچیان بە تاڵان نەبرد و هەر ئەوەی توانیبوویان خۆیان قوتارکەن کەیفیان ساز بوو و ئەوپەری شادمانی خۆیان سەبارەت بە خانەخوێی فیفی و وازوازی بە تەقەی ماڵاوایی لە ڕێی ئەم چالاکییە بوێرانە و دلێرانە و سەرجەم سەرنجڕاکێشە دەربڕی[٧١].

ئێستا بەسرە تەنیا پێگە و ناوەندی نوێنەرایەتی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بوو لە کەنداوی فارس. پەیوەندی کۆمپانیا لەگەڵ ئەم بەندەرە هەر نەپسابوویەوە و تەنیا چەند مانگ دواتر نامەکانی شێخ و پێشنیارە وەسوەسە وورووژێنەکانی ئاکامێکیان لێکەوتەوە. ویلیام پرایس لە سەرڕێیەی بۆ بەسرە بە ناوی نوێنەری خاوەندەسەڵاتی کۆمپانیا لە لایەن بەڕێوەبەرانی شەریکە لە بەمبەئی بۆ وتووێژ لەگەڵ حاکمی بووشێهر خۆی ساز کرد و وایان دانا کە سەبارەت بە شوێنی دامەزرانی توجارەتخانە گفتوگۆ بکرێ. لەگەڵ شێخ

70- BP XXVI, 18 January 1763; Wilson, 178; Lorimer, 94; Amin, 45 – 50.
71- Lorimer, 94 – 96; Amin, 50.

سەعدوون ـ نوێنەری شێخنەسر کە رۆژگارێک وەک بارمتە لــە شــیراز دەژیــا ـ قەراروبڕییەکی دوازدەبڕگەیی نووســی و تێیــا ئیمتیــازی هەڵــگیرانی پیتــاک و پاوانبوونی کــڕینی کــاڵای خــوری و داوودەرمــان و ئاســانکاری پێویســت بــۆ بنەجێبوونی نوێنەری کۆمپانیا وەبەرچاو گیرابوو[72]. پرایس قەراردادەکەی دایــە دەس بریکارەکەی و نــاردی بــۆ لای کــەریمخــانی ســەرۆکی شــێخ لــە شــیراز. کەریمخان لەودەمەدا چووبوو بــۆ ئازەربایجــان، بــەڵام ســادقخــان بەگــەرمی پێشوازی لە «جرویس» کرد. جرویس لە مانگی ئاگۆســتا لــە حاڵــێکا هەڵــگری یەکــەمین پــەیمانی بازرگــانی کۆمپانیــای هینــدی رۆژهــەڵاتی بــوو لەگــەڵ فەرمانڕەوای تازەی ئێران، گەڕایەوە بووشێهر. لەم ڕێککەوتننامەدا پرایس وەک فەرمانداری گشتی «گەلی» ئینگلیس لــە کەنــداوی فــارس نــاوی هــاتبوو و لــە ڕێکەوتی ٢٣ی زیحەجەی ساڵی ١١٧٦ی کــۆچی / ٢ی جــوولای ١٧٦٣ی زایــینیدا ئیمزا کرابوو[73].

بڕگە گرینگەکانی قەراردادەکە برێتی بوون لــە: دەوڵــەتی ئینگلیســتان دەتوانێ هەرچەندی زەوی پێویست بێ لە بووشــێهر بــە دەســتییەوە بــێ. لــەم بەندەرەدا حەقی هەیە ٢١ تۆپی بە لاوە بێ کە سەنگیان لە ٣کیلۆ زیــاتر بــێ بــۆ ئەنجامی ڕێوڕەسمی بەخێرهێنان و شەرەف. لە هەر شارێکی ئێران پێیخۆش بێ دەتوانێ لق و بنکەی بازرگانی بکاتەوە. دەبێ لە دانی پیتاکی سەر بە داوودەرمان و کاڵای هەنارده و بازرگانی بخەلەسن. باجی مشتەرییەکانی ئێرانی کۆمپانیا لە ٣% پتر پێهەڵناچێ. شەریکە هەلومەرجی پاوانی ـ بێجگە لە ئاوریشمی خاو کــە بــە دەس دەزگــای میرییــەوە بــوو ـ بــە دەســتەوە دەبــێ و دەتوانــێ بــەر بــە خۆتێوەردانی چەشناوچەشن بگرێ و کارگێڕانی لە ئازادی ئایین بەهرەوەر دەبن. دەڵاڵەکان و هەواڵنێرانی شەریکە لە دانی پیتاک دەخەلەسێن، خانووی پێشووی شەریکە لە شیراز دەدرێتەوە. لەولاشــەوە کۆمپانیــا دەبــێ هەرچەنــدی کــاڵا و کەلوپەلێکی پێویستە بیهێنێ و تەواوی ئەو دراوانەی کە لە فرۆشی کاڵا وەگیری

---

72- Brieven 3015 (1765), 6; Amin, 71 – 72.

73- Brydges, Cix; Amin, 73 – 75; موقتەدیر، ل ٥٥، مەحموود، ل ٤ – ٦

The full text of the English version of this agreement is given in FR XVI, 782, and Aitchision, 42 – 44; cf. Sykes, 280 (contents).

دەکەوێ بە ویشکەپووڵ لە وڵات نەیباتە دەرەوە هەتا بەر بە لاوازبوونی دارایی وڵات بگیرێ و زیان و زەرەدی قورس نەیەتە دی. شەریکە نابێ پشتیوانی لە دوژمنانی شا بکا.

بەڵگەیەک بە دەستەوەیە کە نیشانی دەدا وەکیل شێخسەعدوونی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی دنە داوە. ئەم کارە بەشێک بوو لە سیاسەت و هەڵوێستی گشتی کەریمخان بە مەبەستی ژیاندنەوە و بووژاندنەوەی توجارەت لە قەڵەمڕەوی خاپووری فەرمانڕەوایەتییەکەیدا. مەرجەکانی بەرتەسک بوونی بردنەدەری ویشکەپووڵ دەریدەخا کە وەکیل یان ڕاوێژکارانی بەتەواوی لە بابەت کاریگەری چوونەدەری دراو لە هاوسەنگی توجارەتی ئێرانا ئاگادار بوون. ئەویش وەک نادر شەریکەی وەک تەنیا هاوپەیمانی جێئومێد لە بەرامبەر ئەگەری پەلاماری دزانی دەریایی و تالانکەراندا چاولێدەکرد؛ ئەم باوەڕە لە پاشماوەی ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتیدا لەنگەری دابوویە سەر پەیوەندی ئەو و کۆمپانیا.

توجارەتی بووشێهر گەیشتە گەشەکردن: لە ماوەی ساڵانی ١٧٦٤ ـ ١٧٦٧دا کڕینی ساڵانەی خوری لە کەنداوی فارس بە شێوەی مامناوەندی خۆی لە ١٤٠٧ بارخانە دا کە بەشی زۆری لە ساڵانی ١٧٦٤ ـ ١٧٦٥ هەر ساڵەی ٧٥٠ بارخانە لە بەندەر بووشێهرەوە دەرچوو. ئەم ژمارانەی سەرەوە نیشاندەری چوونەسەری لە ڕادەبەدەری میانوەندی ساڵانە ٨٠٨ بارخانە بوو لە قۆناخی ١٧٥٤ ـ ١٧٦٢دا، واتە ئەو سەردەمەی کە سەرپەرستێتی نوێنەرایەتییەکانی کۆمپانیا لە بەندەرعەباس بنەجێ ببوو[٧٤]. ئەم ڕادەیە پێنجیەکی نەپالاوتەی تەواوی کڕیارەکانی بازرگانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بوو لە هەرێمی خۆرهەڵاتا. هەناردەی ئاوریشمی خاویش بەو هێندەی کە پارێزگای باکووری ئێران دەینارده خزمەت وەکیل ژیایەوە. بوونی هێوری و تەناهی لە ڕێوبان و ڕەوگەکانی لەشکرکردندا بوو بە هۆی گەشەی گەیاندن و گواستنەوە لە بازرگانێتی ویشکانیدا و هاتوچۆی کاروانەکان. لە بنەبانی ساڵی ١٧٦٤دا ڕێگاکانی نێوان شیراز و ئیسفەهان و ڕەوگەی سنوورەکانی ڕووسیا پڕ بوون لە

74- Amin, 79 – 82, 151, 155; cf, ANP, B1, 175, 1 February, 1775.

بازرگان[٧٥]. ئەم ڕێگۆڕکەیە پەیوەندی پێچەوانەی هەبوو لەگەڵ یەکەمین پەیوەندییەکانی ڕامیاری و لێرە بەدواشەوە لەتەک دارمانی بازرگانێتی بەسرە. سلێمانئاغای میربەندەری ساڵانی ١٧٦٥ تا ١٧٦٦ ئەگەرچی حوکمڕانێکی بەتوانا بوو، لە لایەن بنیکەعبەوە کە گەیبوونە پۆپەی دەسەڵاتیان و کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی و عومەرپاشای سەرۆکی کە سێجاران جەرەبابەی دابوو، لە سەرکار لادرا. ئاکامی لاوازکردنی حکوومەتی بەسرە تا ڕادەیەکی زۆر بوو بە هۆی تێکهەڵچوونی دەوڵەتی بریتانیا و تایفەی بنیکەعب و قەومانی دۆزێکی کارەساتبار بۆ توجارەتی ئەو تایفە و پەیوەندییان لەگەڵ وەکیل و گەمارۆدان و گرتنی بەسرە بە دەس ئێرانییەکان کە ئەو ناوەندەی وەک بەندەرێکی گەورە و قەوغای کەنداوی فارس لە بنە هێنا.

سادقخان بۆ پێداچوونەوە و توێژینەوەی ڕێککەوتننامەی نوێ دەرفەتێکی وای لە کیس نەدا. هەر لەو ساڵەشدا بۆ سەرکوتی میرمەهنا لە بەندەرڕیگ داوای ناردنی پاپۆڕی شەڕکەری کرد، بەڵام ناوەندی شەریکە لە بەمبەئی و نوێنەرەکەی لە کەنداو هیچ بەم داوایە ڕازی نەبوون. بۆیە لە مانگی سێپتامبری ساڵی ١٧٦٤دا، وەکیل لە نامەیەکدا بۆ «جرویس»ی نووسی کە بەم زووانە خۆی دەکشێتە لێوارەکانی دەریا و سەرۆکایەتی هەڵمەت و چالاکی لە ئەستۆ دەگرێ و وا چاوەڕوان دەکا کە چەند پاپۆڕێکی بریتانیایی کە دێنە هانای هێزەکانی لەوێ ببینێ؛ بەڵام داموودەزگای کز و لاوازی هەردکلا ڕێیان لە بەڕێوەچوونی ئەم گەڵاڵەیە گرت.

ڕاست یان هەڵە، هەنگاوێکی ئەوتۆ کە دەیتوانی بە سەرنج و خۆشەویستی وەکیل گوڵ بکا، بەڕێوە نەچوو. دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیا لە بەمبەئی و گرینگتر لەمە بەڕێوەبەرانی دانیشتووی لەندەن وازیان لێنەبوو کە بکەونە شوێن ئەو مەترسییەی ڕۆژبەڕۆژ لە تالاوی ئالەقەدراوی ئیمپراتۆرێتی بازرگانی خۆیاندا پتری دەتەنییەوە، بەتایبەت کە تا ئێستا میرمەهنا هیچ مەترسییەکی بۆ نەنابۆوە. لە مانگی مارسی ساڵی ١٧٦٦دا پەلەپاپۆڕێکی پشتیوان گەیشتە کەنداو هەتا خۆ بداتە شەڕێکی سنووردار دژی

75- Brieven 3048 (1766), 36 – 37.

بنیکەعب. کۆلۆنی دانیشتووی بەسرە ئیزنی نەدا کە دژی میرمەهنا کەلک لەم هێزەی دەریایی وەربگیرێ[٧٦].

ئەم بارودۆخە لەبەر دەستەوداوێن بوونی بێشەرمانەی بنیکەعب بۆ وەگیرهێنانی پشتیوانێتی کەریمخان بە ناوی نەتەوەی ئێرانی هەڵگەڕایەوە. وەکیل فەرماندەرانە دەگوێی دەوڵەتانی ئینگلیس و عوسمانی سرەواند کە دەبێ دەس لە قەڵەمڕەوی وی هەڵبگرن.

دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیا لای وابوو ئەگەر بڕیار وایە ڕەزامەندی بنیکەعب وەدەس بێ، دەبێ مەسەلەی یارمەتی هێزی دەریایی دژی میرمەهنا وەبەرچاو بگیرێ. بەڵام سەرەنجام تەمایان گرت نەک تەنیا وا نەکەن، بەڵکوو بە مەبەستی وەرگرتنی دوورگەیەک ـ خارکیان پێ باشتر بوو کە دواتر گیرا ـ تەتەرپێچیان بکەن و داوا لە دەوڵەتی ئێران بکەن نیوەی ئەو ماڵەی لە دزانی دەریایی وەردەگیرێ بدرێ بەوان. ئەم سەردەمە چڵەپۆپەی چالاکی و هەڵسووڕانەکانی کەریمخان بوو بە مەبەستی وەرگرتنی تاوانانە لە بنیکەعب و سەلماندنی ئیمتیازی ئینگلیسییەکان لە بووشێهر.

ئێستا کەموزۆر لێیان ڕوون ببۆوە کە لەبەر کەترەخەمی جرویس سەبارەت بە نەدانی دیارییەک لە وەختی چوونیدا بۆ شیراز لە ساڵی ١٧٦٥دا و خۆدزینەوەیان لە قبووڵی مەرجەکانی پەیمانەکەی کە بەگوێرەی ئەو دەبوو ساڵێ بایی ٢٠٠٠تمەن قوماش بۆ سپای زەند دابین بکەن و تێکڕای دەکەوتە سەرهەقی پاراستنی کاروانەکانی بەرەو شیرازیان، بەشی هەرەباشی ڕەوت و ڕێبازی دووفلیقانەی کەریمخانیان لە دەس داوە. دەڵێن کەریمخان لە دەرفەتێکا بە تووڕەیی پرسیبووی باشە قازانجی مانەوەی ئەم ئینگلیسییانە لە ئێران چییە؟ پاشان فەرمانی دا کە نوێنەرەکەیان لە شیراز دەربکرێ. دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیا دەستووری دا کە جێنشینی جرویس واتە ڕێزدار «باوێر» دیارییەکی ١٠هەزار ڕووپییەیی (١٢٥٠ لیرەیی) لەگەڵ خۆی بەرێ بۆ شیراز و سەرەتای کرانەوەی درگای وتووێژان خۆش بکا[٧٧].

بەمجۆرە نوێنەری شەریکە یانی جۆرج ئێکسیپ لە ساڵی ١٧٦٧دا پێی

76- BP XXXIX, 25 February 1766; Carmelites, 668; Amin, 67 – 68.
77- FR XVII, 1000, 1003; BP XXIX, 17 December 1766. cf. Amin, 93 – 94.

نایە شیراز، بەڵام چاکی پێشوازی لێنەکرا. وەکیل لەبەر وەرگرتنی چەند دیارییەک لە بنیکەعب زیاتر بۆ ئەم سەرسارییە دنە درابوو، بۆیە خۆی لە دیتنی نوێنەری کۆمپانیا کە نامەی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی پێبوو پاراست[٧٨]. سەرەتا بە شێوەیەکی پرسووکایەتی خۆی لە وەرگرتنی دیارییەکانی ئێسکیپ لاگرت و فەرمانی دا کە رایبگرن. پاش تێپەڕینی مانگی دوایی، کارێکی وا کرا کە وەکیل بە شێوەیەکی ڕێسامەند تەواوی داخوازەکانی بۆ وێنە وێدانی دورگەی خارک قبووڵ بکا. هەروەها وا قەرار کرا کە بڕی نیومیلیۆنێک ڕووپییە یارمەتی بدەن بە هێزی دەریایی ئێران. بەدبەختانە نوێنەری بنەجێی بەسرە لەم وەختەدا تا کۆتایی ساڵی ١٧٦٦ هێنری موورە بوو کە شێتانە چەند تەگەرە و کۆسپێکی خستە سەرڕێی ئەو ڕەوتەی کە دەیتوانی لە داهاتوودا جێی هیواداری بێ. لەبەر ئێرەیی بردن بە ناوەندی گرینگ و گەورەتری بازرگانی بووشێهر و نەسازانی خۆی لەگەڵ ئێسکیپ و ئێرانییەکان هەر لە سەرەتای کارەوە نیشانی دابوو کە

---

٧٨ـ گولشەنی مراد، ل ١٦٠ ـ ١٦١، ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٦٨ ـ ٣٨٨؛

ANP BI, 175, 27 September 1967; Carmelites, 668.

غەففاری لەم بارەدا نووسراوەکەی خۆی لە یەکێک لە نێردراوانی ڕووسیا بە شێوەی دەستی دووهەم و سێهەم وەرگرتووە؛ بەڵگەنامەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی سەبارەت بە سەرەتای هاتنی ئێسکیپ هیچیان تێدا نیە و کۆمپانیا لە بەمبەئی کارەکانی کەریمخانی بە هەڵە لێکداوەتەوە.

BP XXXI, 17 November 1767, whers a favorable impression of the vakils Charcter is obtained from his ((Resolute of the present carried to him by Mr Skipp until affairs were settled)).

بەهەرحاڵ ئەگەرچی نەقل و نەزیلەی ڕۆستەموتتەواریخ سەبارەت بە سووکایەتی وەکیل دەربارەی یەکێک لەم باڵوێزانە زۆری پێوەندراوە(پەراوێزی ٩٦) بەڵام ڕاپۆرتی قۆنسوولی فەرانسە ئۆباڵی بۆ دەکێشێ کە کەریمخان تۆمەتبار دەکا کە دەمچەورانەی لە بنیکەعب وەرگرتووە. ڕاپۆرتی کارملیتەکانیش ئەمە دەسەلمێنن. یەکێک لەوانە هاوڕێیەتی نێردراوی بریتانییەکانی دەکرد کە لە بەمبەئیڕا بە نوێنەرایەتی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هاتبوو. بڕواننە: وتاری پێری، وتاری ڕێزدار ڕەوشەنزەمیر لە گۆڤاری توێژینەوەکانی مێژوویی‌دا، ساڵی١٠، ژمارە٣، ل ٢٤٦ـ ٢٤٧؛ ژمارە٤، ل٧٩ ـ ٢٨٤.

سەبارەت بە وتوویژ لەگەڵ وەکیل و بەدیهێنانی داخوازەکانی نارەزامەندە و لە بەرامبەر سەرۆکانی باڵادەستیدا ئینکەبەری و کەڵەوەکێشی دەکرد. هەر کە راپۆرت و بۆچوونی گەشبینانەی ئێسکیپ لە مانگی ژووەندا خرایە روو، پێشنیارەکانی وەکیلی رەتکردەوە و وەلایەکی نا و بێدەنگەی لێکرد و فەرمانیشی دا بە باڵوێز کە بگەرێتەوە بریتانیا. ئەو کات هەواڵی نارد بۆ بەمبەئی کە وتوویژەکانی شیراز بەرەورووی شکست بوونەوە. نامەکانی بە خوردبوونەوە لە فەرمانی نەفامانەی سەبارەت بە داخستنی نوێنەرایەتی کۆمپانیا لە بووشێهر، کەموزۆر نیشاندەری بێباوەری نەخۆشانەیەتی سەبارەت بە وەکیل. بە سازکردنی یەکێتی لەگەڵ ترکان و تەنانەت میرمەهنا لە راستیدا شەری دژی کەریمخان راگەیاند هەتا بە لێکدانەوەی خۆی هۆکاری باڵادەسبوونی دەوڵەتی بریتانیا لە کەنداوی فارس بەدی بێنێ[٧٩].

ئێسکیپ لە کۆتایی ساڵا وەختایەک تێگەیشت کە دەستەی بەرێوەبەرایەتی شەریکە لەگەڵ پێشداوەرییەکان و رەوگەی خەیاڵاتی ئەمپریالیستی مووره هاودەنگ نیە و بۆچوونەکانیان یەکتر ناگرێتەوە، گەرایەوە بەسرە، لە لایەن بەمبەئیرا بەتوندی سەرکۆنەی ئاکار و جووڵانەوەی نوێنەری بنەجێی بەسرە کرا و پەلەپاپۆرێکی بچووک بە مەبەستی یاریدەدانی ئێرانییەکان بۆ گرتنەوەی دورگەی خارک نێردرا. ئێسکیپ سەرلەنوێ بەرێی شیراز کرایەوە و لە مانگی مەی ساڵی ١٧٦٨دا رێککەوتننامەیەکی مۆر کرد[٨٠].
مووره دیسانیش چەتی خستە وتوویژەکان: هەر لەو مانگەدا بە بێئۆقرەیی سەبارەت بەوەی لە شیراز تێدەپەرێ دڵتەنگی نواند، چونکە دەیبینی کە بەخاتری وەکیل کەوتۆتە ژێر تەوژمێکی تاڵ و ناخۆش. بەرلەوەی رێزدار ئێسکیپ بتوانێ هانی بدا بۆ بەرێوبردنی پەیمانەکە و ناردنی چەند پاپۆرێکی گەورە، لە ٢٠ی مانگی مەیدا دەستووری دا کە هێزی دەریایی بە تەنیایی هەڵمەتبەرێ و لە ئاکامدا بە دەس پیاوانی میرمەهنا تووشی شکستێکی مەینەتبار بوونەوە. پاشان بە بیانووی ئەوەی کە قۆشەنی زەند بە مەبەستی

79- BP XXIX, 31 January 8 and 11 September, 5 November 1767; ANP, B1. 175, 20 May, 9 October 1767; Amin, 95.
80- BP XXX, 6 and 17 November 1767; XXXI, 23 April 1768; Amin, 95 – 96.

کەلکوەرگرتن لە گەمییەکان نەهاتوون، نە تەنیا ئێسکیپی بانگهێشتەوە و لە سەر کاری لادا، بەڵکوو لە کۆتایی مانگی جوولای‌دا فەرمانی دا کە هێزەکەش بگەڕێتەوە بەمبەئی. لە ئاکامی ئەم هەنگاوەدا وەختایەک کە زەکی‌خان دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕووداوە بەخۆی و هێزەکانی داوەری، تەماشای کرد کە هیچ پاپۆڕێک لە گۆڕێ‌دا نیە و پەیوەندی ئێران و ئینگلیس تەنانەت لە ساڵی پێشووش پتر شێوا[٨١].

داڕووخانی میرمەهنا کە لە سەرەتای ساڵی ١٧٦٩دا بە هۆی کۆدەتایەک لە خارک ڕووی دا، دوایین کۆپلەی ئەم شانۆ خەمووڕووژێنەی خێراتر کرد. کارگێڕانی کۆمپانیا لە بووشێهر کە دەیانزانی موورە بەرەوڕووی ناڕەزامەندی پتری ئێرانییەکان دەبێتەوە بە ڕاوێژ و بەرژەوەندی ئەو ڕایانکردە بەسرە. ئێستا موورە داوای لە «حەسەنسوڵتان»ی فەرماندەی تازەی خارک دەکرد کە دوڕگە بخاتە ژێر باڵی پاراستنی هێزەکانی بریتانیایی و نیوەی گەمییەکانی میرمەهنا بداتە دەس ئەوان. موورە تەنانەت زەکی‌خانی بە ملهوڕی تۆمەتبار کرد و حەسەنسوڵتانیش بەڕواڵەت جغەی دەرکرد و هاتە سەر شەڕکردن و موورە بەناچار گەڕایەوە بەسرە. ڕاست لەم ڕۆژانەدا سەربازانی زەند لە خارک دابەزین[٨٢].

کەمتر لە شەش ساڵ پاش ژیانەوەی توجارەت لە بەندەری بەسرە و دەس بەکار بوون لە بووشێهر، کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی بەپێچەوانەی تەواوی ئەو گفتانەی کە سەبارەت بە سەرکەوتنەکانی خۆی دابوونی، لە حاڵێکا لە سەرزەوی سەرەکی ئەم وڵاتەدا جگە لە بەدگومانی و دڕدۆنگی قووڵی ئێرانییان هیچی دیکەی وەدەس نەهێنابوو، بەناچار ئەو ئاو و خاکەی بەجێهێشت. لە بەسرە بەرەوڕووی خەرجوبەرجی قورس و گرانی شەڕی مەینەتبار لەگەڵ بنی‌کەعب بوونەوە و لە توجارەتا رووبەڕووی سەرسووتان هاتن. نێوانیان لەتەک حوکمڕانی بەسرە پتر لە ڕابردوو گرژتر بوو. موورە

81- BP XXXI, 7 July, 7 and 9 September 1768; XXXII, 24 April 1769; ANP, B1. 175, 4 July, 12 August 1768; Amin, 99.
82- BP XXXII, 21 and 22 March 1769; Carmelits, 669; ANP B1, 175, 4 June, 8 July, 12 August 1768; Amin, 99.

لەبەر دۆڕاندنی پێگەی بووشێهر و نیازپاکی وەکیل، لــە لایــەن بەڕێوەبــەرانی کۆمپانیاوە لە بەمبەئی کەوتە بەر ڕەخنە، بەڵام زۆر ســەیر بــوو چونکــە هــەتا شەشمانگی دیکەش لە سەر کار لایان نەدا تا بتوانــن لــە گەمــە سیاســییەکانی گەمارۆی بەسرەدا خۆی بنوێنن[٨٣].

گۆیــا هۆکــاری لێنــەخرانی دەگەڕایــەوە ســەر پشــتیوانی ئــەخلاقیی بەڕێوەبەرانی لە سیاســەتەکانی. ئەمانــە وەک چەشــنێک کۆســپ و تەنگــەژە دەیانڕوانییە ئیزن و مۆڵەتی یاسایی ناردنەدەرەوەی سکە لە لایەن کەریمخانەوە و بە مەبەستێکی ناپێویستیان دەزانی. خۆڕاگری شــەپۆلی بــاوەڕ و متمانــە کــە پاش سەرکەوتن لە شەڕێکی حەوتساڵەدا وەدەس هاتبوو، هەروەها وەرگــرتنی داهاتی پیتاکی تازە (وەرگرتنی پیتاکی چەندین پارێزگای هیندی) وای کردبوو کە بەڕێوەبەران پتر سەریان لە کێشە بخورێ و بەرپرسایەتی زیــاتر لــە کەنــداوی فارس بخەنە ئەستۆیان. بەڕێوەبــەرانی لەنــدەن بــە چــاوی پرمغابەتــەوە لــە نەوی‌کێشانی بەمبەئییان دەڕوانی و مووورەیان سەبارەت بە ئاکارەکــانی لەگــەڵ پاشا و وەکیل بە حــەق دەزانی و دنــەیان دەدا و داوایــان لێــدەکرد کــە لەتــەک ئەوانیشا وەک «ڕاجە»کانی گەنــدەڵ و لاوازی هینــدی بجووڵــێتەوە. بــەڵام لــە کۆتایی ساڵی ١٧٦٩دا تەوژمە ورووژاوەکان بە شــێوەیەکی بــەرچاو لــە هــەموو لایەکــەوە کــەم بوونــەوە: کۆمپانیــای هینــدی ڕۆژهــەڵاتی پــەیمانێکی لەگــەڵ حەیدەرعەلیخانی دەکەنی بەست. مەرگی شــێخسلێمانی کــەعبی و میرمــەهنا ئاشتی لە بەشی سەرووی کەنداوا بە دیاری هێنا. جێگۆڕکەی کاتی میربەنــدەری پڕکێش نێوانی موورە و پاشای خۆش کردەوە. بۆیە بەرپرســان و بەڕێوەبــەران جڵەوی هەڵومەرجی پەرێشان و پرسووکایەتی کاروباریان لــە کەنــداوی فــارس بەردا هەتا هەموو تەقەلاکانیان لە لایەن کۆمپانیاوە لە بەمبەئی چڕ بکەنــەوە و تانوپۆی کاران لە بەسرە بخەنە سەریەک[٨٤].

## ١٥ ـ ٦ کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی: ( ١٧٦٩ ـ ١٧٧٩)

سەرەڕای پێداگری سەرکەوتووانەی موورە سەبارەت بەوەی کــە بەســرە

83- BP XXXII, 24 April 1769; FR XVI, 1009; Amin, 100.
84- FR XVI, Private NO. 12; cf. Amin, 96, 98.

بەندەرێکی بڕەودارە بۆ فرۆشی بەرهەم و قوماشی پەشم، شەریکە لە خۆی ڕانەدەبینی هیچ هەنگاوێک باوێژێ. ئەو لێژنەیەی کە بە مەبەستی هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەی ئەم بابەتە پێکهاتبوو ڕاپۆرتی دا کە هێشتاش بووشێهر خودبەخود باشترین بازاڕی کۆمپانیایە، چونکە قوماشی پەشم-خواهان و کڕیاری لە ئێران زۆر زیاترە لە چاو ئێراق و لە لایەکی دیکەوە ئەو هێندە ئاوریشمە خاوەی کە وەک بەرهەم و داهاتی پارێزگای گیلان دەدرایە دەستی وەکیل و ئەویش ئامادە بوو ئاڵوویری پێبکا، بە شێوەیەکی بەرچاو پەسند بوو[٨٥]. سەرەنجام دەرکەوت کە کەریمخان پێیخۆشە تا کۆمپانیا لانیکەم سەرلەنوێ توجارەتخانەکەی لە بووشێهر دابنێتەوە. لە ١٠ی مانگی ئاگۆستی ساڵی ١٧٦٩دا مووره لە لایەن شێخنەسرەوە کە لە شیراز بوو نامەیەکی پێگەیشت. ناوبراو لەم نووسراوەیەدا بەئاشکرا ڕوونی کردبۆوە کە وەکیل هەموو ڕووداوەکانی ڕابردووی لە بیر خۆی بردۆتەوە و پێشوازی لە دانانەوەی توجارەتخانە دەکاتەوە. مووره زۆر بە ڕێزەوە بەڵام بە سەرساردی وڵامی دایەوە کە کۆمپانیا تەنیا وەختایەک لەم بارەوە دەکەوێتە خۆ کە خودی وەکیل نامەیەکیان بۆ بنووسێ و ئامادە بێ کە قەرەبووی خەسارەتی ماڵ و دارایی تێداچووی کۆمپانیا بگرێتە ئەستۆی. شێخنەسر لە ساڵی ١٧٧٠دا نامەیەکی دیکەی نارد کە بوو بە هۆی ڕازی بوونی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی، بەڵام هەڵبەت مووره پێی قایل نەبوو و کۆمپانیا ئاوای نووسی: «وا وێدەچێ کە ئێرانییەکان زۆریان مەیل لە گەڕانەوەی ئێمەیە بۆ وڵاتەکەیان و نابێ هێندە دڕدۆنگ بین.» ئەو کات دەستووریان دا بە مووره کە یەکێک لە کارمەندەکانی بە ناوی «موورلی» وەک باڵوێز بنێرێتە شیراز[٨٦].

مووره بە کەللەڕەقی دژی ئەم هەنگاوانەی توێژینەوەیان لە سەر کرابوو ڕاوەستا. بۆ ئەم مەبەستە کای کۆنی بە با دەکرد و دەگەڕایەوە سەر یەکەمین بۆچوونەکانی کەریمخان لە سەردەمی ئێسکیبدا و دەیگوت قسەکانی لە ئێمەی ڕوون کردەوە کە وەکیل خوازیاری ئاڵوویری بازرگانی نیە لەگەڵمان، چونکە دەڵێ چوونەدەری سکە دەبێتە هۆی هەژاری وڵاتەکەی. پاشان ناڕەزامەندانە

85- BP XXXII, 31 October, 10 November 1769; Amin, 101.
86- Carmelites, 670; FR XVI, 1009.

ڕایگەیاند کە دوو باڵوێزی نێردراوی پێشوو ١٠هەزار ڕووپییەیان خەرج کردووە و ئەمجارەشیان ٢٠هەزار ڕووپییە پتر خەرج دەبێ و ئەگەر بێتوو گفتوگۆکان سەرکەوتوو نەبن لە شان و شکۆیان کەم دەبێتەوە و لە لایەکیشەوە لەبەر وەرزی گەرما سەفەر نالەبارە و سەرەنجامیش دەستی لەم بیانووتاشینانە هەڵگرت و دەقودۆغر گوتی کە ڕازییە بە کارکردن لەگەڵ ترکان لە بەسرە و بە بۆچوونی وی کەریمخان فەرمانڕەوایەکی زاڵمی پەیمانشکێنە و ئەگەریش خۆی داوەتە وتووێژ تەنیا بۆ ئەوەیەتی کە جەماوەری نزم و هەژاری داهاتێکیان وەگیرکەوێ و چاچنۆکی و بەرزەدەماخی خۆی بسەپێنێ[87].

ئەگەرچی شێخنەسری بووشێهری و حەسەنخانی بەندەرڕیگی دەستیان لە نووسینی نامە و داخوازی دۆستانەیان هەڵنەگرت، بەلام وەکیل خۆی لە نووسینی نامە پاراست. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٧٢دا حەسەنخان کوژرا و میرعەلی کە وازی هێنابوو لە دۆستایەتی دزانی دەریایی و کەریمخان لێی خۆش بوو، جێی گرتەوە. گەمێی بازرگانی «بریتانیا»ی کەوتە دەست و و ئەو ڕاسپێراوەکەی کە بۆ بردنەوەی گەمییەکە نێردرابوویە شیراز بە نالەباری لەگەڵی جوولایەوە و لە بووشێهر دەریکرد. بەلام هەرچۆنێک بێ وەکیل تەواو ئۆبالی بۆ کردەوەی میرعەلی کێشا[88].

سەرەنجام وەختایەک لە ئاوریلی ساڵی ١٧٧٣دا تاعوون گەیشتە بەسرە، موورە و دوازدەکەس لە کارمەندەکانی سواری دوو گەمی بوون. یەکیان گەمییەکی چواردەتۆپە بوو بە ناوی «دریک» و ئەوی تریش یەکێکی هەشتتۆپە بە ناوی «تایگێر». پاشان بەم گەمییانە بەرەو بەمبەئی کەوتنەڕێ. کاتێک لە ٢٦ی ئاوریلا لە بەندەرڕیگەوە تێدەپەڕین سێ پاپۆڕی شەڕکەر لێیان وەدەرکەوتن و گەمێی «تایگێر»یان گرت. گەمێی دریک ڕایکرد و زۆرێک لە مەلەوانانی تایگێر خۆیان خستە دەریاوە. گەمی بەخەنیمەتگیراو لە بەندەرڕیگ لە لیتە چەقی و دووکەس لە کارمەندانی کۆمپانیایان بردە بەندەر. ئەم دووە ناویان «بیومێنت» و «گرین» بوو کە بە مەبەستی دەسپێکردنەوەی کاروباری بازرگانی کۆمپانیا لە بووشێهر نێردرانە شیراز. ئەگەرچی کەریمخان سەعاتەکەی لە گرین ئەستاند

87- FR XVI,1016, 1021 (extracts from Basra Diary, dated 14 and 20 May 1770).
88- FR XVI, 1074 (20 March, 2 August 1772); SP 97/94 (1771), 213b.

بەلام ئەم دووکەسە لە شیراز هیچ بەڵگەیەکیان بۆ دەربڕینی ناڕەزامەندی بە دەستەوە نەبوو و دەیانتوانی بۆ پیاسە کردن بڕونە دەرەوەی پایتەخت. ڕۆژێ حەوت رووپییەیان بۆ بڕایەوە و شەرابێکی زۆریشیان خرابوویە بەردەس. ساڵی داهاتوو بە کەیخودایەتی و نێوبژیوانی شێخنەسر لە بووشێهر ئازادیان کردن. شێخ لەو کاتەدا کە گفتوگۆکان لەگەڵ کۆمپانیا بەرەوپێش دەچوو زور بە وردی پارێزگاری لەم دوو کەسە دەکرد. هەروەها کەریمخان ئیزنی دا کە ئەم هەلە ڕەخساوە لە دەس نەدا و گەمێی «تایگێر» ئامادە بکا بۆ چوونە نێو پەلەپاپۆڕی کەنگان کە لە زستانی ئەوساڵەدا بۆ ئامانجەکانی شەڕی زەکیخان لە عومان و هێرشی داهاتوو بۆ بەسرە تەیار ببوو[٨٩].

مووره و کارمەندانی تەنانەت وەختایەک کە گەیشتنە بەمبەئی ئیزنی دابەزینیان لە بەستێن پێنەدان، چونکە لەوە دەترسان کە تاعوونیان لەگەڵ خۆیان هێنابێ. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٧٧٤دا کە تاعوون ڕۆمرکابوو گەڕانەوە بەسرە. مووره سەرەتا بە ناوی نوێنەرایەتی بریتانیاوە نامەیەکی بۆ کەریمخان نارد و خۆشی نامەیەکی نەرمتر لەوەی بەدڵ پێیخۆش بوو بۆ کەریمخانی نووسی و دیسانیش داوای کرد کە گەمی و زیندانییەکانی بۆ بنێرنەوە و دەسدرێژیکاران تەمێ بکرێن و مەرجەکانی پێویست بۆ داگیرساندنی پەیوەندی بازرگانی ڕابگەیەنێ. بیومێنت و گرین لە ٥ی مانگی جوولایدا لە نامەیەکا بۆ موورەیان نووسی کە وەکیل بە گەیشتنی نامەکەی گەشاوەتەوە، بەلام هەڵبەت وەک لایەنی مامەڵە داخوازێکی هەیە و دەیهەوێ دەوڵەتی بریتانیا لە چالاکی دژی شێخعەبدوڵلا بنیموعین لە دورگەی هۆرمز یاریدەی بدا و هێزی دەریایی بنێرێتە هانای. مووره کە هێشتاش شکستی خارکی لە بیر مابوو بۆ بەمبەئی نووسی و پێیداگرت کە ڕەزامەندی لە سەر ئەم داخوازە دەرنەبڕن.

ولامی گەلالەی چاوەڕوانکراو لە مانگی فێوریەدا هاتەوە و زۆر بەرێزەوە داخوازەکەی وەکیل قبووڵ نەکرابوو. وتووێژەکان لە ماوەی ساڵی داهاتووشدا قۆرتیان تێکەوت. ئەگەرچی گرین ئازاد کرا بەلام مووره بنکەی

89- FR XVII, 1053, 1071; Parsons, 183 – 185, Lorimer,144; Wilson,183; Amin, 111.

بازرگانی لە بەسرە کردەوە و بیست مەن ئاوریشمی خاوی وەک چێشتەی بازرگانی لە ئێران کڕی[٩٠]، بەڵام کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی تازە حازر نەبوو لە بووشێهر کار بکا. لە لەندەن و بەمبەئی بارودۆخی سیاسی کۆمپانیا تووشی ئاڵوگۆڕێک ببوو، چونکە شەڕی ڕووسیا و عوسمانی لە ساڵانی ١٧٦٨ ـ ١٧٧٤دا وای کرد کە دەوڵەتی عوسمانی لەم قۆناخە پڕ بەهرەیەدا کە کۆمپانیا تێدەکۆشا ناوەندی کار و چالاکی بازرگانی کەنداوی فارس لە بەسرە چڕ بکاتەوە، لەم ڕەوگەیە بترازێ و بکەوێتە سەرباری کڕینی کەرەسە و کەلوپەلی وڵاتی هیندووستان. تاعوونی ساڵی ١٧٧٣ زەبرێکی قورسی دیکەی لە کاری بەندەر وەشاند. سەرەڕای ئەم مەسەلەیەش کۆمپانیا لە هیندووستان لە کاروباری دارایی و هەل و هەلکەوتەکانی سیاسیدا تووشی گەشە و نەشەیەکی بێوێنە هاتبوو کە لە ساڵی ١٧٧٣دا دەسپێکردنی کاری ڕێکوپێک پێویستی دەنواند. کەوایە سازکردن و بنیاتنانی چەند بنکە و ناوەندێک لە بەستێنەکانی خاکی ئێران گرینگایەتییەکی ئەوتۆی نەبوو کە وەک سەنگ و پارسەنگێک حیسابی بۆ بکرێ. مووره سەبارەت بەوەی کە توانیبووی مەبەستەکە لە کۆبوونەوەی بەڕێوەبەراندا بێنێتەگۆڕ خۆشحاڵ بوو، چونکە بە بڕوای ئەو لێکدانەوەی خۆپرستانەی زیندانییانی ئینگلیسی کە لایان وایە توجارەتی کۆمپانیا لە بووشێهر سەرکەوتوو دەبێ، هەر بۆ قوتاربوون و ڕەوینی گرفتی خۆیانە[٩١].

بەختەوەرانە نوێنەرایەتی بەمبەئی، سەرەڕای پێناخۆشبوونی مووره لە لەندەنەوە چەند دەستوورێکی ڕاستەوخۆی پێگەیشت کە پێویستە و دەبێ لە ڕۆژی ٧ی مانگی ئاوریلی ساڵی ١٧٧٥دا یەکێک لە کارگێرانی شەریکە بە ناوی گاردێن بە مەبەستی دانانی ناوەندێکی تازە بنێرنە بەندەر و بۆ دەسپێکی وتووێژەکانیش ئازادکردنی دووکەسەی ئینگلیسی بە دیل گیراو نەکەنە پێشمەرج. لەم کاتەدا دەورەدرانی بەسرە تازە دەستی پێکردبوو و مووره و کارمەندانی حەوتەیەک دوای گەمارۆ پێیان نایە بووشێهر. پاش ڕاکردنی لەپڕیان لە بەندەری ئاڵقەدراو، تێگەیشتن کە وتووێژ هەر خودبەخود کۆتایی پێهاتووە و بەپێچەوانەی ڕەخنەی بەردەوامی مووره، گاردێن و سەرۆکانی

---

90- FR XVII, 1061, 1063, 1065, 1071, 1078; Parsons, 185; Amin, 111.
91- FR XVII, 1072, 1074; Amin, 107 – 109, 111, 112.

هێشتاش هەر لە سەر بیروبۆچوونی شەش ساڵ لێرەوبەری خۆیان سوورن کە دەڵێ: «ئەگەرچی بارودۆخ نالەبارە، بەڵام هێشتاش کاروباری ئێمە لە کەنداوی فارس دەگەڕێتەوە سەر پێشبینی سەنگوسووک نەکراوی ئەو چالاکییەی کە نوێنەرمان دژی کەریمخان نواندوویەتی.»

چۆنیەتی ئەم نەسازانەی کە لایەنی بەرامبەریش هەیەتی لە نامەی ڕێکەوتی ٢٤ی ئاوریلی وەکیلا کە تێیا دەستووری ئازادی دیلەکان و دانەوەی گەمێی «تایگێر»ی دابوو، دەردەکەوێ. لەم نامەیەدا بە سەرساردی ویستبووی کە بزانێ داخوا دامەزراوەی بازرگانی ئێمە دووبارە لە بووشێهر دەس بەکار دەبێتەوە یان نا؟ بە ئاشکراش نووسیبووی کە «هیچ دوژمنایەتییەکی لەگەڵ بریتانیا نیە و تەنیا لەگەڵ نوێنەرەکەی ناحاویتەوە.» ڕۆژێک دواتر بیومێنت لە بووشێهر ئاڵای کۆمپانیای لە سەر بینای توجارەتخانەی ژمارە ٢ هەڵدا[٩٢].

گەمارۆی بەسرە بۆ گەیشتنە ئامانجەکانیان هیچ شوێنێکی دانەنا. بەگوێرەی نووسینی پارسۆنێز کەریمخان بەئاشکرا سوێندی خوارد کە یەکێک لە هۆکارەکانی هێرش بۆ سەر بەسرە، تۆڵە کردنەوە بووە لە مووره. پاش ڕۆیشتنی مووره لە بەسرە، وەکیل ئەوپەڕی ڕەزامەندی خۆی بە گاردێن ڕاگەیاند. گاردێن تێگەیبوو کە ئەگەر بێتوو ئێرانییەکان بە سەر بەسرەدا زاڵ بن و بیگرن، کۆمپانیا لەتەرکێن هیچ بنکەیەکی نابێ مەگین ئەوەی لەپێشدا لەگەڵ ئێرانییەکان بگاتە ڕێککەوتنێکی دۆستانە[٩٣]. وێڕای ئەمەش لە ١٤ی مانگی مەیدا سادقخان بە فەرمانێک ڕایگەیاند کە ئەگەر بێتوو شار بگیرێ گیان و ماڵی کاربەدەستانی شەریکە لەوێ دەستەبەر دەکا و بەپێچەوانەی تالان و بڕۆی ماڵ و سامانی جەماوەری شاری داگیرکراو، ئەم فەرمانە لە جێی خۆیا چاکی جێگرت.

مووره لە ڕووی ئەو زانیارییانەی کە گەیبوونە دەستی خۆی لە هاتنی بەسرە پاراست و لە سەردەمانی داگیرکرانی ئەم بەندەرەدا بە دەس هێزەکانی زەند، ئابراهام و لاتووشە بریکاری بوون. ئەمانە لە هاوینی ساڵی ١٧٧٧دا گازندەیان دەکرد کە بەپێچەوانەی ئەو قەرار و فەرمانانەی دەرچوون هێشتاش ناچارن ٣٪ پیتاکی باوی سەردەمی دەسەڵاتی ترکان بدەن. گەمارۆ بە تەنینەوەی

92- FR XVII, 1089; Amin, 113 – 114.

93- Parsons, 185, 198; FR XVII, 1095; Amin, 114 – 115.

تاعوون و ئەو خەسارەتانەی شالاوەکانی بنیکەعب و مونتەفیق تووشیان دەکرد گەیشتە ئەوپەڕی نالەباری خۆی و ئاخرین زەبری داهێنایە بازرگانانی بەسرە و بە مردنی وەکیل لە ساڵی ١٧٧٩دا تەواوی ئومێدەکان بۆ گەشە و سەقامگیربوونی توجارەت لەم شارەدا یەکسەرە با بردی. لێرە بە دوا تەنیا هۆی مانەوەی کۆمپانیا و بوونی بنکەیەکی لەوێ بەخاتری لێکۆڵینەوە سەبارەت بە ڕێوبانی ویشکانی هەتا ئەو وەختەی کە مەترسی لەنەکاوی هەڵگیرسانی شەڕ لەگەڵ فەرانسە لەگۆڕێدابوو پێویستی دەنواند. سەرەنجام ئەم ئامانجە بە چڕبوونەوەی توجارەتی ناوچەی سەرووی کەنداو لە کووەیت وەدیهات. توجارەتخانەی نوێی بووشێهریش ساڵبەساڵ ڕووی کردە نوشستی و تەنانەت بەر لە مردنی کەریمخان بڕیار درابوو کە کارگێڕانی دانیشتووی وێندەرێ کەم بکەنەوە و تەنیا کەسێکی لێبهێڵنەوە. لە ناوچەی خوارووی کەنداو توجارەتی بەندەرعەباس و مەسقەت هەروا بەرقەرار بوو. لەم بارەوە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی و بازرگانانی کەرتی تایبەتی سەر بەو شەریکەیە دەبوو تەواوی تەقەلای خۆیان بخەنە گەڕ بە مەبەستی زیندووکردنەوەی پەیمانێکی مردوو[94].

هەڵبەت ئەم بارودۆخە ـ بۆ توجارەتی ناوخۆی وڵات ـ هەڵنەدەسووڕا؛ گەمیوانی لێواری بەستێنیان لە بەندەرێکەوە بۆ بەندەرێکی دی، هەڵگرتن و گواستنەوەی شتوومەک بە سواری پاپۆڕان و بازرگانی لەڕێی ئۆقیانووسەوە بە گەمێیباتاژۆ لەچاو ئەو ئاڵوگۆڕە سیاسییانەی کە لە بەستێن ڕوویان دابوو گۆڕانێکی کەمتری بە سەر هاتبوو. بەڵام لە تەواوی ئەم ماوەیەدا چ لە ئێران و چ لە بەسرە بەختی شەریکە تا ڕادەیەک پێکەوە گرێدرابوو و دەگەڕایەوە سەر ڕێبازی سیاسی و بەڕێوەبەرایەتی و شێوەی کاری کەریمخان. وەکیل لە دیداری لەگەڵ بازرگانان و باڵوێزان زیاتر بانگەشەی «فرانکلین»ی سوور دەکردەوە کە «سەبارەت بە غەواران بەتایبەت ئوروپاییەکان بە شێوەیەکی ئاشکرا مێهرەبان و خۆشئەخلاقە و قەت ناهێڵێ کە هیچکامیان بێ ئەوەی بیانلاوێنێتەوە و ڕووحی جوامێرانەی خۆیان پێ بنوێنێ لە ئێران دەرکەون[95].» ئاکار و جووڵانەوەی لەگەڵ کارمەندانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی بەپێچەوانەی

94- FR XVII, 1143; Sestini, 206 – 207.
95- Francklin, 307.

سەرسوڕمانی مووره هەرگیز ناکرێ وەک ڕەوتێکی زاڵمانه یان لە ڕووی مەیل و کەیفەوە داوەری لە سەر بکرێ. کەریمخان و ڕاوێژکارانی وەختایەک کە هەوڵیان دەدا بۆ گەشەی باری بازرگانی لەبەر پەیوەندی توجارەتی و هاتنی گەڕۆکی وەک نیبوور و هەروەها وتوویژی ڕاستەوخۆ لەگەڵ نێردراوانی حەیدەرعەلیخان ناشێ کە سەبارەت بە تێگەیشتن لە ئامانجە ئەمپریالیستییەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی بێگانه بووبن[96]. سیاسەتی وی بەپێی ڕێسا لەگەڵ ڕێبازی سیاسی سەفەوییە و نادرشا یەکتری دەخوێندەوە، واتە دەیهەویست کەلک لە تێکنۆلۆژی پێشکەوتووی ئورووپاییەکان وەربگرێ بەلام لە خۆیان نیزیک نەکاتەوە. مەسەلەی

---

96- Reise, 104.

ڕۆستەموتتەواریخ نەقڵێکی سەیر و خۆش سەبارەت بە نێوانی ئینگلیسییەکان و وەکیل لە لاپەڕە ٣٨٦ ـ ٣٩٠دا دەگێڕێتەوە و ڕەنگە لەو دەستە چیرۆکانە بێ کە هەودای باریکی ڕاستەقینەشی تێوەدرابێ. گۆیا وەکیل بالوێزی فەرەنگی بە چاوی سووکەوە وەردەگرێ و بە گێڕانی زنجیرەیەک شانۆ لە لایەن دەرباریانی تەڕدەست و بەهێزی شوێنی لە سەر دادەنێ. بۆ وێنە وشترێک بە شمشێر دوولەت دەکەن و لوولەی تفەنگ بە ئەژنۆ دەشکێنن. ڕۆژێکی خان یەکێک لە غولامەکانی نارد تا گەمێیەکی فەرەنگی بکڕێ، کابرا چوو گەمیوانی کوشت و کالاکانی هێنایە بەستێن. دوابەدوای ئەو قوشەنێکی بێئەژماری فەرەنگ بۆ گرتنی ئێران کەوتەڕێ و کەریمخان بە ڕاسپاردەی ئاغامحەممەدخانی قاجار خەلات و فەرمانێکی بۆ میرمەهنا نارد هەتا خاشەی ئەوانە بکێشێ. یاغی بەخشرا و ٣٠٠چارشێوی بە سەر ٣٠٠کەس لە پیاوکوژانی هەڵکێشا و هەریەکەی دەمانچە و تفەنگێکی پلێتەیی خستە ژێر بالیان و بە سواری گەمی هێنانی بۆ بەندەرعەباس. فەرەنگییەکان ئەم بارە دڵبزوێنەیان لە دووربینانەوە بینی و دەرگای قەلایان بۆکردنەوە و ئەو کات هەموویان قەلتوبڕکران. هاونیشتمانیان لە هیندووستان پێیانزانی و کەوتنە سەر تۆلەئەستاندنەوە، بەلام وەختایەک تێگەیشتن بێتوو شەڕ بقەومێ هیندی پشتی ئێرانییەکان دەگرن، پاشگەز بوونەوە. لە نێوەرۆکی ئەم داستانەدا ـ کە هەروەک یەکێک لە وتە پووچەڵەکانی کامووسی ڕێزدار مووره لێکدەدرێتەوە ـ دەکرێ چەند تیشکەیەک لە بیرەوەری شاندی ئێسکیپ و ڕووداوی گەمێی تایگێر و شەڕی کەعبییەکان و گرتنی هولەندییەکان لە خارک بە دەس میرمەهنا و بالوێزانی حەیدەرعەلیخان بناسرێنەوە.

پەیوەندییەکان و تێکەڵاویتی زیاتر دەبوو درابایە دەس وەچەی داهاتوو.

## ١٥ ـ ٧ کۆمپانیای هولەندی و فەرانسەوی

پارێزرانی بەرژەوەندییەکانی فەرانسە لە هیندووستان کە مانەوەی لە هەرێمی رۆژهەلات و کەنداو بە پێویست دادەنا، پتر دەیهەویست کە وریای رەوگەی هاتوچۆی راستەوخۆی بێ بۆ هیند و نیشانی دا کە هیچ مەیلی لە کەڵەوەکێشی و کێبەرکێی بازرگانی نیە لەگەڵ ئینگلیس و هولەند لە کەنداوی فارس و بۆیە حازر نەبوو کە هیچ پەیمان و پەیوەندییەکی بازرگانی یان سیاسی لەگەڵ وەکیل ببەستێ و دامەزرێنێ. راسپێراویتی گرینگی سیاسی خۆیان لەم کارانە پێ سەرتر بوو، واتە گەورەباڵوێزی فەرانسە لە ئیستانبووڵ هەر ئەوەندە وریای ئێرانییەکان و کۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتی بوو کە بتوانن هاوکاری خودبەخودی عوسمانی بە مەبەستی راگرتنی هاوسەنگییەک لە ئورووپا بپارێزن.

لە ساڵی ١٧٤٨دا دوای ئەوەی کە مووچە و مانگانەی قۆنسوولی فەرانسە لە بەغدا بۆ ماوەی دوو ساڵان لە «پۆندیشیری»را نەنێردرا، سەرەنجام دەستی لە کارەکەی بەردا. لە ماوەی ئەم دەساڵەی دواییدا قۆنسوول جێگۆرکەی پێنەکرابوو. کاروباری قۆنسوولخانە و کۆمپانیا وێکرا لە لایەن «ئیمانۆئێل بالیت»ەوە بەرێوەدەچوو. ناوبراو قەشەی کلیسای کرێملی بابل بوو. لە ساڵی ١٧٥٤دا بە مەبەستی دانانەوەی نوێنەرایەتی کۆمپانیا پاش پێشکەوتێکی کەمتاکورت لە بەندەرعەباس کە لە ساڵی ١٧٢٥را رەنگ و برەوی نەمابوو، کەوتنەخۆ. کەسێک بە ناوی «پێترۆ پێدریۆ» وەک نوێنەری کۆمپانیا نێردرا و لە ماوەی چەند ساڵاندا رێگای گەشە و برەوی بازرگانی فەرانسەی لە کەنداوی فارس خۆش کرد[97].

سەرەرای هەوڵ و هەڵسوورانەکانی پێدریۆ و جێنشینەکانی بە مەبەستی راماڵینی ئەو گرێ و کۆسپانەی لەبەر بێمەیلی سەرۆکەکانیان بەدیهاتبوون، دیسانیش سەرنەکەوتن. بۆیە ترکان هەمیشە لە رێورەسم و تەشریفات و

97- ANP, B1, 175, 15 September and throughout October 1754; Masson, 539, 542.

کردەوەدا نوێنەری بریتانیایان وەپێش دەدا، چونکە ناوبراو لەبەر بوونی پەیوەندی بازرگانی پێشکەوتە و سەرمایەی زیاتر دەیتوانی کۆمەڵێک دیاری بدا بە میربەندەر و پاشا و نوێنەری فەرانسە نەیدەتوانی ڕقبەرقەی لەگەڵ بکا[٩٨]. هەربۆیە ئەگەرچی کەریمخان بە چاوی سووک لە ئینگلیسییە لەچەرەکانی دەڕوانی دەسبەکاربوونی فەرانسەوییەکانی تەنانەت وەختایەک بەگەرمە خۆیان دایە کار بە پەتەو دانەنا.

لە ژووەنی ساڵی ١٧٥٨دا کە دوکتۆر «پیرە»ی گەنج و چالاک بە مەبەستی بەڕێوەبردنی قۆنسوولخانەی فەرانسە گەیشتە بەغدا، لەناکاو بۆخۆی ئۆگر بوو بە مەسەلەی توجارەتی بەسرە و ڕەشنووسی گەلاڵەی پەرە و گەشەی بازرگانێتی کەنداوی فارسی ئامادە کرد. لەمانگی مەیدا لەگەڵ پێندریۆ کە بەرەو «پۆندیشیری» بزووتبوو کلاویان تێکهالا و حازر بوو کە خۆی کارەکانی بازرگانی بەسرەش بەڕێوەبەرێ. لە ساڵی ١٧٦٨دا بە دڵخۆشی شاهیدی کۆسپ و تەگەرەی سەررێی پەیوەندییەکانی کەریمخان و موورە بوو، بۆیە کابرایەکی زمانزانی ناردە شیراز هەتا دەربارەی نووسینی قەراردادێک لەگەڵ وەکیل سەبارەت بە ئاڵوویری قوماشی پەشمی فەرانسەوی لەگەڵ ئاوریشمی گیلان بکەوێتە گفتوگۆ و ڕێی وەرگرتنی خاکی ئەم دوڕگەیە و بەهرەوەر بوونی ئەم دەوڵەتە لە خارک خۆش بکا[٩٩].

موورە لەخۆوە لەبەر ئەم ئاڵوگۆڕە ناخافڵە خۆی توورە نەکرد، چونکە لێی سوور بوو کە سەرچاوەی دارایی دەوڵەتی فەرانسە ئەوەندە بڕ ناکا و ئەو کارەی پێڕاناپەڕێ و دەزگاکانی ئەو حکوومەتە ناتوانن پشتیوانی لە ڕێککەوتننامەیەکی ئەوتۆ بکەن. سەرەنجام جارێک ـ هەڵبەت بۆ یەکەم جار ـ لێکدانەوەکەی بە دروست دەرچوو. شێخنەسریش بە دووروودرێژی ئاماژەی بە بیروبۆچوونی ئەو کرد و گوتی کە وەکیل دەیهەوێ بە دەسپێکردنی وتووێژ

---

98- Carmelites, 662; Masson (542);

ئاوا داوەری دەکا: سەبارەت بە گرینگایەتی و سرشتی بازرگانی کەنداوی فارس، زانیاری هەڵە درابوو بە بەڕێوەبەرانی کۆمپانیای فەرانسەوی لە هیندووستان.

99- ANP, B1, 175, 8 June 1758 to 20 June 1768; 15 March 1770.

لەگەڵ فەرانسەوییەکان، دنەی ئینگلیسییەکان بدا بۆ گفتوگۆ و درێژەی کار لە بووشێهر[١٠٠]. هەرچۆنێک بێ بەرپرسی وتووێژی فەرانسەوییەکان بە پەلە ڕەزامەندی دەربڕی کە کۆمپانیای هیندی فەرانسە هەموو ساڵێ بایی دوومیلیۆن کاڵای هەمەڕەنگ بۆ جلوبەرگی لەشکری ئێران بێنێتە ئەم وڵاتە و پارەکەی نیوەی بە نەغد وەربگرێ و نیوەکەی دیکەشی ئاوریشمی گیلان و خوری کرمان بەرێتەدەر؛ وەکیلیش لە بەرامبەر ئەم هەنگاوەدا وەک شوالییەیەک بێباکانە ڕەزامەندی لە سەر وێدانی دوورگەی خارک دەربڕی. لەگەڵ ئەمەشا بەڵێنی دا بە ئینگلیسییەکان کە نە خۆی و نە حەسەنخانی حاکمی کە ئەو بەینانە خارکی لە میرمەهنا ئەستاندبۆوە نایانهەوێ دوورگە بدەنە دەس کەس. کەچی ئەم گرێبەستە لە مانگی دێسامبری ١٧٧٠دا بە فەرمانێک کە لە لایەن وەکیلەوە دەرچوو بە فەرانسەوییەکان ڕاگەیاندرا[١٠١].

دوابەدوای تەقەلایەک کە بە مەبەستی جێبەجێ کردن و بەڕێوەبردنی ئەم خەیاڵە خاوانە دران، پیرە کۆمەڵێک ڕێککەوتننامەی بەرزەفڕانەی هێنایەگۆڕ. بۆ وێنە دەیهەویست لێیگەڕێن کە خودی خۆی بابەتەکە لە پاریس بخاتەڕوو و لیستەیەک لە دیاری گرانبایی کە قەرارە بدرێ بە وەکیل و نیزیکانی باڵادەست و کارگێڕانی، خۆی بینووسێ، بەڵام هیچکام لە داخوازەکانی بۆ نەچووە سەر.

پیرە لە تاعوونی ساڵی ١٧٧٣دا مرد و «ژان فرانسوا گزاویە ڕۆسۆئێ» کە ساڵی ڕابردوو وەک یاریدەدەری هاتبوویە بەسرە کرایە جێنشینی. قەشەی بابل و کارمەندی قۆنسوولخانەشی بە تاعوون مردن و «دۆن مێرۆدۆت»ی جێنشینی هەڵبژاردەی بەر لە چوونەدەر لە ئێران بە نامەیەکی نارەسمی پێشنیاری بە وەزیر کرد کە ئەوان دەتوانن لە ئۆگری مسۆگەری کەریمخان سەبارەت بە قوماشی پەشمی فەرانسەوی کەلک وەربگرن؛ بەڵام سەرەنجام بەرلەوەی ئەم قەشەیە بگاتە بەغدا کەریمخان مرد. ڕۆسۆ هەوڵی دا کە بەر لە گیرانی بەسرە بچێتە دیداری کەریمخان و تەنانەت بۆ چوونە شیراز و گفتوگۆ دەربارەی

100- FR XVI, 1009 (16 July 1768), 1016 (16 March 1770).
101- ANP, B1, 175, 8 September to 19 Desemer 1770.

بەستنی پەیمانێک بانگهێشتن کرا. بەڵام تەواوی ئەم کۆششانە لەبەر بێ‌مەیلی سەرۆکانی و شەپۆلی پاشاگەردانی کە سێبەری خستە سەر ئێران بەزایە چوون[١٠٢].

زۆربەی کارە نائاسایی‌یەکانی کۆمپانیای هولەندی لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی وەکیلا بۆ وێنە داگیرکردنی خارک و دەرکرانیان بە دەس میرمەهنا لە بەشەکانی پێشوودا خرانە ڕوو. لەو ڕۆژگاری‌دا دامودەزگای بازرگانی خۆیان لە بەرامبەر بریتانیای ڕەقیبیان‌دا لە بەندەرعەباس دانا. ئەم کۆمپانیایە لە سەرەتادا توانی بە سەر کاری بازرگانی کەنداوی فارسا زاڵ بێ، بەڵام هەر ماوەیەک دواتر کەوتە ژێر سێبەری بریتانیای ڕقەبەری. لە مانگی سەفەری ١١٦٨ی کۆچی / ژانوییەی ١٧٥٤ی زایینی‌دا، فەرمانی سەلماندنی ئیمتیازی کاروباری بازرگانی ئەم شەریکەیە لە لایەن عادڵشاوە دەرچوو. برایم‌میرزا و شاروخ‌میرزا لە ئاگۆست و ئۆکتۆبری ئەوساڵەدا هەرکام فەرمانێکی ئەوتۆیان نارد. ئەگەری قازانجی باش دۆخەکەی شڵەژاند و دنەی ئەو بازرگانانەی دا کە لە سێ‌ساڵی ڕابردوودا شاهیدی توانەوەی خێرای توجارەتیان بوون[١٠٣]. بازرگانی بەسرە و بووشێهریش چی‌وا لەوێ چاکتر نەبوو، بۆیە «لوولد»ی نوێنەری کۆمپانیا بووشێهری جێهێشت. لە ساڵی ١٧٥٣دا بەڕێوەبەرانی شەریکە لە ڕووی ئەم ڕاستییەڕا کە ئەوان لە تەواوی ناوەندەکانی بازرگانییان‌دا کەوتوونە ژێر زوڵم و چەوسانەوە (کە لە ڕووداوی بارۆن نیفووژێن‌دا بە شێوەیەکی مەینەتبار خۆی دەنواند) داوایان لە میرناسری بەندەرڕیگی کرد کە شوێنێکیان بۆ بنکەی بازرگانی لەو بەندەرەدا بۆ دابین بکا (هەڵبەت شوێنەکە بە ئاشکرا دیاری نەکرابوو و ناوی خارکیشیان نەهێنابوو)[١٠٤].

---

102- Ibid, 17 April, 7 September 1771 and adjacent memoires; 1 August 1772, 10 June 1773; Masson, 457, 453.

ژان فرانسوا گزاویە کوڕی ڕۆسۆی «ژێنێف»ی بوو (یەکێک لە ئامۆزاکانی ژان ژاک ڕۆسۆ) ڕۆسۆی ژنێڤی سەعاتسازی شاسولتان‌حوسێن بووە؛ بڕواننە: زنجیرەی میرانی سەفەوی، لۆکهارت، ل ٤٣٣. سەبارەت بە کارەکانی دیکەی بڕواننە: مێژووی زەندیە بە قەڵەمی هیدایەتی.

103- Brieven 2640 (1750); GD,4–97,38;2658(1751),33 – 38 – 93 – 94, 101.

104- Brieven 2696 (1759); Basra 15 – 19; 2716 (1754), Basra, 15, 61 – 70.

نامەکەی شێخ بە زمانی عەرەبی، فارسی، ئەرمەنی نووسرابوو هەتا دڵنیا بێ پەیامەکەی دەگا.

گرتنی خارک و سازکردنی قەڵا و قایمە لە لایەن نیفووژینەوە لەوێ بوو بە هۆی خرانەڕووی داوای زیاتر سەبارەت بە هێمنایەتی و گەشەی داهاتی پتر. جووڵانەوە و چوونە سەری سوودی پاڵوتە لە ١٨٧٧١ «فلۆرن»ەوە لە ماوەی سالانی ١٧٥٥ تا ١٧٥٦ بۆ بڕی ١٦٥٨٠٨ فلۆرن لە ساڵی ١٧٥٨ ـ ١٧٥٩دا بێجگە لە سەرجەمی قازانج لە ماوەی سالانی ١٧٥٣ ـ ١٧٦٠دا سەری گەیشتە ٤١٦٨٥٦ فلۆرن[١٠٥]. ئەم کارە بوو بە هۆی خستنە ڕووی گەلاڵەیەک بە مەبەستی گرتنی بەحرەین و زاڵ بوون بە سەر توجارەتی کەنداوا لە لایەن نیفووژێنەوە و زیاتر کەوتە پێش پێشنیاری هاوچەشنی قۆنسوول یابلوونێسکی یان ئاگێنت مووره و هەر بەو خێراییەش خرایە پشتگوێ[١٠٦]. سەرەنجام وتووێژێکی کورت لەگەڵ کەریمخان ئەنجام درا. خان لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ شیراز لە ساڵی ١٧٦٥دا کەلانتەری جولفای بە ناوی سێرگیس ناردە خارک و داوای لە هولەندییان کرد کە لە پێشدا هێزی دەریایی خۆیان بە مەبەستی یارمەتی دانی سەرکوتی میرمەهنا بنێرن و پاشانیش ئەو ئەرمەنییانەی کە لە خارک بنەجێ بوون بیاننێرنەوە شیراز. گۆیا داوا و ڕاسپاردەی وەکیل گەرم و دۆستانە بووە، بەلام هولەندییەکان هەرتک داواکەیان بردەوە پاش. چەند مانگ دواتر میرمەهنا پاش ڕاکردن و شکان لە بەرامبەر هێزەکانی زەندا، هولەندییەکانی بەزاند و لە خارکی دەرکردن.

بازرگانانی هولەندی بەپێچەوانەی بازرگانی ڕووسی و ئینگلیسی زۆر وەبەردڵی فەرمانڕەوایانی ناوچەیی و خانەخوێیان و ڕەقیبان و شەریکەکانیان نەدەکەوتن و زۆرجاران هاوکاری و ڕێککەوتنیان لەگەڵ ئورووپاییەکان دادەبەزی بۆ نزمترین ئاستی خۆی. هەر دوو تاقم پێکەوە تاوانی لە دەس چوونی هەلە ڕەخساوەکان و ئەو بابەتانەیان دەدا کەوا میراتی پێشداوەری و بوغزاندنەکانیان بوون. ڕووداونووسان و هەواڵدەرانی ئورووپایی ئاشکرایان کردووە کە جگە لە ژمارەیەکی کەم، ئەوانی تر نە سڵەیان دەکرد و نە حازر بە نەوی‌کێشان و خۆ بەکەمگرتن بوون، بەلام بە شێوەیەکی سەرسوڕهێن

105- Brieven 2890 (1762), 322 – 323; 2895 (1762), 1844b – 1846b.
106- Brieven 2756 (1757), Kharg 52 – 53 and enclosed correspondence.

دڵسۆزییان بۆ دەرد و مەرەدی جەماوەری خەڵک دەکرد. ئەگەرچی ئاشنا نەبوون لەگەڵ شێوازی کاری حوکمڕانی خۆجێیی، بەڵام زیرەکانە لە سیاسەتەکانیان دەگەیشتن. بەهەر حاڵ کار و کاسپی دۆستایەتی نەدەزانی، تەناهی و بەرژەوەندییان دەکەوتە پێش ئاڵوگۆڕی بیر و بۆچوونی فەرهەنگی لە ڕێی گەشت و گەڕانەوە. یەکێک لە موسافیرانی ئەم سەروبەندەی هیندی وەک نموونە لە ڕاپۆرتێکا کە ئەفسانەیەکی دورگەی خارک دەگێڕێتەوە ئاوا باسی هەلومەرجی ئورووپاییەکان دەکا: بیست ساڵ پاش ئەوەی هولەندییەکان لە خارک دەرکران، خەڵکی خۆجێیی ڕووداوەکەیان ئاوا پاساو دەدایەوە: هولەندییەکان خۆیان دابوویە بەخێوکردنی بەراز؛ ڕۆژێکی بەراز هەڵبڕا و رووی کردە مەرقەدی مبارەکی حەزرەتی خدر؛ خدری دەرهەڵبووش فەرمانی دا بە میرمەهنا هەتا کافران لە دورگە وەدەر بنێ[١٠٧].

## ١٥ ـ ٨ هیندییەکان و توجارەتی کەنداو

لە لایەن حەیدەرعەلیخانی مەنشوورەوە باڵوێزێک بە کۆمەڵێک دیاری بەقیمەتگرانەوە پێی نایە بارگای کەریمخان و چەند مەبەستێکی سەبارەت بە پتەوکردن و گەشەپێدانی دۆستایەتی نێوانیان پێشکێش کرد؛ شازادەکانی دیکەی هیندی و مەهاراجەکانی هۆزیش سەبارەت بە مەشرووعییەت و دەسەڵاتی حەیدەرعەلیخان ئاگادار بوون[١٠٨]. یەکەمین باڵوێزی حەیدەرعەلیخان لە ساڵی ١١٨٤ی کۆچی / ١٧٧٠ی زایینیدا پێی نایە دەرباری وەکیل لە شیراز. یەکێک لە سەیدە ڕەسەنەکانی ئێرانیشی لەگەڵ بوو. چەندێک دیاری و دوو فیل و بەوەرێک و پڵینگێک و حەمتەرێکیشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو و بۆماوەی دوو مانگان لە دەربار بنەیان داکوتا. لە بەرامبەردا ئێرانیش باڵوێزێکی نارده هیندووستان[١٠٩]. لە هیچ شوێنێک باسی ئامانج لە ناردنی ئەم باڵوێزە نەکراوە، بەڵام وا دیارە دەبێ هەر ئەو باڵوێزە بێ کە بە گوێرەی ڕاپۆرتی بارمتەکانی دەرباری وەکیل

107- Abdul Qadir, 31, 34 (Mir Mohanna is described as the chief of the kab Tribe!)
108- Francklin, 308.

١٠٩ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٦٩ ـ ١٧٠؛ عەبدولقادر، ل ١ ـ ٢. لە ساڵی ١٧٨٦دا دیسانیش چەند باڵوێزێکی نارده ئێران و ئیستانبووڵ.

واتــە ڕێــزداران بیومێنــت و گــرین بــە ئامــانجی دانــەوەی وەڵامــی نێــردراوی حەیدەرعەلیخان سەبارەت بە داخــوازی کردنــەوەی بنکەیــەکی بازرگــانی لــە ڕۆخەکانی ئێران، نێردراوە. حەیدەرعەلیخان پێشــنیاری یارمــەتی دەریــایی و داگیرســاندنی دۆســتایەتی و خزمایــەتی کردبــوو بــە مەبەســتی هاوپشــتی و یــەکگرتوویی. هــەتا ئــەو جێــی ڕوون بۆتــەوە ئــەم پێشــنیارەی دوایــی ڕەت کراوەتەوە، بەڵام وەکیل بەڵێنی دابــوو کــە لــە بەندەرعــەباس ئیــزنی دانــانی بنکەیەکی بازرگانییان بداتێیە"[110].

شەریکەقازانجەکانی بازرگانێتی حەیدەرعەلیخان لەوبەری دەریاکان، لە بەستێنەکانی عەرەبی و کەنداوی فارس ڕوویان لە لایەک بــوو کــە بــای وادە هەڵیکردبوو. بەتایبەت لە ساڵی ١٧٦٥را کــە بــە ســەر «مالابــار»دا ســەرکەوت، هەمیشە نێوانی لەگەڵ ئیمامی مەسقەت خۆشــبوو و ئەگــەر تــەواوی دامــەزراوە بازرگانییە هەمیشەییەکانی لێوار ئاوەکانی ئێران تێکچووبان بە قازانجی بوو. بەکردەوە یەکێتی لەشکری لەگەڵ ئێران دژوار بوو بــۆی، بــەڵام ئەگــەر وەکیــل توانیبای خۆ لە بەرامبەر تەوژمەکانی کۆمپانیای هینــدی ڕۆژهــەڵاتی ڕابگــرێ، ئەویش دەیتوانی دەسکەوتەکانی لە هیندووستان توندوتۆڵ بکا. جگە لەمەش لە ساڵی ١٧٦٩دا هێزەکانی ئینگلیسی بەرەو دەروازەی مەدرەس پاشەکشــە پێکــرد و پەیمانێکی نابەدڵی ئاشتی لەگەڵ بەستن. «قەزوێنی» پێداگرە کە وەکیــل چەنــد تاقمێکی بۆ یارمەتی حەیدەرعەلیخان لە شەڕی لەگــەڵ بریتانیــا نــاردبوو[111]، بەڵام ئەگەر ئەم چەکدارانە تێکەڵی سپاکەی نــەبوون، ڕەنگــە تــەنیا بــە نــاوی سەربازی بەکرێگیراو چووبنە لای.وا وێدەچێ کە ئــەم باڵــوێزانە بــە ئامــانجی کۆتایی هێنان و بڕینەوەی شەڕی نێوان ئێران و عومــان هەڵســووڕابن. درێــژەی ئەم شەڕە بە باری پەیوەندی بازرگانیدا کە ئەو نێوانی لەگەڵ هــەردکلا خــۆش بوو بە زەرەدی بوو، چونکە لەم وەختــەدا بــە هرووژمــی ئیمــام بــە مەبەســتی تێکشکاندنی گەمارۆی بەسرە قەیران گەیبووە پەڕپەڕۆچکەی خۆی. وردبوونــەوە لەم خاڵە کە هاتنی باڵوێز لە ١٧٧٤دا دروست پاش پووچەڵبوونەوەی تــەدارەکی

---

110- FR XVII, 1063.

١١١ـ قەزوێنی، ل ١٤٤ئا؛ عەبدولقادر، ل ١٣ ـ ١٥؛ ئەمین، ل ١٠١.

هێرشی زەکی‌خان بۆ سەر عومان رووی داوە، پرمانا دەنوێنێ. سێهەمین بالوێزی حەیدەرعەلی‌خان لە هاوینی ١٧٧٥دا واتە ئەو کاتەی کە هێزی دەریایی ئیمام بۆ رزگاری بەسرە نێردرابوون، هات. ئەم شاندە سێ‌مانگ لە ئێران مایەوە و لەبەر وێرابوونی کەسێکی بە رەگەز ئێرانی بە ناوی عەلی‌خان و چەند دیارییەک وەک فیلی سەماکەر و جەواهێرات ـ کە بەگوێرەی نووسینی قەزوێنی، وەکیل دەستووری دا جوێیان بکەنەوە و بیانفرۆشن[112] ـ دەنگێکی دایەوە. ئەم شاندە بۆ نێوبژیوانی هاتبوون و ئەگەر وابێ راسپاردەکەیان بۆ جێ‌بەجێ نەکراوە، چونکە هێزی دەریایی عومان پاش شەڕێکی قورس ناچار بوو بگەڕێتەوە و وا دیارە کە نێوانگرژی و دوژمنایەتی لانیکەم هەتا زەمانی مردنی وەکیل درێژەی کێشا.

سەبارەت بە وەدەس‌هێنانی قان و پشکی بازرگانی دەس‌وپێوەندەکانی حەیدەرعەلی‌خان لە بەندەرعەباس لە هیچ شوێنێک باسێک نەهاتۆتە گۆڕ. بەلام لە سالی ١٧٦٥دا مزل و مال و کاروانسەراکانی خۆیان لە شیراز بە دەستەوە بوو[113]. وەک باسی کرا هەرچۆنێک بێ بازرگانانی هیندی لە هەموو بوارەکانی بازرگانێتی ئێراندا دەورێکیان گێڕاوە و نە تەنیا وەک تاجر، بەلکوو وەک گەمیوان، دەلال، پارەفرۆش، نوێنەری بازرگانی ئێرانییان و ئورووپایییەکان کاریان دەکرد. بێجگە لەم مەبەستانە لە تەواوی ئەو شوێن و مەلبەندانەی کە مسولمان وەبەرچاو دەهاتن، ئەمانە کۆمەلێکیان قازانج پێدەگەیی و ئابۆرەیەک لە خزمان و دۆستان لە هەر جێیەک کە کاریان کردبا کۆزیان لە دەورەی دەبەستن و هەمیشە بە ناوی ولات یان شەریکەیەکی تایبەتەوە نەدەناسران. رەنگە توجارەت لەگەل ئێران سەری گەیشتبێتە لە سەتاسێی تەواوی بایی و بارستایی توجارەتی ئێرانی رۆژاوایی، بەلام نرخ و بایەخی تەواوی توجارەتی ئێران لە دەر و ژوور کە هیندی دەستێکیان تێی‌دابوو، بێگومان زیاتر و بەرفرەوانتر بوو لەوەی کە لە جەغزێکی ئەوتۆدا بەراورد بکرێ.

---

١١٢ـ قەزوێنی، ل ١٤٤ئا؛ گولشەنی مراد، ل ٢٠٥؛ Miles, 273.; FR XVII, 1089 (31 July 1775)

113- Niebuhr, Reise, 120.




نەخشەی شیراز

# ١٦

## وەکیل لە جەغزی خاک و نیشتمانی خۆیدا

### ١٦ ـ ١ قەڵا و قایمە و نوێکردنەوەی شار

زیاتر فەرمانڕەوایانی گەورە لە ڕووی ئەو شوێنەوارانەوە هەڵدەسەنگێنن کە سازیان کردوون. جگە لە باس و بابەتی جێنشین، یەکەم ئەرکی سەرجەللەی پاشایەتی هەڵبژاردن و ڕازاندنەوەی شارێکە وەک پایتەخت کە نە تەنیا خاوەنی ڕوخسار و قەڵافەتی ناوەندێکی بارناسک و ئیدارییە، بەڵکوو چەکوچۆڵێکی ڕووحی و ڕەوانیشە بۆ هەڵسووڕان بە مەبەستی ڕاکێشان و درێژەی پشتیوانیێتی گشتی و ئابڕووی نەتەوایەتی ئەوان؛ چونکە ماکەشارێکی گەورە و جوان و پێشکەوتە، بەڵگەیەکی ئاشکرایە لە سەر بوونی حکوومەتێکی جوامێر و بەدەسەڵات. پایتەخت ڕەنگدانەوەی دەوڵەمەندی بنەماڵەی میرانە: دەسەڵاتیان بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە لە شارەکانی تەورێز و قەزوێن خۆی نواند و پاشان گوێزرایەوە ئیسفەهان. شاعەباس لەم شارەدا توانی بە ڕۆنانی چەند عیمارەتێکی شکۆدار لە پایتەختی چاوناسیدا، ترووسکەی ڕوخسارێکی نوێ بدا بە حکوومەتی بەهێزی. بەم پێیە کەریمخانیش پاش چەندین ساڵ

پێشڕەوی بێوچان و پاشەکشە لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر لــە هــاوینی ساڵــی ١١٧٩ی کۆچی / ١٧٦٥ی زایــینیدا پێــی نایــە شــیراز و تــوانی لێــرە وەک یەکــە حوکمڕانی بەشی هەرەزۆری ئێران دەس بکا بە چاکردنەوە و ئاوەدانی پایتەختی هەڵبژێراوی.

یەکەم خاڵی کە سەرنجی ڕاکێشابوو، چۆنیــەتی هــەڵومــەرجی قــەڵا و شوورەی شار بوو. لە سەردەمی هێرشــی ئەفغانییەکانــەوە بــەرەودوا شــیراز و مەڵبەندەکانی چەند جارێک دەستاودەستیان کردبوو، بەتایبەت کە ئەم شارە لە ساڵی ١٧٢٤دا ٩مانگ خۆی لە بەرامبەر گەمارۆی ئەفغانان ڕاگـرت و لــە ساڵــی ١٧٤٤ لە وەختی ڕاپەڕینی محەممەدتەقیخانی شیرازی و هرووژمی نادر بۆ ســەر شیراز دوو منارەیان لە کەللەی سەری خەڵک ساز کرد[1]. لەو ڕۆژگــاریدا شــیراز شوورەی پاراستن و بەرگێرەوەی نەبوو؛ ئەو ڕیزە ماڵانەی لە قەراخ شار پاڵــیان وێکدابوو لەبری کلاوقووچە و قۆنگرە و شوورەی شاریش کەلکیان لێوەردەگیرا[2].

خودی وەکیل لەم شارەدا دووجاران شانی لەبــەر کــوێرەوەری گــەمارۆ ڕاگرتبوو و بەکردەوە تێگەیبوو کــە چونکــە خانووبــەرەی شــار لێــک بــڵاون و حەســاری شــار شــتێکی وای بەبــەرەوە نــەماوە، چــۆن چاکــە ئــاوای دەس پێناکرێتەوە، بۆیە خۆی دایە هەڵچنینەوەی ڕووبەری شار هەتا کــارێکی وا بکــا کە بەڕێوەبردن و نوێکردنەوەی حەسار پتر یەکتر بگرنەوە: بــە دەوری کۆمەڵــە خانووبەرەکانی پێشــوودا کــە حەڤــدە یــان هــەژدە گــەڕەک دەبــوون و قــەفی گەڕانگەڕیان دەگەیشتە فرسەخونیوێک دەستی کرد بە کار. خۆی لە کاولەکۆن و خانووبــەرە تــاق و واز و دوورەدەســتەکان پاراســت و چەنــدین بنکــە و پــەلی چەکدارانی تێکەڵ کرد و لە دوازدە شوێنی دەوری شاری دایمەزرانــدن و بازنــەی شاری وێکهێنا و کردی بە فرسەخێک. دەروازەکانی شیرازی لە نۆ یــان دوازدەوە کەم کردەوە بۆ شەش[3]. ئەم دەروازانە بریتی بــوون لــە: دەروازەی ئیســفەهان، سەعدی، قەسابخانە، شاداعی، کازروون و باغی شا. لە دەورەی شار دیوارێکی

---

1- See Lockhart, Safavi Dynasty, 203; Nadir shah, 242.

2- Niebuhr, Arabien, 302.

٣ـ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٦؛ فورسەتوددەولە، ل ٤٣٢ ـ ٤٣٣؛ مێهراز، ل ٩١؛ Birning, 266 – 269.

سەخت و قایم سازکرا کە فرانکلین تاریفی دەکا. ئەم گەڕۆکە لە دەورانی جەعفەرخان‌دا شیرازی دیتووە. شوورەی فرسەخێک و پەنجا هەنگاو درێژ و ١٠فووت بەرز و ٨٠ فووت پان بوو*. هەر بە نێوان هەشتا هەنگاوان قۆنگرەیەک لە دەوری ڕۆنرابوو و هێندێک ئەولاتر خەندەکێکی شەش‌گەز پان و پازدەگەز قووڵ لێدرابوو[٤].ئەم کارە گەورە لە بەهاری ساڵی ١٧٦٧دا دەستی پێکرد و یەکبین نەپسایەوە و دروست دوای ساڵێک تەواو بوو[٥]. نامی بە کەیف‌خۆشی باسی چۆنیەتی سازکردنی شوورە لە دەوری کۆنەماڵان و هەرەسەڕووخاوی دیواری پێشوو بەپێی پێویست دێنێتە گۆڕ و دەنووسێ کە لە پەنا هەر دەروازەیەک دوو کلاوقووچە سازکرا و لە تەنیشت هەر کلاوقووچەیەک قۆنگرەیەکی دی لە بەردی مەڕمەڕ هەڵخرا و هەرکامیان مەودای تیرپەڕێک لە دەروازەوە دوور بوون.

کرێکاران وەک یەک هەقدەستیان وەردەگرت: ١٢هەزار کرێکار لە چەند پارێزگایەکەوە کۆکرابوونەوە و وا داندرابوو کە هاوین و بەهار کار بکەن و زستانان بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان و بەهاری داهاتوو سەرلەنوێ بێنەوە شیراز و شەرتی خۆیان بەرنە سەر. مزەی کرێکار و وەستا و سنعاتکاران هەمیشە لە خەزێنەی میری دەدرا. چەند دەستەیان چاوەش و لۆتی لە پەنای دانابوون و بە تەقەی دەهۆڵ و زوڕنا و شادی و هەڵپەڕکێوە کاریان دەکرد[٦].

بە باری پاراستن و تەناهی‌دا وەکیل داوای لە پیاوانی هەڵکەوتەی خزم و کەسی لە دەزگای بەڕێوەبەرایەتی خۆی وەک سادق‌خان و شێخاڵی‌خان و نەزەرعەلی‌خان کرد کە ماڵەکانیان لە نێوخۆی شوورەی پایتەختا سازبکەن، هەتا لە شارا خانووی تازە بناغەیان بۆ دابندرێ[٧]. بۆ نموونە خۆی ئەرگ

---

* بێگومان دەبێ ئەم گەز و پێوانەیە هەڵە بێ. چونکە ڕەنگە دیواری شار هەر ١٠میتر بەرز و ٣میتر پان بووبێ (وەرگێڕ).

4- Francklin, 51 – 54; ڕۆستەمولحوکەما، ل ٤١٢.

٥ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٥٦ ـ ١٥٧.

٦ـ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ١٥٤ ـ ١٥٥؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤١٤.

٧ـ گوڵشەنی مراد، ل ١٥٧؛ Niebuhr, Reise, 114; Malcolm, 147. نموونەیەک لەم خانووبەرانە ماڵی زەکی‌خانە کە «وەرجاوەند» لە ژمارە ٢ی، ساڵی ٩ی توێژینەوەکانی مێژوویی‌دا بابەتێکی لە سەر نووسیوە.

(قەلاچکە) و قەسری لە قۆلی باکووری شیراز بنیات نا. ئەرگی کەریمخانی کە هێشتاش هەروا قایم و پتەو بەپێوە ڕاوەستاوە، بینایەکی چوارسووچە کە بە خشتی سوور سازکراوە و لە هەر گۆشەیەکی قۆنگرەیەکی بازنەیی هەلخراوە و خەندەکێک هەر بەو ئەندازەی دەوری شووورەی شار، گەڕی لێداوە. کاری سازکردنی عیمارەتەکان دووسالی گرتەوە (١٧٦٧ ـ ١٧٦٨). ئەم خانووبەرە سەخت و قایمانە بە شێوەیەکی شکۆمەند و لەگیرانەهاتوو بنیات نران و باشترین نژیارڤانان و وەستاکاران و کاشیکاران و وێنەگەران و هونەرمەندانی پارێزگاکان داوەرین و کاریان کرد و بە قەولی نامی جەماوەری دانیشتووی بینا تازەکان لە ڕێژەی جەماوەری شار پتر پێهەلاچوو. هێنان و هەلبژاردنی کەرەسەی پێویستی وەک بیجادە و مەڕمەڕ و بەردی جوان لە کانگاکانی شیراز و یەزد و تەورێزەوە سەریان دەگرت. تەنیا گۆشەیەک لە وێنەگەری ئاوڕەنگی حەسل و دیوار و تەنانەت کاشیکاری و مەڕمەڕە تاشراوەکان ماون، بەلام شکل و شێوەکاری ژوورووی بیناکان پتریان عەیبیان تێنەبووە.

ئەم بەشە کەوتۆتە چوارچێوەیەکی خشتەکی و چەند باغچە و ئەستێرێکی درێژووکەی تێدایە و لە سێلاوە بینای دوونهۆم دەوری ئەستێرەکەیان داوە. ئەم کۆمەلە عیمارەتانە لەڕێی چەند ژوورێکی «بەهارەخەو»ڕا دەکەونە سەر سەرسەرای ناوەندی کە چەندین کۆلەکەی بەرز سەریان وەبەر هەیوانی هێناوە؛ دەرگای چوونە ژوورەوە کەوتۆتە لای باشووری ڕۆژهەلاتی کە لە نێرینەی حەوشەوە ڕووی تێدەکرێ[٨].

دیوەخانی کەریمخان کەوتبووە لای باکووری ڕۆژهەلاتی مەیدانەکە و عیمارەتێکی لاکێشی بوو کە جۆگە و جۆبار و کوفارە و داروبار ئامێزیان پێداهێنابوو. ئەم بەشە بە میچی سێسووچەوە خۆی دەنواند و تالارێکی گەورە کە دوو کۆلەکەی بەردی مەڕمەڕی یەکتاشە لە هەیوانی چەقیبوون، هەلکەوتبوو. (ئاغامحەممەدخان لە سالی ١٧٩٢دا ئەمانەی گوێزتنەوە و بردنی[٩].)

---

٨ ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، ل ١٥٦ ـ ١٥٨؛ گولشەنی مراد، ل ١٥٧؛ ڕۆستەمو تەواریخ، ل ٤١٢. لەم سالانەی ئاخریدا ئەم ساختومانە کرابوو بە بەندیخانەی شار، بەلام ئێستا دەستێکیان بە سەروگوێلاکیدا هێناوە... .

9- See Lerner, 236 – 40, for travelers descriptions.

ئەگەرچی ڕووداونووسان مەبەستێکی تایبەتیان سەبارەت بەم عیمارەتە نەنووسیوە، بەڵام ڕەنگە هەر ئەودەمەی ئەرگیان داناوە ئەویشیان سازکردبێ و بە شێوەیەکی گەلێک جوان ڕازاندوویانەتەوە. نەقارەخانەی کەوتبووە شانی باشووری. هۆڵی تایبەتی کورتەئاوازان کە زوڕناژەنان و دەهۆڵکوتانی کەریمخان هەموو ئێوارە و بەیانان لەوێ دە زوڕنایان دەتووراند و ڕاگیرگەی تایبەتی تۆپخانەش لێرە بوو[10]. لە پاشماوەی ئەو جەغزە چوارسووچەدا ـ کە دەکرێ پێی بگوترێ مەیدانی شا ـ لە سەر سنووری بازاڕی وەکیل، حەمام و گومبەزیشی ساز کرد بوو.

## ١٦ ـ ٢ ئەندازیاری شاران و یەکتر خوێندنەوەی عیمارەتەکان

ئاخرین پارمەتییەک کە بە مەبەستی گەشەی بازرگانی شیراز خرایە ڕوو سازکردنی بازاڕی کەریمخان و سەرای وەکیل بوو کە هاوکات لەگەڵ بینای ئەرگ داندران. ئێسکات وارینگ کە شیرازی ماوەیەک پاش کاولکردنی عیمارەتەکان بە دەس ئاغامحەممەدخان دیتبوو و تەواو لە بابەت باری شارەوە تووشی نائومێدی و دڵتەنگی هاتبوو، دیسانیش هەر بە تاریفەوە یادی بازاڕی وەکیل دەکا:

بازاڕی وەکیل شوێنەوارێکی هەڵکەوتەیە کە لە خشتی سوور سازکراوە و میچی بە تاق و گوڵ و هێرە و کەوانە هاتوونە. هەروا نیومایلێک دەبێ و نابێ و ڕەنگە پازدەمیترێک پان بێ. شەوانە کە چراکانی هەڵدەکرێن دیمەنێکی جوانی هەیە[11].

بازاڕی کەریمخان هێشتاش لە شوێنی دیکە بەدیمەنترە. تەنیا بە بوومەلەرزەی ساڵی ١٨١٢ بەشێکی داڕووخا و گۆشەیەکیشی لە وەختی لێدرانی شەقامی تازەی کەریمخانا تێداچوو. لە سەری هەر چوارڕەوگەیەکی بازاڕ کوفارە بەسترابوون و بەرەوڕووی گومبەزی ڕەوگەی سەرەکی سەکۆیەکی تەخت لە سەر

10- Francklin, 55 – 57.

11- Waring, 32 – 33; cf. Kinneir, 62; Bradley – Birt, 134 – 135.

خەزێناوێک خۆش کرابوو کە شوێنی کۆبوونەوەی گشتی بازرگانی شـار بـوو[12]. ئێستکات وارینـگ ڕسـتەکانی خـۆی بـە کۆمەڵـێک ئەفسـانە کـە دەربـارەی فەرمانڕەوایەتی وەکیل لە شاری شیراز بیستوونی ئاوا درێژە پێدەدا:

دەڵێن بەردی سەردەرانە زۆر قورس بووە و بەرز کردنـەوەی ئەسـتەمی نوانـدووە. بـەڵام وەختایـەک کـە خـودی وەکیـل هاتـە یاریـدەی کرێکـاران، جەماوەرەکە ئەوەنـدە گەشـە و نەشـەی کەوتـە دەروونی کـە هـەر لـە جێـوە هەڵیانهێنا. شیراز چیرۆکی ئاوای سـەبارەت بـە وەکیـل زۆر لـەبیرە و تـەنیا پادشـایەکە کـە هـیچم سـەبارەت بـە ئـازار و ئێشـاندنی خەڵـک دەربـارەی نەبیستووە.

کاروانسەرا برێتی بوو لە چایخانە و بارخانە و نووسینگەی بازرگـانی کە بۆ تەیار و تەواو کردنی بازاڕ پێویستی دەنواند. کەریمخان لە شیراز چەندین کاروانسەرای ڕۆنـا کـە یـەکیان «سـەرای فیـل»ە لـە پـەنا مزگـەوتی وەکیـل. کاروانسەرای گوومرگخانە و کاروانسـەرای ڕۆغـەنی دروسـت کەوتبوونـە نێـو دەروازەی ئیسفەهان و کاروانسەرای میرهەمزە لە دەرەوەی دەروازەی ئیسفەهان سازکرابوو. گومبەزی میرهەمزە کەوتبووە شانی ڕۆژاوای[13]. لانیکەم دانانی بینای دوو حەمامیش دەبەنەوە سەر وەکیل: یەکیان کۆڵەکەی لە بەردی مەڕمەڕە و پێی دەڵێن حەمامی وەکیل و «فورسەت»ی شیرازی لای وایە کە بێگومان هەتا ئێسـتا لە هیچ جێیەک شتی وا ساز نەکراوە و لێرە بەدواش لە سەرانسەری ئێرانا تـای نابێتەوە[14]. ئەم حەمامە بەرەڕووی باغی شـا سـاز کـرا و هێنـدێک لـە سـەنگە مەڕمەڕەکانیان بۆ نوێکردنەوەی گلکۆی حافز دەکار کرد.

ڕەنگە باشترین شوێنەواری بەجێماوی کەریمخان مزگەوتی وەکیل بێ کە بازاڕ و باغەکان پێکەوە دەبەستێتەوە. ئەم شوێنە هەر ماوەیـەک پـاش دانـانی شووره و ئەرگی کەریمخانی سازکرا؛ چواربەنـدەی دەوروبـەری سالـی ١١٨٧ی کۆچی/ ١٧٧٣ی زایینی کۆتایی پێهـات، بـەڵام کاشـیکاری و ڕازاندنـەوەی قـەت نەگەیشتە ئـاخری. مزگـەوتی وەکیـل لـە جێـی کۆنەمزگـەوتێک سـازکرا کـە

---

12- Monteith, ((Notes on the Routes)) 118; Lorner, 230 – 231.

١٣ـ بڕواننە: ئیسلامی، ل ٢٢ ـ ٢٧.

١٤ـ ئاسارولعەجەم، ل ٥٠١؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤١٣؛ Lerner, 233.

شوێنەواری نەماوە. ئەم مزگەوتە چواربەندەیەکی قایم و سەرنجڕاکێش و خشتەکییە و هەر قۆڵەی سەتگەزێک درێژە. خەزێناوێک کەوتۆتە حەوشەی و هەیوانێکی گەورەی بە سەر کشاوە. هەیوانەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تایبەتی نوێژکەرانە و بە گومبەز هاتوونەوە و ٤٨کۆڵەکەی بەردی یەکسەرەی بە پێچ و لوول و مینبەرێکی چاردەپلیکانەی تێدایە. دەڵێن ئەو مینبەرەیان بە گا و یەستران لە مەراغەی هەرێمی باکوورەوە هێناوەتە باشووری ئێران[١٥]. بەشی زۆری کاشیکارییە حەسڵەکانی مزگەوت ئێستا گۆڕداون.

بە گوتەی فرانکلین وەکیل لە نیزیک ئەم مزگەوتە گەلاڵەی سازکردنی زنجیرەیەک خانووبەرەی جوانی لە مێشکیدا بوو کە قەرار بوو مەلا و فەقێ و سۆفی و دەروێش و پیاوانی ئایینی لێ بنەجێ بکا. ئەم تەمایەش وەک زۆرێک لە کارەکانی وەکیل تێپەڕینی زەمان تۆزی فەرامۆشی لە ڕووی پژاندن[١٦]. خانەقای «شامیرهەمزە»شی ساز کرد کە ڕەحیمخانی کوڕی لەوێ نێژرابوو[١٧]. هەروەها مزگەوتی وێرانی مەنشوور بە مزگەوتی نوێی کەڵتە کردەوە[١٨].

لە لایەکی دیکەوە بە ساز و گەورەکردنەوەی گلکۆی شاعیرانی پێشوو و گەورەپیاوانی ئایینی شیراز، بە دەورەیانداهات و دەستی ڕێزی لێنان. باخی «حەوتەنان» و «چلتەنان» لە باکووری ڕۆژهەڵاتی داوێنی لێژی گردان لەبەر تالانوبرۆی شرەخۆران و زەبری زەمان گەلێک تووشی خەسار بوونەوە.

لە حەوتەنان (حەوتەوانە) هەیوانێک بە دوو کۆڵەکەی یەکسەرەی چوارگەزونیوی هەڵخرابوو. وەختایەک خەبەریان دا بە کەریمخان کە کێلی قەبری شاشوجاعی موزەففەری گەوردیان لێرە دزیوە، لەڕێوە بەردێکی مەرمەڕی بە زمانی عەرەبی خستەوە سەر گۆڕەکەی. ئێستا ئەم تاتەڵەیە کەوتۆتە لای حەوتەنان. هەروەها لێرە دەستووری سازکردنی گومبەزێکی بیرەوەری دا کە

---

١٥ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢٠٣ ـ ٢٠٤؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤١٣؛ مێهراز، ل ١٤٨ ـ ١٤٩؛
Lerner, 233.

16- Francklin, 63.

١٧ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢٠٥؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤١٣؛
Francklin, 105 – 106; Fraser, An Historical Account, 265.

١٨ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٣٥.

لەبەر پاشاگەردانی دوای مەرگی و هەڵگیرانی ماوەیەک چاوەدێری کەرەسەکان بەرەو دەر ڕاگوێزران[١٩].

گڵکۆی مەزنە پەسندەری شاشوجاع واتە «حافز» لە سەرەتاوە ساڵی ١٤٥٢ی زایینی بە پیاوەتی «بابێر»ی خونکاری مەغوول ساز کرا. وەختایەک کەریمخان هاتە شیراز موغبەرەکەی گرفتاری دۆزێکی مەینەتبار هاتبوو. لە ساڵی ١٧٧٢دا وەکیل برە پارەیەکی بۆ سازکردنەوە و پەرەپێدانی کردە دیاری. بەم پارەیە باخی جوان و دڵگری سەوڵ و نارنجی ئەمڕۆ لێدرا و دیوارێکی قایمیان بە دەوریدا کێشا. بەشێک لە باخەکە پێیدەگوترا نارنجستان و کەوتبووە بەرەوە و کوتەکەی دیکە ناوی گۆڕستان بوو کە خانووبەرەیەکی دووژوورە و هەیوانێکی لێ بنیات نرابوو. تاتەڵەیەکی مەرمەڕی خستە سەر گڵکۆی حافز کە شێعری شاعیرانی پێشووی لە سەر هەڵقەندرابوو.

شوێنەواری گومبەزی موغبەرەکە و ئەم بەشە ڕۆژگارێکی دواتر بۆ ئاخرین جار لە سەردەمی ڕەزاشادا خراپ کرا و سەرلەنوێ داندرایەوە. بەڵام چوار ڕیز کۆڵەکەی ناوەندی هەر ئەوانەن کە کەریمخان دایناب‌وون[٢٠]. نیبوور کە لە ساڵی ١٧٦٥دا سەردانی مەزاری شێخی سەعدی کردووە بە خەمەوە ئاوای نووسیوە: «ئەم شوێنەوارە زۆر شڕە و بەم زووانە دەڕووخێ، مەگین ئەوەی کە چەند مسوڵمانێکی دەوڵەمەند زگیان پێیبسووتێ و بکەونە فریای و کەڵتەی بکەنەوە.» چەند ساڵ دواتر کە کەریمخان ساباتێکی بە خشت و سپیکاری لە سەر ساز کرد و پەرژینێکی ئاسنی بە دەوریدا کێشا، ئەم ئاواتە هاتە دی[٢١].

حافز زۆری کەیف بە کانی «ڕوکنابادی»ی باکووری ڕۆژهەڵاتی شیراز هاتووە. ڕوکناباد ئەوەندە لە «سەعدییە» دوور نیە و هەمیشە بە دەشت و گوڵزاری «موسەللا»دا دێتەخوار. ڕوکنوددەولەی شازادەی ئالی بوویە کەرێزی ئەم چاوەیەی لێداوە و ئێستا تێکچمیوە و گیراوە. ئاوی ڕوکناباد لە سەردەمی کەریمخانا هێشتاش هەروا بەغوڕڕمم بە ڕەوگەی «موسەللا»دا تێدەپەڕی. وەکیل

---

١٩ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢٠٥. بەردی گڵکۆی شاشوجاع ئێستاش کەوتۆتە ژێر هەیوانێکی چیمەنتۆ.

٢٠ـ گوڵشەنی مراد، ل٢٠٤، دونبولی، ل١٢٩؛ cf. Arberry. Shiraz, 106; Porter I, 604.

٢١ـ ڕۆستەمولحوکەما، ل٤١٣؛ مێهرزاد، ل٢٣٠؛ Niebuhr, Reise, 167; Porter I, 690-697

پاش ڕاوێژ لەگەڵ پسپۆڕان فـەرمانی دا کـە قەمتەرەیـەکی بـە ئانیشـکەی بـۆ هەڵبەستن هەتا ئەوەندەی دەکرێ ئاوی کانییەکە بێتە نێو شار. لـەو وەخـتی‌دا ئاوەکەیان شان‌بەشانی ڕووبار هەڵنەبەست هەتا ئاوەکـە بـە دوولای شـوورەی شار و خەندەک و قایمەی ئەرگ‌دا باژوێ. ئەم کـارە ئەوپـەڕ بـەرز و بـەرچاوە ئەندازیارییەی بە پارەیەکی زۆر جێ‌بەجێ کرد[٢٢]. بەدبەختانە ئەم ڕەوگەیە نەما. ڕووباری ویشک واتـە ڕووبـاری وەرزی وەک چـۆن ئێسـتا مـاوە و بـە شـانی باکووری ڕۆژهەڵاتی شیرازدا گەڕ دەداتەوە، یەکێکە لە کارەکانی وەکیـل تـەرکی ئەم ڕووبارەیان قووڵتر کرد کە مەترسی سێڵاو کەمتر بێتـەوە و شـانەکانی بـە دیواری سەنگچن داندرا[٢٣]. وەکیل لە درێژەی ڕاکێشانی تۆڕی ئاوی ئـاوەدانی دوو خەزێناوی لە نیزیک شوێنی پێشووی تۆپخانە بە لای ئەرگەوە سـاز کـرد و بـە لوولێنەی سواڵەت ڕەوگەی پێویستی بۆ ڕاکێشا[٢٤]. لە زەمانێکا کـە سـادق‌خـان حکوومەتی شیرازی لە ئەستۆ بـوو ـ تەنانـەت بـەر لـە ساڵـی ١٧٦٥ ـ وەکیـل ڕایسپاردبوو کە هەموو شەقام و کۆڵانەکانی بازاڕ و پەناماڵان سەنگفەڕش بکا و قاناوێک بۆ پیساوی ناوەندی ڕابکێشێ کە چل هەنگاو ئـەولاتر هەڵـدێرێتە نێـو چاڵان و زارکی چاڵەکان بە سەرپۆشی بەرد بگیرێ[٢٥].

زۆر باخی جوانی ڕەنگاوڕەنگی سەرنج‌ڕاکێشـی میـوانگری شـیراز یـان تازەبەتازە چەقیبوون یان هەر گەلاڵەی کۆن بوون و پەرەیان پێدرا. لە پەنا ئەو باخانە چەند کۆشک و حەرەمخانە و ئەم موغبەرانەی باسیان کرا ڕازانـەوە. لـە باخی نەزەر ـ ئەم شوێنە پاش نـوێ‌کرانـەوە چکۆلـەتر کرایـەوە ـ عیمـارەتی کلاوفەرەنگی ساز کراو مەیتی کەریمخان لەوێ نێژرا. لـە دەرەوەی شـار بـاخی دیکەش لێدرابوون. بۆ وێنە باخی جیهان‌نما کەوتبووە یەک‌مایلی باکووری شار. ئەم باخە لە ساڵی ١١٨٥ی کۆچی / ١٧٧١ ـ ١٧٧٢ی زایینی‌دا لە جێی چاردە تـەغار بنەتۆو لێدرا (٥٥هەزار میترێک). لەم شوێنە کلاوفەرەنگییەکی دیکەی ساز کرد و چوار ڕیزی سپیدار لێ‌ناشت کە خاوەنی فارسنامە نیزیک سەت‌وبیسـت ساڵـێک

٢٢ـ تاریخی گیتی‌گوشای زەندیە، ل ١٥٩ ـ ١٦٠؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤١٢.

٢٣ـ سامی، شیراز، ل ٢٩؛ بامداد، ل ٣٧.

٢٤ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤١٣.

٢٥ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٣٥؛ دونبولی، تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی یەکەم، ل ١٢٩.

پاش دانانی تاریفی جوانییەکەی کردووە. لە باکووری ئەم جێیە کە ئێستاش پێیدەگوترێ جۆنما، باخێکی شوورەداری دیکەی لێدا کە بە ئاوی ڕوکنابادا دەدێردرێ[٢٦].

ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە ئامانجی کەریمخان نوێکردنەوە و پێشکەوتی شاری شیراز بووە. یەکێک لە بەرچاوترین تایبەتمەندییەکانی ئەو شوێنەوارانەی کە وەکیل سازی کردوون و زۆربەی بینەران ئۆبالیان بۆ کێشاون سەختی و پتەوی و بناغەی قایم و وەستاکارییە. شوێنەوارەکانی فەرمانڕەوای زەند لە شیراز چوارجار دوابەدوای یەک تووشی بوومەلەرزە و هرووژمی ئاغامحەممەدخان لە کوشتار و تالانی سالی ١٧٩١دا بوونەوە[٢٧]. بەسەرهاتێکی چەندپاتەکراو لە گۆڕێدایە کە دەڵێ خواجەی ڕەقەڕەن وەختایەک زانی ئەوانەی ڕاسپێراون بۆ کاولکردنی شوورەی شار بە قولینگ و لۆسە دەروەستی نایەن، ناچار بوو دەستەیەک سەنگتراش بە ئامراز و کەلوپەلی پێویستەوە بێنێ و تێیان وەرووکێنێ. کابرای سەرکەوتوو حەساری وێران کرد و فەرمانی دا کە دوو کۆڵەکەی یەکپارچەی بەردی دیوانخانە (دیوەخان) کە بەپێی نووسینی کرۆزۆن پاشان لە بارگای قاجار لە تاران داندران، بگوێزنەوە وێندەرێ[٢٨].

ئەگەرچی بینا یادگارییەکانی وەکیل دەوڵەمەندی و دەسڕۆیشتوویی پڕشنگداری مەیدانی «شا»ی ئیسفەهانیان پێوە دیار نیە، بەڵام لە بەرامبەردا ئارامییەک شانبەشانی چێشکە و شکۆ و بواری سروشتی دەگمەنی شیراز ڕازاندوویاننەوە. کەچی شاری ئیسفەهان لە کەوڵ و قەلافەتی دەشتێکی مەیلەو بیابانا خۆی دەنوێنێ، شیراز لە بناری ئەو گرد و تەپۆلکانەی هەزاروپێنسەد گەزێک سەریان کێشاوە خەوتووە. بە باری وەستاکاری و ئەندازیاریدا شیراز

26- Kinneir, 63; Nava, i, Karimkhan – e – Zand, 306 – 308.

27- Brydges, cxiii, Bradly – Birt, 128; Hovhanyants, 311.

بوومەلەرزە لە سالانی ١٧٨٩، ١٨١٢، ١٨٥٣ و ١٨٥٥دا ڕووی دا.

28- GN Curzon, I, 313; cf. Kinner, 63; Bradley – Birt, 134; Zoka, 88.

تەختی مەرمەڕیش کە وا دیارە لۆرد کرۆزۆن بە کەلوپەلی دزراوی شیرازی داناوە، بیست ساڵ دواتر ساز کرد. تۆپی مرواریش کە پاشان لە مەیدانی شای تاران داندرا بە بڕوای خەڵک لە دەورانی کەریمخانا لە شیراز ڕۆنرابوو.

شارێکە بە لای باکووری ڕۆژهەڵاتیدا بەرەو باشووری ڕۆژاوایی ڕاکشاوە و بەرەو قیبلەیە و لە ئاکامدا زۆربەی عیمارەتە بەرچاوەکان، مزگەوتەکان لەگەڵ ڕاستەشەقامان و بازاڕان و بینا سەرەکییەکانی دیکە کەوتوونە سەر هێڵێک[29]. تەواوی شوێنەوارەکانی کەریمخانی لەگەڵ ئەم نەخشەیە یەکتر دەخوێننەوە.

## ١ ـ ٣ هۆردووگا و بارگا

ڕێکخستنی دامودەزگای ئیداری وەکیل لە شیراز لەچاو ڕێکوپێکی لێزانانەی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی و ڕێورەسمی ئایینی دیاریکراوی بارگای سەفەوی، بچووکتر و ساکارتر و بە باری هاوهەنگاوی لەگەڵ ڕێکخستنی ئیداری و بەڕێوەبەرایەتی و لەشکری پێویستا، لەبارتر و گونجاوتر بوو لە تانوپۆی پڕ خەرجوبەرج و شانۆگەرییانەی سۆفییانی گەورە. باس و بابەتی فەننی و زانستی دەربارەی سەفەوی بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش کە لە ڕادەبەدەر هەڵکێشانی پێوە دیارە لە قەڵەمی یادداشتنووسان و نووسندەکانی هاوچەرخی ئەو خانەدانە داباریوە. ئەگەرچی ئەم ڕەگ و ڕیشانەی مێژوویی ڕوخساری فەرمانڕەوایان لە درز و کەلێنی شکۆ و مەزنایەتی ئەوانەوە نیشان دەدا، بەڵام هەرگیز دەریناخا کە چلۆن پێز و توانستی ڕووداوەکانی پێشوو ئاڵوگۆڕیان بە سەردا هاتووە. بەر لەوی نادرشا ڕێکخستنی داڕزیوی دەربارەی سەفەوییەی وەک دەزگایەکی لەشکری ڕاتڵەکاند و وەگەڕی خست (بەڵام بە شێوازێکی پەسند هەرمان و مەزنایەتییەکەی پاراست). بەڵام ئەم دەزگایە ئەگەر بەشە ڕەنگاوڕەنگەکانی بە دەس کەسێکی لێوەشاوە کە لە دەورەی نادریدا ڕاهاتبوو، ئامادە کرابا، دووبارە وەکار دەکەوتەوە. کەریمخانیش هەروەک نادر لە ناوچەی سنووری دەرگەزەوە هەستابوو و لە تانوپۆی لەشکری ئەو پیاوە جیهانگیرەدا مەشقی کردبوو و دەیتوانی بنەمای هێز و توانستەکانی لەشکری و سیاسی کە تێکڕای لە نادر بە میرات بردبوون بخاتە گەڕ و لە سەر تەوەرەی

---

٢٩ـ ڕووگە لە شیراز کەوتۆتە ٥٦دەرەجە و ٤٦خولەکی باشووری ڕۆژاوایی، وتاری مێهرزاد، ل ٩١.

پاراستنی مافی مرۆڤ بە شێوەیەکی زیرەکانە و پتەو کەلکیان لێوەربگرێ.

ئەم حاڵ و چلۆنایەتییە لە تانوپۆی لەشکری بنەجێی کەریمخان لە شیراز لە ماوەی ساڵانی ئاخری فەرمانڕەوایەتییەکەیدا ڕەنگی دایەوە[30]. لە سەر زمانان ئەم هێزە سەری دەگەیشتە ٤٥هەزار کەس. پتر لە نیوەی ئەم چەکدارانە واتە ٢٤هەزار کەسیان سەربازانی هۆز و تایفەکانی لوڕ بوون کە بە هێزی سەرەکی سپای کەریمخان دادەندران. ئەمانە لە وەختی ڕاپەڕینەکەیدا بە مەبەستی گرتن و بەزاندنی ناوچەکانی لای هەمەدان، کرماشان و برووجێرد یارمەتییان دابوو. زۆربەیان لە تایفەکانی زەند، زەنگەنە، کەلهوڕ، وەند و لوڕانی فەیلی هەڵدەبژێردران و بەتێکڕا سوارە و پیادە بوون. ١٢هەزار کەسیش لە سەربازانی هەرێمی ئێراقی عەجەم وەک تفەنگچی بەشدار بوون کە لە جەرگەی شارەکانی وەک قوم، کاشان، ئیسفەهان، قومشە، ئابادە و یەزد ڕێکخرابوون و ژمارەیەکیش لە نێو چەکدارانی پیادەی گوندەکی هەڵبژێردران، ئەم تاقمە وەک ١٢هەزار تفەنگداری[31] سەردەمی شاعەباسی سەفەوی دەچوون. پارێزگای فارس ئەگەرچی کرابوویە پایتەخت بەڵام تەنیا ٦هەزار سەربازی ئامادە کردبوو؛ ڕەنگە ئەم ژمارەیە سەربازانی ئێلجاڕی ناوچەکانی وەک لار و دەشتستان و خووزستانیشی گرتبێتەوە. کەمترین چەکداری ئێلجاڕی ناوچەیی کە بە دەستەیەکی سەربەخۆ دادەندران بەختیاری بوون کە ژمارەیان سەری دەگەیشتە ٣هەزار کەسێک.

ئەم ژمارە خەیاڵییانەی سەرەوە وا دیارە قەت ڕووی ڕاستەقینەیان بەخۆوە نەدی و هەرگیز نەهاتنە فارس و بەڕاستیش حازر بە خزمەت نەبوون. ئەو لەشکرەی کە ئەمیرگۆنەخان دژی خوورمۆوج و بەندەرڕیگ گاڵی دابوون، گۆیا برێتی بوون لە ٤هەزار سوارە و ٦هەزار پیادە. بەڵام یەکێک لە فەرماندەران بەدزی بە نیبووری گوتووە کە سوارەکان ١١٠٠کەس و پیادەش ٥٠٠کەس بوون. لە ڕاستی ئەم ژمارەیە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم ڕاسپاردەیە تەواو بوو. گەڕۆکی دانمارکی پاشان شیکردۆتەوە کە یووزباشی (فەرماندەی سەتکەسان) زیاتر پەنجاشێست

---

٣٠ـ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٩؛ پەرتەو بەیزایی، ل ٥٨ ـ ٥٩؛ ئەنساری، ل ٢٢٩.
31- Lockhart, ((the Persian Army, 193)).

کەسێکی لەو سەتە دڵخوازەی لەبەردەستا بووە[٣٢]. لە سەرژمێرییەکی مناسبتردا کە وێدەچێ وابێ گوتوویانە سپای چەکداری لە سەر کاخەز لە ٢٠هەزار کەس کەمتر بووە و نیوەشیان نەیاندەتوانی هەرکە لێیانڕاسپاردن خێرایەکی خۆیان بگەیەننە مەیدانی شەڕ، تەنانەت ئەم ئامارە پتر لە بەراوردی شاهیدانی حازر کە لە ئاخری ساڵی ١٧٦٠دا لە ڕەشت ڕاپۆرتیان داوە بە ڕووسان. ئەمانە دەیانگوت کەریمخان سپاکەی بلاوە پێکردبوو و تەنیا ٤هەزار کەسی لە شیراز گل دابۆوە و ژمارەیەکیش لە چەکدارانی هەڵبژارد و لە قەڵایان دایمەزراندن کە سەربازانی ئێلجاڕی گوندان و تایفەکان پاریدەیان دەدان[٣٣].

ڕێکخستنی ئەم سپایە بەتایبەت لە دەستەکانی نەگۆڕی سەر بە بارگای میریدا بە باری تێئۆریکا لە سەر هەمان ڕەوتی باوی سەفەوی هەڵدەسوورا، بەڵام لەبەر گۆڕانکاری خۆجێیی دەوری نادرشا چەند جیاوازییەک رووی تێکردبوو[٣٤]. هێزەکانی هەڵبژاردەی سەردەمی سەفەوی (غولامان) واتە تفەنگدارانی سادەی دەسکەرەوە چەشنی سەربازانی یەنیچەری عوسمانی تێکڕا لە نێو گورجی و مەسیحییانی تر بۆ خزمەت لە ژێر ڕکێفی خودی شادا دەسبژێر کرابوون و لە زەمانی فەرمانڕەوایەتی شاعەباسدا ژمارەیان دەگەیشتە ١٢هەزار کەس. لە دەورانی کەریمخانیشدا ئەم بەشە سەرلەنوێ وەک نموودێکی ئەو تاقمە ژیانەوە و بوونە پارێزەرەی تایبەتی کەریمخان و پێیاندەگوتن غولامان. ژمارەی ئەم غولامانە ١٤هەزار کەسێک دەبوو. ١٢٠٠کەسیان لوڕی تفەنگ چەخماخی بوون ـ ئەوانی دیکە زۆربەیان تفەنگی پلیتەییان لە شانیدا بوو ـ کە پێیاندەگوتن غولامانی چەخماخی، ٢٠٠کەسی دیکەش تێکەڵەیەکی کورد و گورجی و پیاوەکانی ژێر فەرمانی عەلیبەگی شوقاقی، عەلیخان کوردی قەرەچۆرلوو و لوتفعەلیخانی «چرکەس» بوون. ئەو سێ کەسە هەموویان بە ئەنگێوە ناسرابوون. فەرمانـدەرانی گورجیش کەوتبوونە ڕیزی شەڕکەرانی زەندیە، بەڵام وێناچێ کە لە کەرتی ئێلجاڕیدا ڕێکخرابن.

تاقمەکانی دیکەی دەرباری بەگوێرەی فەرمانی کەمبوونەوەی ئەرکی

32- Niebuhr, Reise, 102, 103.

33- Arunova and Ashrafyan, ((Novye Materialy)), 111 note 8.

٣٤ـ پوختەیەکی وەرگیراو لە فەسایی و پەرتەو بەیزایی.

لەشکری یان چوونە سەری خزمەتی بابنۆکەرێتی سەریان دەگەیشتە هەزار یەساوڵێک (ئەو سوار و ئێسکۆرت و ڕکێفدارانەی ئەرکیان ڕێکوپێککردنی جەماوەر و کاروباری دیکەی پۆلیسی بوو). گەورەفەرماندەرانیان بریتی بوون لە: عەلیمرادخانی زەند، عەسکەرخانی ڕەشتی و میرزا محەممەدخانی قاجاری دەوەللوو. هەزارکەسی دیکە نەسەقچیباشی بوون کە ئەرکیان هاوشێوەی یەساولان بوو. حەوسەدکەس جارچی بوون و جلوبەرگی ئاڵوواڵا و جەواهێرنیشانیان دەپۆشی و سێسەدکەسیش ڕیکایان و تەتەران و پێشەنگان بوون و هەزارکەس خزمەتکاری ئاسایی. ئەگەرچی جەزایرچی و کێشکچی و قۆرچییەکان زۆرجار وەک باشترین تفەنگداران لە لایەن ڕووداونووسانەوە ناویان هاتۆتە گۆڕ[٣٥]، بەڵام وا وێدەچێ کە ئەم تاقمە قەت دەستەی هەڵبژاردەی سپا نەبووبن. لەم جەللەیەدا باسی حەوسەدکەس «زەنبوورەکچی»ش خراوەتە ڕوو، بەڵام ڕەنگە محەممەدبەگی گورجی کە تۆپچیباشی کەریمخان بوو هێندێکی چەکی قورستر بە دەستەوە بووبێ[٣٦]. ئەو جۆرەی بۆ ئێمەیان شیکردۆتەوە سەرکردەکانی ئەم هێزانە لە فەرماندەرانی سەرکیڕا بگرە تا دەباشی (سەرپەلی دەکەسان) نیزیکەی شەشهەزار کەسێک بوون. جەللەی واژەکان و زاراوەکانی لەشکری ئاکامی بنەڕەتی وشەکانی دەدەیی ترکی و میراتی قزلباشانە. هێندێکیان هەروا لە سەر شێوەی ترکی خۆیان ماون و بەشێکیش بوونە وشەی باوی فارسی، بۆیە «مینباشی» و «یووزباشی»مان هەیە، بەڵام «پێنسەدباشی»

35- Lockhart, ((the Persian Army))92,96note; تەزکەرەتولملووک، ل ١١٨ و ١٢٤.

* لە سەردەمی قەجەراندا تیرەیەک بە ناوی ڕیکا لە لوڕستان دەژیان. پاش ئەوەی کە بە دەستووری ئاغامحەممەدخان پشتکۆ و پێشکۆی لوڕستان کرایە دووبەش و والی بەناچار لە پێشکۆڕا باری لێنا بۆ پشتکۆ (پارێزگای ئیلامی ئێستا) تیرەی ڕیکاش لە خزمەت ڕکێفیدا ڕۆیشتن و لە ناوچەی مێهران و ساڵحئاوای ئێستا نیشتەجێ بوون و ئێستاش هەر پێیاندەگوترێ ڕیکا. ڕەنگە ئەوانە پاشەواری ڕیکایانی لوڕستان بن (عەلیمحەممەد ساکی).

36- Niebuhr, Reise, 118. Ferrieres de Sauveboeuf (58).
دەنووسێ کە سپای ئێران ئەودەمی زیاتر بە کاری شانۆگێران و خونواندن دەهات تا چالاکی لەشکری.

و «دەباشی»ش وەبەرچاو دێ[٣٧].

چەکدارانی ئێلجاڕی لەک و لوڕ بە خاوخێزانەوە بوونە هۆی چوونەسەری لە ڕادەبەدەری ڕێژەی جەماوەری شیراز و فارس. وەک گوتوویانە سەدان سەر خێزان لە شیراز مزڵیان بووە و هەشتهەزار کەسێک لەم ئاپۆرەیە لە وەختی ئیزنی دیداری گشتی لەگەڵ وەکیل داوایان کردبوو لە خزمەتیدا بن[٣٨]. سیاسەتی یەکسەرە و درێژەداری وەکیل سەبارەت بە پەرەی دەسەلاتی دۆستانی پێشووی لە پلە و پایەی دەرباریدا لە نموونەی کەسانێکی وەک عەبدولـلابەگی کەلهوڕ و حەیدەرخانی زەنگەنەدا کە وەک باڵوێز ناردنی بۆ ئیستانبووڵ و بەغدا، وەبەرچاو دێ (بڕواننە: ١٥ ـ ٣).

کەریمخان لە پەلامارە گەورەکاندا بە چەشنێکی نەگۆڕ سەرکردایەتی دەدایە دەس خزمان و فەرماندەرانی هەڵکەوتەی هاوپەیمان و هەڵبژاردەی خێڵاتی وەک عەلیخانی شاسەیوان و ئەمیرگۆنەخانی ئەفشار. سیاسەتمەداران و پیاوانی دەرباری نەیاندەوێرا کە خۆیان بۆ کاروباری لەشکری دەسنیشان بکەن. بەڵام لە چالاکی لەشکری زەهاودا کە میرزا محەممەدجەعفەری خوراسانی ڕاسپارد بۆ وتوویژ، نەزەرعەلیخانی زەندی وێڕای لەشکرێک نارده یارمەتی. وەکیل تەنیا جارێک داخوازی کەسێکی دەرباری بۆ سەرکردایەتی تێکهەڵچوون و هرووژمی لەشکری قبووڵ کرد و ئەویش بۆ لەشکرکردنی تەقیخانی بافقی بوو بۆ سەر کرمان و وێدەچێ کە شکستی شەرمەزارانەی ئەو کابرایەی لە سەرەتاشدا بە جەفەنگێک دانابێ. ئەم هەڵاواردنە زیرەکانەیەی دەربار و هۆربووگا جیاوازی ئاشکرای هەیە لەگەڵ ئەوەی گەڕۆکانی ئورووپایی لە بابەت ئاخری سەردەمی سەفەوی و سەرەتای گوورانی دەسەلاتی قاجارییەکان دیتوویانە و گوتوویانە: هیچ شتێک لە چەکدارانی ئێلجاڕی ئێرانی چاکتر و لە سەرکردەکانیان خراپتر نیە. ئەمانەیان لە نێوان نزمترین خزمەتکاران و وەزیران و کەسانی قەراخوقولاخی دەربار هەڵدەبژارد[٣٩].

ئەگەرچی هێزی سوارەی خێلاتی بەشی زۆری سپای دەسکەرەوەی

37- Niebuhr, Reise, 103.

٣٨ـ پەرتەو بەیزایی، ل ٥٩؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٩، بە حەوتهەزاری داناون.

39- Monteith, ((Notes on the Routes)), 118.

پێکدێنا، بەڵام سەرداری زەند سەبارەت بە ڕاگرتنی تفەنگداری پیادە کە قەبەزەی هێزە چەکدارەکانی بوون کەمتەرخەمی نەدەکرد. ڕەنگبوو کە ورەی سەربازانی خێڵەکی ڕەوەک شەڕەکە سەربخا، بەڵام دیسانیش بوونی چەند لک و پەلی تفەنگداری بێڕوحمی هەڵبژاردەی نێو ڕیزی چەکدارانی بەکرێگیراو وەرسووڕانی بارەکەی ئاوا باشتر مسۆگەر دەکرد. زەمانێک کە کەریمخان درێژەی دا بە ڕاگرتنی سەربازانی کۆکراوەی هەرێمەکانی ئێراقی عەجەم و دەشتستان، لە وەختی مەترسی سەرهەڵدانی تاقمەکانی خێلاتی و یاخیگەری دەشتستانییەکانا ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی خۆی سەبارەت بە گرینگایەتی بوونی ئەو تاقمە دەردەبڕێ.

ڕوخساری بێڕوحمانەتری ژیانی دەرباری تا ئەو جێیەی ئاشکرایە و خەڵک داوەرییان دەربارەیەوە کردوون، لە وەخت و دیمەنی گەمە و شادیدا کە بێگومان توندوتیژ و تێکەڵبوون بە چالاکی و زەبر وەشاندن و خزم و کەس و پیاوانی خێڵەکی وەکیل دەیانڕەخساندن، وەبەرچاو دێ. ئەو شێر و بەور و فیلانەی کە لە لایەن ئالوێزانی دەرەکیڕا پێشکێشی دەکران، بەگوێرەی دەقی ڕۆستەموتتەواریخ، لە جەنگەی وادا کە محەممەدعەلیخانی زەند نازناوی شێرکوژی درایە، دەنگ دەدران بۆ شەڕ و تێکهەڵچوونێکی گلادیاتۆری. دەنگۆ بوو کە پیاوێکی تایفەی زەند قورتمی فیلێکی داقڵیشاندووە. ئەم کارانە بە شێوەی دادڕین و شکاندنی نالی ئەسپ و تەنانەت شیشەی زەنبوورەک (تۆپیبچووک) بە دەستی بەتاڵ لە وەختی میواندداری کردنی سیاسەتمەدارانی غەوارەشدا گێڕدراوەتەوە. لە بارگای زەندیەدا جلیتێن گەمە و ڕمبازێنێکی باو بوو. ئێسکات وارینگ ئاوا باسی ئەم وەرزیشەی دەشتودەران دەکا: «دارتەقڵەیەک بە قەدرایە باسکەپیاوێک ڕەسوارێک دەهاڵێنن کە بە چوارناڵە تێدەپەڕێ. ئەوەی دارەکەی تێهەڵدەکرێ یان لە حەوا بە دەس دەیگرێتەوە یان خۆی وەردەسووڕێنێتەوە بەرزگی یەکسمەکەی و تەقڵە لێدەدا و دارەکە بە سەرسەریدا سەردەکا. ئەم دارتەقڵەیە وەها تیژ داوێژرێ کە وە هەرچی کەوێ بەرگەی ناگرێ[40].» سوارێک دەتوانێ کە چەند کەڕەتان بە نێزەکەی لە غاردانا، نارنجی داکراو لە سەر سەری پیاوێک بنگێوێ و هەڵیگرێ. ڕۆستەموتتەواریخ سەبارەت بە چارەنووسی

40- Waring, 50; cf. ives, 272.

عومەرئاغا حیکایەتێکی خۆشی تێدایە. عومەرئاغا جلیتبازێکی شارەزا بوو کە لەگەڵ باڵوێزی عوسمانی هاتبووە شیراز: دارجلیتەکەی کە بۆ یاری و وەرزیش نووکی ئاسنی تێنەکرابوو، هەتا هاتنی کەلبعەلیخانی زەند بۆ مەیدان یەسک و پەراسووی چەند کەس لە مەیدانداranی زەند و ئەسپەکانی هاڕین. کەلبعەلیخان بە هاواری یاعەلی شیعان دارەکەی ڕە قارەمانی ترک هاڵاند. کابرا کە لە سەر زینەکەی نوشتابۆوە، پلارەکە ڕاست لە پاشەڵی چەقی و لە نێوکی هاتەوە دەر. عومەرئاغای ناودار کەوتە سەر خاکی چارەڕەشی و ڕیزی خولەفای سێکوچکە[41]. [مەبەستی ئیمامی ئەبووبەکر و عومەر و عوسمانە. وەرگێڕ] زۆرانبازی، سەرمەقولات و ئیشکەڕنی (کەلۆتی و لاساکەرەوە دەیانگێڕا) بەشێک بوون لە کات و ساتی کایە و گەمە و سەرقاڵی گشتی لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی وەکیلدا[42].

## ١٦ ـ ٤ دەزگا و دامەزراوەکانی مەدەنی و کۆمەڵایەتی

دامودەزگای ئیداری و کاروباری خزمەتکردنی شیراز لە دەورانی وەکیلدا دەبێ بە پێوانەیەکی بەرفرەوان و بەرچاو وەک سایری شارەکانی دیکەی ئێران بووبێ. هەرچۆنێک بێ لە ڕووی ئەو نموونانەڕا کە خاکی زەند وەک یادگار لە پاشی بەجێماون دەردەکەوێ کە ئەو چەند شتێکی لێزیاد کردن و گۆڕینی و پایەختێکی لە ڕووی سرشت و تەبیاتی خۆی بنیات نا هەتا جیاوازی نێوان شارەکانی پارێزگاکان و پایتەخت نیشان بدا. ئێمەش بە پارێزێکی زیاترەوە باسی شیراز دەکەین وەک بابەتێکی تایبەت.

هەڵوێست و ڕێبازی وەکیل بە مەبەستی کۆکردنەوە و ڕاکێشانی تاجران و هونەرمەندان و سنعاتکاران و دنە دانی ئەفسەران و خزمانی بە ئامانجی نیشتەجێ بوون لە شیراز و دامەزرانی ژمارەیەکی زۆر لە خاوخێزانی قۆشەنی خێلاتییانەی حکوومەتەکەی لە ژوور و دەوروبەری پایتەخت وای کرد کە ڕێژەی

---

٤١ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٦٧ ـ ٣٦٩.

٤٢ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤١٠.

جەماوەری شار بە شێوەیەکی لە ڕادەبەدەر زیاد بکا. دووبارە سازکردنەوەی شوورەی شیراز و بوونی سپاکەی لە فارس کاریکی کرد کە زۆر بە سووکی دوژمنانی ببەزێنێ. گەشەی ئەم شارە وەک ناوەندی حکوومەت بوو بە هۆی ئەوەی کە ڕێکخستن و هێمنایەتی نێوخۆ زۆر چالاک دەستەبەر بکرێ. نیبوور ئەم کار و هەنگاوانەی لە سەرەتای فەرمانڕەوایەتی وەکیل لە شیرازا دیتووە و بۆچوونەکانی زۆر لەگەڵ ڕوانگەی فرانکلین کە بیست ساڵ دواتر لە زەمانی حکوومەتی جەعفەرخان لەم شارە بنەجێ بووە یەکتر دەگرێتەوە.

هەمیشە دەروازەکانی شار بە وردی چاوەدێری دەکران و تەنانەت ئەگەر کەسێک گوتبای غەریبە ڕێی نەبوو کە بێئیزنی هاتوچۆ پێبنێتە شار. بەگشتی ژنان ئیزنی چوونەدەرەوەیان نەبوو مەگین بەهەڵکەوت، چونکە ڕەنگبوو کە پیاوێکی زیندانی چارشێو بە سەر خۆی هەڵکێشێ و دەرباز بێ[43]. پاش تاوپەڕین دەروازەکان گاڵە دەدران و کیلەکانیان هەتا سبەینێ بەیانی لای حوکمڕانی شار دەمایەوە. لە سەعات ٨ و ٩ی ئێوارەدا تەپڵی ورپاکردنەوە لێدەدرا، سەعات ١٠/٣٠ تەپڵی سێجارەیان دەکوتا و دەبوو بە حکوومەتی لەشکری و بەربەستکردنی هاتوچۆ. ئەوانەی پاش ئەو جەنگە گیرابان دەیانبردنە لای داروغە، ئەگەر نەیانتوانیبا بیانوویەکی بەجێ بێننەوە یان جەریمە دەکران یان فەلاقە[44].

داروغە و پیاوەکانی هەروەک ئێستا لە ڕێکخستنی نەزم و هێمنایەتی کۆمەڵایەتی و ئەرک و ڕاسپاردەی هێزی پۆلیسی شارا وەبەرچاو دێ، بەرپرسی شاری شیراز بوون: داروغەش پلەیەکی ئیداری بوو ـ لانیکەم لە شیراز ـ کە چاوەدێری دەکرد بە سەر نرخی وردەفرۆشی و سەنگ و تەرازوو و گەز و چارەگ و چی ئاوا کە پێویستی بازاڕ بوو. موحتەسیب لەبەر دەستی ویدا کاری دەکرد[45]. ئەرکەکانی داروغە لە ئیسفەهان لە قۆناخی کۆتایی سەردەمی سەفەویدا زۆر وەک کاری موحتەسیب دەچوو لەم زەمانەدا. ئەویش زۆروکەم لەو کێشە بچکۆلانەی نێو شاردا ـ کە سەریان نەگەیشتبایە ١٢ تمەن ـ داوەری دەکرد. ئەگەر

43- Niebuhr, Reise 114.

44- Fracklin, 130.

45- Ibid, 142; Waring, 46 – 65; ڕۆستەموتتەواریخ، ل ١٠٨.

یەکێک لە زیندانییەکانی دارۆغە مردبایە، دیوانبەگی (بەرپرسی راپەراندنی ئەم ئیش و کارانە) بە کێشەکەدا دەچوو. ئەو سەرۆکی دادگای تەناهی بوو کە زۆرجاران وەک گەورەئەفسەری پۆلیسی پایتەخت کاری دەکرد[٤٦]. لە سەردەمی کەریمخانا ئەبولفەتحخانی کوڕەگەورەی دیوانبەگی شیراز بوو[٤٧]. تەناهی و هێمنایەتی شاری شیراز تەواو سەقامگیر بوو: ئەوجۆرەی کە خەڵکی خۆماڵی شیراز لەبیریانە لە تەواوی دەورانی حکوومەتی وەکیلدا لەبەر بوونی پۆلیسی سەرنجڕاکێش و ئەو ڕێکخستنەی دایناوو تەنانەت جارێکیش ئاڵۆزی و ئاشۆپاشۆی وا کە خوێنی لێبکەوێتەوە رووی نەداوە[٤٨].

وەکیل شاری کردبوو بە دوازدە بەش و هەر بەشەی پێیدەگوترا گەڕەک. ئەم گەڕەکانە دەمڕاست و چاوەدێرێک بە ناوی کوێخا بە سەریان رادەگەیشت. ئەرکی کوێخاکان برێتی بوو لە چارەسەر کردنی نێوانگرژی دەروجیرانان، دانی راپۆرتی ئیداری لە بابەتی تایبەتا، ئاشنابوون لەگەڵ دانیشتووان و هەڵسەنگاندنی داهاتیان بە مەبەستی یارمەتیدانی کۆکردنەوەی باجی گەڕەک و دامەزراندنی تاقمەکانی چەکدار و کاری لەم چەشنە. بەر لەوەی کە وەکیل لە ساڵی ١٧٦٥دا بگەڕێتەوە شیراز، سادقخان جێی پێویستی بۆ سپا و میوانە چاوەروانکراوەکانی دابین کردبوو[٤٩]؛ زیادی ئەم مزڵ و خانووبەرانەش درا بە دانیشتووانی شیراز و قەدەغەیان لێکردن کە خۆ لە کڕین و فرۆشتن و ئیجارە و چاککردنەوە و دەستێوەردانی ماڵەکانیان بپارێزن[٥٠].

پلەی بەرزی ئاینی بە شێخولئیسلام دەناسرا. ئەو لە بابەت لێکدانەوە و شیکردنەوە و بەڕێوەبردنی یاساکانی شەرعیدا بە ڕێبەر و سەرۆکی کاروباری ئاینی دادەندرا. وەکیل ڕاستەوخۆ شێخولئیسلامی هەڵبژاردبوو[٥١]. بەڵام جەغزی

---

٤٦ـ دەستوورولملووک، ل ٤٢٨ـ٤٢٩؛تەزکەرەتولملووک، ل ٤٨، ٨٢، ٨٣، ٩٠، ١١٣ و ١٤٩.

٤٧ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤٣٤.

48- Waring, 302.

49- Ibid, 64.

٥٠ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤٣٤.

51- cf. Algar, 40.

کاروباری دادوەری شێخولئیسلام تەواو تەسک ببۆوە لە کێشەی ئایینی و تەڵاق و ئەو وردەئیشانەی شاردا. سەرۆکی کاروباری شار لە کێشەی تاوان و چەپەڵکاری‌دا پێی‌دەگوترا قازی. دەستووری سزادانی وەک برینی گوێ و کەپۆ لە سەر دزی، دەرهێنانی ڕیخۆڵە و هەڵواسین بە دارەوە لە سەر چەتەیی و ڕێگری بەشێک بوون لە دەسەڵاتی[٥٢]. نیبوور یەکێک لەم دادوەرییە قورسانەی بە چاوی خۆی دیتووە و دەنووسێ کە گوێی دوو قەسابیان لە بزمار دابوو و تا ئێوارەی ئەوڕۆژە ڕایانگرتن چونکە گۆشتی پیسیان فرۆشتبوو[٥٣].

لەبەر ئەم جزادانە سەختانە هێمنایەتی باڵی بە سەر پایتەخت و ناوچەکانی دەوروبەری‌دا کێشابوو، چونکە لە هێندێک بابەتان‌دا وەها توندوتیژ دەجووڵانەوە کە بڕیارەکان گەلێک جاران زۆر زاڵمانە و ناباو خۆیان دەنواند. خاشەبڕکردنی لوڕەکانی لیراوای کۆهکیلۆیە بۆ بیرهێنانەوە دەشێ (بڕوانە: ٧ ـ ٤). کاری مەحکەمەی کەریمخان کە بە دەس ژێردەستانی هەڵدەسووڕا هەرگیز بە بڕشت و تەنانەت نەگۆڕ و یەکسان نەبوو. نیبوور چەند بابەتێک شالاوی تەمێیانە و دەمکوتکردنی بە چاوی خۆی دیتووە و باسی هرووژمی هێزەکانی خۆجێیی و قۆشەنی ئەمیرگۆنەخانی ئەفشار لە ساڵی ١٧٦٥ لە ناوچەی تەنگستان دێنێتە گۆڕ. نیبوور دیتبووی کە بۆ تەمێکردنی کەسانی یاغی یان ئەوانەی کە خۆیان لە دانی باج دزیوەتەوە بە خاوخێزانەوە سزایان داون و پیاوەکانی خان «بەپێی ڕێسا» گوندەکانیان خاپوور و تالان کردوون. چەند شەو دواتر کاتێک بە نیزیک دوو گوندی دراوسێ‌دا تێدەپەڕی، هەواڵیان دا کە یەکێک لەم دوو دێیانە کەوتۆتە بەر شالاوی تالان و بڕۆ، بەڵام ئەمیرگۆنەخان و چەکدارانی هەر پێشی ڕانەچەنین و گوێشیان نەدایە[٥٤].

کەچی هێمنایەتی و هێوری ڕێژەیی ڕێوبانان لە حکوومەتی وەکیلا دوای سەردەمی سامناکی قۆناخی بۆشایی دەسەڵات جێی پەند و نموونە بوو. داستانی ئەم تەناهییە نە تەنیا لە لایەن ڕووداونووسانەوە نووسراوەتەوە بەڵکوو هەر کەس لەو ڕۆژگاری‌دا خەریکی گەشت و گەڕان بووبێ، ئەوەی زانیوە. وەک

52- Francklin, 131 – 132.
53- Niebuhr, Reise, 116.
54- Niebuhr, Reise, 179 – 180.

نیبوور گێڕاویێتەوە: لە ڕێگای گەڕانەوەیدا بۆ بووشێهر کابرای بەڵەدی عەرەبی هێندێک زانیاری لەگەڵ ئەو زیارەتکارە شیعەمەزەبانەی کە دەچوونە زیارەتی مەشەد ئاڵوگۆڕ دەکرد، «هەردک دەستە دەقودۆغر دەیانگوت کە لە هیچ شوێنێکی دنیا ناکرێ وەک ئێران ئاوا لە هێمنایەتیدا سەفەر بکەی[٥٥].» زێدە لەمەش ئەم گەڕۆکە زۆر کەوتۆتە ژێر کارتێکردنی ئارامی و مەندی و کەشی دۆستانەی شیراز. بەتایبەت لە ڕوانگەی ئەوڕا وەک گەشتیارێکی بێگانە، جیاوازی خۆ بەکەمگرتنی جەماوەری خەلک و خودی سادقخان کە بەگەلەربەگی فارس بوو لە چاو ئەو سووکایەتی پێکردنانەی کە لە قاهیرە لەبەر ترسان لە غەواران نواندبوویان، مەبەستێکی سەرسوڕهێن بووە[٥٦]. پێموایە کە ناوبانگی ئەم کردارە چاک و شیاوە بەتایبەت خۆپاراستنی وەکیل لە دەستێوەردانی ڕەوت و سیاسەتی ئایینیدا لە چاو زێدەڕەوییەکانی شاسولتان حوسێن و نادرشا جێی خۆیەتی.

ئەگەرچی ئاخرییەکەی جوانکاری و کەلتەکرانەوەی شیراز لە ئەستۆی خەلکی ئەوشارە بوو، بەڵام وەکیل لەم بوارەشدا هەولی دەدا. یەکێک لە ئەرکەکانی «ڕێکایان» دنەدان و ڕاسپاردنی خەلکی گەڕەک و شەقامان بوو بۆ پاراستنی پاک و خاوێنی و وێدەچێ دادگایەکیش بۆ چەسپاندنی ئەم مەبەستە پێکهاتبێ[٥٧].

لە نێو ئەو کارە بەڕێوەچێ کۆمەلایەتییانەی کە شیراز بەو باریدا بەگشتی قەرزداری کەریمخانە و ڕووداونووسان لەبەر ڕێز و حورمەتی ناوی وەکیل، چاویان لێقووچاندووە و باسیان نەکردووە، بەڵام نووسەرانی هاوچەرخ بە دلبەندی و ئافەریمەوە خستوویاننە ڕوو، دانانی جندەخانانە. «هەزاران ژنی مانگڕوخسار» لە خۆفرۆشی ساکاردۆە بگرە هەتا جندەی جندەخانان، سەرەتا لە چەند شوێنی تایبەت لە دەرەوەی شار جێیان بۆ دابین کرابوو و چەکدارانی لەشکرەکەی بۆ ڕابواردن دەچوونە وێ[٥٨]. وەک تەواوی

---

55- Ibid, 178.

56- Ibid, 115.

٥٧ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٠٩.

٥٨ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٤٠؛ دونبولی، تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی ٢، ل ٤٣.

قۆشەنەکانی بزۆک زۆربەی ئەم لەشکرە لە هەوارچییان پێکهاتبوو. هەروەک تێگەیبوو تەنانەت لە سەردەمانی ئاشتی و ئارامی درێژخایەنیشدا بوونی ئەم چەشنە شوێنانە پێویستی دەنواند و ئەم بنکانەی بە ئامراز و پێداویستی تەناهی کۆمەڵایەتی دەزانی. بەم کارەی ڕێگای دەربازبوونێکی بۆ هێزە سەربزێوەکانی پیاوانی خێڵەکی دانا کە ڕەنگبوو دەس بەرن بۆ ناموس و تاڵانی خەڵک. لەم شوێنانە نە تەنیا پیاوانی لەشکری، بەڵکوو خەڵکی شار، کاربەدەستانی بارگا، میوانە بارمتەکانی وەک عەبدورڕەززاقیش ڕابواردنێکی ڕۆژانەیان بۆخۆیان دیتەوە. بێشک تامەزرۆیی وەکیل سەبارەت بە جووت بوون دنەی دابوو کە بکەوێتە ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکە سەخت و بارناسکە و ئەگەر لە ڕووی مەرایی و پێداهەڵدانەوە نەبێ، لێیان گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی شاری بێ خەرابات وەک ماڵی بێئاودەست و کەلاوەیە[٥٩].

کەریمخان بەردەوام شۆخ و شەنگانی هەڵبژاردەی خەراباتی بۆ ڕابواردن دێنایە کۆشکی خۆی. یەکێک لەمانە ژنێکی جەفەنگباز و دەنگخۆش و پەروەردەکراوی شاعیر بوو بە ناوی «شاخینەبات». ئەم ژنە لە ساڵانی کۆتایی تەمەنی وەکیلا یەکێک لە ماشقەکانی بوو. وەختایەکی نەخۆش کەوتبوو دەستووری دا کە هەرچۆنێکی بۆیان دەکرێ ماریجە و ڕزگاری کەن؛ تەنانەت دەستەیەک لە ژنانی دیکەی لە دەوری جێوبانی گێڕا هەتا بە دۆعا و تەسەلمان نەخۆشییەکەی بپەڕێتە سەر یەکێک لەوان، لەم وەختەدا کە جوانەاوی ڕشت و مرد، غەزەلێکی لە سەر زمانی بوو. وەکیلی ئاڵۆزکاوی پەرێشان وێنەی کێشراوەی و هۆنراوەی کێلەکەی کە میرزا سادقناوێک هۆندبوویەوە، لای خۆی ڕاگرت[٦٠].

چیرۆک و بەسەرهاتی جوان و ڕەنگاوڕەنگتر سەبارەت بە دەزگا و دامەزراوەکانی سەردەمی کەریمخان و هۆگرییە تایبەتییەکانی لە گۆڕێ دان. بەڵام لەودیو سنووری ئەو کەیف و نەهەنگ و خۆخاوکردنەوانەی عەبدورڕەززاق

---

٥٩ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٢٩ ـ ٣٢٦ و ٣٣٩.

٦٠ـ هەر ئەم سەرچاوەیە، ل ٣٢٦: بەشێکی هەڵبژێراو لە چیرۆک و بەسەرهاتەکانی خۆش و بەتامی شیراز لە ڕۆستەموتتەواریخ وەرگیراون، لە کتێبی «کەریمخانی زەند»ی نەوایی‌دا، ل ٢٥٦ و ١٩٧ ـ ١٩٦دا وەبەر چاو دێ.

و ڕۆستەمولحوکەما باسیان کردوون، دەبێ لە ڕوانگەیەکی زانستییانەتری «ئێسکات وارینگ»ەوە ئەم دامەزراوەیە لە وەچەیەکی دواترا بخرێتە بەر توێژینەوە. لە ڕووی ئەم لێکۆڵینەوەیەڕا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە کیژان و ژنانی سەماخانە و جندەخانەکان تەواو بە وردی دەستەبەندی و ناونووس کرابوون و کاتێک ڕایاندەگەیاند کە مردوون یان مێردیان کردووە یەکی دیکەیان لە جێی دادەندرا. هەروەها لە لایەکی دیکەوە توێژێکی کۆمەڵ بوون کە باجی قورسیان دەدا و ئەوەندەی کە لە بواری کۆمەڵایەتیدا کاریگەر بوون ئەوەندەشیان دەور دەگێڕا لە داهاتی سامانی گەورەشاری زەندا[61].

## ١٦ ـ ٥ خوو و خدە و ژیانی تایبەتی

دەربارەی مێهرەبانی، ساکاری، دڵاوایی و ڕووحی دادپەروەرانەی وەکیل نەقڵ و نەزیلەی زیاتر لەچاو فەرمانڕەوایانی دیکەی ئێرانی وەبەرگوێ دێ. هەر لەبەر ئەم تایبەتمەندییانە پادشایەکی چاک بوو کە خەڵکی وڵاتەکەی بەڕاستی ڕێزیان بۆ دادەنا و خۆشیاندەویست. خان لە ڕیزەی میرانێکی وەک نۆشیروانی عادڵ، سوڵتان سەنجەر و شاعەباسە. ئەگەرچی فەرمانڕەوایان و پادشایانی دیکە لە ئێران بە باری شانازی لەشکری و بڕشتی نەتەوایەتیدا لەوی سەرترن، بەڵام کەریمخان لە نێو خەڵکی وڵاتەکەیدا وەک پیاوێکی لێوەشاوە کە بوو بە حوکمڕانێکی دڵخواز، هەتا ئێستا پلە و پایەی خۆی پاراستووە و نەبێزراوە.

ڕەنگە زۆرێک لەم داستانانە لە ڕۆژگاری ئێمەدا بکەونە بەر شەپۆلی ناڕەزامەندی یان لە لایەن خەنیمان و لایەنگرانی خانەدانی قاجارەوە بە هەڵبەستراوی لێزیادکراو دابندرێن و تاقمێکی زۆریش هەر بەئاشکرا باسی ساختەبوونیان هێناوەتە گۆڕ. جودا لە هەر باس و بابەتێک بێگومان زۆرەملی و بێڕۆحمییەکانی نادرشا و ئاغامحەممەدخان پلەی پیاوچاکی کەریمخانیان بەرز کردۆتەوە. هێشتاش ئەوەندەی بتهەوێ چیرۆک و بەسەرهاتی ئاوا سەبارەت بە کەریمخان لە گۆڕێ دایە کە لەگەڵ بەڵگەنامەکانی مێژوویی یەکتر دەگرنەوە و

61- Waring, 80.

ئۆباڵ بۆ داوەری وەچەی دوای وەکیل دەکێشن.

کەریمخان پیاوێکی بەقەڵافەت و تەرز و خاوەن ورەی بەرز بوو کە ڕیشی پڕی بەرداوەتەوە و سمێڵی چڕی هێشتوتەوە و لە قسەکردنا پیاوێکی خاکی و لە سەرەخۆ بووە[٦٢]. شەرمی بە بنە و بنەچەکەی نزمی خۆی نەدەهات و قەت نەیدەویست کە ڕەگەزنامەی سەرتر لە سەرۆکی پێشووی تایفەی لە چیاکانی زاگرۆس بۆخۆی سازبکا. بەگوێرەی گێڕانەوەی فۆرستێر «ئەو قەت نەیدەشاردەوە کە لە تافی لاوی‌دا چەتە بووە و کەڵپی بۆیە شکاوە، ئەو یەکسمەی دزیبووی و دەیبرد لووشکەی لێداوە[٦٣].» مەشهوورترین حیکایەتێکی کە سەبارەت بە سەرەتای ژیانی بە شێوەیەکی گەرم و دڵگر و نەخشین دەماودەمی کردووە و بەتایبەت بۆخۆشی زۆری مەیل لە گێڕانەوەی بووە ئەمەیە: وەختایەک لە سپای نادری‌دا تەنیا سەربازێکی هەژار و مسکێن بووە بە بازاڕدا گەڕاوە و هەرکە چاوی بە ڕەخت و زینی زێڕکفتی یەکێک لە سەرکردەکانی ئەفغانی کەوتووە کە بۆ کەڵتەکردنەوە لە لای زین‌دروویەک داندراوە، یەکودوو دزیویەتی. هەر کە زانیویەتی کابرای زین‌دروویان هەڵپێچاوە و لە سەریان کردۆتە ماڵ و ڕەنگە بە پەتییەوە کەن، هاواری ویژدان تینی بۆ هێناوە تا پەنامەکی زینەکە بەرێتەوە ئەو شوێنەی کە دزیبووی. وەختایەک کە ماتەی هەڵگرتبوو دیتی ژنی کابرای زین‌دروو زانیویەتی زینەکەیان لە جێی خۆی داناوەتەوە و کەوتۆتە سەر سوژدە و سەری وەئاسمانەی خودا هێناوە و پاڕاوەتەوە کە یارەبیی هەرکەس ئەوکارەی کردووە عومری درێژ بێ و خودا سەت زینی ئاوای بداتێیە ... لێرەدا وەکیل بزەی دەهاتێیە و دەیگوت: «من بەڕاستی دڵنیام کە دۆعای بەخێری ئەو ژنە گیرا بووە و ئەو بەخت و یەقباڵ و شکۆ و شەوکەتەی کە داوای لە خودا کردووە گرتوویەتی[٦٤].» سێرجان مێلکۆم ئەم داستانەی بە یەکێک لە نموونەکانی دڵپاکی ئەو فەرمانڕەوا بەدەسەڵاتە داناوە.

مێلکۆم هەروەها سەبارەت بە دەمار و هەستی بەتین و توانست و

---

٦٢ـ دونبولی، تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی یەکەم، ل ١٣١ ـ ١٣٢.

٦٣ـ فۆرستێر، پەراوێزی لاپەڕە ٢٤١.

64- Malcolm, 148 – 149; فەسایی بەرگی یەکەم، ل ١١٩؛ قەزوێنی، ئا ـ ب ١٤٥.
Fraser, An Historical Account, 264.

چراغپێ نەبوونی بۆ بیستنی ئەو جەفەنگانەی پێی ئەویان دەگرتەوە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە: ڕۆژێکی بە «ئیشکەڕن»ی دەرباری گوت کە بڕوا و بزانێ ئەو سەگەی دەرەوەی حەساری قەسرێ بۆ دەوەڕێ. ئیشکەڕن ڕۆیی و دوای ئەوەی ماوەیەک بە وردی گوێی هەڵخست گەڕایەوە و بە دەنگێکی بەرز گوتی دەبێ وەکیل یەکێک لە مەزنانی خزمانی بۆ هەڵێنانی ئەو ڕازە بنێرێ هەتا بزانێ ئەو چوارپێیە دەڵێ چی، چونکە ئەو سەگە بە ڕاوێژی زمانخواران کە سەرۆکانی تایفە تێیدەگەن قسە دەکا، بەڵام من هەر حەرفێکیشی لێ حاڵی نەبووم. (کەریمخان بە زاراوەی لەکی قسەی دەکرد و بە لەکانیان دەگوت زمانخوار) کەریمخان پڕبەدڵ پێکەنی و خەلاتی کرد[٦٥]. ڕەنگە ئەم ئیشکەڕنە هەر ئەو نەجەفمیرحوسێنخانە لاساکەرەوە بێ کە لەبەر جەفەنگێکی نابەوەختی تەشەراوی، وەکیل ١٥٠٠تمەنی جەریمە کرد؛ بەرتیلێکی دا بە نیگابانان کە لێیگەڕێن بچێتە لای وەکیل، چونکە بە جەفەنگ لێدان و نوکتە گێڕانەوە هەم خۆی ڕزگار کرد و هەمیش تاوانانەی نەدا[٦٦].

سەبارەت بە ڕاوێژی لوڕی و خدەوخووی وەکیلەوە چیرۆک و بەسەرهات زۆرن. وەختایەک لە ساڵی ١١٨٧ی کۆچی / ١٧٧٣ی زایینیدا شاسمایلی سێهەم مرد، پیاوماقووڵان و خانزادەکانی دەربار بە دابی لوڕان کلاوەکانیان لە قوڕ و خۆڵەمێش وەردەدا و بە دوای مەیتەکەیدا جەللە دەبوون[٦٧]. ڕواڵەت و تەبیاتی وەکیل بە چاکی بنەچەکەی خێلاتی لێوەدەردەکەوت. هاوینان باڵاپۆشێکی ساکاری بە سەر شانی دادەدا و جلکی ڕەشی بە دابی خێلاتییان دەکردەبەر. لە زستانیشدا کەوای جاوی ئاودامێنی بەرداری لەبەر دەکرد و کلاو و پێچی زەردی کشمیری لە سەر دەنا و ڕاست هەروەک ئەو زەمانەی لە کوێستانەکانی وڵاتی خۆی دەژیا جلکی دەپۆشی. هەرگیز جغە و جەواهێراتی دیکەی وە کلاوەکەی نەخست. زیاتر پێی خۆشبوو لە سەر بەڕە و لمەد دانیشێ هەتا سەر تەخت و هەمیشە لە قاپ و قاچاغی مزدا شێوی دەخوارد .

---

65- Malcolm, 551, 552.

٦٦ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤١٠.

٦٧ـ هونەرفەر، ل ٥٢٩؛ پەراوێزی ژمارە یەک؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٩.

تایبەتمەندی وی لەگەڵ جلوبەرگ و خۆڕازاندنەوەی فەتحعەلیشا کە بەگوێرەی سەرچاوەی باوەڕپێکراو نیشانە و لاسایی پادشایانی سەفەوی بوو، زۆر جیاواز بوو[٦٨]. کەریمخان بەپێی هەڵومەرج مانگێ جارێک دەچـوو بـۆ حـەمام و جلکـی دەگۆڕی. تازە ئەوەش بە پێهەڵێنان و زیادەڕەوی دادەندرا، چونکە وەختایـەک وەکیل ئەو مەبەستەی لای یـەکێک لـە لوڕسـتانییەکان درکانـد، کـابرا سـەیر پێیڕاچەنی و گوتی: لەوەتی وەبیری دێ شتی وای نەبیستووە! و درێـژەی دا کـە پیاوانی بنەماڵەی لە ژیانیاندا دوو جار خۆیان دەشۆن، یەکیان ئەو وەختەی لە دایک دەبن و مامان مەلەیان دەدا و ئەوی دیش زەمانێک کە دەمرن[٦٩].

وەکیل زۆری بێز لە دووڕوویی و ڕیابازی هەڵدەستا. نموونەی ئەم شێوە بۆچوون و بیرکردنەوەمان لە کـرداری لەگـەڵ ئاغامحەممـەدخانی ماکیـاولی و برازای مێرمنالیدا وەبەرچاو هاتووە(٩ ـ ٧). ئەو پیاوە فێڵەبازەی کـە دەیگـوت پاش زیارەتی قەبری باوکی (ئیناق) چاوی کوێری چاک بوونەوە ترۆی کرد و بـە تووڕەیی و غەزرینەوە گوتی کە باوکی پیاوێکی ئازای جوامێر بوو، بەڵام هەرگیز لە ڕیزەی پیاوچاکان نەبوو کە موعجیزە بکا[٧٠].

زۆر باسی ئازایەتی و خۆڕاگری و قەڵافەت و شان و باهۆ و بەهەڕەکەتی وەکیل کراوە هەروەک خانەکانی دیکەی زەند. بێگومان فرانکلین نایخاتـە تـای تەرازووی جەعفەرخانی ترسەنۆک و دەڵێ کـە هەمیشـە لـە ڕیـزی پێشـەوەی لەشکرەکەی شەڕی دەکرد؛ ئەم کـارە لـە ئێرانـا جێـی سەرسـوڕمانە، چونکـە هەمیشە فەرمانـدەران لـە مـەودای دوورتـری بـەرەی پێشـەوە مەیـدانی شـەڕ هەڵدەسووڕێنن[٧١]. لە ڕووی ئەو باس و بابەتانەی کـە غـەففاری سـەبارەت بـە شەڕەکانی نووسیویەتی وا دەردەکەوێ کە وەک نادرشا دلێر و ئازا نەبووە و بـە سەری زمانان ئەم بۆچوونەی فرانکلین دەسەلمێنێ کە: هەمیشە لە مەیدانی شەڕ لە شوێنێک. لەنگەری دەگرت کە دەنگی بە تێکڕای هاوڕێیانی سەرەکی خۆی ڕابگا

---

68- Porter I, 328; Maredith, 61 – 62.

٦٨ـ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی ٢، ل ٤٨؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢٧٩؛ مودەڕڕیسی گیلانی، ل ٤٥٤.

٧٠ـ مودەڕڕیسی گیلانی، ل ٤٣٢.

71- Francklin, 305.

و لە وەختی خۆشیدا ئامادەی پاشەکشە بێ، هێزی پشتیوانی تێوەرنەدەدا و ئەو دەمەی پێویست بووایە خۆی تێوەدەگلا. ئەگەرچی بە ئەندازەی نادرشا چاکی لە شەڕ نەدەزانی، بەڵام سەرکردەیەکی شیاو بوو. تەنیا شتێکی کە ڕەسەر نادری دەخست خۆڕاگری و نەبەزی بوو لە شەڕا: ئەم چۆنیەتییە لە ماوەی دەورانی ژیانیشیدا وەبەرچاو دەهات و بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە لە گەمارۆی کرماشان و بەسرەدا خۆی نواند و خیرەسەری و تایبەتمەندی گەڕانەوەی لە هەتلەڕێیان، لە شکستە ئاشکراکانیدا دەرکەوت.

بەڵام جگە لەم بابەتانەی باسیان کرا ئەوەی کەوا برەوی بە توانست و شکۆی دەسەڵاتی دا پێڕاگەیشتن و هاوخەمی بوو دەربارەی ژێردەستانی؛ نیازەکانی دەناسین و سەبارەت بە تەواوی چین و توێژەکانی گەلەکەی هەستی لێبووردن و چاوپۆشی و لاواندنەوە و پێڕاگەیشتنی دەخستەڕوو. ئاکامی ڕاستەقینەی ئەم ئاکارە و خۆپاراستن لە دینداری سەختگرانە و بەتایبەت جیاوازبوونی خڕ و پتوونی لەگەڵ شێتی خۆبەزلزانی نادری و زۆرەملی شێتانەی ئاغامحەممەدخان ئەوی لە هاوچەرخانی خۆی و وەچەکانی داهاتوو تاق دەکردەوە. بێجگە لەوەی هەموو ڕۆژێک ماوەیەکی دادەنا بۆ وەرگرتنی سکاڵا و داخوازەکان و لە ناوەندی دادی باوی فەرمانڕەوا ڕۆدەنیشت، هەمیشە ژێردەستانی دەستیان وێیڕادەگەیشت. جارێکیان کە خەریک بوو کاری تەواو بێ و بڕوا تاجرێک هات و گوتی وەختایەک خەوی لێکەوتووە کاڵایان لێ بەتاڵان بردووە. وەکیل شەکەت بوو بە بێوازی گوتی: «بۆ خەوتبووی؟» سکاڵاکار لەڕێوە وڵامی داوە: «لەرووی بانگەشە و خۆ هەڵدانەوەی تۆڕا پێم وابوو بەخەبەری و کەترەخەمیم کرد.» لەبەر ئەم وڵامە ئازایانە وەکیل ئارام بۆوە و دەستووری دا کە لە خەزێنە تەواو قەرەبووی خەسارەتی بکەنەوە و هەوڵیش بدەن بۆ دۆزینەوەی ماڵەکەی[٧٢].

یەکێک لەو ئەفسانە دڵگرانەی وەکیل دەگەڕێتەوە سەر مێهرەبانی دەرهەق بە خەڵکی ئاسایی قەڵەمڕەوی حکوومەتەکەی و ئی ڕۆژگارێکە کە ڕاست

72- Malcolm, 150 – 151; Fraser, An Historical Account, 263 – 267.
مودەڕپیسی گیلانی، ل ٤٣١.

بۆخۆی بە سەر کارەکانی بیناسازی شیراز ڕادەگەیشت: گۆیا ڕۆژێکی کە بە قەننەی جەواهێرنیشان و ڕازاوە سەرقاڵی مژدانی تەماکۆ بووە کەسێک لە خزمەتکارانی دەربار دیویەتی کە یەکێک لە فەعلاکانیش بەدزی خەریکە مژ لە قلیانی سواڵەت دەدا و لە گۆشەیەک ماتەی هەڵگرتووە. وا بە تووڕەیی تاوی کابرای دا کە قلیانەکەی لە دەستی بەربوو و وردوپرد بوو. کابرا دەستی لە کارەکەی هەڵگرت و ڕووی کردە ئاسمان و بە بۆڵەبۆڵ دەستی دایە تووک و نزا. وەکیل پێیزانی و کابرای بانگ کرد هەتا لە چۆنیەتی ورتە و بۆڵەی حاڵی بێ. گوتی کە لەبەرخۆیەوە سێ «کەریم»ی پێکەوە هەڵسەنگاندوون. واتە خوداوەندی کەریم و دڵاوای ئاسمانان و کەریمخانی وەکیل کە خواقلیانێکی ئاوای داوەتێ و خۆشی کە «کەریم»ێکی ڕووتە. کابرای لاواندەوە و لە پەنا خۆی دانا و بەشداری قلیانکێشانی کرد؛ وەختایەک کە هەستا بڕوا قەننە گرانەکەی دا بەو کابرایە و وەبیری هێنایەوە کە ئەم قلیانە بایی حەوتهەزارتمەنێک دەبێ و نەچێ هەزاران بیفرۆشێ. پیاوێکی وەکیل پاشان سەرلەنوێ قلیانەکەی لەو کەسە کڕییەوە کە کابرای کرێکار پێی فرۆشتبوو[٧٣].

## ١٦ ـ ٦ بیروڕای پێچەوانە

کەیف و نەهەنگی تایبەتی وەکیل خواردن و خواردنەوە و کۆمەڵێک ڕابواردن بوو کە بە شێوەی باو، خاڵی هاوبەشی تێکڕای میرانی ڕۆژهەڵاتە. هێندێک جاران سەرانسەری شەو هەتا بەری بەیانی خەریکی بەزم و ڕابواردن دەبوو و پاشان کە تیشک لە سەرانی دەدا، بەر لەوەی خۆ بداتە ڕاپەڕاندنی کاروباری ئەیالەتی خەوی لێدەکەوت. وەکیل لە شەرابخواردنەوەدا زۆری شوو لێهەڵدەکێشا و بۆ جووتبوونیش ویشکەسوێ بوو. هەتا ساڵێک بەر لەوەی بمرێ و تەمەنی لە حەفتاوهەشتا گاڵەی دەهات سەتوبیست ژنێکی لە

---

٧٣ـ ئیسفەهانی ٣ ـ ٤: ڕەوزەتوسسەفای ناسری، بەرگی ٩، ل ١٢٤؛ جیاوازی هەیە لەگەڵ گێڕانەوەی نەوایی لە کتێبی کەریمخانی زەندا، ل ٢٨٦ ـ ٢٨٧.

حەرەمخانەکەیدا ڕاگرتبوو[٧٤]. خوێندنەوە و پێداچوونەوەی زیاتر دەربارەی ئەم لایەنەی ژیانی دەریدەخا کە کەیف و خۆشڕابواردنەکانی بە لای ئابڕووداری و ئینسافدا شکانەوە. ڕۆژێک گەنجێکی ملئەستووری بیستساڵانە لە ورمێڕا هات و پێی نایە کۆشکی پاشایەتی شیراز و بانگەشەی ئەوەی کرد کە کوڕی خانە و دایکی لە وەکیلی گرتووە. بۆ سەلماندن و سوورکردنەوەی ئەم داوایە ئاڵقەیەکی نەقیمداری کە وەکیل لە وەختی دەستێکەڵکردن لەگەڵ دایکی وێی دابوو نیشانی دا؛ کەریمخان بەم مەبەستەی زانی و لاوەکەی بە کوڕی خۆی قبووڵ کرد[٧٥]. جارێکیش تاهیرخانی زەندی خوشکەزای لە سەر دەستێکەڵکردن لەگەڵ ژنی زۆر ناسک و لەباری دەرکەوانی کۆشک کوتا[٧٦].

وەک دەگێڕنەوە لە سەرەتای حکوومەتیدا بۆ ڕابواردنی شەوانەی کچی خەڵکی بە زۆری ڕادەکێشا. بەگوێرەی گێڕانەوەی ڕۆستەموتتەواریخ پاش یەکێک لە هرووژمە پڕ گرێ و کۆسپەکانی بۆ سەر ئازەربایجان هەموو شەوێ مەی دەخواردەوە و دەڵاڵانیش کیژی جوان و لەباریان دەفڕاند و دەبالیان دەکرد. بۆ بەیانی کچەی بە خەڵاتێکەوە وەدیوی دەرێ دەنا. سەرەنجام لیژنەی نوێنەرایەتی زانایانی ئایینی ئیسفەهان هەسیان دایەوە و پەشیمان بۆوە و تۆبەی کرد و دەستی لەو کارەی هەڵگرت. ڕەنگە هەر لەم ڕۆژگارەدا بێ کە نووسەری کتێبی «فەوائیدوسسەفەوییە» دەیگوت کەریمخان کچێنی هەزار کیژۆڵەی مێرمناڵ و ڕەسەنی بردووە[٧٧] و باسی ئەو کچە جوولەکانە دەکا کە ڕاکێشرابوونە حەرەمخانەکەی[٧٨].

ڕاپۆرتێکی دیکەش لە لایەن گەڕۆکی ڕووسی ناسراو بە «گێملین» کە ساڵی ١٧٧٦ لە گیلان و مازەندەران بووە ئامادە کراوە کە لەگەڵ ڕووحی

٧٤ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل٣٢٢؛ دونبولی، تەجرەبە، بەرگی یەکەم، ل ١٣٢ ـ ١٣٣ و بەرگی دووهەم، ل ٤٨؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٩؛ پەرتەو بەیزایی، ل ٦١؛ بەهار، ل ٣٢٨؛ ڕاپۆرتی قەشەیەکی کارملیت کە بە ناوی پزیشکی کەریمخان لە شیراز خزمەتی دەکرد.

٧٥ـ قەزوینی، ل ١٤٦.

٧٦ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٤١٦ ـ ٤١٩؛ نەوایی، کەریمخانی زەند، ل ٢٥٤ ـ ٢٥٦.

٧٧ـ قەزوینی، ل ١٤٣ب؛ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٣٣٢.

78- Levi, 489.

جوامێرانە و خێرخوازانەی وەکیل یەکتر ناگرێتەوە. بەگوێرەی کۆمەڵێک دەنگۆ و قسەڵۆکی خۆماڵی کە بوغزانـدنی قاجاریانیشـی لێکراوەتـە تامـاو و ڕەنگـە هیدایەتوڵلاخانی ڕەشتی نیمەسەربەخۆش ئاوری لێخۆش کردبێ، ڕوخسـاری وەکیلی وەک کابرایەکی شەرابخۆر و داوێنپیس و دیکتاتۆر و چنۆک نواندووە کە «زۆری سەر لە چاکردنی هەلومـەرجی ژیـانی جـەماوەری هـەرێمی دەسـەڵاتی نەئێشاندووە و لە ترسی ئەشقیا خۆی لە پەنا پەساری حەساری قەسری مەلاس داوە»[٧٩]. ڕاپۆرتی قۆنسوولخانەی ڕووسیا باسی ئـاژاوە و نائـارامی سالـی ١٧٦٨ دەکەن لە پارێزگاکانی گـیلان و مازەنـدەراندا و ئـەم نووسـینە سەرهەڵـدان و ئاڵۆزییەکان دەبەستێتەوە بە چوونە سەری ملکانە و پیتاک و چاونووقاندن لـە حاندِ زێدەڕەوی و زۆرەملی کاربەدەستانی ئیداری ژێـر دەسـەڵاتی و دەڵـێ کـە بەکردەوە خۆ لە کاروباری هەرێمەکان هەڵناقوتێنێ.هەڵبەت دەکرێ ئەم ڕاپۆرتە ئـی سـەردەمی پەشـێوی و ڕاپـەڕینی حوسـێنقولـیخـانی قاجـار و شـالاوە توندوتیژەکانی زەکیخان و عەلیمرادخانی زەند بێ. هەر ئەم ژێدەرە ئاماژە بـە بوونی جووڵانەوەیەک لە نێو خودی شیرازیشدا دەکا و ئـەوەی وا لـەوێ بـووە ئاوا دەنووسێ: «بوونی کەریمخانی فەرمانـڕەوا لـە شـیراز کـە بـێ لەشـکر و چاوەدێری بە سەر کاروباری وڵاتا، تەنیا هەوڵی سـەپاندنی پیتـاکی قـورس و گرانە، وای کردووە کە ورد و درشت لێی بکەونە گلە و گازندە و ڕێی هەرەچمەرەچ و سەرهەڵدان خۆش بێ[٨٠].»

ئەم تاوانە کـە ژێردەسـتانی وەکیـل چـاک نـەحاملابوون و تەنانـەت هێنـدێک جـار زێدەڕەوییەکانیشـی داویشـتنە پشـتگـوێ، لـە لایـەن عەبدوڕڕەززاقبەگیشەوە ئۆباڵی بۆ کێشراوە[٨١]. ئەم گوتەیە کە لەگـەڵ زۆربـەی زانیارییەکانی ئێمە دەربارەی ڕەوت و سیاسەتی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی وەکیل جیاوازە و یەکتر ناگرێتەوە تەنانەت لە لایەن سـەرچاوەیەکی گومـانلێکـراوی وەک ڕۆستەمونتەواریخیشەوە بە شێوەیەکی بەربلاو پشتڕاست کراوەتەوە. دەق

79- Gmelin, 399 – 400.

80- Arunova and Ashrafyan, ((Novye Materialy)), 113, notes 13 – 15; the eyewitness is not identified.

٨١ـ دونبولی، تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی ٢، ل ٤٩.

و نێوەرۆکی واتای دونبولی دەریدەخا کە ئەو لەم بابەتانەدا پارێزگا دوورەدەستەکانی مەبەست بووە و دەیهەوێ ئاماژە بکا کە ناوبانگی دادپەروەری لە تان و پۆی حوکمڕانێتی وەکیلا پتر لەوەی بەکردەوە لە گۆڕێدا بووە زەق کراوەتەوە.

دەنگی بیر و بۆچوونێکی جیاوازی دیکەش لە شیرازەوە هەستا. کەلانتەر بانگەشە دەکا کە «ئەخلاقی کەریمخان لە سالێک بەر لە مردنیڕا گۆڕابوو و کاری وای کردن کە لێی نەدەوەشاوە و کەسیش پێشتر لێی نەدیتبوو.» یەکیان گەمارۆدان و گرتنی شاری بەسرە بوو. گەلێک کەس و مال و پوول بە فیڕۆ چوون. وەختایەک کە بەرپرسی عەمباری دەغلودان تاوانی پاشقولدانی خرایە ئەستۆ، وەکیل کەموکەسری عەمبارەکەی لە ملکدارانی جووتبەندە وەرگرت[82]. بێگومان دەسپێکی شەڕی بەسرە بەشێکی زۆری لە ئەستۆی ئەندامانی سەرکردایەتی نیشتمان بووە کە بەگوێرەی دانپێنانی کەلانتەر خۆشی یەکێکە لەوان، بۆیە دژوارە ئادەمی بڕوا بکا کە سکالا و گازندەی وی نیشاندەری بیروڕای زۆرینەی جەماوەری خەلک بێ.

لەگەل ئەمەشا جاروبارە چەند نموونەیەک دەربارەی کوێرکردنی زالمانە و خوێنڕێژی هاوکات لەگەل نەخۆشی وەکیل لە سالی ١٧٦٠دا وەبەرچاو دێ. لەم بابەتەوە نابێ مەسەلەی نەخۆشی جەستەی کەریمخان کە لە تاوان شەراب و تریاکی وەپێش خۆی دەکرد و بە ئاکاری نالەبارەوە دەنووسا لەبەرچاوان ون بێ، چونکە هەم هێزی دادوەری کول دەکرد و هەمیش تەبیاتی توندی پتر گڕ دەدا. لێرەدا سەرەتایەکی زۆر نیزیک لە مەسەلەی نەخۆشی نادرشا دێتە بەرچاومان. قەیزبوون و نەخۆشی سیپەلاکی ڕەنگە ناهاوسەنگی لە وزەی مێشکیدا پێکهێنابێ و بووبێتە هۆی دلڕەقی لە ڕۆژانی ئاخری ژیانیدا[83]. ئەگەر قەرار وایە بۆ ئەم پارسەنگ و لەنگولۆرییە بە شوێن بنج و بناوانێکی دیکەدا بگەڕێین دەبێ پێی لێبنێین کە کەریمخان پیاوێکی بێئەندازە بەختەوەر بووە کە بەر لەوەی وەک نادرشا بگاتە قۆناخی شێتی مالاوایی لە دنیا کردووە.

---

٨٢ـ کەلانتەر، ل ٦٧ ـ ٦٨؛ فەسایی، بەرگی یەکەم، ل ٢١٨.

٨٣ـ لۆکهارت، نادرشا، ل ٢٧٥ ـ ٢٧٦.

بەڵام ئەوەی وەڕاست گەڕاوە ئەمەیە کە تێکچوونی تەبیاتی چ لە سەرەتا یان کۆتایی عومریدا بووبێ، بۆتە هۆی تێداچوونی کردووە پرشنگدارەکانی رابردووی. تەنانەت کەلانتەر کە قەڵەمە ژاراوییەکەی بە خراپ باسی زۆرێک لە هاوچەرخانی خۆی کردووە، نەیویستووە تا بە درێشووکەی قەڵەمی بینەنگێویێ و ناچار بووە کە پێی لێبنێ ئەگەر چاکە و پیاوەتییەکانی هەزار بن گوناهی تەنیا یەکێکە[٨٤].

## ١٦ ــ ٧ دەسکەوتە گەورەکانی وەکیل

ڕۆستەمولحوکەما لە دووتوێی ئەو تاریفاتەدا کە باسی خوو و خدەی وەکیلی کردووە لیستەیەکی لە مەرجەکانی دەیانەی فەرمانڕەوایان دەخاتە ڕوو. هەڵبەت ئاشکرایە کە وێڕای هێنانی ئەم مەرجانە دەیهەوێ تاریفی پیاوچاکی وەکیل بکا (هێندێک جاریش ڕەخنەی لە کارە پێچەوانەکانی گرتووە). ئەم مەرجانە لە سەر دەق و لێکدانەوەیەکی خەیاڵی بۆ فەرمانڕەوایەکی لێوەشاوە دێنێتە گۆڕ[٨٥]. بۆیە ئەوەی کەوا لێرەدا دەخرێتە بەرچاو فەرمانێکە بۆ پێکەوە هەڵسەنگاندنی میران و هەروا بێتەوە شیکردنەوەیەکیشە کە دەکرێ لە بازنەی ئەوا تایبەتمەندی و پلە و پایەی وەکیل بخرێتە بەر توێژینەوە.

١ــ حوکمڕان دەبێ سەرنجی زۆر بداتە کشتوکاڵ و لە هەرێمی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا چەند عەمبار و دەغڵدانێک بۆ دەغڵ و دانەوێڵە دابین بکا.

٢ــ حوکمڕان نابێ بە غللووری و پەلەپرووزێ کاران بکا، بەڵکوو دەبێ دوای تەگبیر و ڕا و لێکۆڵینەوە مل بداتە کاران.

هەڵبەت شەڕی کەریمخان لەگەڵ ئازادخان بەپێچەوانەی ئامۆژگاری خزمان و کوێرکردنی شێخاڵیخان بەڕاستی دژی ئەم بنەمایە بوو. دیوانسالاری خان نیشانی دەدا کە لە جەغزێکی بەرتەسکتردا بە کورتە ڕاوێژێک تەمای خۆی بەڕێوە دەبرد. بەڵام زیرەکی ئەو لە پاراستنی ڕێسای کایەی بازرگانی دەرەکیدا

---

٨٤ــ کەلانتەر، ل ٦٨: «چاکەکانی هەزار بوون و خراپەی یەک.»

٨٥ــ ڕۆستەموتەواریخ، ل ٣٢٦ ــ ٣٢٨ (پادشا دەبێ ...) لە ڕاستیدا ئەمە ڕێنمایی و یاسا و ڕێسایەکی کارکردنە...

و بەتایبەت بۆچوونەکانی سەبارەت بە ڕێگرتن لە چوونە دەرەوەی سکەی زێڕ دەریدەخا کە لە بوار و بابەتی ئابووریدا چەند ڕاوێژکارێکی بە دەستەوە بووە و سەرنجی داوەتە تێبینییەکان.

٣ـ حوکمڕان دەبێ ئەگەر لایەنی کێشە و سکالایەک یەکێک لە خزمانی بێ، دادپەروەرانە پێڕابگا و خۆشەویستی و ناخۆشەویستی وەبەرچاو نەگرێ.

کەریمخان نیشانی دابوو کە خۆشەویستانی ئەگەر بێکیفایەت و لێنەوەشاوەش بووبن لە خەڵکی دیکەی پێچاکترن و سەبارەت بە هێندێک لە تاوانباران و خائینانیش نەرم دەجوولاوە. ئەم بابەتە دەگمەنە لە کێشەی زەکیخانا کە هەمیشە پیاوێکی خوێنڕێژ و بێڕوحم بووە بەئاشکرا وەبەرچاو دێ. لانیکەم لە دوو کارەساتی نەفامانەیدا چاوپۆشی لێکرا، کەچی ئەوەندەی شوو لێهەڵکێشا کە سەرهەڵدانێکی چاوەڕوان نەکراو و بەرفرەوانی دژی ئامۆزاکەی بەرپا کرد.

٤ـ حوکمڕان دەبێ هەمیشە بەبڕشت و سامەوە قسە بکا.

بەختەوەرانە وەکیل بە نەرمی قسەی دەکرد و جەفەنگی پێخۆش بوو.

٥ـ حوکمڕان نابێ ڕژد و چاوچنۆک بێ.

لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی کەریمخان چاونەزێرنەبوونی بوو[٨٦]، ئەوجۆرەی کە لە نێو بابەتەکانی دیکەدا بە حیکایەتێک دەربارەی ڕیشسپی خێڵەکی و سامانەکەی هێناویەتی (١٤ ـ ٣). بە لای زۆریدا خەزێنەکەی بەتاڵ بوو. زۆربەی داهاتی پارێزگاکان سەرلەنوێ بە شکڵی عیمارەت و مووچە و مانگانە و خەرجوبەرجی تەناهی نێوخۆ دەگەڕێندرایەوە بۆ خەڵک.

٦ـ حوکمڕان دەبێ باوەڕمەند و بەرزەئامانج بێ، وەک باوک بڕوانێتە لەشکرییان و جووتیاران (ڕعێتان).

بەو جۆرەی لە نازناوەکەیڕا دەردەکەوێ بابەتێکی ئەوتۆ لە لایەن وەکیلەوە وەک ئەرکێکی سەرەکی دەپارێزرا. پیاوانی لەشکری و جەماوەری گوندەکی کە سەرچاوەی تەواوی سامان و دەسەڵات بوون و نادرشا زۆر پڕکێشی دەرهەقی کردبوون: بە شێوەیەکی بەربلاو جووتیارانی هێنایە ڕیزی قۆشەنی

٨٦ـ دونبولی، تەجرەبەتولئەحرار، ل ١١ و ٤٩.

خۆی و تەنیا کەمینە دەیتـوانی خـەریکی هەڵـگرتنی دەغـڵ و دان و کاروبـاری مەزرایە بن. بە تەنینەوەی دەس بە سـەراگرتن و چوونـە سـەری پیتـاک، ئـەو گوندی و هونەرمەند و بازرگانانەی کـە هێشـتاش لـە کـاری بەرهـەمهێنـاندا دەوریان دەگێڕا، نە تەنیا دەبوو زیادەی داهاتیان بدەن، بەڵکوو بەشـێکی زۆری سـەرمایە و بەرپێچوونەکەشیان پێـوەی دەچـوو[87]. شـێوازی کـەریمخـان بـۆ ژیاندنەوەی ئابووری لە گەوهەری خۆیدا سـاکار و بـەهرەی لـەم دوو قۆڵـەی هێزی کارە هێنا، بۆ هێنانەدی ئامانجە بەرزەکانی.

دەسپێوەگرتن کەوتە سەرووی کاروباری حکوومەت. نـە تـەنیا شـکۆی زیاتر و کەلوپەلی دەرباری خودی شا کۆکرانەوە، بەڵکوو ئـەرک و ڕاسـپاردەی گرینگی سپا بوو بە پاراستن و بەرگری و ئەم کارە لە درێژخایـەندا قـازانجێکی زیاتر لە هێرشەکانی نادرشای بۆ سەر خەزنـەی هیندووسـتان لێکەوتـەوە کـە پاشماوەیان لە ژێرخانەکانی قـەڵای «کـەلات»دا سـوڕیان ون بـوو. بـە بـاری سازکردنی قەڵا و قایمەی بەڕاستیدا لە سەر سنووران و پێشـکەوتی ئـابووری و ڕازاندنەوەی ئەندازیارانەی شیرازی پایەختی، کاری کەریمخـان تـەنیا دەبـێ لەگەڵ کارەکانی شاعەباس بـەراورد بکـرێ. پـەلاماری تەمبێیانـەی خـان دژی جەماوەری سەربزێو و خۆخستنە گەرداوی لە ئاقڵ بـە دووری شـەڕی عومـان و بەسرە، وەک هەموو لە سەری سوورن تەنیا بە مەبەستی تالان و هەڵـچۆڕاندنی خەزێنە سازکراوە. کەوایە وەک پێشتر باسـی کـرا، ڕەنگـە لاوازی حکوومـەتی ناوەندی بەشێکی بگەڕێتەوە سەر نیازپاکی کە تەنانەت ئاژاوەی بەر لـە مـەرگی وەکیلی لە پارێزگاکاندا بەدیهێنابێ.

هەرچۆنێک بێ لە ڕوانگەی کابرایەکی سەرباز و خێڵەکیڕا دەربڕینی ئەم مەبەستە و قبووڵ کردنەکەی کە ئەو وەکیلی ڕعێتانە، بە هـەموو ماناکانییـەوە باسی سەرکەوتنی ڕاستەقینەی وی دەکەن.

٧ـ حوکمڕان دەبـێ تـاوان و پیـاوکوژی خاشـەکێش بکـا و پـارێزەری هێمنایەتی بێ.

٨ ـ حوکمڕان دەبێ لەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ مێهرەبان بێ و ئەرکی سەرشانی سەبارەت بەوان ڕاپەڕێنێ، جا ئـەم کەسـانە ئاقڵـمەند یـان

87- Aruniva and Ashrafyan Cosudarstvo, 258 – 259.

شێت، مەلا یا ئیشکەڕن، مسولمان یان کافر بن.

٩ـ حوکمڕان دەبێ بۆ خەڵکی ولاتەکەی نموونە بێ و نیازەکانیان سەنگوسووک بکا.

١٠ـ حوکمڕان دەبێ سەرسارد و کەترەخەم نەبێ و تام لە ژیانی خۆی بزانێ، بەلام نابێ لە سەر کیسەی ڕعێتان پرکێشی بکا و دەسپێوەنەگرێ؛ پاش ئەنجامی هەر کارێکی باش دەبێ شوکرانەبژێری دەرگای خوداوەند بێ.

ئەگەرچی بەحاڵودووبەلا ڕەخنەی لێگیراوە، بەلام لەنگولۆری کارەکە روونە. ئەوەی جێی داخە ئەمەیە کە تەگبیری وەکیل دەبوو بە کۆسپ لە سەرڕێی ئەزموونەکانی و بۆ سەرکەوتن پەندی لە شکستەکان وەرنەدەگرت. محەممەدڕەحیمخانی کوڕی سێهەمی کە ڕەنگبوو ببێ بە فەرمانڕەوایەکی کارزان، لە تەمەنی حەڤدەساڵیدا واتە دوو ساڵ بەر لە مەرگی وەکیل مالاوایی لە ژیان کرد. پاش ئەم ڕووداوە هەرگیز خۆی بە ئەبولفەتحخانی کوڕە گەورەیەوە زەحمەت نەدا کە یەکێکی داوێنپیسەی ورەدۆڕاوە بوو[88]. لە ماوەی ئەو پازدەساڵەدا کە بە سەر مەرگی وەکیلا تێدەپەڕی، جێنشینەکانی لەبەر گێرە و کێشەی غللوورانەی خۆیان تەواوی ئەو خێر و چاکەی کە ئەو بۆ نیشتماتنی بەدی هێنابوو، پووچەڵیان کردوە. ڕەنگدانەوەی ئەم کارانە بوو بە هۆی دەسلێکبەردان و پەرمپەرم بوونی مسۆگەریان لە بەرامبەر قاجاراندا و ڕاکێشرانەوەی ولات بۆ ژێر نیری زۆرەملی ڕەقوتەقی ئاغامحەممەدخان و فەتحعەلیشا.

سەقامگیربوونەوەی سەرسوڕهێنی دووبارەی گەشە و سەرکەوتنی ماددی و ئاسوودەیی فکری لەبری تالان و داڕووتاندن و تێکەولێکەی سامناکی ئێران یەکێک لە بەرهەمە گەورەکانی فەرمانڕەوایەتی ٢٨ساڵەی کەریمخان، بەتایبەت ١٤ساڵ بنەجێبوونی بێنێوبڕی لە شیرازە. وا وێدەچێ کە ئەوەندە دڵخۆشی و ئاکارپاکییەی لە ڕووح و گیانی ئێرانی پاش گەندەڵی و بەرەودوا کشانەوەی سەردەمی شاسوڵتانحوسێن و تالانوبڕۆی ئەفغانەکاندا مابوو، لە

88 ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢٠٥ ـ ٢٠٧؛ ڕۆستەموتتەواریخ لە لاپەڕە ٣٣٤دا ئەبولفەتحخان بە جێنشینی کەریمخان دەزانێ.

نێو تەپوتۆزی سەرکەوتنە تیژتێپەڕەکانی ئەوپەڕسنووری لەشکردارانی نادرشا تێداچووبێ. وا هەست پێدەکرا کە وڵات زیاتر نیازی بە ساکاری لە کاروباری دەزگای بەڕێوەبەرایەتی و حوکمڕانانی پارێزگاکاندا هەیە، نەک شکۆ و سڵسڵە و پلپلەی پووچ و خۆهەڵکێشان و دەبێ فەرمانەکان ڕەنگدانەوەی ڕووی ڕاستی و نیشتمانی بن نەک خاوەنی ڕووکاری ئەمپریالیستانەی خەیاڵاتی. بەکورتی دەبوو لە وڵاتا خاشەی هەرەچمەرەچ کێشرابا. کەریمخان لەم بابەتەوە وریا بوو کەچی لەم ڕۆژانەدا سنوورەکانی ڕۆژاوای ئێرانی نوێی بە شەڕ و باڵەپرژە دەپاراست. دەستی لە بەشی بۆشایی ناوەندی ئیمپراتۆرێتی نادری واتە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەفشاریان بەردا، هەتا لەمپەرێک بێ لە نێوان قوڵی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆرێتی جیهانگیر کە ئێستا لە ژێر حوکمی ئەحمەدشا دوڕانیدا بوو. تارمایی فەرمانڕەوایەتی سەفەوی کە نیزیک نەسلێک پاش تێداچوونی هەروا خۆی ڕاگرتبوو و نادر بەئاشکرا لە بنەبڕکردنیدا تووشی ناکامی ببوو، بەئارامی لە سیستمی حکوومەتیدا هەڵیچنی و هەوڵی دا کە ماوەیەک دواتر سوڕی ون بکا و کۆتایی بێنێ بە ئەفسوونی ۲۵۰ساڵەی. لەم ڕێبازەدا بەهرەی لە بڕست و کارامەیی دەوڵەت بۆ ڕوونکردنەوەی خەڵک وەرگرت و ڕێز و ئۆگری هەموو چین و توێژەکانی دەستەبەر کرد. کەسایەتی کەریمخان تێکەڵەیەکی تایبەت و دەگمەن بوو لە ویست و توانست و مێهرەبانی و دڵاوایی کە لە ماوەیەکی کورتی مێژووی درێژی ئێرانا دەوڵەتێکی تۆکمەی بە ڕوانگەیەکی بەڕاستی ئینسانییەوە بەدی هێنا.

# کۆتایی

## جێنشینانی کەریمخان

دەکرێ پاشماوەی سەردەمی زەندیە لە باری دابەشینەوە بە شێوەیەکی بەرتەسکتر لە چوارچێوەی جوولانەوەی خانەدانی قاجاردا بکەوێتە بەر توێژینەوە. بانگەشەی ئەوە ناکەم کە ئەو کورتەباسەی لە سەر بنەمای یادداشتەکانی مێلکۆم و نامی دەخرێنە ڕوو کۆک و پوختە بن و ڕەنگە ئەو کەسانەی کە شیکردنەوە و لێکدانەوەی بەلگەداریان پێ لە لێکۆلینەوەی دیکە چاکترە، ئەم بەرهەمە بە هیچ دانەنێن.

بەداخەوە لە قۆناخە جیاجیاکانی مێژووی زەندیەدا تەواوی پیاوانی ئەو خانەدانە خڕوپتوون کەوتبوونە ژێر سێبەری کەسایەتی کەریمخان. لە ماوەی ڕاپەڕینی کەریمخانا بۆ وەدەسهێنانی دەسەلات و حکوومەت ئەوان بەگشتی وەک تاقمێکی چاونەزێر و ملهوڕ و ناتەواو خۆیان نواند. چەن کەسێکی تایبەت و دەگمەنی وەک شێخالیخان و محەممەدخانی بێکەللە نەمان هەتا چاویان بە لووتکەی دەسەلاتی پاشایەتی کەریمخان بکەوێ. لە نێو کەسانی دیکەدا تەنیا سادقخان کە بە کاراترین و وریاترینی سەردارانی دادەندرا هەرکە چاوی وەکیلی لێ ون دەبوو، دەبوو بە کابرایەکی چاوچنۆکی بەتەماحی ملهوڕ. عەلیمحەممەدخان و عەلیمرادخان و زەکیخانیش لەم هەلانەدا گەلێ جار

# ڕەگەزنامەی خانەدانی زەند




١ـ دایکی کەریمخان دوای مردنی ئیناق مێردی بە بوداق کردووە و زەکیخان و ئەسکەندەرخان لێی بەوەلەد بوون. کەوایە کەریمخان و زەکیخان و ئەسکەندەرخان دایکبران.

٢ـ لە سێ کچەکەی ئیناق یەکیان ژنی محەممەدخان و یەکیان ژنی شێخالیخان و ئەوی تر شووەکەی نەناسرا.

٣ـ لە سێ کچەکەی بوداق یەکیان لەپێشدا مێردی بە باوکی عەلیمرادخان کرد و پاشان بوو بە ژنی سادقخان و جەعفەرخانی لێبوو. کەوایە جەعفەرخان و عەلیمرادخان دایکبرا بوون.

٤ـ کچی زەکیخان ژنی عەلیمحەممەدخانی کوڕی کەریمخان بوو.

بێشەرمی دڕندانە و لێنەوەشاوەیی هەڵسوکەوتی خۆیان ئاشکرا کرد. ئەو دەمەی کە وەکیل مابوو سرشتی ناپاکیان لە بەرامبەر مەزنایەتی و تەبیاتی پیاوانەی ئەوا ناچیزەی دەنواند و لێنەوەشانەوەیان لە شەڕ و پەلامارا بە ئەندازەی قۆناخی دەسەلاتی پاش مردنی وەکیل دیار نەبوو. بە مردنی خان نەفامی و ئاکارە چەوتەکانیان بێ هیچ لەمپەر و بەرگرێک هەڵیدا و سەرەنجام ئەوەی ئەو بناغەی بۆ دانابوو تەفروتونا کرا.

هەرکە داوی ژیانی وەکیل هەڵبڕا زەکیخانی زڕبرای، محەممەدعەلیخانی کوڕی کە زاوای خۆشی بوو کردی بە میر. سەرەتا ئەرگی کەریمخانی گەمارۆ دا کە نەزەرعەلیخان کوڕانی شێخاڵیخان و ئامۆزاکانی لێی بنەگر ببوون. ئەبولفەتحخانی کوڕە گەورەشی لەگەڵ عەلیمرادخانی خوشکەزای خۆی کردە یەک. زەکیخان بە خستنەڕووی ئەم بابەتە کە ئەبولفەتحخان لە کاروباری فەرمانڕەوایەتیدا لەگەڵ محەممەدعەلیخان شەریک و برابەشە، پشتیوانی زۆربەی خەڵکی شاری وەدەس هێنا. بە وەرگرتنی بەڵێنی هاوکاری لە نەزەرعەلیخان و هاوڕێیانی کە لە ئەرگ ماتەیان هەڵگرتبوو پەنای دان. وەختایەک باوەڕیان هێنا و دەروازەکانیان کردەوە هەموویانی بە دمی شیران قەڵتوبڕ کرد(١). دوای ئەوەی جێی خۆی قایم کرد دەرفەتی هێنا تا مەیتی کەریمخان چوار ڕۆژ پاش مردنی بنێژێ.

دوایە سادقخان لە بەسرە گەڕایەوە و شیرازی گەمارۆ دا، بەلام زەکیخان هەڕەشەی لە قۆشەنەکەی کرد کە ئەگەر بێتوو هەدانەدەن لە نێو شار تۆڵە لە بنەماڵەکانیان دەکاتەوە، بۆیە سپاکەی دەوریان بەردا و بلاوەیان لێکرد. ناچار بوو کە بە مەبەستی پەنابردنە بەر قەلای «بەم» باداتەوە و ڕابکا. پاش ئەم ڕووداوە زەکیخان کە بوونی ئەبولفەتحخانی بە زیادی دەزانی لە سەر کاری لادا و خستییە سیاچاڵ و خۆی بە ناوی محەممەدعەلیخانەوە جڵەوی حکوومەتی بە دەستەوە گرت.

لەم بگرەوبەردەدا عەلیمرادخان کە زەکیخان بە سەرکردایەتی بەشی هەرەهەڵبژاردەی قۆشەنی ناردبوویە پەیکەردە و تەفروتونا کردنی سەرۆکی ڕاکردووی تایفەی قاجار، ڕاپەڕی و بە ناوی ئەبولفەتحخانەوە ئیسفەهانی داگیر کرد. زەکیخان بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی ئەم مەترسییە بەرەو باکوور

کەوتەڕێ. لە ئیزەدخواست (یەزدخواست) هەوڵی دا بە زۆر بڕە پارەیەک لە جەماوەرەکەی بستێنێ، بەڵام ئەوان حەشتەبای خودایان شک نەدەبرد. وای گڕ گرتبوو کە فەرمانی دا هەژدە کەسیان لەو پلەبەردە هەڵدێرەوە هەڵاوەسین کە شارەدێیەکەی لە سەر ساز کرابوو. ئەم دڵڕەقییە تەنانەت تەز و لەرزی خستە دڵی لەشکری خۆشی و وای کرد کە هەر لەوێ لێی‌هەڵگەڕانەوە و کوشتیان(٢).

لەڕێوە ئەبولفەتح‌خان لە سەر کار لادرا و عەلی‌مرادخانیش بە مەبەستی پەلاماردانی خێڵی قاجار گەڕایەوە تاران. لەم گرمە و هەرایەدا سادق‌خان توانی لە «بەم»ەوە بەرەو شیراز ببزوێ و جڵەوی حکوومەت بە دەستەوە بگرێ. لەساڵی ١١٩٤ی کۆچی / ١٧٨٠ی زایینی‌دا یەکێک لە کوڕانی خۆی بە ناوی جەعفەرخان کردە حوکمڕانی ئیسفەهان و کوڕێکی دیکەی ناودێر بە عەلی‌نەقی بە مەبەستی دەمکوتی عەلی‌مرادخان کە ئێستا کەڵکەڵەیەکی لە مێشکی‌دا بوو گاڵ دا. لە یەکەم تێکهەڵچوونا عەلی‌نەقی‌خان سەرکەوت، بەڵام دوابەدوای ئەو سەرکەوتنە مانگی دوایی لە ئیسفەهان سەری کردە بادە و شەراب؛ وای‌لێهات کە عەلی‌مرادخان بەخۆی و هێزێکی تازەپشوو لە هەمەدان ڕاپەڕی و عەلی‌نەقی‌خانی شکست پێهێنا کە سەرلەنوێ پەلاماری ئێراقی عەجەمی دابوو. عەلی‌مرادخان هەتا شیراز دەم‌لە سەرپشت کەوتە شوێنی و بۆ ماوەی هەشت مانگ ئەم شارەی گەمارۆ دا. لە فێورییەی ساڵی ١٧٨١دا بە کەینەوبەینە و غەیانەت دەروازەکانی شار کرانەوە، بەڵام سەرکەوتووان تۆڵەیان لە خەڵکی شار نەستاندەوە. سادق‌خان و چەکدارانی پاش ماوەیەک خۆڕاگری لە ئەرگدا خۆیان بەدەستەوە دا و لەگەڵ هەموو کوڕەکانی جگە لە جەعفەرخان کە لە ژێرەوە لەگەڵ عەلی‌مرادخانی دایک‌برای کاکەوبرالەیەکی کردبوو، کوژران.

عەلی‌مرادخان گەرچی پیاوێکی نارەق‌خۆرەی یەکچاوە بوو، هەتا ماوەیەک واوێدەچوو کە ڕواڵەتێکی شەرکەرانەی داوە بە سیستمی لاوازی زەندیە و ئەگەریش نەتوانێ لە دەس پیاوانی بنەماڵەی خۆیانی دەرکێشێ، دەتوانێ لە ئاست قاجاریان بیپارێزێ. زۆری نەخایاند کە خێرا گەڕایەوە ئیسفەهان، چونکە هەلومەرجی بارناسکی ئەو شارە کە کەوتبووە جەرگە و نێرینەی ناوەندی پێشووی دەسەڵاتی زەندیە لە فارس و هێزی بەرەو گەشەی قاجاریان لە مازەندەران لە کردەوەدا ئەوێی بۆ پایتەختێتی لە شیراز باشتر هەڵخستبوو.

جەعفەرخانی کردە حوکمڕانی خەمسە چونکە زولفەقارخان کیسی لە مەرگی وەکیل هێنا و یاغی بوو. عەلیمرادخان تێکیشکاند و تۆماری تەمەنی پێچایەوە. لە ساڵی١١٩٧ی کۆچی / ١٧٨٢ی زایینیدا زۆربەی لەشکرەکەی بە سەرکردایەتی شێخوەیسخانی کوڕی نارده سەر خێڵی قاجار. سەرەتا شێخوەیس چەند سەرکەوتنێکی وەدەس هێنا، ساری گرت و ئاغامحەممەدخانی هەتا ئەستەرئاباد ڕەتاند و پاشەکشەی پێکرد؛ بەڵام ئەو هێزانەی کە خانی قاجاریان هەڵبڕیبوو لە دۆڵودەرەکانی «ئەلبورز»دا کەوتنە داو و تەفروتونا کران. ترس و دڵەڕاوکە تەواوی لەشکرەکەی گرتەوە و شێخوەیسخان ڕایکردە تاران.

عەلیمرادخانی غەزریو چەند کەس لە فەرماندەرانی ڕاکردووی کوشت و ئەگەرچی لەم کاتەدا نەخۆش بوو سپاکەی بۆ گرتنەوەی خاک و مەڵبەندە لە دەسچووەکان کۆکردەوە، بەڵام جەعفەرخان هەلی لەم پاشەکشەیە هێنا و سەری هەڵدا و بەرەو ئیسفەهان ڕکێفکوت کوتای. عەلیمرادخان سەرەڕای ڕاسپاردەی حەکیمان کە دەبوو چورتەی نەکردبا، لە چلەی زستاندا بە پڕتاو بۆ پاراستنی پایتەخت پێی نایە ڕکێف، بەڵام لە فێورییەی ساڵی ١٧٨٥دا لە ڕێیە مرد. لەشکرەکەی دەستی لێکبەردا و جەعفەرخان بێ گرێ و کۆسپێکی ئەوتۆ ئیسفەهانی گرت. فەرمانڕەوایەتی کورتخایەنی عەلیمرادخان خاڵگۆڕانێکی چارەنووسی بنەماڵە بوو؛ ئەم خانەدانە ئیدی قەت جارێکی تر دەسەڵاتی لە باکووری ئیسفەهان وێوەتر نەچوو.

یەکەم هەنگاوی جەعفەرخان خاشەکێشانی شێخوەیسخانی ڕەقیبی بوو، بۆیە پەیامێکی دۆستانەی بۆ نارد و بانگهێشتنی کرد بۆ ئیسفەهان، ئەویش بە نەفامی قبووڵی کرد. هەر یەکدوو پاش ئەوەی گەیشتێ، گیرا و کوێر و زیندانی کرا. ئاغامحەممەدخان ئێستا لە بەرامبەر تەنیا فەرمانڕەوای زەندا لە کەوڵی خۆی هاتەدەر و بەرەو باشوور بزووت. جەعفەرخان بە پەلەپرووزێ و سەرشێواوی لە ئیسفەهان ڕایکرد و بارگەوبنە و خەزێنەی بەجێهێشت و خەڵکی شار بەر لەوەی خانی قاجار بگاتێ دەستیان ڕێخست و تاڵانیان کرد. لە شیراز جەعفەرخان پێشوازی لێکرا، ئەم شارە بە سەرپەرستێتی کەیخودای گەڕەکان لە لایان حاجی برایمەوە کە ئێستا کرابوویە کەلانتەری شار هەڵدەسووڕا و هەروا وەفادار مابوویەوە. سەرەنجام پاش ماوەیەکی کورت

جەعفەرخان گەڕایەوە ئیسفەهان. ئاغامحەممەدخانیش بێ ترس و خۆف لەگەڵ هۆزی سەربەستی بەختیاری کەوتە شەڕ و بە نارێکوپێکی گەڕایەوە تاران. دیسانیش خانی قاجار بایدایەوە ئیسفەهان و جەعفەرخانی بۆ شیراز دەرپەڕاندەوە. خانی زەند هەتا کۆتایی حوکمڕانێتی خۆی لەم شارەدا کەوتە حاڵەتی بەرگری و لە قاپێلکی خۆی نەجووڵایەوە. گیروگرفتی تازە سەریان هەڵدا. لە ساڵی ١٧٨٦دا سمایل‌خانی ئامۆزای(٣) کە حاکمی هەمەدان بوو ڕاپەڕی. جەعفەرخان پاش ئەوەی بێهوودە گەمارۆی یەزدی دا ئەم شارە هەروا بەگەرداو مایەوە. تۆزە سەرکەوتنێکی لوتفعەلی‌خانی کوڕی سەرنجی ڕاکێشان. خانی گەنج لار و کرمانی پێمل کردبوو و بۆ ئاخرین جاریش ئیسفەهانی گرت، بەلام لەبەر هرووژمی سپای قاجار ناچار بوو چۆلی کا. حکوومەتی جەعفەرخان لەبەر یاغی‌بوونی نێوخۆی چەند کەس لە خزمانی و خەیانەتی هاوڕێیانی ڕووخا.

خانی زەند یەکێک لە پیاوانی وەفاداری خۆی بە ناوی عەلی‌قوڵی‌خانی کازروونی بە مەبەستی دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی کاشان گاڵ دا. ئەو بەگوێرەی پەیمانێکی شەرافەتمەندانەی بەخشینی ڕاپەڕیوان ئەم ڕاسپێراوییەی ڕاپەڕاند. جەعفەرخان ئەم قەراروبڕییەی نەسەلماند و ڕاپەڕیوانی لە بەند توند کرد، بۆیە عەلی‌قوڵی‌خان بە دڵشکاوی گەڕایەوە کازروون. جەعفەرخان بە شوێنی‌دا نارد و سوێندی خوارد کە دەستی نەکاتێ، بەلام لەڕێوە خستییە سیاچاڵ و پاشان لە داری دا. لە ساڵی ١٢٠٤ی کۆچی / ١٧٨٩ی زایینی‌دا ئەم کارەی وای کرد تا ئاگری کەتنێک لە نێو ئەو پیاوانەی دەرباری کە لە گیانی خۆیان دەترسان بە سەرکردایەتی «سەید(صید) مرادخان»ی زەند، هەڵگیرسێ(٤). دەمچەورانەیان دا بە غولامێک کە دەرمانداوی بکا، زیندانییەکان لە زیندان دەرپەڕین و هەڵیانکردە فەرمانڕەوای زەند کە لە ئاویلکەدا وەک مار پێچی دەدا. سەریان بڕی و لە پەنجەرەڕا حەوایان دایە دەرەوە.

وەختایەک هەواڵی ئەم ڕاپەڕینە گەیشتە کرمان، لوتفعەلی‌خان لە ترسی بێوەفایی پیاوەکانی خۆی بەناچاری ڕایکردە بووشێهر. لەم شارەدا شێخ‌نەسر پەنا و یاریدەی دا. سەیدمرادخان، شێخ‌مراد [شامراد]خانی برای بە لەشکرێکەوە دژی ڕەقیبی گەنجی گاڵ دا، بەلام پیاوەکانی شێخ‌مراد گرتیان و دایانە پاڵ قۆشەنی لوتفعەلی‌خان. ئەم ڕووداوە دنەی لوتفعەلی‌خانی دا کە

هێرش بکاتە سەر شیراز. کەلانتەر دیسانیش لەم شارەدا کەوتە پشتیوانی لە کوڕی جەعفەرخان. لوتفعەلیخانی جوانچاکی ئازا و گەلخۆشەویست لە لایەن تێکڕای جەماوەرەوە پێشوازی لێکرا. سەیدمراد ماوەیەک لە ئەرگدا دەستی کردەوە، بەلام ئاخرییەکەی گیرا و کوژرا.

ماوەیەکی وا بە سەر سەقامگیربوونی لوتفعەلیخانا تێنەپەڕیبوو کە ئاغامحەممەدخان سەرلەنوێ ڕووی کردەوە شیراز. لە شەشفرسەخی شاری شیراز لوتفعەلیخان شکستی هێنا، بەلام بایدایەوە پایتەخت و مانگێکی دەسکردەوە هەتا سپای قاجار بەناچار گەڕایەوە. سالی داهاتوو کە دەبێتە ۱۷۹۰ هێزێکی کۆکردەوە و لە وەختی گرفتاری ئاغامحەممەدخان لە ئازەربایجان پەلاماری شاری کرمانی دا کە پێشتر ڕایسپاردبوو دەبێ خودی حوکمڕانەکەی خۆی بدا بەدەستەوە. زستانێکی سەخت بوو و خانی زەند بەناچاری پاش لە دەسدانی زۆرێک لە پیاوان و ڕەوەی ئەسپانی گەڕایەوە شیراز.

پاش گەڕانەوە بۆ شیراز لوتفعەلیخان بەئاشکرا سەبارەت بە حاجیبرایمی کەلانتەری بەدەسەلات دووشک بوو. «بەرخوردارخان»ی زەندی غللووری پووچەکە کە دەیگوت کەلانتەر دەیەوێ خەیانەتی پێبکا، ئەوەندی دیکەی تین دا. وەختایەک کە لە سالی ١٢٠٦ی کۆچی / ١٧٩١ی زایینیدا لوتفعەلیخان ئیسفەهانی گرت، کوڕەی گەنجی کەلانتەری وەک بارمتە وێرابوو. لەم کاتەدا کەلانتەر بڕیاری پاراستنی خۆی دا. بە فێل فەرماندەرانی زەندی خستە بەند و جلەوی کارانی بە دەستەوە گرت و پاشان بە ڕاسپاردەیەک چی قەوماوە هەمووی بۆ عەبدوڕڕەحیمخانی برای کە لە سپای لوتفعەلیخاندا بوو، ڕوون کردەوە. ئەویش لەڕێوە لەشکری لێهەلگێڕایەوە و حوکمڕانی لاوی زەند لەگەل سێسەدکەس لە هاوڕێیانی بەرەو شیراز ڕایکرد.

لە شیراز بۆی دەرکەوت کە دەروازەکانیان لە ڕووی داخستووە. حاجی برایم لە پاشماوەی پیاوەکانی ڕاسپارد کە ئەگەر بێتوو بلاوە نەکەن و پشتی لوتفعەلیخان بەرنەدەن تۆلە لە خاوخێزانیان دەکرێتەوە. لوتفعەلیخان وێڕای چوارکەس لە پیاوەکانی ڕایکردە بووشێهر. لێرە تێگەیی کە کوڕەی جێنشینی شێخنەسر دەیەوێ لایەنگری لە کەلانتەر بکا. شۆڕەلاو کە وەک پۆلای جەوهەرداری لێهاتبوو بۆ شەڕ گەڕایەوە جێی جاران. ژمارەیەک لە لایەنگرانی

خۆولاتی کۆکردەوە و ئەو سوارانەی کە لە بووشێهر و کازروونەوە کەوتبوونە شوێنی تێکیشکاندن. بۆ چۆڵەپێچکردنی شیراز بزووت و ئەو سپایەی کە بە سەرکردایەتی مستەفاقولیخانی قاجار بە مەبەستی گرتنی پایتەختی زەندیە هاتبوون تێکیشکاندن. خانی قاجار سپایەکی دیکەی کردە سەری و ئەویش لە بەرامبەر پۆلە چەکدارانی زەندا خۆی بۆ ڕانەگیرا و ڕایکرد و وەختایەک لوتفعەلیخان لێیان وەخۆکەوت و پەلاماری دان و زۆر ئازایانە سەرکەوت، پیاوەکانی بە شادمانی هۆردووگایان تالان کرد.

لە سەر داخوازی حاجیبرایم، ئاغامحەممەدخان بەخۆی و لەشکرێکی چلهەزار کەسی رووی کردە شیراز. پۆلەسوارانی لوتفعەلیخان لە نیزیک «پرێسپۆلیس» پێشقەرەوڵەکانیان شکست دا و هەر ئەو شەوی پەلاماریان بردە سەر جەرگەی هۆردووگا و گوڵمیخی تاوڵ و خێوەتان هەڵکێشران و واوێدەچوو کە تەواوی هۆردووگا بگرێ. بەلام لوتفعەلیخان کە پێی وابوو خانی قاجار رایکردووە نەیهێشت پیاوەکانی بکەونە تالانی هۆردووگا و فەرمانی دا هەتا بەیانی دەس ڕابگرن. بەیانی لە وەختی مەلابانگدانا تێگەیی کە ئاغامحەممەدخان و چەکدارانی پارێزەری تەوەندە بەهێزن کە بتوانن تاقمۆکەی هاوڕێیانی ببەزێنن. سەربازانی بەکرێگیراوی عەرەب کەوتبوونە تالانی تاوڵ و خێوەتی ئاقەوەبوو. لوتفعەلیخانیش جگە لەوەی بۆ پاراستنی گیانی خۆی و پیاوەکانی پێی پێوەبنێ و ڕابکا، چارەیەکی دیکەی نەبوو. ئەم ڕووداوە شومە وەک کۆتایی کاری لوتفعەلیخان و میرانی زەندیە بوو. خانی زەند لە هاوینی ساڵی ١٧٩٢دا ڕایکردە کرمان و چەند کەسێکی لە دەوری خۆی کۆکردەوە و کەوتە بەر پەیکەردەی سپای قاجار. لە ساڵی ١٧٩٣دا کە بە مەبەستی پەلاماردانی شیراز کە ئێستا ئاغامحەممەدخانی لێبوو کەوتەڕێ. بە شێوەیەکی ناسەرکەوتوو گەمارۆی «داراب»ی دا و چەند جارێک تا «تەبەس» پاشەکشەی پێکرا. لە سەر پێشنیاری میرحەسەنخان بەرەو قەندەهار بزووت هەتا بتوانێ یارمەتی لە تەیموورشای دوڕانی فەرمانڕەوای ئەفغانستان وەربگرێ، بەلام چەند ڕۆژ دواتر لەبەر بیستنی هەواڵی مەرگی تەیموورشا بەناچاری گەڕایەوە.

دووکەس لە سەرۆکانی پایەبەرزی نەرماشیر پشتیوانییان لێکرد. ئەم لاوە کە دەستی لە گیانی خۆی هەڵگرتبوو، لە ساڵی ١٧٩٤دا بە سەر کرمانی دادا

و گـرتی. چوارمانگـان ئـەو شـارەی بـە دەسـتەوە بـوو و لـە بەرامبـەر ئاغامحەممەدخان‌دا خۆی ڕاگرت. قاتی بوو بـە هـۆی تێـداچوونی سـەربازگە و سپای قاجار سەرەنجام لە ڕێـی خەیانـەتی چەنـد کەسێکەوە کرمـانی گـرت. لوتفعەلی‌خان لە ماوەی سێ‌سەعاتا خۆی گەیانـدە «بـەم». ئاغامحەممـەدخان سەبارەت بە خەڵکی شاری کرمان بە شـێوەیەکی یـەکجار دڕندانـە جووڵایـەوە. تەواوی نێرینەی باڵغی قەلاچۆ کردن و هێزەکانی نیزیکەی ٢٠هـەزار کـەس ژن و منداڵیان بە کۆیلە بـرد. وەک گێڕاویانەتـەوە ٢٠هـەزار جـووت چـاو بـە کۆگـا هەڵدرایەوە و پاش ژماردن درایە دەست هێزەکانی سەرکەوتوو. حاکمی «بەم» لە ترسی گیانی براکەی کە لە کرمان بوو دەیەویست میوانەکـەی ڕادەسـتی خـانی قاجار بکا. لوتفعەلی‌خان هەستی بـە مەترسـی کردبـوو، بـەڵام هـەتا دوایـین ساتیش بڕوای نەدەکرد کە خەیانەتی پێبکرێ. کاتێک کە بـە مەبەسـتی ڕاکـردن تاوی دا، پەلی ئەسـپەکەیان پەڕانـد و خۆشـی بـە برینـداری گـیرا. ئـاخرین فەرمانڕەوای زەند کە هێشتا پێی لە تەمەنی ٢٥ساڵی نەنابوو درایـە بەردەسـتی جێنشینی ئیمپراتۆرێتی ئێران. دڕندانە کوێری کرد و دایە دەست ئەشکەنجەدەر، پاشان ناردیە تاران و لە ڕەبیعوسسانی ساڵی ١٢٠٩ی کـۆچی / نـوامبری ١٧٩٤ی زایینی‌دا کوژرا.

لوتفعەلی‌خان بە چوست‌وچالاکی ئازایەتی بێوێنـەی، چەنـد سـاڵـێک زنجیرەی خانەدانی میرانی نێو ئاویلکەدانی زەندی کـە زۆر جـاران زەبـری لـە خۆیان وەشاندبوو، بەرەو پلەیەکی بەرزی ڕاسـتەقینەی بـردن. دەسـت‌وبـرد و هەڵمەتە بێوچانەکانی وێڕای نەبەزی خۆی و ئەو هیوایەی کە لە دڵی پیاوانی‌دا شۆقی دابۆوە، بیرەوەری ڕۆژە سەختەکانی وەکیلی لە بیران‌دا زیندوو دەکردەوە. بەڵام ڕێبەرانی کۆمەڵی شارنشین و خێڵاتی خۆیان لـە چنـگ خانـەدانی زەنـد لەبەر خاتری قاجاریان دەرباز نەکردبوو، بەڵکوو لە قۆنـاخێکی زۆر پێویسـتا خۆیان لە یارمەتی و پشتیوانێتی پاراست و ویستیان کە لاپەڕەیـەکی تـازە لـە مێژوو هەڵبدرێتەوە.

## تێبینی و پەراوێزەکانی «ساکی»

١ـ لەورۆژەدا کە کەریمخان مرد، زەکیخانی دایکبرای دەرفەتی لە بە دەستەوە نەبوونی سادقخان هێنا و لە کاتێکا مەیتی وەکیل هەروا لە گۆڕێ بوو، بە ناوی محەممەدخانی کوڕی دووهەمی کەریمخانەوە هەڵسووڕا، بەڵام چونکە هەستی کرد کە خانانی دیکەی زەندی «بەگلە» و «هەزارە» لایەنگری لە ئەبولفەتحخان دەکەن، لە حکوومەتا کردی بە شەریک. کوڕان و براکانی محەممەدعەلیخان و شێخالیخان کە لە ئەرگ درگایان لە رووی خۆیان داخستبوو بە سوێند و قورئان و بەڵێنی پاراستنی رووحیان لە ئەرگ هاتنە دەر و بە دەستووری زەکیخان، تاقمێک لە کەلێن و قوژبنان خۆیان لێ مەڵاس دان و هەر کە ئاسۆگیان دا و دەرکەوتن لێیان وەدەس هاتن و دەسرێژیان لێکردن. ئەو جۆگەلەخوێنانەی شێلاوگەیان بەست هەتا ئەو دەمی کەس وێنەی نەدیبوون. ئەو ٢٣کەسەی کوژران برێتی بوون لە: کەلبعەلیخان کوڕی شێخالیخان، نەزەرعەلیخان برای شێخالیخان بەخۆی و سێ کوڕ: حوسێن و فەتحعەلی و حەسەن، کوڕانی محەممەدخان بە ناوی تاهیر و وەلی و داراب، کوڕی عەلیمحەممەدخان ناسراو بە باقرخان، سادقخان برای محەممەدخان بە چەند کوڕەوە، عەرازسوڵتان و میرزا جەعفەری خوراسانی وەزیری نەزەرعەلیخان و کوڕانی شێرعەلیخان.

ویلیام فرانکلین کە چەند ساڵ پاش مەرگی سەردارانی زەند چۆتە شیراز دەنووسێ: پێنجشەش پاڵەوان کە خۆیان رووت کردبۆوە و کراسیان فڕێدابوو بە زەبرێ شیر خانەکانی زەندیان رەپێچەک دایە بەر دەمی زەکیخان و لەتوپەتیان کردن و کەلاکیان فڕێ دانە مەیدانی بەردەرکی قەسرێ. ئەگەرچی ئەمانە کەسوکاری بوون، بێ ئەوەی ژنومنداڵیان وەبەرچاو بگرێ ماڵ و سامانی داگیر کردن. فرانکلین ژمارەی کوژراوان بە ٢٢کەس دادەنێ و گیتیگوشا بە ١٥کەس. مەیتی کەریمخان چوار رۆژ پاش مردنی نێژرا.

٢ـ زەکیخان لە ئیزەدخواست گۆڕەهوو کرا. ناوبراو لەو ناوچەیە بە بیانووی ئەوەی کە دەستیان وەبەر پیاوەکانی عەلیمرادخان نەهێناوە و

لێیانگەڕاون باج کۆکەنەوە جەریمەی کردن و چەند کەسێکی لێکوشتن. لەبەر کوشتنی گەورەمەلای شار و دەسدرێژی بۆ سەر ژن و منالانی، شەرکەرانی «مافی» بڕیاریان دا بیکوژن. زەکیخان لەبەر ئازایەتی قەرەوڵ و نیگابانی نەبوو. شەرکەرانی مافی ڕستەی خێوەتەکەیان ترازاند و بە سەریاندا خست و دەسڕێژیان لێکرد. خانعەلیخانی مافی گوللەی پێوەنا. ڕەزاخانی مافی سەری بڕی و کەلاکی پێخوست کرا.

٣ـ سمایلخانی زەند کوڕی شوجاعەددینخان بوو. باوکی لە شەڕی ئەستەرئاباد کوژرا و ئەویش لە ئامۆزایانی کەریمخان بوو. سەرەتا لە برووجێرد ڕاپەڕی و بە نەمانی قوربانخانی باجەلان سەربەخۆیی ڕاگەیاند. جەعفەرخان هێزەکانی شکست دا و بەناچار ڕایکردە هەمەدان. لەم شارە لەگەڵ تاقمێک لە خێلاتی کوردستان و لوڕستان و هەمەدان دژی جەعفەرخان بوو بە هاوپەیمان. جەعفەرخان پەلاماری هەمەدانی دا، بەلام لەبەر خوێڕێتی و ترسەنۆکی هێزەکانی تێکشکا و بارگەوبنە و جەواهێراتی بەجێما.

٤ـ یارانی سەیدمرادخان(صیدمرادخان)بە دەستی کەنیزێک جەعفەرخانیان ژارخواردوو کرد، بەلام لەبەروەی ژارەکە زۆر کاریگەر نەبوو تەنیا لە جێیەی خستبوو. بەناچاری بەرتیلیان دا بە دووکەس لە غولامانی بە ناوی ڕەجەب و باقر و ئەوانیش دەست و پێی زیندانییەکانیان کردەوە و بەم شێوەیە لە کوژرانی جەعفەرخاندا بوونە هاودەست. ڕێزدار پێری ڕووداوی دەرمانداو کرانی بە دەست کەنیزێک و دەربازبوونی زیندانییانی لەڕووی مێژووی ئێران بە قەڵەمی سێرجان مێلکۆمەوە نووسیوەتەوە و دەڵێ غولامێک جەعفەرخانی ژارخواردوو کرد و بەندییەکانی ئازاد کرد.

# پاشکۆ

توێژینەوە و هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان
جەللەی ناوی شوێنەکان
جەللەی ناوی هۆز و خانەدان و تایفان
جەللەی ناوی کەسان

# تویژینەوە و هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان

ئەگەرچی سەرچاوەی زۆر و چەندزمانە دەربارەی سەردەمی دەسەلاتی ئەفشارییە و زەندیە لەچاو سالانی سەرەتای حکوومەتی سەفەوی و نادرشا کەمن، بەلام دیسانیش لە هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەیاندا کەندوکۆسپی تایبەتی وەبەرچاو دێ. بەگوێرەی تەقەلایەکی کە بۆ نرخاندنی سەنگ و شیاوی ئەم ژێدەرانە دراوە، دەیانکەینە هەشت بەش و دەیانخەینە بەر لێکۆڵینەوە و تویژینەوە: شەش بەشی سەرەتا سەبارەتە بە نووسراوەکانی بنەڕەتی هاوچەرخی ئەوان ڕۆژگاران کە لەبەر نارێکوپێکی شێوەی هەڵسەنگاندن ئەو ڕیزاوڕیزەیان کردووە، گەرچی خودی ڕیزبەندییەکانیش دەبنە کۆسپێکی گەورە لە بەردەم نەزم و ڕێکخستنی وردی کارەکان. دوو بەشەکەی دیکەش تایبەتن بەو نووسراوانەی کە پەیوەندییەکی تایبەتییان بە مەبەستی باسەکەی ئێمەوە هەیە. پێرستی تەواو تایبەتی وێرای کورتەنیشانەی سەرچاوەکان بۆ چوونە سەر ژێدەر و ئەو بەڵگەنامانەش کە لە ڕیزبەندی تایبەتی خۆیان دان خراونە ڕوو.

## ١ـ مێژووە گرینگەکان ئێرانی

ئەو سێ شوێنەوارەی کە وێکرا بەشی زۆری تانوپۆی قۆناخی سالانی ١٧٤٧ ـ ١٧٩٥ دەگرنەوە و تێکیانتەنیون، بە شێوەیەکی بنەڕەتی دەکەونە ڕیزی ڕووداونووسینەوەکانی زنجیرەیی لە سەر شێوازی شیکردنەوەی کۆنباوی ئێرانییەکان پاش ئەوەی دەسەلاتی ڕەگەزی مەغوول بە سەریاندا دەشکێتەوە. کەموکووڕی ئەم بەرهەمانە کە لە بابەتی ٢ و ٣ و ٦دا کەلکیان لێوەرگیراوە پێشتر لە لایەن تویژەرانەوە باسیان کراوە و لە شوێنەوارەکانی خۆیاندا هێناویانن و پێویست بە دووپاتی ورد و باریک ناکا[1]. مەیل و سەرنجی ئەمانە بۆ

1-See Browne, A History of Persian Literature in Modern Times,444 – 446; هادی هیدایەتی، کورتەباسێک، ل ١٧ ـ ٢٣.

سەر شێوازی تەنتەناوی عەرەبی و بنەجێبوونیان لــە دەربــاران و لەشــکرگای پاشایان لە بەرامبەر کۆمەڵی گــەورەی گەڕانگــەڕیاندا دەگەڕێتــەوە ســەر ئــەو هەڵومەرجەی باڵی بە سەر کێشاون. هێندێک جاران کە وەک گوڵستانە زۆریــان بێلایەنی پاراستووە، خەڵکی ئاسایی لــە کتێبەکــەدا دێنــە ڕوو. نووســینەوەی ڕووداوەکان لەم شوێنەوارە بێنەزم و غەرەزاوییانــەدا و خۆدانــە نووســینەوەی ساڵبەساڵی ڕووداوەکان گەلێکی هەڵە لە حیسابی ڕۆژمێری ئیســلامی کــۆچی و ڕۆژمێری هەتاوی ترکان و ئێرانییەکاندا بەدی هێناوە و تەنانــەت لــە هێنــدێک بابەتاندا لەبەر ئەم دووتووییە هەتا شەش مانگ نێوان و جیاوازی هاتۆتە گۆڕ. بەلام بەلای زۆریدا ڕیزبەندی بــاس و بابەتــەکانیان پاراســتووە و لــە بــواری ئــەدەبیات و هونــەر و میعمــاری و ژیاننامــەکاندا جارجارێــک هێنانــەگۆڕی ئیستیعارە و جوانکاری یان دەقەکەی تۆکمە کردووە یان لێکیدابڕیوە. بــێمــەیل بوونیان سەبارەت بە هێنانی ناوی سەرچاوە و بەڵگەنامەکان - لــەم بابەتــەوە زۆربەی گەڕۆکانی ئورووپایی هــەر وەک ئــەوانن - بانگەشــەی سەرســوڕهێن و فوولێکردنەکانیان دەمانخەنە گومانــەوە، بــەلام لــە هــەر شــوێنێک دەســتیان گەیوەتە بەڵگەی سەرچاوەیەکی سەربەخۆ، بابەتەکانیان بــە شــێوەیەکی ورد و بەرچاو لەگەڵ ڕاستەقینە یەکتر دەخوێنێتەوە.

## ئەلف: تاریخی گیتیگوشای محەممەدسادق مووسەوی ئیسفەهانی

نووسەری تەواوترین بەرهەمی یادداشتنووسینەوەی سەردەمی زەندیــە لە بنەماڵــەی ســەیدەکانی مووســەوی هەڵــکەوتووە. وەک گێڕاویانەتــەوە لــە سەرەتای سەدەی هەژدەدا لە فارســەوە هاتۆتــە ئیســفەهان و کەوتۆتــە ڕیــزی داموودەزگــای ئیــداری ســەفەوییان. لــە زەمــانی شاسوڵــتانحوســێندا میرزامحەممەدڕەحیمی مــامی پزیشــکی بارگــا واتــە حەکیمباشــی بــووە و وەک باسیان کردووە میرزاســادق کــار و خزمــەتی خــۆی لــە ژێــر چــاوەدێری ئــەو دەسپێکردووە. ڕوون نیە کە لە دەورانی داگیرکرانی ولات بە دەس ئەفغانەکان و قۆناخی پادشایەتی نادرا بە چی بەڕێچووە، بەلام لە ڕۆژگاری کەریمخانــا وەک شاعیرێکی هەڵکەوتە ناسێندراوە. لە وەختی دەســەلاتدارێتی عــەلیمرادخــانی زەندا لەپڕێک لەبەرچاوان کەوت و تووشی هەژاری و نەداری و کۆڵەمەرگی بۆوە

و ڕووی کردە تریاککێشـان، ئـەم هـەلومەرجـە وای کـرد کـە سـەبارەت بـە عەلیمرادخان و مێژووی فەرمانڕەوایەتی ئەو چەند باس و بابەتێکی تەنتەناوی بنووسێ. لە ڕۆژگاری میرایەتی جەعفەرخانا سـەرلەنوێ بووژایـەوە و کتـێبی گیتیگوشای پێشکەش بەوی کرد. لەبەر دڵی جەعفەرخان کەوتە سـەر غەیبـەتی عەلیمرادخان و لە نووسراوەکانیدا بەئاشکرا لایەنگری لە سادقخانی زەند کرد. نامی لە ساڵی ١٢٠٤ی کۆچی / ١٧٨٩ ـ ١٧٩٠ی زایینیدا لەوپەڕی پیریدا مرد[٢].

ئەدیبانی هاوچەرخی سەرەتا ئەویان لە ڕیزی لاساکەرەوانی «نیزامـی» داناوە کە لە چوارچێوەی مەسنەویدا شێعری دەگوت. هێندێک دواتر لە دەورانی کەریمخانا دەستی کرد بە نووسـینەوەی مێـژووی فەرمانڕەوایەتییەکـەی. ئـەو کارەی دیاری و خەڵاتێکی تۆکمە و چڕوپڕە سەبارەت بـە مێـژووی حوکمـڕانێتی خانی زەند لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە ڕوانگەی کەسێکی پایتەختنشـینەوە بـۆ پێشکێشکردن بە نەسلەکانی دواتـر[٣]. لـە ڕاسـتیدا ئـەم کتێبـە جێگرەوەیـەکی زیرەکانە و ئەدیبانەی بیرەوەرییەکانی مـیرزا محەممەدحوسـێنی فەراهانییـە. ناوبراو لە ساڵانی کۆتایی پاشایەتی وەکیلا وەزیری بـوو[٤]. شـێوازی نووسـینی کتێبەکـە کـارتێکردنی ئەدیبانـەی مێـژووی گـەورەی مـیرزا مەهـدیخـانی ئەستەرئابادی پێوە دیارە و نامی لە پەسندەرانی ئەم نووسەرە بووە. لە کتـێبی نامیدا کەمتر لە باوی سەردەم خۆ لە قەرەی ڕووداونووسینەوەی سـاڵانە دراوە. بۆ دەسپێکی پێنجساڵەی سەرەتای پاشایەتی کەریمخـان کـەلکی لـە ڕۆژمێـر و ناوەکانی ترکی بـە هەڵـپاچینی چوارسـاڵ وەرگرتـووە. بـۆ وێنـە لـە کتـێبی «سیچقانئیل»دا ساڵی ١١٦٩ی کۆچی / ١٧٥٦ی زایینی دروستە نەک ١١٦٥ی کۆچی / ١٧٥٢ی زایینی و هتد. دووپاتی بەهەڵکەوتی سەر باسەکان بۆ دۆزینەوەی خاڵـە هاوبەشەکانی باس و مەسەلەکانی جوغرافییایی و بابەتی یاریدەرە. بەداخـەوە

---

٢ـ بڕوانە: گوڵشەنی مراد، ل ٢٤٤ ـ ٢٤٧؛ ئازەر، ژیاننامـەی هاوچـەرخان؛ دونبـولی، تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی یەکەم، ل ١٣٥ و نیگارستان، لاپەڕە ٢٧١ـ ٢٧٢؛ بـیر، ل ١٥؛ هیدایەتی، مێژووی زەند، ل٣٣ ـ٣٤، کورتەیەک، ل٢٤ـ ٢٧؛ سەدری ئەفشار، ل ١٥٩ ـ ١٦٠.

٣ـ سەبارەت بە ژیاننامـەی نـامی وەک شـاعیر، بڕواننـە: وتـاری بـەحرولعلوومی، گۆڤاری کۆلێژی ئەدەبیات، ساڵی ٢١، ژمارە ١، ل ٢٥ ـ ٣٢.

٤ـ گیتیگوشا، ل ٢١٠. Mann, ((ueber die Quellen 17 – 18)); Beer, 11 – 12.

خودی بابەتەکان لەبەر تێوەدانی ئیستیعارە و درێژدادڕی کەمکاڵە بوون[٥].

گەڵاڵەی نامی بە مەبەستی تەواوکردنی مێژووی خانەدانی زەندیە هەتا کۆتایی میرایەتی کەریمخان، لەبەر مردنی لێکهەڵپسا. دوو پاشکۆکەی دواتر بە دەس میرزا عەبدولکەریمی کوڕی عەلیڕەزا ئەششەریف شەهراوی (نووسەری کتێبی زینەتوتتەواریخ) و محەممەدڕەزا شیرازی نووسراوە و ئەم دوو بەشە لە زۆربەی ئەو شەش نوسخەی گیتیگوشایەدا کە بە دەستەوەن وەبەرچاو دێن. من کەلکم لەو کتێبە وەرگرتووە کە مامۆستای نەمر نەفیسی پێیداچۆتەوە و هەڵە و پەڵەکانی هەڵگرتۆتەوە. خوێنەرەوە بە مەبەستی وەدەسهێنانی زانیاری زیاتر دەبێ بچێتەوە سەر پێشەکی ئەو کتێبە[٦].

## ب: مێژووی «گوڵشەنی مراد»ی ئەبولحەسەنی غەففاری کاشانی

هاوچەرخی لاوتری نامی و سێهەمین کوڕی موعیززەددین محەممەدی غەففاری مستەوفی لە بنەماڵەیەکی کاشانی بەوەلەد بووە. باوکی لە سالانی حکوومەتی کەریمخانی زەندا حوکمڕانی کاشان بوو[٧]. لە وەختی شالاوی محەممەدحەسەنخانی قاجار بۆ سەر شاری کاشان کەوتە بەرخۆدان. لە پەلامارێکی لەنەکاوی سپای قاجارا لە حەمامدا کەوتە داو و بە دیل گیرا. نووسەر لە پێشەکی گوڵشەنی مرادا بە داخ و کەسەرەوە باسی ئەو ماوەیە دەکا کە لە تەمەنی ٧ تا ٩ ساڵیدا ناچار بە فێربوونی وێنەگەری کراوە. ئەو دەیهەویست لەم ڕێگەیەوە خۆی بۆ وەرگرتنی شوغڵێک لە نیگارخانەی میریدا ئامادە بکا، بەڵام زەوقی پتر لەگەڵ ئەدەبیات دەهاتەوە. میرزا محەممەدی برووجێردی کە خەزێنەداری میری و دۆستی غەففاری پیر بوو پێشنیاری پێکرد کە کوڕەکەی بخاتە سەر ڕەوگەی کاری ئیداری. لەبەر ڕاسپاردەی وی یادداشتنووسی گەنجی

---

5- cf. Beer, 11 – 15; Mann, ((ueber die Quellen)) 18;

هیدایەتی، مێژوو، ل ٣١ ـ ٣٥؛ کورتەباسێک، ل ٢٩ ـ ٣٤.

٦ـ پێشەکی هەڵەچن لەسەر مێژووی گیتیگوشای زەندیە، هیدایەتی، مێژووی زەندیە، ل ٣١ ـ ٣٢ و ٤١ و ٤٥ و هەروەها Rien, 196 – 197.

٧ـ گوڵشەنی مراد، ل ٧ و ٤٢ تا ٤٣؛ زەرابی ٣١٦ ـ ٣١٩؛ نەڕاقی، پەراوێزی ١٥٣ و ١٥٥.

ئێمە لە بارگا وەک میرزا دەستی کرد بە کار و توانی لە رایەڵوپۆی زانیارییەکانی خۆی و باوکی مێژوویەک بۆ سالانی دواتر لە ١١٦٧ی کۆچی / ١٧٥٤ی زایینی بە شێوەیەکی ورد و باریک و بەکەلک بنووسێ و رێکیبخا.

لە ساڵی ١١٩٣ی کۆچی / ١٧٧٩ی زایینیدا یانی ساڵمەرگی وەکیل، غەففاری بە ئامانجی نووسینەوەی رووداوەکانی سالانی حکوومەتی زەندیە، بە وردی کەوتە خۆ و لە ماوەی چوارساڵ ئاژاوە و پشێوی ئەم خانەدانەدا تا حکوومەتی عەلیمرادخان لە ساڵی ١١٩٧ی کۆچی / ١٧٨٣ی زایینی و هەڵبژاردنی ئیسفەهان وەک پایتەخت بە بوونی ئارامییەکی کەمتاکورت و خاترێکی ئاسوودەوە لەم رێگەیەدا شێلگیرانە هەوڵی دا و لە ساڵی ١٢١٠ی کۆچی / ١٧٩٦ی زایینیدا کارەکەی تەواو کرد. کتێبی گوڵشەنی مراد پێکهاتووە لە پێشەکییەک و دوو بەش ـ جگە لە بەشی سێهەم کە گەلالەی بۆ دارێژراوە ـ دەربارەی فەرمانڕەوایەتی کەریمخان، زەکیخان و عەلیمرادخانی پەسندەرێتی و دوابەدوای یەک نووسراون و نووسەر ناوی کتێبەکەشی لە رووی سەلیقەوە داناوە و ناوی «مراد»ی لێناوە[٨].

پێشەکی ئەم شوێنەوارە کورتە پێداچوونەوەیەکی روونە سەبارەت بە جێنشینانی یەک لەدوای یەکی نادر و ململانەی دەسەڵات لە ئێرانی رۆژاواییدا و لە دوو بەشەکەی دواترا دیمەنێکی روون و ئاشکرا دەربارەی چوونە سەر دەسەڵاتی کەریمخان لە ساڵی ١١٦٨ی کۆچی / ١٧٥٥ی زایینیرا لەگەڵ هەندێک وردەکاری باریک دەخاتەروو. کتێبەکەی لە لایەن ژێدەرانی ئوروپاییرا ئۆبالی بۆکێشراوە و لە تاریخی گیتیگوشای نامی جێیمتمانەترە. چەند باسێکی هەڵە وەک بەسەرهاتی میسیۆنی مەسیحی شیراز و کارگێری کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵاتی بە ناوی ئێسکیت کە غەففاری لە کتێبەکەیدا بە باڵوێزی رووسیای داناوە (١٥ ـ ٥) لەم کتێبەدا نووسراوەتەوە. لە بەشەکانی سەر بە کۆتایی فەرمانڕەوایەتی کەریمخانا کە غەففاری لە دیتن و هەستپێکردنی رووداوەکانی شیراز بێبەش بووە و وێدەچێ کە لە کاشان بووبێ، بڕوایەکی قووڵی سەبارەت بە نامی نیشان داوە و باس و بابەتەکانی خۆی بەتایبەت دەربارەی گەمارۆی

---

٨ـ گوڵشەنی مراد، ل ٢ ـ ٤؛ مێژووی زەندیە، هیدایەتی، ل ٤٦ ـ ٤٧ کورتەباسێک بە قەڵەمی هیدایەتی، ل ٣١ ـ ٣٥.

بەسرەوە وشە بە وشە لە ڕووی کتێبەکەی ئەورا نووسیوەتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا هەڵسەنگاندنی ئەم کتێبە لەتەک موجمەلوتتەواریخی گوڵستانە کە بە شێوەی گشتی پڕە لە گەلێک لەنگیولۆری لە بابەت سالانی ۱۷۵۰ ـ ۱۷۵۵ و هەروەها لەچاو کتێبی نامی بایەخی زۆر پترە. ئەگەرچی بە باری نووسەریدا بەرهەمێکی شاز و درەوشاوە نیە، بەڵام لەبەر تەرخان کردنی چەند بەشێکی دووروودرێژ سەبارەت بە شێعر و هونەرمەندان و زانایانی ئایینی هاوچەرخی، دیمەنێکی چاکتر لە ژیان و کەلتووری کۆمەڵی زەمانی خۆی نیشان دەدا.

وا وێدەچێ کە تەنیا دوو بەرگ لەو کتێبە هەبێ: یەکیان لە کتێبخانەی «مەلیک»ی تارانە و ژمارەی سپاردنی ٤٣٣٣یە و لە ساڵی ۱۲۱۰ی کۆچی / ۱۷۹٦ی زایینیدا لە کاشان ڕێکخراوە و ئەوی تر زۆر درەنگتر نووسراوەتەوە و لە ساڵی ۱۸۸۷دا لە ڕووی ئەم بەرگەی کاشان هەڵگیراوەتەوە و بە ژمارەی ۳۵۹۲ لە کتێبخانەی بریتانیایە[9]. بەپێی ئەم نوسخەیە ژمارەیان لێدراوە و ئێمەش کەلکمان لەم دەقە وەرگرتووە.

## ج: ئەبولحەسەن محەممەدئەمین گوڵستانە ـ موجمەلوتتەواریخ

ناوبراو ئاخرین کەسی ئەم تاقمەیە و بە یەکێک لەو سێ رووداونووسەوە سەرەکییانەی دەورەی زەندیە دادەندرێ. ئەو باشترین بیۆگرافینووسی بەڵگەدارە و لە ڕەگەزی بنەماڵەی سەیدانە. ئەم سەیدانە پاشناوی خۆیان لە ڕووی ناوی ناوچەیەک لە ئیسفەهان خواستۆتەوە، چونکە باپیرانیان لەم مەڵبەندە ژیاون. ماوەیەک بوو کە بنەماڵەکەی بەرەو خاکی کرماشان کۆچوباریان لێنابوو. لە زەمانی نادرشادا دووکەس لە مامەکانی پلەی بەرزیان وەرگرت، بەڵام ماوەیەک دواتر کەوتنە بەر غەزەبی و ڕایانکردە هیندووستان. میرزا محەممەدتەقی مامی باوکی ماوەیەک حوکمڕانی هەڵبژێراوی نادرشا بوو لە کرماشان و چەند پلەیەکی دیکەی لە ڕۆژاوای ئێران وەدەس هێنابوو. پاش نەمانی ئەو پاڵشایە، عادڵشا وێڕای ئەمیرخانی تۆپچیباشی

9- See Rieu Suppt, 45 – 66; Storey, Persian Literature, I, 331 – 332, Persidskaya Literatura, 936 – 937; هیدایەتی، ل ۳۵.
The latter two Works incorrectly date Malik Monuscript as 1201.

کردییە سەرداری گرینگترین سەربازگە و قۆرخانەی قەڵای کرماشان، بەڵام وەختایەک برایمیرزا دژی عادڵشا ڕاپەڕی کەوتە ڕیزی لایەنگرانی ئەو. پاش ئەوەی سەرهەڵدانی برایمیرزا بەخراپ بە سەری‌دا شکایەوە و پێی تووشی گرفتاری و چارەڕەشی بۆوە، میرزا محەممەدتەقی بە یارمەتی عەبدولعەلی‌خانی میش‌مەست جڵەوی کاری قەڵای بە دەستەوە گرت و لە بەرامبەر کەریم‌خانا دەستی کرد بە بەربەرەکانی. بەڵام ماوەیەک دواتر تێگەیی کە دەبێ بەر لە گەیشتنی عەلی‌مەردان‌خان و خوازەری تانج و تەختی پاشایەتی هاوڕێی کە لە بەغداوە دێن، قەڵا چاکتر دابەستێ. ماوەیەک دواتر هەستی کرد کە ڕەوتی ئاڵوگۆڕەکان بە قازانجی ئازادخان داژوێن و کەوتە لای وی. ئازادخان دووبارە کردییەوە بە حوکمڕانی کرماشان. سەرەنجام ڕاپەڕیوان لە کرماشان کوشتیان. گوڵستانەی گەنج وەک بارمتە لای دۆستانی کەریم‌خان دەژیا، بە مەبەستی چوونە نەزرگەی پیرۆزی ئیمامان لەوێ ڕایکرد، پاش ڕاکردن دوو برای لە خۆی چکۆلەتریشی کە بە دەس بکوژانی میرزامحەممەدتەقی دیل و زیندانی کرابوون، چوونە لای. پاشان لە ساڵی ١١٦٩ی کۆچی / ١٧٥٦ی زایینی‌دا هەرسێکیان لە ئێراقەوە بەرەو هیندووستان کەوتنەڕێ[١٠].

ئەگەرچی ماوەی پازدەساڵی ئاخری تەمەنی وەک دوورخراوە لە مورشیدئاوا دەژیا، بەڵام کتێبی موجمەلوتتەواریخی وی پاش نادر کە لە ساڵی ١١٩٥ ـ ١١٩٦ی کۆچی / ١٧٨١ی زایینی‌دا نووسرا[١١] بەشێکی زۆری تایبەتە بە ڕووداوەکانی کۆتایی ئەفشارییە و سەرەتای سەردەمانی زەندیە و نووسەر نەک هەر تەنیا بە چاوی خۆی دیتوونی، بەڵکوو لە هێندێکیان‌دا دەوریشی گێڕاوە؛ بۆ وێنە جارێکیان لە لایەن مامی‌ڕا نێردرابوویە هۆردووگای وەکیل. ئەگەرچی دەڵێ کە هیچ دەقێکی مێژوویی سەبارەت بە ڕووداوەکانی پاش نادری بە دەستەوە نەبووە و تەنیا سەرچاوەکانی خۆی لە دووتوێی نامە و بەڵگەنامەکان‌دا

١٠ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٣١، ٢٣٤،١٢٣، ٢٨٦، ٢٧٣، ٣١٣ و پێشەکی هەڵەچنەکەی، لە ل١٠ـ١٦؛ هیدایەتی، مێژووی زەندیە ل٥٠، کورتەباسێک، ل٣٥ـ٣٩؛ سەدری ئەفشار١٢٠ـ ١٣٠؛ Mann, ((ueber die Quellen)) 5 – 8, Storey, Persian Literature, 1, 330.

11- For the date of composition see Mann, ((ueber die Quellen)) 9 – 14; موجمەلوتتەرایخ، ل ١٧.

دۆزیوەتەوە، بەلام بە ڕوونی پێی‌لێدەنێ کە سێبەشی ئاخری کتێبەکەی میرزامەهدی‌خان، واتە جیهانگوشای نادری ڕوونووس کردۆتەوە و لە ڕووی ڕاوێژی کتێبەکەی‌ڕا دەردەکەوێ کە بەهرەی لە بیرەوەرییەکانی «داودمیرزا»ی کوڕی شاسلێمانی دووهەم کە هەر لەو وەختی‌دا لە مورشیدئاوا ژیاوە[12]، وەرگرتووە. بابەتەکانی کتێبەکەی پاش چوونەدەر لە ئێران بە سەرنج‌دان بە وردەکاری جێی‌متمانەتری ئەو ڕووداوانەی کە لە وەختی مانەوەی لە ئێرانا بە چاوی خۆی دیتوونی، تەواو لێک جیاوازن و یەکتر ناگرنەوە.

مەیلی گولستانە بەرەو کەریمخان ئەگەرچی لە بەرەی دوژمنانی‌دا بووە، نیشانەی بێلایەنی و نەبوونی دەمارگرژی و بەدخوازییە. ئەویش وەک بارمتەکانی دیکەی وەکیل ــ کە یەکیان عەبدوڕڕەززاق دونبولی بوو ــ مەترسی تێوەدرانی لە گەمەکانی سیاسی خستە سەرشانی و بە چاکی لێی ڕوون بووە کە دۆزینەوەی بارمتەدارێکی باشتر لە وەکیل کارێکی دژوارە. شێوازی نووسینی گولستانە مەیلی بەرەو کورت‌بڕینەوەیە و زۆر کەمتر لە نامی و غەففاری خۆی لە قەرەی خوازە و وێنواندن داوە و لەبەر دیتنی وردەکاری ڕووداوی مەینەتبار، سۆزی خەمێک لە نووسراوەکانی‌دا هەست پێدەکرێ. پێداچوونەوە و ڕاست و بلاوکردنەوەی کتێبەکە لە لایەن مودەڕڕیسی ڕەزەوی‌ڕا لە دەقەکانی دیکەی وەک کووهمەرەئی بەکەلکتر کردووە. کتێبەکە پەراوێزی پێویستی بۆ کراوە.

## ۲ــ مێژووەکانی هاوچەرخ کە لەگەل زەندان کەمتاکورتێک یەکتر دەگرنەوە

دەقی بابەتی ڕووداونووسینەوەکانی بەر لە سالی ۱۷۵۰ یان پاش سالی ۱۷۷۹ یا ڕووداوەکانی دەرەوەی قەلەمڕەوی ئێرانی ڕۆژاوایی، پتر لەگەل باس و بابەتەکانی سەرچاوەکانی سەرەوە یەکتر دەگرنەوە. بێجگە لەو وردەزانیارییانەی کە وەبەرچاو نەگیراون یان لایەنگری و ئەو مەسەلانەی دیکە کە جێی ناکۆکین، دیسانیش بوونە هۆی ڕاگرتنی هاوکێشی بایەخدار لە مێژووەکانی چەرگەی زەندیەدا لە ئێراقی عەجەم.

---

12- Mann, ((ueber dis Quellen)) 9; موجمەلوتتەواریخ، ل ۱۹ ــ ۲۰.

## ئەلف: مەجمەعوتتەواریخی میرزا ئەحمەدخەلیل مەرعەشی

کتێبی میرزاخەلیل دەربارەی باپیرانی بەختوەرگەڕاوی، یەکێک لە باشترین سەرچاوە بەردەستەکانە و لە مەودای ڕووداوەکانی چەندساڵەی سەرەتای پاش مەرگی نادرا نووسراوە. میرسەیدمحەممەدی باوەگەورەی جێنشینی سەرپەرستی کاروباری گومبەزی ئیمامڕەزا بوو لە مەشەد و بۆ ماوەیەکی کورت لە ساڵی ١٧٥٠دا بوو بە پادشا و هەر لەڕێوەش کوێرکرا. داودمیرزای باوکی کوڕەگەورەی میرسەیدمحەممەد، کە لەمێژبوو لەگەڵ ژنبراکەی لە ئێران ڕەویبوون و بەر لە ڕووخانی دەسەڵاتی سەفەوییە، چوونە مەزارگەی پیرۆزی ئیمامان لە ئێراق، لە بنەبانی سێپتامبری ١٧٥١دا بەرەو بووشێهر بزووتن و بەدزی بە یارمەتی نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە بووشێهرەوە بە سواری گەمی چوونە هیندووستان[13]، هەتا لای جێهانگیری گوورەکانی دێهلی بگیرسێنەوە. بەر لە چوونی ئەوانیش ژمارەیەک لە شازادەکانی سەفەوی پەنایان بۆ بردبوو. کاتێک ئەم ناوچەیە کەوتە بەر شاڵاو و تاڵانوبڕۆی ئەحمەدشای دوڕانی، چوونە بەنگال و سەرنجام وەک گوڵستانە ڕوویان کردە مورشیدئاوا. لەم وەختەدا میرزاخەلیل لە ئیسفەهان دەژیا و پاشان چووە شیراز. لەم شارە لە لایەن کەریمخانەوە ڕێزی لێگیرا و لاوێندرایەوە[14]، بەڵام ئاخرییەکەی میرزا داود لە ساڵی ١١٩٢ی کۆچی / ١٧٧٨ی زایینیدا مرد و چوارساڵ دواتر میرزا خەلیل ئەم مێژووەی نووسی[15]. ناوی تەواوی کە تەرجەمە کراوە بریتییە لە: «پوختەی مێژوو لە ڕووخانی خانەدانی سەفەوی و ڕووداوەکانی دوای وی‌ڕا تا ساڵی ١٢٠٧ی کۆچی / ١٧٩٣ی زایینی» و وەک بۆخۆی دەڵێ ئامانجی سەرەکی لە نووسینی ئەم کتێبە هێنانەدی بەرهەمێکی بەرچاوتر و دروستتر بووە لە کتێبی میرزامەهدیخانی ئەستەرئابادی. کتێبەکەی تا ڕادەیەک بێلایەنی تێدا وەبەرچاو گیراوە. هەڵبەت لەبەر پەلەپرووزێ و بە دابی ئەو ڕۆژگاری پڕە لە خوارەکە و پێچەکە و درێژدادڕییەکی زۆر و هێنانەگۆڕی

13- G D VI, 29 September, 3 October 1751.

14- See Rieu 1, 193.

15- Mann ((ueber dis Quellen, 10-11)); Lockhart, Safavi Dynasty, 510 – 512; Pertsch, 425– 427; Sadri – Afshar, 138;.پێشەکی هەڵەچنی کتێبی مەرعەشی

تەنتەنە و سەنسەنەی ئەدەبی و دەسوەردان لە زانیارییەکان[١٦]. ئەگەرچی زۆری هەوڵ داوە بەڵام دەروەستی پێکەوەهەڵکێشانی غللوورانەی پێچەڵفلووچی هەوراز و لێژی بابەتەکانی جیهانگوشای نادری نایا.

بۆ وێنە ئەگەرچی بەسەرهاتی خزمانی سەفەوی خۆی پێش و پاش نادر بە دووروودرێژی نووسیوە، بەڵام بەسەرهاتی نادر و جێنشینانی بە کورتی هێناوە و سەبارەت بە ژیاننامەی کەریمخانیش تەنیا چەند دێڕێکی تەرخان کردووە. شێوازی نووسینەکەی ناوردەکاری و ئاڵۆزبلۆزی پێوەدیارە. کەچی لە میرزامەهدیخان و یادداشتنووسانی دەورەی زەندان ساکارتر و کەمئیددیعاتر قەڵەمی راداوە.

## ب: میرزامەهدی کەواکبی ئەستەرئابادی (مێژووی جیهانگوشای نادری و دورڕەی نادری)

میرزامەهدی واژەناس و رووداونووسێکی وایە کە چەشنی گێڕانەوەکەی بەسەرهاتی نادرشای بۆتە ئیلهامبەخشی زۆرێک لەو مێژوونووسانەی پێشتر ناویان هات و زۆر کەم باسی رووداوەکانی سەردەمی بەرنامانجی ئێمەی کردووە. کتێبی جیهانگوشا بە لێکهەڵوەشانی هێزەکانی برایممیرزا لە رێگای مەشەد کۆتایی پێدێ و دورڕەی نادری تەنیا تۆزێک باسی وردەکاری گیرانی برایممیرزا و مەرگەکەی دەکا و کەم پێهەڵدەچێ. تەواوی ئەم رووداوانە لە ماوەی دووساڵی پاش کوژرانی نادر قەومان.

سەبارەت بە مەهدیخان و کتێبەکانی هیچ بەرهەمێک ناتوانێ هێندەی نرخاندن و هەڵسەنگاندنی چڕوپڕی لۆرێنس لۆکهارت بەکەلک بێ[١٧]. تەنیا دەبێ وەبیر بێنمەوە کە هەردک کتێب هەتا ئێستا بە شێوەیەکی لەبار چاپ و بڵاو کراونەوە و من سوودم لە هەردووکیان وەرگرتووە.

---

١٦ـ پێشەکی کتێبی مەرعەشی و هەروەها: Lockhart, Nadir shah, 294.

17- Lockhart, Nadir shah, 292 – 296; Safavi Dynasty 512 – 513;

هەروەها بڕواننە: هیدایەتی، کورتەباسێک، ل ٤٢ ـ ٤٤.

## ج: مێژووەکانی سەبارەت بە ئەحمەدشا

مێژووی ئەحمەدشاهی، نووسراوی ساڵی ۱۱۷۱ی کۆچی / ۱۷۵۷ی زایینی کە چەند نوسخەیەکیان لە لەندەن و لێنینگرادن، بە قەڵەمی مەحموود ئەلحوسێنی نووسراوە. بەشێک لە ناوەکەی بە شێوەی «ئەلموسەننا» و «ئەلموشەننا» ناودێرە. خوێندنەوەی ئەم کتێبە زانیاری ئێمە سەبارەت بە ڕووداوەکانی پاش کوژرانی نادرشا و بەتایبەت هێرشی ئەحمەدشای دورانی بۆ سەر خوراسان پێهەڵادەبا. لە پێوانەیەکی چکۆلەتردا ئەم کتێبە وەک مێژووی ئاسیای ناوەندی عەبدولکەریم (نەدیم بوخاری) دەچێ[18].

## د: مێژووەکانی سەرەتای قاجار

تەنیا کتێبێکی کە سەبارەتە بە سەرەتای سەرهەڵدانی قاجاریان و من کەلکم لێوەرگرتووە و بابەتی تازە دەخاتە سەر نووسراوەی ڕووداونووسانی سەردەمی زەندیە، مێژووی «محەممەدی»یە. ئەم کتێبە چەند زانیارییەکی دەربارەی ئاکامی چارەنووسی محەممەدحەسەنخان و حوسێنقولیخانەوە پێیە و بە زمانبازییەکی فریودەرانە و ناشیانە ڕێکخراوە و بە ئەحسەنوتتەواریخ ناسراوە و لە ساڵی ۱۲۱۱ی کۆچی / ۱۷۷۹ی زایینیدا بە قەڵەمی محەممەدی سارەوی (خەڵکی ساری مازەندەران) بە ناوی ئاغامحەممەدخانەوە نووسراوە[19].

## ۳ـ بیرەوەرییەکان، یاسا و ڕێساکان، سەربوردەکانی بنەماڵەیی، مێژووەکانی گشتی، کورتە و پەراوێز و پاشکۆی دیرۆکانی هاوچەرخ

پاشماوەی سەرچاوەکان برێتین لە چەند جۆرە ژیاننامە، کورتەمێژوو، گەشتنامە و کورتەباسی لێرولەوێ. زانیاری نێوەرۆکی ئەم کتێبانە بە باری نرخاندندا بە چەشنێکی هاوشێوە پێکەوە جیاوازن و ڕاپۆرتی سەلمێندراو لە لایەن شاهیدانەوە هەتا گێڕانەوەی خەیاڵات و بێبەڵگەش دەگرنەوە.

---

18- Mann Quellen Studien, Rien, 1, 213b; Saidmuradov.

19- Rieu 1, 199a. هیدایەتی، مێژووی زەندیە، ل ۵۵، کورتەباسێک، ۳۹ ـ ۴۰:

ئەلف: کەلانتەر

ڕۆژنامەی بیرەوەرییەکانی میرزامحەممەد لە دیرۆکی سەدەی هەژدەی ئێرانا خاوەن شوێنێکی تایبەتە. ناوبراو لە زەمانی حکوومەتی کەریمخان و جێنشینانیدا کەلانتەری شیراز بوو. لە ساڵی ١١٣٢ی کۆچی / ١٧٢٠ی زایینیدا لە بنەماڵەیەکی بە ڕەگەز سەیدی دەورانی فەرمانڕەوایەتی شاسمایل کە لە خزمەتکاران و بنەماڵەی سەفەوی بوون پێی نایە جەغزی ژیان. سەرەتا بوو بە میرزا (نووسندە) و بە کاروباری دیوانییەوە سەرقاڵ بوو. لە وەختی ڕاگەیاندنی جێژنی پادشایەتی نادرشادا لە دەشتی موغان ئەو یەکێک بوو لە نوێنەرانی فارس و ماوەیەک دواتر بوو بە باجئەستێنی مەمێند. میرزامحەممەدحوسێنی شەریفی مامی دایکی وەک ساحێبئیختیاری فارس (کەلانتەر ـ شارەوان) هەڵبژێردرا و میرزامحەممەد لە خزمەت ئەوا دەستی کرد بە کار. وەختایەک کە شیراز گیرۆدەی پاشاگەردانی و کێشمەکێشمی قۆناخی بۆشایی دەسەلاتی پاش کوژرانی نادرشا بۆوە، مامی دایکی دروست بەر لە هاتنی کەریمخان بۆ شیراز لە ساڵی ١١٦٨ی کۆچی / ١٧٥٤ی زایینیدا ماڵاوایی لە دنیا کرد و میرزامحەممەد لە جێی داندرا. لە ڕۆژگاری جەعفەرخان و عەلیمرادخانیشدا دەستی لە حکوومەتی زەندیە هەڵنەگرت و بیرەوەرییەکانی خۆی هەتا ماوەیەکی کورت بەر لە مردنی لە ساڵی ١٢٠٠ی کۆچی / ١٧٨٦ی زایینیدا نووسینەوە[20].

وەک شاهیدێکی حازر بە سەر تەواوی ڕووداوەکانی ئەوان ڕۆژگاران، لەم ڕێگەیەدا سەرکەوتنێکی ئەوتۆی وەدەس نەهێناوە. سەرسەنگینی و تاکڕەوی و بێ هەستوسۆزی ئەم کتێبەی لە ڕەنگوڕوو خستووە، شێوازی نووسراوەکەش لە بواری داڕشتن و لێکدانی ڕستەکان و بە بواری ڕەوتی ڕووداوەکانیشدا کورت و لاوازە. فەسایی لە فارسنامەی ناسریدا بە شێوەیەکی بەربلاو سوودی لە نێوەرۆکی ئەم کتێبە وەرگرتووە[21].

---

٢٠ـ کەلانتەر ل ٤٩ ـ ٥٢.

٢١ـ بڕواننە: پێشەکی هەڵەبڕی ڕۆژنامەی بیرەوەرییەکانی میرزامحەممەد کەلانتەر.
Lockhart, Nadir shah, 301 – 302; Sadri – Afshar, 127.

## ب: ڕۆستەموتتەواریخ

بە باری شوێن و پلەی تایبەتیش‌دا کتێبی نائاسایی و سەیروسەمەرەی ڕۆستەموتتەواریخ نووسراوی محەممەدهاشم بە نازناوی ئاسەف و ناودێر بە ڕۆستەمولحوکەما وەبەرچاو دێ. خودی سەردێڕی کتێبەکەش سەرنج ڕادەکێشێ لە پێشەکی کتێبەکەی‌دا دەنووسێ کە مامی باوکی و باوەگەورەی ئەمیر شەمسەددین محەممەد هەردووکیان لە خزمەت دەوڵەتی سەفەوی‌دا بوون و باپیری ماوەیەک دواتر وەک کارخانەئاقاسی (ڕیش‌سپی ـ دەمڕاست) شاسوڵتان‌حوسێن هەڵبژێردراوە؛ باوکی لە بارگای وەکیل ژیاوە و لە وەختی دەسبەسەربوونی ئاغامحەممەدخان‌دا لە خزمەتی‌دا بووە. ئەم کتێبە سەرجەمی ئەو نەقڵ و نەزیلە مێژوویی و بەسەرهاتە کۆمەڵایەتییانەن کە لە بیرەوەری باوکی و باپیرەی بیستوونی و گوڵبژێری کردوون. ئەم بەرهەمە لە سەرەتای میرایەتی شاسوڵتان‌حوسێنەوە دەس‌پێدەکا و لە قۆناخی فەرمانڕەوایەتی عەلی‌مرادخانی زەند لە ساڵی ۱۱۹۹ی کۆچی / ۱۷۸۵ی زایینی‌دا کۆتایی پێدێ. کوڕەکەی ئەم کتێبەی هەتا دەورانی فەتحعەلی‌شا درێژە داوە. شێوازی کتێبەکە هەروەک باوکی ڕایسپاردبوو، ساکار و دەوڵەمەندە[22].

بەگوێرەی پێشەکی نوسخەی دەسنووسی تەزکەرەتولملووک کە دەستوور و ڕێسای کاروباری ئیدارییە، یەکێک لە شوغڵە مەشهوورەکان، کاری ئەمیرسەمیع «نامی»یە کە خۆی مامەگەورەی محەممەدهاشم بووە[23]. ڕۆستەموتتەواریخ لە بابەت ئەرکی ئەم شوغڵەوە چەند بابەتێکی نووسیوە و لیستەیەکی کاروباری ئیداری و پێداچوونەوە بە داهاتی پارێزگاکان و نرخی کەل‌وپەلی بازاڕیشی تێدایە و لە نیگای یەکەمڕا دەردەکەوێ کە ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی درەوشاوەیە وەک کەرەسەی خاوی مێژووی کۆمەڵایەتی و ئابووری سەدەی هەژدەی زایینی ئێران.

بۆ بەدبەختیان بەشێک لەو گاڵتە و جەفەنگانەی کە دەکرا دژی سەرچاوەکانی دیکە کەلکیان لێوەربگیرێ ساکار و خەیاڵاتییانەن و ئەوانەش کە

---

٢٢ـ ڕۆستەموتتەواریخ، ل ٦٢ ـ ٦٣.

٢٣ـ دەستوورولملووک، ل ٤٧٦ ـ ٤٧٧.

وا نین ڕەنگ و بۆنی فێڵ و ئەفسانەیان لێدێ. دوو بەسەرهاتی سەمەرەی لە بابەت ئازایەتییەکانی شازادەکانی زەندی لەگەڵ مێژوویەکی گاڵتەجاڕییانەی نێوان و پەیوەندی کەریمخان و بریتانیای تێدا وەبەرچاو دێ[24]. ئەو نوکتانەی کە سەبارەت بە وەکیل هێناونی زۆربەیان خاوەنی سرشتی ساختە و خەیاڵاتییانەن و گەلێک جاران زمانی نەپاراستووە و قسەی سووکی کردووە؛ لەگەڵ ئەمەشدا دونبولی و مێلکۆم و نووسەرانی ئەم ئاخرییانەی بنەماڵەی قاجاریش نەقڵی وەوتۆیان گێڕاوەتەوە. من بەهەرمم لە زانیارییەکانی ئیداری و پوختەی ڕۆستەموتتەواریخ، بەتایبەت لە بەشی چاردەهەمدا وەرگرتووە، بەڵام دەبێ پێی لێ بنێم کە سەبارەت بە ڕاستی و دروستی باس و بابەتی بەشەکانی دیکە کە لە لایەن سەرچاوەکانی ترەوە ئۆباڵیان بۆ نەکێشراوە، دووشکم.

پێرستەکانی «ڕۆستەموتتەواریخ»م لە ڕووی دەقی دەسنووسی «توو‌بینگێن»ەوە نووسیوەتەوە[25].

## ج: تەزکەرەتولملووک و دەستوورولملووک

ئەم دوو کتێبە باسی یاسا و ڕێسا و دەستووری کاروباری بەڕێوەبەرایەتییە و بۆ فێربوونی ئەشراف و سەرکەوتووانی ئەفغان سەبارەت بە هەڵسوکەوتی دەرباری و حکوومەتی پاشایەتی بەو جۆرەی کە لە زەمانی ئاخرین سوڵتانەکانی سەفەوی لە ساڵانی ۱٦۹٤ ـ ۱۷۲۲دا باو بووە، نووسراون، بەڵام تەواو هاوکات ڕێکنەخراون. وەک دیتمان بیر و سەلیقەی حکوومەتی سەفەوییان لانیکەم هەتا ٥٠ساڵ پاش سەرەونخوون بوونی ئەو خانەدانە وەک بنەما و بنەڕەتی تێئۆریکی حکوومەت مابوویەوە. بە بەراورد کردنی سەرچاوەکانی زەندیە و سەرەتای قاجارییە و سەردێری بابەتەکانی کە لەم دوو کتێبە پڕبایەخەدا دێتە بەرچاو، ئادەمیزاد وێڕای پێداچوونەوە و نرخاندن دەتوانێ بەم ئاکامە بگا کە داب‌ونەریتی سەفەوی لە حاڵی سوان و پوان یان جێگۆڕکە لەگەڵ بیر و بۆچوون و کاری تازەدا بوون.

تەزکەرەتولملووک لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ناوی نووسەرەکەی دیار

---

24- Pp. 385 – 398; See 15. 6 note 96.

۲٥ـ بڕواننە: بابەتەکانی دیکەی ڕۆستەموتتەواریخ و پێشەکی هەڵەچن.

نیە و ویلادیمیر مینۆرسکی ئەمر زۆری زەحمەت بە هەڵەبڕی و پەراوێز و تەرجەمەکەیەوە کێشاوە. «دەستووروڵملووک»ی میرزا ڕەفیع لە باری چوارچێوە و گەڵاڵە و هۆنینەوەی وشەکان زۆر وەک ئەم کتێبە دەچێ. شێوەی ڕێکخستنەکەی باشتر و وردترە؛ دەقێکی بە پێشەکی گەلێک باشی محەممەدتەقی دانیشپەژووە بە شێوەی زنجیرە وتار لە گۆڤاری کۆلێژی ئەدەبیات و زانستە کۆمەڵایەتییەکانی زانکۆی تارانەوە چاپ کراوە. لەبەر ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان هەردک پێداچوونەوە و هەڵەبڕی و شیکردنەوە و لێکدانەوە و پێرستنووسی ئەوانا هەیە ناوی کتێب لە ژێر ناوی ئەو کەسە نووسراوە کە خۆی بە ڕاستکردنەوەیەوە، سەرقاڵ کردووە.

## د: ئازەر و دونبولی

یەکەلکترین فەرهەنگنامەی فارسی سەبارەت بە ژیان و بەسەرهاتی ئەدیبان دوو کتێبی «ئاتەشکەدە»ی مەنشووری لوتفعەلی بەگی ئازەر و تەجرەبەتولئەحرار و تەسلیەتولئەبراری عەبدورڕەززاق دونبولییە. ئازەر بە شێوەیەکی بەربلاو لە ماوەی پادشایەتی نادرشا و ڕۆژگاری بۆشایی دەسەڵاتا گەڕاوە و لێکۆڵینەوەی کردووە. (لە هۆردووگا وێڕای عەلیمەردانخان و کەریمخان بووە.) لە زەمانی فەرمانڕەوایەتی وەکیل لە ساڵی ۱۱۷٤ی کۆچی / ۱۷٦۰ی زایینی واتە لە تەمەنی ٤۰ساڵیدا کتێبەکەی نووسیوە: دوابەشی کتێبەکەی کە باسی ژیان و بەسەرهاتی هاوچەرخان دەکا بەداخەوە لە چاپی سەنگی بەمبەئیدا ژمارە لاپەڕەی لێنەدراوە، بەڵام ژیاننامەی خودی نووسەری تێدایە[26]. کورتەیەک لە مێژووی دەورانی سەفەوی هەتا زەمانی مانی خۆی و ـ پوختەیەک لە نووسراوەی ئەستەرئابادی ـ چەند زانیارییەکی سەبارەت بە ژیان و بەسەرهاتی هاوچەرخانی[27] تێدا وەبەرچاو دێ. دونبولی (۱۱۷۲ ـ ۱۲٤٤ی، ک.م.) وەختایەک کە لە ساڵی ۱۷٦۵دا نێردرایە لای وەکیل لە شیراز

26- See Browne, Persian Literature, 282 – 284;

دونبولی، تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی یەکەم، ل ۲٦۹.

۲۷ـ تەجرەبەتولئەحرار، بەرگی یەکەم، ل ۱۱۳؛ بەرگی ۲، ل ٤۱ ـ ٤۲؛ سەدری ئەفشار، ل ۱٤۸؛ هەروەها بڕواننە: سەرچاوەکانی ۵، ۷، ۱۳ و ۵۰.

منالۆچکەیەک بوو. ئەو وەک بارمتەی نەجەفقولیخانی باوکی هاتە ئەم شارە. کتێبەکەی سێ بەشە کە بەشی یەکەمی تایبەتە بە چەند بابەتێک سەبارەت بە ۲۰دیوانەشێعر و بەشی دووهەم قۆناخێک لە سەردەمی سەفەوی و شاعیرانی هاوچەرخ دەگرێتەوە. بەشی سێهەم کە بەکەلکە، تایبەتە بە کورتەیەک لە ژیاننامەی خۆی و ئەو ڕووداوانەی لە شیراز دیتوونی. ئەم بەرهەمە لە دوو بەرگاندا بە دەس ح.ق. تەباتەبایی چاپ کراوە و «نیگارستانی دارا» و «مێژووی شوێنەوارەکانی سولتانییە»ش دوو کورتەبەرهەمی دیکەی «دونبولی»ن.

.

## ه: کووهمەرەئی

یەکێک لە پڕبایەخترین بەرهەمە خالیسەکانی مێژوویی سەبارەت بەم قۆناخە کۆبە و پەراوێزەکانی «موجمەلوتتەواریخ»ە. ئەم کتێبە لە کۆتایی سالی ۱۲۰۰ تا ۱۲۰۳ی کۆچی / ۱۷۸٦ ـ ۱۷۸۹ی زایینی لە شیراز بە قەڵەمی زەینولعابیدین کووهمەرەئی نووسراوە. ئەم بەرهەمە برێتییە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی دوورودرێژ و ڕووناککەرەوە سەبارەت بە زەندیە و دەقەکەی لە ڕووی گولستانەوە هەلگیراوەتەوە. ئەم کتێبە زیاتر پەیوەندی بە دەورەی بەرباسی ئێمەوە هەیە و ڕووداونووسینەوەیەکی بەربلاوە و بیۆگرافی کورتی مەزن و گەورەپیاوانی زەند و هاوچەرخانی دیکەی دەگرێتەوە و کۆمەلێک بیرەوەری خۆی و ئەو ڕووداوانەی تێدایە کە باوکی و دۆستانی لە فارس دیتوویانە[۲۸].

## و: بیرەوەری و سەربوردەکانی بنەمالەیی و خۆجێیی

. کتێبی بەکەلکی «فەوایدوسسوفییە» لە سالی ۱۲۱۱ی کۆچی / ۱۷۹٦ـ۱۷۹۷ی زایینیدا بە دەس یەکێک لە پەنابەرانی سەفەوی لە هیندووستان نووسراوە و ناوی «ئەبولحەسەن قەزوێنی»یە و تا کۆتایی سالی ۱۲۰۵ی کۆچی / ۱۷۹۱ی زایینی لە تاران ژیاوە. نووسراوەکەی تێکەلەیەکە لە بەسەرهاتی بنەمالەیی و مێژووی ئێرانی ئەو سەردەمە. ئەم بەرهەمە بە فەرمانی کوڕی

۲۸ـ موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٦ ـ ۲۷.

شاسوڵتانحوسێنی دووهەم ـ هەر ئەوکەسەی داوای پادشایەتی دەکرد و عەلیمەردانخان باڵی بە سەر کێشابوو ـ نووسراوە، بەڵام وەک یەکێک لە سەرچاوە سەرەکی و دوورودرێژەکانی ڕۆژگاری میرایەتی شاروخمیرزا، شاسلێمانی دووهەم و ئەحمەدشای دورانی پشتڕاست کراوەتەوە. پوختەیەکی بەکەلک و مناسبی دەربارەی ڕووداوەکانی خانەدانی زەندی ئەو ڕۆژگاریشی تێدایە[٢٩].

تەزکەرەی ئالیداود لانیکەم لە بەشی دووهەمدا تۆزە جیاوازییەکی لەگەڵ کتێبی مەرعەشی هەیە. بەشی یەکەمیشی بە بەرفرەوانی لە فەوایدوسسوفییە وەرگیراوە. ئەم نووسراوەیە بەرهەمی محەممەدهاشم پێنجەمین کوڕی میرسەید محەممەد (شاسلێمانی دووهەم) و مامی میرزاخەلیلی مەرعەشییە. ئەو لە ساڵی ١١٦٠ی کۆچی / ١٧٤٧ی زایینی هاوکات لەگەڵ کوژرانی نادرشا لە مەشهەد پێی نایە ژیان و لە ساڵی ١١٨٣ی کۆچی / ١٧٦٩ی زایینیدا ئەو شارەی جێهێشت و چووە ئیسفەهان و سەرەنجام سەفەری کرد بۆ شیراز. لە ساڵی ١٢١٨ی کۆچی / ١٨٠٣ی زایینیدا لەم شارە کتێبەکەی خۆی تەواو کرد (گۆیا کتێبەکەی بە «زەبوور»ی ئالیداود بەناوبانگە) بەڵام تا دەساڵی دیکەش واتە هەتا زەمانی مردنی هەر لێی زیاد کرد. ئەگەرچی ئەو لە سەردەمی ئەفشارییان و زەندیاندا ژیاوە، کەچی ئەو کاتە زۆر گەنج بووە و کتێبەکەی گەلێ بیرەوەری خۆی نەگرتۆتەوە و ئەو مەبەستە وای کردووە کە نووسراوەکەی وەک مێژوویەکی کۆنەونوێی لێبێ دەربارەی بنەماڵەکەی. بەشی سەبارەت بە زەندیە بە شێوەیەکی تایبەتی ڕێکوشراو و کورت کراوەیە[٣٠].

سەید عەبدوڵڵای شووشتەری نووسەری تەزکەرەی شووشتەر و میر عەبدوللەتیف شووشتەری نووسندەی توحفەتولعالەم لە ژیان و بەسەرهاتیانڕا دوو سەیدن کە هەردووکیان زێد و نیشتمانیان کە شووشتەر بێ لێیان بۆتە پاشناو. توحفەتولعالەم وردە زانیارییەکی ڕاستەقینەی لە بابەت گەماڕۆی شووشتەر و تایفەی بنیکەعبەوە تێدایە.

زینەتوتتەواریخ، مێژووی گەورەی هەرێمی ڕۆژهەڵات لە ساڵی ١٢١٨ی

29- cf. Browne, Catalogue, O0 6. 41; Rieu 1, 133 - 134; Pertsch, 515 – 516.

30- Mann, Quellen Studien, 14 – 15; Rieu 191. موجمەلوتتەواریخ، ل ٢٠ و ٢٢.

کۆچی / ۱۷۰۳ی زایینیدا بە قەڵەمی میرزا محەممەدڕەزا تەوریزی (کە لە داوێنی موجمەلدا ئاماژە بە ناوی کراوە) و لە لایەن عەبدولکەریم کوڕی عەلیڕەزا شەریف ئەششەهاورەی بە ناوی فەتحعەلیشاوە نووسراوە. سێرجان مێلکۆم تارادەیەکی بەرچاو سوودی لەم کتێبە وەرگرتووە. وەک گوتوویانە عەبدورڕەززاق دونبولیش لە نووسینی ئەم کتێبەدا بەشدار بووە[31]. دوو نوسخەی ئەم کتێبە لە کتێبخانەی بریتانیایە کە من کەلکم لێوەرگرتوون و پشتم بە بابەتەکانیان بەستووە و ژمارەیان «۸۳ و ۱۷۱»ە. لە ڕاستیدا شەهاوەری یەکەم نووسەری درێژەدەری کتێبی «نامی»یە، بەڵام بەپێچەوانەی بۆچوونی سەعید نەفیسی وێناچێ لەگەڵ نووسەری مێژووی زەندیە کە «ئێرنێست بیر» ناساندوویەتی بە هەڵە گیرابێ؛ ناوی وی بە پاشوپێش کردنی ناوی باوکی بە شێوەی کوڕی عەبدولکەریمی عەلیڕەزا شیرازی نووسراوە، بەڵام ئەم وەپێشدان و ناسینەوەیەش لە هەموو دەقەکاندا ڕەنگی داوەتەوە. ئەم مێژووەی ئاخری ـ کە لە کتێبخانەی بریتانیادا ژمارەی ۲٤/۹۳۰ بە سەرەوە ـ بە گشتی هەروەک دەربارەی جێنشینانی کەریمخان دواوە، ئاواش باسی دەورەی قاجاری کردووە. سێرجان مێلکۆم بەهرەی لە بابەتەکانی ئەم کتێبە وەرگرتووە[32]. ئەو پێشنیارەی کە ئێرنێست بیر لە سەری نووسیوە زۆرتر خستوویەتە ڕۆژەوی کەلک لێوەرگیران.

کتێبەکە هەروەک زینەتوتەواریخ سەردێڕێکی بە سەرەوە نیە و باسی دیرۆکی ئێران لە مابەینی ساڵانی ۱۷۲۲ تا ۱۷۷۹دا دەکا و ڕەزبیەددینی تەفرەشی نووسیویەتی. هەردەڵێی ناوبراو بەرهەمی نامی و غەففاری کورت کردۆتەوە و سەرلەنوێ نووسیویێتەوە[33].

## ز: نوکتە و وتەی ورد و باریک

نامەی خوراسان شوێنەواری ئیحتیشامولموڵک ـ یەکێک لە کوڕانی

---

۳۱ـ ئاغاسی، ل ٥۳۸.

۳۲ـ تاریخی گیتیگوشای زەندیە، پێشەکی هەڵەچن، سەدی ئەفشار، ل ۱۱٤.

Rieu 1, 135 – 137.

33- Rieu II, 738.

فەتحعەلیشا ـ یە. بە باری گێڕانەوەی دووبارەی نەقڵ و نەزیلەکانی وەکیل و ئاغامحەممەدخان بەتایبەت لە وەختی دەسبەسەر بوونی خانی قاجاردا لە شیراز زۆر بایەخدارە. هێندێک لەو ڕووداوانەی خودی فەتحعەلیشا لە کاتی بارمتەبوونی مامیدا لە شیراز دیتوونی، دەگێڕێتەوە. کۆمەڵێکی دیکەی ئەم داستانە «حیکایەتوسسەلاتین»ی میرزامەهدی ئیسفەهانییە. نوسخەی دەسنووسی ئەم کتێبەی کە من کەلکم لێوەرگرتووە، ئێستا لە زانکۆی «ئیدنبوورگ» هەیە[34]. ئەم کتێبە بۆ ڕێزدار «ڕۆبێرت مۆنرۆئێ بینینگ»ی ئینگلیسی نوسراوەتەوە و ئیمزای وی لە سەرەتاکەیدا ودبەرچاو دێ. ئەم شوێنەوارە بە دژواری دەکرێ بە بەرهەمی هاوچەرخ دابندرێ، چونکە لە ساڵی ١٨٤٥ یا ماوەیەک بەر لەوی نووسراوە و زنجیرە بابەتێکی سەبارەت بە کەریمخان تێدایە (بەشی یەکەم). هەروەها بابەتەکانی کتێبەکە لە سەردەمی فەرمانڕەوایانی دیکەی زەند و قاجاریان تا مەرگی فەتحعەلیشا (بەشی ٧) دەخاتە بەر توێژینەوە. ئەم نووسراوانە لێرەدا باسیان کراوە، چونکە بەهەر حاڵ چەندین داستان سەبارەت بە کەریمخان دەگێڕنەوە. نوکتەی مەشهوور و ئاشنا و ئەوانەش کە نەبیستراون لە دووتوێی ئەدەبیاتی کۆنباوەوە پێچراون و وێناچێ کە پشتی بە سەرچاوەیەکی نووسراوەی کۆنی پێشوو بەستبێ.

## ٤ـ بەڵگەنامە ڕەسمییەکان، فەرمانەکان، نامەکان و دەساوێژەکانیتر

### ئەلف: نووسینەکان و نامەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی

نووسینەکان و نامەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی بە کورتەنیشانەکانی BP, FR , GD و نامەکانی ئەیالەتی زۆر گرانبایی لە کۆلکەخانەی بایەخدار و شایانی باسی کۆمپانیا لە کتێبخانەی شەریکە لە لەندەن ڕاگیراون. یادداشتەکانی ڕۆژانە و نامەکان و ڕاپۆرتەکانی شەریکە لە لایەن یەکێک یان زۆربەی ناوەندەکانی بازرگانی بەندەرعەباس و بەسرە و بووشێهرەوە نووسراون و سەرچاوەیەکی چڕوپڕی زانیارین سەبارەت بە

---

٣٤ـ لە بابەت سەرنجدانە ئەم کتێبە خۆم بە ئەمەگداری پرۆفسۆر R.B.Serjeant دەزانم.

ڕووداوەکانی نێوخۆی وڵات لە ماوەی سەدەی هەژدەدا. بایەخی گرینگی ئەوان سەبارەتە بە ڕێکەوتی ڕووداوەکان و پێکەوە بەسترانەوەیان بە شێوەیەکی ڕێژەیی یان موتڵەق و لەم ڕێگەیەوە دەکرێ ڕاپۆرتەکانی ڕووداونووسانی ئێرانی بە وردی بکەونە بەر توێژینەوە. هەروەها بۆ ناسینی وردەکاری و هەلومەرج و ئەو ڕووداوانەی کە بەڵگەی تەواویان لە سەر بە دەستەوە نین یان بەگشتی لە ڕووداونووسینەوەکاندا فەرامۆش کراون یاریدەمان دەدا. دەبێ بە باری ناسینی زۆربەی ڕووداوەکانی نێوخۆییدا هەمیشە سەبارەت بە زەمانی گەیشتنی هەواڵەکە و کارتێکردنی بادان و گۆڕین، نەرمی نیشان بدرێ و سەرنج بدرێتە سەر شێوەی ڕاستەقینەی دەنگنووسینەوەکان وەک زۆربەی سەرچاوەکانی ئورووپایی. ئەگەرچی چەند کەسێکی دیاری چەشنی «تووماس شاو» یا «هووس کرووف» و ئەفغانەکان بە ساکاری دەناسرێنەوە، بەڵام ناوی وەک بوغایری و بوخاری، حەسەن و حوسێن هەمیشە لە سەر ڕەوگەی هەڵەن. جگە لە ڕووداوەکانی سیاسی، کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بەشێکی زۆری پێشینە و زانیاری بازرگانی و ئاڵوگۆڕەکانی ئابووری ئێران و ناوچەکانی کەنداوی فارس دەخاتە ڕوو.

هەروەها دەربارەی ساڵانی کۆتایی دەورانی سەفەوی و حکوومەتی نادرشا یادداشتەکانی گێمبروون هێشتاش بۆ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە خاوەنی پلەیەکی بەرزن[35]. سەبارەت بە ساڵانی ۱۷٤٦ ـ ۱۷٦۳ یانی لە سەرەتاوە تا ئەودەمەی کە کارخانە (ناوەندی بازرگانێتی) بە دەس کۆمپانیا لە بەندەرعەبباس (گێمبروون) داخرا و گوێزرایەوە بۆ بووشێهر، بەرگی ٦ تا ۱۳ چەند بابەتێکیان لەخۆ گرتووە. پاشماوەی ئەم دەورەیە پڕە لە کۆمەڵێک نامە و پەیام لە بەسرە و بووشێهرەوە بۆ سەرۆک و دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیا لە بەمبەئی. من ئەم یادداشتانەی ناوەندی بازرگانیم بە FR دەسنیشان کردووە. بەرگەکانی ۱۵ (۱۷۲۹ ـ ۱۷۵۲) و ۱٦ (۱۷۵۳ ـ ۱۷۷۳) و ۱۷ (۱۷۷٤ ـ ۱۷۸۳) هەر لەم جەللەیەدا بە ناوی یادداشتەکانی گێمبروون (GD) نووسراون. بەرگی حەوت و نۆش پاش ڕێکخران پێرست کراوە، بەڵام دیسانیش دەبێ توێژینەوەیان لە سەر بکرێ هەتا پوختە و کورتەی هەردک قۆناخەکە بە شێوەیەکی دروست بدۆزرێتەوە و

35- cf. Lockhart, Nadir shah, 303 – 304.

بنووسرێتەوە.

زانیارییەکانی بازرگانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ فەرمانڕەوایانی خۆجێیی وەک کەریمخان دەبێ لە توێژینەوەی دەستووراتی نووسراوە و ئەو پەیامانەی کە لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی دەرەوەی دەستەی کارگێڕی بەمبەئی بۆ کەنداوی فارس نێردراون (BP)، هەڵنجێندرێ. لەم چەشنە بەڵگەنامانە ٣٢ بەرگیان سەبارەتە بە سالانی ١٧٤٦ ـ ١٧٨٠. بۆ کەلک وەرگرتن لەم بەرگە ئەستوورانە پێشنیار دەکرێ کە یادداشتەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی و فەرهەنگی و جوغرافیایی مەزن و مایندەی «لۆریمێر» و هەڵبژاردەی ساڵناسان لە ڕۆژنامەکانی ئەیالەتی و لێکۆڵینەوەکانی بەشی یەکەم لە بەرگی یەکەمی «ئەمین»دا دەربارەی بریتانیا لە کەنداوی فارس پێکەوە بەراورد بکرێن و بە مەبەستی توێژینەوە سەبارەت بەم قۆناخە گەلێک یاریدەرە.

دەوڵەتی بریتانیا لەم ڕۆژگارەدا هێشتاش لە ئێران نوێنەری هەمیشەیی نەبووە، بەڵام باڵوێزی بەرزەجێی لە ئیستانبووڵ پارێزەری ڕاستەقینەی بووە لە ڕەوت و ڕووداوەکانی پارێزگاکانی بەغدا و بەسرە و هەمیشە لە لایەن پیاوانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بنەگر لە کەنداوی فارس کۆمەڵە ڕاپۆرتێکی بۆ دەنێردرا. ئەم ڕاپۆرتانە برێتی بوون لە زانیاری سەبارەت بە هەڵوێست و سیاسەتی بابیعالی و جگە لەوە تێکڕای لە زیرەکی ڕێزدار «ئینسیلی» باڵوێزی بریتانیاوە بوو کە دەنێردرایە وەزارەتی دەرەوە و لەوێ لە نێو نامەکانی گشتی وەزارەتی دەرەوە لە لەندەن دەکەوتنە ڕیزی نامەکانی نیشتمانی (SP)؛ ئەم بەڵگانە بەتایبەت بە باری لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە ئێراقی عوسمانی سەر بە گێرە و کێشەکانی کوردستان و ئێراقی باشووری لە ماوەی سالانی ١٧٧٤ ـ ١٧٧٦دا بەکەلکن.

## ب: کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هولەند

بەڵگەنامەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە کۆلکەخانەی کۆلۆنییەکانی وەزارەتی دەرەوە لە «لاهە»ن و لەچاو بەڵگەنامەکانی کۆمپانیای بریتانیایی ڕەقیبی لە قۆناخی کار و چالاکییاندا لە سالانی ١٦٢٣ ـ ١٧٦٩دا گرینگایەتییەکی کەمتریان هەیە. ئەمانە دوابەدوای هەرچیوپەرچی پاش

کوڕانی نادرشا ناچار بوون کە بنکە بازرگانییەکانیان لە ئیسفەهان و کرمان کۆ بکەنــەوە و بچنــە بەسـرە و بەندەرعــەباس و لــە ســاڵانی ۱۷۵۳ و ۱۷۵۹دا بــە شێوەیەکی ڕێژەیی دەس لەوێ بەردەن. بەهەر حاڵ لــە مــاوەی ســاڵانی ۱۷٥٤ ـ ۱۷٦۹دا لە دورگەی شێوەکۆلۆنی خارک گیرۆدەی کێشمەکێشمەکانی کەریمخان و فەرمانــڕەوایانی خــۆجێیی و دزانی دەریــایی و کۆمپانیاکــانی بازرگــانێتی ئووروپایی لە ناوچەی ســەرووی کەنــداوی فــارس بوونــەوە و هــەر لێــرەوە دۆڕاندنی ئەوان دەستی پێکرد(۱۵ ـ ۷).

ئەو بابەتانــەی کــە یادداشــت کــراون و دەکەونــە جــەغزی ســەردەمی بەرباسی ئێمە بەگشتی لە لایەن سێ بنکەی بازرگانی سەرووی کەنــداوی فــارس بۆ بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیا لە «باتاویــە» نێــردراون و دەبــێ ئــەم بــاس و بابەتانە و بەڵگە ئاماژەپێکراوانە لە یادداشتەکانی Brievenدا وەدۆزرێن. لە نێو بەڵگەنامەکاندا بە شێوەیەکی ناتەواو کەوتوونــە ڕیزەکــانی ۲٦۱۷ تــا ۳۱٤۲ بــە دوای یەکا و ساڵبەســاڵ لــە ۱۷٤۹ڕا تــا ۱۷۷۰ دەگرنــەوە و کتێبێکــی ناتــەواو و کەمبایەخ بە ناوی پێرستی نامە ئاڵوگۆڕکراوەکانی هیندووســتان لــە ســاڵانی ۱۷٦۲ ـ ۱۷۷۵ لێرە وەبەرچاو دێ.

## ج: نامە ئاڵوگۆڕکراوەکانی قۆنسوولخانەی فەرانسە

بەڵــگەنامەکانی قۆنســوولخانەکان و نوێنەرایەتییــەکان و کۆمپانیــای هیندی فەرانسە لە بەسرە، بەغدا، ئیسلامبووڵ بە باری پەیوەنــدی ڕاســتەوخۆ لەگەڵ ڕووداوەکانی ئێران بابەتێکی ئەوتۆیان پێنیە و لە ڕوانگەی ڕوانینە ســەر فەرمانڕەوایەتی کەریمخانیش نرخێکی کەمتریان هەیە. کەچی ئەو زانیارییانەی کە گەشتیارانی ئووروپایی خستوویانەتە ڕوو لــە بــواری سیاســی و ڕەشــەبای لەشکری چەند ساڵ پاش کوڕانی نادر گەلێک بەسوودن. ڕاپۆرتەکانی ســەر بــە ئێران لە دوو شوێنی بەجێ و دیاریکراو ڕاگیراون: کۆلکەخانەی وەزارەتی دەرەوە MAE و «کــێ دۆرســی»[۳٦]. ڕیزێــک لــەو بەرگانــە ســەبارەتن بــە نامــە ئاڵوگۆڕکراوەکانی ئێران و دوو بەرگیشیان نامــەکانی «ســیمۆن»ی قۆنســوولی

---

۳٦ـ کێ دۆرســی (Quai dorsay) نــاوی گــەڕەکێکی پاریســە کــە عیمــارەتی وەزارەتی دەرەوەی لێبوو.

فەرانسە لە بەغدای تێدایە. ئەم پیاوە پزیشکی تایبەتی ئازادخان بووە. لە نامە و نووسراوەکانی سەبارەت بە ئێران لە بەسرە و پاش ساڵی ١٧٤٢ تا ١٧٩١ تەنیا لە بەرگێکدا بە ژمارەی ١٩٧ ـ Bi ڕاگیراوە. ئەم بەرگانە هەڵگری زانیارییەکی کەمن سەبارەت بە قەوماوەکانی ئێران و چەندین لێکدانەوەی توند و ژاراوی قۆنسوولەکان دەربارەی توجارەت و سیاسەتی ڕقەبەری گەورەیان، واتە بریتانیا لەخۆ دەگرێ.

## د: ڕاپۆرتەکانی قۆنسوولخانەی ڕووسیا و نووسراوەکانی دەزگاکانی پاراستن

کۆمپانیاکانی ڕووسی لە مەودای سەدەی هەژدەدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە دەریای خەزەر و ناڕاستەوخۆ لە قوڵی خانشینەکانی قەفقازەوە پەیوەندییەکی بازرگانی چاکیان لەگەڵ ئێران بووە. لە ١٧٤٧را پاش ڕۆیشتنی ئینگلیسییەکان بوونە خاوەن توجارەتێکی پاوان لەگەڵ ئێران. ئەندامانی شەریکەی ڕووسی لە ماوەی قۆناخی بۆشایی دەسەڵاتا، لە دەیەی دوایی‌دا گیرۆدەی گەلێ دەرد و مەردد بوونەوە، بەڵام نوێنەرەکانیان لە بەندەرئەنزەلی مانەوە (ئەم شارە ئێستا پێی‌دەگوترێ بەندەر پەهلەوی)[٣٧]. ئەم نوێنەرایەتییە ڕاپۆرتی بەردەوامی لە «هەشتەرخان»ەوە دەنارد بۆ سەنتپێترزبوورگ. لەودەمی‌دا سەرداری قەفقاز لە ڕێی سنووری عوسمانییەوە ئەرکداری پەیوەندی بوو لەگەڵ گورجستانی هاوپەیمانیان بە دژی ترکان و خۆی دەدایە کۆکردنەوەی زانیاری پێویست دەربارەی بارودۆخی هەرێمی باشووری خۆی.

ئەو مەبەستانەی کە لەم سەرچاوانە وەدەس‌هاتوون سەر بە ئارشیوی سیاسی ڕووسیایە و کورتەنیشانەی AVRP لێنینگرادی بۆ داندراوە. تەنانەت توێژەرانی ڕووسی تا ئەم ڕۆژگارەش بۆ نووسینی مێژووی ئێران کەمتر کەلکیان لەوان وەرگرتووە. زانیاری ڕووسان سەبارەت بە بارودۆخی ئێرانی باکووری بە شێوەیەکی تایبەت تەواوکەری ڕاپۆرتەکانی ئینگلیسی و هولەندییەکانە دەربارەی باشووری ئێران. بەڵام من هێشتا دەستم بەو سەرچاوانە ڕانەگەیشتووە، کەچی لەڕێی کورتەباس و لێکۆڵینەوە بڵاوکراوەکانەوە کەلکم

---

٣٧ـ پاش شۆڕشی گەلانی ئێران کرایەوە ئەنزەلی (عەلی‌محەممەد ساکی).

لێوەرگرتوون. بەرچاوترینیان سێبەرگ کتێبی Butkovیە و هەڵگری چەند بابەت و بەڵگەنامەن سەبارەت بە مەودای سالانی ۱۷۲۲ تا ۱۸۰٤ و دەربارەی توێژینەوەی ئەو ڕووداوانەی کە بوونە هۆی جودایی‌خوازی ئاشکرای پارێزگاکانی ئازەربایجانی باکووری لە ئێرانی سەردەمی سەفەوی‌دا ڕێنوێنیمان دەکەن. ئەو نامە و ڕاپۆرتانەی کە لە قۆنسوولخانەکانی ڕووسیا و تاجرەکانی چالاک لە باکووری ئێران لە خوێندنەوەکان و لێکۆڵینەوەکان‌دا دەکار کراون زۆربەیان دەربارەی سەردەمی «نادری»ن و لە لایەن «ئارنووا» و «ئەشرەفییان» و «کوکانۆیا» و «ماراکوا» کەلکیان لێوەرگیراوە. ئەمانە لە ژێر پەردەی بازرگانێتی و ئابووری لە ناوچەی دەریای خەزەر چەند مەسەلەیەکیان لە پەیوەندییەکانی ئێرانی باکووری لەگەڵ باشووری کەریمخانی ئاشکرا کردووە. لەقسان لە سۆڤییەتیش کۆمەڵە زانیارییەکی ئەوتۆ لە ئارشیو (کۆلکەخانە)ی مێژوویی ئەرمەنییەکان وەدەس کەوتووە[38]. لە ئارشیوی گورجستان‌دا، چەند نامەیەک سەبارەت بە پەیوەندی نێوان کەریمخان و سولتان ئارکێل بە دەستەوەیە (کە لە لایەن «تسین دازە»وە بە ڕووسی و گورجی چاپ و بلاو کراوەتەوە). ئەو کتێبە لە سەرچاوەکانی دیکە زیاتر بەڕوونی مەیل و ڕەوتی هەنگاوی گورجییەکانی بەرەو ڕووسیا دەرخستووە.

## ه : فەرمانەکانی عوسمانی، ئێرانی، پەیوەندییەکانی سیاسی و ناوەندەکانی سکەناسی

سەبارەت بە پەیوەندییەکانی ئێران و عوسمانی دوای کوژرانی نادرشا کەلێک بابەتی ڕوونکەرەوە بە دەستەوە، هەروەک لە مێژووەکانی ئێرانی‌دا باس کراوە، دەربارەی عوسمانی پەیوەندییەکی لەگەڵ عادڵشا و برایم‌میرزا و ئەحمەدشا دورانی بووە کە دەقی بەڵگەنامەکان لە کۆلکەخانەی تورکیادا لە ئیستانبووڵ بە ناوی خەتی هومایوون، نامەی هومایوون و ڕیزەنامەی دەفتەری ڕاگیراون. هەروەها فەرمانێکی دیکەی فەرمانڕەوایەتی وێڕای چەند نامە بۆ کەریمخان سەبارەت بە کێشمەکێشمەکانی کوردستان و بەسرە لە ۱۷۷٤ــ ۱۷۷٥دا وەبەرچاو دێ. هێندێک لەم بەڵگانە لە لایەن توێژەرانی ترک و ئێرانی‌ڕا کەلکیان

38- Arunova and Ashrafyan, (Novye Materialy, I, 1150.)

لێوەرگیراوە یان چاپ کراون(بڕواننە: نەسیری، ئوونات، ئووزان گازسیلی).

ئەم بابەتە دەبێتە سەرچاوەیەکی هەمیشەیی بۆ نائومێدی ئادەمی کە لەم قۆناخەی مێژووی ئێراندا بەتایبەت لە کێشەکانی سەدەی هەژدەدا هیچ هەنگاوێک بۆ سازکردنی ئارشیوێک بە مەبەستی کەلکوەرگرتنی مێژوونووسان ناویژرێ. جگە لەوەی کە لە ژمارەیەک کتێبی پەنجەژمێری وەک بەختیاری، موقتەدیر و نادرمیرزادا خراونە ڕوو، تەنیا جارێک بەشێک لە فەرمانە دەستنووسەکانی ئەم دەورەیە ڕوون کراوەتەوە. کەوایە جگە لەو سەرچاوانەی کە تا ئێستا بلاو کراونەوە، دەبێ سەرنج بدرێتە سەر ناوی ئەو فەرمانڕەوایەی کە سکەی لە سەرەمی‌دا لێدراوە. بەهەر حال دەبێ هیوادار بوو سەبارەت بە دەرکەوتنی بابەتی زیاتر و بلاوکردنەوەی پتری ئەو بەڵگەنامانە لە گۆڤاری توێژینەوەکانی مێژوویی و شوێنەکانی تردا لە لایەن توێژەرانی ئێرانییەوە. بەداخەوە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوە نیشانیان داوە کە لە مابەینی ١٥٠ بەڵگەنامەی بلاوکراوەی ئەو ئاخرییانە کە پەیوەندی هەیە بە سەدەی چاردەوە تا ئەمڕۆ تەنیا یەکیان سەر بە دەورەی بەرباسی ئێمەیە.

بە باری هەڵسەنگاندنی سکەکانی هاوچەرخی ئەم دەورەیەدا و کەلک لێوەرگرتنیان وەک سەرچاوەیەکی مێژوویی دەبێ وەبیر بێنینەوە کە سەرەڕای گرینگایەتی کۆنباوی سکەکان بۆ دەستنیشان کردنی قۆناخ و سەردەمی دەسەلاتی زنجیرەی میرانی ئیسلامی، ڕێکخستنی پێرستێک بۆ ڕێنوێنی لە بابەت سنوور و مێژووی قەلەمڕەویان بەم هۆکارانەی پێشتر باسیان کرا جێی متمانە نییە. (١٣ ـ ٤، پەراوێزی ٥١).بەلام دیسانیش بوونی ئەم سکانە نیشاندەری ئەو ئاڵوگۆڕانەن کە لە شێوەی حکوومەتی ئێرانییان لە ماوەی ئەم دەورانە ناسەقامگیرەدا بەدی هاتووە و گرینگایەتی مەسەلەی ئابووری لە جەرگەی گۆڕانکارییە سیاسییەکان دەخاتە ڕوو.

## ٥ـ وەرگیراو لە دەقی گەڕۆکانی غەوارەی دانیشتووی هاوچەرخ

### ئەلف: چەرخوخولی بەر لە زەندیە

سێکەس لەو پیاوە بەرچاوە غەوارانەی دانیشتووی ئێران لە سالانی بەر لە ١٧٤٠ بریتین لە: بازین، جان هانۆی و دوکتۆر کۆک. هەرسێکیان چەند

سالێک پاش مەرگی نادر لە ئێران دەرکەوتن. بایەخدارترین راپۆرتەکان لە بازین بەجێماون. ناوبراو پزیشکی تایبەتی نادرشا بوو. لە تویێ دووهەمین نامەی لە ساڵی ۱۷۵۱دا لە بەندەرعەباسەوە، سەربوردەی خۆی پاش مەرگی ئەربابەکەی هەتا مەرگی عادڵشا لە ساڵی ۱۷٤۹دا خستۆتە ڕوو. (لەو زەمانیدا بە تەنیا لە هۆردووگای جیهانگوشا ڕایکردبوو.) جگە لە ژێدەرە بلاوکراوەکانی فەرانسە Lettres Edifiantes at Curieuses، ڕاپۆرتی سەرنجڕاکێشی چۆنیەتی گیرانی ئیسفەهان بە دەس عەلیمەردانخان و کەریمخانیشی تێدایە و بە قەڵەمی «پێرگریموود» نووسراوە. نامەکانی «بازین»یش کەموزۆر بە لێکدانەوە و شەرحەوە کراونە فارسی و لە پەراوێزەکاندا بە شێوەی گشتی کەڵکم لێوەرگرتوون. وتاری «پیسۆنێل» بە وردی لە لایەن «هانۆی»ڕا کەوتۆتە بەر توێژینەوە. شێوازی کارەکە لە سەر بنەمای ڕاپۆرتی میسیۆنەکان و گەشتیارانی ترەوە دامەزراوە و نەقڵ و بەسەرهاتی سوودمەند لە ڕووداوەکانی باکووری ئێرانی پاش مەرگی نادرشا هەتا ساڵی ۱۷۵۳ دەخاتە ڕوو.

بە مەبەستی توێژینەوەی ڕووداوەکانی ئێراقی عەجەم و هەوڵەکانی کەریمخان، محەممەدحەسەنخان و ئازادخان ڕیزەنامەیەک لە ئارشیوی قۆنسوولخانەی فەرانسە (MAE) نیگادێری کراون کە زۆرتر لە بەندەرعەباسەوە نێردراون. ڕاپۆرتەکانی کارمەندی دەزگای زانیاری قۆنسوولخانەی فەرانسە بە ناوی «لی شوور سیمۆن» و چۆنیەتی ئەم سرشتی پیلانگێڕییە دەبێ بە دوو باراندا لە نێوەرۆکی بەرگی حەوتەمی MAE Perse (نامەکانی ۷۰ تا ۱۰۲)ڕا و نووسراوەی «ماسۆن» بخرێنە پەنا یەکتر (ل ۵٤۰). بەکورتی ناوبراو لە ژووەنی ساڵی ۱۷۵۱دا لە ئیستانبووڵەوە نێردراوەتە ئیسفەهان و فەرمانی پێدراوە کە سەبارەت بە بارودۆخ و هێزەکانی ئەم پادشایەتییە و ئەو دەستەبەندییانەی کە دەبنە هۆی ئاژاوەنانەوە و دووبەرەکی و ئەو شازادانەی کە خۆ بە خاوەنی تاج و تەخت دەزانن و هەلومەرجی سیاسی ئەو دەسەڵاتانەی کە دەوریان داوە، بەتایبەت سەبارەت بە بەندەری گێمبروون و ڕووسیا زانیاری کۆ بکاتەوە. لە سەر ڕێیەی بۆ وێندەرێ «پیسۆنێل» چەند وردەکارییەکی بەکەڵکی خستۆتە بەر دەمی. پیسۆنێل دواتر لە «ئێسمیرنا» بوو بە قۆنسوول.

سەرۆکانی لە هێندێک کارانی تووڕە ببوون (لە حەلەبەوە نامەیەکی

پێگەیبوو کە وریـای کردبـووە نهـێنی خـۆکردی نەخاتـە گـەڕ و لـەو نهێنییـە تاقەتپرووکێنە سێچەشنە کە بۆی داندرابوو کەلک وەربگـرێ، چونکـە هێشـتا کلیلی نهێنی ئەویان بە دەس نەگەیشـتبوو). لـە بەغـداش بـە نـاوی پزیشـکی تایبەتی، خۆی گەیاندە خزمەت پاشا (حوکمڕان) و داوای لێکرا کە بـۆ هەمیشـە لای وەمێنێ؛ بەڵام توانی ڕابکا و چوو بۆ ئێـران. لـەم کاتـەدا ١٦٠٠ پیاسـتەریش لەوێ قەرزدار بوو کە دەبوو قۆنسوولی تووڕە و ناڕەحەت دابای. لە ئۆکتـۆبری ساڵی ١٧٥٤دا هاتە هەمەدان و لە ژێر باری گوشارا مسوڵمان بوو و زۆر بەگەرمـە درێژەی بە کارەکەی دا. نامەکانی بە ڕێکەوتی کۆچی مانگی دەنووسـین و واژۆی دەکردن و بەخۆی دەگوت میرزامحەممەد. سەرەڕای ئەو قسانەش لای سـەرۆکانی پێیدادەگرت کە موڕتەد بوونەکەی تەنیا فێڵێکی سەربازییە. مـانگی سـێپتامبری ساڵی ١٧٥٠ی لە ئیسفەهان تێپەڕ کرد و وەک پزیشکی تایبەتی لەو شارە مایەوە و چەشنی «بازین» لە زەمانی نادرشادا دوکتۆری تایبەتی دەربار بـوو. بڕشـت و دەســەڵاتی خـۆی بــە مەبەســتی ســوکنایی و قــەرەبووی دەرد و مــەرەدی مەسیحییەکانی ئەم شارە داگیرکراوە بە کار هێنا و تا ڕادەیەکی زۆر لە ئازادخان نیزیک ببۆوە و بە دژبەرانی کەریمخـان و محەممەدحەسـەنخـان دادەنـدرا. لـە پەلاماری ناسەرکەوتووی ساڵی ١٧٥٧ی ئازادخان دژی قاجارییاندا بزر بوو.

## ب: یادداشتنووسی کرێملی

لێرە بە دوا تا نیوەی دووهەمی فەرمانڕەوایەتی کـەریمخـان هیچکـەس پێـی نەنایـە قەڵـەمڕەوی مەترسـیداری ئێـرانی ڕۆژاوایـی و تەنانـەت لێـرە بەدواشەوە غەوارەکان زور کەم و بۆ ماوەیەکی کورت لەو شوێنە مانــەوە. بــەڵام لانیکەم ژمارەیەک لە میسیۆنەکانی ئایینی بەپێی ئەو دەستوورانەی پێیاندرابوو لە سەدەی پێشووڕا لە گەڕانگەڕی خاکی ئەم وڵاتەدا بنەیان داکوتابوو کە برێتی بوون لە تاقمەکانی: دۆمینیکیان، بەندیکتیان، کرێملیانی پاپەتی، ژێزوونیـت، کاپوسنان و ئاگۆستینیان. ئەمانە لـە ئـێش و ئازارەکـانی سـەردەمی بۆشـایی دەسەڵات بە زیندوویی قوتـار بـوون هـەتا سـوود لـە هەڵەسـوونهێنانـەوەی هێمنایەتی و جوامێری و بارودۆخی ڕۆژگاری کەریمخـان وەربگـرن[٣٩]. کامڵـترین

٣٩ـ قایمەقامی، ژمارەکانی ٤٧ و ٤٨، ل ١٠٣؛ بڕواننە: ١٣ ـ ٧.

یادداشتەکانی جێماوی ئەم میسیۆنانە بە دەست نوێنەرانی کرێملی نووسراوە. ئەمانە لە ماوەی بۆشایی دەسەڵاتا لە ئێران دەرکەوتن و بێپسانەوە لە بەسرە بنەگر بوون[40]. Continuatio domestcate Bosserensis historiae لە بەسرە کە لەگەڵ یادداشتەکانی بەندەرعەباس لە ١٩٣٩دا تەرجەمە و کورت و بڵاو کراوەتەوە لە سەرانسەری سەردەمی ئێمەدا بە شێوەیەکی ڕێکوپێک ئەو دەنگۆیانەیان بڵاو دەکردەوە کە لە کەنداوی فارس و نێوخۆی ئێرانەوە دەخرانە ڕوو. (زۆریش سەیرە چونکە ئەغلەبیان درۆن.)چەند نامەیەکی کرێملی و تاقمەکانی دیکەی ئایینیش لە نێو نامەکانی قۆنسوولخانەی فەرانسەدا ڕاگیراون.

## ج: فەرمانڕەوایەتی کەریمخان

جگە لە شاندی گیاناسی پالاس، گێملین و لێپچین کە بە بەستێنەکانی دەریای خەزەردا گەڕاون، لە ساڵی ١٧٦٠ تا ١٧٧٠ گەشتیارێکی زۆر کەم ڕۆخەکانی کەنداوی فارسیان بە سەر کردۆتەوە. لە نێو ئەم تاقمەدا یادداشتەکانی «کارلێستۆن»، «نیبوور» و «ئابراهام پارسۆنێز» لە هەمووان بەنرخترن.

نیبوور ئاخرین پاشەواری شاندی زانستی هولەند بوو کە لە ساڵی ١٧٦٠دا نێردرایە هەرێمەکانی ڕۆژاوا. لە ساڵی ١٧٦٥دا و لەو ماوەیەدا کە چالاکی لەشکری دژی میرمەهنا بەردەوام بوو، چووە دیتنی بەندەرەکانی کەنداوی فارس و شیراز. هیچکام لە پرسەکانی مێژوویی و خەریتەکێشانەوەکان یان ئامانجەکانی کۆمەڵایەتی لەبەر چاوی تامەزرۆ و قەڵەمی ڕەوانی وی لەم قۆناخە بەرتەسک و بەڵام گرینگەدا ون و بە فیڕۆ نەچوون. پارسۆنێزیش لە سەرەتای ئاڵقەدرانی شار لە لایەن ئێرانییەکانەوە لە بەسرە بوو و هەموو ڕۆژێ نەقڵێکی سەرەنجڕاکێش سەبارەت بە چالاکی لەشکری و گوێزتنەوەی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لە بەسرە دەگێڕێتەوە. نووسراوەکەی بە سەداقەتێکی زۆر بەرچاو لەگەڵ ڕووداونووسینەوەی نامی یەکتر دەخوێنێتەوە. سایری گەشتیارانی هاوچەرخیش وەک ئەمین، ئیووز و «پلیستید»یش کۆ بە و پەراوێزی بەهەڵکەوتیان لەو گێڕانەوانە زیاد کردووە.

40- Carmelites, 644 – 645.

### د: ئاخری سەردەمی زەندیە

ئەو گەشتیارە عالمانەی کە پاش مەرگی وەکیل چوونە گەشت و گەڕان بۆ بەستێنەکانی کەنداوی فارس و بەسرە، زۆر لەوەی زیاترن کە لەم کورتەیەدا باسیان بکرێ. ئەمانە وردەکاری ئالۆزبلۆزی ئابووری و سیاسی کە بە هۆی داگیرکرانی بەسرە و شەڕوشووڕی جێنشینانی کەریمخانەوە قەوماون و تایبەتمەندی و ئاکامی جڵەودارانی دیکەی زەندیان شیکردۆتەوە. ئەوەی لەم بابەتەدا سەرنجڕاکێشە ئەمەیە کە تەنیا موسافیرێکی دەرەکی کە ڕاپۆرتێکی دوورودرێژی لە پاش بەجێماوە ناوی «خواجە عەبدولقادر»ە و مسوڵمانە. ئەو لە ساڵی ١٧٨٦دا ڕاپۆرتەکەی لە وەختی باڵوێزبوونیدا لە ئیستانبووڵەوە ناردووە بۆ تیپووسوڵتانی میسووری (١٧٨٢ ـ ١٧٩٩). وەک گوتوویانە چەند قان و پشکێکی بۆ بازرگانانی هیندی لە بووشێهر وەدەس هێنابوو[41]. خواجە یادداشتەکانی سەفەرەکەی کە هەڵگری چەند ڕاستەقینەیەکی بایەخدار و تا ئەندازەیەکیش ئەفسانەن بۆ ئێمەی بەجێهێشتوون و ئەم یادداشتانە دەربارەی خەریتەکێشانەوەی کەنداوی فارس و توجارەتەکەی هەر لە سەر شێوازی بە توێکڵەوەنووسانی کۆنباوی ئێرانی، وەک لاتیننووسینی کارمێلیتەکان ڕێکخراون.

گەشتیاران بۆ شیراز و ناوچەکانی جەرگەی ئێران ژمارەیان کەمتر بووە؛ ئەمانەش سەبارەت بە خانووبەرە و عیمارەتەکان و دامودەزگاکانی وەکیل هەر بەو پێودانەی کە دەربارەی کاروباری ئیداری و یادگارە ئینسانیەکانی نووسیویانە چەند بابەت و مەبەستێکیان جێهێشتووە. یەکێک لەو گەڕیدانە «فرانکلین»ە کە ماوەی ٨مانگ وەک میوانی جەعفەرخانی زەند لە پایتەختی زەندیە بنەی داکوتا. کەسایەتی دیکەی ئەم دەستەیەش «ئێسکات وارینگ» بوو.

## ٦ـ مێژووەکانی ئەم قۆناخەی ئاخری کە هەڵگری چەندین زانیاری سەرچاوەکانی هاوچەرخن

### ئەلف: مێژووەکانی ناوچەیی ئێرانییان

لەو شوێنەوارە سەرنجڕاکێشانەی کە ئەغلەب وردەکاری ڕوون سەبارەت

---

٤١ـ عەبدلقادر، ١ ـ ٢، ل ٦١.

بە ڕووداوەکانی خۆجێیی و دابونەریتەکانی بنەماڵـەیی کـە لـە شـوێنی دیکـە باسیان نەکراوە دەخاتە ڕوو، مێژووی کرمانە بە قەڵـەمی ئەحمەدعـەلیخـانی وەزیری کرمانی. باپیری نووسەر کە بە ئاغاعەلی وەزیر دەناسرا لە نێو پیاوانی سەربەدەرەوەی سەردەمی زەندیـە و سـەرەتای قاجارییـەدا، کەسێکی دیـار و بەرچاوە. لە دەوروبەری ساڵی ١١٨٠ی کـۆچی / ١٧٦٧ی زایـینی کـەریمخـان بـە شوێنیدا نارد بێتە شیراز. هەتا ئەو کاتەی کە بۆ وەدەسگرتنی دەور و پلەیـەک لە حکوومەتی کرمانا لە لایەن زەندیـەوە گەڕایـەوە ئـەو شـارە، لـە بارگـای کەریمخان دادەنیشت. لە زەمانی جەعفەرخاندا بۆ گرتنی کرمان و بـەڕێوەبردنی ئەو شوێنە بۆ زەندان چـاک هەڵسـووڕا و بـە شـێوەی ناڕاسـتەوخۆ و لەبـەر وەفاداری سەبارەت بە خانـەدانی زەنـد تووشـی ئـەو گیروگرفتانـە بـۆوە کـە ئاغامحەممەدخانی ڕقەوەن بۆ کرمان بەدیهێنا[٤٢]. من کەلکم لـە چـاپی یەکـەمی ئەو کتێبە وەرگرتووە کە دوکتۆر باستانی پاریزی پێیداچۆتەوە و هەڵە و پەڵەی لێهەڵگرتۆتەوە (١٣٤٠ی هەتاوی / ١٩٦١ی زایینی).

مێژووی «ئەحمەد کەسرەوی» دەربارەی خووزستانیش چەند بابـەتێکی بایەخداری سەبارەت بە نێوانی عەرەبسـتان (خووزسـتان) لەگـەڵ حکوومـەتی زەندیەی لە خۆ گرتووە و سەبارەت بە بنیکەعب و تایفەکانی دیکـەی خـۆجێیی بە سوودوەرگرتن لە دابونەریتی ئەو هۆز و تایفانە کۆمەڵێک بابەتی خسـتۆتە ڕوو. مێژووی فەسایی سەبارەت بە فارس نووسراوە و بەگشتی لە سەر بناغـەی گـیتیگوشـا و ڕۆژنامـەی کەلانتـەر داڕژاوە، بـەڵام ئەغلـەب سـەبارەت بـە خەریتەکێشانەوەی ناوچە و مەبەستی دیکەش بابـەتی پێیـە. باکیخـانۆف لـە بابەت باکووری گوڵستانی ئیرمم و شیروان و داغسـتانەوە هـەتا سـەرەتاکانی سـەدەی نـۆزدە مێژوویـەکی نووسـیوە کـە بـۆ ڕوونکردنـەوەی ڕووداوە ئاڵۆزبلـۆزەکانی ئەوپـەڕی قـەفقاز و پەیوەنـدی و نێوانیـان لەگـەڵ یـەکتر سوودمەندە[٤٣].

٤٢ـ وەزیری، پێشەکی دەزگای بڵاوکەرەوە، سەدری ئەفشار، ل ١٦٥.

43- See Storey, Persian Literature, 1, 425 – 426, Persidskaya Literatura, 1279-1281.

## ب: مێژووەکانی ئەرمەنییان و گورجستان

بیر و بۆچوونی زیانبار سەر بە زەقکردنەوەی کاروباری ئایینی لە مەودای ئەم ساڵە ئاڵۆزکاوانەدا ـ بە بێلایەنی، تاڵی، تامەزرۆیی، بەرفرەوانی و سرشتی گرفتارییەکانەوە ـ وەک تام و مەزەی بابەتەکان لە لایەن رووداونووسانی ئێرانیڕا کایەیان پێکراوە. بەڵگەنامەکانی نێو تەرجەمەکانی «برووسە» باسی کورتە پەیوەندییەک جگە لە بابەتی نێوانی ئێران و حکوومەتەکانی قەفقاز دەکا. بەڵام لە مێژووی جولفادا راپۆرتێکی چڕوپڕی سەبارەت بە بەسەرهاتی کۆمەڵی ئەرمەنی جولفای نوێی تێدایە[44]. شاری نیشتەجێ بوونی ئەرمەنییەکان لە لایەن شاعەباسەوە سازکرا. گێڕانەوەی شاهیدانی حازر بە تێکەڵ بوون لەگەڵ نەزیلە و بەڵگەنامەکان و کورتەی مێژووی ئەفشارییە و زەندیە لە ئێران کامڵ دەبێ[45].

## ج: توێژینەوەی هەرێمەکانی دەوروبەر

وێڕای توێژینەوەکانی توێژەرانی غەوارە کە سوودیان لێوەرگیراوە، دەبێ باسی چەند بابەتێک سەبارەت بە دیرۆکی ئەم قۆناخەی ئێران لە بەرهەمەکانی جەودەتپاشا لە تورکیا، عەباس ئەلعەززاوی لە ئێراق، محەممەدئەمین زەکیبەگ دەربارەی کوردستان بێنە گۆڕ. هەروەها باس و بابەتی گرینگ لە ئارشیوی عوسمانییەکان و سەربوردەی هۆز و تایفەکاندا خۆ دەنوێنن. ئەمانە گەلێک زانیاری پڕبایەخ سەبارەت بە شەڕەکانی ئێران و عوسمانی لە ماوەی دەسەڵاتی وەکیلا دەخەنە بەردەم.

## ۷ـ دووهەمین سەرچاوەی سەرەکی

دیرۆکە گشتییەکانی ئاخرین سەردەمی قاجارییە بەتایبەت رەوزەتوسسەفای ناسری بە قەڵەمی ڕەزاقولیخانی هیدایەت و مونتەزەمی ناسری ئیعتیمادوسسەڵتەنە هەڵگری کۆمەڵێک زانیاری زۆروزەوەندە سەبارەت

---

٤٤ـ من سەبارەت بە پەیداکردنی نوسخەیەکی ئەم کتێبە خۆم بە ئەمەگداری کارۆمیناسیان و کورک بێرد کجیان دەزانم کە ئەم دەقە دژوارەیان وەرگێڕابوو.

45- Malcolm, 662 – 663 (quoted by Yapp, 348).

بە محەممەدحەسەنخان و حوسێنقولیخان کە لە مێژووەکانی سەرەتای ئەم دەورەیەدا وەبەرچاو نایەن؛ وێڕای ئەمەش دەمارگری ئەوان سەبارەت بە خانەدانی قاجار و کەموکووڕی زانیاری نووسراوەکانیان ئەم بەرهەمانە گومانبار دەنوێنن. کارێکی چاکی کە سێرجان مێلکۆم لەم بارەدا ئەنجامی داوە ئەمەیە کە هێندێک لە نووسراوەکانی هاوچەرخانی هەتا ئەو جێیەی کە دەستی داوە لە مێژووەکەی خۆیدا هێناونی. ناوبراو نە تەنیا دەستی گەیوەتە کتێبی گیتیگوشا و زینەتوتتەواریخ و دەقە دەسنووسەکانی دیکەی ڕووداونووسان ـ کە بەداخەوە پێناسەی ڕوون نەکردوونەوە ـ بەڵکوو ئاشنایەتی ڕاستەوخۆی لەتەک برایمی کەلانتەر و دەورگێڕانی تری بنەبانی دەورانی زەندیە و گەشت و گەڕانی بەربلاوی لە ماوەی سالانی سەرەتای سەدەی نۆزدەدا، ئەوی لەگەڵ چەندین بەسەرهاتی یەکەمدەستی ڕووداوەکانی وەچەی پێشوو ئاشنا کردووە. «سێرهارفۆرد جۆنز»یش لە جەغزێکی بەرتەسکتردا مێژووی کورتی فەرمانڕەوایەتی پڕرووداوی لوتفعەلیخانی کۆتایی پێهێناوە. گەلێک ئاماژەی سوودمەندی لە پێشەکی وەرگێڕاوی شوێندانەری سوڵتانییەی دونبولیدا نووسیوە. سەیر ئەوەیە کە کارتێکرانەکانی ئەو دەربارەی زەندیە مێلکۆمیشی خستۆتە ژێر کاریگەری و بە قێزەوە باسی دیپلۆماسی ئێرانییەکان دەکا و لای وایە «تایبەتمەندی بەرچاوی ئەم گەلە، خۆبەزلزانی بووچیانە» و هەڵبەت دەربڕینی ئەم مەبەستە ڕەخنە و سەرکۆنەی لە سەر دەکاتە حەق.

خوێندنەوە و توێژینەوە تازەکان سەبارەت بە سەرانسەری ئەم قۆناخە کە لە بنەبانی سەفەوییەڕا تا سەرەتای فەرمانڕەوایەتی قاجاریان درێژەی کێشاوە، گەلێک زانیاری و کەرەسەی باش کە بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی وەکیلدا مناسبە دەخاتە ڕوو. من بە شێوەیەکی ڕێسامەند لە بواری مێژوونووسیدا کەلکم لە بەرهەمەکانی «لۆرێنس لۆکهارت»ی نەمر سەبارەت بە سەردەمی بەر لە زەندیە یانی ئاخرییەکانی سەفەوی و داگیرکردنی ئێران بە دەس ئەفغانەکان و نادرشا وەرگرتووە.

تەنانەت بە ڕەچاو کردنی بەجێ و دروست بوونی ڕەخنە لەمەڕ ئەم بەرهەمانە لەبەر نیزیک کەوتنەوەی نووسراوەکانی لۆکهارت لە ڕاپۆرتنووسی، دیسانیش لە جێی خۆیدا بەگشتی ئەم نووسەرە دەکەوێتە پێش

کەسانی تر[46]. هێشتاش سەبارەت بە سەرەتای قاجارییە لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ بە دەستەوە نیە، بەڵام پەڕاوێزی بابەتی چاردە، بەتایبەت لە بابەت زنجیرە وتارێکی کە لەم بوارەدا بەکورتی چەند باسێک ئاشکرا دەکەن، لە ناسینی سرشتی ئێرانی دەوری زەندیە لە سەرکەوتن و بەرکەوتنیدا یارمەتیمان دەکا.

## ٨ ـ خوێندنەوەی نوێ سەبارەت بە سەردەمی زەندیە

وەختایەک کە شانم دایە بەر ئەم کارە تەنیا کتێبێکی تەواو باوەڕپێکراوم دەربارەی کەریمخان وەدەس کەوت بە ناوی «مێژووی زەندیە» کە هادی هیدایەتی نووسیبووی. چاپی یەکەمی ئەم کتێبە ساڵی ١٣٣٤ی هەتاوی / ١٩٥٥ی زایینی لە تاران بڵاو کرابۆوە. ئەگەرچی ڕێدەستی بووە تا کەلک لە مێژووە گەورەکانی ئێرانی وەربگرێ، بەڵام دیسانیش ناتەواوی و ناوردبینییەکی زۆری بە کارەکەیەوە دیارە. هەڵبەت نووسراوەی عەبدولحوسێنی نەواییش لە کۆمەڵە زنجیرەی کتێبی گشتی بۆ لاوان لە ساڵی ١٣٤٤ی هەتاوی / ١٩٦٥ی زایینیدا بڵاو کرابووە: ئەم کتێبە لە سەرچاوەکانی دیکەی ئێرانیڕا بابەت و سەربوردەی تۆکمە و جێمتمانەی ڕاگوێزتووە و نووسیوێتەوە[47]. ئەو فرە بابەتانەی کە لە توێژەرانی دیکەی ئێرانیش وەرگیراون کەموزۆر لە پێرستنووسینەکاندا وەبەرچاو دێن. هەروەها کتێبی بەڵگەداری «ئەحمەد فەرامەرزی» بە ناوی کەریمخانی زەند و کەنداوی فارس شایانی باسکردنە (١٣٤٦ی هەتاوی / ١٩٦٧ی زایینی)[48].

---

46- See Martin Dicksons review article, 503 – 517; Arunove and Ashrafyan, Gosudarstov Nadir shah Afshar, 4 – 5.

47- See my review of these works in Iranian Studies V(1972) No. 4, 184 – 188.

48- For an appreciation of this work, as of others in this Section, see T.M, Ricks in Iranian studies VI (1973) No. 52 – 53, 110 – 126.

# جەللەی ناوی شوێنەکان

## ئەلف

## ب

## ت



## ج



## چ



## ح

## خ



## د

## ڕ



## ز



## س

## ش

## ع



## ف



## ق

## ک

## گ



## ل

## م



## ن

## ه



## و



## ی

# جەللەی هۆز و خانەدان و تایفان

## ئەلف



## ب

## پ



## ت



## ج



## چ



## ح

## خ



## د



## ڕ



## ز

## س



## ع



## غ



## ق

